## پێشکەش

ئەم کتێبە پێشکەش دەکەم بە:

گیانی پاکی ئەو شەهیدانەی گیانی خۆیان لەپێناو کوردو کوردستان بەختکرد.

هەروەها ئەو برا عەرەبانەی گیانی فیداکاری یان بەرامبەر گەلو نیشتمانەکەیان تێدایەو باوەڕیان بەوەیە کەدەبێت کێشەی کورد جێبەجێ بکرێت. هەروەها پێشکەش بەو سیاسەتمەدارو ڕۆشنبیرانەی کورد کەبەرگری یان لەمافە ڕەواکانی کورد کردووە.

هەموو ئەو کوردە نیشتمانپەروەرانەی لەپێناو شۆڕشی ئەیلولی ١٩٦١و ڕاپەڕینی بەهاری ١٩٩١دا گیانیان بەخشی و ماڵوێران و دەربەدەربوون.

بەوانەی ئاشبەتاڵ و ٣١ی ئابیان بینیو ماڵیان تاڵانکرا.

بەوانەی لەپێناو دروشمی (یاحەمرین یا دەمرین)دا بوون بەقوربانی, لەکاتێکدا ئەمڕۆ سنوورمان لەسنووری شارەوانیی شارو شارۆچکەکانی دهۆك, هەولێر, چەمچەماڵ, کەلارو مەیدان تێناپەڕێت و حزبەکانیش دەنگیان لێوە نایەت" بەڵکو ڕێگە بۆ زیندووکردنەوەی صەدامی دکتاتۆر خۆشدەکەن.

بەهەموو ئەوانەی بڕوایان بەوەیە کەبنەماڵەی بارزانی، تەنها لەڕێگەی ڕاپەڕینێکی جەماوەری یەوە لەناودەبرێت, نەك بەهۆی ئەو سەرکردە حزبی یانەوە کە لەترسی لەدەسچوونی بەرژەوەندی یەکانیان مجامەلەیان دەکەن. چونکە دوای نەمانی بنەماڵە بە٢٤ سەعات, ئاشتی و برایەتی و ئارامی لەناو سەرجەم گەلی کورددا بەرقەرار دەبێت و هەموو حزبە سیاسی یەکان یەکدەگرن.

## پێشەکی

هیچ کەس و گروپێکی سیاسی هانی نەداوم کەئەم کتێبە دەرکەم, بەڵکو رای شەخصی خۆم و کوڕەکانم بازیان و رەوەزو رووباری کچم هانیاندام، بەڵام براو خزمەکانم لەبەر باری ئەمنی خۆیان حەزیان نەدەکرد. بۆیەش بەکوردیم نووسی تاکو یەکەم جار بکەوێتە بەرچاوی کورد. کاتێك لەناوزەنگ بووم برای دڵسۆزو کوردپەروەر دکتۆر خدر معصوم نامەیەکی بۆناردبووم، داوای شەش (کرێ) رەنگاورەنگی کردبوو، ناردم لەقەڵادزێوە شەش کەری بۆ هات، ئێمە، یان دەڵێین (رانکوچۆغە) یان دەڵی ین (بوزوو)، ئەمە بوو بەنوکتە، لەخۆشناوەتی پێی دەڵێن (کڕ).

من نووسەر نیم، لەگەڵ ئەوەشدا خۆم کتێبەکەم داڕشت. بۆ ئەوەی کەس تاوانبارم نەکات کەهانیانداوم و تیشك بخاتە سەرم، رای چەند برایەکی دڵسۆزو نیشتمانپەروەرم وەرگرت پێم راگەیاندن لەبەر بارودۆخی ئیمڕۆی کوردستانی باشوور کتێبێکم بەدەستەوەیە لە ١٧ی تموزی ١٩٦٨ەوە دەست پێدەکەم چونکە صدام لەرووخاندایە، هەتا زیندووەو لەژیاندااوە پێش مەرگی (انشاء الله) بەکوردیو عەرەبیو ئینگلیزی بڵاویدەکەمەوە. هەموویان پەسەندیانکردو بۆچوونی خۆیان روونکردەوە کەبۆ گەلی عێراق بەگشتیو بۆ گەلی کورد بەتایبەتی سوودبەخش دەبێت، بەڵام چوار برای دڵسۆز گوتیان یاری بەئاگر دەکەی، ئەمە بۆ خۆتو کوڕەکانت خەتەرناکە، گوتم من لەئێرانو تورکیاو سوریا گیراوم، ئێستا لەپەنای ئەو دوو زلهێزە لەچی بترسم؟ تەنها مەترسی منداڵەکانمە، ئەگینا خەمی خۆم نی یە.

خوشك وبرای خۆشەویست: پێشەکی کتێبەکە دەبوو وا دەست پێبکەم کە لەیەکەم خاڵەوە تێهەڵچم، بەڵام هەڵوێستی من لەسەرەتای ١٩٦٢ەوە تاکو ئەم ئەمڕۆ ئاشکراو روونە بەتایبەتی لای هەردوو سەرکردە مەزنەکە، تیکۆشان و هەوڵدانم لەپێناوی یەکبوونیان بێت.

### تێبینی

*بەداخەوە هیچ بەڵگەنامەیەکم نەماوە، تەنها خۆم ماوم بۆیە دەڵێم:*

*١- ئەو وێنەو نامە گرنگانەی هەمبوو لەساڵی ١٩٥٨ کاتێك گرتیانم و لەساڵی ١٩٦٢ کەماڵیان پشکنیم، هیچی نەماوە.*

*٢- کاتێك کودەتاکەی ناظم گزار ئاشکرابوو رامکرد بۆ دەرەوەی وڵات دایکمم ئاگادارکردەوە هەرچی بەڵگەنامەو وێنەو کاسێتێکم هەبوو لەگەڵ نامەی تایبەتیو شتی زۆر گرنگ کەبۆ ئەمڕۆ زۆرگرنگو بەکەڵکبوو، بەداخەوە هەمووی بسوتێنێ.*

*٣- لە ١٩٧٦/٩/١٤ گیرام و هەموو ئەو شتە گرنگانەی هەمبوو لەگەڵ دەمانچەیەکی (کاتم الصوت) لەناویانبردبوو، پێش ئەوەی ماڵم بپشکنن.*

*٤- ئەم کتێبەم بە ٤٥ ڕۆژ نووسی، بەڕاستی کاك شوان نوری سعید لەگەڵمدابوو ئەوپەڕی یارمەتیدام و هاوسەرەکەی شەوو ڕۆژ خزمەتی دەکردم تاکو کۆتای یم پێ هێنا.*

**خزمەتکاری گەلی کورد**

**رەفیق پشدەری**

## چیم دیت ... چیم بەسەرهات

ڕۆژی ١٧ی تەمموزی ١٩٦٨ کاتژمێر ٤ی بەیانی لەبەغدا تەقەیەکی زۆر کرا، خەبەرمان بۆوە، درواسێکەم گوتی: چی یە؟ گوتم: ئەمە تەقەیە، لەخۆشی کودەتایە.

١٧ی تەمموز، ئەو کودەتا سەربازی یەبوو کەبەعسی یەکان لەبەغدا کردیان. من ئەو کاتە هەموو شوێنو دەزگا گرنگەکانی ناو بەغدام پشکنی، دوای کاتژمێر ١ی پاش نیوەڕۆ بەتەلەفۆن قسەم لەگەڵ مامۆستا ابراهیم احمد کرد بۆ ئاگادارکردنەوەی لەو گۆڕانکاری یانە، گوتم دەزگاکانی حکومەت هەمووی وەکو خۆیەتی، تەنها دوو کەس دوورخراونەتەوە ئەوانیش عبدالرحمن عارف و عبدالجلیل احمد کەبەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی بوو، هەروەها ژمارەی بەشداربوانی کودەتاکە ٤٠٠ کەس بوو کەنیوەیان چەکدارو سەر بەحزبی بەعس بوون، ئەمەش هەموو هێزو توانای سیاسی یان بوو.

سەردانی چەند ماڵێکی ناسراوم کرد لەبرا عەرەبەکان لەوانە عبدالستار علی حسەین کەوەزیری نەوت بوو، بەهۆی ئەوەبوو کەنەوتی عەرەب ڕاوەستاو نەنێردرا بۆ ئەوروپا، لەکاتێکدا کە عبدالسلام عارف لە ١٤ی تەمموز دادگایی کرا عبدالستار علی حسەین پارێزەری بوو. بە (ام علی)م گوت ئامادەم هەرکارێك بەمن بکرێت بۆتان بکەم. ناوبراو زیرەك، ئازا، پاك، بیروباوەڕی نەتەوەی ی بوو، کاتی خۆی لەپارتی استقلال کاریکردووە. ئینجا سەردانی ماڵی (رجب عبدالمجید)م کرد، کەئەفسەری پلەی عقیدو ئەندازیار بوو، پلەی سکرتێری ئەفسەرە سەربەستەکان (الضباط الاحرار) بوو، لەشۆرشی ١٤ی تەممووزدا بەشداربوو، کۆمەڵێك کاری گەورەی لەدەرەوەو لەناوەوەی وڵات پێسپێردرابوو، وەکو وەزیری ناوخۆ، جێگری سەرۆك. زیرەك، ئازا، ڕاستگۆ، نیشتمانپەروەرو بێلایەنیش بوو.

یەك سەعات لەگەڵیاندا دانیشتم، زۆر بێتاقەتو ماتو بێزەوق بوون، پێمگوت (ابو محمد) شتێك هەیە لەمنی دەشاریتەوە، ئێستا گوشار ناخەمە سەرت پێم بڵێ یت.

ڕۆژی ١٨ی تەمموز ڕۆیشتمە کۆشکی کۆماری بۆ ئەوەی چاوم بەسەرکۆماری تازە، احمد حسن البکر بکەوێت، گوتیان کاتی نىیە کەس ببینیێ. گوتم نوسراوێکم پێ یە هاتووم ئاراستەی بکەم، گوتی کوانێ نامەکە هەتا بۆی بەرم، گوتم نامەکەم زارەکی یە. ئینجا گوتم ئێوە هاتوون (تستعملون لغة الحدید والنار) او(تستعملون لغة العقل والحکمة والادراك لحل القضیة الکردیة). گوتی تۆ کێ یت؟ گوتم رەفیق پشدەریم. ئەویش خۆی پێناساندم گوتی: من (طه یاسین رمضان)م. بەرگێکی سەربازی لەبەردابوو بەپلەی نقیب، بەتەلەفۆن ئاگاداریکردن کەفلان کەس هاتووە بتانبینێ نامەیەکی زارەکی پی یە. ڕێگایاندام بچمە ژوورەوە, کەچوومە ژووری کۆمەڵێك خەڵکم دی لەوانەی بەکودەتاکە هەڵستابوون، دیقەتمدان زۆر ماندووبوون، ڕەنگی بێخەوی و هیلاکی یان پێوە دیاربوو، کراسیان چڵکنو پێڵاوەکانیان پیس بوو. لەوانەی ناسیمن (مرتضی الحدیثي و عبدالکریم الندی و محمود الندی)، ئنجا بەتەنها چاوم بەشفیق الدراجي کەوت.

**طـه یاسـین رمـضان:** کـوردە، شەشـی تـەواو کـردووە، نائـب ضـابط بـوو، پیـاوێکی شـەڕانیو خوێنمـژ، بیروباوەڕی وەکو عەرەبێکی نەتەوەی ی شۆڤێنیو، دوژمنی گەورەی کوردە.

**مرتـضی الحـدیثي:** بـەڕەگـەز کـوردە، مامۆسـتا بـوو، زیـرەك، پـاك، نیـشتمانپەروەر، خوێنـدەوار، سیاسەتمەدارێکی ناسراو، زۆر پلەی گرنگی وەرگرت، صەدام ئازارو ئەشکەنجەیەکی زۆریـدا، دەیانهێنـا لـەناو خەڵقدا وەکو کەر بزەڕێت، دوایی کوشتیان، چونکە لەناو بەعسیەکاندا ڕێزیان لێدەگرت، جار جار بەرهەڵستی صەدامی دەکرد.

**عبدالکریم الندی:** خزمێکی نزیکی احمد حسن البکر بوو، دەیگوت ئێمە سەرێکمان کوردە، زۆر نزیك بـوو لەبکر. صدام کومەڵێك کاسبی پێکرد تا لەبەرچاوی ئەلبکری بخات.

**محمود الندی:** خزمێکی نزیکـی احمـد حـسن البکـر بـوو، نـزیکترین کـەس بـوو لێـی، کاسـب بـوو، صـدام ئیشوکاری تایبەتی پێدەسپارد، ناردی بۆ لای عبدالرزاق نایف دڵنیای بکات, لەهەمانکاتدا پیاوکوژەکانی نارد لەلەندەن تیرۆریان کرد، بۆچوونی بەرامبەر کورد باش بوو.

**شفیق الدراجی:** بەڕەگەز کوردە، ئەفسەربوو، ئازا، زیرەك، خوێندەوار، بیروبـاوەڕی لەسـەرەتاوە بەعـسی بوو، عەرەبێکی شۆڤێنی نەبوو، زۆر جێـی بـاوەڕبوو لای بکـر، صـدام حـسابی بـۆ دەکـرد، پـاك بـوو، حـەزی بەخراپە نـەدەکرد، کـەیفی بـەمرۆڤی کـورد دەهـات، بەڕێوەبـەری ئیـستخباراتی سـەربازیبـوو لەحکومـەتی عبدالـسلام وعبـدالرحمن عارفـدا، سـکرتێری ئەنجومـەنی سـەرکردایەتی ی شـۆڕشو لەهەمانکاتـدا سـکرتێری بکریش بوو.

بەتەنها چاوم بەشەفیق الدراجی کەوت، گوتم ئەوسـا ئەگـەر چـاوم بـەبکر بکەوتبایـە سـکاڵام لـەلادەکرد کەئاگایان لەتۆ بێت بەڵام ئێستا بـەڕێزتان هاتوویـت بـەناوی حکومـەتی بکـرەوە گفتوگـۆم لەگـەڵ دەکـەیت. بەدوورودرێژی باسی قسەکانی منی کرد کە بەگشتی خۆشـحاڵ بـوون پـی یـان. گـوتی ئێـستا کۆبوونـەوەمان دەربارەی هەموو ئـاڵۆزیو کێـشەکانی عێـراق هەیـە، بەتایبـەتی چـۆنیەتی جێبـەجێکردنی کێـشەی کـورد، لەهەڵسانمدا گوتم سڵاوم بگەیەنە، گوتی بەشی زۆریـان بەشـخـصی دەتناسـن، سـڵاومان بگەیەنـە بەمامۆسـتا ابراهیم احمد و مام جەلالو گشت برادەران.

لە٢٥ی تەممووزدا لەگەڵ کەریم قەرەنی سەردانی ابراهیم داودم کرد کـەوەزیری بـەرگری بـوو، گـوتم خـەڵك بەگـشتی دەیزانـی کودەتـا دەبـێ. سەرسـوڕمان لەوەدایـە فەرمانـدەی گـاردی کۆمـاری لەگـەڵ جێگـری بەڕێوەبـەری دەزگـای ئیـستخبارات بـەم کـارە هەسـتان. کـەریم قـەرەنی، ئەفـسەربوو، لەناوچـەی سـلێمانی ناسراوبوو، ئازاو زیرەكو نیشتمانپەروەربوو، حەزیدەکرد بەپی ی توانا خزمـەتی کـورد بکـات، بـەڵام لـەکاتی مەترسیدا خۆی دووردەخستەوە، زۆر حەزی بەبرادەرایەتی عەرەب دەکرد.

**ابــراهیم داود:** لێپرســراوی حیمایــەکانی کۆمــاریو جێبــاوەڕی عبــدالرحمن عــارف بــوو، ئــازا، زیــرەك، نیشتمانپەروەربوو، بیروباوەڕی عەرەبێکی نەتــەوەیی بــوو، دژی کــورد نــەبوو، لــە ٢٧ی تــەمموزی ٦٨ ئەمــە دووهەم جارە کەلەو ڕۆژەی عبدالرزاق نایف هاتۆتە ســەر حــوکم لەگەڵیــدا کۆببمــەوە، ســێ قــۆڵی دانیــشتین ناوی ئەو کەسەی تر نابەم لەبەر ئــەوەی ئێستا لەبەغدایــە. گــوتم: جــاران وەزعــت لەئێــستا زۆر بــەهێزتربوو، هەرچەندە بەناو زۆر گەورەی، بەڵام مەترسی یــەکی گــەورەت لــەدەوری خــۆت کۆکردۆتــەوە، قــسەکانتان زۆر جیاوازە لەگەڵ کادرەکانی بەعس، ئەوان وردەوردە جی ی خۆیان خۆشدەکەن.

لە٢٨ی تەممووزی ١٩٦٨ سەردانی (رجب عبدالمجیـد)م کـرد، بەدوورودرێـژی چـیم بـە عبـدالرزاق نـایف و ابراهیم داود گوتبوو هەمووم بۆی باسکرد. ئینجا ابو محمـد هـەموو نهێنیـیەکانی بـۆ گێڕامـەوە گـوتی: ئێمـە دەمێکە خەریکی ئەم کودەتایـەین، وا ڕێککـەوتووین کـەمن بکـرێم بەسـەرکۆمارو احمـد حـسن البکـر بکرێتـە سەرۆکی وەزیران بەڵام ئەفسەرەکان هاتنە لام، عبدالرزق نایف لەوانە بوو کەگوتی احمد حسن بکر بەتەمەنـە با ئەو ببێتە سەرکۆمارو تۆش ببە بەسەرۆکی وەزیران. من رازی بووم. کاتێك عبدالرحمن عـارف بـۆ فەرەنـسا بوو، وا بزانم ساڵی ١٩٦٨بوو، پرسیان پێکردم کودەتا بکەین. گوتم: نەخێر، بـۆ شـانی عـەرەب جـوان نیـیە عبـدالرحمن عـارف لەگـەڵ سـەرکۆماری فەرەنـسادا کۆببێتــەوە، ئێمــەش لێـرە کودەتـا بکـەین. ابـو درێـد (عبدالرزق نایف) بەم نزیکانە سەردانیکردم گوتی: هەموو دەسەڵات وهێزێك بەدەسـت ئێمەیـە، بـۆ کودەتاکـە بەجووتە نەکەین؟ تـۆ(رجـب عبدالمجیـد) ببیتـە سـەرکۆمارو منـیش ببمـە سـەرۆکی وەزیـران، گـوتم: بەسـە باهیچی تر عەسـکەر نەیەتـە سـەر حـوکم، ئـیتر ئـەم کودەتایـەی ١٧ی تـەمموز بـەم شـێوەیەی ئێـستا کـرا، بەڕاستی ابو بازیان باشت بەعبدالرزاق نایف گوتووە.

لـەدوای ٢٨ی تـەممووزەوە مامۆسـتا ابـراهیم احمـدو مـام جـەلالو حمـە امـین فـرجو عمـر دەبابـە دەچـنە سەردانی حماد شهاب کەئەفسەرێکی ناسراو بـوو، یـەکێك بـوو لەچـوار لێپرسـراوەکەی بـەعس، بـۆ پیرۆزبـای یکردنی بەبۆنـەی ١٧ی تـەممووزەوە، لەمیوانـداری یەکـەدا یـەکێك قـاوە دەگێـڕێ، حمـاد شـهاب ڕوو دەکاتـە ابراهیم احمد دەڵێت ئێوە لاوێکی شۆڕشگێڕتان هەیە بەناوی جەلال تاڵەبانی، ئێمـەش لاوێکـی شۆڕشـگێڕمان هەیە پێی دەڵی ین (صدام التکریتی) کەقاوەی بۆتان دەگێڕا.

ئێوارەی ڕۆژی ٣٠یتـەمموز چـوومە مـاڵی رجـب عبدالمجیـد لەسـەر داواکردنـی خـۆی، کـەنزیك بوومـەوە لــەماڵیان، تەماشــامکرد بــەردەرگایان دەشــۆرد, گــوتم لــەوە دەچــێ چــاوەڕوانی میــوان بکــەی؟ گــوتی: سەرلەبەیانی ابو درید (عبدالرزاق نایف) تەلەفۆنی لەگەڵ کردم، داوای لێبوردنی لێکردم، چاوەڕوانم ئێستا بێـت، حـەزم کـرد لێـرە بیـت. بەپێکەنینـەوە گـوتم عبـدالرزاق نـایف گـیراوە، لەصـالحیە ژمـارەی ٢٠٠ کـەس راوەستــاون بەرامبــەر ئیـستگە چـاوەڕوانن کەبـەم بۆنەیـەوە بـەناوی ئەنجومـەنی سـەرکردایەتی ی شـۆڕش ڕوونکردنەوەیەك بڵاوبکەنەوە. ئینجا گوتم: ئەمڕۆ بەناوی ئەلبکر تەلەفۆنیان لەگەڵ عبدالرزاق نـایف کـردووە

کەبۆ نانخواردنی نیوەڕۆ بێتە کۆشکی کۆماری بەیەکەوە کەباب بخۆین، کەدەگاتە شوێنی دیاریکراو دەیبەنە ژوورێك لەپڕ صدامو عبدالکریم شیخلیو چەند کەسێکی تر خۆیان دەکەنە ژوورەوەو میلی کلانشکۆفی لێرادەکێشن، عبدالرزاق نایف دەترسێ ودەپاڕێتەوە کە نەیکوژن، ئنجا احمد حسن بکر فریای دەکەوێتو ناهێڵێت بیکوژن. کەقسەکانم بۆ رجب عبدالمجید تەواوکرد دیقەتیمدا سوور هەڵگەڕاوە، تاساو گرژبوو، چاوەڕوانی ئەم دەنگوباسە ناخۆشو دڵتەزێنەی نەدەکرد.

دوای گرتنو دوورخستنەوەی عبدالرزاق نایف بەعسی یەکان دەستیانکرد بەپڕوپاگەندەی جۆراوجۆر گوایە نیازی کودەتای هەبوەو دەیویست بەتەنها حوکم بکاتو وەکو عبدالکریم قاسم، عێراق بگەڕێنێتەوە بۆ سەردەمی پاشایەتی، نەوتی عێراقیان بداتێ، هەروەها بۆچونێکی سیخوڕی هەبوو بەو نیازەی عەسکەر حوکم بکات. ئەمە هەنگاوی یەکەمیان بوو کەبەعس بەتەنها فەرمانڕەوای ی بگرنەدەست. عبدالرزاق نایف ئەفسەربوو بەپلەی عقید، زیرەك, زۆردار, پیاوکوژ, خوێندەوار, سیخوڕێکی پیلانگێڕ, داوێنپیس، دزو بەرتیلخۆرێکی بێوێنە، شۆڤێنیو دژی کوردیش بوو. بۆ دەرەوەی وڵات بۆ لندن دوورخرابۆوە، محمود الندی بۆی گێڕامەوە گوتی: لەسەر داوای صدام چوومە لای عبدالرزاق کەگفتوگۆی لەگەڵدا بکەم، کەچی لەپەنای من کوشتیان، کەگەڕامەوە یەکسەر صدامم دیت گازاندەم لێکرد کەبۆچی یەکێکی دیکەت نەنارد بەم ئیشە هەستێت؟ ئەمە بۆ من زۆر ناشیرینە. صدام گوتی ابوشکر تەنها تۆ دەتوانیت وابکەیت عبدالرزاق نایف جێگای خۆی ئاشکرا بکاتو بەپیرتەوە بێتو میواندارێت قەبووڵ بکات" ئێمەش فرسەت لەوە وەردەگرینو کوشتمان، ئەمە پیاوێکی مەترسیدارەو دوارۆژ دەبووە سەرکۆمار.

محمود الندی گوتی: رەفیق ئایا دەزانیت جەلال تاڵەبانی زۆر برادەرمە؟ دەترسم پچم بۆ لەندەن لەگەڵی دانیشم، دەترسم وەکو رووداوەکەی عبدالرزاق بکەن! ئێمە زۆر نزیکین لەکوردو خزمایەتیمان هەیە، ئەمە لەسەر بنەماڵەی ئێمە زۆر دەکەوێت.

باسی چەند کەسێك دەکرا کەئەمانە ئیشوکاری وڵات بەڕێوەدەبەن لەوانە: احمد حسن بکر, صالح مهدی عماش, حردان التکریتی, حمادی شهاب.

**احمد حسن بکر:** پلەی ئەفسەر بوو، لەڕووی سەربازی یەوە مامناوەندی بوو، لەڕووی سیاسی یەوە بێتوانا بوو، زۆردار، پیاوکوژو بێگفت بوو، دەستێکی باڵای هەبوو لەسیخوڕیو پیلاندانان، عەرەبێکی شۆڤێنی بوو، هەرچەندە ڕەگەزێکی کورد بوو. بەتاوانباری یەکەم دادەنرا دژی گەلی عێراق، بەتایبەتی کوردو شیعە، هەروەها پەیکەرێك بوو بۆ پاڵپشتی صدام حسەین، زۆر حەزی لەلێدانی رەبابە دەکرد. کاتی زۆری تەرخانکردبوو بۆ ژەنینی ڕەبابەکەی، لەئیستگەش هەموو ڕۆژێك بەشێك تەرخانکرابوو بۆ ژەنینی رەبابە.

**صالح مهدی عماش:** پلەی ئەفسەربوو، لەڕووی سەربازی یەوە ناسراو، خوێندەوار، زیرەك،

هۆشمەند, شاعر، یاریزانی تـۆپی پـێ بـوو, بیروبـاوەڕی بەعـسی بـوو، سیاسـەتمەدارێکی پـاك بـوو، دوژمنـی هەموو نەتەوەییەکان بوو بەتایبەتی کوردو شیعە، لەداڕشتنی سیخوڕیدا دەستێکی باڵای هەبوو.

**حردان التکریتی:** پلەی ئەفسەر بوو، فڕۆکەوانێکی شارەزاو ناسراو بوو، خوێندەوار، زیرەك، لەنەخشەدانان دژی جەماوەر دەستێکی باڵای هەبوو، باوەڕی بەدیموکراسی نەبوو. بەکارێکی تایبەتی دەچێتە ئیتالیا لەگەڵ باڵیۆزی عێراقـی بـەرەو کۆشـکی کۆمـاری دەڕوات، بـەهۆی تەلـەفۆنی نـاو ئوتومبێلەکـە هـەواڵیان پێـدەگات کەحردان تکریتـی جێگـری سـەرۆکی وەزیـران، هـەموو پلـەو پایـەیان لێساندەوە. صـدام بەئاشـکرا لـەکوێت کوشتی، ئەو کاتە عبدالکریم شیخلی وەزیـری دەرەوە بـوو لەگـەڵ ژمارەیـەك چـەکدار لەفڕۆکەخانـەی کوێـت هاتنە خـوارێ، وەزیـری دەرەوەی کوێـت سـەری سـوڕما کەچـاوی بـەو دیمەنـە کـەوت،   ناچـاربوو ئەوانـەی بەتاوانی کوشتنی حردان گیرابوون، تەسلیمیان بکاتەوەو بەهەمان فڕۆکەش گەڕانەوە بەغدا.

**حماد شهاب:** پلەی ئەفسەر بوو، لەڕووی سەربازی یەوە بەشارەزا باسدەکرا، بیروباوەڕی بەعسی بوو، ئازا، پاك، مرۆڤێکی سەنگین. لەکودەتاکەی نازم گزاردا کوژرا.

صدام ناڕازیبوو چەند کەسێکی مەدەنی ببنە ئەندام لە (مجلس قیـادە). دوای لابردنـی عـارف عبـدالرزاق, میشێل عفلق بەم ئیشە هەستاو بەناوی ئەوەی کەنابێت دووبەرەکی لـەناو سـەرکردایەتیی بـەعس ڕووبـداتو، بەتـەنها عەسـکەریەکان فـەرمان بگرنـە دەسـت، بۆئـەوەی لـەڕووی چەسـپاندنی یاسـادا کـەموکوڕی نـەبێتو دیموکراسی بەرقەرار   بێت ئەوە بەرژەوەندیی وڵات وا پێویست دەکات کەئەمانـەش ببنـە ئەنـدام لـە(مجلس قیادە)دا. ئەوەبوو پیلانەکەی میشێل عفلـق سـەریگرتو صـدام هاتـە پێـشەوەو بـوو   بەئەنـدام، وردە وردە لەپـشت پـەردەوە دەسـتی خـستە نـاو کاروبـاری وڵات بەپـشتیوانی   احمـد حـسن بکـرو میـشێل عفلقـی مامۆستایان. ئەوان بەناوی دەسـتکەوتەکانی شۆڕشـەوە ڕێگایـان نیـشاندەدا بـەهێزێکی چـەکداری پیـاوکوژو خوێنمژ و زۆردار ١٠٠ کەس لەژێر   فـەرمانی تایبـەتی صـدامدابوون بـۆ چەسـپاندنی حـوکمی خۆیـان کەپـەنا نەبەن بۆ پۆلیسو ئاسایش و ئیستخباراتو دادگا چ لەناو خۆیان وەکو بەعس چ لەناو عێـراق، چـی یـان بـوێ بۆی جێبـەجێ بکـەن کەئەمـە گـەورەترین  هەڵـەی کاربەدەسـتانی بـەعس بـوو کەصـدام لـەو خاڵـەوە خـۆی جێگیرکردو لەڕێگای توندوتیژی بەتەواوەتی زاڵ بوو.

**میشێل عفلق:**  هەموو ژیانی خۆی لەپەنای صدام بۆئەوە تەرخانکردبوو کەئەوپـەڕی دژایـەتی هـەموو گـەلی عەرەب بکات، سیاسەتمەدارێکی ناسراو، نووسەرێکی بەتوانا، زیـرەك، لەیەکـەم ڕۆژەوە تـاکو مـرد پاڵپـشتی صەدام بوو، چوار جار بەدوورودرێژی لەسـەر مەسـەلەی کـورد لەگەڵیـدا دواوم, وامـدەزانی رای باشـە، بـەڵام دوای هەرەسەکە بۆم باسکرد کەئەو کوردانەی دەگەڕێنەوە ڕەفتاری نابەجی یان لەگەڵدا دەکرێت. ئـەوەبوو لەگۆڤاری (أفاق) شتێکی بڵاوکردەوە کەبەڕێوبەرایەتی ی ئاسایـشی گـشتی هـەمووی کـۆکردەوەو سـوتاندی بەڵام (١٠٠)دانەی کەوتە دەست خەڵك. من وای بۆ چووم کەکوردی خۆشدەوێت کەچی گوتبـووی مەلامـستەفا

بارزانی چی داوا دەکرد بۆ کورد برۆن بەزووترین کات جیّ بـەجی ی بکـەن. سـوپاس بـۆ خـوا کەصـەدام لـەم بارەیەوە بەقسەی میشێل عفلقی نەکرد، لەرێگای پیلانی خۆی جوولاّیەوە کە نەیتوانی زالّ بێت بەسەر کوردو کوردستان. صـدام لەسـەرەتاوە تـاکو ئێـستا بەهەڵـە دەڕوات، ئاسایـشی گـشتی منیـشیان ئاگـادار کـردەوە کەهاتوچۆی نەکەم.

## پیلان دارشتنی بەعسیەکان:

بـۆ دەسـت بەسـەراگرتنی ولاّتو بـەرێوەبردنی کەوتنـە نەخشەکێـشانو پاکـسازی لـەدەزگاکانی سـوپاو ئاسایشی گشتیو ئیستخباراتی عەسکەریو وەزارەتی ناوخۆ.

١ـ لەمەکتەبی تایبەتی احمد حسن بکرەوە فەرمان بۆ وەزارەتی نـاوخۆ دەرچـوو کەئـەو قوتابیانـەی ٣ی ناوەندی یان تەواوکردووە، یان لەخوێندن دابڕابوون لەوەزارەتی ناوخۆ بەپلەی مفوض وەرگیرێن، ماوەیـەکی کـورتیش خولیـان پـیّ بیـنین‌و دوایـی بەشـێکیان پلـەی گـەورەیان وەرگـرت. کـەمالی بـرام هەشـتەم نـاوبوو کەوەرگیرا، ئەویش بەهۆی منەوەبوو.

٢ـ ژمارەیەك قوتابی لەوانەی کەپۆلی شەشەمی ئامادەیی یـان تـەواوکردبوو، یـان دابڕابـوون لەخوێنـدن، فەرمان لەمەکتەبی احمد حسن بکرەوە دەرچوو بۆ وەزارەتی بەرگری و کـران بـە(نائـب ضـابط) ماوەیـەکی کورتیش دەورەیان دی، دوای ی کران بەئەفسەرو پلەی گەورەیان لەسوپادا وەرگرت.

٣ـ هەموو ئەو بەعسی یانەی لەسەردەمی حکومەتەکانی عبدالکریم قاسم و عبدالسلام عـارف و عبـدالرحمن عارف دوورخرابوونەوە یەکسەر لەدەزگاکانی حوکمەت چ عەسکەری بووبێت یان مەدەنی، وەرگیرانەوە.

٤ـ دەستیانخستە ناو ئابووری ولاّت، ئەوانەی کەسەر بەخۆیان بوون بەرژەوەنـدیی گـەورەیان دانەدەسـتو دەولّەمەندیانکردن.

٥ـ ئەوانەی دژی بەعسی یەکان بوون بەنهێنیو بەئاشکرا لـەناویانبردن, بـۆ نموونـە کـاتی خـۆی کـە احمـد حسن بکریان بۆ دادگایەکی عەسکەری راپێچا، دادوەرەکـە پـی ی نـەگوتبوو دانیـشە، ئاشکراشـە کـەتاوانبار بۆی نی یە لەژووری دادگا دانیشیّ، بەلاّم کەهاتنەسەر حوکم، ناوبراوی لەدادگا دەرکردو گرتی.

فوئاد الرکابی تاوانێکیان بۆ دروستکردو حوکمدراو خرایە بەندیخانـەی باقوبـە. ڕۆژێـك لەگـەڵ مـام جـەلال چووین بۆ سەردانی فوئاد الرکابی, لەژووری بەرێوەبەر چاومان پێکەوت, فوئاد بەمام جەلالی گوت عـەریفێکی عەسکەری کوردیان هێنایە (انضباط)خانە بەپێی یاساش دەبیّ پلەکانی سەرشـانی لێوەرگرنـەوە، عەریفەکـە گوتی من سیّ خەتم هەیە، یەکێکیان هی بەعسە، دوانەکەی تر هی خۆمە (بۆ نوکتە)و گاڵتەوگەپ، مام جـەلال وەلاّمیدایەوە: ئیمرۆ لە عێراقدا بەعس فەرمانڕەوای ی دەکات کەچی دامەزرێنەری بەعس کەسکرتێری بەعس بووە ئێستا لەبەندیخانەیە. دوای ی صەدام بەوەش وازی لێنەهێناو هەر لەو بەندیخانەیەدا کوشتی.

٦- کادرەکانی بەعس وەکو نەدیوبدی دەستیانکرد بەکۆشك دروستکردن و کڕینی ناومال و ئوتومبێل و هێنانی ژنی تر بەسەر خێزانەکانی خۆیاندا. بەکورتی لەبەرچاوی جەماوەر خۆیان پۆشتەکردەوە. دوای ئەم کردەوانە ناویان بەزەقی کەوتە ناو ناوانەوە. سەرەتا تاکو ماوەیەکی زۆر یەکێکیان هەر بەهەژار خۆی لەبەرچاوی جەماوەر نیشاندەدا گوایا تەنها بۆ خزمەتکردنی وڵات هاتووە, هەروەها بەرژەوەندیی جەماوەری پێ هەموو شتێکە، ئەو کەسەش صدام بوو. بۆ نموونە خەیروڵلای خاڵی، لەیەکەم ڕۆژی هاتنی بەعس فەرشێکی لەخانەقین بە١٢٠ دینار کڕیبوو, مانگانە بەقیست پارەکەی دەدا فەرشەکەم بۆ هێنایەوە بۆ بەغدا، زۆری پێنەچوو بوو بەدەوڵەمەندترین کەس لەسەرانسەری عێراقدا.

٧- بۆچوونیان بەرامبەر بەکورد: پێش هاتنیان بۆ سەر حوکم پێوەندی یان بەهەردوو باڵە سەرەکی یەکەی کوردەوە کردبوو کەپارتی دیموکراتی کوردستان و م.س جماعەتی مام جەلال بوون. لەهەموو دانیشتن و کۆبوونەوەکانیاندا دانیان بەلاپەڕە رەشەکانی خۆیاندا دەنا کە بەتەنها حوکم ناگرنە دەست بەڵکو دەبێت حکومەتێك پێکبێت هەموو گروپە سیاسی یەکان تی یدا بەشداربن، ئەمە پڕوپاگەندەیان بوو، بۆ خۆشیان بەردەوام ئەم قسەیەیان دەکردو ڕووبەڕووی کورد بەگشتی دەیانگوت ئەگەر ئەم جارە ئێمە بی ینەوە سەر حوکم یەکەم شت مەسەلەی کورد بەئاشتی جێبەجێ دەکەین، حکومەتەکانی پێشوو هیچیان نەیانتوانی چارەسەری بکەن، هەروەها شەڕ، ماڵوێرانی هەموو لایەکەو حکومەتی عبدالرحمن لاوازە ناتوانێت بەرامبەر عەسکەری یەکان دان بەمافە رەواکانی کورددا بنێت.

کاتێکیش (عبدالرزاق نایف)یان دوورخستەوەو فەرمانڕەوایی‌یان گرتەدەست بەقسە وایان نیشاندا گوایە لەباڵی پ.د.ك (بارزانی) دوورکەوتوونەتەوە بەو بیانووەی کەپاڵیان بەڕژێمی شای ئێران داوە، ئەم هەڵەیان قۆستەوەو خۆیان لەباڵی م.س (مام جەلال) نزیککردەوەو بەئاشکرا زۆر یارمەتی یان دەدان، بەڵام بەنهێنی کنەیان دەکرد کەخەڵکیان لێ بکڕن و دووبەرەکی یان بخەنە ناو. بۆ ئەم مەبەستە تارق احمدیان هاندا کەخۆی جیابکاتەوەو لەگەڵ چەکدارەکانی یەکسەر پاڵ بداتە حکومەت لەکاتێکدا ئەوپەڕی دۆستایەتی و یەکێتی هەبوو لەنێوان جماعەتی مام جەلال و بەعسی یەکان.

مام جەلال پێمی گوت ئاگاداری حکومەت بکەوە کەپێوەندیمان دەپسێنین ئەگەر بێت و تارق احمد و چەکدارەکانی نەگەڕێنەوە ناو هێزی عەسکەری مەکتەبی سیاسی یەوە, لەمەوە بەئاشکرا گومان کەوتە نێوان جماعەتی مام جەلال و حکومەتی بەعسەوە. حکومەت ویستی هێزی سێهەم دروستبکات. ئاشکرابوو کەدوو باڵی سەرەکی هەیە ئەوانیش (پ.د.ك) بەسەرۆکایەتی بارزانی و م.س. جماعەتی (مام جەلال).

هەرچەندە هێزی فرسان هەبوو کەناویان نابوو (جاش)، ویستیان هێزی سێیەم دروست بکەن لەسەرۆکی هۆزەکانی کورد کەنیشتمانپەروەر بوون, بۆ ئەم مەبەستە پەیوەندیم بەچەند سەرۆك هۆزێك کرد، هیچ

کامێکیان نەهاتنە ژێر ئەو پیلانەی بەعس، گوتیان کەمەسەلەی کورد تەنها لەرێگەی ئەم دوو گروپە سیاسی یەوە گفتوگۆی لەسەردەکرێت.

چووم بۆ بارزانو لەگەڵ شێخ عوسمان بارزانی بەیاوەری شێخ بابۆ کەبرای مەلامستەفابوو لەگەڵ کوڕەکەی کەتەمەنی ٨ ساڵان بوو هاتینە بەغدا. رۆژێکی بەهاری ساڵی ١٩٦٩بوو چووینە لای احمد حسن بکر کەعمر هزاعو شفیق الدراجی لەلابوون. کەچووینە ژوورەوە ئەلبکر بەتووڕەبوونو گرژی یەکی زۆر ناشیرین ڕوویکردە شێخ عوسمان بارزانیو بەدەنگێکی بەرز گوتی: ئایا من عبدالسلام عارفم یان عبدالرحمن عارف؟ من احمد حسن بکرم, ئەگەر بێتو ئەمە بەسەرما تێپەڕێت لەکاتێکدا مەلامستەفا سەرکردایەتیی شۆڕش دەکاتو شێخ احمد بارزانی پارە لەئێمە بکێشێتەوە.. من هەڵمدای ی گوتم: سلام علیکم جنابی سەرۆك, سەعاتێکە دانیشتووینو میوانداری یەکتان نەکردووین، تۆش لەگەڵمان بەم جۆرە گرژ بیت، دیارە دەمارێکی کوردت تێدایە! گوتی: ئەمە چۆن دەزانیت؟! گوتم: ئێمە ماوەیەك دراوسێی ماڵی عبدالکریم الندی بووین هاتوچۆی یەکتریمانکردووە, بەرێزتان بەهاوسەرەکەمو دایکمت گوتبوو من ڕەگەزم کوردە. گوتی: تۆ ابو کێت پێدەڵێن؟ گوتم: کچەکەم ناوی ڕووبارە، ئەوان بەرووبا ناویدەبەن، خۆشحاڵی دەربڕیو ئەحواڵی ماڵەوەو دایکمی پرسی گوتی عومەرئاغا کە لەتکریت حاکم بوو خاڵم بوو، کوردە، بەخێرهاتنێکی گەرمی کردین سەرو دەمانچەی پێشکەشکردین، دوای ی دانی پێدانا کەڕەگەزی کوردە.

**عمر هزاع:** ئەفسەر بوو گەیشتە پلەی (قائد فرقە)، بیروباوەڕی بەعسی بوو، ئازا، حەزی بەدۆستایەتی ی کورد دەکرد، خزمێکی نزیکی احمد حسن بکر بوو. بەفەرمانی تایبەتی صدام بەزیندویەتی زمانیان بڕی و دوای ئەوە کوشتیان.

**شێخ عوسمان بارزانی:** کوڕی شێخ احمد بارزانی، ئازا، زیرەك، خوێندەوار، شێخ ئەدهەم کوڕە گەورەیەتی. بەفرمانی صدام لەگەڵ ٣٤ کەس لەبنەماڵەی شێخانی بارزان کوشتیان.

**صدامو کێشەکانی:**

ئاشکرایە بۆ ئەوەی دەسەڵاتی خۆی بەسەر عێراقدا بچەسپێنێت توندوتیژی بەکارهێناو ئێستا سەرکردەی وڵاتەو ئیتر پێویست بەوە ناکات وەکو پێشتر هێزێکی چەکداری خوێنمژ لەدەوری خۆی کۆبکاتەوە چونکە ئەمە بۆ شانی جوان نی یە، پێویستی بەوەبوو کەسێك بدۆزێتەوە وەکو خۆی درندەو پیاوکوژو لەناو هەموو گەلانی عێراقدا ناسراو بێت بەتایبەتی لەناو حزبی بەعسدا، بەناو بۆ چەسپاندنی فەرمانڕەوای ی بەعس، بەڵام لەڕاستیدا بۆ بەدەستهێنانی ئارەزووەکانی خۆی بوو لەژێر پەردەی ئەو فەرمانڕەوایی یەدا. صدام ئەم مەبەستانەی باسمانکرد لەکەسایەتی نازم گزاردا بەدیکرد.

ئەمە یەکەم بڕیاری (مجلس القیادە) بوو کەمرۆڤێکی مەدەنی بەپلەی لیوا دامەزرێنێت کەساڵی ۱۹۶۹ کرا بەبەڕێوەبەری ئاسایشی گشتیو جێگری بەڕێوەبەری پۆلیسی گشتی. نازم گزار هەموو فەرمانو ئارەزووەکانی صدامی جێبەجێ دەکردو گوتەو فەرمانەکانی خۆیشی رەتکردنەوەی نەبوو.

بەیانییەك دەرنەچوو بووم لەماڵەوە, جمیل صبری عبداللە کەمفوض بوو لەئاسایشی گشتی پەنای بۆ هێنام کەنیازی چوونە دەرەوەی وڵاتی هەبوو بۆچارەسەرکردن کەتووشی نەخۆشی پێست بوو بوو, کاروباری سەفەرەکەی لای حامد العانی بوو، گوتی ئێستا نازم گزار بۆتە بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی بەهیچ جۆرێك رێگام نادات و دەبێت لەگەڵم بی یت بۆ ئەوەی بڕیار بدات سەفەر بکەم. ئەوەندە پاڕایەوە ناچاریکردم، گوتم من لەگەڵت دێم، بەڵام من یەك جار نازم گزارم دیوە کەبەڕێوەبەری پەیوەندی یەکانی (مجلس قیادە الثورة) بوو، زۆر زەحمەتە بتوانم بگەمە لای چونکە دەوروتەسلیمی لەگەڵ دەکەن. پێشی کەوتم بۆ بەڕێوەبەرایەتی ی ئاسایشی گشتی. لای عقید حاجی عبدالواحد نوری کەیاریدەدەری بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی بوو دانیشتم تائاگاداری بکەن بۆ ئەوەی کەی کاتی بێت بتوانم چاوم پێی بکەوێت. کەچوومە ژووریێ بەگەرمی یەوە بەخێرهاتنیان کردم بەتایبەتی نازم گزار, پیرۆزبای یم لێکرد بەبۆنەی دامەزراندنی لەبەڕێوەبەرایەتی ئاسایشی گشتی. سێ کەس لەژورەوە بوون: نازم گزار بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی، حامد العانی جێگری وەزیری ناوخۆ کەپێش ئەوە بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی بوو, عبدالخالق عبدالعزیز بەڕێوەبەری کاروباری سیاسی لەدەزگای ئاسایشی گشتی. گوتم (ابو حرب)، نامەوێت کاتت لێبگرم ئێوە ئیشوکاری گرنگتان لەبەردەستایە وا ماوەی دوو کاتژمێرە پەیوەندیت کردووە بەبەڕێوەبەرایەتییەکەتەوە منیش هاتووم برادەرێکی دڵسۆزو خۆشەویستم هەیە تووشی نەخۆشی یەکی کوشندە بووەو دەیەوێت بڕوات بۆ ئەڵمانیا بۆ چارەسەر، تکام وایە بڕیار لەسەر مامەڵەکەی بدەیتو بۆی تەواو بکەیت. گوتی: ئەمە ئاسانە. دەستبەجێ بڕیاریدا بۆی ئەنجام بدرێت, پاشان گوتی: رەفیق پشدەری رۆژانە سەر دەکات بەم وەزارەتو ئەو بەڕێوەبەرایەتیەدا، بەڵام زەحمەتە بتوانین دەستنیشانت بکەین کەبەڕاستی لەچ شوێنێکیت، یا سەرت بەچ وەزارەتێکدا کردووە، وەرە باڕێك بکەوین بەیەکەوە ئیش بکەین، بەیەکەوە لەسەر ئەم مێزە کاروباری وڵات بەڕێوەبەرین، ناهێڵم هیچ گیروگرفتێك بێتە رێگات، چیت دەوێ هەتاکو بۆتی بکەم دەربارەی یارمەتیدانی خەڵك بەشێوەیەکی گونجاو بۆت جێبەجێ بکەم بەپێی تواناو یاسا. گوتم: (ابو حرب) زۆر زەحمەتە بتوانین بەیەکەوە کار بکەین چونکە بۆچوونمان جیاوازە، هەروەها دۆستایەتیەکەمان لەدوورەوە بێت باشترەو، زەحمەتە تۆش بتوانیت من قبووڵ بکەیت بۆ ئەو کارە، ئایا تۆ دەتەوێت دەنگوباست پێ ڕابگەیەنم کەئەمە بەعسییە، یان ئەمە شیوعییە، ئەمە کاری من نییە، بەڵام ئەگەر هاتو راستی یەکانم گوت ئایا دوایی پێستم ناچێتە دەباخانە؟ ئێستا دانیشتوانی بەغدا بەگشتی باسی دامەزراندنی تۆ دەکەن و دەڵێن نازم گزار قەصابە لەم شوێنە گرنگە دامەزراوە، واتە بەڕێوەبەرایەتی ئاسایشی گشتی دەبێتە هۆی

ئەوەی کەخوێن بەجۆرێك برژێت تا دەگاتە ئەژنۆ، هەروەها دەڵێن ١٣ بەڕێوەبەری هەیە، هەریەکە لەجێگای خۆی دانیشتووە لەپشت مێزەکەی جووڵەی تێدا نییە، نازانێت چۆن چۆنی لەگەڵ بەرێزتان بجووڵێتەوەو ڕاپۆرتی ڕۆژانەی خۆی پێشکەش بە بەرێزتان بکات. گوتی: من لەکەسێکی وا

دەگەڕێم، ئەویش تۆی، ڕازیم و دەرگای ژوورەکەم کراوەتەوە لەئاستی تۆداو دەبێت هەموو ڕۆژێك کەدانیشتم لەسەر کورسی‌یەکەم یەکەم کەس تۆ بی یتە ژوورەوە گفتوگۆ بکەین، بۆ جێبەجێکردنی هەموو گیروگرفتێك لەپێناوی خزمەتکردنی وڵات.

**نازم گزار:** خەڵکی عمارەیە، بەئاین صببی، دەرچووی پەیمانگای پیشەسازی، کادرێکی کۆنی ناسراوی بەعس بوو، زیرەك، ئازا، دەستبڵاو، کەم دەدوا، کەدەستی بەقسە دەکرد سێ سەعات لەسەریەك قسەی دەکرد، پەیوەندی خزمایەتی‌و خێزانی نەدەزانی، دژی نەتەوەی کورد نەبوو، تێکەڵاوی لەگەڵ کورد هەبوو، (زاوایەکی کورد بوو) خێزانی نەبوو، دژی سەروەت‌و سامان بوو, هیچی نەبوو. پیاوکوژو ستەمکارو خوێنمژ. لەکودەتاکەی ١٩٦٣دا ناوی هاتە ناو ناوانەوە, کرا بەلێپرسراوی لێکۆڵینەوە, زۆر کەس بەفەرمانی ئەم کوژراون. لە١٩٦٨دا کەبەعس هاتە سەر حوکم, کرا بەبەڕێوەبەری پەیوەندی بیەکان لە(مجلس قیادة الثورة), ساڵی ١٩٦٩ کرا بەبەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی عێراق‌و بریکاری بەڕێوەبەری پۆلیسی گشتی. لەبەر ئەوەی جێی باوەڕو متمانەیەکی زۆری بکرو صدام بوو, ئەم دەسەڵاتەیان خستە ژێر دەستی بۆ ئەوەی دڵنیابن لەوەی کەپەیڕەووپرۆگرامی حزبی بەعس لەناو خەڵکی عێراقدا جێبەجێ دەکرێ, بۆیە لەدەسترۆی یدا لەدوای صدامەوە دەهات.

پاش ماوەیەك هەڵوێستی ئەحمەد حەسەن بکرو صدام حسین ئاشکرابوو بۆئەندامانی بەعس کەئەمانە لەبەرنامەی بەعس لایانداوەو, کار وا بڕوات دەیانگوت ئەوا بکرو صدام هەموو بیروباوڕێکی حزبی بەعس دەخەنە ژێر پێ بۆیە گەیشتنە ئەوەی کەمانەوەیان لەحوکمدا خەتەرێکی گەورە بۆ بەعسی یەکان بەتایبەتی‌و عێراق بەگشتی دروست دەکات.

ئەم هەڵسوکەوتەی بکرو صدام ڕۆژ بەڕۆژ لەناخی نازم گزاردا ناڕەزای یەکی دروستدەکرد لەبەرامبەریان تاوای لێهات لەناخی خۆیدا بڕیاریدا کەخۆی‌و محەمەد فازل‌و چەند کەسێکی‌تر پیلانێك داڕێژن بۆ لەناوبردنی بکرو صدام, بەڵام دوای سەرنەکەوتنی کودەتاکە تەنها ناوی عبدالخالق سامرائی ئاشکرابوو لەنێوانیاندا, کاتێکیش دەستبەسەرکران بەهیچ جۆرێك دانیان بەوەدا نەنا کەهیچ کەسێکی تریان لەگەڵدایە.

## صدام و گیروگرفتەکانی

١– گەیشتە ئەو باوەڕەی کە لەدەرەوەی ولات جموجۆلێکی ئاشکرا لەئارادایە بۆ گۆڕینی رژێمی عێراق (بەعس).

٢– جەنەراڵە عەسکەرییەکان خاوەن پلەو دەسەلاتدارن حسابی دواڕۆژیان بۆ دەکرێت، ئینجا هەموو فەرماندەی فرقەکان سەر بە(بکر)ن بەشەخصی.

٣– کێشەی ناوخۆی گروپە سیاسییەکانی ناو عێراق کە بەشێوەیەکی نهێنی کاردەکەن لەدژی حکومەتی بەعس لەوانەش بەعسی سەر بەسوریا.

٤– کێشەی کورد: هەرچەندە باڵی م.س، لەڕووی عەسکەریو سیاسی شان بەشانی بەعس راوەستاونو، رۆژنامەی النور، رۆژانە دەردەچێت، خوێنەرێکی زۆری هەیە، بەلام لەگەڵ ئەمەشدا نەیتوانی بەتەواوەتی دەست بەسەر کوردستان بگرن، هەروەها باڵێکیش هەبوو کەبریتی بوو لەچەند کەسێك لەناو بەعسدا دژایەتی جەماعەتی مام جەلالیان دەکرد.

گفتوگۆ لەنێوان پ.د.ك و بەعس دەستی پێکردو پڕوپاگەندەی بۆ دەکرا. لە ٥ی ئازاری ١٩٧٠ لەماڵی ئێمە لەبەغدا (حی العرب) کۆبوونەوەیەك کرا لەسەر داوای بەعس بۆ ئەوەوی بەباڵی م.س جماعەتی (مام جەلال) بڵێن کەوا گفتوگۆ هەیە لەگەڵ باڵی پ.د.ك (بارزانی)و نەگەیشتوونەتە ئامانج, هەر کەڕێکیشکەوتن ئەوان باڵێکن لەکێشەی کورد.

صدام دوای ئەوەی گەیشتە ئەو باوەڕەی کە لەدەرەوەی ولات جموجۆلێکی ئاشکرا بەردەوامە بۆ گۆڕینی رژێمی عێراق، رووسەکان لەڕێگای حزبی شیوعی ئاگاداریانکردنو، بریماکۆف بەم کارە هەڵسا. دەوری سەرەکی بۆ ئەم مەرجەی گۆڕان لەعێراقدا بەکارهێنانی دۆسیەی کوردو بارزانی یە. کەصدام بەم هەموو مەترسی یانەی زانی روویکردە گەلالە, ئەو کاتە ئامادەبوو کەکاغەزی سپی بۆ مەلامستەفا ئیمزا بکات، نەك هەر کەرکوك، بەڵکو هەتا سنووری راستەقینەی کوردستانی باشوور کەدەگاتە شاخیحەمرین رازی بێت، بارزانی توندبوو لەسەر کەرکوك، بەلام بەداخەوە چەند کەسێك لەدەوروپشتی بارزانی لەسەر رێکەوتننامەکە هەولێکی زۆریاندا کەڕازی بکەن، هەروەها لەم دۆسیەی ئیمزاکردنەی بارزانی و بەعسدا، بریماکۆف دەوری هەبوو.

## بەیاننامەی ١١ی ئازاری ١٩٧٠

گەورەترین رووداوە لەمێژووی کورددا لەدوای تێکچوونی کۆماری مهاباد. بەعس بەرامبەر جماعەتی مام جەلال نیازیان خراپ بوو، رۆژنامەی النور لەژێر چاپدابوو، صدام لەرێگای احمد حسن بکرەوە بەتەلەفۆن ئاگاداری وەزارەتی رۆشنبیری کرد کەنابێت رۆژنامەکە دەرچێتو بەهیچ جۆرێك بلاّوبکرێتەوە. لەهەمان کات جەلال تاڵەبانی پیرۆزبای ی لەو رێکەوتننامەیە کرد، هەروەها مامۆستا ابراهیم احمد ئەو کاتە لە لندن بوو، چوو بۆ باڵیۆزخانەی عێراق بۆ پیرۆزبای یکردن لەبەیاننامەی ١١ی ئازار.. خۆپیشاندانێك لەبەغدا وویدا کەئەمە یەکەم جارە بەم شێوەیە خەڵك بێتە سەر شەقام, کەس باوەڕی نەدەکرد کەهێندە کورد لەبەغدا هەیە. لەبارەگای باڵی م.س دانیشتبووین، من گوتم: دەچمە لای برادەرەکەم نازم گزار سەرێکی دەدەم بزانم چ باسە؟ کەچوومە ژوورەوە بۆلای تەماشای تەلەفزیۆنی دەکردو بەم رووداوە پێدەکەنی, گوتی ئیتر بەتەواوەتی دەستمانگرت بەسەر عێراقدا. دوای چەند رۆژێك داوای لێکردم بەناوی پشوودان بچم بۆ قاهیرە، گوتی: مەگەرێوە هەتا وەلاّمت بۆ دەنێرم. نزیکەی مانگێك لەئوتێل هێلتۆن بووم، رۆژێك انور ثامر باڵـوێزی عێراق هاتەلام پێی راگەیاندم کەداوات دەکەن لەعێراق کەبگەرِی یتەوە.

فاخر بارزانی بەناوی مەلامستەفا بارزانی هاتبوو بۆ بەغداو لەگەڵ مام جەلال کەوتبووە گفتوگۆ، هەروەها تۆفیق وەهبی بەگ کە لەلندن دادەنیشت نووسراوێکی ئاراستەی بارزانی کردبوو کەپێویستە لەم کاتە دژوارەدا کورد یەکبگرێتو، ئاشتبوونەوەیەکی گشتی لەنێوان هەردوو باڵە سەرەکی یەکەی کورددا بێتەدی.

چاوم بەسەرکردەکانی بەعس کەوت بۆ ئەوەی لەم رووداوانەی بەدەستەوەنو ئاگاداریان بکەمەوەو بەڕای خۆم تیشکی بخەمەسەر. گومانم نی یە لەمن باشتر ماهیەتی باڵی م.س لەهەموو روویەکەوە باش دەزانن، شێوازی سیاسیو عەسکەری ئێستای بارزانی وا خەریکە لەچەند رێگایەکەوە هەوڵدەدەن کە لەگەڵیان رێکبکەوێتو بۆ ئەم مەبەستەش بەزەقی فاخر بارزانی بەم ئیشە گرنگە هەڵدەسێت. کێ دەڵێت دوای چوار ساڵیتر ئەم رێکەوتنە هەڵناوەشێتەوە؟ کەی ئەمە بەرژەوەندیی ئێوەی بەعسە، ئێوە خۆتان ماتکردووەو بێدەنگ راوەستاون. وەلاّمی هەموویان (بەعس) بەئاشکرا ئەمە بوو: (کذب اذا احنا نگول عدنا صدیق بین الاکراد, احنا نگول عدنا صدیق واحد بین الاکراد هو البارزانی, روحوا کلکم التحقوا بالبارزانی قوة البارزاني ين قوة البعث, مفهوم يا رفيق پشدری؟).

### تێبینی

*لەبڕیاری ١١ی ئازاری ١٩٧٠دا دوو ئەندامی (مجلس قیادة الثورة) ئیمزایان نەکردبوو, ئەوانیش ناسراوبوون کەرەگەزیان کوردە، هەوڵی زۆرمدا کەبزانم هۆی چی یە ئیمزایان نەکردووە؟! ئەو دوو کەسەش طە یاسین رمضانو عبدالکریم شیخلی بوون، دەیانگوت:*

*أ- ئێمە هەموو بیرکردنەوەیەك و بۆچوونێکمان عەرەبییە، وەکو عەرەبێکی نەتەوەی ی بیردەکەینەوە.*

*ب- ئەم هەڵوێستە لەدوارۆژدا عێراق لێکجیادەکاتەوەو پارچەپارچەی دەکات.*

باڵی م.س جەماعەتی مام جەلال بوون بەسێ بەشەوە:

١- بەشی هەرە زۆریان چوونە پاڵ پ.د.ك (بارزانی).

٢-چەند کەسێك رۆیشتنە دەرەوەی وڵات لەوانە حلمی علی شریف بوو.

٣-بەشێك پاڵیاندا بەحکومەتی بەعس، من یەکێك بووم لەوانە، مامۆستا ابراهیم احمدو مام جەلال ئاگاداریان کردمەوە کەقسەیان لەگەڵ بارزانی کردووە دەربارەی من کە لەناو حکومەت دەستێکی باڵای هەیەو سوودبەخش دەبێت کە لەجی ی خۆی بمێنێتەوە. ئیتر لەرێگای برادەرانەوە پێوەندیم بەردەوام بوو لەگەڵ شۆڕش.

منو نازم گزار برایەتیو دۆستایەتیو باوەڕمان بەجۆرێك پتەوبوو، کەجێی سەرسووڕمان بوو لای کەسوکارو کاربەدەستانی بەعس بەتایبەتی صدام حسەینو تاکو رۆژی کودەتاکە ئینجا لێکجیابووینەوە. دەرگای ماڵم بۆهەموو کەسێك کرابۆوە بەپی ی توانا هەرچی رووی تێدەکردم خزمەتم دەکردو یارمەتیم دەدا چ کورد چ عەرەب. بۆ نموونە بەشێکی زۆر کەم لەم شێوانەی خوارەوە بەکورتی باسیدەکەم.

رۆژێك مەجیدخانی حەمەڕەشیدخانی بانە بەتەلەفۆن قسەی لەگەڵ کردم گوتی لەئوتێل مەیامی دابەزیوم, بەختیاری کوڕم لەبازگەی بەغدا نزیکەی ٦ رۆژە بەدەمانچەوە گیراوە, تکام وایە کەبەیانی بی یتە لام جلوبەرگ و پێویستی یەکانی بۆ بەرینو چاوم پێ بکەوێت. گوتم: ئەگەر هیچ تاوانێکی نەکردبێت بەیانی سەعات ٩ بەیەکەوە نانی بەیانی دەخۆین. ئینجا بەخۆیو دەمانچەکەی سەعات ٨,٣٠ گەیشتینە لای مجیدخان.

رۆژێك باوکی نازم گزار هاتە لام گوتی ئەمە چەند جارێکە دەمەوێت چاوم بەنازم بکەوێت بەلام ناگەمەلای. چووم بۆلای گوتم: هۆی چییە باوکت نابینی؟ وەلامیدامەوە (واسطة)ی باوکم کۆتای ی نایەت، گوتم لەهی منیش زۆرترە؟ لەگەڵ باوکی بەیەکەوە چووینە لای.

شەوێك درەنگ گەڕامەوە بۆ ماڵەوە, هاوین بوو لەسەربان دەخەوتین، بینیم ئافرەتێك لەگەڵ منداڵەکەی خەوتوون دەرکەوت خێزانی قادر تەگەرانی یە لەگەڵ کوڕێکی تەمەن ٩-١٠ ساڵان لەسوراغی مێردەکەی دەگەڕا کە چی بەسەرهاتووە، گوتم: یەکەم جار هاتە لام کە بەحکومەتی بناسێنم رێگام لێگرت، دوایی لەرێگای ئامۆزایەکی و طە یاسین رمضان پێوەندی بەنازم گزارەوە کردبوو، جاری دووەم هاتە لام ئوتومبێلەکەیان لێ سەندبوو، زۆرم گوت گوێی لێنەگرتم, بەپێی خۆی لەگەڵم هات بردمە لای نازم گزار. جاری سی یەم لەگەڵ برایەکی دڵسۆزم (أبراهیم حمە خورشە) هاتنە لام کەنازم گزار لەهەموو شتێك چەکیکردووە، ئەمجارە زۆرم گوت کەبۆ خۆتو خێزانت ئەمە باشترە کە لەگەڵیان نەبێت، ئەوەندە پاڕایەوە

ناچاریکردم هەرچەندە أبراهیم حمەخورشە زۆری لەگەڵ گوت، ئەمجارەش دەستمگرت چووینە لای نازم گزار. ئیتر ماوەیەکە بەهیچ جۆرێك ئاگادار نیم, من نازانم چی بەسەرهاتووە. کوڕەکەیم لەگەڵ خۆم بردە دەرێ لەدەرگای ئاسایشی گشتی راوەستام گوتم تۆ لەناو ئوتومبێلەکە نەیەیتە دەرێ، بەدووروودرێژی بۆ گزارم گێڕایەوە تکام لێکرد وەڵامێکم بداتەوە، گوتی کوانێ کوڕەکەی؟ وەڵاممدایەوە رۆیشتنەوە بۆ سلێمانی.

**تێبینی**

*زۆرم پرسی تەنها ئەمەم زانی هەموو ئەو خەڵکانەی کە بەفەرمانی قادر تەگەرانی کۆکرابوونەوە شەو سواری لۆری سەربازی کرابوون، کەسم نەدیت شتێك ئاگاداربێت، تەنها صدام و گزارو ئەلبکر دەیانزانی. بەعس بەپیاوی شای ئێران دایاننابوو.*

ڕۆژێك خێزانی حسەین شیروانی (کەزیندانی بوو) لەگەڵ براکەی هاتنە لام گوتیان هەندێ شتمان هەیە وەکو دەرمانو سەعاتو بەرماڵ ناتوانین وا بکەین بگاتە دەستی, ئێستا لەبەندیخانەی نازم گزارە لەقصر النهایە، گوتم: هەمووی بخەنە ناو جانتایەکو لەسەری بنووسنو بیکەنە لیست بۆم بێنن ئێوارەکەشی وەرن پسووڵەکەتان بدەمەوە. تەسلیم بەنوێنەری تایبەتی (ابوحرب)م کرد کەهاتوچۆی (قصر النهایە)دەکات. بەناوبراوم گوت لەسەر فەرمانی (ابو حرب) ئەم جانتایە بەرە ئەویش لیستەکەیە پێی ئیمزا بکەو بۆم بێنەوە، (ابوحرب) لەڕووی نەدام کەئەم کارەم بەبێ ئەو کردووە.

**محمود خفاف:** ئەفسەرێکی کوردبوو لە(شعبە الاقتصاد)ی ئاسایشی گشتی کەداوایان لێکردبوو بۆ لێکۆڵینەوە کەکاتی خۆی شتومەکی سەربازی کڕیوە کۆمسیۆنی وەرگرتووە جێگە نەمابوو بچێتە ناوی راستەیەکەشی داوێکی گەورەیان بۆ رێکخستبوو. لەگەڵ خۆم بردمە لای (ابو حرب) نەمهێشت یەك چرکە بگیرێتو لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا بکرێت.

**رشید عارف:** سیاسەتمەدارێکی کوردو دەوڵەمەندێکی ناسراوبوو، بەتاوانی گەورە گیرابوو، یەکێکیان چوونە پاڵ اسرائیل. لەچاوپێکەوتنی لەگەڵ بارزانیدا گوتبووی ئەگەر رەفیق پشدەری نەبوایە ٢٠ ساڵ حوکم دەدرام، خانووێکی لەوەزیریە دامێ ئەو کاتە نرخی ١٣ هەزار دینار بوو، وەڵامم دایەوە ئەمە کاری من نی یە، من بەپارە ئیش ناکەم.

**حامد العانی:** وەکیلی وەزیری ناوخۆو برادەرێکی دڵسۆزم بوو، گوتی: بەگوێرەی یاسا ئاسایشی گشتی بەستراوە بەوەزارەتی ناوخۆ, ئێمە دەزانین کە (ابو حرب) پەیوەندی یەکانی یەکسەر بەصدامەوەیە، (ابو حرب) نەچاك نەخراپ بەهیچ جۆرێك هاتوچۆ لەگەڵ سعدون غیدان ناکات، حەزدەکەم بچینە ناو ئەو بابەتەوەو گزار لەقسەی تۆ دەرناچێت. العانی دوای دوو رۆژ ئاگاداریکردمەوەو سوپاسیکردم. ابوحرب خۆی هاتەلای.

سەرلەبەیانی ئوتومبیلێکی ڕەشی مۆدێل کۆنی اولدزمۆبیل لەبەر ماڵماندا راوەستا، دایکم رۆیشت بەپیریەوە، گوتی هاتووم رووم لەماڵی ئێوە کردووە یارمەتیم بدەن من فلانم. لەگەڵ خۆم بردمە ئاسایشی گشتی چوومە لای ابو حرب بەپێوە پێم گوت ئاخرزەمانە کچی (صالح جبر) روو بکاتە ماڵی رفیق پشدەری بۆ یارمەتیدانی, بڕوا ناکەم ئەم حکومەتە دەوام بکات. یەکسەر کارەکەی ئەنجامداو توانجێکی لێدام گوتی: وەزارەتی صالح جبر بڕیاری خنکاندنی چوار ئەفسەرە کوردەکەیدا، وەڵامم دایەوە راستە، بەڵام (وەصی) پێی داگرت دەبێت ئەم کارە ئەنجام بدرێت، چونکە کاتی خۆی ئەفسەرە عەرەبەکانیش بڕیاری خنکاندنیان درا.

ئێوارەیەك بیستم ویستوویانە بارزانی بکوژن، سوپاس بۆ یەزدانی مەزن رزگاری بووە، بەم کارە زۆر دڵتەنگ بوومو دنیام لێهاتەوەیەك. ئێوارەکەی مام جەلالم دی بۆم باسکرد, لەگەڵ ئەو مەلایانە لەو کاتانەی کەدەچووم بۆ لای ابو حرب، یان ئەوان دەهاتنە دەرێ یەکترمان دەبینی, گوتم بەهیچ جۆرێك ئەمەم نەزانیوە دەنا خۆمم دەگەیاندە لای بارزانی.

## پیلان بۆ لەناوبردنی شێخ بابەعەلی شێخ مەحمودی حەفید

نازم گزار باسی باباعەلی شێخ محمودی لەگەڵ کردم، بەبۆچوونی ئەوان یەکێکە لەکوردە ناسراوەکانو دۆستێکی دێرینی ئەمریکایە, گوتی بوونی لەدەرەوەی وڵات بۆ دواڕۆژ مەترسی یەکی گەورەیە، بەناوی احمد حسن بکرەوە دەچیتە بەیروت گفتوگۆی لەگەڵدا دەکەیتو ڕێگای بۆ خۆش بکە متمانەت پێ بکات بۆ گەڕانەوە. گوتم: باشە بەڵام من لەئاستی ئەو پیاوە مەزنە نیم، ئەو کوڕی مەلیکی کوردستانە, ڕێگام بدە برادەرێکی خۆشەویستی هەردوولامان کەشوکت بەگی جافە، ئەو لەگەڵ خۆمدا دەبەم. لەگەڵ شوکت بەگی جافدا، ابو حربمان بینی، ئینجا چووینە بەیروت سەردانی شێخ باباعەلیمان کردو ماوەی سێ ڕۆژ لەسەریەك بەشی زۆری کاتمان لەخزمەتیدا بردەسەر. سێ قۆڵی هەموو ئەو باسانەمانکرد کەبۆی هاتبووین، شێخ باباعەلی رازیو خۆشحاڵبوو کە بەزووترین کات لەگەڵماندا بگەڕێتەوە. ئینجا هەستم بەمەترسی ئەنجامەکەی کرد کەدواڕۆژی ئەم پیاوە مەزنە چی دەبێت، ئۆباڵی گرتنی یان کوشتنی دێتە ملی من. لەهەلێکدا دڵم بۆ کردەوەو ئەوەی دەمزانی راستی یەکەم پێگەیاند، گوتم دەگەڕی یتەوە ئەمە پەیوەندی بەخۆتەوەیە ڕەنگە دیاری یەکی باشیش وەرگرم, بەڕێزتان چۆنی بەباش دەزانن من ئامادەم.

باڵوێزخانەی عێراقم لەبەیروت ئاگاداركردەوە كە بەبروسكە نازم گزار ئاگاداربكەن كەرەفیق سەرکەوتووەو بەیانی دەگەڕێتەوە. لەگەڵ شێخ باباعەلی رێككەوتین دوای چەند ڕۆژێك بەیروت بەجێ بهێڵێتو چوو لە لەندەن نیشتەجێبوو.

لەهەمانکاتدا ئێستگەی ئەهواز بەشی عەرەبی‌یەکەی باسی رەفیق پشدەری کردبوو کەچووەتە بەیروت بۆ کوشتنی شێخ باباعلی، بەهەرحاڵ بەشێکی هەواڵەکەی ڕاست بوو, بۆ من سوودی هەبوو, ئەم هەواڵە

بلاونەکرابایەوە گومانم دەخرایەسەر، بەلاّم من نەبامایە دەکوژرا، شێخ باباعلی ئەمەی لەبەرچاوبوو، جارجار دیاری ی رێکوپێکی بۆ دەناردم.

جارێکیان شێخ عوسمان بارزانی هاتبووە بەغدا دیاری بۆ احمد حسن بكر هێنابوو، ویستم بۆی بەرم ئاگاداری (ابو حرب)م کرد گوتی چاکبوو بۆت نەبردووە تەسلیم بەمەخزەنی ئێرەی بکە با ئەو هەنگوین و پلّنگە مۆمیاکراوە لێرە بێت ژەهری بۆ دەنێرم، خودا لەناویان بەرێت. ئەمە یەکەم جاربوو بەو لەهجەیە رووبەڕوو گوێم لێبێت هێرش بکاتە

سەریان, لەئەنجامدا دووبەدوو ناوبەناو دەکەوتینە سەروگوێلاکی احمد حسن بکروصدام.

گوتم ابو حرب وەکو ئێستا ئاوا بەم شێوەیە لەگەڵ تۆ بکرامایەوە دەستم دەگرتی نەمدەهێشت بەو ئیشە هەستی و پیلان بۆ کوشتنی بارزانی دابنێن. بەبیرم هێنایەوە کەکاربەدەستەکان دەیانگوت (کذب اذا احنا انگول عدنا صدیق بین الاکراد, احنا عدنا صدیق واحد هو البارزانی, روحو کلکم التحقوا بالبارزانی، بارزانی قوه...)، گوتی ئەمە لەکانگای دلّمانەوە بوو. گوتم بۆچی ئەو مامۆستایانەتان بەکوشتداو گومانتان خستە ناو دلّی کورد بەگشتی و پ.د.ك بەسەرۆکایەتی بارزانی بەتایبەتی؟ گوتی: من خۆم بەیاننامەی ئازارم بەگەورەترین دەستکەوت بۆ گشت دانیشتوانی عێراق بەتایبەتی بۆ بەعس و پارتی زانی، دوای ئەوە لەبەرژەوەندیی پارتی نەبوو دۆستایەتی لەگەڵ حکومەتی ئێران بەهێزتر بکات و پەیوەندی یە نهێنی یەکانی لەگەڵ دەرەوە پێ زیادبکات، لەکاتێکدا بەیاننامەی ١١ی ئازار مەترسی یەکی گەورەی بەرپاکرد بۆ حکومەتی ئێران و تورکیا، صدامیش بەتەواوەتی گەیشتە ئەوەی پاشگەز بێتەوە، ئێمەش بەگشتی لەم خالّە حەقمان دایە کەچۆن بارزانی ئەم دەستکەوتەی بۆ خاتری چەند کەسێکی دەوروپشتی و حکومەتی ئێران و تورکیا پوچەڵ دەکاتەوە. گوتم: شتێکی باشتان نەکرد کە بەکردەوە کردتان بۆ کوشتنی بارزانی. گوتی: بەهەر حالّ کردمان. ئێستا شەخصی صدام و بکر هەموو دەزگاکانی حکومەت کە لەژێر فەرمانی ئەوانن بۆ بەرژەوەندیی ئەم دوو کەسەو کەسوکاریان کار دەکەن, هەموو سامانی عێراق دەخرێتە گیرفانیان پڕیش نابێت، تێرنابن، ئەوەی کردوومە لەسەر فرمانی صدام و بکر کردوومە چ بەئاشکرا چ بەنهێنی، ئێستا بیر لەوە دەکەمەوە چۆن بکرو صدام دوورخەینەوەو رزگارمان بێت لەدەستیان، عێراقێکی سەربەخۆو دیموکراتی بێنینەدی و مەسەلەی کورد جێبەجێ بکەین، بەئاژاوەنانەوەو شەڕ بەهیچ جۆرێك ناگەینە ئامانج, هەتا بەم شێوەیەی ئێستا بین دەولّەتەکانی دەوروپشتمان لەڕێگای ئەمەریکاو رۆژئاواوە رۆژ بەڕۆژ زیاتر دەست دەخەنە ناومان, سەرکەوتنی ئێمە بەنەمانی صدام و بکر دەبێت.

## کودەتـــای نازم گزار

ئەم وشە ترسناکە مەترسی خستە دڵمەوە کەوا منیش یاری بەئاگرەکە دەکەم، بەڵام لەهەمانکاتدا خۆشحاڵبووم بەوەی کەئەمانە گەیشتوونەتە ئەم باوەڕە کە لەپێناوی عێراقێکی سەربەخۆو دیموکراتی مەسەلەی کورد جێبەجێ بکرێت، بەلامەوە ئەم کودەتایە سەربگرێت خەونی رابردووی ١٤ی تەممووزی ١٩٥٨ دێتەدی, بەکورتیو بەوردی باسی بەشێك لەکودەتاکەی نازم گزار دەزانم کەوەکو سەرەقەڵەم لەخوارەوە نووسراوە:

١- نازم گزارو محمد فازل ئەنجامدەری کودەتاکە بوون و پیلانیان بۆ دانابوو.

٢- هیچ کەس لەخۆیان گەورەتر نەبوو کەچاودێری یان بکاتو جێی گومان نین.

٣- تاکو سەعاتی کودەتای تەممووزی ١٩٧٣ هەموو ئیشوکارێکیان بەڕێوەبردووە بەبێ ئەوەی یەك گومان پەیدا بکەن.

٤- چەند کەسێك کە بەپەنجەی دەست دەژمێردرێن ڕاستەوخۆ لەئەنجامدانی کودەتاکە بەشداری یان کردووە, وەکو داود الدرە. خەڵکی دیکەش بەم کودەتایەی زانیوە، یان ئاگاداریانکردووە، بەڵام کەس نازانێت ئەمانە کێن. بەندە یەکێکم لەوانە.

٥- بەو نیازەی کەپێشەنگایەکی تازەی ئامێری ئەلەکترۆنیو کارەبای یو تەلەفزیۆن بۆ چاودێری بەغدا خەڵکێکی زۆریان لەکاربەدەستانی حکومەت بانگهێشت کرد بۆ دیداری ئەو شتومەکە کارەبای یانە، لەوانە سعدون غیدانو حماد شهاب، بێنەسەر تەلەفزیۆن دان بەتاوانەکانی خۆیاندا بنێن دوای نەمانی بکرو سەدام.

٦- احمد حسن بکر لەکاتی رووداوەکەدا لەبولگاریابوو ئاگاداری هیچ شتێك نەبوو, گەڕایەوە بۆ بەغدا گەیشتەوە ماڵەوە لەکاتی پشوودان بەتەلەفۆن ئاگاداری دەکەن، محمود الندی لەماڵی دەبێت, تەلەفۆن هەڵدەگرێت لەڕێگای جهازی ئوتومبێلی فریاکەوتنەوە لەنازم گزارەوە بانگەوازێك ئاراستەی احمد حسن بکر کراوە، ئینجا دەرکەوت کەکزار نیازی ئەوەی بووە کودەتا بکات چەند داواکاری یەکی هەیە دەبێت بۆی جێبەجێ بکەن.

ئەو دوو زلهێزە گەورەی دەسەڵاتیان بەسەر هەموو جیهاندا گرتبوو(شرق وغرب) یەکێك لەوانە سەفەرەکەی احمد حسن بکری دواخست بەهۆی ئەوەی کەفرۆکەکەی دەستکاری دەوێت و تێکچووە. نازم گزار گەیشتە ئەو باوەڕە کەیەکێك لەو دەوڵەتە زلهێزانە بەم کودەتایەی زانیوەو گەڕانەوەی احمد حسن بکری دوا خست. نازم گزار خۆیو هەموو ئەو خەڵکەی کە بەپێویستی زانی لەگەڵ خۆی بردیو لەبەغدا بەرەو سنووری ئێران دەرچوو، لەوانەی لەگەڵیدابوون حماد شهابی کوشت.

لەڕاستیدا هەموو حساباتێکیان بەپیلانێکی کورتو بەوردیو ڕێکوپێك داڕشتبوو, نازم گزارو محمد فازل دوو بەدوو ١٥ شەو بەیەکەوە لەخانوویەکدا بوون بۆ ئەوەی بەهیچ جۆرێك ئاشکرا نەبن، بەلاّم ئایا رۆژئاوا چۆن دەهێلێت عێراقێکی بەم سنووره ستراتیژیە تێکچێت کەخاوەن بەشێکی نەوتی (احتیاط) بەم پیتو بەرەکەتە مرۆڤێکی نیشتمانپەروەر باوەڕی بەدیموکراسیو کێشەی کورد بەیەکجاری جێبەجێ بکەنو ببیەن بەڕێگاوە بەسەرپەرشتی عبدالخالق السامرائی.

لەڕاستیدا ئەمە جێی مەترسی یە بۆ ڕۆژئاوا بەتایبەتی ئەمریکا. هەروەکو شۆڕشی ١٤ی تەمموز بەپیلانی ئەمریکـــــاو ئینگلیزو ئیسرائیلو تورکیاو ئێرانو دەوڵەتانی کەنداو شکستی هێنا ، کوردیشیان تێوەگلاندوعبدالکریم قاسمیش بەدیکتاتۆریەتیەکەی خۆیو سیاسەتە چەوتەکەی بەشی خۆی بەشداربوو، بەتایبەتی دژی کورد.

دە رۆژ پێش کودەتاکە هەموو ئیشوکارێکی سەفەرم ئەنجامدابوو، هەروەها ٧ ڕۆژ پێش ڕووداوەکە مام جەلال بەتەلەفۆنو بروسکە ئاگاداری کردبووم کە بەپەلە بگەمە قاهرە بۆ ئیشوکاری زۆر پێویست، ڕۆژی ڕووداوەکە سەعات ١٠ی بەیانی چوومە باڵوێزخانەی میسر لەبەغدا، خۆم پێناساندن کەوا لەلایەن جەلال تاڵەبانییەوە میوانداریکراوم, ڕێزیان لێگرتمو یەکسەر ئیشوکارەکانیان بۆ ئەنجامدام، لەگەڵ ابو حرب ڕێککەوتبووین دوای تەواوکردنی ئیشوکارەکانم سەعات ١٢ لای بم، بەداخەوە بەئیشێکی تایبەتی، لەگەڵ ماڵەوە منداڵێکمان بردە لای پزیشكو گەڕامەوە ماڵەوەو پشوویەکمدا، ڕوومکردە بەڕێوەبەرایەتیی گشتی، لەدوورەوە یەکێکم دیت پێی ڕاگەیاندم کەابو حرب بەخۆیو ژمارەیەکی زۆر ئوتومبێلەوە چووەتە دەرێ، لەهەمانکاتدا بیستم احمد حسن بکر گەڕاوەتەوە، ئیتر دنیام لێهاتەوەیەك، جارێ بەتەواوەتی نازانم چی ڕوویداوە هاتمەوەماڵێ لەبەر خۆمەوە قسەم دەکرد، ڕووبکەمە چ لایەك (هەر بیرم دەکردەوە).

سەعات ٩ی شەو کەمالی برام تەلەفۆنی بۆ کردم، باسی ابو حربو ڕووداوەکەی بۆ کردم کە بەخۆیو بەشێك لەکاربەدەستانی بەڕێوەبەرایەتی ی گشتی کەجێی متمانەن، لەبەغدا چوونەتە دەرێو بەرەو سنوور هەڵاتوون، دنیا خامۆشە، بەلاّم هەموو حکومەت لەئامادەباشیدایە. پرسی ئەی تۆ چی دەکەیت هەر لەماڵەوە دەبیت؟ گوتم: دەرناچم،

تەندروستیم باش نییە.

لەگەڵ دایکم کەجێی باوەڕم بوو لەشتی گرنگو مەترسیدار پرسم پێدەکرد دووبەدوو باسمان لەو کێشانە دەکرد کەخۆم بەشدارم تی یدا (وەکو کودەتاکەی ابو حرب). بڕیارمدا بەخۆم و ماڵەوە بەرەو سوریا ڕاکەم, ئەگەر تاکو سبەی ئێوارە منداڵەکانم نەهاتنەوە ئەوا من گەیشتوومەتە جێی دیاریکراو چونکە من لێرە بم سەد دەر سەد لەسێدارە دەدرێم, کەس ئاگادار مەکە, ئەگەر پرسیاریانکرد بڵێ نازانم.

خۆمان پێچاپەوە, قاسەکەم کردەوە هەموو ئەو شتە نهێنیانەی هەمبوو دایکمم لێ ئاگادارکردەوە کەبەیانی زوو لەتونی حەمام بیانسووتێنێ, پارەش بڕی ٤٧٠ دینار دەبوو گوتم ئەمە بخە گیرفانت, بڕی ٧ هەزار دینارم پێبوو لەگەڵ نزیکەی ٥ هەزار دۆلارو ١٠٠٠ پاوەنێك. سەعات ١٢ی شەو لەبەغداوە بەرەو سنوور دەرچووین, لە١٣ بازگە پرسیاریان لێکردین لەکوێوە هاتوونو بۆ کوێ دەچن، ئایا دەزانن چی ڕوویداوە, ئێوە کێن، ئایا هاتوچۆکردن بەئوتومبێل لەناو شاری بەغدا قەدەغەیە؟ گوتم ئێمە کوردین لەسلێمانی یەوە هاتووین, بۆ گەشتوگوزار دەچینە دەرەوەی وڵات, هیچمان نەبیستووە, پیاوێكو ژنێكو سێ منداڵ بووین, بەجۆرێك بەعەرەبی قسەم دەکرد کەبەهیچ جۆرێك وام لەخۆ نەکردبوو بزانن من دانیشتووی بەغدام تەنها پاسپۆرتەکەم پیشاندەدان، پێناسەکەم نیشاننەدەدان، تاگەیشتینە روتبە, سنوور داخرابوو, بڕی ٢٢٠ ئوتومبێلی لێبوو ئینجا زیادیکرد, یەك کوردم ناسی نزیك یەك کەوتینەوە, لەخۆمەوە چوومە بارەگای بەعس لەگەڵ منداڵەکانم خۆمم بەکاربەدەستەکەی ناساند، ناوی ابراهیم بوو, گوتم من بەئیشی تایبەتی دەچمە درەوەی وڵات شتێکی وا بکە کەدوو ئوتومبێلیتر لەگەڵمدا بەرەو سوریا بێن بۆ ئەوەی موخابەراتی سوریا گومانم لێنەکەن. ئاگاداریشم کرد کەنازم گزار لەکودەتاکەیدا سەرنەکەوتووە، دنیا ئارامە، عێراق ئاسایشە بەتایبەتی بەغدا.

یارمەتیدام بۆ ئەم کارەو کەوتمەڕێ، دوای دەرچوونم هێشتا عێراقمان بەجێنەهێشتبوو فرۆکەیەکی هیلۆکۆپتەری سەربازی بەسەرماندا تێپەڕی، مەترسی یەکی گەورە دایگرتم, دوای ی هیلۆکۆپتەرەکە لەنزیك دوو ئوتومبێلی سەربازی نیشتەوە، منیش کەوتمەوەڕێو مەترسیم نەما. بەسەلامەتی گەیشتمە یەکەم بازگەی سوریا, چووینە چایخانەیەك خۆمو دایکی بازیان شایەتمانێکی بەحەقمان هێنا کەشکور ڕزگارمان بوو. لەشام چووینە ئوتێلێك, سەعات ٥ی ئێوارە تەلەفۆنم لەگەڵ مام جەلال کرد بڕوای نەکرد کەمنم, گوتم خۆمو دایکی بازیانو ڕووبارو بازیانو رەوەزم لەگەڵدایە. بەڕاستی زۆر لەمەراقدابوو، وای زانیبوو کەمن نەماوم چونکە دەیزانی لەگەڵ نازم گزار تێکەڵاوی یەکی تایبەتیم هەیە، لەهەندێ شت ئاگاداربوو. خۆشحاڵی خۆی دەربڕی کە لەگەڵ هێرۆ خانی هاوسەری دەربارەی چارەنووسم زۆر ناڕەحەت بوون، هەروەها پرسیاری دەربارەی(عولەما زەبیجی)کرد گوتم من شەو ڕامکرد کەس نازانێ لەکوێمو بۆ کوێ چووم تەنها دایکم نەبێت ئەویش لەگەڵ هاوسەری شەفیقی برام دوو بەدوو لەماڵەوەن لەبەغدا، ئێستا ئەوانیش یەکدڵ بوونەتەوە، بۆیان ڕوون بۆتەوە کەمن بەسەلامەتی رزگارم بووە، ئەو ئەمانەتەی لای من بوو لەگەڵ خۆم هێناومە. پرسی پرۆگرامت چیە؟ گوتم: پێویستمان بەپشوودانێکە، مێشکم زۆر ماندووە، دووبەیانی سەعات ١١ بەفرۆکە دەگەینە قاهیرە، تکامان وایە لەئوتێلێکی نزیك ماڵی خۆتان دوو ژوورمان بۆ بگری.

لەکاتی دیاریکراودا گەیشتینە فرۆکەخانەی قاهیرە, لەدوورەوە مام جەلالمان بەدیکرد، دوای تەواوکردنی ئیشوکارەکانمان هاتینە دەرێ, گوتی منو هێرۆ لەشوقەیەکین, جێگام بۆ نەگرتوویت, دەچینە ماڵی

خۆمان. نزیکەی ١٥ رۆژ لەماڵی مام جەلال بووین ئەوپەڕی خزمەتو میوانداری یەکی چاکیان کردین. بەبێ ئەوەی دەست بەگیرفانمدا بکەم یان ئەو گرژبێت، چونکە بازیانو ڕووبارم زۆر ناڕەحەت بوون ڕۆژگارمان بەئاسانی بەسەردەبرد، چونکە ئەوەندە لەخۆشیدابووین. چاوم بەچەند عەرەبێکی عێراقی کەوت کە لەمیسر پەناهەندەبوون لەوانە عارف عبدالرزاقو عقید رشید محسن کەبۆ ئەوەی منداڵەکانی بەخێو بکات خەریکی کشتوکاڵ بوو، بۆ ئەوەی پارەی پەناهەندەی ی لەمیسری یەکان وەرنەگرێت. هەرچەند هەوڵمدا کەدیاری یەکم لێوەربگرێت قبووڵی نەکرد تەنها جگەرە نەبێت.

دوای ١٣ رۆژ کە لەماڵی مام جەلال بووین ئاگاداریکردم کەئیمڕۆ میوانێکی عەرەبی میسریم دێت. کاتێك میوانەکەی هات, دوای کاتژمێرێك بانگی کردم, چونکە ئەوان بەتەنها دانیشتبوون پێی راگەیاندم کەحەز دەکەم ئەم زاتە بناسیت, ئینجا میوانەکەی پێم ناساند کەئەوە عمید فلانە سەرۆکی یاوەری ئەنوەر ساداتە, بەویشی گوت ئەمە کوردێکی عێراقی یە لەگەڵ خێزانەکەی ماوەی ١٣ رۆژە میوانمەو پێکەوەین, ناوی رەفیق پشدەری یە. یاوەرەکەی انور سادات لەجێی خۆی تەکانێکیدا بەسەرسوڕمانەوە سێ جار لەسەریەك گوتی (دە رفیق پشدەری؟) مام جلال گوتی ئەمە انور سادات ناردوویەتی کەرفیق پشدەری هاتووە بۆ کوشتنی تۆ.

مام جەلال لەگەڵ میسری یەکاندا لەڕۆژی هاتنی جمال عبدالناصرەوە دۆستایەتی یەکی پتەوی لەنێوان کوردو میسردا دروستکردوە. جارێك صالح مهدی عماش بۆی گێڕامەوە، لەچلەی جمال عبدالناصر کەنێردراوی سەرۆکی عێراق بوو لەبەردەمی ئوتێل هێڵتۆنی قاهیرە راوەستابووم کەئۆتومبێلێکم بۆ بێت بۆ شوێنێکی تایبەتی تا بەو بۆنەیەوە لەوێ کۆدەبینەوە، کەسەرنجمدا جەلال تاڵەبانی لەتەنیشتم راوەستاوە, دوای سلاو پێم گوت: وەرە لەگەڵ من سواربە.بەڕاستی ئەگەر بەچاوی خۆم نەمدیبایە بەڕاپۆرت ئەمەیان بۆ نوسیبامایەوە بڕوام نەدەکرد، کردیشم بەڕاپۆرت وەکو بۆ تۆی دەگێڕمەوە پێشکەش بەسەرکۆمار احمد حسن بکرم کرد، مام جەلال رێزی سەرۆکی وەفدیان لێنابوو, لەئوتێلەکەدا لەژوورێکدابوو لەنێوان ژووری قەزافیو پاشای مەغریب, هەروەکو من چۆن سەیارەیەکی تایبەتیم بۆ دانرابوو، بەژمارە کەدەمگوت صالح عماشم هاواری ژمارەکەیان دەکرد، جەلال تاڵەبانی یش بەهەمان شێوە، گوایە لەدەفتەری رۆژانەیعبدالناصر ناوی ٢٠ کەسی نووسیوە کەئەمانە نزیکترین کەسن, جەلال تاڵەبانی یەکێکە لەوانە.

گەڕامەوە بۆ شام، لەگەڵ ماڵەوە چووینە بەیروتو تورکیاو بولگاریاو یوگسلافیا، ئینجا هاتمەوە بۆ بەیروت. کات گەیشتە ئەوەی کەمنداڵەکان دەبێت بگەڕێنەوە بۆ ئەوەی بەردەوام بن لەخوێندن، ئەوان گەڕانەوە. منیش لەسەر هەڵوێستی مام جەلال ئەو بڕیارەم پەسەندکرد کەئوتومبێلەکەم بفرۆشم لەگەڵ هەموو پارەکەی کەپێم دەبێت بەبڕی١٢٠٠٠ هەزار دینار بچمە نەمسا، لەوێ کاسبی بکەمو بەم پارە زۆرە جگەرە بفرۆشم.

لەرۆژی دەرچوونم لەعێراق تائەو رۆژە هیچ پەیوەندی یەکم بەحکومەتی عێراقەوە نەمابوو, لەو خەڵکانەی لەناو پارتی یان سیاسەتمەدارانی عەرەبی عێراق ناسراوبوون دوور دەکەوتمەوە، ئەو نهێنی یەی لەگەڵ نازم گزاردا هەمبوو بەردێکم لەسەر داناو بەهیچ جۆرێك باسم نەکردووەو کەسیش نایزانێت تەنها نازم گزارو خۆمو دایکم.

لەمام جەلالم پرسی بۆچی بەتەلەفۆنو برووسکە ئاگادارت کردبووم کەبەزووترین کات بگەمە قاهرە؟ وەڵامیدامەوە کە لەرێگەی (أیاد سعید ثابت)ەوە دەمزانی کودەتا دەبێت ویستم رزگارت بکەم لەکوشتن الحمدلله خۆت خۆتت رزگارکرد. تائێستاش مام جەلالم لەوە ئاگادار نەکردۆتەوە کە لەو کودەتایەی نازم گزاردا بەشداربووم. لەسەرەوە باسمکردووە کەمام جەلال تا چ رادەیەك ئاگاداری دۆستایەتی منو نازم گزارە، هەروەها کەس نەیدەزانی کەمن رامکردووە, کەخەڵك ئەمەیان لێدەپرسیم خۆم لەوەڵامدانەوە دەدزی یەوە.

رۆژێك مام جەلال گوتی با سەرێکی فوئاد عارف بدەین. تەلەفۆنی بۆ کرد کەنیازمان وایە سەردانت بکەین، ئەویش خۆشحاڵی خۆی دەربڕی. کاتێك چووینە لای دوای سێ دەقە تەلەفۆنی هەڵگرت بەناوبراوی گوت فەرموو تەشریفت بێت کەسم لا نىیە. کە تەلەفۆنەکەی داخست دەموچاوی گرژبوو، روومکردە مام جەلال گوتم ئەو برادەرەی کەدێتە لای فوئاد عارف یەکێکمانی بەدڵ نىیە ئەویش منم, با جێتان پێ لەق نەکەم، من دەڕۆم کاتێکیتر دێمەوە خزمەتتان. فوئاد عارف گوتی: دانیشە تا قاوەکەت دەخۆیت. هەڵسام بڕۆمە دەرێ زەنگی شوقەکەی لێدرا, کەدەرگایان کردەوە عەبدولوەهاب ئەتروشی بوو. من لەڕۆیشتندا بووم هەموویانی پشتگوێ خست, دەستی گرتمو لەتەنیشتم دانیشت, کەوتە پێکەنینو قسەی خۆش لەگەڵمدا, داوای لێکردم یا دەعوەتی بکەم یان دەعوەتم بکات, هەرچی کردی گوتم لەگەڵ تۆ دانانیشم، فوئاد عارف گوتی من دەعوەتەکە دەکەم, منیش قبووڵم نەکرد گوتم ئێوە نیشتمانپەروەرن, عەبدولوەهاب ئەتروشی فەرماندەیەکی پارتىیە منیش سیخوڕێکی بەعسیم، ئینجا مام جەلال کەوتە نێوانمانەوەو رازیبووم بەوەی شەو کەدەچمە گازینۆی لوبنان لەوێ یەکتر دەبینین، کەعەبدولوەهاب ئەتروشی گەڕایەوە دوو بەدوو لەناو ئوتومبێلەکە دەبین بۆ خۆمان قسەدەکەین. ئەتروشی چەند پرسیارێکی لێکردم وەکو گوایە من لەسەرانسەری کوردستان وەکیلم هەیەو لامان سەیرە کەتۆ لەناو بەعس بەم جۆرە بەچاوێکی مەزن تەماشات دەکەن! گوتم، ئەمە ڕاست نىیە, بەعس پێویستی بەوە نىیە کەمن لەسەرانسەری کوردستاندا وەکیلم هەبێ بۆ دەنگوباس کۆکردنەوە، من جێی خۆم لەناو بەعسدا کردۆتەوە, بەهەموو توانایەك یارمەتی خەڵکی لێقەماو دەدەمو بەهیچ جۆرێك دەستم لەمەسەلەی گرتنو سێدارەداندا نی یە، من ئەوە نیم بتوانم نەخشەی بەعس بگۆڕم، دۆستایەتی یەکەی من باوەڕە، ئەگەر بەقسەم بکەی وات لێدەکەم تۆش بگەیتە پلەی من. ئێستا تۆ پارێزگاریتو دوو ئوتومبێل بەدواتەوەیە بۆ پاسەوانی, کاتێ دەچیتە بەغدا دەتوانیت ١٥ تەنەکە پەنیرو ١٥

مەنجەڵ ماست لەگەڵ خۆتدا ببەیتوبەسەر سەرکردەکانی بەعسدا دابەشی بکەی، هەرماڵەی مەنجەڵێك ماستو تەنەکەیەك پەنیریان بۆ ڕەوانە بکەیتو، لەسەر دیاری یەکە دەنووسی (عبدالوهاب ئەتروشی), لە احمد حسن بکرەوە دەست پێبکە، ئەوانیش ماوەیەکی دیکە دیاری بۆ تۆ رەوانە دەکەن, هاتوچۆی خێزانی دەبێت, دۆستایەتی بەهێز دەبێت, لەپاڵ ئەوەشدا باسی مەسەلەی کوردیان بۆ دەکەیت. بەلاّم دەزانم تۆ دەترسیتو لەترسی ئێران‌و خەڵکانی کوردی نیشتمانپەروەر ناتوانیت ئەوە بکەیت.

بەیانی سەعات ٧ خۆمکرد بەژوورەکەیدا کە لەئوتێل بەیروت (مارتینس) دابەزیبوو, لەوێش باسی بەشێك لەو شتانەم بۆ کرد, ئەو بارودۆخی منی نەدەزانی.

دوای ئەوە لەگەڵ مام جەلال قسەمکرد کەماڵەوە رۆشتوونەتەوە منیش خۆم کۆدەکەمەوە دەچمە نەمسا، زۆری پێنەچوو کەمالی برام لەبەغداوە هات نووسراوێکی دەستنوسی پێبوو کەداوام لێدەکات بگەڕێمەوە، تۆ هیچت لەسەر نی‌یە سەیرە منداڵەکانت لەگەڵ دایکیان لەبەیروت هاتوونەتەوە، سەیرە تۆ بەتەنها لەبەیروت ماویت، چیت پێویستە برۆ باڵوێزخانەی عێراقی تاکو فەرمان بدەین بەجێبەجێکردنی، حەزدەکەین بەیەکەوە لەگەڵ کەمالی برات بگەڕێنەوە. ئەوەم پیشانی‌مام جەلالدا دوای لێکۆڵینەوەیەکی زۆر گوتی: با کەمال بڕواتەوە تۆ لێرە چەند رۆژێك بمێنەوە، هەتاکو دڵنیا دەبم، ئینجا بگەڕێوە.

لەدانیشتنەکەدا لەگەڵ کەمالی برام دوو بەدوو پێی گوتم کەعەبدولوەهاب ئەتروشیت دیوە؟ گوتم ڕاست نی‌یە تەنها لەگازینۆی لوبنان دوور بەدوور چاومان بەیەك کەوت.

دوای چەند رۆژێك گەڕامەوەبۆ عێراق یەکسەر هاتم بۆ ماڵەوە چاوم بەعەبدولخالق عەبدولعەزیز کەوت کەبەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی بوو.

**عبدالخالق عبدالعزیز:** دەرچووی کۆلیجی پۆلیسی بوو، کادرێکی کۆنی بەعس, لەپۆلیسیدا یەکەم کەسە کەئەفسەر بووبێ, جی ی باوەڕی احمد حسن بکر بوو, زیرەك‌و لەسەرخۆ, ئازاو پاك بوو. لەخێزانێکی عەرەبی ناوداری موصل، خاڵی (حسن توحلە)یە کەسعید قزاز خۆی شاردبۆوەو ماڵیان پشکنین، پەیوەندی ئێجگار زۆرە لەگەڵ کورددا، دۆستێکی دێرینی من بوو، خۆشم یارمەتیمداوە کاتێك نازم گزار حوکمی دەکرد، راستی یەکەی ئەم دەورێکی گرنگی هەبوو کەلەسێدارە نەدرێم. رۆژێکیان چووم بۆ لای صدام گوتی: ئیمڕۆ هەمووی لەگەڵ تۆ دەبەمەسەر، زۆرم لا سەیرە کوردێکی سوننی‌و نەتەوەی ی خەڵکی پشدەر لەگەڵ عەرەبێکی صبی خەڵکی عمارە بەم شێوەیە یەکبگرن، ئەومرۆڤێکی پیاوکوژ تۆش ئەوەندە خێرخواز.

رۆژگار هاتوڕۆیشت, ڕۆژانە لەگەڵ سەدامدا لەیەکتر نزیك دەبووینەوە, لەکاتێکدا ڕۆژانە یەکترمان دیوە لەگفتوگۆکردن‌و لێکۆڵینەوە باسی ناوخۆو دەرەوەی وڵاتمان دەکرد، گوتم گومانت نەبێت باسی هەموو رووداوەکانمان کردووە, گومانم نەبووەو بەهیچ جۆرێك هەستم نەکردووە کەنازم گزار بەرامبەر سەرکۆمارو

بەڕێزتان نیازی شتێکی هەیە ئەگینا بەپەلە خۆم دەگەیاندە تۆ. بەڕێز (سید النائب) وا بزانم ئەم حەقەم پێدەدەیتو بەگەورەی ی خۆت دەمبەخشیت، ناچاربووم رامکرد چونکە دوای کودەتاکەی نازم گزار گومانم نەبوو دەگیرام, چونکە رەفیق پشدەری کەبەم جۆرە نزیك بوٚتەوە چۆن ئاگاداری ئەمە نی یە؟ منیش یەکسەر بڕیاری کوشتنم دەردەچوو یان منیشی لەگەڵ خۆیدا دەبرد. صدام گوتی: ڕاستە, چاکتکردووە کەڕاتکردووە بەڵام ئێمە نازم گزارمان کرد بەم پیاوەو محمد فازل ئەوەندە جێی باوەڕی من بووە ماوەیەکی زۆر دایکم جلوبەرگی بۆ دەشوشت. تۆ مرۆڤێکی نیشتمانپەروەریت, پەیوەندیت بەهیچ وڵاتێکی دەرەوە نی یە. سوپاسم کردو گوتم من عێراقیم, لەسەرمە کەخزمەتی وڵاتەکەم بکەم، ئێوەش بەڕاستترین گروپی سیاسی دادەنێم کەلەخزمەتتاندابم.

ئینجا بەسەلامەتی هاتمە دەرەوەو سوپاسی خوام کرد کەلەم ئەزموونە رزگارم بوو. دوای ئەوە چاوم بەسعدون غێدان کەوت, هەموو ئەو گفتوگۆیەی لەگەڵ صدامدا کردبووم جارێکی تریش بەدوورودرێژی باسمانکرد.

سعدون غێدان بۆی باسکردم کەنازم گزار بەچ جۆرێك ئازارو ئەشکەنجەیدام، زامداریانکردم, وام لەخۆمکرد کەوا خەریکە بمرم، دەستیان لێهەڵگرتم, خۆم وا رۆحم دەردەچێت بەهیچ جۆرێك توانجم تیّ نەدەگرتن، وەڵامی پرسیارەکانیانم نەدانەوە، ئێستا
تەندروستیم بەرەو باشتر دەڕوات، دەستم لەکارناکەوێت وردە وردە باش دەبێت.

پرسیاریکرد بۆ چەند وڵات چوویت، گوتم سوریا، میسر، لوبنان، تورکیا، بولگاریا، یوگسلافیا. پرسی لەتورکیا عەبدولڕەحمان عارفت دیت؟ گوتم: لەئەستەنبولّ رۆژێکیان لەگەڵ ماڵەوە لەسەر دەریا بووین چاوەڕوانی کەشتی بووین تا بچینە ئەوبەر, لەناکاو لەگەڵ عەبدولڕەحمان عارف یەکمانگرت, دوای ئەحواڵ پرسینێکی زۆر، ئینجا یەکە یەکەی ئەوانەی لەگەڵماندابوون پێم ناساندو گوتم ئەمە هاوسەرەکەمە، ئەمەش کچی گەورەمە رووبار، ئەوەش کوڕی گەورەمە بازیان، ئەویش کوڕی پچووکم رەوەز، بازیان پرسی ئەم پیاوەم دیوە، گوتم کوڕم ئەمە سەرکۆماری کۆنە، بابە کۆمار یەعنی چی؟ عەبدولڕەحمان عارف گوتی کوڕم من سەرکۆماری کۆنم.

گۆڤارێکی عەرەبی لەسەر رووداوی تازەی عێراق دەنگوباسی بڵاوکردبۆوە, لەهەمانکاتدا باسی رووداوەکەی ١٧ی تەمموزی ١٩٦٨ دەکات کەچۆن عبدالرزاق نایف کودەتاکەی بەسەر عارفدا کرد ئینجا ئەویشیان دوورخستەوەوحماد شهاب کوژراو سعدون غێدان دەستی پەکی کەوت. عارف گوتی کاتێك لەلەندەن بووم لە(هاید پارك) قەدەحم لێدەدا مەترسیم لەوەبوو کەابراهیم داود دەکوژن یان کوژراوە، د.خالد رمایا پێی گوتم خەفەت لەچ دەخۆیت, بیر لەڕابردوو مەکەوە، ئێستا ئیستگە بڵاویکردەوە کەابراهیم داود کراوەتە وەزیری بەرگری.

سوپاسیکردم کەیارمەتی کەسوکاریم داوە، داوای لێکردم کەئێمەش لەگەڵیاندا بڕۆین لەم میوانداری یە بەشدار بین، گوتی ئەوەش تەلەفۆنو ناونیشانمە، لای من پشوو بدەن ئەگەر شتێکت پێویستە حەز دەکەم یارمەتیت بدەم. سوپاسمکرد، گوتم زۆر پیاوەتی تۆم بەسەرەوەیە, ئێمەش میوانداری کراوین لای خزمەکانی دایکی بازیان کەئێستا یاریدەدەری فەرماندەی هێزی ئاسمانی ی تورکیایە, باوکی کوردێکی خەڵکی سلێمانی بووە. سعدون گوتی من پیاوەتی تۆم لەبیرناچێتەوەو بەهیچ جۆرێك ئێوە جێی گومان نین کەپەیوەندیت بەکودەتاکەی نازم گزارەوە هەبووبێت هەروەکو باسی لێکراوە. رای خۆم بەئاشکرا دەردەبڕمو ناحەقت ناگرم کەبۆ دەرەوەی وڵات راتکردووە ئەگینا دوور نی یە تۆش ئازارو ئەشکەنجەیەکی زۆر درابایو بەکوشتن چووبای. گوتم: راستە من برادەرێکی دێرینی نازم گزار بووم, راستی یەکەی من لەزۆر شت ئاگاداربووم، بەڵام لەکوشتنو ماڵوێرانکردن بەشدارنەبوومو لەکاتی کودەتاکەشدا تا سەعات ١١ی شەو نەمزانیوە، بیرم لێکردەوە باشترین شت ئەوەیە رابکەم تا دونیا دێتەوە سەرخۆی، ماڵەوەم ناردەوە پێش گەڕانەوەی خۆم, برای وەکو ئێوەم هەبێت بەتایبەتی وەکو ئێوەو ابو مازنو ابو عروبەو سید نائبو جنابی سەرۆك، بۆچی دەربەدەری وڵاتان بم, چیم کردووە. هاتمەوە ماڵەوە بەکەیفو خۆشی دایکم ٣٠٠ صەمون کەهەریەکەی پڕ بوو لەشفتەو سەوزە، بردیە شێخ عبدالقادر بەناوی خێری مولودی پێغەمبەر دابەشیکرد.

بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی عبدالخالق عبدالعزیز بەگەرمی بەخێرهاتنیکردم وەکو جاران کاتێك نازم گزار یارمەتی یاندام، پەیوەندیم لەگەڵ بەعسدا لەڕابردوو گەلێك بەهێزتر بوو لەهەموو روویەکەوە.

**سعدون غێدان:** دەرچووی کۆلێژی سەربازی، عەرەبێکی شۆڤێنیست، بیرو پیلانی سیخوڕی بوو، ئازا، داوێنپیس، حزبایەتی نەکردووە، تێر نەدەبوو لەماڵ کۆکردنەوە، ماستاوچی یەکی سەیربوو، زۆر جار دەستی بۆ ساکە دبلوماسی یەکەی درێژ دەکرد، دەیگوت کەی سید نائب لێم ناڕازی بوو یەکسەر دەچمە ماڵەوە. هەتا ١٦ی تەمموزی ١٩٦٨ لەلیوای کۆماری فەرماندەی کتیبەی دبابات بوو، لەکودەتاکەدا بەشداربووە, لە١٨ی تموزدا کرا بەئەندام لە (مجلس قیادة الثورة)، لەڕۆژی سی یەم چووە پاڵ بەعس گوتی لەمڕۆوە من فەرمانی احمد حسن بکر جێبەجێدەکەمو صدام چی بڵێت وادەکەم.

رۆژێك لەساڵەکانی ١٩٦٩ دوو بەدوو لەگەڵ صدام دانیشتبووین لەپڕ گوتی مرتضی الحدیثیو سعدون غێدان دەیانەوێ بێنە ژووریٚ چی دەڵی یت، وەڵامم دایەوە ئەمە پەیوەندی بەبەڕێزتانەوە هەیە، بەهاتنیان خۆشحاڵ دەبم, کەهاتنە ژووریٚ سعدون غێدان گوتی: من کاتێك رەفیق پشدەریم ناسی لەکەرکوك لەفرقەی ٢ بووم بەپلەی نقیب، دەستیکرد بەدڵسۆزی نواندن بۆم. صدام گوتی: دیارە نهێنی یەکانیت دەزانی بەم شێوەیە باسی دەکەی؟ ئینجا درێژەی بەقسەکانیداو گوتی: دەتنێرم بۆ سویسرا کەچاوت بە جنرال بەختیار بکەوێتو قسەی لەگەڵ بکەیت بۆئەوەی بەیەکجاری بێتە عێراق. سعدون غێدان یەکسەر گوتی: کارێکی باشە کەرەفیق زۆر بەئاسانی دەتوانێت ئەم ئیشە ئەنجام بدات. گوتم: نەخێر لەبەر چەند هۆیەك من بۆ ئەم

فەرمانە سوودم نابێت، یەکەم فارسی نازانم، ئینگلیزی یەکەم مام ناوەندی یە، پلەی سەربازیم نی یە، من لەئاستی ئەم پیاوە مەزنە نی یم، منێکی سیخوڕ چۆن دەتوانم بۆئەم کارە گرنگە رووبەڕووی ڕاوەستم. صدام قسەکانمی پەسەندکردو سوپاسیکردم.

هیچ گومانم لەوە نەما کەئەو پەیوەندی‌یەی لەگەڵ نازم گزار هەمبووە کەئاگاداری کودەتاکەم" لەخۆم زیاتر کەس نایزانێت، ئەوە بووە هۆی ئەوەی پەڕەیەکی تازە لەگەڵ بەعسدا هەڵدەمەوە، ئەمەش لەئەنجامی ئەوەی کەسەرکردەکانی بەعسم بۆ ئاشکرابوو، بۆم روون بۆوە کەئێستا گەلێك زیاتر باوەڕو ڕێزیان بۆم هەیە، لەئەنجامدا هەموو ئەو پارەیەی کەسەرفم کردبوو لەو ماوەیەدا بەزیادەوە بۆمیان سەرفکردەوە. ئینجا کەوتمە پینەکردنی پەیوەندی یەکانم بەڕووداوەکەی نازم گزارو ئەو خەڵکانەی کە لەبەڕێوەبەرایەتی یەکەی ئەو کاریانکردووە، یەکە یەکە بیانبینم، دوورخرابوونەوەو لەدەرەوەی بەغدا بەوەزیفەی زۆر نزم لەحلەو بعقوبەو کەرکوك‌و رومادی دامەزرابوون, تەنها بەڕێوەبەری گشتی عبدالخالق عبدالعزیز نەگواسترابۆوەو کرابووە بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی، ناوبراو جێی باوەڕی احمد حسن بکر بوو و صدامیش ڕێزی لێدەگرت. ناوبراو جێی متمانەی نازم گزار نەبوو و هەموو کات گومانی لێدەکردو نەیدەهێشت شوێنە گرنگەکان ببینێ, جار جار بۆم راست دەکردەوە لای نازم گزار, بۆم دەرکەوت کەکەس نەبووە لەناوەوەی عێراق ئەم کودەتایە ئاشکرا بکات، ئینجا گەیشتمە ئەو باوەڕەی کەدەوڵەتێکی زلهێز بوو بەهۆی سەرنەگرتنی ئەم کودەتایە ئەویش رۆژئاوا (امریکا) بوو.

مام جەلال پێی گوتم هەوڵبدە بەزووترین کات لەڕێگەی تایبەتی خۆتەوە پەیوەندی بکە لەگەڵ مەلامستەفا. ئەمە چووە مێشکم هەرچەندە لەدوای ڕێکەوتنامەی ١١ی ئازار باڵی م.س. چوونە پاڵ پ.د.ك (بارزانی), منیشیان وا ئاگادار کردبوو کەمەلامستەفا خۆشحاڵبووە بەوەی کەمن لەپاڵ بەعسدا بمێنمەوە بۆ خزمەتی کورد. گەڕامەوە بەغدا, چووم خوشکە (ز.ئـ. ح)م دی کەدۆستێکی دێرینی خێزانەکەمان بوو، نووسراوێکم ئاراستەی بارزانی کرد کە(ئامادەم بەسەرو ماڵ گیانی خۆم لەپێناوی کوردو کوردستان بەخت بکەم, لەڕێگەی شفیقی برام کە لەقەڵادزێ دادەنیشێ وەڵامم بدەنەوە). لەو کاتەی کەئەم نامەیەم نووسی لەژیانێکی بەختەوەربووم, چوار ئوتومبێلم هەبوو, لەچەند بانقێك لەدەرەوە پارەم هەبوو, هەرچی پێی بڵێن گیروگرفت نەمدەزانی چی‌یە، بەهۆی دەسترۆیشتن‌و پارە ڕێزێکی تایبەتیم لەناو کورددا هەبوو بەتایبەتی کوردی بەغداو نیشتەجێی قەڵادزێو کۆیە. حزب فقیرو میللەت دەوڵەمەندە.

مەکتەبی بارزانی بەبروسکە ئاگاداری حەسۆ میرخان دەکەن کەشفیق مامە صادق بۆ ئیشێکی تایبەتی بێتە مەکتەبی بارزانی. حەسۆ میرخان قسە لەگەڵ شفیقی برام دەکات کەداوات دەکەن بچیتە مەکتەبی بارزانی. حەسۆ دەڵێت (رەفیقی سەگباب)ی برات کەی واز دێنێت, شفیق لەوەڵامدا دەڵێت تۆش باوکت هەیە، بەمەترسی یەکەوە شفیق روودەکاتە مەکتەبی بارزانی لەحاجی ئۆمەران، دەگاتە لای

مسعود بارزانی، ئینجا ئەحواڵی من دەپرسێت دەڵێت ڕەفیق پیاوی باشە، شفیق دەڵێ نایبینم و ئاگام لێ نیە، پاکەتێك جگەرەی بەغدای دەداتێ دەڵێت ئەمە تەسلیم بەڕەفیقی برات بکە. شفیقی برام هات بۆ بەغداو پاکەتە جگەرەکەی دایە دەستم، دوای هەشتەمین جگەرە کەتووتنم بەتاڵدەکرد لەناو تۆیەم جگەرەدا نووسراوەکەی مسعود بارزانی بوو, خوێندمەوە خستمە سەرچاوم، بەڵێنمدا وەڵلاهی چیم لەتوانادا بێت درێخی نەکەمو ئامادەم گیانی خۆموماڵو منداڵم لەگەڵ براکانم بۆ ئەم مەبەستە بەخت بکەین.

کەوتمە چالاکی نواندن بۆ بەهێزکردنی دۆستایەتیو برایەتیم لەگەڵ هەموو کاربەدەستەکانی حکومەتی بەعس بەتایبەتی دامودەزگا ئەمنی یەکان. بەخۆمدا چوومەوە کەلەم دەقەیەوە چی بکەمو کارەکانم چۆیەو چۆن سوودم لێ وەربگیرێت. بیر لەسەرمایە نەکەمەوە، ئامادەبم بۆ هەموو کاتێ کەلێم بقەومێ. ناوماڵەکەم کەم کردەوەو فرۆشتم, لەگەڵ ئەو پارەیەی کەهەمبوو تەسلیم بەدایکم کرد بۆ ڕۆژی لێقەومان. لەگەڵ شەفیق و کەمالی برام سێ قۆڵی دانیشتین بۆ کارکردنو خزمەتگوزاری لەم چوارچێوەیەداو پلانمان داڕشت کەچۆن بجووڵینەوە، یەکەم شفیق تەتەربێت لەنێوان ئێمەو مەکتەبی بارزانی، داوامکرد کەجفرەیەکی تایبەتیم بۆ بنێرن لەکاتی پێویست لەشاخی بەمۆوە بەلاسلکی بۆتان رەوانە بکەم، لەژێرەوە دەستمکرد بەوەی ئەو کوردانەی تەواو هەواداری بەعسن جێگایان پێ لەق بکەم، بەئاشکراو بەنهێنی خراپەیان بکەم، بەئاشکراو بەنهێنی پشتگیری هەموو کوردێکی بەشەرەف بکەم چ رووبکاتە ماڵم یان خۆی ئاگادارم بکات یان ئاگادارم بکەن، ئەمە بوو بەپرۆگرامی رۆژانەم، ڕۆژ بەڕۆژ بیروباوەڕو توانام پاڵی پێوەدەنام کەزیاتر وا بکەم جێدەستم دیاربێت هەتا ئەگەر ماڵ وێرانکردنو کوشتنو نانبڕینی تێدابێت, هەرکەسێك کۆسپ بێت بەرامبەر شۆڕش منیش ئەمە هەڵوێستم دەبێت بەرامبەری.

چووم بۆ بەیروت, لەئوتێل شێخ دابەزیم, عبدالرحمن زەبیحیو حلمی علی شریف لەهەمان ئوتێل دابەزیبوون، ئەو کاتە مام جەلال لەبەیروت دەژیا لەگەڕەکی (بەیروت—رومانە), رۆژانە دەهاتە لایان, مام جەلالم ئاگادارکرد کەزەبیحی لەمەکتەبی (شؤون الشمال) کەسەدام سەرپەرشتی دەکات فەرمانی گرتنی دراوە, بگەڕێتەوە دەگیرێتو چاوەڕوانی شتی مەترسیداری لێدەکرێت. مام جەلال گوتی ئەگەر من پێی رابگەیەنم لەوانەیە وا بزانێت پیلانی منە. ناچارخۆم دوو بەدوو قسەم بۆ زەبیحی کرد کەفەرمانی گرتنت لەسەرە لەمەکتەبی (شؤون الشمال) کەصدام بەڕێوەیدەبات. بڕوای بەقسەکەم هێنا, گوتی پارەم پێویستە, گوتم چەندت دەوێ ئامادەم, گوتی مادام لەماڵی مام جەلالدام ٣٠٠ دینار بەشی یەك ساڵم دەکات. ئینجا بەیەکجاری ئوتێل شێخی بەجێهێشتو رۆیشتە ماڵی مام جەلال.

**عبدالرحمن زەبیحی:** خەڵکی کوردستانی رۆژهەلاتە، سیاسەتمەدارێکی ناسراوی کوردە، زیرەك, زانا، رۆشنبیر، خوێندەوار، پاك، دڵسۆز بۆ گەلەکەی، چەند لەسەری بنووسی کەمە.

لەگەڵ مام جەلال دوو بەدوو گفتوگۆی دوورودرێژمان کرد, بۆم روونکردەوە کەگرژی دەستی پێکردووە, بەعس دەستیکردووە بەجمووجۆڵ, گەڕامەوە بۆ بەغدا.

## پیلانی بەعس و بەکارهێنانی عوبێدوڵڵا بارزانی

بەعس پیلانی وابوو دەست بخاتە ناو عەشیرەتی بارزان، بۆ ئەم پیلانەش عوبەیدوڵڵا بارزانی کەقونسڵ بوو لەباڵوێزخانەی عێراقی لەجەزائیر گەڕاندیانەوە بۆ بەغداو شێخ عوسمان شێخ ئەحمەد بارزانی یان هێنا بۆ بەغدا لەگەڵ عیمادی کوڕیـو ئەدهەم. بایەخێکی یەکجار زۆریان پێدان کەئەمانە دەبنە هۆی ئەوەی عەشیرەتی بازران دووبەرەکی یان تێبکەوێتو بەشی زۆری عەشیرەتەکە پاڵیان پێوە دەدەن، ئەمە دەبێتە هۆی ئەوەی بارزانی یەکان دژی یەك ڕاوەستێنو یەکتر بکوژن، بەعس حساباتێکی یەجگار زۆریان لەسەر کردبوو کەدەتوانن ئەو بۆشای یەی جماعەتی مام جەلال بەجی یان هێشتووەو جی یان دیارە, بەهاتنی عبیداللەو شێخ عوسمان پڕ دەبێتەوەو شۆڕش لاواز دەبێت، لەهەمانکاتدا بەتەواوەتی ئاگاداری هەموو جووڵەیەکی شێخ عوسمان بوومو بەجۆرێك پەیوەندیم پێوەکرد لەگەلێك شت لەخۆی زیاتر ئاگاداربووم وەکو پیلانی بەعس کەفرمانی شتێکی دەردەکرد شێخ عوسمان جێبەجێی بکات، منیش پێش جووڵانی شێخ عوسمان یەکسەر مەکتەبی بارزانیم لەهەموو شتێك ئاگاداردەکرد. شێخ عوسمان دەیگوت پێش ئەوەی هەنگاو بنی ین یەکسەر لای شۆڕش ئاشکرا دەبێت. بەعس کەوتە دوودڵی کەوا لەناو خۆیاندا دەستێکی ناپاك هەیە یان ئەوانە بەپیلان هاتوون، لەئەنجامدا پلانی شێخ عوسمان کە لەپاڵ بەعسدا گەورەترین دەسەلات بگرێتەدەست, شکستی هێنا.

عوبەیدوڵڵا بارزانی دەورێکی ڕاگەیاندنی هەبوو کەکوڕە گەورەی مەلامستەفایە, قسەو گوتارو کۆبوونەوەی لەگەڵ رۆژنامەکانو پەیامنێرەکان بلاودەکرایەوە، بەڵام سوودێکی گەورەی نەبوو بەڵکو تەنها بایەخێك کەهەیبوو وردە وردە ماهیەتی لای صدام کەمبۆوە، بەعس لەدوورو نزیکەوە چاودێری یەکی وردیان دەکرد بەو ناوەی کەژیانی لەمەترسیدایە.

لەساڵی ١٩٥٧ دراوسێ بووین لەگەڵ ماڵی مەلامستەفا بارزانی لەگەڕەکی (الاعظمیة) لە(شارع الضباط)، هاتوچۆی خێزانیمان هەبوو, رۆژگار دۆستایەتیو برایەتی لەگەڵ ئەم بنەماڵە گەورەو بەڕێزە رۆژ بەڕۆژ بەهێزتر دەکرد تا بلاوکردنەوەی ئەم کتێبە.

منو عوبەیدوڵڵا بارزانی رۆژ بەڕۆژ هاتووچۆمان پەرەی دەسەند، هەرچەندە بۆچوونمان لێکجیاواز بوو بەڵام برادەرێتیمان هەروەکو خۆی بوو. کەدەهاتە ماڵمان منیش لەوێ نەبوومایە دایکم وەکو کوڕی خۆی سەیری دەکرد، زۆر جار هاتۆتە ماڵمان نانی خواردووەو ڕۆیشتۆتەوە ئینجا من گەڕاومەتەوە بۆ ماڵەوە. کە

لەشۆڕش رادەکات دێتە موصلّ, پارێزگاری موصلّ (خالد عبدالحلیم) صدام ئاگادار دەکاتەوە، جلوبەرگی سەربازی لەبەردەکەن و بەفڕۆکە دەیهێننە بەغدا، صدام دەڵێت بۆ ئەوەی مەلامستەفا زویر نەبێتو ئاشکرا نەبێت. ئەوەبوو کرا بەقونسلّ لەجزائیر, بەنامە یاخود بەتەلەفۆن بەردەوام یەکترمان بەسەردەکردەوە, ناوە ناوە دیاری جوان جوانی بۆ دەناردم (جلوبەرگ و بۆینباخ). جارێکیان دووربینێکی بۆ ناردبووم کەئەمەش قەدەغەیە, دەزگای ئیستیخباراتی سەربازی وەریگرت ئەوانیش تەسلیمانکردم. لەبەشی زۆری وتووێژەکانی خۆی ئاگاداری دەکردم کەنیازی ئەوەیە کاتێك شۆڕش نەما بچێتەوە بارزان لەگوندی ڕێزان جێنشین بێت. من بەدوورودرێژی چەند جارێك ئاگادارمکرد، هەندێك جاریش دایکم لێهاندەدا کەسەر بکاتە سەری بۆ هەمان مەبەستو دایکی بازیانیشم لێهاندەدا. پێم دەگوت (عبیدالله) تۆ یاری بەئاگر دەکەیت, دوارۆژت نەمانە, لای بەعس جێی باوەڕ نیت, هەموو هەڵسانو دانیشتنێکت دەزانن کە چی دەکەیتو بۆ کوێ دەچیت، تەلەفۆنو ماڵت لەژێر کۆنترۆڵدایە, ئەوانەی بەناوی پاسەوان پارێزگاریت دەکەن کارمەندی موخابەراتو ئیستخباراتو ئاسایشن, واتە چاودێریت دەکەنو خەڵکانێك لەگەڵتدا هاوڕێن بۆ رابواردنو کات بەسەربردن بەشێکیان فرمانیان پێسپێردراوە کەچاودێری تۆ بکەن, هاتوچۆی باڵوێزخانەیەك دەکەیت ئەمە زۆر زۆر مەترسیدارە, رۆژێك دێت لەناوت دەبەن، دڵت بەو پلەیە خۆش نەبێت کەئێستا پێت دەڵێن وەزیری وڵات, بۆ ئاگاداریت تۆ جێی متمانەی صدامیش نیت.

## تێبینی

*ساڵی ١٩٨٥ لەراژان کاتێك کەوتبوومە نێوان پ.د.ك. و ی.ن.ك, رۆژێك مسعودو ئیدریس بارزانی دەربارەی عبیدالله پرسیاریان لێکردم کەبۆ رزگارت نەکرد، چونکە تۆ یەکێك بووی لەهەرە نزیکەکانی، گوتم دوای دوو شت کەوتبوو پارەو..., باوەڕم پێ هێنان بابەتەکەمان داخست.*

کۆمەڵێك لەکوردەکانی بەغدا کەناسراوبوون, بەئاگاداری حکومەت چوونە لای بارزانی بۆناوبژیکردن لەنێوان بەعسو شۆڕش. من بەپێی زانیاریم ئاگادارمکردن کەئەوانەی دوو لایەنن (مزدوج)ن و بەشێکیان جێی باوەڕن لەدڵەوە هاتوون, بەگشتی کوردی بەغدا نایەوێت شەڕ رووبداتەوە، ئەمە شتێکی باشە، چونکە شەڕ ماڵوێرانی یە, لەلایەکی دیکەشەوە هەندێك جێی پێ لەق دەبێو بەشێکیان بەئاشکرا سەر بەشۆڕشنو بەنهێنی لەگەڵ بەعسن ئەمانە چاوەڕوانی ئەوە دەکەن لافی کوردایەتی لێبدەنو ببنە نوێنەری کورد. هەرچەندە کوردی بەغدا بەزۆری پاکن، بەڵام ئاسان نی یە لەژێر سێبەری بەعسدا بژیتو بەئاشکراش لافی نیشتمانپەروەری‌و کوردایەتی لێبدەیتو بەناوی شۆڕشەوە بدوی یت.

لەماڵی (...) چاوم کەوت بەحبیب محمد کریم فەیلی، پ.د.ك. نووسراوێکم ئاراستەی مەکتەبی بارزانی کرد دەربارەی بارودۆخی ئەو رۆژە, هاتووچۆو گفتوگۆ هەبوو لەنێوان بارزانی‌و حکومەتی بەعس, گرژی یەکە

لەزیادیدا بوو, لەئەنجامدا بۆ چارەسەرکردنی گیروگرفتەکان نەگەیشتنە هیچ ئاکامێك، پیلانی بەعس ئەوەبوو کەشەڕ دەست پێبکاتەوە.

## هەڵگیرسانی شەڕ (١٩٧٤)

بەعس هەرچی لەتوانایدا بوو بەکاری هێنا بۆ ئازارو ئەشکەنجەدانو کوشتنو ماڵ وێرانکردنو سوتاندنی دێهاتو خەلەوخەرمانی جوتیار بۆ ئەوەی بەدەستێکی پۆڵای ین دەست بەسەر کوردستاندا بگرێت.

بۆ ئەوەی بەئیشوکارەکانی خۆم هەستمو دوانەکەوم، شەفیقی برام بوو بەتەتەر لەنێوان خۆمو مەکتەبی بارزانیو چەند جار بۆئەوەی دەنگوباسەکانم دوانەکەوێت, کاتێك کەشەفیق دوادەکەوت دایکمم تێوە دەگلاند, لەڕێگەی ئەو, نامەکانی منی دەبردە کۆیە، کەدیتم هاتوچۆکە ئاسان نییەو من ناوم بەسیخوری بڵاوبۆتەوەو لەهەمانکاتدا شفیق برامە هاتوچۆکردنی جی ی متمانەیە چ لای میری چ لای بەشێك لەسەرکردەکانی شۆڕش، ئەمە بوو بەهۆی ئەوەی شفیقمان دوورخستەوە لەتەتەری، سێ کەسیتر کەیەکێکیان ماوە، دڵسۆزو نیشتمانپەروەرو خۆشەویست بوون بەبێ هیچ جۆرە یارمەتی یەك هەستان بەم کارە. یەکێکیان کاك ئەمین بەنەخۆشی شێرپەنجە لەساڵی ١٩٧٧ گیانی بەگەلو نیشتمان سپارد، ڕەنگە ئەگەر شەهیدانەی بۆ بکەم گاڵتەم پێبکەن. بەداخەوە ئێستا توانای ئابووریم نییە کەبتوانم سەر لەمنداڵەکانی بدەمو برێك پارەیان پێشکەش بکەم.

بۆ ئەو کارە، دی یەکی سێ ماڵی لەسەر رووباری سیروان, بوو بەبارەگام بۆ نامەنووسین, لەبەغداوە کەدەهاتم دوو رۆژ دەمامەوە لەوێ نامەکانم دەنووسی هەرچەندە ئوتومبێلەکەی من هیچ بازگەیەك بۆی نەبوو داوای پشکنینی بکات هەروەها خۆشم لەهاتوچۆکردندا کەس بۆی نەبوو داوای پێناسەم لێبکات.

لەڕێگەی حەمەی وەلی حەمەی کەرەم لەبنکەی پێشمەرگایەتی بەمۆوە بەلاسلکی بەناوی(بەیروت — مارتینس) ئاگاداری مەکتەبی بارزانیم کرد کەلەم رۆژانە بەعس، بەفرۆکەی مێکی رووسی بەناپاڵم بۆردوومانی شارۆچکەی قەڵادزێ دەکات, رابەری لاسلکییەکە لەحەمە وەلی دەپرسێ کەیەکێکە لەناوبراوەکانی ئەو ناوچەیە دەڵێ ئەمە یەکەم جارە جفرەی وام دیبێتو بیستبێتم، پێم بڵێ ئەمەت لەکوێ بوو، وەڵامی دەداتەوە دەڵێت بازرگانێکی کوردی فەیلی لەبەغدا نایناسم ئەم کاغەزەی دامێ تکای لێکردم کە لەڕێگەی بارەگایەکی پێشمەرگەوە رەوانەی بکەمو خۆشم لێرە لەساڵی ١٩٦١ پێشمەرگە بووم حەزم کرد سەردانێکتان بکەم.

جارێکیان شەفیقی برام لای عەلی شەعبان سێ رۆژ بەند دەکرێت، ئەویش خۆی پێ ناناسێنێ کەتەتەرە لەنێوان مەکتەبی بارزانیو رەفیق پشدەری. جارێکیشیان دایکم نامەکەی بردبوو بیگەیەنێتە شەفیقی برام لەکۆیە لەبازگەی نێوان کەرکوكو تەقتەق ژنێکی شروگی دایکم دەپشکنێ، لەپڕ دایکم وا دەکات بڕی ٥٠ دینار پارەی لێ بکەوێتە خوارێ، ژنەکە لەخۆشی پارەکە واز لەدایکم دەهێنێ.

یەکێك لەو برا دڵسۆزو نیشتمانپەروەرانە کە لەژیاندایە شایانی باسکردنە لەهەموو ڕوویەکەوە هەرچەندە خوێندەواری نەبوو، بەڵام کەمی وا هەیە لەدونیادا بەم جۆرە بتوانێت لەسەر سنگی, کتێبێکی ٥٠٠ لاپەڕەی ی لەبەربکات. من زۆر خۆم بەقەرزاری ئەو دوو برایە دەزانم کەهیچ جۆرە دەسەڵاتێکم نی یە لەخزمەتیاندا بم نە بەماڵ نە بەکردەوە. لەهەمانکاتدا ئەوەی بۆ مەکتەبی بارزانیم دەنارد دەبێت ئەو خاڵانە بخەمە بەرچاو کەچەند بایەخ و گرنگی یان پێداوە یەکسەر حەمەی وەلی گەیشتووە لەشوێنی تایبەتی دایانناوەو ڕێزیان لێگرتووە, نامەکەیان لێوەرگرتووەو بەزووترین کات وەڵامیان داوەتەوەو هەندێ جار دوای چەند دەقیقەیەك مسعود بارزانی چاوی پێکەوتووە، ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کەسەرکردایەتی ی شۆڕش شتی گرنگی پشت گوێ نەخستووە.

ساڵی ١٩٧٥ برووسکەیەکم لەعبدالرحمن زەبیحی یەوە بۆ هات کە لەبەیروت بوو، ڕوونی کردبۆوە دەڵێت لەفلان ڕۆژ دەگەڕێمەوە بۆ بەغداد، لەکاتی دیاریکراو لەفڕۆکەخانەی بەغدا چاوەڕوانم بکە بی یت بەپیرمەوە. لەڕۆژی دیاریکراودا چوومە فڕۆکەخانە، دیتم نزیکەی ٥٠ کەس هاتبوون بەپیری یەوە, کاتێك لەفڕۆکەکە دابەزی من بۆم هەبوو بچمە ژووری ترانزێت, چووم بەخێرهاتنەوەم کرد، پاسەپۆرتەکەم لێوەرگرت و تەسلیم بەیەکێك لەو ئەفسەرانەم کرد کەسەر بەبەڕێوەبەرایەتی ی ئاسایشی گشتی بوون، دامێ و بۆ جێبەجێکردنی (لەژوورێك سێ کەسی لێیە بەرگی مەدەنی یان لەبەرە یەکێکیان سەر بەئیستخباراتەو دووەمیان سەر بەمخابراتە سێیەمیان سەر بەئاسایشە)، ئەمانە لێپرسراوی فڕۆکەخانەکەن لەهەموو ڕوویەکەوە بەتایبەتی بۆ ئیشوکاری نهێنی بۆ ئەو خەڵکانەی کەنەیانپشکنن و بەپەلە ئیش‌وکاریان بۆ جێبەجێ بکەن، گرتن و بەردان لەهاتنە ژوورەوەو لەچوونە دەرەوە ئەوان لی ی بەرپرسیارن.

ماوەی سەعاتێکی پێ چوو ئینجا پاسپۆرتەکەی (عبدالرحمن زەبیحیان) داینەوە. من هەستم بەشتێ کرد، پرسیارم کرد لەو ئەفسەرەی کەپاسپۆرتەکەم پێدابوو، هیچ هەیە؟ گوتی: نەخێر ئاسای یە، بەڵام ناوەکەی نزیك بوو لەناوێکی دیکە کەشتی لەسەر بوو. ئینجا لەگەڵ عبدالرحمن زەبیحی چووینە ناو میوانە ئازیزەکانی کەبەشی زۆریان پارتی کۆن بوون دوای ی بوونە باڵی مەکتەبی سیاسی جماعەتی (مام جەلال).

دوای یەك کاتژمێر دانیشتن لەگازینۆی فڕۆکەخانەکە، ئینجا بڵاوەمان لێکردو عبدالرحمن زەبیحیم گەیاندەوە ماڵەوە کەشوقەیەك بوو لەنهۆمی دووەم لەگەڕەکی (تل محمد). بەیانی چوومە لای، پارێزەر عبدالله کانیمارانی لابوو، پێم گوت: بەڵکو ڕێگەمان بدەیت منو زەبیحی پێکەوە هەندێك نهێنیمان هەیە باسی بکەین, گوتی: من ناچمە دەرێ، ئێوە بڕۆنە دەرێ قسەی خۆتان بکەن. چووینە دەرێ, پێم گوت بۆچی هاتیتەوە؟ من لەبەیروت ئاگادارم نەکردی کەفەرمانی گرتنت لەسەرە؟ دوێنێ هۆی دواکەوتنمان ئەوەبوو کاتێك پاسپۆرتەکەی تۆم دا بەئەفسەرەکە کەسەرنجەدەدا تۆ فەرمانی گرتنت لەسەرە ئەویش بەتەلەفۆن ئاگاداری بەڕێوەبەری ئێشکگری ئاسایشی گشتی دەکات، ئەویش لەڕێگەی خۆیەوە ئاگاداری بەڕێوەبەری

ئاسایشی گشتی دەکات کەفەرمانت چی‌یە؟ دەڵێت با ابو بازیان زویر نەبێت ئەم کارە ئەنجام مەدەن هەتاکو ئاگاداری رەفیق پشدەری نەکەن، ئینجا وا هاتووم چی دەڵی یت بگیری یت بەردانت نی یە، من پەیوەندیم بەسەرەوە نی یە، بەڵام ئامادەم بەیەکەوە رووبکەینە ناوچەی کەلار دوای دوو سەعاتی تر کەدەگەینە ناوچەی ئازادکراو کەماڵی برام چاوەڕوانە, ئایا چی پەسەند دەکەی؟ عبدالرحمن زەبیحی گوتی: من باوەڕم بەم شۆڕشە نی یە کەئێران دەستی بەسەردا گرتووە, دواڕۆژی سەرنەکەوتووە, لەبەرئەوە دەچم خۆم تەسلیم بەحکومەت دەکەم.

هاتینە ژووریٚ بەعبداللە کانیمارانیم گوت ٢٥ دینارم بدەیە، بەزەبیحیم گوت من ٣٠٠ دینارم دایتیٚ ئایا ناتوانم ٢٥ دیناریشت بدەمیٚ، خۆی کۆکردەوەو شتومەکی بەندیخانەی هەرچی پێویستە هەڵمانگرتو بەیەکەوە چووینە ئاسایشی گشتی لای بەڕێوەبەری لقی سیٚ عبدالقادر الراوی, ماوەیەك دانیشتین پرسی ئەم برادەرە ناناسم، گوتم ئەمە عبدالرحمن زەبیحی‌یە بەپێی خۆی هاتووە هیچ گومانێکی لەخۆی نی یە تەسلیم دەبێت, ئەو گوتی فەرمانی گرتنی لە(مكتب شؤون الشمال)ەوە دەرچووە، وەرن بابچینە بەندیخانە.

شانەیەکی حزبی لەبەغدا گیران لەمانە (لیلی قاسم)یان لەگەڵدا بوو. یەکێك لەناو خۆیان (مزدوج) بوو واتە دوو لایەنە بوو ئەو بوو بەهۆی ئەوەی ئەوانە ئاشکرا ببن، لێکۆڵینەوەیەکی زۆریان لەگەڵدا کردن لەئەنجامدا یەکێك دەچێتە ناویان بەناوی وەزیری ناوخۆ گفتوگۆیان لەگەڵدا دەکات پی یان رادەگەیەنیٚ دان بەوەدا بنێن کەئێمە ئەو کارانەمان کردووە ئێوە بەردەدرێن. بەداخەوە زۆر هەوڵمدا شتێکیان بۆ بکەم سەرنەکەوتم، لەیلا و هاوڕێکانی بڕیاری لەسێدارەدانیان بەسەردا سەپاندنو جێبەجی یان کرد.

سەعات چواری ئێوارەی هەمان ڕۆژ، شەوکەت بەگی جاف تەلەفۆنی بۆ کردم کەبچم بەپەلە سەردانی بکەم لەماڵەوە. کەچووم, بەهۆی ئەوەی کەصلاح جافیش لەسێدارەدراوە زیاتر لە ٢٠ کەس لەبەگزادەکانی جاف دانیشتبوون، کاتی خۆی لەگەڵ چەند بەگزادەیەك چووینە لای بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی عبدالخالق عبدالعزیز ئەویش پێشنیازێکی پێشکەش بە(مجلس قیادة الثورة) کرد کەبڕیاری لەسێدارەدانی جێبەجیٚ نەکرێتو گفتیان دابوو کەنەکرێت، یەکێك لەوانە وەزیری ناوخۆ بوو. بەبرادەرانی جافم راگەیاند چیتان لەمن دەویٚ ؟ گوتیان تەرمەکەمان دەوێت، چونکە ئەو رۆژە ئەستەم بوو، واتە شەڕی نێوان شۆڕشو بەعس لەوپەڕیدا بوو، لاشەی کوژراوو زامداری سوپا بەژمارەیەکی زۆر دەهاتەوە, مرۆڤی کورد لەخۆیەوە دەترسا بەتایبەتی لەجی یەکی وەکو بەغداو موصلو کەرکوك.

تەلەفۆنم لەگەڵ وەزیری ناوخۆ سعدون غیدان کرد، گوتم مردوو کەدەمرێت شەیتان دەستی لێهەڵدەگرێت، ئەمانە لەسێدارەدراون, ژمارەیان ١٧ کەسە، یەکێکیان لیلی قاسمە, دونیا هاوینە گەرمەو بارودۆخیش نالەبارە, بەڕێزتان ئەگەر فەرمان بدەن من دەچم لەمەیتخانە تەرمەکانیان وەردەگرمەوە، هەر ئەمشەویش وا دەکەم بەبێدەنگ بیاننێژن. قسەکەی منی پەسەندکرد، ئینجا تەلەفۆنم لەگەڵ بەڕێوەبەری

ئاسایشی گشتی کرد, بۆم باسکرد کە لەگەڵ سعدون غیدان دواوم، ئەویش پەسەندیکرد، داوام لێکرد کەئاگاداری ئاسایشی وەزیریەیە بکەیت کەنزیکمان نەبنەوە، من خۆم لەوێم، بەبێدەنگیو بێئەوەی هیچ ڕوو بدات کارەکان جێبەجێ دەکەم. بەبرادەرانی بەگزادەی جافم گوت ژمارەیەکی کەمو بەدوو ئوتومبێل دەچین با قەرەباڵغی دروست نەکەین. کاتێك گەیشتینە بەر مەیتخانە پیاوێکی بەتەمەن, کورتەبالاو عەینەك لەچاو ئەویش هات لەنزیك ئێمە ڕاوەستا، سەرنجمان دایە وامزانی سیخوڕی وەزیریەیە, لێی نزیك بوومەوە بەعەرەبی پرسیارم لێکرد بۆچی لێرە وەستاویت، گوتی کارم هەیە، گوتم کارت چیە؟ بەدەنگێکی نزم لەسەرخۆ گوتی لەوانەی ئیمڕۆ لەسێدارەیاندان یەکێکیان (لیلی قاسم)ـە, کچی منە. گوتم تۆ باوکی هەموومانیت شانازیت پێوە دەکەین کەئەمە یەکەم جارە لەمێژووی عێراق لەسەر سیاسەت کچێکی کورد لەسێدارە بدرێت. بەڕێز چیت دەوێت تاکو بۆت جێبەجێ بکەم. دەستم بەگیرفانمداکرد بڕی ٧٠ دینارم پێ بوو تکام لێکرد کەخۆشحاڵ دەبم ئەو دیاری یە پچووکە لەمن وەربگرێت. گوتی: من خاوەن گەورەترین سامانم لەکوردستان, من باوکی لیلی قاسمم, تەنها ئەوەم دەوێت تەرمەکەی وەرگرمەوە. منیش خۆم بۆ نەگیراو گریام. گوتی: لیلی ڕازی نی یە کەس بۆی بگرێی، ئیمڕۆ لای بووین سێ جار خۆی گۆڕی هیچی نەخوارد نەبادە لەکاتی لەسێدارەدانیدا بڕشێتەوە، یا دوژمن بڵێت کچە کوردەکە ترساوە.. هەموو کات دانیشتنمان لەگەڵیدا دەکرد هەر پێدەکەنی, هەر نوکتەی بۆ دەگێڕاینەوە, ئێمەش گفتمان داوەتێ کەئەمشەو هیچمان نەگری ین یەك لەدوای یەك نوکتەی بۆ بگێڕینەوە.

ئوتومبێلێکی فریاکەوتن هات لەبەر تەرمەکان تایەکانی نیشتبوو, چووە ژووریٚ تەرمی ١٧ کوردی تێدا لەسەر یەك، وەك کەلاکی ئاژەڵی سەربڕاو کە لەئەوروپاوە دێت دەخرێتە ناو گوێنی سپی بەم شێوەیە یەك لەسەر یەك ریزیان کردبوو بەهەمان شێوەش تەرمەکانیان لەسەریەك دانرابوو لەسەرو هەموویانەوە تەرمی لیلی قاسم بوو کەناوی چووە ریزی شەهیدانی کورد. ئوتومبێلێکی پۆلیسی فریاکەوتن لەدواوەی دەڕۆیشت, کەئێمەی بینی لەترسان هاواریکرد دووربکەوینەوە, لی ی چوومە پێشێ پێم گوت بەفرمانی وەزیری ناوخۆ خاوەن تەرمەکان هاتوون وەریانبگرنەوە، ترسی ناوێت. باوکی لیلی تەرمەکەی وەرگرتەوە.

**تێبینی**

*لەمەکتەبی بارزانی پرسیارم زۆر لێکرا کەئاشکرای بکەمو تیشك بخەمە سەر ئەو تاوانبارەی کەئەو نهێنییەی ئاشکرا کردو بووە هۆی ئەوەی لیلی قاسم و هاوڕێکانی لەسێدارە بدرێن.. ئێستا گومان لەسەر منزر نقشبندی یە کەتا ئەمڕۆ لەسەر خراپەکاری بەردەوامەو لەبەغدا دەژی.*

لەگەڵ مەکتەبی بارزانی ڕێکەوتین بۆ ئەوەی کەکار بکەین بەشێوازێکی پوختو نوێ بێجگە لەکاری نامە گۆڕینەوە، بچینە ناو قووڵای ی سەرکردەکانی بەعس، بۆئەوەی سەرنجیان بەرامبەر بەماهیەتی شۆڕش ڕابکێشین.

دوو کەس کە لەسێبەری شۆڕشدابوون علی بەگی جاف و بەکری مام ڕەزا, هەروەها ئەو برادەرە دڵسۆزەمان کەبەردەوام هاتوچۆی دەکرد, کاکە حمەولی, بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتیو وەزیری ناوخۆم وا تێگەیاند کەدەنگوباسی راستەوخۆمان دەربارەی هێزی پێشمەرگەو ژمارەیان پێدەگەیەنن, بارودۆخی ئابووری یان، سنووری ئێران کەسەرانسەری بۆ بەرژەوەندی شۆڕش کراوەتەوەو هەندێك زانیاری ڕاستەقینەو بەڵگەدار, ژمارەیانو جۆری چەك لای شۆڕش, واتە ئەم زانیاری یانە لەمەکتەبی بارزانی یەوە دەنێردران، بەڵام لەڕێگەی علی بەگی جافو بەکرەوە, منیش پێشکەش بەوەزارەتی ناوخۆم دەکرد کەئەم دوانە نوێنەرن. چەند جارێك ئەو برادەرە کاك (حمە وەلی)م لەگەڵ خۆم بردە لای وەزیری ناوخۆ کەئەمە بڕێك جگەرەی دیوپۆنتی کڕیوە لەفرۆشگای شۆڕش بەم فێڵە هاتوچۆی حاجی ئۆمەران دەکات، وەزیری ناوخۆ زانیاری یەکەی ئەوەندە لا گرنگ بوو بەکاسێت تۆماری کرد, منیش دەمگۆڕیە سەر زمانی عەرەبی، ڕێکوپێکم دەخست، ئەو زانیاری یە راستانە کاتی خۆی شتێکی زۆر گرنگ بوو کەسەرکردەکانی بەعس بگەنە ئەوەی کەشۆڕش زۆر بەهێزەو پەیوەندی یەکانی دەرەوەی ڕۆژانە پتەوتر دەبێ.

ئەو زانیاری یە درۆیانەی کەپی یان دەگات، ژمارەیان کەمە، بارودۆخی ئابووری یان خراپە، لەناوخۆیاندا ناکۆکی یان هەیە، بۆیان ڕوون بۆوە کەهەمووی درۆیە، شۆڕش بەهێزە
بارزانی سەرپەرشتی دەکاتو تەنگوچەڵەمەیان نیيە.

لەلایەکیترەوە، بەشێوەیەك کوشتارو زامدار زۆربوو ڕۆژانە زیادی دەکرد, هەرچەندە ئیستخباراتی سەربازی دەیویست بەشەو تەرمەکان دابەش بکات تەرمێکی یەجگار زۆر دەگاتە بەغداو لەزیادیدایە. ئیستخبارات هەرچیکرد بۆیان نەشاردرایەوە ئەوەش بوو بەهۆی ئەوەی کەگوشاری زیاتر بکاتە سەر صدام. بارودۆخی ئابووری بەرەو خراپی دەڕۆیشت، جەنەراڵە عەسکەری یەکان کەبەڵێنیان بەصدام دابوو راستیان نەکرد، درۆیەکانیان ئاشکرابوو.

گەیشتمە ئەو باوەرەی کە بەنهێنی گفتوگۆ لەنێوان بەعسو حکومەتی شا هەیە, هەروەها خەریکن لەیەك نزیك ببنەوە. بەپەلە رۆیشتمە بەیروت ویستم بەنهێنی بەناوێکی ترەوە بچم بۆ ئێران رووبەڕوو چاوم بەبارزانی بکەوێت بۆ ئەوەی ئاگاداری بکەمەوە, بەداخەوە سەرنەکەوتمو گەڕامەوە بەغدا. لەڕێگای حەمەی وەلی نووسراوێکی دوورودرێژم بەرزکردەوە کە بەهۆی نزیکبوونەوەی بەعسو شا، شۆڕش لەخەتەرێکی گەورەدایە،
هەروەها برادەرەکەمان دەگاتە لات لەهەمووشتێك ئاگادارت دەکاتەوە.

م.ك تەلەفۆنی لەگەڵداکردم کەدوو ڕۆژی تر لە (بەیروت– شەقامی بلیس ـچێشتخانەی سقراط)، سەعات یەك چاوەڕوانتم، لەکاتی دیاریکراو لەساڵی ١٩٧٥ ڕۆیشتم گەیشتمە نزیك شوێنی مەبەست کۆمەڵێك لەچێشتخانەکە دەهاتنە دەرێ لەوانە مام جەلال و شێخ عزیز رەزا، مام گەڕایەوەو دانیشتین بەدوورودرێژی

باسی هەموو شتێکی بۆ کردم کە شا وا خەریکە بەتەواوەتی دەست بەسەر شۆڕشدا بگرێت, جا ئەگەر بتوانین هەوڵ بدەین هەریەکەمان لەلای خۆیەوە گفتوگۆیەك لەنێوان صدام و بارزانی دروست بکەین. بۆ ئەم مەبەستە مامۆستا ابراهیم احمد کاسێتێکی ناردووە ئاماژە بۆ ئەم رووداوە گرنگە دەکات، لەگەڵ مام جەلال بەیەکەوە چووینە ماڵەوە لە(بەیروت– رومانە), لەوێ بەتەواوەتی گوێم لەکاسێتەکە گرت. پێشەکی بۆ چەواشەکردن دەنگی باڤێڵی کوڕە گەورەی مام جەلال تۆمار کرابوو. ئینجا وشە بەنرخەکانی مامۆستا ابراهیم احمد بەدوورودرێژی باسی ماهیەتی شۆڕش دەکات کەپێش ئەوەی ئێران بەتەواوەتی دەست بەسەر شۆڕشدا بگرێت، رێکەوتن لەنێوان بەعسو شۆڕش هەموو ئەو خەتەرانە پووچەڵ دەکاتەوە.

بەیانی لەگەڵ مام جەلال هاتینە فرۆکەخانەی بەیروت, من ڕوومکردەوە بەغدا و مام جەلال ڕۆیشتە قاهیرە. کاتی دیاریکراوی لەکاربەدەستانی میسر وەرگرتبوو کەبیانبینێت. کەگەڕامەوە بۆ بەغدا بۆ ئەم مەبەستە کەوتمە جموجولو پرۆگرامێکم بۆ خۆم داڕشت کە لەکوێوە دەست پێبکەم، بەپیلان جووڵامەوە. بەدوروودرێژی بەنووسینو بەقسە سەرکردەکانی بەعسم تێدەگەیاند کەشۆڕش لەهەموو روویەکەوە چەند بەهێزە. بۆم روون دەکردنەوە بەهیچ جۆرێك شۆڕش بەشەڕ کۆتای ی نایەت، نە سوپای عێراقی توانی شۆڕش لەناوبەرێت، نە شۆڕش ئەو دەسەڵاتەی پەیداکرد کەدەست بەسەر هەموو پارێزگاکاندا بگرێت وەکو موصل، دهۆك، هەولێر، کەرکوك، سلێمانی. پیلانی CIAو شای ئێران ئەوەبوو کەشەڕ لەنێوان بەعس وکورد رووبداتەوە، هەرچەندە هەردوولا تاوانباری گەورەن چونکە دەیانتوانی لەئەنجامی گفتوگۆ ڕێك بکەوتنایەو ئەو ماڵ وێرانی یەیان بەسەر عێراقدا نەهێنایە.

هەروەها ئێستا ئاشکرابووە کەهەردوولا لەناوەوە زۆر بەهێزن، هیچ گۆڕانکاری یەك لەعێراقدا ڕوونادات, واتە کودەتا بەسەر بەعسیەکاندا ناکرێت. ئینجا بارودۆخی ئێستا لەبەرژەوەندی گشتیدایە کەبەعس و شۆڕش بکەونە گفتوگۆو ڕێکەوتن، هەموو پڕوپاگەندەو دەسیسەی شاو CIA کەهێڵمزی بەڕێوەبەری پێشووی موخابەراتی ئەمریکی، کەئێستا بەپلەی باڵیۆزی ئەمریکی لەتارانە، لەو پلە گەورەیەی پێشووی هاتۆتە ئەو پلە پچووکە گومان نیەیە بۆ جێبەجێکردنی پیلانێکی زۆر گەورەو نهێنی هاتووە، ئەگەر بێتو هەردوولاتان (صدام و بارزانی) بکەونە گفتوگۆو ڕێکبکەون ئەوە کورسی‌یەکەی هێڵمز دەکەوێتە لەقینو هەموو ئەو دەسیسانەی هەیە پوچەڵ دەبێتەوە.

**تێبینی**

١–لەسەرکردەکانی بەعسەوە دەستم پێکرد, لەبەشێکی زۆر کەس‌وکاری احمد حسن بکرو صدامەوە هەروەها لەبەشێك لەعەرەبە نیشتمانپەروەرەکان کەدۆستایەتی یان لەنزیکەوە لەگەڵ سەرکردەکانی بەعسو خزمانی بکر و صدام هەبوو.

٢- چاوم بەچەند کوردێکی ئازاو نیشتمانپەروەر کەوت کەپێویستە ئەوانیش دەوریان هەبێت بەڵام بەداخەوە...

٣- کەدکتۆر عبدالرحمن قاسملۆ بۆ ئەم مەبەستە دەورێکی زۆر گەورەو گرنگی هەبوو، بەیاننامەیەکی بڵاوکردەوە بەو ناوەی ئاشتی لەنێوان بەعس و شۆڕش بەرقەراربێت. دکتۆر قاسملو کاتێك ناسیم مەلامستەفا بارزانی لەخانووە کۆنەکەی نوری سعیدبوو لەساڵی ١٩٥٩, من لەباخچەکە راوەستابووم کەچاوی بەمن کەوت بانگی کردم گوتی رەحمان بەکوردێکی جەربەزەت دەناسێنم سوودبەخش دەبێت. بۆ نانخواردنی نیوەڕۆ لەخزمەت مەلامستەفادا بووین, مام جەلال و دکتۆر عبدالرحمن قاسملۆو هاوسەرەکەی نەسرین و بەندە.

**حەمەی وەلی حەمەی کەرەم و سەعدون غێدان**

لەکاتی چاوپێکەوتنی حمەی ولی لەگەڵ سعدون غیدان بەندەش بەناوی وەرگێڕ ئامادەبووم, بەناوی ئەوەی کەحمە وەکیلی منەو کار بۆ بەعس دەکات. لەهەمانکاتدا ئەم پیلانەمان بۆ بەرژەوەندی شۆڕش بەئاگاداری مەکتەبی بارزانی و مسعود بارزانی دادەنا تاکو لەم رێگایەوە جموجوڵ بکرێت، بەعس لەگەڵ بارزانی گفتوگۆ بکات. کەقسەکانی حەمەی وەلیم بەعەرەبی بۆ باسکرد، تۆماریکرد، جۆری چەکەکانی بنکەو سەربازەکانی ئێران کەتۆپە گەورەکانیان دژی سوپای عێراق بەکاردەهێنن و بۆردوومانی پێدەکەن.

سعدون غیدان کامیرایەکی بەحەمە وەلیدا و گوتی: ئەمجارە وێنەی بنکەو بازگەکانی ئێران بگرە, لەمەودوا ئەمە وا دەکات کەبیر لەگفتوگۆ بکەینەوە لەگەڵ بارزانی.

کاتێك حمە گەڕایەوە بەنووسراو مەکتەبی بارزانیم ئاگادارکردو هەموو شتێکم بۆ روونکردنەوە، حەمەی وەلی کامێرەکەی تەسلیم بەمسعود بارزانی دەکات و چی هەبوو ئاگاداریکردنەوە، مسعود بارزانی ڕازی نەبوو بەوەی کەوێنەی بنکەو تۆپی سەربازەکانی ئێران بگرن، گوتبووی ئەمە دەبێتە کارێکی نابەجێ بەرامبەر ئێرانی یەکان, ڕەنگە بەعسی‌یەکان ڕۆژێك سوود لەمە وەربگرن.

حەمەی وەلی دوای ٣ سێ ڕۆژ گەڕایەوە, یەکسەر چوومە لای، لەبەر گرنگی بارودۆخی ئەو رۆژە نووسراوێکی ترم ئاراستەکردن. لەملاشەوە چیم توانی بەنووسین و بەقسە رووبەڕوو خستمە بەرچاوی سەرکردەکانی بەعس بۆ ئەوەی گفتوگۆ لەگەڵ بارزانیدا بکەن. ئینجا گەیشتمە ئەو باوەڕەی بەهیچ جۆرێك سەرکردەکانی بەعس لەبیروباوەڕیاندا نی‌یە لەگەڵ بارزانی دانیشن بۆ جێبەجێ‌کردنی بەیاننامەکە.

راستە گومانم لەوە نی‌یە کەگفتوگۆی نێوان صدام و شا بەنهێنی بەردەوامە، کۆبونەوەیان لەدەرەوەو ناوەوەیە. هەلومەرجەکە مەترسیدارە، ئاگاداربن پیلانێکی گەورە لەئارادایە. بەچوار کاتژمێر چیم دەزانی خستمە سەرکاغەزو بەقسەش بەدووردرێژی نووسراوەکەم بۆکاکە حەمە باسکردو دووجار

خوێندمەوە کەئەویش مسعود بارزانی ئاگادار بکاتەوە. کاکە حەمەش نووسراوەکەی تەسلیم کردبوو، (سالی ۱۹۹۲ ناوبراو خۆی بەکاك مسعود بارزانی ناساندبوو لەدانیشتنێکدا ئەمەی بۆ گێڕابۆوە).

لەگەڕانەوەیدا کەدەگاتە مەهاباد, لەڕادیۆ چاوپێکەوتنەکەی شای ئێران و صدام لەجەزائیر بلاوبوەبێتەوە.

### هەرەسهێنانی شۆڕشی ئەیلول ( ۱۹۷۵ )

لەئەنجامی هەرەسهێنانی بزووتنەوەی کورد لە ۱۹۷۵/۳/۷ دونیـام لێهاتـەوە یـەك, ناخۆشـترین ڕۆژم بـوو لەژیاندا, لەکاتێکدا ئەم شۆڕشە مەزنە ئامانجی هەموو کوردێکی نیشتمانپەروەرو بەشەرەف بوو، ئێستا وەکو بەفری بەهار تواوەتەوە. بەم هەموو دەستڕۆیشتنەو دەسەلاتەی بەتۆپ وچـەك‌و تەقەمـەنی، بەحـەفتا هـەزار پێشمەرگە کۆتای ی هات. پێشمەرگە پۆل پۆل بەچەکەوە خۆی تەسلیم دەکاتەوە. منو کەمالی بـرام لەگـەڵ مالەوە چووینە بنکەی ڕۆژانەمان کە لەسەر چەمی سیروان بوو, هیچ دەسەلاتێکمان نەمابوو, لەگـەڵ ئـەمین‌و دوو برادەرەکە (پێنج پیاوو ئافرەتێك) دەستمانکرد بەگریان، چـونکە هیـچمان نـەبوو قـسەی لەسـەر بکـەین تەنها ئەوەمان گوت کەدوژمنانی کـورد (دەولەتـە دراوسـێکان) عێـراق وئێـران و تورکیـاو سـوریا هەرچـەندە دوژمنی یەکن، بـەلام بەرامبـەر بـەکورد یـەك هەلوێـستیان هەیـە. ئەمـەریکاش کـەکۆماری مهابـادی رووخانـد وریاکردنەوەی سەرۆکی کۆماری ئەمـەریکا بـۆ سـتالین ئـەوەبوو گـوتی: (هـەتا ئەوەنـدە سـەعاتی‌تر سـوپای سووری ڕووسی لەئازربایجانی ڕۆژئـاوای ئێـران نەکـشێتەوە لەگەلتانـدا دەجـەنگم). ئـەوەبوو سـوپای ڕوسـیا کشایەوەو سوپای ئێران کوردستانی داگیرکردەوەو کۆمـاری مهابـاد رووخـا. لەهەمانکاتـدا مـن لەناوجەرگـەی دوژمندام, بـەناو سـیخوڕم، دلـسۆزێکی بەعـسم، وەکـو ئـەوان بەشـدارم، دەبێـت پێبکـەنم‌و خۆشـحالی خـۆم دەرببڕم, زیاد لەوەش هێرش بەرمە سـەر سـەرکردایەتی شـۆڕش. جـا ئـەو بـرادەرە شۆڕشـگێڕەی کـەدوێنێ پێشمەرگەبوو، دوای هەرەسەکە دەهاتەوە ناو مالو مندالەکانی خۆی دادەنیـشت یـا کـارێکی مـیری دەکـردو خۆی

بەتاوانبار نەدەزانی.

لەگەڵ هەموو ئەو خەلکانەی ئیشمان پێکەوەدەکرد، واتە تەتەر بوون‌و بەقسە یا بەکردەوە لەمن زیاتریان کردو ئیشوکاری خۆیان زۆر بەپاکی‌و دلسۆزی بردەسەر، لەسەر ئەوە رێکەوتین کەبرادەرێتی‌و دۆسـتایەتیمان هەر دەمێنێت، بەلام ئەمە لەبیرخۆمان دەبەینەوە چونکە ئەمە ئاشـکرا بێـت یەکسەر لەسـێدارەمان دەدەن، بەلێنتان پێدەدەم ئەوەی ئاشکرا بێت منم, بڕوام پێبکەن پارچەپارچەم بکەن دان بەوەدا نانێم بلێم مـن ئـەم کارەم کردووە.

**حەمەی وەلی حەمەی کەرەم:** لەدایکبووی ١٩٣٢ - دی ی ئەحمەدئاوا لەکەلار کەناسراوە بەگازینۆکە. کاسبکارو ئازابوو، ساڵی ١٩٥٩ لێپرسراوی دووهەمی پارتی بووە لەکەلار, ساڵی ١٩٦٢ لەبەمۆ پ.م بوو. یانزە جار لەدێی ئەحمەدئاواوە چووە بۆ سەرکردایەتی, چوارجار بەپێ لەدۆڵی شەهیدانەوە رۆیشتووە, دووجار لەگەڵ شەفیقو حەوت جار بەماشێن چۆتە ئێران کە بەسێ رۆژ گەیشتوەتە مەکتەبی بارزانی و بەسێ رۆژیش هاتۆتەوە نووسراوی تایبەتی لەمسعود بارزانی یەوە بۆ هێناوم. هەموو جارێك لەهاتوچۆکردنو گەڕانەوەیدا پرسیارم لێکردووە سەعات چەند گەیشتنو سەعات چەند چاوت بەمسعود بارزانی کەوتووە، دەیگوت کەدەگەمە ئەوێ لەشوێنێکی تایبەتیم دادەنێن، ئینجا شەو دووبەدوو لەگەڵ مەسعود بارزانی بەدووردرێژی گفتوگۆمان دەکرد, نووسراوەکەی دەخوێندەوەو پرسیاری لێدەکردم منیش وەڵامم دەدایەوە.

جارێکیان حەمە پێی دەڵێت: کاك مەسعود ئێوە ئاگادارن کە ٢٤ کەس کوژرابوون, لەوکاتەدا عەبدولوەهاب ئەتروشی بەلایاندا تێدەپەڕێ راناوەستێت, لەکاتێکدا دەزانێت ئەو٢٤ پێشمەرگەیە لەهێزەکەی ئەو کوژراون, چۆن سەرکردە دەبێت ئەمە هەڵوێستی بێت, ئاخر خەڵك قسە دەکات, بۆچی نایگۆڕن بە(...)؟ کاك مەسعود وەڵامی ناداتەوە.

تا دوێنێ هەڵوێستێکم هەبوو ئێستا وەکو بەعسی یەکان دەبێت توانجیان تێبگرم، بەڵام چی بکەمو هەڵوێستم چۆن بێت؟ چونکە دەبێت بەشدار بم لەرێوڕەسمی گەڕانەوەو بەخێرهێنانەوەی بەشێك لەو خەڵکەی کەناسراون، چ بەفڕۆکە، یان لەڕێگەی سنوورەوە بەپیریانەوە بچم چاوم پی یان بکەوێت.

صالح یوسفی یەکەم کەس بوو لەئەندامانی مەکتەبی سیاسی پ.د.ك بەپەلە بەنیازی گفتوگۆ گەیشتە بەغداو لەئوتێل کلیوپاترا دایانبەزاند. چوومە خزمەتی بەخێرهاتنم کرد, داوای لێکردم کەچاوی بەصدام حسەین بکەوێت.

هەڵوێستی کوردایەتی ئەم پیاوە گۆڕانکاری بەسەردا نەهاتبوو, ورەی بەرزبوو, لەمیوانخانەکەدا بەشێوەیەك کەقسەی بۆ دەکردم دەتگوت لەناو پێشمەرگەکانی خۆیدایەو وتاریان بۆ دەخۆێنێتەوە لەگەڵ ئەوشدا کەدەیزانی دەورووپشتەکەی هەمووی سیخوڕن. من لەقسەکانی تێگەیشتم کەدەیەوێت چاوی بەسەید النائب بکەوێت بەمەبەستی ئەوەی بۆی ڕوون بکاتەوە کەرێکەوتننامەی جەزائیر سەرکوتوو نابێت ئەگەر رێگاچارەیەك بۆ کێشەی کورد نەدۆزرێتەوە. من پێم گوت ئەگەر رێگام بدەیت دەستە بەنرخەکانت ماچ دەکەم, ئیجازە بفەرموو باهەندێك شتت بۆ روونبکەمەوە ئەویش ئەوەیە کەلای سەرکردەکانی بەعس (بکرو صدام) شتێك نەماوە جێی سەرنج بێتوپێی بڵێن کێشەی کورد, کێشەی کورد لەلای ئەوان کۆتایی پێهاتووە بۆ هەتاهەتایەو ئەم باسەم زۆر بەوردیو بەدورودرێژی بۆ باسکرد.

دوای گفتوگۆ سەیدا یوسفی زۆر دڵگران بوو, کەتێگەیشت بارودۆخەکە بەو شێوەیە ئاڵۆزە گرژبوو, نزیکەی نیو ساعات بێدەنگی و بێتاقەتی دایگرت, ئینجا گوتی: بەڕاستی ئێمەی رۆشنبیرانو لێپرسراوان کە

لەدەوری بارزانی بوین رۆژ نەبوو لەناو خۆماندا باس لەمەترسی ئەو پەیوەندی یە بەهێزە نەکەین کەبارزانی لەگەڵ (شا)دا بەستویەتی, دەمانگوت نیازی شا ئەوەیە کەرۆژ بەرۆژ دەسەڵاتی بەسەر شۆڕشەکەدا زیاد بکات, من یەکێك بووم لەوانەی چوومە خزمەت بارزانیو ئاگادارمکردن لەوەی کەحکومەتی کۆنەپەرستی ئێران لەسەرانسەری مێژوودا بەتایبەتی بنەماڵەی شا, دوژمنی کورد بونو مێژوویەکی ڕەشیشیان بەرامبەر بزوتنەوە کوردیەکان تۆمارکردووە, بۆ نمونە: کوشتنی سمایل ئاغای سمکۆ هەروەها لەسێدارەدانی سەرۆکی کۆماری مهاباد خوالێخوش بوو قازی محەمەد. ئێمە لەناوخۆماندا گومانێکی زۆرمان بەرامبەر بارودۆخەکە پەیداکردووەو خۆت لەهەموو کەس شارەزاتری لەحکومەتی ئێران. لەوەڵامدا پێی گوتم: ئێمە بەهێزترین شۆڕشین لەڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستداو چەكو جبەخانەو پارەی پێنج ساڵمان هەیەو لەهیچ شتێکمان کەم نیەو بەهیچ شێوەیەك مەترسیتان لەعێراقو ئێران نەبێت.

که لەباسی قسەکانی بارزانی تەواوبوو پێی گوتم ئێمە بەتەواوی باوەڕمان بەقسەکانی بارزانی هەبوو چونکە منیش لام ئاشکرابوو کەچەكو جبەخانەو دارای یمانو هێزو توانای پێشمەرگەو فیداکاری یان, لەلایەکی تریشەوە کەگەلی کورد بەهەموو جۆرێك باوەشی بەشۆڕشەکەدا کردبوو, ئەمانە هەمووی جێی متمانەو قایلی بوون بەوەی کەکەس ناتوانێت زەفەر بەشۆڕشەکە بەرێت. ئەوەی جێی سەرسورمان بوو لەلای منو هەموو گەلی کورد ئەوەبوو کەبارزانی بەتەنها بریارپیدا کەئاشبەتاڵ بەشۆڕش بکاتو تێگەیشتین کەئەم کارە پەیرەویکردنی پیلانێکی داڕێژراو بوو لەلایەن شاو C.I.A بەئاگاداری جولەکە کەلەلایەن بارزانیەوە جێبەجێ کرا.

دوای تەواوبوونیوتەکانی سەیدا, پێم گوت سەرکردەکانی بەعس دەڵێن سوپاس بۆ یەزدانی مەزن لەپیلانەکەی نازم گزاردا, مەلامستەفا هیچی لێنەهات, چونکە مانی بارزانی گەورەترین سودی هەبوو, ئەوەتا بەدەستی خۆی ئاشبەتاڵی بەکورد کرد. سەیدا یوسفی گوتی دەبێ هەوڵ بدەین هیچ کوردێکی عێراقی لەئێران نەمێنێتەوە بۆ ئەوەی جارێکی تر کورد نەکەنەوە بەداردەستی خۆیان.

**تێبینی**

*١- سەرکۆمار ئەحمەد حەسەن بەکر بۆچونێکی تایبەتی هەبوو بەرامبەر سەیدا یوسفیو ڕێزی زۆر لێدەگرت, روونو ئاشکرابوو لەلایان کەکوردێکە هیچ جۆرە پەیوەندی یەکی بەدەرەوەی وڵاتەوە نیەو هۆی ئەوەبوو ماڵەکەی لەبەغدا وەکو خۆی مابۆوەو دەستیان لێنەدابوو.*

*٢- ساڵی ١٩٩٧ لەگەڵ هاوسەرەکەم سەردانی خێزانی خوالێخۆشبوو سەیدا یوسفیم کرد لەزاخۆ, پێم گوت تەلەفزیۆن نیشانیداوە کەسەرۆك بارزانی هاتۆتە لاتان ئینشائەڵڵا کەموکوڕی یەکانی بۆ ئەنجام دوایت, لەوەڵامدا گوتی: داوام لەسەرۆك کرد باخچەی خانووەکەم جێگای (٤٠) دوکانی تێدا دەبێتو یارمەتی پارەمان بداتێ بۆ ئەوەی دروستی بکەین ئەوکاتە باری ئابوریمان زۆر باش دەبێت بەڵام سەرۆك بارزانی*

*لەوەڵامدا گوتی ئێستا پارەمان نیيە کەی پارەمان بوو بۆت دەکەین.*

*٣- دوای چەند مانگێك لەو سەردانەم, بەتەنیا سەردانێکیتری زاخۆم کردەوە کە لەمیوانخانەی (بەغداد) دابەزیبووم, لەپڕ گوێم لەدەنگی دەهۆڵو مۆسیقابوو, کەسەرنجمدا ئاهەنگێکی گەورەیە سازدراوە بۆ پەردە لابردن لەسەر پەیکەری صالح یوسفی, منیش چوومە باڵەکۆنی میوانخانەکە بۆ ئەوەی تەماشای ئاهەنگەکە بکەم، رووم‌کردە کابرایەك لەتەنیشتمەوە ڕاوەستابوو لەبەر خۆمەوە گوتم: پارەی ئەو پەیکەرەیان بدایە بەهاوسەرەکەی دوکانەکانی پێ دروست بکردایە باشتر نەبوو؟ کابرا جوابی نەدامەوەو رۆی, دوایی خاوەن میوانخانەکە گوتی ماڵ خراپ رەفیق, ئەوە نەقیبی ئاسایش بوو, منیش گوتم کەواتە ئاگاداری وەزعەکەیە بۆیە رۆی.*

ئینجا پارەم دا بەیاوەرەکەم کەئەم شتانەی بۆ بکڕێ (کراس، بیجامە، پێڵاو، دەرپێ، فانیلە، گۆرەوی، خاولی، تاقمی ڕیش تاشین) کەئەم شتانەیان هێنا پێم گوت برۆ خۆت بشۆو ڕیشت بتاشە, کەلێبوویتەوە چاوەڕوانم بکە. گەڕامەوە لای گوتم: ئەوە کلیلی ماڵەوەیە فەرموو با بتگەیەنم، ماڵەکەت وەك خۆیەتی دەستی لێنەدراوە.

ساڵی ١٩٩٦ لەزاخۆ لەگەڵ هاوسەرەکەم (ئێرانی فیض الله بەگی) چووینە ماڵی سەیدا صالح یوسفی, خۆم بەهاوسەرەکەی سەیدا ناساند، بەگەرمی بەخێرهاتنی کردین‌و خۆشحاڵی دەربڕی, بیری کەوتەوە کەمن بەچ جۆرێك هەڵوێستم نیشانداون، ڕووبەڕووی کچەکەی بەبیرم هێنایەوە، گوتم بۆچی سەیدا صالح یوسفیت کوشت، ئەدی نەهاتمە ماڵتان، ئەی ئاگادارم نەکردیت کەژیانی سەیدا لەمەترسیدایە, تۆ بەرهەڵستیتکرد, خاوت کردەوەو پێت گوتبوو هەتا کەی دەربەدەربین. هاوسەرەکەی سەیدا گوتی نەمدەزانی دەیکوژن ئەگینا بەقسەم دەکردیت.

### لەسنووری عێراق – ئێران( خانەقین- منذرية )

چاوەڕوانی بەکری مام رەزا و علی سلیم بەگم دەکرد کەچاوم پی یان بکەوێت‌و پی یان ڕابگەیەنم بەناوی ئەوان ڕاپۆرتێکم بۆ بەڕێوەبەرایەتی ئاسایشی گشتی‌و وەزیری ناوخۆ نووسیوەو هاتووم ئاگاداریان بکەمەوە نەبادا لەکاتی هاتنیان بۆ عێراق ڕێزیان لێنەگرن، چونکە ناوم بەئاسایشی گشتی دابوون‌و پی یان بڵێن ئێوە خزمەتی بەعستان کردووە, بۆ من زیانێکی گەورەیە. کاتێك ئەمە بزانن ڕاست نیيە، پەنجەم دەخەنە سەر کەڕەفیق پشدەری پاراستنە، ئیشی بۆ شۆڕش کردووە.

زۆر جار لەمەسعود بارزانی یەوە هەندێك دەنگوباسی گرنگو راستم بۆ دەهات کەبیخەمە بەرچاوی بەعسیەکان‌و ببێتە هۆی ئەوەی ماهیەت بەشۆڕش بدەن‌و دان بەمافی کوردا بنێن، منیش دەمکرد بەڕاپۆرت‌و بەناوی بەکری مام رەزا یان عەلی سەلیم بەگ کەلاری دەمنارد.

**بەکری مام رزا:** لەبنەماڵەیەکی نیشتمانپەروەری کۆیەیە, لەقەلادزێ لەدایکبووە, دەرچووی کشتوکاڵە، ئازا، زیرەك، خوێندەوار، کوردپەروەر، سەرەتا پێشمەرگەبوو، ناسراوە بەباڵی م.س جماعەتی (مام جەلال).

**عەلی سەلیم بەگی جاف/ کەلاری:** لەبنەماڵەیەکی ناسراو, دانیشتووی کەلار, ئازا, زیرەك, خوێندەوار, نیشتمانپەروەر, ئەندام بووە لەحزبی هیوا، کادرێکی دێرینی پارتی بووە، لەپێشمەرگە کۆنەکانی شۆڕش، ناسراوبوو بەباڵی م.س جماعەتی مام جەلال.

لەسەر سنوور بووم دوو ئوتومبێلی ئاسایشی بعقوبە هاتبوون بۆ منذریة چاوەڕوانی شوکتی مەلائیسماعیلیان دەکرد. کەگەیشت بەپیرییەوە چوون ڕێزیان لێگرت, دوای ی بەرەو بەغدا کەوتەڕێ و دەستبەجێ یەکێك بوو لەو خەڵکانەی کەدایانمەزراند، بەمە ڕازی نەبوو نووسراوێکی ئاراستەی صدام کردبوو کەچاوی پێ بکەوێت. کاتێك دەچێتە ژوورەوە بۆ لای سکالای خۆی دەکات، کەدەبوو لەجێگەیەکی گرنگی دابنێن، صدام دەڵێت تۆ ترسنۆکیت, گفتی خۆت بەجێ نەهێنا کەدەتگوت بەو ئیشانە هەڵدەستم، شوکت دەگیرێت دەڵێ ڕەفیق پشدەری کەشفی کردووم. ئەو کاتە صدام دەڵێت نامەوێ گوێم لەو قسەیە بێت، ناوی ڕەفیق پشدەری مەهێنە.

ڕۆژێکیان سەردانی فواد عارفم کرد بەبۆنەی گەڕانەوەی بۆ عێراق، چونکە ئەویش وا ئاشکرا بوو کەپەیوەندی بەشۆڕشەوە کرد. پێشەکی زۆر زۆر سوپاسی کردم کەسەرم لەماڵی داوە، گوتی تەنها تۆ بوویت فریای ئێمە بکەویت، دەستی یارمەتیت بۆ درێژ کردووی ین کاتێك عطای کاکە حەمەو نوالی کچی ماجد مصطفی کەهاوسەری فەرهادی کوڕمە، دێنە لات هەموو کارێکیان بۆ ئەنجام دەدەیت، بەڕاستی جی ی سەرسوڕمانە لەکاتێکدا من گەڕاومەتەوەو هەتاکو ئەو سەعاتەش فەرهادی کوڕم لەبەندیخانەیە. بەبەڕێوەبەری ئاسایشی گشتیم گوت بۆچی فەرهادی کوڕی فوئاد عارف بەرنادەن؟ ئەویش بۆی باسکردم هۆیەکان چین. منیش ئاگاداری فوئاد عارفم کرد گوایا بەڕێزتان لە لندن بوون یەکێك (....) بەئێوەی گوتووە کاك فوئاد بۆ ناگەڕی یتەوە بۆ عێراق، تۆش گوتووتە تاکو صدام لەحوکم مابێت من ناگەڕێمەوە. فوئاد عارف گوتی ئێمە چەند کەسێك بووین پێش ئەوەی شەڕ دەست پێبکاتەوە لەبەغداوە چووینە لای بارزانی بەمەبەستی ئەوەی ئاشتی بەردەوام بێت, منیان هێشتەوە بەبێ ئەوەی ئامادەی یم هەبێت, لە (رضائیة) لەئوتێل بووم ژوورەکەی تەنیشتم هی بارزانی خۆی بوو کەچی نەیانهێشت ئەو پیاوە ببینم، تاکو دوای هەرەسەکە ئینجا بارزانیم دیتو زۆر ڕەخنەم لێگرت کەبەم شێوەیە ڕەفتار لەگەڵ من کراوە، رەفیق من لەئێران نەچوومەتە دەرێ. ئەم قسانەم وەکو خۆی گەیاندە شوێنی مەبەست کەئەمە راست نییە، ئینجا فەرهاد بەردرا. ئەو کەسەی ئەو ڕاپۆرتە درۆزنەی لەسەر فوئاد عارف نووسیوە ناوی (عبدالرحمن)ە, جارجار

دیومه لەهەولێر لەترسان بەگەرمەوە سلاوی لێدەکەم, کەدەلێت چۆنی، من وەلامـی دەدەمـەوە دەسـتەکانت ماچ دەکەم، چونکه ماهیەتی دێتەوە بیرم.

لەفرۆکەخانەی بەغدا چاوەڕوانی کەکۆمەلێك کوردم دەکرد، کەبەشداری شـۆڕش بوون لەتارانــەوە دەگەڕێنــەوە بــۆ ولات. لــە مایــسی١٩٧٥ کــە لەفرۆکــە دابــەزین دیــتم خــەلکێکی رۆشــنبیرو نیشتمانپەروەرو ناسراو کە لەناو جەماوەری کورد جی ی ڕێزن، بەگەرمی بەپیریانـەوە چـووم، وامکـرد هـۆلی میوانـداری یـان بـۆ بکەنـەوە. دوای خواردنـەوەی چـــا مـاوەی سـەعاتێك بەیەکـەوە دانیـشتین, نەمهێـشت جانتاکانیان بەهیچ جۆرێك تەماشا بکرێت چونکە ئاگاداریانکردم، رێکـەوتین کەبـەیانی لەشـوێنێکی دیـاریکراو چاومان بەیەکتر بکەوێت. ئەمانە دکتۆر کەمال خەیات، دکتۆر کەمال مەزهەر، دارا رشید جەودەت، خەسـرەو تۆفیقو کەمال محی الدین بوون.

سیاسـەتی بەعـسم بـۆ روونکردنـەوە کەچـۆن لـەخۆیان بـای ی بـوونو وا تەماشـای کێـشەی کـورد دوای هەرەسەکە دەکەن کەئیتر هەموو شتێك کۆتای ی هـاتووە. عـزت دوری گوتبـووی وادەکـەین هـەر صـەد مـالٌ چەقۆیەکیان پیٌ بێت بۆ کاروباری چێشتخانە. کاتێك رێکەوتننامەی جەزائیر بلاوکرایەوە لەناو بەشـێکی زۆری کادرانی بەعس مقۆمقۆ دەربارەی رێکەوتنەکە پەیدابوو, دەیانگوت بۆچی سەدام لەگەلٌ بـارزانی رێنەکـەوت؟ صدام لەگەلٌ دوژمنی عەرەب کەشــای ئێرانە بەم شــێوەیە چۆکــی دادا بەشــێکی زۆری لەخاکی عیراقی خۆشەویستو نیوەی (شط العرب)ـی دایە (ئێران).

کاتی خۆی نوری سعید دەلێـت دەسـتم بـبڕن ئەمـە ئیمـزا ناکـەم، فـەرمانێك لەسـەرکردایەتیی بەعسەوە دەرچوو کە بەهیچ جۆرێك دەربارەی رێکەوتنی جەزائیر نابێت گفتوگۆ بکرێت, هەرکەس باسی بکات بەخراپی لەحزب دەردەکرێت و شەش مانگ دەخرێتە بەندیخانە.

بەمیوانەکانم گوت: برایانی بەڕێز ئێوە رۆشنبیرو سیاسەتمەدارو شـارەزان, پێویـست ناکـات مـن رێگاتـان نیشان بدەم, بەگەورەی ی خۆتان بمبەخشن کەداوا لەبەڕێزتان دەکەم بارودۆخی ئیمرۆی کوردیـان بـۆ ڕوون بکەنەوە کەکورد لەژێر سیاسەتی دەولەتێکی وەکو ئەمـەریکا ئـەم رێکەوتنـەی لـەنێوان دوو دەولـەتی. پێـان بەلێن ئەگەر هاتو ئێوەی بەعس ئەوەی بارزانی هەولی بـۆ دەدا کەئـەویش ئۆتۆنـۆمی بـوو، ئێـوە بـۆ کـوردی جێبەجیٌ بکەن، هەتا هەتایە جارێکی تر کورد ناچێتەوە شاخ، بەلام بـەو شـێوەیەی ئێـستا ئێمـە رۆشـنبیری کوردین راســتیەکانتان دەخەینــە بەرچاو بۆ مــێژوو و دوارۆژ، کورد نزیکــترین نەتەوەیە کەپالپشتی عەرەب بووە، بۆ نموونە صلاح الدین الایوبی جێدەستی دیاربووە.

بەلێنم دانیٌ دەتانبەمە لای یەکێك لەکاربەدەستانی بەعس، پێم گوتن تی یان بگـەێنن کەئەگـەر مافـەکانی کورد جێبەجیٌ نەکەن زوو بێت یان درەنگ شۆڕش بەرپا دەبێتەوە. مـن بـۆم نیـیـە کەدانیـشتین ئـەو قـسانە

بکەم، بەڵام ناهێڵم ئازارو ئەشکەنجە بدرێن و بتانگرن, چۆن بەفڕۆکە هاتن‌و چوونە ماڵێ هەر ئاواش بەم شێوەیە دەپارێزرێن, من بەرپرسیارێتی ئێستاو دواڕۆژتان دەگرمە ئەستۆ.

کەقسەکانم تەواوکرد، بڕیاریاندا کەهەڵوێست و قسەکانی منیان بەلاوە پەسەندە, لەناوخۆیاندا باس لەوەکرا کەیەکێك هەڵبژێرن بەناوی هەموویان قسە بکات، بڕیار لەسەر دکتۆر کەمال خەیات دراو قسەکانی کەدەیکات لەناو خۆیاندا پەراوەیان دەکرد. د. کمال مەزهەر و د. کەمال خەیات‌و صالح یوسفی‌و دارای ڕەشید جەودەت‌و کمال محێدین‌و خوشکە زەکیە ئیسماعیل حەقی بوون.

ئاگاداری بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتیم کرد کەئەو برادەرانە هاتوونەتەوەو ڕۆشنبیری ناسراوی کوردن, سوودێکی باش دەبەخشن بۆ پڕوپاگەندەکردن لەپێناوی بەعسدا، تکام
وایە کەچاوت پی یان بکەوێت‌و ڕێبازی بەعسیان بۆ روون بکەیتەوە، ئەویش رازی بوو.

لە ١٩٧٥/٥/٥ چووینە ئاسایشی گشتی لای بەڕێوەبەری (شعبە)ی سیێ، هەریەکە لیستێکیان دانێ پڕیانکردەوە کەبریتی بوو لەناونیشانیان. ئینجا چووینە لای سکرتێر, بە د.کەمال خەیاتم گوت تەماشای ئەو وێنەیە بکە کەبەرامبەرمانە، چاوەکەی چەندە زەقە, ئەو (عیون السحریە)یە, چاوی شاراوە، ئێستا لەژوورەوە بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی چاوی لەهەموومانە. ئینجا چووینە لای بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی عبدالخالق عبدالعزیز, گومانم نی یە ئەو قسانەی لەوێ کران لەژوورەوە هەمووی تۆمار کرا. ناوبراو بەگەرمی بەخێرهاتنی کردین، باسی سیاسەتی بەعسی بۆ روونکردینەوە کەئێمە هەڵوێستمان هەموو کاتێك خزمەتی گەلی عێراقە بێ جیاوازی، ئینجا هێرشێکی توندی کردەسەر بارزانی‌و شۆڕشەکەی‌و گوتی ئێوەش ڕۆشنبیری کوردن سوودبەخش دەبن بۆ وڵات. ئینجا د.کمال خەیات لەجیاتی هەموویان ماوەی نزیکەی ٢٠ دەقیقە دوا, زۆر لەسەرخۆ گوتی:

سوپاستان دەکەین کەکاتێك لەفڕۆکە دابەزین بەم شێوەیە بەخێرهاتنتان کردین،
ئەوپەڕی ڕێزتان لێگرتین، ئێستاش ئەم دانیشتنە لەخزمەت بەڕێزتان کەبەڕێوەبەری ئاسایشی گشتین، بەم شێوەیە لەگەڵمان دانیشتووی بەڕاستی جی ی سەرسوڕمانی ئێمەیە کەدەبێت لەدەرەوە ئەمە باس بکەین، هەروەها ئێمەت وا لێکرد باوەڕت دا بەئێمە کەبارودۆخی ئێستای عێراق‌و بەتایبەتی هی کورد ڕاستی‌یەکان چی هەیە بیخەینە بەرچاوتان‌و ئەگەر رازی بیت رووبەڕوو روونی بکەینەوە، چونکە ئێمەی ڕۆشنبیر، مێژوو دواڕۆژ حسابمان لەگەڵ دەکات. متمانەمان وایە لەڕێگای ئێوەوە کەدەسەڵاتدارن برایانی سەرکردەکانی بەعسیش ئەم ڕاستی‌یە بزانن، با هیچی تر دوژمن دەست نەخاتە وڵاتەکەمان. عێراقێکی بەپیت وبەرەکەت، خاوەن نەوت, چواردەورمان چاویان بڕیوەتە ئێمەو، داگیرکەر لەیەکەم ڕۆژەوە هەوڵی دووبەرەکی دەدات، شەڕو ئاژاوەو کێشەی کورد شتێکی سەرەکی‌یە، دەبێت ئێوە ڕێگایەك بدۆزنەوە کەجارێکی دیکە هەمان شۆڕش روونەداتەوەو بەشێوەیەکی سیاسی نەهێڵن کورد چەك هەڵگرێت‌و ڕوو لەشاخ بکاتەوە. لای ئێوە

ئاشکراو ڕوونە ئەو هەموو هێزەی شۆڕش لەپڕدا وەکو بەفری بەهار توایەوە، ئەمە خۆی لەخۆیدا ڕووداوێکی سیاسی بوو چونکە ئەم پیلانە لەدەرەوەی ولآت کرا. ئەگەر ئێوە بتانەوێت جارێکی دیکە هەمان شۆڕش ڕوونەداتەوە ئەوەی کەبارزانی داوای دەکرد بۆ گەلی کورد، حوکمی زاتی راستەقینەبوو، دەبێت ئێوە دان بەمافی کورددا بنێن‌و جێ‌بەجێ ی بکەن. ئەو کاتە ئێوە بەتەواوەتی جی ی پارتی‌و بارزانی دەگرنەوە، هەموو کورد لەدەورووبەری بەعس کۆدەبێتەوەو سەرکەوتنتان هەتا هەتایی دەبیێ، ئێمە راستمان لەگەڵداکردن چونکە ئەم دانیشتنە رۆژێ لەڕۆژان مێژوو باسی دەکاتو ئەگەر بەشێوەیەکی ئاشتی‌و دیموکراتی هەموو مەسەلەکانی کورد جێبەجێ نەکەن مەحاڵە سەرکەوتن بێننەدی.

لەیەکەم ساتەوە کە د.کەمال خەیات دەستیکرد بەقسە چاوم بڕیبووە عبدالخالق، سەرنجمدا وردەوردە رەنگی سوور هەڵگەڕاو گرژتر دەبوو, کەقسەکانی تەواوبوو بەبەڕێوەبەری ئاسایشی گشتیم گوت بەڕێزتان ڕێگامان بدەیت هەموو ئەو برایانە بۆ نان خواردنی نیوەڕۆ لەئوتێل خیام لای منن تکام وایە کەفەرمان بە عبدالقادر الراوی بدەیت لەگەڵمان بێت.

لەسەر سفرەی نان خواردن نزیکەی ١٣ کەس بووین، شەو سەردانی بەڕێوەبەرێ ئاسایشی گشتیم کرد، یەکسەر گوتی ئەمە چی‌بوو تووشی منت کرد، دوای لەناوچوونی شۆڕشیان بەم جۆرە ڕووبەڕووی من ئەم قسانەیان کرد، ئایا لەکاتی شۆڕش هاتبانایە بۆ گفتوگۆکردن ئەوکاتە چۆن چۆنی قسەیان دەکرد! گوتم ابو مازن ئەمانە رۆشنبیرو نیشتمانپەروەرن، ولآتیان خۆش دەوێت، لەدڵسۆزی‌یەوە راستی‌یەکانیان خستە بەرچاوت تا بەڕێزتان لەنزیکەوە بزانیت ئەمە ئاواتی کوردە. خزمەتێکی گەورەیە بەرامبەر سەرکردایەتی بەعس راستی‌یەکان بزانن، بۆئەوەی نەخشەی بۆ بکێشن چۆن لەگەڵ کورد هەڵسوکەوت بکەن، تۆش وابکەیت ئەم ڕووداوە گرنگە وەکو خۆی بگاتە شوێنی خۆی.

**تێبینی:**

*ئەو رۆشنبیرو نیشتمانپەروەرانە لەوسەردانەدا چی یان گوتبوو لەگەڵ پێشەکی‌یەکدا بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی وەکو خۆی بەنامیلکەیەك بەسەر سەرکردەکانی بەعسدا بڵاویکردەوە. من کەئەمەم زانی مەترسیم لێنیشت کەبیانگرن بەتایبەتی د.کمال خەیات و د.کمال مەزهەر.*

چوومە پارێزگای دیوانیە بۆ سەردانی فەرماندەی فرقە عمر هزاع، بێئەندازە ڕێزی لێگرتم، منی بەهەموو کاربەدەستانی فرقە ناساند, گوتی ئەمە رەفیق پشدەری‌یە دۆستێکی نزیکی سەرۆك‌و(نائب)و جی ی باوەڕیانە. گوتم کەهاتووم سێ تکام هەیە کەبۆم بکەیت. لەلایەن خۆتەوە چیت لەتوانادایە بەم ئیشە هەڵسیت، بەتایبەتی ئیشی یەکەمیان کەزۆرم لا گرنگەو بۆ بەرژەوەندی ولآت سوودێکی گەورەی دەبێت, بڕوا ناکەم ئێوەی عەرەب ئەوە هەڵوێستتان بێت کەکورد بەم شێوەیە تەماشا بکرێت, بڕوات بێت خۆم دوو کەس لەو لێقەوماوانە دەناسم ئەوانیش ژیانم بۆ دابین کردوون:

١-نزیکەی ١١٠٠ پۆلیس لەوانەی پەیوەندی یان بەبارزانیەوە کردو دوای هەرەسەکە گەڕاونەتەوە پاڵ حکومەت، ئێستا هەموویان وەکو مەڕ لێرە کۆکراونەتەوە بۆیان نیە لەسنووری پارێزگا دووربکەونەوە، زۆریان ژیانی ئابووری یان زۆر خراپە، هەرچەندە کاسبی عەیب نیە، بەڵام ئەمانە ناونیشانێکی تریان پێیە کەپێشمەرگە بوونو گەڕاونەتەوە, ئێستا لەبەر بارودۆخی ئابووری بوونەتە بۆیاخچیو کۆڵهەڵگر، لەسەر شەقامەکان وردەواڵە دەفرۆشن، دانیشتوانی شارەکە بەجۆرێك ڕێزیان لێدەگرن بەهەموو توانایەك دەستی یارمەتی یان بۆ درێژ دەکەن و بەشێکیان بەنهێنی سواڵ دەکەن. ئایا ئەوەیە هەڵوێستی عەرەب لە (بعقوبە) لەناو ئەو تۆزو خۆڵە, ئێستاش خەڵکێك ماوە ڕێگا نادەن بچێتەوە شوێنی خۆی. نزیکەی دوو مەتر دووربووم لەخوشکم لەبەر تۆزو گەرمای کەمپەکە نەمناسیەوە. کە لەبەغداوە بەرەو دیوانیە هاتم سەرنجمدا چەند خانوویەکی تازەکراوە هەر ژوورەی خێزانێکی کوردی تێدایە.

٢- لەم ڕۆژانە چوومە ناصری یە سەردانی برادەرێکی خۆشەویستم کرد تازە گەڕاوەتەوە، یەکێك بوو لەدۆستە نزیکەکانی بارزانی، ناسراوە پی ی دەڵێن (شەفیق ئەحمەد ئاغا). تکام لەپارێزگاری ناصری یەو بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی ناصری یە کرد کەئەم پیاوە مەزنە دەیتوانی بچێتە دەرەوەی وڵات، یان لەئێران بمێنێتەوە، بەڵام بۆیە گەڕاوەتەوە کەبەئازادی لەوڵاتی خۆیدا بژی یت.

٣- برازایەکم سەربازە ناوی محمد شفیق مامەیە بانگی بکە چی دەوێت بۆی بکە.

٤- برایەکی دڵسۆز و خۆشەویستم هەیە ناوی (ئاغای حمەی حاجی)یە رەنگە هۆی سەرەکی ئەوەبووە کەهاتوومەتە ئێرە بزانە چی دەوێت کارەکانی ئەنجام بدە.

عمر هزاع گوتی: شتێکی کورت دەربارەی پۆلیسەکان دەزانم، بەڵام ئێستا باشت بۆ روونکردمەوە، بەیانی دادەبەزم شەرت بێت ناگەڕێمەوە تاکێشەکانیان بۆ چارەسەر نەکەم.

ئینجا ناردی بەشوێن برازاکەم لەبیمارستانی سوپا سەرباز بوو، لەگەڵ بەڕێوەبەری نەخۆشخانەکە عقید فلان هاتنە ژوورێ, داوای لێکردن دانیشن. برازاکەم ئەم هەڵوێستەی قبووڵ نەکرد، هزاع گوتی چیت دەوێ بۆت بکەم یەکسەر دی یتە لای خۆم, دەتەوێت لای بەڕێوەبەری نەخۆشخانەبیت؟ گوتی مراسلی ناکەم و ئینزباتیش بەمن ناکرێت، دەچمەوە شوێنی خۆم کەسەربازێکم. *(ئێستا محمد شێتە. کوری گەورەشی ٢٢ ساڵە، بۆ خۆی لەکۆڵانان دەخەوێت, بەتایبەتی لەقەڵادزێو رانیەو کۆیە دەژی، خەڵکی ئەم ناوچەیە دەیناسن، جار جار دەیبەنە حمام یان ماڵەوە دەیشۆنو بەرگی تازەی لەبەردەکەن).*

پاشان بانگی ئاغای حمەیحاجی کرد لی ی پرسی چیت دەوێ بۆت بکەمو ئیشت چیە؟ ئاغا گوتی: من بەڵێندەرم. هزاع گوتی: راوەستە, ئێوە راستگۆ نین هەموو بەڵێندەرێك خەریکی پارە کۆکردنەوەیە لەڕێگایەکی چەوتەوە, تۆ چۆن ئەم برا گەورەیەی منت دۆزیوەتەوە هێناوتە ئێرە, من دەسەڵاتم نیە بەرامبەری فەرمان بدە هەتاوەکو بۆت جێبەجێ بکەم. ئاغا گوتی ئیشێکم لەئەشغال وەرگرتووە کەئەوەندە

مەتر چوارگۆشەیە بۆیان بگوازمەوە، دەمەوێ فرقە کتابێکم بۆ بکات, لەو شوێنەی کەگلی لێ هەڵدەکەنن ئەمە لەدوارۆژدا دەبێتە چاڵێك زیانێکی گەورەی دەبێت بۆ بارەگای سوپا, ێگا نادەین هیچی دیکە گڵ لێرە هەڵکەنن و بیگوازنەوە بۆ شوێنێکی دیکە. عمر هزاع پرسی سوودی تۆ لەم کارە چەندە؟ گوتی مەتری وابزانم ٦٠ فلسە. عمر هزاع گوتی: هەر ئێستا کتابێك بکەن ئەم بەڵێندەرە چۆنی دەوێت ئاوا بۆی بنووسن تا بۆی ئیمزای بکەم، ابو بازیان بەخۆڕای ی نەبوو کەگوتم بەشی زۆری بەڵێندەرەکان ساختەچین.

***ئاغای حەمەی حاجی:*** خەڵکی سلێمانییە, ساڵی ١٩٦٦ کە لەسەر کوردایەتی گیرابوو توانیم بەری بدەم و ناسیاویم لەگەڵدا پەیداکرد وەکو برایەك، نیشتمانپەروەر، زیرەك، کاسب, شارەزابوو کەچۆن ملیۆن لەسەر ملیۆن دابنێت.

### تێبینی

*هەموو ئەو داوایانەی لەعمر هزاعم کرد رۆژانە بەتەلەفۆن ئاگاداری دەکردم کەئیمرۆ چی بۆم کردووە.*

زکیە اسماعیل حقی لەسەر داوای خۆی لەماڵەوە سەردانیم کرد, ئاگاداریکردم کەحبیب محمد کریم لەقاهیرەیەو دەمەوێت بچم بۆ لای سەردانی بکەم، چونکە لەبەر بارودۆخی ئێستای کورد دوای هەرەسەکە زۆر بێتاقەتە، گومان نییە لەرۆژگارێکی سەختدایە، پرسیاری لێکردم چ راسپاردەیەکت هەیە بۆی بەکورتی پێم بڵێ. گوتم: ئومێدەوارم هەرچۆنێك بێت لەقاهیرەو شوێنیتر بژی باشترە نەك بگەڕێتەوە, گەڕانەوەی نەمانە، بەعس جی ی متمانە نییە، رۆژێك دێت لەبەر ئەوەی سکرتێری پارتی بووە لەناوی بەرن.

مانگێکی نەخایاند حبیب گەڕایەوە, زکیە تەلەفۆنی بۆ کردم. بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی ئاگاداریکردم کەحبیب گەڕاوەتەوە، چاوت پێی بکەوێت. چووم و بەخێرهاتنەوەم کرد, دووبەدوو کەوتینە گفتوگۆ, خوشکە زەکیەش بەشداری بەشێك لەقسەکانمانی کرد. گوتم: ئایا زکیەخان ئاگاداری نەکردیت کەگەڕانەوەت مەترسی بەدواوەیەو بەعس هەروا بەئاسانی دەستت لێ هەڵناگرێت؟ چاوت لی یە وا لەسەر ستوونی کارەبای ماڵتان خەریکی ئەوەن تەلەکان چاك دەکەن؟ ئەوانەی ئەم کارە دەکەن کارمەندن لەئاسایشی گشتی، ئەوە (لاقیتە) دادەنێن کەگوی یان لەهەموو قسەو تەلەفۆنێکتان بێت. رادیۆکەم بەرزکردەوە تاقسەکانمان لەگەڵ رادیۆکە یەکبگرێت، ئینجا بەتورەی ی بەجێمهێشت.

گەلاوێژ خان خێزانی دارا تۆفیق هاتە ماڵمان گوتی دارا لەبەیروتە, دوای هەرەسەکە نەیتوانیوە لەئێران بمێنێتەوە. دارا وەڵامی بۆ گەلاوێژخان ناردبوو کەدەبێت چاوت بەرەفیق پشدەری بکەوێت کەئایا چی پەسەند دەکات, بگەڕێمەوە یان هەر لەبەیروت بم؟ گوتم: گەلاوێژ خان لەڕێگەی خزمەکەتان کاك نوری وەڵامم بۆ ناردیت کەڕەوانەی حاجی ئۆمەرانت دەکەن بەڵام تۆ گوتبووت کەمەترسیم لەسەر نییەو رۆژ نییە یەکێك لەئەندامانی (مجلس قیادة الثورة) تەلەفۆنم لەگەڵدا نەکات, من ماڵەکەم بەجێ ناهێڵم. دوای ی

بەو سوکایەتی پێکردنە خۆتو منداڵەکانت بەدیلی رەوانەی حاجی ئۆمەران کرایت، ئەمە شتێکی ناشیرینە، من دەمتوانی لەرێگەی تایبەتی خۆم بەسەلامەتی بتگەیەنم بۆ لای کاك دارا. ئێستاش هاتوویت دەڵی یت دارا تۆفیق لەبەیروتە دەیەوێت بگەرێتەوە بۆ بەغدا؟ من چی بۆ بکەم؟ گەرانەوەی لەسێدارەدانی بەدواوەیە چ ئێستا بێت چ دوای ١٠ساڵیتر بێت.

دوای ماوەیەك گەلاوێژخان ئاگاداری کردمەوە کەدارا تۆفیق گەرایەوە. چاوم پی ی کەوتو بەخێرهاتنم لێکرد. گوتی: چاپخانەکەم لای حکومەت دەستی بەسەردا گیراوە، ئەم چاپخانەیە هی خۆمە, زۆر مەمنونت دەبم ئەگەر بۆم وەربگریتەوە برِی ١٠٠٠ دیناریشت دەدەمێ. گوتم: دارا من پارێزەر نیم، ئیش بەپارە ناکەم، دەتوانیت بپرسیت هیچم نەکردووە هەتا باسی بکەم دەشتوانی بپرسیت ئەوەی کردوومە بۆ یارمەتیدانی خەڵك بووە، بەشێکیان پارەم داونەتێ پارەم وەرنەگرتووە، چاپخانەکەش هی شۆرشە, خۆ ئەگەر وەریبگرمەوە وا دەزانم بۆ خۆمی وەردەگرمەوە.

ساڵی ١٩٩٢ بەسەردان لەهەولێرەوە هاتمە سلێمانی، چوومە ماڵی خزمێکم (جەلال عبدالرحمن شرف), لەپڕ گەلاوێژخان بەسەردان هاتەلایان, پێم گوت: ئێستاش نازانم بۆچی دارات بەکوشتدا؟ بروا ناکەم ئەم سیاسەتمەدارە بەو ئاسانی یە هاتبێتە ژێر پەتی قەنارە.

**جەلال عبدالرحمن شرف:** ئەفسەر بوو، کۆی ی، ئازا، زیرەك، خوێندەوار، نیشتمانپەروەر، سیاسەتمەدار، لەبنەماڵەیەکی نیشتمانپەروەرو زانابوو، مامی (مەلا سدیق عبداللە) سەرۆکی
دادگای ناوچەی کەرکوك و سلێمانی و هەولێر بوو.

جارێکیان چوومە لای بدری خوشکم لەقەڵادزێ، دیتم خواردنێکی زۆر دروستکراوە کەسەرنجی راکێشام, پرسیم مەولودی پێغەمبەرە یاخود گەرەکێکتان دەعوەت کردووە؟ وەڵامیدامەوە ئەو خواردنە بۆ ئیستخباراتی سەربازی یە چونکە لێرە بۆتە نەریت کەچەند ماڵێك بەم شێوەیە خواردنیان بۆ دروست دەکەن. گوتم ئەمەیان لێ تێکدەدەم, ژەهریان بۆ دروست دەکەین، ئێوە ماڵە قەسابن چیتان لەوە داوە، ئەمانە دوژمنی کوردن, پیاوخراپو دزو ماڵوێرانکەری کوردن, کە بەسەردان دێمەوە بۆ ئێرەو دەیانبینم لێم دەپارێنەوە کەرۆژێك نانێکیان لەگەڵدا بخۆم, ئێستا بەتەلەفۆن ئاگاداریان دەکەمەوە دەڵێم ئێوارە بۆ نانخواردن لای ئێوە دەبم, دوای یش ناچم.

یەکێك لەسیخورەکانی ئیستخباراتی قەڵادزە زۆر بەگرژیو بەشێوەیەکی نابەجێ توانجی لەئافرەت دەگرت, بەنهێنی براو برازاکانم ئاگادارکرد گوتم دەرۆم بۆ کۆیە ئێوە لەم ماوەیەدا شەرێکی بۆ سازبکەنو دارکاری یەکی باشی بکەن. لەسینەما باشیان لێدابوو, کراسیان لەبەر درانـدبوو. کەئاگاداریان کردمەوە بەیانییەکەی هاتمەوە قەڵادزێ، پێش هاتنەوەم ئاشتیان کردبوونەوە، داوام لەبەشی زۆری پیاوماقوڵان کرد کەزۆر بایەخ بەپیاوانی ئیستخباراتی سەربازیو ئاسایش نەدەن، تکام وایە بەو شێوەیە رێزیان لێ نەگرن.

بەعس دەستیکرد بەگرژیو ئازارو ئەشکەنجەو دوورخستنەوەو گواستنەوەی خەڵك بۆ باشوور, ٤١ خێزانیان گواستەوە. لەسلێمانی بووم کەئەم دەنگوباسەم بیست, لەوێ چوومە ئاسایشی گشتی بەدوورودرێژی باسی سلبیاتی ئەم هەڵوێستەم کرد، گوتیان ئەم فەرمانە لای ئێمە دەرنەچووەو بەڕاستی دانانی ین, ئەمە لەسەرەوە کراوە، ئەمانە کوردایەتی دەکەن، خەڵك هاندەدەن، خەتەرناکن جەماوەر هاندەدەن، دواڕۆژ زۆر خراپە بۆ بەعس. لەگەڵ تایەری عەبە پشی بەیەکەوە چووینە بەغدا کاتێك گەیشتینە ئاسایشی گشتی, تایەر لەناو ئوتومبێلەکە مایەوە، یەکسەر چوومە لای بەڕێوەبەر. گوتم: لەسلێمانی بیستم کە ٤١ خێزانی کوردتان بۆ باشوور دوورخستۆتەوە، بۆ لەم بارودۆخەی ئێستا کاری وادەکەن کەڕوونی دەکەنەوە نیازتان بەرامبەر بەکورد خراپە؟ دوژمنانتان لەم کارە سوودبەخش دەبن‌ودژی بەعس پڕوپاگەندەی پێدەکەن, کاتێك ئەمەم بیست زۆر دڵتەنگ بووم، چونکە ئەمە لەنێوان بەعسو کورددا بڕوا ناهێڵێت, لەهەمووی ناخۆشتر بۆ من لەناو ئەو ٤١ خێزانەی کەدوورخراونەتەوە یەکێك لەوانە کەنزیکترین دۆستمە برایەکی دڵسۆزو خۆشەویستە, ئەمە بۆ من وەکو سووکی‌یەکی گەورەیە کە لەبەرچاوی خەڵك نەتوانم بەخزمەتی هەستم بەرامبەر رووداوێك کەئەویش زیان بەبەعس دەبەخشێ, لەهەمانکاتدا ماهیەتی من لەناو کورد کەم دەکاتەوە کەدەسەڵاتم نەبێت بۆ پووچەڵکردنی ئەم بڕیارە. گوتی: ئەمە بەفەرمانی مەکتەبی بەڕێوەبەری شمالە من هیچ دەسەڵاتێکم نی‌یە، بەڵام راپۆرتێك لەسەر ئەم ٤١ خێزانە بنووسە کەدوورخراونەتەوە, وەکو خۆی بۆت رەوانە دەکەمو گوتی خۆم بەدوورودرێژی باسی ئەم هەنگاوە پیرۆزەی تۆ دەکەم.

**تێبینی**

*تێگەیشتم کەدەستێکی گەورە هەیە لەناو بەعسدا دەجووڵێتەوە بۆئەوەی جەماوەری کورد ماهیەتی بەعس بناسێت.*

هاتمە سلێمانی چوومە ماڵی بەڕێوەبەری ئاسایشی سلێمانی (ابو ریم)، پێم ڕاگەیاند هەتا ئەم سێ کەسە بەرنەدەیت لێرە دەرناچم. لەژووری (ابو ریم) دانیشتم هەرسێکیان هێنانە ژوورێ بەو ناوەی کەوا بەربوون، گوتم لەخودا بەزیادبێت کەئەم ئامانجەم هاتەدی، کەدانیشتن دەستم بۆ حەمە سووری مینە عرب راکێشا گوتم: ابو ریم من زۆر قەرزداری ئەم پیاوە مەزنەم, ئەوە مامۆستامەو زۆر شتی لێوە فێربووم، ئەمە نیشتمانپەروەرو دڵسۆزە، لەهەموو روویەکەوە شایانی باسکردنە، هەروەها لەناوچەکەی ئێمە زۆر ناسراوە، لەکۆتایی چلەکاندا, کە ١٦ ساڵان بووم رێگای نیشاندام, ئێستا ناوبراو وازی لەسیاسەت هێناوە، بەڵام منی تووشکردووەو ئێستا لەخزمەتی بەعسدام. ئینجا دەستم بۆ حاجی کاکەڵڵا راکێشا گوتم: پیاوێکی کاسبە، دۆستێکی دێرینی باوکم بووە, هیچ پەیوەندی بەسیاسەتەوە نی‌یە، بۆی هەڵبەستراوە. سێهەمیان

ئاغا غفوری نجیمە هەتا بۆی کراوە خراپەی ئێمەی کردووە کەچی ئەوەتا من دەبمە هۆی بەردانی ئەگینا ١٠ تا ١٥ ساڵ حوکم دەدرا، بەڵکو لەمەولا خراپە لەگەڵ کەس ناکات. لەهەمانکاتدا عەلی حسن ئاغای سەرۆکی هۆزی مەنگوڕ خاوەن دێی شەروێتە، لەگەڵ بایز ئاغای برای گیرابوو، ئازارو ئەشکەنجەیەکی زۆریان دابوون توانیم بەریانبدەم.

**عەلی حەسەن ئاغا:** سەرۆکی عەشیرەتی مەنگوڕە, هۆشمەند, زیرەك, دەوڵەمەند، قسەخۆشەکانی بەشێکی زۆری خەڵك لەبەریکردووە. جارێکیان محەمەد زەمام کاربەدەستی بەعس لەسلێمانی دەچێتە گوندەکەی قسە بۆ دانیشتوانی دێ دەکات دەڵێت ئێمەی بەعس بەم جۆرە خزمەتی ئێوە دەکەین بەتایبەتی جوتیارو ئاژەڵدارەکان، حەوزێکتان بۆ دروستدەکەین مەڕەکانتان ساڵی دوو جار دەخەینە ناو حەوزەکە تا پاك ببنەوەو نەخۆش نەکەون، ئەو داربەڕووانەتان بۆ دەکەینە فستق, جۆری توتنەکەتان دەگۆڕین، بەجۆرێك بارودۆخی ئێوە دەگۆڕین کەجێگەی سەرسوڕمان بێت. عەلی حەسەن ئاغا ئەم فشەو درۆیەی محمد زەمام بەشێوەیەکی تر باس دەکات، کاتێ قائمقامی قەڵادزە وەکو خۆی پێنیشان نادات، واتە وشەکان وەکو خۆی دانی پیادا نانێتو هەڵیدەگێڕێتەوە، لەگەڵ خۆم بردمە لای بەڕێوەبەری ئاسایشی سلێمانی، بەتەلەفۆن داوام لەمحمد زەمام کرد، هاتە لامانو قسەکانی خۆیم گێڕایەوە کە لەدێی شەروێت سوخنرانیت کردووەو عەلی حەسەن ئاغا وەڵامی داویتەوە. وەکو خۆی قسەکانی عەلی حەسەن ئاغایان پێ نەگوتبوویت, ئەمە راستی‌یەکەیەتی. عەلی ئاغا دەڵێت: پیاوێك لەگوندەکەی ئێمە لەگەڵ دایکیدا دەژیا، ژنی نەهێنابوو ناوی نەبی بوو, خەڵکی گوندەکە چەندجار ئاگاداری دایکی نەبی یان کردبۆوە کەدەچن بۆ دارهێنانو گەڵای بەڕوو هەرچەندە نەبی کەرێکی پێدەبێت خۆشی باری دووکەر دەخاتە کۆڵی، رۆژێکیان نەبی ناگەرێتەوە دایکی دەست دەکات بەشیوەنو گریان خەڵك دەچنەوە شاخ بەیانی‌یەکەی دەیدۆزنەوە، کەبارەکەی لەکۆڵ باردەکا هەڵناسێتەوە تا گوو بەخۆیدا دەکات. عەلی ئاغا گوتبووی دەترسێم بەعسی‌یەکانیش بارەکەیان ئەوەندە قورس بێت رۆژێك بێت ئەوانیش گوو لەبن خۆیان بکەن. بەداخەوە علی ئاغا کۆچی دوای یکردووە دەنا پێم دەگوت قسەکانت راست دەرچوو.

**حەمەی مەلاشەریف:** کوێخایەکی مەنگوڕە، خاوەن دێی سورەگوڵێیە، نانبدە، ئازا، پیاوێکی شێنێ ی ی لەسەر زەوی کوشت، لەو کاتەشدا کەس چەکی پێ نەبوو، ئەوەی مابووشی لەماڵێ شاردبوویەوە، یان لەژێر گڵ. پۆلیسو سیخوڕو ئیستخباراتی قەڵادزەو ڕانیە کون بەکون بەشوێنیدا دەگەڕان بۆئەوەی بەزیندووی ی بیگرنو لەشاری سلێمانی لەسێدارەی بدەن. وای لێهات خەڵك بەنهێنی یارمەتی بدات، بوو بەبنێشتە خۆشەی بن دانی خەڵکی، هەتاوەکو دەهاتمەوە قەڵادزێ ئەم باسەیان بۆ دەکردم گەیشتمە ئەوەی بایەخی پێ بدەم. رۆژێکیان منو مامۆستا مەلامحەمەد دەڵگەی ی دووبەدوو باسی بارودۆخی ئێستای میللەتی کوردمان دەکرد کە لەدوای هەرەسەکەوە ئەمە یەکەم جارە پیاوێك لەسەر پیاوکوشتن رووبکاتە شاخو بەم جۆرە خەڵك

ڕۆژانە باسی بکات, لەکاتێکدا هیچ پەیوەندییەکی بەسیاسەتەوە نەبێت، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو برا ئازیزەم گوتی مانی حەمەی مەلا شریف سوودمەندە, ئێستا سیخوڕو پیاوەکانی بەعس هەوڵی کوشتنی دەدەن، جا ئەگەر بتوانیت ڕزگاری بکەیت سوودی دەبێت, ماوەیەك لەمەوپێش منیشیان راسپارد لەگەڵ چەند کەسێکیتر بچین بیهێنینەوە، منیش بەنهێنی وەڵامم بۆ دەنارد کەئێمە نەبینێت چونکە حکومەت نیازی خراپە. گوتم مامۆستا ئەوە پیلانێکی ئێجگار ڕێکوپێکی دەوێت.

**مەلا محەمەد دەڵگەی ی:** خەڵکی پشدەرە, لەبنەماڵەیەکی ناسراوی ئاینییە، سیاسەتمەدارێکی کوردە، خوێندەوار، زیرەك، ئازا، پاك، نیشتمانپەروەر، دڵسۆز بۆ نیشتمانەکەی، لەلایەن بەعسەوە گیرا, ئازارو ئەشکەنجەیەکی زۆر درا.

بۆ مەسەلەی حەمەی مەلاشەریف چاوم بەقائمقامو ئاسایشو ئیستخبارات هەروەها ڕێکخراوی بەعس کەوت لەقەڵادزێ، هەروەها بەڕێوەبەری ئاسایشی سلێمانیو پارێزگاری سلێمانیو ئیستخباراتی سلێمانی. باسی حەمەی مەلاشەریفیان لەگەڵداکردم، بەدووروودرێژی لەو هەوڵانەیان ئاگاداریان کردمەوە کە بەنهێنی یان بەئاشکرا بۆ ئەم مەسەلەیە داویانە. ڕاپۆرتێکم دەربارەی، ئاراستەی مەکتەبی کاروباری شمال کرد, نووسیم: دوای هەرەسەکە ئەمە یەکەم ڕووداوە لەناوچەی قەڵادزەو ڕانیەو دەڵێن لەسلێمانیش، کەدەڵێن چەکدارێك بەخۆیو کوڕەکانی، کەژمارەیان هەر ١٠ کەسە، ڕووبەڕووی حکومەت ڕاوەستاونو هەتا ئەم سەعاتە کاربەدەستانی پارێزگای سلێمانیو ئاسایشو ئیستخباراتی سەربازیو هەموو ڕێکخراوەکانی بەعس, نە بەگرتن نە بەکوشتن هیچیان بۆ نەکراوە, ناویان ناوە کوێخا رینگۆ, دەڵێن حەفتا هەزار پێشمەرگە هەرەسی هێنا وا خەریکە ئەم ١٠ کەسە بچنە چاوی حکومەت. فەوجێك پۆلیس بەیاریدەدانی سریەیەك سەرباز شاخی قەندیل دەپشکنن, ئەویش شەوو ڕۆژ لەو بەرد بۆئەم بەرد رادەکاتو خۆی دەشارێتەوە بەڵام ناگیرێت, جار جاریش تەقەیەك دەکات. ئیتر گولەی ئەوە یان هی ناوخۆیە کەپۆلیسێك یان سەربازێك زامدار دەبێت. من وای بەباش دەزانم ئەمە بەم شێوەیە بمێنێ مەترسی یەکی گەورەیە, بەهێزی سەربازی چارەسەر ناکرێت چونکە شوێنی دیاریکراوی نییە، خۆی بەدەستەوە نادات, شەوانیش گروپەکەی لەم دێ یان ئەو دێ دەحەوێنەوەو بەڕۆژیش لەشاخ خۆی دەشارێتەوەو بەدووربینیش چاودێریی پۆلیسو سەرباز دەکات. بەهۆی ئەوەی لەناو گەنجاندا باس دەکرێت کەمرۆڤێکی ئازایە ئاگای لەهەموو شتێکە، ئەگەر فەرمانتان لەسەربێت من لەڕێگای خۆمەوە دەچم بۆ دیتنی بزانم ئەمە چییەو چی دەوێت؟ ئەو کاتە بەگوێرەی واقیعەکەو هەڵسەنگاندنی مەسەلەکە دەتوانم ڕاستییەکانتان بخەمە بەرچاو، ئێستا گەلێك ئاسانترە لەبەیانی بەمەرجێك ئەگەر ئەمە سەر بەدەرەوەی وڵات نەبێ، چونکە پڕوپاگەندە هەیە گوایا لەدەرەوەی وڵات (ئێران) یارمەتی دەدرێت.

ئاگاداریـان کردمــەوە کەصـدام داوات دەکـات. لـەکاتی دیـاریکراودا چـوومە خزمـەتی، دوای بـەخێرهاتنم فــەرمووی کــارێکم پێتــە. گــوتم ئاخرزەمانــە, جــەنابی (سـید نائـب) کــارێکی لای منــە. گــوتی: ئینـشائەڵڵا جێبەجێـدەبێت. گـوتم: ئینـشائەڵڵا. گـوتی: دەمـەوێت لەگـەڵ منـدا کـار بکـەیت. گـوتم: بـبم بەشـۆفێر یـان پاسەوانی تایبەتی؟ گـوتی: شـۆفێرو پاسـەوانم بۆچـی‌یە؟ دەمـەوێت لەگـەڵ خـۆم ئـیش بکـەیت. گـوتم: مـن کوردم، کاتی خۆی پێشمەرگە بووم، موخابەراتی دەوڵەتە ئیقلیمی‌یەکان ناوم دەزانن، ئایا ئەمە نابێتـە هـۆی ئەوەی پێستم پچێتە دەباخانە, ئایا دەمپارێزیت؟ گوتی: دەتپارێزم.

کەهاتمە دەرەوە لەخۆشـیدا دەسـتمکرد بـەگریان، بـەخۆمم گـوت رەفیـق تائێـستا لـەرێگای بەڕێوەبـەری ئاسایشی گشتی یان وەزیری ناوخۆ یـان ئیـستخباراتی سـەربازی راپـۆرتێکم دەگەیانـدە لای (سـید نائـب)، ئێستا شکور بۆ خـوای گـەورە دەرگـای راسـتەوخۆم بـۆ کرایـەوە کـەبتوانم خزمـەتی کـورد بکـەم. بـەجۆرێك دڵخۆش بووم وامزانی هەموو دونیا هی منە.

دوای ١٥ رۆژ ئاگادارکرامەوە کەبۆچوونەکانت دەربارەی چۆنیەتی گفتوگۆکردن لەگەڵ حەمەی مەلا شـریف هەمووی پەسەندکرا. لەگەڵ شەفیقو حەسەنی بـرام چـوومە لای کوێخـا قـادرو کوێخـا خـدر کـەخزمی نزیکـی حەمەی مەلاشەریفن‌و دۆستو ناسیاوی بنەماڵەکەمانن، ١١ ڕۆژ لەو شاخ بۆ ئەم شاخ دەگەڕاین چ بـەپێ، یـان سواری ئێستر تاوەکو چاومان پێ بکەوێت، هەندێك جار هانیانـدەدام کەبگەڕێمـەوە. شـەوی ١٣/١٢ی مـانگی نیسانی ١٩٧٦ لەکەناری شاخی قەندیل لـەژوورێکی تاریـك چـاومان بەیـەکتر کـەوت، مـن‌و دوو براکـەم، ئـەوو کوڕەکەی، پێنج کەس بووین. لەبارودۆخێکی یەکجار ناخۆشدابوو لەهەموو روویەکـەوە, نەیـدەتوانی دۆسـتو دوژمن لەیەك جیابکاتەوە، متمانەی زۆرکەم بوو, تـەنها بـاوەڕی بـەو چـەند کەسـەبوو کـە لەگەڵیـدا دەژیـان. دوای گفتوگۆیەکی دوورودرێژ پێم گوت دەتەوێت رۆژێك لەرۆژان خەڵك دەستت بـۆ درێـژ بکـەن‌و بڵـێن ئەمـە یەکەم کەس بوو کە لەدوای هەرەسەکە چەکی هـەڵگرت، ئینجـا خـەڵك لەناوچـەی پـشدەرو ئـاکۆ بەپیرتـەوە بێن؟ ئەگەر قسەم ئاشکرا ناکەیت ئەوە بەقورئان‌و تـەڵاق سـوێندت دەدەم، ئینجـا رێگـات بـۆ دادەنـێم کـە بەبێ من هیچ شتێك ناکەیت. گوتی: من یەکەم جارە تـۆ دەبیـنم، باوکـت بـاش دەناسـم و شـەفیق وحەسـەن باشتر، وا چەکەکەم دادەنـێم، بمکـوژە یـا تەسـلیمم بکـەوە بەحکومـەت, چـیت دەوێـت بیکـە, چـی بکـەیت ئامادەم, توانای ئەم ژیانەم نەماوە. گوتم: هەرکەسێك بەناوی منەوە نامەی بۆ هێنایت لیـی وەرمـەگرە، بڵـێ من نەخوێنـدەوارم, هەرکەسـێك بـەناوی منـەوە شـتێکی پێـت گـوت وەرە قـەڵادزێ یـان رانیـە، بەقسەی نەکەیت، هەتا ئەگەر خۆم یان حەسەن‌و شەفیق هـاتن لەئێستا گـەلێك زیـاتر ئاگـات لـەخۆت بێـت. ئەوانـەی هاتوچۆیان کردوویتو ئەوانەی لەماڵیان بوویت حکومەت دەیزانێ, بەڵام داوای حکومەت ئەوەیـە بەزینـدووی ی بتگرن‌و لەسلێمانی لەسێدارەت بدەن، لەدوای خۆم تەنها بـاوەڕت بەمامۆسـتای دەڵگـەی ی‌و کوێخاقـادرو کوێخاخدرو شەفیقو حەسەنی برام بێت، ئەمانە جێی باوەڕن، بەڵام وریابە کەدێن با کەسیان لـەدواوە نـەبێت

نەبادا بتکوژن، سەعات ٨ی شەو چ کوێخایەکی مەنگوڕی ناوچەکە خزمەتی نەکردوویت یان خراپەی کردوویت بۆم دەستنیشان بکە.

ناوی کوێخایەکی گوت. هەمان شەو وەڵامم بۆ ئەو کوێخایە نارد کەسبەی نیوەڕۆ بۆ نانخواردن میوانی دەبم و ٢٠ کەسم لەگەڵدایە، چاوەڕوانم بن. بەیانی سەعات ٩ گەیشتمە دی ی ناوبراو، سەعات یانزەش حەمەی مەلا شریف بەخۆیو جەماعەتەکەی بەرەو دێ هاتن، یەکسەر دانیشتوانی دێ سەریان سوڕما ئاوا بەئاشکرا رووەدەکاتە ئاوەدانی, بەپیریەوە چووم دەستمان خستە ناو دەستی یەك, چووینە سەربان بەیەکەوە هەڵوەستاین، گوتم: ئەوەی رێز لەم پیاوە بگرێتو میوانداری بکات ڕێز لەحکومەت دەگرێت، ئەمە حەمەی مەلا شریفە، پیاوێکی ناسراوی ناوچەکەیەو جیّ باوەڕی حکومەتە, خەڵکینە ئێوەو ناوچەکە من باش دەناسن، من لەسەر فەرمانی جەنابی صەدام هاتووم، ئەم پیاوە مەزنە بۆی هەیە بەچەك بسووڕێتەوەو هاتوچۆ بکات تەنها بۆ ئەو قەدەغە نیە کەچەك هەڵگرێت.

نمەنمە باران دەباری, پاڵتۆکەم شتێکی زۆرنایاب بوو جگەلەوەی جەنابی شێخ باباعلی شێخ مەحمودی نەمربوو، زۆر لام بەنرخ بوو کەپاڵتۆی ئەم زاتە ببەخشم، لەبەر حەمەم کرد، ئینجا هاتمە بارەگای پۆلیس لەگوندی سورەگوڵیّ دی ی حەمەی مەلاشریف، لەوێوە بروسکەیەکم ئاراستەی مەکتەبی (کاروباری شمال) کرد کەکوێخا حەمەی مەلا شریفم دی و گفتوگۆمان کردو سەرکەوتوو بووم، بەئەفسەرو پۆلیسی گوندی سورەگوڵێم گوت: لەگەڵ دانیشتوانی دێیەکە زۆر ناشیرین جوڵاونەتەوە, ئەمە ڕێبازی بەعس نیە, ئازارو ئەشکەنجەیەکی زۆری خەڵکتان داوەو لەگەڵ ژنانی ئاوای ی ناشیرین جووڵاونەتەوە.

گەڕامەوە بۆ بەغدا, راپۆرتێکم نووسی کەحەمەی مەلا شریف هیچ پەیوەندییەکی بەدەرەوە نیە، ئێرانی یەکان ویستوویانە رایکێشن بۆ لای خۆیان بەڵام بەهیچ جۆرێك چاویان پێنەکەوتووە، پیاوێکی سیاسی نی یە، کاسبی ماڵی خۆیەتی. پێم ڕاگەیاند تۆ چۆن بە ١٠ چەکدارەوە دەتوانیت بەرەنگاری بەعس راوەستیت؟ لەئەنجامی گفتوگۆ ملی کەچکرد، دەبێتە یەکێك لەدڵسۆزەکانی بەعس، دواڕۆژ دەبێتە پاسەوان, ئێستا هەنگاو بەهەنگاو لێی پچینە پێشەوە، لەدواڕۆژدا وادەکەین بگاتە بەردەمی دادگا، بەڵام ئێستا با وەکو خۆی بمێنێتەوە, لەفلان دی یە, قسەم بۆ خەڵك کرد کەئەمە دڵسۆزێکی بەعسەو لەم رووەوە سەربەستە.

ئەوانەی رۆژانە ئاگاداری ئیستخباراتیان کردووە کەچۆن چۆنی بجووڵێنەوەو ئامادەن بیکوژن، هیچ کامێکیان ڕاستیان نەکردووە, ڕۆژانە ئاگاداری حەمەی مەلا شریفیان کردووە.

رەئی مەکتەبی شمال: بەهەموو بڕیارەکانم رازیبوون داوایان لێکردم دەبێت ئەمەش بکەیت کەهەنگاوت بۆ نەناوە، (صلح العشائر) لەنێوان حەمەو کەسوکاری کوژراو، ئاشتبوونەوە بکرێت.

**تێبینی**

*١- وابڵاوبۆوە کە ڕەفیق پشدەری ئەمەی بەپیلان کردووە بۆئەوەی حەمەی مەلا شەریف بەکوشت بداتو پارەی پێ وەربگرێت.*

*٢- تەنها کەمال و حەسەن و شەفیقی برام و مەلا دەڵگەی ی و عمر دەبابە و عەلی عەسکەری و دکتۆر خالد حمەسعیدو ئیبراهیمی حەمەخورشەو ئەنوەری جەمیل بەگی جاف و حەمەسووری مینەعرب و بابکرئاغاو ئەمانە ڕاستی یەکەیان دەزانی کەمەبەستی من ئەوەیە دوارۆژ هێزێکی چەکدار هەبێت کەبریتی بێت لەبنکەیەکی پێشمەرگە.*

دیسان هاتمەوە قەڵادزێ، چاوم بەحەمەی مەلاشریف کەوت, وامکرد مانگانە بڕی ٢٠٠ دیناری بۆ ببڕنەوە بەناوی ئەوەی وەکیلی ئەمنە، هەروەها چاوم بەکوێخا خدری شێنێ کەوتو بۆ ئاشتبوونەوە بڕێك پارەم بۆ سەرفکردن. باشم لەبیر نیە ئایا ١٥٠ دینار یان٢٠٠ دینار بوو، قاتێك جلیشم بۆ کوێخای شێنێ کرد.

شایەنی باسە لە١٩٧٦/٩/١٤ کەموخابەرات گرتمیان، ئیتر لەیەك دابڕاینو بەهیچ شێوەیەك ئاگاداری دەنگوباسی نەماوم.

**دێی شێنێ:** دانیشتوانی ئەو دێیە بەشێنێی ی ناودەبرێن، واتە ناوبانگی هۆزەکەیان بەناوی شێنێی ی رۆیشتووە وەك چۆن دەڵێن هۆزی جاف یان هۆزی هەرکی. وردە وردە دانیشتوانی ئەودێیە لەبەرئەوەی زەوییەکەیان تەلانە بەو شێوەی کەزیاد دەکەن جی ی هەموویان نابێتەوە، کەم کەمە ڕوودەکەنە ناو هۆزی مەنگوڕو مامەشو سوێسنی، چ لەکوردستانی عێراق چ کوردستانی ئێران. بەڕاستی لەهەموو ڕوویەکەوە شایانی باسکردنن, ڕۆشنبیرانو شاعیرەکان چەند بنووسن لەسەر شێنێیی هەر کەمە، چونکە نیشتمانپەروەرو فیداکارن، یەکەم ناوچەیە حکومەت نەیتوانی دەستی بەسەردابگرێت بۆ ڕاگوێزانی. شێنێ دەروازەی شۆڕشی نوی یە کەدەستی پێکردووە، دەنگوباسی جەنەراڵ بەفر زۆر لەشوێنان باس دەکرێت، بەڵام دەوری هەرە گەورە لەو فیداکارییەدا کەشێنێ هەیبوو, لەپاڵ ئەوەشدا ئەو بەفرەی باری سوپای عێراقی چەواشەکرد.

## گەشت بۆ بەیرووت

لەمانگی تەموزی ١٩٧٦ بەو ناوەی کەپێویستم بەپشوودانەو لەو هاتوچۆیانەدا ماندوو بووبووم چووم بۆ بەیرووت. هەرکە گەیشتمە بەیروت تەلەفۆنم لەگەڵ مامۆستا ابراهیم احمد کرد کەئەوە ناونیشانمەو دەمەوێت لەڕێگای خۆتەوە ئاگاداری مام جەلال بکەیتەوە کەهاتنم بۆ ئێرە بۆ بینینی بوو, جگەلەوەی بەتەواوەتی جێگاکەیم نەدەزانی ئەگێنا لە بەغداوە دەچوومە ئەو شوێنەی ئەوی لی یە.

دوای ٢٤ ڕۆژ بەسەر تەلەفۆنەکەدا، ئێوارەیەك تەلەفۆنەکەم هەڵگرت بەدەنگ یەکترمان ناسیەوە، مام جلال گوتی بێ دواکەوتن هەرئێستا وەرە بۆ ئەم ناونیشانە، چاوەڕوانتم، ئەگەر دوابکەویت نامبینی. چووم

بۆ شوێنی دیاریکراو, زۆرم چاوەڕوان کرد، ماندووبووم ئەوەندە ڕاوەستام، دۆندرمەیەکم خواردو دانیشتم، لەپڕ دوای ماوەی ٤٠ دەقیقە بەئوتومبێلێکی بیجۆی سپی، بەژمارەیەکی سوری ڕاوەستا، دەرگا کرایەوەو منیان سوارکرد, لەم شەقام بۆ ئەو کۆڵان ڕۆیشتین کە لەژێر چاودێری ئوتومبێلی دیکەش بوو, دوای ئەوەی بڕوایانکرد کە بەتەنهام چووینە شوێنێکی تایبەتی دووبەدوو دانیشتین دەستمانکرد بەگفتوگۆ، پرسیم ئەرێ مام جەلال ئەم هەموو گەڕانو هاتوچۆیە چی بوو بەمنتان کرد؟ منت بەپەلە هێنا خۆشت دوای ٤٠ دەقیقە هاتیت. گوتی: لەو ڕۆژەی تەلەفۆنت کردووە مامۆستا ابراهیم احمدو برادەران باسی ئەوە دەکەن کەڕۆیشتنەکەت خەتەرناکە، راستە رەفیق پشدەری ناتکوژێت، بەڵام حکومەت ناردوویەتی لەهەمانکاتدا هەردووکتان بەیەکەوە دەکوژن.

هەموو گفتوگۆی ئەو دانیشتنەم بەباشی لەبیرنەماوەو پێویستیش ناکات هەمووی بنووسم، بەڵام دەتوانم بڵێم هەزارویەك پرسیاری لێکردم، منیش لەیەکەم خاڵەوە لەدوای هەرەسەکەوە بۆم کورتکردەوە:

١–پێویست ناکات لەخۆبای یبوونی بەعس لەهەموو ڕوویەکەوە بەدرێژی باسبکەم، دکتاتۆریەتی صدام لەهەموو دکتاتۆرە ناسراوەکانیتر زیاترە، دەتوانم بڵێم لەو رووەوە لەپێش هیتلەریشەوە.

٢–بەشی زۆری ئەو کوردانەی گەڕاونەتەوە خۆیان تەسلیم بەبەعس کردەوە، بەراپۆرتی دووردرێژ هەموو زانیاری یەکیان خستە سەر کاغەز تەسلیم بەکاربەدەستانی بەعسیان کرد (لەخودا بەزیادبێت) ٩٨٪ ی ئەو راپۆرتانە نەخوێندرانەوەو پشتگوێ خراونو وا تێگەیشتوون کەئیتر تەنگوچەڵەمەیەك نییەو نابێت پێی بڵێن کێشەی کورد هەیە.

٣–دوای هەرەسەکە، ئەوانەی شانبەشانی حکومەت وەستابوون، چ سەرۆکی هۆزەکان یا حزبە سیاسییەکان یا پیاوە ناسراوەکانی کورد، ئێستا بەهیچ جۆرێك بایەخیان پێنادەن.

٤–بەشێوەیەکی ئەوتۆو ناشیرین تەماشای کورد دەکەن کەهاوڵاتی دووەمەو هەندێ جار سێهەمە. چۆن کاتی خۆی پێش سەد ساڵ جیاوازی لەنێوان سپی پێستو رەش پێست کراوە لەئەمەریکا، بەعسیش بەهەمان شێوە تەماشای کورد دەکەن، بەڵکو کەمتریش، کورد خاوەن ماڵ ودارای یو خێزان نییە.

٥–هەڵوێستو رەفتاریان باسناکرێت. لەیەکەم ڕۆژی هەرەسەکەوە بەتەقدیری خۆیان وا تێدەگەن کە ٩٠٪ی کوردیان لەگەڵدایەو ٨٠٪ی هاتۆتە ریزی بەعس، ئیتر بەئاشکرا ڕای خۆیان دەردەبڕن، دەڵێن: مەحاڵە جارێکیتر شۆڕش رووبداتەوە.

بەمام جەلالم گوت: لەم بارودۆخەی ئێستا ئاشکراو روونە کەشۆڕش ئەمجارە دەست پێبکاتەوە بەهێزترین شۆڕش دەبێت. هەروەها لەناو دەزگای سەرۆکایەتی بەعسدا زۆر شت دەکرێت کە بەهیچ جۆرێك لەبەرژەوەندی ئەواندا نی یەو هەر فەرمان بەناوی (مجلس قیادة الثورة)وە دەردەچێت، ئینجا نازانم شۆڤێنییەکەیانە، یان دەستێك هەیە پی یان دەکات. مام جلال پرسی: هۆی چییە بەم شێوەیە تۆ پەلەی

گەڕانەوەی ئێمەتە؟ گوتم: من لەڕاست خۆمەوە ئیتر چی دیکە توانای ئەم هەموو سیاسەتە شۆڤینی یەی بەعسم نىیە، توانام نەماوە هیچیتر بەدەمیانەوە پێبکەنمو بەدرۆ بلێم راست دەکەن. بۆ ئاگاداریت لەو رۆژەی شۆڕشم بەجێهێشتو هاتوومەتەوە پاڵ حکومەت بەهیچ جۆرێك بەم شێوەیەی ئێستا رێزم لێنەگیراوەو دەسەلاتم وا بەهێز نەبووە، دەتوانم بلێم هەرچیم بوێ بۆم دەکەن، صباح میرزا و بارزان تکریتی گوتیان خۆزگەم بەخۆت کەبەم جۆرە دەسەلاتت هەیە. دوو کەس نەبێت بکرو صدام بەکات دەچمە لایان، دوای ئەوان هەموو وەزیرەکانو کاربەدەستان بەبێکات دەتوانم بیانبینم، چیم دەسەلات بێت کردوومە لەهەموو جۆرە یارمەتییەك، ئینجا هەندێکیان پارەشیان دەدەمێو یارمەتی لەکەس قبووڵ ناکەم، بەلام من ئێستا بەختەوەر نیم کەدەبینمو ئاگادارم کەبکرو صدام چ پیلانێکیان بۆ نەمانی کورد بەدەستەوەیە. مام جلال گوتی: ماویەتی، با یەکلا بێتەوە، هێشتا خەڵك باشیان ناناسێت، باهەموو کورد لەبەعس شارەزابێت. هەروەها گوتی: ئێمە وا حزبێکی سیاسیمان بەناوی یەکێتی نیشتمانی کوردستانەوە دامەزراندووە، ئێستا لەسوریا مەشق و ڕاهێنانی سەربازی دەکەین بۆ ئامادەبوونو گەڕانەوە بۆ وڵات، بەلام یەکەم: تۆ ئەم کارەم بۆبکە هەرچەندە ئیشوکاری تایبەتی من ناکەی. دووجار دووبارەیکردەوە کەئامۆژگاری صدام نەکەی. گوتم: مەترسە ئەو کەری دێزەیەو ئامۆژگاری کەس قبولْ ناکات، هەتا هی من قبولْ بکات. گوتی: حەز دەکەم بەیەکەوە سەرێکی سوریا بدەین, لەگەڵ من بەم ئوتومبێلە بەهیچ جۆرێك داوای پێناست لێناکەن. گوتم: خۆشم پێم خۆشە، بەلام ئەمە زۆر جی ی مەترسی یە. هەروەها پێم گوت: هەلۆێستی ئێوە تێگەیشتم، خۆشحاڵی خۆم دەردەبڕمو من لەئێستاوە ئامادەمو هەموو فەرمانەکانتان لەسەرچاو دادەنێم. ئینجا گوتم: پرسیارێکم هەیە: چیت پێ سپاردووم دلْنیابە ئەنجامی دەدەم, بەلام ئایا ئیتر بەیەکجاری بەگژ بەعسدا دەچنەوە؟ هیچ مەجالێکی تێدا نىیە ئاشتی بێتە ناوەوە؟ چونکە من زۆر بەئاسانی دەتوانم رووبەڕوو لەگەڵ صدام قسە بکەم، رێگام پێدەدەیت لەم خاڵە بجوولێمەوە؟ تکام وایە بەگەورەی ی خۆت بمبەخشیت. گوتی: کەی ئەمە بەشەڕ تەواو دەبێت؟! دوارۆژی هەر گفتوگۆیە، بەلام لەصدام زۆر دوورە دان بەمافی کورددا بنێت.

گەڕامەوە بەغدا, چاوم کەوت بەعەلی عەسکەری, عمر دەبابە, دکتۆر خالید, مسعود محمد, محمد حاجی طاهرو عەلی مام رەزا.

مەسعود محمد دوای ئەوەی دووبەدوو لەماڵی خۆیان لەبەغدا بەدوورودرێژی قسەم بۆ کرد گوتی: لەلایەکەوە خۆشحاڵی خۆم دەردەبڕم کەبتوانم لەم ڕووەوە خزمەتێك بکەم بۆ نیشتمانەکەم، بەتایبەتی لەم بارودۆخەی ئێستادا, دەتوانی بەزووترین کات بچیتەوە بەیروت چاوت بەمام جەلال بکەوێت؟ گوتم: من زۆر بەئاسانی دەتوانم کەی بمەوێت سەفەر بۆ دەرەوەی وڵات بکەم، بەلام مەبەستت چىیە لەسەفەری منو بەم پەلەیە؟ گوتی: دەمەوێت بەزووترین کات چاوت بەمام جەلال بکەوێت. گوتم: کاتێك گەیشتمە بەیروت

لەڕێگەی مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەدەوە ئاگادارمکردو دوای ٢٣ رۆژ ئینجا مام جلالم دی, ئاسان نیـیە مـرۆڤ بچێتە دەرەوەی ولات رووبەروو لەگەڵیدا دانیشێت، بەلام دەتوانم ڕاسپاردەکەت وەکو خۆی بگەیەنم. گوتی: دەمەوێت پێی بڵێی ئەم شۆڕشە هەڵنەگیرسێتەوە، چونکە شۆڕشێك بەناوی ئەوەوە رووبـدات کوڕانی مەلامستەفا لێی

تێکدەدەنەوە. گوتم: بۆ ئاگاداریت کوڕانی بارزانی ئاگادارن.

لەگەڵ عەلی عەسکەریش لەبەغدا، لەدوکانێکی بەرگدروو (ابو صابر) لە(شارع النهر) دووبەدوو دانیشتین، بەدوورودرێژی باسی مام جەلالم بۆکردو هەموو ڕێبازی حزبی نوێم بوو کە(یەکێتیئیشتمانی کوردستان)ـە بۆ گێڕایەوە. لەهەمانکاتدا شێخ سالارو شەفیقی برام لەدوورەوە دانیشتبوون، لەم وتوێژە ئاگادار نەبوون. عەلی عەسکەری خۆشحالی دەربڕیو بەجۆرێك گەشایەوە گوتی لەخۆشیان قاچم عەرز ناگرێت, چاوەڕوانی ئەم رۆژەم دەکرد.

عمر دەبابەش کەچوومە ماڵەوە بۆ لای دووبەدوو بۆم باسکرد کەوتە خۆشیو شادیو گوتی بەڕاستی رووداوێکی گرنگە بۆ هەموو گەلی کورد، (ان شاء الله) چیمان پێبکرێت لەم ڕێگا پیرۆزە ئەنجامی دەدەم.

دکتۆر خالید حمەسعیدیشم لەبیمارستانی (شەمماعیە) دیت، کەبۆم باسکرد سەری سوڕماو ئاگادارمکرد کەچاوم بەوبرایانە کەوتووە. محمد حاجی تاهیریش هەروەکو برادەرانی دیکە دەقی رووداوەکەم بۆ باسکرد، گوتی: ئێمە تەمەنێکە لەگەڵ مام جلال یەکتر دەناسین انشاءالله پاڵپشتی دەبم چونکە ئەمە سەرکەوتنە بۆ گشت گەلی کورد. علی مام رەزایش یەکەم قسە سوێندم دا بەقورئان و تەلاق کەئەمە نەدرکێنی تا مام جەلال دەگەڕێتەوە بۆ ولات. گوتی: هەڵۆی کوڕم نەخۆشییەکەی (مەنگۆلی)یە لەشێوازە خراپەکەیە، زۆر خۆشحاڵ دەبم کەدەست بدەمە چەكو قەڵەمو بەشەرەفەوە لەم شۆڕشەدا بەشداربم، بەلام دەبێت چاوەڕوان بکەم هەتاوەکو هەڵۆ دەمرێت، ئینجا بچمە پاڵ شۆڕش.

## رووداوەکانی کۆمەڵە

ئێران بیستوچوار ئەندامی لەکادرە ناسراوەکانی کۆمەڵەی رەنجدەران تەسلیم بەڕژێمی عێراق کردبۆوە، بابەتەکەیان لەژێر چاودێری مەکتەبی کاروباری باکوور بوو، زۆر بەگرنگی سەیری دۆسییەکەو بیروباوەڕو بۆچوونیان دەکردن. لەناو بەعسدا دوو را هەبوون

یەکێکیان لەناوبردنیانو بەشێکیان دژی ئەم بۆچوونە بوون. من لەلایەن خۆمەوە زۆر گرنگیم پێدا کەزانیم ئەمانە نیشتمانپەروەرنو بیروباوەڕیان دەبێتە هۆی ئەوەی جەماوەرێکی زۆر لەدەوروپشتیان کۆببێتەوەو سوودێکی گەورەی بۆ شۆڕش دەبێت، زۆریشیانم لێدەناسی.

لەسەر داوای بکرو عومەری مام رەزا هاتمە سلێمانی, باشتر بۆمیان روونکردەوە کە

ڕێکخراوی کۆمەڵەو بۆچوونو بارودۆخو هەڵوێستیان چی یە، ئاگاداریان کردمەوە کەدارۆی شێخ نوری لەئاسایشی سلێمانی بەندکراوە، چوومە ئاسایش بەو نیازەی کەهەوڵێکی بۆ بدەم. بەڕێوبەری ئاسایشی سلێمانی (أبو ريم) پێی گوتم، ئەمە لەبەڕێوەبەری مەکتەبی کاروباری باکوور(صدام) داواکراوە، ئێمە ناتوانین هیچی بۆ بکەین بەڵام مادام ناسیاوی تۆیە ڕێزی لێدەگرینو بەسەلامەتی رەوانەی بەغدای دەکەین، هەرچەندە ئەمە یەکەمجارە بەخزمەتی بگەم، بەڵام براکانی شێخ جەنابو شهابم باش دەناسین.

ڕۆژێك خێزانی دارۆی شێخ نوریو فریدون عبدالقادرو پرشنگ خان خێزانی ئاوات غەفوورو نازەنین خان خێزانی شەهابی شێخ نوریو زێبا خوشکی جەعفەر لەگەڵ چەند ئافرەتێکی دیکە هاتنە لام لەماڵەوە، لەبەغدا. گوتیان چووینە لای وەزیرە کوردەکانو ماڵی تەها محیالدین، کەسیان بەپیرمانەوە نەهاتنو ئێمەشیان نەدی، وا ڕوومان لەتۆ ناوە. من نازەنین خان و زێبا خانم باش دەناسی وخۆم بەقەرزداری زێبا خان دەزانم کەڕۆژێك بێت منیش بەخزمەتی هەستم.

ساڵی ١٩٦٣ کەپێشمەرگەبووم لەبەندیخانەی کەرکوك گیرابووم, زێبا خان ٧ دینار یارمەتی بۆ هێنام، ئەمەم هەر لەبەرچاوە, هەرچەندە پارەکە هی پارتی بوو و ڕێکخراوی کەرکوك فەرمانیان پێدابوو کەئەم ئیشە جێبەجێ بکات. گوتیان وامان بیستووە ئەو ٢٤ کەسەی گیراون لەژێر ئازارو ئەشکەنجەدا زۆریان نەماون، وەڵامم دانەوەو ڕێکەوتم بەیانی سەعات ٩، لەگۆڕەپانی ئەندەلوس ڕاوەستن خۆم دێم بەئوتومبێلەکەی خۆم هەڵتاندەگرم، چونکە بۆیان نىیە بمانپشکننو ڕێگەی هاتوچۆم لێبگرن. لەسەعاتی دیاریکراودا گەیشتمە لایان، لەگەڵمدا هاتن بۆ لای بەڕێوەبەری ئاسایشی بەغدا، پێم ڕاگەیاند بەئاگاداری (سيد نائب) ئەمانە چاویان بەهەموو کەسوکاریان بکەوێت، چونکە پڕوپاگەندەی وا هەیە کەنەماون. خواردنەکانیان لێوەرگرتنو یەکتریان دی ئیتر دڵنیابوون کەماونو پڕوپاگەندەکە ڕاست نىیە، بەڵام بەنهێنی بەمنیان گوت ئەوانە پرسیاریان لێدەکرێت. ئەوان چوونە دەرەوە ئینجا من چوومە لای بەڕێوەبەری ئاسایش، گوتم (ابو علا) درۆم لەگەڵ کردیت، ئەمانە ناچاریانکردم کەبەم ئیشە هەڵسم. گوتی ئەمانە وەکو میوان لای ئێمەن، کێشەکەیان پەیوەندی بەبەڕێوەبەری مەکتەبی باکوورەوە هەیە, ناچاربوو بەتەلەفۆن مەکتەبی باکوور ئاگادار بکات کەڕەفیق پشدەری ئەم کارەی ئەنجامداوە بێئەوەی ئێمە لەڕاستىیەکەی ئاگادار بکاتەوە. وەڵامیان دابۆوە ئەوە رەفیق پشدەرىیە، بۆچوونەکانی مخابراتىیە، ویستوویەتی گاڵتەت لەگەڵدا بکات، ئاگاداری کردبووینەوە.

بەڕاپۆرتو بەقسە، ئاگاداری بەعسم کرد کەمقۆمقۆو دەنگوباس لەئارادایە کە لەبەشی زۆری کوردستان بەتایبەتی سەر سنوور چەکداریان دیوە، ناوی هەندێك خەڵکی ناسراویان هێناوە وەکو عمر دەبابەو عەلی عەسکەریو دکتۆر خالید حمەسعیدو خەڵکی دیکەش. بەزەقی لەهەموو شارو شارۆچکەکانی کوردستان باس باسی ئەوەیە.

رۆژ بەرۆژ ئەم دەنگوباسە تازەیە کەشۆڕش بەسەرۆکایەتی مام جەلال هەڵگیرساوەتەوە دەمخستە بەرچاوتان، ئایا فەرمانتان لەسەرە بچم چاوم بەحەمەی مەلاشریف بکەوێ کەچۆن گفتوگۆی لەگەڵ بکەمو پرۆگرامی تازەی بۆ دارێژین؟

لەسەر راو فەرمانی بەعس لە ١٩٧٦/٨/٢٠ لەگەڵ شەفیق وحەسەنی برام چووومە قەڵادزێو لەوێشەوە چووم بۆ قەندیلو ناوچەی مەنگوڕایەتی. گەیشتمە هاوینەهەواری خواروکوترەڵ کەیەکێکە لەخۆشترین هاوینەهەواری ئەم ناوچەیەو دەکەوێتە سنووری دەستکردی هۆزی مەنگوڕی کوردستانی عێراقو کوردستانی ئێران. بۆ پشوودان روومانکردە ماڵی کوێخاخدر ئینجا هەواڵی حەمەی مەلاشەریفم پرسی گوتی: ماوەی نیوسەعات لەئێمەوە دوورە. دەستبەجێ نووسراوێکم ئاراستەی عمر دەبابەو دکتۆر خالید کرد کەچاوەڕوانتان دەکەم بەپەلە بگەنەلام. ئەوانیش حەوت سەعات دووربوون لەئێمەوە.

چووینە سەردانی حەمەی مەلاشەریف. بەگەرمی بەپیرمانەوە هاتن، خۆشحاڵی خۆی دەربڕی کەئێستا لەوهەلومەرجەدا دەژێت کەبارەگاکەی بەبارەگای کوێخا حەمەی مەلا شریف ناودەبرد. دوای هەرەسەکە ئەمە یەکەم بارەگای پێشمەرگە بوو لەناوچەی قەڵادزێو رانیە بەئاشکرا خەڵك دەستی بۆ درێژ بکات. بارەگاکەی بریتی بوو لەڕەشماڵێکی گەورەو سێ خێوەتو کەپرێك، ئافرەتەکان لەژێر دوو خێوەتەکەدا بوون، ماڵی علی عەسکەری لەوێ دەژیان، صبیحە خانی هاوسەری عەلی عەسکەری سەرپەرشتی ئامادەکردنی خواردنی دەکردو حەمید باتاسیش ئاگاداریان بوو.

روومکردە صبیحەخانی بەڕێزو پێم ڕاگەیاند بارە قورسەکان هەمووی کەوتونەتە سەر تۆ، ئاسان نىیە کە لەناو ئەو شاخو بەردە بەدار خواردنی ئەم هەموو خەڵکە دروست بکەیت. صبیحە خان گوتی: من ئێستا ئازادم, بەسەربەستی دەژیمو دوورم لەحوکمی بەعس، ئەمە خۆشترین رۆژمە کەشۆڕش هەڵگیرساوەتەوە, منیش وا خزمەتی ئەو برا پێشمەرگانە دەکەمو شانازی یان پێوە دەکەم کەلەم خەباتە نوێیەدا تێدەکۆشن.

عمر گوتی: کاتێك گەیشتینە (علی وخالد) لای کوێخا حەمەی مەلا شریف دەستبەجێ عەلی عەسکەری لەهەموو ئەو پیلانەی داتانڕشتبوو وەکو خۆی ئاگادارمان کردەوە. زۆری لا سەیر بوو کەئێمە بەم شێوەیە ئاگادارینو دەقی شتەکان دەزانین هۆی ئەوەیە بەسەربەستی روومانکردۆتە لای تۆ.

لەپەنا بەردێکدا لەگەڵ عمر دەبابە دوو بەدوو دەستمانکرد بەم گفتوگۆیە:

١- بەعس تووشی هستریاو سەرسوڕمان بووە، باوەڕیان بەوە نەدەکرد کەجارێکی دیکە شۆڕش هەڵگیرسێتەوە.

٢- بۆ لەناوبردنو تێکدانی شۆڕش هەوڵدەدەن بەدەستێکی ئاسن ئاشبەتاڵی پێبکەن،

چی لەتوانایاندابێت بەکاری دەهێنن لەکوشتن‌و برین‌و تیرۆرکردن‌و گرتن‌و ماڵ وێرانکردن‌و پڕوپاگەندەو سووککردنی بەوەی هەر لەناوخۆدا باسبکرێت.

٣- بەشی زۆری سیخوڕو بەکرێگیراوەکانیان بەکاردەهێنن بۆ تیرۆرکردن، ئەمە یەکێك لەپیلانە گرنگەکانیان و مەبەستی سەرەکی یانە، من لەلایەن خۆمەوە ئەم خاڵە زۆربە گرنگ دەزانم‌و زەحمەتە پاکسازی بکەن دەست بخەنە سەر ئەو جۆرە کەسانە، چونکە دەزگاکانی بەعس هەریەکە لای خۆیەوە بۆ مەبەستی تیرۆرکردن ئەم فەرمانەیان پێ سپاردوون, لەبەر ئەوە من، یا برایەکی‌تر بتوانێت ئەم جۆرە کەسانە دەستنیشان بکات چونکە بەشی زۆری ئەو کەسانە لەناوتاندا دەژین.

٤- کاتێك گەیشتمە ئێرە دەستبەجێ نووسراوێکم ئاراستەکردن, ئەوەبوو لەنیوەی ڕێگا یەکترمان بینی‌و ئەوا دوو ڕۆژە دانیشتووین زانیت هۆی چی بوو کەمن بەم جۆرە پەلەم دەکرد بۆ چاوپێکەوتنتان، هەربۆیەش بەبست لێت دوور ناکەومەوە.

بەعس ئاگاداریکردمەوە کە لەگەڵ علی حسن ئاغا پیلانیان بۆ کوشتنی عمر دەبابە و دکتۆر خالدو عەلی عەسکەری داڕشتووە. گوتیان تۆش لەو ناوچەیە دەبیت, لەگەڵ عەلی حسن ئاغا بۆ ئەم مەبەستە گفتوگۆ دەکەن بۆ جێبەجێکردنی بەزووترین کات, کوێخا حەمەش بێگومان هاوکاریت دەکات لەم کارەدا، وام بەکاربەدەستانی بەعس گوتبوو کەکوێخا حەمە جێ باوەڕی ئێمەیە، عەلی حسن ئاغاش قسەکانی وەکو خۆی بۆ گێڕامەوەو ئاگاداریکردمەوە کەکوشتنی عمرو خالد زۆر ئاسانە. ئینجا گوتیان کاتێ سەری لەئێوە داوە شەش کەس بوون، جا کەی دەست بکەین بە لەناوبردنیان؟ ئایا لەماڵی خۆمان دەعوەتیان بکەم بۆ نانخواردن ئەو کاتە کارەکە ئەنجام بدەین، باشترین ڕێگایە، گوتم: عەلی ئاغا بەڕاستی پلانەکان زۆر بەڕێکوپێکی داتانڕشتووە، بەڵام دکتۆر خالد دەبێت راکێشین بۆ لای عمر بزانین وا بکەین عەلی عەسکەریش بێتە ئێرە. ئینجا بەعەلی حسن ئاغام گوت خۆت گوێت لێبوو کەعمر دەبابە گوتی: دکتۆر خالد زۆری پێخۆش بوو چاوی پێت بکەوێ من ڕێگەم نەدا. تۆ پێویستە ئێستا لەبنکەکەدا بیت, ئینجا گوتم: راوەستە تاوەکو داوا لەعمر بکەین کەوا بکات دکتۆر خالید بەزووترین کات بگاتە ئێرە.

٥-عمر دەبابە گوتی ئەمە راست نی‌یە لەیەکەم ڕۆژەوە دەستبکەین بەکوشتنی کورد، بەتایبەتی یەکێکی وەکو عەلی حسن ئاغا سەرۆکی هۆزی مەنگوڕ. باشە دکتۆر خالد لەگەڵماندا نی‌یە دەنا دەستبەجێ دەیکوشت, ئێستاش لەڕێی خۆمەوە بەهەموو شتێك ئاگاداری دەکەمەوە.

٦-علی حسن ئاغا دەعوەتی نانخواردنی بۆکردبووین دوور لەخواروکۆترەڵ کە بەچوار سەعات چووینە ئەوێ. دوای پشوودان‌و نانخواردن عمر دەبابە هەموو قسەکانی بۆ باسکردبوو کەشتێکی واهەیە، عەلی ئاغا گوتبووی کاك عمر ویستوومە رەفیق تاقی بکەمەوە. کاتێ عەلی ئاغا گەڕایەوە ناومان سوور هەڵگەڕابوو،

لەتەنیشت من دانیشتبو گوتی خۆم زۆر بەشەرمەزار دەزانم، ئەمە قسە بووە، بەقەبری بابم بەکردەوە نیازی شتی وەهام نەبووە، منیش بەتوندی لەبەرچاوی کوێخاکان قسەم پێگوت.

پاشتر صەدام لەتەنیشت دێیەکەی خۆی شەروێت, خۆیو کوڕو براو چەند کەسێکیتر، کوشتیانن, نازانم ژمارەیان چەند کەس بوو چونکە ئەوکاتە من لەمخابرات بەندکرابووم.

لەگەڵ عمر دەبابە بەدووقۆڵی دانیشتبووین گوتی: کەهاتمە دەرێ ئوتومبیلێکم هەبوو فرۆشتم، پارەکەیم بۆ شۆڕش خەرجکرد، چاوەڕوانی هاتنی مام جەلال دەکەین کەپارە لەگەڵ خۆیدا بهێنێت. بارمان قورسەو قەرەباڵغی یەکی گەورەمان بەسەر کوێخا حەمەوە دروستکردووە، ژمارەشمان هەروا لەزیادیدایە، جائەگەر بتوانین بڕی ۱۰۰۰ دینار بۆ کوێخا حەمە پەیدا بکەین باشە.

**بروسکەیەك**

**لەڕەفیق پشدەرییەوە بۆ مەکتەبی کاروباری باکوور:**

*(چەند رۆژێکە لەناوچەی پشدەر دەسووڕێمەوەو ئێستا لەماڵی کوێخا حەمەی مەلاشریفین, وای بەپەسەند دەکەم کەژمارەی چەکدارەکانی بگاتە ٥٠-١٠٠ کەس تا بتوانیت بەرامبەر چەتەکانی جەلال تاڵەبانی و خالد محمد سعید کەناسراوە بەدکتۆر خالدو عەلی عەسکەری و عمر مصطفی کەناسراوە بەعمر دەبابە بوەستێت کەلەم ناوچەیە پڕوپاگەندە دژی بەعس دەکەن و دەورێکی تێکدەرانە دەبینن, تکام وایە دەستبەجێ دوو هەزار دینارم بۆ بنێرن تا تەسلیم بەحەمەی مەلاشەریفی بکەم).*

ئەم بروسکەیەم تەسلیم بەحەسەنی برام کرد کە لەڕێگای ئاسایشی قەڵادزێوە رەوانەی بکات، لەدوای ٢٤ سەعات حەسەنی برام گەڕایەوە, کاتژمێر ٩ ی بەیانی کەدەگەنە دێی (مارەدوور) بۆئەم مەبەستە منو کوێخا خدرو کوێخا قادرو کوێخا حەمەی مەلاشریف لەگەڵ شەفیقو حەسەنی برام هاتینە شوێنی دیاریکراو, لەپڕ دوو جێبی مەدەنی گەیشتنە لامان، لەوانەی هاتبوون عبدالقادر الراوی بەڕێوەبەری بەشی سێ و کەمالی برام کەئەو کاتە(مفوض) بوو لەئاسایشی گشتی, لەگەڵ چەند چەکدارێك دابەزین. ماوەی دوو کاتژمێرێك دانیشتین باسمان لەبارودۆخی ئێستاکرد، عبدالقادر گوتی: جێگەی سەرسوڕمانە کەعمر و عەلیو خالیدبەو ئیشە هەڵستاون، چونکە لەئێمە ئاشکرایە جەلال بەفەرمانی سوریاو دەوڵەتە داگیرکەرەکان ئاژاوە دروست دەکات، دواڕۆژی ئەویش وەکو بارزانییە، ئەوانە هەمووی دامەزرابوونەوە شاخیان بۆچییە؟!

دوو هەزار دینارەکە تەسلیم بەکوێخا حەمە کراو بەڵێنی پێدرا لەچەك و پارەو یارمەتیو پشتگیری بەعس بەشدار بێت.

## تێبینی

*داواکاری‌یەکەی عمرم جێبەجێ کرد, هەروەها پی ی ڕاگەیاندبووم کەچاوم بە شێخ جەنگی تاڵەبانی بکەوێت , ئەم دەنگوباسەی پێ ڕاگەیاندم کەئێستا ڕوودەدات هەروەها ئاگاداری براژنم (فاتمەخان) بکەمەوە بەو ناونیشانە کەپێنج دینارم دابوێ کەجانتایەکم بۆ بکڕێ باقی پارەکەی بۆهێنابوومەوە هەندێ شتی ئاگادار بکەمەوە. ئینجا هەموومان گەڕاینەوە قەڵادزە، شەوەکەی لەوێ بووین، لەماڵی حەسەنی برام، بەیانی‌یەکەی قەڵادزێمان بەجێ هێشت هاتینەوە بۆ سلێمانی.*

لەکۆیە سەردانی شێخ جەنگی تاڵەبانیم کرد، هەموو ئەو ڕاسپاردانەی کەعمر دەبابە پی ی گوتبووم وەکو خۆی گێڕامەوە، ئەویش لەلایەن خۆیەوە زۆر خۆشحاڵ بوو گوتی سوپاس بۆ یەزدان کەشۆڕشەکەمان هەڵگیرسایەوە.

سەردانی ماڵی تاهیر ئەفەندی برای عمر دەبابەم کرد, چاوم کەوت بەفاتمەخانی هاوسەری گوتم: کاك عمر لەکوێیە، بۆچی دیار نی‌یە؟ گوتی: کاکە رەفیق، رۆژ نی‌یە خەڵکێکی زۆر نەیەت پرسیارمان لێ‌نەکات، بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی ناردی بەشوێن تاهر ئەفەندیدا پی ی گوتبوو دەبێ بچیت عمر مصطفی بهێنیتەوە، ئەویش لەوەڵامدا گوتبووی بڕوا بکە نازانم رووی کردۆتە چ شوێنێك. ئینجا کەناونیشانەکەم پێگوت دەستیکرد بەپێکەنین، ڕاسپاردەکانی عمر دەبابەم هەمووی پێگوت ئەویش بەخۆشحاڵی‌یەوە وەریگرت.

**عبدالقادر الراوی:** دەرچووی کۆلێجی پۆلیسە, کادرێکی کۆنی بەعسە، شۆڤێنی بوو, لەگروپی زەعیم صدیق‌و غانم مصباح‌و تەها شکرچی بوو, کەبوو بەبەڕێوەبەری ئاسایشی سلێمانی بەدەستی خۆی خەڵکی کوشتووە، بەجۆرێکی سەیر ئازارو ئەشکەنجەی کوردی داوە. دانیشتووی بەغدابوو، خۆی ئەوەندە بەدڵسۆزو دۆستی کورد دەزانێت پێشانگای کڕین‌و فرۆشتنی ئوتومبێلی هەیە، ئێستا وابزانم ناوی ناوە نەورۆز! خۆی بەدۆستێکی نزیکی من دەزانێت، لەزۆر شوێندا باسی من دەکات. ڕاست دەکات دۆستین، بەڵام من دەمزانی ئەمە هەڵوێستێتی بۆ بەرژەوەندی کورد دەبوو شان بەشانی برۆم‌و یارمەتی بدەم، تاوەکو دەوڵەمەند بێت. لەڕۆژی گیرانم کە ١٩٧٦/٩/١٤ ـە یەکترمان نەبینیوەتەوە.

## دیدار لەگەڵ شهاب و جەعفەرو ئەنوەر:

رۆژی سەردانی گشتیبوو, چوومە بەندیخانەی ابوغریب بەشی لەسێدارەدان، شهاب وئـەنوەر، لەژوورێکـدا بوون و جەعفەر عبدالواحد کەدەسـتی لەکـەلەبچەدا بوو, بەتـەنها لـــە ژوورێکدابوو.

شهاب وجەعفەرم باش دەناسی لەهەموو ڕوویەکەوە جێی متمانەبووم لایان، بەلأم ئەنوەر یەکەم جارم بوو بیبینم. دیارییەکانم پێشکەشکردن، گوتیان خۆت هەموو شتێکیت. خۆشحاڵی خۆیـان دەربڕیو رەزامەنـدی خۆیان نیشاندام کەچیم کردووە بۆیان و بەچ جۆرێك پێشوازیم لەماڵیان کردووە و ڕێزم لێناون. وەلأمم دانەوە مـن هیـچم نـەکردووە بـۆ ئێـوە، هـاتووم بۆتـان بـاس بکـەم کەچـیم بەدەسـتەوەیەو نیـازم چـییە تـا بەنـدە لەخزمەتتانـدا بێـت. ئینجـا باسـی هـەموو دەنگوبـاسو رووداوی ئـەو رۆژەم بـۆ کـردن، لەگـەڵ ئـەوەی کـە بەسەرۆکایەتی مام جەلال (یەکێتی نیشتمانی کوردستان) هاتەکایەوە. دەقـی ئـەو قـسانەم بـۆ گێڕانـەوە کـە لەگەڵ مام جەلال باسمکرد، چەند ڕۆژێکە لەقەندیل گەڕاومەتەوە. ئەمەشم هەموو بۆ باسکردن، بەبێ ئـەوەی ڕای ئێوە وەربگرم، هەولێکی زۆرمدا لەگەڵ سەرکردەکانی بـەعس، ئەگـەر بێتـو بەخۆتانـدا بـچنەوە حزبێکـی سیاسی سلێمانیو هەولێرو دهـۆك بەئاشـکرا بارەگایـان هـەبێتو رۆژنامـەو گۆڤاریـان دەرچـێت سـوودبەخش دەبێت بۆ ئێوە, واتە پاڵپشتێکی جەماوەری دەبێت. لەگەڵ ئـەو هـەموو بۆچـوونەی خـۆم کەچـیم بەمێـشکدا هاتووە چ بەقسە، یـان بـەڕاپۆرت خـستوومەتە بەرچـاویان، لەگـەڵ ئەوەشـدا راسـتی یەکـەتان پـێ بڵـێم کـە بەگەورەی ی خۆتان بمبەخشن ناچارم بۆتان روونبکەمەوە, بەعس بڕیاریداوە لەسـێدارەتان بـدات, مـن خـۆم گەیشتمە ئەو باوەڕە چونکە وایان وەلأمی من دایەوە. یـەك ڕێگـا مـاوە کەدەیخەمـە بەرچـاوتان کـەڕزگارتان بکات ئەویش فڕاندنی کوڕێکی صدامە، بازیانی کوڕم لەگەڵ یەکێکیان بەیەکەوە لەمەکتەب دەخـوێنن، یـەکتر باش دەناسن دۆستایەتی یان زۆر بەهێزە, من ئامادەم لـەپێناوی ئێـوە هەرچـەندە بـاش دەزانـن بیروبـاوەڕم کۆمەڵە نییەو کوردێکی نەتەوەی یم بەلأم هەرچی ڕاست بێتەوە کـورد رزگاربکـات مـن خزمـەتکاری دەکـەم. وەڵلأهی باوەڕیـشم بـەئێوە هەیـە کـەئامادەن بـۆ ئـەم نیـشتمانە گیـانی خۆتـان بـەخت بکـەن. مـن ئامـادەم لەپێناوی جێبەجێکردنی ئەم کارە، دوور لەبرادەرانی ئێوە، لەدەرەوە پەیوەندیم پێوە بکەن بەو ناونیشانەی کەخۆتان دیاریدەکەن. ئەمە تاکە ڕێگەیە کەڕزگارتان بێت چونکە فڕاندنی کوڕەکـەی دەبێتـە مایـەی ئـەوەی کەدەست لەسەر ئێوە هەڵگرێتو ئازادتـان بکـات, منـیش خـۆمو کمـالو منداڵـەکانم بەئاسـانی دەگەینـە لای برادەران لەشاخ.

**تێبینی**

*١- خۆشحاڵی خۆیان دەربڕی، سوپاسیان کردم، گوتیان پەیوەندیت پێوە دەکەین.*

*٢-لەکاتی تەواوبوونی چاوپێکەوتن، بەندکراوەکان دەگەڕێنەوە جێگەو شوێنی خۆیان یەکە یەکە ژمارە دەکرێن کەژمارەیان تەواو بوو ئینجا رێگە دەدەن بەوانەی کەلەدەرەوە هاتوون بۆ چاوپێکەوتن و دەرگاکانیان بۆ دەکەنەوە، رێگایان دەدەن برۆنە دەرێ لەبەندیخانە. ئەو رۆژە یەك سەعات مامەوە لایان، چونکە یەك ژمارە لەبەندکراوەکان دیارنەبوو. دوای ی دۆزی یانەوە لەتوالێت بووە.*

*٣-هەرچەندە ژیان ئەوەندە خۆشە کەبەراورد لەگەڵ مردندا ناکرێت، سەربارێشی کاتێك گوتم ئێوە لەسێدار دەدرێن رەنگیان تێکنەچوو، لایان شتێکی تازەو سەرسوڕهێنەر نەبوو، گوتیان لامان روونە کەبەعس لەجێبەجێکردنی هەر بڕیارێك پاشگەز نابنەوە.*

*٤-شهابو جەعفەر بەمنیان گوت ئەمە رۆژێکە مێژوو باسی دەکات, لەسێدارەدانمان، گرنگە بۆ کوردو شۆڕشی نوێ, ئیمڕۆ لەهەموو رۆژانی تر بیرمان لەسەرخۆترە. کەبڕیاری بەعسیشمان بەتەواوەتی زانی یەکلا بووینەوە.*

*٥-کاتێك من حوکمدرام نازەنینی هاوسەری شهاب لەسەردانکیدا بۆ بەندیخانە پی ی گوتم: کاتێك شهابو جەعفەرو ئەنوەر بیستیان کەتۆ گیراویت باسی هەڵوێستی تۆیان کرد کەچۆن بوویت لەگەڵیاندا, زۆریان لاناخۆش بوو دڵتەنگ بوون.*

*ئەو کاتەی کەمن گیرابووم ئەوان لەسێدارە نەدرابوون.*

سەعات ١٠ی سەر لەبەیانی ١٩٧٦/٩/١١ چوومە لای صدام بەگەرمی بەخێرهاتنی کردم، ئەحواڵی پرسیم گوتی: فکرم زۆر لات بوو، چونکە زۆرت پێچوو ماندوو بوویت. گوتم: سوپاست دەکەم، ئەوەی کردوومەو پی ی هەستاوم ئیشوکاری خۆمە, لەگەڵ ئەوەشدا فەرمانە دەبێت ئەنجامی بدەم. گوتی: لەکاتێکدا کورد کەوتۆتە پشوودان خەریکی ژیانی ڕۆژانەیەتیو ئاشتی لەسەرانسەری وڵات بەردەوامە. ئینجا گرژ بوو هێرشی بردە سەر سەرکردەکانی کورد کەبەفەرمانی دەرەوە دژی عێراق دەجووڵێنەوە, گوتی: نازانم نوری نوری فیصل الحدیثی لەگەڵتدا قسەی کرد؟ گوتم: سید نوری چەند پرسیارێکی لێکردم کەئایا جەلال تاڵەبانی ئێستا لەکوی یە؟ (لەدڵی خۆمدا وا هەستمکرد کە انشاءالله نیازی گفتوگۆیان هەیە).. ئینجا گوتی: بارودۆخی ئێستا لەباکوور ئەوەی پێی هەڵدەستێت بەکرێگیراوی دوژمنانی عێراقن ئەویش جەلال تاڵەبانی یە, وام بەباش زانی قسەت لەگەڵ بکەم تا دڵنیابم ئەم کارە ئەنجام دەدەیت, تۆو نوری مامۆستای (مخابرات) پیلان دابنێن بۆ تیرۆرکردنی جەلال تاڵەبانی. گوتم: بۆچی منتان هەڵبژاردووە بۆ کوشتنی جەلال تاڵەبانی , بۆچی یەکێکی تر دەستنیشان ناکەن، بەداخەوە ئەوە هەڵوێستو ئیشی من نی یە, بەڕێزتانم ئاگادارکرد لەیەکەم رۆژەوە کەداوات لەمن کرد لای خۆم وەلامم دایتەوە, رووبەڕوو بۆم روونکردیتەوە کەدەوری تیرۆریستو

سیخوڕی نابینم. صدام گرژ بوو, بەدەست ئیشارەتی دامێ کەکۆبوونەوەکە کۆتای ی هات. داوای لێبووردنم لێکردو هاتمە دەرێ.

سەعات ١١ر٤٠ سەر لەبەیانی رۆژی ١٩٧٦/٩/١٤عبدالقادر الراوی تەلەفۆنی بۆ کردم کەبەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی داوام دەکات. گوتم: ناتوانم بێم چونکە (ابوصابر) خەیاتەکەمان لەئەمەریکا دەگەڕێتەوە وا خۆم ئامادەکردووە کەبچم بۆ فرۆکەخانە. گوتی: پێنج دەقیقە زیاترت پێناچێت. گوتم: کەگەڕامەوە لەفرۆکەخانە دەستبەجێ دێم بۆ لاتان.

گوتی: بڕوا ناکەم پێنج دەقیقە دوات بخا لەچوونت بۆ فرۆکەخانە. گوتم: واهاتم. کاتێك گەیشتم لەئوتومبێلەکە هاتمە خوارێ ئەفسەرێك هات بۆ لام, بەیەکەوە چووینە لای عبدالقادر الراوی, دەستبەجێ روویکردە منو گوتی فەرمانی بەندکردنت دراوە. ئنجا منیان بردە (شعبة الامن الخارجی)و بەتەنها لەژوورێك دایاننام.

## تێبینی

*شەوماڵی (ابوصابر)ی بەرگدروو تەلەفۆن لەگەڵ دایکی بازیان دەکەن دەڵێن کوانێ ابو بازیان , بۆ بەهاوارمان نایەن , ئایا دەزانن چیمان لێقەوماوە؟ کاتێك ابو صابر لەگەڵ دایکی لەفرۆکە دادەبەزێت لەژووری ترانزێت لەسەعات یەك گیانی دەردەچێت، کەدایکی چاوی پێدەکەوێت وا کوڕەکەی مردووە ئەویش گیان لەدەستدەدات، دایکی بازیان دەڵێت بەداخەوە ابو بازیانیش لە سەعات یەکەوە گیراوە.*

سەعات ٩ی بەیانی ١٩٧٦/٩/١٥ بردیانم بۆ لای بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی, هەڵسا هات بەپیرمەوە لەتەنیشتم دانیشت، گوتی: کێشەکەت چیە؟ گوتم: (ابو مازن) من دەمەوێ پرسیارت لێبکەم کەکێشەکەم چیەو بۆچی گیراوم؟ گوتی: کەتەلەفۆنەکەم هەڵگرت سید نائب بوو، گوتی ئێستا دەنێریت بەشوێن رەفیق پشدەری، لای خۆتان بەندی بکە، ڕێ نەدەن بەسەرکردنەوەو چاوپێکەوتنی لەگەڵدا بکرێت، تەنها کەماڵی برای بۆی هەیە ڕادیۆو ڕۆژنامەو خواردنی بۆ بەرێت. گوتم: ابو مازن ئەگەر نووسراوێك ئاراستەی سید نائب بکەم کەی دەگاتە دەستی؟ گوتی: ابو بازیان نووسراوەکە بنووسە دوای نیوسەعات دەگاتە دەستی دەیخوێنێتەوە، بەڵام وەڵامەکەی لای ئەوە, من دەزانم کەسید نائب تۆی خۆش دەوێت. قەڵەمو کاغەزی دامێ، بە(ابو مازن)م گوت خۆت من باش دەناسی کەپیاوکوژ نیم, پێشمەرگەبووم، شەڕم کردووە، ئەمە ئاشکرایە بەڵام پیاوێکی تیرۆریست نیم , تۆو ناظمو صدام ئەمە باش دەزانن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نەدەبوو وەڵامی صدام بەگرژی بدەمەوە.

**گەورەم جەنابی سید نائب ( صدام تکریتی ):**

*ماوەیەکە مێشکم هیلاکەو ماندووم لەبەر هاتووچۆکردن‌و بارودۆخی ئەمڕۆ , شەوی ٩|١٠و ١١|١٠ /١٩٧٩ خەریکی خواردنەوەو یاریکردن بووم، بەجۆرێك مەعیدەم تێکچوو کەوتمە رشانەوەو تەندروستیم باش نەبوو, کاتێك بەڕێزتان داواتان کردبووم ئەو کاتە ئامادەنەبووم، بەناچاری هاتمە خزمەتت, خۆم بەشەرمەزار دەزانم , بەگەورەی ی خۆت بمبەخشە، کەڕووبەڕووی بەڕێزتان زمانم هەڵەی کردو بەنەخێر وەڵامم دایەوە.*

*گەورەم سید نائب:*

*من ئامادەم هەموو فەرمانێکی بەڕێزتان بخەمە سەرچاوو ئەنجامی بدەم، تکایە ڕێگام بدەیت بۆ پێنج دەقیقە لەبەرامبەر بەڕێزتان ڕاوەستم جێی شانازی یە.*

*ئیتر هەر بژیت هەتاهەتایە بۆ خزمەتی وولات*

برای پچووکتان / رەفیق پشدەری

١٩٧٩/٩/١٥

## تێبینی

*١-عبدالخالق عبدالعزیز دەستبەجێ نووسراوەکەی منی خستە ناو زەرفەوە, داوام لێکرد بیخوێنێتەوە گوتی ئەمە بۆ (سید نائبە) بۆم نییە بەهیچ جۆرێك تەماشای ناوەڕۆکەکەی بکەم. بەڵام باش دەیزانی ناوەڕۆکەکەی چی یە.*

*٢-کاتێك رووبەڕووی صدام بوومەوەو داوای ئەوەی لێکردم دوو رێگام لەبەردەمدا بوو، یا ڕازی بوومایە بەوەڵامی بەڵێ و بەسەرچاو، ئینجا دوای ئەوە چیم دەکرد ئەوە شتێکیترە، یا وەکو بەم جۆرە کەگرژ بووم وەڵامم دایەوە نەخێر کەکاتێك هاتمە دەرێ لەژوورەکەی یەکسەر رامبکردایە، ئەو کاتە ئەوو نوری دەستی خۆیان دەشکاندەوە کەهۆی چی بوو دەستبەجێ فەرمانی گرتنیان بۆ دەرنەکردم. کاتێك لەبەندیخانە بووم خۆم بەخۆمم دەگوت ئەم هەموو پشوودانو دواکەوتنە بۆچی؟ یەکجار زۆر بوو بەو ناوەی کەخۆم کۆبکەمەوە، من نزیکەی ٥٠ سەعاتم هەبوو، ئەوەم بیر دەکەوتەوە لەکودەتاکەی نازم گزار کەڕوویدا لەبەغداوە رامکرد سەعات ٤ یا ٥ بوو لەگەڵ مام جەلال بەتەلەفۆن لەشامەوە قسەم کرد.*

*٣-نووسراوەکەم زیادبوو, دەمزانی ڕۆژێك ئەم فرتوفێڵە سەرناگرێو پەتەکەم حەڵاڵ کردووە, چونکە دەمێکە فێڵیان لێدەکەم، زۆرم بۆ چۆتەسەر، لەپەنا ئەوەدا دۆستایەتیو برایەتیو هاوکارییەکی زۆری خەڵکم کرد بێ بەرامبەر، ئەوەی کردووشمە بۆ کوردو وڵاتەکەم، ئەوە کوردێکمو فەرمانی سەرشانی خۆم بووە.*

*٤-بەهۆی ئەم نووسراوە ئەوەندە توند نابن لەگەڵمدا، کەمرۆڤ بێدەسەڵات بوو پاڕانەوەی باشترە لەسنگ دەرپەڕاندن، ئەمە پێنجەمین جارە دەگیرێم، ئەمجارە زمانی پاڕانەوە بەکاردێنمو ئەمە بڕیارمە.*

**نوری فیصل شاهر:** خەڵکی ڕاوەیە, دەرچووی کۆلێجی پۆلیسە، شۆڤێنی، لەگروپی زەعیم صدیقو غانم مصباحو تەها شکرچییە, دەتوانم بڵێم کەس بەقەدەر ئەم زاتە خراپەی لەگەڵ کورددا نەکردووە، لەهەموو کوشتنو ماڵ وێرانکردنو گواستنەوەو ئەنفالکردن بەشداربووە. جێی داخە کوردێکی زۆری دەناسی, پڕوپاگەندەیەکی باشی بۆ دەکەن ئێستاش پەنیرو ماستو هەنگوینو دیاریتری بۆ دەبەن. ئەم جۆرە خەڵکانە پێویستە ناویان لەناو هەموو خێزانێکی کورد بڵاوبکرێتەوەو بیانناسن, بەتایبەتی کەداردەستی صدامە. لەهەمووی سەیرتر ئەوەبوو لەو مەسئولیاتانەی کەوەریگرتووە جارێکیان کرابوو بەوەزیری ئەوقاف، کە ئەم جێگایە لەو ناوەشێتەوە.

لە ١٩٧٦/٩/١٥ تاوەکو ١٩٧٧/١/٣ لەئاسایشی گشتی بووم. لە١٩٧٦/٩/١٧ وە لە ژوورێکیان دانام کامێرای شاراوەیان داناو هەموو گفتوگۆو هەڵسانو دانیشتنو نانخواردنم زۆر باش ئاگاداربوون، پی یان راگەیاندبووم ئەوەی کەدەیزانیت نابێت بەهیچ جۆرێك باسی بکەیت, چونکە ئەو نهێنی

یانە موڵکی حکومەتە (زانیم مەبەستیان چی یە کەئەو دەنگوباسە نەگاتـەوە مـام جـەلال کەنیازیانـە تـیرۆری بکەن).

ڕۆژانە کمالی برام دوو، یان سێجار دەهاتە لام، خواردنو ڕۆژنامەی بۆ دەهێنام، بـەهیچ جۆرێـك باسـی هیچ ڕووداوێکی سیاسیمان نەدەکرد، بەڵکو قـسەشمان لەگـەڵ یەکتریـدا نـەدەکرد، تـەنها ماڵـەوە چـۆنن، چونکە لەو باوەڕەدا بووین مەترسی یان بەجۆرێك بوو دەمگوت کەئێستا کمـالو شـفیق و حەسـەنی بـرام و دایکم و حەمەی مام وەلی و کاکە ئەمین وحبیب محمد کریم و زکیە اسماعیل حقی دەگرن.

ڕۆژگـارم بەنوێـژو قورئـان خوێنـدن بردەسـەر، بـەهۆی کاربەدەسـتانی ئاسایـشەوە کتـێبی گـرنگو نایـابم دەسـتکەوت کـە لـەبازاڕ قەدەغەیـە یـان هـەر نیـیەو سـوودێکی گـەورەم لێبـینی، لەگـەڵ ئەوەشـدا ڕۆژانـە ڕاپۆرتیان لەسەر وردودرشتی ژیانی ڕۆژانەم دەنووسی. لەو ماوەیەدا

چوار جار بازیانو ڕەوەزم دی.

### تێبینی

*لە٢/١/١٩٧٧ لەگەڵ عەریفێکی شیعەی سەر بەئاسایشی گشتی کەخەڵکی عەمارە بوو، دۆستایەتیمان زۆر بەهێز بوو ڕێککەوتین کەیارمەتیم بدات، بەشەو کاتێك مەسئولی مـن دەبێـت بەیەکـەوە هـەڵی یـنو بەرامبـەر بەوە بڕی ١٢ هەزار دیناری بدەمێ، کەدوای ڕاکردنی خێزانی ژیانیان ئاسوودە بێت.*

لەشەوی ٣\٤ی ١/١٩٧٧ گواسترامەوە بۆ فەرمانگەیەکی (مخابرات) لەناوچەی بەتاوین, خانووەکـە بریتـی بـوو لەسـێ نهـۆم، مـن لـەنهۆمی یەکـەم بـووم کـەبریتی بـوو لەشـانزدە ژوور. هـەمووی لەسـەر یـەك شـێوە دروستکرابوو، هەر هەشت ژوور بەرامبەر بەیەك بوون و داڵانەکەی بریتـی بـوو لەمـەترو نیوێـك، کـەس کەسـی نەدەدی، تەنها گوێت لەدەنگی ئافرەتو منداڵ بوو دەگریان، هەر شانزدە ژوورەکەش تەنها یەك دەرگـای سـەرەکی هـەبوو، لەهەشـتو نیـوەوە تاکاتـژمێر چـواری ئێـوارە نەدەکرایـەوە، ئەوانـەی لـەوێ بـوون بەفەرمانی سەدام بەندبوونو هەر بەندکراوێکیش لەسەر دۆسیەکەی نووسراوە: (هکذا یعامل) واتە بەم جـۆرە ڕەفتـار بکـەن لەگەڵیـدا، هـەموو ژوورەکـان لـەژێر کـۆنترۆڵی سـەرەکیدابوون, بـەکامێرا چـاودێری هـەموو ژوورەکانیان دەکرد.

هەریەکـە جـۆرە خـواردنێکی دەدرای یو ڕەفتـاری لەگەڵـدا دەکـرا، لـە ٥/١/١٩٧٧ بردیانمـە لای کاربەدەستێکی مخابرات، پێشتر یەکترمان دەناسی, گوتی: تۆ لەشوێنێکی ئەمینی چونکە بەفـەرمانی سـید نائب گیراوی, نە چاك نە خراپ ناتوانم لەخۆمەوە هیچیانت لەگـەڵ بکـەم، ئێمـە بـەکورتی بـەپی ی فـەرمانی سید نائب لەگەڵتدا دەجووڵی ینەوە. ئیتر بەهیچ جۆرێك هەرچی پەیوەندییەکم هەیە بەدەرەوە نەماو ئاگـام لەهیچ دەنگوباسێكو ڕووداوێك نەما، بەهۆی بانگی هەینی ڕۆژانی هەفتەم دیاریدەکردو پێش ئـەوە بەخـەت لەدیواری بەندیخانەکە هەفتەم دیاریدەکرد زستانو هاوین، بەگەرماو سـەرما ئاشـکرابوو لام نـۆزدە مـانگو

دە رۆژ لەیەك ژوور بەندبووم تەنها دوانزە رۆژیان لەژوورێكی تایبەتی بووم, ئازارو ئەشكەنجەدرام, دوای ی دی ینه سەر ئەو باسەش.

شەوو رۆژێك لەو دوانزە رۆژە لەگەڵ شێتێك ژیام. بەرزی ژوورەكە یەك مەتر بوو، چوار كاتژمێر لەگەڵ دوو كەس بووم، لەژوورێكی دی كەدوو لاوی رێكوپێكی لێبوو قسەمان لەگەل یەكتر دەكرد، بۆ من زۆر خۆش بوو، چونكە وا دەمەتەقی یان لەگەڵ دەكەم, من بەمخابراتم دادەنان، یەكێكیان منی ناسی گوتی تۆ ابو بازیانیت, ئایا ئیعترافت نەكردووە؟ گوتم: من هیچم لەسەر نییەو ئیعتراف لەسەر چیبكەم؟ ئەوەی تریان جێ برینی دیاربوو، بەڵام لەناچاری ئیعتراف كردبوو بەجۆرێكی وەها ئازارو ئەشكەنجەیان دابوو، هەرچەندە دانی بەوەدانا كەئەم تاوانەی نەكردووە. دوای ی بیستم لەسێدارەدراوە. لەماوەی نۆزدە مانگو دە ڕۆژ تەنها دوانزدە رۆژیان نەبێت خواردنم بەم جۆرە بوو: بەیانیان ماستو پەنیرو قەیماغ و شیرو چا, سەعات ۱۰ی‌بەیانی سەمونێكی عەسكەری لەگەڵ میوەی وەرزی ئەو كاتە, سەعات یەك، كاتی نانخواردنی نیوەڕۆ برنجو شلەو نزیكەی نیوكیلۆ گۆشت, سەعات چواری ئێوارە شەربەتی نادر، پاكەتێك جگەرەی رۆسمەن, سەعات هەشتی شەو نەواشف یان كەبابی اربیلیان لە(نادی صید) بۆ دەهێنام.

كەهاتمە مخابرات كێشم ۱۰۳ كغم بوو، لەگەڵ ئەو هەموو خواردنەخۆش‌و رێكوپێكەی بۆیان دەهێنام، وەكو گیسكەكەی هەیاس كەهاتمە بەندیخانەی ابوغریب كێشم بوو بوو بەپەنجاو دوو كیلۆ، كەس‌وكارم نەیاندەناسیمەوە، بردیانمە ئەو قاعەیەی كەبەشی زۆریان كۆمەڵەو پارتی‌و برا یەزیدی‌یەكان بوون. ڕوومكردە برا كۆمەڵەكان گوتم: من رەفیق پشدەریم كەمیان لەسەر ئێوە لێنەداوم، بۆ نایەن بەپیرمەوە. حەمیدی كریم شانەی ی خزمم بوو بەجۆرێك گۆڕابووم نەیناسیمەوە. هەفتەی یەك جار ژوورەكەیان پاكدەكردەوە، جارێكیان ئەوەی هات پاكی بكاتەوە ئەفسەرێك بوو بەپلەی عقید، زۆرم لا سەیر بوو.

رووباری كچم سێ جار تەلەفۆنی لەگەڵ سید نائب كرد بۆ ئەوەی چاویان بەمن بكەوێت. لەیەكەم چاوپێكەوتندا لە ۱۹۷۷/٤/۷ دایكم وهاوسەرەكەم و كەمال و بازیان و ڕەوەز و خەرمان‌و شلێر هاتنە لام، ماوەی دوو كاتژمێر لەگەڵیاندا دانیشتم لەدائرەیەكی ئاسایش پیاوەكانی مخابرات لەگەڵماندا دانیشتبوون. دایكم باوەشی پێداكردم‌و ئەملاو ئەولای ماچ كردم, بەدەنگێكی نزم گوتی كۆنەكەیە یان تازەكەیە؟ ئەملاو ئەولام ماچ كردەوە گوتم: هەردووكیانە, واتە لەسەر پارتی— بارزانی یان یەكێتی—جەلال تاڵەبانی. جاری دووەم ماچی كردمەوە بەبیانووی صدام كەئەمە باوكمانە، گەورەمانە، دانت بەتاوانەكانی خۆتدا ناوە؟ گوتم نەخێر.

لە ۱۹۷۷/۱/۱۲ بردیانم بۆ ژووری لێكۆڵینەوە, هەرچەندە چاوم بەستراوەتەوە بەڵام بەهۆی دەنگەكانیان وام هەستكرد سێ كەسن، نزیكەی شەش سەعات پرسیاریان لێكردم، ئەو كاتە شتی هەرە گرنگ ئەمەبوو: ئایا تۆ سیخوڕی چ دەوڵەتێكی دەرەوەیت؟ لەكاتێكدا زانكۆت تەواو نەكردووەو خەڵكی ناوچەیەكی

شاخاویت، ئەگەر سەر بەوڵاتێك نەبیت چۆن گەیشتوویتە ئەو پلەیە کەبەم شێوەیە راپۆرت بنووسی، بەم ژیانە ڕۆژگار دەبەیتە سەر، ئەم هەموو هاتوچۆیە دەکەیت بۆ دەرەوە. ئێمە هەموومان گەیشتووینەتە ئەو باوەڕە کەتۆ سیخوڕی ئەڵمانیا یان ئینگلیز یان هەروڵاتێکی تریت. دوای ئەوە بڕیاریان لەسەر ئەوەدا کەبەنووسین سێ پرسیارم لێبکەنو منیش بەنووسین وەڵامیان بدەمەوە: کێشەی کورد چۆن جێبەجێ دەبێت, کێشەی نەوت, حکومەتی شای ئێران.

داوایان لێکردم لەئێستاوە تا یەك مانگیتر بۆم هەیە لەسەر ئەم سێ باسە چی دەزانم بنووسم. گوتیان: ئەمە وەکو محەکی ئاڵتوونە. رۆژانە دەستمکرد بەنووسین, رۆژی سێ جار دەهاتن راپۆرتەکانیان لێوەردەگرتم. لە ١٩٧٧/٢/٢٠بانگیانکردم، هەموویان بەیەك دەنگ شایەدی یاندا کەگەیشتینە ئەو باوەڕە کەئەوەی دەینووسی بیروڕای خۆتە، خوا ئەو زیرەکییەی پێ بەخشیوویت.

لێکۆڵینەوە هەر بەردەوام بوو, شەفیقی برام شانزدە مانگ لەهەمان خانوودا بوو, سێ جار یەکترمان دی جارێکیان من چاوم کرابۆوە ئەویان هێنایە ژوورێ چاویان بەستبۆوە، کاسێتێکیان لێدا بەشێوەی دەنگی من گوایە ئیعترافم کردووە، ئایا شفیق تۆ بۆچی ئیعتراف ناکەیت؟ دەمی کردەوە قسە بکات نەمدەزانی دەڵێ چی, یەکسەر پێم گوت: راست نییە, ئیعترافم نەکردووەو نایکەم. ئەویان بردە دەرێ منیش دوو شەپازلەیان لێدام.

جارێکیان منیان بردە سەربان بۆ ئەوەی هەتاو لێم بدات، دیتم شفیقی برام فەرش دەشوات، بەچاو یەکترمان دواند، دوور بەدوور تێمگەیاند کەتەندروستیم زۆر باشە, ئەوەتا وەرزش دەکەم. سێهەم جار بردیانین ئەشیعەی سنگمان وەربگرن.

دووەم لێکۆڵینەوە لەسەر پارتی — بارزانی، کەمن پەیوەندیم هەبووە، رۆژانە هەموو دەنگوباسێکی حکومەتم بۆ ناردوونو بەڕاستەوخۆ پەیوەندیم بەمسعود بارزانییەوە هەبووە, نامەکانم لەڕێگەی شەفیقی برام ناردووە. بەهیچ جۆرێك دانم پێدا نەنا کەمن لەگەڵ پارتی یان مسعود بارزانی هیچ پەیوەندی یەکم هەبێت. رۆژێك بانگیانکردم گوتیان تا کەی دان بەخۆتا دەگریتو دەڵێیت پەیوەندیم بەمەسعود بارزانییەوە نییە؟ ئەی کەناونیشانەکەمان هێنایت (کلمة السر) (بەیروت– مارتینس)؟ هەرچەندە چاوم بەستراوەتەوە بەڵام رووبەڕوویان بەزەردەخەنەیەکەوە گوتم ئەم شتە سەیرانە چییە باسی دەکەن؟ (قسەکانیان زۆریان ترساندم ئەوەندەی نەمابوو تووشی نەخۆشی دڵ ببم). راستە من ئەو ئوتێلەم زۆر دیوە، چونکە خاوەن ئوتێل حەسەن توحلەیەو کاکەی حاجی محمود بەشدارە لەو ئوتێلە بەهۆی ئەوەوە سەردانی شەخسی کاکەم دەکرد.

مرۆڤ پەیوەندی لەگەڵ سەرکردە بێتو نهێنی یەکەی ئاشکرا بێت زۆرم لا سەیرهات کەئەمە تەنها خۆم و کاك مسعود بارزانی دەیزانین. چۆن ئەمە لەمەکتەبی ئەوەوە چووە شوێنێکی دیکەو ئینجا دەست مخابرات

کەوت؟! لێپرسراوی مەکتەبەکە گوتی: تکات لێدەکەم با لەگەڵ بەڕێزتان تووشی ئازارو ئەشکەنجە نەبین، راستە باوەڕمان کرد کەتۆ سیخوڕی دەوڵی نیت، بەڵام کارت بۆ شەخسی جەلالو مسعود کردووە. ئێمە دەتوانین ئەنجن ئەنجنت بکەین، بەڵام دەمانەوێت خۆت دانی پێدا بنی یت لەبەر ئەوەی لەمەکتەبی کاروباری شمالو (مجلس قيادة الثورة)و مەکتەبی (سيد نائب) دەنگوباسە نهێنی یەکان بڵاوبۆتەوە. ئێمە گەیشتینە ئەو باوەڕە کەئەمە هەمووی ئیشی تۆیە دان پیانانت دەبێتە هۆی ئەوەی ئەم گومانە لەسەر ئەو شوێنە گرنگانە لابچێت. جەنابی سيد نائب زۆری لەلا گرنگە ڕاستی یەکەی بزانێت، راستی‌یەکەشی لای تۆیە فەرموو قسە بکە. گوتم: من لەیەکەم ڕۆژەوە هیچ پلەیەکی ئاشکرام نەبووە، وەکیلی ئەمن بووم, لەناو کورد بەسیخوڕ ناوبراوم، نازانم هۆی چی‌یە ئەو هەموو بایەخەتان داوە بەمن، کابرایەکی بەستەزمانی نەخاوەن شەهادەیەکی بەرز، بۆچی هەموو ئەوەی کەڕوویداوە لە(قيادە) تیشك بخرێتە سەر من, جار نی‌یە باسی ئازارو ئەشکەنجەم لەگەڵدا نەکەن، من لەبەردەستاندام، دەتوانن هەموو شتێکم لێبکەن.

ڕۆژێکی‌تر بانگیانکردم کەپەیوەندی تەواوت بەجەلال تاڵەبانی یەوە هەبوو, هەموو دەنگوباسێکی قیادەت بەجەلال داوە، ئەویش لەڕێگەی خۆیەوە داویەتی بەبارزانی‌و لەو دوای بیانەدا بەسوریا. گوتم من لەپەنجاکانەوە کاتێك لەشەریکەی نەوتی کەرکوك کاتب بووم، تەمەنم شانزدە ساڵان دەبوو لەوکاتەوە جەلال دەناسمو سيد نائب باش دەزانێتو ئاگادارە، پێش گرتنم بە ١٠ یان ١٥ ڕۆژ لەناوچەی شاخی قەندیل بووم زۆر نزیك بووم لەبارەگای عمر مصطفی ئەگەر شتێکم لەخۆم شك ببردایە دەچوومە پاڵیان، جەلال پێویستی بەوە نی‌یە من دەنگوباسی بدەمێ. گوتیان لەکەیەوە مسعودو ئیدریس بارزانیت نەدیوە؟ گوتم: لەساڵی ١٩٦٤وە, ساڵی ١٩٦٥ ئامر بەتالیۆنی نۆ بووم لەهێزی قەرەداغ رامکرد، بەناخێری گیانم هاتومەتە پاڵ حکومەت, چەند جار ویستوویانە تیرۆرم بکەن، جارێکیان بۆمبێکیان لەناو ئوتومبێلەکەدا بۆدانام شانسی خۆم نەتەقیەوە، جارێکیشیان کەنوری فیصل شاهر بەڕێوەبەری ئاسایشی سلێمانی بوو, لەڕێگەی(ابو مازن)ەوە ئاگادارکرامەوە کەمەفرەزەیەك بەسەرپەرشتی حەسەن ناوێك هاتوون بۆ کوشتنت.

جارێکی‌تر بانگیانکردم گوایە من لەکودەتاکەی نازم گزار ئاگاداربوومو بۆ دەرەوەی وڵات رامکردووە. گوتیان: پەیوەندیت چی‌بوو بەنازم گزارەوە؟ گوتم لەپێش کودەتاکە بە ٢٤ سەعات من بەشێوەیەکی رەسمی چوومە دەرەوەی وڵات, ماڵو منداڵەکانم لەگەڵدابوون. گەڕامەوە سيد نائبو وەزیری ناوخۆ بۆیان ڕوون بۆوە کەمن هیچ پەیوەندی یەکم بەو کودەتایەوە نی یە، لەکۆتای یدا سيد نائب پی ی گوتم: باشتکرد کەڕاتکردووە.

دوای مانگێکی تر دەربارەی حەمەی مەلا شریف پرسیاریانکرد ئەم کابرایە پیاوکوژە, تۆ بۆچی ئەو بایەخەت پێداو کردت بەشۆڕشگێڕ، ئینجا راپۆرتێکی شێواوت ئاراستەی مەکتەبی کاروباری شمال کرد بۆ چارەسەرکردنی ئەو کێشەیە؟ باش بۆمان روونبۆوە حەمەی مەلاشەریف بنکەی بارەگایەك بوو دروستتکرد

پێش ئەوەی جەلال تاڵەبانی بێتەوە بۆ کوردستان. گوتم گرتنی من بوو بەهۆی ئەوەی خەڵك گومان لەحکومەت بکات. ئەو کابرایە کردمانە وەکیل بەمانگانەی ۲۰۰ دینار، زۆر خۆشحاڵبوو بەو شێوەیە حکومەت باوەڕی پی یەتی، بەڵام لەیەکەم رۆژەوە کەهەستیکرد رەفیق نەماوە ئیتر لەخۆی دەترسیٚ.

چەند جار بەدوورودرێژی باسی ئەو شەڕانەیان لەگەڵ دەکردم کەکاتێك من ئامر بەتالیۆنی نۆ بووم، وەڵامم دەدانەوە کاتێك کەهاتمەوە، خۆم تەسلیم بەحکومەت کرد، ئینجا فرقەی دوو منیان نارده بەغدا, عبدالرحمن عارف کەسەرۆکی ئەرکانی سوپا بوو، پرسیاری لێکردم چەند کەستان لێکوژرا لەو شەڕانەدا، کەژمارەیەکم پێگوت ئەوەندە کەس بوو زۆری لا سەیربوو، ئەو ژمارەیەی کەمن پێم گوت لەگەڵ بڵاوکراوەی فرقەی دوو جیاوازی یەکەی یەك و پەنجا بوو, هەر بەو شێوەیەش عبدالسلام عارفم ئاگادارکردەوە ئەوە شەڕەو کوژراوی تێدا دەبێت و برینداریشی تێدا دەبێت، ژمارەی بەتالیۆنەکەم ٤١٧ کەس بوو، هێزێکی نیزامی نییە کەهەرچی یان پیٚ بڵێم بەقسەم بکەن, ئەوانە لەبیروباوەڕێکەوە دەجووڵێنەوە تەنها دەسەڵاتت بەسەر خۆتدا هەیە بۆ بڕیاردان. گوتیان: ویستووتە سید نائب تیرۆر بکەیت. گوتم تکام وایە ئەم وشەیە جارێکی تر مەیخەنە بەرچاوم و گوێم لیٚ نەبیٚ، چونکە سید نائب لای من رێزێکی تایبەتی هەیە، من لەهەموو ڕوویەکەوە قەرزاری ئەم زاتەم. لەژیانمدا کەسم تیرۆر نەکردووەو بیریشم لەوە نەکردۆتەوە بەتیرۆرکردنی خەڵك ببمە خاوەن کۆشك و ئوتومبێل و پارە.

چەند جارێك خەڵکیان دەهێنا منیان لەشوێنێك ڕادەگرت, لەتەنیشتم دوو کەسیتر رادەوەستان, بەرامبەرەکەم دور لەمن بەپێنج مەتر سەری پێچابۆوە عەینەکی لەچاودابوو, ماوەی نیو سەعات ڕایاندەگرتم ئینجا منیان دەهێنایەوە شوێنی خۆم. ڕووبەڕوو پی یان گوتم ئیتر ئەمە دوا لێکۆڵینەوەیە، دان بەتاوانەکانتدا دەنی یت یان نا؟ کیٚ هەیە قینی لێت بیٚ؟ دوژمنت کیٚیە؟ گوتم بەو جۆرەی کەئێوە ئەم هەموو پرسیارو وەڵامەتان لێکردم گومانم نییە کەنیوەی گەلی عێراق بەعەرەب و کوردەوە دوژمنی منن.

رۆژانە نزیکەی بیست و پێنج تا سی نوێژم دەکرد, رۆژی دەهەزار جار (الله — سبحان الله — والحمدلله)م دەکرد, رۆژانە هەشت سەعات قورئانم دەخوێند. وام لێهات دوای نزیکەی ۱۰ مانگ هەموو شتێکم دەدی و راستەوخۆ دەهاتە بەرچاوم، بۆ نموونە کەسوکارم هاتبوونە لام گوتم: خۆ کمالی برام کاتیٚ کەئوتومبێلەکەی وەرگەڕاوە تووشی ئازار نەهاتووە, سەلامەتە. ئەوان سەریان سوڕما. جارێکی تر کەسوکار هاتنە لام پێم گوتن نەخۆشییەکەی ڕەوەزی کوڕم خۆ (انشاءالله) خراپ نییە، دڵم زۆر لایەتی. وایانزانی بوو کەئاگام لەدەنگوباسیانە. جارێك زکیە اسماعیل حەقی یان هێنایە مخابرات. وابزانم زیاد لە۱۰ رۆژی پیٚچوو, بەجۆرێك وەڕس و بیٚتاقەت بووم، چونکە دەمگوت ئێستا ئیعترافم لەسەر دەکات. گەیشتمە حاڵەتێك نوێژی نیوەڕۆم نەکرد، وشەی ناشیرینم بەکار دەهێنا، کاتیٚ بردیانم بۆ دەست شۆردن گوێم لەدەنگی زکیە بوو

دەیگوت ماڵی باوکم لێرەوە زۆر نزیکە، پێویست ناکات ئێوە بەئوتومبێل بمگەیەنن، ئینجا دەستمکرد بەپاڕانەوە لەخودای گەورەو تێر تێر گریام، داوامکرد لەیەزدانی مەزن کەلەم گوناحەم خۆش بێ.

رەمەزان بوو, چوارەمین رۆژ ئێوارەکەی پێش بەربانگ، تەماشای سینیەکەی خۆمم کرد، بریتی بوو لەسەمونێکی عەسکەریو قاپێ ماستی ترشاو و شەش دەنك خورما. لەدڵی خۆمدا گوتم: خوایە من باوكو باپیری خۆمم دیتووە بەدەوڵەمەندی، خۆشم دەوڵەمەند بووم، بەقوربانت بم رۆژو واناگیرێت، زەحمەتە، ئاوڕێکم لێبدەوە. هەر لەگەڵ خۆم ئەو قسانەم دەکرد. لەپڕ دەرگا کرایەوە کاربەدەستێکی مخابرات هاتە ژووریێ پرسی ئایا بەرۆژوویت؟ خواردنەکانت چیە؟ گوتم: نانی بەیانی تەنها ماستەکەی هەڵدەگرم، نانی نیوەڕۆ کەبۆم دێت وەکو خۆی دەگەڕێتەوە چونکە سارد دەبێتەوەو رۆنەکەی دەمەیێت، ژەمی سێیەم کەنانی شەوە دوای بەربانگکردن بەسەعاتو نیوێك دێت ئەویش بۆ پارشێو ئەو سوودەی نابێت. گوتی: کەبانگیدا رۆژووەکەت بشکێنەو نوێژ بکە، بەلأم نان مەخۆ. دوای نیو سەعات هاتەوە ژووریێ کیسێکی رەشی داناو رۆیشت، کەکردمەوە مریشکێکی مەحشی تێدابوو، دەستمکرد بەخواردنی لەسنگەکەو نیازم وابوو برنجەکەو رانەکانی هەڵگرم بۆ پارشێو، کاربەدەستەکە هاتەوە ژووریێ گوتی: بۆ تۆ چۆن باشە لەمانگی رەمەزان بەدوو جۆر خواردنت بۆ دێ, ژەمێکیان گۆشتو کەبابو ژەمەکەیتریان مریشك. گوتم: سوپاسی هەستی برایانەت دەکەم، لوتفتان زیاد بێ، خودای مەزن رەحم بەهەموو هەژارو لێقەوماوێك بکات، بۆ ئێوارەکان (مشوی مشکل) باشە بۆ پارشێویش مریشکەکە.

لەو کاتەی ئازارو ئەشکەنجەیان دەدام ئەو دینە ئیمان و باوەڕی وا بەهێز کردبووم کەوا دەهاتە بەرچاوم ئەمە شانۆیە.

دوای چاکردنەوەم هەوڵیان دا(مسح دماغ)م بکەنو دەست لەئیشی خودا بدەن، خوا بەگەورەی ی خۆی شتێکی نیشاندام کەچارەسەری ئەم هەڵوێستەی بەعس بکەم. رۆژانە (دوای ١٠مانگ) هەستم وای لێهات کە لەسەیرانم، من بەند نیم. پرسیارم دەکرد ئایا من لەسێدارە دەدرێم؟ پی یان دەگوتم لەسێدارە نادری یتو ئەو شوێنەیان دەخستە بەرچاوم کەڕووی تێدەکەم، راستیەکەی کەحوکم درام چوومە ئەو ژوورەی کەهاتبووە بەرچاوم. کاتێك حوکمدرامو هاتمە بەندیخانەو ناو خەڵك، تووشی قسەو گفتوگۆ ڕووبەڕوو لەگەڵ خەڵك، ژن وپیاو، ئەوەی کەپێشووتر دەمدی هیچی نەما. کاتێك کە لەئاسایشی گشتی گواسترامەوە بۆ مخابرات ئەمە دووەم جارە لەگەڵ کەسوکارم یەکتر ببینین، ئەویش لەمانگی تەمموزی ١٩٧٧ بوو. چونکە پێشتر رووباری کچم تەلەفۆنی لەگەڵ صدام کردبوو لی ی پاڕابووەوە کەلوتف بفەرمویت بۆ بەردانم. صدام دەڵێت: سید رفیق خیانەتی لێکردووم، دەبێت لە(باب شرقی) هەڵیواسینو پارچەپارچەی بکەین، بەلأم من مامتانم، چیتان دەوێتو پێویستتانە مانگانە بۆتان جێبەجێ بکەم، تۆ منداڵیت نازانیت سیاسەت چیە. رووبار دەڵێت: سوپاستان دەکەین یارمەتی ماددیمان ناوێت. ئەگەر ئەمر بفەرمویت چاوێکمان بەباوکم

بکەوێت. صدام دەڵێت: بەیانی سەعات ١٠ لەئاسایشی گشتی چاوتان پێدەکەوێت...پـێم گـوتن ئەمـە دووەم جـارە بـەدیتنتان شـاد دەبم (دایکـم و کـەمال ودایکـی بازیـان‌و رووبـارو بازیـان‌و رەوەزو خـەرمان‌و شـلێرو حەسەن‌و نادر بوون).

## ئازارو ئەشکە نجە

چاویان بەستمەوە، بردمیانە ژێرخانێك ١٠ × ٧م بوو، چۆن ماکینەی ئوتومبێل هەڵدەواسن بەهەمان شێوە دوانی لەم جۆرەی لێبوو، دەستیانکرد بەلێدانم بەکێبڵ. دوانزە رۆژ بەم شێوەیە ئازارو ئەشکەنجەیاندام, بـەقاچ هەڵواسـین، بەدەسـت هەڵواسـین، بـەکارەبا، نینۆکـەکانیان هەڵکەنـدم، ناوەناوە لەپشتم بەقەدەر دەنکە نۆکێك گۆشتیان دەکردەوە. بیـست وچـوار سـەعات میـوانی کوردێـك بـووم لەژوورەوە بەیەکەوە لەژێر دیوارێکدا بووین بەرزای یەکەی ١م بوو، پانای ی ژوورەکـەش ١م بـوو، زمانیـان وا لێکردبوو بەقەدەر زمانی گوێرەکەیەکی لێهاتبوو، خۆی نەدەناسی‌یەوە، بـەجۆرێك ترسـابوو چـۆن کەچـوومە ژووریێ بەچیچکانەوە دانیشتبوو هەروا مایەوە هەتا هاتمە دەرێ، وام لێهـات وەکـو منـداڵێکی شـەش مانگـان بجووڵێمەوە، کەگەیشتمە ئەوەی واگیان دەدەم بەپێی رای دکتـۆر کـە بـەئینگلیزی قـسەیان لەگەڵدا دەکـات دەڵێ ئەمە وا گیان دەدات. خۆشم ئاواتم بوو رزگـارم بێـت، خـۆ ئەگـەر شـتێك هەبوایـە خـۆم پـێ بکوشـتایە یەکسەر دەمکرد، لەپاڵ ئازارو ئەشکەنجەدا هەوڵیاندەدا کەنەخەوم، هەرچەندە ئازارو ئەشکەنجە وای لێکردم کەبەم جۆرە چاوم بەخۆم دەکەوت لەو تەمەنەدا میز بەخۆمدا بکەم، بەناچـاری هـاوارم دەکـرد، جارجـاریش دەگریام، ئەوەندە وەڕس بووم تەمەننای مردنم دەکرد.

کەڵکی ئەوەم نەما کە بەپێوە ڕاوەستم، لەسەرکورسی‌یەك دایاننابووم، قاچـم دوو مـەتر لـەزەوی یـەوە دووربوو، دەستیان بۆ سەرو ملم نەبردبوو، لەئەژنۆم بەرەوخوار تا نـوکی قاچـم بـەجۆرێك ئاوسـابوون لەگـەڵ ڕانم لەیەکتری دەکەوتن. هەردوو دەستم لـەئیش کـەوتن, میـزو خـوێن تێکـەڵ ببـوو، دوای ئـەم هـەموو تـۆپ تۆپێنەی پی یان کردم، ئینجا دەستیانکرد بەپاڕانەوە، دەیانگوت: تکات لێدەکەین پێش ئەوەی بمریـت چـی دەزانیت پێمان بڵێ. دوانزدە رۆژە ژیانت لەئێمە حەرامکردووە !

کاتێ ئازارو ئەشـکەنجەدەدرام مـردنم بـەئاوات دەخواسـت، زۆر مانـدووبووم, لـەپڕ وێنـەی ئـەو پیـاوەی تەمەنی ٦٠ ساڵ بـوو کەچـەند سـاڵێك لەوەوبـەر هاتـە بـەرماڵمان‌و داوای خـواردنی کـرد، پـارەم پێدا گـوتی برسیمانەو ژنەکەم کۆچی دوای ی کردووەو هەشت منداڵم هەیە، هاتە بەرچاوم. کاتێك خواردنەکـەی وەرگـرت دایکم بانگی کرد، لەبەیانی‌یەوە هەموو رۆژێك وەرە خواردن بۆ خۆتان بەرە. برادەرێتیمان پەیداکرد، رۆژانـی هەینی لەگەڵ هەشت منداڵەکەی دەهاتن‌و مانگانە بڕی حەوت دینارم دەدایـە. بـەخۆی‌و منداڵـەکانی قـسەیان لەگەڵ دەکردم، دڵیان دەدامەوە دەیانگوت مەترسە, هیچت بەسەر نایەت, رزگارت دەبێـت خـۆم‌و منداڵـەکانم لەخودا دەپاڕینەوەو دوعای خێرت بۆ دەکەین کەانشاءالله سەلامەت دەبیت. منـیش ئیمـانم بـەهێز دەبـوو

زەردەخەنـەم دەهـاتیْ، قەسـابەکانی بـەعس وایانـدەزانی خەریکـە شـێت بم، ئەوکاتـە هەسـتمکرد بـەوەی کەڕاسـتیەکەی دڵـم کراوەتـەوە, ئەوەنـدە هەسـت بـەئازار ناکـەم, ئـەوان لەبەرقاچـم دانیـشتوون (خێرکـردن بەهەژارو لێقەوماوان لای خوای مەزن هەرگیز گوم نابێت). لەدڵی خۆمدا دەمگوت: چـیم لەگـەڵ بکـەن تۆڵـەی خۆتان ناکەنەوە، ئێستا شانازی پێوە دەکەم کەدوژمن بەم دڕندانەیـە لەگـەڵ مـن دەجووڵێتـەوە. بەداخـەوە ئەوەی منـی پـێ دڵتـەنگ دەبێـت ئەوەیـە کـەمنیان لەسـەر کورسـی یەکـە هێنایـە خـواریێو بەچاوبەسـتراوی خستمیانە ناو بەتانی یەك، لەجێگایەکیان دانام، لەناو ژوورەکە پاڵ کەوتم. دوای ماوەیەك هەڵیانگرتمو بـەدوو دەست لەسەر قەنەفەیەك دایاننام، پەڕۆکەیان لەسەر چـاوم لابـرد، بینـیم بـارزان تکریتیی‌یـە(مـدیر المخـابرات العامە) گوتی: رفیق تۆ وا گیان دەدەیت، خۆتت دیوە چۆن خوێن لێت دێتـە خـواریێ, ئـیعتراف بکـە، چـاکت دەکەینەوە، بەشەرەف دەتنێرمەوە لای حاجی (واتە دایکم)، بیری منداڵەکان ناکەیت؟

کاتـێك گەیشـــتمە ئەو باوەڕەی کـەنەمانی صەدام دەبێتە هۆی گۆڕانێکـی یەجــگار سوودبەخش بۆ هەموو دانیشتوانی عێراق بەتایبـەتی کـورد، خـۆم بـەخۆمم دەگـوت دوو جـار بـۆم هەڵکـەوت صەدام تیرۆر بکەم، ئاخم هەڵدەکێشا کەبۆچی تیرۆرم نەکرد, بەقسەی ئەو برا مەزنەم نـەکرد کـەگوتی رفیـق دەتوانیت صدام بکوژیت، بۆچی بەقسـەم نـەکرد، راسـتە لەسـێدارەیان دەدام، بـەڵام لەئێـستام کـەخۆم بـەم جۆرە دەبینم گەلێك باشتر بوو. گوتم: گرنگ ئەوەیە تـۆ بمبینیـت کـاتی خـۆی منـت دیـوە هـیچ جارێـك بـەم شێوەیە هاتوومە لات کەخوێن لەگەڵ میز تێکەڵ بووبێت، پیێخـواس، هـەردوو دەسـتەکانم لـەئیش کـەوتووە، قاچـم بەشـێوەیەك ئاوسـاوە لەگـەڵ ڕانم جیاناکرێتـەوە؟ بێـدەنگ بـووم. هەڵـسا چـووە دەرەوە, ڕوویکـردە (قەصابێك) ئەوەی سەرپەرشتی لێکۆڵینەوەو ئازارو ئەشکەنجە دەکاتو پـی یگـوت بەکـەیفی خۆتـان بکـەن. بارزان پی ی گوت: ئیشی خۆتان تەواو بکەن لەگەڵیدا. دوو سـەعات زیـاتر مامـەوە لەسـەر قەنەفەکـە ئینجـا کــەبارزان رۆیــشتە دەریێ، دوای ماوەیــەك قەصــابەکەش چــووە دەرەوە. دوای ی (قەصــابەکە) وەکــو فریشتەیەك هاتە ژووریێ (بین المغرب والعشاء یفعل الله مایـشاء) دەسـتبەجیێ لەسـەرخۆ، سـیێ دۆلکـە ئاویـان بەدەمدا کردم، پێنج کوپ چایان بەدەمداکردم، ئینجا بردمیانـەوە ژووری تـەداوی تایبـەتی خۆیـان، لەهـەمان خانوو لـەنهۆمی دووهەمـدا. بەپەلـە چـەند دکتۆرێك هاتنـە سـەرم فەحـصی هـەموو گیانیـان کـردم، گوتیـان نەخۆشی دڵت نی‌یەو یەکسەر عەمەلیاتیان کردم بۆ ئەوەی تووشـی نەخۆشـی کـانگرین نـەبم، لەسـەر پـشتی قاچم لەسەرڕووی پەنجەکانەوە بەقەدەر شقارتەیەك لەگۆشتیان بڕی. تاکو چاکیان کردمەوە، رۆژی چوار جـار دکتۆرەکان دەهاتنەسەرم، ئەوەندە پێمەوە مانـدووبوون سـەرم سـوڕمابوو, دەبێـت مەبەسـتیان چـی بێـت؟ ئەوەی لایان گرنگ بوو ئەوەبوو کەهەردوو دەستم ئیش بکات، وەکـو منـداڵێکی پیـنج مانگـان دەبـوو یـەکێك لەگەڵمدا بێت بۆ تەوالێت پاکم بکاتەوە.

رۆژێك دکتۆرێك هاتە سەرم، کەئەمە یەکەم جاربوو بیبینم, رێگەی نیشاندام، ئەویش وەرزش بوو بۆ چاکبوونەوە.

## دادگای شۆڕش ( محكمة الثورة )

### یەکەم دانیشتن

سەعات شەشی سەرلەبەیانی رۆژێکی مانگی نیسانی ١٩٧٨ دەرگایان کـــردەوە، تاقمی ڕیش تاشینیان دامێ، ئینجا بردیانم بۆ حەمام، جلەکانم لەبەرکرد. سەعات ٨,٥ سواری ئوتومبێلیان کردم, کاتێك لەگۆڕەپانی دائرەکەوە چوومە ناوەوە سەرنجمدا وا شەفیقی براشم دانیشتووە. لەچەکدارەکانی مخابراتم پرسی چیمان لێدەکەن؟ بۆ کوێ دەچین؟ ئەمانە وەکو منداڵی ساوا جارێ زمانیان نەگرتووە کاکە شەفیق بۆیە هیچمان پێ ناڵێن. کاتێك گەیشتینە کەڕادە, لەبەردەرگای دادگای شۆڕش ڕاوەستابووین. لەدالانێکی گەورە دایاننایین، کورسییەکیان بۆ من هێنا لەسەری دانیشتم، چەند کەسێکی لێبوو سەرنجی منیاندا, ئەمە کێیە کورسی بۆ دێنن؟ رەنگە شاهد بێت یان ئەفسەرێکی مخابرات. ئێمەیان بردە ژووری سەرۆکی دادگا. سەرۆك و دوو یاوەرەکەی لەگەڵ (مدعی عام) و دوو کاتب لەمسەرو ئەوسەری ژوورەکە دانیشتبوون. من و شەفیقیان بەرامبەریان ڕاگرت. سەرۆك چەند پرسیارێکی کرد" ناوتان چییە؟ دوای ئەمە هاتینە دەرێ، دادگایی دواخرا, بۆ کەی؟ نازانم و پێت ناڵێن.

### دووەم دانیشتن

لەمانگی مایس ١٩٧٨ ئامادەیانکردین (ڕیش تاشین و حەمام و خۆگۆڕین) سەعات ٨ ئێمەیان برد بۆ دادگا، سەعات ٩ چووینە ژووری سەرۆکی دادگا کە سەرۆك و دوو یاوەرو مدعی عام و دوو کاتب, یەك بانگکەرو هەشت (انضباط)ی لێبوو.

(مدعی عام) تاوانەکانی یەك لەسەر یەك خوێندەوە گوتی: چوار جار هێرشت بردۆتە سەر سوپای عێراقی، بوویتە هۆی کوشتن و بریندارکردنی چەند سەربازێك، دەرکەوتووە کەدەستێکی باڵات هەبووە لەکۆمەککردنی بارزانی، ئەو شتە نهێنییانەی کەشاراوەو تایبەتە بەحکومەت داوتە بەبارزانی و لەڕێگەی ئەوانەوە گەیشتۆتە دەست ئێران و ئیسرائیل. پەیوەندیت هەیە بەکۆمەڵە. بەنهێنی کارت بۆ کردوون، سەردانی ئەو تاوانبارانەت کردووە کەحوکم دراون بەسێدارەو چوویتە لایان بۆ بەندیخانە، بەشداربوویت لەکودەتای نازم گزار، پیاوکوژو تاوانبار حەمەی مەلاشەریفت کردۆتە نیشتمانپەروەر، بەهۆی تۆوە توانیویەتی بارەگایەك دابنێ بۆ حەسانەوەی پێشمەرگەو ماڵ و منداڵیان, هەروەها جەلال تاڵەبانی لەمە زۆر سوودی وەرگرتووە، لەڕۆژی هەڵگیرساندنەوەی شەڕ کە بەسەرۆکایەتی جەلال دەستی پێکردووە لەهەموو جووڵانەوەیەك چ نزیك یان دوور

بەشدار بوویت، هەوڵتداوە یارمەتی ئەم بەکرێگیراوانە بدەیت، توانیوتە لەخەزێنەی دەوڵەت پارەیان بۆ وەرگریت. داوا لەسەرۆکی دادگا دەکەم کەگەورەترین سزا بەسەر ئەم تاوانبارە بدەن کەئەویش لەسێدارەدانە، براکەشی نامەکانی بردووە بۆ مسعود بارزانی, داوای حوکمی ٢٠ساڵی بۆ دەکەین. ئینجا کەمدعی عام لەخوێندنەوەی ڕشتەی تاوانەکانم تەواوبوو دانیشتەوە.

سەرۆکی دادگا گوتی: بانگی شاهد حبیب محمد کریم بکەن. بانگکەر داوای حبیب محمد کریمی کرد.

سەرۆك پرسی: ناوت؟ وەڵامی دایەوە: حبیب محمد کریم.

ئیشت: فەرمانبەر.

سەرۆکی دادگا گوتی: سوێند بخۆ کەڕاست دەڵی یتو چی دەزانی بەرامبەر رەفیق مامە صادق (دەستی بۆ من درێژ کرد) حەبیب گوتی: بەهۆی رەفیق بەشی زۆری دەنگوباسەکانی حکومەتمان دەزانی، ئاگاداری دوو نامەم کەبۆ شۆڕشی نارد یەکسەر پەیوەندی بەدەزگای پاراستنەوە بوو کە بەسەرۆکایەتی مەسعود بارزانی بوو، نووسراوەکانی لەڕێگای شەفیقی برای دەنارد.

سەرۆکی دادگا: وشەی مامە بەعەرەبی چیە؟ حبیب گوتی: وشەی مامە کوردیە بەعەرەبی واتە (العم). سەرۆکی دادگا گوتی: رەفیق تۆ دەڵێی چی؟ گوتم: ئەم پیاوە دوژمنایەتی هەیە لەگەڵمدا. ئەمە لەگەڵ (...) رایدەبواردو بارزانی ئەمەی باش دەزانی, جارێکیان رووبەڕوو بارزانی ئاگاداری حبیب محمد کریمی کردبوو، حبیب بەو شەهادەتەی دەیەوێت ئێوە بڕیاری لەسێدارەدانم بدەن.

حبیب گوتی: سەرۆك تکایە لەزمانی رەفیق بمپارێزە.

گوتم: جەنابی سەرۆك نێوان منو پەتی سێدارە یەك مەترە, ئەوە سەرۆك لەگەڵ هەردوو یاوەرەکانیو مدعی عام، ئەمەش شاهید کەکێشەی من تەواوبووە، بەڵام حبیب دەزانیٚ رۆژێك زیندوو بوومەوە دەیخۆم، بڕوانە چەند لەسێبەرەکەم دەترسیٚ.

ئینجا حبیب چووە دەریٚ. سەرۆك داوای لەپارێزەر کردو ئەویش هەموو ئەو تاوانەی (مدعی عام) دابوویە پاڵم, دانی پێدا نا.

بەڕاستی نەمدەزانی کەشانۆیەکی ئاشکرایەو دەسەڵاتی دادگای شۆڕش ئەمەیە.

گەڕاینەوە مخابرات, هەریەکەمان چووینە ژووری خۆمان. بەیانی دەرگا کرایەوە, زۆر زوو بوو (فلاٚن) هاتە ژووریٚ گوتی: لەسێدارەت دەدەن، گوتم: راکەم؟ گوتی: من دەڵێم راکە، گوتم: خۆم بکوژم؟ گوتی: تۆ مرۆڤێکی زاناو تێگەیشتووی زۆرم لا ناخۆشە لەسێدارە بدری یت، بیر بکەرەوەو خۆت رزگار بکە, ئەمە هەموو دەسەلاٚتێکی منە.

## تێبینی

*١–وەسیەتم بۆ بازیانو رەوەزی کورِم کردووە ئەگەر ئەو پیاوە هاتە لاتان تەنها خێزانەکانتان نەبێت، چی پێویست بوو بۆی جێبەجێ بکەن.*

*٢–سێ رۆژ لەسەر یەك بیرم دەکردەوە، چی بکەم، قورئانم بەرزکردەوە هاوارم بۆ خودای مەزن دەبرد کەرێگەم نیشان بدە.*

لەئەنجامدا بریارەمدا لەرِی ی ئەم دوو خاڵەی خوارەوە دەستبەکاربم:

١–جارێکیان تەلەفۆنم لەگەڵ صدام کرد گوتم دەمەوێت بێمە خزمەتت, گوتی:چیت دەوێت؟

گوتم: تێوەگلاوم. گوتی: کێ تۆی تێوەگلاندووە؟ گوتم: تۆ! گوتی: بۆ من خەڵك تێوەگلێنم؟ گوتم: بەهۆی تۆوە نیوەی گەلی عێراق تێوەگلاوە. گوتی: (یبین لاحگ, تعال بالعجل). بەغدای ی کەباینجان پێدەگات دەڵێن (لاحگ)، دیارە پێگەیشتووە بەپەلە وەرە.

٢– ساڵی ١٩٧٦، جارێکیان لەگەڵ صدام گفتوگۆم دەکرد، باسی بارودۆخی سیاسی ئەو رۆژەم بۆ دەکرد کە لەبەیروت تازە هاتبوومەوە. صدام قسەکەی بریم و گوتی: ئێستا کاتم نیيە گوێت لێبگرم، چونکە لەگەڵ هاورێیەکی کۆن بەیەکەوە دەبین‌و گفتێکی دانیشتنی سیاسیم هەیە, رۆژێکی‌تر دەنێرم بەشوێنتدا. گوتم: ماوەیەك لەبەیروت بووم دەمەوێت ئەوەت بخەمە بەرچاو کەشتی گرنگ هەیە بەباشی نازانم دوابکەوێت، بائەم باسانە پێکەوە باس بکەین، گوتی: ئەمە دووهەم جارە پێت رادەگەیەنم دەڵێم دەنێرم بەشوێنتدا. گوتم: ئاخر گرنگ‌و گرنگتریش هەیە. گوتی: هەڵسە برۆ دەرەوە. گوتم: نەتۆ نەسوپای عێراق نەبەعس هێز نیيە من دوور بخاتەوە لێرە تاکو قسەکانم تەواو نەکەم. صدام پشتی

تێکردم‌و وردەوردە رووی تێکردمەوە, دوو پەرداخ شیری بەسەر یەکەوە خواردەوە.

قسەکانم دەربارەی کێشەی کورد بوو لەعێراق لەحکومەتی شێخ محمودی نەمرەوە تاوەکو هەرەسەکەی بارزانی‌و دووبارە هەڵگیرسانەوەی شۆرش، ئەمە نزیکەی دوو سەعاتی خایاند، کەتەواوبووم ئەوەی دەمزانی بۆ بەرژەوەندی وڵات پێم گوت، ئینجا هەڵسام برۆم. گوتی: بۆ کوێ دەچیت وا کتوپرِ هەستایت؟ گوتم: دەچمە بنکەی پۆلیسی وەشاش‌و بنکەی پۆلیسی مەنصور دەڵێم من بەفەرمانی سید نائب دەستبەسەرم. گوتی: چما من دەڵێم دەستبەسەریت ؟! گوتم: بەرێزتان دەڵێن برۆ دەرەوە. گوتی: دانیشە. ئینجا پرسی: بابەکر ئاغا چیتە؟ گوتم: بابەکر ئاغا بەخزمایەتی هیچم نیيە. گوتی: بابەکر ئاغا محمود دەڵێم, ئێوە خزمایەتیتان هەیە من وا سەرنجی راکێشاوم. گوتم: من بەرەگەز خەڵکی کۆیەم، بەڵام باپیرم ١٥٠ ساڵە هاتۆتە پشدەر, لەقەڵادزێ جێنشین بووین‌و بەپشدەری ناسراوم، ئێمە بنەماڵەیەکین نزیکەی ٩٠ خێزان دەبین, سوقاقی نین , جێگای خۆمان کردۆتەوە، باوکم دۆستێکی دێرینی محمودئاغاو بەگزادەی ئاغاواتی پشدەر بووە خۆشم دۆستێکی هەموو ئاغەواتی پشدەرم‌و لەگەڵ بابەکرئاغا نێوانمان لەبرا خۆشترەو شانازی

پێوە دەکەم، باوکم پیاوێکی کاسب بووە، بۆ خۆشم توانیومە جێی خۆم بکەمەوە، گەیشتمە پلەی ئامر بەتالیۆن لەناو پێشمەرگە، بەڕێزتان داواتان لێکردم کە بەتایبەتی ئیشتان لەگەڵدا بکەم. بابکر ئاغای محمود ئاغای پشدەر یەکێکە لەبنەماڵە ئاغاکانی میراودەلی، سیاسەتمەدارێکی کورد، دڵسۆزو نیشتمانپەروەر، پارێزەر، خوێندەوار، زیرەك، ئازا، سەخی، ناسراو لەناو گەلی عەرەبو کورد، دێی هێرۆ جێگای پشوودانی هەموو کوردێکی سیاسەتمەدار بووە, حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێرانو پارتی لەوێ دەحەسانەوە، هەندێك جار نووسینەکانیان بڵاودەکردەوە، بابەکرئاغا لەحکومەتی بەعس چەند جار پلەی وەرگرتووە، بەوەزیری، ئێستا ئەندامە لە(جامعة الدول العربية). سەدام گوتی: سید رفیق هەردووکمان زۆر لێکدەکەین, ئێمەش لەخێزانێکی سوقاقی نین، خۆمان توانیومانە بەدەستی خۆمان پێبگەین، من کوڕە پۆلیسم، تۆ ئازاو زیرەك، منیش ئازاو زیرەك. ئینجا هەڵسا ئەملاو ئەولای ماچ کردم.

*تیشکم خستە سەر ئەم دوو خاڵەی سەرەوەو بیستو حەوت رۆژ لەسەریەك رۆژانە سێجار لەگەڵ خۆم دەرسەکانی خۆم دەگوتەوە کەئەو رۆژەی رووبەڕووی سەرۆکی دادگای شۆڕش چی بڵێم، زیاتر لەدوو سەعاتی خایاند.*

**سی یەم دانیشتن:**

سەرلەبەیانی رۆژێکی مانگی تەمموزی ١٩٧٨ سەعات هەشتو نیو لەگەڵ شەفیقی برام بردیانین بۆ دادگا. لەژێرزەمینی دادگا دایاننانین, روومکردە کاکە شەفیقم گوتم: من دان بەهەموو تاوانەکانی خۆمدا دەنێم. شفیق گوتی: بۆ شێت بووی, ئەمشەو خەونم پێوە دیتی لەخەونمدا چاکەتێکی عەسکەریت لەبەردابوو ئەستێرەکانی سەرشانت ئاڵتون بوو, خەڵکی کەلار بەپیرتەوە هاتبوون، برا ئەم هەموو ئازارو ئەشکەنجەیە دراین ئیتعترافمان نەکرد لەم دواییەدا ئیعتراف دەکەیت؟ گوتم: خەونەکەت جەنازەکەمە بەکەلاردا دەمبەنەوە, ئەستێرەکانیش ئەوە جاجمێکی سوورە بەسەر تابوتەکەمدا دەدەن. گوتم کاکە شتێکم بەدەستەوەیە بیستو حەوت رۆژە خۆمم بۆ ئامادەکردووە، چیم کردووەو چی دەزانمو چی پێشنیارێکم پێشکەش کردوون بۆ بەرژەوەندی وڵاتو هەموو کەموکوڕییەکیان دەخەمە بەرچاو، زۆر بەتوندی دەجووڵێمەوە تا قینی صدام خۆشبکەم ئینجا یا پەتەکەم لەمل لادەدەم یا لەسێدارە دەدرێم. باش بزانە ئەمەی ئیمڕۆ روودەدات دوا تاقیکردنەوەمە لەژیانمدا, سەرکەوتووبم یا تیابچم. بەهەرحاڵ قسەکانی ئیمڕۆم لەناو دۆستو دوژمندا بڵاودەبێتەوە, رۆژێکیش دێت کتێبێك لەسەر ئەو دادگای یەی من بڵاودەبێتەوە.

چووینە ژووری سەرۆکی دادگا, سەرۆك تاوانەکانی منی یەکە یەکە باسکرد کەئەمە بەپی ی یاسا بڕیارماندا لەبەرئەوەی تاوانبارە، دەستبەجێ پەنجەم هەڵبڕی داوام لەسەرۆکی دادگا کرد کەڕێگەم بدا دوو دەقیقە قسە بکەم. سەرۆك گوتی: کورسی بۆ بێنن, دیارە توانای نەماوەو پەکی کەوتووەو رووخاوە, پەرداخێك ئاویشی بۆ بێنن بابێتەوە سەرخۆی. گوتم: سەرۆك, دەمەوێت ئیعتراف بکەم. سەرۆکی دادگا

لەجێگەی خۆی لەسەر کورسی‌یەکە تەکانێکی دا, گوتی: بۆچی تۆ دەتەوێت ئێستا ئیعتراف بکەیت؟! گوتم: جەنابی سەرۆك من باش دەزانم کەحوکمی لەسێدارەدانم بەسەردا دەسەپێنی، بەلاّم ئەندامانی (مجلس قیادة الثورة) بەتایبەتی (سەرۆك بکرو سید نائب) رازی نابن بەوەی کەمن لەسێداره بدرێم، بەلاّم من ئەوه بڕیارمه بەریشم بدەن ئەوەی کردوومەو تاوانەکانم نووسراوه لای ئێوه جارێکیتر بەهەمان ڕێگادا بڕۆم، بنەماڵەی ئێمه تەنها من سیاسیم نامەوێت بەهۆی منەوه کەسوکارم هیچی تر تووشی ئازارو ئەشکەنجەو دەربەدەری ببن، ئەوەتا براکەم کاسبه لەرووی سیاسەتەوه بەهیچ جۆرێك پەیوەندی بەمنەوە نیە, ئەوه شانزه مانگه دووره لەماڵ و منداڵی. جەنابی سەرۆك من دەمەوێت چیم کردووه دژی حکومەت هەمووی بخەمه بەرچاو, لەدانیشتنێکی زۆر نهێنی بێت بەڕێزتان خۆتان ئەو خەڵکانه دەهێڵنەوه لەژووری دادگا چونکه باسەکانی من پەیوەندی بەسەرکردەکانی شۆڕشەوه هەیە. پرسی: مەرجەکانت چی یە؟ گوتم: بەتەلەفۆن رازیبوونی (مجلس قیادة الثورة) وەردەگری که لەدوای ٤٨سەعاتی دیکه لەسێداره بدرێم, نامەوێت چاوپێکەوتن لەگەڵ کەسوکارمدا بکەم , ئەوه شەفیقی برامه شاهیدەو ئاگادارە لەهەموو ئەو قسانەی کەمن کردوومە.

گەڕاینەوه بۆ ئەو شوێنەی لێی بووین, دوای نیو سەعات هاتینەوە، سەرۆکی دادگا دەرگاکانی داخست، هیچ ئینزباتێکی لێنەمابوو، کورسی‌یەکیان بۆ دانام و پەرداخێك ئاویان بۆ هێنام, کەپەرداخەکەم گرت لەدەستم کەوته خوارێ و شکا، گوتم: بەڕێز جەنابی سەرۆك تکایەکی ترم هەیە کەقسەکانم دەکەم رێگەم بدەیت هەتاکو کۆتای ی پێدێنم دوای ی ئامادەم وەلاّمی هەموو پرسیارێکتان بدەمەوە:

پێشەکی سوپاسی ئەو خوا گەورەیە دەکەم کەکوردمو ئاینم ئیسلامە, دانیشتووی ئەم ولاّتەم کەعێراقە, کەچاوم کردۆتەوە دایكو باوکی خۆمم دیوه لەوانەی کەناتوانم قەرزەکانیان بدەمەوە ئەویش دایکمە ئەگینا ئەوانەی ئیشم لەگەڵدا کردوون قەرزاری کەسێکیان نیم. شانازی بەعێراقەوه دەکەم بەتایبەتی کوردستانی عێراق، کەولاّتێکی بەپیتو بەرەکەتە درێژای ی ١٠٠٠ کم و پانای ی ١٥٠ کم هەر لەخانەقینەوه تاوەکو زاخۆ جوانترینو باشترینو خۆشترین شوێنه لەهەموو روویەکەوه خەڵکێکی کاسبو سەخی شانازی یان پێوه دەکرێت هەرچەنده لەهەندێك شوێن بەشی زۆری ساڵەکە سارده لەگەڵ ئەوەشدا بەخۆشیو شادی ژیاون.

جارێکیان لەبەیروت بووم کەتەلەفۆنەکەم هەڵگرت عمر هزاع بوو قسەی لەگەڵ کردم، پرسیم ابو فاروق چۆن زانیت من لەو ئوتێلەم؟ گوتی: چوومه باڵوێزخانه ناوی ئەو عێراقیانەیان دامێ کە لەبەیروتن، یەکەم جار تەلەفۆنم بۆ تۆ کرد. گوتم: لەشارێکی وەکو بەیروت کەدانیشتوانی عەرەبن بەشوێن کورددا دەگەڕی یت؟ لام سەیرە. گوتی: ابو بازیان من بەشوێن عەرەبدا ناگەڕێم من دەگەڕێم بەشوێن مرۆڤێکی عێراقی گفتوگۆی لەگەڵدا بکەم. لەخودای مەزن بەزیادبێت بیست وپێنج ساڵە ماڵم لەبەغدایە هەستم بریندار نەکراوە، لەلایەن برایەکی عەرەب کەبڵێ ئەمە کوردە، لەگەڵ هەموو ئەو ڕووداوانەی کە لەسەرەتاوه روویدا تاکو ئێستا

دووبەرەکی لەنێوان کوردو عەرەبدا روویندداوە. جێی داخە کاربەدەستانی حکومەت لەسەرەتای دامەزراندنیەوە کێشەی کوردیان جێبەجێ نەکردووە.

لەدوای شۆڕشی ١٤ی تەمموز گۆڕانێك بەسەر وڵاتدا هات لەهەموو ڕوویەکەوە, تاکە گۆڕانکاری بوو لەڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لەدوای گۆڕانکاریەکەی کە لەمیسر کرا بەسەرۆکایەتی جمال عبدولناصر، کە لەیەکەم بەیاننامە بلاوکرایەوە کوردو عەرەب شەریکن لەم نیشتمانەدا, خۆشیو شادی وئازادی کەوتە وڵاتەکەمانەوە کەعێراقە، هەموو دانیشتوانی وڵاتەکەمان بەتایبەتی چینی چەوساوەو جوتیارو کرێکارو کاسبو خوێندەوار, ئەوەی نیشتمانپەروەر بوون لەوپەڕی خۆشحاڵیدا بوون، بەلام کۆنەپەرستو شۆڤێنی لەکوردو عەرەبو دەوڵەتە دراوسێکان بۆچوونیان جۆرێکی تر بوو. لەساڵی ١٩٦٩ لەڤیەننا لەگازینۆیەك دانیشتبووین، منو وریا رەواندوزیو رشید عارف لەدوورەوە عێراقیەکمان دی بەتەنها دانیشتووە، ناسیاوی رشید عارف بوو، کەئەویش خلیل کنة بوو لەپیاوە ناسراوەکانی عەهدی مەلەکی بوو، خزمایەتی هەبوو لەگەڵ نوری سعید. بەخۆشحاڵیەوە بانگمانکرد, لەگەڵماندا دانیشتو رێزمان لێگرت، ئینجا خۆمان پێ ناساندو باسی بارودۆخی ئێستامان کرد، خلیل کنە گوتی: ئەوەی دووبەرەکی خستە ناو وڵاتو بوو بەهۆی ئاژاوەنانەوە لەناو عێراق، عبدالکریم قاسم بوو، نەك لەبەر ئەوەی کەدەستی بەسەر عێراقدا گرت، بەلام مێژوو لەسەری دەنووسێ ساڵ بەساڵ کەگەورەترین تاوانیکردووە بەرامبەر بەهەموو عەرەب بەتایبەتی عێراق. ئینجا روویکردە ئێمە کەهەرسێکمان کوردین گوتی: ئایا دەزانن چی کردووە؟ گوتوویەتی (العرب والاكراد شركاء في هذا الوطن). گوتم: ئێمەش تاوانبارین کەلەگەڵ تۆ دادەنیشین، من یەکێکم لەو کوردانەی بەئاشکرا چەکم هەلگرتووە شانبەشانی بەعسو لەخزمەتیاندا وەستاوم، بەڵێن بەخۆم دەدەم کەلەم کاتەوە پاسەوانیو دڵسۆزیو فیداکاری بۆ بەعس بەزیادەوە بکەم، چونکە عەرەبی شۆڤێنی وەکو تۆ هەیە. جوان نیە، ئەگینا لێرە خراپم پێ دەکردیت، بەلام بەسەر عێراقدا دەشکێتەوەو دەڵێن دوو عێراقی شەڕیان کردووە.

بارزانی کەگەڕایەوە بۆ وڵات، لەیەکەم چاوپێکەوتنیدا لەگەڵ زەعیم قاسم, گوتی: من سەربازێکی تۆم. من یەکێك بووم لەوانەی ئەم وشەیەم لاپەسەند نەبوو, لەیەکەم ئاهەنگی قوتابیانی کورد کەبەم بۆنەیەوە ئامادەیان کردبوو لەهۆڵی مەلیك فیصل لە(باب المعظم) هەژاری شاعیرو جەلال تاڵەبانی هەلوێستیان هەبوو، ئینجا بارزانی هاتەسەر شانۆ گوتی: (من سەرۆك نیم, من سەربازێکی قاسمم) نالێم کامیان لێپرسراوی یەکەمن قاسم یا بارزانی. ئێمە بۆچوونمان دەربارەی بارزانی لەوکاتەی لەڕوسیابوو، بەسەرۆکمان دادەنا, ئەوکاتە ناوی عبدالکریم قاسممان نەبیستبوو هەرچەندە خوالێخۆشبوو (قاسم)م دووجار بەهۆی بارزانیەوە دیوە، وشەی زەعیمم بەکارهێنا بەلام زەعیم لای ئێمە بارزانیە. لەڕێگەی مامۆستا ابراهیم احمدەوە جارێك لەنزیکەوە عبدالسلام عارفم دیبوو، کەشۆڕشی کورد بەسەرۆکایەتی بارزانی هەلگیرسایەوە پەیوەندیم

پێوەکردن چوومە ڕیزی پێشمەرگە ئەوەبوو دوایی خۆم تەسلیم بەحکومەت کردەوە کەعبدالسلام عارف سەرکۆماربوو. یەکەم جار کەچوومە خزمەتی وامدەزانی ڕێزم لێدەگرێت چونکە من ئامر بەتالیۆن بووم، ئەوکاتە پی یان دەگوتم شۆڕشگێر، پێشمەرگە، بەڵام ئێستا کورد پێم دەڵێن خۆفرۆشو جاش, بەم شێوەیە قسەی لەگەڵ کردمو وەڵامی دامەوە, گوتی: تۆ جێت پێلەق بوو, ئەتروشی ویستوویەتی لەناوت بەرێت ناچار بوویت خۆت تەسلیم بکەیتەوە بۆئەوەی گیانی خۆت رزگار بکەیت، ئەی کاتێك ئامر بەتالیۆن بوویت ئەگەر راستت دەکرد خۆتو پێشمەرگەکانت هاتبانایە خۆتت تەسلیم بکردایەتەوە، ئەو شەڕانەی بەلێپرسراویەتی تۆ کراوە زیاد لە ٤٠٠ سەرباز کوژراون تۆ تاوانباریت. پێم گوت: سەرۆك, بەتالیۆنەکەم ٤١٧ کەس بوو هەمووی خاوەن بیروباوەڕو هەستی نەتەوایەتی بوو، کێشەکەیان بەڕاست دەزانی, کەهاتمەوە بەتەنها بەسەلامەتی گەیشتم، ئەگەر یەکێك لەم ٤١٧ پێشمەرگەیە بیزانیبایە ئەوە بەزیندووی ی منت نەدەدی. هەموو پێشمەرگەیەك کە لەشاخدایە وا هەست دەکات کەکێشەکەی راستو رەوایە، کاتێك بەچاوی خۆی کەموکوڕیەکان دەبینێ یان دەبیستێ ئاگادار دەبێت کەچی بەکورد دەکەن، وەکو گرتن، کوشتن، دوورخستنەوە، تاڵان، ماڵ وێرانکردن. بەڕێز جەنابی سەرۆك ئەو راستی یانە دەخەمە بەرچاوت تاوەکو بەوردی لێی بکۆڵنەوە کەهۆی چیە پێشمەرگە بەچەکێکی ئاسای ی دەچێتە شاخ رووبەڕووی تانكو چەکی قورسو زرێپۆشەکانتان دەبێتەوە، لەپاڵ ئەوەشدا فڕۆکەکان وایانکردووە بەڕۆژ کەس لەماڵەوە نەبێتو شەوان دێنەوە, هێزی سەربازیش هەموو شەقامە سەرەکیەکانو دەوروپشتی شارە گەورەکانیان تەنیوە، ئەگەر بەوردی تەماشای بکەی بەدوو جۆر حوکمیان بەسەردا دەدەیت یەکێکیان ئەوەیە دەڵی یت ئەوانە شێتن، دووەم هەموو ئەو شێتانەی کە لەشێتخانەدان شێت سەرپەرشتی یان ناکات ! پێم وایە لێکۆڵینەوەیەکی ڕاستەوخۆ بۆ ئەو کێشەیە بکەیت سوودێکی گەورەی دەبێت بۆ وڵات. بەگرژی وەڵامی دامەوە گوتی: ئایا تۆ هاتوویت دانوستانمان لەگەڵ بکەیت؟

گوتم ئەگەر شەخصی عبدالرحمن عارف نەبوایە، ئەو کاتە سوپاسالار بوو، تووشی گرتن یان شەرئێشە دەبووم. لەسەردەمی سەرۆکایەتیی عبدالرحمن عارفدا, مام جەلال وحلمی علی شریف ساڵی ١٩٦٦ هاتنە بەغدا کەئەمانە باڵێکن لەبزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد، باڵی م.س بوون, لەڕێگەی منەوە کەوتنە دانوستان, من ئاگاداربوومو دەڵێم عبدالرحمن عارف گەیشتبووە ئەو باوەڕەی کەکێشەی کورد جێبەجێ بکاتو لایەك بەسەر لایەکدا بەهێز نەکات، هەوڵی زۆریدا بۆ ئەو مەبەستە، بەڵام دەوروپشتەکەی بەسەریدا زاڵبوون, نەیاندەهێشت ئەو کێشەیە لەڕێگەی عبدالرحمن عارفەوە تەواو بێت، هەروەها قائد فرقەکانو ئەفسەرەکانو کاربەدەستان کە لەکوردستان بوون بەشی زۆریان بۆ بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان کاریان دەکردو ئاواتەخواز نەبوون کەئەم کێشەیە چارەسەر بکرێت، لەلایەکی دیکەشەوە یەکەم چاوپێکەوتنم لەگەڵ مام جەلال لەماڵی علی مام رەزابوو لەگەڕەکی (تل محمد) لەبەغدا, پرسیاری لێکردم ئایا ئەمانە چۆن چۆنی

دان بەمافی کورددا دەنێن؟ لەناوەڕۆکی هەردوولا شەخصی عبدالرحمن عارفو باڵی م.س جماعەتی (جەلال تاڵەبانی) و پ.د.ك —بارزانی گومانم نەبوو هەرچەندە دووربووم لی یانەوە, بەڵام ئەوانیش بۆ جێبەجێکردنی مافەکانی کورد رازی دەبوون. چونکە لەنزیکەوە خەڵکێکم دەدی سەر بەبارزانی بوون. ئەوەبوو بەداخەوە ئەم هەلە بەخۆڕای ی لەدەستچوو.

جەنابی سەرۆکی دادگا، بەڕاستی خۆشم سەرم سوڕماوە لەوەی بەو شێوەیەی کەقسەت بۆ دەکەم هاتمە ناوەوە, وا هەست دەکەی کەمن لەعێراقدا دەورێکی سەرەکیم هەبووە، بارم ئەوەندە قورس بووە باش هەستم پێدەکرد لەهەندێك خەڵکم دەپرسی، وەکو مامۆستا تەها محیالدین دەیگوت ئەمە ئیشی تۆیە، دەرکەوت کەڕاستم کردووە ئەوەندە بەپلەوپایە چوومەتە پێشێ، وەکیل بووم لەئاسایش کەهیچ پلەیەکو دەسەڵاتێکیشم نەبووە، بەڵام خۆشم نازانم چۆن گەیشتوومەتە ئەو پلەیە کەدەستوەردەمە کاروباری سەرکردایەتیو پێشنیاریان بدەمێ.

له ١٨ تەمموزی ١٩٦٨ چوومە کۆشکی کۆماری ویستم چاوم بەسەرکۆمار احمد حسن بکر بکەوێت، پێم گوتن: ئێوە هاتوون(تستعملون لغه حديد والنار اوتستعملون العقل والحكمة والادراك لحل القضية الكردية)؟ گوتیان: ئەو شتانەی لەو کۆبوونەوەیەدا باسیدەکەین کێشەی کوردە. زۆر باوەڕم بەقسەکان بوو، چونکە شفیق دراجی وای پێ گوتم.

رۆژگار وای لێکردم تا دەهات لەسەرکردەکانی بەعس نزیکتر دەبوومەوە، بەڵام بۆ زانیاریت من لەهیچ بارودۆخێك عەریزەیەکم ئاراستەی کاربەدەستانی بەعس نەکردووە کەبپارێمەوەو داوایان لێبکەم کە لەخۆیان نزیکم بکەنەوەو دامبمەزرێنن. بۆ نموونە: لەیەکەم ڕۆژەوە کەنازم گزارم دی دوای دامەزراندنی بەدوو سەعات لەبەڕێوەبەرایەتی ئاسایشی گشتی، وا رێکەوت کەبۆ ئیشی لێقەوماوێك سەردانی بکەم. لەبەرچاوی حامد العانی و عبدالخالق عزیز پێی گوتم: با بەیەکەوە ئیش بکەین، وەڵامم دایەوە(يقال ويشاع لقد تم تعي ين ناظم كزار (قصاب) مديرا للامن العامة، اهالي بغداد يقولون الدم راح توصل للركبة , عندك ١٣ مدير كلهم جالسين وراء الميز حايرين شلون يرفعون التقرير).

بەم شێوەیە هەتا ئەو رۆژەی ڕوومکردە دەرەوەی وڵات ئەویش روویکردە دونیای ئاخیرەت بەیەکەوە کارمانکرد. ماوەیەکی دوورودرێژ دۆستایەتیو برایەتیمان بەجۆرێك بەهێز بوو وای لێهات باوکی بێتە لامو بڵێت نازم نامبینێت، حامد العانی بڵێت رفیق پشدەری هەموو شتێك دەزانێ بەڵام وەزیری ناوخۆ سعدون غیدان ئاگای لەئاسایشی گشتی نیەیە، بەڕێوەبەرەکەی هیچ بایەخێکی پێنادات، ئەو شوێنانەی کەتایبەتیەیە تەنها نازمو چەند کەسێك کەلەگەڵیاندا ئیش دەکەن بۆیان هەیە سەردان بکەن. من زۆر بەئاسانی رووم لەو شوێنانە دەکرد تەنها (قصر النهايه) نەبێت ئەویش چونکە ئارەزووی بینینی کاری ئەشکەنجەو ئازاردانی مرۆڤم نیەیە بۆیە رێم نەکەوتۆتە ئەو شوێنە. کاتێکیش چوومە دەرەوەی وڵات بەپێی نامەیەکی

کاربەدەستێکی سەرکردایەتیی بەعس هاتمەوە هیچ پرسیارو وەڵامێکیان لێنەکردم، جەنابی (سید نائب) دوای گەڕانەوەم بەدوورودرێژی گفتوگۆی لەگەڵ کردم.

دەربارەی نازم گزاریش دانی پێدانا کەباشم کردووە رامکرد ئەگینا بەجۆرێك لەئەو نزیکبووم حەقی کوشتنم هەبوو، هەروەها لەگەڵ سعدون غیدان ئەو باسانەی لەگەڵ (سید نائب) باسم کردبوو ئەویش دەقی خۆی بۆم گێڕایەوەو پشتگیری کردم کەباشت کردووە راتکردووە. زۆرم لا سەیربوو کەئەو مامۆستا ئاینییانە بەشداربوون لەهەوڵی کوشتنی مەلامستەفا بارزانی، سوپاس بۆ یەزدانی مەزن کەنەکوژرا، چونکە ئەوە زیانێکی گەورەی بۆ هەردوو نەتەوەی عەرەبو کورد دەبوو.

لەچەند سەرکردەیەکی بەعسم پرسی ئەو قسەیەی بۆتان باس دەکەم گومانم نییە کەباشتان لەبیرە لەدوای ١١ی ئازار، کەبارزانی ویستی هەموو کورد لەچوارچێوەی (پ.د.ك)دا کۆبکاتەوە واتە دووبەرەکی نەهێڵێت , ئێوەی بەعس بەماددیو مەعنەوییو بەکۆمەکی پارەو یارمەتیدانی هێز پشتگیریتان لەبارزانی کرد، چونکە هەمووتان یەك قسەتان کرد ئەویش ئەوەبوو(کذب اذا احنا نقول عندنا صدیق, عندنا صدیق واحد هو بارزاني روحوا كلكم التحقوا بالبارزاني , قوة بارزاني قوة البعث).

چەند جارێك لەم بارەیەوە لەنازم گزارم پرسی بۆچیو بەفەرمانی کێ ئەو پلانەتان ئەنجامدا؟ کەچی گوتی: ئاخر ئەم جۆرە ئیشانە زیانی گەورە بەوڵاتەکەمان دەبەخشێت.

لەو رۆژەوە حکومەتی عێراق دامەزراوە، کێشەی سەرسنوور لەگەڵ ئێرانو تورکیاو کوێت هەیەو بەردەوامەو هەریەکە بۆچوونی تایبەتی خۆی هەیە. شای ئێران دەڵێت (شط العرب)و کەنداوی عەرەبی موڵکی ئێرانە، کوێت بەو سنوورەی ئێستا رازی نییە, بەڵام بۆچوونی حکومەتی عێراق لەیەکەم رۆژەوە تا ئێستا کوێت بەشێکە لەعێراق، تورکیا دەڵێت موصلو کەرکوك بەشێکە لەتورکیا. ئاشکرایە کەگەلی عەرەبی سێ کێشەی گەورەی هەیە:

١- کێشەی نێوان فلسطینو ئیسرائیل (جوولەکەو عەرەب), ئەم کێشەیە ئەوەندە ئاڵۆزە چارەسەرکردنی زۆر زەحمەتە لەبەر زۆر هۆ، جا من لێرەوە بەجێی دەهێڵم.

٢- کێشەی ئەسکەندەرونە کەدانیشتوانی شارەکە بەشی زۆریان عەرەبنو خۆی بەشێکە لەوڵاتی عەرەبی هیچ مرۆڤێکی عەرەب لەئەسکەندەرونە بۆی نییە بڵێ من عەرەبم، لەکاتێکدا لەماڵەوە بەعەرەبی قسە دەکەنو لەدەرەوە لەگەڵ عەرەب بەعەرەبی قسە دەکات، بەڵام کەقسەی لەگەڵ دەکەیت دەڵێت پێناسەکەم تورکە، ئەوەیان فێرکردوونو بەسەریاندا سەپاندوون، لەتورکیا بەچاوێکی زۆر سووك تەماشای عەرەب دەکەن، پێی دەڵێن کۆپك (سەگ).

٣- ٩٠٪ ی دانیشتوانی ناوچەی ئەهواز عەرەبنو خۆشیان بەعەرەب دەزانن، فارسەکان وایان لێکردوون دەڵێن ئێمە فارسین.

**ئێران:** دانیشتوانی لەم نەتەوانە پێکهاتووە: ئازەر، کورد، فارس، عەرەب، بلوج.

**تورکیا:** دانیشتوانی لەم نەتەوانە پێکهاتووە: تورك، کورد، ئازەر، عەرەب، ئەرمەن.

ئەو کەمایەتی یانەی کە لەخاکی عەرەبدا دەژین عەرەب وا ناویان دەبا گوایە ئەمانە لەخاکی عەرەبدا دەژین وەکو جنوبی سودان، بەربەر، دروز، مارۆنی، کورد (لەسەر خاکی خۆیدا دەژی کەپێی دەڵێن کوردستان). لەبەر چەند هۆیەك، لەهەموویان نزیکتر لەگەلی عەرەب کوردە لەکاتێکدا کەزانراوە بەشی زۆری دانیشتوانی کوردستانی عێراقو سوریا ئیسلامن، دەوری (صلاح الدین ئەیوبی)یش مێژوو باسیدەکات، لێرەوە هەتا دەگاتە کۆتای ی سنووری عەرەب گۆڕستان نیە تەرمی کوردی لێنەبێت کەشانبەشانی عەرەب جەنگاوە، خۆی بەختکردووە، ئەم راستیە هەموو رۆشنبیرێکی عەرەب دەیزانێت، لەنێوان گەلی کوردو عەرەب هیچ ناکۆکیەك روونەداوە ئەمەش هەم مێژوو شایەدیەتی هەم هەموو نیشتمانپەروەرێکی کوردو عەرەب.

ئەگەر بێتو بیربکەینەوە کەچۆن عەرەبی ئەهوازو عەرەبی ئەسکەندەرونە رزگار دەبن، باشترین بۆچوون ئەوەیە، لەهەمان کات ئەگەر بتەوێت کورسی شای ئێران بهەژێنیت، ئایا دەتەوێت ئەو مقۆمقۆیەی کەتورکیا دەڵێت لەکاتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانلی ئاینی ئیسلام زۆر بەدەسەڵات بوو، هەموو کات دەبێت عەرەبی نیشتمانپەروەر بیر لەوە بکاتەوەو باش بزانێت خەتەری گەورە ئیسرائیل و تورکیایەو ئەگەر بێت بیر لەوە بکەیتەوە کەسنووری عەرەب بەهێز بکەیتو کێشەکانی کەباسمانکرد جێبەجێ بکەیت، تەنها یەك رێگا هەیە ئەویش کێشەی کورد لەعێراقدا جێبەجێ بکەیت کەئەویش (الاستقلال الذاتي) واتە لەفیدراڵی فراوانتر بدەیت بەپارتی دیموکراتی کوردستان بەسەرۆکایەتی بارزانی.

سەرۆکی دادگا قسەی بڕیمو گوتی: دەتەوێت حکومەتی کوردی دابمەزرێنیت؟ گوتم: جەنابی سەرۆك سەرەتا بەڵێنت پێدام کەڕێگام بدەیت قسەکانم تەواو بکەم، ئینجا ئامادەم بۆ هەموو پرسیارو وەڵامێکتو ملکەچیشم بۆ هەموو بڕیارێکت.

ئینجا درێژەم پێدا: لەڕێگــــەی کوردی عێراقەوە کەبەتەواوەتی بەهێزتکــردن دان پیانان بە(استقلال الذاتي) یە، یارمەتی هێزی بەشەری یت پێویست ناکات تەنها یارمەتی چەكو پارە لەڕێگەی ئەوانەوە (بارزانی) دەتوانیت کوردستانی ئێران ڕزگار بکەیت، ئەو کاتە ئێران پارچەپارچە دەبێتو سنووری عێراق دەگاتە نزیك سنووری ئازەر (تەورێز) لەئێران، واتە کاتێك کوردستانی عێراقو کوردستانی ئێران بوو بەیەك هێز، ئەو کاتە کوردستانی تورکیاش رزگار بکەن، ئنجا سنوور دەگاتە سنووری تورکیا، واتە نزیك ئەنقەرە، سنووری عەرەب لەگەڵ سنووری کورد لێکدەداتەوە، ئەو کاتە سنووری عەرەب بەکوردەوە پاڵدەداتو لەئەنجامدا تورکو فارس نامێنێت. بوونی هێڵمز کەکاتی خۆی بەڕێوەبەری مخابراتی مەرکەزی ئەمریکی بوو ئێستا باڵوێزی ئەمریکایە لەتاران، بێگومان پیلانێکی گەورەی بەدەستەوەیە لەو ناوچەیەداو ئەگەر بتەوێت

ئەو پیلانەی دایڕشتووە هەڵوەشێنیتەوە کەئەویش دژی عێراق و کوردە، ئەو بۆچوونەی من وەکو خۆی سەد دەر سەد هەموو پیلانەکانی هێڵمزو ئەمەریکا تێکوپێك دەدات.

ئامانجی رێکەوتننامەی جەزائیر دەستهەڵگرتن بوو لەبەشێکی خاکی عێراق کەنیوەی کەنداوی عەرەبە لەگەڵ هەرەسهێنان بەشۆڕشی کورد. کاربەدەستانی حکومەت بەئاشکرا دەیانگوت تازە شۆڕشی کورد هەڵنادات‌ەوەو تا سەد ساڵی‌تر کوردێك لەعێراق چەکی پێنابێت. منیش دەنگم خستە پاڵ ئەو کاربەدەستانەی بەعس بەمەرجێك ئەگەر هاتبانایە ئەو لافیتانەی بەرزیان کردۆتەوە کەسەرکردایەتی پارتی دیموکراتی کوردستان بەسەرۆکایەتی بارزانی لەپێناویدا دەجەنگی، هەموو ئەو مافانە بەعس دانی پێدا بنێت، کێشەی کورد جێبەجێ بکات ئەو کاتە بەبێ گومان بەعس جێگەی پارتی دیموکراتی کوردستان و بارزانی دەگرێتەوەو رەنگە٩٠٪ ی جەماوەری کورد دەچووە پاڵ بەعس، ئەو لافیتانەی کەبەعس هەڵیگرتبوو بۆ نموونە: (وحدە —حریە— اشتراکیە) کورد هەمووی قبووڵ دەکرد، هەرچەندە هیچ مرۆڤێکی نیشتمانپەروەرو کوردێکی دڵسۆز ئەمە قبولْ ناکات چونکە لەگەڵ ئایدیۆلۆجیەتی کورد ناگونجێ، بەلام ئەمەی پشتگوێ دەخست چونکە کێشەی سەرەکی جێبەجێ کردووە بۆ کورد.

لەسەرەتای گەڕانەوەی خەڵك بەپیر زۆر لەکادرەکانی پارتی، لەوانەی کەبەشداری شۆڕشیان کردبوو دەچووم‌و هەریەکە بەگوێرەی بۆچوونی خۆی راپۆرتێکی پێشکەش دەکرد. جارێك چەند رۆشنبیرێك لەرێی منەوە چاویان بەبەرێوەبەری ئاسایشی گشتی کەوت رای خۆیان دەربڕی کەچۆن کێشەی کورد جێبەجێ بکەن.

جەنابی سەرۆکی دادگا: ئەوەی راپۆرتەکەی لەسەرمن نووسیوە گوایا لەگەڵ جەلال تاڵەبانی کۆبوومەتەوە، من خۆم دان بەوەدا دەنێم کەلەوە گەلێك زیاترە. کە لەبەیروت گەڕامەوەو بەخزمەت جەنابی سید نائب گەیشتم باسی بارودۆخی ئێستای کوردم بۆ کرد، کەناوی جەلالم هێنا گرژو ناڕەحەت بوو، تووڕەبوو گوتی: بڕۆ دەرەوە. بەلام من زیاد لەدوو سەعات قسەم بۆ کرد، گوتم: هەتا کەی ئاژاوەو کوشتن‌و ماڵ وێرانکردن بەردەوام دەبێت، بیرێك ناکەیتەوە لەوەی کەئەو پیلان و سیاسەتەی ئێوە هیچ سوودێك نابەخشێ‌و وڵات دوادەخات، لەناوخۆی وڵاتدا گەورەترین کێشەت کوردە، لەیەکەم رۆژەوە کەئێوەم ناسی لە ١٨ ی تەممووزی ١٩٦٨دا پێم گوتن (لغە الحدید والنار) بەکاردەهێنن یان (العقل والحکمە والادراك)؟ جەنابی سەرۆکی دادگا: بۆ ئاگاداریت سید نائب خۆی رێگای دابووم کە چ بەقسە یان بەنووسین دەربارەی بەرژەوەندیی عێراق بەتایبەتی کورد چی بەباش دەزانم ڕاستەوخۆ بیخەمە بەرچاوی. ئەگینا من نە سەرۆکی هۆزم نە رۆشنبیرێکی ناسراو، نە ملیۆنێرم، وەکو پێشتر گوتوومە خۆی داوای لێکردووم کەئیشی لەگەڵدا بکەم، سوپاس بۆ خودای گەورە کەئەو ماهیەتەی داومەتێ. ئینجا کاتێك لەقسەکانم لەگەڵ سید نائب

تەواوبووم داوام لێکرد کەئێستاش کات ماوە بۆ ئەوەی کێشەی کورد بەئاسانی جێبەجێ بکرێت، داخوازی یەکەشم ئەوەبوو کەعومەر دەبابە لەڕێگەی بەڕێوەبەرایەتی ی ئاسایشی گشتیو مەکتەبی کاروباری شمال, چوو بۆ لەندەنو سوریا بۆ جێبەجێ کردنی کێشەی کورد، کەگەڕایەوە لەڕێی بەڕێوەبەرایەتی ئاسایشی گشتی نێردرا بۆ مەکتەبی کاروباری باکور سێجار لەڕێی بەدالەی ئاسایشی گشتی یەوە تەلەفۆن لەگەڵ بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی دەکات، وەڵامی نادرێتەوە. کاتێك هاتە لام دەیویست بەپەلە وەڵامەکەی وەرگرێتەوە، تەلەفۆنی تایبەتی بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتیم دایەو خۆم تەلەفۆنم لەگەڵدا کرد گوتم: ابو مازن ئەو ژمارە تایبەتیەی تۆم داوەتە عمر دەبابە ئێستاش لام دانیشتووە بەتەنها قسەت لەگەڵ بکات، یان تۆ خۆت چۆن بەباشی دەزانیت. گوتی: (اخي كل ما هناك رفعنا التقرير الى فوق غير ماكو شي بيدي). گوتم: خۆت ئەم چوار کەلیمەیە بەکاك عمر رابگەیەنە.

هەروەها گروپێکی سیاسی کورد کەپێی دەڵێن (کۆمەڵە) ناسیاویم لەگەڵ چەند کەسێکیان هەیە، ئێران ژمارەیەك لەوانەی تەسلیم بەعێراق کردەوە، چەند ڕاپۆرتێکم ئاراستەی سەرکردایەتی کرد کەئەمانە ڕۆشنبیرن، دڵسۆزی وڵاتەکەن، نیشتمانپەروەرو خاوەن بیروباوەڕن، لەگەڵ ئەو حزبانەی کەدروستکراون جیاوازیەکی زۆریان هەیە، ڕێگا بەمانە بدەن لەکوردستان لەپارێزگای سلێمانیو هەولێر ودهۆك ئیش بکەن، ڕۆژنامەو گۆڤاریان هەبێت، جەماوەرێکی زۆر لەدەورەوپشتمان کۆدەبێتەوە، وەڵامی بەعس ئەوەبوو ڕزگارمان بوو لەپارتی، ئینجا نۆرەی کۆمەڵەیە. لە مخابراتیش، یەکێك لەتاوانەکانم ئەوەبوو کەمن ئەندامێکی کۆمەڵەم، ئاخر من (رفیق پشدەری) بەسیخوڕ ناسراوم، بەداخەوە جێگام ناکەنەوە ئەگینا سەرمایەیەکی گەورەیە. ڕاستە چوومەتە لایان، کاتێك لەژووری لەسێدارەدان بوون بەزەردەخەنەوە کەلەپچەکانی دەستیان نیشاندامو گوتیان لەسێدارەدانمان سوودێکی گەورەی دەبێت بۆ کورد بەتایبەتی بۆ کۆمەڵە. من کەپێم گوتن ئێوە لەسێدارە دەدرێن، دەستیانکرد بەپێکەنین، بەڵام منیان هێنایە گریان.

بەڕێز جەنابی سەرۆکی دادگا: من هەموو ئەو ماوەیەی کە لەخزمەت بەعسدابووم سوپاستان دەکەم بەتایبەتی سەرۆك و سید نائب و نازم گزار کەتوانیم لەڕێگەی ئەوانەوە یارمەتی زۆری خەڵکی هەژارو لێقەوماوو زوڵم لێکراو بدەم، هەروەها یارمەتی یاندام منیان لەکابرایەکی وەکیلی ئاسایش (امن) گەیاندە ئەو پلەوپایەیە. بەڵام منیش لەلای خۆمەوە هەموو هەوڵدانو بۆچوونم تەرخانکردووە لەڕێگەی بەعسەوە بتوانم خزمەتی وڵاتەکەم بکەم کەعێراقە، بەتایبەتی کورد. لەیەکەم چاوپێکەوتنم لەگەڵ سید نائب پێمگوت من لەدایكو باوکێکی کوردم, خیانەت ناکەمو پیاوکوژیش نیم، بەڵام هەموو هەوڵدانو گیانفیداکردنێکم ئەنجامەکەی ئەوەبوو کە٢٠ مانگە میوانی مخابراتم بەفەرمانی سید نائب. لەیەکەم لێکۆڵینەوەدا پی یان گوتم: تۆ سیخوڕی دەوڵەتێکی ڕۆژئاوایت، ئەمە عەقڵی خۆت نیە کەڕاپۆرتەکانت پێشکەش بەسەرکردایەتی

کردووە. پاشان ئیسپات بوو وا نی یە، ئێوەش ویستتان جێی خوا بگرنەوە (استغفر الله) خوا لەهەموومان گەورەترە قەسرەکەی (هاروونە رەشید) کە لەسەرو ئورزدییە لەشارع رەشید ئێستا گەراجی سەیارەیە هەمووما دەزانین ئەمەش بەسەر دەچێت.

ئینجا لەمێژووی مخابرات یەکەم کەس بووم کەتوانای هەموو ئازارو ئەشکەنجەیەکم گرت. شەرم دەمگرێت وام لێهات وەکو منداڵێکی (٤)مانگ ەفتار بکەم، پێم نیشاندان کەهێز هەموو شتێك نییە , نێوان بەشەرو ئاژەڵ عەقڵە، ئەوەی بەمنیان کرد پشیلە بەمشکی دەکات، سەگ بەپشیلەی دەکات، شێریش لەگەڵ هەموو ئاژەڵێکی تردا دەیکات ئاوا لەگەڵم جووڵانەوە. ئینجا ویستیان (مسح الدماغ)م بۆبکەن، ئەوە ئێستا بۆتان روون بۆوە کەوا دوو سەعات زیاترە بەبێ ئەوەی قەڵەمو کاغەزێکم پێ بێت، بابەت لەدوای بابەت بۆتان دەدوێم، بەجۆرێك نارەحەتیان کردم سێجار ویستم خۆم بکوژم. وا بزانم هەموو ئەو تاوانانەی کەمن کردوومە چ (مدعی العام) چ خۆم خستمانە بەرچاوی بەرێزتان، هەروەها هەڵوێستی خۆم باش وونکردەوە کە لەخزمەتی عێراقێکی سەربەخۆ، گەلی کوردو عەرەب بژی. چەندم لا سەیرە ٢٠ مانگ لەژوورێکی تەنها بژیم، دوای ئەو هەموو ئازارو ئەشکەنجەیە لەدادگای شۆرش اوەستم، لەکاتێکدا باش بۆتان روونبۆوە تاوانباری گەورە ئاشکرایە ئەگەر دیموکراتیەت هەبایە لەعێراق لەجیاتی من ئەویش (بکر و صدامە).

کاتێك گەیشتمە ئەو باوەرەی کە لەدۆسیەی صدام شتێك نییە پێی بڵێن کێشەی کورد، بەپێی توانای خۆم هەموو شتێکم بەکارهێنا. کاتی خۆی بەراپۆرت ئاگاداری مسعود بارزانیم کرد کەدەمەوێت پەیوەندی بەشۆرشەوە بکەم چونکە لەپەنای بەعسدا ناتوانم خزمەتی کورد بکەم. لەمانگی ئەیلولی ١٩٧٦ کە لەگەڵ عمر دەبابە چاومان بەیەك کەوت، گوتم: نامەوێت بگەرێمەوە , دەمەوێت بەیەکجاری پەیوەندیتان پێوە بکەم، چونکە لەپەنای بەعسدا بەهیچ جۆرێك خزمەتم پێناکرێت. کێشەی حمەی مەلا شریف بەم جۆرە بەئاشکرا بۆم ناچێتەسەر.

جەنابی سەرۆك حەز دەکەم بزانیت لە ١٩٧٦/٩/١١ چوومە (المجلس الوطني) سید نائب بەپیرمەوە هات پی ی گوتم: (بقی بالی یمك هوایە) بەم شێوەیە بەخێرهاتنیان کردم، بەڵام لەبەرئەوەی وەکو ئەو گوتی وەڵامەکەم سلبی بوو لای ئەویش کوفرە چۆن دەبێت مرۆڤ بۆی هەبێت وشەی نەخێر بەکاربهێنێت. لەرۆژی ١٩٧٦/٩/١٤ گیرام وەکو پرسیار لەمن دەکەیت پرسیارێکیش لەو زاتە مەزنە (صدام) بکە ئەم گۆرانکارییە ١٨٠ پلەیە بایدایەوە چیبوو , من بۆم نییە قسە بکەم چونکە گفتمداوە، من لای خۆمەوە ئەم وشەیە دەبەمە ناو گۆرەکەم (کوشتنی مام جەلال).

سەرۆکی دادگا گوتی: مووچەت لەوەزیرێك زۆرتر بوو هەرچەندە پلەوپایەی ئاشکرات نەبووە، بەڵام لەوەزیر زیاتر دەستت ویشتووە، ئایا دەزانی ئەمە تاوانەکەی چییە؟ مرۆڤێکی زیرەکی وەکو تۆ خاوەن ماڵو منداڵ، جێگەی سەرسورمانە، بۆ ئەمەت کرد ؟

گوتم: هەرچەندە زۆر نزیك بوومەوە لەسەرکردەکانی بەعس، بەڵام بۆم دەرکەوت کەڕۆژێك لەڕۆژان کێشەی کورد چارەسەر ناکەن، ئەگەر کورد بەو مێشکە بیربکاتەوە بڵێ ڕۆژێ لەڕۆژان صدام کێشەی کورد جێبەجێ دەکات ئەمە نەبووەو نابێت. کورد لەهەموو کونو قوژبنێکی کوردستانی عێراق خاوەن هیچ شتێك نیەیە، من دەڵێم ئەمە هەڵوێستی منەو لەبەرئەوەی هەموویم ئاشکرا کرد ناپاڕێمەوە بڵێم بەرەڵلام بکەن چونکە ئەگەر جارێکی تریش زیندوو ببمەوە پەیمان بێت ئەمە ڕەفتارمە.

سەرۆك گوتی: کەوابێت هەموو ئەو تاوانانەی کەمدعی عام دایە پاڵت راستە کەپەیوەندی راستەوخۆت لەگەڵ جەلالو مسعود هەبووە. گوتم: من کادرێکی جەلالو مسعودم, ئەمە شەرەفە بۆ من(دەستم بۆ چاوەکانم برد)، ئەمە مسعودە، ئەوی تریان جەلالە.

سەرۆکی دادگا" ئیشارەتیدا کەکاتی پشوودانە. منو شەفیقی برام هاتینە هۆڵی دادگا ماوەی دوو سەعات دانیشتین هەردووکمان بێدەنگ بووین، چونکە نەماندەزانی خوا چی لەچارەی نووسیوین. کەس نەما لەوانەی لەدادگا ئیش دەکەن , گەورەو پچووك نەیەن تەماشامان نەکەن، ڕەنگە بەشی زۆریان وایان تەماشا دەکردم کەئەو پیاوە شێتە کێیە ئەو کەدانی بەتاوانەکانی خۆیدا نا؟ سەرو دوو پەرداخ ئاویان بۆ هێنایین, من داوای پەرداخێکی تریشم کرد. ئێمەیان بانگکردەوە، سەرۆکی دادگا تاوانەکانی یەك لەدوای یەك خوێندەوە ئینجا گوتی: (اشغال شاقة المؤبدة)، من ٢٠ ساڵ حوکمدرامو شەفیقی برام پێنج ساڵ.

کەکۆتای ی بەخوێندنەوەی حوکمەکە هێنا، ئەوەندەی نەمابوو لەخۆشیدا بکەوم، ئەمەم ئەوەندە لاخۆش بوو چونکە لەلایەکەوە پەتەکەم لەملی خۆم کردەوە لەلایەکی‌ترەوە چیم کردبوو خراپو چاك هەموویم خستە بەردەمیان. ڕووبەڕوویان سەرم (ڕەنگە ٢سم) هێنایە خوارێ، بەسەری زمان گوتم (شکرا لسید الرئیس واعضاء المحکمة وللسید المدعي العام وللحاضرین). ئیتر ئێمەیان هێنایەوە بۆ مخابرات، هەریەکەمان خراینەوە شوێنی خۆمان. ئێوارەکەی بانگیانکردم، کاربەدەستەکە گوتی: تۆ نهێنیەکانی سەرکردەکانی بەعست لایە لەبەر ئەوە تۆ لەم ژوورە تەنهایی‌یە بیست ساڵەکە تەواو دەکەیت، بەڵام ئەگەر بەدەستو خەتی خۆت بنووسیتو پەیمان بدەیت کەئەم نهێنیانە نادرکێنی، ئەوا بەیانی بەڕێت دەکەین بۆ بەندیخانەی (ابوغریب). چیان ویست بەدەستی خۆم بۆم نووسین.

### تێبینی

*شەو دەرگا کرایەوە، ئەو پیاوە باشە (...) هاتە ژوورێ ویستم دەستی ماچ بکەم، گوتم: تۆ منت رزگار کرد ئەگینا نەمدەتوانی بەو شێوەیەی کەبیستوومە بەرامبەر بەدادگای شۆڕش ئەم هەموو قسانە بکەم , سوپاس بۆ یەزدانی مەزن کەمرۆڤێکی وەکو تۆی لێیەو لەناو ئەو دۆزەخە یارمەتی هەژارو لێقەوماو دەدەیت، من هەمووی بەهی تۆ دەزانم، قەد بیرم ناچێتەوە، حەز دەکەم ناوت بزانم، شوێنت، چیت دەوێت بۆت بکەم، ئایا چی وای لەتۆ کرد کەیارمەتیم بدەیت؟ گوتی: ناوم (...) ئەم نیشانە لەنێوانماندا بێت، من*

*پەیوەندیم بەهیچ گروپێکەوە نییە، ئەوەی وای لێکردم کەیارمەتیت بدەم ئەمەبوو توانیت بەرامبەر ئەو هەموو ئازارو ئەشکەنجەیە راوەستیت، جاری یەکەم چاوم بەدایکت و کورەکانت کەوت هەر لەخۆمەوە دڵم بۆیان کرایەوە. لەو رۆژەوە بەبێئاگاداری تۆ زۆر یارمەتیم داویت، خوای گەورەش روحمی خستە دڵی صدام هەموو ئەو قسانەی کەرووبەرووی دادگا کردت، بەپەلە صدامیان لێ ئاگادارکردەوە، قسەی صدام ئەمەبوو: (رجل شجاع ما يعدم) ئەوەبوو حوکم درایت بە ٢٠ ساڵ. کاکە رەفیق ئەوە سیاسەتە، دوور نییە مانگ نەرِوا بەرەڵڵاش بیت، ئێمە بەتێکرِای ی باسی ئەوە دەکەین کەچۆن ئەم هەموو شتەت لەمێشکدا هێشتبۆوە، ئێستا تێکرِا بەچاوێکی گرنگ تەماشات دەکەن، بەیانی دەتبەنە بەندیخانە بەماڵومندالت شاد دەبیتەوە. گوتم: فلان کەهاتم دووجار بەقەدەر ئێستا بووم. راستمکرد لە ١٠٣ کیلۆوە هاتمەسەر ٥٢.*

### هۆکارەکانی باڵادەستبوونی صدام:

سەرکەوتنو زاڵبوونی بەسەر ئەو رووداوانەی کەلەخوارەوە بەکورتی ئیشارەتی پێدراوە, بوو بەهۆی ئەوەی کەبگاتە ئەو پلەیەی ئێستا بەدیکتاتۆری عێراق ناودەبرێت.

١- ٣٠ تەموزی ١٩٦٨و بوونی بەئەندامی (مجلس قيادة الثورة).

٢- بەیاننامەی ١١ی ئازاری ١٩٧٠.

٣-خۆماڵیکردنی نەوتو دابەشکردنی داهاتی بەشێوەیەك کە٣٣٪ی بۆ خۆی‌و٣٣٪ ی بۆ وەزارەتی بەرگری‌و ٣٤٪ی بۆهەموو دانیشتوانی عێراقو دەزگای ئاسایش (استخبارات، مخابرات، ئاسایشی گشتی).

٤- رێکەوتننامەی جەزائیرو هەرەسهێنان بەشۆرِشی کورد (١٩٧٥).

٥- پووچەڵکردنەوەی کودەتاکەی نازم گزار.

٦- بەزیندووی ی لەسەر حوکم لادانی احمد حسن بکر.

٧- دوورخستنەوەی ٢١ کادری بەعس کە لەرِێگای کەسوکاریان گوللەباران کران بەبێ ئەوەی کەسێك هەبێت رووبەرِووی راوەستێت.

ئاشکرایە کەبەعس لەسەرەتای هاتنیان لە ١٧ی تەمموزی ١٩٦٨ ەوە کوردو عەرەب‌و شیعەو ئاسووری بەرهەڵستکاری هەبوو, صدام تیشکی خستەسەر ئەو خاڵانەی سەرەوە تاکو بەرهەڵستکاران بەهیچ جۆرێك نەتوانن بەرهەڵستی بکەن، لەدەرەوەو لەناوەوە زاڵ بێت. ئەوەش (رِێکخراوی بەعس، مخابرات، ئاسایش، استخبارات، سوپای کۆشکی کۆماری، محكمە الثورة) بوون بەپێی نووسراوی ئاسایش‌و استخبارات‌و مخابرات بەگوێرەی نووسراوەکانیان حوکم دەردەچێت‌و بەپێی فەرمانی صدام، رِۆژانە کاروباری وڵات بەرِێوەدەبەن کەهیچ یاسایەك نییە لێپرسینەوەیان لەگەڵدا بکات. بۆ نموونە: کوشتن، گرتن، دوورخستنەوە، لەناوبردن، ماڵ وێرانکردن، ئازارو‌ئەشکەنجەدان، ریسواکردن.

**تێبینی**

*گرنگ نىیە کەئازاو زاناو زیرەك‌و رۆشنبیرو پرۆفیسۆرو زمانزان یان شاعیر بیت، یان سەرۆکی هۆز، یان لەبنەماڵەیەکی بەرز بیت، گرنگ ئەوەیە یەکێك بیت لەوانەی سەرەوە، ئەوکاتە تۆ یەکێکی لەبەختەوەرەکانی عێراق‌و خاوەن هەموو شتێکیت.*

**صدام و هەڵەکانی:** دژایەتیکردنی کورد، دژایەتی شیعە(بنەماڵەی محسن حکیم)، هێرش کردنەسەر ئێران، گرتنی کوێت.

**کـــــورد:** صدام بەهەموو توانایەکیەوە دژی ٦ ملیۆن کورد راوەستاو هەموو جۆرە چەکێکی قورسی بەکارهێناو کوشندەترین چەك (گازی خردل‌و ڤی ئێکس)، کەجیهان ئەوەیان خستە پشتگوێ، بۆچی یارمەتی‌و پارێزگاری کورد بکەن لەکاتێکدا کەکیانی سیاسی نىیە، لەهەمان کاتیش صدام زوير دەبێت‌و کاروباری بازرگانی لەگەڵیاندا دەوەستێنێت، لەکاتێکدا ئەو کارەساتەی لەساڵی ١٩٨٨ بەسەر شاری هەڵەبجەیدا هێنا کەچی دەوڵەتێکی وەکو ئەمریکا پاکانەی بۆ صدام کرد، هەرچەندە کوردی بێ پشت ناچارە هەمیشە ئەمە پشتگوێ بخات‌و لەبیر خۆی بەرێتەوە. لەسێدارەدان‌و تیرۆرکردن، وێرانکردن، تەعریب، تەبعیس، ئەنفال، ١٨٢ هەزار کورد زیندەبەچاڵکران هەروەها ٨٢٠٠ بارزانی کە٣٤ کەسیان لەبنەماڵەی شێخەکانی بارزان بوون.

**ئێران:** هێرش بردنەسەر ئێران‌و ٨ ساڵ شەڕ بەردەوام بوو، (١٩٨٠– ١٩٨٨) ئینجا شەڕ راوەستا, وا چەند ساڵە هەر لەوتوێژدان، هەتاکو صدامیش مابێت ئەم رێکەوتنە نابێت.

**شیعە:** دژایەتی ئاینی شیعە، بەتایبەتی بنەماڵەی (محسن حکیم)، لەیەکەم رۆژی هاتنیان بۆسەر حوکم تاکو ئێستا بەعس بەردەوامە لەدژایەتیکردنیان.

**کوێت:** گرتنی کوێت‌و تالان‌و وێرانکردن‌و کوشتن‌و دوورخستنەوەی خەڵکەکەی. ئەوەبوو ئەم هەموو هەوڵ‌وکۆششەی جیهان کردی لەڕێی گفتوگۆ لەگەڵ صدام تا بگەڕێتەوەو لەکوێت دەرچێت، لەخۆبای ببوونی بووە هۆی ئەوەی کەئەوروپاو ئەمەریکاو وڵاتە عەرەبىیەکان بەگژیدا بچنەوە. سەربازیشی بێشەرمانە ئیمزای تەسلیمبوونی کرد. سەرۆکی لیبی (قەزافی) لەلێدوانێکیدا گوتی: صدام ژەهرت بخواردایە باشتربوو لەوەی تەسلیم بوویت.

گەلی عەرەب بەتایبەتی نەتەوەی یەکانیان، دوای نەمانی خوالێخۆشبوو عەبدولناسر، تیشکیان خستەسەر صدام کەفلسطین و قودس رزگار دەکات، بەڵام بەشێکی زۆر کەم لە سیاسەتمەدارانی جیهان دەیانزانی کەئەمە لەصدام ناوەشێتەوە. چونکە سوپای عێراق بەتایبەت سوپای بەعس، پڕچەکە، بەڵام ٩٠٪ ی ئەفسەرو سەربازی بەعسی نىیەو خۆی بۆ شەخصی صدام بەکوشت نادات. زۆر لەجەنەڕاڵە سەربازی یەکان گەیشتوونەتە ئەو پلەیە کەکۆلێجی ئەرکانیان نەخوێندووە، بۆ نموونە بۆ خۆی لەژیانیدا

رۆژێك سەربازی نەكردووە كەچی پلەی (مشیرە) لەجیاتی ئەوەی ئەفسەرێكی ناسراو(عبدالله سید احمد) كە لەناو ٦٧ دەوڵەتدا بەیەكەم دەرچووە لەكۆلێجی ئەركانی ئینگلیزی دەبوو ئەو سەركردایەتی سوپای بكردایە، بەڵام لەبەرئەوەی كوردە دووریان خستەوە.

## سەركۆمار چۆن هەڵدەسەنگێنرێت:

سەركۆمار مەسئولە بەرامبەر خودای مەزن و گەلەكەی، ئەوەندە مەزنە لەدوای خواوەندی گەورە ئەو رابەرە كە بەچاوی باوك سەیردەكرێت. دەبێت هەموو پێویستیەكانی گەلی عێراق ئەنجام بدات، ئاسایش و ئارامی، ژیانی رۆژانەی، ژیانی ئابووری، رێگادان بەخوێندن بەخۆڕای ی، خزمەتگوزاریی تەندروستی. فەرمانەكانی سەرشانی گەلیش پێویستە بەپێی یاسا كەبۆی دانراوە هەمووی جێبەجێ بكات، بەبێدواكەوتن، مرۆڤ بۆی هەیە چ بەنووسین یان بەقسە هەموو سلبیاتی حكومەت بخاتە بەرچاو چ لەرێگای رۆژنامەو گۆڤارەوە لەسنووری یاسادا رای خۆی دەرببڕێت.

ئێستا ٨٠٪ی دانیشتوانی عێراق بارودۆخ وای لێكردن لەسیاسەت بدوێن و قسە بكەن و بۆچوونی خۆیان بەزەقی ئاشكرا بكەن، لەسەر رەوشت و كردەوەو بۆچوونی سەددام هەموو سەعاتێك چەند رۆژنامەو ئیستگەیەك لەهەموو جیهاندا گوتارێك بلأودەكەنەوە لەسەر كەسی سەدام باسی سلبیاتی دەكەن. رۆژانە هەموو دانیشتوانی عێراق دەبێت لەهەموو بۆچوونێكی باسی سلبیاتی صدام بكات، هەموو كەموكورتیەكی تایبەتی هەبێت ئەو بەتاوانبار دەزانێت، هۆی هەموو ئەو بارودۆخەی بەسەر عێراقدا هات بۆ خودی صدام دەگەڕێتەوە. خەڵك تاوانباری دەكەن دەڵێن سیخوڕی ئەمەریكایە. بەفەرمانی ئەمەریكا بوو شەڕی ئێرانی كرد. ئەمەریكا ئیشارەتی بۆكردیت بۆ گرتنی كوێت. دەوڵەتەكانی كەنداو بەهۆی گرتنی كوێت كەوتنە ژێر قەرزەوە، ئەوەندە دڕندانە جوولایەوە لەگەڵیاندا، ناوێرن ئەگینا بەدەنگێكی بەرز لەڕۆژنامەو ئیستگەو تەلەفزیۆنەوە بەزەقی بلاویان دەكردەوەو هاواریان دەكرد، رۆژانە دەیانگوت هەموو ئەوەی روودەدات تەنها فیتی صدامە، نەمانی مایەی ئاشتیو شادییە لەجیهاندا. سەروەت و سامانەكەی دووجار بەرامبەر سامانی شای ئێرانە كە لەدوای جێماوە، بەردەوامیش زیاددەكات. بەردەوام خەریكی كۆشك دروستكردنە كەسەدان ملیۆن دۆلاری تێدەچێت. سەربازو ئەفسەر بەجلوبەرگی سەربازی یەوە سواڵ دەكەن. بەشێكی زۆر لەدانیشتوانی عێراق روویكردۆتە دەرەوەی ولات، لەهەموو چین و توێژێك بەردەوام خەڵك لەڕۆیشتندایە, ئەوانەی لەسنووری توركیاوە دەڕۆن باش دەزانن كوشتن یان گرتن و سنوورداش چاوەڕوانیانە. رۆژانە بەردەوامە لەوێنەگرتن و بەناچاری هەموو مرۆڤێك وێنەی ئەوی لەماڵەوە هەڵواسیوە. ژنی دووەمی نیرۆن تەنها یەك رەسمی هەیە ئەویش لەمۆزەخانەیەكی فەرەنسیدا دانراوە، لەهەموو ئیتالیا رەسمی نی یە.

یەکێك لە قسەکانی دەڵێ (کەهاتم عێراقیێکی دواکەوتوو بوو لەهەموو بارێکەوە، کەڕۆیشتم دەبێت بەوێرانی بەجێی بهێڵم).

سەدام لەبەڕێوەبردنی سیاسەتدا تیشك دەخاتە سەر دوو خاڵ:

١-بەپێی ڕاپۆرتی رۆژانەو مانگانە کەدێتە بەردەمی لەوەزارەتی دەرەوەو ناوەوە بەتایبەتی لەباڵوێزی عێراق لەتاران‌و تورکیاو سوریاو نوێنەری عێراق لەنەتەوە یەکگرتووەکان‌و ئاسایشی گشتی‌و استخباراتی عەسکەری‌و رێکخراوی بەعس لەباکور.

٢- تایبەت بەشەخسی خۆی، دوا بڕیارو پەیوەندی بەخۆیەوەیەتی.

ئەنجومەنی وەزیران لەسەر داواکردنی صدام کۆدەبێتەوە, ئەو راپۆرتە درۆیانەی کە ١٪ی ڕاستەو باقیەکەی هەمووی درۆیە، کەتەواوبوو لەخوێندنەوەی، صدام قسە دەکات.

**عبدالسلام عارف:**

لەساڵی ١٩٦٥ بەفرۆکە سەردانی پارێزگای بەسرەی کرد، بۆ زوبێر چوو، هەلیکۆپتەرەکە کەوتە خوارەوە هەموویان سووتان، بەهۆی سەعاتەکەی دەستی تەرمەکەیان ناسی یەوە ئەم کارە تیرۆریستی یە بەدەسیسەی بەعس ئەنجامدرا.

ئەفسەرە کوردەکان کە لەکۆلێجی سەربازی بوون، دەگێڕنەوە ئێواران کاتی پشوودان هەموومان کۆڕمان دەبەست‌و لەگەڵ برا عەرەبەکان گفتوگۆمان دەکرد, قسەو گفتوگۆو هاتوچۆکردنمان یەکجار پتەوو خۆش بوو، تەنها عبدالسلام عارف نەبێت زۆر خۆی دوور دەخستەوە، هەڵوێستی یەکجار نارێکوپێك بوو. کاتێك لەڕووداوی ١٤ی تەمموز ١٩٥٨ ناوی هات بەم شێوەیە کەدیمان حوکمی گرتەدەست. ئەگەر رۆشنبیرانی کورد بەسەدەها کتێب بنووسن لەسەر ئەوەی بەرامبەر بەگەلی کورد کردویەتی، تەواو نابێت لەکوشتن‌و دێ سووتاندن‌و ماڵ وێرانکردن‌و لەسێدارەدان‌و گرتن‌و زوڵمکردن.

هەڵوێستی روون‌و ئاشکرا بوو، بەزەقی‌و بێشەرمانە دەیگوت لەعێراق هەرچی هۆزێکی کورد هەیە رەسەنی دەگەڕێتەوە بۆ عەرەب، وشەیان گۆڕاوە چونکە لەشاخ ژیاون، بەکوردی دەدوێن، دەیگوت لەعێراق کێشەیەك نی‌یە کەپێی بڵێن کێشەی کورد.

جارێکیان برایەکی ئەرمەنی خاوەن (صالون حلاقە ئاڤۆ) لەبەغدا (منصور) گیرا، دوای بەردانی هاتە لام سوپاسی کردم‌و بەیەکەوە چووینە لای بەڕێوەبەری ئاسایشی کەرخ , پرسیارم لێکرد ئایا ئەمە تاوانی چی‌یە؟ ئاگاداری بکەن خۆی باش بکات تا جارێکی تر تووشی ئازارو ئەشکەنجە نەیەت‌و منیش تووشی زەحمەت نەکات. بەڕێوەبەری ئاسایشی کەرخ دووبەدوو پێی ڕاگەیاندم ئەم کابرا ئەرمەنیە گەورەترین تاوانی کردووە هەقی کوشتنە، (ابو بازیان) چۆن تۆ یارمەتی ئەم جۆرە کەسانە دەدەیت، ئایا دەزانیت (ام احمد)ی خێزانی عبدالسلام عارف چۆتە لای، تۆ چۆن بەمە ڕازی دەبیت ژنی سەرکۆماری کۆن کردەوەی

وەهای لەگەڵ بکرێت. گوتم: لەم ڕۆژانە لای صالح مهدی عماش بووم (وەزیری ناوخۆ) تەلەفۆنیان بۆ کرد کەڕێگابدات ام احمد سەفەر بکات بۆ قاهیرە، عماش گوتی: من ڕێگا نادەم ژنی سەرکۆماری کۆن بچێتە قاهیرە ئابڕوومان بەرێتو لەوێ بەکەیفی خۆی رابوێرێت، وادیارە ام احمد بۆتە ... کاتێك ئاگاداری ئاڤۆم کرد کەتۆ لەسەر ئەوە گیراویت دۆستایەتیت لەگەڵ ام احمد هەیە، پێکەنیو بڕیاریدا ئیتر واز بهێنێت لەئیشەکەیو نەچێتەوە دوکانەکەی، بڕوام پێ نەکردو دەمزانی کەڕاست ناکات. رەنگە ئەمە بەشێك بێت لەو دوعایەی کورد.

**دوای ڕێککەوتننامەی جەزائیر:**

بۆمدیەنی سەرکۆماری جەزائر بەشێوەیەك گیانی لەدەستدا دووجار ویستی خۆی بکوژێت، ئەوەندە کەنەفت بوو لەسەر جێگا. شای ئێران، محەمەد رەزا، لەهەموو جیهان

جێگای نەبۆوە, پاڵپشتەکەی کەئەمەریکا بوو ڕێگای نەدا پشـــوو بدات. دونیای لێهاتەوە یەكو بەنەخۆشی شێرپەنجە گیانی لەدەستدا. بزانین صدام چی بەسەر دێت؟

**احمد حسن بکر"**

رابردوویەکی تاریكو ڕەشی بەرامبەر بەگەلی کورد هەیە، زاڵم، پیاوکوژو درۆزن. کاتێك سەرۆکی وەزیرانو سەرکۆماربوو، بەشدارە لەهەموو بڕیاردانو پیلانێك بۆ لەناوبردنی گەلی کورد، دەستی باڵای هەبوو لەبڕیاری کوشتنی بارزانی، احمدو صدام ونازم گزار بەشدارن لەپیلاندانان، بەڵام نازم بۆ جێبەجێ کردنی لەگەڵ مەلا ئاینی یەکان کۆدەبێتەوە، شوکر بۆ خوای مەزن بارزانی سەلامەت بوو.

احمد وصدام (تعریب وتبعیسو انفال) یان (کورد بەعەرەب کردنو کورد کردن بەبەعسیو کوردیان بەکافر دانا بۆ لەناوبردنی), هەرچی یان پێکرا کردیان. (احمد وصدام) ویستیان ٤ ملیۆن کورد لەعێراق بۆ دەرەوەی ولات دوورخەنەوە، بەڵام دڵسۆزو پاڵپشتی هەمیشەی کورد جەنابی سەرکۆماری لیبیا معمر القذافي و سەرکۆماری سوریا ڕێگایان نەدا ئەمە جێبەجێ ببێت.

برادەرێکی دڵسۆزو شیرینم کەناتوانم ناوی بهێنم چونکە لەژیاندا ماوەو پیاوێکی ناسراوە، ساڵی ١٩٩٨ پرسیارم لێکرد ئایا دۆستایەتیو هاتوچۆکردنتان لەگەڵ احمد حسن بکر چۆن بوو؟ گوتی: لەو کاتەوەی لەسێ سەرەتای ی بووم یەکترمان ناسی هەموو ژیانمان بەیەکەوە بوو, رۆژ بەڕۆژ زیاتر دۆستایەتیمان بەهێزتر دەبوو. گوتم: ئەرێ راست بوو یـــان

شانۆگەری بوو کە احمد حسن بکر دەستی کشاندەوە لەپۆستی سەرکۆماری؟

گوتی: ئەمە سەدام بەسەری سەپاند، دووساڵ بوو لەمخابرات تەنها وێنەی صدام بەدیوارەوە بوو، سەدام حوکمی گرتبووەدەست, پرسیم: باشە چۆن مرد؟ گوتی: لەو خانووەی لێی بوو پاسەوانی عەسکەری هەبوو دوو کیژی جوانی فنلەندی خزمەتیان دەکرد، کەشتیان دەهێنا لەسەر دەژنۆ دەڕۆیشتنو پشتاوپشت

دەگەڕانەوە، مانگی ٤–٥ جار دەچوومە لای. پێش مردنی بە ٢٥ رۆژ چوومە لای، پاسەوانەکانی نەمابوون , دەرگا لەسەر پشت بوو دەرگای ژووریشی کرابۆوە, دوای سلاو پێم گوت (احمد) وا دەمری، بۆچی بەسەرهاتی خۆت نانووسیت منیش رۆژ نا رۆژێك دێم دەیبەم، گوتی ناتوانم، بۆ تۆش باش نیەیە. پێش مردنی بەچوار ڕۆژ چوومەوە لای, پاسەوانەکانی نەمابوونو کیژەکانیش نەمابوون، لەسەر سەری ڕاوەستام، کاتێك سەری هەڵبڕی گوتی (فلان) لەکەیەوە لێرەیت؟ گوتم: ١٦ دەقیقەیە بەسەر سەرتەوە وەستاوم، ئەوە قورئان دەخوێنی؟ لاواز بوویت، خەریکە دەمریت، چیتە قسەم بۆ بکە. گوتی: ماوەی یەك مانگە نانم پێناخورێت، بەهیچ جۆرێك ئیشتیهام نەماوە، وایان لێکردم کەبەم جۆرە بمرم.

دوای چەند ساڵێك هاوڕێکەمو خیرالله طلفاح یەکتر دەبینن. (...) گوتی: رۆژێك خیرالله طلفاح هاتەلام گوتی ئایا دەزانی خەڵك بەچ جۆرێك بەخراپی باسی برادەرەکەت احمد حسن بکر دەکەن؟ فلان وەلامی دەداتەوە: دەڵێن نەعلەت لە احمد حسن بکر. خیر الله طلفاح دەڵێت: هەزار جار نەعلەت لەاحمد حسن بکر. فلان دەڵێت: تۆ بۆچی وا دەڵی یت خۆ ئێوە بەهۆی احمدەوە گەیشتنە ئەم پلەو پایەیە. خیر الله طلفاح دەڵێت: دوو بەدوو لەگەڵ ابو عدی قسەمان دەکرد، باسی بارودۆخی سیاسی ئەم رۆژەم کرد کەبنەماڵەی ئێمە بەچ جۆرێك دوژمنمان لەدەرەوەو ناوەوە هەیە بەتایبەتی شەخسی تۆ (صدام), من وا بەباشی دەزانم کەیەکێك لەخزمە نزیکەکانی خۆت جێنشیی تۆ بێت کەخودا نەخواستە تووشی شتێك هاتیت یەکسەر بێتە سەر حوکم تاکو ئەم حکومەتەمان هەر بەردەوام بێت. صدام دەڵێت: خاڵە بەڕاستی باشت بیرکردۆتەوە منیش لەم بارەوە ئەم پێشنیازەت دەخەمە بەردەم , چ کەسێك پەسەند دەکەی ؟ خیر الله طلفاح گوتی: کەس هەیە لەکوڕی خاڵت بەم جۆرە دڵسۆزو نزیکت بێت، لەهەموو ڕوویەکەوە جێباوەڕتەوهی هەموو خێزانەکەیە. دوای سێ ڕۆژ عدنانی کوشت (١٩٨٩). فلان دەڵێت: تۆ ئەمە دەزانیت کەصدام لەپیلانێك بەفڕۆکە عدنانی کوشت, لەساڵی ١٩٩٧ حسەین کاملی زاوایشی کوشت, عدی زامدار کرا، نیوە مرۆڤە، هەتاکو ماوە هەر بەشکستی رۆژگار دەباتەسەر.

ئاشکرایە لەیەکەم ڕۆژی دانانی حکومەتی عێراق هەرچی هاتۆتە سەر حوکم هەمووی بەکودەتای سەربازی هاتوون یان وەکو مەلیك فیصل، ئینگلیز دایمەزراندن. هەموو سەرۆکی حکومەتەکان بەهەموو توانایەکیانەوە نەخشەی سیاسیو عەسکەری یان ئەوەبوو کەنەهێڵن ڕۆژێك لەڕۆژان کورد بەخۆشیو شادیو سەربەستی وەکو گەلی عەرەب بژی، هەر بەچاوی مرۆڤی پلە دوو یان سێ تەماشا کراوەو مامەڵەیان لەگەڵ کردووە. لەگەڵ ئەوەشدا هەموو پیلانو نەخشەی سیاسیو عەسکەری یان لەزەمانی پاشای ی تاوەکو ئەم مێژووە لەناوبردنی کورد بووە.

لەساڵی ١٩٥٩ بابەکرئاغای گەورە کەسەرۆکی هۆزی پشدەرە ئەمەی گێڕایەوە منیش ئامادەی ئەو دانیشتنە بووم: لەکودەتاکەی رشید عالی گەیلانی ساڵی ١٩٤١، دوای ٤٠ ڕۆژ بەسەر حکومەتەکەی تێپەڕیبوو ئەوەبوو تێکچوو و هەرەسی هێنا رایکرد بۆ ئەڵمانیا.

باڵوێزی تازەی ئینگلزی هاتە عێراق، لەو کاتەی باڵیۆزی کۆنی ئینگلیزی لەفرۆکەخانەی بەغدابوو، پیاوە گەورەکانی عێراق ئامادەبوون، بالیۆزی کۆن داوا لەباڵیۆزی تازە دەکات کەیەکەیەکە لەگەڵ ئەو خەڵکانەی هاتوون خواحافیزی یان لێ بخوازێت، لەهەمان کاتیش یەکەیەکە بەباڵیۆزی تازە بناسێنێت، کاتێك کەدەگەنە سەر جمال بابان کەناسراوە بەباوکی شوان باڵیۆزی کۆن رووردەکاتە جمال بابانو قسە لەگەڵ باڵیۆزی تازەدەکات دەڵێت کاتێك کەمن چلوئەوەندە ڕۆژ دەست بەسەربووم ئەوەی کەزوو زوو سەری دەدامو بەردەوام خواردنی خۆشی کوردی بۆ دەهێنام ئەم زاتە مەزنە بووە لەبنەماڵەیەکی کوردی ناسراوە کەحکومەتی کوردیان هەبووە بەناوی حکومەتی بابان لەسلێمانی، بۆ ئاگاداریت ئەم زاتە مەزنە دۆستێکی تاجی بەریتانیەیە، راسپاردە هەیە کەپشتگیری بکەین. باڵیۆزی تازە دەڵێت خۆشحاڵم بەناسینت، حەز دەکەم ئەگەر کارێکت هەیە بۆت ئەنجام بدەم. جمال بابان دەست هەڵدەگوشیێو رووردەکاتە هەردووکیان بەباڵیۆزی کۆنو تازە دەڵێت (فیصل)تان هێنا کردتان بەمەلیك بەسەر ئێمەدا دوایی ئەم هەموو خزمەتەی عەرەبتان کرد لەعێراق حکومەتێکتان بۆ دامەزراندنو ئێمەتان بەزۆر بەعەرەبی عێراق بەستەوە لەکاتێکدا ئێمە کوردین، ئینجا کودەتایان بەسەرتاندا کرد لەکاتێکدا ئێوە لەجەنگدان دژ بە هیتلر، باشە بۆ بیرێك لەکێشەی کورد ناکەنەوە؟ داوام لەتاجی بەریتانی ئەوەیە کەشتێکیش بۆ ئێمە بکەن، کێشەی کورد جێبەجێبکەن.

باڵیۆزەکان یەك وەڵامیان دەبێت، ئەویش ئەوەیە کەجانتای دبلوماسی ئێمە، کێشەی سیاسیی کوردی تێدا نیيە، بەڵام حکومەتی تاجی بەریتانی داوای لەحکومەتی عێراق کردووە، کەڕێگەی خوێندنو کاسبیو پلەی عەسکەریو پلەوپایەی فەرمانبەر بەم جۆرە بێت: کورد بۆی هەیە لەپلەی عەسکەری بگاتە سەرۆکی ئەرکانی سوپا هەروەها لەخوێندندا بۆی هەیە بگاتە هەر پلەیەك کەبیەوێ , لەفەرمانبەریدا بگاتە سەرۆکی وەزیرانو لەکاسبیدا دەوڵەمەندترین کەس بێت.

## تێبینی

*١- لە ٨٥٪ راستیانکرد، تەنها کاری سیاسیت نەکردایە بەرامبەر بەحوکمی مەلیکی بۆ نموونە لە ١٤پارێزگار (١١) یان کورد بوون.*

*٢- سەرۆکی دادگای کەرکوكو پارێزگارو بەڕێوەبەری پۆلیسو بەڕێوەبەری شارەوانیو پۆلیسو پاسەوانەکانی کەرکوك هەموویان کوردبوون. فرقەی (٢)ی سەربازی لە ٩٠٪ی سەربازەکان کورد بوون و ٤٠٪ ی ئەفسەرەکان کورد بوون، و لەژمارەی٤٨٠٠ کرێکار لەکۆمپانیای نەوت ٣٩٠٠ یان کورد بوون، دانیشتوانی*

*شارەکە (٤)ماڵی عەرەبی لێنەبوو گامێشیان بەخێو دەکرد, هەندێك لەکاربەدەستەکان عـەرەب بـوون، شـاری کەرکوك ٨٥٪ ی کوردو١٥٪ ی تورکمانبوون.*

*٣- ئەگەر ئێستا سەرژمێری شاری کەرکوك بەتێکڕای ی بکەین دەردەکەوێت کـەدوای کودەتاکـەی ١٩٥٨ چی یان بەسەر کوردا هێنا. گۆڕستانی کـەرکوك گـەورەترین شـاهدە بـۆ مێـژوو کـەناتوانن دەسـتی لێبـدەن‌و بیگوێزنەوە ئەویش ١٠٠٪ ی کوردە.*

*سەدام بەم خەیاڵەوە ڕۆژگاری دەبردەسەر، تێکڕا کورد لـەژێر فـەرمانی بـەعس دەجووڵێتـەوە , هەمیشە شـانازی بـەهێزو ژمارەیـەك ڕێکخـراوی بـەعس دەکـرد، دوو ملیـۆن کـورد بەعـسی‌یەو چـەکداری فرسـانمان ژمارەیان زیاد لە ٢٠٠ هەزار چەکدارە، کەکورد پی یان دەڵێن جاش , دانیشتوانی حوکمی زاتـی ٩٩٪ی لەگەڵ ئێمەدان، پاڵپشتی هەرە گەورەی بەعس ئیمـڕۆ کـوردە، ڕۆژنامـەو گۆڤـارو تەلـەفزیۆن وای دەخستە بەرچاو کەکورد هەموو لەدەورو پشتی سەرۆکەکەیان (صدام) کۆبوونەتەوە، تەنها دووژمنانی کوردو بـەعس نبێـت کـە لەژێر فەرمانی دەرەوە دەجووڵێنەوە، ئەوانیش ژمارەیان ئەوەندە کەمە بەپەنجەی دەست دەژمێرێن، ئا بەم جۆرە بیری دەکردەوە.*

### بەرەی کوردستانی‌و ڕا پەڕینی ١٩٩١

بەرەی کوردسـتانی کەوتـە جمووجـۆڵ‌و پـەیوەنـدی ی بەزۆربـەی دانیـشتوانی کوردسـتان کـرد. بەڕاسـتی دەورێکی گەورەی بوو بەتایبەتی دوو هێزە گەورەکەی کورد- یەکێتی نیـشتمانی کوردسـتان بەسـەرۆکایەتی مام جەلال و پـارتی دیمـوکراتی کوردسـتان بەسـەرۆکایەتی بـارزانی, ئـەوەبوو ٩٧٪ ی کـورد بەشـداری ئـەم ڕاپەڕینەی کـرد، هـەموو کـورد یـەکیگرتو بـوو بەیـەك هێـز بەچـەکی سـووك‌و دارو گیـانی خـۆی پـەلاماری داگیرکەری کوردستانی باشووریدا.

لەماوەی یەك هەفتەدا، سەد هەزار سەرباز بەهەموو چەکێکی قورس‌و سووکەوە تەسلیم بوون، کوردستان ٩٥٪ ی پاککرایەوەو ڕزگاربوو. گەلی کورد بۆی ئاشکرا بـوو بەیـەکگرتن دەکرێت بەسـەر دوژمنـانی زاڵبێـت‌و کوردستان‌و دەبێتە قەلأیەك بۆ هەموو مرۆڤێکی نیشتمانپەروەری کوردو کەمایەتی‌یـەکان , دەبێتـە بنکەیـەك بڵێسەی ئازادی لێرەوە بۆ گەلانی دراوسـێمان پەرەبسێنێت. کـورد هەمیـشە گـەلێکی ئـازاو بەجـەرگ بـووە، دوژمنان لەڕێی هێزەوە نەیانتوانیوە لەناوی بەرن، زیاتر ڕێگەی سیاسی‌و پیلان داڕشتن لەڕێگـەی دەوڵـەتانی ترەوە هێزی پێشمەرگەو جەماوەری کوردیان کپ کردۆتەوە.

یەکـەم ڕاپـەڕین (١٩٩١/٣/٥) لـەدەروازەی ڕانیـەی خۆشەویـست دەسـتی پێکـرد، دوای نزیکـەی مانگێـك بەسـەر ڕاپەڕینەکـەدا، صـدام بەهـەموو توانایەکیـەوە هێرشـێکی دڕندانـەی کردەسـەر کوردسـتان لەهـەموو لایەکەوەو (مجاهدین خلقی ئێران) شان بەشانی سـوپاکەی صـدام (گـاردی کۆمـاری) دژی کـورد دەجـەنگان، خەڵکێکی زۆری بێتاوانیان کوشت.

**کۆڕەو:**

گەورەترین رووداو بوو لەمێژووی کورددا، لەسەرانسەری جیهان باسکرا، نزیکەی سێ ملیۆن‌و نیو کورد سەروەت‌و سامان‌و ماڵیان بەجێ هێشت روویانکردە تورکیاو ئێران. حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، بەیانێکی ئاراستەی گەلی کورد کرد لەکوردستانی رۆژهەلات بەبۆنەی کۆڕەوی کوردستانی باشوورەوە تی یدا رایگەیاند هەریەکێك لەڕاست خۆیەوە بەهەموو توانایەوە دەستی یارمەتی یان بۆ درێژبکەن، بەپیر براکانتان بچن‌و خزمەتیان بکەن بەماڵ‌و بەگیان، ئەوەبوو هەلۆێستیان ئەوەی پیشاندا، لەهەمانکاتدا کوردستانی باکوور باوەشیان کردەوە، جێی شانازی یە هەموو کوردێکی باشوور کەگەڕاوەتەوە چ لەکوردستانی باکوور چ لەکوردستانی رۆژهەلات، راستی ئەم بەپیرچوونەو ئەو خزمەتکردنە تاوەکو ئەم ساتەش باس دەکرێت کەوەها هاتن بەپیرمانەوە باوك پارووی لەدەمی منداڵەکەی دەردەهێناو دەرخواردی ئەو خێزانەی دەدا کەدەیبردەوە بۆ ماڵەوە.

**رووداوەکانی کوردستانی باشوور:**

لای هەموو دانیشتوانی کوردستانی باشوور ئاشکرایە منیش لەکتێبەکەم ئەو خالانەی گرنگ‌و زەقە بەکورتی باسیدەکەم:

بڕیاری ئەوروپاو ڕۆژئاوا (ئەمەریکا، بەریتانیاو فەرەنسا) کەپارێزگاری کوردستانی باشوور بکەن دانانی هێڵی ٣٦، هەروەها بنکەی ئەنچەرلیك بۆ ئەم مەبەستە، عێراق بۆی نی‌یە بەفڕۆکەو هێزی پیادە هێرش بکاتە سەر هێڵی ٣٦.

هەڵبژاردن کرا (١٩٩٢/٥/١٩) , لەئەنجامی ئەم ئەزموونە حکومەت‌و پەرلەمانی هەرێمی کوردستان دامەزرا، لەگەڵ هەموو دەزگاکانی.

دەوڵەتە ئیقلیمی‌یەکان کەوتنە پیلان‌و دەسیسەی گلاو بۆ تێکدانی ئەم ئەزموونە, هەر سێ مانگ جارێك (ئێران‌و تورکیاو سوریا) بەئاشکرا کۆدەبوونەوە, عێراق بەنهێنی دەوری سەرەکی هەبوو.

کاتێك شەڕ لەنێوان (پ.د.ك) و (ی.ن.ك) هەلگیرسا ئەم سێ دەوڵەتە ئیقلیمی‌یە وازیان لەکۆبوونەوەکانیان هێنا، گەیشتنە ئەو باوەڕەی بەپێی ئاگاداری خۆیان کە لەقوولای ی کوردستاندا دەستیان دەڕوات، جارێکیتر مەحاڵە یەکێتی‌و پارتی لەژێر یەك یاساو هەرێم کۆببنەوەو بەیەکەوە ئیش‌و کاری کوردستان بەڕێوەبەرن.

گەلی کورد لەکوردستانی باشوور لەژێر ئیدارەی سێ حکومەتدا دەبێت، بەم شێوەیە:

– ٢/٥ی کوردستان لەژێر سێبەری صدام (خانەقین، کەرکوك، سنجار) دەژین.

– بەشێکی کوردستانی باشوور بەناوی هەرێمی کوردستان پایتەختی هەولێرە ئیدارەو حوکمی لەژێر پارتی دیموکراتی کوردستاندایە بەسەرۆکایەتی بارزانی.

– بەشێکی کوردستانی باشوور بەناوی هەرێمی کوردستان پایتەختی سلێمانیە ئیدارەو حوکمی لەژێر یەکێتی نیشتمانی کوردستاندایە، بەسەرۆکایەتی مام جەلال.

### تێبینی

لەنێوان یەکێتی نیشتمانی کوردستانو کۆماری ئیسلامی ئەوپەڕی دۆستایەتی بەردەوامەو تاکو ئەم مێژووە بەناوی بەرژەوەندی گشتی، لەیەکتر نزیکتر دەبنەوە.

لەنێوان پارتی دیموکراتی کوردستان و تورکیا ئەوپەڕی دۆستایەتی بەردەوامەو تاوەکو ئەم مێژووە رۆژانە بەناوی بەرژەوەندی گشتی، لەیەکتری نزیکتر دەبنەوە.

### رێکەوتننامەی واشەنتۆن:

جەماوەر بەتێکڕای ی ئەم پرسیارانە دەکاتو دەڵێت: لەکاتێکدا ئەمە گەورەترین ڕووداو بوو لەمێژووی کوردستانی باشوور، لەدوا شەڕی براکوژی کەهەردوو رابەر شانبەشانی وەزیری دەرەوەی ئەمەریکا راوەستان ڕێکەوتەنەکەیان ئیمزا کرد.

لەمانگی ئازاری ١٩٩٩ نوێنەری هەردوو حزبەکە چوونە ئەمەریکا کەگەڕانەوە بڵاویانکردەوە کەنوێنەری روسیاو چین و فەرەنسا ئێمەی نەدی، بەڵام نوێنەری ئەمەریکاو بەریتانیا گفتوگۆیان لەگەڵدا کردین، پێ یان راگەیاندین بڕۆنەوە رێکەون ئەو کاتە ئێمە هەموو شتێکتان بۆ دەکەین بەقەوارەی سیاسیشەوە.

تەنها لەو رۆژەوە کە لەواشەنتۆن ئیمزایانکرد لەنێوانیاندا شەڕ رووی نەداوەتەوە، ئێستاش کەمن ئەم کتێبە بڵاودەکەمەوە نوێنەری هەردوو حزبەکە بەرەو ئەمەریکا رۆیشتن.

روونکردنەوەیەك دەربارەی هەرچوار دەوڵەتە ئیقلیمیەکان، ئینجا داوا لەبرا ئازیزەکانم دەکەم لەڕۆشنبیرو کوردی نیشتمانپەروەرو کەدەربارەی باکوورو کوردستانی ڕۆژهەڵاتو کوردستانی ڕۆژئاوا، بەهۆی بارودۆخ وچەند هۆیەك زۆر بەکورتی نووسیومە.

### سوریا:

بەدرێژای ی سنووری تورکیاو سوریا کوردیان گواستەوە، ئەمە کاری بەعس بوو، بەناوی (پشتێنەی سەوز) دژی کورد، کێشەی کورد بەهیچ جۆرێك باسناکرێت، کەناوی کوردستانی رۆژئاوا دێت سوریەکان دەڵێن گوایا کوردی ئێرە کۆچەرین, لەتورکیاوە هاتوون.

### تورکیا:

قسەکانی سەرکۆماری تورکیا سلیمان دیمریل، لەڕۆژنامەو تەلەفزیۆن بڵاوکرایەوە، گوتی: (کوردو حکومەتی کوردیم نەبیستووە)، بەئاشکرا سیاسەتیان بڵاودەکەنەوە، دەربارەی کوردستانی باشوور رازی نین بەهیچ جۆرێك هەردوو حزب رێکبکەون،

كەبانگەشەی فیدرالّیەت بكەن, ئەوان تووشی لەرزو تا دێن.

**ئێران:**

كەباسی كێشەی كورد دێت هەموو سەركردەكانی كۆماری ئیسلامی یەك وەلاّمیان هەیە:

ئێمە كێشەی كوردمان نیـیە، چونكە (اسلام سنووری نیـیە)، بەشـێك لەڕۆشـنبیرو كـوردی نیـشتمانپەروەر وا هەست دەكەن لەبۆچوونی سەركۆماری تازە گۆڕانكارییەك دەربارەی لەكێشەی كورد روودەدات.

**بۆ حاكمی بەغدا صدام تكریتی:**

لەو رۆژەوەی هاتوویتە سەر حوكم بەهیچ جۆرێك نەتویستووە كێشەی كـورد بەئاشـتی چارەسـەربكەیت، ١١ی ئازاری ١٩٧٠ش بارودۆخی پی ی كردی، ئەویش كاتی بوو.

تاكو تۆ لە ژیاندا مابیت بارودۆخی ولاّت بەم شێوەیە دەبێت: بەگشتی گـەلی عێـراق چـاوەڕوانی گۆڕانـە، ئـەویش نـەمانی تۆیـە، (ان شـاء الله) دوای بڕیارەكـەی كۆنگرێـسی ئەمـەریكی بـۆ لابردنـی تـۆ، سـەركۆماری ئەمـەریكا بیـل كلنتـۆن چـەند جـار گـوتی پـێش كۆتـاییو فـەرمانڕەوای ی مـن, دەبێـت (صـدام تكریتـی) نەمێنێت.

بەگشتی گەلی عێراقی چاوەڕوانی ئەوەی لـەتۆ دەكـرد (یـا را بكـەیت یـا اسـتقالە بـدەیت یـا خـۆت بكوژیت) یـا داوای لێبـوردن بكـەیت لەگـەلی عێـراق، بەتایبـەتی لـەكوردو شـیعە. كۆمـاری ئیـسلامیش كەئـەو شەڕەت بەزۆر بەسەردا سەپاندن، داگیركردنی كوێت، دەبوو هەنگاوێك بنی یت بۆ مانەوەی خـۆت بـچیتەسەر تەلەفزیۆن بەیانێك بلاّوبكەیتەوە كەداوای لێبوردن بكەیت لەگەلی كورد بەتایبەتی بـۆ كیمیابـارانی هەڵەبجـەو ١٨٢ هەزار زیندەبەچاڵ و كوشتنی ٨٢٠٠ بارزانی كە ٣٦ كەسیان لەبنەماڵەی شێخانی بارزان بـوون، دان بـنی یـت بەدیموكراسـیو هەڵبـژاردنی ئـازاد، فرەحزبـی، كێـشەی كـوردو شـیعەی باشـوورو كەمایەتیـیـەكانی تـر، ئەوانەی تعریب كراون بگەڕێنەوە بـۆ شـوێنی خۆیـان، دان بەفیدرالّیـەت بـنی یـت بـۆ گـەلی كـورد، (كـەركوك وخانەقین وسنجار) بچێتە سەر حوكمی فیدرالّیەت.

سەدام گرەو لەسەر ئەو دووخاڵە دەكات:

ئەوە راپۆرتێكی وەهمیـیـە، هەرچـەندە لەشـوێنێكی تـردا نووسـیومە، بـەلاّم لێـرە بەدوورودرێـژی باسـی دەكەم:

– لـەدیوانی سـەرۆكایەتی كۆمـاری عێـراق بـۆ صـدام حسـەین، ئـەم راپـۆرتەتان ئاراسـتە دەكـەم كەلەرێكخراوی بەعسو ئاسایشی گشتیو استخباراتی عەسكەری و مخابرات بەكورتی دەیخەینـە بەرچـاوتان دەربارەی (شمالی عێراقی حبیب)، دوو حزب ئیدارەی دەكات، ناكۆكی لەنێوانیاندا بەردەوامە, دوور نیـیە لەم نزیكانە شەڕبێتەوە (گرانی، بێكاری، دزی)پیاوكوژی، سووتەمەنی گرانە، خەڵك تەواو لی یان بێزارە، هـەموو كورد داوامان لێدەكات بەزووترین كات سوپای خۆشەویستمان بگەڕێتەوە، خەڵكی شمال چیتر كۆمـەكی ئـەو

حزبانە نەکات، ئێستا کەسیان لەگەڵدا نەماوە، وەزارەتی دەرەوە هەڵوێستی تورکیاو سوریاو ئێرانی روونکردەوە بەتایبەتی تورکیا کەڕازی نیيە بەفیدراڵیەتو یەك حکومەت دابمەزرێنن، ئەمەش خشتەی دیدارەکانیانە بەئاشکراو بەنهێنی، جۆری چەکیان، ژمارەیان، لەگەڵ ئەو رێکخراوە بیانی یانەی کەلەوێ کاردەکەن.

– لەصدامەوە بۆ رێکخراوی بەعسو ئاسایشی گشتی و استخباراتی عەسکەریو مخابرات: فەرمان دەردەکات هەوڵ بدەن دووبەرەکی زیاتر بێت، شەڕ دروست بکەنەوە، بەسەخاوەت پارە دابەش بکەن بۆ ئەو خەڵکانەی کە لەکۆنەوە لەدڵی ئێمەدان، ناوە ناوە رێگەی سلێمانیو موصلو کەرکوك دابخەن، قەیرانی نەوتو بەنزینو گاز دروست بکەن.

## نامەیەك بۆ سەدام

### بەڕێز صدام تکریتی پێشکەشە:

پێشەکی داوای لێبوردنت لێدەکەم , قینم لەتۆ نیيە چونکە قەرزاری ئێوەم کاتێك خاوەن دەسەڵاتو ناوو سەیارەو پارە بوومو توانیومە هەرچی رووم تێبکات دەستی یارمەتی بۆ درێژ بکەم، بەنهێنی خزمەتی گەلەکەم بکەم، تا توانیومە فێڵم لێکردوویت، لەگەڵ ئەوەشدا بەفرمانی شەخسی تۆ لەسێدارە نەدرامو بەرتدام، هەتاکو ئەو رۆژەی لەپەنای ئێوە بووم پێویستم بەیارمەتی کەس نەبوو، لەهیچ روویەکەوە ماڵم بەرنەدەکەوت، بەڵام لەو رۆژەی خیانەتم لەتۆ کرد وامزانی بارودۆخم لەهەموو روویەکەوە باشتر دەبێت بەداخەوە کەس هاتوچۆم ناکات، ناتوانم چاوپێکەوتن لەگەڵ کاربەدەستان بکەم، چونکە دەزانن دەستم ناڕوات، ویستم بازیانی کورپم بەشۆفێر دابمەزرێنم، بەدۆلار، هەرچەندە واسیتەکەم زۆر گەورە بوو گوتیان لەوە گەورەتر هەیە، بەڵام دەست نایگاتی.

بەڕێز سەدام: تاوانباری سەرەکی تۆیت، چونکە رووداوەکانی عێراق هەمووی دەگەڕێتەوە بۆ شەخسی تۆ، بەتایبەتی رێککەوتننامەی جزائر، ئەنفال، تعریب، تەبعیس، هێرش بردنە سەر ئێران، گرتنی کوێت، ئیمرۆ گەلی عێراق رۆژگارێکی رەشی بەسەردا تێدەپەڕێت، تەنها خۆت و منداڵت وە.. بەشەکانی کە من لەچاو خەڵکێکی تردا زۆر باشم. ئەم کتێبەم بەکوردیيە ویستم خوێندەواری کورد باشتر لەنزیکەوە ماهیەتی بزانن، وەریدەگێڕمەوە سەر زمانی عەرەبی و انگلیزی، بێبەشت ناکەمو بڵاو دەبێتەوە، پارەی چاپکردنی قەرزە , کەس یارمەتی نەدام، چونکە کێشەی کورد بۆتە حزبایەتی، باش دەزانم کەکتێبەکەم هاتە کتێبخانە، دەستبەجێ دەستت دەکەوێت، یەکسەر بڕیاری کوشتنم دەردەکەیتو پریشکی بەر رووبارو بازیانو رەوەزیش دەکەوێت. هەرچیت ویستووە چ لەناوەوە چ لەدەرەوە بەفەرمانی تۆ تیرۆرکراوە، خەڵکێك هەیە فرمانی تۆ یەکسەر ئەنجام بدات، حەمەی عیساکەلاری دوای نەمانی شا جێی پێ لەق بوو، لەئێران

ویستی بگەڕێتەوە بۆ عێراق، داواتان لێکرد کەئەو فریشتەیە، ئەو پیاوە نیشتمانپەروەرە عبدالرحمن قازی تیرۆربکات، بەئاگاداری تۆ ئەم کارە ئەنجامدرا، بەحوسەینی حەمەی سوورەئاغام گوت بۆچی فاروقی مام عەلی یت تیرۆرکرد، خۆ هیچ ئازارو ئەشکەنجەیەکی نەداویت.

حەمەی عیسا: ئێستا لەبەغدا دادەنیشێ، کابرایەکە دەورێکی خراپەی هەیە بەردەوامە لەئازارو ئەشکەنجەی خەڵکو تیرۆرکردن.

**نامەیەکی کراوە بۆ صدام حسەین:**

ئێستا من بەرامبەرت راوەستاوم بۆت روونەدەکەمەوەو دەڵێم ئەمەیە پیلانو نهێنیەیەکانی کە لەدڵتدایە، با من پێت بڵێم:

١- بەهیچ جۆرێك ئەوەت لەمێشکدا نیەیە کەداوای لێبوردن لەگەلی عێراق بکەیت.

٢- کەرکوكو خانەقینو سنجار، تعریب دەکەیت بەیەکجاری، بۆت سەر بگرێت رەنگە قەبرسانەکانیش تەخت بکەیت.

٣-چاوەڕوانی ئەو هەلەی کەی ئەو کاتە دێت کەئەمەریکاو ئینگلیز لەپاسەوانیکردنی کورد (خەتی ٣٦) کشانەوە دەستبەجێ کوردستانی باشوور داگیر دەکەیت، بەدەستێکی ئاسن , بەکوردیەیەکەی شەلم کوێرم ناپارێزم کورد زیندەبەچاڵ دەکەیت.

**نامەیەك بۆ مام جەلال و كاك مەسعود بارزان**

**بۆ سكرتێری یەكێتی نیشتمانی كوردستان (مام جەلال) پێشكەشە:**

**بۆ سەرۆكی پارتی دیموكراتی كوردستان كاك (مەسعود بارزانی) پێشكەشە:**

سڵاوێكی گەرمی برایانە..

هیوادارم سەركەوتوو و زاڵ بن بەسەر هەموو ئەو تەنگوچەڵەمانەی كە لەئارادایە.

برایانی بەڕێز كاك مسعود بارزانی و مام جەلال

كتێبەكم بەناونیشانی (كورد دوژمنی خۆت بناسە) كەبەرگەكەی نەخشەی كوردستانە، وا لەكتێبخانەكان بڵاوم كردۆتەوە وێنەیەكم ئاراستەی ئێوەی بەڕێز كرد، كە بەگەورەی ی خۆتان بمبەخشن و لەهەموو كەموكوڕی یەكەم بمبوورن.

برایانی دڵسۆز مام جەلال و كاك مسعود، بێگومان ئەوەی ئێوە دەیزانن رەنگە من ١٪ی بزانم، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا یەكبوونتان بەیەكەوە كاروباری وڵات ببەن بەڕێوە ئامانجی هەموو كوردێكی نیشتمانپەروەرە لەهەر چوار پارچەكەی كوردستان، دڵنیام لەماوەیەكی كەمدا ئەم گۆڕانكاریانە روودەدات:

١- گەلی كورد وەكو راپەڕینی ١٩٩١ یەكدەگرێتەوەو بەگیانێكی كوردایەتی دێنەوە مەیدان.

٢- دەوڵەتە ئیقلیمیەكان دەكەونەوە جموجوڵ، ناچار دەبن بەپیرتانەوە بێن، رێزتان لێدەگرن.

٣- ئەو ناوچانەی كورد كە لەژێر سێبەری حوكمی صدامدان، كەخانەقین و كەركوك و سنجارە دەگەشێتەوە متمانە پەیدا دەكەن كەرزگاریان دەكەن.

٤- ئاسایش و ئارامی لەئێستا زیاتر بەرقەرار دەبێت.

٥- دەتوانن بارودۆخی ئابووری لەكوردستانی باشوور بەرەو باشتر بەرن.

٦- دوژمنانی كورد هیچیتر جێگەیان نابێتەوە دەست بخەنە ناو كوردستانی باشوور.

ئیتر بۆ پێشەوە ... هەر سەركەوتوو بن

برای دڵسۆزو بچوكتان

رەفیق پشدەری

## پێشەکی

خوێنەرانی بەڕێز:

دڵنیاتان دەکەم لەوەی هیچ گروپو لایەنێکی سیاسی هانیان نەداوم ئەم کتێبە دەرکەمو پەیوەندیشم بەهیچ ڕێکخراوێکەوە نیە, هەروەها دەرکردنی ئەم کتێبە تەنها بەبڕیاڕی شەخصی خۆمو هاوسەرەکەم ئێران فەیزوڵا بەگیو رووباری کچمو بازیانو رەوەزی کوڕم بوو کەهانیاندام بۆ دەستکردن بەنووسینی، بەو نیازەی کەهەستی نەتەوایەتیو نیشتیمانپەروەرێتیی کورد بگێڕمەوە بۆ رۆژی راپەڕینەکەی ١٩٩١و هەوڵدان بۆ تێکنەچوونی ئەم ئەزمونە بەهاریکاری سیاسەتمەدارو نیشتیمانپەروەرانی کورد لەدەرەوەو ناوەوەی ولآت, هەروەها یەکخستنەوەی کورد لەژێر ئالآی کوردستان. بەلآم کەسوکارم لەبەر باری ئەمنییان رێگرییان لێکردم, بۆیە هەر بەکوردیش نوسیومە چونکە باس لەکێشەی کورد د زۆرێك لەوانەی بەشی یەکەمیان خوێندبووەوە پرسیاریان لێدەکردم مەبەستت چییە لەدوژمنی کورد..؟ گوتم: ئەوەی باش کتێبەکەم بخوێنێتەوە بۆی دەردەکەوێت کەدوژمنی کورد, بێگانە نییە بەتەنها..! بەشی یەکەمم بەچلو پێنج ڕۆژ دەرکرد بەلآم ئەم کتێبە بەشەش مانگ, ئەویش بەیارمەتی کەسێکی نزیکی خۆم. هانام بۆ چەند نووسەرو ڕۆشنبیرێك برد بۆ یارمەتیدانم بەلآم لەترسدا کۆمەکیان نەکردم. بەشی یەکەمم لە ١٧/تەموزی ١٩٦٨ەوە دەستی پێکرد چونکە صدام لەڕوخاندایە هەر بۆیە حەزم کرد پێش تیاچوونی, ئەو زانیارییانەی دەیزانم لەسەر بەعس, بلآوی بکەمەوە. واش بەتەمابوومەبەشی دووەمدا کورتەباسێکی بنەماڵەی خۆمان بکەمو بەدوورودرێژی باس لەدامودەزگا

ئەمنیەکانی رژێم بکەمو ناوەڕوەکی ئەم بەشە ئێستا هی بەشی چوارەم بوو بەلآم لەبەربارودۆخی ئێستای کوردستان بەپێویستم زانی کەبیهێنمە بەشی دووەمەوە نەوەك تیرۆرمبکەن یان بمفرێننو نەتوانم ئەو راستییانە بگەینمە جەماوەر, ئینجا پشت بەخوا باسیدەزگا ئەمنیەکانی لەگەڵ بەسەرهاتەکانی ١٩٦٣-١٩٨٤, لەبەشی سێیەمدا دەکەم, ئەویش ئەگەر مردن مۆڵەتیدام.

هەندێك لەو کەسانەی ئاگاداری من بوون کەدەنوسم, لێیان دەپرسیم ئایا تۆ بەپشتیوانی لێپرسراوێك ئەم زنجیرە کتێبە دەنوسیت؟ گوتم: نەخێر گەورەترە! گوتیان حزبە؟ گوتم: نەخێر گەورەترە! گوتیان کەواتە دەوڵەتە, چ دەوڵەتێکە پێمان بڵێ؟ گوتم: نەخێر گەورەترە، خوایە..! (حسبی الله ونعم الوکیل). لەسەر بەشی یەکەم, کوڕانی مەلامستەفا بەنهێنی بڕیاری تیرۆرکردنیان دەرکردم بەلآم پ.د.ك. پێیان گوتم راکە کوڕانی مەلامستەفا دەتکوژن. بەهەمان شێوە ئافرەتێکی بەعسی کورد خەڵکی هەولێر هات

پێیراگەیاندم کەسەدام بڕیاری فڕاندنی دەرکردویت، راکە.

بۆیە بەناچاری خۆمو هەردوو کوڕەکەم، سێ خێزان رامانکرد بۆ سلێمانی, ئێستا لەخانوویەکی کرێدا دەژین, ژمارەمان ١٢ کەسە, ئەم بەشەی کتێبەکەم لەژوورێکدا تەواوکرد درێژییەکەی سێ مەترەو پانییەکەی مەترو نیوێکە, ئەو مێزەی لەسەری دەنوسم سی دیناری پێدراوە لەمەزادخانەکە. لەماوەی ئەم چەند مانگەدا کەسەرقاڵی تەواوکردنی کتێبەکەبووم زۆر بەکەمی چومەتە دەرەوە، خۆ ئەگەر نەیانهێشت لێرەش دانیشم زەوی خوا فراوانە. هەندێك لەو بەڕێزە کوردپەروەرانەی لەلندن دادەنیشن تەلەفونیان بۆ کردم گوتیانوەرە بەشی دووەم لەلای ئێمە بنوسە یارمەتیت دەدەین، گوتم: یەکەمم لێرە نوسیوە گرفت نەهاتۆتە رێم, خوا یاربێت بۆ نوسینو بڵاوکردنەوەی بەشی دووەمو سێیەمو چوارەمو پێنجەمیش هەر لەسلێمانی دەبمو هیچ گرفتێکم تووش نابێ. بەڵام ئەوەی جێی داخە هیچ بەڵگەنامەیەکم نەماوە چونکە هەندێکی، ساڵی ١٩٦٢ ماڵەکەم لەلایەن ڕژێمی قاسمەوە پشکنییان کەدەستگیر کرابووم دەکەوێتە بەردەستیانو دەیبەن. ئینجا لەدوای ئەوەی کەشفبوو لەکودەتاکەی نازم گزاردا بەشداربووم دوای ئەوەی کەڕامکرد بەخوالێخۆشبووی دایکمو براژنە سەبریم (کەئێستا لەڕانیە دەژی) راگەیاند هەرچیم داونەتێ لەبەڵگەنامە بیسوتێنن، ئەوانیش هەموویان سوتاند. دواتر ئەو بەڵگەنامانەی لەلام مابووەوە لەگەڵ دەمانچەیەکی (کاتم صەوت) *دا کەکاك مەسعود بۆی ناردبووم, کەلە١٩٧٦/٩/١٤دا گیرام, ماڵەوەمان پێش ئەوەی ماڵەکە بپشکنن لەناویان بردبوون.

لەدنیادا تەنها قەرزاری شەش کەسم، یەکەم خوا، دووەم دایکم چونکە ئەو هۆشەی

هەمە بەهی ئەوی دەزانم، سێ یەم ئەو بەڕێزەی لەبەغدا پێی گوتم حوکم دەدرێی بەئیعدام خۆت رزگاربکە، چوارەم ئەو برا پارتییەی پێی گوتم راکە کوڕانی مەلامستەفا دەتکوژن، پێنجەم ئەو خوشکە کوردە بەڕێزەی ئاگاداریکردمەوە کەبڕیاردراوە صدام بمفڕێنێت، شەشەم ئەو بەڕێزەی لەژێر دەسەڵاتی پارتی دەریکردم، داواکارم خوای گەورە پاداشتی چاکەیان بداتەوە چونکە پاداشتی ئەوان لەتوانای مندا نیە.

زۆر سوپاسی حکومەتی هەرێمی کوردستان دەکەم کەتوانیومە بەهۆی ئەم ئازادییەی ئێرە تائێستا دوو بەش دەرکەمو هیچ گرفتێکیان نەهێناوەتە رێم.

خزمەتکاری کوردو کوردستان

رەفیق پشدەری

---

* سوپاس بۆ خوا کەئەو دەمانچەیە فەوتاو بەکارم نەهێنا, چونکە ئەمڕۆ هەواڵیان بۆ کەسوکاری کوژراوەکان دەناردو دەیانگوت رەفیق پشدەری کوڕەکەی ئێوەی کوشتووە.

## چەند روونکردنەوەیەك لەسەر بەشی یەکەم

بەڕێزان کەسانێکی یەکجار زۆر لەوانەی کتێبەکەی پێشومیان خوێندبوەوە چەند پرسیارو ئامۆژگارییەکیان ئاڕاستەکردم لەسەر ئەو باباتانەی کەباسمکردوون گوایە رووداوەکان ڕوون نینو بەشێکیشیان بچڕبچڕن, منیش هەوڵمداوە بەپێی توانا ئەو هەڵانە لەم کتێبەدا دووبارە نەبێتەوە. راستە زۆر شتی نهێنی هەیە بەشاراوەیی بەجێم هێشتووە, بەڵام دڵنیاتان دەکەمەوەو پەیمانتان دەدەمێ کە بەدوورودرێژیو بەئەمانەتەوە ئەوەی دەیزانم بیخەمە بەردەمی ئێوەی بەڕێز, پەردە لادەدەم لەسەر زۆرێك لەو زاڵمو پیاوکوژو ئەوانەی لەژێر دروشمی کوردایەتیدا خەزێنەی میللەت تاڵاندەکەن, چەند کەسێك لەوانەی پەیوەندی ئاشکراو نهێنییان لەگەڵمدا هەیەو بەشێك لەکتێبەکەمیان پەسەند نەکرد بەپاساوی ئەوەی صدام حسین ناڕوخێتو لەوانەیە ڕۆژێك لەڕۆژان بێتەوە, پێیان گوتم دەبوایە چاوپۆشیت لەهەندێك رووداو بکردایە کەیەکێك لەوانە ئەوەیە کە لە١٩٧٦/٩/١١دا, صدام داوای لێکردبووم کەپیلان بۆ تیرۆرکردنی مام جەلال دابڕێژم, هەروەها پێیان گوتم پێویستی نەدەکرد لەدوای ئەم هەموو ساڵانە, ئەم جۆرە رووداوانە بڵاوبکەیتەوە, بەڵام من پەیمانم بەخوای خۆم داوە کەهەرچی بەسەرهاتێك ئاگاداربووبم و دەبێتە هۆی بەرچاوڕوونی خەڵکی ئەمولاتە بێکەسە, لەڕاستییەکان بێدەنگ نابمو دەینوسم ئەویش لەڕوانگەی ئەو فەرمودە بەنرخەی پێغەمبەر (د.خ) کەدەفەرموێت (الساكت عن الحق شيطان اخرس). ئێستاش لەسەر داوای ئەو نیشتمانپەروەرانەی بەدوای راستییەکاندا وێڵن, بریارمدا کەزۆرتر لەسەر راستییەکان بنووسم وەك لەوەی بریارمدابوو, هەروەها بەسەرهاتەکانی (کورد, دوژمنی خۆت بناسە) درێژە پێبدەم.

کتێبەکە, بەپشتیوانی خودای گەورە دەنوسم, بەبێ ئەوەی بەهیچ جۆرێك ترسی هیچ کەسو هیچ لایەنێك لەدڵمدا هەبێت. شایەنی باسە کەلەبەرگی یەکەمدا, بەکورتی باسم لەڕوداوەکانی نێوان حزبی بەعسو صدام حسینو بارزانی کردووە بۆیە لەم بەرگەدا بەدوورودرێژی راستیی ئەم رووداوانە بۆ جەماوەری گەلی کورد ئاشکرا دەکەم بۆ ئەوەی نەوەی دوارۆژ شارەزاو ئاشنابن بەدۆستو دوژمنی گەلەکەیان.

چەند کەسێك کە لەحکومەتی شای ئێران زۆر نزیکبوونو لەدەوروپشتی بارزانیدا کاریان دەکرد داوایان لێکرد کەدۆستایەتیو پەیوەندی لەگەڵ حکومەتی رەزا شاو CIAو ئیسرائیل نەپچرێنێت, بەبیانوی ئەوەی کەصدام پەیوەست نابێت بەو رێکەوتننامەیەی لە١١ی ئازاری ١٩٧٠ مۆریانکردووە, هەروەها CIAنەیدەویست ئەم رێکەوتننامەیە دەوری خۆی ببینێتوسەرکەوتوبێت هەر بۆیە هیلمز کەبەرێوەبەری دەزگای C.I.A بوو, کرا بەباڵوێز لەباڵوێزخانەی ئەمریکا لەتارانو لەئەنجامدا دیاربوو رووداوەکان سەری بۆ پیادەکردنی ئەو پیلانەی C.I.A دایڕشتبوو دەکێشا, ئەویش بەوەی کەڕۆژ بەڕۆژ پەیوەندی نێوان بارزانیو C.I.A لەزیادبونو توندوتۆڵبوندابوو لەچاو ئەو رۆژگارانەی پێش بڵاوکردنەوەی ڕێکەوتننامەکەی ١١ی ئازار,

هەروەها نوێنەری ئیسرائیلیەکانیش بەئاشکرا لەحاجی ئۆمەران لەناو خەیمەکاندا هاتوچۆیان دەکرد. ئەمانە روویانـدەدا لەکاتێکـدا هـەموو دەزگاکـانی حزبـی بـەعس بـەپیلانێکی داڕێـژراو لەلایـەن صـدام حـسێنەوە لەسەنگەردابوونو ئاگاداری هەموو جموجۆڵێکی بـارزانی بـوون, بـەبێ ئـەوەی بـارزانی رەچـاوی ئـەوە بکـات کەئەم پەیوەندییـە گەرمـەی لەگـەڵ ئـەو سـێ لایەنـەی کـەناوم بـردووە, جێـی نیگەرانیـەکی زۆر زۆر دەبێـت لەلایەن حزبی بەعسەوەو ئاکامێکی زۆر ئاڵۆزو نادروستی لێدەکەوێتەوە.

ئەم رووداوانە لەکاتێکدا روودەدەن کەبارزانیو صدام لەلوتکەی خۆشیی مـۆرکردنی بەیاننامەکـەدا بـوون. سەرکردەکانی بەعس بەتێکرایی گەیشتبونە ئەو باوەڕەی کـەبارزانی بەهـەموو باوەڕێکـەوە رێکەوتننامەکـەی مۆرکردووەو باوەڕی پێیەتی, بۆیە بەعسییەکان بەئاشکرا بەمنیان راگەیاند گوتیان (کذب اذا احنا نقول عندنا صدیق, احنا عندنا صدیق واحد بین الاکراد, روحوا کلکم التحقوا بالبارزانی, قوة بارزانی قوة البعث).

ئەو پەیوەندییەی نێوان بـارزانیو رەزا شـاو C.I.Aو مۆسـادی ئیـسرائیلی, بـوو بـەهۆی ئـەوەی دەزگـای موخابەرات زۆر بەوردی جێ پێیەکانی بارزانی هەڵگرێتو لەسەرانسەری عێراقـدا, رۆژانـە بـەڕاپۆرت ئاگـاداری حکومەتیان دەکردەوە لەجموجوڵی بارزانیو دەسـتەودایرەکەی. بـۆ نمونـە ئەفـسەرێکی ئیـسرائیلی بـەهۆی عەبدولوەهاب ئەتروشییەوە تـوانی بگاتـە پارێزگـای رمـادیو بـەهۆی یارمـەتی ئەمـەوە جـارێکی تـر حـەوت خێزانی جولەکە لەبەغداوە بۆ ئێران بەرێدەکرێت. گەلێك لەم دەنگوباسـانەو زیـاتریش لەمـە لەڕاسـتو لـەدرۆ دەگەیشتنەوە بەردەمی دەزگا سیخوڕییەکان تا کار گەیشتە ئەوەی بەشی زۆری سـەرکردایەتیی نەتـەوەییو هەرێمایەتی (بەعس) بکەونە گفتوگۆ لەگەڵ ئەحمەد حەسەن بەکرو صدام حسیندا, بەتایبەتی صدام, چونکە ئەو دەوری راستەوخۆی هەبوو لەرێکەوتننامەکەی ١١ی ئـازاری ١٩٧٠داو گوشـاریان بخەنـە سـەر بـۆ ئـەوەی هەڵوێستێکی توند پیشان بدەن بەرامبـەر ئـەو کارانـە, ئـەوەبوو بکـرو صـدام, بڕیـاری تیرۆرکردنـی بـارزانی دەدەنو داوا لەنازم گزار دەکەن کەئەم کارە جێبەجێ بکات, ئەوەبوو ویستیان لەرێگای ئەو مەلا داماوانـەوە تیرۆری بکەن کەئاگاداری هیچ نەبوون.

**تێبینی**

*رێکەوتننامەی ١١ی ئازار ١٩٧٠, گەورەترین ڕووداوبوو لەمێژووی کورددا, بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا خـەڵکێکی زۆر هـەبوو پێیـان نـاخۆش بـوو لەوانـە بـاڵی مەکتـەبی سیاسـی _ مـام جـەلالو ئەفـسەرانی سـوپاو سـەرۆك جاشەکانو تێکراپی سیخوڕەکان, هەروەها باباعەلی شێخ مەحمود بەم رێکەوتنە بەجۆرێك دڵگـران بـوو کاتێـك شەفیق ئەحمەد ئاغا دەچێتە لای لەبیروت داوای لێـدەکات بگەڕێتـەوە بـۆ لای بـارزانی, لەوەڵامـدا گوتبـووی (ئەگەر قولاپی ماسیشم لەلوت بکەن ناگەڕێمەوە بۆ لای بارزانی).*

ئەوانـەی بـاسمکردوون خۆشـحاڵ نـین بەرێکەوتننامـەی ١١ی ئـازار, نمونـەشمان لـەو کەسـانەی کەلـەناو دەسەڵاتی رژێمدا پێیان ناخۆشبوو ئەم رێکەوتننامەیە بکرێت عەمیـد تـەها شەکەرچـی دەهێنمـەوە کـە(قائـد

فرقه) بوو, ناڕەزایی پیشاندانی ئەم پیاوه لەناو ئەفسەرەکاندا دەگاتەوە صدام ئەویش دەنێرێت بەشوێنیداو کەدەگاتە لای صدام وەڵامدانەوەی سەلامەکەی بەزلەیەك دەدرێتەوەو پێشی دەلێت ئەگەر بێتو ئەم جارە ببیستمەوە کەناڕەزاییت دەربڕیوە بەرامبەر بەبڕیارەکانمان ئەوا سەرت لەملت دەکەینەوەو دەبێت لەماوەی ٢٤ کاتژمێردا بەغدا بەجێ بهێڵێتو بچیت بۆ باڵوێزخانەی عێراقی لەهندستان لەبەشی سوپا دەستبەکاربیت.

ئەوانەی لەسەرەوە باسمانکردون, لەبەر ئەوەی هیچ دەسەڵاتو توانایەکیان نەبوو بۆیە خوازیاربوون سەریان سەلامەت بێت. لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشەوە: ئایا بارزانیو صدام کامیان تاوانباربوون بەپوچەڵکردنەوەی ڕێکەوتننامەکەی ١١ی ئازار؟ لەوەڵامدا دەڵێم هەڵوێستو هەڵسوکەوتی هەردوولایان ئەوەندەی کەمن ئاگادارم دەخەمە روو ئینجا بڕیاری کۆتایی بۆ خۆتان دادەنێم.

بارودۆخی ناوخۆی بارزانی بەشێوەیەك بوو (پ.م)ەکانی باڵی مەکتەبی سیاسی _ جەماعەتی مام جەلال تەقەی تفەنگیان بەئاسانی دەگەیشتە بارەگای بارزانی, لاوازییەکی زۆر دیاربوو بەهێزەکەیەوەو زۆر بەکەمیوەڵامی ئەو بەرەنگارییەی بۆ دەدرایەوە.

لەباری دەرەوەشدا, سیاسەتەکان بەپیلانێکی زۆر تونـدوتوڵ لەلایەن ڕۆژئاواوە دارێژرابوون, ئەوەبوو تاران باسی کودەتای دەکرد بەسەر حوکمی بەعسدا کەئەم پیلانە بەسەرۆکایەتی شاو دستبەکاربونی عبدالغنی الروای جێبەجێ دەکراو بڕیاربوو کەدوای سەرکەوتنی کودەتاکە مەلامستەفا بنێرن بۆ حەج, دوای ئەوە بۆ خۆی بێتەوە لێرە نیشتەجێ ببێ, بەبیانوی ئەوەی کەکوردو عەرەب هەردوکیان موسڵمانن حزبی بەعسیش نەما ئیتر کورد لەوە زیارتر چی دەوێت.

روسیا دوور بەدوور چاودێری ئەو بارە ناهەموارەی دەکرد کەبەسەر حکومەتی بەعسو بارزانیدا هاتووە, ئاگاداربوو کەباری ناوخۆی عێراق بەرەو چ گێژاوێك سەردەکێشێت, بۆیە کەبیرۆکەیەکی دەستکەوت لەو پیلانەی کەڕەزاشا بەبۆچونی ڕۆژئاوا کێشابووی دەستبەجێ یەکێك لەرۆژنامەنوسەکانی خۆی دەنێرێت بۆ عێراق کەناوی پریماکۆف بوو بۆ ئەوەی قەناعەت بەحکومەتی بەعس بکات کەلەگەڵ کورددا دابنشێت بەسەرۆکایەتی بارزانی. ئەوەبوو وەکو هەموو لایەك ئاگادارن ڕێککەوتننامەی ١١ی ئازار ١٩٧٠ مۆرکرا, کەبوو بەهۆی ئەوەی حکومەتی عێراق لەکودەتاکەی کەبۆ لەناوبردنی داڕێژرابوو رزگار ببێتو لەهەمانکاتدا پاڵپشتێك بوو بۆ خودی بارزانی بۆ ئەوەی باڵادەست بێت لەکوردستانداو لەو گێژاوەی تێی کەوتبووو لاوازی کردبوو, بێتە دەرەوە.

دوابەدوای مۆرکردنی ڕێککەوتننامەکە حکومەتی بەعس بەهەموو شێوەیەك هەوڵیدەدا کە لەبارزانیو گەلی کورد نزیکبێتەوە، زۆر حەزی دەکرد بەهەموو شێوەیەك گومانو دووبەرەکیو پێکاهەڵپژان جارێکی تر دروست نەبێتەوەو نەمێنێت لەنێوانیانو بۆ دەربڕینی پاکیو راستی هەڵوێستی خۆی, صدام , کەئەو کاتە جێگری سەرۆك بوو, داوای لەبارزانی کرد کەیەکێك لەکوڕەکانی بکرێت بەجێگری سەرۆك, بەڵام بارزانی

فەرمووی بنەماڵەی ئێمە فەرمانبەریی حکومەت پەسەند ناکات. ئەوەبوو بارزانی پێشنیاریکرد کەحەبیب محەمەد کەریم دابمەزرێنێت بەجێگری سەرۆك, بەڵام بەعس ئەمەی بەتوانج زانی لەبەر ئەوەی کەئەم پیاوە ئێرانی‌یەو بەلای بەعسەوە لەو ئاستە شیاوەدا نەبوو کەببێت بەجێگری سەرۆك. لەگەڵ ئەمانەشدا حزبی بەعس هەر سووربوو لەسەرئەوەی کەکورد بەشداربێت لەدەسەلاتدا بۆیە لەدانیشتنێکی سەدام لەگەڵ بارزانیدا, پێشنیاریکرد کەفوئاد عارف ببێتە جێگری سەرۆك بەڵام بارزانی دەستی خستە سەرشانی فوئاد عارفو گوتی (منو کاك فوئاد کارمەندی ناکەین).

حزبی بەعس داوای لەبارزانی کرد کەچەند ئەندامێکی پارتی دیموکراتی کوردستان بنێرێت بۆ ئەوەی بەشداربن لەدەسەلاتدا, لەمەشدا بارزانی دوو ئەندامی پارتی نارد کەهەردوکیان جێی گۆمانێکی زۆرو لەهەمانکاتدا خاوەنی ئاستێکی کۆمەلایەتی نزم بوون, ئەو دوو کەسە عبدالوهاب ئەتروشیو هاشم عقراوی بوون. دوای چەند مانگێك وردەوردە بەئاشکراو نهێنی پەیوەندیەکانی بارزانی لەجاران بەهێزتر بوو لەگەڵ شادا, لەهەمانکاتدا پەیوەندی لەگەڵ جولەکەدا تازەکردەوە بەلام بەشێوەیەکی بەهێزتر لەجارانو زۆر بەنهێنی.

هێلمز کەبەرێوەبەری C.I.A بوو کرا بەباڵیۆزی ئەمریکی لەتاران, هەروەها کیسنجەر کەوەزیری دەرەوەی ئەمریکا بوو لەسەردانێکیدا بۆ ئێران چاویکەوت بەبارزانی.

بارزانی وایدەزانی کەزۆر بەچاکی کارەکەی بۆ دەچێتە سەر, لەلایەك خاوەنی کوردستان بێتو لەلایەك لەگەڵ حکومەتی بەعسدا تێکەڵ بێت, هەوەها لەلایەکی‌ترەوە پەیوەندی بەهێزتر بکات لەگەڵ حکومەتی ئێرانو C.I.Aو ئیسرائیل بێ ئەوەی حکومەتی بەعس لەهیچ شتێك لەم کارە ئاگاداربێت.

لەدانیشتنێکی تایبەتی لەنێوان حکومەتی بەعسو پارتیدا, بەرێوەبەری ئاسایشی گشتی نازم گزار بەدورودرێژی باسی هەموو ئەو سەرکێشیانەی کرد کەپارتی پێی هەڵساوە لەسەرەتای ١١ی ئازارەوە هەتا رۆژی ئەو دانیشتنە. ئەم کارەی حزبی بەعس جێی سەرسورمانێکی گەورە دەبێت لەلای پارتی, بەخەیاڵی خۆیان‌وایانزانیوە کەحکومەت گێلەو ئاگاداری هیچ شتێك نیەو تەنها بارزانی سیاسەت دەزانێت. لەسەروو ئەمانەش هەمویەوە لەخۆباییبونێکی ترسناك روویکردبووە بارزانیو دەوروپشتەکەی, بەشێوەیەك حزبی بەعس زۆر پەشیمان بوو کەپاڵی بەباڵی مەکتەبی سیاسی جەماعەتەکەی (مام جەلال) نا کەبچنە پاڵ بارزانیو بەهۆی ئەو لەخۆباییبونەی بەسەریاندا زاڵبوون نەیانتوانی سود لەو هێزو دەسەلاتە وەرگرن کەهاتبوە بەردەستیان. لەهەمانکاتدا لەجیاتی ئەوەی کەباڵی مەکتەبی سیاسی جەماعەتی (مام جەلال) لەخۆیان نزیك بکەونەوە بۆ ئەوەی پشتیوانی بارزانی بن, بگرە هەتا دەهات دوریان دەخستنەوە لەخۆیان.

### هەڵسوکەوتی (بەعس - صدام)و هەوڵوێستی بەرامبەر شۆڕش

لەدوای ١١ی ئازار بەعس بڕیارێکی دەرکرد کەئەو کەسانەی لەپێش ئەم ڕێکەوتننامەیەدا مووچەخۆری بەعس بوونو کوردن, واتە سەرۆك جاشەکانو سیخوڕە ناسراوەکان, بەهیچ شێوەیەك نابێت ڕێگایان پێ بدرێت کەچاویان بکەوێت بەوەزیرو سەرکردەکانی حزبی بەعس. بۆ نمونە: رۆژێکیان چووم بۆ لای سعدون غیدان کەوەزیری ناوخۆ بوو, چوومە ژورەوە ئاگادارم کردەوە لەوەی کەحسێن ئاغا سورچیو عمر ئاغای سورچی لەخوارەوە لەپرسگە دانیشتونو نایەڵن بێنەلات, لەوەڵامدا گوتی: ئەی تۆ چۆن گەیشتیتە سەرەوە, منیش گوتم کەگەیشتمە پرسگە وەکو هەمو جارێك پرسم نەکردو یەکسەر هاتمە سەرەوە بەڵام ئەمجارە لێیان پرسیم تۆکێیت منیش لەوەڵامدا گوتم من رەفیقم, لەکابراش وایە دەڵێم (رەفیق حزبیم)! ئەم بەسەرهاتەی من بوو بەنوکتەو گەیشتەوە سەدام. ئەو کوردانەی لەبەغدا مانەوە نەچونە پاڵ شۆڕش, بەعسیش پشتی تێکردنو لەدوای ١١ی ئازار باری ئابورییان هەتا دەهات بەرەو خراپی دەرۆیشت. بۆ نمونە ئەنوەربەگی بێتواتە, داوای لێکردم کوڕێکی بۆ دامەزرێنم بەچاودێر (مراقب) لەلای هەرکەسێك بێت مانگی بە ١٥ دینار, هەروەها محی هەرکی کەیەکێك بوو لەو سەرۆك جاشانەی باری ئابوری بەجۆرێك خراپ بوو ئێستا رووم نایەت باسی ئەوە بکەم کەهات بۆلام داوای چی دەکرد. ژمارەیەکی زۆر لەبراو کوڕی سەرۆك هۆزەکان ناچاربوون کەبن بەشاگرد کەبابخانەو چایخانەو میوانخانەکان.

لەدوای تێپەربوونی ساڵێك بەسەر مۆرکردنی ڕێکەوتننامەکەدا, ئەو تەباییەی لەنێوان بەعس و پارتیدا هەبوو وردەوردە نەدەماوو گومانی خراپ بەیەکبردن جێگای دەگرتەوە, هەربۆیە دوای ئەم ماوەیە صدام دەستیکرد بەهەڵوێست وەرگرتن بەرامبەر بارزانی, ئەوەبوو بەنهێنی فەرمانی دەرکرد کەئاسایشو سیخوڕو هەواڵگریو ڕێکخراوی بەعسیش دەگرێتەوە هەروەها بۆوەزارەتی دەرەوە کەئاگاداری باڵیۆزخانەی عێراقی لەئێرانو تورکیاو سوریا بکاتەوە کەزۆر بەوردی هەموو هەواڵێکی بارزانی رۆژانە بەڕاپۆرت بگاتەوە لای صدام دەربارەی جۆری چەکیان, ژمارەی پێشمەرگەکانیان, پەیوەندییان بەدەرەوە, لەهەمانکاتدا بەهەموو شێوەیەك هەوڵ بدرێت کەسیخوڕکان خۆیان لەجەماعەتی بارزانی نزیك بکەنەوە هەروەها دووبەرکی لەناو بنەماڵەدا دروستبکەن, ئەوەبوو پەیوەندییان بەعبیداللە کوڕی مەلامستەفاو شێخ عوسمانی کوڕی شێخ ئەحمەد بارزانی کرد, هەروەها کار لەسەر ئەوە بکەن کەجەماعەتی مام جەلال رێگایان پێنەدرێت بەهیچ شێوەیەك لێپرسراوییان لەناو شۆڕشدا هەبێت, بەتایبەتی عەلی عەسکەریو مام جەلالو د.خالید.

حزبی بەعس دوای ئەوەی لەپیلانەکەیدا سەرکەتووبوو, بەنهێنی دەستیکرد بەکارکردن لەسەر پیلانە ئاشکراکان وەکو: دوورخستنەوەی برا فەیلیەکان, گرتنی ئەو هاووڵاتیانەی پەیوەندییان بەشۆڕشەوەبوو, لەناوبردنی هەندێك لەو هاوڵاتیانەی پەیوەندییان بەشۆرشەوە هەبوو وەکو حسێن شێروانی, ئینجا دەستیانکرد بەدورخستنەوەی هاوڵاتیان لەکەرکوك.

بۆ روونکردنەوەی پیلانی تیرۆرکردنی بارزانی لەلایەن نازم گزارەوە بەهۆی مەلاکانەوە ئەم تێبینییانەم هەیە لەسەری:

## پیلانی تیرۆرکردنی بارزانی

مەلاکان لەڕوانگەی بیروباوڕێکی ئیسلامیو نەتەوایەتی, بەئاشکرا لەهاتوچۆکردندابوون بۆ چاکردنی نێوان گەلی کوردو گەلی عەرەب بەبێ ئەوەی ئاگاداربن کەبۆ پیلانێکی ئاوا گەورە نێردراون, تەنها دوو کەس بەم پیلانەیان دەزانی کەئەوانیش یەکێکیان شۆفێری ئۆتۆمۆبیلەکەبوو, ئەوەیتر ئەو کەسەبوو کە لەسەیارەکەدا مابووەوە کۆنترۆلی (T.N.T)یەکانی لەلابوو, بەو نیازەی کە لەکاتی پێویستدا ئەو کارە ئەنجام بدات. لەلایەن حکومەتیشەوە تەنها ئەحمەد حەسەن بکروصدامو نازم گزار بەم کارەیان دەزانی. ئەم کارە خۆی لەخۆیدا کودەتایەك بوو بۆ سەر مەلامستەفاو بزوتنەوەی کوردی بەڵام لەبەر ئەوەی کودەتاکە سەرنەکەوت, پیلانەکەشیان سەری نەگرت بۆ لەناوبردنی بزوتنەوەی کوردی.

ئەم کارە پاڵنەرێك بوو بۆ بارزانی کەپەیوەندییەکەی لەجاران بەهێزتر بکات لەگەڵ شا, C.I.Aو ئیسرائیلدا, ئەو کەسانەش کە لەدەوری بارزانی بوونو هاندەریشی بوون بۆ ئەم کارە تا دەهات پلەوپایەیان لەلای بارزانی بەرزدەبووە, تا کار گەیشتە ئەوەی کەئەو کۆمەڵە, قسەیان بەسەر سەرکردایەتیی پارتیشدا دەرۆیشت, ئەو کەسانەش کەزۆر هەوڵیان لەگەڵ بارزانیدا دەدا کەپەیوەندی لەگەڵ بەعسدا نەپچرێنێت ڕۆژ بەڕۆژ پلەوپایەیان لەلای بارزانی بەرەو لاوازی دەرۆیشت.

### حسێن حەمەسوارئاغای پشدەر

لەتیرەی میراودەلی ناسراوی پشدەرە, لەبنەماڵەیەکی زۆر خزمەتگوزار, بەڵام بەداخەوە خۆی کابرایەکی دزو تاڵانکەرو خۆینمژو ستەمکارو خۆفرۆش بوو. یەکێکە لەوانەی بەشداریکردووە لەئەنفالەکانداو جێی باوەڕو متمانەیەکی زۆری بەعس بوو لەناوچەی پشدەر, هەروەها دژی هەموو کوردێکی نیشتمانپەروەرو کاسب بوو, چەندەها پێشمەرگەی لەپێناوی چەند دینارێکدا شەهیدکرد, بەفەرمانی بەعس پیلانێکی بۆ کوشتنی فاروقی مام عەلی دارشت کەکادرێکی ناسراوی یەکێتی نیشتمانی کوردستان بوو, ئێستا لەسەر تاوانێکی گەورە لەبەندینخانەی (پ.د.ك)دایەو دوور نیە دوای ئەوەی ئەم کارەی ئەنجامداوە دەرگای بەندیخانەی بۆ بکەنەوە چونکە جەلالییەکی کوشتووە.

**زەکیە اسماعیل حقی (فەیلی)**

دەرچووی کولێجی یاسایە بەپلەی (امتیان)، زیرەك‌و رۆشنبیرو لەبنەماڵەیەکی ناسراوی بەغدا، سەرۆکی یەکێتی ئافرەتانی کوردستان بوو لەساڵەکانی (٧٠)دا، لەرابردوودا کوردێکی نیشتمانپەروەر بوو، دوای ئاشبەتاڵەکە لەمانگی ٤ ی ١٩٧٥دا (متحەت ابراهیم جمعە) کەباڵیۆزی عێراق بوو لەتاران هاتبوو بۆ بەغدا بۆ گفتوگۆکردن‌و لێکۆڵینەوە دەربارەی کورد، منیش زەکیەخانم بە(متحەت) ناساند، لەماڵی باوکی لە(بەتاوین) سێ قۆڵی کۆبونەوەمان کرد، باسی ئەوەمان کرد کەچۆن ئەو کوردە عێراقیانەی کەلەئێران ماونەتەوە، بەخۆشی بگەڕێنەوە.

چونکە هەڵوێستی ساواك‌و پاراستن ئاشکراو روونە بەهەموو شێوەیەك پڕوپاگەندە دەکەن بۆ ئەوەی نەگەڕێنەوە، چونکە مانەوەیان زیانێکی گەورەی هەیە بۆ میللەتی کوردو لەهەمانکاتدا سودبەخشە بۆ دواڕۆژی حکومەتی شا، ئەوەبوو کۆمەلێك لەکوردی عێراق رۆیشتن بۆ ئێران بۆ ئەوەی لەنزیکەوە چاویان بەکوردەکانی ئەوێ بکەوێت تاکو قایلیان بکەن کەبگەڕێنەوە، زەکیەخان یەکێك بوو لەو کۆمەڵە، لەگەڕانەوەیدا ئاگاداریکردم کە بەتەلەفۆن قسەی لەگەڵ حەبیب محەمەد کەریم کردووە کەسکرتێری پارتی دیموکراتی کوردستان بوو، ئەوەبوو حبیب ئێرانی بەجێ هێشت چووە قاهیرە، زەکیەخان لەوێش سەردانیکرد. دوای گەڕانەوەی زەکیەخان بەماوەیەکی کەم، حەبیب گەڕایەوە بۆ عێراق‌و خۆی تەسلیم بەحکومەت کرد، زەکیەخان چالاکییەکی بێ ئەندازەی ئەنجامدا بۆ خزمەتی بەعس کەشایەنی باسکردنە کە لەئەنجامدا بۆمان دەرکەوت ئەندامێکی چالاکی موخابراتە.

**تێبینی**

*لە ١٩٩١/٣/١٣ لەماڵی عزەت بەگ لەدێگەڵە چاوم بەکاك مەسعود بارزانی کەوت کە لەهەمان ماڵدا لەژورێکیتر زەکیەخان چاوەڕوانی دەکرد چاوی بەسەرۆك بکەوێت. منیش بەرێکەوت چاوم بەزەکیە کەوت لەو ماڵەدا، زۆرم حەز دەکرد کەدەست بکەم بەچاویداو ناپاکی‌و خیانەتەکانی بدەمەوە بەڕوویدا، بەڵام سوپاس بۆ خوا ئەم هەڵوێستەم نەبوو چونکە حەبیب محەمەد کەریم کەسکرتێری پارتی دیموکراتی کوردستان بووو دوای ئاشبەتاڵەکە خۆی تەسلیم بەحکومەت کردبوو، ئەمجارە زەکیە لەبەغداوە هێنایەوە بۆ ناو پارتی کەلێرە بە(عضو لجنة مراقبة وتفتيش) لەریزەکانی پارتیدا دامەزرا.*

**حەبیب محەمەد کەریم-دارا تۆفیق - عەلی عەسکەری**

لەبەڕێوەبەرایەتی ئاسایشی گشتی داوای چەند کەسێکیان دەکرد لەوانەی لەگەڵ شۆڕشدا بوون‌و دوای ئاشبەتاڵ گەڕاونەتەوە، لێپرسراوی کاروباری سیاسی عەمید سلیمان کە لەئاسایشی گشتی بوو، دەنێرێت بەشوێن حەبیب محەمەد کەریم‌و دارا توفیق‌و عەلی عەسکەری‌و پێیان رادەگەیەنێت کەئێوە لەلایەن حکومەتەوە دەستنیشانکراون بۆ ئەوەی دابمەزرێن بەکاربەدەستی میری‌و دەمانەوێ بزانین راتان چی‌یە؟

حەبیب محەمەد کەریم دەڵێت: زۆرخۆشحاڵم بەم بڕیارە تایبەتەی بەعس کەبۆ منی دەرکردووەو بەم شێوەیە رێزم لێدەگرن, بەڵام یەك داواکاریم هەیە: لەشوێنێك دامبمەزرێنن کەکوردی تیادا نەبێت. دارا تۆفیق دەڵێت: ئەوپەڕی سوپاسی سەرکردەکانی بەعس دەکەم, زۆر رێزم هەیە بۆیانو بەم کارە خۆشحاڵم. بەڵام عەلی عەسکەری دەڵێت: ئێوەی بەعس هەڵوێستی من باش ئاگادارن کەهەرگیز نەمویستووە بچمە پاڵ ئەو شۆڕشەی کە(شا) سەرپەرشتی دەکرد, بەڵام ئێوە بەزۆر پاڵتان بەمنەوە نا بۆیە رازی نیم بەم دامەزراندنە.

ئەم قارەمانە نیشتیمانپەروەرە یەکێك بوو لەسەرکردەکانی باڵی مەکتەبی سیاسی کەپێیان دەگوتن جەماعەتی جەلال تاڵەبانی. دوای ١١ی ئازاری ١٩٧٠ بەعس گوشاری خستنە سەر کەبچنەوە پاڵ بارزانی.

**تێبینی**

*بەڕێوەبەری ئاسایش ئەم وەڵامانە دەکات بەراپۆرتێكو دەینێرێت بۆ (مكتب شؤون الشمال) کەصدام لێپرسراوی یەکەمیەتی, لەڕاپۆرتەکەدا دەربارەی حەبیب دەڵێت: (سەیرم لێدێت یەکێك ئەمە بیرو بۆچونی بێت چۆن لەلایەن مستەفا بارزانییەوە کراوە بەسکرتێری حزبەکەی, هەروەها بەخۆڕایی نەبووە کەمەلامستەفا لەعەلی عەسکەری ترساوە, هەروەها (دارا)یەك کەبیروباوەڕێکی چەپی هەیە چۆن مەلامستەفا لەلای خۆی کردوویەتی بەلێپرسراو).*

*لەدوای ئاشبەتاڵەکە خێزانەکەی دارا پەیوەندی پێوە کردم گوتی: دارا دەیەوێت بگەڕێتەوە لەبەیروت, کاك رەفیق تۆ دەڵێیت چی؟ گوتم: ئەگەر بگەڕێتەوە لەسێدارەی دەدەن، دارا وایدەزانی حکومەت یا لەبیریان چۆتەوە یا چاوپۆشی لێدەکەن کەپەیوەندی بەدەرەوەی وڵات هەیە بۆیە بەو پلە بەرزە دایدەمەزرێنن بەڵام ئەوەبوو هەر لەناویان برد.*

**عبیداللە بارزانیو شێخ عوسمان بارزانی**

هەردوکیان هەریەکە بەجیا پەیوەندییان هەبوو بەبەعسەوە پێش ئەوەی مەلاکان بنێردرێن بۆ تیرۆکردنی بارزانی. دوای ئەوەی عبیداللەو عوسمان بارزانی پەیوەندیەکەیان بەحکومەتەوە بەهێز دەبێت ئینجا بەحکومەتی بەعس دەڵێن ئەگەر بێتو ئێوە لەو پێشنیارانەی دەیخەینە بەرچاوتان بەشێوەیەکی باش پشتیوانیمان بکەن, ئەوا بەڵێنتان دەدەینێ کەهەموو خێڵی بارزان رابکێشین بەلای حکومەتدا, رەنگە تەنها چەند نەفەرێك بمێننەوە بەلای بارزانییەوە, داواکارین بەقسەی سەرۆك هۆزەکانی دەوروبەری بارزان هەڵسوکەوت لەگەڵ ئێمەدا نەکەن چونکە ئێمە ناکۆکی کۆنمان لەگەڵیاندا هەیە.

بەعس دوای ئەوەی هەستیانکرد شۆڕشی کورد جارێکیتر دەست پێدەکاتەوە, بیریانکردەوە کەدەبێ پیلانێکی توندوتۆڵ داڕێژن بۆ لەناوبردنی شۆڕشەکە, ئەوە بوو پیلانێکی گەورەیان داڕشت کەچەند خاڵێکی زۆر سەرەکی لەخۆی گرتبوو, یەکێك لەو خاڵانە ئەوەبوو پشتیوانییەکی بەهێز لەعبیداللە بارزانیو عوسمان بارزانی بکەن بۆ ئەوەی ئەو پەیمانەی داویانە بەحزبی بەعس بیبەنەسەرو لەکەسایەتی بارزانی دابەزێنن.

دوای ئەوەی شەڕ لەنێوان بەعس‌و بارزانیدا دەستی پێکردەوە, عبیدالله کرا بەوەزیری ولآت. ئەمە وایکرد یەکەم پیلانی حزبی بەعس سەرکەوتوبێت کە لەهەموو راگەیاندنەکانی حزبی بەعسەوە بڵاودەکرایەوە کەعبیداللەی کوڕە گەورەی بارزانی, بیروباوەڕی مەلامستەفا بەڕاست نازانێت ئیتر ئەو خەڵکە چۆن باوەڕی پێدێنن‌و بەڕاستی دەزانن؟!

دوای ئەوە بەعس تەنها بەڕاگەیاندنەکانی خۆیەوە نەوەستا بەڵکو (عبیدالله)یان بەشاراندا دەگێڕا بۆ ئەوەی دیداری ڕۆژنامەگەری لەگەڵدا ببەسترێت. بۆ نمونە کۆنگرەیەکی رۆژنامەگەری لەئەڵمانیای رۆژئاوا بۆ دەبەسترا, دوای ئەوەی هەموو رۆژنامەوانەکان لەپرسیارو وەڵامەکانیان دەبنەوە لەگەڵیدا, تەنها یەك رۆژنامەنووسی ئەڵمانی دەمێنێتەوە کەکیژێکی زۆر سەرنج راکێش بوو خۆی دەهێڵێتەوە بۆ ئەوی دوا کەس بێت کەچاوپێکەوتنی لەگەڵدا بکات. کاتێك سەرەی دێت دەچێتە پێشەوە لەعبیدالله بارزانی‌و دەست دەکات بەپرسیارکردن‌و سێ جار لەسەر یەك پێی دەڵێت ناوت چی‌یە, دوای ئەوەی سێ جاری تر دووبارەی دەکاتەوەو دەڵێ باوکت ناوی چی‌یە, دوای ئەوە پێی دەڵێت باشە بەڕاست تۆ کوڕی ئەو مستەفا بارزانییەی کەهەموو جیهان باسیدەکەن‌و حکومەتی عێراقی بەدەستیەوە زەلیلە؟ عبیدالله لەوەڵامدا دەڵێت بەتەئکید. ئافرەتەکە زۆر بەلایەوە سەیر دەبێت‌و پێی دەڵێت: خۆزگە لەبار دایکت بچویتایە. لەم کاتەدا عبیدالله خۆی جیڕ دەکاتەوە بۆ ئەوەی هەڵوێستێکی توند بنوێنێت بەرامبەری بەڵام نوری فەیسەڵ شاهری یاوەری کەسکرتێری سەدام بوو, چاکەتەکەی لەپشتەوە رادەکێشێت پێی دەڵێت ئاگاداربە ئەمە کۆڕی رۆژنامەگەرییە بۆت نیە هیچ شتێك بەرامبەر ئەو ئافرەتە بکەیت.

یەکێك لەپیلانەکانی تری حزبی بەعس ئەوەبوو کەبایەخێکی زۆر بدرێت بەعوسمانی کوڕی شێخ ئەحمەد بارزانی, بۆ ئەوەی بتوانن ئەم پیاوە ئامادەبکەن بۆ ئیشکردن دژی خێڵی بارزان بۆ ئەوەی بتوانێت بەشێوەیەك بیروباوەڕی خێڵی بارزان بگۆڕێت بەرامبەر بەمەلامستەفا کەئەگەر بێتو حکومەتی بەعس بەهەموو سەرکردایەتیەوە بچن لەبارزان دابنیشن بەهیچ شێوەیەك مەترسی لەسەرنەبێت.

عبیداللەو عوسمان بارزانی لەهەموو راپۆرتەکاندا کەدەیاننارد بۆ سەرکردەکانی بەعس هەروەها لەهەموو چاوپێکەوتنێکیشیاندا کەچاویان بەسەرکردەکانی بەعس دەکەوت, بەتایبەتی صدام, ئەوەیان دووپات دەکردەوە کەئەگەر بێتو حکومەتی بەغدا لەگەڵ حکومەتی ئێراندا رێکبکەوێت ئەو کاتە مەلامستەفا نامێنێت, چونکە هێزی دەرەکی مەلامستەفا, ئێران‌و ئەمریکاو ئیسرائیلە, لەبەر ئەوەی هێزی خۆی هیچی تیا بەسەر نی یە.

کار گەیشتبووە ئەوەی بەشێوەیەك لەڕاگەیاندنەکانی بەعسەوە ئەم دوو کەسایەتییە باسی بنەماڵەکەی خۆیان دەکرد, قسەی نابەجێیان پێدەگوت کەمن بەهیچ شێوەیەك لەرووم نەدەهات بیخەمە سەر کاغەزو بینێرمەوە بۆ بارزانی, بۆیە لەمەکتەبی بارزانی‌یەوە رادیۆو تەسجیلێکیان بۆ ناردم بۆ ئەوەی دەنگیان تۆمار

بکەمو بۆیانی بنێرمەوە.

شێوەی کارکردنمان وابوو کەمن لێپرسراو بووم بەسەر شێخ عوسمانەوە, بەهۆی لێپرسراوێتیمەوە هـەموو پـیلانو هەڵـسوکەوتێکی عوسمـان بـارزانی کەدەهاتـە بەردەسـتم یەکـسەر مەکتـەبی بـارزانیم لیَ ئاگـادار دەکردەوە بۆ ئەوەی پیلانەکانی پوچەڵ ببێتەوە, بەهۆی منەوە کار گەیشتە ئـەو ئاسـتەی کـەبوون بـەجێی گومان لای صدامو وایان بۆ لەقەڵەم درا کەئەمانە (خط مائـل)ن,واتـە لەگـەڵ هـەردوولادا کاردەکـەن. لەگـەڵ پیلانەکانی مندا بۆ نەمانی ئەوان، هەموو سەرۆك هۆزەکانی دەوروپشتی بارزانیش پەیتاپەیتا دەچـونەوە لای سەدام و پێیان دەگوت کەئەم دوو بارزانییە راست نـین لەگەڵتـدا. تـوانیم سـەرکەوتوانە دووبەرەکییـەکی زۆر بخەمەوە نێوان شێخ عوسمانو عبیداللە, بەڕاستی ئەوەی ئەم دوو کەسەی بەدەم حزبی بەعـسەوە سـوككرد ئــەوەبوو هــەموو هەڵـسوکەوتو هەسـتانو دانیـشتنێکیان لـەپێناو پـارەدا بـوو بـەڵام عبیداللـە هەنـدێك هەڵسوکەوتی نابەجێی دەکرد کە نەدەبوو لەو بوەشایەتەوە ئەویش ئەوەبوو دەستی لەگەڵ باڵیۆزخانەیـەکی بێگانـە تێکـەڵکردو زۆربـەی کاتەکانیـشی لەگـەڵ SEXدا دەبردەسـەرو ئـەو کوردانـەی لەگەڵیـدا دەگـەڕان خەڵکێکی نزمو بێ مستەوا بوون. گرنگترین شت بەلای شێخ عوسمانـەوە ئـەوەبوو کـە بەهەرچـی شـێوەیەك بێت پـارەی دەسـتکەوێت. ئـەم پیـاوە ئەونـدە حەزیـشی لەسـەیارەی جـوان بـوو ناچـاریکردم بـچم لـەکوێت ئۆتۆمبیلێکی مارسیدسی تازەی بەگریزەوە بەقاچاخ بۆ بهێنم بـۆ بەغـدا, کـاتێکیش سـەعدون غێـدان ئەمـەی بیستەوە پێی گوتم (أخی متجیب لی سیارە ألی همینە).

قەسـتەم بـەخوا, ئەگـەر مـن نەبوومایـە هێـزی حکومـەت بەپـشتیوانی خێڵـی بـارزان عبیداللـەو عوسمـان هێرشیان دەبردەسەر بارەگای مەلامستەفا بارزانی.

### هەوڵێك بۆ دانوستان

لە تەمموزی ١٩٧٦دا چاوم کەوت بە(مام جەلال) لەبەیروت. دوای گەڕانەوەم بـۆ بەغـدا لەسـەر داوای مـام جـەلال چـاوم کـەوت بـەو بـرادەرە ئـازیزو شۆڕشـگێڕو نیـشتمانپەروەرو سیاسـەتمەدارانەی کەڕایـسپاردبووم لەمژدەی بەرێوەبونی چرای رووناکی گەڵی کوردستان ئاگاداریـان بکەمـەوە کەیـەکێتی نیـشتمانی کوردسـتان دامەزراوە, پێم راگەیاندن کەئەم هـەنگاوە ئومێـدی ئـەوەی لێـدەکرێت پـشت بـەخوا, کـاروانی رزگـاریخوازی کوردستان بێت, بەدوورودرێژی هەموو ئەو راسپاردانەی کەمام جەلال رایـسپاردبوومەکو خـۆی بەئەمانەتـەوە بەنهێنی گەیاندمە جێی خۆی.

دوای ئەنجامدانی ئەم کارەم, ماوەی (١٠) ڕۆژ سەرقاڵی خۆئامادەکردن بـووم تـاکو بتـوانم لەگـەڵ صـدام دابنیشمو بەشێوەیەکی داڕێژراو رووداوەکانی بۆ بگێڕمەوە.

کەچاوم بەصدام کەوت یەکەم پرسیار کەلێی کردم گوتی بـۆ چوڵاتێـك رۆیـشتبووی؟ گـوتم مـن لبنـانم زۆر لاخۆشە لەبەر ئەوەی لێان تێدەگەم هەروەها زۆربەی خواردنەکانیشیان لەخواردنی کورد دەکـات, بـەخێریش

گەڕا چونکە لەگەڕانەومدا چاوم بەجەلال تاڵەبانی کەوتو بەدووروردرێژی گفتوگۆمانکرد. صدام بەشێوەیەکی زۆر ناشرین هێرشی بردەسەر سەرکردەکانی کورد بەزیندوو مردووەوەو لەم کاتەدا سکرتێرەکەی ناوی (نوری فیصل شاهر) کەبەدیارمانەوە وەستابوو چاوەڕوانی ئەوەی دەکرد بەڵکو سەدام بلێت رەفیقم بۆ رەوانەی کونە رەشەکە بکە, چۆن لەخۆیەوەو بەبێ پرسی ئێمە لەگەڵ جەلال تاڵەبانیدا دانیشتنیکردوە. چاوەڕوانم کرد هەتا هەرچی لەسکیدابوو هەمووی هەڵڕشت ئینجا رێگایدام قسە بکەم, منیش گوتم: کاتێك لەبیروت گەڕامەوە دەستبەجێ خۆم گەیاندە چەند کاربەدەستێکی بەدەسەڵات یەکێکیان سعدون شاکر بوو کەبەڕێوەبەری موخابەراتی گشتی یە, ئایا سید نائب بەفڕۆکە هاتوچۆی کەنداوی عەرەبی دەکات؟ لەدوای وەڵامەکانیان بۆم روونبووەوە کەپیلانەکەی من زانیومە ١٠٠٪ راستە, جەنابی سید نائب تکام وایە لەئێستەوە بەدواوە هیچی‌تر هاتوچۆی کەنداو نەکەیت چونکە پیلانێکی زۆر رێکوپێکیان بۆ داڕشتوی بۆ ئەوەی فڕۆکەکەت بەزۆر لەئاسمان بێننە خوارێ خۆشت دەستگیربکەن.

دوای قسەکانی من سید النائب چەند دەقیقەیەك ماتی دایگرت ئینجا گوتی: من ئەوەندە ترسنۆك نیم کەخۆم بەزیندوویی تەسلیم بەدوژمن بکەم. دەستی برد بۆ گیرفانی پشتەوەی پانتۆڵەکەی شتێکی دەرهێنا سێ ئەوەندی شقارتەیەك دەبوو کەدەستی پیادا نا فیشەکێکی دەمانچەی (یۆبلّی) هاتە دەرەوە, گوتی: ئا بەمە خۆم دەکوژم. ئینجا هەڵوێستی گۆڕا بەرامبەرمو زۆر بەگەرمی سوپاسی کردمو ئەملاو ئەولای ماچ کردم, پرسیاری لێکردم ئایا کوردەکان بەگشتی بۆچونیان لەسەر تۆ چۆنە؟

گوتم ئەوەی رووبکاتە ماڵم بەگەرمی بەخێرهاتنی دەکەمو کارێکی کەهەیبێت بۆی جێبەجێ دەکەمو دوای جێبەجێکردنی کارەکەی پارەشی دەدەمێ, لەبەر ئەوە روو لەهەرشوێنێك بکەم بەپیرمەوە دێن. منیش بەهۆی تۆوە ئیشوکارەکانم لەهەموو شوێنێکدا بەئاسانی جێبەجێ دەبێت.

ئینجا پرسیارێکی تری کرد گوتی: ئەی پلەی حزبیت چی‌یە؟ گوتم من لەگەڵ هەموو هەڵوێستێکدام کەتۆ پێی هەڵدەستیت, لەوکاتەدا زەنگی تەلەفونەکەی لێیدا, دووجار هەڵیدەگرتو تەلەفونەکەی دادەخرایەوە, گوتی: تەلەفۆنی سید النائب تێکچووە,وەڵامم دایەوە لەوە دەچێت ئەو کەسە پەراوە بکات چونکە ئەوەندە سامت هەیە کەگوێی لەدەنگت دەبێت دایدەخاتەوە.

**تێبینی**

*کاربەدەستانی بەعس لەهەولێکی بەردەوامدا بوون لەگەڵمدا کەببمە ئەندامێکی رێکخراوی بەعس, دەمزانی هەتا (عضو فرقة) دەرۆم بەڵکو زیاتریش, بەڵام دوایی دەمکەنە کارمەندێك لەفەرمانگەیەکی میری. لەگەڵ ئەوشدا هەرچەندە ناوم بەسیخوڕ دەرکردبوو بەڵام توانیومە بەهۆی ئەم ناوەوە خزمەتێکی گەورەی کوردو کوردستان بکەم لەهەموو لایەنێکیەوە. بۆ نمونە جارێکیان داوام لەمامۆستا تەها محێدین مەعروف کرد کەجێگری سەرۆك بوو, هاوکاریم بکاتو پێکەوە بچینە لای صدام تاکو بتوانین کێشەی کورد بخەینە*

*بەردەمی, لەوەڵامدا گوتی ئەمە ئیشی من نیە بەڵام بۆ تۆ زۆر ئاسانە, بەردەوامبە، هەرئەوەت بۆ دەمێنێتەوە.*

سەدام پرسیاری کرد لەگەڵ جەلال تاڵەبانیدا باسی چیتان کردووە بەدوورودرێژی وەکو خۆی بۆم بگێڕەوە, منیش گوتم: گفتوگۆو لێکۆڵینەوەیەکی دوورودرێژ دروستبوو لەنێوان دوو بیروباوەڕی جیاوازدا کە بەئەندازەی ئاسمانو زەوی لێکەوەدوورن کە بەدوو سەعات کۆتاییمان پێهێنا. ئەوەبوو مام جەلال پێی گوتم: حزبێکی تازەمان داناوە بەناوی یەکێتی نیشتمانی کوردستان، لەو کوردە رۆشنبیرو نیشتمانپەروەرانە پێکهاتووە کەباوەڕیان بەدۆستایەتی ئێرانو تورکیاو جولەکەو C.I.A نیە, هەروەها ئەو کوردە عێراقیانەی کە لەپاڵ بارزانیدا بونو باوەڕیان بەئاشبەتاڵ نەبووو ئێرانیشیان بەجێهێشتوەو نەگەڕانەوە بۆ عێراقو چون بۆ هەندەران بەشی زۆریان دێنە پاڵ ئێمە, هەروەها هەموو هێزو توانایەکمان لەخۆمانەوە دەبێت, بڕیاریشمانداوە لەگەڵ حکومەتدا شەڕی پارتیزانی بکەینو چەکی قورسیشمان نابێتو ئیستا مەشق لەسەر چەکی سوك دەکەین. لەدواییدا باسی هەموو سلبیاتێکی حکومەتی کرد لەهەموو رویەکەوە, بەڕاستی لەهەموو کەموکوڕییەکانی حوکمی زاتی لەکوردستان باش ئاگاداربوو گوتی تەنها بەناو حوکمی زاتییەو هەتا ئێستا گواستنەوەو تەعریبو تەبعیس بەردەوامە, کورد هیچ مافێکی نەتەوایەتی نیە, بەهاوڵاتی پلە دوو دانراوە, ئێمە بەتەماین لەناوەوەو لەدەرەوەی وڵات هەموو پڕوپاگەندەیەکی بەعس بەدرۆبخەینەوە کەڕۆژانە بەتەلەفزیۆنو ئێستگەو رۆژنامە بڵاویدەکاتەوە گوایە کێشەی کوردیان جێبەجێکردووە, هەروەها ئێمە بەتەماین بەژمارەیەکی زۆر کەم (٤٠٠–٥٠٠) چەکدار وابکەین سوپای عێراقی بەشی زۆری بڕژێتە کوردستانو شەووڕۆژ پاسەوانی شارو شارۆچکەو رێگاوبانەکانی پێبکات.

لەدرێژەی قسەکانمدا بۆ سەدام گوتم: دوای ئەوەی جەلال تەواو بوو لەقسەکانی گوتم: ئایا تۆ بەجانتایەکی بەتاڵو (٥٠٠) چەکدار دەتەوێت جێگای بارزانی بگریتەوە لەکاتێکدا ئەو خاوەنی (٧٠,٠٠٠) پ.م بوو بەچەكو جبەخانەی تەواوو سەروەتو سامانی نزیکەی (١٠٠)ملیون دۆلار جگە لەدیناری عێراقیو تومەنی ئێرانیو لیرەی تورکی, ئینجا ئێرانو سوریاو تورکیاو جولەکەو C.I.A بەهەموو شێوەیەك پشتیان گرتبوو, یارمەتیشی لەهەموو لایەك وەردەگرت؟ بەڵام بارزانی کاتێك گەیشتە ئەو باوەڕەی کەبارودۆخی دەرەکی لەبار نیە بۆ ئەوەی مەسەلەی کورد جێبەجێ بکرێتو ئەگەر شۆڕش بەردەوام بێت زیانێکی زۆر گەورەی بۆ میللەتی کورد دەبێت, گوتی بەردەوامیدان بەشۆڕش یاریکردنە بەئاگر.

گوتم مام جەلال راستە لەلایەن حکومەتەوە کەموکوڕیەکی زۆر هەیە بەڵام روو لەچاکبوونە لەهەموو ڕوویەکەوە, چونکە سەید النائب سەرپەرشتی (مکتب شؤون الشمال) دەکاتو کار لەسەر ئەوە دەکات کەهەموو ئەو سلبیاتانەی لەبەرچاودایەو هەستی پێدەکرێت لەناوی بەرێتو ئێستا بارودۆخی باکور بەرەو ئارامییەکی زۆر دەڕوات, خەڵکی بەکارو کاسبی خۆیەوە سەرقاڵەو دزیو خراپەکاریو پیاوکوژی

بەئەندازەیەکی زۆر کەمبۆتەوە, دیاردەی چەکداری بەهیچ شێوەیەك بەدی ناکەیتو یاسا سەروەرە. گوتم: (جەلال) جەنگ ڕێگاچارە نیە بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد, هەرگیز ئێوە ناتوانن بگەنە هێزو توانای بارزانیو لێت روون بێت کەحکومەت دەربارەی تۆو حزبەکەت لەهەموو شتێك ئاگادارە, بەعس بەجۆرێك بەهێزە لەناوچەکەدا کەهیچ هێزێك نییە بتوانێت بەرامبەری راوەستێ. جەنگ ڕێگاچارە نیەو ئایا وا باشتر نیە کەدووبەدوو پیلانێك دارێژین بۆ هەڵدانەوەی پەڕەیەکی سپی لەسەر رووداوەکانو چیتر ئاوڕ نەدەیتەوە لەبەسەرهاتە کۆنەکان؟ من کەگەڕامەوە دەچم بۆ خزمەت سەید النائبو ئاگاداری دەکەم لەوەی کەچاوم بەجەلال تاڵەبانی کەوتوەو بەبیروباوەڕێکی تازەوە پێش هەر هەنگاوێك دژی بەعس, دەستی ئاشتی درێژ دەکات, ئایا(جەلال) ڕێگام پێدەدەیت کەلەم بارەیەوە زمانحاڵی تۆ بم لەلای (سەید النائب)و هیچیتر هاولاتی عێراقی خوێن لەلوتی نەیەت. جەلال گوتی: رازیمو زۆریشم پێخۆشە سلاو رێزم هەیە بۆ (سەید النائب)و پێی رابگەیەنە گواستنەوەو تەعریبو تەبعیس بنەبڕ بکاتو باکور وەکو خۆی لێبکاتەوە, هەروەها حوکمی زاتی راستەقینە بچەسپێنێت, من یەکسەر سواری فڕۆکە دەبمو دەگەڕێمەوە بۆ عێراق بادەستگیرم بکەن.

دوای ئەوەی هەموو ئەو گفتوگۆیەی لەنێوان منو مام جەلالدا روویدابوو گێڕامەوە بۆ صدام لەکۆتایی قسەکاندا پێی گوتم دەمەوێت بەدوورودرێژی باسی بارودۆخی ئێستای کوردستانم بۆ بکەیت بەبۆچونی خۆت. گوتم: لەیەکەم رۆژەوە کەبارزانی کوردستانی بەجێهێشت, وەکو ئاشکرایە ئێوە بالادەست بوون لەسەرانسەری باکوردا, ئەگەر بهاتایە ئێوە سودتان لەو بارودۆخەوەربگرتایە ئەوە ٥٥٪ی ئەو داواکارییانەی بارزانی داوای دەکرد بۆ کورد, دوای رۆیشتنی خۆی بۆ خەڵکی باکورتان دابین بکردایە ئەوا ئێستا ٩٥٪ی کورد لەگەڵ ئێوەدا دەبوو.وەکو جەنابتان ئاگادارن لەدوای ئاشبەتاڵەکەوە بارزانی بۆشاییەکی گەورەی بەجێهێشت لەنێوان کوردو حکومەتدا بەتایبەتی لەو ناوچانەی کە لەساڵی (١٩٦٢–١٩٧٥) لەژێر فەرمانی بارزانیدا بوون, هەرچەندە رێکخراوەکانتان هەوڵیدا ئەو بۆشاییە پڕبکاتەوە بەڵام بەداخەوە بەهۆی خراپ هەڵسوکەوتکردنی دەزگاکانی ئاسایشو هەواڵگری تیمە سنوریەکان لەگەڵ خەڵکی ئەو ناوچانەدا, بۆشاییەکە زیادیکرد کەمی نەکرد, جەنابی السید النائب من بەش بەحاڵی خۆم چ بەراپۆرت چ بەقسە ئەم کەموکورییانەم خستۆتە بەرچاو بەڵام لەوە دەچوو بێسود بێت, هەروەها ئەو حزبە کوردیانەی کەدروستکرابوون بۆ ئەوەی جێی پارتی بگرێتەوەو لەلایەن ئێوەوە بایەخێکی زۆریان پێدرا, ئەمانیش سەرکەوتوو نەبوون بۆ پڕکردنەوەی بۆشاییەکە چونکە بەشێوەیەکی گشتی هەموو هەوڵێکیان بۆ پارە کۆکردنەوە بوو نەك بۆ پڕکردنەوەی بۆشاییەکە, لەهەمانکاتدا زۆر لەکەسایەتی ئەم حزبانە ناسراوو خۆشەویست نەبوون لەناو جەماوەردا, هەروەها خەڵکێکی زۆریش بێ ئیشوکاربوو کەهەوڵتان نەدا رێگاچارەیەك بۆ بێ ئیشیو هەژاربونیان بدۆزنەوە. بەشێوەیەکی گشتی هەرسێ دراوسێکانمان (ئێران, تورکیاو سوریا) چاویان بڕیوەتە

باردۆخی ئێستای عێراق چونکه لەبەرژەوەندی ئەواندا نیيە حکومەتی عێراق لەهەموو ناوچەکانی عێراقدا باڵادەست بێت بەتایبەتی لەناوچەکانی باکوردا, هەروەها ئەوەی ئاشکراو روونە ئێران بۆ سەقامگیربوونی مەبەستەکانی لەیەکەم رۆژەوە کەکوردەکان چونە ئێران دوای رێکەوتننامەی جەزائیر, لەرێگای پاراستن‌و ساواکەوە, هەموو هەولێکیاندا کەئەو کوردانە نەگەڕێنەوە بۆ عێراق بەنیازی ئەوەی لەدواڕۆژدا لەبەرژەوەندی خۆی بەکاریان بهێنن, بەڵام سوریا هەر لەیەکەم رۆژی رێکەوتننامەی جەزائیرەوە ناڕەزایی خۆی دەربڕی لەوەی کەکورد چەك دابنێت, بۆ ئەم مەبەستەش نوێنەری خۆی بۆ لای بارزانی نارد کە بەهیچ جۆرێك چەك دانەنێت چونکە ئێمە بەهەموو شێوەیەك یارمەتی دەدەین, بەڵام بارزانی گوتی: (دەوری من کۆتایی پێهات), ئێستا سوریەکان بەئاشکرا یارمەتی دوژمنانی عێراق دەدەن, هەربۆیە مۆڵگەی ئۆپۆزسیۆنی عێراقی لەئێرانەوە گواسترایەوە بۆ سوریاو بۆ کوردەکان دەرگا والابوو بەتایبەتی بۆ جەماعەتی جەلال تاڵەبانی.

ئینجا دوای دەربڕینی بۆچونەکانی خۆم بەرامبەر بارودۆخەکە سەید نائب پرسی: ئایا حزبی شیوعی شوێنکەوتویان هەیە لەکوردستاندا؟ ئایا دوای نەمانی شۆڕشەکەی بارزانی توانیویانە ئەو بۆشاییە پڕبکەنەوە؟ گوتم: لەبەر ئەوەی حزبی شیوعی شانبەشانی ئێوە بەرامبەر بەشۆڕشەکەی بارزانی راوەستا, لەهەمانکاتدا دوای ئاشبەتاڵ کەخەڵك گەڕایەوە, ئێوە رێگاتان پێنەدان وەکو پێویست جموجوڵ بکەن بۆ ئەوەی بتوانن بەشێك لەوخەڵکە رابکێشن بەلای خۆیانەوە, بەڵام کەم تا زۆر لەناو خەڵکدا هەن چونکە کۆنترین حزبن لەساحەکەدا, بۆ نمونە ساڵی ١٩٦٢ کاتێك پ.م بووم شوانێك قسەی بۆ کردم کەساڵی ١٩٥٤ مانگانە (٥٠) فلسی بەحزبی شیوعی وەکو ئابوونە داوە.

ئینجا جارێکی تر پرسیاری کرد ئایا ئەو کوردانەی لەپاڵ بارزانیدا بوون‌و گەڕانەوە بۆ عێراق, هەڵوێستیان چۆن دەبێت بەرامبەر شۆڕشی نوێی جەلال تاڵەبانی؟

گوتم: ئەوانەی گەڕانەوە بارزانی زۆری پێ ناخۆش بوو بەگشتی‌و بۆ گەڕانەوەی لوقمانی کوڕی بەتایبەتی زۆر دڵگران بوو, ئەوەی دەگەڕایەوە هەریەکە لەڕاست خۆیەوە راپۆرتێکی دووروودرێژی پێشکەش بەئاسایش دەکرد تیایدا بەزەقی باسیان لەهەموو سلبیاتێکی بارزانی دەکرد, ئەمانە لەلایەن بارزانی‌و جەلال متمانەی خۆیان لەدەستدا چونکە شۆڕشیان بەجێهێشت, ئەگەر ئاسایش پاڵیان پێوە نەنێن هەرگیز ماڵەکانیان بەجێ ناهێڵن.

صدام پرسی: ئایا مەلامستەفا بەتایبەتی کوڕەکانی دەچنە ناو ئەو رێکخراوە تازەیەی کەجەلال دروستیکردووە یان کۆمەکیان دەکەن؟ گوتم: پرسیارم لەجەلال دەربارەی بۆچونی بارزانی بەرامبەر ئەم شۆڕشە تازەیە کرد, بەقسەی جەلال ئاگاداریکردوون‌و رازین‌و خۆشحاڵن بەدامەزراندنی ئەم رێکخراوە تازەیە, بەڵام ناچنە پاڵی‌و دژیشی راناوەستن.

صدام ماوەی چەند دەقیقەیەك پیشی خواردەوەو بیری کردەوەو خەریکی چروت کێشان بوو, جارجاریش کەتەماشای منی دەکرد هەستمکرد گرژی لەدەموچاویدا نەمابوو, دیاربوو خۆشحاڵبوو بەقسەکانم, ئینجا بەزردەخەنەیەکەوە گوتی: خۆت ئامادەبکەو بەنهێنی بچۆ بۆ لای جەلالو ابراهیم بۆ دۆزینەوەی ڕێگاچارەیەکی گونجاو بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد.

گوتم: سوپاسی هەستی بەرزت دەکەمو خوا تۆمان بۆ بهێڵێت, حەزدەکەم دڵنیات بکەم لەوەی ئەم ڕێکەوتنە هیچ مەترسییەکی نییە بۆ سەر بەعس بەڵکو سودێکی گەورەی هەیە لەهەموو ڕوویەکەوە, هەنگاوێکی گەورەشە بۆ پوچەڵکردنەوەی پیلانە گڵاوەکانی دوژمنانی بەعس, من پێم باشە کەسەرنجت بۆ تێبینییەکی زۆر گرنگ رابکێشم ئەویش ئەوەیە کەئەگەر من بەم کارە هەڵسم سەرکەوتوو نابم لەبەر ئەوەی من بەسیخوڕ ناسراومو پێدەچێت زۆر متمانەم پێنەکەن, لەهەمانکاتدا من لەو ئاستەدا نیم کەبەم کارە گەورەیە هەستم، بۆیە پێشنیار دەکەم عومەر مستەفا کەناسراوە بەعومەر دەبابە ئاگادر بکرێتەوە کەبەم کار هەڵسێت, ئەم پیاوە لەگەڵ ئەوەی یەکێك بوو لەوانەی ئێرانیان بەجێهێشتو هاتنەوە بۆ عێراق, بەڵام جێی متمانەیەکی زۆرە لای جەلالو ابراهیم ئەحمەد.

سەید النائب گوتی: پێشنیارەکەتمان لاپەسەندە, بەگەرمی سوپاسی کردمو لەکۆتاییدا گوتی: ئێمە بڕیارێك دەدەین کە لەبەرژەوەندی وڵاتەکەماندا بێت.

ئینجا ئیشارەتی پێدام کەکۆبونەوەکە تەواوبوو.

**تێبینی**

*١-ئەم دانیشتنە لەگەڵ صدام, ماوەی ٢,٣٠ سەعاتی خایاند کەلەو ماوەیەدا دوو پەرداخ شیری خواردەوە.سکرتێرەکەی صدام (نوری فیصل شاهر) زۆر دڵگران بوو بەو سەرکەوتنەی من بەڵام دەسەڵاتی نەبوو.*

*٢-بۆ دەربڕینی سوپاسگوزاریم بۆ یەزدانی مەزن کەپشتیوانیکردم لەسەرکەوتنم لەم کارەدا, دایکمم راسپارد ٣٠٠ لەفە شفتە دروستبکاتو ببیات لەمەرقەدی شێخ عەبدالقادری گەیلانی دابەشی بکات.*

*٣-فەرمان لە(مكتب شوؤن الشمال)ـەوە بۆ بەڕێوەبەرایەتی ئاسایشی گشتی دەرچوو کە بەپەلەو نهێنی پەیوەندی بەمامۆستا عومەر دەبابەوە بکرێت بۆ ئەوەی کارئاسانی بۆ بکرێت کەبچێت بۆ لەندنو سوریاو چاوی بەئیبراهیم ئەحمەدو مام جەلال بکەوێت بۆ ئەوەی لەنزیکەوە باس لەسەر داواکارییەکان بکرێتو بۆیان جێبەجێ بکرێت.*

*٤-کاتێك کاك عومەر دەگەڕێتەوە لەسەفەرەکەی, راپۆرتێك ئاڕاستەی بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی دەکات تیایدا بەدوورودرێژی ئەنجامی چاوپێکەوتنەکەی ڕووندەکاتەوەو چاوەڕوانی وەڵامی راپۆرتەکەی دەکات بۆ ئەوەی لەسەر رۆشنایی وەڵامەکەی ئاسایش, وەڵام بەرێتەوە بۆ مام جەلالو مامۆستا ئیبراهیم.*

*چەند جار کاك عومەر مستەفا دەیویست بەتەلەفۆن لەگەڵ عەبدالخالق عەبدالعزیز قسە بکات, کەبەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی بوو بەڵام پرسگەی ئاسایش لەوەڵامدا پێیان دەگوت لەوێ نی‌یە, بەڵام لەڕێگای منەوە وەڵامەکەی وەرگرتەوە.*

*٥-بۆیە ئەم باسەم ئاوا بەدوورودرێژی ڕوونکردۆتەوە چونکە چەند کادرێکی پارتی, باسی چۆنیەتی گەشتەکەی کاك عومەر دەبابەیان لەگەڵدا کردم کەچۆتە لەندەن و سوریا چاوی کەوتووە بەمامۆستا ئیبراهیم ئەحمەدو مام جەلال لەسەر فەرمانی بەعس.*

وەکو ئاشکرایە، صدام خاوەنی دەرکردنی بڕیارەکانە لەعێراقداو لەو زیاتر کەسی‌تر بۆی نی‌یە بریاردەربکات. بۆیە لێرە پرسیارێك سەر هەڵدەدات ئەویش ئەوەیە, باشە صدام حسین لەچاوپێکەوتنەکەی لەگەڵ مندا بۆچی بەو شێوە گەرموگوڕە سوربوو لەسەر چارەسەرکردنی کێشەی کوردو جەختی لەسەر ئەوەکرد کەعومەر دەبابە بڕوات بۆ لەندەن و سوریا؟! کەچی کەبەڕێز عومەر دبابە گەڕایەوە بەشێوازێکی زۆر ساردو چاوەڕوان نەکراو پێشوازی لێکراو بەهیچ شێوەیەکیش وەڵامی نەدرایەوە؟

وەڵامدانەوی ئەم پرسیارانە لەدوو خاڵی سەرەکیدا خۆی دەبینێتەوە:

١-کاتێك هێشتا عومەر دەبابە نەگەڕابوەوە بۆ عێراق, ئیدریس بارزانی لەوتارێکی ئاشکرادا بڵاویکردەوە گوتی (ئێمەی بارزانی ئەگەر شۆڕشمان پێنەکرێت بەڵام شۆڕشمان پێ تێکدەدرێت). بەمەدا صدام گەیشتە ئەو باوەڕەی کەبارزانییەکان مەترسی ئەوەیان لێناکرێت بچنە پاڵ شۆڕشەکەی مام جەلال و کۆمەکی بکەن, بەڵکو دژایەتییان دەکەن.

٢-بۆچوونی دووەم ئەوەیە کەتورکیا بوبێت بەهۆکارێك بۆ پاشگەزبوونەوەی صدام, چونکە لەساڵی ١٩٨٤دا یەکێتی نیشتمانی کوردستان و حکومەتی بەعس گەیشتبوونە ئەوەی کەڕێکەوتننامەیەك مۆربکەن, شەوێك پێش مۆرکردنی ڕێکەوتننامەکە وەفدێکی تورکی بەپەلە دەگەنە بەغداو کاتێك ڕۆژ بووەوە صدام لەهەموو ئەو بڕیارانەی کەبۆ ڕێکەوتن دابوی, پەشیمانبووەوە.

## بۆردومانی قەڵادزێ و هەڵوێستی عێراق:

کاتێك شەڕ لەنێوان بەعس و شۆڕشی بارزانیدا دەستی پێکردەوە (١٩٧٤), دانیشتوانی شارۆچکەی قەلادزێ, بەهەژارو موچەخۆرو دەوڵەمەندو لاوو پیرەوە بەکۆمەڵ باوەشیان بۆ خەباتگێڕانی شۆڕش کردەوە کەپێکهاتبون لەسیاسەتمەداران و نیشتمانپەروەران و ڕۆشنبیران و دکتۆرو مامۆستاو قوتابی کەبەوپەڕەی دڵسۆزیەوە پاڵیان دابوو بەشۆڕشەکە, شۆڕشیش ویستی بەم خەباتگێڕانە زانکۆیەك لەناو شارۆچکەی قەلادزێ دابمەزرێنێت, لەکاتێکدا بەهیچ جۆرێك پێویستییەکانی زانکۆ ئامادە نەکرابوو, بەڵام لەبەر بەرژەوەندیی حزبایەتیی تەسك, پڕۆپاگەندەیەکی زۆرکرا لەئێستگەو ڕۆژنامەو گۆڤارەکانیانداو ڕۆژانە باسی دامەزراندنی ئەم زانکۆیە بڵاودەکرایەوە بۆیە حکومەتی بەعس کە بەدامەزراندنی ئەم زانکۆیەی زانی, توشی

هیستریا بوو وای لێکدایەوە کەبارزانی بەدامەزراندنی ئـەم زانکۆیـە بڕیـاری جیابونـەوەی داوە, بۆیـە بڕیاریـدا بەهیچ شێوەیەك ئەم زانکۆیە لەگەڵ شارۆچکەی قەڵادزێدا نابێت بمێنێتو دەبێ ئەو شارە سەرەوبن بکرێت.

لەرێگای کاك حمەیوەلی حمـەی کەرەمـەوە لەبنکـەی پێـشمەرگایەتی شـاخی بـەمۆ بەلاسـلکی ئاگـاداری مەکتەبی بارزانیم کرد کەلەم ڕۆژانەدا بەعس بەفڕۆکـەی مێکـی ڕوس بەچـەکی ناپـاڵم بۆردومـانی شارۆچـکەی قەڵادزێ دەکات, ناوی نهێنیم (بەیروت مـارتینس) بـوو, بەڕاسـتی نـەوەك هـەر مـن ئـەم هەواڵـەم گەیاندبێتـە مەکتەبی بارزانی, گومـان لـەوەدا نیـە کەسـانێکی زۆری تـریش کـەدڵیان بـەم شـارەو بەخەڵکەکـەی دەسـوتا بەهـەمان شـێوە مەکتـەبی بارزانییـان ئاگـادار کردبـۆوە لـەوەی کەصـدام بەتـەمای وێرانکردنـی قەڵادزێیـە بەزانکۆکەوە. بەهەرحاڵ هەرچی داواکارییەکانی ئێرانو ئەمریکا هەیـە هـەمویان بـەرێکوپێکی جێبـەجێ کـرد دڵنیـابن لـەوەی هـیچ کـەس گلـەیی لێنـەدەکرن لەسـەر ئـەوەی کەپیلانـەکانی ئـەوانتان جێبـەجێ کـردووە, بەمەرجێك ئەگەر بهاتایە چۆن بەنهێنی پیلانەکانتان جێبەجێ کرد بەهەمان شـێوە هـەر بـەنهێنی پارێزگـاری ئەو شارەو دانیشتوانەکەیتان بکردایە, دەبا ئەو خەڵکـە داماوە بـەڕۆژ دەوامیـان نەکردایـە لـەزانکۆو بەشـەو دەوامیان بکردایە, هەروەها ئاگاداری ئەو خەڵکەشتان بکردایەتەوە کـە بـەڕۆژ بـچونایەتە دەرەوەی قـەڵادزێ بۆ ئەوەی لەو بۆردومانە سەلامەت بونایە, وەکو ئەمانەشـتان بەچـاك نـەدەزانی دەبـا لـەجیاتی ئـەو دۆشـکە شکاوەی کەهی جەنگی جیهانی یەکەم بوو, لەحەسار کە ٥ کم لەقەڵادزێوە دوورە داتاننابوو, چەند چـەکێکی چاكو تازەی ئەو رۆژەتان لەC.I.A وەربگرتایە کەبیتوانیایە بەرامبەر مێکی (٢٣)ی روسی بەرگری بکردایە.

سەردانی سەعدون غێدانم کرد کەوەزیری ناوخۆ بوو, پرسیاری لێکردم, ئایا دەزانی بۆردومانی قەڵادزێمان کـرد, شـارەکەو زانکۆکـەمان بەیـەکجاری لـەناوبرد. بەزەردەخەنەیەکـەوە وەڵامـم دایـەوە گـوتم: دەسـتتان خۆشبێت شتێکی باشتان کرد. بەڵام دنیـا لەبـەر چـاوم تـاریکبوو, یەکـسەر خـۆم بـەخۆمم گـوت رەفیـق دان بەخۆتـدا بگـرە. بەپەلـە گەڕامـەوە ماڵـەوە بەهاوسـەرەکەم راگەیانـد ئیمـرۆ لەماڵەوەبـە تـاکو گوێـت لەئێسگەکەبێت بـۆ ئـەوەی بزانیـت چـی روویـداوە. هەرچـوارمان بەدزییـەوە دەسـتمانکرد بـەگریان بـۆ ئـەو شەهیدانە. دایکم گوتی ئەی کوڕم تۆ ئاگادارت نەکردبونەوە؟ هاوسەرەکەم گوتی بەتفەنگی ئینگلیزی شـەڕی فڕۆکە ناکرێت.

سەعات ١٠ی سەر لەبەیانی رۆژی ١٩٧٤/٤/٢٤ قەڵادزێ بۆردومانکرا, ١٣٤ کەس شەهید بـوو, ٣٠ کەسـیان لەشیان پارچەپارچە ببوون نەدەناسرانەوە, ١٥٠ کـەس برینـدار بـوون, ٢٠٠ خـانوو ڕوخـا, ٥٠ لـەم شـەهیدانە خەڵکی شارۆچکەی قەڵادزێ بوون کەلەم بنەماڵەنەن:

| ناوی بنەماڵە | ژمارەی قوربانیەکان | ناوی بنەماڵە | ژمارەی قوربانیەکان |
|---|---|---|---|
| کاك ئەحمەد صابر | ٩ | کوڕی عەلی باپر ئاغا | ١ |
| حەسەن حاجی محمود | ١ | مەلا بەکر | ٢ |
| رەسول مام ئەحمەد | ٧ | عوزێر رەسول ئاغا | ١ |
| هۆرمەر کەرە | ١ | ئەحمەد کەریم | ١ |
| مامۆستا عەبدولڕزاق | ٤ | حاجی رەحمن دەشتی | ٢ |
| قادری وەستا ئەحمەد | ٤ | فەتحی حاجی کەریم | ١ |
| جەمال حمە عەلی کەڵپە | ١ | حاجی ئەحمەد هەلاج | ١ |
| زاهیر مام رەشید رەسام | ١ | عبد الرحمن رۆستەم | ١ |
| زاهیر کارەبایی | ١ | مامۆستا غەریب حمە ئەمین | ٤ |

لەدوای رووداوەکەی قەڵادزێ رۆژنامەکانی جیهان بەعسیان مەحکوم کرد بۆ ئەو تاوانە گەورەیە. لەم کاتەدا چەند رۆژنامەنوسێك هاتنە کوردستان کەیەکێکیان رۆژنامەی لیمۆندی فەرەنسی بوو کە لەجیهاندا دەنگیدایەوە چووە بۆ قەڵادزێ, کەگەڕایەوە بۆ فەرنسا لەسەر ئەو تاوانە دڕندانەی بەعس دوابوو. لەدوای راپەڕینەکەی ١٩٩١ کاك ئەحمەد سابیر دەچێتە هاوینەهەواری سەڵاحەدینو چاوی بەکاك مەسعود دەکەوێت دەڵێت لەدوای بۆردومانەکە خوالێخۆشبو مەلامستەفا بارزانی هاتە گوندی حەسار چاوی بەبەشی زۆری کەسوکاری شەهیدان کەوتو بەڵێنی پێدان کەیارمەتیمان بداتو خانووەکانمان بۆ دروست بکاتەوە بەتایبەتی بەڵێنی بەمن دا کەژنم بۆ بهێنێتو خانوەکەم بۆ دروست بکاتەوە چونکە من خاوەنی ٩ شەهید بووم کەسم دەرنەچوو. لەوەڵامدا کاك مەسعود دەڵێت: ئێستا پارەمان نییە بەڵام بڕی (٢٠٠٠) دیناری دەداتێ.

باشە کە(شا) ئەوەندەی کورد خۆش دەوێتو بەمەکتەبی بارزانی (مەسعودوئیدریس) دەڵێت زانکۆ بکەرەوە لەقەڵادزێ بەکوردی, بۆچی لەناو قوتابخانەکانی خۆیدا نەیدەهێشت هیچ قوتابیەك بەکوردی بخوێنێ تەنانەت لەپشوەکانی نێوان وانەکاندا چاودێری قوتابیەکانیان دەکرد نەوەك بەکوردی بدوێن, هەروەها کەس بۆی نەبوو منداڵەکەی بەکوردی ناوبنێت, ئەگەر ئەمە پیلانێکی داڕێژراو نییەو بەیارمەتی شۆڕش پیادە ناکرێت؟ بەڵام هەموو شتێك روونو ئاشکرایە چونکە مەکتەبی بارزانی بۆیان نەبوو هیچ بڕیارێك بۆ هیچ شتێك ئەگەر زۆر بچوکیش بوایە دەربکەن پێش ئەوەی شاو C.I.Aو جولەکە رەزامەندی خۆیان دەرنەبڕن, بەڵگەش ئەوەیە کاتێك بارزانیلەلووتەکەی تواناو دەسەڵاتی خۆیدابوو ئێران فرمانیکرد بەئاشبەتاڵکردن, ئەوەبوو کاتێك لەبارزانییان پرسی بۆ ئاشبەتاڵتان کرد؟ گوتی: دەوری من تەواوبوو,

هەروەها لەڕێکەوتننامەکەی جەزائردا سەدام, لەشا دەپرسێت دەڵێت ئەی بارزانی؟ ئەویش دەڵێت ئەوە پەیوەندی بەخۆمەوە هەیە.

بەهەمان شێوە لەقەڵادزێ لەسەر جێبەجێکردنی پیلانەکەی شاو C.I.A, مەکتەبی بارزانی ١٥ ملیۆن دۆلار وەردەگرنو لەبانقەکانی ئەوروپادا هەڵیدەگرن, منیش دەڵێم: لە(١٩٧٤)ەوە فایزی ئەو پارەیە چەندەبووە بۆ خۆتان, بەڵام خوێنی ئەو خەڵکە بێتاوانەی کە لەسەر ئێوە شەهیدکرا بەرێکوپێکی بدەن لەو پارەیەی کەوەرتانگرت, چونکە ئەگەر ئەو پارەیە بەیەکسانی دابەش بکرێت بەسەر خاوەن شەهیدەکانی شارۆچکەی قەڵادزێ, هەریەکەیان بەلانی کەم ٥٠ هەزار دۆلاریان بەردەکەوێت, قەڵادزێشی پێئاوەدان دەکرێتەوە.

جولەکە دوای مۆرکردنی ڕێکەوتننامەی جەزائر لەڕۆژنامەیەکدا بڵاویکردەوە کەئێمە ١٥ رۆژ پێش مۆرکردنی ڕێکەوتننامەکە ئاگادارکراینەوە, بەڵام کەزانیمان ئەم ڕێکەوتننامەیە هیچ زیانێك نابەخشێت بەبەرژەوەندییەکانمان لەو ناوچەیەداو سوپای عێراق بەهیچ شێوەیەك دژ بەجولەکە ناجولێتەوە, دەنگمان نەکرد.

ساڵی ١٩٨٦ هاتوچۆم دەکرد لەنێوان یەکێتیو پارتیدا, لای کاك مەسعود بارزانی دانیشتبوم پێم ڕاگەیاند هەندێك نهێنی هەیە دەمەوێ بێتی بڵێم, کاك مەسعود گوتی: دەبێ کاك عەلی عەبدوڵڵاش بەشداربێت. ئەوکاتە بنەماڵەی مەلامستەفا بەتەواوی زاڵ نەبوون بەسەر پارتی دیموکراتی کوردستانداو بێ کاك عەلی چاویان بەکەس نەدەکەوت, بەڵام ئێستا مامۆستا عەلی عەبدوڵڵا دەبێ لەڕێگای پرسگەوە کاتی بۆ دیاری بکرێت ئینجا چاوی بەسەرۆك بکەوێت, پێم گوت مام جەلال فەرمویەتی ئاگاداری کاك مەسعود بکە کەچەند سەرکردەیەکی کۆماری ئیسلامی (فلانو فلان فلان) پێیان ڕاگەیاندوم کەکوڕانی مەلامستەفا ئەوپەڕی پەیوەندییان هەیە لەگەڵ C.I.Aدا, کەقسەکانم تەواو کرد کاك مەسعود بێدەنگی دایگرتو هیچوەڵامی نەدامەوە, بەڵام جارێکیتر کەهەر لەهاتوچۆدابوم لەنێوانیاندا کاك مەسعود فەرموی: (کاتێك لەسەرەتای هەشتاکاندا زۆرێك لەئۆپۆزسیۆنەکانی عێراق لەسوریا کۆبونەوە بۆ ئەوەی ڕێوشوێنێك دابنێن بۆ یەکخستنی سەنگەرەکانی خەبات دژ بەحزبی بەعس, لەو کۆبونەوەیەدا داوایان لێکردم کەبەیاننامەیەك دەربکەم, ئێستا پەیوەندیم بەC.I.Aوە نەماوە بەڵام لەوەڵامدا پێم گوتن کاتێك بۆردومانی قەڵادزێ کرا کەس بەهانای ئێمەوە نەهات تەنها (C.I.A) نەبێت, دووپاتی دەکەمەوە من لەپێشوشدا پەیوەندیم هەبوو ئێستاش پەیوەندیم هەیە).

منیش دەڵێم: پەیوەندیکردنی سەرکردەیەك بەC.I.A لەبەر رزگاری وڵاتەکەیو بەرژەوەندیی گشتیی هاووڵاتیەکانی بێت ئەمە گەورەترین خزمەتە بەمەرجێك ئەم پەیوەندییە وەکو کۆسۆفۆ بێت نەك وەکو بارزانی کەفەرمانی بۆ دەرچێت لەئەمریکاوە بە(ئاشبەتاڵ) کردن بەبێ ئەوەی گوێ بداتە وڵاتەکەی یەکسەر بڵێت باش بەسەرچاو.

که لـەدادگای بـەعس حـوکم درامو بڕیـاری حوکمەکـەیان بـۆ خۆیندمـەوە سـەیرمکرد یـەکێك لەتاوانـەکانم ئەوەبوو کەمن سیخوڕی نێودەوڵەتیم, بەو واتایەی من پەیەوەندیم هەبووە بەئیـسرائیلو ئێرانـەوە. بەڕاسـتی ئـەم بریـارە جێـی سەرسـورمان بـوو بـۆ مـن, چـونکە مـن دڵنیـابووم لـەخۆم کەپەیوەنـدیم بـەهیچ وڵاتێکـی دەرەکییـەوە نـەبووو هـەتا ئێـستاش نیمـە, لەگـەڵ ئەوەشـدا کـە بەهـەموو شـێوەیەك هـەوڵم لەگەڵـدا دراوە پەیوەندیم هەبێت پێیانەوە, دوای ئـازادبوونم لەبەندیخانـە, یەکـەم کـار کـەپێی هەڵـسام گـەڕان بـوو بـەدوای راستی ئەو تاوانەداو دۆزینەوەی سەرچاوەکەی, ئەوەبوو بۆم دەرکەوت حزبی بەعس بـەبێ هـۆ ئـەو تاوانـەی نەخستبوە پاڵم, بەڵکو من هەرچی هەواڵێکی کۆشـکی کۆمـاری کـە بەدڵـسۆزانە گەیاندمـە مەکتـەبی بـارزانی (مەسعودو ئدریس) ئەوانیش کردبویان بەڕاپۆرتو دابویان بەئێرانو ئیسرائیل.

تاوانبـاری دووەم لـەم کارەسـاتەدا (بۆردومـانی قـەڵادزێ), حکومـەتی بەعـسە, چـونکە بـەعس هـەموو توانایەکی خۆی بەکارهێنا دژی گـەلی کوردسـتان بەهـەموو جۆرێـك, قـەڵادزێی بۆردومـانکرد, لەگـەڵ ئەوشـدا کەدەیزانی ئەو زانکۆیە هیچ زیانێکی نابێت بۆ ئـەو, بـەڵام رقو کینـەی بەرامبـەر بـەکوردو پـیلان دانانەکـەی لەلایەن C.I.Aەوە دارێژراوە, نەیدەهێشت جگە لەوێرانکردنی کوردستان هیـچی تـر ببینێـت. دوابـەدوای ئـەو کارەسـاتە صـدام چـەندەها جـاری تـر چـوو بـۆ قـەڵادزێ کەدانیـشتوانەکەی چـاوەڕوانی بەزەییـەك بـوون لەسەرۆکی وڵاتەکەیان بەڵام نەوەك هەر یارمـەتی نـەدان بـەڵکو بڕیاریـدا قـەلادزێ بگوازێتـەوە بـۆ ئۆردوگـا, ئـەوە بـوو بەناچـاری نوێنـەرانی قـەڵادزێ بەسـەرۆکایەتی مامۆسـتا مەلامحەمـەد دەلگـەیی چـونە بەغـدا بـۆ دۆزینەوەی رێگاچارەیەك بۆ خەڵکی ستەم لێکراوی ئەم شارە, بەڵام دوای ئەوەی ئازارو ئەشـکەنجەیەکی زۆر درا لەلایەن رژێمەوە, سواری ئۆتۆمبیلێکیان کردو بردیان قـەڵادزێیان بـەوێرانکراوی پێـشاندا گوتیـان ئێمـەی بەعس بمانەوێت کارێك ئەنجام بـدەین هـەر ئـەنجامی دەدەیـن, بـزانین دەتـوانی لـەم وێرانەیـەدا مـاڵی خـۆت بدۆزیتەوە.

**هەڵوێستی C.I.A لەم کارەساتەدا**

هێڵمزی بەڕێوەبەری C.I.Aکە کرا بەباڵیۆزی ئەمریکی لەتاران لەبەر ئەم مەبەستانە بوو:

١-لاوازکردنی حکومەتی عێراق.

٢-راکێشانی شۆڕشی کوردی بەلای خۆیاندا بۆ ئەوەی چۆنیان بوێت ئاوا بیجوڵێنن.

٣-بەهێزکردنی شۆڕشی کوردی بۆ ماوەیەکی کەم, ئەوەبوو سوپای ئێرانی لـەناو خـاکی ئێرانـەوە سـوپای عێراقی بۆردومان دەکرد.

٤-شەڕی لەنێوان حکومەتو بارزانیدا گەرم دەکرد بۆ سودوەرگرتن لەو بارودۆخە.

٥-چۆکی بەعێراق دادا بۆ ئەوەی لەگەڵ ئێراندا رێکەوتننامەی جەزائیر مۆربکات.

٦-ئەوەبوو دوای مۆرکردنی رێکەوتننامەکە, دەوری مەلامستەفا تەواو بوو, ئینجا دوای ئەوەی هێڵمـز زانـی

هەموو پیلانەکانی سەرکەوتوبوو گەڕایەوە بۆ واشنتۆن.

٧- مەبەست لەداڕشتنی ئەو پیلانە گڵاوەی C.I.A بۆ مەکتەبی بارزانی ناچارکردنی صدامو بۆ بۆردومانکردنی قەڵادزێ بوو بەو نیازەی نێوان کوردو بەعس بەتەواوەتی تێکبچێت نەوەك جارێکی تر ڕێکەوتننامەیەکی تری نهێنیوەکو (١١ی ئازار) ئەنجام بدرێت لەنێوانیاندا، بۆیە دەڵێم تاوانباری سەرەکی مەکتەبی بارزانی بوو.

## کورتەباسێك لەسەر بنەماڵەکەمان

من کەناوم ڕەفیق مامە صادقە ناسراوم بەڕەفیق پشدەری لەبنەماڵەیەکی دەوڵەمەند هاتومەتە دونیاوە, ٤٠٠ ساڵ پێش ئێستا لەناوچەی جزیرەو بۆتانەوە هاتوینەتە کوردستانی باشوورو لەشاری کۆیە جێنشین بوین, ئێستاش ئاسەواری باپیرەگەورەمان ماوە بەناوی کاولی علیبەگ ناو دەبرێت, یەکێك لەنەوەکانی ناوی صادقە کەپێی دەگوترا مام صادقەدرێژ کەدەکاتە باپیرم, نزیکەی ١٠٠ ساڵ زیاتر ژیاوە, هاوسەرەکەی مام صادق ناوی فاتمە مستەفا بووە لەبنەماڵەیەکی کۆیی ناسراوەو خوشکی صابر کۆیی بووەو پوری ملاخدر نجم الدین قەڵادزێی بووە.

باپیرم دەستێکی باڵای هەبووە لەکاری پزیشکیداو مرۆڤێکی کاسب بووەو چوار زمانی زانیوە (کوردی، عەرەبی، فارسی، تورکی), قسەخۆشو سەخی بووە، کاروانی چۆتە بەغداو بصرەو موصلو دیاربکرو مهابادو تەورێز. دوو کوڕو چوار کچی هەبووە، کوڕی گەورەی ناوی حسین بووە بەمامە ناسراوە، کوڕی دووەمی ناوی تۆفیق بووە کچەکانی: عیفەت، ڕەعبە، ڕەعنە، گوڵێ.

حسین کە بەمامە ناسراوە لەتەمەنی ١٥ ساڵیدا ژنی هێناوە، هاوسەرەکەی ناوی صبریە ڕەزا مام یحیا بوو ئامۆزازای مامە بووە کە لەتەمەنی ١٣ ساڵی شوویکردووە، دایکی ناوی مریەمەسوور بووەو لەبنەماڵەی مەلاعبداللە بێتوشە, سێ کوڕو دوو کچی هەبووە بەناوی شفیقو ڕەفیقو کەمالو بدریەو فخریە. تۆفیق صادق لەژنی یەکەمی دوو کچی هەبووە، لەژنی دووەمی پێنج کوڕو چوار کچی هەبووە، پیاوێکی کاسبو سەخی بووە, خزمەتی هەژاری زۆر کردووە، سالار تۆفیق صادق پ.م ناوخۆ بوو، لەساڵی ١٩٦٥ لەشارۆچکەی قەڵادزێ شەهید کرا. سردار تۆفیق صادق کەیەکێکە لەکوڕەکانی ئێستا لەپۆڵەندە دەژی. تاوانبارێکی گەورەیە لەهەموو رویەکەوە بەتایبەتی بەرامبەر ژنو منداڵەکانیو گەلی کوردو بنەماڵەکەیو بەتایبەتی من.

چوار ژنی هێناوە یەکێکیان لەمهابادەو کوڕێکو کچێکی هەیە, کچەکەی لەساڵی ١٩٩٩ شویکردو کوڕەکەی لەزانکۆیەو نازانن کەباوکیان ناوی سەردارە، ژنێکی تری لەشاری سنەیە، خێزانی کچی پوریەتی بەموچەی خۆی توانیویەتی کوڕو کچەکانی بەخێو بکاتو پێیان بگەیەنێت بەبێ ئەوەی باوکیان یارمەتی دابن، خێزانی چوارەمی لەپۆڵەندەیە بەیەکەوە دەژین نازانێت کەسەردار سێ ژنی تری هێناوەو هەمویانی بەجێی هێشتووە، مهابادی خێزانی دەڵێت: (تەنها تەڵاقنامەم بۆ بنێرێت هیچی ترم لێی ناوێت). سەردار بەهەر گوندو

شارۆچکەیەکدا تێپەڕ بووبێت خراپەیەکی کردوەو پارەی لەچەند کەسێك وەرگرتووە بەدەستبڕین, بۆ نمونە ٢ هەزار دۆلار لەدکتۆر ئەرجمند مەلاصدیق لەئەڵمانیا بەناوی منەوە وەردەگرێ.

**عیفەت سادق - خێزانی مام رەزا**

مام رەزا پیاوێکی ئازاو زیرەكو ناسراوەو ڕیش سپی قەلاَدزێ بووە, لەسەرەتای شۆڕشدا دادوەر بوە لەقەلاَدزێ ئێستاش بۆ نمونە هەمیشە باسی دڵسۆزیو نیشتیمانپەروەری ئەم پیاوە دەکەن, پێنج کوڕو سێ کچی هەبوە کوڕەکانی: علی مام رەزا کە بەپیاوێکی شۆڕشگێڕو نیشتیمانپەروەرو دڵسۆزو سیاسەتمەدار ناسراوە، بکر مام رەزا دڵسۆز بوو بۆوڵاتەکەی کوردێکی نیشتیمانپەروەر بوو.

**عمر مام رەزا :** کوردێکی دڵسۆزو نیشتیمانپەروەر.

**حاجی مام رەزا :** کارمەندێکی دڵسۆزو پاك بوو, کۆچی دوایی کرد.

**محمد مام رەزا :** لەتەمەنی لاوی لەشەڕێکدا ناوبژی کردبوو کوژرا. کچەکانی خەیریەو سەرگوڵو رووناك.

**رەعبە صادق:** خێزانی کەریمی مام علی بووە کەبن ئامۆزای یەکن.

**کریمی مام علی:** پیاوێکی کاسبو ناسراو بووە لەشارۆچکەی کۆیەو یەك کوڕو پێنج کچی هەبووە, مام غریب بەکارمەندێکی پاكو دڵسۆز بۆ کارەکەیو وڵاتەکەی ناسراوە، کچەکانی بەناوی دلاراو ئامینەو فخریەو ناسکەو حلیمە.

**رەعنا صادق:** خێزانی حەمدی مستەفاسوور بووەو بن ئامۆزانی یەکن، حەمدی پیاوێکی کاسبو ناسراوبووە لەشارۆچکەی کۆیە, دوو کوڕو سێ کچی هەبووە، کوڕە گەورەی ناوی جەلالە, هاوسەرەکەی – گورجی خان کچی تۆفیق صادق بووە, ساڵی ١٩٨٤ جەلال کاتژمێر ٨ی شەو کۆچی دوایی کرد, پاش ١٢ سەعات، واتە کاتژمێر ٨ی بەیانی هاوسەرەکەی (گورجی) بەدوایدا کۆچی دوایی کرد، کوڕی دووەم (عبد الخالق مضمد) پیاوێکی دڵسۆز بوو بۆ وڵاتەکەی, کوڕەکەی (سەرباز) لەتەمەنی ١٢ ساڵی بەدەستی جاشەکانی بەعس شەهیدکرا، کچەکانی ئامنەو نەزاهەتو عەزیمەو لایقە.

**گوڵێ صادق:** خێزانی عەبدەی مستەفاسوورەو بن ئامۆزای یەکن, عەبدە پیاوێکی کاسبو ناسراو بووە لەشارۆچکەی کۆیە, دوو کوڕو چوار کچی هەبووە شوانو ئیسماعیل, نەزیرەو سنەوبەرو خەیریەو نەجیبە.

**هەندێك لەبەسەرهاتەکانی صادقەدرێژ:**

کورد دەڵێت مشتێك نموونەی خەرمانێکە, دەستێکی باڵای هەبوو لەکاری پزیشکیدا لەهەمانکاتدا مرۆڤێکی کاسب بووە, کاروانی چۆتە بەغداو بصرەو موصلو دیار بەکرو مهابادو تەورێز, لەو هاتوچۆو گەڕانانەیدا شتی خۆشو سەرسوڕهێنەری بەسەرهاتووە, چەند نموونەیەکیان لێباس دەکەم. ساڵێکیان بەشی زۆری توتنی پشدەری کڕیوەو بەرەو بەغداو بصرە ڕۆیشتوەو پاش ئەوەی توتنەکەی شێ دەکاو دەڕزێ دوای ٩ مانگ دەگەڕێتەوە ماڵەوە، کاتی نانخواردن دەبێت سێ کفتەی گەورەی کۆیی دەخوات،

نەنکە فاتمم پێی دەڵێ کابرای کاروانچی چوار جارە داوای کرێی بارەکەت لێدەکات، تۆش جەنابت لەسەر ئەو هەموو توتنەی بردوتە عانەت نەهێناوەتەوە سێ کفتەشت خوارد، مام صادق دەڵێت: دایکی مامە بەری دڵت گرتم ئەگینا دەمکرد بەچوار کفتە.

لەیەکێك لەسەفەرەکانی لەساڵی ١٩١٩دا لەگەڵ مامەی کوڕیدا کاتێك لەمهاباد دەبن ئیسماعیل ئاغای سمکۆ دەست بەسەر شاری مهابادا دەگرێت، هەرچییەکیان هەیە تاڵان دەکرێ، ناچار خۆی لەگەڵ مامەی کوڕی دەبێت بەحەماڵ (کۆڵ هەڵگر) لەو ڕێگایەوە خۆیان دەگەیەننە جەنابی ئیسماعیل ئاغا, دوای سڵاو دەستدەکات بەگفتوگۆ لەگەڵ ئیسماعیل ئاغادا باپیرم دەڵێ: من دانیشتوی شاری کۆیەم، بازرگانێکی دەوڵەمەندبووم ئێستاوا کۆڵ هەڵگرم, لەکاتێکدا بەمرۆڤێکی کوردپەروەر ناسراویت، بەنیازی ئازادکردنی ئەم وڵاتەی، بڕیارمداوە کەگەڕامەوە باسی چالاکیو فیداکاریو ئێوەی مەزن بکەم، زمانم لاڵ دەبێت قسەیەکی ناجۆر بکەم بەرامبەرت ئەوەش بارودۆخی منە کە لەبەر چاوتم.

ئیسماعیل ئاغا کەگوێی لەقسەکانی دەبێ زۆر بەلایەوە خۆش دەبێو ڕێزێکی زۆریان لێدەگرێت, داوایان لێدەکات ئەو شەوە میوانی ئەو بنو کاتێك ڕۆژ دەبێتەوە دەڵێ: مام صادق چیت ڕۆیشتوە باسی بکە تاکو دوو بەرامبەر زەرەرەکەت بۆ ببژێرم. کاتێك مام صادق دەگەڕێتەوە ناو کەسوکارەکەی خۆی لەزۆربەی کۆڕوکۆمەڵەکاندا باسی هەڵوێستی مەردانەی ئیسماعیل ئاغای سمکۆ دەکا بەرامبەر کۆڵ هەڵگرێکی ماڵ تاڵانکراو، کە بەڕاستی ئەو هەڵوێستە چاوەڕوانکراوبوو لەسەرکردەیەکی کوردی نیشتیمانپەروەری لێهاتوو.

جارێکیان ئاغایەکی پشدەر دێتە ماڵەوە بۆلایو داوای دەرمانێکی لێدەکات بۆ ئەوەی بتوانێ بەفەرمانی خۆی هەستێ لەگەڵ هاوسەرەکەی. باپیرم دەرمانی دەداتێو دەڵێت کەئەم حەبانەت تەواوکرد ئەو کاتە ئاغاژن هیچیتر گلەیی نامێنێ، لەو کاتەی کەباپیرم لەگەڵ ئاغاکە گفتوگۆ دەکەن لەهەمان ژور نەنکم دانیشتوەو لەخواری ژورەکە ڕەستەی یاپراخ ئامادە دەکات گوێی لەهەموو قسەکانی دەبێ, لەدواییدا ڕوودەکاتە باپیرمو دەڵێ بابی مامەی خورکت لێکەوێ کەدەرمانیوات هەیە بۆ نایخۆیت.

باپیرم وەڵام دەنێرێ بەدوای حەمەدو عەبدەی مستەفاسور بێنە قەڵادزێ. ئەو کاتە هاتوچۆکردن بەوڵاخ بووەو کاتێ دەگەنە ئەوێ هاوین دەبێ, باپیرم سەرو قات جلیان بۆ دەکاتو لێیان دەپرسێت چەندتان پارە هەیەو کاسبیتان چۆنە, ئینجا دەڵێت بەتەمام گوڵێو ڕەعناتان لێمارەبکەمو لەگەڵ خۆتان بیانبەنەوە بۆ کۆیە. هەموو جلوبەرگێکی بووکو هەندێك زێڕو بڕی ٥٠ پەنجا دیناریان دەداتێو بانگی نەنکم دەکات بۆ ئەوەی کچەکان بڕازێنێتەوەو ئامادەیان بکات لەگەڵ مێردەکانیاندا بەڕێ بکەون بۆ کۆیە. بەڕاستی باپیرم لەکاتێکدا ئەم هەڵوێستە دەگرێت کەزۆرێك لەدەوڵەمەندانو ناودارانی شارەکەی خۆی داوای کچەکانی لێدەکەن بەڵام دیاربوو لەمێشکی خۆیدا بڕیاریدابوو کەبیاندا بەکەسێك لەدینو خووڕەوشتیان شارەزابێت بەبێ ئەوەی گوێ بداتە پارەو ناو. بۆ زیاتر شارەزابوون لەخووڕەوشتی ئەم پیاوە حەزدەکەم

ئەم بەسەرهاتەشتان بۆ بگێڕمەوە: باپیرم لەکۆیە نیشتەجێ دەبێ‌و گرانییە گەورەکە دێت بەسەریاندا, خۆی‌و زۆربەی کەسوکارەکەی کۆدەکاتەوەو دەچێ بۆ گوندی سماقوڵی بۆ ئەوەی ژیانێکی باشتر بژین, کاتێك یەکەم ئێوارە نان دەخۆن سەیر دەکات ٧٦ کەس لەکەسوکاری خۆی لەگەڵی هاتۆتە دەرێ.

**حسین - مامە صادق**

لەتەمەنی ١٤ ساڵیەوە لەگەڵ باپیرم لەبەشی زۆری سەفەرەکانیدا بەشداریکردووە, دوکانی کوتاڵی هەبووە لەگەڵ دەرمانی پزیشکی‌و کاسبی توتنی کردوە، دێهاتی بەکرێ گرتووەو ساڵانە ٣-٤ هەزار سەر ئاژەڵی لەکوردستانی ئێرانەوە دەهێنا دەیبردە موصل، ساڵی ١٩٦٥ لەتەمەنی ٦٠ ساڵیدا بەنەخۆشی شێرپەنجە کۆچی دوایی کرد. تەرمەکەی لەگۆڕستانی کۆیەیە، ئەوپەڕی دۆستایەتی‌و برایەتی بەهێزبووە لەگەڵ خەڵکی پشدەرو مەنگوڕو مامەش‌و تائێستا سامانی ئەو دۆستایەتیە هەر بەردەوامە. بۆ نموونە بەجۆرێك لەئاغاکانی پشدەر نزیکبوو کەقسەیان رەتنەدەکردەوە، جارێکیان چەند ریش سپییەکی (شۆڕێ) دێنە لای پێی دەڵێن دەبێت یارمەتیمان بدەی شوێنی ژیانمان بچوکە بەڵکو تکامان بۆ بکەی لەلای جەنابی میناغای گربداغ خاوەنی قەڵادزێ کەڕێگامان بدات لەدەوروپشتی جوتکانییان خانووبەرە بکەین‌و لەناو بازاڕی قەڵادزێدا کاسبی بکەین بەڵکو بەهۆی ئەو هەوڵەی تۆوە بحەسێینەوە. کاتێك کەباوکم دەچێتە خزمەت میناغا داوای ئەوەی لێدەکا, میناغا دەڵێ: کاکە مامە تۆم زۆر خۆش دەوێ, ئێمە یەك ماڵین, هەموو داواکارییەکی تۆ بەسەر چاو جێبەجێ دەکەم بەڵام بەقسەم بکە ئێوەی کۆیی کەزاڵن بەسەر دارایی قەڵادزێ هاتنیان بۆ ئێرە مایەی زەرەرە لەدواڕۆژدا بۆ ئێوە. باوکم: دەڵێ ئێمە گیرفانمان پڕ بووەو ئەوانیش گیرفانیان بەتاڵە, رێگایان بدە بەڵکو ئەوانیش گیرفانیان پڕ بێ. ئەوەی ئاگادار بم لەوەزعی برا شۆڕێیەکان جێی شانازین بەگشتی لەهەر لایەك هەن, وابزانم گیرفانیان پڕە بەڵام ئایا کەسیان لەبیرماوە لەبەر گیرفان پڕی؟!

**شفیق مامە صادق**

لەساڵی ١٩٢٦ لەگوندی گرمیتەر لەدایکبووە کەنزیکەی ٢٠کم لەقەڵادزێوە دوورە، مرۆڤێکی دڵپاك‌و خۆشەویست بووە لەناو خەڵکدا، خوێندەواری هەبو، سەرەتا بیروباوەڕی شیوعی بوو، لەگەڵ ٢٤ کەس لەبەغدا هێرش دەبەنەسەر رۆژنامەی (فجر الجدید), لەساڵی ١٩٦٠دا دەگیرێت، بەهۆی بارزانی هەر هەمویان بەربوون، ئینجا بوو بەپارتی. ساڵی ١٩٧٦ گیراوە, ساڵی ١٩٧٨ بەردرا، ساڵی ١٩٨٠ کۆچی دوایی کرد, تەرمەکەی لەگۆڕستانی قەڵادزێ بەخاك سپێردرا، ئەم پارچە شیعرەی شاعیری بەناو بانگی کورد شێرکۆ بێکەس لەسەر کێلەکەی نوسراوە کەدەڵێ:

| | |
|---|---|
| چرای دڵم بەناو ژووری زیندانمە | باوەشی کرد بەتاریکی ژیانما |
| کاتێك مردم چراکەش کوژایەوە | پەنجەی ئازار دوا پەڕەی هەڵدایەوە |

چوار كوڕو شەش كچی هەبووە، كوڕەكانی محمد، ئاراس، احمد، نەبەز، كچەكانی ئەمیرە، نەزیرە، نەورۆز، بەیان، هەوار.

**محمد شفیق:** بوو بەپێشمەرگەو ساڵی ١٩٨٥ كەوتە ناو بۆسەی عباس بایزی باڵوئاغا كە لەبەر خاتری بڕێك دینار نامەیەكی هەڵبەستراو دەخاتە ناو گیرفانی ئەم لاوە كوردپەروەرەو تەسلیمی هەوالگری سوپای دەكاتو لەئەنجامی ئازارو ئەشكەنجەدانێكی زۆر، توشی نەخۆشی مێشك دەبێتو هەرچەندە پیشانی دكتۆرێكی زۆر درا بۆ چارەسەركردنی بەڵام بێسوود بوو، ئێستا بەشێتی بەناو بازاڕی قەڵادزێدا دەسوڕێتەوە.

**ئاراس شفیق:** لەدایكبووی ساڵی ١٩٦٢، دەرچوی كۆلێژی زانست بەشی كیمیا، لەبەر ئەوەی نەچووە ریزی بەعسەوە رایكرد، لەم ساڵانە شهادەكەیان بۆ هێناویەوە، ماوەیەك (پ.م) بوو، لەكاتی كیمیابارانەكەدا هاتەوە، مرۆڤێكی نیشتیمانپەروەرە ئێستا مامۆستایە لەشارۆچكەی رانیە.

**نەبەز شفیق:** لەدایكبووی ساڵی ١٩٦٥، پیشەسازێكی ناسراوە لەبواری ئۆتۆمبیل چاكردندا، پ.م ناو شار بوو، سێ جار گیراوە, بەهۆی مامیەوە (مفوض كمال) بەردراوە، پەیوەندی هەبووە بەكۆمەڵەی رەنجدەرانی كوردستان, ئێستا لەقەڵادزێ دەژی.

**ئەمیرە شفیق:** خێزانی عبدالخالق، كوڕێكی (سەربان) بەدەستی جاشەكان شەهیدكرا، ئازادو گۆرانو ئەژین ئەم سێ منداڵەی ماوە.

**نەورۆز شفیق:** خێزانی حسین حاجی علی لەیەكێك لەشەڕەكانی كوردكوژەدا كە لەنێوان (پ.د.ك)و (ی.ن.ك) روویدا لەساڵانی ٩٤–٩٥ دا، تۆپێكی كوێر كە لەلایەن پارتیەوە لەئێرانەوە ئاڕاستەی قەڵادزێ كرابوو، بوو بەهۆی ئەوەی ٢١ تەرم بهێنریتە دەرێ لەماڵی خوالێخۆشبوو, نەورۆز كەیەكێك لەكچەكانیشی تەمەنی ١٦ ساڵان بوو ناوی كانی بوو لەنێو ئەو ٢١ تەرمەدا بوو. لەسەردانێكی كاڵێی كچی خوالێخۆشبوو (نەورۆز) لەگەڵ باوكیدا بۆ خزمەتی سەرۆكی(پ.د.ك)، سەرۆك دەفەرموێت: چیتان دەوێ بۆتان بكەم..؟ كاڵێ خان دەڵێت: دایكمو خوشكم بۆ زیندوو كەرەوە، كاشكا ئەو تۆپە بەر ماڵی تۆ بكەوتایە.

**بەیان شفیق:** خێزانی بازیان رەفیق، دەرچوی پەیمانگای مامۆستایانە.

**هەوار شفیق:** خێزانی ئارام كریمە، دایكی ئارام پورزامانە.

**جوان شفیق:** خێزانی جبار عبدالله مولود، هەردووكیان دەرچوی ئامادەیی پیشەسازین.

**كمال مامە صادق:** لەقەڵادزێ لەدایكبووە لەساڵی ١٩٤١, لەتەمەنی ١٦ ساڵان لەگەڵ دایكمو ئەمیرەو نەزیرە بردمە لای خۆم لەبەغدا، لەساڵی ١٩٥٦ لەقوتابخانەی فەیلیەكان سەرەتایی تەواوكرد، ئینجا لەكاشف الغطاء ناوەندی تەواوكرد كاتێك بەعس كودەتاكەی بەسەر عبدالرحمن دا كرد كرا بەمفوضی پۆلیسی فریاكەوتن، شوینەكەی یەكجار ناخۆشبوو، زۆر پاڕایەوە بگوازرێتەوە بۆ بەڕیوبەرایەتی ئاسایش، ناچاربووم لەبەر خاتری دایكم جێبەجێی بكەم.

که له١٩٧٦/٩/١٤ گیرام، ساڵی ١٩٧٧ گواسترایەوه بۆ ئاسایشی سلێمانی، چەند جار توشی مەفرەزەی پ.م هاتووه دەستیان بۆ درێژ نەکردوه بەڵکو جێی رێز بووەو چەندێك لەئاسایش کاری کردووه بەگشتی خەڵکی زۆری لێڕازی بوون، ئینجا لەئاسایشی سلێمانی دور خرایەوه, دوای چەند مانگێك کرا بە(مدیری سوق مرکزی) لەسلیمانی، لێرەوه توشی کێشەو گیروگرفت بوو, بازاڕی ڕەش دەستی پێکرد (سەعات, ویسکی, جگەرەو هەموو کەلوپەلێکی ناوماڵو جلوبەرگی ژنانو پیاوانو خواردەمەنی) ڕۆژانە توشی تەنگوچەڵەمە دەبوو لەگەڵ کاربەدەستانی مخابەراتو ئیستخباراتو سوپاو چڵکاوخۆرەکانی میریو قاچاغچیەکانی ناو بازار، ڕۆژێك بەنهێنی سەردانی کاك مستەفا چاوەڕەشی کردبوو گوتبووی: هیچتان هەیە لەسەر من؟ کاك مستەفا دەفەرموێت: نەخێر بەڵام ئاگاداری رەوشتی ناو دائیرەکەی خۆتبە، پارێزگاری تەواوی ئافرەتەکان بکە نەهێڵیت تەعەدایان لێبکرێت، ئێمەش بەگشتی زۆرت لێڕازین، جارجار بەنهێنی دەهات منی دەبینی بەئاگاداری کاك نەوشیروان مستەفا، لەڕاپەڕیندا دەستگیریان کردبوو بردبوویانە دادگای شۆڕش لەوێ دوای لێکۆڵینەوەیەکی دورودرێژ دابویانە دەست جەماوەر، بەگولەی وێڵ کوژرا.

کەهەولێر گیرا خەبەری کوشتنی کەمالم زانی, هاتمە سلێمانی چومە خزمەت کاك ملازم عمر, بەڕاستی ئەم پیاوە مەزنە لەهەموو ڕویەکەوه جێی شانازیە, لەڕۆژی لێقەومانداوێنەی نییە, بەجۆرێك پێشوازی لێکردم کەهەرگیز لەبیرم ناچێتەوه، فەرموی دوای گرتنی سلێمانی بەدوو ڕۆژ ئینجا ئێمە هاتینە ناو شار, بەگۆڕی شەهیدان کاتێك هاتومەتە ئێرە یەکەم کەس هەواڵی کاك کەمالم پرسیوە, تازە کار لەکار ترازابوو، ئەمە چەقۆو ئەمە ملی من, ئێستاش با لەمزگەوتی کاك ئەحمەدی شێخ پرسەی بۆ دانێین، پ.م سەرپەرشتی بکات خۆشم ئامادەم لەبەردەرگا بوەستمو ئامادەم کەئوتومبیلێك پ.م بۆ گەڕەکەکەیان بنێرم تا کەلوپەلی ماڵەکەی لەماڵان بهێنینە دەرێ. گوتم: نوسراوێکم بۆ ئاڕاستەی کاك مسعودو کاك نەوشیروان بکەو تێیدا روونی بکەوه کەچۆن ئەم کارەساتە رویداوه.

گەیشتمە قەزای صدیق (رەواندوزی تازە) لەماڵی جەنابی عزت بەگی دێگەڵە, ڕۆژی ١٩٩١/٣/١٣ چاوم بەکاك مسعود کەوت, عومەری مام ڕەزاو بازیانی کوڕم لەگەڵدابوو زۆر بەگەرمی بەخێرهاتنی کردین، بەڵام من بەگرژیو بەشێوەیەکی ناشیرین لەڕویدا وەستام, لەوانەی دانیشتبوون کاك فرانسۆ حریریو عبدالمهیمن بارزانیو حاجی ئیبراهیمی شیرخۆرو عزەت بەگ بوون, نامەکەی کاك عومەرم دایەو دوای خوێندنەوەی فەرمووی: بەگۆڕی بارزانی ئاگام لێی نییە، نامەکەی دا بەکاك فرانسۆ حریری ئەویش گوتی: تۆ داوای (رد الاعتبار) ناکەیت..؟ ئەوە کاك عومەر ئیشارەتی پێداوه" کاك مسعود زیاد لەنیو سەعات قسەی کرد, ئینجا فەرموی: برای تۆ نە پارتیو نە یەکێتی نەیانکوشتووه بەڵکو جەماوەر نەیانناسیوەو بەر گولەی وێڵ کەوتووه، پاشان فەرمووی: جەولەیەکم لەکوردستان بەدەستەوەیە پێم خۆشە لەگەڵم بیت، تۆ وەزیری دەستە راستی ئایندەی. گوتم: دەبمە فەڕاش بەڵام لەگەڵتدا نابم،وا دەچمە سلێمانی تەرمەکەی کماڵی برام

بەخاك دەسپێرم چونكە هەروا بەئەمانەت نێژراوە. گوتی: پاش (٧) ڕۆژێ کەدێمە سلێمانی کۆنگرەیەکی ڕۆژنامەنوسی جیهانیم بۆ دەبەسرێت باسی بارودۆخی ئێستا دەکەم، من خۆم زۆر باش لەدورونزیك کمال دەناسم باسی فیداکاری ئەو دێنمە بەرچاو کە بەهەموو توانایەك خزمەتیکردوە, پەیوەندی بەخۆمەوە بووە، بچۆ بۆ لای نێچیرڤان بەناوی منەوە تاکو چیت پێویستە بۆت ئەنجام بدات.

نانی بەیانیو نیوەڕۆو شەوم کرد بەیەك ژەم,ویستم بڕۆم خواحافیزیم کرد. گوتی: ئیشم پێتە ئینجا کاتی ئەوە هاتووە کەچەند پرسیارێکت لێ بپرسم, گوتی: ئایا صدام دەڕوخێ؟ گوتم: لەبەر بارودۆخی ئێستای جمهوری ئیسلامی، ئەمریکا صدام لاواز دەکات بەڵام ناهێڵێت بڕوخێت.

پرسیار: ئەگەر کەرکوك بگرین صدام ناڕوخێت..؟

وەڵام: بەهیچ جۆرێك رووەمەکەنە کەرکوك چونکە دانیشتوانی شاری کەرکوك بریتین لە (کوردو تورکمانو ئاشوریو ئەرمەنیو کلدانو عەرەب) هەروەها شەریکەی نەوتی تێدایە, سەبارەت بەدهۆك کەگرتتان بەمەرجێك وەکو سلێمانیو هەولێر تالان نەکرێت، لەڕۆژانی نزیکدا کەرکوك رزگاری دەبێت تکاموایە کەدهۆك وەکو سلێمانیو هەولێر تالان نەکرێت.

پرسیار: ئایا پ.م بنێرین بۆ بەغدا بۆ گرتنی سەرکەوتو نابین..؟

وەڵام: شەڕی بەغدا بەپ.م ناکرێتوناگیرێت.

ئینجا من رومکردە کاك مسعودو چەند پرسیارێکم ئاڕاستە کرد:

پرسیار: ئایا سووتەمەنیتان دەستەبەرکردووە؟ فەرموی مەبەستت چیە؟وڵامم دایەوە نەوتو بەنزین، فەرموی نەخێر.

پرسیار: ئایا خۆراکتان دابینکردوە؟ فەرموی نەخێر.

پرسیار: ئایا بڕی چوار هەزار ملیۆن دۆلارتان پێیە؟ فەرمویوالله یەك دۆلارم پێ نییە. دەستی خستە سەر ساکەکەی (جانتاکەی).

پرسیار: ئایا ئەمریکاتان لەگەڵدایە؟ فەرموی نەخێر.

گوتم ئەی باشە بۆ هاتنەوە؟ ئینجا گوتم: کاك مسعود زۆر سوپاسی هەستی برایانەت دەکەم بەڵام یەك پێشنیازم هەیە دەیخەمە بەرچاوت، تکام وایە پەسەندی بکەیت، لەم چەند ساڵانەدا دەستدرێژیو تاوانی گەورەو ناشیرین بەئاشکرا لەلایەن سەرۆك جاشەکان بەرامبەر هەندێك خێزان کراوە هەرچەندە لێخۆشبوونی گشتیتان دەرکردوە بەڵام تاوانەکان زۆر زەقن، لەهەر پارێزگایەکدا دادگایەکی شۆڕش دابنێن ئەو تاوانبارانە لەسێدارە بدەن.

فەرموی ئەم پێشنیازەت بەم زوانە لەهەموو پارێزگاکاندا جێبەجێ دەکەین.

خواحافیزیم لەکاك مسعود کردو بەنیازی ئەوەی بچمە لای کاك نەوشیروان یەکسەر کاك فرانسۆ حریری

لەقسە خۆشە رازاوە جوانەکانی شەکرێکی شکاندو گوتی: نەوشیروان دوو کەسی لەگەڵە، بەڵام لـەوە دەچـوو کاك فرانسۆ حریری لەوە ئاگادار نەبێت کەسەرکردە دەبێت هێزی جەماوەری لەگەڵ بێت نـەك هێـزێ بـەپارە کڕاو.

لەهـەمان شـوین دور لـەکاك مـسعود چـوومە خزمـەت بـرای تێکۆشـەرو نیـشتیمانپەروەر کـاك نەوشـیروان مـستەفا، بەگـەرمی بـەخێرهاتنی کـردم، زۆری لا ناخۆشـبوو کەڕەحمـەتی بـرام کـوژراوە, چـەند نمونەیـەکی هێنایەوە کە لەزۆر شوێن ئەندامانی کۆمەڵەیان کوشتووەو جارێکیان ئەندامێکی کۆمەڵە لەبەردەستی دادگـای شۆڕشدا بوو بەتەلەفون ئاگاداریانکردم کەناتوانین بیپارێزین چونکە جەماوەر داوای دەکات ئێمەش دەکوژن.

نامەکـەی کـاك(عومـەر عبـدالله)م پێـدا, گـوتی: زۆر لـەکمال خـراپتر هـەبوو رزگاریـان بـووە بـەڵام کمـالی ڕەحمەتی باسکیلو شیری نیدۆ واتە (سوق مرکزی) کوشتی.

لەچاوپێکەوتنێکدا جەنابی (حاجی محمود ئاغای پشدەری)[1] و برای تێکۆشەر (خاڵەنەبەز)[2] یش کەناسـراوە بە(خولەی جگەر) لەهەمان شوێن لەخزمەتی کاك نەوشیروان بوون دەستمانکرد بەقسەو باسمـان لەچـۆنیەتی روخانی سوپای عیراق کەچۆن ئەم هێزە گەورەیە وەکـو بـەفری بـەهار بـەم شـێوەیە بەرامبـەر بەجـەماوەری کورد توایـەوە، شـەو درەنـگ بـوو فـەرمووی ئێـوە زۆر مانـدون، ئـەم ماڵـە رێکوپێکـە لێـرە بـن ئێمـە یـەکتر دەبینینەوەو بەیانی دێمە لاتان.

لەماڵی جەلال بەگ ئامۆزای کەریم خان محمود خەلیفە صمد شەومان بردە سەر, ئەمە یەکـەم جـارە بـەم شێوەیە بەتەنها مـنو جـەلال بـەگ دوو بـەدوو گفتوگـۆ بکـەین، جـەلال مـستەشارێکی کـۆنی بـاوەڕپێکراوبوو لەلایەن رژێمی بەعسەوە. گوتی: من زۆر حەز لەڕاو دەکەم, دەچـومە ڕاوە(مـرۆڤ), بارزانیـەکان هەنـدێك جـار لەبەر دیواری مزگەوتدا دادەنیشتن کامەی قەڵەوو ناسراو بوایە دەمکوشت راوی مـن بەئاشـکراو نهێنیـو کـاك مسعودیش ئەمـە دەزانـێ، بەیانیەکـەی کـاك مـسعود سـێ جـار نـاردی بەشـوێنیدا بـۆ نـانخواردن نەدەچـوو, لەدواییدا بەپاڕانەوەی زۆری من رۆیشت نانی لەگەڵ خوارد, دوایی گوتی: کاك رەفیـق ئاگـاداری بـەچ جۆرێـك گەورەکەیان پەیتاپەیتا دەنێرێت بەشوێنمدا...؟ گوتم: من رێـزم هەیـە بـۆ ئـەم پیـاوە مەزنـە ئەگـەر گلـەییم لەبنەماڵەی بارزانی کردبێت ئەوە چونکە لەساڵی (١٩٥٦)ـەوە تێکەڵاوییم لەگەڵیاندا پەیـداکردوەو نـازم هەیـە بەسەریانەوە بەڵام بەڕاستی کارێکی زۆر خراپت کردووە، من ئەم قسە گرژانـەم لەگـەڵ جـەنابی کـاك مـسعود کردووە، بەڵام کەلێی قبوڵ کردووم چونکە برام بەناهەق کوژراوە خزمەتی شۆڕشمان زۆر کردوە.

---

[1] هەرسێك براکـە حـاجیو بـابکرو مـستەفا بـەپێی توانـای خۆیـان خزمـەتێکی زۆریـان کـردووە, لەگونـدی هێـرۆ ماڵیـان بارەگایـەکی نهێنـی بـووە بـۆ سەرکردەکانی حزبی دیموکراتی ئێران, هەروەها پارتی. جەنابی مەلامستەفا بارزانی لەساڵی١٩٦٢ بەخۆیو هێزێکی زیـاد لـە٤٠٠ پ.م مـاوەی ٤٠ ڕۆژ زیـاتر میوانی ئەم بەڕێزانە بوو ناچاربوون قەرز بکەن. چونکە بۆچونیان جیاواز بوو لەکاری سیاسی.

[2] ساڵی ١٩٨٣ ئەم زاتە بەڕێزەم ناسی, مرۆڤێکی ئـازاو زیـرەكو شۆڕشـگێڕو نیـشتیمانپەروەربوو, یەکێکـە لـەو کەسـانەی کەجێدەسـتی دیـاربوو لـەو ناوچانەی کەخۆی پ.م بووەو تیایدا لێپرسراو بووبێت.

چوینە سلێمانی تەرمەکەی رەحمەتی کمالمان هەڵگرت بردمانە کۆیە لەوێ بەخاکمان سپارد، شەوەکەی لەگەڵ مامۆستای گەورەو نوسەری بەناوبانگ کاك مسعود محمدی مەلای گەورەی کۆیە دانیشتین بەدورودرێژی باسی چاوپێکەتنەکەمم لەگەڵ برایانی شۆڕشگێڕ کاك مسعودو کاك نەوشیروان بۆ گێڕایەوە، ئینجا کەوتینە گفتوگۆو لێکۆڵینەوە دەربارەی داهاتوی کورد کەئایا چۆن کێشەکە چارەسەر دەکەنو لەداهاتوودا، ئەم دوو حزبە چۆن سیاسەت بەڕێوە دەبەن؟ هەردووکمان بەیەك دەنگ گەیشتینە ئەم باوەڕە کەدوژمنانی کورد لەدەرەوەو ناوەوە زۆر بەهێزن مادام دوو حزبن نابنەوە بەیەك لەبەر ئەوەی دووبەرەکی دەست پێدەکات. کاتێك کەبانگی بەیانیدا هەریەکە بڕیاری خۆیدا، من دەمگوت دوای دوو ساڵیتر، شەڕی براکوژی دەست پێدەکات کاك مسعود محمد دەیفەرموو: نەخێر دوای شەش مانگیتر، بەهەرحاڵ تەنها لەسەر ماوەکە جیاوازیمان هەبوو لەبۆچونەکاندا.

لەسەر فەرمانی کاك مسعود بارزانی چومە سلێمانی چاوپێکەوتنم لەگەڵ کاك نێچیرڤان کرد، کاك فائق تۆفیق (فایەقەڕەش)و دکتۆر محمدی لا بوون بەگەرمی بەخێرهاتنی کردم، کەوتینە گفتوگۆ، گوتم: ئایا دەزانی ئێرە میوانخانەیەو ئەمەش ژوری بوكو زاوایەو وا سەعات دووی پاش نیوەڕۆیەو نانتان نەخواردوە،ماڵی رەحمەتی کمالتان تاڵان نەکردایەو لەوێ دانیشتنایە باشتر نەبوو؟ بەڕاستی ئێوە بێ سفەتن کەئیشتان بەیەکێك دەبێت دەستەکانی ماچ دەکەنو کاتێك کەئیشتان پێی نەما رێزی لێناگرن.

کاك فائق ویستی وەڵامی قسەکانم بداتەوە، کاك نێچیرڤان گوتی: کاك رەفیق ناڵێت پارتی بەڵکو قسەکانی بەرەوڕوی ئێمەیە، ئەمە دۆستێکی دێرینی مەلامستەفا بووەو باوکم زۆر رێزی لێگرتووە، لای مامم رێزی هەیەو زۆری خۆشدەوێت، بەچاوی مامم تەماشای دەکەمو کاك رەفیق بۆی هەیە رووبەڕوی ئێمە هەمووکات قسەمان لەگەڵدابکات، بەگرژی خواحافیزیم خواست.

**تێبینی:**

***تانکییەکی گەورەی پڕ لەبەنزین وەستابوو، منیش ئۆتۆمبیلەکەم بەنزینی تێدا نەمابوو لەبازاڕیش دەست نەدەکەوت، داوای بەنزینم لەمەسئولەکە کرد نەیتوانی بمداتێ گوتی دەبێ کاك نێچیرڤان ئەم بڕیارە گرنگە بداتو بەنزین بەدەست ئەوە. گوتم: هەتاکو بەنزینیش لەئێستاوە کەبچوکترین شتە هاتۆتە بەردەستیان ناتوانن بێ پرس بیدەن، خودا رەحمتان پێبکات، بەم شێوەیە لەیەکەم رۆژەوە خۆیان تەسلیم بەم بنەماڵەیە کرد، کەلێپرسراوەکە چۆوە بۆلای کاك نێچیرڤان وەرگەڕایەوە سەیارەکەیان بۆ پڕکردم لەبەنزین، خوا خوایان بوو دورکەومەوە قسەی تر نەکەم. بەو نیازە هاتبوومەوە سلێمانی کەکاك مسعود بارزانی تەشریفی دێت منیش بەشداری سکاڵای خۆم بکەم دەربارەی کوشتنی کمال، بەڵام کەچومە بنجوبنەوانی مەسەلەکە گەڕامەوە هەولێر، چونکە هەموو راستیەکانم بۆ دەرکەوت وا بەکورتی رونیدەکەمەوە.***

لەگەڵ زۆر لەپیاوە ناسراوەکانو سیاسیو کاسب لەدانیشتوانی پارێزگای سلێمانی کۆبومەوە دەربارەی

راووبۆچونیان بەرامبەر ڕەحمەتی کەمالی برام هەرچەندە خۆم لەهەموو کەس باشترم دەناسی چونکە لەتەمەنی ١٦ ساڵییەوە لەگەڵ خۆمدا دەژیا، بەڵام کە لە١٩٧٦/٩/١٤ گیرام هاتە سلێمانی, یەکەم جار مفوض بوو لەئاسایشی سلێمانی دوور خرایەوە، دوای چەند مانگێك کرا بە(مدیری سوق مرکزی) لەئەنجامی لێکۆڵینەوە زۆر باش راستیەکانم بۆ دەرکەوت. کە لەئاسایشی سلێمانی کاریکردووە خراپەی نەبووە، کاك مسعود بارزانی ری خۆی دەربڕیو کاك نەوشیروان مستەفاش چەند جار لەسەر کمال قسەی کردووە، خەڵکێکی یەکجار زۆرم دیوە کەگوتویانە کمال رزگاریکردووم لەزیندانیو سێدارەدان، لەمانە بۆ نمونە کاك ئەحمەد سمێڵ گوتبوی: ئەگەر کمال نەبوایە من کوژرابووم، کاکەحمەی فەرج گوتی بەمام جەلالم گوتوە کمال رزگاریکردم. دەروێش ئاغا گوتی: تەمەنام دەکرد لەخودا کەبێمە سلێمانی کمال بەلێقەوماوی ببینمو فریای بکەوم لەبەر ئەوەی دوو جار منی لەکوشتن رزگارکردووە.

کاتێك بووەتە مدیری سوقی مرکزی رۆژانە توشی کێشە دەبوو لەگەڵ چڵکاوخۆرو قاچاخچیەکانو مخابەرات. رۆژی ١٩٩١/٣/٧ لەکاتێکدا دەچێتە ماڵی کچێکی پوری چاوەڕوانی ئەوە دەکات کەپ.م بێتە ناو شار تاکو بیناسن، چەکدار دێن بۆ گرتنی, لە١٩٩١/٣/٨ خاوەن ماڵەکە دەڵێت لێرە نییە، کمال هاوار دەکات دەڵێت من لێرەم, هیچ لەخۆم شك نابەم, دەیبەنە دادگای شۆڕش، ماوەی چەند سەعاتێك لێکۆڵینەوەی لەگەڵ دەکەن هەموو پەیوەندیەکانی خۆی ئاشکرا دەکات کەپەیوەندی بەگروپە سیاسیەکان بەتایبەتی (ی.ن.ك) و (پ.د.ك) هەبوە، دوای ئەوەی کەهیچی لەسەر نادۆزنەوە تەسلیم بەجەماوەری دەکەن گوللەیەکیوێڵی لەپشتەوە بەر دەکەویو دەکوژرێ.

بەشی زۆری جەماوەری نیشتیمانپەروەر تینوی ئازادی بوونو ٧٠ ساڵە کورد چاوەڕوانی ئەم هەلومەرجەی دەکرد کەڕزگاری بێت بەتایبەتی لەدەست بەعسو تاوانەکانی، بەڵام لەپەنا جەماوەرەکە خەڵکی چڵکاوخۆرو دزو سیخوڕ سەر بەڕژێمی بەعس لەوانە چەند کەسێك مانگانەیان لەدەست کمالوەرگرتووە.

**پرسیار:**

١. ئێوە لەخۆتانەوە ناوی خۆتان نابوو (دادگای شۆڕش) کەزانیتان هیچی لەسەر نییە بۆچی موجامەلەتان کرد ئینجا تەسلیم بەو جەماوەرە غەوغایەتان کرد؟ ئەو رۆژەی کەمەسئولی دادگاکە چەکی پێ نەبایە بەدەست بەستراوی تەسلیم بەجەماوەر کرابایە ئەویش هەمان چارەنووسی دەبوو.

٢. جەنابی سەرۆکی دادگای شۆڕش:وەکو بەکوشتتدا ئەم کردەوە ناشرینەت لەگەڵ کرد، مردوو کەمرد شەیتان دەستی لێ هەڵدەگرێت. سەرتان بڕی, ئەو مرۆڤە کە لەسوقی مرکزی جگەرەی نەدابویە جگەرەیەکی خستبوە ناو دەمی، راستە برا خۆشەویستە, رەحمەتی کمال نزیکترین برادەری گیانی بەگیانیم بوو لەهەمانکاتدا وەکو باوك لەگەڵی دەجولامەوە، تاوانێکی زۆر گەورەیان لەگەڵ کردین کەبەم شێوەیە

كوشتیان..لەهەمانكاتدا سوپاس بۆ ئەو برا بەڕێزانەی دادگای شۆڕش‌و ئەو برایەی لەپشتەوە تەقەی لێكرد، هیچ ڕق‌و كینەیەكم لێیان نەماوە، سوپاسیان دەكەم چونكە یارمەتییەكی زۆرتان داین ئەگینا ئەگەر كمال نەكوژرایە ئێستا لەپاڵ گروپێكی سیاسی دەبوو خەڵكێكی زۆری ئاشكرا دەكرد لەوانەی لەژێرەوە پەیوەندییان بەرژێمی بەعسەوە هەبووەو زۆریان ئێستا لێپرسراوو كارمەندن، ئەمەش مەترسییەكی زۆر گەورە دەبو, منیش ئەوسا دەبوایە لەگەڵ یەكێك لەم دوو هێزە بومایەو بەناچاری بەشداری جەنگی براكوژیم بكردایەو گومانم نییە لەوەی كەئێستا كوژرابوومو تەرمەكەم بۆگەنی دەكرد لەسەر (تەپكەی حەمەدئاغا) دەرزام یا لەبندیخانەی (ئاكرێ یا لەدێی شێنێ)و دەبوایە ئەم هەموو راستیانە كە لەلای منە لەگەڵ خۆم بمبردایەتە گڵەوەو خودای گەورەش دەفەرموێ(وعسى ان تكرهوا شيئاوهو خير لكم).

بەڵام ئێستا سەربەستم, لەخودا بەزیادبێت لەگەڵ هیچ گروپێكی سیاسیدا نیم‌و جێدەستم دیارەوا كتێبی دووەمم بڵاوكرایەوە. ئەوەی لەپشتەوە گولەی پێوە نا، هەوڵێكی زۆری دابوو كەئازای كوڕی بكوژێت، پڕوپاگندەیەكی زۆری لەسەر بڵاوكردەوە دیاربوو زۆر دەستڕۆشتوبوو چونكە دەنگوباس‌وا بڵاوبۆوە كەئازای كوڕی كەمال پشدەری بەسەیارەیەكی بەڕازیلی شەوان خەڵك دەكوژێ یا تەقە لەخەڵك دەكات.

لەهاوڕێكانی پرسیار بكەن بزانن ئازا رەوشت‌و كردەوەی چۆن بووە لەگەڵ هاوڕێكانی لەقوتابخانەو لەگەڵ دراوسێكانی، ئازا لەڕێكخراوی بەعس نەبووەو ئێستا شۆفێرە لەهەولێر. سوپاسی ئەو برا ئازیزانە دەكەین كەیارمەتییان داین بەتایبەتی ئەم بەڕێزانە: كاك مـلازم عمر, كاك شێخ صلاح تاڵەبانی, كاكەسوور, كاك رەئووفی زەڕنگەر, كاك عومەری مام رەزا, ئەم زاتانە یارمەتی بازیانی برازای رەحمەتی دەدەن بۆ هەڵگرتنی تەرمەكەی. هەروەها كاك شێخ ئەشرەف تاڵەبانی كەخێزانی‌و منداڵەكانی رەحمەتییان بردەوە كۆیە. كاك عزیز رحمان‌و كوڕەكانی یارمەتییان داین بۆ شۆردن.

**بدریە مامە صادق:** خێزانی ئیسماعیل مام حمەد ناسراو بەئیسماعیل قصاب, پێنج كوڕو سێ كچی هەیە، كوڕەكانی: جەلال‌و جبارو كاوەو رزگارو بەختیار، كچەكانی گەلاوێژو هێزەو بەناز. جلال لەشەڕی عیراق‌و ئێران كوژرا، ماوەی چەند ساڵێك لەگەڵ خۆم پ.م بووە. كاوە لەناو شاری رانیە ئینزیباتێكی عەسكری پانزە گولەی پێوە نا چونكە كاوە ویستویەتی چەكەكەی لێ بسێنێ.

**فخریە مامە صادق:** خێزانی رحمان مام صادق، پێنج كوڕو سێ كچی هەیە، كوڕەكانی مریوان‌و بەهمەن‌و كامەران‌و كەریم‌و بەهزاد، كچەكانی شلێرو نهایەت‌و بەختەوەر. كامەران لەئاوی ئاسكی كەڵەك خنكا، كوڕەكانی تری لەهەندەرانن.

باوكم ژنی دووەمی لەساڵی ١٩٣٦ هێناوە لەجولەكەكانی قەڵادزێ, ناوی سمحە ناحوم بووە, كەهاتە سەر ئاینی ئیسلام ناویان نا عاصمە ناحوم، پێنج كوڕو دوو كچی هەیە، كوڕەكانی حسن‌و حاجی‌و جمال‌و قادرو نادر, كچەكانی نسرین‌و كوردستان. خاڵێك‌و پورێكیان ماون بەهۆی ئەوانەوە هەموو كوڕەكان چونە

ئیسرائیل, دوای چەند ساڵێك ئیسرائیلیان بەجێهێشت چونە ئەوروپا,وەکو بیستم حاجیو قادر هاتبونەوە قەڵادزێ سەر لەماڵە خەزورانیان بدەن، ئێستا حاجیو قادر لەسویدن، نسرین خانیش لەهەندەرانە.

**کوردستان مامە صادق:** خێزانی کاك عبداللە حاجی احمد, لەڕانیە دەژین، مرۆڤێکی نیشتیمانپەروەرو دڵسۆز بوو بۆ ماڵو منداڵەکانی.

**رەفیق مامە صادق (رەفیق پشدەری):** حەز دەکەم پێناسەیەکی خۆمتان بۆ بکەمو لەگەڵمدا بژین تاکو لەنزیکەوە ئاگادارین کەچیم دیوەو چیم بەسەرهاتووە.

لەدایکبووی ساڵی ١٩٣١ لەشارۆچکەی قەڵادزێ, پۆلی شەشم تەواو کردووە, پۆلی چوارو پێنجەمم لەقۆتابخانەی فیصلیە لەشاری سلیمانی تەواوکردوە کاتێك کەماڵمان چو بۆ سلێمانی بەڵام دوایی ماڵمان گەڕایەوە قەڵادزێ، باوکم هەمیشە هانیدەدام کەشارەزای کەسابەت بم، ساڵی ١٩٤٧ لەقەڵادزێ مامۆستای تێکۆشەرو نیشتیمانپەروەر کاك حمەسووری مینەعەرەب هانیدام کەلایەنێك لەم دوو لایەنە سیاسیە هەڵبژێرم: پارتو تەحەرور, منیش زۆر بەباوەڕەوە پارتم هەڵبژاردو دوایی ئەم وشەیە گۆڕاو بو بەپارتی، لەتەمەنی ١٧ساڵیدا قەڵادزەم بەجێهێشت چوومە کەرکوك. جەنابی بابکرئاغای پشدەری نوسراوێکی بۆ یەکێك لەبەڕێوەبەرەکانی شەریکەی نەوت دامێ, ساڵی ١٩٥٢ دامەزرام بەپۆستەبەر لەنێوان شەریکەی نەوتو موتەصەریفیەتدا مانگانە بەموچەی ١٦,٦٠٠ دینار. دوای ساڵێك بووم بەکاتب، دوایی وردەوردە موچەکەم زیادیکرد تا گەیشتە ٢٥,٦٠٠ دینار بووم بە(ملاحظ توزيع الأوراق), لەهەمانکاتدا ئێواران لەقوتابخانەی خۆیەتی دەوامم دەکرد تا ناوەندیم تەواوکرد فێری زمانی تورکیو ئینگلیزی بووم، لەقوتابخانەی شەریکەی نەوت ژمێریاریم تەواوکرد فێری رێکخستنی تۆماری ژمێریاری بووم بەشێوەی (بلانجو), هەروەها شارەزاییەکی تەواوم وەرگرت کەچۆن فایل رێکوپێك بکەم، بەڕێوەبەری پۆلیسی کۆمپانیای نەوت بە( شیوعی)یان لەقەڵەم دابووم بۆیە ناچاریانکردم کەواز بهێنم، یەکسەر چومە بارەگای رۆژنامەی الأهالی لەبەغدا چاوم کەوت بەمامۆستا (حسین جميل)[٣] پێم راگەیاند کەکۆمپانیای نەوت بە چ جۆرێك مافی گەلانی عێراق پێشێلدەکەن، راستەوخۆ پێیان گوتم ئێمە دەربارەی کۆمپانیای نەوت هیچ باسێك بڵاو ناکەینەوە.

لەبەغدا نیشتەجێ بووم, ١٢ شوێنی بازرگانیم گرتبووە دەست کەڕۆژانە لەسەر شێوەی بلانجو حساباتم بۆ دەکردن، توانیم دوای ساڵێك سەرمایەیەکی باش کۆبکەمەوە هەروەها کاتێك لەکۆمپانیای نەوت بووم لەکەرکوك هەندێك پارەی ترم کۆکردبۆوە، توانیم لە( شارع النهر) بەناوی رەفیق پشدەرییەوە لەخان یاسین خضیری نوسینگەیەکی بازرگانی دانێم. ساڵی ١٩٥٦ رۆژ بەڕۆژ بارودۆخی ئابوریم بەرەو باش دەڕۆیشت، توانیم دوای ماوەیەك لەدەرەوەیوڵات سەعاتو رادیۆ بە(استيراد) بهێنم.

ئەوەبوو کەخۆم گرت دایکمو کماڵو ئەمیرەو نەزیرەم هێنایە لای خۆم بۆ بەغدا لەپاڵ کاسپیەکدا دەستمدایە کوردایەتی. لەکاتی حوکمی مەلەکیەت ماوەی حەوت ڕۆژ گیرام، هاتمە گۆڕەپانی سیاسیەوە پەیوەندیو دۆستایەتیم لەگەڵ خەڵکێکی زۆری نیشتیمانپەروەرو سیاسەتمەداری کورد پەیداکرد, لەم

[٣] سیاسەتمەدارێکی ناسراوی عێراق، نیشتیمانپەروەر، لەحزبی نیشتیمانی دیموکراتیدا پلەی بەرزی بوو، هاوسەرەکەی کورد بوو لەبنەماڵەی زهاوی بوو، لەزەمانی مەلیکدا کرا بەوەزیری داد, بەیانێکی دەرکرد هەموو ئەو بارزانیانەی کە لەژوری لەسێدارەداندا بوون حوکمەکەی گۆڕین بەبەندکردن، کوردی زۆر خۆشدەویست.

مامۆستا بەڕێزانە سودێکی گەورەموەرگرت, شارەزاییم لەسیاسەت پەیداکرد، رۆژ بەڕۆژ زانیاریم وەردەگرتو هەر گوێگر بووم, قەرزداریانمو خۆم بەبچوكو قوتابییان دەزانم هەتا مردن, ئەویش ئەم بەڕێزانەن: مەلامستەفا بارزانی، نوری شاوەیس، ئیبراهیم احمد، عبدالرحمن زبیحی، مسعود محمد، عمر دەبابە، سعید قزلی، جمال نەبەز، رەفیق حلمی، حلمی علی شریف، مام جەلال، انور جمیل بەگ جاف، همزە عبداللە، هەژاری شاعیر.

دوای ٢٥ ساڵ رۆژێك لەکۆڕێك قسەم دەکرد مامۆستای مەزنی ناسراو کاك مسعود محمد پرسیاری لێکردم ئەمەی کەباست کرد چۆن چۆنی دەیزانیت..؟ گوتم کاتی خۆی رۆژێك لەمیوانخانەی (تروکادیرۆ) لەبەغدا بەڕێزتان ئەم قسەیەت کرد منیش نوسیمەوە لەبەرم کرد، بەم شێوەیە لەم بەڕێزانە شت فێربووم.

ماڵمان لە(شارع مشجر)بوو گواستمانەوە بۆ (أعظمیة شارع الضباط). ساڵی ١٩٥٧ یەکەم ژنم هێنا کەناوی شیرین معروف رۆستم بابان بوو لەبنەماڵەیەکی ناسراوی سلێمانی بوو. کاتێك کەپارتی دیموکراتی کوردستان بەسەرۆکایەتی بارزانی داوای لەزەعیم کرد رێگایان بدات بەشێوەیەکی ئاشکرا کاروباری حزبایەتی بکەن هاوسەرەکەم یەکێك بوو لەو ئافرەتانەی کەناویان لەلیستەکەدا بوو. لەهەموو دیدارێکی زەعیم کەلەگەڵ ئافرەتانی کوردستاندا کۆبۆتەوە هاوسەرەکەم بەناوی (پ.د.ك)وە بەشداربووە. کەشەڕ دەستی پێکرد فەرمانی گرتنی دەرچوو لەماڵی عبدالکریم الندی خۆی شاردبۆوە کەخزمێکی نزیکی احمد حسن بکر بوو. ساڵی ١٩٨١ توشی نەخۆشی شێرپەنجە بوو, لە١٠/١١/ ١٩٩٣ کۆچی دوایی کرد, تەرمەکەی لەگردی سەیوانە. دوو کوڕو کچێکم لێی هەیە بەناوی ڕوبارو بازیانو رەوەز.

لەساڵەکانی حەفتا لەکوێت لەباڵیۆزخانەی عیراق لای باڵیۆز مدحت ابراهیم جمعە دانیشتبووم پیاوێك هاتە ژوورێ داوای لەمدحت کرد کەبڕی ١٠٠٠ دیناری کوێتی بداتێ، مدحت گوتی دەبێت بروسکەم بۆ بێت ئینجا دەتوانم، کەزانیم ئەمە عبد الکریم الندییە گوتم: پێویست ناکات, من قەرزداری ئەم پیاوەم. تەلەفونم کرد لەگەڵ عنایەت شکر علی[٤] کە بەابوحیدر ناسراوە داوام لێکرد کەهەر ئێستا بڕی ١٠٠٠ دیناری کوێتیم بۆ بهێنێت من لای جەنابی باڵیۆزم. کەپارەکەم دایە، گوتی من ناتناسم. گوتم: کورد پیاوەتی لەبیر ناچێتەوە ئەگەر یەکێك چاکەی لەگەڵ بکات، من فلانم، هاوسەرەکەم کەشیرین معروف رۆستم بابانە کاتی خۆی بەڕێزتان یارمەتیتان داوە کەدەستگیرنەکرێت, لەماڵی ئێوە خۆی شاردۆتەوە. گوتی: ئەی ئەگەر یەکێك خراپەتان لەگەڵ بکات؟ گوتم: ئەگەر دەسەلاتمان هەبێت یەکسەر چیمان دەسەلات بێت لەگەڵی دەکەینو ئەگەر هیچمان پێنەکرا چاوەڕوانی دوارۆژ دەکەین.

لەساڵانی حەفتاکاندا جارێك لەخزمەت مام جەلالو هاوسەرەکەی چوینە کوێت لەمیوانخانەی (فینیقیا)

---

[٤] لەکوێت بەبارزانی ناسراوە, لەپەنجاکانەوە لەکوێت دەژی, دەڵێت ئێمە جافین، پیاوێکی ناسیاوو سەخییە جێی خۆی کردۆتەوە, حەزی لەخزمەتکردنی دەوروپشتەکەی زۆرە.

دابەزین, مام جەلال فەرموی برادەرێکم هەیە ملیۆنێرە منیش, گوتم برادەرێکم هەیە بەرامبەر سەرمایەی ئەو برادەرەت (مفلس لێرە)وەرە تاقییان بکەینەوە. تەلەفونم کرد بۆ کابرای ملیونلێر, دوای چاكو چۆنی ئاگادارمکرد کە لەکوێتم لەخزمەت مام جەلالو هاوسەرەکەی، وەڵامیدامەوە تەلەفونیان بۆ دەکەمەوە، منیش گوتم مام جەلال ئەوە برادەرەکەی تۆ. ئینجا تەلەفونم بۆماڵی برادەرەکەی خۆم کرد، پرسیاری لێکردم بۆ لەمیوانخانە دابەزیویت, ئاگادارمکرد لەخزمەت مامەم. دوای ئەوەی شوینو تەلەفونی زانی دوای نیو سەعات پرسگای میوانخانەکە پێیان راگەیاندین کەمیوانتان هاتووە. روخسەتم لەمام جەلال وەرگرت ئینجا گوتم بابێنە سەرەوە، سێ کەس بوون خۆیو کورەکەی حیدەرو براکەی کاك عبدالله، زۆریان هەوڵدا کەبگوێزینەوە بۆ ماڵی ئەوان، گوتیان ئەوە دوو سەیارەشمان بۆ هێناون لەخزمەتتاندا بێت، میوانداری کردین لەماڵی خۆی, کاتێك چوینە ژورەوە بۆ نانخواردن هەرچی میوەیەك هەبوو لەسەر سفرە دانابوو، گوتم ابو حیدەر دەتەوێ بەمیوە تێرمان بکەیت، گوتی: ئەوە بخۆن دوایی نان بخۆن, منیش گوتم: نان دەخۆین دوایی میوەکە دەخۆین. گوتم: مام جلال ئەوە برادەرەکەی من!

**هاوسەری دووەمم:** ئێران فیض الله بەگی لەساڵی ۱۹۵۱ لەشارۆچکەی سەقز لەدایکبووە, دبلۆمی هەیە لەرشتەی تەبیعی (سروشتی). باوکی حاجی عبدالله خانی فیض الله بەگی سەرۆکی هۆزی فیض الله بەگی بووە، ۸۰۰ چەکداری هەبوو، لەکتێبەکەی مسعود بارزانیدا (البارزانی والحرکة التحرریة الکردیة _ ثورة بارزان ۱۹٤٥ _ ۱۹٥۸) ئیشارەت بەوە دەدات کەعبدالله خان بەناوی هۆزی فیض الله بەگیەوە ۸۰۰ چەکداری لەگەڵ بووە.

دایکی خوشکەزای خوالێخۆش بوو قازی محمدە سەرۆکی کۆماری مهاباد، دایکی پێشەوا کەناوی گەوهەرتاج خانم بووە فیض الله بەگی بووە خزمێکی نزیکی دایكو باوکی هاوسەرەکەم بووە، خێزانی سیف القاضی خزمێکی نزیکی دایكو باوکی هاوسەرەکەمن. خاڵی سعیدخانی همایۆنییە کەلێپرسراوی پاراستنی پێشەوا قازی محمد بووە، لەهەمانکاتدا سکرتێریشی بووە. دوای روخانی کۆماری مهاباد یانزە کەس لەکەسوکاری هاوسەرەکەم لەسێدارەدران لەنێوانیاندا حسن خانی فیض الله بەگی کەمامی خێزانم بووەو علی بەگ یەکشەوە مامی دایکی خێزانمە. باوکی حاجی عبدالله خان بەندکرا, دوای ئازارو ئەشکەنجەیەکی زۆر ئینجا ئازادکرا.

لەکاتی هاتوچۆکردنم لەنێوان (ی.ن.ك) و(پ.د.ك) لەگەڵ ئەم بنەماڵە بەرێزە ناسیاویم پەیداکرد بەیارمەتی دکتۆر شیرازیو ئاغای حسن رۆشنفکرو هاوسەرەکەی، کارەکە زۆر ئاسان بوو بەڵام لەکاتی مارەکردندا (اطلاعات)ی شارۆچکەی سەقز بردیانم, لەو کاتەدا کەخەڵکێکی زۆر لەپیاوە ناسراوەکانی کوردستانی رۆژ هەڵات ئامادەبوون بەم بۆنەیەوە لەپڕ گوتیان ئێمە رازی نین (این ازدواجی سیاسی نەمیشی). رێگایان نەدا مەلا مارەی بکات, بەنائومێدی ویستمان بگەرێینەوە تاران، لەکاتێکدا هاتینە

(تێرمینالّ _ گەراج) تەشریفی حاجی عبدالله خانو ئێران خان لەپڕا دەرکەوت تاکو بەرێمان بکەن بەڕێز حاجی عبدالله خان فەرموی هەتاکو من لەژیاندا مابم دەسەلأت بەدەست خۆمە, خودای مەزن بیەوێت کارێك ئەنجام بدات کەس ناتوانێت بەرامبەری راوەستێت، پشت بەخوا دوای حەوت رۆژیتر دێینە خزمەتتان لەتاران.

منو بازیانی کورم بەرامبەر ئەم پیاوە بەرێزە قسەمان بۆ نەدەهات, بازیانی کورم سوپاسی یەزدانی مەزنی کرد کەئێمەی نەناسراوو ئەم پیاوە گەورەو ناسراوە هەلّەویستی بوو، لەگەلّ ئەوەشدا ئێران خواردنی خۆشی بۆ ئامادەکردین بیبەین بۆ رێگا.

لەڕۆژی ١٩٨٧/١١/٤ لەسەر مەزهەبی شافعی مارەکرا بەبیّ ئاگاداری کۆماری ئیسلامی. سوپاس بۆ یەزدانی مەزن خۆم بەبەختەوەر دەزانم لەگەلّ ئەم بەرێزەدا رۆژگار دەبەمە سەر هەرچەندە توشی ئازارو ئەشکەنجەیەکی زۆر بون کەئەویش داستانێکە لەکتێبی سێیەمم بەدووروودرێژی باسی دەکەم.

دایکی بازیان لەژیاندا مابوو کاتێك بازیانو رەوەز لەگەلّ دایکیان کێشەیان دەبوو دەهاتنە هەولێر پەنایان دەهێنا بۆلای ئێران خان بۆ ئەوەی چارەسەری کێشەکەیان بکات، پێش کۆچی دوایی دایکی بازیان بەچەند مانگێك ئێران خان رۆیشتە سلێمانی دایکی بازیانی هێنایە هەولێر ماوەی ١٧ رۆژ خزمەتی کرد.

فیض اللهبەگی هۆزێکی ناسراون لەسەرانسەری کوردستانی ئێراندا، تیرەیەکن لەفەقیّ ئەحمەدی دارشمانە. لەپێناوی ئازادیو سەربەخۆیی کوردستان گیانی خۆیان بەختکردوە.

## پەیوەندییەکانم لەگەلّ بنەماڵەی بارزان

لە(اعظمیة) دراوسێی پێنج مالّی کورد بووین یەکێکیان مالّی مەلامستەفا بارزانی بوو, مالّەکەیان بەناوی مالّی عبیدالله ناو دەبرا.

لەگەلّ دایکمو هاوسەرەکەم چوینە مالّی جەنابی عبیدالله بارزانی سەردانمانکردن، رۆژ بەرۆژ هاتوچۆمان زۆرتر دەبوو, دایکم زوو زوو سەری لێدەدان دەیگوت کورم بەداخەوە هەندێك لەئافرەتەکان باش لەقسەیان تێناگەم بەلأموا خەریکە لەگەلّ زمانەکەیان رادێم, کاتێك لەگەلّیان دادەنیشم خۆمم لەبیر دەچێتەوە ئەوەندە رێکوپێکن, وەکو خۆیان دەیانگوت میری موچەی کەناسیمان دەدەنیّ خودا چۆن بەوە رازییە، ئەو ماوەیە بارودۆخی ئابورییان زۆر خراپ بوو، لەپەنا عبیداللهدا دۆستایەتیو برایەتیم لەگەلّ شێخ صادقو شێخ محمدخالدو لوقمان پەیداکرد وای لێهات نزیکترین برادەری عبیدالله من بووم, ئیدریسو صابر برادەری کمالی برام بوون، چەند جار سەردانی شێخ ئەحمەد بارزانیم کرد لەبەندیخانەی بصرە، سەردانی ئەو قوتابخانەیەم کرد لەاعظمیة کەئیدریسو مسعودو صابر تیایدا قوتابی بون. بەرێوەبەری قوتابخانەکە گوتی: زیرەکترینو بەڕەوشتو جوانترین قوتابی ئەمانەن کەتۆ هاتوییت پرسیاریان لێدەکەی, تکا دەکەم ئاگاداریان بکە ئەوان چاویان لەئێمە بێت، راستی دلّخۆش بووم کەکوڕانی سەرۆك مستەفا بارزانی ئەم رێزەیان هەیە

لەقوتابخانەکە.

دوو جار سەردانی بەڕێوەبەرەکەیانم کردووە جارێکیان لەگەڵ کاك بورهان جاف چوین بۆلایان. لەجەژنێکیتردا سەردانی شێخ ئەحمەدو شێخ لەتیفم کرد لەبەندیخانەی بصرە، باسی خۆڕاگریو لەسەرخۆیی ئەم پیاوە مەزنەی بۆ کردم کە بەجۆرێك هەموو بەندەکان رێزی لێدەگرن کەشێخ ئەحمەد نمونەی خۆڕاگرییە، لەهەموو میواندارییەکدا من دەمکرد دەبوایە عبیداللەو صادق‌و لقمان بەشدار بونایە، زوو زوو سەرادنی خولەی حمەی لەیلێمان دەکرد بەڕێوەبەری دارایی میوانخانەی (ریجینت)و مانگی زیاتر لەدە جار میوانداری تایبەتی دەکرد بۆیان, هەروەها ئەوەندەی من لەنزیکەوە ئاگاداربووم بەڕێز عبیداللە خۆی بۆی باس دەکردم جەنابی کاکە زیادئاغاو رەسولی حسن ئاغای پشدەریو خولەی حمەی لەیلی بێئەندازە خزمەتی عبیداللەیان دەکرد.

عبیداللەو شێخ صادق‌و لوقمان زۆر خۆڕاگربوون, ئەمجۆرە ژیانە سەختەیان پێوە دیار نەبوو, بەلاّم دڵی خۆیان بۆ من دەکردەوەو گلەییان دەکرد لەچەند کوردێکی دەوڵەمەندو ناسراو. بۆیە ئاگاداری کاکەخولەی حەمەی لەیلێم کرد کەعبیداللە زۆر بێتاقەتە حەزدەکەم کۆڕێکی دانیشتن‌و گۆرانی ساز بکەین لەماڵی ئێمە، ئاهەنگێکمان پێکهێنا کەئەم بەڕێزانەم بانگهێشتکرد: کاکە زیادئاغاو عبیداللەو شێخ صادق‌و لوقمان‌و خولەی حمەی لەیلیۆ عەونی یوسف، کاکەخولەو رەشۆل عبداللەو تایەر تۆفیق‌و رەسول گەردیو حسن زیرەك ئامادەبوون، بۆ ئەم ئاهەنگە لەژنان هاوسەرەکەم لەگەڵ دکتۆرە نەزیهە دلێمیو صبیحە جبوری ئامادەبوون، بەلاّم ئەوان لەژورێکی تایبەتی دانیشتبوون.

## شۆڕشی ١٤ تەموزی ١٩٥٨

بەسەرۆکایەتی زەعیم عبدالکریم قاسم ئەنجامدرا, گەورەترین روداو بوو لەمێژووی عێراقدا، ئەوانەی کەسەر بەبنەماڵەی پادشا بوون توشی ئازارو ئەشکەنجە بوون، لەڕۆژانی یەکەمی شۆڕشدا لەگەڵ عبیداللە پیاسەمان دەکرد تەماشامان کرد لەگەڕەکی خۆمان ئاگریان لەتەرمەکەی صباح نوری سعید بەردابوو، کابرایەك گوتی: ئەمە تەرمی ناوبراو نییە, تەرمی مسئولێکی ئۆردونیە بەناوی تۆقان، لەم جۆرە روداوانە زۆریوا هەبوو بەڵکو گەلێك لەمە زیاتر دەهاتە بەرچاو پێم جوان نییە باسی تەرمەکانی تر بکەم بەڕاستی دیاردەیەکی زۆر ناشرینە، مرۆڤ دوای کوشتنی ئەم جۆرە رەفتارەی لەگەڵ بکرێت، بەداخەوە بێگومانم لەوەی ئەمە پیشەی باوو باپیرانمان نەبووە بەڵکو دەستێکی تاوانەو پێویستە لەبنا ببڕدرێت چونکە لای هەموو کەسێك ئاشکرایە ئەگەر خاوەن دکتۆرا بێت‌و لەسەر تەختی پادشاییو بێ رۆشنبیری بێت خۆڕاییەوەکو شاعیر دەڵێ، هەموو خویندەوارێك رۆشنبیر نییە بەلاّم هەموو رۆشنبیرێك خوێندەوارە.

## تێبینی

ئێمەی کورد لەڕاپەڕینە مەزنەکەدا زۆر لەوە ناشرینترمان کرد, هەندێك کەس دەرونی نەخۆشەو حەز بەئەتککردنی بەرامبەرەکەی دەکات لەتۆڵەکردنەوەدا, دوای مردنی مرۆڤەکە یاری بەلاشەکەی دەکەن یان دوای تاڵانکردنیماڵەکەی ئەوەی بۆی ناچێت تێکوپێکی دەشکێنێ. دوای گرتنی کەرکوك ماڵی علی حسن مجید تاڵان دەکرا کابرایەك لەتراکتۆرو ئۆتومبیلەکەیدا جێ نامێنێ هیچیتری تێبکات دەست دەکات بەشکاندنی کەلوپەلی ماڵی علی حسن مجید, پێی دەڵێن لەتراکتۆرەکەتدا جێ نەماوە شتیتر بەریت ئەوانەی ماوە بۆ دەیانشکێنیت؟ لەوەڵامدا دەڵێت چونکە قینم لێیەتی.

## تێبینی:

ساڵی ١٩٥٨ دوای سەرکەوتنی شۆڕش، ئەم زاتە مەزنانە لەماڵی بەندە بوون بۆ نانخواردنی نیوەڕۆ، کاکە زیادئاغاو شێخ لەتیف شێخ مەحمود, مەسعود محەمەد, ئیبراهیم ئەحمەد, عبیداللە بارزانی, لوقمان بارزانیو شێخ صادق بارزانی, تەها بامەرنی[٥]. پرسیار لەکاك تەها بامەرنی کرا کەهۆی چیبوو پارێزگاریت لەخاوەن شکۆ نەکردو یەکسەر هێزەکەت بەتێکڕایی تەسلیم کرد؟ بەم جۆرە باسی هۆی تەسلیمکردنی هێزەکەی بەشۆڕشگێڕانی ١٤ تەموزی ١٩٥٨ کرد، گوتی:

لە ١٩٥٨/٧/١٢ ئاگاداریانکردم کەئامادەبیت چونکە خاوەن شکۆ فەیصەلی دوهەم لە١٩٥٨/٧/١٤ بەیانی تەشریفی سەفەر دەکات بۆ تورکیا. سەرلەبەیانی ١٩٥٨/٧/١٤ هەواڵمان بۆ هات کەجموجوڵێك لەناو شاری بەغدا هەیەو هێڵی تەلەفۆن بەگشتی پچڕاوە، چومە کۆشکی رەحاب کەسەردانی وصی عبدالالە بکەم لەسەر فرمانی خۆی، لەنهۆمی دووهەم هاتە خوارێ کراسێکی سپیو پانتۆڵێکی خاکیی لەبەردابوو، زەردەخەنەی دەهات،

---

[٥] تەها بامەڕنی (وطن حر وشعب سعید) فەرماندەی لیوای حەرەسی مەلەکی. لەبنەماڵەیەکی ناسراو، دەرچووی کۆلیژی سوپا، کوردێکی نیشتمانپەروەرن بەبیروباوەڕ نەتەوەیی. ئازا، زیرەك، بەپێی توانا خزمەتی زوری کوردی کرد، لەکۆبوونەوەیێکی جەماوەری لەبەغدا، لەکاتێکدا سەرۆکی هێزی گەل بوو، یەکەم قسەی گوتی: (وطن حر وشعب سعید).

لەو کاتەی گفتوگۆی لەگەڵ من دەکرد گاڵتەی دەهات. گوتی: تەها چەند کەسێك لەسوپا بەم گێرەشێوێنیە هەڵستاون، ژمارەیەکی زۆر کەمن، خۆت راگرە تاکو هێزی سوپامان لەدیوانیەوە دەگاتە ئێرە ئەو کاتە هەمویان دەستگیر دەکەین.

تەها گوتی: کاتێك دەرچووم بینیم ژمارەیەکی کەم سەرباز خۆیان بەزەویدا داوە بەرامبەر کۆشکی مەلیکی، ئەفسەرێك هاتە بەرامبەرم سڵاوی لێکردم یەکترمان دەناسی، باسی رێبازی شۆڕشەکەی بۆ کردم بەسەرۆکایەتی عەبدولکریم قاسمو گوتی کەدانراوم ئاگادارت بکەم. کاتی خۆی لەفەلەستین ئەو ئامر فەوج

*بوو منیش لەفەوجەکەی قاسم کارم دەکرد, پەیوەندی دۆستایەتیمان زۆر بەهێز بوو.*

*تەها گوتی: بڕیاری شەخصیم دا پاڵیان پێوە بدەم بەهەموو توانایەکەوە پشتگیرییان بکەم. ئینجا فەرمانم دەرکرد بۆ لیوای مەلیکی کەئێمە بەهیچ جۆرێك دژی ئەو برا سەربازانە ناوەستین. داوای تەقەمەنییان کرد چییان‌ویست بەزیادەوە تەسلیمم کردن.*

*یەکێك لەدانیشتوان پرسیاری لەکاك تەها بامەرنی کرد بۆچی مەلیك کوژرا؟ کاك تەها وەڵامی‌دایەوە ئێمە (لیوای گاردی کۆماری) بەهیچ جۆرێك تەقەمان نەکرد، ئەو هێزەی هاتبوو کەمەلیك‌و وصی بەدیل بگرێت ئەوانیش دوای ئەوەی هەڵوێستی من ئاشکرابوو، فەرمانی ئەوەیان پێ‌نەبوو تەقە بکەن. بەڵام وەکو زانیمان کوردێکی مەندەلی لەسەربانی کۆشکی رەحاب تەقەی لەسەربازەکان کرد, ئەوەبو لەهەموو لایەك دەستکرا بەتەقە، کۆژراوو زامدار هەبوو، مەلیك‌و وصی کوژران, هاوسەرەکەی وصی عبدالالە زامدارە کچی ئەمیر ربیعەی کوتە , هەروەها ئەفسەرێکی کوردیش زامدار کرا (مستەفا بانەیی).*

*تەها گوتی: رفعەت حاجی سری بەشی زۆری لەماڵی ئێمەبوو, من گلەییم لێکرد هۆی چی بو کەئاگادارت نەکردم, رفعەت لەوەڵامدا گوتی عەبدالکریم قاسم دەیگوت دڵنیام تەها لەگەڵ ئێمەیەو لەسەعاتی سفردا پشتگیرمان دەکات.*

بۆ پیرۆزبایی لەزەعیم دەربارەی ئەم سەرکەوتنە مەزنەی بەدەستی هێنا، لەهەموو شارۆچکەیەکی کوردستان چەند کەسێك بەنوێنەر هەڵبژێردرا لەگەڵ کوردی بەغدا ژمارەیان گەیشتە ٥٠٠ کەس, چوینە وەزارتی بەرگری، ئەمبەروئەوبەری شەقامی رەشید دەستیانکرد بەچەپڵە لێدان هاواریان دەکرد (بژی برایەتی کوردو عەرەب). کاتێك لەدەرگای سەرەکی وەزارەتی بەرگری چوینە ژورێ‌و گەیشتینە باڵەخانەکەو چوینە ناوەوە, زەعیم هاتە خوارێ ئەوەندەم سەرنجدایە وێنەکێش نیم هەرچەندە ٤١ساڵ بەسەر ئەم روداوە رۆیشتووە، بەناوی نوێنەرانی کوردستان پێشوازی لێکردین مامۆستای مەزن‌و تێکۆشەر ابراهیم احمد وتارێکی بەنرخی بەناوی گەلی کورد خوێندەوەو پیرۆزبایی لەزەعیم کرد, خۆشحاڵی کوردی پێڕاگەیاند کەگەلی عێراقی رزگار کرد لەستەم‌و زۆرداری‌و کۆنەپەرستی پادشایی بەتایبەتی گەلی کورد، هەروەها مامۆستا ابراهیم فەرموی کەئێمەش ئومێدەوارین شانبەشانی ئێوە مافمان پارێزراو بێ‌و من بەڵێنی گەلی کوردستانت پێڕادەگەیەنم کەئامادەین پشتگیری لەشۆڕشی ١٤ تەموز بکەین. زەعیم سوپاسی نوێنەرانی کوردستانی کردو بەڵێنیدا کەمافی میللەت بپارێزرێت بەتایبەتی گەلی کورد.

ئەم روداوەی ئەو رۆژە، یەکەم جاربوو لەمێژووی کوردا بەو ئاشکرایە نوێنەرانی کورد رووبکەنە وەزارەتی بەرگری، وشەکانی مامۆستا ابراهیم احمد زۆر بەنرخ بوو. شۆڕشی ١٤ تەموزی ١٩٥٨ بەهەزاران کتێب‌و نامیلکەو رۆژنامەو هۆنراوەی لەسەر بڵاوکراوەتەوە, گەلی کورد لەعیراق هاتە ناو ناوانەوە, یەکەم جاربوو دوای روخانی کۆماری مهاباد بەم شێوەیە باسی کورد لەلایەن جیهانەوە ببیسترێت. عقید ماجد محمد امین

چەند وتەیەکی بەنرخی فەرموو گوتی کوردو عەرەب هاوبەشن لەم نیشتیمانەدا, ئەم وتەیە هۆکارێ بوو بۆ خۆشیو شادی خستنە ناو دڵی هەموو کوردێکەوە لەسەرانسەری کوردستاندا, وا بیر دەکرایەوە کەمەسەلەی کورد چۆتە کۆڕوکۆمەڵی نێودەوڵەتییەوە.

لەدوای شۆڕشی ١٤ تەموز گۆڕانکارییەکی سیاسی بەسەر بارودۆخی خۆمدا هاتماڵم بوو بەبارەگایەکی ئاشکراو جێی کۆبونەوە, لەسەرەتای شۆڕشدا، دانیشتوانی گەڕەك وایاندەزانی مۆری کوردایەتی لای منە. لەو گەڕەکەی لێی بووم لەساڵی ١٩٥٦ پێنج خێزانی کوردبوین بەماڵی عبیداللەوە، ئێوارانی پێنجشەمە دەچوینە پشت (سەدە) بەیەکەوە کاتمان دەبردەسەر، بەڵام دوای وتەکەی ماجد محمدامینو زەعیم کەبڵاوکرایەوە کوردو عەرەب هاوبەشن لەم نیشتیمانەدا, لەو ٨٦ ماڵەی لەگەڕەکدا بوون ٤٢ یان هاتنەلام دەیانگوت ئێمە رەچەڵەکمان کوردە بەڵام ماوەی ١٥٠–٢٠٠ ساڵێك دەبێت هاتۆینەتە بەغداد.

رۆژێکیان لەخزمەت جەنابی کاك حسینی سید احمدی خانەقا(٦) بووم جەنابی کاك حاکم عبداللە سعید کەسەرۆکی دادگای کەرکوك بوو بەسەر قسەکاندا هات. عبداللە سعید فەرموی ئێمە چوار قوتابی بوین لەقۆناغی یەکەمی کۆلێژی یاسا, رۆژێکیان مامۆستایەکی ئینگلیز هاتە سەرمان گوتی: حکومەتی (تاجی بریطانی) داوای لەحکومەتی عیراق کردووە کەحوکمی زاتی بدەن بەکورد, وابزانم لەناو ئێوەدا چەند کوردێك هەیەو لەکاتی دانپێانانی ئەم بڕیارە پێویستتان بەخوێندەوارێکی زۆر دەبێت تاکو دامەزرێن بەباشکاتبو مدیری ناحیەو قائمقام, هەر قسەکەی تەواو کرد ٥٥٪ی قوتابیەکان هەڵسانە سەرپێ گوتیان ئێمە کوردین, بەکورد دەرچوون لەکاتێکدا پێش ئەم قسەیە چوارمان کورد بوین (عارف جیاوكو معروف جیاروكو عبداللە سعیدو من...)

کاك حسن گوتی: کوڕم رەفیق لە٣٥٪ی دانیشتوانی عێراق کوردن بەڵام لەیەکەم رۆژی دامەزراندنی عێراقەوە ئەگەر بتگوتایە کوردم توشی زیانێکی گەورە دەبویت, ئەوانەی دەڵێن ئێمە تورکمانین ٩٠٪یان بەرەچەڵەك کوردن، بەڵام لەبەر بەرژەوەندیی خۆیان, خۆیان دەکەن بەعەرەب یان تورکمان، مادام کورد کیانی سیاسی نی یە رۆژ بەرۆژ لەکەمی دەدات، لەهەمانکاتدا رۆژ لەدوای رۆژ بیروباوەڕی نەتەوایەتی روو لەزیادی دەکات.

باس لەگەڕانەوەی بارزانیو دەستو دایرەکەی دەکرا بەڵام زۆری پێچوو هەر بەقسە دەمانبیستو لەبەر زۆر هۆ هاتنەوەکەی دوادەخرا, چونکە عەرەبە شوفێنیەکان بەئاشکرا نیشانیان دەدا کەگەڕانەوە مەترسیدارە حکومەتی تورکیاش بەئاشکرا ناڕەزایی خۆی دەربڕیبوو بەرامبەر گەڕانەوەی, لەهەمانکاتدا هەلومەرجی ئەو رۆژە زور پێویستی بەشخصی بارزانی بوو لەگۆڕەپانەکەدا, زەعیم لەدواییدا بڕیاری گەڕانەوەی بۆ دەرکرد ئەوە بوو مامۆستا ابراهیم احمد, کاك نوری احمد تەها، شێخ صادق، عبیداللە سەفەریان کرد بۆ رۆمانیا بەو نیازەی پێشوازی لێبکەنو لەگەڵی بگەڕێنەوە بۆ عێراق.

مستەفا بارزانی ساڵی ١٩٥٩ گەڕایەوە، یەکەم جار لەمیوانخانەی خەیام دابەزی, چەند ساڵ بوو بیرم لەوە دەکردەوە تۆ بڵێی رۆژێك بێت چاوم بەم زاتە گەورەیە بکەوێت! زۆری

---

(٦) خوێنەری بەڕێز ئاگاداردەکەمەوە کورتەباسێکم لەسەر بنەماڵەی سەید ئەحمەدی خانەقا، لەکۆتایی ئەم کتێبەدا نوسیوە.

پێنەچوو خەوەکە بوو بەڕاستو بەرامبەر سەرۆکی گەلو نیشتمان راوەستام دستم خستە ناو دەستە پیرۆزەکانی، هەزار جار سوپاسی خودام کرد کەنەمردم رووبەڕوو چاوم پێکەوت, بەجۆرێك دڵشاد بووم زمانم نەبوو کەبڵێم من کێم. جەنابی شێخ صادق بارزانی هاتە بەردەمی بارزانی گوتی: ئەمە رەفیق پشدەرییە کەبۆمان باسکردبویت. بارزانی زۆر بەگەرمی بەخێر هاتنی کردمو فەرموی دانیشە، لەخۆشیان قسەم بۆ نەدەکرا, دوای ماوەیەك هەستام بڕۆم فەرموی دانیشە, رویکردە صابری کوڕی, گوتی: کاتی پشوودانی تۆ هاتوەو بڕۆە بخەوە, منیش هەڵسام بەرەوماڵەوە بڕوم, بارزانی فەرموی مەڕو لەگەڵ ئێمە نان بخۆ، باشم لەبیرە بارزانیو دوانزە کەسیتر بەیەکەوە نانمان خوارد, لەوانەی لەبیرمە بابەعلی، ابراهیم ئەحمەد، مام جەلال، حاکم جەوهەر دزەیی، بکرئاغای حەویزی, نوری احمد تەها, وحید بامەڕنی، علی عزیز، تەها بامەڕنی، صالح میرانو شێخ صادق, بەشێکی تریش بەجیا نانیان دەخوارد. لەخوشییان نەمدەزانی چۆن خواردنەکە بخۆم هەر تەماشای ئەم شوڕشگێڕەم دەکرد, کاك جەوهەر دزەیی خوێو بەهاراتی کردە ناو شورباکەوە. بارزانی گوتی: دەتۆ جارێ کەوچکێکی لێ بخۆ, بۆ ئەوەی بزانی بێ خوێیە یان نا ئینجا خوێی تێ بکە. بەچاو تەماشام دەکرد بەگوێ گوێم دەگرت بزانم چ دەفرموێت. شەو دەرنگ داهات خواحافیزیم لێکردن, شێخ صادق گوتی بەیانی تۆزێك زوو وەرە کارمان دەبێ.

گەڕامەوە ماڵەوە بەدورودرێژی بۆ دایکمو هاوسەرەکەم گێڕایەوە. دایکم گوتی: کوڕم ئەمە ئاشکرایە عبیداللەو شێخ صادق باسی تۆیان بۆ کردوە کەچیت بۆ کردون بۆیە بەم جۆرە پێشوازی لێکردویت. بۆ بەیانی چومە خزمەتی, لەبەر بچوکی میوانخانەکەو نەبوونی باخچەو گۆڕەپان گواستمانەوە بۆ میوانخانەی سمیرامیس لە(سنك)، لەگەڵ کاك میرحاج کەلوپەلو جانتاکانی بارزانیمان گواستەوە. بارزانی سەردانی زەعیم قاسمی کرد بەگەرمی پێشوازییان لێکرد لەهەمو رۆژنامەو گۆڤارو ئێزگەیەکدا وتەکەی بارزانی بڵاوکرایەوە کەفەرموی من (سەربازێکی زەعیم)م, لەهەموو وتوێژێکیدا هەمیشە ئەمەی لەسەر زمان بوو. بەڵام بەگشتی جەماوەری کورد ئەوەی لاپەسەند نەبو کەچۆن دەبێت بارزانی ئەم دەستەواژەیە بەکاربهێنێت (من سەربازم).

لەسەرەتاوە ئەوپەڕی متمانەو دۆستایەتی دروست بوو لەنێوان بارزانیو عبدالکریم قاسم. بەشی زۆری رۆژگار لەخزمەتی بارزانیدا بووم، کاروباری تایبەتی پێ دەسپاردم. رۆژێك لەگەڵ دایکمو هاوسەرەکەم چوینە

خزمەتی, بارزانی فەرموی: دایکی رەفیق زۆر خزمەتی منالّی ئێمەتان کردوە, زۆریان بۆ باسکردوم, ئەمەم لەبیرناچێتەوە. دایکم وەلاّمی دایەوە: گەورەم بارزانی حەزدەکەم نانێکمان لەگەڵ بخۆیت. بارزانی فەرموی رۆژێك دێم, لەپر رۆژێك هات ئەو رۆژەی کەهات چێشتی ساوەرمان هەبو.

دوای ئەوەی ماوەی ٤٥ رۆژ لەمیوانخانەی سمیرامیس بوو فەرموی لەگەڵ خاوەنەکەی حساب بکە، هەموی گەیشتە ١٤٧٠دینار لەگەڵ حسابی قەدری جان کەشاعیرێکی کوردی ناسراوی سوریا بوو.

بارزانی فەرموی وەرە حساب بکەین, دوای ئەوەی مەسرەفی ئەو ماوەیەی مابووەوە بۆم دەرکرد لەو پارەیەی کەوەزارەتی دارایی بویان ناردبوو کە ٥٠٠٠ دیناری عێراقی بوو تەنها ٥٣٠ دیناری پێ مابوو. لە دوای ئەم حسابە هەندێك پارەی تری هەبوو دایمێ فەرموی ئەم پارانەم بۆ بگۆڕەوە بەدیناری عێراقی، چوومە لای ئەوانەی پارە دەگۆڕنەوە وەکو خۆی بۆم هێنایەوە گوتم ئەم تمەنانە کاتی بەسەرچووە هی زەمانی شایەو ئێستا نایگۆڕنەوە. فەرموی با جانتاکان بگوازینەوە، نانی نیوەڕوش لێرە ناخۆین هەر چەندە پارەشمان داوە چونکە ئەگەر لێرە بمێنینەوە دەبێ ئەو پارەیەی پێمان ماوە ئەویش بدەینە خاوەنی میوانخانەکە. گواستمانەوە بۆ خانوی خوالێخۆشبو نوری سعید بەرامبەر ئیستگە لەگەڕەکی صالحیە, خانویەکی چوڵوهۆل بوو هیچی تیانەبوو, یەکسەر دەستمانکرد بەشت کڕین لەگەڵ زەعیم علی برای شەهید عزت عزیز, هەندێك شتمان کڕی بەشی زۆری بەدیاری هات، ئەو کاتە بەپێچەوانەی ئێستا بوو (حزب فقیر بوو میللەت دەوڵەمەند بوو). بەم شێوەیە بارزانی باوەڕی بەمن هەبو, بەپاساوانە بارزانییەکانی ڕاگەیاندبوو رەفیق بۆی هەیە هەمو کات بێتە لام بێ پرس.

پیاوێکی ئاسوری هەبوو بارزانی خۆشدەویست, لای برا ئاسورییەکان بەپیاوێکی راستگۆو کەسایەتییەکی زیرەك‌و قسەزان‌و دڵسوز ناسراو بوو, هەروەها لەلای بارزانیش رێزیکی تایبەتی هەبوو تەنانەت ئەو پیاوە یەکەمین کەس بوو لەدوای گەڕانەوەی بۆ بەغدا سەردانیکردو یەکەمین کەس بوو کەبارزانی قبوڵی کرد کەماڵەکەی دەعوەت بێت، ئەم پیاوە مەترانی حریر بوو, ناوی ماریوسف حنا ئیشۆ بوو.

جاریکیان بەفەرمانی بارزانی لەگەڵ مەترانی حریردا چوینە وەزراتی بەرگری چاومان بە(عقید وصفی طاهر) کەوت کەسکرتێری زەعیم بوو, ئاگادارمکرد کەبارزانی رایسپاردووم جەنابی مەتران دەیەوێت لەگەڵ زەعیم کۆببێتەوە بۆ ئەوەی زەعیم رێگاچارەیەك بۆ کێشەی ئاسورییەکان بدۆزێتەوە. کاتێك عقید وصفی طاهر هاتە دەرەوە لەلای زەعیم ئیشارەتێکی بۆ من کرد چومە پێشەوە بۆ لای گوتی: زەعیم دەیەوێت بەتەنها چاوی بەتۆ بکەوێت, ئەمە دووهەم جارە بەرامبەر ئەم شۆڕشگێڕە راوەستم, قسەم بۆ نەدەکرا، لەخۆشییاندا وام بیردەکردەوە کەگەلی عێراق هەمووی دەبێت دوعا بۆ ئەم پیاوە مەزنە بکەن.

زەعیم فەرموی: سلاّوم بگەیەنە بەبارزانی, رێزم هەیە بۆی, مرۆڤێکی نیشتمانپەروەرە, ژیانی خۆی بەختکردوە لەپێناوی گەلی کورددا، هەمو لایەکمان ماڵوێرانی دەستی ئیستعمارین بەکوردو عەرەبەوە. ئێستا

مستەفا بارزانی دیەوێ گەڕەکی دۆرە بکاتە بنکەیەکی ئینگلیز تا لەکاتی پێویست ئابلوقەی بەغدا بدەن واللە هەتاکو لەسەر ئەم مێزەبم ئەم بریارە نادەم.

کە لەخزمەتی زەعیم هاتمە دەرێ ئاگاداری جەنابی مەترانی حریرم کرد کەزەعیم لەم بارەیەوە گفتوگۆ لەگەڵ شخصی بارزانی دەکات, لەبەرچاوی جەنابی مەتران بەهەمان شێوە بۆ بارزانیم باسکرد. بەڵام دوای رۆیشتنی دووبەدوو بەدورودرێژی دەقی قسەکانی زەعیمم بۆ جەنابی بارزانی گێرایەوە, کەزەعیم رای چەند خراپە بەرامبەر برا ئاسوریەکان. بارزانی فەرموی رەفیق شارەزاییت پەیداکردوە, بەڵام من زۆر قەرزداری برا ئاسورییەکانم، هەرچییان بۆ بکەم کەمە, زەعیم کەیفی خۆیەتی چۆن تەماشای مەسەلەکە دەکات, ئایا ئەمەی کورد چ تاوانێکە بەرژەوەندی خۆمان هەبێت؟ بەداخەوە زەعیم ئێستا لەخەوە دورودرێژەکەدایەو دانیشتوانی دۆرە لە٨٥٪ برا ئاسوریەکان ئەویش بەعقلێکی تەسکەوە دەیڕوانیە مەسەلەی جێگیربونی ئاسوریەکان لەدۆرە لەبەغدا.

لەهۆڵی مەلیك فیصل لەباب المعظم لەساڵی ١٩٥٩ بەبۆنەی گەڕانەوەی جەنابی بارزانی بۆ نیشتمان ئاهەنگێك سازکرا بەناوی قوتابیانی کورد. ئەمە یەکەم جارە پارتێکی سیاسی کورد بەم شێوە ئاشکرایە ئاهەنگێك ساز بکاتو بۆ یەکەم جاریشە بەم شێوەیە حکومەتی مرکزی بەغدا شانبەشانی شۆڕشگێڕانی کورد بەشداربێت. رۆژیك پێش دەست پێکردنی ئاهەنگەکە ئەوانەی بەشداربوون هەر یەکە جێگای خۆی بۆ دیاریکرا نزیکەی ٤٠ قوتابی لەقوتابیەکانی زانکۆ دانرابوون بۆ خزمەتکردن لەئاهەنگەکەدا کە٢٠ لەوانە کیژ بوون, بەندەی بچوکتان مەسئولی تەشریفاتو رێکخستنو دابەشکردنی خواردن بووم لەگەڵ ئەو ٤٠ قوتابییەدا, هەروەها ئەندامانی سەرکردایەتیش هەریەکە بەئیشێك هەڵدەستا.

ژمارەی میوانەکان لە٧٠٠ کەس زیاتر بوون, لەوانە نوێنەری تایبەتی زەعیمو حزبی شیوعیو حزبی نیشتمانی دیموکراسی (کامل چادرچی)و ئەندامانی دادگای شۆرش, ئەم بەڕێزانە جەنابی مهداویو کاك فەتاح شاڵی, دڵسۆزی کورد ماجد امینو باڵیۆزی دەولەتە ئیشتراکیەکان, حکومەتە عەرەبەکانو سیاسەتمدارانی کوردو عەرەبو شاعیری بەناوبانگی عێراقو دۆستی کورد محەمەد مهدی جواهری. بەهۆی گۆرانیو هەڵپەرکێو دەنگی دەهۆڵو زورنا هۆڵەکەش کەوتە خۆشیو شادی میوانەکان هەریەکە لەراست خۆیەوە سەرنجی راکێشام کەئەم پرۆگرامە بەم شێوە رێکوپێکە پێشکەش دەکرێت ئەم کیژە جوانانە بەجلوبەرگی رەسەنی کوردی سورو زەردو سەوزی پەزیرایی دەکەن لەدابەشکردنی خواردنو خواردنەوی بیبسی وەرگێرانی کوردی بۆ عەرەبی و ئینگلیزی. شاعیری بەناوبانگی کورد مامۆستا هەژار هاتە سەر شانۆ شعرێکی ئامادەکردبوو کەئەویش ئەوە نەبوو کەخستبویە بەرچاوی لیژنەی لێپرساو، کاتێك لەسەر شانۆ دەستی درێژ کرد بۆ جەنابی بارزانی ئەی سەرۆکی کوردو کوردستان, ئەی مەلیکی کوردستان چاوەڕوانی بەڕیزتانین کەکوردستان رزگار بکرێت, ماوەی دە دەقیقە چەپڵەی بوە لێدرا. جەنابی بارزانی گرژبوو،

لەشیعرەکەی مامۆستا هەژار زۆر نارەحەت بوو وەلامی‌دایەوە روونیکردەوە کەئەمە بۆچونی من نییە، یەك زەعیم هەیە ئەویش عبدالکریم قاسم، من سەربازێکی عەبدلکریمم، سەربازێکی شۆڕشی ١٤ی تەموزم خۆم بەخت دەکەم لەپێناویدا. کاتێك کەچوومە خزمەتی بارزانی زۆر کرژ بووە بەرامبەر ئەمە یەکەم جاربوو بەم شێوەیە بەگرژی لەگەلم بدوێت، هەڕەشەیەکی زۆریشی لەمام جەلالو مامۆستا هەژار کرد.

چاوم بەمامۆستا هەژار کەوت بۆم باسکرد بارزانی هەڕەشەی لێدەکات، لەسەر شیعرەکەی. چوومە خزمەتی مام جلال لەمیوانخانەی (تروکادیرو) بوو بۆم باسکرد کەبارزانی چەند گرژەو توڕەیە فەرمویەتی هەموی جەلال تاوانبارە.

بارزانی فەرموی ئەم نامەیە تەسلیم بەباباعەلی شێخ محمود حفید بکە،ولامەکەش بهێنەرەوە. ئەمە یەکەم جاربوو بەخزمەت ئەم پیاوە مەزنە بگەم، چەند پرسیارێکی لێکردم تۆ کێیت، خەلکی چ شوێنێکی، ئیشوکارت چیە، چۆن بارزانی بەم شێوەیە باوەڕی پێتە، لەقسەکانی باش تێگەیشتم کەنامەکە زۆر گرنگ بوە، وەلامەکەشم بۆ بارزانی هێنایەوە.

ڕۆژگار بەخۆشیو ئارامی بەسەر دەچوو، لەنێوان بارزانیو زەعیمدا هیچ جۆرە گرژیەك نەبوو کەشایانی باسکردن بێت، جەنابی بارزانی ئیشوکاری زۆر بەباشی بەڕێوە دەچوو، ئەو نامانەی بۆ عبدالباقی کاظم بەڕێوەبەری گشتی پولیسی بەغدای دەنارد کەهەمو کارەکانی بارزانی لەڕێگای ئەم پیاوە جێبەجێ دەکرا بەفەرمانی زەعیم بۆیە ئاگاداری ئەمە بووم چونکە زۆربەی کات من نامەکانی بارزانیم دەبرد بۆ عقید عبدالباقی کەبۆی جێبەجێ بکات.

دوای روخانی کۆماری مهاباد یەکەم جاربوو لەپارچەیەك لەپارچەکانی کوردستان بەم شێوەیە ڕێکخراوێکی سیاسی کورد بەئازادی هەبێت بەناوی پارتی دیموکراتی کوردستان بەسەرۆکایەتی مستەفا بارزانی، دەرچونی رۆژنامەی خەبات بەسەرپەرشتی مامۆستا ابراهیم احمد روداوێکی زۆر گرنگ بوو، بابەتەکانی روونو ئاشکرابوو، لەبارودۆخی ئەو کاتەی کوردی دەکۆلیەوەو شانازی پێوە دەکرا. هەلکردنی مەشخەلی ئازادی لەسەرانسەری کوردستان، نەمانی ترس لەسەر جەماوەری کورد کەئازارو ئەشکەنجە بدرێت، هۆیەك بوو کەسیاسەتو پەیڕەوو پرۆگرامی خۆی رۆژانە لەرۆژنامەی خەباتدا بلاوبکاتەوە، گەلی کورد بەتێکڕا هەریەکە لەڕاست خۆیەوە کەوتبوە جموجولَ رووەو بارەگاکانی ڕێخکراوی پارتی دەرۆیشت، کادرانی پارتی لەسەرانسەری ولات کاروباریان بەڕێوە دەبرد، شەوو رۆژ لەتێکۆشاندابوون، لێپرسراوانیان راستەوخۆ پەیوەندی رۆژانەیان بەجەماوەرەوە هەبوو، دەرگای مالو بارەگاکانیان لەسەر پشت بوو تا داواکارییەکانیان جێبەجێ بکەن، بارزانی زیاتر لە١٨ سەعاتی لەشەوو رۆژێکدا تەرخان کردبوو لەپێناوی ولاتدا، سەرنجی دانیشتوانی عێراقی بەگشتی راکێشابوو بۆ لای خۆی، بەهەزارەها عەگالَ بەسەرو دشداشە لەبەرو جامانە بەسەر رووی لەڕێکخراوەکانی پارتی دەکردو دەیانگوت: (باوباپیرانمان کورد بوون بەلام

لەساڵانێکی زووەوە هاتونەتە باشورو ناوەڕاست جێگیربوون) لەمەوە بۆم دەرکەوت کەوتەکانی کاکە حسێنی خانەقاو حاکم عبدالله سعید زۆر ڕاست بوون کەدەیانفەرموو: (ئەگەر کورد ئازارو ئەشکەنجە نەدرێت ئەوا ٣٥٪ ی عێراق کوردە).

لە نێوان پارتیو حزبی شیوعیدا گرژییەك پەیدابوو کەجاربەجار سەری دەکێشا بۆ کوشتنوبڕین لەنێوانیانداو کێشەکانیان تا دەهات بەرەو خراپی دەڕۆیشت لەسەر ململانێی حزبیو نەتەوایەتی, لەبەر ئەوەی لەسەرەتاوە رای حزبی شیوعی دەربارەی مافی نەتەوایەتی کورد ئەوەبو دوژمنانی کۆمارەکەمان زۆر بەدەسەلاتن, بەلام رۆژانە لەرۆژنامەکەیاندا لاپەڕەیەك یان دوو لاپەرەیان لەسەر مافەکانی کورد بلاودەکردەوە.

لەهەمانکاتدا لەناو رێکخراوی پارتیش کێشە دروست ببوو, ئەوە بوو مامۆستا همزە عبدالله کەسکرتێری پارتی بوو دور خرایەوە, مامۆستا ابراهیم کرا بەسکرتێری پارتی لەکاتێکدا مامۆستا همزە عبدالله دامەزرێنەری (پ.د.ك) بوو بەلام خۆی هەڵنەستا بەسەرۆکایەتی حزبەکەو مەلامستەفای دانا بەسەرۆکی (پ.د.ك)، بۆیە لەنامەیەکدا کە لەساڵانی شەستەکاندا همزە عبداللە ئاراستەی بارزانی دەکا پێی دەڵێت: (چۆن بەنامەیەك تۆم کردە سەرۆك بەنامەیەکیش دەتهێنمە خوارەوە).

## دوژمنانی شۆڕش

لەیەکەم ڕۆژی شۆڕشەکەمان (شۆڕشی کوردوعەرەب) دوژمنان چ لەدەرەوە چ لەناوەوە بەئاشکراو نهێنی تەکتیكو پیلانو نەخشەیان بەردەوام بوو بۆ تێکدانی شۆڕشەکە لەهەموو رویەکەوە, عەرەبە شۆفێنیەکانو تورانیەکانو کۆنەپەرستەکان لەکوردو عەرەب بەئاشکرا هەوڵێکی زۆریاندا بارزانی نەگەڕێتەوە, سەفیری تورکی لەبەغدا رووبەڕوو بەمامۆستا صدیق شەنشەل وەزیری ١٤ تەموزی گوت: ئێمە رازی نین کەبارزانی بگەڕێتەوە چونکە گەڕانەوەی مەترسییەکی گەورە دروست دەکات بۆ کۆماری تورکیاو ئێوەی کۆماری عێراق. لەسەردانێکدا بۆلای صدیق شنشل کە بەندەو کاك عبیداللە بارزانی بوین، بۆی گێڕاینەوە کە لەوەلامیدا بۆ سەفیری تورکیا فەرمویەتی: بەنیسبەت کۆماری عێراقەوە ئەوە کێشەیەکی ناوخۆیەو ئێوە بۆتان نیە باسی لێوەبکەن.

جەنابی عمر عەلی کەئەفسەرێکی ناسراوە, پلەیەکی بەرزی هەبوو لەسوپای عیراقیدا ئەویش دەچێتە لای زەعیم پێی رادەگەیەنێ مەلامستەفا بارزانی دوارۆژ مەترسیەکی گەورەیە بۆ عێراق, بەهاتنەوەی زۆری پێناچێت شەڕ دروست دەبێتەوە, هەروەها دوو سەرۆك هۆزی ناسراویش بۆ ئەم مەبەستە چاویان بەزەعیم دەکەوێت.

رۆژ بەڕۆژ بارودۆخی کورد بەرەو باشتر دەرۆیشت, دوارۆژی روو لەڕووناکی بوو بەلام لەهەموو رویەکەوە ساوابو, شخصیەتی بارزانی بەرزتربو بەرامبەر بەدۆستو دوژمن. جارێکیان مەلامستەفا چوو بۆ سەردانی

شێخ احمد بارزانی, کەگەڕایەوە فەرموی پانزە ساڵ پێش ئێستا سەرشاخی بەرز کەوتبووم, ئێستا توانیم بەهەمان شاخدا سەرکەومەوە. لێرەوە شکم پەیداکردو گوتم: جەنابی بارزانی دەڵێی نیازێکت هەیە.

یاسای چارەسەرکردنی کشتوکاڵ لە٣٠ی ئەیلولی ١٩٥٨ ئەم بڕیارە مێژووییە گەورەترین هەنگاوبوو زەعیم عەبدولکریم قاسم پێی هەڵسا, کەبووە هۆی ئەوەی جوتیاران ببن بەپاڵپشتی ئەم ئەزمونە. بەڵام کەموکوڕییەکی یەکجار زۆر لەناوەرۆکی یاسای چارەسەرکردنی کشتوکاڵدا هەبوو کەبوو بەمایەی تەنگوچەڵەمە لەنێوان ئاغاو خاوەن زەویو جوتیاراندا, ئەوەبوو هەرچەندە بەشی زۆری ئاغاو شێخەکان بوون بەدوژمنی کۆماری ١٤ تەموزو چەکیان رووبەڕوی هەڵگرتو بەشێکیان چوونە ئێران, هەتا باس لەم یاسایە بکرایە ئەوان زیاتر گرژ دەبوون, لەهەمانکاتدا لەیەکەم ڕۆژی ١٤ی تەموزی ١٩٥٨ گەورەترین خاوەن زەوی لەعێراق بەتایبەت لەکوردستان انور جمیل بگ جاف کەخاونی ٧٦,٠٠٠دۆنم بوو, زەوییەکانی پێشکەشی شۆڕشی ١٤ی تەموزی کرد, هەروەها شەوکەت بگ جاف ٧٠,٠٠٠هەزار دۆنمی پێشکەش شۆڕش کرد. بەڵام بەشێك لەئاغاو بەگزادەو شێخو خاوەن زەویەکان لەگەڵ چەند کەسێك روویانکردە حکومەتی شای ئێران, کەدەستی هەرەگەورەی هەبوو لەیەکەم ڕۆژەوە کەکونێك لەشۆڕشی ١٤ی تەموز بدۆزێتەوە تاکو بتوانێت لەوێوە بچێتە ژورەوە, هەروەها سوریاو کوێتیش بەشداربوون لەگەڵیاندا.

**تێبینی**

*بەو نیازەی چاپخانەیەك بهێنم لەئەمریکا, سەردانی بەشی بازرگانی باڵوێزخانەی ئەمریکیم کرد لەبەغدا, بۆ ئەم مەبەستە لەڕێگای گۆڤارێکی ئەمریکی بازرگانییەوە بەلاوکراوەیەکم بڵاوکردەوە کەدەمەوێت چاپخانەیەك بکرم, بەڵام پاش ماوەیەك وێنەی زیاتر لە٥٠٠ چاپخانەم بەنمونە بۆ هاتەوە منیش چوار جار هاتوچۆی بەشی بازرگانیم کرد لەباڵوێزخانەی ئەمریکی لەبەغدا, لەم هاتوچویانەدا منیان هێنایە گفتوگۆ, یەکسەر چومە خزمەتی بارزانی ئاگادارمکردو بۆم گێڕایەوە کە بەکورتیەکەی پییان گوتم بۆچی شۆڕش ناکەنو داوای سەربەخۆیی خۆتان ناکەن؟ لەوەڵامدا بارزانی فەرموی ئیتر هیچیتر هاتوچۆیان مەکە.*

چەندجار جەنابی بارزانی دەیفەرموو زۆرم باوەڕپێتەو ئیشوکارت زۆر پێدەکەمو بومەتە مایەی ناڕەحەتی بۆ تۆ لەئیشوکارم کردویت. من دەمگوت: گەورەم من قەرزای بەڕێزتانم, خەڵکێکی زۆرم ناسی لەکوردو عەرەب بەهۆی جەنابتانەوە, بۆ نمونە ئەگەر بەڕێزتان نەبێت (زایستف) باڵیۆزی روسی کارتی میواندارییم بۆ نانێرێت, دوو جار شخصی زەعیمم دیوە, لەپەنا بەڕێزتان فێری سیاسەت بووم, من بەجلوبەرگو نانی خۆم خزمەتم دەکردن, ئینجا لەسەر ئەوەشەوە بەندە خزمتکاری کوردو کورستان دەمگوت سوپاس.

## ڕووداوەکانی دژە شۆڕش

١. مانگرتنی شەواف‌و گرتنی موسڵ, ساڵی ١٩٦٠ پوچەڵکرایەوە.

٢. ڕووداوی کەرکوك, ساڵی ١٩٦٠ کوردیان تێوەگلاند.

٣. هەوڵدان بۆ تیرورکردنی زەعیم ساڵی ١٩٦٠.

## بۆچوونی زەعیم

لەسەرەوە چەند خاڵێکم بەکورتی نوسیوە, زەعیم‌وەکو تەبیعەتی ئادەمیزاد غرورێك چووەوە جەستەی‌و خۆی بەهێزێکی پۆلایین دەزانی بێ ئەوەی هەموو باروودۆخێکی ئەو ڕۆژە هەڵسەنگێنێ حسابی بۆ هیچ گروپێکی سیاسی نەدەکرد. زەعیم سیاسەتی گۆڕی بەرامبەر نیشتمانپەروەران‌و بەهێزی ئازادی دەگوت: گێرەشێوێنەکان (مخربین), زۆر لەکادرانی حزبی شیوعی لەموسڵ‌و کەرکوك‌و بەغدا گیران, کوردیش بەرکەوت لەوانە زۆریان ئەندامی پارتی بوون بەبیانوی ئەوەی ئەمانە دژی دیموکراتی‌و دژی گەلن.

لەگەڵ ئەوەشدا کەئینگلیز‌و ئەمریکاو ئێران‌و تورکیاو سوریاو کوێت‌و میسر هەریەکە لەلایەن خۆیەوە کاری بۆ ڕوخانی ئەم ئەزمونە‌و تێکدانی نێوان زەعیم‌و بارزانی دەکرد, توانییان بەناوی دژی (یاسای چاکردنی کشتوکاڵ)ەوە بوشایی دروست بکەن وردەوردە بچنە نێوان زەعیم‌و بارزانیەوە، لەهەمووی گرنگتر ئەوەبوو خیانەت کەوتە ناو پیاوەکانی زەعیم‌و دەستێکی باڵایان هەبوو لەتێکدانی نێوان زەعیم‌و بارزانیدا, بەتایبەتی شخصی کمال عوسمان ئاغا ئەم زاتە نامبارکە کەدەورێکی زۆر خراپ‌و خیانەتکارانەی هەبوو.

—بارزانی کتوپڕ بەغدای بەجێهێشت گرژی بەرەو زیادی دەرۆیشت.

—سەرۆك هوزەکانی کورد کەوتنە جموجوڵ بۆ گۆڕینی یاسای چاککردنی کشتوکاڵ.

—کوشتنی احمد زێباری لەموصل بەدەست چەند بارزانیەك, لەوانە مەلکۆ بارزانی.

—کوشتنی صدیق میرانی شەقلاوە بەدەستی محمود کاوانی, فەرمانی گرتنی مامۆستا ابراهیم احمد دەرچو, دەستکرا بەگرتنی ئەندامانی پارتی, لەوانە کاکی کاکان عمر دبابە.

## بۆچوونی بارزانی‌و هەڵەکانی

١—بارزانی دەستێکی باڵای هەبو لەجموجوڵی سەرۆك هۆزەکان, وای دەزانی زەعیم لاوازەو دەنێرێت بەشوێنیدا دەڵێ وەرە مەلامستەفا ئەم باروودخە چاکە.

٢— لەکاتێکداوایان تێگەیاندبوو کەزەعیم ئابلۆقە دراوە لەدەرەوەوناوەوە زۆر لاوازە داواکارییەکانی جێبەجێ دەکات, بەداخەوە حسابەکانی هەموی هەڵەبوو.

٣—هەرچەندە زەعیم بەتەواوی ئاگاداری پیلان‌و تاکتیکی بارزانی بوو بەڵام بەهیچ جۆرێك بایەخی پێنەدا پشتی تێکرد.

٤—بارزانی لەخۆی بایی بوو, لەهەموو رویەکەوە هەڵەبوو,وایدەزانی زەعیم لاوازە بەناچاری داواکاریەکانی

جێبەجێ دەکاتو هەمو ئەو حکومەتو گروپە سیاسیانەی دژ بەزەعیمن پشتیوانی لێدەکەن, بەڕاستی خەڵکێکی زۆر پرسیاریان لەهۆکاری تێکدانی نێوان زەعیمو بارزانی دەکرد کەس نەبوو وەڵامی بداتەوە هەتا کۆچی کرد. هۆکاری تێکدانی لەگەڵ زەعیمدا ڕەفتارێکی نادیاربوو، ئایا پێیان کرد یا پێوەبوو بەقسەی ئەو حەوت سەرۆك هۆزەی کەچووبونە لای لەبەر خاتری چەند بستێك زەوی ئەم کێشەیەیان دروستکرد, لەکاتێکدا بەبێ ئەوەی هیچ پیلانێکی داڕێژراوی هەبووبێت لەپێش ئەوەی ئەم هەڵوێستە گەورەیە بگرێت بەرامبەر زەعیم.

## بارزانی نوسراوێکی ئاراستەی زەعیم کرد

جەنابی کاك عبیداللە بارزانی ئاگاداریکردم کەمەلامستەفا نوسراوێکی ئاڕاستەی زەعیم کردووە, بەیەکەوە سەرمان بەزۆر کوندا کرد کەس نەیتوانی ئەم نامەیە بگەیەنێ. ئینزباتێکی کوردی دڵسوزو نیشتمانپەروەر ناوی (٠٠) بوو (ئێستاش ماوە) پاسەوانی تایبەتی زەعیم بوو یارمەتیدایین کەئەو نامەیە بگەیەنینە زەعیم، بڕیارماندا کەبەرامبەر ماڵەکەی رابوەستین لەبەتاوین پێش گەڕانەوەی, بۆ ئەوەی کەگەڕایەوە چاوی پێمان بکەوێت, ئەوەبوو کاتێك هاتەوە ئێمەی بینی ئینزباتێك هات بانگی کردین، لەگەڵی رۆیشتین تا گەیشتینە لای زەعیم سڵاومان کرد, نامەکەی بارزانیمان تەسلیم کرد بەڵام بەبینینی نامەکە غەزەب لەدەموچاوی باریو ساردییەکی بەرامبەر عبیداللە بارزانی نواند.

زەعیم گوتی: ئەمەم چاوەڕوان نەدەکرد لەمەلامستەفا بەرامبەر بەخۆم بەتایبەتی, چونکە یارمەتێکی زۆرمدا لەهەموو رویەکەوە, من لەسەر ئەو لەزۆر شوێن بەلاوازیان دادەنامو پڕوپاگەندەیەکی زۆرم بۆ دروستکرا لەسەر ئەو، ١٤ی تەمموز نەبوایە تەرمەکەی لەروسیا دەبوو, چۆن ئەم تاوانە گەورەیەی کرد بازگا دانێت رووبەڕووی سوپاو جەماوەری عێراق, باشە ئەو بە چ حەقێك خەڵك دەستنیشان دەکاتو دەڵێت ئەمە دڵسۆزە یان ئەو هۆزە خراپن چونکە پاڵپشتی حکومەتن, ئەی دوێنی هەر ئەو نەبوو دەیگوت من سەربازم, کەچی ئێستا بازگای داناوە ! لەکۆتایی قسەکانیدا بەکاك عبداللە بارزانی گوت دەتبینم بەڵام چاوی پێنەکەوت, پێدەچوو لەقسەکانی ئاگاداری هەموو شتێکە, وا دەردەکەوت نیازی خراپەو بڕیاریداوە هەلوێست بگرێت, سوپاسمان کردو هاتینە دەرێ, نزیکەی ٢٠ مەتر لەماڵی زەعیم دورکەوتینەوە, کمال عوسمان ئاغا[٧] لەسەیارەکەی هاتە خوارێ بەبێ ئەوەی سڵاومان لێبکات بەگرژیەوە قسەی لەگەڵ کردین گوتی ئێوە چیدەکەن لێرە, چۆن ئێرەتان دۆزییەوە؟ کام ئینزباتی کورد یارمەتیدان؟ چۆن گەیشتنە زەعیم؟ روویکردە عبیداللە گوتی: هاتوویت قسە لەگەڵ شخصی زەعیم بکەیت؟ لەکاتێکدا چەکداری مەلامستەفا بازگایان دژی سوپای زەعیم داناوە, مستەفا هانی سەرۆك هۆزەکانیدا لەدژی یاسای (اصلاح الزراعی), ڕەفیق

---

[٧] چەند بنوسیت لەسەری کەمە, گەورەترین تاوانباربوو بەرامبەر گەلی کورد, دەورێکی زۆر گرنگی هەبوو لەدروستکردنی ناکۆکیو دووبەرەکی لەنێوان زەعیمو بارزانیداو سەرکەوتو بوو لەپیلانەکانی.

پێم نالێیت بۆچی دوای کلاوی بابردو کەوتوییت؟ دوای بێدەنگبونی کمال، عبیداللە گوتی: ئەم پرسیارانەی لەئێمەت کرد برۆ لەزەعیمی بکە وڵامەکانیان لای ئەوە.

## دوژمنانی کۆماری عێراق

سەرەتا ئەو حکومتانەی پیلانیان دادەنا بەتایبەتی شای ئێرانو تورکیاو ئینگلیزو ئەمریکا بوون کەناکۆکی دروست بکەن لەنێوان زەعیمو بارزانیدا (حکومەتی عێراقو گەلی کورد)و گەیشتنە ئامانجی خۆیان.

پیلانی تازەیان لاوازکردنی حکومەتی قاسم بوو لەهەموو رویەکەوە لەناوەوەو دەرەوەی وڵات، ئینجا هەوڵدان بۆ روخانی ئەو حکومتەی کەدژی رۆژئاوایە.

عەرەبە شۆفێنیەکانو تۆرانیەکانو حزبی بەعس هەموو هەوڵێکیان خستبووە گەڕ بۆ پشتیوانیکردنی زەعیم بۆ لاوازکردنی بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردی کەئەویش لەپارتی دیموکراتی کوردستاندا خۆی دەبینیەوە، وەك دەڵێن دوژمنی دوژمنم دوستمە, بەفرمانی حکومەتی تورکیا تۆرانیەکان گەروەترین دەوری سیخوڕییان هەبو دژی کورد.

خۆپیشاندان بە فەرمانی بارزانی لەسەرانسەری کوردستان کرا، هەموو هێزە چەکدارەکان بەهەموو توانایەکیانەوە رووبەڕووی حکومەت سەنگەریان لێداو بازگایان دانا, حکومەت هەمو هێزو توانایەکی بەکارهێنا بەئاگرو ئاسنو بەهەموو جۆرە چەکێکی قورسەوە پەلاماری سەرانسەری کوردستانیدا.

هێزو سوپای عێراقی چەکی شەستەکانی بەکارهێنا لەفڕۆکەو تازەترین تانكو زرێپۆش تازەترین چەکی سووك, سوپایەکی شارەزاو رێکوپێكو خواردنو جلوبەرگی سوپایەکی مودێرینیان هەبوو. لەبەرامبەردا هێزی کورد بریتی بوو لەچەکی سەرتایی جەنگی جیهانی یەکەم، تفەنگی سێتێری فرنسی, تفەنگی ئینگلیزیو هولَندیو برنەوی چیکی بوو. هاتوچۆ یان بەپێ یا بەوڵاخ بوو, کورد هێزێکی چەکداری شارەزای نەبوو جلوبەرگو نەخوشخانە شتێکە باسی نەکەی باشترە چونکە توانایەکی وایان نەبوو کەجێی باسکردن بێت. لە ١١ ئەیلولی ساڵی ١٩٦١ پ.د.ك. بەسەرۆکایەتی بارزانی بڕیاری شۆڕشی ئەیلولیدا.

## حکومەتی قاسمو پیلانەکانی

رژێم لەسێ خالەوە دەستیکرد بە لەناوبردنی بزوتنەوەی کوردی:

١-سوپای عێراق بەهەمو هێزو توانایەکیەوە هێرشێکی دڕندانەی کردە سەرانسەری کوردستان بەفڕۆکەو تانكو زرێپۆشو پەلاماری گوندو ماڵو منداڵو ئاژەڵیاندا.

٢-بەبۆنەی دەست بەسەراگرتنی شارو شاروچکەو گوندی کوردستان, بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتیو استخباراتی سوپا دەستیانکرد بەگرتن بەناوی پارێزگاریکردن لەحکومەتی قاسم لەتابوری پێنجەم، هەروەها لەبەغداو موسڵیش کوێرانە خەڵکیان گرت.

٣-پیلانو دەسیسەی پەیوەندیکردن بەسەرۆك هۆزەکانو ناودارانی کورد لەلایەن کەمال عوسمان ئاغا

سەرپەرشتی دەکرا, لەهەندێ بواردا سەرکەوتو بوو توانی شێخ ئەحمەد بارزانی نزیك بکاتەوە لەحکومەتو لەئیستگەو تەلەفزیون بڵاویکردەوە.

### سەبارەت بەگرتنی خۆم

کاك حسێن شێروانی ئاگاداریکردم لەئاسایشی گشتی فرمانی گرتنت دراوە, لەماڵی دۆستێکی دێرینی ئەرمەنی کەدوکانی سەرتاشینی هەبوو لەگەڕەکی مەنصور بەناوی (محل ئاقۆ) خۆم شاردەوە, دوای دە ڕۆژ بەرکەوتم گیرام, بردیانم بۆ ئاسایشی گشتی، دەستێکیان بەسەرو ریشمدا هێناو بەشێوەیەکی ناڕێکوپێك سەریان سفرکردم, ماڵیان پشکنیم, راپورتەکەیانوا لێدابووم کەمسئولێکی گەورەی پارتیم, هیچیان نەدەزانی سەبارەت بەمن, لەئەنجامی لێکولێنەوە شتێکم لەسەر نەبو (حجزیان کردم لەخلف السدە) کەسوکارمو دایکمو هاوسەرەکەمو کمالی برامو محەمەدی مام رەاز هاتن بۆ لام, روباری کچم تەمەنی سێ ساڵان بوو کەچاوی بەمن کەوت بەسەر تاشراوی ترساو ئەوندە گریا ژیرنەبوەوە, دوای یەك هەفتە گواسترامەوە بۆ فەلوجە لەوێ لەبنکەی پولیس یەك شەو مامەوە بەپارە ناردیانم بۆ بندیخانەی رمادی، کۆمەڵێك لەگیراوەکان کوردبوون لەسەر مسەلەی کورد گیرابوون ژمارەیان ٤٠ کەس دەبوو لەوانە کاك انور دزەیی[٨] و عەلی سلیم بەگو جرجیس فتح اللەو دوو ئامۆزای سید مجیدم دەناسی وەکو یەك خێزان لەسەر یەك سفرە نانمان دەخوارد ڕۆژگارمان بەلێکۆڵینەوە لەسەر بارودۆخی ئێستا دەبردەسەر, بەگشتی خۆڕاگرو ئازاو خاوەن بیروباوەڕبوون, کاربەدەستانی بەندیخانە بەناچاری ڕێزیان لێدەگرتین.

برا شیوعیەکان وەکو ئێمە لەسەر یەك سفرە نانیان دەخوارد, ڕێکوپێك بوون بەڵکو لە

[٨] پارێزەری ڕۆژنامەی خەبات بوو، لەبنەماڵەیەکی ناسراوی هۆزی دزەیی، پیاوێکی ژیرو داناو بەخشندە بوو، کوردێکی نیشتمانپەروەرو خۆڕاگربوو، برازای خدری ئەحمەدپاشا بوو.

ئێمە باشتریش, ناکۆکیمان نەبوو ڕێزمان لەیەکتری دەگرت, بەڵام لەبۆچوندا لەیەك دوور بووین لەبەر ئەوە لێکولێنەوەمان نەدەکرد تەنها مامۆستا جرجیس فتح اللە هەندێ جار خۆی نەدەگرت دەکەوتە لێکۆڵینەوە لەگەڵیاندا، بەجۆرێك شارەزابوو لەسەر مارکسیەت کەهیچیان دەرحەقی نەدەهاتن, ڕەوف خالدی لەگەڵیاندابو ڕێزیان لێدەگرت بەکەسێکی نیشتمانپەروەریان دانابو, دەیگوت شیوعیەکان نامناسن تکایە ئاشکرام مەکەن, باش دەلەوڕێم لەسەر حسابی شیوعیەکان، ئاگادارمکرد تەنها ئەوەم لەتۆ دەوێت جاسوسی نەکەی, نەچی بۆ دائرەی بندیخانە, ئەمە مەکە من باست ناکەم؟

بەعسیەکان لەهەمو رویەکەوە زۆر ئازادبوون, لەوانەی تاوانبار کرابوون کەتەقەیان کردوە لەزەعیم لەشوێنی تایبەتی بوون، دەرگا بۆ ئەوان لەسەرپشت بو ڕێزیان لێدەگیرا, بەشێکی تریشیان لەگەڵ بەندکراوەکان بوون. کاتێك پارێزەر عبدالستار عەلی حسێن هاتە لام لەڕێگای ئەوەوە بەعسیەکانم ناسی.

گوتم: ئێمە بونمـان لێـرە لەیـەك سەرچـاوە تاونبـارین, یـەك دوژمنـان هەیـە ئـەویش عبـدالکریم قاسمـە. لـەم بووچوونەوە گفتوگـۆم لەگـەڵ کـردن،   وامـدەزانی دوای ئـەم چـاوپێکەوتنە نزیـك دەبینـەوە لەیـەك وەکـو پارتیو بەعس, بەڵام کەوتنـە دوژمنایـەتیمان. صـدیق شنـشل, عبدالـستار عـەلی حـسێنی نـاردبو بـۆ ئـەوەی یارمەتیم بدات بۆ بەردانم بەڵام بەداخەوە نەیتوانی هیچم بۆ بکات.

مـانگی چـوار جـار چـاوپێکەوتنمان هـەبوو, لـەکاتی چـاوپێکەوتنـدا سـیخوڕێك بەدیارمانـەوە رادەوەسـتا لەیەکەم چـرکەوە تـا کۆتـایی چـاوپێکەوتنەکە, ئـەو بەنـدەی دوای چـاوپێکەوتن دەگەڕایـەوە شـوێنی خـۆی دەبوایە ئەمانەی خوارەوەی بکردایە, هەموو ئـەو شـتومەکەی بـۆی هـاتوە لـەخواردن وەکـو خـۆیی تەسـلیم بەمسئولی دابەشکردنی خواردن دەکات, دەربارەی بارودۆخی ئێستای کورد لەهـەموو روداوەکـانی چ رویـداوە وەکو خـۆی لای بـاوەڕپێکراو (مـسئول) بـاس دەکـات. لیژنەیـەك هەیـە بـۆ سەرپـەرشـتی هـەموو ئیـشوکاری ناوخۆمان لەسێ کەس پێکهاتوەو, مسئول بۆ پەیوەندی سیاسیو چێشت لێنانو قـاپ شـتنو پاککردنـەوە, لیژنەی یارمەتی ئەوانەی مواجهەیان نییەو بارودۆخی داراییان باش نییە.

لەسـەر دایکـم کـەزمانی عـەرەبی نـەدەزانی، بەدەسـتی عەرەبـە شـۆفێنیەکان کـاروان کـرام (کـاروان لەبەندیخانەکان بەکاری دەهێنن واتە دارکاریکردن بەکۆمەڵ). بەدەنگێکی بەرز هاوارکرا رەفیـق مامـە صـادق (مواجهـە), کەچـوومە دەرێ چـاوم بـەدایکم کـەوت دەسـتە بەنرخـەکانیم ماچـکرد, ئەمـە یەکـەم جـاری بـوو لەبەندیخانە سەردانم بکات, رووبەڕووی دانیشتم دەستمانکرد بەقسە، سیخوڕێك لەگەڵماندا دانیشتبوو, دایکـم هەواڵی منداڵو ژنو دوکانەکەمی بۆ هێنابووم, وتەکانیشی بریتی بوو لە: روبار تەندروسـتی باشـە بـەڵام هـەر دەگری دەڵێ بابە کوانێ, بازیان منـداڵێکی گرینۆکـە, دایکیـان لەهـەمان مەکتبـە بەڕێوەبەرەکـەی رێکوپێکـە لەگەڵیدا, کەمالی برات باشـەو هاتوچـۆی دوکانەکـەت دەکـات, زۆری خـەڵك قـەرزەکان ناهێنێتـەوە کێـشەمان نییە, انشاءالله بەم زوانە بەر دەبی, منیش زۆر باشمو هەر خەریکی خـواردنو نوسـتنمو رۆژگـار بەخۆشـی دەبەینە سەر, سیخوڕەکە لێی پرسیم دەڵێن چی؟ منیش یەکە یەکە هەموو قسەکانم کردە عەرەبی, لەیەکەم دەقیقەوە پرتەوبۆڵەی دەهاتو قسەی ناخۆشو ژەهراوی دەکرد, زۆر بێـشەرمانە لەگـەڵمان دەدوا, دەیگـوت چۆن دایکت لەژێر سێبەری وڵاتێکی عەرەبیدا دەژی زمانی ئەم وڵاتە نازانێت (ئێرە عێراقـە) وڵاتـی عەرەبـە, تورکمانەکان دەستیان خۆش بێت ئـەوان بـاش دەزانـن چـۆن لەگەڵتانـدا بجوڵێنـەوە, منـیش وەکـو دیلێکـی بێدەسەڵات ناچار زۆر لەسەرخۆ وڵامم دایەوە ببورەواللـە دایکـم عـەرەبی نازانێـت، لەلایـەکی تریـشەوە بۆیـە لێرەم چونکە تاوانەکەم ئەوەیە کەکوردم، من حجزم بەڵام هیچم لەسەر نییە بەم زوانە بەردەبم خۆ مـن بـزنم نەدزیوە. هەرچی سیخوڕەکە گوتی من وەڵامم نەدایەوە بۆ ئەوەی گرژ نەبێتو دایکم بەخۆشی بڕواتە دەرێ, دەستە پیرۆزەکانیم ماچکردو خواحافیزیکرد.

گەڕامەوە شوێنی خۆم، ئەو دیارییانەی بۆم هاتبو دامەدەست لێپرسراوەکە. نانمان خوارد, پاش پشودان

بانگیانکردم چاوپێکەوتنت هەیە. کەچومە دەرەوە, پاسەوانێکی بەندیخانە پێشمکەوت, دوانیشیان لەدوامەوە دەرۆیشت تاکو گەیشتمە بەر باخچەی ئیدارە دور لەژوری محجر, ئینجا چواردەوریان گرتم، ژمارەمکردن ١٣ پاسەوان بوون, گوتیان پێویستیت بەکاروان هەیە، دوای ئەم کاروانە دایکت فێری زمانی عەرەبی دەبێت.

یەکەم جاربوو وشەی کاروان لەمرۆڤێکی عەرەب ببیستم, چونکە کاروانوشەیەکی کوردییە, خۆم بەخۆمم گوت رەفیق ئەمەیە کاروان. ١٣ کەسەکە دەوریان گرتبووم, هەریەکە لەڕاست خۆیەوە دەستو قاچی بەکار دەهێنا, زۆری پێنەچوو ئازار زۆری بۆ هێنام‌و هاوار هاوار بەدەنگە گەورەکەی خۆم دەستی پێکرد, بەڵکو حکومەتی رمادی فریام کەوێت... بەڵام نەخێر! گوتم رەفیق سەعات چواری ئێوارەیە حکومەت بریتیە لەو ١٣وەردیانە, دوعام دەکرد وازم لێبهێنن, بەردەوام بوون تا پەکیان خستم‌و کەوتم, ئینجا بەچوار کەس وەکو مەڕی مردارەوەبوو بەتەنها فڕێیان دامە ژورێکی چۆڵ‌و تاریك‌و رەش‌و پیس کەمشکی تیابوو، ژورەکە ٢٥ ساڵ لەوەوپێش چێشتخانە بووە، شوینی دەستوقاچیان دیاربوو, وردەوردە بەخۆمدا چومەوە عاقڵانە نەدەجوڵامەوە لەگەڵییاندا, فرسەتم لەیەکێکیان هێنا بەهەردوو دەستم پەلاماری گویجکەکانیم داو بەقاچیش تێم هەڵدەدا هەتا بەهەر ١٢ وەردیانەکەی تر ئەوەندیان لێدام کەوتمە ئەرزەکە.

دوای یەك هەفتە لەتاکبەندی (أنفرادی) بردیانمەوە بۆ ناو بەندیخانەی گشتی کەزیندانییەکانی لەسەر پیاوخراپی گیرابوون (درو پیاوکوژو شەوکوت), بەڵام کەهاتمە ناویان خۆشبەختانە خەڵکێکی رێکوپێك لەناویاندا هەبوو خزمەتێکی بێئەندازەیان کردم لەبەر ئەوەی دەیانزانی کوردم‌و دژ بەرژێمی قاسمم‌و ئازارو ئەشکەنجەدراوم. لەناو بەندکراوەکاندا کوردێکی زۆریان لەگەڵدابوو لەوانە کوڕی شێخێکی گەورە هاتەلام گوتی باپیرمان نزیکەی ١٠٠ساڵ پێش ئێستا لەبەر دوژمنایەتی لەهەولێرەوە هاتوتە ئەم ناوچەیە, نەنکم کوردی باش دەزانێت, کەی کوردستان رزگار بێت ئێمە دەگەڕیینەوە, بۆم دەرکەوت کە لەناوچەی رمادی کوردێکی زۆر نیشتەجێ بووەو چەند گوندێکی سەر بەخۆیان هەیە.

ئەنوەر دزەیی توانی سەرم بداتو بەیەکەوە نانمان خوارد، گوتی باش رزگارت بوو لەم دارکاریە, بەڵام وەکو وەردیانێکی کورد بۆی باسکردم تاوانبارە بەعسییەکان کەتاوانبارن بەهەوڵدانی تیرۆرکردنی عەبدولکریم قاسم دەستێکی سەرەکیان هەبوو لەم دارکاریکردنەی تۆدا. باسی بارودۆخی ئێستامان کرد لەسەر بنەمای ئەو هەواڵانەی کە لەلایەن خزمانەوە بەشێوەیەکی راستودروست ئاگاداریان دەکردێنەوە لەچاوپێکەوتن وسەردانەکاندا. دەیانگوت قاسم بارودۆخی بەرەو باشی ناڕوات, بزوتنەوەی کورد بەرەو پێشەوە دەڕوات, قاسم بەهۆی راپۆرتی سیخوڕەکان‌و استخباراتی سوپاو بەرێوەبەری ئاسایشی گشتی وا چووبووە مێشکی کەبزوتنەوەی کوردی کۆتایی پێهات, سوپای عێراق بەتەواوی دەستی بەسەر باکوری خۆشەویستدا گرتوەوە, چاوەڕوان دەکرێت کەمەلامستەفا یا خۆی تەسلیم دەکات یا رادەکاتە تورکیا یا

سوریاو ئەوانەی کەلەگەڵی ماون بەپەنجەی دەست دەژمێردرێن, قاسم لەخۆی بایی ببوو بەلام خەڵکی پشتی لێکردبوو, دڵی خۆی بەو ڕاپۆرتانە خۆشدەکرد کە لەلایەن کمال عوسمان ئاغاوە بەدەستی دەکەوت. کاك ئەنوەر دزەیی فەرموی ئێمە بەردەبین, ئەم قسەیە لەزمانی کمال عوسمان بیستراوە. هاتنی کاك ئەنوەر لەهەموو رویەکەوە دڵی خۆشکردم, چونکە ئەوە بۆ ماوەی ١٥ رۆژ دەچێت, بەهیچ جۆرێك ئاگاداری بارودۆخیوڵات نیم, چونکە دورخراومەتەوە.

ساڵی ١٩٦٢ عەبدولکریم قاسم لەدەربەندیخان وتارێکی خۆێندەوە, بڕیاری لێبوردنی گشتی بۆ هەمو ئەو کوردانەی کە لەسەر سیاسەت گیراون، دەرکرد. قاسم ئەوەی باش دەزانی خەڵکێکی بێتاوانی زۆر گیراون, لەکاسبکارو فەرمانبەرو کرێکارو جوتیار کەپەیوەندییان بەبارزانییەوە نەبوو, بەلام ویستی بەم بڕیارە خۆی لەکورد نزیك بکاتەوە, قاسم بۆی دەرکەوتبو ئەو هێرشەی کردبوی لەڕووی سیاسییەوە شکستێکی زۆر گەورەبوو بۆ خۆی. دوای ٢٤ سەعات بڕیارەکەی قاسم جێبەجێ کراو ئێمە ئازادکراین تەنها مامۆستا جەرجیس فتح الله[٩] نەبێت کە بەبەندکراوی مایەوە.

پاش پشودانێکی کورت, رووەکردە بازاڕ بۆ ئەوەی بزانم دوکانەکەم لەچیدایە کەگەیشتمە ئەوێ دەستمکرد بەلێکۆڵینەوە لەگەڵ کەمالی برامو ئەو کوڕە ژمێریارەی کە لەلام بوو. یەکەم جار لەپەڕوای قەرزەکانەوە دەستم پێکرد سەیرمکرد زۆرێك لەقەرزەکانم فەوتاون, ئینجا هاتمە سەر فرۆشراو کڕدراو تەماشامکرد لەوێشدا زەرەرم کردووە بەهۆی

---

[٩] پیاوێکی زۆر تێگەیشتوو و زاناو قسەزان بوو. بەهیچ شێوەیك ئامادە نەبوو لەگەڵ عەرەبە شۆڤێنییەکانو بەعسییەکانو شیوعییەکان تێکەڵاوبێت. زۆر حەزی بەتێکەڵاوبوون هەبوو لەگەڵ ئەو کەسانەی بیروباوەڕیان لەسەر بنەمای دیموکراتیو سەربەخۆییو ئازادی دامەزراوە، زۆر دۆستی کورد بوو، بەبەردەوامی لەهەوڵی ئەوەدابوو لەکورد نزیکبێتەوە. هەرچەند لەتوانای بووبێت، بەهەموو شێوەیەك خزمەتی کوردو بزوتنەوەی رزگاریخوازی کردووە. عەرەبە شۆڤێنییەکان کە بەمەیان زانی، لەداخا تاوانباریانکرد بەوەی لەڕووداوی شەوافدا دەستی باڵای هەبوە لەئەشکەنجەدانی عەرەبە نەتەوەییەکان. ئەم تۆمەتەی بۆیە درایە پاڵ تا لەبەندیخانە دایڕزێنن لەکاتێکدا چەکەکەی تەنها پێنووس بوو هیچیتر. خۆشبەختانە بەهۆی هەوڵی بارزانیو پ.د.ك. رزگاری بوو، دوای ئەوە بەیەکجاری چووە ریزی پارتییەوە، هەرچەندە هەندێك نهێنی هەبوو بەلام جێدەستی دیاربوو، ئیجابیاتی گەلێك زۆربوو.

مانەوەی یان فرۆشتنی بەنەزانی. بەکورتی بۆم دەرکەوت ئەوەی لەماوەی ٥–٦ ساڵدا بەیەکەوەم نابو بەو ماوە کەمە تیاچو. دڵم بەو دوکانە زۆر خۆشبوو, چونکە لەدەرەوەی ولاتەوە بە(استراد) شتومەکی کارەبایی تازەم بۆ دەهاتو بریکارێکی زۆرم هەبوو بە(کۆ) لێیان وەردەگرتم, بەتاك دەیانفرۆشتەوە, بەلام لەگەڵ قەدەری خوا هیچ شتێك ناکرێ، ئەوەندە هەیە ئەو گرتنە, بوو بەهۆی ئەو زەرەرە گەورەیەم.

بەئاشکراو نهێنی کەوتمە سەردانی برادەرانی کوردو نیشتمانپەروەر بەتایبەتی کادرانی ناسراوی پارتی لەلایەنگرو پاڵێوراوو دڵسۆزان, کەوتمە گفتوگۆکردنو لێکۆڵینەوە لەسەر بارودۆخی کوردستان کەبە چ

قۆناغێك تێپەر دەبێت، دوای بڕیارەكەی عەبدولكریم قاسم كەبڕیاری ئازادكردنی بەندكراوەكانیدا قاسم نەیدەزانی حزب بڕیاری شۆڕشی چەكداری دەداو هەمو كوردێكی بەشەرف پشتگیریی لەم شۆڕشە دەكات بەسەرۆكایەتی بارزانی. ڕوومدەكردە هەر كوردێك پرسیاریان لێدەكردم ئایا ڕاستە لەبەندیخانە بەشێوازێكی ناشرین رەفتاریان لەگەڵداكردویت؟

لەگەڵ ئەوەشدا كەزیاتر لە١٠ ساڵ بوو لەبەغدا دەژیامو زۆری برادەركانیشم عەرەب بوون, بەڵام نەمدەزانی كەهەندێ عەرەب هەستێكی شۆڤێنی تیادایە بەرامبەر بەكورد, لەكاتێكدا كەدایكم ژنێكی پیرەو دێت بۆ لام بۆ بەندیخانە لەبەر ئەوەی عەرەبی نازانێت دەبێ من ببرێم بۆ (كاروان)و لەوێ ئەشكەنجە بدرێم. ئەمەو چەندها بیرەوەری تر دەهاتنەوە یادم هاواریان دەكردو دەیانگوت رەفیق بیربكەرەوە چۆن ببیت بەخولەپیزەو تۆڵەی خۆت بكەیتەوە. بیرم دەكردەوە كەمنێك بەژیانی قەلادزێ رازی نەبووم ئێستا لەبەغدام گەیشتمە نازو ژیانێكی بەختەوەر كەزۆر لاو خەونی پێوە دەبینێ، بەڵام ئێستا هەستی كوردایەتی پاڵم پێوە دەنێ كە بەزوترین كات ڕووبكەمە ناو (پ.م), ئەم بڕیارەمدا بەڵام دەبێ ڕای دایكمو هاوسەرەكەمو كمالی برام وەرگرم چونكە روبارو بازیان منداڵن, یەكەم جار كەوتمە گفتوگۆ لەگەڵ دایكم كەچیبكەمو كام ڕێگا بگرمەبەر لەكاتێكدا لەهەموو روویەكەوە شۆڕش ڕۆژ بەڕۆژ بەهێزتر دەبێت؟ ئینجا دوای ماوەیەكی تر ئاسایش دەستدەكاتەوە بەگرتنی خەڵك منیش یەكێك دەبم لەگیراوەكان، ئایا فرمانت بەچییە؟

دایكم یەكسەر بۆچونەكەی منی پەسند كرد فەرمووی رۆژێك زوتر خۆت بگەێنە لای مەلامستفا بارزانی, خۆم سەرپەرشتیماڵەكە دەكەم، روبارو بارزیان هەمیشە لەباوەشم دەبن, كمال خۆشحاڵی خۆی دەربڕیو ئامادەیی نیشاندا بۆ پڕكرنەوەی هەمو كەلێنێك لەماڵەوە. هاوسەرەكەم هەرچەند ئەندامێكی پارتی بوو بەڵام سەخت بوو بەلایەوە كەمن ماڵەوە بەجێبێڵم, بەڵام هەستی نەتەوایەتی هەمیشە زاڵبوو بەسەر ویستو خواستەكانیدا.

پاش بیركردنەوە لەچوونم بۆ ناو ڕێزی (پ.م) بەخۆمم گوت: شتێكی نەزانی لەبواری چەكو تەقەو شەڕی پارتیزانیدا دەبمە نانخۆری جێگر، بۆیە بەپێویستم زانی كەئیشیك بۆ خوم رەچاوكەم ئەویش كاری (اسعافات) برینپێچی بوو، بڕیارمدا كەپێویستە لەكاری پزیشكیدا شتێك فێربم, ئەم دكتۆرە نیشتمانپەروەرانە كەشایانی باسكردنن یارمەتێكی زۆریاندام، ماوەی دوو هەفتە لەگەڵمدا خەریك بوون بۆ شارەزابونم لەو كارە، جار جار بەدلەیەكی سپییان لەبەردەكردم لەگەڵ یەكێك لەقوتابیەكانی دكتۆر سەروەری كاكە حەمەو دكتۆر ئەحمەد شاڵیو دكتۆرو عمر دزەییو دكتۆر دارا ئەحمەد توفیق, بەشهادەتی هەمویان شارەزاییەكی باشم پەیداكردو بڕیارمدا كەئیتر دەتوانم لەم بوارەدا لەخزمەت پ.م كوردستاندا بم، نزیكەی دە كارتون دەرمانم كڕی كەبڕی هەزار دینارم بۆ ئەم مەبەستە تەرخانكرد, لەسەر هەموو شوشەو پاكەتێك دەمنووسی بۆ چ نەخۆشیەك باشە.

مامۆستای تێکۆشەرو رۆشنبیرو نیشتمانپەروەر ئەنوەر مائی هات بۆ ماڵەوە، پاش گفتوگۆکردن لەبارودۆخی ئێستای کوردستان گوتی لەم هەفتەیەدا پەیوەندی دەکەم بە(پ.م)، پرسیاریکرد ئەی تۆ کەی پەیوەندی دەکەی؟ گوتم: منیش لەم روژانە دەچمە ریزی (پ.م)، لەرێگای موسڵەوە برادەرێکم هەیە یارمەتیم دەدا دەگەمە لای سەرۆك بارزانی. گوتی: ئەم شۆڕشە بارزانی سەرۆکایەتی دەکات, هیچ جیاوازییەك نییە کەڕوو بکەیتە هەر ناوچەیەك بنکەی (پ.م)ی لێبێت. پاش گفتوگۆ رێککەوتین رووبکەینە بارەگای شاخی بەمۆ، دوای ٥ رۆژ بەدوای یەکدا بچینە خانقین.

دەستە بەنرخەکانی دایکم ماچکرد، گوتم انشاءالله جێدەستم دیار دەبێت، بەمە وشەی (کاروان) لەبیر خۆم دەبمەوە خودای مەزن تۆمان بۆ بهێڵێت. ئەملاو ئەولای هاوسەرەکەم ماچکرد چاوی کمالی برام ماچکرد ئینجا چاوی رووبارو بازیانم ماچکرد، ماڵو منالّم بەجێهێشت خواحافیزیم لێکردن, دوو برادەر گفتیاندا نایەڵێن پێویستیان بەهیچ شتێك بێت کۆمەکیان دەکەین. بەڵام بەهیچ جۆرێ بەسەریان نەکردنەوە.

دەرمانەکانم لەرێگای کاك عەلی عمر تەسلیم کرد, خۆشم بە(پاصی مصلحە) چومە بعقوبە لەوێشەوە چومە خانقین یەکسەر چوومە ماڵی کاك عەلی عیسا ئەرکەوازی, لەرێگای رێکخراوی پارتی دوای چوار رۆژ پرسیارو ئاگاداری سەرەوە کرا, ئینجا بەرێیانکردم بۆ ناوچەی شاخی بەمو. بەهار بوو سعات ٥ی ئێوارە بەئوتۆمبێلێکی پاص گەیشتمە ماڵی پ.م جەنابی علی احسان بەگی شەرەفبەیانی لەگوندی باخەهەنارەو ناوچەی رزگارکراو, شەو لایان مامەوە دوای نانخواردنی بەیانی نزیکەی ٤٠ دەقیقە رۆیشتین گەیشتینە بارەگای پ.م، کاك حلمی عەلی شەریفو مامۆستا ئەنوەر مائی بەگەرمی پێشوازییان لێکردم، دڵخۆشی خۆیان نیشاندام ئینجا یەکەیەکە برا پێشمەرگەکان بەخێرهاتنیان کردم، رێزیان لێگرتم، یەکسەر بەدکتۆر ناوبرام، ئیستاش دوای ٣٧ ساڵ دەچمە ناوچەی دەربەندیخانو کەلارو بەمۆو هۆرێنو شێخان خۆمیان پێدەناسێنم رێزم لێدەگرن، رابردویان لەیادە، سوپاس بۆ یەزدانی مەزن.

## بنەماڵەی شەرفبەیانی

وەسمان بەگ سەرۆکی هۆزەکەیانە، ٤٠٠ ساڵ لەمەوپێش لەناوچەی بادینان هاتونەتە ناوچەی هۆرێنوشێخان, پیاویکی سەخی, ئازا, زیرەك, هاوسەرەکەی ئەختەرخان کچی حامد بەگی جاف, کوڕی گەورەی علی احسان بەگ ئەندامی حزبی هیوا بوو,کوردێکی نیشتمانپەروەربوو، سەلمەخانی هاوسەری خوشکی شێخ عوسمانی بیارە, مەحمودخان کوڕی دووەمی بوو، خێزانەکەی بەبۆمبارانی فرۆکە شەهیدکرا, تەرمەکەی شەو لەگۆڕستانی بەمۆ دەریانهێنایەوە, بردیانەوە بۆ ئێران چونکە قەڵخانی بوو لەگۆڕستانی خۆیان ناشتیان.

تاهر بەگ خاوەنی گوندی بێلولە برای وەسمان بەگ بوو، چەکدارەکانی کە لەبراو کوڕەکانی پێکهاتبوو دە کەس بوون هەمویان لەریزی پ.م بوون, هەروەها جۆری چەکیان تفەنگی برنەوبوو شەوو رۆژ لەبارەگای

دەربەندی بێلوله بوون، جێدەستیان دیار بو, ئەم بنەماڵەیە نەبونایە توشی چەند جۆرێك نەخۆشی دەهاتین بەڵام بەهۆی یارمەتی ئەوانەوە نەبونیمان پێوە دیار نەبوو، بەداخەوە وەکو بیستومە بارودۆخی داراییان زۆر خراپە کەچاوم پێیان دەکەوێ چونکە دەزانن لەوان خراپترم بەهیچ جۆرێك گلەییم لێناکەن.

ئەم بنەماڵەیە چەند لەسەریان بنووسم کۆتایی نایەت، تەنها ئەم دوو دێرە دەنووسم دەڵێم ئەگەر ئەم بنەماڵەیە نەبونایە کەسەرۆکەکانیان جەنابیوەسمان بەگو تاهر بەگو هەموو بەگزادەی شەرەفبەیانی نەبونایە بنکەی پ.م نەدەبو لەم ناوچەیە, ڕۆژیك بوو, دەمانگوت:(حزب فەقیر میللەت دوڵەمەند) بەڵام ئێستا (حزب دەوڵەندە میللەت فەقیرە). ئەم ناوچەیە کەبەهۆرینو شێخان ناسراوە زۆربەی دانیشتوانی خەڵکێکی خاوەن بیروباوەڕو هۆشیاربوون، کاك نوری ئەحمەد تەها لەگوندی شمشێرکوڵەوە گەیشتۆتە مهاباد پەیوەندی بەکۆماری مهابادو قازی محمد کردوە.

## پەیوەندیم لەگەڵ حلمی عەلی شەریف

ساڵی ١٩٥٤ یەکترمان ناسیوە، تا ئەو ساتەی کوچی دوایی کرد برادەریو دۆستایەتیمان زۆر پتەوبوو. بەڵام لەرووی بیرو بۆچونمانەوە زۆر لێکدور بووین، من دوای خوای گەورەو پێغەمبەر کەمەلامستەفام خۆشویست ئەمە بەپێچەوانەی بۆچونی ئەوبوو، من کوردێکی مەلایی بوومو ئەو پارتییەکی کوردبوو. کەدوو بەدوو گفتوگۆمان دەکرد لەسەر بارودۆخی وڵات لەیەك خاڵدا یەکمان نەدەگرت ئەویش مەلامستەفابوو. لەیەکەم ڕۆژەوە کەهاتمە ناو پ.م هەمو هەوڵوکوششی ئەو پیاوە ئەوەبوو کەکار نەکەمە مێشکی پ.مو بیانکەمە مەلایی هەر بۆیەش بەنهێنی بەپێشمەرگەکانی گوتبوو باوەڕی پێمەکەن ئەمە دۆستی زەعیمە، هەرچەندە کاك حیلمی مسئولی یەکەم بوو بەڵام نەیتوانی سەرکەوتوبێت لەم هەوڵەیدا. سوپاس بۆ خوا لەبواری پزیشکیدا سەرکەوتنێکی گەورەم بەدەستهێنا جگە لەوەی ئەو گوندانەی دەوروپشتی مەیدانیش نزیك شارۆچکەی خانەقین دەهاتنە لامو لەخودای مەزن بەزیاد بێت دەرمانەکانم چارەسەری نەخۆشی دەکرد.

## پەیوەندیم لەگەڵ برا پێشمەرگەکانو دانیشتوانی ناوچەی هۆرێنو شێخان

بەگشتی لەگەڵ هەمویان وەکو یەك دەجوڵامەوە, جیاوازیم لەنێوانیاندا نەدەکرد، ئەوانیش ڕێزیکی تایبەتیان لەمن دەناو بەبرای گەورە دایاندەنام, بەهیچ جۆرێك ڕۆژیك لەڕۆژان ناکۆکییەك یا گرژییەك ڕووینەداوە لەنێوان منو برا پێشمەرگەکاندا, بۆ ئاگاداریتان تا ئەم کاتە ئەوانەی ماون لەژیاندا پەیوەندی دۆستایەتیم بەردوامە وەکو ڕابوردوو کەپ.م بوین، پێکەوە چۆن برایەتیمان خۆش بووە ئێستاش برایەتیمان بەهەمان شێوە هەر خۆشە، بەڵام بەهۆی بارودۆخی ئێستاوە دورکەوتوینەتەوە لەیەكو لەگەڵ زۆریاندا دابڕاوین.

پێشەکی لەگەڵ وەسمان بەگو تاهربەگو خانەوادەکەیاندا ئەوپەڕی دۆستایەتی بەهێزم هەبوو،

سەرانسەر لەخزمەتیاندابووم بەهەموو توانایەکەوە، چونکە ئەم بنەماڵەیە بەنانو بەرگی خۆیان لەخزمەتی کوردستاندا فیداکاربوون، بەم کردەوە فیداکارییانەیان جێی خۆیان کردبوەوە بەڵام خراپەیەکی زۆر لەلایەن هەندێك کەسایەتییەوە چونکە ئەمانە سەرۆك هۆزو دەوڵەمەندبوون. لەگەڵ جوتیارو شێخو مەلای ئەو ناوچەیە پەیوەندی ڕۆژانەم بەهێزبوو، ڕێزم لێدەگرتن ئامادەیی خۆم نیشاندەدا کەبەردەوام لەخزمەتیاندام.

لەهەموو جەولەیەکی پ.م بەشداریم دەکردو بەدەنگە گەورەکەی خۆمو تارم بۆیان دەخوێندەوە، لەهەر کاتێکدا ئەگەر یەکێك بهاتایەو بیگوتایە نەخوشەکەمان ناتوانێت بگاتە بارەگا بۆ چارەسەرکردن زۆر بەپەلە شتەکانم دەپێچایەوە دەچووم بەدەنگیەوە، گوێم نەدەدایە ئەوەی دورە یان نزیك، بەتایبەتی ئەگەر کەسوکاری پ.م بوایە. بەشی زۆری کارەکان من پێی هەڵدەستام بەڵام بەناوی کاك حلمی تەواو دەبوو، ئەویش لەدڵەوە وەکو پێویست نەبوو, جارجار دەمگوت بەبێ مەلامستەفا هیچتان بۆ ناکرێت؟

بارەگاکانی پ.م بریتی بوون لەمانە:

١- دەربەندی بێلولە بارەگای سەرەکی ناوچەی خانەقین بوو کەبریتی بوو لەئەشکەوتێك جێگای ٢٠ پێشمەرگەی تیادەبوەوە, کەوتبووە راستی شاخی بەمۆو جێگای حەوانەوەی شەو رۆژی پ.م بوو. ئەم شوێنە نزیکەی ١٠ کم لەسنوری ئێرانەوە دووربوو, ئەگەر پشتت بکردایەتە ئێران دەستی راستت دەربەندی بیلولەیەو دەستی چەپت گوندی بێلولەیە، بەردەمەکەشت گوندی باخەهەنارەیە.

٢- بنکەی سەرتەك هۆرێن.

٣-بنکەی شمشێرکوڵ: لە پشتی گوندی شمشێرکوڵەوەیە بەدووری ١٠کم, ماوەی ١٥کم دوورە لەناحیەی دەربەندیخان، نیوانیان ئاوی سیروانە.

ژمارەی پ.م ٣٥ کەس دەبوو, ئەم ناوانەی خوارەوە بوون ئەگەر کەسم لەبیرنەچوبێت، داوای لێبوردن دەکەم لەو برایانەی ناوم نەهێناون. حلمی عەلی شەریف مردووە, ئەنوەر مائی شەهیدە, رەفیق پشدەری ماوە,وەسمان بەگ مردوە, عەلی ئیحسان بەگ مردوە, حەمەڕەشید بەگ مردوە, مەحمودخان ماوە, تاهربەگ مردوە, کەریم تاشەیی کوژرا, مەلاعەلی مردوە, کوێخامحەمەد شمشێرکوڵی مردوە, صابر کوێخامحەمەد ماوە, عەلی فەیلی شەهیدە, عەلی سەلیم بگ مردوە, حمە باخەهەناری ناسراو بەحەمەفریشتە لەشەڕی براکوژیدا کوژرا, عەزەی ئەوڕەحیم لەشەڕی براکوژیدا کوژرا, عەلی حاجی مشیر بوو بەجاشو کوژرا, رەزا قالەجاف بوو بەجاش کوژرا, رەشەی قالەجاف ماوە, کوێخامحەمەدی ناوماچك کوژرا, ئەحمەد هۆرێنی ماوە, حەمەی وەلی کەرەم ماوە, حمەئەمین کەلاری ماوە, عەزەی حەوا ماوە, خولەرەشاش ماوە, حەمەی صوفی صالح ماوە, محمود قەصلان مردوە, مامۆستا مەلا سەعید زەمناکۆیی ماوە, حسێن حاجی محێدین مردوە, حەمە شمێرانی کوژرا, مەحمود صۆفی ماوە, عەلی کاکەڵلا ماوە, صالح پاڵەوان شەهیدکرا, عەزەی حەمەخەنان ماوە.

**خواردنمان:** بەیانیان نانوچا, نێوەڕوان پەتاتەی کوڵاو, ئێواران پەتاتەی سورەوەکراو, هەفتەی دوو جار ماستمان هەبوو, مانگی جارێك گۆشتمان دەخوارد, وەسمان بەگو تاهر بەگ هەریەکە حەیوانێکیان بۆ سەردەبڕین, ئەمە بڕیاری وەسمان بەگ بوو. گوتی: ئەمانە کوێر دەبن ئەگەر گۆشت نەخۆن.

**جۆری چەك:** وەسمان بەگو براو کوڕەکانی چەکیان بڕنەو بوو, تفەنگی سێتیری فەرنسی, ئینگلیزی, هوڵندی, یەك دەمانچەی بڕنەو, سێ دەمانچەی چواردەخۆر.

**هەڵوێستی پێشمەرگەکان:** خاوەن ورەیەکی بەرزو قارەمانو کوڵنەدەرو ئازابوون, خووڕەوشت بەرزو دواینپاك بوون, کاتێك فەرمانێکیان بۆ دەردەچوو بەبێ ئەوەی بپرسن جێبەجێیان دەکرد, گورجوگۆڵ بون لەکارەکانیاندا, بەڕاستی نمونە بوون لەهەموو رویەکەوە بۆ خزمەتی کوردستان.

**پەیوەندی پێشمەرگە:** ئەگەر بەراوردی بکەی لەگەڵ هێزی دوژمن هیچ حسابێکی ژمارەیی بۆ نەدەکرا, بەڵام بەهۆی ئەوەی جەماوەر بەتێکڕایی دەستیان دابووە باڵی پ.م, بەهەمو جۆرێك یارمەتیان دەدان، هێزی پ.م گەیشتە ئەوەی بەهیچ جۆریك دوژمن نەتوانێت بەرەنگاری ببێتەوە تەنها بەهۆی دووبەرەکییەوە نەبێت.

ئاگاداری هەموو جموجوڵێکی دوژمن بوون بەتایبەتی لەبەعقوبەو جەلەولاو خانقینو کەلارو دەربەندیخان, شەو یان رۆژ روومان بکردایە هەر گوندێك دانیشتوانەکەی بەگەرمی پێشوازییان لێدەکردینو بەهەموو توانایەکیانەوە دەستی یارمەتیان بۆ درێژ دەکردین، بەگشتی پەیوەندی نێوان پ.مو دانیشتوانی ناوچەکە زۆر پتەوبوو, بەجۆرێك لەهەڵوێستیاندا لەیەکتری جیانەدەکرانەوە بەپێچەوانەی ئێستا.

**ژیانی ناوچەکە:** سەرچاوەی ژیانی ناوچەکە ئاژەڵداریو کوشتوکاڵ بوو, گەنمو جۆو برنجی بێلوولە بەناوبانگە، گوندی دەربەندی بێلولەو سەرتەك باشترینو خۆشترین گوێزو هەنجیرو قۆخو قەیسییان هەیەو گوندی سەرتەك لەهاوینەهەوارەکانی کوردستانە.

**رێگاوبان:** هاتوچۆکردن یا بەپێ یا بەولاخ بوو, ئوتومبێل دەگیشتە گوندی بێلولە، لەشەڕی عێراق-ئێراندا بەعس لەبەر بەرژەوەندی خۆی نەك لەبەر کورد، جادەی بردە سەرانسەری سنورو سەرتەکیش بێبەش نەبوو لەم کارە.

**مۆزەخانە:** ٣٠٠مەتر دوور لەئەشکەوتەکە بەردێکی داتاشراوی لێیە درێژیەکەی نزیکەی دوو مەترو نیوو پانییەکەی مەترو نیوێك دەبێت، کەپەیکەری مرۆڤێکە بەچەکی ئەو کاتە بەسەر دوژمنەکەیدا زاڵبوە, مامۆستا ئەنوەر مائی دەیگوت بەرێنووسی مێخی نوسراوە کەئەمە (ئەنونو بانونییە) کوردە ئابلۆقەدراوە, بەڵام دوایی بەسەر دوژمندا زاڵبووە.

لەکۆتایی دەربەندی بێلولە لەسەرچاوەی کانیەکە ئاوی کانیەکە راکێشراوەو بەدرێژایی زیاد لە١٠ کیلو مەتر لەو شاخە بەردیان داتاشیوە بۆ ئەوەی ئاوەکەی پیادا بڕوات، وەسمان بەگ گوتی: لەساڵانی سیەکاندا

باڵیۆزی بەریتانی لەگەڵ دوو کەسی ئینگلیزدا کەئەو کاتە بەهار بوو هاتنە باخەهەناره، عەلی کمال [10] معاونی پۆلیس بوو لەخانەقین. سەردانی دێکەو

[10] ساڵی ١٩٧٦ کاتێك گیرام، کاك عەلی کەمال, عەقید فایق دەنێرێتە ماڵی ئێمە بۆ ئەوەی مانگانەیان بۆ ببڕێتەوە, دایکم پێی دەڵێت ڕێزمان هەیە بۆ کاك عەلی و پێی ڕابگەیەنە کەپێویستیمان بەپارە نییە, لەدوای ئەمە عەلی کمال خۆی دەچێت سەردانی دایکم دەکات دەڵێت دایکی کاك رەفیق ئەوە بۆم کردنە ٣٠٠دینار مانگانە، دایکم دەڵێ کەپارەکەم وەرنەگرتووە لەبەر ئەوە نەبوو کەم بوبێت بەڵکو هەر پێویستیمان بەپارە نییە. عەلی کەمال دەفەرموێت مادام مانگانەکەم لێ قبوڵ ناکەن ئەوا من پارچەیەك زەوی لەزەویەکانی خۆم لەسلێمانی دەکەم بەناوی کاك رەفیقەوە بۆ ئەوەی بۆ منداڵەکانی بێت. کاتێکیش ئازادبووم، ئەو زەوییەم فرۆشتو پێی چووم بۆ لندن، لەوێ هەفتەی دووجار کاك عەلی کەمال دەهاتەلام. ڕۆژێك فەرمووی رەفیق جوانییە من بەمجۆرە ئەرکم بەسەر تۆوە بێت. گوتم: کاك عەلی، پارەی زەوییەکەی تۆیە لێرە دەیخۆم.

ئاوەکەیان کرد, ماوەی نیو سەعات لای پەیکەرە داتاشراوەکە راوەستان, بەڵام زیاد لەچوار سەعات سەرنجی سەرچاوەی ئاوەکەیان داو ئەو شوینەی که لەشاخەکەدا بوە بەجۆگە, پێدەچو توشی سەرسوڕمان بوبن.

**شاخی بەمۆ:** شاخێکی زۆر سەختە ئاوی یەکجار زۆر کەمە بەڵکو نیەیە, کاتێك ئەم ناوچەیە ئابڵوقەدرا ماڵومنداڵیان چوونە سەرووی شاخەکەوە لەوپەڕی بێئاوی شاخەکەدا لەسەرووی شاخەکەیان داتاشیوە حەوزی گەورەیان دروستکردوە بۆ ئەوەی کەئاوی تیا پاشەکەوت بکەن, چ ئاوی زستان یا ئاوی بەهار. حەیواناتی یەکجار زۆرە، پڵنگو بەرازو ورچو حیوانەکێوی زۆر هەبوو, زوو زوو گۆشتیان بۆ دەهێناین, خاوەن ئاژەڵەکان ناو بەناو هانایان بۆ دەهێنان کەبیست سەر بزنیان نەهاتۆتەوەو دابڕاوە لەشوانەکەی, پێشمەرگەکان لەگەڵییاندا دەگەڕان دوای ماوەیەك کەلاکی ئاژەڵەکانیان دەدۆزیەوە, ئەمە ئیشی پڵنگ بوو, بەراز بەشێوەیەکی ئەوتۆ هەبو زۆر دەبینران, بەتەمەنەکان دەیانگێڕایەوە ٥٠-٧٠ سەر بەرازیان لەساڵی پەنجاکاندا بەیەکەوە بینیوە. ڕۆژێکیان چەند برادەرێکی رێکخراوی پارتی هاتن سەردانی مامۆستا حلمییان کرد یەکێکیان کاکەحەمەی فەرەج بوو، لێرەوە لەگەڵ ئەو پیاوە بەڕێزەدا یەکترمان ناسی.

**پەیوەندیکردنی سەربازێك:** سەربازێك بەنهێنی هاتە بارەگای پ.م دوای لێکۆڵینەوەو هاتوچۆکردنی ٣جار لەبارەگایەکی دەربەنیدخان گوتی: دە سەرباز ئامادەن بێنە ناو پ.م بەچەکەوەو رەنگە بەکارێکی گرنگ هەستین, ژمارەی ١٠ پ.م خۆیان ئامادەکردو لەکاتو شوێنی دیاریکراودا چاوەڕوانیانکردن, تەنها منو کاك عەزیز حەمەخەنان مەلەوانیمان دەزانی لەشوێنی دیاریکراو چاوەڕوانیمانکردن، شەو تەقە دەستی پێکرد ئێمەش لەڕاست خۆمانەوە کردمان بەتەقە، بارەگاکانی سوپا تا بەیانی بەردەوام بوون لەتەقەکردن. بەتەنها یەك سەرباز هات گوتی ئاشکرابوین, بەیانیەکەی پێش ڕۆژهەڵات پەڕینەوە، کاك حلمی لەگوندێکی ئەو ناوە چاوەڕوانی دەکردین. گوتم: کەهاتین بگەڕێینەوە ئاوەکەیان کردبوەوەو پەڕینەوە زۆر زەحمەت بوو, هەرچەندە برا پێشمەرگەکان هاوارو قیژەیان کرد وەڵامم نەدانەوە, نەمتوانی ئەم ئەرکە هەڵگرم, کاك حلمی ئایا من دەکتورم یا مەلەوانم..؟ لەکاتی پەڕینەوەدا جلوبەرگو پێلاوو دەمانچەکەم خستە ناو جامەناکەم

لەسەر سەری خۆم داناو بەدەستێك گرتمو بەدەستکەی تر تفەنگو برا پ.م گرت بۆ پەڕینەوە.

یەکەم جارە سەرباز بێتە ریزی پ.م، بەناوچەکەدا دەمانگێڕا لەناو گوندەکاندا پڕوپاگندەمان پێوە دەکرد, چەکێکی زۆر گرنگی پێبوو تەنها ناومان بیستبوو بەڵام تەنها بەدەست سەربازەوەبوو، ئەمە یەکەم جارە لەم ناوچەیە بەشانی (پ.م)ەوە بێت ئەویش کلاشینکۆف بوو. لەم دواییەدا هەواڵی ئەو سەربازەم پرسی گوتیان شێت بووە.

### شەڕی نێوان پ.مو چەکدارە شیوعییەکان:

لەیەکەم رۆژی گەیشتنمەوە بۆ بنکەی شاخی بەمۆ، رۆژی دوو دەرزیم لەمامۆستا حلمی عەلی شەریف دەدا کە بەدەست چەکدارەکانی شیوعی زامدار کرابوو. بەدووروودرێژی بۆی باسکردم کەناکۆکیەکان گەیشتوەتە چ رادەیەك، گوتی: ئێمەی پارتی بەئاشکرا رووبەڕووی حکومەتی قاسم وەستاوینەتەوە دەجەنگین, کەچی شیوعیەکان رێگامان لێدەگرن بەهەموو جۆرێك، پڕوپاگەندیەکی زۆرمان بۆ دەکەن لەهەموو گوندێك دژایەتیان دەکردین, سەرنجمدا پێشمەرگەکان بەرامبەر شیوەعیەکان گرژن، بەجۆرێك ئەگەر وا بڕوات حکومەتی قاسمیان لەبیردەچێتەوەو هەریەکە لەڕاست خۆیەوە دەستی لەسەر پەلەپیتکەی تفەنگەکەی بێت. بەنهێنی دەربارەی ئەم ناکۆکییە گفتوگۆم لەگەڵ کردن بەشی زۆریان دەیانگوت دەبێت ئێرە پاك کەینەوە لەشیوعیەکان, تەنها دوو پ.م نەبێت دەیانگوت زۆر هەڵەیە بەڵام ناوێرین لای مامۆستا حلمی ئەوە بڵێین. لەگەڵ وەسمان بەگو کوڕەکانی قسەم دەکرد دەیانگوت هەرچی شیوعی هەیە بۆ کوشتن باشە هەروەها دەیانگوت نابێت لێرە یەكماڵیان بمێنێت, خۆشم بیرم دەکردەوەو دەمگوت ئەوا بۆ شەش مانگ دەچێت من لەناو (پ.م)دامو هاتومەتە ئێرە بەشەو بەڕۆژ هاتوچۆ دەکەم لەنێوان گوندەکاندا بەهۆی ئەوەی کەدەکتۆرم خەڵك دێت نەخۆشییان هەیە رۆژێك یا شەوێك چەکدارێکی شیوعی رێی لێ نەگرتوم.

شەو مامۆستا حلمی ئاگاداریکردم کەهێرش دەبەینە سەر شیوعیەکان، خۆت ئامادە بکە. کاتێك گەیشتینە گوندی هۆرێن هێرش دەستی پێکرد, من ئەمە یەکەم جارمە لەژیانمدا بکەومە ناو شەڕەوە، نەمدەزانیو شارەزا نەبووم لەناوچەکە, کاتێکم زانی کەوتمە ناوەندی شەڕەکە لەدوو لاوە تەقەیان لێکردم یەکسەر وەکو فیلمی سینەما خۆم کرد بەمردوو خۆم تلۆر کردەوە تاکو کەوتمە پەنا بەردێکی گەورە هاوار هاوار دەستی پێکرد دکتۆر رەفیق کوژرا، سەرم هەڵنەبڕی پێشمەرگە گەیشتە سەرم، کوژراوو زامدار لەهەردوولا هەبوو, لای ئێمە ئازاترین (پ.م) کەناسراوبوو بەپاڵەوان، شەهیدکراو حەوتیتر زامداربوو. سوپاس بۆ خوا زامدارەکانم بەسەرکەوتویی تیمار کردو دوای ماوەیەکی کەم هەمویان چاکبونەوە، پێشمەرگەکان مەڕوماڵاتێکی زۆریان هێنا هی ماڵە شیوعیەکان بو, شەوێك شیوعیەکان هێرشیان هێنایە سەر ئەشکەوتی دەرەبەندی بێلولەو چواردەوریان گرتینو نەیانهێشت یەك پ.م لەبارەگاکەی بێتە دەرێو هەموو مەڕوماڵاتەکانی خۆیان بردەوە, خەڵکی گوندەکە بەنهێنی یارمەتیان دابوون لەرێی خزمایەتیەوە بۆیە توانیان

سەرکەوین.

ئێمەو شیوعیەکان ١٥ ڕۆژ بەرامبەر یەکتر راوەستاین, هەردوولا شەووڕۆژ لەحاڵەتی ئامادەباشیدابووین، دەستمان لەسەر پەلەپیتکەی تفەنگ بوو, چاوەڕوانی فرمان بووین. لەپر نوێنەری (پ.د.ك)و شیوعیەکان تەشریفیان هێنا بۆ بنەبڕکردنی وەزعەکە, کاتێك سەرنجمدایە نوێنەری (پ.د.ك) سەیرمکرد کاك (محەمەدی حاجی تاهر)ـە[11] منیش لەبەری هەڵسامو زۆر بەگەرمی پێشوازیم لێکرد ئەویش زۆر بەگەرمی جوابی دامەوە چونکە لەوەپێش یەکترمان باش دەناسیو لەگەڵ ئەوەشدا خزمایەتییەکی دووریش هەبوو لەنێوانمان، بەچرپە پێمگوت من لێرە (د.رەفیق)م پێدەڵێن, گوتی ئەمە تۆ (د.رەفیق)ی؟ تا گەیشتومەتە ئێرە هەر باسی تۆیان بۆ کردووم, ئینجا گوتم وەکو خۆت ئاگاداری پ.م زۆر حەز لەجەولەکردن دەکاتو حەزی لەهێرش بردنە سەر شوێنێكو شەڕی چەند سەعاتی هەیە, ئەوە بۆ ماوەی (٢٠) ڕۆژ دەبێت بەبەردەوامی لەسەنگەردان بۆیە وام پێباشە بەزوترین کات ڕێکمانبخەیت, چونکە ئەگەر وەزعمان بەم شێوەیە بمێنێتەوە ئەوا یان توشی بەرەنگارییبونەوەیەکی خۆێناوی دەبین لەگەڵ شیوعیەکاندا, یان ئەوەتا پێشمەرگەکان سەنگەر بەجێ دەهێڵن.

دوای گفتوگۆیەکی دوورودرێژ هەردوولا ڕێککەوتن, سوپاس بۆ خوا بەربەرەکانییەکە ڕووینەدایەوە.

---

[11] لەبنەماڵەیەکی کوردپەروەر، کادرێکی کۆنی پارتی بووە، سەرانسەری ژیانی خۆی تەرخانکردووە بۆ خزمەتی بزوتنەوەی کوردیو لەساڵی شەستەکانەوە, لەکاتێکدا (انشقاق) لەنێوان پارتیوباڵی مەکتەبی سیاسی جەماعەتی مام جەلال ڕوویدا ئەویش یەکێك بوو لەسەرکردەکانی, کادرێکی پاكو زیرەك بووەو خاونی خوڕەوشتێکی بەرزەو بەجەلالی ناسراوە.

### چەند تێبینیو ڕوونکردنەوەیەك لەسەر ڕووداوەکان:

١–بنەماڵەی شەرەفبەیانی لەناوچەی هۆرێنو شێخاندا زۆر دەستڕۆیشتوو بوون, بۆ نمونەوە سمان بەگ بۆی گێڕامەوە لەچلەکانەوە بەکۆڵی جوتیارێك بردویانە بۆ سەرتەك.

٢–وەسمان بەگ بەلای شیوعیەکانەوە یەکێکە لەدەرەبەگە ناسراوەکان.

٣–شیوعیەکان لەکۆنەوە بنکەیەکی جەماوەرییان هەبوو لەناوچەی هۆرێنو شێخان. جوتیارێك بۆی گێڕامەوە کەهەموو مانگێك (٥٠) فلسی وەکو ئابوونە داوە, دانیشتوانی ناوچەکە بەبیروباوەڕەوە بووبونە ئەندام لەحزبی شیوعیدا, کادری مەزنیان تیادا هەڵکەوتبو وەکو مامۆستا مەلائەحمەد بانیخێلانی, ئەم پیاوە زۆربەی کاتی لەناو جوتیاراندا بردۆتەسەر, ڕۆژێکیان لەناو پێشمەرگەکاندا گوتم پارتی شانسی باشە ئەگەر حزبی شیوعی لەم ناوچەیە بەشۆڕش هەڵسایە بەهیچ جۆرێك جێگای (پ.د.ك) لەناوچەکەدا نەدەبوەوە. بەڵام سوپاس بۆ خوا ئەوان دروشمی سەر زمانیان ئاشتییە, دیارە فەرمانەکەیان لەروسیاوە بەم جۆرە بۆ هاتووە.

٤–حزبی شیوعی بەئاشکرا بەیانی بلاوکردەوە دژی شۆڕشی چەکداری.

٥–هەموو پێشمەرگەکانی بەمۆ ٢٥ کەس بوون لەوانە ١٠ پێشمەرگەیان خەڵکی کەلارو جاف بوون, ژمارەی ١٢ کەسێان خەڵکی هۆرێنو شێخان بوون, ئەوانیش بەشی زۆریان لەبنەماڵەی شەرەفبەیانی بوون.

٦–مامۆستا حلمی عەلی شەریف لەو ناوچەیە لەبەر زۆر هۆ سەرکەوتوو نەبوو, خۆی وا هەستی دەکرد کەشیوعیەکان کۆسپن لەڕێگای ئەودا بۆیە لەناخیدا بڕیاری دابوو لەگەڵیان بجەنگێ بەلام نەخێر زۆر هۆیتر هەبو بۆ سستی (پ.د.ك) لەو ناوچەیەدا.

ئەم شەڕە بوو بەمایەی رەخنە بۆ مامۆستا حلمی چونکە ئەو فەرمانیدا خۆشی ٢٥ کم لەشەڕەکەوە دووربوو, هەروەها وەکو پێویست سەردانی زامدارەکانی نەکرد. دانیشتوانی ناوچەکە چ پارتی چ شیوعی بەگشتی بەقسە ناڕەزاییان دەردەبڕی, بەگشتی ناوچەکە دەیانگوت پێویستە حزبی شیوعی کۆمەکیان بکات یا هیچیتر پڕوپاگەندە نەکات دژی پ.م پارتی. دانیشتوانی ناوچەکە وردەوردە روویاندەکردە بارەگاکانی پ.م, سەریان لە(پ.م)ـەکان دەدا، ئەو ٢٠ رۆژە بەبەردەوامی بەدیاریانەوە بوومو لەگەڵیاندا لەهەموو شەڕیکدا, بەلام بڵێم چی شەهید نەبووم. چاکبونەوەی زامدارەکان سەرکەوتنێکی گەورەبوو لەهەموو روێکەوە بۆ من, لە٨٠٪ی دانیشتوانی ناوچەکەو گشت برایانی پ.م بەپیرمەوە دەهاتن بەجۆرێك رێزیان لێدەگرتم توشی سەرسوڕمان بووم، ئەگەر هەڵبژاردن بکرایە من دەبووم بەلێپرسراو. کاك حلمی ئەوەی باش دەزانی بەبەردەوامی دەیگوت هەموو ئەندامێکی پارتی پێشمەرگەیە بەلام هەموو پێشمەرگەیەك پارتی نییە. منیش دەمزانی ئەوەی لەگەڵ منە چونکە ئەو کاتە بیروباوەڕو عەقڵم هەمووی مەلایی بوو (بارزانی).

دوای ئەوەی هیچ کێشەو گرژییەك نەما نوێنەرانی پارتیو شیوعی هەریەکە گەڕانەوە بۆ جێگای خۆیان. مامۆستا حلمی گوتی مشکلەی گەورەی ئێمە ئەوەیە کەچەکمان نییە، وا مام جەلال بەرەو پێنجوێن دەڕواتو چەند پێشمەرگەیەك دەنێرم تاکو ژمارەیەك چەکمان بۆ بنێرن, ناوی من لەئارادا نەبوو بەهیچ جۆرێك. کاك حلمی گوتی: حەز دەکەم بەکاك محەمەد بڵێیت منیش با بێم تا لەنزیکەوە لەگەڵ مام جەلال قسەبکەم. منیش چووم بەکاك محەمەدم گوت حەزدەکەم بێم لەگەڵتا بەڵکو چاوم بەمام جەلال بکەوێت, کاك محەمەد گەڕایەوە بۆ لای کاك حلمی گوتی کاك رەفیق زۆر جەخت لەسەر ئەوە دەکات کەبێت لەگەڵ مندا, کاك حلمیش گوتی قەیچێکە بیبە لەگەڵ خۆت, بەلام من نەمدەزانی کەئەمە پیلانێك بوو لەلایەن مامۆستا حیلمییەوە بەرامبەر من, چونکە ئەو کاتە من لەسیاسەتدا تازەبووم, هەر لێپرسراوێك فەرمانێکی بەسەرما بدایە بەبەڵی جوابم دەدایەوەو دەستبەجێ بەکارەکە هەڵدەستام. خوداحافیزیم کرد لەمامۆستا حلمیو ئەنوەر مائی, هەروەها هەموو برا پێشمەرگەکان بەتایبەتی لەجەنابیوەسمان بەگ شەرەفبەیانیو کوڕەکانی. گوتم جەنابیوەسمان بەگ انشاءالله رۆژێك دێت کوردستان رزگار دەبێت منیش ئەو شەرەفەم پێبدرێت کەدەست دەرێژکەم بۆ جەنابتان لەبەرچاوی جەماوەر بڵێم ئەگەر ئەم زاتە مەزنە نەبوایە پ.م لەشاخی بەمۆ نەدەبوو, کاتێك پ.م بارەگای لەدەربەندی بێلولە بوو ژیانی رۆژانەمان لەسەر ئەو بوو (حزب فەقیر میللەت دەوڵەمەند).

کەوتینەڕێ لەخزمەتی کاك محەمەد حاجی تاهر بەلیپرسراوێتی کاك حمەی وەلی حمەی کەرمو ئەم پێشمەرگانەشمان لەگەڵدابوون: مامۆستا شێخ محەمەدامین عبابەیلی[12] لەگەڵ

[12] لەبنەمالەیەکی ناسراو, دەرچوی کۆلیژ, مرۆڤێکی نیشتمانپەروەرو خوێندەوارو ئازاو شۆڕشگێڕ بوو, جەماوەری زۆر بوو ڕێزیان زۆر لێدەگرت.

(٥) پ.م هاتبونە لامان کەیارمەتیمان بدەن لەو شەڕەی لەنێوان پارتیو شیوعیدا روویدا بەڵام کەگەیشتنە ئەوێ شەڕ تەواوبوو، بەڕاستی لەهەموو روویەکەوە شایانی باسکردن بوون. ژمارەمان بوو بە١٢ پ.م, شەو گیشتینە گوندی (تاوگۆزی) کەخوالێخۆشبو شاعری بەناوبانگی کورد مەولەوی لەم گوندە هاتۆتە دنیاوە، هەزار رەحمەت لەخۆتو ناوچەکەت کەپێیدەڵێن تاوگۆزی.

شەو دوای نان خواردن کاك محەمەدیان جیاکردەوە لەدەرەوە پێیان گوت کابرایەك رانکوچۆغەیەکی سپی لەبەردابوو ماوەیەك پێش ئێستا هاتەلامان بەمیوانیو ئێسترێکی لێوەرگرتین بردی نەیهێنایەوە من هەرچەند دیقەتی لێدەدەم بەو کابرایەی دەزانم، دوای گفتوگۆو لێکۆڵینەویەکی چەند سەعاتی ئینجا کابرای خاوەن ئێستر بڕوا دەکات کەڕانکوچوغە سپی دکتۆر رەفیقە کابرای دز نیەیە، نەوەك وا حاڵی بوبێت کەهەرچی سمێل سوربوو همزە ئاغایە, لەوەشەوە بوینە برادەر لەگەڵ ئەم خاوەن ماڵەدا، هاتوچۆم دەکردو دەمامەوە بەمیوانی, رۆژی دووەم دور لەهەڵەبجە بەسێ سەعات بەتەنیشت گوندێکدا تێپەڕبوین پیاوو ژنو منداڵ دەوریشتیان گرتین بەچەپڵەو هەلهەلەو گریان باوەشیان پیاکردینو پاڕانەوە شەو لایان بمێنینەوە, ژنێك روویکردە من گوتی کاکی پ.م کوڕەکەم نەخۆشە لەڕانکوچوغەی خۆت پارچەیکم بۆ لێبکەرەوە دەیدەم بەمناڵەکەم بەڵکو خوا شفای بۆ بنێرێت! لەدڵی خۆمدا گوتم انشاالله خوا لەبەر خاتری دڵسۆزیو متمانەی ئەم ژنە بە پ.م، خوا کوردستان رزگار دەکات, ئەوەند خوشحاڵبووم تێر تێر دەستمکرد بەگریانی خۆشی, سوپاس بۆ خوا کەپ.م.ی کوردستان بەمجۆرە جەماوەر باوەڕی پێی هەیە. ڕێکخراوی هەڵەبجە ئاگاداربوون کەئێمە دەگەینە ئەوێ, ئێستاش نازانم چونیان دابەشکردین لەڕێکوپێکی ئەو دابەشکردنە سەرم سوڕمابوو، دووبەدوو هەریەکیان بردین بۆ ماڵێك, منیان بردە ماڵی جمال خەفاف, کاکەحەمەی فرج لەوێ یەکترمان ناسی ئێستاش هەر شانازی بەو یەکتر ناسینە دەکەم چونکە ئەم پیاوە, پیاوی تەنگانەیەو رۆژی لێقەومان بەهاناتەوە دێت.

رۆژی دووهەم ئێوارەکەی لەگەڵ یەکێکی شارەزا رۆیشتم کوچەبەکوچە تا نزیك ماڵی قائیمقام بومەوە, بەتەنها رویشتمە بەردەرگا, پاسەوانەکەی پرسیاریکرد چیت دەوێت, وڵامم دایەوە کێشەم هەیە دەمەوێت چاوم بەقائیمقام بکەوێت, خۆی دەمناسێت, تەماشای جلوبەرگم مەکە کەدڕاوە, ئینجا رۆیشت. کەهاتەوە ڕێگایدام بچمە ژورێ, کەقائمقام چاوی پێم کەوت ئیشارەتی بۆ پاسەوانەکەی کرد ئێرە بەجێبێڵە, کاك کانبی دزەیی[13] بەگەرمی بەخێرهاتنی کردم، بانگی هاوسەرەکەی کرد خوشکە رمزیەخان, ئەمە دەناسیتەوە؟ ئەوە کابرای سەعات فرۆشەکەی بەغدایە، بەجۆرێك ڕێزیان لێگرتم شەرمەزار بووم.

گوتی چۆنوا هاتویتە ئێرە، ناوت زۆر دەبرێت لەم ناوە, ئەگەر بگیرێیت رزگارت نابێت. گوتم: پرسیارت

لێدەکەم کەی پارەی دائرەی توتن دێت؟ گوتی: بڕوابکە من نازانم, بەئوتوموبێلێکی تاکسی دێتو کاتی هاتنەکەی زانراو نیەو لەپڕ دێت, ناردی رانکوچۆغەو پشتێنو کڵاشیان بۆ هێنامو بڕی (دە) دیناری دامی.

هەڵبجەمان بەجێهێشت بنارەوبنار رۆیشتین، دوای ٣سێ رۆژ نزیکی دارۆخان بوینەوە لەگەڵ ئەو هێزەی بەسەرۆکایەتی مام جەلال هاتبوو کەپێنجوین داگیرکات یەکترمان گرتەوە, دوای سڵاو چوینە ریزی ئەو هێزەوە وەکو پ.م, مامە گوتی با حەمەی مامەوەلی بچێتە پێشەوە، چونکە گەنجێکی رێکوپێکە چونکە تفەنگێکی برنەوەی درێژی دارشوشەی پێبوو فەرەنجیەکی سپی کەفشانی لەبەردابوو.

حەمەڕەشیدخانو کوڕەکانی هاتن بەپیرمانەوە، یەکەیەکە دەستیان خستە ناودەستی هەموو پێشمەرگەکانو بەگەرمی بەخێرهاتنی هەمومانیان کرد. مام جەلال پێڵاوێکی دڕاوی لاستیکی لەپێدابوو، هەموو لەشی قوڕاوی بوو، لەو کرێکارانەی دەکرد کەقوڕ دەشێلن. حەمەڕەشیدخان فەرمووی کاتێك بانەمان گرت خێزانی ئەفسەرەکان مەترسییان لێپەیدابوو داوای منیان کرد, کاتێك چوومە ناویان بەیەك دەنگ گوتیان (ان خانە) ئەمەیە خان, ئێستاش مام جەلال لەو ڕوژەی من دەکات, چونکە بەجۆرێك جلوبەرگی تۆزاویو قوڕاویو پیس بوو زۆریان لاسەیر بوو.

حەمەڕەشیدخان ساڵی ١٩٥٣ کاتێك لەشاری کەرکوك دەستبەسەر بوو هاتوچۆی دوکانی حەمەئەمینی شەربەت فرۆشی دەکرد ئەو کاتە یەکترمان ناسیو منی ناسییەوە.

ژمارەی پ.م زیاد لە٤٠٠کەس دەبوو, نیوەڕۆو ئێوارە بەتێکڕایی لەخزمەت خاندا نانمان

---

(١٣) لەبنەماڵەیەکی ناسراوی هۆزی دزەیی، دەرچووی کۆلیژی یاسا، کوردێکی نیشتمانپەروەرو زیرەك، سیاسەتمەدا، برازای خوالێخۆشبوو خدری ئەحمەد پاشا.

دەخوارد, گەورەو بچوك وەك یەك نانی دەخوارد, هەر دوو کەس لەسەر یەك سینی کەسینیەك پێکهاتبوو لەقاپێك برنجو قاپێك شلەو قاپێك گۆشتو زەلاتەو دوو قاپ کاستەر, لەگەڵ چوار نانو دوو پەرداخ ماستاو. پیاوێکی باڵابەرز کەجلوبەرگێکی رێکوپێکی لەبەردابوو تفەنگێکی برنەوەی لەشاندابوو چای دابەشدەکرد، پیاڵە چاکانی یەکە یەکە لەسەر سینیەکی زەردی پاك دادەنا ئینجا خۆی پشتاوپشت دەگەڕایەوە. من ئەو کاتە هەرچییەکم بدیبایە لەمێشکم تۆمارم دەکرد بۆ ئەم رۆژە.

دوای ٥ ڕۆژ کاك محمود کاوانی[١٤]، دارۆخانی بەجێهێشت. مامە فەرموی تۆ بچۆ لەبنکەی دڕی لەماوەت دانیشە تاکو پێنجوین دەگرین, منیش هەموو وەڵامەکەم هەر بەڵێ بوو. لەگەڵ جەنابی کاك محمود کاوانی کەوتینە رێ، چوار لەخزمەتیدابووم, کاتێك دابەش دەکراین بەیەکەوە دەبوین پەنجەی بۆ من درێژ دەکردو دەیفەرموو ئەمە لێپرسراوە. ئەگەر لەماڵێکیتر بوومایە دەهاتە لام یا دەینارد بەیەکەوە دادەنیشتین, ئیوارەیەکیان بەناو گوندێك تێپەڕین تکایان لێکردین چایەکمان لا بخۆنەوە, منو کاك مەحمود لەبەردەمی

ماڵێکدا دانیشتین ژنی ماڵەکە نانی دەکرد, فەرموی لێکردین نانو تەرەپیازو دۆی بەهار بخۆن, ١٦نانی ساجمان خوارد, دەستی کاك محمودم گرت کەبینیم چوار گونك هەویری مابوو با ئەمەش بۆ منالەکەی بێت, ژنەکە بەپاڕانەوە گوتی: بەقوربانی پ.م بم، خوا بکات بەنانی من رازی بن بەرختان بۆ سەردەبرم.

پێش جیابونەوە دووبەدوو قسەی لەگەڵ کردم, گوتی چی تۆی گەیاندە شاخی بەمۆ, بۆچی نەهاتیتەلای بارزانی, ئێستا کەدەچیتەوە بارەگای دڕی لەوێ دەستبەسەر دەبیت، وەرە لەگەڵ من دەتگەیەنمە لای بارزانی. گوتم من هیچ لەخۆم شك نابەم, ئەگەر بێم گوێی بارزانی پڕدەکەن ئەم فەرمانەش بەدڵ جێبەجێ دەکەم. بەخۆمم گوت رەفیق سەبرت بێت ئەمەش بەسەر دەچێت, ئەمە دەستێکی گەورەیە، لەلایەکیترەوە زۆر عاجزبووم چونکە

---

(١٤) کوردێکی نیشتمانپەروەر, ئازاو زیرەك, زەمانیك بوو نزیکترین کەس بوو لای بارزانی, بنەماڵەیەکی فیداکاری خاوەن شەهیدن لەپێناوی کوردو کوردستان, رۆژگارێك رۆژانە لەسەر زمانی بەشی زۆری کوردی بەشەرف ناوی دەهات, صدیق میرانی تیرۆرکرد, راستی چەند لەسەری بنوسێت کەمە, روونو ئاشکرابوە که بەفەرمانی بارزانی صدیق میرانی کوشت.

زوڵمم لێکراوە, چالاکیو فداکاری من دەنگی دابوەوە ئێستا (فلان) بەم شێوەیە پاداشتەکەم دەداتەوە، شەرتم کرد بەسەر خۆمی نەهێنم. کەبرا پێشمەرگەکان دەگەڕێنەوە پرسیاریان ئاراستە کردبوون دەربارەی من دەڵێن لەگەڵ گەیشتنمان رێزێکی زۆریان لێدەگرت, هەمو کاتێك لەدیوەخانی حمەرەشیدخان دەماندیت لەپڕ نەما, پرسیارمان کرد وەلامیان داینەوە لەگەڵ مەحمود کاوانی رۆیشتووە, بەلام پێش گەڕانەوەمان بەهۆی تەتەرێك زانیمان لەبنکەی دڕی (ماوت) دانشتوە, دەڵێن دەستبەسەرە, کاتێك پێشمەرگەکان دەچنەوە بلاو دەبێتەوە رەفیق دەستبەسەرە,وەسمان بەگو کوڕەکانیو خەڵکی ناوچەکە دەمیان دەکەنە مامۆستا حلمی بەتاوانباری دادەنێنن یان دەستی تێدایە یا بێدەسەلاتی, ئەی هۆی چییە ئاوا بێ هیچ هەولدانێك بۆ بەربونی راوستاویت.

لێپرسراوی بارەگای بنکەی دڕی لەماوەت نەیدەزانی من بۆچی لەلایەن مام جەلالەوە نێردراوم, لەهەمانکاتدا خۆشم هیچم نەدەزانیو بەهیچ شێوەیەك باسی رابوردووی خۆم بۆ ئەو خەڵکە نەدەکرد. دەبوو هەموو رۆژێك کاتژمێر ٤ی سەر لەبەیانی لەگوندەکە دەربچینو لەترسی فرۆکە کەس لەبارەگا نەمێنێتو خۆمان بشارینەوە, ئێوارەیەکەیان کابرایەك مێوژی دەفرۆشت کیلۆی بە(٥٠) فلس, زۆر حەزم لەمێوژبوو بەلام یەك فلسم پێ نەبوو, ناچار وەکو سوالکەر بەرامبەری راوەستام گوتم بەڵکو یەکێك لەوانەی کەمێوژ دەکڕن دڵیان نەرم ببێت هەندێك مێوژم بدەنێ بەلام سەیرمکرد کەس هیچی نەدامێو مێوژ فرۆشەکەش خەریك بوو دەرۆیشتەوە، ئینجا بانگی کردم گوتی(دکتۆر رەفیق وەڵڵا حەز لەمێوژ دەکەیتو پارەت پێ نییە, ئەوە روبعە دینارێكو کیلۆیەك مێوژ خێری مەولودی پێغەمبەر). ئەمە ساڵی ١٩٦٢ روویدا، ئەو کاتە

تەمەنی ئەو کابرایە تەمەنی ٥٠ ساڵێك دەبوو، لەوانەیە ئێستا کۆچی دوایی کردبێت هەروەها ماڵی شارەزانیم ئەگینا پاداشتێکی زۆر چاکم دەدایەوە.

من پاڵم لێداوەتەوە بەسەر خۆمی ناهێنم, چونکە ئەم ڕێگایە خۆم هەڵمبژاردوەو کەس تاوانبار نییە لەوەی بەسەرم هاتووە، دڵسۆزیو تێکۆشانم بەو ڕۆژەی گەیاندم چونکە زۆر زوو جێ خۆم کردەوە لەناو (پ.م)و دانیشتوانی ناوچەکەدا, دەمزانی ئەم ڕێگایە گرتومە کوشتنی تێدایە یا ڕۆژێك بەدیل دەگیرێم, بەڵام ئەمەم چاوەڕوان نەدەکرد, من تازەکورەبووم نەمدەزانی ئەم جۆرە دەسیسە هەیە کوردیش بەکاری دەهێنێ.

ماوەی ١٥ ڕۆژ زیاتری پێچوو بێئەوەی کەسێك قسەیەکەم لەگەڵ بکات یان شتێکم پێ بڵێت, خەریکی خواردنو نوستنم بەڵام پارەم پێ نیە, لێپرسراوی ڕێکخراوی قەلادزێ کاك عەبداللە ئەحمەد[١٥] نوسراوێکی بۆ ناردبووم کەچیم پێویستە، منیش داوای پارەو جەلوبەرگم کرد, کاتێك بۆی ڕەوانە کردبووم بۆیان ناردبۆوە, چونکە ئێواریەك ئاگاداریانکردم کەبەیانی دەکەویتەرێ بەرەو شاری سلێمانی لەگەڵ جەڵەبچی دەگەیتە مەیدان پرسیاری ئەم ناوە بکە, گەیشتم برادەرەکەم دۆزیەوە تەسلیمی ماڵێکی کردم بردیانم بۆ حەمام بەجلوبەرگی دڕاوو پیسەوە, ناتر پاك شوشتمی کەهاتمە دەرێ سەیرمکرد جلە کۆنەکانم نەماوە بەڵکو لەسەرەوە تا خوارەوە هەمویان بۆ گۆڕیوم بەتازە, خاوەن حەمام لەگیرفانی خۆی ناردی چوار کەبابو دووشیش تەماتەو ماستاوو چوار نانیان بۆ هێنام، باشیان گوتووە کەخەڵکی دەرێ دێتە شار کەدەگەڕێتەوە پرسیاری لێدەکەن چیت خوارد دەڵێت کەباب, ئینجا بەسواری عەربانە بردیانمە ماڵێك لەوێشەوە بردیانمە ماڵێکیتر کە بەناسیاوی ماڵەوەمان دەرچو ئەویش خوشکە بهیە مەعروفە[١٦] . پارەیان بۆ ناردم، ڕێکخراو ڕەوانەی هەڵەبجەیان کردم لەوێشەوە بۆ بارەگای بەمۆ. ئەم ڕووداوەم نەگێڕایەوە چونکە خۆشم بەتەواوی باش تێنەگشتم! ڕۆژێك لەماموستا حلمی یا مام جەلال دەپرسم.

[١٥] بنەماڵەکەی لەکوردستانی ڕۆژهەڵاتەوە هاتبونە قەڵادزێ حێنشین ببوون، زۆر خۆشەویست بوون جێی خۆیان کردبۆوە, یەکێك لەکوڕەکانیان ناوی عەبداللە مام ئەحمەد بوو برادەرێکی دڵسۆزو خۆشەویستو هەمیشەییم بوو, بوو بەئەندامێکی پارتی، دوایی بو بەلێپرسراوی ڕێکخراوی قەڵادزێ، ناوێکی بۆ خۆی دروستکرد لەهەموو ڕویەکەوە ئێستاش باسی خوڕەوشتو کردەوە جوانەکانی دەکەن کەشایەتی ئەوەیە نمونەی کادرێکی حزبێکی سیاسی بیت, چەند لەسەر هەڵوێستی بنوسی کەمە. کاتێك دووبەرەکی پەیدابوو لەنێوان بارزانیو مەکتەبی سیاسی جەماعەتەکەی ابراهیم ئەحمەد، (استقالەی) کردو ئەو مێژووە چاکەی بۆ خۆی بەجێهێشت هەر چەندە حەسو میرخان بارزانی گوشاری خستەسەر کەبۆ جارێکی تر بێتەوە. لەداخی دوو ڕوداو توشی نەخۆشی شێرپەنجەبوو کەیەکێکیان دووبەرەکی بوو ئەوەی تریان بەهۆی ڕۆستەمی برایەوە بوو, توانیم دەستی یارمەتی بۆ درێژکەم لەکاتی نەخۆشیەکەیدا بەڵام بێ هودەبوو، چونکە نەخۆشی شێرپەنجە چارەسەری نییە.

[١٦] لەماڵی خۆشکە بەهیە معروف پێنج ڕۆژ مامەوە، بەخۆیو دایكو خوشکیەوە هەمویان خزمەتیان کردم. ئەم ئافرەتە ڕۆشنبیرە لەسەرەتای ژیانیەوە بەکاری سیاسیەوە سەرگەرم بووە، بگرە دەتوانی بڵێیت، سەرانسەری ژیانی خۆی تەرخانکردەوە لەپێناوی خزمەتکردنی کوردو کوردستان، انشاءاللە بەخەبات بۆی نوسراوە، بەڵام مادام ئێستا بزوتنەوەی کوردی بووە بەدوو بەشەوە ڕەنگە لەلایەکەی تر بەتاوانباریش لەقەڵەم بدرێت.

کاتێك گەیشتمە ناو برا پێشمەرگەکان هەرچەندە پرسیاریان لێدەکردم چ دووبەدوو یا بەکۆمەڵ وەڵامی

من ئەوەبوو, مسئولانی پارتی بیستویانە کەخزمەتێکی زۆرم کردوەو ماندوو ببووم پێویستم بەپشودانە بۆیە منیان ناردە شاری سلێمانی تاکو پشوبدەم. چەند جار کاك حلمی دەیویست پاکانە بۆ خۆی بکات, یەکسەر وەڵامم دەدایەوە هیچ رووینەداوە تکام وایە ئەمە بەهیچ جۆرێك لەناو پێشمەرگەکان بڵاونەبێتەوە چونکە زیان بەم.س. بەتایبەت بەشخصی تۆ دەگەیەنی (چونکە دوژمن چاڵ بۆ بەرامبەرەکەی هەڵدەکەنێت نەوەك لێپرسراوێك بۆ پێشمەرگەکەی خۆی بەڵام لەوە دەچێت ئیمرۆ بوبێت بەباو).

کەبیرم دەکردەوە ئەوەی ئەو چاڵەی بۆم هەڵکەندبوو ئەوەبوو دور بکەومەوە لەکودرایەتیو رابکەم بۆ لای میری یا لەگەڵ محمود کاوانی ریگا بگرمە بەرو دواڕۆژم تاریك بێت، سوپاس بۆ خوا بەحەقی خۆم چومەوە ریزی پ.م لەجاران زیاتر لەدەوروپشتم کۆبونەوە. دڵنیام لەوەی هەرچەندە من راستییەکەم نەدەدرکاند, بەڵام ئەوان دەیانزانی. لەجاران زیاتر هەوڵمدا جێدەستم دیاربێت لەخزمەتی کوردو کوردستاندا.

مامۆستا شێخ حمەئەمین عەبابەیلیّ لەگەڵ ٥ پ.م بەو نیازەی ئێمەش لەگەڵی بڕۆینە ناوچەی هەڵەبجە جەولە بکەین زۆری گوت بەڵام کاك حلمی نەیدەویست لەغەیری خۆی ناوی کەس بڵاوببێتەوە, منیش پشتم گرت بەڵام رای یەکەمو دوایی لای حلمی بوو.

ژمارەی پ.م گەیشتە ٤٠ کەس, ژمارەی چەکەکانمان زیادیکرد، خواردنمان باشتر بوو, لەجاران زیاتر بەگوندەکاندا جەولەمان دەکرد تاوای لێهات نزیکی شارۆچکەی خانقین بووینەوە. دوای پاشەکشەی چەکداری هۆزەکان لەدەربەندیخان لەساڵی ١٩٦١وە هێزی پ.م یەکەم جارە بەئاشکرا رووبکاتە ناوچەی جاف لەگەرمیان. لەبنکەی بەمۆ ٣٤ پ.م لەسیروان پەڕینەوە، دوای دە سەعات گەیشتینە گوندی گۆڕەشە, لەسەعات ١١ی شەو بەجۆرێك ماندوبوون لەدووری گوندەکە لەسەر خەرمانێك پشوماندا هەمومان خەوتین پاسەوانەکەشمان خەوت, سەگی گوندەکە دەوەڕین, خەڵکی گوندەکە بەدەنگ سەگوەڕەوە دێن کەدەگەنە لامان دەبینن وا چەکدارێکی زۆر هەموی لەخەودایە نزیك دەبنەوە کەسەرنج دەدەن بەشی زۆرمان دەناسنو خزمایەتیان لەگەڵ هەندێکدا هەیە, دەڵین دیارە زۆر ماندون با دورکەوینەوە تاکو تێر بخەون, چواریان دەگەڕینەوە ناو گوندەکە دەڵین خۆتان ئامادە بکەن حەیوان سەربڕن، ئەوانە پێشمەرگەن، با بەتێکرایی بەپیریانەوە بچین. کاتێك خەبەرمان بوەوە هاوارو هەلهەلە دەستی پێکرد بەرەورومان هاتن، بەجۆرێك باوەشمان بەیەکداکرد یەکترمان بەرنەدەدا, ئێمە کەخەلکی ئەو ناوچەیە نەبوین بەشێکمان غەریب بوین لەخۆشیو شادی ئەم دیمەنە دەستمانکرد بەگریان, خەڵکی گوندەکە کەبینییان ئێمە وا دەگرین یەکسەر پیاو ژن رویانکردە ئێمە دەستیان ماچ دەکردینو شانیان ماچ دەکردین بەقوربانمان دەبوونو دوعای خێریان بۆ دەکردین, ئینجا خوشکان بەتێکڕایی دەستیانکرد بەگریانی خۆشی.

ئینجا گوتم: نەخشەمان ئەوەیە کە بەنهێنی لەناو گوندەکاندا جەولە بکەین تا هەڵوێستی جەماوەر بزانین. ئامادەبوان یەکسەر لەبەگزادەو شێخو مەلاو جوتیار هاواریانکرد بانگی محەمەد بەئاشکرا خۆشە،

نەمردین (پ.م)مان دی، ئیمرۆ جەژنە, رۆژی شادییە, ژمارەی ٢٠ پ.م بەڵکو زیاتر خەڵکی دانیشتوانی ناوچەی جاف بوون, لەناو هۆزی جاف بەگشتی ئەم برا پێشمەرگانە رێزێکی تایبەتییان هەبوو بەهۆی ئازایەتیو فیداکاریو کوڵنەدەریو خواناسیو نیشتمانپەروەریێتیانەوە, هەمویان جێی شانازیی بوون بەشێکی زۆریان وێنەیان لەبەرچاومە, بەڵام ناوی هەندێکیانم لەبیر چوەتەوە. لەوانە حسێن حاجی محیالدین, عەلی سەلیم بەگ, حەمەی مامەوەلی حەمەی کرم, حەمەئەمین کەلاری, عەبدالرحمن زلکەیی, عەزەی حەوا, رەشەجاف, قادرجاف, حسن خلیفە مالك, کامل مەلاوەیسی, محمد صوفی, عەزەی حەمەخەنان. کاك حسین حاجیو عەزەی حەوا فەرمویان دکتۆر رەفیق ئەوە بۆچی وتارێك ناخوێنیتەوە, ناوچەکەتان ئەوەندە ورەیان بەرزە وابزانم دەبێت ئەم جەماوەرە بەرێزە قسە بۆ ئێمە بکەن.

ئەوەی لەبیرم مابێت بەدەنگە بەرزەکەی خۆم سوخەنرانیم کرد لەناو گوندەکە گوتم ئەو هەڵوێستەی ئێوە نیشانەیە کەدوارۆژمان روناکە, پیاو ژنو بەگزادەو شێخو مەلاو جوتیار لەگەڵ هێزی پ.م ی کوردستان بەسەرۆکایەتی بارزانی هەموی بەتێکڕایی گیانی خۆی فیداکاری دەکات بۆ رزگارکردنی کوردستان، بەڵی ئێوە کوردستان رزگار دەکەن, پێغەمبەر(د.خ) فەرمویەتی (من لم یدافع عن دینه وعرضه لیس منا), چەپڵەو هاوار هاوار دەستی پێکرد، بژی بارزانی... بژی پ.م... بژی کوردستان... بروخێت دکتاتۆر قاسم.

روومانکردە هەرگوندێك هەموی بەم شێوەیە بەپیرمانەوە دەهاتن پێشوازییان لێدەکردینو خوشحاڵی خۆیان دەردەبڕی, یەکێکمان نەدی روی گرژبێت, هەر ماڵێك رومکردوٚتە ناویان یەکسەر جلوبەرگیان بۆ شۆردوین بۆ گشت پێشمەرگەکان بەبێ جیاوازی, دوای حەوت رۆژ گەڕاینەوە بنکەی شاخی بەمۆ. ژمارەمان بوو بە٧٠ پ.م، هێرشێکی گەورەمان بردەسەر ناحیەی مەیدان بەنیازی گرتنی بەڵام لەبەر زۆر هۆ سەرنەکەوتین.

بەم هێزە گەورەیە لەنزیك شارۆچکەی خانەقین جەولەمانکرد ئینجا هاتینە گوندێك نزیکی حەوشکور، ٢٠ ماڵ دەبوون زۆر دەوڵەمەندو خاوەن مەڕوماڵاتێکی یەکجار زۆربوون, کێشەی ئابورییان نەبوو، لەناو خۆیاندا ریکوپێك بوون, رێزێکی باشیان لێگرتین, داوایان لێکردم وتارێك بخوێنمەوە, هەرچی دەهات لەبرا پێشمەرگەکان من هەر بێدەنگ دەبووم ناچاریان کردم کەقسەیان بۆ بکەم. گوتم: ئێمە نزیکەی ٢٠ سەعاتە لەخزمەت ئێوەین نانی نیوەڕۆو ئێوارەو بەیانیمان لای ئێوەی بەرێز خوارد, ئەی برایانی بەرێز دانشتوانی گوندی گۆڕشەلە ئاگرتان بەتەپاڵەیە خانوەکانتان بەقامیش سەری گیراوە با ناگیرێتەوە, من نالێم ببنە پ.مو کوردایەتی بکەن ئێمە ئەمشەو بەتێکڕایی پاسەوانی ئێوە بوین یەکیك لەئێمە چاوی نەچوٚتە خەو, هاتوین بەناوی پ.م کوردستان داواتان لێدەکەین کەخۆتان چاك بکەن، لەو جۆرە ژیانەتان لەکاتێکدا هەموتان دەوڵەمەندن کەچی بەم جۆرە دەژین, تکامان وایە لەمڕۆوە جۆری ژیانتان بگۆڕن خوا ڕازی نابێت بەم جۆرە بژین, ئەگەر رەحم بەخۆشتان ناکەن رەحم بەمناڵەکانتان بکەن، ٢٤ سەعات یەك قسە دەڵێنەوە (مەڕەکان

مەڕەکان مەڕەکانم). هەرچەند وتەکانم لەشوێنی خۆی نەبوو بەڵام گۆڕانکاریەکی باش لەم گوندە رویدا لەڕوی ژیانی رۆژانەیان, دوای ٢٥ ساڵ خەڵکی ئەم گوندەم دیت ئەوان باسیانکرد کەدوابەدوای قسەکانی تۆ بیرمان لەبارودۆخی خۆمان کردەوە لەهەموو روویەکەوە.

بەردەوام بوین لەجەولەکردن لەدەروپشتی ناحیەی مەیدانو شارۆچکەی خانقین، هاتینە گوندی حەوشکور.. لەبەر گرنگی ئەم گوندە بەلامانەوە دوو شەو ماینەوە کەگەورەترینو کۆنترین شارۆچکەیەو مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ پێش دینی ئیسلامی بە ٢٠٠٠ ساڵ, جێو شوێنی سنوری شارەکە ئیستاش دیارە, نزیکەی ٣٠ دوکانو ٥٠ خانووە بەهاوین فینكو زستان گەرم. هەستی کوردایەتییان زۆر باشە, مامۆستا عەلی حمدی لەکاتی خۆ شاردنەوەیدا دوو مانگ لەویَ دەمێنێتەوە.

کاتژمێر ٩ی شەو لەبارەگای بنکەی شاخی بەمۆ بوین، بەشێکمان خەوتبوین، لەرێگای رێکخراوی شارۆچکەی خانقین ئاگاداریانکردین کەبەیانی مووچەی ناحیەی مەیدان کەسەر بەشارۆچکەی خانەقینە دێت. کاك حلمی ئاگاداریکردین بەسەرۆکایەتیو سەرپەرشتی کاك حەمەیوەلی حمەی کەرم کەوتینە رێگا, کاتژمێر چواری بەیانی هاتینە ناوچەی ناوماچك، زۆر بەرێکوپێکی بۆسەمان بو دانان، خۆمان ماتکرد, یەکێك لە(پ.م)ەکان لەماڵی پ.م کویخامحەمەد نانو ئاوی هێنا, کاتژمێر دووی دوای نێوەڕۆ سەیارەیەکی پۆلیس هات لەهەموو لایەکەوە دەستڕێژمان لێکردن، کەوتنە بۆسەکەوە چارەیان نەما تەسلیم بوون, دەستکەوتمان رەشاشێکی برێنو دوو تفەنگی هۆڵەندی بوو, دوابەدوای ئەوە سەیارەیەکی تاکسی هات ویستیان پارەکە بشارنەوە بەڵام ناچارمانکردن خۆیان پارەکە تەسلیم بکەن, دوابەدوای ئەوان پاسێكو سیارەیەك هات ئەوانیشمان راوەستاند, ٩پولێس بەدیل گیران.

بەدورودرێژی رەوتی شۆڕشم بۆ روونکردنەوە، ئینجا هێنامن بۆ سەر گۆڕی شەهیدانی کوردو کوردستان هیتافم پێکێشان (بژی پ. د.ك بەسەرۆکایەتی بارزانی), دیلەکانو گشت ئەو هاوڵاتیانەی کەدەچونەوە بۆ گوندەکانیان بەرێزەوە بەرێمانکردن، داوای لێبوردنمان لێکردن کە بەهۆی ئەم رووداوەوە دواکەتوون لەئیشوکاریان. ئێمەش بۆ ئەوەی بەسەلامەتی بگەڕێینەوە, بەرێگاکەدا نەگەڕاینەوە بەڵکو گردو گردو شاخەو شاخ دەهاتین, جووتیارێك پاسەوانی خەرمانەکەی بوو لەسەر جۆخینەکەی میلی دەمانچەی راکێشا بەدەنگێکی بەرز گوتی ئێوە کێن لەوە زیاتر نەیەنە پێشێ, هەر چەندە هاوارمانکرد برا گیان ئێمە پێشمەرگەین بڕوای نەکرد, زۆر لەبرایانی پ.م گرژ بوون کەرووبەڕوی بوەستین, من رازی نەبووم گوتم (من دکتۆر رەفیقم)، دەستم بەرزکردەوەو دەنکە شقارتەیەکەم لێداو چوومە بەردەمی, کەمنی دیت بەگەرمی پێشوازی لێکردین، هەرچی لای بوو لەخواردن لەبەردەمی ئێمەی دانا ئینجا خوداحافیزیمان لێکرد رۆیشتین. بەرەبەیان گەیشتینەوە, کیسەی پارەکە بریتی بوو لەقوماشێکی خامی سپی کە لەبارەگای پ.م کردمانەوە بڕی دوو هەزارو پەنجا دیناری تیدابوو, هەر پ.م بڕی پێنج دیناریان پێدا. من بەپارەکە دوو گیسکم کڕی

بەپێنج دینار کەبەخۆشی خواردمان, حەفتەیەك سەرانسەر شەوان لەخۆشیدا دەستمان دەکرد بەهەڵپەرکێو گۆرانی, لەوێوە زۆر حەزم لە هۆرەو قەتارو اللهوەیسی کرد.

بەپێی ئەو رۆژە روداوێکی یەکجار گرنگ بوو لەپارێزگای دیالی کەپێشمەرگە بەم ئیشە هەستێت. چونکە لەو کاتەدا دەزگاکانی سەر بەقاسم پروپاگندەیان دەکرد گوایە تەنها چەند موخەربێك ماون‌و لەئەشکەوتەکاندا بەشەو دێنە دەرێوەکو شەمشەمەکوێرە وان. ئەو روداوە دەنگیدایەوەو هەموو ئەو پروپاگەندانەی دەزگاکانی رژێمی قاسمی بەدرۆخستەوە.

## جەولەکردن

کاتێك کەمن هاتمە ریزی پ.م لەبنکەی بەمۆ تەنها لەو گوندانەی خوارەوە جەولە دەکرا, دەربندی بێلولە, باخەهەنارە, بێولە, شاوازی, خرکنێ, کەمناران, سەرتەك, هۆرێن, شمشێرکوڵ. دوای ئەوە هێزی پ.م گەیشتە ئەوەی لەگشت ئەو گوندانەی کەوتونەتە نزیك شارۆچکەی خانقین جەولەبکەین‌و بگەینە گەرمیان‌و جافایەتی, ئەمە سەرکەوتنێکی گەورەیە کەگوند لەدوای گوند رێبازی شۆرشیان بۆ روونده‌کەینەوە، لەهەموو گوندێك گەورەو بچوك بەچاکی پێشوازییان لێدەکرێن, ژمارەمان رۆژ بەرۆژ لەزیادیدایە, لە ٧٠ پ.م بوین بە١٢٥ پ.م، ئەگەر چەك هەبوایە دەگەیشتنە ٣٠٠ پ.م.

بۆ یەکەم جار لەدایکی گەورەی بەرێزمەوە نوسراوم بۆ بێت خستمە سەرچاوم. بەهۆی رێکخراوی خانەقین, رونیکردبوەوە کەزەروریە سەرێکمان لێبدەیت گەر بۆ یەك شەویش بێت. نامەکەم تەسلیم بەمامۆستا حلمی کرد, گوتی چۆن بەتەنها جێم دەهێڵیت, مامۆستا ئەنوەر مائی[١٧] فەرموی تکات لێدەکەم ئەم سەفەرە مەکە چونکە خەونم دیوە, پ.م بەگشتی رازی نەبوون. بەردەوام گفتوگۆم لەگەڵ دەکردن دوای دوو رۆژ رازیبوون, خۆشم زۆرم پێخۆش بوو. خوداحافیزیم لەمامۆستا حیلمی‌و مامۆستا ئەنورەو گشت برایانی پ.م‌و

جەنابی وەسمان بەگو کوڕەکانی کرد.

لەگەڵ دوو برای پێشمەرگە کەوتینەرێ، شەو گەیشتنە گوندی کەلار، چوومە خزمەت مستەفابەگی جاف, بەیانی پێکەوە سەعات شەش گەیشتینە بەغدا, ئینجا لێکجیابووینەوە.

---

[١٧] لەسەر ئەو مامۆستا تێکۆشەرو رۆشنبیرە چەند بنوسرێت کەمە لەبارەی خۆڕەوشت‌و ئازایەتی‌و زیرەکی‌و خوێندەوارییەوە، لەهەمووی گرنگتر ئەوەندی پەیوەندی بەرێکخراوەوە هەبو کاتێك بارزانی دەیکا بەلێپرسراوی بەرواری بالاّ بەبروسکە ئاگاداری مامۆستا ابراهیم ئەحمد دەکاتەوە دەڵێت ئێوە رازین؟!

مـن چـومە مـاڵی خزمێکـی هاوسـەرەکەم کـاك جـەمال عـەزیز خـاڵی کـاك حەسـەن رفعـت, ئێوارەکـەی هاوسەرەکەم‌و دایکم‌و کمال‌و روبارو بازیان هاتنەلام, ئەو چاوپێکەوتنە لەگەڵ چاوپێکەوتنەکەی بەندیخانەی رمادی ساڵی ١٩٦٢ جیاوازیەکی زۆری هەبوو، سیخوڕ بەسەرمانەوە نەبوو بەدایکم بڵێت بەعەرەبی قسەبکە.

لەیەکەم رۆژەوە لەبارەگای پ.م هاتمە دەرێ رووکردبێتە هەر شوێنیك ئەم قسانەم کردوە, ئێمە لەهەموو رویەکەوە گەلێك لەئێوە باشتردەژین, ئەویش بەهۆی ئازادیە. بەپشتیوانی خواو قارەمانێتیو تێکۆشانو فیداکاری برا پێشمەرگەکان بەزوترین کات ئازادی باڵدەکێشێت بەسەرتاسەری کوردستاندا. هاوسەرەکەم گوتی: هاتبوون بمگرن بەڕێوەبەرەکەمان خێزانی شاکر خصباك, وەڵامی دابونەوە لێرە نییە, ٢٥ رۆژ خۆم شاردەوە لەماڵی دراوسێیەکمان (عبدالکریم الندی) کوڕی خاڵی ئەحمەد حسن بەکر, ئیشەکەیان بۆ جێبەجێکردم بەتەواوەتی, باری تەندروستیم خەتەرناك بوو بەڵام ئێستا روو لەباشیە، روبار لەراهباتە. کەمال گوتی: چۆن مریشك دەورویشتی جوجەڵەکان دەدات منیش روبارو بازیان هەمیشە بەباوەشمەوەن پێم دەڵێن بابە, بەهۆی جەمال قادربەگ بابان دامەزراوم بەسەرپەرشتیار (مراقب) لەگەڵ صەباح میرزا کەمانگانە ١٩ دینار وەردەگرم. دایکم گوتی: هیچ فکری لێمەکەرەوە لەهەموو رویەکەوە ئێمە گەلێك باشترین، خودا بکات کوردستان رزگار بێتو تۆش بەسەلامەتی بگەڕێیتەوە ناومان ئێمە هیچمان ناوێت، لەرەحمی خودا بەزیاد بێت, مووچەی دایکی بازیان ٤٧ دینارە مانگانە ٤٥ دەدات بەمن, کەمال مانگانەی ١٩ دینارە, بڕی ١٥ دیناری دەدات بەمن, ئیدارەی پێدەکەین ئەگەر نەخۆشی کاك بازیان وازمان لێبێنێت ئەویش زوو زوو دەیبەینە مەزاری شێخ عەبدلقادر گەیلانی، دوو دراوسێی باشمان هەیە ماڵی حمەسەعیدبەگ جافو حمەرەشیدبەگ, زێباخانو بەهیەخان شەوو رۆژ بەسەرمان دەکەنەوە, میرحاجیش زوو زوو بەسەرمان دەکاتەوە. پرسیاریان لێکردم پارەت پێیە منیش گوتم بەڵێ بڕی چوار دینارم لەگیرفاندایە ئەگەر دەتانەوێت, هەمویان پێکەنین ئەوان ٥ دیناریان دامێ.

دوای پێنچ رۆژ رووم لەکادرێکی ناسراوی پارتی کرد لەکاظمیە (ناوی ناهێنم چونکە کۆچی دوایی کردوە)، دەرگای لێکردمەوە گوتی: ناوی خۆت مەڵێ, دەمزانی هاتویتەوە، شوێنم پێنەدەزانی باشە خۆت هاتویت, ئەم کارە ئەنجام بدە. گوتم: ئەمە پێنج شەوە لێرەم, شەوێك لەماڵی جەمال عەزیزبووم شەوێك لەماڵی خۆمان, شەوێك لەماڵی نوری مەلامارف, دوو شەو دوای سەعات دوانزەی شەو لە ئەبونەواس لەسەر تەختی چایخانە دەخەوتم, ریشهاتوو کراس چڵکن کەسێکتان ماڵمانی بەسەرنەکردۆتەوە جەنابتان فەرمانم بەسەردا دەدەیت. گوتی: ئەمە پەیوەندی بەخۆتەوەیە بۆچی پەیوەندیت بە پ.م کرد.

هاتمە دەرێ بەپێ رۆیشتم نزیکی پردی (جسر الحدید) بومەوە لەپڕ کاك بێباك کوڕی حامدبەگ جاف بەدەم پێکەنینەوە هاتە بەردەمم بەگەرمی چاكو چۆنی لەگەڵداکردم, کەوتینە گفتوگۆ کردن, بەهۆی هاوسەرەکەی وەسمان بەگ شەرفبەیانی خوشکە ئەختەرخان ئاگاداری من هەبوو، بۆم گێڕایەوە کەوا پێنج رۆژە لێرەم, ماڵمان دوو رۆژە نازانن لەچ ماڵێکم, ناشبێت بزانن چونکە ئەوان بەمە دڵتەنگ دەبن. گوتی: ئێمە حزبی نین، ماڵی ئێمە هەر کوردێکی نیشتمانپەروەر پێی رازی بێت دەیخەینە سەر چاو, خودا بکات بەڕێزتان رازی بن دەتوانین خزمەتت بکەین.

ماوەی ٥ رۆژ بەجۆرێك خزمەتیانکردم کەهەرگیز لەبیرم نەچێتەوە, شەرمەزاریان کردم لەهەموو روویەکەوە, ماڵەوەمان بەتێکڕایی هاتنە ئەوێ, ئەنجا جلوبەرگی تازەیان بۆ کردمو رادیۆیەکی باشیان پێشکەش کردم, بەداخەوە نەمتوانی منیش وەکو پێویست ئەم قەرزە بدەمەوە, لەراستیدا بنەماڵەی حامد بەگی جاف بەم شێوەیە سەرانسەر خزمەتگوزارییان کردووە بۆ هەموو کوردپەروەرێك.

خوداحافیزیم لێکردنو بەغدام بەجێهێشت, گەیشتمە کەلار دوو شەو مامەوە, لەگەڕانەوەدابووم دوو پ.م قالەی رەزا جافو رەشەی رەزا جاف رێگەیان نەدام لەرێگای تایبەتی خۆم بگەڕێمەوە، ناچاریانکردم کەدەبێت بەقسەی ئەوان رێگا بگرمەبەر تاکو بەسەلامەتی بگەمەوە, دەیانگوت چۆن دەبێت دەکتۆر رەفیق هەروا بگەڕێتەوە. کەوتینە رێگا هەردە لەدوای هەردە رۆیشتین ئەوان بەسواری, منیش بەپیادە چونکە وام لێهاتبوو بەپێ زۆر باش رێگام دەکرد, نزیك گوندی تازەدێ چاوەڕوانبوین لەجادە بپەڕینەوە لەپڕ ئۆتومبێلێکی پۆلیسی گومرگ چاوی بینیمانی پۆلیسەکان تەقیان لێکردین, ئەوان رایانکرد منیان بەجێهێشت, هەرچەندە دەمانچەکەم هەڵکێشا هیچ شتێکم بۆ نەکرا گیرام, پۆلیسەکان دابەزین یەکێکیان دەستی بەگیرفانمداکرد چی تیدابوو دەری هێنا, ئەویتر دوو شەپازەلەی دا بەگوێچکەم. من بووم بەکەوا سپی بەر لەشکر.

## دکتور رەفیق بەدیل گیرا

بردیانمە مەخفەری قەڵای شێروانە لەژورێکی تەنهایی دایاننام, دەرگایان داخست، زۆر ماندووبووم, خەوتم پشوویەکی باشمدا, نانیان بۆ هێنام زۆر باش خواردم, ئینجا چاوم نوقاند خۆم کرد بەنوستو. دەستمکرد بەبیرکرنەوەو پیلانو نەخشەی تازەم کەچۆن بجوڵێمەوە, چۆن چۆنی بێت تازە تووشی هاتم ئەمە رۆژێك بوو مەترسیم لێبوو هاتە پێشم, دوو رێگا هەیە, یەکێکیان من دیلم بەقسەو نەخشەی میری چییان پێ گوتم لەسەر فرمانی ئەوان بجوڵێمەوە, دان بەهەمو شتێکدا بنێم, تاکو خۆم رزگاربکەم, خۆم بەخۆمم گوت بەهیچ جۆرێك ئەمە ناکەم، رابردوم زۆر چاك لای میری ئاشکرایە, مەحاڵە رزگارم بێت, شاهید زۆرە بەسەرمەوە, عەقڵ بەکار دەهێنم دان بەتاوانەکانمدا ناهێنم, ماڵی خەڵك وێران ناکەم چونکە تاوانەکەم لەسێدارەدانە, روژانە لەبەندیخانە دەتوانم زیاتر خزمەتی کوردو کوردستان بکەم, بەرامبەر سیخوڕو پۆلیسو چڵکاوخۆرەکان رادەوستم, هەڵوێستم هەمیشە سلبی دەبێت, لەهەر بەندیخانەیەك رووی تێدەکەم هەوڵدەدەم ئەوپەڕی خزمەتی گیراوەکانی کورد بکەم, هەتاوەکو بتوانم تەنگوچەڵەمە بۆ کاربەدستان دروستبکەم, کەی بۆم رێککەوت رادەکەم, ماوەیەکیتر دەمبەن بۆ لێکوڵینەوە، خۆم ئامادەدەکەم بۆ پرسیارو وەڵامو (کاروان)و ئازارو ئەشکەنجە, قسەم ئامادەکرد وەڵامەکان چۆن دەدەمەوە، بەتایبەتی لەگەڵ دادوەری لێکۆڵینەوە, بەدەنگی بەرز قسە ناکەم رێز لەیاسا دەگرم, کەبانگیان کردم دکتور رەفیق خۆم گێل دەکەم چونکە من کەی دکتۆرم, ناوت رفیق مامە صادقە, ئیشوکار کاسبم, کاتی خۆی لەبەغدا

دوکانم هەبوو، لەخان یاسین موادی کارەبایی‌و سەعات فرۆشتن. تۆ پیشمەرگەی, قوربان ئەم کارە زۆر سەختە بەمن ناکرێت, لە چ شارێك جێنشینی؟ قەلادزێ. ئەم بەڵێنەم بەگۆڕی شەهیداندا کەلەو رۆژەوە دەبمە پێشڕەوی بەندیخانە نەهێڵم کەس ئەمەی بدرێتی.

پۆلیسەکان لەکونی دەرگاکەوە سەیریان دەکردم، دەیانگوت ئەم هەموو خەوە بوو بەچی, کاتژمێر چواری ئێوارە سواری سەیارەی پۆلیسیان کردم، دەستم بەستراوەتەوە, معاون پۆلیس ناوی جەمال ئەفەندی بوو، بەتورکمان ناسرابوو، معاون پۆلیسی گەمرگ بوو, دوای دەوڵەمەندی کەوتبو، بەشۆین قاچاخ دەگەڕا ئێستا پ.م.ی بەدیل گرتوە, دەیویست خۆی دەرخات. هاتینە کەلار لەبەردەمی ماڵی مەحمودبەگی جاف سەیارەکەی راگرت داوای ئاوی لەخوشکی کەریم بەگی جاف کرد, ئەو شۆڕشگێڕەی لەگەڵ مەلیك مەحمودی نەمردا بوە, خوشکە حەبەخان ئاوەکەی هێنا, بەڵام روەو من هات گوتی: حەمە, سەد خۆزگە ئاوا تۆم بەدیلی نەدیبایە، فرمێسکی چاوی هاتە خوارێ, جەمال وای هەستکرد ئاویش بۆ ئەو دەهێنی, بەڵام خوشکە حەبەخان چوە ژورەوەو دەرگاکەی داخست.

دانیشتوانی گوندی کەلار بەگرتنی من دلتەنگو عاجز بوون, بەجۆرێك گرژی پێیانەوە دیاربوو کەمنیان بەدەست بەستراوی دەبینی بەسەرسوڕمانەوە سەیریان دەکردم نەیاندەزانی تەماشای من بکەن یان دەرگاکە لەسەر خۆیان داخەن، هەڵوێستی حەبەخانو دانیشوانی کەلار بیروباوڕی منی بەجۆرێك بەهێزکرد سوێندم بەخودا خوارد کەدەبێ خوڕاگربمو قسەی خۆم بەرمەسەر.

بردیانمە بەڕێوەبەرایەتی پولیسی کفری. منیان بردە ژوری بەندکراوەکان کە لەسەر کوردایەتی گیرابوون بەناوی پارتییەوە, سلاوم کرد زۆر ساردبوون لەگەڵم, زۆری پێنەچو لەڕێکخراوەوە وەلامیان بۆ هات کەئەمە (پ.م)هەریەکە لەڕاست خۆیەوەوە لامی دەدامەوە، بەپیرمەوە هاتن گوتیان چیت پێویستە, چیت دەوێت بۆت بکەین.

شەو بانگیانکردم بۆ پرسیارو وەلام، هەر ئەوەم وتەوە کەلەوەبەر گوتبووم, چونکە وڵامەکەی خۆمم چاك لەبەر کردبوو. ناوت: رەفیق مامە صادق. دانیشتوی: قەلادزێ. ئیشت: کاسبم. پێشتر, دوکانم هەبوو لەبەغدا هی موادی کارەبایی. هۆی چیبوو لەناوچەی کەلار بویت؟ کاسبم قەرزم لای کابرایەکە دەڵێن لەم ناوچەیە دەژی. تۆ موخەریبیت؟ ئەم ئیشە زۆر زەحمەتە بەمن ناکرێت. تۆ دکتۆر رەفیقی: نەخێر من دکتۆر نیم.

هەرچەند هەوڵیان لەگەڵ دەدام بەهەموو شێوەیەك هەندێك جار گرژبوون لەگەڵم هەندێ جار قسەی خۆشیان لەگەڵ دەکردمو هەندێ جار لێیان دەدام بەلام من هەر لەسەر قسەی خۆم سوربووم. چیم گوتبوو لێی پەشیمان نەدەبومەوە. دوای ٥ رۆژ بردیانم بۆ کەرکوك, لەوێش هەمان پرسیاریان لێکردم. دوای حەوت رۆژ بردیانم بۆ بەعقوبە لەوێش هەمان پرسیاریان لێکردم, دوای ٣ رۆژ بردیانم بۆ بەڕێوەبەرایتی خانقین لەوێش هەمان پرسیاریان لێکردم, هەمان وەلامم دانەوە.

ئیوارەیەك لەگەڵ ١٢ کەسی بەندکراودا رایانگرتین، ئەو پۆلیسانەیان هێنا کە بەدیل گیرابوون، یەکەیەکە دەهاتن کەسێکیان نەیگوت ئەمە رەفیقە تەنها پۆلیسێکی عەرەب زامدار بوو چاکیش ببوەوە, ئەو دەستی لەسەر سنگم دانا گوتی ئەمە دکتۆر رەفیقیان پێدەگوت, سێ جار جلوبەرگیان گۆڕیم هەر دەهات دەیگوت ئەمەیە.

دادوەر گوتی: ئەی ئێوەشی لەگەڵ نەبوون, رویکردە پۆلیسە کوردەکان, بەیەك دەنگ هاواریانکرد, جەنابی دادوەر ئەمە نەبوو, ئینجا دادوەر کۆتایی بەپرسیارو وەڵام هێنا.

لەژورێکدا بەتەنها بووم, شەو نانیان بۆ هێنام کاتێك سەرنجمدا لەناو برنجەکەدا نوسراوێکی پێچراوی تێدابوو, کەخویندمەوە لەخوشکی دڵسۆز سنەوبەرخان مەلا صدیق هاوسەری کاك جمال عبد الرحمنی دادوەر بوو, لەنوسراوەکەیدا دەڵێت کەسمان نانمان پێ نەخورا, هەمومان دانیشتوین دڵتەنگو ماتو بێدەسەڵات, هیچمان بۆ ناکرێت کەجەمال رزگارت بکات, پۆلیسە کوردەکان بەڕاستی دەورێکی باشیان هەبوو، لەگەڵ پۆلیسە عەرەبەکە قسەکرا بەڵام ئێمە باش دەزانین مەحاڵە ئەوەی پۆلیسێکی کورد لەم رۆژەدا بۆ تۆی دەکات, عەرەبێکی شۆڤینی بۆ کوردی بکات, من دەچمە بەغدا سەر لەماڵتان دەدەم، چاوم پێیان دەکەوێت انشاءالله کێشەکەت ئاسان دەبێت, دەخرێتە قاڵبی مەسەلەی کورد (سیاسی)، چیت دەوێت, چیت پێویستە, هەرچی داوابکەی کتوپڕ بۆت روانە دەکەین. وڵامەکەی لەپشتی نامە بنوسە, تەسلیم بەو برا پۆلیسەی بکە کەخواردنەکەی هێنا.

**وەڵام / بۆخوشکی بەڕێزم دایکی تاراخان پێشکەشە:**

*بەگەرمی ئەحواڵتان دەپرسم سوپاسی هەستی کاکە جەمال دەکەم, ئاگادار بووم رەنگی سور هەڵگەڕا کەچاوی بەمن کەوت بەدیلی, ئەوپەڕی سڵاوو رێزم هەیە بۆتان زەحمەتتان کێشا, خواردنەکە زۆر خۆش بوو, هەموویم تەواو دەکرد ئەگەر نوسراوەکەم نەبینیایە, بۆچی دڵتەنگن, ئەگەر من ئەم فیداکاریەم نەکردایە چۆن بەمجۆرە دانشتوانی شاروچکەی خانەقینو کفریو کەرکوك رێزیان لێدەگرتم, ئەگەر کێشەی کورد جێبەجێ بوو دەستبەجێ من بەردەدرێم، چاوی تاراخان ماچ دەکەم. برای خۆتان رەفیق پشدەری.*

بردیانەوە بۆ بەڕێوەبەرایەتی پۆلیسی کفری. منیان بردە لای دادوەر، هەمان پرسیاریان لێکردم. هەر رۆژە لەماڵێك نانیان دەکرد بەتایبەتی ماڵی ئەحمەد بەگی بابانو دایکی نجیب بابانو فاتح بابانو خەڵکانیتر وەکو مەلاعەبدولو مەلارەوف سەعاتچی, کەنانیان دەنارد نەك تەنها بەشی من بەڵکو بۆ هەموو گیراوەکانو گشت پولیسەکانیان دەنارد. کاتێك دەیانگواستمەوە پۆلیسەکان زۆریان پێناخۆش بوو دەیانگوت نانمان بڕا. زۆرجار خۆم بەخۆمم دەگوت ئەگەر دەمزانی بەم شێوەیە رێزم لێدەگرن زۆر دەمێك بوو خۆم بەدەستەوە دەدا, وایان لێکردم کەبەهیچ جۆرێك پەشیمان نەبمەوە لەوەی رۆژێك لەڕۆژان کردوومە, بیرم دەکردەوە رۆژ بەڕۆژ بیروباوەڕو هەستی نیشتمانەکەم گیانی فیداکاریم زیاتر بەخت بکەم لەپێناوی کوردو کوردستان.

هێنامیانەوە (موقف سرای شرطة کرکوك). تاوانبارم بەدوو کێشە یەکێکیان ڕوداوی خانقین, دووەهەم ڕوداوی گرتن لەکەلار (کفری). ڕۆژێك پاسەوانەکە بانگیکردم جلوبەرگم لەبەرکرد, چومە دەرێ سیخوڕێك دەستی گرتم بردیانمە ژورێك دوای پێنج دەقیقە نوری خیاط بەڕێوەبەری ئاسایشی کەرکوك هاتە ژورێ. گوتی: کاك حسێن سید احمدی خانەقاو کاکەحەمەی حاجی مەحمود هاتنە لام ویستیان چاویان پێت بکەوێت, بەباشم نەزانی بەڵام خۆڕاگربە, بەم شێوەیە من لەدەرەوە یارمەتیت دەدەم انشاءالله خودا لەم تەنگوچەڵەمەیە ڕزگارت دەکات لەچونە دەرەوەدا چاوت پێیان دەکەوێت قسەیان لەگەڵ نەکەیت, دڵنیابە کێشەکەت دوادەخەن کەرەوانەی دادگا نەکرێت. کەهاتمە دەرێ, چاوم بەکاکەحەمەی حاجی مەحمودو جەنابی کاکەحسێن سیدئەحمەدی خانەقا کەوت بەڕاستی گەشامەوە.

## گرتووخانەی پۆلیسی کەرکوك

هۆڵێکی گەورەیە ناوەڕاستەکەی دائیرەی پۆلیسە، ڕووبەرەکەی ٥٠ × ٢٠مەتربوو، حەمامو ئاودەستەکەی پەنجەرەی تیدا نییە، یەك دەرگای هەیە بۆ چونەدەرو هاتنەوە, زستان پانکە هەڵدەکرێت, هاوین حەمامی ساونایە, شێتو, دزو پیاوکوژو سیاسەتمەدار پێکەوەن, هەواکەی بەجۆرێك پیسە کاتێك دەرگا دەکرێتەوە ئەم بۆگەنە ڕوو لەدەرەوە دەکات پۆلیسەکان ٢٠ مەتر دوردەکەونەوە, دوای ٢٠ دەقیقە دەتوانن بێنە پێشێ.

ژمارەمان بەگشتی ٦٠٠کەس بوو, پارتیو شیوعی هەرلایەنە بەکۆمەڵ نانمان دەخوارد, پەیوەندیمان لەگەڵ شیوعیەکان هەبوو, کاتمان بەقسەوباس لەسەر بارودۆخی کوردستان دەبردەسەر. هەفتەی دوو جار لەماڵی تاهرئەفەندی برای کاکی کاکان (عمر دەبابە) خواردنم بۆ دەهات, لەپڕ تاهرئەفەندی تەشریفی خۆی هات, بەخێرهاتنم کرد، جێگاکەی خۆم پێشکەش کرد, بریتی بوو لە ١٥٠سمو پانایی ٣٠سم.

من هەر بەردەوام بووم لەهاتوچۆکردن, بردیانم بۆ شارۆچکەی خانەقین, هەولم زۆر بۆ درا کە بەسەرکەوتویی نەجاتم بێت. کەگەڕامەوە کەرکوك ئینجا یەکسەر منیان بردە بەندیخانەی کەرکوك، بەڕێوەبەرەکەی وتی انشاللە لێرە فرمانی بەردانت دەردەچێت, ناردیانم بۆ بەشی (محجر) ئەویش بەشێکە لەبەندیخانەی گەورەی کەرکوك.

هەفتەی چوارجار چاوپێکەوتن هەبوو, هەموو بەندکراوەکان دەچونە دەرێ, بەشێکی زۆری پیاوو ژن ڕوویان لەمن دەکرد, لەبەر ئەوەی کەسوکارم دورە ناتوانن بێنەلام. جارێکیان خۆشکێك هاتە نزیکم گوتی کاکە ڕەفیق من هاتووم بۆ لای بەرێزتان، دووبەدوو دانیشتین گوتم خۆت بناسێنە. گوتی: من ناوم زیبایە خوشکی خالید دلێرو جەعفەرم, حزب ناردومی بولای ئێوە نوسراوێکم هێناوە, لەگەڵ بڕێك پارە کەحەوت دینارە. زۆر سوپاسم کرد, گوتم دەمەوێت نوسراوێك ئاراستەی م.س بکەمو بۆم بگەیەنیتە شوێنی خۆی. گوتی: هەفتەکەی تر یان خۆم دێم یا یەکێك بەتایبەتی دەنێرم. نوسراوێکم ئاراستەی م.س کرد، گوتم: *(ئەم شەرفەم بدەنێ کاتێك منیان بردە دادگا ڕووبەرووی دادوەر ڕاوەستم پارێزگاری لەکوردو کوردستان*

*بکەم, تکایە شەرەفی ئەندامێتیم بدەنێ, لەو رۆژەی گیراوم دانم نەناوە بەوەی (پ.م)م, دانم نەناوە بەنهێنییەکان و ناوی کەسم نەهێناوە).*

رێکخراوی کەرکوك ئاگاداریان دەکات کەرەفیق پشدەری نوسراوێکی ئاراستەی م.س کردوە. جەنابی مامۆستا ابراهیم ئەحمەد پرسیار لەمیوانەکان دەکات لەمانە بابەکری مەحمودئاغا, ئایا ئێوە دەڵێن چی داوای چی کردوە, بەگشتی دەڵێن داوای پارێزەر دەکات بەڵکو لەم تەنگوچەڵەمەیە رزگاربێت. کە نوسراوەکە هەڵدەپچرن دەیخوێننەوە هەریەکە لەلای خۆیەوە تەماشای ئەوەیتر دەکات دەڵێن بەڕاستیوشەکانی کاری کردەسەر هەمومان، ناوی نەهێنیکەی (تەلان) بەگشتی لەبەری دەکەن, کاك بابەکر بۆی گێڕامەوە نهێنییەکەت دەزانین.

کودەتای بەعس کراو لەساڵی ١٩٦٣ تا ئەو رۆژەی بەعس هێرشی هێنایە سەر کوردستان, رۆژانە یا هەفتانە چ لەڕێی رێکخراو یا ئەوانەی دەهاتنەلامان پێیان رادەگەیاندین ئیمرۆو سبەی بەردەدرێین, ئەم پرۆپاگەندەیە بەردەوامبوو نەشەڕ نە ئاشتی.

هاوسەرەکەم هاتە لام، بەدورودرێژی باسی بارودۆخی خۆم بۆ گێڕایەوە, دایکی بازیان گوتی: خزمو کەسوکارو برادەران زوو زوو سەرمان دەدەن، دایکتو کەمالو روبارو بازیان باشن موشکیلەمان نییە, جلوبەرگو کراسو بیجامەم بۆ هێناویت، بەم زوانە رزگارتان دەبێت، ئەمەش بری ١٥ دینارە بۆم هێناویت. گوتم خۆشحاڵبووم بەهاتنت بەخێر بێیت بان چاو, بەڵام ئەمانەی هێناوتە پێویستم بەهیچ شتێکیان نییە, بەهۆی خزمو برادەران کاك جەلال عەبدالرحمن شرفو مامۆستای نیشتمانپەروەر تاهر صادقو خوشکە لطیفە صدیق, عبیدالله, هەمو شتێکیان بۆ ناردومو پارەشم پێیە, لەگەڵ کاك فوئاد تاهر صادق بەیەکەوە لێرەین، هەرشتێکم بوێت یا حەز لەهەر خواردنێك بکەم دایکی کاك فوئاد هەمینەخان بۆم ڕەوانە دەکات, تەنها قاتە جلەکەم بۆ بەجێبێڵە, لەخۆشییان گەشایەوە، ئاگاداریکردم کەدایکم هاتبوە قەزای کفری گوتبویان لەقەزای خانەقینە, لەوێشەوە چووە بۆ کەرکوك گوتبوویان چوەتەوە خانەقین بەناچاری گەڕابوەوە بەغدا, گوتم راستی ئازارو ئەشکەنجەیەکی زۆرم داون نازانم چۆن ئەم قەرزەتان بدەمەوە.

کاتێك کەئەم گفتوگۆیەم دەکرد لەگەڵ هاوسەرەکەم, لەژوری بەڕێوەبەری بەندیخانە بووین چونکە کاتی چاوپێکەوتن نەبوو, بەڕێوەبەرو یاریدەدەرەکەی دانیشتبوون تەماشایان دەکردین, بەچاوو بەگویچکەش بزانن چی دەڵێین. بەڕێوەبەرەکە عەرەب بوو, دانیشتوی بەغدا زۆر رێکوپێك بوو, یاریدەدەرەکەی محەمەدئەفندی پیاوێکی زۆر خراپ بوو دژ بەنەتەوەی کورد, دژی ئازادی بوو، محەمەد ئەفەندی رویکردە هاوسەرەکەم گوتی خوشکم خودا فرسەتت بدا چون لەگەڵ رەفیق دەژییت, پیاوێکی شەڕانیەو گیروگرفتمان بۆ دروست دەکات, باواز لەبەندکراوەکان بهێنیت ئێمە ژورێکی تایبەتی دەدەینێو خواردنی تایبەتی بۆ دەکەین, رۆژانەش ٢٥٠ فلسی دەدەینێ رەنگە زیاتریش, ها رەفیق دەڵێی چی؟ گوتم: بەندکراوێك لەسەر

دزی حوکم درابوو,وشەی زۆر ناشرین دژی بارزانی بەکاردەهێنا, چەند برایەك رووبەرووی راوەستان, وەردیانەکان هاتنە ژوریَ پینج لەو برادەرانەی ئێمەیان بردە دەرێ کەرەوانەی موقف سەرای پۆلیس بکەنەوە، محەمەد ئەفەندی بێدەنگ بوو بەرامبەر تاوانبار چونکە تورکمان بوو, منیش چومە پێشی داوای محەمەدئەفندیم کرد, کەجەنابی هات ئاگادارمکرد ئەم پێنج برادەرە بێنەوە ژوریَ, من تاوانبارم, کەهاتنەوە ژوریَ, روومکردە محەمەد ئەفەندی ئێمە میوانی بەرێزتانین تۆ پیاوێکی ژیریت ئێمە میوانین لای ئێوە حوکم نەدراوین شوێنەکەمان هیچ عەیبی نییە, چاوەروانی رەحمەتی خودای مەزنین کەلە چ کاتێك برپاری بەربونمان دەردەچێت. جەنابی بەرێوەبەر تکایە چاوت لەئێمە بێت چونکە محەمەدئەفەندی خراپەو گیروگرفتمان بۆ دروست دەکات لەکاتێکدا بەڵێندەرەکە بەئاشکرا دزیمان لێدەکات کەچی لایەنگیری دەکات، رووبەروو پێی گوتم رۆژی ۲٥۰ فلست دەدەمیَ, هەڵوێستی محەمەدئەفەندی ئەمەیە, سوپاس بۆ جەنابی محەمەد ئەفەندی کەدەیەوێت یارمەتی من بدات با ئەم یارمەتیە گشتی بێت چونکە من ناتوانم خۆم لەبەندکراوەکان جیابکەمەوە, بەرێوەبەر لەگەڵ محەمەدئەفەندیدا لەمەسئەلەی پارەدا شەریکن.

هاوسەرەکەم بەدڵخوشی خوداحافیزی لێکردم, بەرەو بەغدا کەوتەرێ. ئەوەیان نەدەزانی کە لەرۆژی بەدیلگیرانم گفتم بەخودا داوە, لەهەر بەندیخانەیەك بم دەبێت رووبەرووی دوژمن راوەستم.

## بەندیخانەی کەرکوك

بینایەکی کۆن کە لەسیەکانەوە دروستکراوە, رووبەری ٥۰۰۰ مەتر زیاترە, کە لەدەرگای سەرەکی دەچیتە ناوەوە گۆرەپانێکە درێژییەکەی ٥۰مەترو پانایی ۲۰ مەترە, ئەنجا لەدەرگایەکیتر کەدەچیتە ژوریَ, ئیدارەی بەندیخانەی گەورەیە، دەرگایەکی لەسەرە دەچیتە گۆرەپانەکە, درێژایی ۱٥۰ مو پانایییەکەی ۲۰ مەترە, دە ژووری ٤ × ۳ی تێدایە، وا بزانم ٥ هۆڵی گەورەو حەمامو چەند ئاودەستێکی تێدایە. وەردیانەکان شەو رۆژ لەگۆشەکانی سەربان رادەوستان بەچەکەوە، هاتنە ژورەوە بۆ ناو بەندکراوەکان بەچەکەوە قەدەغەبوو, رۆژی دوو جار سەرژمێریان دەکردێن, رۆژانی چاوپێکەوتن, بەندکراوەکان سەرژمێر دەکران ئەنجا ئەوانەی هاتوون دەچنە دەریَ, کە لەکاتی هاتنە ژورەوەیان هەریەکە لەسەر مەچەکی دەستی، نیشانەیەکی لێدەدەن.

ژمارەمان ٦۰۰ کەس بوو, حوکم نەداربوین بەتاوانی لایەنگریکردنی پارتی (بارزانی), دەستبەسەر بوین, بەتەمەن, لاو, دەوڵەمەند, فەقیر, ئاغا, جوتیار, شێخ, مەلا, مامۆستا, قوتابی, خوێندەوارو بێسەواد, لەسەر یەك سفرە بەتێکرایی نانمان دەخوارد, بۆ نمونە کاك حسن کەڵەمێرد چوار مریشکی بۆ دەهات, لەسەر یەك سفرە دادەنیشتین, مامۆستاکان دەرسیان دەگوتەوە وەکو کاك حەمەنوری توفیقو تەهای برایو فواد تاهر صادق, من خۆم خەتم زۆر ناخۆش بوو, کاك حەمەنوری توفیق ئەوەندە لەگەڵم خەریك بوو سوودی زۆر باشم لێوەرگرت, ئەم ماوەیە لەناو خۆماندا بەهیچ شێوەیەك شەر روونەدا, دەنگوباسمان بەجۆرێك دەزانی زۆر

کەس دەهاتەلامان سەری سوڕدەما, تەواوی رۆژەکە خەریکی لێکۆڵینـەوە بـووین, رۆژێـك ئەفـسەرێکی کـورد بەناوی احمد حسن بە٢٠ ساڵ حوکم درابوو لەسەر ئەوەی فەرمانی ئـامر لـوای جێبـەجێ نـەکردبوو کـەهێرش بباتە سەر پ.م، هینایانە بەندیخانەو لەژورێك دایاننا, بەجۆرێك رێزمان لێگـرت, یەکەیەکـە هـەر٦٠٠ کەسـەکە چوینە خزمەتی بۆ دڵنەوایی کردنی, دوژمن سەری سوڕما لێمان. لەناو خۆماندا ئەوندە رێکوپێك بووین بەهیچ جۆرێـك جیـاوازی لەنێوانمانـدا نـەبوو, دوو ئەنـدامی لیژنـەی مەرکـەزی پـارتی هەفتـەی جارێـك قاپـەکانیان دەشوشت.

گفتوگۆو لێکۆڵینەوە لەنێوان بەعسو شۆڕشی بارزانیدا زۆری پێچوو, کاتێك حکومەتی قاسم روخا لەیەکەم رۆژەوە چاوەڕوانی بەردان بوین.

شەڕ لەنێوان بەعسو شۆڕش دەستی پێکردەوە, دوای چـەند رۆژێـك بەیانییـەك هـەمومانیان کـۆکردەوە، نـاوی ٢١ کــەس لەبەنــدکراوەکان خوێندرایــەوە منــیش یــەکێك بــووم لەوانــەی خۆمــان ئامــادە بکــەین، گواسترابینەوە, یەکێك لـەبرایان هاتـە لام گـوتی بـەناوی هـەموو بەنـدکراوەکان ئاگـادارت دەکـەم تـو گـۆڕی شەهیدان ئیمرۆ رۆژێکی خەتەرناکە هێمنو بێدەنگبە شعرو هتاف کێشان مەکە با نەبیتە هـۆی کوشـتنی ئـەم بیست کەسە, بەڵێنم پێدا لەجێگای خۆم بێدەنگ دەبم, هەر دەرچوین برادەرێك دەستیکرد بەهتاف کێـشانو سرودی هەر دەڵێین کوردین, هەر تەماشای سەروگوێلاکی منـی دەکـرد کـەدیتم بەتەنهایـە منـیش رووکـردە برادەرەکانی گوتم ئەمەش تاوانی منە؟ ئەنجا من دەسـتم پێکـرد بـەتێکڕایی سـرودمان خوێنـدەوە, هتافمـان کێشا بـژی کـوردو کوردسـتان بەسـەرۆکایەتی بـارزانی، کاتێـك چـوینە دەرێ لەشـاری کـەرکوك ئەفـسەرەکە دابەزی گوتی: دەزانن بۆم هەیە هەموتان بکوژم, ئاگر دەبارێت ئێـوەش خۆتـان بـەپێی خۆتـان دەچـنە نـاو ئاگرەکە. بێدەنگ بوین.

کەگەیشتینە هەولێر بردیانین بۆ موقفی سەرای پـۆلیس، شـەو لـەوێ مانیـەوە, بەیانیەکـەی بردیـانین بـۆ موسڵ, یەکسەر منیان جیاکردەوە, بردیانم بۆ موقف سرای پۆلیسی موصل بـۆ نـاو گیراوەکـان کـە بـەتاوانی حزبی شیوعی گیرابوون. قاتێك جلی تازەم لەبەردابووو سـاکێکی تـازەم بەدەسـتەوە بـوو بەشـێوەیەك لـەوە دەچوو کـەتازە لەفڕۆکـە دابـەزیوم, سـڵاوم کـرد ئینجـا لەبەردەرگاکـە لەسـەر پیڵاوەکـانم دانیـشتم. یـەکێك لەشیوعیەکان چـاوی بـەمن کـەوتبوو لـەموقف سـەرای کـەرکوك, دەسـتی گـرتمو لای دانیـشتم, بەهـەمویانی ناساندم, منیش وەکو ئەوان خۆم روتکردوە, تەنها دەرپێ سپییەکەم لەبەردا مایەوە.

هەمویان دانشتوانی موسڵ بوون یەك کوردیان لەگەڵدا بوو, ئەویش من بووم, دکتۆرو ئەفـسەرو مامۆسـتاو قوتابیو کرێکارو جوتیار, لەهەموو چینەکانی حزبی شیوعی لێرەن. ژمارەمان ٨٠٠ کەس بوو لـەژورێکی ٦×٤ دا, هەموو بەدەرپێی سپییەوە دانشتوون دوو تەنەکەی لێبوو یـەکێکیان بـۆ میـزو ئـەو ئـەویتر بـۆ پیـسایی، بەهۆی بۆنی پیسو بۆگەنو گەرما هەفتەی یەکەم دوو کەس مردو هەشت کەسێان بـردە نەخۆشـخانە. دوای

دە رۆژ منیـان بـردە لای بەڕێوەبـەری پـۆلیس, هــەمان پرسـیاری لێکـردم,وەڵامـم دایـەوە, ئاگـاداریکردم کەڕەوانەی (محکەمەی فەوری) دادگای بەپەلە کراویت. گوتم: نامەیەکم بۆ بهجت کشمولە هەیـە, ئەگـەر بـۆت دەکرێت بۆم رەوانە بکە, برا شیوعیەکان بویان باسکردبووم کەمرۆڤێکی باشی خانەوادەی کشمولەیە.

گەڕامەوە شوێنی خـۆم، نامـەێکم بـۆ بەهجـەت کـشمولە نـارد، داوای دوو شـتم لێکردبـوو, یـەك ئاگـاداری ماڵەوەم بکات, دووهەم دە رۆژە لێرەم ئەگەر مانگ تەواو بکەم دەمرم.

دایکم سەریدانیکردم, نوسراوێکی کاك عـەتا محەمـەدی پێبـوو, بردبـوی بـۆ ئـەم زاتـە کـە لەبنەماڵەیـەکی موسڵاوی ناسراوو حاکم بوو. بـەدایکمی گوتبـوو دوو تـاوانی لەسـەرە, ئەوراقـەکانی تـەواو نییـە، کێـشەکەی دوادەخرێت.

منیـان کـردە سـەرکار (مراقـب) رۆژی ٧جـار دەچـومە دەرێـی ژورەکـە, شـەوان تـاکو سـەعات ٩ی شـەو دەچومە دەرێ ئاوم دەهێنا, رۆژی دوو جار ناوی هەموو ئەوانەی لەوێ بوون لەلیـستەیەك ناویـان دەنووسـم, ژمارەیـان ١٨٠ کەسـە، رۆژی جـارێکیش ئاوێـك بەخۆمـدا دەکـەم لەگۆڕەپانەکـە, مـسئولی موقـف رئـیس عرفایەکی خەڵکی تلعفر بـوو تورکمـان بـوو, پیـاوێکی بـاش بـوو لەگـەڵمان, هەفتانـە ٥ دینارمـان دەدایـە, ٤ دیناریش بۆ جێگرەکەی کەناوی شـحاتە بـوو, پیـاوێکی زاڵـم بـوو یـەکجار زۆر خـراپو دڕنـدەبوو، لەحـەیوان دەچوو.

رۆژێك لەسەر ناوی (دنخە)یەك ٣٩ کەس گیرابـوو, دوای دوو رۆژ ٣٨ دنخـەیان بـەردا یـەك دنخـە مایـەوە. لەرێگای شاگردی چێشتخانەکە پەیوەندیم بەرێکخراوی پارتی کرد، زۆر بەرێکوپێکی رۆژانە ئاگادارم دەکردن. شاگردی چێشتخانکە رۆژی دوو جار دەهات خواردنی بۆ دەهێنایـن, منیش نیوەڕۆو ئێواران لیستەم بۆ جۆری خواردنەکەمان بۆ دەکرد.

ماوەی دوو مانگ سـەرکاربووم ئـەم سـێ روداوە سـەرنجی راکێـشام, بەشـوێن دنخـە ناوێـك دەگـەڕان ٣٩ دنخەیان گرت, شەش لیستم کرد دوایی ٣٨یان بەرەڵاکرد یەك دنخە مایەوە.

قەشەیەکیان بەجلوبـەرگی کەنیـسەوە هێنـابوو ٣ شـەوو ٣ رۆژ ئـازارو ئەشـکەنجەیاندا دانـی بەتاوانەکانیـدا نەنا, جێی شانازیبوو، لەشـوێنی خـۆم دامنـا تـەداویم کـرد، لـەرێگای رێکخـراوەوە ئاگاداریـانکردم کەئەمـە پیاوێکی مەزنە, نیشتمانپەروەرێکی ناسراوە, لێی بپرسە بزانە چ پێویستیەکی هەیە, ئەویش زۆر خۆشحاڵبوو کە لەموقفی سەرا, پارتی بەم جۆرە بەهێزە. گوتی: خوشحاڵ دەبم کەپەیوەندیم لەگەڵ بکەیت.

کوردێکی ناوچەی بەرواری باڵا, تەمەنی ٥٠ ساڵان دەبو, شێت بـوو, رۆژی یـەك دوو جـار دارکـاری دەکـرا قسەی ناشیرنی بەعەبدوسەلام عارفـو عەرەب دەگوت جارجاریش بەبارزانی. لاوێکیان هێنا تـەمـەن ١٨سـاڵان بوو, رێکخراو ئاگاداریکردم, ئەمە کوردێکی تورکیایە, (پ.م) گیراوە، بری حەوت دیناریان بۆ ناردبو.

ئێوارەی چوارشەمە رئـیس عورەفاکـە هـاتو داوای یارمەتیەکـەی کـرد, خۆیـو جێگیرەکەشـی بەمۆڵـەت

دەڕۆیشتنەوە, پارەم بۆ کۆکردنـەوە. ڕۆژی پێـنچ شـەممە دوای سـەعات دوو، نائـب عـەریفی پۆلیـسی تـازە هات, ناوی ئازادکردنی بەندێکی هێنا, کاتێك سەرنجمدا نـاوی شـێتەکەو ئـەو بـرا (پ.م)ی تـازە هـاتوە نـاوی خۆیانو باوكو باپیریان وەکو یەکە. داوام لەبرا کوردەکـەی تورکیـا کـرد, نـاوت هـاتوە بـەردراویت, دەچـیتە دەرێ ئەمەش ناونیشانی چێشتخانەکەیە ڕووبکە لای ئەوان ڕزگارت دەکەن, لەسەرخۆبە با گومانت لێنەکەن.

گوتـی: ئەی تۆ,ولاٌمم دایـەوە مـن حەوالـەی دادگـای کتـوپڕ کـراوم (محکمـە الفوریـە) بـەهۆی ڕاکردنـی تـۆوە کێشەکەم زیادو کەم ناکات, ڕزگـارت بێـت مـن لەچـاودێری لادەدەن، ڕەنگـە یـەك دوو شـەو دارکـاریم بکـەن. خوداحافیزی بێـت ئـەو ڕۆیـشت مـن مامـەوە. ڕۆژی یەکشەممە داوای ئـەو بـرا کـوردەی تورکیایـان کـرد مـن بەکابرای شێتم گوت داوات دەکەن, شەو هێنایانەوە !

من لەترسان بیرم دەکردەوە, ئایا ئەم برایە ڕزگاربیووە, ئایا توشـی چ ئـازارو ئەشـکەنجەیەك دەبم. ئـەی ئەو برایەی لەچێشتخانەکە کار دەکات دیار نیەیە؟ من نەمدەزانی کەئەم شتانە زۆر ڕوویـداوە لای ئـەوانو زۆر بەگرنگی ناڕواننە ئەم کارە.

شەوی چوارشەممە بردیانم بۆ لای بەڕێوەبەری پۆلیس, ئەمە دووهـەم جـارە لەبـەردەمی ڕاوەسـتم, خـۆم بەفەقیریو مەلولیو لاوازی نیشاندا,وا ڕاوەستام کەمن جێگـای ئـەوە نـەبم گومـانم لێبکرێـت. پرسـیاری کـرد جەنابی بەهجەت کەشمولە چۆن دەناسیت؟ گوتم: من لەساڵی ١٩٥٤ـەوە لەبەغـدا ژیـاوم زۆر خـەڵك دەناسـم. گوتـی: توشی تەنگوچەڵەمەیەکی گەورە هاتبویت بەلاٌم ئێمە لەناو خۆمان جێبەجێەمان کرد چونکە زۆر کەس نانبڕاو دەبوو، کێشەکەمان کۆتایی پێ هێنا, کوردێکیترمان هێنا ناچارمان کرد دانی بەو تاوانانەدا نا کەئێمە دەمانەوێت, زۆر جاریتر کەگیراوێك ڕادەکات یەکسەر دەچین بۆیاخچیەك دەهێـنین لـەجیاتی کـابرای گـیراوی ڕاکردوو. من زۆر پاڕامەوە کە بەهیچ جۆرێك دەستم لەم ئیشەدا نییە چونکە هیـچیان خـزم نـین، مـن خـەڵکی قەلادزێم. گوتی: بەیانی ڕەوانەی مەخفەری پۆلیسی دەواسە دەکرییێت. گوتم: خـودا یاربێـت انـشالله خۆشـی لەخۆت دەبینی.

### مەخفەری پۆلیسی دەواسە لەموسڵ

بەچوار پۆلیس بەدەستی کەلەبچەو زنجیرکراوەوە بردیانم بۆ لای بەڕێوەبەری پۆلیس، نزیکەی دە دەقیقە ڕووبـەڕووی ڕاوەسـتام, هـەر تەماشـای دەکـردم منـیش هـەردوو چـاوم بڕیبـوە زەوی، فـەقیرو بێدەسـەلاٌت ڕاوەستابووم لەخزمەتی پیاوێکی تەمەن ٤٥ – ٥٠ سـالاٌن. گـوتی کەلەبـچەکەی بکەنـەوە, دوای ئـەوە گـوتی دانیشە. ناردی خواردنم بۆ هات, ئەنجا قسەی لەگەڵ کردم گوتی باش ئاگاداری کێشەکەتم, ٣ ژورمـان هەیـە, یەکێکێان هی دزو پیـاوکوژ, دووهـەم بەتاڵـە بـۆ ئەوانـەی خەتـەرناکن, سـێهەمیان حـەوت مامۆسـتای تێدایـە دەتنێرم بۆ لای ئەو مەسیحییانە بەمەرجێك کێشەم بۆ دروست نەکەیت وەکو موقف سـرای موصـل،وا دیـارە واستەت بەهێزە. گوتم:واستە خودایە, انـشاءالله لەڕەوشـتم ڕازی دەبیـت, هـیچ لـەخۆم شـك نابـەم بەناحـەق

گیراوم, ئەم تاوانەیان بۆ دروستکردووم.

منیان بردە ژورێکی زۆر ڕێکوپێکو پاك, بەندکراوی لێبوو خەڵکی ئەلقۆشو بەرتەلە بوون, بەهۆی بەسەرهاتی (دنخە) ناویان بیستبووم, تاوانباربوون کەشیوعین: بەرێزو زاناو پاكو دڵسۆزو نیشتمانپەروەربوون, یەکێکیان سیاسەتمەدار بوو, بەهۆی ئەم برایانەوە شارەزاییەکی باشم پەیداکرد لەسیاسەتدا, زۆر ڕێزیان لێگرتم, ئەم دە ڕۆژە میوانداریەکی بێئەندازەو ڕێکوپێك خزمەتیان کردم, دوای دە ڕۆژ ڕەوانەی کەرکوکیان کردمەوە, هاتمەوە شوێنە ناخۆشەکە لەموقف سەرای پۆلیسی کەرکوك. سوپاس بۆ خوا دەستێکی بەدەسەڵات هەبو یارمەتی دەدام چونکە دوو جار بردیانم بۆ (مەحکەمەی فەوری) هەروا دەهاتمەوە کەرکوك. دوای حەوت ڕۆژ ڕەوانەی (معتقل عسکەری کەرکوك) کرام, کەچومە ژورێ چاوم بەو برایانە کەوت کە لەبەندیخانەی کەرکوك بەیەکەوە بووین کەژمارەیان ٢١ کەس بوو دوریان خستێنەوەو ئاگاداری دەنگوباسی یەکتری نەبوین، لەوانە مامۆستای نیشتمانپەروەر کاك حمەنوری تۆفیق مسئولی برایانی پارتی بوو, ڕاستی لێرەش خزمەتێکی گەورەی دەکرد لەهەمو ڕویەکەوە، ڕێزی لێدەگیرا، ئەو مسئولی نێوان پارتیو شیوعی بوو.

## گرتووخانەی سەربازی لەکەرکوك

لەژێر چاودێری سوپادا بوین لەهەمو ڕویەکەوە تا خواردن وەکو میوانێك بەڵام چۆن میوانێك, دوو ئەفسەر مسئول بوون, یەکێکیان نەقیب ئدریس خەڵکی موصل بوو, عەرەبێکی نیشتمانپەروەر بوو, ڕێزی زۆر لێدەگرتین جێگرەکەی کوردبوو بەناخێری گیانی هەتا بڵێیت خراپەی لەگەڵ دەکردین, چونکە کوڕی سەرۆك هۆزێك بوو لەجاشە ناودارەکان.

شوێنەکە بریتی بوو لەدوو هۆڵی گەورە ڕووبەری هەریەکەیان (٧٠×٢٠)م کە بەبلۆك دروستکرابوو, سەرەکەی چینکۆ بوو شوێنی چەكو فیشەك بوو, ژمارەی ئەو بەندکراوانەی لەهەردوو هۆڵەکەدا بەندکرابوون زیاد لە٦٠٠ بەندکراو دەبوین، بەناوی پارێزگاریکردن لەبەرژەوەندیی گشتی حکومەتی بەعس ئێمەیان بەتابوری پێنجەم لەقەڵەم دابوو بەڵام حوکم نەدرابوین هێشتا استخباراتی سوپا لەدورو نزیکەوە چاودێری دەکردین، ئێمە نەماندەزانی کام سەرباز سیخوڕە، هەمویان جلوبەرگی سەربازییان لەبەردەکرد, پاسەوان بەتێکرایی سەرباز بوون. لەهەمووی سەیرتر ئەوەبوو نزیکەی ٢٠ قاز پاسەوان بوون بەسەر دوو هۆڵەکەوە. چواردەورەی هەردوو هۆڵەکە بەبەرزایی ١٨٠سم تەلبەند کرابوو, چاوپێکەوتن لەدەرەوە دەکراو قەدەغەبو کەس بێتە ژورێ, خواردنو شتومەك وەردەگیرا, سەربازەکان تەماشایان دەکرد ئەنجا ئێمە وەرماندەگرت, بەڵام زۆر ڕێکوپێك بوون.

هۆڵێکیان شیوعی و پارتی بەیەکەوە بوین. ئەو هۆڵەی هەموویان سەر بەپارتی بون، زۆربەیان کۆیی بوون لەمامۆستاو قوتابی، زۆریانم دەناسی لەوانە خزمێکم بەناوی حمید عبدالله کۆیی.

هاوین بەبەردەوامی گەرم بوو, بەڕاستی دەرەوە گەلێك باشترو خۆشتر بوو لەهەموو ڕوویەکەوە بەلاّم هۆڵەکە یەك سودی هەبوو ئەوەیش ئەوەبوو خۆر نەدەهاتە ژورێ, زستان زۆر ساردبوو، نوستنی دەرێ لەهەموو رویەکەوە باشتربوو, قاعەکە تەنها ڕێگای بارانی گرتبوو کەتەڕ نەبین. مامۆستا حمەنوری تۆفیق سەرپەرشتی دەکردین, بەهەمومان یەك رادیۆمان هەبو هەرجارە بەندێك لەژێر پەتۆکەیدا گوێی لێدەگرت. دەنگوباسەکەی لەسەر کاغەزیەك دەنوسی تەسلیم بەمامۆستا حمەنوری دەکرد ئەویش بەسەر شانەکانیدا دابەشی دەکرد, ئەو کاتە بەسەر هەمووماندا بلاّودەبووەوە. ڕۆژێك ڕادیۆکە لای من بوو کەسەرکۆماری ئەمریکا جۆن کەندی تیرۆرکرا.

ئیستخباراتی سوپا بیستبویان کەرادێومان هەیە, چەند جار بەتێکڕایی هەمومانیان دەبردە دەرێ ماوەی ٣سەعات دەگەڕان لەجلوبەرگو نوێنو ساکو هەموو شتێك. کەدەهاتینە ژورێ جاریکیتریش دەیانپشکنین بەلاّم هەرچییان دەکرد رادێوکەیان بۆ نەدەدۆزرایەوە, چونکە لەناو خۆماندا خائینی تیا نەبوو, بۆیە هەرچییان دەکرد نەیاندەتوانی بیدۆزنەوە. رادێوکە جۆری سلڤەری بچوك بوو لەناو بوتڵی نایلونێکی زەرد دامانانبوو لەگەڵ ٢٠بوتڵی پڕ لەئاو، لەئاودەست بەجێمانهێشتبوو, ئەو بوتڵەی رادێوکەی تێدا بوو لەژێرەوە لاستیکەکە کون کرابوو جێی شك نەبوو, لەکاتی دەنگوباس دەردەکرا.

منیان گواستەوە بۆ ئەو قاعەیەی کەهەمویان پارتین, خۆم زۆرم پێخۆش بوو ئەنجا لێرە لەدەنگوباسی کەسوکارم باشتر ئاگادار بووم. جارێك خوشکە لطیفە صدیق عبدالله خوشکی دکتۆر ارجمند لەگەڵ مەحمود دلێر وەلاّمی بۆ ناردبووم چیت پێویستە, حەز لەخواردنی چ دەکەی.ولاّمم بۆ ناردەوە بەرماوەی خواردنی خۆتان زۆری زیادە. ئەم خوشکە خواردنی بۆ هێنام, نەقیب ئیدریس گوتی ئەمە خواردنی مەولودە چونکە پێنج کیلۆ گۆشتیان کردبوو بەشفتە.

گۆڕانی سیاسی رویدا، عەبدولسەلام عارف کودەتای کرد بەسەر بەعسدا. گفتوگۆ لەنێوان بارزانیو عبدالسلام عارف لەڕێگای پارێزگاری سلێمانی عبدالرزاق دەستی پێکرد ئەنجا لەناو خۆمان پڕوپاگندەی بەردانمان دەستی پێکردەوە, کەمالی برام هاتە لام دەربارەی بەردانمان ئاگاداریکردم.

### هاتنی رەشید مصلح سەرۆکی دادگای سوپای گشتی

ڕۆژێك رەشید مصلح بەخۆیو چەند ئەفسەرێکەوە هاتە ناو قاعەکە, سەرەتا بەڕاستی گەشاینەوە لەدڵی خۆمانوا هەستمانکرد یەکسەر بەرماندەدات, چونکە دەمانزانی کەیەکێك لەمەرجەکانی بارزانی ئەوەیە بەندەکان ئازاد بکرێن, ئەمیش دەیکات بەپیاوەتی خۆی نەك هی بارزانی, چونکە سەرۆکی دادگای سوپای گشتییەو زۆرباش دەیزانی کە ٦٠٠ بەندکراوی بێتاوانینو تاوانەکەمان تەنها ئەوەیە کەکوردین. گوتی ئێوە چەتەن, پیاوکوژن, تیرۆریستن, پ.م بوون, کاتی خۆی هێرشێکی زۆرتان کردوتە سەرمان. ئێوە بەخۆڕایی نەگیراون بۆیە لێرەیان داناون چونکە مەترسیتان لێدەکرێتو دژ بەحکومەتن. زۆر کرژبوو بەرامبەرمان,

هەرچی کینەیەکی لەدەرونیدا کۆکردبووەوە پێی رشتین. چاوەروانم کرد تا کۆتایی بەقسەکانی هێنا. رۆیشتمە بەردەمی, سڵاوم لێکرد گوتم جەنابی سەرۆکی دادگای سوپای عێراق رێگام دەدەیت چەند قسەیەك لەخزمەتتاندا بکەم؟ گوتی: قسەبکە. گوتم: ئێمە خۆشحاڵ بوین بەهاتنی بەرێزت, ئەم خەڵکەی بەرامبەرت ڕاوەستاون مامۆستاو قوتابیو کاسبو جوتیارو کرێکارن, ماوەیەکی زۆرە لەماڵو منداڵیان دورخراوەنەتەوە, دان بەتاوانەکانی خۆمدا دەنێم من پ.م بوومو بەتۆمەتی گرتنی دوو تفەنگو یەك ڕەشاشی برێنو بردنی (٢٠٥٠) دینار دەستگیرکراوم, ئەمانەی راوەستاون تەنها ئەوە نەبێت باقی تاوانەکەیان ئەوەیە کەکوردن. رەشید مصلح گوتی: رەفیق ناوت دەبەن بەدکتۆر رەفیق داوای بەردانت دەکەن. گوتم: پارەو چەکەکە لای بارزانیە, هاتوچۆی بارزانی دەکەیت بۆ گفتوگۆکردنو لێکۆڵینەوە منیش بەتاوانبار دادەنێیت. رەشید مصلح بەتوڕەییەوە چوە دەرێ لەبەر خۆیەوە بۆڵەبوڵی دەهات.

بەگشتی برادەران لەدەوروپشتم کۆبونەوە هەریەکە لەلای خۆیەوە خۆشحاڵی خۆی دەربڕی سوپاسیان کردم، گوتم: من لەو رۆژەوە بەدیلگیراوم بەڵێنمداوە کەدەبێت لەبەندیخانەکان دەوری سەرەکیم هەبێت, من برا بچوکی ئێوەم خودای مەزن رزگارمان بەکات ئازادبین لەدەست ئەم شوڤێنیانە, من خزمەتکاری کوردو کوردستانم.

دوای پێنج رۆژ سەربازێك هات ئاگاداریکردم کەنەقیب ئەدریس داوات دەکات, گوتی: برات هەیە ناوی کەمال بێت؟ فەرموی دانیشە چونکە ئەوندە ئازایانە بەرامبەر سەرۆکی دادگا قسەت کرد, لەژێر خەیمەکەی من دانیشە چاوت بەبراکەت بەکەوێت, چاشتان بۆ دێت بەکەیفی خۆتان گفتوگۆ بکەن.گوتم: زۆر سوپاسی بەرێزت دەکەم، من شتێکی نهێنیم نییە هەمووی ئاشکرایە. کمال گوتی وامزانی لەسەر داوای بارزانی بەربویت، ئیمرۆو بەیانی بەردەبێت من لێرە دەبم. گوتم: بەریشم بدەن لەبەغدا بەردەبم, چاوەڕوانم بکە لەماڵەوە.

چەند رۆژێکی پێنەچوو منیان بردە لای بەڕێوەبەری پۆلیسی کەرکوك لەوێشەوە ناردیانم بۆ ئاسایشی بەغدا, بەتەلەفون ئاگاداری مامۆستا صالح یوسفییان کرد کەرەفیقمان بەردا, مامۆستا صالح قسەی لەگەڵمداکرد, کاتێکمان دانا یەکتر ببینین. یەکسەر چومەوە ماڵەوە دەستە بەنرخەکانی دایکم ماچکرد, ئەملاو ئەولای هاوسەرەکەم ماچ کرد, چاوی کەمال گیانو روبارو بازیانم ماچ کرد. خۆشحاڵ بوون بەهاتنەوەم کە بەسەربەرزی نزیکەی ١١ مانگم لەبەندیخانە بردبووە سەر.

سوپاس بۆ خوا کەدەسەڵاتی بارزانی (کورد) بەم شێوەیە بەهێز منی لەدەست ئەم زاڵمە شۆڤێنیانەی وەکو رەشید مصلح رزگارکرد.

ماوەی پێنج رۆژ لەماڵەوە بووم بەتەواوی پشوومدا, سەردانی زۆر کەسم کرد, سوپاسی خزمانی بەگزادەی جافم کرد کەزۆر ماندوبوون پێمەوە, رەنگە مەترسییان پەیدا کردبێت کاتێك گیرام نەوەك اعترف

لەسەر یارمەتی‌یەکانیان بکەم.

دووجار دووبەدوو لەگەڵ مامۆستا صالح یوسفی کۆبومەوە, یەکەم قسەم کە لەگەڵ یوسفی کردم باسی بەردانی ئەو برایانەبوو کە لەبەندیخانەی عەسکەرین, بەدووورودرێژی باسی بارودۆخی ئەو رۆژەی بۆ کردم, هەروەها لەگەڵ مامۆستا عبد الرحمن زبیحی, لەگەڵ ئەو برا نیشتمانپەروەرانە دانیشتم کە لەنزیکەوە لەکێشەی کورد ئاگادارن, کاتێك من لەبەندیخانەی عەسکەری بووم ئەو رووداوە دڵتەزێنە بەرپابو, کەدوژمن چەند ساڵ بوو پیلانو تەکتیکی دادەڕشت کەدووبەرەکی لەنێوان سەرکردەکانی کورد دروستبکات ئەوەبوو توانی سەرکەوتو بێت لەپیلانەکانیدا.

### تێبینی

*دەربارەی دووبەرەکی لەنیوان بارزانیو م.س. ئەم باسە بەدورودرێژی دەخەمە بەرچاوی خوێنەری بەرێز, هەرچی لەودیو پەردەوە شاردراوەتەوە دەیخەمەڕوو, باسێکی تایبەتی دەبێت لەم کتێبەی ئێستا لەبەردەستدایە.*

کەوتمەرێ بەرەو قەلادزێی خۆشەویست، گەیشتمەماڵی باوکی بەرێزم، دەستە پیرۆزەکانیم ماچکرد, خۆشحالبوو کە لەبەندیخانە پێی هەستابوم, ئەنجا دەستی باوەژنم ماچکرد, چاوی خۆشكو براکانم یەکەیەکە ماچکرد. سەردانی خزمانم کرد، یەکەم جار چومە خزمەت مامم، دەستە بەنرخەکانیم ماچکرد، بەیانیەکەی چومە ناحیەی سەنگەسەر بۆ بارەگای بارزانی. گەیشتمە پرسگە، کاك تەها بامەڕنی سکرتێر بوو، لەژێر خەیمەکەی دانیشتبوو، سڵاوم کرد کەسەری هەڵبڕی منی دیت هەڵساو خۆشحاڵی خۆی نیشاندا. گوتی: بارزانی دەزانێت کەبەربویت, چوار رۆژ لەمەوبەر ئەحواڵی پرسیت، وەڵاممان نارد بۆ باوکت لەقەڵادزێ. ئنجا دەستی گرتم بەیەکەوە چوینە ژوورێ بۆ خزمەت بارزانی.

بارزانی کەچاوی بەمن کەوت بەجۆرێك پێشوازی لێکردم شەرمەزاریکردم, لەبەرم هەڵساو لەتەنیشت خۆی دانیام, دەستە پیرۆزەکانیم ماچکرد. ناوە ناوە قاچم بەناچاری درێژ دەکرد بەرامبەر سەرۆکی کوردو کوردستان, فەرموی قاچت درێژکە, بەڵام تەنیشتەکەم ناوە ناوە دەستێکی لەکەلەکەم دەدا, یەعنی قاچت درێژ مەکە, بارزانی چاوی پێکەوت فەرمووی ئەمە هی بەندیخانەیە باش دەبێت. بارزانی گەلێك لەمن زیاتر ئاگاداری دەنگوباسی بەندکراوەکان بوو, کەبە چ جۆرێك ئازارو ئەشکەنجەیانداون, ئەنجا باسی منی کرد کەبەرامبەر سیخوڕەکان خۆڕاگربووم، بەجۆرێك باسیکردم شەرمەزاریکردم، ناچار بووم بڵێم کەبەندەی بچوکتان ئەو پیاوەنیم باسم دەکەیت, فەرموی حلمی ناشریف بۆیە باسی خراپەی تۆی دەکرد چونکە تۆ ئازا بویت, ئەنجا هێرشی هێنایە سەر م.س کەیارمتیان نەداوم, ئەنجا بەرامبەر م.س. هەرچی خودا پێی ناخۆشە, زیاد لە٣٠دەقیقە گوتی نەیگوتەوە. گوتم: جەنابی سەرۆك، ئەمانەی باستکرد خراپ بۆیان باسکردویت, حلمی عەلی شەریف بەهیچ جۆرێك خراپەی نەکردووم, کە لەبەندیخانەبووم پارتی زۆر

یارمەتییان داوم لەهەموو رویەکەوە, زۆر ئاگاداری من بون, زۆر جار پارەشیان بۆ ڕەوانە کردووم.

سێ کەس لەخزمەتی دانشتبوون، مەحمودئاغای عەباس ئاغای پشدەر[18], برای یا برازای فتاح ئاغای هەرکیو عەبداللەئاغای پشدەری. لەهەموو هێرشێکی بۆ سەر م.س تەنها من ولامم دەدایەوە, بەلام جەنابی فەتاح ئاغای هەرکیو مەحمودئاغا هانیاندەدا کەڕۆژێك زوتر م.س لەناوبەرێتو سەری یەکەیەکەیان ببڕێت.

بەسەرۆك بەرزانیم گوت: ئەگەر رێگام بدەیت لەخزمەتت هەستم, بەڕێزتان باوکی گەورەمانیت، وەکو ئاگاداربم جەلال خۆی بەکوڕی بەرێزتان دادەنێت، هەموو م.س. ئامادەیە فەرمانی بەڕێزتان جێبەجێ بکات. فەرموی: سەری باوکت بدە بەلام زوو زوو سەری منیش بدە.

چومە لای کاك لوقمان بارزانی, بارەگاکەی بەتەنیشت بارەگای بارزانییەوە بوو, لەو

---

[18] دۆستێکی نزیکی بنەماڵەمان بوو، لەهاتوچۆکردندا هەمیشە لەماڵی ئێمە دەمایەوە ، چەند جار لەخزمەتدابووم, ئاوم بەدەستدا کردووە, جارجار ولاغەکانم بۆ ئاودەدا, باوکم وەکیلی بوە, گوتبووی حاجی مامە کوڕەکەت رەفیق شێتە, بارزانی بەجۆرێك بەخێرهاتنی کرد ئەگەر بەچاوی خۆم نەمدیبایە بڕوام نەدەکرد، ئەویش لەقەی لەرزقی خۆیداو بەدەستی خۆی ماڵی خۆی وێرانکرد بەم بەرگەریکردنەی کە لەجەماعەتی جەلالی دەکرد.

مەحمودئاغا کوڕی گەورەی عەباس ئاغایە, پیاوێکی دەوڵەمەند، باشترین ئەسپو ماینو دڕترین سەگی هەبوو, زاڵم, پیاوکوژ, لەساڵی ١٩٥٢دا حەیوانەکانی بەکری قەساب دەبات بەتالانی, باوکم حەفتا دینار دەداتە مەحمودئاغا ئەنجا حەیوانەکان تەسلیم بەخاوەنەکەی دەکاتەوە. ساڵی ١٩٦١ جارێکیان پ.م بەگوندی چۆمخڕکەدا تێپەڕدەبێت لەنزیك ماڵی مەحمودئاغا, سەگەکانی ئاغا پەلاماری پ.م دەدات, ئەویش لەترسی گیانی خۆی تەقە لەسەگەکە دەکاتو دەیتۆپێنێ، ئاغا خەریك دەبێت پێشمەرگەکە بکوژێت, سەرۆك بارزانی دەچێتە گوندی چۆمخڕکە بۆ ئەوەی (پ.م) رزگار بکات.

گوندی چۆمخڕکە پێشەکی مەلازادەو وەجاغزادەو مامەش– رسول ئەحمەدئاغابووە, بەلام واهات عەباس ئاغا داگیری دەکات, ئێستا کەوتۆتە ژێر دەستی خاوەنی خۆی کەجوتیارەکانن, لەخودای مەزن بەزیاد بێت خودا زوڵم قەبوول ناکات.

كاتەدا دەنگی گۆرانی بێژێكی تۆماردەكرد، گوتی: ماوەیەك بەندكرابووم چاوەڕوان بووم كەسەردانم بكەیت، كاتێك بەربووم ئەحوالم پرسی گوتیان گیراوە, ئیمرۆش زانیم لێرەیت بڕیارم دابوو سەردانت بكەم لەقەلادزێ لەماڵی باوكت، گوتم: حەمەی خولەی لەیلێ لێرەیە هاتبووە خزمەتت بەداخەوە رێگەیان نەداوە، ئایا لەبیرت چوە مانگی ١٠جار میوانداری تۆو عبیداللەی دەكرد, ولامی نەبوو چونكە ئەوانە پیاوەتییان زوو لەبیر دەچێتەوە.

بەیانیەكەی چومە رانیە، سەردانی مام جەلالم كرد كە لەماڵی شێخ حەمید میوان بوو. كەچومە خزمەتی، عبداللەئاغای پشدەری قسەكانی منی دەگێڕایەوە، دەیكرد بەهی خۆی جارجاریش تەماشای منی دەكرد.

زوو زوو سەردانی سەرۆك بارزانیم دەكرد لەسەنگەسەر یا لەرانیە. بارزانی فەرموی سەعیدی حەمەئاغای مێرگەسور لەگەڵ خۆت ببە بەغداو بەیەكەوە بگەڕێنەوە, فەرمانەكەم جێبەجێ كرد كەبۆ كارێكی تایبەتی بارزانی دەبوایە بچوایە بۆ بەغدا، بەلام نەیدەوێرا بەتەنیا بروات نەكا تیرۆر بكرێت كەچی دوای هەرەسەكە لەبەندیخانەی رایات بەفەرمانی سەرۆك بارزانی تیرۆركرا.

***أعظم جهاد كلمة حق عند سلطان جائر***

ئەی جەماوەری كوردی بەشەرەف، رۆڵەكانی شێخ مەحمودو شێخ سەعیدی پیرانو قازی محمدو مەلامستەفا بارزانی، ئەی دانیشتوانی كوردستانی باشوور، ئەی ئەوانەی ئامادەن لەپێناو سەقامگیربونی ئازادیو دیموكراتیو سەربەخۆیی راستەقینە بۆ كورد گیانی خۆتان بەختكەن، ئەی ئەوانەی پەیمانتان داوە هەتا پەتی سێدارە نەگاتە ملتان وەكو لەیلا قاسمو هاوڕێكانیواز لەخەبات نەهێنن لەپێناوی كوردا، سەرنج لەم راستییانە بدەن:

ئەم بەشە تایبەتە بەگەڕانەوەی سەرۆك بارزانیو پەردەلادان لەسەر ئەو استییانەی كەخۆم بەشەخصی ئاگاداربووم، ئەو دووبەرەكییە ڕووندەكەمەوە كەئێستا بەردەوامەو نەیهێشتوە تینویەتی ئەو شۆڕشگێڕانە بشكێنێت كەتینوی سەروەریی میللەتی كوردن، لەكوێوە هاتووەو چۆن بووەو تاوانبارەكان كێن..؟ بەو نیازەی كوردپەروەران بەرچاو ڕوون بن لەدوژمنانی گەلەكەیان چونكە دار دەڵێت ئەگەر تەور دەسكی لەخۆم نەبێت نامبڕێتەوە. كوردستانەكەمان دابەشكراوە بەسەر چوار دەوڵەتدا: عیراقو ئێرانو توركیاو سوریا، لەناو خۆیاندا لەسەر هەموو شتێك ناڕێكن تەنها لەسەر ئەوە نەبێت كەكورد ببێت بەدەوڵەت، من مرۆڤێكم لەچاو ئێوەدا بێدەسەلاتمو عەقڵیشم بەهەموو شتێك ناشكێتو ئەو راستیە دەزانم، ئەی باشە ئەو پیاوە گەورانەی لەسەر حسابی خەڵكی شارەكەی خۆیان بەرژەوەندییە حزبییەكانیان بنیاد دەنێنو بەناوی سیاسەتەوە دەست لەگەڵ ئەو دوژمنانەدا تێكەڵ دەكەن، نازانن ئەوە كارێكی نابەجێیە؟ ئەگەر پەیوەندیت هەیە بەهەموو وڵاتەكانی دەرەوە ئەمە كارێكی باشە، بەلام چۆن؟

بەو شێوەیە باشە کەخۆتو حزبەکەت بکەیت بەپردێك بۆ ئەوەی خەڵکی وڵاتەکەت بەسەریدا تێپەڕێت لەژیانێکی کولەمەرگی ناخۆشەوە بۆ ژیانێکی ئاسودەو پڕ کامەرانی لەژێر ئاڵای کوردستانێکی ڕزگارکراودا نەك خەڵکی وڵاتەکەت بکەیت بەپردێكو خۆتو ئەو دەوڵەتەی کەئارەزوی لێبێت بەسەریدا تێپەڕێتو چۆنیان بوێت بەو شێوەیە بەرژەوەندییەکانیان لەناو خەڵکدا بچەسپێنن، ئەگەر ئەمە خیانەت نەبێت ئەی چیيە ؟

ئەگەر هەموو حزبەکانی کوردستان خۆیان لەچوارچێوەی یەك بەرەی گەورەی کوردستانیدا یەکبگرن ئەوە مانای ئەوەیە ٤٥ ملیۆن کورد بوو بەیەك، لەم کاتەدا تۆ بەلای کەمەوە ٣ ملیۆن کورد نوێنەرت دەبێت لەوڵاتەکانی دەرەوەدا چ پێویستییەکت بەعیراقو ئێرانو تورکیاو سوریا دەبێت کەرێگات بدەن بچیت بۆ دەرەوەی وەڵات یان نا، بۆ نمونە تۆ بۆ ئەوەی بەتەنیا بچیت بۆ ئەمریکاو چاوەڕوانی پێشوازی بیت، ئەو کاتە وەزیری دەرەوەی ئەمریکا خاتوو مادلین ئۆڵبڕایت خۆی دێت بۆ کوردستان دەڵێت چیتان دەوێت بۆتان بکەم، ئنجا هەموو دانیشتوانی کوردستان بەپیریەوە دەچن چونکە وەکو زانراوە ئەمریکا تەنها لەدوای بەرژەوەندیی خۆی دەگەڕێت، تۆ لەم کاتەدا دەبیت بەخاوەنی ٤٥ ملیۆن کەسو خاوەنی نەوتو ئاوو کانزایەکی زۆر، هەروەها خاکێکی بەپیت بۆ کشتوکاڵ ئیتر دەتوانی یارمەتی ئەو بدەیت لەو دوو لایەنەوە نەوەك ئەو یارمەتیت بدات. تۆ لەهەموو ساتێکدا دەتوانیت پەیوەندی بکەیت بەو شوێنەوە کەخۆت دەتەوێت بەڵام ئێوە ئیستغلالی ئەو دووبەرەکییەتان کردووە کە لەناو کوردستاندا هەیە بەتایبەتی کوردستانی باشوور بۆ ئەوەی بتوانن لەپێناو بەرژەوەندی تایبەتی خۆتان هاتوچۆی ئەو چوار دەوڵەتە ئیقلیمییە حەڵاڵ بکەن، هەروەها بۆ ئەوەی ئەگەر دەستی دووژمنانی میللەتەکەشت گرتو هێناتە ناو وڵاتەکەتەوە بتوانیت پاساوی بۆ بهێنیتەوە لەلای خەڵك بەگشتیو میللەتەکەت بەتایبەتی.

خۆتان زۆر چاك ئاگاداری ئەوەن ئەگەر بێتو گۆڕانکارییەك بەسەر داهاتوی عیراقدا بێتو ئەو گۆڕانکارییە لەبەرژەوەندی تورکیاو ئێراندا نەبێت دەرگاکانتان لێ دادەخەنو بەهیچ شێوەیەك نایەڵن لەخاکیانەوە هاتوچۆ بکەن، جگەلەوی خەراپەتان دەکەن. بۆ نموونە دوای ئاشبەتاڵی ١٩٧٥، ئێرانو تورکیا چۆن بەرامبەر بەکورد گۆڕانو کونەمشکیان لێکردن بەقەیسەری، بۆیە ئامۆژگاری سەرکردەکان دەکەم کەچارەسەرەکانی من بەوردی بخوێننەوە پێش ئەوەی بڕیاری تیرۆرکردنی خۆمو ماڵومنداڵم بدەن، هەرچەندە تا ئێستا سوودتان لەڕابوردوو وەرنەگرتووە، بۆیە پێم باشە کەلەم بەشەدا بەچاکی ماهییەتی ئەو چوار دەوڵەتەو پیلانەکانیان، لەڕێی کوردەوە بۆ لەناوبردنی کورد، روونبکەمەوە.

سەرەتای نائارامییەکان لەوێوە دەستی پێکرد کاتێك دوای شۆڕشی ١٤ی تەمووز، لەزۆر لەناوچەکانی کوردستان گرژی لەنێوان پارتیو شیوعی پەیدابوو. شیوعیەکان بەشی زۆری چینی چەوساوە( جوتیارو کرێکار) چونە پاڵیان لەسەرانسەری عیراق بەتایبەتی لەکوردستان ئەوان بەهێزتر بوون، هەروەها ئەوان

دەستیان خستە ناو کادرەکانی پارتی بەنهێنی، لەلایەکی تریشەوە شیوعیەکان دەیانگوت کۆمارەکەمان ساوایەو لەم ڕۆژە ناسکەدا نابێت هیچ داواکارییەك لەحکومەتی زەعیم بکەین، ئەم حاڵە چوو بۆ بەردەمی زەعیمو دەوروپشتی لەوانە سکرتێرەکەی وصفي طاهر، هەروەها ئەندامانی دادگای شۆڕش ماجد محمد امینو تەنها کاك فتاح سعید شاڵی [19] یەکێك لەو ئەفسەرانەی بە(الضباط الأحرار) ناو دەبرێن پشتگیری لەپارتی دەکرد، شیوعیەکان زۆر بەڵگەیان بەدەستەوەبوو پڕوپاگەندەیان بۆ خۆیان دەکردو دەیانگوت لەبەر ئەوەی بارزانی ماوەیەکی دورودرێژە لەڕوسیایە گومانی تێدا نییە کەشیوعیە.

پ.د.ك. لەهەموو چینەکان لەدەوروپشتی کۆبونەوە لەجوتیارو کرێکارو قوتابیو کاسبکارو شێخو ئاغاو مەلا، پارتی پڕوپاگندەی خۆی دەکرد لەناو جەماوەر کەبارزانی سەرۆکی پارتیەو بە ئاشکرا دەربارەی مافی کورد دەدوانو دەیانگوت لەم بارودۆخەی ئێستای عیراقدا پێویستە حکومەت دان بنێت بەمافی کوردو خوێندن ببێت بەزمانی کوردی لەکوردستانی باشووردا.

سیاسەتمەداران بەتایبەتیو جەماوەری کورد بەگشتی چاوەڕوانی هاتنەوەی بارزانی بوون دەیانگوت ئەگەر بارزانی بگەڕێتەوە لەکام گروپ دەبێت: (شیوعی یان پارتی)؟

دوای ئەوەی نزیکەی ١٣ ساڵ ژیانی لەتاراوگە، لەڕوسیا بردەسەر، کەگەڕایەوە عیراق یەکەم شەو لەمیوانخانەی خیام لە(باب الشرقي) دابەزی، بۆ بەیانی گواستیەوە بۆ میوانخانەی سمیرامیس (لەسنك) لەبەغدا. دانیشتوانی عیراق بەگشتیو جەماوەری کورد بەتایبەتی ڕووەو بەغدا هاتن بۆ ئەوەی بەچاوی خۆیان لەنزیکەوە بەخزمەت ئەم شۆڕشگێڕە قارەمانە بگەن. بەجۆرێك پێشوازی لێکرا کەجێی سەرسوڕمان بوو لەدەرەوەو ناوەوەی عیراق، ئەو ڕۆژە گەورەترین کەسایەتی لەسەرانسەری کوردستان تەنها مستەفا بارزانی بوو، بەگشتی زۆرمان پێناخۆش بوو کە لەوتارێکیدا بۆ عیراق فەرموی من سەربازێکی زەعیمم چونکە کەسایەتی بارزانی، هاوشانی کەسایەتی زەعیم بوو گەلێك زیاتریش.

بارزانی دوای گەڕانەوەی بۆ عێراق پۆستی سەرۆکایەتی حزبی پارتی پێدەدرێت، بەم کارە جەماوەرێکی زۆر لەدەوروبەری پارتی کۆدەبنەوە، ئەمە بوو بەهۆی ئەوەی ٨٠٪ی خەڵك خۆیان بەجەماوەری پارتی لەقەڵەم بدەنو شیوعیەکان جەماوەرێکی زۆر کەمیان بۆ بمێنێتەوە. لەیەکەم ساتەوە توانی بەتەواوەتی بەسەر مەکتەبی سیاسیو لیژنەی مەرکەزیدا زاڵبێت، هەر یەکە کاری خۆی بۆ دیاری بکات، بۆ نموونە مامۆستا همزە عبداللە پێشوازی لەبەشی زۆری کەسایەتیە عەرەبیو کوردیەکان دەکرد چونکە من یەکێك بووم لەپێشوازیکەران، زۆربەی پیاوە مەزنەکانمام نەدەناسی، بۆ نموونە من جەنابی نور الدین محمودم نەدیبوو کەفەرموی دەمەوێت بەتەنها چاوم بەبارزانی بکەوێت، پەنام بۆ مامۆستا همزە عبداللە هێنا چونکە ئەو ناسراوبوو، خەڵکیشی لەئێمە زۆرتر دەناسی.

مامۆستا ابراهیم احمدو کاك نوری شاوەیس بەتەنها لەباخچەکە دانیشتبون کەس ئاوڕی لێنەدەدانەوە،

---

[19] لەبنەماڵەیەکی ناسراو هاتوتە دنیاوە لەسلێمانی، نیشتیمانپەروە، بەشداری لەشۆڕشی ١٤ تموزدا کردووە، ئەندامێکی سەرەکی دادگای شۆڕش بوو، یارمەتیداو (جەماعەتی مام جەلال بوو) زیرەك، پاك، ئازا لەناو عەرەبە نەتەوەییەکاندا ڕێزی تایبەتی هەبوو.

لەکاتێکدا کەبارزانی کاتی نەبوو خەڵك بەتەنها ببینێت، ژمارەی خەڵك دەگەیشتە نزیکەی ٤٠٠–٥٠٠ کەس، ئەم خەڵکە لەگۆڕەپانی پشت میوانخانەکە کۆدەبونەوە ئینجا لەباڵکۆنی میوانخانەکەوە بارزانی ڕۆژانە وتاری بۆ جەماوەرکە دەخوێندەوە.

## پەیوەندی نێوان مستەفا بارزانیو عبدالکریم قاسم

قاسم لەیەکەم دیداری لەگەڵ بارزانیدا دەڵێت ئامۆژگارییەکم هەیە: ئیمڕۆ تۆ گەورەی هەموو کوردیت، تکام وایە هەرچی لەرابردوودا بەرامبەرت چ لەلایەن سەرۆك هۆزەکان یا هەر کەسێکیتر لەبیر خۆتی ببەیتەوە، لەمڕۆوە بارودۆخەکە پێویست بەوە دەکات لاپەڕەیەکی سپی هەڵدەیتەوە بەرامبەر هەموو سەرۆك هۆزەکانو گشت ئەو خەڵکانەی خراپەیان کردوویت، ئینجا بەناو هەموو هۆزەکاندا بگەرێیتو بەیەك چاو تەماشای هەموو کورد بکەیت, ئەمە سودبەخش دەبێت بۆ کۆمارەکەمان چونکە دوژمنمان یەکجار زۆرە با کونێك نەدۆزنەوە لەوێوە بێنە ژورێ، جارێ ئێمە کۆمارێکی ساواین.

لەسەرەتاوە هەرچی پێی بڵێی ناکۆکی لەنێوان زەعیمو بارزانیدا نەبوو بەتایبەتی بارزانی کەبەردەوام لەناو جەماوەرو لەکۆڕی دانیشتنی تایبەتیدا دەیگوت: من سەربازێکی زەعیمم. بارزانی ئەوەی ویستویەتی ٩٠٪ی بۆ جێبەجێ کراوە، بۆ نمونە: منێکی کە لەهیچ کونو قوژبنێکەوە دیارنەبووم کاتێك دەیفەرموو ئەم نامەیە بەرە بۆ وەزارەتی بەرگری یا بۆ (وصفي طاهر) سکرتێری قاسم یا بۆ عبد الباقی کازم کەبەڕێوەبەری گشتی پۆلیس بوو، بەبێ یەكو دوو هەرچی داواکاریەکانی ناو نامەکەی بارزانی هەبوو جێبەجێیان دەکرد چونکە قاسم ئەوانەی ئاگادار کردبۆوە کەداواکارییەکانی بارزانی ڕەتنەکەنەوە.

بارزانی ئامۆژگاریەکانی قاسمی پشتگوێ خستو پیادەی نەکرد، ڕاستە دۆستایەتی بەهێزکرد لەگەڵ چەند سەرۆك هۆزێکدا، بەڵام ئەوەی لەڕابردوودا دوژمنایەتی بارزانی کردبوو دەفتەرە ڕەشەکەی هەروەك خۆی مایەوەو نەکوژایەوەو ناکوژێتەوە. ڕۆژێکیان ئاگاداری سەرۆك بارزانیم کرد کەمحمود همزە بگ شاسوار دەیەوێت بێتە خزمەتت، فەرموی ئەمە لەکوێ دەناسیت؟ گوتم: همزە شاسوار[٢٠] قائمقام بوو لەقەڵادزێو دۆستێکی دێرینی باوکم بوو، گوتی ئەم سەگبابە هەر ماوە، حەقی کوشتنی هەیە چونکە خراپەی ئێمەی زۆر کردوە. گوتم: گەورەم یەکجار زۆر بەتەمەنە لەمردندایە بەڵام کوڕەکانی دۆستایەتیم هەیە لەگەڵیاندا، کاك محمودو کاك احمد هەردوکیان کوردێکی نیشتیمانپەروەرن. ڕۆژێك گوتم: گەورەم ئەسعد ئاغای شێتنە[٢١] دەیەوێ بێتە خزمەتت، فەرموی ناوی ئەم سەگبابەت هێنا ئیمڕۆ نانم پێ ناخورێت، گوتم: کمال عوسمان ئاغا بۆی گێڕامەوە کەقاسم ئاگاداری سکرتێرەکانی کردوە اسعد ئاغا هەر کاتێك ویستی بێتە لام دوای

---

[٢٠] کاتێك حکومەتی عیراقی هاتە قەڵادزێ بۆ یەکەم جاری لەساڵی ١٩٣٨ همزە شاسوار بەیەکەم قائمقام دانرا، ئەم پیاوە زۆر کۆنەپەرستو لەهۆزی دەلۆ بووە زۆر ئازاو زیرەكو ئیداری بوو دوو کوڕی هەبوو محمودو ئەحمەد لەدوای ١٤ ی تموز لەڕێگای عبدالسلام عارفەوە یەکسەر مەحمودیان کەئەفسەر بوو خانەنشین کرا. (احمد) بەتاوانی ئەوەی سەر بەبارزانیە گیرابوو من ڕزگارم کرد لەسێدارەدان، کاتێ قائمقام بووە لەدهۆك کوڕێکی دڵسۆزو نیشتمانپەروەر بووە، دەرچووی کۆلیجی یاسایە.

[٢١] لەچلەکانەوە شان بەشانی سوپای عیراقی خزمەتی کردووە، بەبۆنەی چالاکی لەزەمانی پادشایدا پلەی (رائد) یان داوەتێ لەسوپای عیراقی. لەگوندی شێتنە دادەنیشت، بەجۆرێك خراپەی بارزانیەکانی کردووە بەنوسین کۆتایی نایەت.

مەخەن. گوتی: خراپەی ئەم سەگبابە لەهیچ دەفتەرێك جێگای نابێتەوە.

جارێکیان کەسێك هاتبوو جلوبەرگێکی زۆر رێکوپێکی لەبەردا بوو تەمەنی ٥٠ ساڵ دەبوو لەباخچەی خانوەکە بەبێدەنگیو کلۆڵی راوەستابوو، ئەگەر ئەو جلوبەرگەی لەبەر نەبوایە دەمگوت سواڵکەرە، کاتێك بارزانی لەژورەوە هاتە دەرێ ئەم برایەش چووە بەردەمی دەستی ماچ بکات، بارزانی فەرمانیکرد کەبیکوژن، منو کاك عەلی عزیز رزگارمانکرد لەدەست پاسەوانەکانی. ئەو پیاوە لەرێگای کمال عوسمان ئاغا دەگاتە عبدالکریم قاسم بۆ شکاتکردن.

خەڵکێکی زۆر دەهاتنە خزمەت بارزانی، بۆ نموونە: لەسالآنی پێشو (فلآن) ئاغا، یا( فلآن) شێخ گوند یا ئەرزیان لێ داگیرکردوە، یا کەسوکاری کوژراوە، ئەمەو چەندەها کێشەی تر باری سەرۆکیان زۆر قورس کردبوو، لەهەموی گرنگتر چەند دۆستێکی دێرینی خۆی لەسەرۆك هۆزە ناسراوەکان پێیان رادەگەیاند ئەگەر یاسای چارەسەرکردنی کشتوکاڵ جێبەجێ بکرێت ژیانیان زۆر زەحمەت دەبێ، لەکاتێکدا ئەگەر ئەو یاسایە دەرنەچوایە شۆڕشەکەی قاسم بەشۆڕشی ١٤ی تموز ناو نەدەبرا.

هەندێك لەکادرانی پارتی لەسەر بەشداربوونیان لەرووداوەکانی شەواف‌و کەرکوکدا بەبێ ئاگاداری بارزانی، لەپارێزگاکانی موصل‌و کەرکوك دەستگیرکران‌و ئەم کارە سەربەخۆیانەی ئەندامانی پارتی هەتا دەهات گرژی نێوان قاسم‌و بارزانی زیاد دەکرد، تۆرانیەکان‌و عەرەبە شوفینیەکان دەستێکی بالآیان هەبوو لەگرتنیاندا. سەرۆك هۆزی زێباری احمد زێباری لەسالآنی شەستەکاندا لەموصل تیرۆرکرا، کەباوکی ئەرشەد زێبارییە، ئەوانەی بەو کارە هەستابوون یەکێکیان لەوانەی لەساڵی ١٩٦٣ یەکترمان ناسی پێیان دەگوت مەلکۆ بارزانی، لەبەغدا بەباوکی جەمیلە ناسرابوو، ژنێکی رووسی هەبوو ماڵەکەیان لەئیسکانی غەربی بەغدابوو، کاتێك هاتوچۆی بارزانیم دەکرد لەسەنگەسەرو رانیە ئەو یەکێك بوو لەبارزانییەکانی نزیکی مەلامستەفا، دەفتەرێکی بچوکی پێبوو بەئاشکرا ئەوەی هاتوچۆی بارزانی دەکرد دەینوسی. لەناو خەڵکدا بەسیخوڕی روسیا ناوی دەرکردبوو بەڵام هەر بەئاشکرا چالاکیەکانی خۆی ئەنجامدەدا، کەشەڕ دەستی پێکردەوە (١٩٧٤) لەبەغدا مایەوە، بەهۆی تەسلیمکردنی راپۆرتێك لەلایەن کوردێکی خەڵکی مەندەلییەوە بەکارمەندێکی سەفارەتی رووسی لەبەغدا لەساڵی ١٩٧٥دا، ئەم کوردە دەستگیر دەکرێت، لەدوای لێکۆڵینەوەیەکی زۆر دان بەوەدا دەنێت کەئەمان تۆڕێکن سەر بەروسیاو مەلکۆ بارزانیش سەرۆکی ئەم تۆڕەیە، دەمودەست ملکۆ دەستگیر دەکرێت، لەدوای ئەوەی لەمیش دەکۆڵنەوە دەڵێت باوکی ئەرشەد زێباری بەبڕیاری مەلامستەفا کوژراوە، من سەر بەڕوسیام، هاوسەرەکەم کەپێی دەڵێن دایکی جەمیلە، روسیەیە. کوشتنی ئەم زێبارییە یەکێك بوو لەو هۆیانەی قاسمی بەرامبەر مستەفا بارزانی گرژکرد چونکە بارزانی پەیمانی بەقاسم دابوو چیتر خوێنی کەس نەرێژێت، من پەیتاپەیتا مەکتەبی بارزانیم لەهەنگاوەکانی لێکۆڵینەوەکە ئاگادار دەکردەوە چونکە زۆر بەلایانەوە گرنگ بوو ئەم پیاوە لەسێدارە بدرێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا زۆر هەوڵمدا لەرێگای تایبەتی خۆمەوە کە لەسێدارە نەدرێت‌و یارمەتی بدەم بەڵام هەر لەسێدارەدرا.

لەپڕ لەو بارودۆخە ناسکەدا هەواڵی تیرۆرکردنی صدیق میرانی شقلاوە[٢٢] بڵاوبۆوە کە لەبۆسەیەکدا بەدەستی محمود کاوانیو بەپیلانی بارزانی ئەنجامدرا، لەئەنجامی ئەمەدا دوژمنانی بارزانی(پارتی) ئەمەیان خستە پاڵ مامۆستا ابراهیم احمد، هەرچەندە تیرۆرکردنی بەبڕیاری گشتی م.س نەبووە بەڵکو بەتەنها بارزانیو محمود کاوانی نەبێت کەسیتر ئاگادار نەبوو بەڵام دوژمنانی کورد کێشەکەیان گەورەکرد، بەجۆرێك کەقاسم گەیشتە ئەو باوەڕەی کەبارزانی کێشەی زۆری بۆ دروست دەکات.

بارزانی کەهەستیکرد قاسم لێیان ناڕازییە، پێنج نامەی تایبەتی رەوانەکرد بۆ سەرۆك هۆزەکان لەوانە جەنابی عباس مامەندئاغا (سەرۆك هۆزی ئاکۆ) کەهێزی چەکدار کۆبکەنەوەو مانۆڕێکی چەکداری بەرامبەر حکومەت ئەنجامبدەن. بارزانی ئەو پیلانەی بەو نیازە داڕشت کەعبدالکریم قاسم داوای چارەسەرکردنی کێشەکانی لێبکات، چونکە بارزانی وایدەزانی حکومەت زۆر لاوازبووە.

### بارودۆخی حکومەتی عبدالکریم قاسم لەدەرەوەو ناوەوە

لەدەرەوە ئێرانو تورکیاو دەوڵەتەکانی کەنداو سوریاو ئەمریکاو بریتانیا پیلانیان دادەڕشت کەچۆن حکومەتی قاسم لاواز بکەن ئینجا بەرەو روخانی بەرن، لەناویشەوە بەعسو عەرەبە شۆفینیەکانو تۆرانیەکان، بەڵام دەوڵەتە ئیشتراکیەکانو ئەوانەی سیاسەتی روسیایان پەسەند دەکرد لەدەرەوەی وڵات پشتگیرییان لێدەکرد. لەناویشەوە حزبی شیوعیو بەشی زۆری هێزی دیموکراتی لەعەرەب بەتایبەتی عەرەبی شیعەو جوتیارو کریکارو چینی چەوساوەو بەشێکی کوردی نیشتیمانپەروەریش پشتگیرییان لێدەکرد.

هەڵوێستی عیراق بەرامبەر بەکورد ئەوەبوو کە لەدەستوریدا هاتبوو عەربو کورد لەم نیشتیمانەدا هاوبەشن، وەزیری کوردی هەیە، پارتێکی سیاسی کوردی بەناوی (پ.د.ك)ەوە بەئاشکرا کاروبارو بیروباوەڕەو بۆچوونی بۆ جێبەجێ کردنی کێشەی کورد لەڕۆژنامەی خەبات کەزمانحاڵی پارتییە بەهەموو ئەو دەنگوباسانە بەزەقیو بەئاشکرا بڵاوی دەکردەوە کە لەبەرژەوەندی حزبەکەیدابوو.

پێشەکی هیچ جیاوازییەك نەبوو لەنێوان عەرەبو کورد، هەموو کوردێك لەراست خۆیەوە بەئیشوکاری تایبەتی خۆی هەڵدەستا (کاسب، جوتیار، قوتابی، مامۆستا،سەرباز، ئەفسەر، خویندکار، لەزانکۆ). بزوتنەوەی کوردی لەهەموو لایەکەوە رۆژ بەڕۆژ بەرەو پێشەوە دەرۆیشت، ئەگەر بەگشتی لەعیراق هەڵبژاردن بکرایە ٣٤٪ی دانیشتوانی عیراق کورد دەردەچو، ئەو بنەماڵانەی زیاتر لەسەد ساڵ بوو کوردستانیان بەجێهێشتبوو هاواریان دەکرد دەیانگوت ئێمە باپیرمان کوردە، ژمارەی کورد روو لەزیادبوون بوو، شارۆچکەی خانەقین ١٠٠٪ کوردبوو، کەرکوك ٨٥٪ ی کورد بوو، ١٥٪ی تورکمان بوو، چوار ماڵی

---

[٢٢] یەکێکە لەپیاوە ناسراوەکانی خۆشناوەتی، لەسەردەمی پاشایەتیدا ماوەیەکی زۆر ئەندامی پەرلەمان (نائیب) بووە، بەهۆی ئەوەی جێنشینی شقڵاوە بوو خەڵکێکی زۆر لەکوردو عەرەب بەخزمەتی گەیشتبوو، دۆستێکی دێرینی کمال عوسمان ئاغا بوو،خودی قاسم زۆر رێزی لێدەگرت، مرۆڤێکی کۆنەپەرست بوو، لەناو چینی چەوساوە بەڕقەوە تەماشادەکرا چونکە دوژمنی ئازادی بوو، رۆژێك لەڕۆژان لەگەڵ بزوتنەوەی کوردیدا نەبووە.

عەرەبی لێبوو گامێشیان بەخێو دەکرد، بەڵام موچەخۆری زۆری لێبوو کەعەرەب بوون، ئێستا ٧٥٪ی دانیشتوانی کەرکوك عەرەبە، دووبز ٩٥٪ی کورد بوون ئێستا دووبز بۆتە دبس‌و ٩٥٪ی عەرەبن، ئەمەی باسمکرد نمونەیەکە، هەروەها شێخان‌و سنجارو تلعفرو زەمار، سنورمان نزیك شاخی حمرین بوو بەڵام ئێستا دور لەهەولێر بەدە کیلۆ متر عەرەبە، بەم شێوەیە بڕوات کوردی هەولێریش دەبێتە ٥٠٪و بەهەمان شێوە لەهەموو کوردستاندا.

## جۆری چەکەکانی پارتی‌و حکومەت

حکومەت تازەترین چەکی شەستەکانی هەبوو لەفڕۆکە، تانك، زرێپۆش، توپ، هەموو جۆرە چەکێکی سوك، هەموو جۆرە هۆیەکی گواستنەوە، تەقەمەنییەکی زۆر، ئامێری گەیاندن وەکو تەلەفون‌و لاسلکی، نەخۆشخانە، خەزێنەی پڕ، سوپایەکی شارەزای مەشقکردووی رێکوپێك، خواردن‌و جلوبەرگێکی زۆر بۆ سوپا. بەڵام کورد چەکی جەنگی جیهانی یەکەم (١٩١٤)ی بەکاردەهێنا، تفەنگی ئینگلیزی، هۆڵەندی، سێ تیری فەرەنسی، برنەو، تەقەمەنی تەنها ئەوەبوو کەپێیان بوو، هاتوچۆکردن بەوڵاخ یان بەپێ بوو، نەخۆشخانەیان نەبوو، نامە بەهۆی پۆستەچی‌یەوە (تەتەر) بەدەست دەگەیشت.

بەڵام پارتی لەسەرانسەری کوردستاندا هێزێکی جەماوەریی پتەوی هەبوو, بەشی زۆری کوردستانی باکورو کوردستانی رۆژهەڵات‌و کوردەکانی سوریا دوعای خێریان بۆ دەکردین‌و بەپێی توانای خۆیان بەنهێنی‌و بەبێ ئاگاداری حکومەتەکانی سوریاو تورکیاو ئێران هەندێك یارمەتی شۆڕشیان دەدا. بەفەرمانی بارزانی لەزۆربەی کوردستاندا خاڵی پشکنین دانرا، ئەم کارە بەتەواوی گرژی لەنێوان قاسم‌و بارزانیدا دروستکرد.

بەفەرمانی عبدالکریم قاسم هەموو هێزێك بەرامبەر بارزانی بەکارهات وەکو فڕۆکەو تانك‌و زرێپۆش، لەئەنجامدا لەماوەیەکی کورتدا هێزە چەکدارەکانی بارزانی لەسەرانسەری کوردستاندا تێکشکا.

چەکدارەکانی هۆزی پشدەر شانبەشانی چەکدارەکانی شۆڕش دژ بەهێزەکەی عبدالکریم قاسم راوەستابوون، بەڵام تیرەی بابکر سەلیم ئاغای پشدەر نەبێت لەجیاتی ئەوەی هێرش بەرنەسەر دوژمن ئەو بارودۆخەیان بەهەل زانی‌و هەڵوێستێکی زۆر نامەردانەو نامرۆیانەیان نواند، ئەوەبوو هێرشیان بردەسەر گوندی (دێلۆو مێرتکە) کەسەر بەهۆزی مامەش بوون، هەردوو گوندەکەیان تاڵانکردو سوتاندیان، چەند کەسێکیان لێ کوشت‌و منداڵێکیشیان بەلانکەوە سوتاند. هەڵوێستی ئەم ستەمکارە زیانێکی زۆری گەیاند بەباری رامیاری شۆڕشەکە لەو ناوچەیەدا، چونکە حزبی شیوعی ئەم هەلەی قۆزتەوەو لەئەنجامدا بەیانێکی بڵاوکردەوە تیایدا باسی لەوە دەکرد کەئەم شۆڕشە چەند (ئاغاو کۆنەپەرست‌و دەرەبەگ)ێك بەرێوەی دەبات کەدژی شۆڕشی ١٤ی تەموزی پیرۆز راوەستاون, لەهەمانکاتدا شیوعیەکان بەنهێنی دەستی یارمەتییان درێژ کرد بۆ ئەم دوو دێیە, ئەوەبوو لیژنەیەکیان پێکهێناو بەناوی دانیشتوانی شارۆچکەی

قـەڵادزێوە بەسـەرۆکایەتی تـۆفیقی حـاجی صـادق کـەمامی منـەو سـەر بەشـیوعیەکان بـوو, ئـەو کارەیـان ئەنجامدا.

## مستەفا بارزانی سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستان

هەرچەندە پارتی، لیژنەی مەرکەزیو مەکتـەبی سیاسـیو سـکرتارییەتی هـەبوو، وەکـو هـەموو رێکخـراوو پارتێك کە لەجیهاندا هەیە، بەڵام خودی بارزانی هەموو شـتێك بـوو لـەڕووی بڕیـارو دەسـتەڵاتەوە, سـتالینێك بـوو بـۆ خـۆی بەسـەر کوردسـتانەوە. مامۆسـتا همـزە عبـداللهو جەماعەتەکـەی دەیـانگوت (پ.د.ك) کۆتـایی پێهات، دەبێت لەمەودوا بەگوێرەی پرۆگرامو ئایدۆلۆجیەتی مارکس هەڵسوکەوت بکـەینو بـچینە پـاڵ حزبـی شیوعی. مام جـەلال دوورخرایـەوە بـۆ یـەك سـاڵ، ئـەو کاتـە مـن تـەنها قوتابییـەکی گوێگربـووم لـەکاروباری رامیاریدا، برای بەڕێزو مامۆسـتای نیـشتیمانپەروەرم مامۆسـتاجمال نەبـەز بـۆی روونکردمـەوە ئەگـەر بێـتو مامۆسـتا هـەمزە عبـدالله لـەم بارودۆخـە ناسـکەی بزوتنـەوەی کوردیـدا هەوڵبـدات پـارتی بەرێتـە نـاو حزبـی شیوعیەوە ئەوا دەبێ بڵێین حزبێکی نەتەوایەتی هەبوو کەهەوڵی بۆ رزگارکردنی کوردستان دەدا ناوی پـارتی دیموکراتی کوردستان بوو.

بارزانی گوێی لەم قسەیەی من بوو کە بەمامۆستا همزە عبداللەم گوت (ئەگەر لەبەر خودی بارزانی نـەبێت ئێستا چەقۆیەك لەسکت دەدەم)، پاش ماوەیەك مامۆستا همزە عبدالله چەند جارێك پرسیاری لێکـردم کـەکێ تۆی هاندابوو دژی من، منیش هەردەم داوای لێبورنم لێدەکرد لەسەر ئەو کارە ناڕەوایەم.

سەرۆك بارزانی لەماوەی چەند سەعاتێکدا ئەو چوار شۆڕەسوارەی کەبڕبڕەی پشتی پارتی بـوونو پێیـان دەگوتن (فرسان الاربعە)(مامۆستا همزە عبدالله کەسکرتێری پ.د.ك بوو, صالَح حیدەریو نـەژاد احمـد عزیـز ئاغاو خەسرەو تۆفیق)ی دوورخستەوە, من یەکێك بووم لەوانەی ئـەم هـەنگاوەم زۆر پێخـۆش بـوو. مامۆسـتا ابراهیم احمد بەفرمانی بارزانی کرا بەسکرتێری پ.د.ك, بارزانی کەسەرۆكو بـاوکی گـەلی کوردبـوو تێکۆشـەرو فیـداکاربوو، کەسـایەتی ئـەم پیـاوە مەزنـە هـەموو شـتێك بـوو لـەلای جـەماوەر، ئینجـا دوابـەدوای بـارزانی کەسایەتی مامۆستا ابراهیم احمد بوو کەهەموو شتێکم لەخودی ئەم زاتـە گـەورەو زانـا تێگەیـشتووە دەهاتـە بەرچاو, وام بیردەکردەوە ئەگەر ئەم دوو زاتە مەزنە بەیەکەوە رێکخـراوی پـارتی، بەڕێوەبـەرنو نەخـشە بـۆ پتەوکردنی بکێشن، هەموو جەماوەری کورد لەدەوروبەری حزبەکە کۆدەبێتەوەو کوردستان رزگاری دەبێت.

لەکۆنگرەی پێنجی پارتیدا چەند کەسێك چونە خزمەت مستەفا بارزانی بەپاڕانەوەو دەسـت ماچـکردن بـۆ ئەوەی بارزانی بەشداری بکات لەکۆنگرەدا، بەڵام جوان نییـە کـەمن لێـرە باسـی بکـەم هەرچـەندە قـسەکانی بیستراوەو بڵاوبۆتەوە کە بە چ جۆرێك هێرشـی بـردە سـەریان کەئـەوە بـەم پیـاوە مەزنـە لایـەق نـەبوو بـەو شـێوەیە سـوکایەتی ئاڕاسـتەی هـەموو ئـەو سـەرکردانە بکـات کەهەڵیانبـژاردبوو بـۆ پۆسـتی سـەرۆکایەتی, بەتایبەتی ئەو دڵسۆزو نیشتیمانپەروەرانەی نوێنەری راستەقینەو پێشڕەوی کوردبـوون. کـۆنگرەی پێنجـەمی

(پ.د.ك) بوو بەهۆی ئەوەی کەچارەنوسی دواڕۆژی کورد ببەستێتەوە بە(پ.د.ك) ــەوە کە لەژێر باڵی شەخصی سەرۆك مستەفا بارزانیدابوو, تەنها خۆی خاوەن بڕیاربوو لەهەڵبژاردنی هەر یەك لەم سێ ڕێگایانەی خوارەوە بۆ کورد ئاشتی, شەڕ, ئاشبەتاڵ.

بەداخەوە ئەم تێکۆشەرو سیاسەتمەدارانەی کورد بەمجۆرە دواڕۆژی کوردیان تەسلیم بەمەلامستەفا بارزانی کرد، لەکاتێکدا لەماوەی ئەو ١٣ ساڵەی کەدوور لەوڵات بوو، هیچ پەیوەندیەکی نەبوو بەڕێکخراوی پارتییەوە. مام جەلال لەساڵی ١٩٥٦ کە لەروسیا لەگەڵ بارزانی کۆبوبوەوەو دووبەدوو گفتوگۆیان لەسەر ئایندەی کورد کردبوو، شارەزاییەکی باشی لەماهیەتی بارزانی پەیداکرد.

مامۆستا ابراهیم احمدو کاك نوری احمد تەها یەکەم کەس بوون چونە خزمەت بارزانی لەڕۆمانیاو تا گەڕانەوەیان چەند جارێك دانیشتنیان لەگەڵ بارزانیدا ئەنجامدابوو، کەگەڕانەوە کاك نوری شاوەیس و کاك عمر دبابەو کاك علی عبداللەیان بەنهێنی ئاگادارکردەوە لەماهیەتی مەلامستەفا بارزانی لەهەموو رویەکەوەو ئەم ئاگادارییە هەتا ئێستاش هەر بەنهێنی ماوەتەوە.

جەنابی (میرحاج)[٢٣] چونکە شارەزای کەسایەتی بارزانی بوو رای بەدەست خۆی بوو، دوای ماوەیەك خۆی دوورخستەوە لەشەخصی بارزانی تاکو کۆچی دوایی کرد کەس بەمەی نەزانی. بۆ نموونە: جارێکیان بارزانی دەچێتە سەردانی میرحاج, کاك فواد عارف لەگەڵ خۆی دەبات بۆ ئەوەی دەرگای لێبکاتەوە، کاك فواد لەدەرگای ماڵیان دەدات دەڵێت بیکەرەوە، میرحاج گوتبووی لەبەر خاتری تۆ دەرگا لەمەلامستەفا دەکەمەوە.

ساڵی ١٩٧٤ سەردانی جەنابی شێخ عوسمان کوڕی شێخ احمد بارزانیم کرد لەبەغدا لەماڵی خۆیان, کەچوومە ژوورێ جەنابی میرحاجم بینی دەگریا, زۆرم لا ناخۆش بوو ئەم پیاوە مەزنە ئاوا دەگری، بەڵام دوایی تێگەیشتم بۆ دواڕۆژی مللەتی کورد دەگریا کەتاریکە, چونکە دەیزانی مەلامستەفا، کوردستانی پێ ڕزگار ناکرێ و بەرەو هەڵدێری دەبا. مەکتەبی بارزانیم لەو هەڵوێستەی میرحاج ئاگادار نەکردەوە، جەنابی میرحاج خۆشحاڵی خۆی دەربڕی کەیارمەتی شێخ عوسمان دەدەم، فەرمووی داواکارییەکم هەیە ئەویش ئەوەیە سەیارەی تازەی نییە، لەسەر داواکردنی میرحاج لەکوێت سەیارەیەکی مارسیدسم بەقاچاخی بەپارەی خۆی بۆ هێنا. لەکاتێکدا هاتنی شێخ عوسمان بۆ بەغداو هەموو هەوڵدانێکی بۆ ئەوەبوو کەسەرانسەری هۆزی بارزانی بکەوێتە ژێر دەستی حکومەت، سەیر ئەوەیە میرحاج ئەمەی بەباش دەزانی، بەڵام من بەردێکم لەسەر دانا. ئەوانەی دەستیان لەوەدا هەبوو کەبارزانییان کرد بەسەرۆك بەسەر کوردەوە ئەم کەسایەتیانەبون (مامۆستا ابراهیم احمد, مام جەلال، نوری شاوەیس, علی عبداللە, عمر دبابە, نوری

---

[٢٣] دەرچووی کۆلێژی سەربازییە، ئازا، زیرەك، شۆڕشگێڕ، سیاسەتمەدارێکی کورد، نیشتمانپەروەر، نمونەی ئەخلاق، لەشۆڕشی بارزان و لەکۆماری مهاباد بەشداربووە، لەگەڵ بارزانی و هاوڕێکانی ڕۆیشتە روسیا، لەدوای ١٤ تموز ١٩٥٨ لەگەڵ بارزانی گەڕایەوە عیراق، گەڕایەوە بۆ سوپا بەپلەی عقید، لەوەزارەتی بەرگری (مترجم) بوو, لەهەمانکاتدا لەکۆلیژی سەربازی دەرسی دەگوتەوە.

احمـد تـەهاو صـالّح یوسـفی). ئینجـا هـەموو ئەوانـەی لەکۆنگرەکـەدا بەشـدابوون کەمتەرخـەم بـوون لەبڕیارەکەیاندا، تەنها دوو کەس نەبێت هیچ تاوانێکیان نییە یەکـەمیان: شەخـصی بـارزانی بـوو چـونکە ئـەم دەستەڵاتە بەزۆر سەپاندیان بەسەریدا، دووەم: مامۆستا حلمی علی شریف کەتاکە کەس بوو دوای قسەکانی بارزانی کەتەواوبوو، گوتی: ئەم کابرایە لەسەرەتای قسەکانیەوە هـەتا کۆتاییەکـەی سـوکایەتی بەئێمـە کـرد بەجوێندان، ئەگەر کابرایەك رازی نەبێت سەرۆکی من بێت بۆچی دەستی ماچ بکەمو بەزۆر بیکەم بەسـەرۆکی خۆم، ئەوەبوو دوای ئەو هەموو سوکایەتییە کەبارزانی پێی کردن هێشتا هەر بەمـەمنونی کردیـان بەسـەرۆك, پیغەمبەری ئازیز (د.خ) دەفەرموێت (من أعان ظالماً سلطه الله علیه). ئەگەر بەگشتی پێشنیارەکەی مامۆستا حلمی شریفیان پەسەند بکردایە لەکۆنگرەی پێنجەمدا، کورد تەنها دوو حزبی رێکخراوەیی نەتەوەیی سیاسـی دەبوو کەیەکێکیان حزبەکەی بارزانی دەبوو ئەوەیتر پ.د.ك دەبوو بەڵام بەبێ بارزانی.

سەرکردایەتیی پ.د.ك ماوەی ئەو ١٢ ساڵەی کەبارزانی لەروسیابوو،وێنەی ئەم زاتەیان بەجوانترین شێوە دەکێشا بۆ ئەو خەڵکە، رۆژانە لەهەموو بڵاوکراوەکانیاندا باسی چالاکییەکانی مەلامستەفایان بۆ ئـەو خەڵکـە دەکردو دەیانگوت ئەگەر مەلامستەفا نەبێت کورد کۆتایی دێت، مەلامستەفا جەنەڕاڵـە لەڕوسـیا، مەلامـستەفا ئەوەندە ئازایە هەولێـداوە لەجـەنگی میـسردا بەشـداری بکـات، هـەموو سـاڵێك دەیـانگوت: مەلامـستەفا ئـەم بەهارە دێتەوەو کوردستان رزگار دەکات... هتـد. بـەم شـێوەیە پڕوپاگندەیـەکی زۆربڵاوکرایـەوە دەربـارەی بارزانی. بۆیە کاتێك گەڕایەوە بۆ عیراق هەموو خـەڵك بـەو ئاواتـەوەبوون کـە بەخزمـەت ئـەم زاتـە پایەبـەرزە بگەنو دەستەکانی ماچ بکەن. بەم شێوەیە ئەگەر بهاتایەو مەلامـستەفا حزبێکـی بـۆ خـۆی بەتـەنیا دروسـت بکردایە ئەوا زیاتر ٧٥٪ی جەماوەری لەگەڵ دەبوو، بەهەمان شێوە ئەگەر سەرکردایەتی پ.د.ك بیانویـستایە پـشت نەبەسـتن بەمەلامـستەفاو بیریـان لەکـەمیو پـوختی بکردایەتـەوەو هەڵنەخەڵەتانایـە بـەزۆریوبۆریو سەبریان بگرتایە لەسەر ئەو لاوازیو کەمییـەی کەتوشـیان دەهـات کـە لەوانـەبوو ٢٥٪ی جـەماوەریان پێـوە نەمایە، بەدڵنیایی دەڵێم ئەم بارودۆخەی سەرکردەکان تەنها چـەند سـاڵێك وا دەمایـەوە چـونکە ئـەو خەڵکـە لەماهییەتی مەلامستەفا بەتەواوەتی تێدەگەیشتن، ئەوسا ٧٥٪ی جـەماوەرە روویانـدەکرەوە ئـەو سـەرکردە بەتواناو رۆشنبیرانەو تەنها ٢٥٪ی ئەو خەڵکە لەگەڵ بارزانی دەمانەوە کەبریتی دەبوون لەسەرۆك هۆزەکـان, ئنجا بارزانی دەبوو بەسەرۆکی حزبێـك وەکـو پـارتی پارێزگـارانی ئێـستا، سـەرکردایەتیی پـارتیش بێگومـان حزبێك دەبوو کەهەموو دوژمنانی کوردسـتان سـڵیان لێـدەکردەوەو ئـەو دووبـەرەکیو شـەڕی براکوژیانـەش رووی نەدەدا کەئێستا هەموو کوردێکی بەشەرەف پێوەی دەناڵێت.

دانیـشتوانی کوردسـتان بەگـشتی مەشـخەڵی ئـازادیو ڕزگـاری کوردسـتانیان لەسـەرۆکایەتی بارزانیـدا دەبینیەوە، جەماوەر ئـەم هـەنگاوەیان پەسـەندکرد بـەجۆرێك کـە لەبـەردەمی زۆری بارەگاکـانی (پ.د.ك)دا ئاهەنگیان بۆ دەربڕینی خۆشحاڵی خۆیان دەگێڕاو هەموو پڕوپاگندەیەك بەناوی سەرۆك بارزانی دەکرا. بـەم

بۆنەیەوە کەکۆنگرەی پێنج بەم شێوەیە سەرکەوتوو بوو، جەماوەر بەگشتی بڕیاریاندا هەموو هەنگاوێکی سەرکردایەتی جێبەجێ بکەن‌و گیان‌و ماڵ‌و سامانی خۆیان فیدای ئەم سەرکردایەتییە پیرۆزە بکەن‌و کوێرانەو بەبێ ئەوەی هیچ پرسیارێك بکەن بەرەو مردن مل بنێن.وا چوبووە مێشکیانەوە کەهەرکامێکیان بکوژرێت شەهیدە، تەنانەت بەندەی خزمەتکاری کوردستانیش یەکێك بوو لەوانە.

### حکومەتی قاسم لەچەند بەرەیەکەوە شەڕی دەست پێکرد:

یەکەم: هەموو هێزو توانایەکی لەڕێگای سوپاوە خستەگەڕ، ئەوەبوو هێرشێکی دڕندانەی بردەسەر سەرانسەری کوردستان.

دووەم: دەستیکرد بەگرتنی هەموو ئەو کەسانەی سەر بە(پارتی_بارزانی) بوون بەناوی تابوری پێنجەوە.

سێیەم: بۆ ئەوەی لەبەرچاوی خەڵکی عیراق بەگشتی‌و کورد بەتایبەتی، ناشیرین نەبێت دەیگوت ئەمە شەڕێکە لەگەڵ چەتەکاندا.

چوارەم: بۆ ئەم مەبەستە تاوانباری گەورەو سیخوڕ کمال عوسمان ئاغا، کەوتە جموجوڵ, پەیوەندیکرد بەسەرۆك هۆزەکانەوە بۆ سوککردنی بارزانی، ئەوەبوو یەکەم سەرۆك هۆز شێخ احمد بارزانی بوو کەهێنایان لەمیوانخانەی سمیر امیس دایاننا. کەچومە خزمەتی، ئەفسەرێکی سیخوڕی تورکمان خەڵکی شارۆچکەی کفری چاودێری دەکردو بۆم نەکرا بەتەنها لەگەڵیدا گفتوگۆ بکەم، بەڵام شارەزای ژورەکەی بووم. کاتژمێری چواری بەیانی خۆم گەیاندە ژوورەکەی، پاسەوانی بەردەرگاکەی وایدەزانی کارمەندی میوانخانەکەم، کاتێك چوومە ژووری شێخ لەخەودابوو، کەکەوتینە قسەکردن زۆر باش لەوشەکانی حاڵی نەدەبوم، هەستام بانگی جەنابی شێخ محمد خالیدم کرد ئەویش لەخەودابوو، ئاگادارمکرد بۆیەوا زوو هاتووم کەسیخوڕەکانی لێنەبێت هەرچەندە شەرمەزارم کەجەنابتانم لەخەوکرد بەڵام مەبەستم ئەوەیە کەمن‌و جەنابی شێخ احمد لەیەك حاڵی بکەیت لەبەر ئەوەی بەڕێزتان سۆرانی باش دەزانن. گوتم من دڵسۆزێکی ئێوەم, خۆم وەکو هەر بارزانییەك داناوە، پیلانی رژێمی قاسم لەهێنانی ئێوە بۆ ئێرە ئەوەیە کەدووبەرەکی بخەنە ناو هۆزی بارزانەوە بەتایبەتی لەنێوان جەنابی شێخ احمدو مەلامستەفا بارزانی، ئێوەش هۆزی بارزان بەسەر مەشخەڵی شۆڕش‌و کوردایەتی ناوبانگتان لەسەرانسەری کوردستان بڵاوبۆتەوە، بەندە هاتوم ئاگادارتکەم مەترسییەکی زۆر گەورەی هەیە لەم کاتەدا پشت لەمستەفا بارزانی بکەیت، شۆڕشی کوردی بەجۆرێك لاواز دەبێت رەنگە ئاشبەتاڵی لەدوابێت، ئێمەی کورد ئەگەر هەمووومان یەك بین‌و دووبەرەکی لەناوماندا نەبێت رەنگە بگەینە ئامانجی خۆمان أنشاءالله. بارودۆخی زەعیم روو لەخراپییە، کورسی‌یەکەی رۆژ بەرۆژ زیاتر بەرەو لەقی دەڕوات. شێخ فەرموی: راستە تۆ دڵسۆزی، بەڵام سەرکردەکانی کورد وەها نین. رەفیق ئیشی کوردان پوچە، کورد ئالۆزوبلۆزی دەکات. پاش دوو رۆژ دوای چاوپێکەوتنەکەم شێخ احمد چۆن لەگەڵ مندا قسەی دەکرد بەهەمان شێوە بۆ ئێزگەی بەغدا بەشی کوردی دوا.

ئـەنجامی هێرشـەکەی رژێمـی قاسـم بـۆ سـەر کوردسـتان لەهـەموو لایەکـەوە سـەرکەوتوبوو، چـەکداری هۆزەکان شکان، بەشی زۆری بڵاوەیکرد، بارزانی تـەنها ٤٠٠–٥٠٠ چـەکداری لەگەڵدامایـەوە, بـۆ نمونـە شـێخ حسین بۆسکین دوو کەسی لەگەڵدا مـابوو، لەئـەنجامی ئـەو رەشـبگیرەی قاسـم دەسـتی پێکردبـوو مـن‌و ٣٨ کەس بەرکەوتین‌و بردیـانین بـۆ بەندیخانـەی رمـادی. لەبەنـدکراوەکان تـەنها سـیانیان پـارتی بـوون ئـەوانیتر تاوانەکەیان ئەوەبوو کەکورد بوون، منـیش یـەکێك بـووم لەوانـەو بـەهۆی بەنـدکردنم, ئاگـام لـەرووداوەکانی دەرەوە نەما.

کاتێـك لەبەندیخانـە دەرچـووم عقیـد صـدیق هەنـدێك رووداوی بـۆ گێڕامـەوە، هـەروەها کـاك علـی عەسـکەریش بـەهۆی ئـەوەی کـاتی خـۆی لەخزمـەتی بارزانیـدا بـوو ئـەویش هـەمان رووداوی بـۆ گێڕامـەوە کەئەویش ئەوەیە: هێزی چەکداری هۆزەکان دەشکێن‌و بڵاوەی لێدەکەن، بارزانی لەگەڵ ٥٠٠ چەکدار دەچێتە ناوچەی بەرواری باڵا نزیك سنوری تورکیا، چەند نوسراوێك ئاڕاستەی چەند حکومەتێك دەکات لەوانە تورکیاو سوریا، داوایان لێدەکات کەخۆی‌و هێزەکەی بەپەنابەر وەرگرن بەڵام هیچ کام لەو دوو حکومەتە رازی نابن.

بارزانی بەپێی بڕیاری کۆنگرەی (٥) بۆی هەبوو لەبەر بەرژەوەندیی گشتی هەموو بڕیارێك بـدات هـەروەکو رونمکردۆتەوە, بۆی هەبو لەوسێ خاڵەی پێشتر بـاسمکردوون بەبۆچـونی خـۆی هەرچـییەك بەڕاسـت بزانێـت فەرمانی لەسەربدات. ئەوەبوو لە رۆژی ١١ی ئەیلول ١٩٦١دا، بەفـەرمانی بـارزانی شـۆڕش بـەرپابوو... ئـەی دانیـشتوانی کوردسـتانی باشـور سـەرنجێك بـدە لـەپێش رۆژی ١٩٦١/٩/١١ سـنوری کوردسـتان گەیـشتبووە شاخی حەمرین ئێستا بزانە سنورەکەمان لەکوێیە..؟ بـەهۆی ئـەو بڕیـارە هەڵەیـەی بارزانییـەوە چ زیـانێکی گەورە لـەکوردو کوردسـتان کـەوت. رۆژانـە لەتەلـەفزیۆن‌و ئێزگـەو رۆژنامـەو گۆڤارەکانیانـدا باسـی شۆڕشـی یانزەی ئەیلول دەبیستین، بۆیە پێم باشە هەندێك راستی گـرنگ لەسـەر شۆڕشـی ئـەیلول بخەمـە بەرچـاو بـۆ چاوڕونی ئەوانەی کەشارەزانین‌و بیری ئەوانەشی بهێنمەوە کە لەبیریان چۆتەوە. من زۆر دڵنیام لەوەی کـورد بەشۆڕش نەبێت رزگاری نابێت، چونکە حـەق دەسـێنرێت، نادرێـت، تاکـە رێگاچـارەیەك ئەگـەر هـەبێت بـۆ رزگارکردنی کورد لەچنگی ئەو چوار دەوڵەتە تەنها شۆڕشە، بـەڵام کـام شـۆڕش؟ شۆڕشـێك کـەدوو هۆکـاری سەرەکی ببیات بەڕێوە ئەویش عەقڵ‌و هێزە چونکە ئەگەر بێتو بیرو بۆچونەکان هـەمووی چـوونیەك نـەبێت‌و ئاگاداری هەڵوێستی جیهان نەبیت بەرامبەر شۆڕشەکەت، هەروەها بەرژەوەندیی گشتی جەماوەرو هەڵوێـستی دراوسێکانت بەرامبەر بەتۆ هەمووی چوونیەك نەخەیت, لەگەڵ سازدانی چەکدارێکی زۆرو رەچاوکردنی جۆری چـەکەکەت‌و کـات‌و شـوێنی شۆڕشـەکەو بـاری ئـابووری لێکنەدەیتـەوە, زۆر بەزەحمـەت شۆڕشـەکەت سـەردەگرێت. بۆیـە مـن بۆچـونم وایـە یـەکێك لـەو هەڵـە گەورانـەی لەلایـەن سـەرکردەکانی کـوردەوە کەئەنجامـدراوە ئـەوە یەکێکیانـە ئەگـەر ئـەم بڕیـارە لـەجیاتی ١٩٦١/٩/١١ کەبەهەڵـە لـە ١٩٧١/٩/١١ درا لەدوای دە ساڵ دەرچوایە، ئێمە ئێستا دەوڵەتێکی کوردی سەربەخۆمان هەبوو.

ساڵی ١٩٦٣ بەهۆی سەرۆك بارزانی لەبەغدا بەریاندام, دوای پشودانێکی چەند رۆژی یەکەم کەس چاوم بەمامۆستای تێکۆشەرو ڕۆشنبیرو سیاسەتمەدار صالح یوسفی کەوت سوپاسی هەستی برایانەم کردو ئەویش خۆشحاڵی خۆی پێنیشاندامو گوتی: هەموی هەوڵدانو کوششی بارزانی بوو کەتۆی رزگارکرد چونکە میری بڕیاریاندابوو کەبەرنەدرێیت. بەتەنهاو دووبەدوو زیاتر لەیەك کاتژمێر باسی بارودۆخی ئەو ماوەیەی بۆ کردم کەمن تیایدا بەندکرابووم کە چ جۆرە ناکۆکییەك هەیە لەنێوان بارزانیو م.س. من گوێم دەگرت جار جاریش پرسیارم لێدەکرد بۆ ئەوەی هەندێ شتم بۆ روونبکاتەوە تاکو بزانم حەق لای کێیە. لەئەنجامی ئەو دانیشتنە, من هیچ رایەکم دەرنەبڕی، رێککەوتین کەپێش ئەوەی بەغدا بەجێ بهێڵم یەکتر ببینین.

چاوم بەخەڵکێکی زۆر لەرۆشنبیرو نیشتیمانپەروەرو سیاسەتمەداری کورد کەوت لەوانە مامۆستا عبدالرحمن زەبیحی (علماء). لەئەنجامی ئەو چاوپێکەوتنانەدا زۆر باش لەڕووداوەکان تێگەیشتم، رۆژێکیان چەند سەعاتێك بەبیانووی ئەوەی کەتەواو نیمو پشو دەدەم دەرگام لەسەرخۆم داخست، سەرم سوڕما خۆم بەخۆمم دەگوت ڕەنگە ئەمە خەون بێت, ئەمە ئەگەر بەو شێوەیە بێت کەواتە (ناقوسی خەتەر) لێدراوەو دەبێ چاوەڕوانی چارەنوسێکی ڕەش بکەین,والله لەو رۆژەوە ئەمە بڕیارم بووە سوێندم بەخوای تاکو تەنها خوارد لەسەر ئەم رایەی خۆم سوور بم.

لەدانیشتنی دووەم جارمدا لەگەڵ مامۆستا صالح یوسفی دەستمانکرد بەگفتوگۆ, لەئەنجامدا هەڵوێستی روونو ئاشکرا نەبوو هەرچەندە بەلای بارزانیدا زیاتر بایدەدا بەڵام رای کۆتایی یەکلاخەر نەبوو. گوتم: مامۆستا حەز دەکەم لەئێستاوە رای خۆمت بۆ باس بکەم تاکو باش ئاگادار بیت، من لایەنگری هیچ کامێکیان نابم, رەنگە ئەم هەڵوێستەی من زیانێکی سیاسیو مادیم لێبدات بەڵام ویژدانی خۆم ئازار نادەم بەوەی بچمە پاڵ لایەنێکیان لەکاتێکدا لەهەموو کەس زیاتر ئاگاداری راستییەکانم ئینجا رێگام بدە با بەبۆچونی خۆم تیشك بخەمە سەر ئەو رووداوانەی لەم ماوەیەدا روویداوە:

١- وەکو بۆم دەرکەوتوە حکومەتی عیراقی لەپاڵ سوپاکەیدا هەموو هێزو توانایەکی خۆی بەکار هێنا، ئێستا پیلانی تازە دادەڕێژێت بۆ لەناوبردنی شۆڕش لەڕێگەی دووبەرەکی نانەوە لەنێوان بارزانیو مەکتەبی سیاسیداو مەبەستەکەش روونو ئاشکرایە.

٢-بارزانی دەڵێت لاوازی ئێمە لەبەرچاوی حکومەت هۆی ئەوەیە کەدوو سەرکردایەتیمان هەیە، یەکێکیان لەسۆران ئەوی تریشیان لەبادینان، لەکاتێکدا من سەرۆکی حزبمو بەو بڕیارەی لەکۆنگەری پێنجدا دەرچووە بۆم هەیە سەرپەرشتی هەموو کوردستان بکەم بەڵام جەماعەتی ابراهیم احمد رێگام نادەن.

٣- مەکتەبی سیاسی، بارزانی تاوانبار دەکەن بەوەی دەیەوێت دووبەرەکی بخاتە نێوانمانەوە دەیەوێت بەزەبری هێز سەرپەرشتی کوردستان بکاتو بەعەشایەری بەرەنگاری ڕووداوەکان ببێتەوە لەگەڵ عبدالسلام عارفدا, لەکاتێکدا عبدالسلام عارف هیچ هەنگاوێکی نەناوە بۆ نزیکبوونەوە لەکوردو تەنها داوای (هودنە)

دەکات، واتە نەشەڕ نەئاشتی.

مامۆستا صالح پرسی ئایا چ ڕێگایەك دەگریتەبەر؟ وەڵامم دایەوە انشاءالله ڕێگایەك دەگرم کەخزمەتی کوردو کوردستانی پێبکەم چونکە لەخودا بەزیادبێت لەساڵی ١٩٥٦ـــەوە دۆستایەتی‌یەکی زۆر چاکم هەیە لەگەڵ شێخەکانی بارزان، هەموو توانای خۆم بەکار دەهێنم بەڵکو نەیەڵم ئەم دووبەرەکییە ڕووبدات. گوتی: خۆشحاڵبووم کەئەمە بۆچوونتە، ئەوەندەی ئاگاداربم بارزانی زۆر تۆی خۆش دەوێت.

نامەیەکی دەربارەی من ئاڕاستەی بارزانی کرد، گەیشتمە لای بارزانی‌و نامەکەم دایەو خستیە ژێر دۆشەکەکەیەوە نەیخوێندەوە, چونکە ئەوەندە بەگەرمی پێشوازی لێکردم نامەکەی پشتگوێ خست.

## بارزانی‌و دانیشتنەکانی

ئەو ماوەیەی سەردانی بارزانیم دەکرد چ لەسەنگەسەر یا ڕانیە، ئەوەی تێبینیم کرد بەردەوام لەهەوڵی ئەوەدابوو زەمینەسازی دەکات بۆ ئەوەی بەتەواوەتی بەسەر کوردستاندا باڵادەست بێت‌و ئەمەی دووپات دەکردەوە لەدانیشتەکانیدا نەوەك بەتەنها بۆ من بەڵکو بۆ هەموو کەسێك دۆست بوایە یان دوژمن، هێرشی دەبردە سەر جەماعەتی ابراهیم ئەحمەد دەیگوت: ئەمانە ١٤ کەسن نەیانهێشتووە کەس بگاتە پلەی مەکتەب سیاسی‌و لیژنەی مەرکزی. تاوانی دەخستە پاڵیان کەپیاوکوژو ماڵخۆرن, خۆیان ناونـاوە مەکتەب سیاسی, ئیمبراتۆرییەتی ماوەتیان هەیە، خەڵك نان نیە بیخۆن ئەوان بەئارەزووی خۆیان خواردن‌و خواردنەوە دەخۆن, مانگانە٧٠ دینار دەدەن بەجۆ بۆ مریشك‌وعەلەشیشەکانیان, پەلاماری شەرەفی کوردیان داوە بەتایبەتی مجید گورگ[٢٤]، مەلاماتۆڕ[٢٥]، حلمی ناشەریف، حمە امین قەرەج، عومەر تەنەکە، بلەی ئەحەڕەش، هەردوو نوری‌یەکەو، عەلەی کەچەڵ‌و، جەلۆ کەدەیانەوێت زاڵ بن بەسەر کوردستاندا.

## پیلانەکانی بارزانی

١. لەگەڵ خەڵکدا کەدادەنیشت هەریەکە بەگوێرەی کەسایەتییەکەی گفتوگۆی لەگەڵ دەکرد، ئەگەر ئاغاو شێخ‌و مەلا بوایە ئەوا ئەو هێرشەی کە لەسەرەوە بەکورتی باسمکردووە بەشێوازێك دەکردە سەر جەماعەتی باڵی مەکتەبی سیاسی ابراهیم احمد کەقەناعەتی پێدەکردن‌و وای لێدەکردن لەدەوری کۆببنەوە دوو کەس چۆکیان بۆ دانەدا لەداهاتودا ناویان دەهێنم. سەرۆك هۆزەکانی‌وا حاڵی کردبوو ئەگەر بێت‌و سەرکەوتن بەدەست بێنی بەسەر باڵی م.س. ئەوا هەموو شتێك لەبەرژەوەندیی ئەواندا دەبێت.

٢. کەنوێنەری حکومەت دەهات، بارزانی داوای لەمەکتەبی سیاسی دەکرد بەژداربن بۆ گفتوگۆ، بۆ نموونە

---

[٢٤] ئەندامێکی پارتییە، کادرێکی پێشکەوتو نیشتیمانپەروەر، لەناوچەی کۆیەو قەڵادزێ‌و ڕانیە کەسایەتییەکی ناسراوە, ڕێزی هەیە لای جەماوەرو بەگشتی دەرەبەگەکان‌و سیخوڕەکانی ئەو ناوچەیە دژایەتییان دەکرد چونکە ئازاو زیرەك بوو.

[٢٥] مامۆستا مەلا عبدالله بەسواری ماتۆڕ بەناو جوتیارەکاندا گەڕاوە لەوەوە پێی دەڵێن مەلاماتۆڕ, پیاوێکی خوێندەوار, زیرەك, ئازا، یەکێکە لەوانەی جێی شانازییەو جێدەستی دیارە لەبزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردستاندا بەهۆی نیشتیمانپەروەری‌و پاکی‌و دڵسۆزییەوە بۆ نیشتیمانەکەی, دوای ١١ی ئازار لەبەغدا مایەوە, لە١٩٧٤دا کەشەڕ دەستی پێکردەوە لەوێ کرا بەوەزیر.

جارێکیان جەنابی تایەر یەحیا سەرۆك وەزیرانی رژێم دێت بۆ گفتوگۆ، بارزانی رووی تێدەکاتو دەڵێت من هیچ داواکارییەکم نییە ئەمانە مەکتەبی سیاسین، واتە ابراهیم احمد داواکارییەکانیان کۆتایی نایەت. مامۆستا ابراهیم احمد بەناچاری مافە نەتەوایەتییەکانی کورد بۆ تایەر یەحیا شیدەکاتەوەو داواکارییەکانی کوردی پێ ڕادەگەیەنێتو بۆی روونەکاتەوە کەشۆڕشی کوردی تەنها لەپێناوی ئەو مافانەدا بەرپابووەو خوێنی رشتووە، پێیشی دەڵێ ئێوە تا ئێستا هیچ هەنگاوێکتان بۆ گۆڕینی بارودۆخی ئێمەی کورد نەناوە کەچی داوا لەئێمە دەکەن بڕیارەکانتان بۆ جێبەجێ بکەین، لەو ڕوانەگەیەوە حکومەت بەرچاوڕوون بوو کەجەماعەتی ابراهیم ئەحمەد نایانەوێت لەگەڵ حکومەتدا ئەم کێشەیە چارەسەر بکەن ئەگەر هەموو داواکارییەکانیان جێبەجێ نەکات، بۆیە حکومەت سیاسەتی خۆی گۆڕی بەوەی کەپێویستە پشتی بارزانی بگرێتو دژ بەجەماعەتی ابراهیم ئەحمەد یارمەتی بدات. ئەم کارەی حکومەت یارمەتی بارزانیدا بۆ ئەوەی بەشی زۆری سەرۆك هۆزەکان لەدەوری خۆی کۆبکاتەوە.

٣. مەکتەبی سیاسی جەماعەتی ابراهیم احمد, لەیەکەم رۆژدا پارێزگاری سلێمانی حاجی عبدالرزاق لەگەڵ بارزانی کۆبووەوە بەمەبەستی (هودنە) لەنێوان عبدالسلام عارفو بارزانیو مەبەستیان چارەسەرکردنی کێشەی کورد بوو لەبنەڕەتەوەو دانانی نەخشەیەك بۆ ئەو مەبەستە. هەموو هەوڵێکی مەکتەبی سیاسی جەماعەتی ابراهیم احمد لەم کاتی هودنەیەدا بۆ ئەوەبوو کەبارزانی لەخۆیەوە بڕیارێك نەدات هۆکارێك بێت بۆ دووبەرەکی لەنێوانیاندا، دەیانگوت ئێمە بەهەموو هەڵوێستەکانی ئێوەی بارزانی رازین ئەگەر دەڵێن (شەڕ — شەڕ) (ئاشتی—ئاشتی)و بەهەموو شێوازێکی شەڕ راگرتن رازین تەنها ئاشبەتاڵی لێدەرچێت، هەرچی هەوڵێکیاندا لەگەڵ بارزانیدا هەمووی بێسوودبوو، ناچاربوون کەپەنا بەرنەبەر کەسایەتییەکانی کورد بەڵکو بتوانن هەوڵێك لەگەڵ بارزانیدا بدەن بەتایبەتی سەرۆك هۆزی ئاکۆ—عباسی مامەندئاغاو جەنابی کاکەزیادی حەمەئاغای کۆیە، بەڵام هەوڵەکانیان بێهودە بوو, دوابەدوای ئەمانیش چەند کەسایەتییەکی تریش کەوتنە نێوانیانەوە بۆ ئەوەی دووبەرەکی روونەدات وەك شێخ لەتیفی شێخ مەحمودو مامۆستای مەزن مەسعود محمد، بەڵام هەر بێ ئەنجام بوو. دوای کوردی لەبەغداوە هات دڵخۆشی کەوتە ناو دڵی هەموو جەماوەر دەیانگوت گومان نیە ئەمانە سەردەکەون، لەسەر شێوەی دادگا وتووێژو پرسیاریان دەکرد. دوای پرسیارو وتووێژێکی زۆر لەگەڵ بارزانیدا جەنابی رەشید عارف کەسەرۆکی وەفدەکەبوو بەبارزانی دەڵێت هەڵسە تۆ بچۆ دەرێ چاوەڕوان بکە هەتا لەگەڵ مامۆستا ابراهیم ئەحمەدیشدا وتووێژ دەکەم، بارزانی لەوەڵامدا بەزەردەخەنەیەکەوە دەڵێت بەسەر چاو، لەگەڵ ئەوەشدا کەئەموەفدە سەرکەوتووبوو بەڵام بەداخەوە دوای سێ رۆژ هەریەکەیان پاساوێك بۆ خۆی دێنێتەوە بۆ ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ بەغداو هەندێکیان دەیانگوت: منداڵەکانمان مەکتەبیان هەیە، ماڵەوەمان نەخۆشە، ئیشەکانم پەکی دەکەوێت، دەرمانەکانم لەگەڵ خۆم نەهێناوە....هتد.

ساڵی ١٩٦٩ لەجەنابی ڕەشید عارفم بیست کەلەو ١٢ کەسە ٨ هەشتیان نەیانویستبوو بگەڕێنەوە بەڵام کەحکومەت زانیبووی سەرکەوتوون لەکارەکەیاندا فەرمانی گەڕانەوەیان دەرکردبوو. بارزانی دوو هەفتە بەناوی پشوودانەوە چوو بۆ پشتی دۆڵەڕەقە لەناوچەی ئاکۆ, شێخ لەتیفو کاکە زیادئاغاو عەباسی مەمەندئاغا جێگری بوون بەڵام هیچ دەسەڵاتێکیان نەبوو, ئەم بەرێزانە زۆر بەپەرۆش بوون بۆ سەقامگیربوونی ئاشتی, هەوڵێکی یەکجار زۆریشیاندا بەڵام بێسوودبوو، هەتا دەهات گرژی لەنێوان بارزانیو م.س. روو لەزیادبوون بوو و کار گەیشتە پڕوپاگندە بۆ یەکترو دەیانگوت بارزانی بەپرتەقاڵو سێو شۆڕشی فرۆشت، ئینجا م.س. دەستوبازوویان بەکارهێنا بەڵام سەرکەوتوو نەبوونو بارزانی لەسەر قسەی خۆی سووربوو دەیگوت دەبێ ئەم ١٤ کەسە نەمێنن.

بەشی زۆری ئەو خەڵکەی لەدەوروپشتی بارزانی بوون هانیاندەدا کەنابێت بەهیچ جۆرێك جەماعەتی ابراهیم احمد بمێنێت، سەرۆك هۆزەکان دەوری سەرەکییان هەبوو لەئاژاوەنانەوە (تەنها چەند کەسێك نەبێت), چونکە بیروباوەڕیان وابوو ئەگەر بێتو باڵی م.س. نەمێنێ ئەوا کێشەی جوتیاران نامێنێتو بەشێك لەو رۆشنبیرو سیاسەتمەدارانەی لەدەوری مەلامستەفا کۆبوونەوە بەو نیازەی ئەگەر ئەو چواردە کەسە دوور بکەونەوە ئەوان بچنە جێگایانو ببنە ئەندامی م.سو لیژنەی مەرکەزی. بەشێکی زۆر لەو ئەفسەرانەی پەیوەندییان بەشۆڕشەوە کردبوو چونە پاڵ بارزانیو هەندێکیان دەورێکی زۆر خراپیان هەبوو بەتایبەتی عزیز عقراوی.

حزبی شیوعی چاوەڕوانی ئەوەی دەکرد کەمەکتەبی سیاسی نەمێنێ بۆ ئەوەی بتوانن جەماوەر بەگشتی لەدەوری خۆیان کۆبکەنەوە، بارزانی لەهەموو دانیشتنێکی لەگەڵ حزبی شیوعیدا دەیگوت: هەرچی گرژیەك کەڕوویداوە لەم ناوچەیەدا هەتاکو ئێستا جەماعەتی ابراهیم احمد بەو کارانە هەستاونو لێی بەرپرسیارن, من بەهیچ شێوەیەك ئاگادار نەبووم.

بەندە.. بەردەوام بوم لەهاتوچۆکردن لەنێوان بارزانیو مەکتەبی سیاسیدا, جارجاریش دەچومە ماوەت. جارێکیان پێشمەرگەیەك بەناوی کاك احمد هۆرێنی, بەمام جەلالو مامۆستا حلمی علی شریفی گوت: با دکتۆر رەفیق لەگەڵماندابێت بۆ بەمۆ چونکە خەڵکی ناوچەی هۆرێنوشێخان زۆر رێزی لێدەگرن، مامۆستا ابراهیم احمد فەرموی بەکوشتنی مەدەن, جارێ ئێشمان زۆر پێی ماوە. رۆژێکیان لەکاتی نانخواردن لەخزمەتی مامۆستا ابراهیم احمدو دکتۆر عزیز شەمزینیو کاك علی عبدالله بووم کاتێك نانیان هێنا برنجو شلەی فاصۆلیای سادەبوو، مانم گرت گوتم ئەمە ناخۆم, ئێوە مانگی ٧٠ دینار دەدەن بەجۆ بۆ مریشكو عەلەشیشەکانتان، ناردیان کەبابم بۆ هات.

زۆرم گوت چ بەنهێنی، چ بەئاشکرا، چ لەبەر چاوی کۆمەڵ بەجەنابی سەرۆك بارزانیو هەروەها بەبرادەرانی مەکتبی سیاسی, بەداخەوە نەگیشتمە ئەوەی کەمن دەمویست کە دووبەرەکی روونەدات کە

بەهیچ جۆرێك بەرژەوەندیی گەلی کورد لەسەرانسەری کوردستانی باشور لەم دووبەرکییەدا نییە، بەلاّم بێسوودبوو.

ڕۆژێك سەرۆك بارزانی فەرموی ئاگاداری خۆت بە دوژمنت هەیە. گوتم: لەهەموو دانیشتنێکم چ بەنهێنی چ بەئاشکرا زۆر باش بۆ برایانی مەکتەب سیاسیم روونکردۆتەوە کە بەبێ بارزانی هیچتان بۆ ناکرێت هەروەکو چۆن رووبەڕووی بەڕێزتان رامگەیاندووە کەبەیەکەوە نەبێت ناتوانن کوردستان رزگاربکەن بەلاّم دووبەرەکی مەترسیەکی کوشندە دەبێت بۆ دواڕۆژی کورد، بەگەورەیی خۆت بمبەخشە, بەندە رەفیق بارزانیم بەڕێزتان ڕێگاتان پێداوم کە لەخزمەت جەنابتان قسە بکەم, ڕۆژێك لەخزمەتتدا لەمیوانخانەی سمیرامیس فەرموت تۆ وەکو لوقمان تەماشا دەکەم، هەر بۆیە حەز دەکەم پێت رابگەیەنم ئەوانەی باسی منیان بۆ تۆ کردووە هەر ئەوان لەم شەوانەدا لەماڵی باوکم بوون لەقەلاّدزێ پێیان دەگوتم بۆ ناچیتەوە بەغدا لەناوماڵ و منداڵەکەی خۆتدا دانیشیت خەریکی کاسپی بیت, تازە لەسایەی مەلامستەفاو ابراهیم ئەحمەدەوە کورد هیچ بەهیچ ناکات، گەورەم گومانم نییە ئەمانە بەخراپم باس دەکەن چونکە مەترسییان هەیە جێگایان پێ لەق بکەم.

ناوم نەهێنان، ئەو دوو برا بەڕێزە وایان دەزانی کەجەماعەتی ابراهیم احمد نەمێنێ ئەوان دەچنە جێگایان. نە مامۆستا ابراهیم احمد توانی جێگای مامۆستا همزە عبداللە بگرێتەوە، نە ئەو برایەش کەئێستا لەلەندەنە, نە مامۆستا حبیب محمد کەریمو نە مامۆستا علی عبداللە! یەك لەدوای یەك بۆیان رون و ئاشکرا بووە!

کاك عزیز عقراوی لەساڵی ١٩٨١ لەسوریا بەڕاشکاوی فەرموی بەدەستی خۆم ماڵی خۆمم وێرانکرد ئەو رۆژەی کەچوبویتە لای شێخ احمد بەشوێنتا دەگەڕام کەئازارت بدەم، بەلاّم ئێستا دەرکەوت هەڵوێستی تۆ راستبوو.

ئەوەی تا ئێستا لەژیاندا ماوە با ئەو نهێنییانەی لەلایەتی بلاّویبکاتەوەو وەکو خوالێخۆشبوو مامۆستا همزە عبداللە لەگەڵ خۆی نەیباتە گڵەوە، ئومێدەوارم کەڕابردوی خۆی نووسیبێتەوە نەوەکانی بۆی بلاّو بکەنەوە.

بەیاننامەو قسەو گرژی بەتەواوەتی پەرەی سەند, برایانی مەکتەبی سیاسی بەیەکجاری رانیەیان بەجێهێشت و چونە ماوەت, دکتۆر عەزیز شەمزینی گیرا، ئینجا گەیشتە گرتن و شەڕ... زەنگی مەترسی لێیدا. ئێوارەیەکیان چومە خزمەت بارزانی لەڕانیە, فەرهادی کوڕی لوقمانی لەسەر کۆشی خۆی دانابوو، لەپڕ دیلێکیان لەجەماعەتی م.س هێنا کەناوی عوسمان عوزێری چەرمەگایی بوو. بارزانی زۆر قسەی تونـدو ناخۆشی پێگوت کەئێمە لەشوێنی خۆمانەوە شەرممان دەکرد سەرۆکی کوردو کوردستان ئەم وتە نابەجێیانە دژی کەسێکی بێدەسەلاّت و دژی جەماعەتی ابراهیم احمد بەکار دەهێنێت، ئینجا بەکلاّشەکەی خۆی دەستیکرد بەلێدانی، من و دوو کەس لەخزمەتیدابووین تەماشای منیان دەکرد کەدەستی بگرم, بەجۆرێك

گرژبوو منیش ترسام بەڵام ڕێگەیەکیترم دۆزیەوە کەواز لەکاك عوسمان بێنێت، گوتم گەورەم کاك لوقمان زۆر شۆخە بەڵام فەرهادی کوڕی نەك شۆخ نیە بەڵکو پیسو پۆخەڵە, ڕێگەم بدە با لەگەڵ خۆم بیبەمە دەرەوە دەستو دەموچاوی بۆ بشۆم. گوتی: رەفیق ئەوە زۆر خۆشەویستە با بازیانی کوڕت لەسەر خێر منداڵی ببێت ئینجا دەزانی ئەوە چەند خۆشەویستە. سوپاس بۆ خوا بارزانیم وا سەرقاڵ کرد کاك عوسمان عوزێری لەبیر چووەوە. لەمانگی تەموزی ساڵی ١٩٩٩دا لەکوڕی کاك صابر بارزانیم پرسی ئایا کاك فەرهاد ئێستا لەئەمریکا جلوبەرگی ڕێکوپێکو پاکوتەمیزە یا هەر وەکو تەمەنی پێنج ساڵانی وایە؟ گوتی: هەر وایەو نەگۆڕاوە.

لەڕانیە چومە خزمەت سەرۆك بارزانی فەرموی لەم ڕۆژانە لەقەلادزێ کۆنفراس دەبەسترێت, ئەندامانی تازەی لیژنەی مەرکەزیو مەکتەبی سیاسی هەڵدەبژێردرێت ئینجا بڕیاری کۆتایی دەدرێت بۆ دورخستنەوەی ئەم ١٤ کەسە بەپێی فەرمانی کۆنفراس, دەبێت هەرچی چەكو پارەو شتومەکی حزبیان لایە تەسلیم بەئەندامانی تازەی لیژنەی مەرکەزی بکەنو ئەگەر سەرپێچی بکەن سزا دەدرێن, ئەو کاتە ئمبراتۆریەتی ماوەت بەزەبری هێز لەناو دەبرێت. گوتم: گەورەم بڕوا مەکە هەروا بەئاسانی تەسلیم بن, بایی ئەوە خەڵکیان لەگەڵدایە، ئایا ڕێگایەکیتر نییە ئاشتبونەوەی تێدا بێت؟ گوتی: ئەمە بڕیاری کۆنفرانسە, دەبێت خۆیان تەسلیم بکەن, با کەس بەکوشت نەدەنو خۆشیان رسوای دونیاو قیامەت نەبنو ئەگەر دەزانی بەقسەت دەکەن بڕۆ پێیان بڵێ. گوتم: کارێکی زۆر سەختە, کێشەکە هەتاکو دێت گەورەتر دەبێت. گوتی: رەفیق بڕۆ خۆت هەڵبژێرە بۆ ئەندامی لیژنەی مەرکەزی پارتی. گوتم: گەورەم سوپاست دەکەم کەبەڕێزتان بەم جۆرە بەتەنگ منەوەن, بەڵام بەندەی بچوکتان بۆم نییە خۆم هەڵبژێرم چونکە من ئەندامی پارتی نیم. بەگرژییەوە گوتی: ئەی تۆ چیت..؟ گوتم: گەورەم من پیاوێکی سەگ وسەگبابو بێ عەقڵم, ماڵو منداڵم بەجێهێشتووە وازم لەئیشوکارم هێناوە, خۆم توشی ئەو بەلا گەورەیە کردووە کەدواییەکەی کۆتایی نایەت.

چەند دەقیقەیەك تەماشایکردم، هەردوکمان بێدەنگ بوین، ئینجا یەکسەر ڕۆیشتەوە بۆ گوندی سەرکەپکان. منیش چومەوە سلێمانی, لەوێوە چوومە ناحیەی ماوەت، ئەحواڵی برایانی مەکتەبی سیاسیم پرسی پێیان گوتم: لەماڵی بابکرئاغای پشدەری میوانن. لەخزمەتیاندا نانی بەیانیشمان بەیەکەوە خوارد، لەوە ئاگاداربوون من بۆ ناوبژی گەیشتبوومەلایان، کەوتینە گفتوگۆکردن، بەڵام ئەو وتووێژەی لەنێوان منو سەرۆك بارزانی روویدابوو کەخۆم هەڵبژێرم, باسم نەکرد. گوتم: لەو سەعاتەی گەیشتومەتە خزمەتتان هەر خەریکی قسەی خۆشو پێکەنینو ئاگاداری دوا دەنگوباس نین، ئێوە سێ ڕێگاتان لەپێشە یا راکەن، یاشەڕ، یاخۆتانو هەموو شتومەکی حزب تەسلیم بەبارزانی بکەنەوە.

ماوەیەك هەر یەکە تەماشای یەکتریان کرد, کەوتنە گفتوگۆکردن بەڕاشکاوی، مامۆستا ابراهیم فەرمووی شێخ احمد بارزانی ئێمە باش دەناسێ, ڕێزمان هەیە بۆی, هەروەها بۆ شێخ محمدخالد، شێخ احمد چوار

کەسی زۆر خۆش دەویّ, عمر دبابەو مام جەلالو کاك احمد دزەیی، عمر و جەلال لایەنگرن، کاك احمد دزەیی جارێکیان چۆتە خزمەتی دەربارەی رێککەوتن لەنێوان ئێمەو بارزانیدا سەرکەوتو نەبوو, بەلاّم تۆ رەفیق یەکێکی لەوانەی کەشێخ تۆی زۆر خۆش دەوێت, ئەگەر بچیتە خزمەتی گومانمان نییە سەرکەوتوو دەبێت, ئێستا کاك نوری شاوەیس لەسلێمانییە, بچۆ بۆ ئەویّ چاوت پێی بکەوێت تاکو تەدابیری چوونو هاتنەوەت بۆ بکات. گوتم: ئەگەر هاتو شێخ احمد بارزانی هێنا, ئێوە هەڵوێستتان چۆن دەبێت؟ گوتی: هەر کاتێك تەشریفی گەیشتە کۆیە ئێمە هەموو ئەندامانی سەرکردایەتیمان دەگەینە رانیە، شێخ چ دەفەرموێتو چۆن بڕیاری کۆتایی دەدات ئێمە هەموو قسەکانی جێبەجیّ دەکەین تەنها ئاشبەتاڵی لێدەرچیّ.

ئامانجم ئەوەبوو کەنەهێڵم بگاتە مریشکە رەشە، بەرەو سلێمانی رۆیشتم چومە ماڵی کاك نوری شاوەیس، بەهۆی خوشکی رۆشنبیرو نیشتیمانپەروەر ناهدە شێخ سەلام چاوم بەکاك نوری کەوت, بەدورودرێژی قسەم بۆ کرد دوعای خێری بۆ کردم، سەیارەیەکی جێبی تازەیان بۆ گرتم بۆ ماوەی حەوت رۆژ لەگەڵمدابێت, کرێکەی ٥٥ دینار بوو حزب پارەیان نەبو، ناهدەخان لەگیرفانی خۆی ئەم پارەیەیدا. گوتی: لەبەر خاتری کاك رەفیق بەڵکو سەرکەوتو بێت، بڕوانە ئەندامانی م.س خاوەنی ٥٥ دینار نەبوون، ئەو کاتە (حزب فەقیر میللەت دەوڵەمەند) ئێستاش بەهەمان شێوە ئەندامانی م.س. پارەیان لەگیرفاندا نییە بەلاّم ئەوانەی لەدوایانەوە دەڕۆن یەکێکیان تەنها سەفتەی دەیی پێیەو ئەویتریشیان دۆلار!

لەگەڵ برای شۆفێر کەوتینە ریّ, من خەوم لەخۆم خست بیرم دەکردەوە لەوەی قسەکانم ئەوەندە رێکوپێك بێت بتوانم سەرنجیان راکێشم زوو زوو ئایەتەلکورسیم دەخوێند, لەخودا دەپاڕامەوە کەشێخ احمد بەوە رازیبێت لەگەڵ مندا تەشریفی بێت گەلی کورد لەم تەنگوچەڵەمەیە رزگاربکات کەگیرۆدەی بووە، ئێوارە درەنگانێك گەیشتینە ناحیەی مێرگەسوور.

لەژێر ساباتەکەی جەنابی شێخ محمدخالد دانیشتم, خەبەریان پێدا یەکسەر هات بەگەرمی بەخێرهاتنی کردم, کەوتینە گفتوگۆکردن, ئاگادارمکرد هاتوم پشتگیریم بکەی بەهەموو توانایەکتەوە. گوتی: کاك احمد دزەیی هاتبوو بۆ لای شێخ من رەوانەم کرد، ئێمە تۆمان خۆش دەوێت, من هاتومەتە ماڵت, رێزت هەیە لای ئێمە, دووەم جارە پەنامان بۆ دێنیت، حزبی ئیمڕۆ ئیشیان بەمن و تۆیە. ئینجا کەوتە گلەیی لەحزبو لەسەرۆك بارزانیو زیاد لەکاتژمێرێك بەردەوام بوو هەر دەمگوت قوربان راست دەکەی.

فەرمووی پردی چامە بەبۆردومانی فڕۆکە تێکچووەو رێگا لەنێوان میرگەسورو چامە بڕاوە, با ئوتۆمبیلەکە لێرە بێت بەیانی رەوانەت دەکەم بۆ خزمەت شێخ، ئەمە دەسەلاّتی منەو شێخ باشت دەناسیّ, پێویست بەنامە ناکات.

بەیانی کەوتینەریّ, بەچوار بارزانی دوو ئێستریان پیّ بوو, رێگاکە یەکجار ناخۆشبوو, نیو کاتژمێر سواری ئێستر دەبووم دوو کاتژمێریش بەپیّ دەڕۆیشتم، یانزەی شەو گەیشتینە لای شوانێك زۆرم برسی بوو،

میوانداریییەکی ئەوەندە ڕێکوپێکی کردم خواردنێکی ئەوەندە خۆشی دامێ کەئەمە یەکەم جاربوو لەژیانمدا خواردنی وا خۆش‌و بەلەزەتم خواردبێ, شوانەکە مەڕی دۆشی‌و شەکری کردە شیرەکەو دەستمکرد بەخواردن, زۆرم برسی‌بوو چونکە نیوەڕۆکەی لاماندا لای ماڵێکی دەوڵەمەندترین کەس لەبارزان خاوەن ٥٠٠ سەر مەڕ بوو نانی نەداینێ، ئینجا شوانەکە بەفری لەئەشکەوت دەرهێناو چایی پێ لێنا.

سەعات یەکی شەو گەیشتنە هاوینەهەواری سەری کۆڕێ‌و هۆڕێ, چوینە ژێر سابات، شێخ نەزیری کوڕی شێخ احمد بەخێرهاتنی کردم گوتی شێخ دەفەرموێت ڕەفیق ماندووە با پشو بدات، بەیانی چاوم پێی دەکەوێت. بەجۆرێك ماندووبووم یەکسەر خەوتم, بەیانی کاتژمێر هەشت خەبەرم بۆوە, چاوم کردەوە لەژێر ساباتێکدام ١٢×٦م, زۆر ڕێکوپێك‌و پاکوتەمیزبوو, سەیرانگایەکی دڵفڕێن, لەسەرانسەری ساباتەکەی بەرد لەشێوەی کورسی دانراوە کەنیوەی لەژێر گڵدایە، دوای نانخواردن تەشریفی شێخ هات, زیاد لە٣٠ کەس دانیشتبوون هەموومان هەستاین, خۆمان تا ناوقەد چەماندەوە، کەس تەماشای دەموچاوی نەدەکرد, دوای دانیشتن لەسەر بەردەکەو پشوودانێکی دوو دەقیقەیی, بەدەست ئیشارەتیدا کەهەر یەکە لەجێی خۆی دانیشێت.

هەڵسام چومە خزمەتی، دەستیم ماچکرد, بەگەرمی بەخێرهاتنیکردم, خۆشحاڵی دەربڕی, ڕویکردە دانیشتوان باسی دڵسۆزی منی بۆ کردن بەرامبەر بارزان، ئینجا باسی بەندیخانەی بەسرەی کردو ئێستا لەسەری کۆرێ‌و هۆری پێکەوە دانیشتوین. گوتم: قوربان لەگەرمای بەندیخانەی بصرە خەڵوزت دەگەشاندەوە چات پێ لێدەنا. پێکەنی, فەرموی ڕەفیق(عیال) ماڵ‌ومنداڵ چۆنن، چ حاڵە, لەگەڵ مستەفا چۆنن! گوتم: گەورەم لەدورڕا هاتوم قسەم زۆر پێیە, ئینشاڵلاّ نائومیدم ناکەی‌و حەج هاتۆتە ڕێت, خزمەتێکی گەورە دەبێت لەدنیاولەقیامەتدا، بۆیە داواکارم جەنابتان ئاوێ بەو ئاگرەدا بکەن.

وردەوردە بارودۆخی ئەو ڕۆژەم بۆ باسکرد لە١٤ ی تەموزەوە, ئەو ڕۆژە موبارەکەی کوردی لەدەست حوکمی پادشایەتی ڕزگارکرد, بەڕێزتان لەگەڵ شێخ لەتیفدا لەبەندیخانەی بصرە بوون هاتمە ئێستگەی شەمەندەفەر بە چ جۆرێك پێشوازیتان لێکرا، ئینجا مستەفا بارزانی بەسەربەرزی گەڕایەوە بەڵام دوژمنانی عێراق چ لەدەرەوە یا ناوەوە پڕوپاگندەو تەکتیکیان لەنێوان عبدالکریم قاسم‌و مستەفا بارزانی بەکارهێنا, گەیشتە ئەوەی شەڕ ڕوربدات, بەداخەوە زیانێکی گەورە بوو بۆ ئێمەی کورد لەسەرانسەری کوردستان, چونکە تازە خەریکبووین خۆمان بگرین, بەدەستی خۆمان ئاگرمان بەردایە ماڵی خۆمان، ئێمە بوین بەهۆی ئەوەی حوکمی عبدالکریم قاسم بڕوخێت، عبدالسلام عارف بەشەریکایەتی بەعسییەکان حوکمیان گرتەدەست‌و بەهەموو هێزو توانایەکیانەوە بەکاریان هێنا، ئینجا عبدالسلام کودەتای بەسەر بەعسییەکاندا کردو حوکمی عێراق کەوتە ژێر دەسەڵاتی. شۆڕشەکەمان بەسەرۆکایەتی مستەفا بارزانی توانی بەرامبەر هێرشە دڕندانەکەی عبدالکریم قاسم‌و عبدالسلام عارف ڕاوەستێت, بەعس بۆیان دەرکەوت کە بەشەڕ ناتوانن

زاڵ بن, عبدالسلام عەرەبێکی شوفینی دژ بەکوردبوو بەتایبەتی بەئێوەی بارزانی, ڕابردوی ئەم زاڵمە خوێنمژە روونو ئاشکرایە لای جەماوەری کورد, حکومەتەکەی پیلانێکی گەورەیان بەدەستەوەیە, لەدەوروپشتی بارزانی هەڵدەسورێن کەکێشەی کورد بەئاشتی جێبەجێ دەکەن دوو مەبەستی هەیە لەوە، یەکەمیان دووبەرەکی دروست بکات لەنێوان بارزانیو جەماعەتی ابراهیم احمد، دووەم پێویستی بەپشودانە تابتوانێت بەتەواوەتی حوکمی عیراق بخاتە ژێر دەستی، هەروەها بەعسیەکان لەڕیزی سوپاو شوێنی گرنگ دووربخاتەوە، ئینجا کە بەهێزبوو هێرش دەست پێدەکاتەوە.

مستەفا بارزانیو جەماعەتی ابراهیم احمد بەیەکەوە بەهێزن بەڵام کەجیابونەوە کورد بەگشتی لاواز دەبێت، ئەو کاتە دەبنە دوو باڵ بەرامبەر بەحکومەت، ئەو هێزەیان نابێت. گەورەم من لەخۆمەوە هاتوم بەڵام برادەرانی مەکتەبی سیاسی ابراهیم احمد، عمر دبابە، جەلال تاڵەبانی، نوری شاوەیس، نوری احمد تەها گوتیان بەپێویستی دەزانین ئێمەش بێینە خزمەتی بەڵام ڕێگا لەئێمە گیراوە شوێنێك نییە پێیدا بڕۆین دەستمان بگاتە دەستە پیرۆزەکانی شێخ احمد، ئەوان بەگشتی سڵاوو ڕێزیان هەبوو دەیانگوت تەنها شێخ دەتوانێ چارەسەری ئەو بارودۆخەی ئێستا بکات، ئێمە بەهەموو فەرمانێکی رازین، چۆن چۆنیمان ڕێکدەخات لەسەر پەیڕەوێکی تازە، بەمەرجێك ئاشبەتاڵی تێدا نەبێت. من بۆم نییە کەس تاوانبار بکەم، مستەفا بارزانی گەورەمە، باوکمە، ئەویش ڕۆژێك فەرموی تۆ وەك لوقمان تەماشا دەکەمو برادەرانی م.س. ڕێزم هەیە بۆیان. ئەم دووبەرەکییە ئەگەر چارەسەر نەکرێت دواڕۆژی کورد مەترسیدار دەبێت.

ئامادەبوان ماوەی ١٠ دەقیقە تەماشای شێخیان دەکرد، فەرموی ئەی عباس ئاغاو کاکەزیادو شێخ لەتیف بۆچی چاری ئەوەیان نەکرد؟ گوتم: قوربان جەنابی عباس ئاغاو کاکەزیادو شێخ لەتیف هەوڵێکی زۆریاندا هیچیان بۆ نەکرا, ڕاستی هەرسێکیان جێی شانازین ، بەڵام مستەفا بارزانی بەقسەی نەکردن. فەرمووی ئەی تۆ مستەفا زۆری خۆش دەوێیت. گوتم: هەرچەندە هەوڵمدا هیچم بەهیچ نەکرد. فەرمووی: ئەی ئەو کوردانەی لەبەغداوە هاتبوون. گوتم: هاتنیان سودی زۆر بوو بەڵام دوای سێ ڕۆژ کێشەکەیان وەکو خۆی بەجێهێشت, وا دیاربوو هاتبوون سەردانێکی ناوچەکە بکەن. فەرمووی: ماوەیەك پێش ئێستا مستەفا لێرەبوو ناڕەزایی خۆی پیشاندا دەربارەی کردەوە ناشیرینەکانی مسئولانی حزب وەکو مەلا ماتۆڕو مجید گورگو ابراهیم احمد کە بە چ جۆرێك ئازارو ئەشکەنجەی خەڵکیان داوە، پۆلیسەکانی میری بەم شێوەیە لەگەڵ خەڵك نەجوڵاونەتەوە. گوتم: گەورەم جەنابی شێخ, من نەهاتوم بڵێم ئەوانەی جەنابی مستەفا بارزانی ناوی بردون خەڵکێکی باشن. ئینجا بۆم روونکردەوە کەروناکیەك لەمەسئەلەی کورد بەدی ناکەم، بەڵام بەیەکبوونو ڕێککەوتن لەناو خۆمان دوژمن ناچاردەکەین چۆك دابدات بەرامبەر کێشەکەمان, ئەوان هەریەکە لەلای خۆیەوە ئەوەیتر تاوانبار دەکات، تەنها جەنابتان دەتوانن لەمە بکۆڵنەوە کەکامیان تاوانبارن. فەرموی: رەفیق زۆر ئاڵۆزە, چ بکەین باشە؟ گوتم: سەیارەیەکم پێیە لەمێرگەسوور, ئێستا بکەوینەڕێ شەو

دەگەینە ماوەت, هەموو جەماعەتی ابراهیم احمد لەخزمەتتدا دەبن‌و پێکەوە دەچنە خزمەت مەلا مستەفا بارزانی، بەندەش لەخزمەتتدا دەبێت بۆلای بارزانی، جەماعەتی مەکتەبی سیاسی گوتیان کەی جەنابی شێخ گەیشتە کۆیە هەواڵمان پێدەگات ئێمە هەموومان دێینە رانیە بۆ خزمەتی. فەرمووی ئایا حکومەت هاتنی منی پێ ناخۆش نابێت؟ گوتم: بەدڵنیایی زۆری پێ ناخۆش دەبێت چونکە ئەمە وەکو خەنجەرێکی ژەهراوی وایە لەپشتی عبدالسلام عارف بدرێت. فەرمووی: رەفیق دێم, دوای نان خواردن.

ئەو خەڵکەی دانیشتبوون لەخۆشییان گەشانەوە, لەپڕ کابرایەك هەستایە سەر پێ‌و رووی لەجەنابی شێخ کردو دەستیکرد بەقسە, دوایی ناسیمەوە ناوی (کاك عیسا)[٢٦] بوو. گوتی: کاك رەفیق دەناسم, زۆر هاتوچۆی بارزانی دەکرد, کەپرسیم گوتیان دڵسۆزی بارزانیە, من شکم لەدڵسۆزی نییە بەڵام من باشتر دەزانم لەکاروباری حزبایەتی, لەم رۆژانەدا کۆنفرانسی پارتی لەقەڵادزێ کۆدەبێتەوە جەماعەتێکی تازە هەڵدەبژێرن دەبنە ئەندامی م.س و لیژنەی مەرکەزی, یەکسەر ئەو ١٤ کەسەی جەماعەتی ابراهیم احمد دەردەکرێن, دەبێت هەرچی بەڵگەنامەکانی حزب هەیە تەسلیم بەپارتی بکەنەوە لەپارەو چەك ئینجا ئیمبراتۆریەتی ماوەت بەجێ بهێڵن, ئەو دووبەرەکییە ئێستا دروستبووەو لەنێوان بادینان‌و سۆراندا هیچی نامێنێت, جەماوەر بەگشتی لەدەوروپشتی بارزانی کۆدەبێتەوە، پارتی لەمەولا زیاتر بەهێزتر دەبێت لەناوەوەو لەدەرەوە.

کاك عیسا لەکۆتایی قسەکانیدا گوتی: کاك رەفیق بۆ کورد دڵسۆزە, بەڵام بەخۆڕایی خۆی ماندوو دەکات، ئەم گۆڕانکارییە دووبەرکی‌و شەڕ دروست ناکات, چونکە گۆڕانکاریە تازەکان بەهەڵبژاردن دەبێت، لەکاتی کۆنفرانسەکەدا یاسایی‌و شەرعیشە. گوتم: قوربان جەنابی شێخ وەکو نمونەیەك ئەمەشت بۆ بگێڕمەوە هەرچەندە سەرم ئێشاندی (بین المغرب والعشاء یفعل الله مایشاء) دونیاکە هەروەك خۆیەتی‌و ناگۆڕێ, بەڵام خەڵکەکە هەرگیز وەکو خۆی نامێنێ‌و دەگۆڕێ, مەلامستەفا گەڕایەوە عێراق, کەگەیشتەوە بەغدا یەکەم کات لەمیوانخانەی خیام دابەزی کۆمەڵێك خەڵك لەخزمەتی دانیشتبون بەندەی بچوکتان یەکێك بوو لەوانە, گومانم نیە لەوەی جەنابت بکرئاغا (بکر عبدالکریم) دەناسی، شێخ فەرمووی باش دەیناسم, بکرئاغا مرۆڤێکی (زیخە)واتە ئازایە. لەو کاتەدا جەنابی بکر ئاغا جگەرەی بەناو میوانەکاندا دەگێڕا، مام جەلال بەڕویەکی گرژەوە پاکەتە جگەرەکەی لێسەندو گوتی: (ئەم شەرەفە نادرێت بەتۆ). بەم شێوەیە مام جەلال جگەرەی بەناو میوانە ئازیزەکاندا دەگێڕا، دوای چەند رۆژێکی‌تر مەلامستەفا هێرش دەباتە سەر ماوەت‌و نە مەلامستەفا نە مام جەلال بەشداری ئەو شەڕە ناکەن بەشەخصی, بەڵکو تەنها فەرمان دەردەکەن, ئینجا کێ دەکوژرێت لەخەڵکێکی بەسەزمان‌و بێدەسەڵات‌و فەقیر زیاتر؟ لەکۆتایی شەڕەکەدا هەریەکەیان

---

(٢٦) ساڵی ١٩٥٩ یەکترمان ناسی کەهاتوچۆی بارزانی دەکرد, ئەو کاتە لەحبانیة جێنشین بوو، بەسۆرانی‌و بادینانی باش دەدوا، لەڕێکخستندا زۆر شارەزابوو، رەئی‌و دەسەڵاتی لەلای شێخ هەبو، رێزیان لێدەگرت، شوێنی تایبەتی لەژێر خەیمەیەك بەتەنها هەبوو, نوێنەری لایەنێك بو، دژی باڵی سیاسی جەماعەتی ابراهیم احمد بوو.

بەکوژراوەکانی خۆیان دەڵێن شەهیدە، هەردوولا تاوانبارن بەم دووبەرەکییە، بەڵام لەکۆتاییدا بەسەر هۆزی بارزاندا دەشکێتەوە، جەنابی شێخ تۆش باوکی کوردیو جێی باوەڕی ئەو خەڵکەی، ئێستا چارەسەرکردنی ئەم بارودۆخە دێتە سەر شانی تۆو ئەگەر چارەی نەکەیت لەدواڕۆژدا بەشاهێدی ئەو خەڵکە ئەمە ڕوودەدات کە لەخزمەتتدا دانیشتبون, پاش بیست ڕۆژ یا بیست حەفتە یا بیست ساڵ یا صەد ساڵ یا دووصەد ساڵیتر، ئەگەر کابرایەك جامانەیەکی سوری لەسەربێت خەڵکی دەستی بۆ درێژ دەکەن دەڵێن ئەو کابرایە بارزانییە، کابرای بارزانی لەترسا جامانە سورەکەی لەسەر خۆی دەکاتەوە دەیخاتە ژێر جلەکانی دەیشارێتەوە. شێخ هەر خەریکی دارتاشین بوو بەڵام زۆر گرژبوو، فەرموی ڕەفیق دوای نانخواردن قسەی لێدەکەین. ئینجا هەستا.

من لەخزمەتی چوومە دەرێ, دەستە پیرۆزەکانیم ماچکرد، بەپێکەنینەوە تەماشایکردم, دەستی خستە سەر شانم فەرموی(چیێ دەبێت)واتە باش دەبێت, منیش گوتم انشاءالله بەسایەی خودای مەزنو جەنابتانەوە. ژمارەی ئامادەبوان دەگەیشتە ٣٠ کەس، برایەکی بارزانی بەتەمەن دیاربوو لێپرسراو بوو لەدانانی جۆری ئەو خواردنەی کەبۆ میوانەکان ئامادە کرابوو ، هەر سینییەك بۆ دوو کەس بەشێك برنجو شلەو بەشێك شۆربای لەسەربوو. بەتەواوەتی نانیان دابەشکرد، ئینجا بەدوو کەس سینییەکی مسیان هەڵگرتبوو لەبەر دەمما دایاننا تەماشای خواردنەکانم کرد یەکە یەکە! ئینجا ڕوومکردە تەنیشتەکەم، جەنابی سوارئاغای شێروان مەزن [٢٧] دانیشتبوو داوام لێکرد کەبەیەکەوە نان بخۆین, فەرموی (نەشێ _ فضلناکم بعضاً علی بعض), دەستمکرد بەنانخواردن بەڵام نەمدەزانی چۆن چۆنی دەست پێبکەم, خواردنەکەم برنجو دوو جۆر شلەو گۆشتی مریشك, گۆشتی حیوان, گۆشتی حیوانی کێوی, کاستەر, ماستاوو نان بوو, دڵم خۆش بوو, بەئارەزوی خۆم لەسەرخۆ دەستم بەسەر سینییەکەدا گرت، خۆم بەخۆمم گوت رفیق ئاوا میوانداریت لێبکەن گومانم نییە بەم شێوەیەش شێخ دڵت خۆش دەکات أنشاءالله.

دوای نانخواردن جەنابی شێخ گەڕایەوە شوێنی تایبەتی خۆی کەکەپرەکە بوو, گوتی: ڕەفیق ئەم نامەیە تەسلیم بەمستەفا بکە، ئەگەر ئالۆزوبلۆزی کرد یەکسەر بگەڕێوە، وەرە خۆم دێم, سێ جار ئەمەی دووبارە کردەوە ئینجا رویکردە پیاوێك بەناوی (مەلا...) گوتی: لەگەڵ ڕەفیق دەچێتە لای مستەفا لەوەکیلایەتی منەوە قسەی لەگەڵ بکە, ئەگەر ئالۆزوبلۆزی کردو ڕەفیق نەیتوانی بگەڕێتەوە, وەرەوە خۆم دێم. گوتم: قوربان حەزم کرد لەخزمەتتدا ماوەیەك بمێنمەوە بەڵام بارودۆخی ئێستای کورد خەتەرناکە, دوعای خێرم بۆ بکە بەڵکو بەبۆنەی نامە موبارەکەکەی بەڕێزتانەوە خودا ڕوحم بەگەلی کورد بکات ئاوێك بەو ئاگرەدا بکرێتو بکوژێتەوە. ئینجا دەستە بەنرخەکانیم زیارەتکردو دوعای تەمەن درێژیم بۆ کردو خواحافیزیم لێخواست.

هەروەها خواحافیزیم لەگشت ئامادەبوان کرد بەتایبەتی کاك عیسای بەڕێز خودا شەرمەزاری دونیاو

---

[٢٧] یەکێکە لەبارزانیەکان لەدانیشتوانی شێروان مەزن, ساڵی ١٩٩٨ پرسیارمکرد گوتیان بەفەرمانی نەوچیرڤان کوژرا.

قیامەتی بکات انشاءالله, ماوە لەسەر ئەو تاوانەی پاکانەیەك بۆ خۆی دەکات چونکە من رونمکردۆتەوە ئەگەر ئەو نەبوایە، تەشریفی شێخ دەهات بۆ لای سەرۆك بارزانیو بەهۆی ئەوەوە ئەم براکوژییە رووینەدەداو، ئێستا ئێمەی کورد لەقوناغێکی‌تردا بوین, داوای سەربەخۆییمان دەکرد, راستی کاکەعیسا تاوانێکی گەورەی کرد بەرامبەر ٤٥ ملیۆن کورد.

لەهاتنە دەرەوەم سوارئاغاو شێخ نەزیر چەند شەقاوێك شانبەشانی من هاتنو بەرێیانکردم. گوتم: جەنابی شێخ نەزیر بە چ جۆرێك قسە لەگەڵ جەنابتان بکەم چونکە ئەگەر بەڕێزتان نەبوایە گفتوگۆ کردنو هەوڵوتێکۆشانم لەگەڵ جەنابی شێخدا بەهۆی کاك عیساوە بەفیڕۆ دەچوو. فەرموی هەموو کارێك لێرە ئەنجام بدرێت بەفەرمانی خودی شێخە، بەڵام من بۆچونی تۆم بەڕاست زانی بۆ بەرژەوەندی بارزان بۆیە پشتگیریم لێکردیتو حەزم دەکرد شێخ بۆ خۆی بێت بەڵام بەداخەوە تۆ سوور نەبوویت لەسەر ئەوەی شێخ بێت، یا داوای منت کردبایە، چونکە شێخ تۆی خۆش دەوێت دڵی رازی دەکردیت.

لەگەڵ مەلا وەکیلەکەی شێخ بەیاوەری برا بارزانیەکان کەشێخ محمد خالد ناردبوی لەگەڵماندا, بەرێکەوتین. لەدوو لاوە پشتم بەهێز بوو بەنامەی شێخو وەکیلەکەی. کەهاتین بەرەوژور دەبوینەوە شەومان بەسەر هات، لەگەڕانەوە بەرەو خوارەوە دەهاتین، لەهاوینەهەواری سەری کۆریێ هۆریێ تاکو بەروناکی گەیشتینە گوندی چامە، گوندەکانی سەر رێگامان ئەوانەی بەتەنیشتیاندا رۆیشتین لە ٤-١٠ماڵ پێکهاتبوون, گوندەکانیان زۆر بێئاوبوون، شیناییەکانیان لەچەند گوندێکدا ١٠ بڕ بامیەو ١٢ بڕ تەماتەو ١٠ بڕ باینجان بوو، لەڕێگا لاماندا لای ئاژەڵدارێکی دەوڵەمەندی ناسراو لەناو هۆزی بارزان خاوەن ٥٠٠ سەر ئاژەڵ، نانی نەداینێ بەڵام چامان خواردەوە، خاوەن ماڵ گوتی لەبەیانیەوە ٤٥ میوانم بەرێکردوە. ناوچەیەکی شاخاوی زۆر سەختو زۆر روت بوو.

شەو گەیشتینە مێرگەسور, جەنابی شێخ محمدخالد رێگای نەداین بگەڕێینەوە، زۆر سوپاسی دڵسۆزی جەنابی شێخو کاك نەزیرم کرد کە بە چ جۆرێك پێشوازییان لێکردمو یارمەتیدام, انشاءالله ئەم نامەیەی شێخ کۆتایی بەم گرژییە دەهێنێو من هەموی لەخودی بەڕێزتان دەبینم کەدەستت هەبووە بۆ ئەوەی بەدەست بەتاڵی نەگەڕێمەوە. گوتی: شێخ تۆی خۆش دەوێت, ئەوەی بۆ تۆی کرد شتێکی گەورەیە، ئایا رۆژێك ئەگەر پێویستیت بەیارمەتی بێت بچیتە لایان، ئەوەی تۆ کردت ئایا پاداشتەکەت دەدەنەوە؟ گوتم: جەنابی شێخ محمد خالد, ئەوەی من پێی هەستام سودێکی یەکجار زۆری دەبێت بۆ سەرانسەری کوردستان بەتایبەتی بۆ جەماعەتی ابراهیم احمدو شەخصی مەلامستەفاو هۆزی بارزان بەڵام بۆ خودی خۆم رەنگە زەرەری هەبێت. ئینجا خواحافیزیم لەجەنابی شێخو ئەو برا بارزانیانەی لەهاتوچۆکردن یاوەرمان بوون، کرد.

ناحیەی مێرگەسورمان بەجێهێشت رووەو سلێمانی هاتین. لەڕێگا دووبەدوو لەگەڵ وەکیلەکەی شێخ کەوتینە وتووێژ دەربارەی کێشەی کوردو باروودۆخی ئێستای کورد, خۆی وا پیشاندەدا دەتوانێت

رووبەڕووی بارزانی هەموو جۆرە قسەیەك بکات چونکە جەنابی شێخ ئەحمەد بارزانی ناردویەتی، بۆچونەکانمان یەك بوو, زۆر خۆشحاڵ بووم بەهاتنی, دەمگوت بەڵکو بارزانی ناچاربکات ملکەچ بێت بۆ نامەکەی شێخ, جەماعەتی ابراهیم ئەحمەدیش بەتەواوەتی لەسەر نەخشەیەکی تازە لەبەر بەرژەوەندیی گشتی ملکەچ ببن‌و لەگەڵ بارزانیدا بەیەکەوە کاروباری پارتی بەڕێوە بەرن.

سەعات هەشتی شەو گەیشتینە سلێمانی, بڵاوبۆوە کەڕەفیق پشدەری لەگەڵ وەکیلێکی شێخ ئەحمەد بارزانی گەڕاوەتەوە، برادەرانی پارتی جەماعەتی ابراهیم ئەحمەد داوایان لێکردم دەبێت ئەمشەو بەڕێ بکەویت بۆ بارەگای بارزانی لەبەر ئەوەی بارودۆخ زۆر گرژە، کەوتینە ڕێ, لەکانی‌وەتمان لاماندا نان بخۆین، خاوەن چێشتخانەکە هەستیکرد ئێمە بۆ لای بارزانی دەچین بۆ چارەسەرکردنی کێشەکە, لەخۆشیاندا پارەکەی لێوەرنەگرتین. کاتژمێر یەکی شەو گەیشتینە بارەگای بارزانی لەسەرکەپکان، داوام لەلێپرسراوی پرسگا کرد کەسەرۆك ئاگادار بکاتەوە دەمەوێ بچم بۆ خزمەتی. کاك مسعودو کاك ئدریس بەرەو پیرم هاتن‌و ئاگاداریانکردم بارزانی لەپشودایە. پرسیاریان لێکردم بۆچی بەم کاتە درەنگە هاتویت بۆ لای بارزانی؟ منیش نوسراوەکەی شێخ احمدم تەسلیم کردن لەسەر داواکردنی خۆیان‌و مەلاش کەوەکیلی شێخ احمد بوو لەوێ مایەوە، بەڵام خۆم بەتەنها گەڕامەوە رانیە چونکە پێیان گوتم بەیانی چاوەڕوانت دەکەین. شەو زۆر درەنگ بوو رووم نەهات بچمە هیچ ماڵێك، لەسەر کورسییە تەختەکانی چایخانەیەك پاڵکەوتم‌و خەوتم, لەدەنگی ماستفرۆش‌و میوەفرۆش خەبەرم بۆوە.

دوای گەیشتنم بۆ بارەگای بارزانی پرسگەیان داخست‌و گوتیان ئەمڕۆ بارزانی چاوی بەکەس ناکەوێت, بەڵام وەکو سەرنجمدا ئەو شوێنەی بڕیارە بارزانی لێ دانیشێت یەك کەسی بێگانەی لێنەبووو لەمن زیاتر یەك سۆرانی تر بۆی نەبوو بێتە ئەو جێگەیە, هەروەها پاسەوانێکی زۆر, دووربەدوور پارێزگاری جێی دانیشتنەکەو خودی بارزانییان دەکرد, ئامادەبوان پێکهاتبوون لەئیدریس‌و مسعودو حەمەدئاغای مێرگەسوورو[٢٨] ئەو مەلایەی کەنوێنەری شێخ احمد بوو. پاش تاوێك مەلامستەفا هات, بەگەرمی بەخێرهاتنی کردم‌و هەواڵی پرسیم, رویکردە ئامادەبوان‌و فەرموی ئێوە وەکو من رفیق ناناسن, من حسابی کەسێکی بارزانیم بۆ کردوە, کاتێك لەدەرەوەی وڵات بووم خزمەتێکی زۆری بنەماڵەی ئێمەی کردووە, کەگەڕامەوە عیراق لەیەکەم رۆژەوە چۆتە دڵمەوەو لەخزمەتکردندا بەردەوامبووەو هەرگیز پشتی لەئێمە نەکردووە, ژمارەی ٤٠ پاڵتۆی بۆ ناردبووم‌و دەرمانێکی زۆری کڕیوە لەگیرفانی خۆی‌و چۆتە ریزی پێشمەرگەوەو وەکو دکتۆر خزمەتیکردەوە, کاتێك گیراوە ناوبانگی هەیە کەبە چ جۆرێك لەبەندیخانە بەرامبەر حکومەت راوەستاوە. سەرۆك ماوەی نیو سەعاتێك، بەردەوام بوو لەباسکردنی چالاکی‌و فیداکاری‌و

---

[٢٨] یەکێکە لەناسراوەکان لەناو هۆزی بارزان، مەلامستەفا لەبنەماڵەی ئەم پیاوە زۆر دەترسا, کەشەڕ دەستی پێکردەوە لەساڵی (١٩٧٤) خۆی‌و کوڕەکانی لەبەندیخانەی شۆڕش زیندانیکران, دوای مۆرکردنی ڕێکەوتننامەکەی جەزائیر، بارزانی یەکەم کار کەپێی هەڵسا لەناوبردنی احمدئاغاو کوڕەکانی بوو.

ئازایەتی من, منیش هەر دەمگوت قوربان من بەو جۆرە شایەنی باسکردن نیم، بەڵام ئەو هەر بەردەوام بوو لەباسەکەی، بارزانی بەجۆرێك سووربوو لەسەر باسکردنی چاکەو دڵسۆزیم بۆ ئەوانو خۆشەویستی ئەوان بۆ من لەدڵی خۆمدا دەمگوت: بەڕاستی جێی شەرمو احراجیەیە ئەم باسە بۆ خەڵك بگێڕمەوە، گومانم نەمابوو لەوەی کەنامەکەی شێخ احمد بارزانی جێی خۆی گرتبێت.

دوای ئەوەی لەباسی چاکەکانی من تەواوبوو، تۆزێكوەستا ئینجا ئاڕاستەی قسەکانی بەئەندازەی ١٨٠ پلە بەرامبەرم گۆڕیو لەماوەی ١٠ دەقیقەدا لەپیاوێکی زۆر باشەوە بووم بەپیاوێکی زۆر خراپ، قسەکانی بۆنی ئەوەی لێدەهات کەمن لەخراپەکاریدا وێنەم نییە، بارزانی بەتورەییو ناوچەوانێکی گرژەوە کەمرۆڤ سامی لێدەکرد، باوەڕتان هەبێت کونەمشکم لێبووبو بەقەیسەری، دونیا لەبەرچاوم تاریکبوو، فەرموی دەڵێم وەرە خۆت هەڵبژێرە بۆ لیژنەی مەرکەزی دەڵێت من ئەندامی پارتی نیم، دوای ئەوەش دەچی لای شێخ احمد شکاتم لێدەکەیت؟ بۆم ئاشکرا بووە کەتۆ خائینیت. هەرچی خودا پێی ناخۆشە لەقسەی سوك رووبەڕوو پێی گوتم. زۆر بەتوندی هەڕەشەی لێدەکردم کەئەمە یەکەم جارە لەژیانمدا ئاوا بەزیندویی برینـدار بکرێم, لەسەگبابەوە پیایدا هاتو بەجوێن بەهەموو رەچەڵەکمدا چووە خوارەوەو ماوەی یەك کاتـژمێر لەوتە ناشیرینەکانی بەردەوام بوو, لەم ماوەیەدا چەند جارێك ئدریسو مسعود دەیانویست بابەتەکە بگۆڕن، حەمەدئاغای میرگەسوور زۆری بۆ هات گوتی مەلامستەفا کاتێك سەعیدی کوڕمت ناردە بەغدا تۆ پێت راگەیاندم لەڕێگەیەکی زۆر ئەمینەوە دەینێرمو تەسلیم بەڕفیق پشدەری دەکەم چونکە وەکو لوقمانی کوڕم وایە. مەلامستەفا کە لەجوێندان تاقەتی چوو ئینجا روویکردە مەلا بەجوێنەوە کەنوێنەری شێخ احمدبوو، بەچوارمشقی دانیشتبوو لەوە دەچوو بەحاڵ هەناسەی تیا مابێت تەماشای ئەملاو ئەولای نەدەکرد, خوا خوایبوو خودا لەو دانیشتنە رزگاری بکات بەڵکو بەسەلامەتی بگاتەوە ناو ماڵو منداڵەکەی.

ئینجا مەلامستەفا پێی گوت چەند رۆژێك لێرەبوویت, بەباشی خزمەتکرایو بڕی ٥٠ دینارم دایتێ گوتت دەچمەوە ماڵێ، بەملی شکاوت چی تۆی گەیاندە لای شێخ احمد, هەی درۆزنی مونافق (کۆمەڵێك جوێنی زۆر ناشرینی پێدا). دوای ئەمە ئیتر هەواڵیم نەبیستەوەو نازانم چی بەسەر هات. بەڵام ئەو قسانەی کەبارزانی کردی بەهیچ جۆرێك نەمگرتە دڵ چونکە لەناخی خۆمدا سێ اعتبارم بۆ دانابوو یەکێکیان ئەوە بوو وەکو باوکم سەیرم دەکرد, دووەمیشیان سەرۆکی کورد بوو, سێیەمیشیان لەبەرچاوم بوو ئەگەر ئەوەی مەلامستەفا پیلانی بۆ داڕشتووە جێبەجێی بکات ئەوا بەدووبەرەکیو کوردکوژیو لەناوبردنی بزوتنەوەی کوردی, کۆتایی دەهات. ئینجا کاتی نانخواردن هات مەلامستەفا هەستا گوتی بابچین نان بخۆین، منیش گوتم: من برسیم نییەو نانیش ناخۆم, وەڵامی نامەکەی شێخ احمدم دەوێت. دوای ئەم قسەیەم، بارزانی لەیەکەم جار زۆر گرژترو توڕەتر روویکردە ئامادەبوان گوتی: سوێند بەخوا ئەمجارەیان رەفیق رزگاری نابێت لەبەردەستمداو هەر دەیکوژم، ئینجا من یەکسەر بێدەنگ بووم چونکە زانیم وتووێژ لەگەڵ ئەم پیاوەدا

بێسودە, خواخوام بوو رزگارم بێت لەدەستی‌و نەکوژرێم. لەبەر ئەوەی زۆرم برسی بوو دەرونیشم ئاسوودەبوو کەئەو ئەرکەی خستبومە سەر شانی خۆم بۆ سەروەریی میللەتی کورد گەیاندمە جێی خۆی، دوو کفتەم خوارد، دوای نانخواردن کاك ئدریس‌و کاك مسعودو حەمەدئاغا پارێزگارییەکی زۆریانکردم‌و لەگەڵ مەفرەزەیەك پێشمەرگە رەوانەیان کردمەوە بۆ رانیە لەوێشەوە دوو پێشمەرگەم لەگەڵدا هات هەتا چنارۆك چونکە کاك عزیز عقراوی موبارەك بیستبووی من بەو کارە هەڵساوم فەرمانی پشکنینی ماڵی باوکمی دابوو لەقەلادزێ بەو بیانوەی کەمن چەکم لەماڵەوە شاردۆتەوە.

کەگەیشتمە کۆیە چومە ماڵی خزمێکی خۆم، یەکەم رۆژ سەردانی شاعیری نیشتیمانپەروەرو دڵسۆز عوسمان عەونیم کرد, حەوت رۆژ لەکۆیە مامەوە گوێم لەقسەی خەڵك دەگرت, بەبێ ئەوەی خۆم بەشدارییان بکەم, هیچ قسەم نەدەکرد، رووم‌دەکردە هەر ماڵ‌و دوکان‌و چایخانەیەك یان هەر شوێنێك کەخەڵك تیایدا کۆدەبوەوە بەتێکرایی هەموویان باسیان لەبارودۆخی ئێستای کوردستان دەکرد، هەر یەکە لەڕاستی خۆیەوە لێکدانەوەو بۆچونی خۆی دەردەبڕی, کە لەزۆربەیان نزیك بوومەوە سەرنجمدا هەموویان باسەکانیان لەیەك تەوەرەدا دەخولایەوە, دەیانگوت: ئایا رێکدەکەون؟ کوردەکانی بەغدا هیچیان بۆ نەکرا؟ ئایا جەماعەتی ابراهیم احمد دان بەکۆنفرانسە تازەکەدا دەنێن؟ ئایا بارزانی هێرش دەکاتە سەر ماوەت؟ بەڵام من بەهیچ شێوەیەك بۆچونی خۆمم نەدەدرکاند. رۆژی حەوتەم سەردانی کاك عوسمان عەونیم کردەوە لەوێ چاوم بەمامۆستای نیشتیمانپەروەر مێژوونوس طاهر صادق کەوت, کاك عوسمان عونی پرسیاری لێکردم گوتی: بۆچی لەمنت شاردەوە کەچوی بۆلای شێخ ئەحمەدو مەلامستەفا؟ تکام وایە لەنوکەوە رووداوەکانم بۆ بگێڕیتەوە، منیش لەسەرەتای گەشتەکەمەوە بۆم گێڕایەوە هەتا مەلامستەفام بەجێهێشت، ئەویش گوتی: بەگوێم بکە چونکە من لەتۆ شارەزاترم, ئەم نامەیەی شێخ ئەحمەد ناردویەتی، مەلامستەفا زۆر پێی ناڕەحەت بووە چونکە هەرچی ئەو پیلانانەی کەدایڕشتوە هەمووی پوچەڵکردۆتەوە، دڵنیام ئەو هەڵوێستەی مەلامستەفا بەرامبەر بەتۆ تەنها شانۆیەك بووە هیچی‌تر، نیازی نەبووە بتکوژێت چونکە خۆت دەزانیت ئەگەر بیویستایە بتکوژێت بەئاسانی دەیکوشتیت, بۆیە وایکردووە کەتۆ واز لەو هاتوچۆیە بهێنێت‌و نەچیتەوە لای شێخ ئەحمەد، ئینجا گوێم بۆ راگرە با من چەند ئامۆژگارییەکت بکەم، وەکو بیستومە ئەو بنەماڵەیە تۆیان خۆشدەوێت‌و هەموو شتێکت لێ قبوڵ دەکەن‌و چەندیشت پارەت پێویستە من دەتدەمی بەمەرجێك بچیتەوە بۆلای شێخ ئەحمەد. بەڵام من بەگوێم نەکرد.

دوابەدوای گەڕانەوەم لەکۆیە چوم بۆ هەولێرو بەغداو خانەقین‌و کەلارو سلێمانی, بەبێدەنگی سەرنجی ئەو خەڵکەم دەداو سەیرم دەکرد خەڵکی بەگشتی باس لەهەمان بابەت دەکەن کەدانیشتوانی کۆیە لەناوخۆیاندا باسیان دەکرد. دوای چەند ساڵێك بەسەر ئەم رووداوەدا چاوم کەوتەوە بەبەڕێز حەمەدئاغای مێرگەسوور, پێی گوتم: ئەو شەوەی تۆ مەلات لەبارەگا بەجێهێشت‌و پێیان گوتیت بارزانی سبەینێ بەیانی چاوی پێت

دەکەوێت، ئەو شەوە گوشاریان خستبوە سەر مەلاو بەناچاری هەرچی روویدابوو لەنێوان تۆو شێخ احمد هەمووی بەدوورودرێژی بۆ بارزانی گێڕابووەوە, دیاربوو نامەکەی شێخ ئەحمەد زۆر توندبوو, لەهەمانکاتدا بارزانی دەیزانی هیچی دەسەڵات نییە بەرامبەر بەشێخ ئەحمەد، هەر بۆیە بەو گرژییە مامەڵەی لەگەڵ کردی بۆ ئەوەی بترسیتو نەگەڕێیتەوە بۆلای شێخ ئەحمەد چونکە ئەگەر ئەو پیاوە بەرێزە بهاتایەتەوە لەگەڵتا ئەو کاتە مەلامستەفا نەیدەتوانی لەفەرمانی شێخ ئەحمەد دەربچێتو دووبەرکیش ڕوی نەدەدا.

کەقسەکانی بەڕێز حەمەدئاغاو ئامۆژگارییەکانی مامۆستا عوسمان عەونیم بەراوردکرد بۆم دەرکەوت کەمن تاوانبارمو دەبوایە بچومایەتەوە لای شێخ ئەحمەد. بۆیە داوای لێبوردن لەگەلی کورد بەگشتیو لەخێزانی ئەوانەی بەهۆی دووبەرەکی کوژران بەتایبەتی دەکەم کەئەم ئیشەم کۆتایی پێ نەهێنا، ئەمەش لەنەزانیمەوە بوو. لەناخی خۆمدا بڕیارمداوە ئەگەر رۆژێك لەڕۆژان پارەم بێتە دەستو ببم بەخاوەنی خانوی خۆم لەباخچەکەمدا پەیکەرێکی گەورە بو شێخ ئەحمەد دروست دەکەم.

لێرەدا رادەوەستم واتە لەساڵی ١٩٦٣وە ڕووداوەکان دەپچڕێنم هەتا ساڵی ١٩٨٤، لەکتێبی سێیەممدا أنشاالله باس لەڕووداوەکانی ئەو چەند ساڵە بەدوورودرێژی دەکەم.

ساڵی ١٩٨٤، کاتێك( ی.ن.ك)و رژێمی بەعس لەگفتوگۆکردندا بوون بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد، لەسەر فەرمانی سەرکردایەتی (ی.ن.ك) پەیوەندیم بەزۆرێك لەسەرۆك جاشەکان کرد بەنیازی هێنانەوەیان بۆ ریزی شۆڕش. کاتێك کەشەڕ دەستی پێکردەوە منیش چومە خزمەت مام جەلال بۆ دێی سێروان پێم گوت: ئەوە من هاتومەتەوەو لەخزمەت کوردستاندام، گوتی: لەبارەگایەك دانیشە هەتا لەماوەی مانگێکدا کارێکت بۆ دیاری دەکەین، منیش چومە دێی (کۆڕوان) کەبارەگاکەی کاك نەوشیروانی لێبوو، پێم گوت کاك نەوشیروان میوان قبوڵ دەکەیت؟ گوتی: خوا دەکات تۆ بەئێمە رازی دەبیت دەتخەمە سەرچاو. لەماوەی ئەو چەند رۆژەدا کەلای کاك نەوشیروان بووم زیاد لەپێویست خزمەتیکردم. لەدوای ١٣ رۆژ (١٩٨٥/٥/٤) لەکاتژمێری ٤ی عەسردا کاك نەوشیروان پێی راگەیاندم سەر لەمام جەلال بدەو کاك ملازم عمریش لەگەڵ خۆتدا بەرە. کاتێك گەیشتمە خزمەتی کاك عمر عبدالله کەلێپرسراوی دەزگای کاروباری پێشمەرگەبوو، دوای سڵاو ئاگادارمکرد کەکاك نەوشیروان فەرمویەتی لەگەڵ ملازم عمردا بچمە خزمەت مام جەلال، کاك عمر گوتی: ئینشاالله سەرکەوتو دەبیتو لەگەڕانەوەدا نانی ئێوارە لای من دەخۆیت. ئینجا نەوتی بەخەڵوزەکەدا کردو ئاگری تێبەردا، من بەتەنها هاتمە دەرەوەو بەڕێ کەوتم بۆلای مام جەلال کە١٠ دەقیقە لەبارەگاکەی ملازم عمرەوە دوور بوو. گەیشتمە لای مام جەلال, هێرۆ خانو سید مجیدی لابوو, زۆر بەگەرمی پێشوازی لێکردمو یەکسەر گوتی: کاك رەفیق دەتەوێت کوردستان رزگاری بێت؟ گوتم: کێ هەیە نەیەوێت کوردستان رزگاری بێت. گوتی: تۆ هەوەست لێبێت کوردستان رزگار دەکەیت. بەحەپەسانەوە گوتم: من...! مام جەلال گوتی: بەڵێ, خەڵك دەست درێژدەکاتو دەڵێن ئەمە بوو کوردستانی رزگار کرد. گوتم: مام جەلال،

ئەمجارەیان بەتەمای چیم لێبکەیتو چیت ناوەتەوە؟ گوتی: ئێمە تەنها ئاسمان ماوە تەقەی لێبکەین، ئەگەر بێتو لەگەڵ کوڕانی مەلامستەفادا ئاشتمان بکەیتەوە کوردستان ڕزگاری دەبێتو کورد کێشەی نامێنێت. گوتم: ئەمە قسەی دڵتە یا پیلانە یا وتەیەکی کاتییە، داواکارم لێت کە لەدۆستایەتی ئەوانەم نەکەیت. مام جەلال گوتی: لەکەیەوە پەیوەندیت پێیانەوە نەماوە؟ گوتم: لەو ڕۆژەوە کەخۆمو پێنج کەسەکە لە(ی.ن.ك) جیابوینەوەو بازیانی کوڕم نارد بۆلای کاك مسعود بەمەبەستی یارمەتیدانم بۆ دامەزراندنی حزبێكو ئەویش بەنامەیەك وەڵامی دامەوە دەڵێت (یارمەتیت دەدەم بەڵام لەمەودوا نامەم بۆ بنێرە بەناوی (هێرۆ خانەوە)و لەلایەن ئێوەوە دەستگیرکرام ئینجا مختار عبداللە غەریبی[29] یاوەرمتان کوشتو منتان بەبەندکراوی لای خۆتان هێشتەوە، پەیوەندیم پێیانەوە نەماوە. مام جەلال گوتی: دوو نامە دەنوسم یەکێك بۆ مەلا دەڵگەیی ئەوەی تر بۆ کوێخا سمایلی تەلان[30] کەلای کاك مسعود کەپشتگیریت بکەن بۆ ئەوەی سەرکەوتوو بیت لەم کارەتدا. گوتم: من دەبێت کاغەز بۆ کاك مسعود بنوسم بڵێم ئاگات لەو پیاوە بەڕێزانە بێت. مام جەلال گوتی دەکەواتە من نامەیەکی سپیت بۆ ئیمزا دەکەم، تۆ وەکیلی من بە. گوتم: بازیانی کوڕیشم کە( پ.م)ـە لەمەکتەبی عەسکەری لەگەڵ خۆمدا دەیبەم. مام جەلال گوتی: ئەگەر سەرکەوتوبویت ئەوا دەڵێم من ناردومەو ئەگەر شکستت هێنا دەڵێم ئەوە ڕەفیق پشدەرییە ئاگام لێنەبووەو هەزار شتی وایکردووە.

دیدارەکەم لەگەڵ مام جەلالدا بەخواحافیزی کۆتایی پێهێناو گەڕامەوە بۆلای کاك عمر عبداللە، کەپرسیاری لێکردم شێری یان ڕێوی؟ گوتم: من هەرگیز ڕێوی نەبووم، هەر شێرم..

کاك عمر بەدەستی خۆی مریشکەکەی کرد بەشیشەوە، لەسەر ئاگرەکە برژاندیو ئینجا کردی بەپاروو دای بەدەستمەوە، لەم کاتەدا کاك مستەفا چاوڕەش فەرموی ئەو غەزەلە چییە؟ منیش لەترسی مام جەلال لەگەڵ ئەوەشدا کەئەم پیاوە برای شیریمەو زۆریشم خۆشدەوێت ڕاستییەکەم بۆ نەدرکاند.

کەگەڕامەوە بۆ بارەگای کاك نەوشیروان, شەو لەخزمەتیدابوومو بەیانی هەر یەکەمان ڕۆیشتین بەلایەکدا. منو بازیانی کوڕم لەڕۆژی ١٩٨٥/٥/٧ بەڕێ کەوتین, لە ٩ی مانگ گەیشتینە گوندی شووکێ کەمەڵبەندی

---

(٢٩) ماوەیەك پێشمەرگەبوو لەگەڵ گروپە سیاسییەکاندا، ی.ن.ك بڕیاری گرتنیان دەرکردبوو لەگەڵ چەندکەسێکیتردا، مامۆستا مەلادەڵگەیی نامەیەکی بۆ ناردبوم کەئەو پیاوە خەڵکی قەڵادزێیەو دژی ڕژێمەو چالاکی گەورەی بەرامبەر بەڕژێم ئەنجامداوە, چەند جارێك زامدارکراوە بۆیە دەبێت لەگەڵ مام جەلالدا قسە بکەیت کەلێی خۆش بن" لەسەر داواکاریی من مام جەلال لێی خۆشبوو. هاتە ریزی یەکێتی، ڕوداوێك ڕوویدابوو شایەت هەبوو بەسەریەوە کەئەم تاوانبارە لەم ڕووداوەدا برادەرانی کۆمەڵە دەیانویست لەسەر ئەو کارە لەسێدارەی بدەن, ئەمجارەش توانیم ڕزگاری بکەم. کەجیابوومەوە لەمام جەلال بەو نیازەی حزبێك دابنێم، کەدەزگیرکرام کتوپڕ موختاریان کوشت, بەڵام دوای کوشتنی بەچەند ساڵێك یەکێتی لەبەیانێکدا بەشەهیدی ی.ن.ك لەقەڵەمداو بەپێشمەرگەیەکی نیشتیمانپەروەر ناویان دەبرد.

(٣٠) تاکە سەرۆك هۆزە لەکوردستاندا کەخاوەن دۆنمێك زەوی نییەو کێشەی لەگەڵ جوتیار نییە، یەکێکیشە لەسەرۆك هۆزەدڵئاوکانی کوردستان، عادەتیان وایە کەمیوانێك ڕوودەکاتە دیوەخانەکەیان خۆیان پێشوازی لێدەکەنو لەڕۆیشتنەوەشدا خۆیان بەڕێی دەکەن. هەموو هۆزەکەی دەست دادەنێن کەئەو بەسەریدا بڕوات. هەرکەسێك ناکۆکیەك هەبێت لەو ناوچەیە ئەو بەهانایانەوە دەچێت، کەسایەتییەکی شۆڕشگێڕو نیشتیمانپەروەرەو ڕابوردویەکی پاکی هەیە، لای هەموو گروپە سیاسییەکان ڕێزدارە چونکە ژیانی بەختکردوە لەپێناوی کوردو کوردستان. توشی ئازارو ئەشکەنجەیەکی زۆربووەو چەندین جار گیراوەو دورخراوەتەوە، لەهەموو شۆڕشەکانی کوردستاندا بەشداریکردووە، باسی چاکەی ئەم پیاوەو کورەکانی (احمدو محمود) بەکتێبێك کۆتایی نایەت، ئەگەر دەتەوێ قسەکەی من تاقی بکەیتەوە بچۆ بۆ شارۆچکەی دوکانی سەرەوە بڵێ ماڵی کوێخا سمایلی تەلان کامەیەو مانگێك میوانی بە ئنجا بۆت دەردەکەوێت کەچۆن پیاوێکە.

یەکی یەکێتی لێبوو، دوو ڕۆژ لەوێ ماینەوە ئینجا بەڕێیانکردین بۆ گوندی باراو بۆ لای برادەرێکی دڵسۆزی یەکێتی کەناوی شێخ نوری بوو ڕیش سپی ئاوایی بوو، ئەم دێیە هەرچەندە لەسنوری دەسەڵاتی یەکێتیدا بوو بەڵام پارتی زاڵتربوو تیایدا، پێش ئەوەی بگەینە دێکە توشی شێخ نوری بووینو لەگەڵ ئەودا چوینەوە ماڵی خۆیان, نانی نیوەڕۆیان بۆ هێنایین کەبریتی بوو لەهێلکەوڕۆن، بەڵام پێش ئەوەی دەست بکەین بەنانخواردن خێزانەکەی فەرمووی: راوەستن، ئینجا روویکردە شێخ نوری گوتی: ئەمانە بەڕۆژی نیوەڕۆ لەگەڵ مەفرەزەیەکی یەکێتیدا هاتنە ناو دێکەوەو بەچەکەوە، ئێستاش پرسیار لەبارەگای پارتی دەکاتو دەیەوێت بەچەکەکانیانەوە بەئازادی بچنە ناو پارتییەوە، هەر بۆیە هاواریکرد گوتی بەزاتی خوا رێککەوتنە، ئینجا شێخ نوری روویکردە سەبری خانی کچیو فەرمووی برۆ مریشکەکەیان بۆ سەربرە، خێزانەکەی شێخ نوری گوتی: ئاخر هەر ئەو مریشکەمان هەیەو هێلکەکەریشە، شێخ گوتی: سەگباب دەڵێم برۆ سەری ببڕە ئەوا کورد خەریکە رێکدەکەون. دوای نانخواردن عەرزی شێخم کرد گوتم: بازیانی کوڕم بۆ بگەێنەرە لقی چواری پارتی. هەمان رۆژ بازیانی کوڕمو شێخ نوری بەڕێکەوتن بۆ لقی چوارو لەوێ بازیان چاوی کەوتبوو بەجەنابی دەروێش ئاغا کەکوردێکی شۆڕشگێڕو نیشتیمانپەروەرو ناسراوە، بەدەروێش ئاغای راگەیاندبوو کەباوکم لەدێی باراو چاوەڕوانەو دەیەوێت بچێت بۆ خزمەت کاك مسعود بارزانی، دوای ئەوەی وەڵامی بروسکەکەی دەروێش ئاغا بەڕەزامەندی دێتەوە, بەیانی بەڕێز دەروێش ئاغا خۆیو مەفرەزەیەك پێشمەرگە هاتن بۆ پێشوازیکردنمو پێی گوتم ئەمە (عدم تعرض)ێکە بەناوی حاجی ئەحمەدەوەیە بۆ تۆمان کردووە بەچەکەوە، کەگەیشتینە خاڵی پشکنینی ئێرانییەکان پیشانیان بدە. ئینجا چوینە بارەگای لقی چوار، شەو ماینەوە، بەیانی بەرەو نوسینگەی پەیوەندییەکانی پارتی لەمەریوان بەڕێکەوتین، لەوێ چاوم بەبرای دڵسۆزو شۆڕشگێڕو نیشتیمانپەروەر کاك فایەق تۆفیق کەوت کەناسراوە بە فایەقەڕەش، بەڕێوەبەری نوسینگەکە بوو، لەڕێی خۆیەوە منو بازیانی بەڕێکرد بۆ م.س پارتی دیموکراتی کوردستان لەڕاژان، لەسەعات ٨ی سەر لەبەیانی رۆژی ١٩٨٥/٥/١٨ لەمەریوانەوە بەڕێکەوتین لەسەعات ٣,١٥ی هەمان رۆژ گەیشتینە بارەگای مەکتەبی سیاسی پارتی لەڕاژان.

بە درێژایی رێگای نێوان مەریوانو راژان هیچ قسەیەکم لەگەڵ بازیانو ئەو برا پێشمەرگە پارتییەی لەگەڵماندابوو نەکرد، چونکە هەموو هەستو بیرو هۆشێکم لەلای ئەوەبوو کەگەیشتمە ئەوێ چۆن دەست پێبکەمو بڵێم چی بۆ ئەوەی چیتر خوێنی رۆڵەی میللەتەکە بەهەدەر نەڕژێتو وەکو ساڵی ١٩٦٣م لێ نەیەتەوە کەنەمتوانی نێوان بارزانیو م.س– جەماعەتی ابراهیم احمد یەکبخەمەوە، بەدڵ لەخوا پاڕامەوە ئەمجارە بەسەرکەوتوویی بگەڕێمەوە، زۆر دڵخۆشبووم بەوەی کەمن راسپێردرام بەم کارە پیرۆزە هەڵسم، خۆم بەخۆمم دەگوت: رەفیق هەرچەند مام جەلال تۆی ناردووە بەڵام تۆ خۆت بەلایەنگری هیچ لایەك نازانیتو هەردوولا بەیەك چاو سەیر دەکەیت، انشاالله سەرکەوتویت لەم کارەتدا.

کاتێك گەیشتمە پرسگەی م.س. یەکسەر منیان برد بۆ ژووری بەڕێوەبەرایەتی کەشوکری نێرۆیی جامانەیەکی سوری لەسەردابوو، بەڕێوەبەربوو زۆر بەرگەرمی بەخێرهاتنی کردم، هەتا ئەو چوو بەکاك مەسعود رابگەیەنێت من لەتاو ماندویەتی لەسەر یەکێك لەو دۆشەکانەی داخرابوو پاڵکەوتمو دوای بیست دەقیقە پێیان گوتم فەرموو بچۆرە ژورەوە، کەچوومە ژوورەوە چەند کەسایەتییەکی گەورەی پارتی دانیشتبون بەڵام لەناو هەموویاندا تەنها کاك مسعودو مامۆستا علی عبداللەم دەناسی، دەستبەجێ مامۆستا علی لەگەڵ ئەو کەسایەتییانەی تردا بەیەکتری ناساندین، من ناویانم بیستبوو بەڵام بەخزمەتیان نەگەیشتبووم کەپێکهاتبوون لەفازڵ میران، مامۆستا مەلاعبدالقادر، فرانسۆ حەریری، د. رۆژ، ملازم یونس رۆژبەیانی, بەگەرمی بەخێرهاتنیان کردم. رووملکردە کاك مسعود پێم گوت: منو تۆ لەو رۆژەوە کەباوکت لێم توڕەبوو زۆر هێرشی کردەسەرمو تۆو کاك ئدریس یارمەتیتاندام بۆ گەڕانەوە، چاومان بەیەك نەکەوتووەو پەیوەندیمان تەنها بەنامەبووە.

ئەوانەی دانیشتبوون لەخزمەت کاك مسعوددا بەسەرسوڕمانەوە گوێیان لێدەگرتم چونکە هیچیان ئاگاداری ئەو پەیوەندییە تایبەتییە نەبوون کەبەدرێژایی رابوردوو بەبەردەوامی لەگەڵ مەکتەبی بارزانیدا هەمبوو. ئامادەبوان، بێجگە لەکاك مەسعودوا تێگەیشتبون کەمن لەلایەن ڕژێمەوە نێردراوم ئنجا بەو نیازەی زیاتر خۆم بەو بەڕێزانەی دانیشتبوون بناسێنم، چەند یادەوەرییەکم بۆ کاك مەسعود گێڕایەوە، باسی شاهیدییەکەی حبیب محمد کریمم کرد کە لەسەر من دابووی لەدادگای رژێمو چۆنو بە چ شێوەیەك وەڵامم دایەوەو بەگلەییەیەك کۆتاییم بەباسەکان هێنا گوتم: کاك مەسعود بۆ ئەوەندە سست بوویت لەوەڵامدانەوەمدا کەداوای پشتگیریم لێکردیت بۆ دانانی حزبێکی تازە؟ کاك مسعود روویکردە کاك علی عبداللەو فەرمووی کاك رەفیق دەناسیت؟ کاك عەلی فەرمووی: من دەمزانی کەمەلامستەفا زۆری خۆش دەوێت بەڵام ئاگاداری ئەوە نەبووم کە بەدرێژایی ئەم چەند ساڵە پەیوەندی تایبەتی بەمەکتەبی بارزانییەوە هەبووە. ئینجا کاك مەسعود بەدوورودرێژی باسی منی بۆ کردن، بەجۆرێك کەزۆر پێی سەربەرزبووم، ئەو باسوخواسە وایکرد ئامادەبوان بۆیان روونبێتەوە من وەکو نوێنەرێکی رژێم نەچومەتە ئەوێ بەڵکووەکو کادرێکی ی.ن.ك هاتومو مەبەستیشم یەکخستنەوەی ئەو دوو حزبە بەجەنگ هاتووەیە.

رووملکردە کاك مسعود، کاغەزو قەڵەمێکم پێداو گوتم: ئەگەر تۆو مام جەلال ئیستقالە بکەن کورد رزگاری دەبێت. کاك مسعود بەمەبەستی ئیستقالە نوسین قەڵەمەکەی گرت بەدەستیەوە، منیش دەستیم بەتوندی گرتو گوتم: تۆمارکەرێك(مسجلە)ێکم بۆ بێنن بۆ ئەوەی بەئەمانەتەوە هەرچیم پێیە بۆ ئێوەی باس بکەم لەگەڵ بیروبۆچونی خۆمدا لەلای ئێوە بمێنێتەوە بەتۆمارکراوی بۆ مێژوو. لەسەر داواکارییەکەی خۆم تۆمارکەرێکیان هێناو دووجار تاقییان کردەوە ئینجا گوتیان فەرموو چیت هەیە بیڵێ: منیش بەدوورودرێژی دەقی ئەو گفتوگۆیەم بۆ گێڕانەوە کە لەنێوان منو مام جەلالدا روویدابوو تەنها ئەوە نەبێت مام جەلال

فەرموبوی (کوڕانی مەلامستەفا) بەڵام من لەوێ گۆڕیم بە(پارتی دیموکراتی کوردستان)، دوایی گوتم من بۆچونی خۆمم هەیە بۆ ئەم داواکارییەی مام جەلال، من ناتوانم کەفیلی مام جەلال بمو بڵێم بەدڵ منی ناردووەو راستدەکات، بەڵام من بەدڵێکی پاکەوە هاتومەتە لاتان بۆ ئەوەی ڕێکتان بخەمو تەنها لەو وتانە بەرپرسیارم کەخۆم دەیکەم.

کاک عەلی فەرمووی ئیمڕۆ کاک مەسعود لەبەر تۆ زۆر ماوەتەوەو ئێستاش کاتی حەوانەوەی هاتووە، رۆژی شەممە دادەنیشینەوەو بەتەواوەتی قسەی لەسەردەکەین. منیش گوتم چما کورد رزگاری بووە تا هەینیو شەممە هەبێت! ئەم کارەی بۆی هاتوم کارێکی زۆر گرنگەو کێشەی میللەتی کوردە هی ئەوە نییە رۆژێك دوابخرێت. کاک مەسعود کەزانی من زۆر سورم لەسەر دوانەخستنی دانیشتنەکە، بڕیاریدا کەسبەینێ هەینی کاتژمێر ٢ی پاش نیوەڕۆ دابنیشینەوە بۆ لێکۆڵینەوە لەو کارە. بەڵام پێش ئەوەی کاك مەسعود هەڵسێت پێم گوت: جاران کەدوو سەرۆك دەوڵەت دانیشتنیان بکردایە بەچەكو تەقەمەنییەوە بەرامبەر یەکتر دادەنیشتن، بەڵام ئێستا ئەگەر بیانەوێت دابنیشن بۆ گفتوگۆکردن لەسەر مەسەلەیەك دەچنە چێشتخانەیەکی گەشتوگوزاری پلە یەك بۆ ئەوەی دانیشتنەکەیان لەکەشوهەوایەکی خۆشدا ئەنجام بدەنو کۆتایی دانیشتنەکەشیان بەخواردنێکی بەلەزەت بهێنن، هەر بۆیە داواکارم لەدانیشتنەکەی سبەینێ سێوو کاهوو ڕێواس لەبەردەمماندا دابنێن چونکە کەمن ناوی مام جەلالم هێنا تۆ گرژ دەبیت ئەوسا سێوێك بخە ناو دەمت ئاو بەدەمتدا دێتە خوارێو گرژییەکەت نامێنێت. ئامادەبوان بەم قسەیە دەستیانکرد بەپێکەنینو کاك مەسعود لەکاتژمێر ٤,٢٠ هەستا چووە دەرەوەو من یەکێك بووم لەوانەی هەتا دەرگای دەرەوە بەڕێمانکرد.

دوابەدوای ئەو, هەموو ئامادەبوان چونە دەرەوە بۆ پیاسەکردن لەدەشتێکدا کەنزیکەی ٥٠٠م لەبارەگاکە دووربوو بەڵام تەنها کاك علی عبدالله بەشداری نەکردن، منیش ئەو پیاسەیەی ئەوانم بەهەل زانی بۆیە چومە ناویانەوە بۆ ئەوەی باس لەگرنگی ئەو ڕێکەوتنە بکەم بەنسبەت ئەوانو هەموو میللەتی کورد، دوای ئەوەی بەتەواوەتی بابەتەکانم بۆ روونکردنەوە فازل میران، د.رۆژ، مامۆستا مەلاعبدالقادرو یونس رۆژبەیانی خۆشحاڵی خۆیان دەربڕی تەنها یەکێك ئەو ڕێکەوتنەی پێ باش نەبوو کەهەتا ئێستاش بۆچونی نەگۆڕاوەو هەرپێی خۆش نیە کورد ببێ بەحکومەت ئەویش فرانسۆ حەریرییە، شەو لەخزمەت مامۆستا علی عبدالله بووم زیاتر لە ٢ کاتژمێر لەسەر گرنگی ئەو ڕێککەوتنە دواین بەڵام بەجۆرێك خۆشحاڵ بوو بەو کارە کەئێستا نازانم چۆن باسی بکەم.

سەر لەبەیانی رۆژی هەینی سەعات ٨,٣٠ منو بازیان چوینە شاری رەزاییە (ورمێ) لەئێران بۆ خۆشتن لەیەکێك لەگەرماوەکاندا، دوای ئەوە لەلای گوڵفرۆشێك چەپکێك گوڵی گەورەمان بە١٠٠٠ تومەن کڕیو بەنوسینێکی گەورە لەناوەڕاستەکەیم نوسی (خوالێخۆش بوو باوکی گەلی کورد مەلامستەفا بارزانی) لەژێریشیدا نوسیم نوێنەری(ی.ن.ك) ڕەفیق پشدەری، ئینجا بردم لەسەر مەزارەکەی لەگوندی هەلاج دامنا،

گوتم: بەڕێز بارزانی، داوای لێبوردنت لێدەکەم، دەبوایە زوتر هەوڵم بۆ ئاشتبوونەوە بدایە بۆ ئەوەی چیتر کورد لەیەکتر نەکوژن, انشاالله لەم کارەمدا سەرکەوتو دەبم بۆ خزمەتی کوردو کوردستان. لەکاتی قسەکانمدا پاسەوانی مەزارەکە بەسەرسوڕمانەوە گوێی لێدەگرتم.

گەڕامەوە بۆ گوندی راژان، سەعات ٢ دەستمانکردەوە بەکۆبونەوە لەکەشوهەوایەکی زۆر خۆش و دڵفڕێندا، دیاربوو ئەو قسانەی رۆژی پێشتر بۆم کردبوون جێی خۆی گرتبوو چونکە بەگشتی مامەڵەیان نەرمونیانتر بوو لەڕۆژی پێشو، (یەقین)م بۆ دروستبوو کەهەر هەموویان لایەنگری ئەو پرۆسەیەن، بۆیە لەسەرەتای وتەکەمدا گوتم: دوای ئەوەی گفتوگۆکانی نێوان رژێم و ی.ن.ك شکستی هێنا، ئێستا نە رژێم کێشێك بۆ ی.ن.ك دادەنێت نە ئێرانیش کێش بۆ ئێوە دادەنێت، چونکە ئێوە لەنێوان خۆتاندا ناکۆکن و هەتا بەم شێوەیە بمێننەوە جێی بایەخ نابن لای دوژمن، ئایا دەتانەوێ خودی رەفسەنجانی بەفڕۆکە بێت لای ئێوە دابەزێت؟ ئەگەر لەناو خۆتاندا رێککەون ئەوە بەچاوی خۆتان دەبینن. ئایا دەتانەوێت صدام نوێنەری خۆی بنێرێتە لاتان ؟ رێککەون صدام بەرەو پیرتان دێت و باوەشتان بۆ دەکاتەوە. ئێوە لەدوای هەرەسەکەی ١٩٧٥ـەوە لەکوردستانی باشور پچڕاون و شوێنەکەتان ئەوەندە دوورە ئەگەر مەفرەزەیەکتان بیەوێت بچێتە سلێمانی بە سێ رۆژ دەگاتە ئەوێ، ئەگەر لەدەست سەربازەکانی رژێمیش رزگاریان بێت رووبەڕوی پێشمەرگەکانی یەکێتی دەبنەوە و بەم شێوەیە ئەو مەفرەزەیە یان ناگەڕێتەوە یا بەهیلاك دەچێت، پێم باشە زۆر بەوردی بیر لەپێشنیارەکانم بکەنەوە چونکە ئەگەر ئێوە رێکبکەون لەگەڵ یەکێتیدا، ئەو مەفرەزەیەی باسمانکرد, لەجیاتی ئەوەی توشی بەرەنگاریبونەوە بێت لەگەڵ یەکێتیدا دەچێت لەبارەگاکەیان دەحەوێتەوە و کارەکەی خۆی سەرکەوتوانە ئەنجام دەدات و بەسەلامەتی دەگەڕێتەوە بۆ لاتان، کەواتە ئێوە ئەگەر لەگەڵیاندا رێکەون زۆر سودمەند دەبن، بۆیە داواکارم پێش ئەوەی لەم ژوورە بچینە دەرەوە بڕیارێکی یەکلایی بدەن، حەز دەکەم بۆ جاری دووەم دووپاتی بکەمەوە ئەگەر بەم پەلەیە رەزامەندی خۆتان دەربڕن بۆ رێکەوتن لەهەموو سەرێکەوە ئێوە سودمەند دەبن، ئەوسا مام جەلالیش ناتوانێت ئەم هەڵوێستە مەردانەیەی ئێوە لەبەرچاوی خەڵك بشارێتەوە.

لەئەنجامدا هەموویان لەسەر بڕیاری کاك مەسعود رەزامەندی خۆیان دەربڕی بۆ گفتوگۆکردن لەگەڵ مام جەلالداو پێیان گوتم هەر ئێستا بەپەلە بازیانی کوڕت بنێرەوە بۆلای مام جەلال بۆ ئەوەی بڕیاری رەزامەندی ئێمەی پێبگەیەنێت.

ئێوارەی شەممە ١٩٨٥/٥/٢٠ بڕی ٢٤٠ دیناری عیراقییان لەناو خۆیاندا بۆ بازیان کۆکردەوە و لەگەڵ نجم الدین ناوێکدا کە(پ.م)ی لقی چوار بوو بەڕێیانکردو پێیان گوت ئەمشەو دەچن لەڕەزاییە دەمێننەوە بەڵام بەهیچ شێوەیەك قسەی لەگەڵدا ناکەیت، ئەم تەنها کاری ئەوەندەیە ئەگەر گیرایت دەگەڕێتەوە هەواڵمان دەداتێ.

بازیانی کورِم کەگەڕایەوە، ئەم گەشتەی بەدووروودرێژی بۆ گێڕامەوە, گوتی: سعات ٤ی بەیانی لەڕەزاییە دەرچوین، سەعات ٥ ی ئێوارە گەیشتینە لای کاك فایەقەڕەش لەمەریوان، خەریکی نانخواردن بوو لەوێ نەیهێشت دانیشم نان بخۆم پارووییەکی بۆ کردم گوتی لەگەڵ ئازاد قەرەداغیدا (کەئەندامی لق بوو) هەرئێستا بەڕێکەون، دوو سەیارەش پاسەوانی داینێ بۆ ئەوەی هەواڵەکە بەسەلامەتی بگەیەنمە جێی خۆی. کاتژمێر ٧ی ئێوارە گەیشتمە بارەگای لقی چوار بۆ خزمەت دەروێش ئاغا، ئەویش بەهەمان شێوە لەنانخواردندابوو، ماسییەکی بۆ کردم بەلەفەو گوتی بەگۆڕی ئەوڕەحمان ئاغای باوکم شەو لێرە نامێنێتەوە دەبێت هەرئێستا بەپەلە نامەکە بگەیەنیتە ئەودیو، مەفرەزەکە هەتا کێوی حاجی مامەند پاسەوانییان کردم کەکۆتایی سنوری ئێران بوو، لەوێشەوە بەتەنها چومە ناو یەکێتییەوە بۆ بارەگای مەڵبەندی یەك لەشوکێ، سەعات٩،٣٠ لەماڵی کاك جەبار فەرمان چایەکەم خواردەوەو لەگەڵ مامۆستا صالح بەڕێکەوتین بۆ پیری شەوکێڵ، کەگەیشتینە ئەوێ تەسلیمی کاك حمەامین خەجێی کردمو پێی گوت: ئەم کوڕە ئەمانەتە لەملی تۆداو دەبێ هەر ئەمشەو بیگەیەنیتە گاپیلۆن، ١٢ی شەو گەیشتمە گاپیلۆن، بەم شێوەیە لەماوەی دوو ڕۆژدا لەڕاژانەوە گەیشتمەوە دێی سێروان لەناوچەی مەرگە بۆ خزمەت مام جەلال، سەعات ٧ی بەیانی ڕۆژی سێیەم چوومە بەردەرگای بارەگای مام جەلالو نامەکەی باوکم تەسلیم بەپاسەوانەکەکرد، نامەکەی بردە ژوورەوەو هاتەوە دەرێ گوتی مام جەلال نەخۆشەو کەس نابینێت، منیش گەڕامەوە ژورەکەی کاك ملازم عمر پێم گوت:پاسەوانەکە دەڵێت مام جەلال نەخۆشەو کەس نابینێت. دوای ئەوەی نانی بەیانیمان لەگەڵ کاك ملازم عمرو کاك مستەفا چاوڕەش‌و کاك شێرکۆ بێکەس پێکەوە خوارد, کاك ملازم عمر کورسییەکی بۆ دانام بەرامبەر بارەگاکەی مام جەلالو فەرمووی: دانیشەو مەجوڵێ هەتا لەبارەگاکەی دێتە دەرەوەو چاوت پێی دەکەوێت. دوو شەوو دوو ڕۆژ لەو جێگایەدا دانیشتم نەمدی بێتە دەرەوە، ڕۆژی سێیەم سەعات١٠ی سەر لەبەیانی کاك ملازم عمر گوتی: ئەوە هەر لێرە دانیشتوی؟ منیش گوتم ئەی نابێت بانگم بکات ئینجا بچمە خزمەتی، بەتوڕەیی‌یەوە گوتی هەستە پێشم کەوە، بردمیە بەردەم دەرگای ژورەکەی مام جەلال، هەرچەند پاسەوانەکە گوتی مام جەلال کەس نابینێت بەڵام ئەو گوێی نەدایەو دەرگاکەی کردەوەو پێی گوتم فەرموو ئەوە مام جەلال. چاوم بەبەرێز مام جەلال کەوت دەستەسرێکی پێبوو دەستیکرد بەکۆکەو فەرمووی: وەکو خۆت ئاگاداری سێ ڕۆژە نەخۆشم چاوم بەکەس نەکوتووە، بەخێر بێیتەوە، ئنجا فەرموی: ئەو گوڵە چییە باوکت لەسەر مەزاری مەلامستەفا دایناوە، کەی من ناردوومە بۆ ئەوە، چۆن باوکت لەو ماوە کەمەدا توانی چاوی بەمەسعود بارزانی بکەوێت‌و قایلی بکات ئەگەر ئەوە پیلانی نێوان ڕەفیق‌و مەسعود بارزانی نیە؟! من حەمەی باقیم نارد ٢٢ ڕۆژ لەڕاژان مایەوە چاوی بەمەسعود بارزانی نەکەوت، من لەمە ناگەم. لەکۆتاییدا نامەیەکی دامێ لەگەڵ١٥٠ دیناردا، گوتی ئەمە وەڵامەکەی منە، کاتێك گەڕامەوە بۆ ڕاژان ٩ ڕۆژم پێ چووبوو، هەرکەسێکیانم دەبینی ساردی پێوە دیاربوو.

دوای ئەوەی بازیان بەنامەکەی مام جەلالەوە هاتەوە, چووم بۆ م.س، لەگەڵیاندا دانیشتمو نامەکەی مام جەلالیشم پێشکەشکردن بێ ئەوەی باسی ئەو بەسەرهاتانە بکەم کەبازیان بەدوورودرێژی بۆی گێڕامەوە، هەرهەموویان ناوەڕۆکی نامەکەی مام جەلالیان زۆر بەدڵ بوو بەڵام پێیان گوتم ئێمە کۆبوونەوەی لەسەر دەکەین‌و وەڵامت دەدینەوە. نامەیەکم بۆ بەرێز مام جلال نووسی تیایدا باسی ئەوەم کرد کەسەرکەوتوم لەئیشەکەمدا بەڵام تۆزێك بڕیارەکەیان دوادەکەوێت لەبەر ئەوەی لەسەری کۆدەبنەوە. هەمان نامەم بۆ کاك نەوشیروان‌و کاك ملازم عمریش نارد. وەڵامدانەوەی ئەم نامەیە لەلایەن پارتییەوە چوار مانگ‌و نیوی خایاندو لەو ماوەیەدا ئەم شتە سەرکییانە روویاندا:

١- داوام لەکاك مسعود کرد چەند ساڵێکە بەخزمەت جەنابی شێخ محمد خالید بارزانی نەگیشتووم حەز دەکەم سەردانێکی بکەم، ژمارەی تەلەفونەکەیم لێوەرگرت‌و قسەم لەگەڵ کرد, ئاگادارم کردەوە کاتێك گەیشتمە راژان هەواڵی بەرێزتانم پرسی گوتیان لەکەرەجە, انشاالله بەم زوانە دێمە خزمەتت ئەگەر لێرە برادەرانی پارتی (عدم تعرض)ێکم بۆ بکەن‌و بەرێم بکەن بۆلای جەنابتان.

دوای ئەوەی هەموو ئیشێکی گەشتەکەیان بۆ جێبەجێ کردم برادەرێکی پارتییان لەگەڵ ناردم پێکەوە چوینە تاران لەوێوە چوومە کەرج بۆ خزمەت شێخ محمد خالید بارزانی، کەچاوی پێم کەوت زۆر بەگەرمی پێشوازی لێکردم، بەدوورودرێژی باسی ئەو یادەوەرییانەمان کرد  کە لەساڵی ١٩٥٦ هەمانبووە، زۆر هەواڵی ماڵومنداڵەکانمی پرسی ئینجا ئەو رۆژەم یادخستەوە کەچوبوومە خزمەت باوکی شێخ احمد بارزانی بۆ ئەوەی دووبەرەکیی نێوان بارزانیو م.س. نەهێڵم‌و تێمگەیاند  کەئێستاش هەر بۆ هەمان مەبەست هاتومەتە خزمەتت‌و وا پێویست دەکات جەنابتان پشتگیرییەکی تەواوم بکەن تا هیچیتر خوێنی کورد بەدەستی کورد نەرژێت، هەموو ئەندامانی سەرکردایەتی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان سڵاوو رێزیان هەیە بۆ جەنابتان بەتایبەتی بەرێز مام جەلال‌و کاك نەوشیروان، ئەم هاتنەم بۆ لای جەنابتان بەئاگاداری ئەوانە بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی برایانە پشتگیری لەو رێکەوتنە بکەیت بەو ئومێدەی زۆر هەوڵبدەیت بۆ سەرکەوتنی ئەم پرۆسەیە.

شێخ محمدخالید فەرمووی: من بەهەموو جۆرێك پشتگیریت لێدەکەم بۆ ئەوەی ئەم کارە سەرکەوتوبێت، بەڵام دەبێت تۆ زۆر بەسەبربیت‌و وەکو جارەکەیتر نەکەیت کەناردمیتە لای شێخ احمدی باوکم بەهەڕەشەیەکی مەلامستەفا راتکردو وازت لەرێکەوتنەکە هێنا، ئەمجارەوا نەکەیت باشە، دەبوایە ئەو رۆژە بیرت لەوە بکردایەتەوە ئەگەر تۆ نێردراوی شێخ احمد بارزانی بیت چۆن مەلامستەفا دەتوانێت بتکوژێت. بەهەر حاڵ، شێخ ئەحمەد ساڵی ١٩٦٢ پێی فەرمویت (ئیشی کوردان پوچە)، بەڵام مرۆڤ دەبێت بەبەردەوامی بەدوای کاری خێردا بگەرێت‌و مادام تۆ هاتویت بۆ ئەم کارەو ئێمە تۆمان خۆش دەوێت ئەوە بەهەموو شێوەیەك پشتگیریت دەکەم. ئینجا پرسیاری لێکردم تا چ رادەیەك ئاگاداری هەواڵی عبیداللەو

لوقمانو سابیرو شێخ عوسمانو بارزانیەکان هەیت چونکە ئێمە هەموومان دەزانین کەنزیکترین هاوڕێی عبیداللە بوویت. گوتم: من کە لەساڵی ١٩٧٦دا دەستگیرکرامو لە١٩٧٩دا ئازادکرام, دوای ئازادکردنم بەماوەیەکی کەم چوومە دەرەوەی وڵاتو لەساڵی ١٩٨٢دا گەڕامەوە چومە ریزی پێشمەرگە لەناو یەکێتیدا، بەڵام پێش دەستگیرکردنم هەوڵێکی زۆرم لەگەڵ عبیداللەدا بۆ ئەوەی یاری بەئاگر نەکات، بەهەر حاڵ من دەگەڕێمەوە، کەئەمجارە هاتمەوە بەدوورودرێژی هەواڵی هەموویانت بۆ دەهێنم. گوتی: سڵاوو ڕێزم هەیە بۆ مام جەلالو کاك نەوشیروان، لەزمانی منەوە ئاگاداریان بکە کەزۆر بەلامەوە گرنگە هەواڵی بارزانیەکانو عبیداللەو لوقمانو شێخ عوسمانم بۆ بنێرنەوە. ئینجا فەرمووی نەوشیروان چۆن کەسێکە؟ لەوڵامدا بەدوورودرێژی باسی کاك نەوشیروانم بۆ کرد.

گەنجێك لەسوچێکی ژوورەکەدا دانیشتبوو زۆر سەرنجی راکێشام، چونکە ئێمە نزیکەی سێ سەعات گفتوگۆمان کرد ئەو بەهیچ شێوەیەك بەژداری نەکردین، وامدەزانی کەڕولاڵە، کەجەنابی شێخ محمد هەستی بەوە کرد من دەمەوێ بزانم ئەم کوڕە کێیە دەستپێشکەری کردو فەرمووی ئەوە کوڕی گەورەی ئدریسە، ناوی نەوچیرڤانە. گوتم: ئەمە لەئدریس ناکات چونکە ئەگەر بەپێنج وشە قسە لەگەڵ ئدریسدا بکەیت ئەو بە ١٢وشە بەشداریت دەکات، ئەوە بۆ سێ سەعات دەچێت یەك‌وشە لەدەمی نەهاتۆتە دەرەوە.

**تێبینی**

*١. ئەو باسانەی لەدەمی مام جەلالەوە بۆ شێخ محمدخالدم کردبوو هەمووی دروستکراوی خۆم بوو.*

*٢. کاك مسعود بۆچوونی هەڵەی هەبوو لەسەر هەندێك کەسایەتی ناو یەکێتی نیشتیمانی کوردستان، بەتایبەتی بەرامبەر کاك نەوشیروان، منیش هەوڵی ئەوەم دەدا بۆچوونەکەی بۆ راست بکەمەوە بۆیە پێم گوت: من پێش ئەوەی بێم بۆ ئێرە ١٣ ڕۆژ میوانی کاك نەوشیروان بووم، رۆژێکیان کاك نەوشیروان لێی پرسیم دیارنیت ؟ گوتم: ژورەکەی تۆم بەجێهێشتو ئێستا لای کاك حەمەتۆفیقم, لەوە ترساوم شتێکت بدزرێتو بڵێن رەفیق پشدەری ناردویەتی بۆ (مخابرات)ی رژێم، کاك نەوشیروان گوتی: بۆ تۆ میوانی منی یان میوانی حەمە تۆفیقی؟ ماوەی ئەم ١٣ ڕۆژە زۆربەی کاتمان بەیەکەوە دەبردەسەر، بۆیە کەسایەتی ئەم پیاوەم بەکەسایەتییەکی کوردپەروەرو خەمخۆری ئەم میللەتە هەڵسەنگاندو باوەڕم بەوە هەیە کەئەم پیاوە گوێ بۆ هەموو کەسێكو هەموو بۆچونێك دەگرێت ئەگەر لەگەڵ ئایدۆلۆجیای کۆمەڵەشدا نەگونجێت، بەمەرجێك لەبەرژەوەندیی گەلی کوردا بێت.*

*راستە دەرکردنی بڕیاری رێکەوتن لەسەر بۆچونی هەموو ئەندامانی مەکتەبی سیاسی دراوە، بەڵام بناغە دارشتن بۆ ئەو بڕیارەو هاتنی من لەخودی نەوشیرواندا دەبینمەوە، ئینجا بۆ کاك مەسعودم شیکردەوە کەنەوشیروانێك سکرتێری کۆمەڵە بێتو ئەندامی سەرکردایەتی یەکێتی بێتو بەئەندازەی تاڵە موویەك دڵی نەیەت لەمام جەلال دووربکەوێتەوە لەگەڵ ئەوەشدا من لەبارەی جیابونەوەی لەگەڵ مام جەلالدا زۆر*

گفتوگۆم لەگەڵدا کردبوو، زۆر ئاسایی بێت بەلاتانەوە کەهەرچی بڕیارێك لەیەکێتی نیشتیمانییەوە دەربچێت ئەو ١٠٠٪ جێبەجێی بکات.

٣. ئەوەی لای من زۆر زەحمەت بوو کاك فرانسۆ حریری بوو چونکە ئەو، بیروبۆچونی بۆ رووداوەکان لەگەڵ هەموو ئەندامانی مەکتەبی سیاسیو لیژنەی مەرکەزیدا جیاوازبوو، ئەم پیاوە کلیلی مێشکی مەسعودو ئیدریس بووو بەهەموو شێوەیەك جێی باوەڕیان بوو، ئەوان چییان پێ بگوتایە ئەو جێبەجێی دەکرد بەبێ ئەوەی گوێ بداتە ئەوەی کەئەو شتە راستە یان نا، بەهەمان شێوە وتەی ئەم لای کاك مەسعودو کاك ئیدریس گەڕانەوەی نەبوو، ئەگەر بەدەست ئەو بوایە حەزی دەکرد کەمام جەلال لەقیمەبدات ئینجا دوابەدوای ئەو هەموو یەکێتی، چونکە یەکێتی تاکە حزب بوو کەبەرامبەر ئیمپراتۆریەتی مەلامستەفا راوەستاوە، ئەم جۆرە زەلامانە زۆر بەزەحمەت بۆچونی خۆیان لەسەر رووداوەکان دەگۆڕن. کێشەی من هیچ کام لەئەندامانی مەکتەبی سیاسی نەبوو بەکاك مەسعودیشەوە، بەڵام تاکە کەسێك کەدەترسام ببێت بەکۆسپ لەرێگای کارەکەمدا کاك فرانسۆ بوو، هەر بۆیە ناچاریکردم کەسایەتی خۆم بگۆڕمو لەسەر کەسایەتی کاك فرانسۆ کۆپی بکەم بۆ ئەوەی بتوانم لەم پیاوە نزیك ببمەوە نەیەڵم ببێتە کۆسپ لەکارەکەمدا، بۆیە شێوازی وتەکانم لەگەڵ ئەم کابرایەدا گۆڕیو بۆم روونکردەوە کەمن خۆم بەدڵسۆزی خودی بنەماڵەی مەلامستەفا دەزانمو ئەو یادەوەرییانەم خستەوە یادی کە لەگەڵ سەرۆك مستەفا بەرزانیو هەموو بنەماڵەکەیاندا لەساڵی ١٩٥٦ـەوە هەمبووە، ئەوەبوو بەپشتیوانی یەزدان لەو پیلانەمدا کەکێشابووم بۆ نزیکبوونەوە لەفرانسۆ، سەرکەوتو بووم. چونکە ئەو هەرچییەکی بفەرموایە منیش هەمان وتەی ئەوم دووبارە دەکردەوە، بۆ نموونە: دوو رۆژنامەنوسی ئیتالی هاتبوون بۆ راژان، کاك فرانسۆ هات بۆلام گوتی وەرە چاوپێکەوتن لەگەڵ ئەم دوانەدا بکە، منی پێشکەش بەرۆژنامەنوسەکان کردو گوتی: ئەمە ناوی رەفیق پشدەریەو سەرۆکی وەفدی یەکێتی نیشتیمانی کوردستانەو هاتون بۆ رێکەوتن لەگەڵماندا، لەکۆتایی چاوپێکەوتنەکەمدا لەگەڵ رۆژنامەنووسەکاندا، یەکێکیان روویکردە کاك فرانسۆو گوتی ئەم پیاوە نوێنەری پارتی دیموکراتی کوردستانە نەوەك نوێنەری یەکێتی، من قسەکانی بڵاوناکەمەوە، ئەم رۆژنامەنوسە بۆیەوا تێگەیی بوو چونکە هەرچی پرسیارێکیان لێدەکردم بەدڵی فرانسۆ وڵامم دەدایەوە، ئینجا لەدڵی خۆمدا گوتم الحمدلله توانیم وا لەفرانسۆ بکەم کەدژ بەرێکەوتنەکە هەڵوێست وەرنەگرێت.

٤. لەماوەی ئەم چوار مانگو نیوەدا هەموو هەوڵێکم بۆ ئەوەبوو کەئەندامانی مەکتەبی سیاسیو لیژنەی مەرکەزی لەو رێکەوتنە سارد نەبنەوە، ئەوەبوو بەچاوی خۆم بەرهەمی ماندوبونەکەمم بینیو ئەو پیاوانەوایان لێهات لەمن بەپەرۆشتر بن بۆ رێکەوتن، بەتایبەتی بەرێزان مامۆستا علی عبداللە، د. رۆژ، فازل میران،وشیار زێباری، یونس رۆژبەیانی، مامۆستا مەلاعبدالقادرو هەموو کادرانی پارتی پاڵپشتی ئەم رێکەوتنەیان دەکرد، زەلامێکم نەبینی کەنارازی بێت بەرێکەوتن. لێرەدا پرسیارێك بەرەورومان دەبێتەوە

*ئەویش ئەوەیە باشە ئەگەر بەو شێوەیە هەر هەموو پارتی ئەو رێکەوتنەیان پێخۆشە، بۆچی من چوار مانگ چاوەڕوانیوڵام بووم؟ کەچومە بنجوبنەوانی مەسەلەکە بۆم دەرکەوت کەپارتی بریتییە لەدوو کەس (یەکەم ئدریس دووەم مەسعود)، لەیەکەم رۆژەوە کەمن لەراژان بووم کاك ئدریس لەدەوەری وڵات بوو، کاك مەسعودیش نەیدەتوانی بەبێ رەزامەندی کاك ئدریس بڕیار بدات. رای دووەم ئەوەیە کەدەبێ وڵاتانی دەرەوە رەزامەندی دەربڕن لەسەر ئەم رێکەوتنە، ئەوەی لەمن ئاشکرابوو ئەو دەوڵەتە ئێران بوو، بەڵام لەپشت ئێرانیشەوە دەوڵەتێکی تر هەبوو کەتەنها ئدریسو مەسعود دەیانزانی. لەو ماوەیەدا چەند کەسێك بەمنیان گوت چاوەڕوانی چی دەکەیت، بۆ نارۆیتەوە، لەوانە کاك خورشید شێرە بوو، منیش وڵامم دەدانەوە من بەهیچ شێوەیەك ئێرە بەجێ ناهێڵم، ئەگەر رێکیشنەکەون من پارتیمو ناگەرێمەوە، (رجل مخابراتم) زۆر چاك دەمزانی کەعیراقو ئێرانو تورکیا بەهیچ جۆرێك پێیان خۆش نەبوو ئەم کارە سەرکەوێت، هەر بۆیە پەیمانم بەخوا دابوو هەتا ئەم کارە سەرنەخەم نەگەرێمەوە بۆ عێراق.*

*٥. جەنابی کاك ئدریس گەڕایەوە، من داوای چاوپێکەوتنیم نەکرد، چەند کەسێك لەخۆیان (پاراستن) دەهاتن بۆ لام دەیانگوت: ئەوە کاك ئدریس هاتۆتەوە بۆ داوا ناکەیت چاوت پێ بکەوێت؟ منیش لەوەڵامدا دەمگوت ئێستا سەری قاڵە، کەدەستی بەتاڵ بوو خۆم دەچم داوای دەکەمو چاوم پێی دەکەوێت. رۆژێکیان کاك فرانسۆ حەریری هاتە لام, لەو کاتەدا موو بەنێوانماندا نەدەچوو، گوتی: کاك رەفیق رەحمەت لەدایكو باوکت... لەو رۆژەوە کاك ئدریس هاتۆتەوە چاوەڕوانی ئەوەبوو کەتۆ داوای چاوپێکەوتنی بکەیت بەڵام ناچارتکرد من بنێرێت بۆ لای تۆو ئێستا خۆی دەیەوێت چاوی پێت بکەوێت؟*

بەشێوەیەك لەلایەن کاك ئدریس بارزانییەوە پێشوازیکرام دەتگوت من مامی ئەومو یەکێکم لەبنەماڵەی بارزانی، دوای باسکردنی چەند یادەوەرییەکی نێوانمان یەکسەر دەستمانکرد بەگفتوگۆ کردن لەبارەی رێکەوتنەکەوە(چونکە کەهاتبووەوە هەموو شتێکیان لەبارەی منەوە بۆ باسکردبوو)، پێی گوتم: ئەو وتانەی بۆیان تۆمار کردبووی دوو جار گوێم لێگرت، حەز دەکەم کەتێمبگەیەنیت لەماهیەتی جەلال، رۆژێك بوو کە لەهەندەران بوو (پاراستن) بوو، پەیوەندی بەخودی خۆمەوە هەبوو، نازانم چیوای لێکرد کەئاوا بەرامبەرمان بگۆڕێتو یەکێتی دروست بکاتو توشی دووبەرکیمان بکات، جەلال کات بەدڵی خۆی هەڵدەبژێرێت، دەیەوێت کەگوتی شەڕ، شەڕ، کەویستیشی ئاشتی هەڵبژێرێت بەدوای رەفیق پشدەریدا دەگەڕێتو رووبەڕووی ئێمەی دەکاتەوە. لەکۆتایی قسەکانیدا گوتی: انشاالله سەرکەوتوو دەبیت لەم کارەدا.

دوای ئەوەی بەتەواوەتی دڵنیابووم لەوەی کاك ئدریس زۆر پێخۆشحاڵە بەم رێکەوتنە, روخسەتم لێ خواستو هاتمە دەرەوە. دوای دەرچوونم کاك ئدریس باسی من دەکاتو دەڵێت ئەگەر ئێمە دۆستێکمان هەبێت رەفیق پشدەرییە، تۆ بڵێی رۆژێك ئیشێکی تێم نەکەوێت بۆ ئەوەی پاداشتی ئەو چاکانەی بدەمەوە (ئەم هەواڵە، پاسەوانێکی بۆی گێڕامەوە لەو کاتەدا لەوێ بوو، بۆیە ناوی نابەم چونکە ماوەو ئێستا لەهەولێر

دەژی).

دوای ئەوەی کاك ئدریس لەسەر رێکەوتنەکە رازیبوو، وەلامی نامەکەیان دامەوەو لەرێگەی مامۆستا علی عبداللهوە پێی گوتم ئەو نامەیەی سکرتێری ی.ن.ك. ناردبووی بۆ رێکەوتن, ئەوە ولامەکەیەتی لەلایەن پارتی دیموکراتی کوردستانەوە، ئەوپەڕی سلاوو رێزمان هەیە بۆ گشت برایانی یەکێتی هەروەها سلاوی کاك مەسعودیشیان پێ بگەیەنە، پێی گوتم کاك رەفیق ئیتر چیت دەوێ، ئەوەی چوار مانگو نیوە چاوەڕوانی دەکەیت ئەوە ولامەکەیەتی انشاالله بەسەلامەتی دەچیتو بەسەلامەتی دەگەڕێیتەوە، بەلام پێش ئەوەی سبەینێ دەربچیت سەردانێکم بکە بۆ ئەوەی رێگایەکت بۆ دابنێم چۆن بگەڕێیتەوەو توشی کێشە نەبیت لەرێگا.

عادەتی کاك علی وابوو کەئێوارە خواحافیزی لێ بکردیتایە دەبوایە بۆ بەیانی چاوی پێت بکەوتایەتەوە بۆ ئەوەی کەبەجێتهێشت بەهیچ شێوەیەك گلەییت نەبێت، ئەم کارە لەهەموو کارێکی ژیرانەتربوو، ئەم پیاوە بەڕاستی شایەنی باسکردنە لەهەموو روویەکەوە، بەلام بەداخەوە ئیمبراتۆریەتەکەی مەلامستەفا ئامۆژگارییەکانی ئەم پیاوە ژیرە لەگوێ ناکەن.

**تێبینی**

***ئەو ماوەیە کە لەرەزاییەچاوم بەبرای بەرێزو نیشتیمانپەروەر کاك قادر عزیز دەکەوت، خۆمم دەشاردەوە چونکە مام جەلال ئاگاداری کردبوومەوە بێجگە لەپارتی چاوم بەهیچ گروپێکی تری سیاسی نەکەوێت. هەروەها کاك عزیز محمد سکرتێری حزبی شیوعی لەو ماوەیەی لەوێ بووم هاتبوو بۆ سەردانی پارتی داوای لەکاك علی عبدالله کردبوو کەپچم چاوم پێی بکەوێت بەلام من لەترسی مام جەلال ئەو رۆژە سەرانسەر خۆمم لەم پیاوە بەرێزە ونکرد، خۆم زۆر خۆشحالّ دەبم کەچاوم پێی دەکەوێت چ لەبیابان بێت یا لەشاخ یا لەناو ئاگر.***

بەیانی دوای ئەوەی چوومەوە خزمەتی کاك علی عبدالله خواحافیزیمان لەیەکتر کردو لەگەلّ ئەندامێکی لیژنەی مەرکەزیدا بەرێیکردم. ئەو رۆژە، سەرلەئێوارە گەیشتینە گوندی ئالّوەتان، لەبارەگای پ.د.ك. لاماندا، ئینجا روخسەتم خواست گوتم من دەچم سەردانێکی مالّی سەلیم ئاغای بایز دەکەم کەدۆستێکی دێرینی باوکم بووە. کاتێك چوومە ئەوێو گوتم من کوڕی حاجی مامەی حاجی صادقم زۆر بەگەرمی پێشوازییان نەکردم چونکە لەرێگای پارتییەوە چووبومە لایانو گومانی ئەوەیان لێدەکردم کەسەر بەپارتی بم (چونکە کۆماری ئیسلامی ئێران بەیارمەتی پارتی شەڕیان لەگەلّ دیموکراتی ئێران کردبوو، پێشمەرگەیەکی زۆریان لێکوشتبوونو لەزۆربەی ناوچەکانی ئێران رایانمالّیبوون).

نیوەڕۆی رۆژی دوایی گەیشتمە گوندی شێنێو چومە بارەگای یەکێتی لەزەلێ. بەبروسکە ئاگاداری مام جەلالم کرد کە لەئیشەکەمدا سەرکەوتوومو داواکارم رێگایەکم بۆ دانێی کەپیایدا بگەڕێمەوە لاتان. دوای دوو

رۆژ وەڵامی بروسکەکەی دایەوە گوتی: لەڕێگای قەڵادزێوە مەگەڕێرەوە مەترسی هەیە، بچۆ چاوت بە (فلان) کەس بکەوێت لەفلان گوند ئەو دەتوانێت رێگای گەڕانەوەت بۆ ئاسان بکات، کەلێم کۆڵییەوە ئەم کەسایەتییە سەر بەکۆماری ئیسلامی بوو، لەهەمانکاتدا ئیشوکاری یەکێتیشی بەڕێوە دەبرد لەو ناوچەیە. گەیشتمە لای، خۆمم پێناساند،(عدم تعرض)ێکی بۆ کردمو تا بارەگای مام جەلال لەگەڵمدا هات. ماوەیە نێوان راژانو بارەگای مام جەلالم بەپێنج رۆژ بڕی. گەیشتمە پرسگەکەی مام جەلال، پێیان گوتم دەیەوێت نامەکە ببینێت، ئینجا دوای نیو سەعات گوتیان مام جەلال داوات دەکات، کاتێك چوومە ژوورەوەو چاوی پێم کەوت بەدەنگی بەرز فەرموی(لیس للانسان الا ماسعی) لەوەڵامدا گوتم: (وان سعیە سوف یری)، ئینجا زۆر بەگەرمی بەخێرهاتنەوەی کردم، گوتی من تۆم نەناردووە گوڵ لەسەر مەزاری مەلامستەفا دانێیت. گوتم: من بۆیە چووم رێکتان بخەمو هەرچی لەبەرژەوەندی میللەتی کوردبێت دەیکەم. گوتی: دەنگوباسی ئەوێ چییە بۆم بگێڕەرەوە. گوتم: من نەچووم قسەی ئێوە بەرم بۆ پارتیو هی ئەوانیش بێنم بۆ ئێوە. گوتی: لەناوخۆیاندا وەزعیان چۆنە؟ گوتم: لەدڵسۆزیو تەبایىو برایەتی زیاتر هیچی ترم نەدیو هەریەکەیان بەگوێرەی پلەوپایەی خۆیان بەکارو فەرمانەکانیان بەرێکوپێکی هەڵدەسن، رێکخراوێکی باشیان هەیە کاك مەسعود سەرۆکایەتی دەکاتو کاك علی عبدالله سکرتێرەو..هتد. گوتی: مادام تۆ بۆ منی باس ناکەیت با من بۆ تۆی باس بکەم ئەو پلانە چۆن دابەزیوەتە خوارەوە. ئدریس لێپرسراوی یەکەم، مەسعود لێپرسراوی دووەمەو بەم شێوەیە، باشە هەرگیز بووە نامەیەك بنێردرێتو دوای چوارمانگو نیو وەڵامەکەی وەربگیرێتەوە؟ گوتم: بۆ ئەو ئیشە ئەوەندە ئاسانە کە بەیەك دوو هەفتە وەڵام بدرێتەوە؟ مام جەلال نامەکەی دایەوە دەستمو گوتی: برۆ کاك نەوشیروان ببینەو سبەینێ نیوەڕۆ وەرەوە لای من نانی نیوەڕۆ بخۆ.

**تێبینی**

*هەر لەوماوەیەدا د. رۆژیش هەمان پرسیاری لێکردمو گوتی: هەواڵی ئەولا چییە؟ منیش گوتم من هاتووم رێکتان بخەم نەهاتووم قسە بێنمو قسەبەرم.*

مام جەلال بەسەیارەیەك ناردمی بۆلای کاك نەوشیروان کەبارەگاکەی لەهەڵەدن بوو. کاك نەوشیروان زۆر بەگەرمی بەخێرهاتنەوەی کردم، نامەکەم تەسلیم کرد، دوای خوێندنەوەی فەرمووی ئەمە شتێکی زۆر باشەو خۆشحاڵم کەسەرکەوتوو بویت لەم کارەدا. ئەو شەوە کە لەلای مامەوە بەدوورودرێژی باسی هەڵوێستی ئەندامانی پارتیم بۆ کردو بۆم ڕوونکردەوە ئەوان زۆر شادمانن بەم رێکەوتنەو هیچ گرفتێك بۆ ئەنجامدانی نەهاتۆتە رێگام. کەرۆژ بووەوە هەتا درەنگانێك هەر بەردەوام بوین لەوتوێژ. گەڕامەوە لای مام جەلال، زۆر درەنگ بوو، مام جەلال نائومێد بوبوو لەگەڕانەوەم، کەچاوی پێم کەوت زۆر گرژبوو لەوەی دواکەوتبووم، لەبەر ئەوەی من نەوسنمو ئەویش حەز لەخواردنی خۆش دەکات دوو بەدوو بەتەنها دانیشتین خواردنێکی زۆر

خۆشی ئامادە کردبوو پێکەوە خواردمانو هەروەکو کاك فازل میرانی دەڵێت: (کەس نییە وەکو مام جەلال بزانێت سفرە بڕازێنێتەوە)، لەکاتی نانخواردنەکەدا پێم گوت: شێخ محمدخالدو کاك مسعود هەریەکە بەتەنها داوایان لێکردم کە بەدووروردرێژی لەهەواڵی عبیداللهو لوقمانو سابیرو شێخ عوسمانو بارزانیەکانیتر کەدیار نین ئاگاداریان بکەیتەوە، چی دەزانیت بەهۆی منەوە پێیان رابگەیەنیت هەروەها داوای هەواڵی ئەو بارزانییانەیان دەپرسی کە لەقوشتەپەدان. مام جەلال فەرمووی: چاوت بەکاك شوکەتی حاجی مشیر بکەوێت ئەو هەواڵی ئەوان دەزانێت، هەروەها فەرموی: جارێکیان هەواڵی (عبیدالله)م لەعزت دوری پرسی، گوتی: (الله یرحمه) دوای پارە دەکەوت.

مام جەلالم بەجێهێشتو دوای چەند رۆژێك چوومە سەرگەڵو بۆ لای کاك شەوکەتی حاجی موشیر کەئەو کاتە لێپرسراوی کاروباری پێشمەرگە بوو لەهەولێر. بەدووروردرێژی باسی ئەو بارزانییانەی بۆ کردمو فەرمووی: لەمانگی ٣ی ساڵی ١٩٨٤دا لەگوندێکی نزیك هەولێر رۆژێکیان حەوت ئافرەت هاتنە لام پرسیاریان لێکردم گوتیان تۆ ناوت چیە؟ منیش گوتم ناوم شەوکەتە، سێ جار لەسەر یەك ئەو پرسیارەیان لێ دووبارە کردمەوە. ئینجا گوتیان: لەچ هۆزێکی؟ گوتم: لەهۆزی جافم، ئەمجارەش سێ جار لێیان دووبارە کردمەوە. گوتیان: تۆ چیت؟ گوتم: پێشمەرگەم. گوتیان: پێشمەرگەی کێیت؟ گوتم: پێشمەرگەی کوردستانو هی یەکێتی. گوتیان: ئامانجو بیروباوەڕتان چیە؟ گوتم: کوردستان رزگار دەکەین. گوتیان: وەکو بیستومانە ئێوە لەگفتوگۆدان لەگەڵ رژێم، باشە تۆ لەوەڵامەکانت دڵنیایت؟ گوتم ئەی دایە بۆ درۆت لەگەڵ بکەم. گوتیان پێش ئەوەی کوردستان رزگار بکەن وەرن ئێمە رزگار بکەن، پیاومان لەگەڵدا نەماوەو ئەوەی نێرینە بێت لە١٠ ساڵ بەرەو خوارن لەگەڵماندا، ئایا دەزانی ئێمە چۆن پارێزگاری لەخۆمان دەکەین؟ ئەم حەوتەمان کەوەستاوین هەریەکەمان لایتێك دەگرین بەدەستمانەوەو لەدەوروبەری خێزانەکانمان ئێشك دەگرین بۆ ئەوەی ئەگەر شەو جاشی نامەرد بەسەرماندا بدەن بیکەین بەلایت لێدانو هاوارکردن بۆ ئەوەی نەتوانن کچەکانمان بەرنو کاری نابەجێیان لەگەڵدا بکەن، بەرۆژیش چەند ئۆتۆمبیلێکیان بەناوماندا هاتوچۆ دەکەن, چاویان بەهەر کچێکی ئێمە بکەوێت یەکسەر پەلاماری دەدەنو دەیفڕێننو دوای ٦-٧ رۆژ بۆمان دەهێننەوە, بەم شێوەیە بڕوات کچمان تیا نامێنێت.

کاك شەوکەت فەرمووی: لەو کاتەدا کەئەم ئافرەتانە ئەم رووداوانەیان بۆ دەگێڕامەوە کاك سابیر رەسولو سەفینی مەلا قەرەم لەلا دانیشتبوو، کەگوێیان لەقسەی ئەم ژنەبوو کە بەناوی هەموویانەوە قسەی دەکرد, زۆر گرژبوون, بڕیارماندا بەهەرسێکمان چارەسەرێك بۆ ئەم خەڵکە بدۆزینەوەو نەیەڵین ئەم کارە دووبارە بێتەوە، دەستبەجێ بەبروسکە مام جەلالمان ئاگادارکردەوە، لەوەڵامدا فەرمووی: (دەستبەکاربن بەرامبەر ئەو دیاردەیەو گوێ مەدەنە ئەو گفتوگۆیەی لەگەل رژێمدا هەمانە، چونکە ناموسی کورد بەلای ئێمەوە پیرۆزترە لەو گفتوگۆیەو هیچ باکی ئەوەم نیە لەگەل حکومەتدا لەسەر ئەمە تێکی بدەمەوە)، ئینجا زۆر

بەڕێزەوە خواحافیزیم لەئافرەتەکان کردو پێم گوتن بڕۆنەوە، ئێمە لەم ساتەوە بەهەموو شێوەیەك بەبەرگری لەئێوە دەکەین.

دوای ئەوە هەرسێکمان لەناوخۆماندا کۆبوونەوەمان کردو بڕیاری یەکەم هەنگاوماندا کەچی بکەین. دەستبەجێ چوومە قوشتەپەو رووبکردە ئامر مەفرەزەکەی سوپا کەلێپرسراوی پارێزگاریکردن بوو لەبارزانییەکان، پێم گوت ئێوە لێرەن بەو ناوەوە کەمەترسیتان هەیە لەپێشمەرگە, بەڵام ئێمە لەگفتوگۆداین لەبەر ئەوە پێویست ناکات لێرە بن, خۆمان پارێزگاری ئەم ناوچەیە دەکەین. هەرچەندە ئەفسەرەکە گوتی ئێمە بەفەرمان لێرەینو ناڕۆین، بەڵام من زۆرم بۆ هێنان گوتم: بڕۆنو بڵێن دەریانکردین. دوای قسەکەی من کەزانییان ئێمە زۆر گرژین، ئەو جێگایەیان بەجێهێشت. ئینجا بەسەرپەرشتی کاك سابیر رەسول, دوو کەرتی پێشمەرگەمان بۆ پارێزگاری لەوێ دانا، کەلەو مەسەلەیەمان کۆڵییەوە سەیرمانکرد جاشەکانی سید قەهارو شێمەی هاروون شانبەشانی ئەمنو ئیستیخبارت بەم کارە چەپەڵە هەڵدەسان. ئینجا بۆسەمان بۆ ئەو دوو بەرازیلییە سپیە دەرکرد کەدەهاتنە ئەو ناوە, کچی جوانی بارزانییەکانیان دەفڕاندو دەیانبردن بۆ ئەمنو ئیستیخبارتو لێپرسراوانی بەعسو دوای چەند رۆژێك بەکوژراوی یان بەئەتککراوی لەدەوروپشتی قوشتەپە فڕێیان دەدان، دوای ماوەیەك بەردەستمان کەوتنو ئەو دوو کەسەی بەم کارە هەڵدەسان لەناومان بردنو ئۆتۆمبیلەکانمان دایەوە بەرژێم گوتمان ئەو سەیارانەمان دۆزیوەتەوە، ئێمە بەئاشکرا لایەنگری بارزانییەکانمان دەکرد بەبێ ئەوەی گوێ بدەینە ئەو ناکۆکییەی نێوانمان چونکە ناموسی کورد لەسەرو ناکۆکیی حزبی بوو لەلای ئێمە، بەڵام جاشەکان ئەوەیان نەدەزانی، ئەوەبوو شەڕی قۆریتان لەنێوان ئێمەو جاشەکاندا لەسەر ئەم مەسەلەیە روویدا، لەئەنجامدا ٧ جاش کوژرانو دوو پێشمەرگە زامداربوون، پاش ماوەیەك ئەو خوشکە بارزانییە بەتەمەنەی سەرپەرشتی کێشەکەی دەکرد هاتەوە بۆ لام گوتی: زۆر سوپاستان دەکەین لەسەر ئەو هەڵوێستە مەردانەتان، بەڵام هێشتا کێشەیەکمان ماوە، ئەویش ئەوەیە ئەو کەسانەی لەلایەن رژێمەوە بۆ سەرپەرشتیکردنی ترومپای ئاوەکە دیاریکراون زۆر ئازارو ئەشکەنجەمان دەدەن. منیش یەکێکم نارد لەدوورەوە چاودێری ترومپاکە بکات، کاتێك گەڕایەوە گوتی: ئەو کەسەی لەسەر ترومپاکەیە کام کچەی جوانە ئاوی دەداتێو قسەی نابەجێی لەگەڵ دەکاتو کاری نابەجێیان بەرامبەر دەکاتو هەوڵدەدات بەزۆر شت هەڵیانخەڵەتێنێ. ئینجا ئەوانیشمان دوورخستەوەو خۆمان ئاومان دابەش دەکرد. شەوێکیان مەفرەزەیەکی جاشەکان بەدزییەوە هاتبوون ترومپاکەیان شکاندبوو، ئێمە هەموو ئەو کارە نابەجێیانەمان بەمام جەلال راگەیاند، پێمان گوت پێویستییەکی زۆریشیان بەیارمەتی هەیە، ئەوەبوو مام جەلال سەد هەزار دیناری بۆ خەرجکردین ترۆمپایەکی باشمان بە هەشت هەزار دینار کڕیو باقی پارەکەشمان بەسەر بارزانییەکاندا دابەشکرد.

کاك شەوکەت فەرمووی: ئەوەی سەرنجی راکێشام ئەوەبوو کابرایەك هاتەلامان ناوی مام صالح بارزانی

بوو گوتی: هاتووم سوپاسی ئێوە بکەمو ئەوپەڕی ڕێزو سڵاوم هەیە بۆ مام جەلال، بەناوی هەموو ئەو پیاوانەوە کەدورخراونەتەوە لەقوشتەپە, من بەتەنها لێرە ماومەتەوە، بۆ ئەوەی نەکەومە بەردەستی ڕژێم چاڵێکم لەژوورەکەمدا هەڵکەندووە بەقوڵایی دوو مەتر, ماوەیەکی زۆرە خواردنو نوستنم هەر لەو چاڵەدایە، کەزانیشم دنیا خامۆشەو دەستودایرەکەی ڕژێم لەو ناوە نەماوە، هاتمە دەرەوە، ئێستاش من بچوکی ئێوەمو هەرچی فەرمانێکتان هەیە لەخزمەتتاندام. پێم گوت نامەوێت ببیتە پێشمەرگە لەلای من، بەڵام لەبەر ئەوەی دانیشتوانی قوشتەپە هەموویان بارزانین، پێم باشە ببیتە لێپرسراوی ئەو دوو کەرتەی لەو ناوە بۆ پاراستنی ئێوە دامانناوە. لەخۆشیدا دەستیکرد بەگریان.

لەگەڕانەوەمدا دەقی قسەی کاك شەوکەتم کرد بەراپۆرتێكو دام بەکاك مەسعود، خۆشم چووم بۆ کەرەج بەئەمانەتەوە قسەکانی مام جەلالو کاك شەوکەتم بۆ شێخ محەمەد خالید گێڕایەوە. ئەوەی ڕاستی بێت هەواڵی بارزانییەکان ڕووداوێکی ئەوەندە شەرمەزاری بوو نەمدەزانی چۆن بیکەم بەراپۆرتو بیخەمە بەردەستیان یان بەقسە پێیان بڵێم.

ئەوەی لەو ناوەندەدا تێبینیم کرد ئەوەبوو کەهەتا کاك نەوشیروان نەیفەرموو ڕازیم لەسەر ئەم ڕێکەوتنە مام جەلال بەهیچ شێوەیەك ڕەزامەندی خۆی بۆ دەرنەبڕیم, هەروەها هەموو ئەو هەڵسوکەوتانەی بەبێ پرسی ئەوانو لەخۆمەوە ئەنجاممدابوو مام جەلال زۆر پێی دڵگران بوو، کاك نەوشیروان بەپێچەوانەی ئەوەوە دەستخۆشی لێکردم.

دوای حەوت ڕۆژ مام جەلال وەڵامی نامەکەی مەکتەبی سیاسی پارتی، بەنامەیەك دایەوەو بردمەوە بۆ ڕاژان، ناوەڕۆکی نامەکە زۆر دڵخۆشکەربوو، بوو بەهاندەرێك بۆ من کەهەست بەماندوویەتی نەکەم.

دوای ئەوەی سەرکەوتوو بووم لەوەی کەهەردولا بەرێکەوتن قایل بکەم، کارەکەی من چووە قۆناغێکی تازەوە ئەویش ئەوەبوو هەوڵبدەم خاڵی ناکۆکی نێوانیان کەم بکەمەوە. دوای پێنج جار هاتوچۆ لەنێوانیاندا توانیم ئەم قۆناغەشیان بەسەرکەوتویی ببڕمو لەجاری پێنجەممدا کە لەڕاژان بووم، نیوەڕۆ مامۆستا مەلاعبدالقادرو کاك فەرانسۆم بۆ نانی نیوەڕۆ دەعوەتکرد. پێش ئەوەی ئەو پیاوانە بێن بۆ لام لەسەعات ١٠ی سەر لەبەیانی فڕۆکەی ڕژێمی عێراق گوندی زێوێیان بۆردومان کرد کەگوندێکی ئێرانیەو ١٠ کم لەڕاژانەوە دوورە، بەناوچەی تەرگەوەڕو مەرگەوەڕ ناسراوەو سەر بەرەزائیەیەو ٩٠٪ی دانیشتوانی ئەم دێیە ئاوارەی پارتی بوونو زۆربەشیان بارزانی بوون، لەئەنجامدا ٤٠٠ کەس کوژران کەبەشی زۆری کوژراوەکان منداڵ بوو، چونکە بۆردومانەکە قوتابخانەیەکی گرتەوە، ڕووداوێکی زۆر دڵتەزێنو ناخۆشبوو، بەبۆچوونی من لەبۆردومانی قەڵادزی زیاتربوو، بەهۆی ئەم کارەساتەوە، ٤٢ ڕۆژ چاوم بەکاك مەسعود نەکەوت چونکە بەیانی هەڵدەستا دەچوو بۆ ناو کەسوکاری شەهیدان هەتا بانگی مەغریب، لەگەڵ ئەوەشدا پارتی زۆر خراپەی کوردی ئێرانو دیموکراتی ئێرانی کردبوو بەڵام هێشتا ئەو خەڵکە گوێیان نەدەدایە ئەو

شته، خەڵکی ئەو دەوروبەرە بەلۆریو تراکتۆر خواردنیان بۆ لێقەوماوانی ئەو دێیە دەهێناو لەبەر ئەوەی کوژراوەکان کەسیان نەدەناسرانەوە گۆڕی بەکۆمەڵیان بۆ هەڵکەندن, من بەناوی یەکێتییەوە چوومە ماڵی زۆربەی ئەو شەهیدانەو سەرخۆشیم لێکردنو لەمەراسیمی بەخاکسپاردنی تەرمەکاندا بەشداریمکرد.

لە دووری یەك کیلۆمەتر لەگوندی زێوێ سەنگەرێکی ئێرانی لێبوو چەند دۆشکەیەکی بەسەرەوەبوو لەگەڵ چەکی دژی فڕۆکە, ئێرانییەکان وایان بڵاوکردبووەوە ئەم سەنگەرە بۆ پارێزگاریکرنی بارزانییەکان دانراوە، سەعات ١٠ی سەر لەبەیانی کەفڕۆکەکانی ڕژێم هاتن گوندی زێوێیان بۆردومان کرد یەك دۆشکە لەم دۆشکانە گوللەیەکی بەرەوڕووی فڕۆکەکان نەتەقاند، پێدەچوو بۆ پارێزگاری دانەنرابێت بەڵکو بۆ خەڵکی ئەو دێیە دانرابێ نەوەك ڕۆژێك لەڕۆژان ئەم بارزانییانە بەرامبەر دەسەڵاتی کۆماری ئیسلامی راوەستن، خەڵکێکی زۆر لەوانەی لێیان قەومابوو بەکۆمەڵ دەهاتن بۆ م.س پارتی بۆ داوای یارمەتی، کەخەڵك دەهات وەڵامیان دەدایەوە دەیانگوت چاوەڕوان بکەن لەلقی یەکەوە یارمەتی دێت ئەوسا دەتاندەینێ. بۆ نمونە علی شەعبان هات بۆ لای کاك مەسعودو کاك ئیدریس، گوێم لەقسەکانیان بوو کاك عەلی دەیگوت خراپ لێمان قەوماوە ئێمە نزیکەی ٥٠ ماڵین بەڵام ئێوە لێمان ناپرسنەوە، کەچی نوێنەرانی ئیسلامی هاتنە لامان گوتیان لەمەسعودو ئیدریس جیاببنەوە لەشوێنێکی تر داتاندەنێینو هەموو پێویستییەکانتان جێبەجێ دەکەینو هەر ماڵەی ٥٠٠ دینارتان دەدەینێ، بەڵام ئەگەر ئێمە لەبرساندا بمرین یارمەتی لەکۆماری ئیسلامی وەرناگرین, ئێمە خۆمان بەکوڕی بارزانی دادەنێین, ئێمە بۆیە ڕوومانکردۆتە ئێوە شتێکمان بۆ بکەن، وەڵامیان دانەوە لەلقی یەکەوە یارمەتیتان بۆ دێتو بەسەرتاندا دابەشی دەکەین. لەکاتێکدا ڕوونو ئاشکرایە کەدوای هەرەسەکە, هەرچی سەروەتوسامانی پارتی هەیە لەخزمەت بنەماڵەی بارزانیدا بوو، دەستیان بەسەرداگرت، بەڵام هەرچی سەروەتو سامانی بنەماڵەی بارزانی هەیە لەخزمەت بانقەکانی ئەوروپادا بوو.

### حاجی مستەفەوی

جاری شەشەم کەگەڕامەوە بۆ ڕاژان کاك ئیدریس فەرمووی دووبەیانی دەچیت چاوت بەحاجی مستەفەوی[(٣١)] دەکەوێت کەلێپرسراوی ئازەربایجانی غەربیە، ئێمەو هەموو گروپە سیاسییەکان پەیوەندی بەو کابرایەوە دەکەینو تۆ لەو چاوپێکەوتنەدا دەبێ بیگەیەنیتە ئەو باوەڕەی کەرێکەوتنی نێوان یەکێتیو پارتی هیچ زیانێکی بۆ کۆماری ئیسلامی نابێتو بگرە سوودی دەبێت. گوتم ئایا ئەو کابرایە زانیاری هەیە کەمن لەدەزگاکانی ئاسایشو نوسینگەی صدامدا کارم کردووە؟ گوتی: زۆر چاکت دەناسێت، ئاگادارمان

---

(٣١) کاتێك لەنێوان کۆماری ئیسلامیو کوردستانی ڕۆژهەڵات لەشاری نەمسا کۆبونەوەبوو, نوێنەری کۆماری ئیسلامی حاجی مستەفەوی بوو, نوێنەری کوردستانی ڕۆژهەڵات د. قاسملو سکرتێری حزبی دیموکراتی ئێران بوو. دوای چەند دانیشتنێك وا خۆیان پیشاندەدا کەپرۆسەی ڕێکەوتنەکە زۆر بەچاکی بەڕێوەدەچێت بەڵام لەناکاو بەو پیلانەی دایانڕشتبوو بەسەرپەرشتی حاجی مستەفەوی ئەو پیاوە مەزنە ناودارەی کوردیان تیرۆرکرد، لەهیچ زەمانێکدا گلەیی لەکورد نەکراوە، هەرچەندە کوڕانی مەلامستەفا زۆر چاك دەیانزانی د.قاسملو بەدەستی مستەفەوی تیرۆرکراوە زۆر بەئاشکرا پێشوازییەکی گەرموگەورەی لێکرا لەهاوینەهەواری صلاح الدین، هەروەکو چۆن کاك عبدالله ئوج ئالان دەستگیرکرا بۆ ڕۆژی دوایی کردیان بەپشوی ڕەسمی لەهەرێمی پارتیدا.

کردۆتەوەو پێمان گوتوە (رفیق مانای ئیدریسو رەفیق مانای مەسعود)، گوتم: دەتانەوێ چۆن لەگەڵیدا بدوێمو چی لەگەڵیدا باس بکەم؟ گوتیان: عەیب نیيە ئێمە تۆ فێری چۆنیەتی وتووێژبکەین. دوای دوو رۆژ منیان بردە بارەگای ئیتلاعاتی ئازەربایجانی غەربیو لەماوەی ئەو دوو رۆژەدا زۆر بەچاکی لەمێشکی خۆمدا دامڕشتبوو چی بەو کابرایە بڵێم. کەچوومە ژوورەوە منیان بەتەنها لەودیوی مێزێکەوە داناو خۆشیان بەرامبەرم لەدیوەکەی تر. چوار کەس بوون، دوای سڵاوو خۆ پێ ناساندن گوتم: من فارسی نازانم، دەمەوێت ئەو وەرگێڕەی بۆم دێنن کورد بێت یا عەرەب. راستم نەکرد لەوەدا کەفارسی نازانم چونکە بەشی ئەوە تێدەگەیشتم بەڵام مەبەستم ئەوەبوو کابرا بەفارسی جارێك پرسیار دەكات لێی وەردەگرمو جارێکیتر کەبۆم وەردەگێڕن لەمێشکی خۆمدا بەباشی لێکمدەدایەوە بۆ ئەوەی ئەو وەڵامەی دەیدەمەوە لەجێی خۆیدابێت.

جاری یەکەم سێ رۆژ لەسەریەك گفتوگۆمانکرد، رۆژی چوار سەعات، هەموو جارێك کەتەواو دەبووین حاجی مستەفەوی منی بەسەیارەکەی خۆی دەهێنایەوە بارەگای پارتی لەرەزائیيە، بەیانیش بەخۆی سەعات ٩ دەهات بەشوێنمدا. لەیەکەم ساتەوە کەچاوم لەگەڵ ئەو کابرایەدا کرایەوە بەشێوەیەك مامەڵەم لەگەڵداکرد کەمن کابرایەکی کەم نیمو نوێنەری کوردم بەگشتیو ئەو دوو لایەنە بەتایبەتی، بۆیە لەدوای یەکەم دانیشتنەوە من بارەکەم کۆنترۆڵکرد، بەشێوەیەك گفتوگۆم لەگەڵدا دەکرد کەئەو قوتابییە لەبەردەستمدا، پێش ئەوەی لێکۆڵینەوە دەست پێبکەین داوام لێکرد قسەکانمان بەتۆمارکەرێك تۆماربکات بۆ ئەوەی راستییەکان لای خۆیان بمێنێتەوەو نەتوانن شتم بۆ دروستبکەن.

یەکەم پرسیار لێی کردم گوتی چەند جار هاتووی بۆ ئێرە؟ بۆ تا ئێستا سەردانی منت نەکردووە؟ بە چ شێوەیەك لەنێوان عێراقو ئێراندا هاتوچۆ دەکەیت؟ وەڵامم دایەوە گوتم پێنج جار چووم بۆ راژان، ئەمە جاری شەشەممەو مام جەلال بەمنی نەگوتووە سەردانت بکەم، من بەناو کوردستاندا هاتوومو ئەو سنوورەی کەتۆ باسی دەکەیت لەلایەن خۆتانەوە دروستکراوەو کێشە بۆ من دروست ناکات. پرسی: دوای ئەو هەموو خوێنە کەرژا، مام جەلال چۆن رازیبوو لەگەڵ صدام دانیشێت؟ گوتم: هەموو شەڕێك هەر بەئاشتی کۆتایی دێت، سەدام چەند دوژمن بێت کەدەستی بۆ میللەتی کورد درێژکرد کوردیش دەست دەخاتەوە ناودەستیو پەشیمانبونەوەش لەلایەن مام جەلالەوە نەبوو بەڵکو صدام بەگوشاری تورکیا رێکەوتنەکەی هەڵوەشاندەوە. پرسی: بە چ نیازێکەوە وا بەگەرمی دەتەوێت پارتیو یەکێتی رێك بخەیتەوە؟ گوتم: یەکخستنەوەیان هۆکارێك دەبێت بۆ نەمانی گرژیو ئاڵۆزی لەکوردستانداو دەبن بەهێزێك کەزۆر بەئاسانی دەتوانن بەرامبەر بەدوژمن، کەصدامە، راوەستن، ئەو کارەی من پێی هەڵساوم ئیشی ئێوەیەو دەبوایە لەمێژەوە ئەم کارەتان بکردایە، چونکە هێزی یەکێتیو پارتی بەیەکەوە زۆر سودبەخش دەبوو بۆ ئێوە. گوتی: پارتی دۆستمانن بەڵام مام جلال بەبەردەوامی دژایەتیمان دەکاتو شانبەشانی پێشمەرگەکانی دیموکرات شەڕمان لەگەڵدا دەکات. گوتم: زۆر حەز دەکەیت بزانیت کێ هۆکارە لەم دژایەتییەی یەکێتی بۆ

ئێوە؟ هۆکاری سەرەکی ئێوەن چونکە زۆر بەزەقی دژایەتی یەکێتی دەکەن، تاوان نییە ئەگەر ڕێکخراوێکی سیاسی وەکو یەکێتی لەگەڵ دیموکراتدا دۆست بێت، ئێمە هەموو کوردین، ئەی بۆچی بۆ ئێوە حەڵاڵ بێت لەئێرانەوە لەگەڵ (حزب الله)ی لوبنانی پەیمان ببەستن! بەڵام بۆ ئێمە کەهەردوولامان کوردین حەرام بێت؟

لێرەدا کەهەستمکرد دانیشتنەکەم بەتەواوەتی کۆنترۆڵی کردووە هەروەها کێشەی ڕازیبوونی ئێرانم نەماوە بۆ ڕێکەوتنی ئەو دوو حزبە، ئەو هەلەم قۆزتەوەو پێشنیارم کردو گوتم: ئەگەر دەتانەوێت سنووری ئێران بچێتە شاخی حمرینو ئەنقەرە من لەژوورێك دابنێنو بەناوی مستر (x)ەوە چیم پێ گوتن جێبەجێی بکەن، ئەگەر لەدوای شەش مانگی تر سەرکەوتوو نەبوون لەسێدارەم بدەن، ئۆتۆنۆمی بەدیموکراتی ئێران بدەن لەهەموو کارێکتاندا سەرکەوتوو دەبن، ئینجا هەموو کوردستانی باشوور دێتە پاڵ ئێوە چونکە کورد لەساڵی ١٩٢٢ەوە کەحکومەتی عێراقی دامەزراوە بەزۆر بەعەرەبەوە بەستراوەتەوە، لەبەر ئەوەی ئێمە نەتەوەیەکی ئارینو ئێوەش ئارین کەواتە ئێمە لەئێوەوە نزیکترین تا عەرەب، ئینجا ئەو ڕێکەوتنە سێقۆڵیەی نێوان کوردستانی باشوورو دیموکراتی ئێرانو کۆماری ئیسلامی، ئەگەر سەربگرێت هۆکارێکی سەرەکی دەبێت بۆ زوو لەناوبردنی ڕژێمی بەغدا، سەرکەوتنەکەش بۆ کۆماری ئیسلامی دەنوسرێت.

کەناوی دیموکراتم هێنا دەموچاوی حاجی مستەفەوی گرژبوو، بەشێوەیەك غەزەبی لێدەباری، هەستمکرد دەیەوێ هێرش بکاتەسەر خوالێخۆشبوو قاسملو، دەستپێشکەریم کردو بەهیچ جۆرێك ڕێگام نەدا ناوی ئەو پیاوە مەزنە بەخراپە بهێنێت، بۆیە پێش ئەوەی دەم هەڵبێنێت پێم گوت ئەگەر بێتو بەخراپە باسی ئەم پیاوە بکەیت منیش باسی گەورەکانی شیعە دەکەم.

مستەفەوی گوتی: ئێمە دەوڵەتێکی ئیسلامینو ئیسلامیش سنووری نییە، با لەباسەکەمان دەرنەچین، با باسی یەکێتی بکەین، ئێمە وەکو تۆ گوتت ئارینو دراوسێی یەکین، ئەگەر من مردم دەبێت تۆ لەبەر ئەجری دراوسێتی بچیتە ژێر جەنازەکەم ، لەبەر ئەوە وا پێویست دەکات پەڕەیەکی سپی لەنێوان خۆماندا هەڵدەینەوە. گوتم: لەم کارەدا دەبێت ئێوە دەستپێشکەری بکەن، ئێوە لەسەرەتاوە تا ئێستا لاتان روونە کەیەکێتی دژی شا بووەو یەکێتی یەکێك بووە لەو حزبە چەکدارانەی شانبەشانی هەموو جەماوەری ئێران لەراپەڕینەکەی رووخاندنی شادا بەشداریکردووەو گومان لەوەدا نییە لەهەموو شارێکی ئێراندا بەلای کەمەوە شەهیدێکی داوە. حاجی مستەفەوی گوتی: ئەو شەهیدانەی باسیان دەکەیت لەراپەڕینەکەدا شەهید نەبوون بەڵکو کاتێك لەگەڵ دیموکراتدا بەرەنگاری ئێمە بوونەتەوە کوژراون.

لەکۆتایی دانیشتنەکەدا گوتی: با منو تۆ لەم دەقەیەوە پەڕەیەکی تازە هەڵدەینەوە بۆ ئەوەی بەهەردووکمان بتوانین پەیوەندییەك لەنێوان ئێرانو یەکێتیدا دروستبکەین, هەروەها پێم باشە هەرچی شتە ئیجابییەکان هەیە لەم دانیشتنەدا بۆ مام جەلالی بگێڕیتەوەو بەزووترین کاتیش بگەڕێیتەوە بۆ ئێرە.

خواحافیزیمان لەیەکتر کردو گەڕامەوە بۆ مەکتەبی سیاسی پارتی، لەوێ کاك ئیدریسو کاك مەسعودو

كـاك علـی عبـدالله لێیـان پرسـیم  دانیـشتنەكەتان چـۆن بـوو؟ تـەنها بـەدوو وشـەوە لآمـم دانـەوە، گـوتم: (سەركەوتوو بووم الحمدلله).

وەڵامی نامەكەی مام جەلالیان ئامادەكردبوو، رۆژی پاشتر بەرێكـەوتم بـۆ لای مـام جـلال. كەگەیـشتمەوە بارەگـای مـام جـەلال لەیاخـسەمەر، ئـەوەی شـایەنی باسـە لەهـەموو تازەگەرییـەك لەرێكەوتنەكـەدا ئاگـادارمكردەوە ئینجـا بەدووروردرێـژی چـاوپێكەوتنەكەی نێـوان خـۆمو حـاجی مـستەفەویم بـۆ گێڕایـەوە" لەهەموو چاوپێكەوتنێكمدا لەگەل هەردوولا هەنگاوێك زیاتر لەیەكترم نزیك دەكردنەوە.

دیاربوو ئەو قسانەی حاجی مستەفەوی، جێی سەرنجی لای مام جلال بوو، بۆیە زۆر بەپەلە ناردمیەوە بۆ ئەوێ، لەپێنج رۆژ زیاتر نەیهێشت لەو ناوە بمێنمەوە، بەڵام پێش ئەوەی برۆم گوتی: ئیشەكەی تۆ بوو بەدوو ئیش, یەكێكیان حاجی مستەفەویو ئەویترپـارتی، بـەڵام یەكـەم جـار گرنگەكـەیان ئەنجامـدەدەیتو بـەبێ ئاگاداری ئەندامانی پارتی دەچیت بۆ لای حاجی مـستەفەوی، كەلـەوێ تـەواوبوویت ئینجـا بـچۆ بـۆ بارەگـای پارتی.

كەگەیشتمە ئێران ئەو كارەم ئەنجامدا  كەویژدانی خۆمی پێ ئاسوودە دەبوو بەرامبەر بەمیللـەتی كـورد، چونكە یەكەم هەنگاوم كەبۆ ئەم رێكەوتنە هەڵهێنایەوە پەیمانم بەخوای خۆم دابوو ئـەم دوو حزبـە بكەمـەوە بەیەكو چی لەبەرژەوەندیی میللەتی كورددایە ئەوە بكەم، لەهەمانكاتدا لەناخی خۆمدا گومـانم لەدۆسـتایەتی ئێران هەبوو. بۆیە وەكو هەموو جارێك، یەكەم جار رووەمكردە راژان بۆ خزمەتی كاك ئیدریسو كاك مەسـعودو مامۆستا علی، دوای ئەوەی كارەكانی خۆمم بەتەواوەتی ئەنجامدا ئینجا چوومەوە لای حاجی مستەفەوی پێم راگەیاند مام جەلال خۆشحاڵە پێكەوە لاپەڕەیەكی سپی هەڵدەنەوە. رۆژی دواتر چـاومان بەیـەكتر كەوتـەوەو كۆتایی قسەكانی بەوە هێنا كەپێی گوتم: گەشتێك بۆ تـاران بكـە بـۆ ئـەوەی چـاوت بەرەفـسنجانی بكـەوێت، لەوەڵامدا گوتم: بەداخەوە من ناتوانم بـچم بـۆ ئـەوێ چـونكە مـام جـەلال روخـسەتی بینـینی جـەنابتی زیـاتر نەداومەتێ!

لەماوەی دوو رۆژدا سێ جار كۆبوونەوەم لەگـەڵ حـاجی مـستەفەویدا كـرد، ئینجـا بەنامەیـەكی مەكتـەبی سیاسی پارتییەوە گەڕامەوە بۆ لای مام جلال كەچەند پێشنیارێكی تازەی تیابوو بـۆ پێشخـستنی پرۆژەكـەو زیاتر لەیەك نزیكبوونەوەیان. نامەكەی مەكتەبی سیاسی پارتیم دا بەمام جەلالو پـێم گـوت: چـاوم بـەحاجی مستەفەوی كەوتووەو زۆر رێزو سڵاوی بۆ جەنابتان هەیەو چاەوڕوانی شت بكە.

ئینجـا بـۆ جـاری هەشـتەم گەڕامـەوە بـۆ راژانو ئـەمجارەیان لەگـەڵ مەكتـەبی سیاسـی پارتیـدا باسمـان لەچۆنیەتی دەستنیشانكردنی جێگایەك كرد  كەنوێنەرانی هەردوولا لەئەندامانی مەكتەبی سیاسـی, رووبـەڕوو دابنیشن بۆ ئەوەی كێشەكانیان لەنزیكەوە چارەسەر بكەن، پێم گوتن: نوێنەرانی یـەكێتی ئامـادەن بـەنهێنی بێن بۆ لاتان لەراژان بەمەرجێك لەهاتنو رۆشتنەوەیاندا پاسەوانییان بكەنو كەس لەم شتە ئاگادار نەكەنـەوە

هەتا دەگەڕێنەوە شوێنی خۆیان. لەکۆتایی دانیشتنەکەدا مامۆستا علی عبداللە فەرمووی: دەبێت نوێنەری کۆماری ئیسلامیش لەو کۆبوونەوەیەدا لەگەڵماندا بەشداربێت چونکە ئێمە ئەو کۆبوونەوەیە لەخاکی ئێراندا دەکەین. گوتم باشە، دوو گروپی سیاسی کورد کە لەبەرژەوەندیی میللەتەکەی خۆیان کۆدەبنەوە چ پێویست دەکات بێگانەیەکی وەکو کۆماری ئیسلامی لەرێکەوتنی نێوانیاندا بەشداربێت!

من بەم هەڵوێستەی پارتی زۆر گرژو دڵگرانبووم, لەدوای گفتوگۆیەکی زۆر قەناعەتم پێ هێنان کەیان لەقەڵاتوکان یان لەشێنێ دانیشین، چونکە ئەم ناوچانە لەناو عێراقدان، نەهی پارتییە نەهی یەکێتی، ئێرانیش بۆی نییە لەدانیشتنەکەدا بەشداربێت، هەروەها بۆ سەلامەتی هەموولایەك وشەیەکی نهێنیم دانا لەنێوانماندا، کاك مەسعود گوتی تەنها خۆت لەو جفرەیە دەگەیت، گوتم دەمەوێت تەنها خۆم تێبگەمو کەس تێی نەگات، ئەمەش بۆ سەلامەتی هەردوولاتان. ئینجا گوتم: دەگەڕێمەوە بۆ لای مام جەلال، یا بەبروسکە یا خۆم دێمەوە لەکاتو شوێنی دیاریکراوی دانیشتنەکە, ئاگادارتان دەکەمەوە.

کەگەڕامەوە بۆ بارەگای مام جەلال بۆم باسکرد کەرێککەوتووین لەسەر قەڵاتوکانو داوام لێکرد بڕێك پارەم بۆ سەرف بکەن بۆ ئەوەی هەموو مەسرەفی دانیشتنەکە ئێمە بیکێشین، کاك نەوشیروان فەرمووی چەندت پارە پێویستە لەدارایی وەربیگرە. دوای ئەوەی پارەم وەرگرت ٥ رۆژ لەناو برادەرانی یەکێتیدا مامەوە ئینجا گەڕامەوە بۆ ڕاژان، لەگەڕانەوەمدا کەدوو رۆژم پێچوو زۆر دڵخۆش بووم بەوەی سەرکەوتوو بووم لەم رێکەوتنەدا, بەجۆرێك لەخۆشیدا نەمدەزانی چی بکەم، بەڵام لەوەدەچوو ئەم خۆشییە تا سەر نەبێت، ئەوەبوو کەگەیشتمە ڕاژان داوای چاوپێکەوتنم لەگەڵ کاك مەسعودو مامۆستا علی عبداللەدا کرد کە بەهیچ شێوەیەك وەڵامیان نەدامەوە، زۆر سەرم لەم هەڵوێستەیان سوڕما چونکە لەیەکەم رۆژەوە تا ئەو کاتە شتیوا لەگەڵ مندا رووینەدابوو، خێرخوایەك هات (نامەوێت ناوی بەرم چونکە لەهەولێرە) پێی گوتم مەفرەزەیەکی پارتی لەهەولێر تەفروتوناکراوە بۆیە نایانەوێت چاویان پێت بکەوێت، لەدڵی خۆمدا گوت: ڕەفیق دانیشەو بیربکەرەوە بزانە چۆن لەگەل ئەم کارەساتەدا مامەڵە دەکەیت. بەڵام کۆڵم نەداو هەر سوور بووم لەسەر ئەوەی چاوم پێیان بکەوێت، بەناچاری ناردیان بەشوێنمدا، کەچوومە ژوورەوە حەوت کەس لەلێپرسراوان دانیشتبوون، لەتوڕەییدا ڕەش داگیرسابوون، کەبۆیان باسکردم چی روویداوەو چۆن مەفرەزەیەکی یەکێتی، مەفرەزەیەکی پارتی بەغەدرو خیانەت لەکاتی میوانداریکردنیاندا لەناودەبات، هەموو مووی لەشم لەتوڕەییدا هەستا, بەبێدەنگی چاوەڕوانم دەکرد لەقسەکانیان ببنەوە. کاك مەسعودو کاك علی عبداللە لەتوڕەییدا قسەیان بۆ نەدەکرا، دوای ئەوەی هەموویان لەقسەکانیان بوونەوە، لەکاتی قسەکانی ئەواندا لەمێشکی خۆمدا بیرم لەوە دەکردەوە چۆن ئەو رووداوە پینەکەم، روومکردە هەموویانو گوتم: ئەوەی باستانکرد راستە روویداوە، بەڵام من چەند بەڵگەیەکم هەیە ئیسپاتی دەکات ئەو رووداوە بەفەرمانی مام جەلالو سەرکردایەتی یەکێتی نەبووە:

١- کەئێوەم بەجێهێشتو چوومەوە بۆ ناو یەکێتی سەعات ٨ی شەو چوومە ژوورەکەی د. فوئاد مەعصوم لەبەرگەڵو، د. فوئادو کاك کۆسرەت، نانیان دەخوارد، کەچاویان بەمن کەوت بەپێشمەرگەیەکیان گوت برۆ خواردنی تری بۆ بهێنە با نان بخوات. پێم گوتن کاتو شوێنمان دیاریکردووە بۆ ئەوەی نوێنەری هەردوولا لەپلەی مەکتەبی سیاسی بەیەکەوە دابنیشن بۆ گۆڕینەوەی بیرورای خۆیان, دوای ئەوە مام جەلالو مەسعود بارزانی بۆ دەرکردنی بڕیاری کۆتایی چاویان بەیەك دەکەوێت، زۆر خۆشحاڵ بوون بەو هەواڵە، کەکاتی نوستن هات ویستم بچمە ژوورێکی تر بنووم چونکە ژووری تایبەتی د. فوئاد مەعصوم تەنها دوو قەرەوێڵەی بۆ حەوانەوەیان لێبوو، بەڵام کاك کۆسرەت هەستایە سەرپێو دەستی برد بۆ قەرەوێڵەکەی خۆیو فەرمووی: ئەم جێگایە شوێنی تۆیە, من بۆم نیە لێرە بنوم، چونکە ئەوەی تۆ ئەنجامتداوە تا ئێستا کەس نەیتوانیوە ئەنجامی بدات.

٢- من ئێستا لێرە دانیشتوومو دەتوانن خۆتان دڵنیا بکەن لەوەی کەکاك د. فوئاد مەعصوم و کاك فەرەیدون عبدالقادر بەناوی جەولەوە بەرەو قەلاتوکان بەڕێکەوتوون، بەڵام دەیانەوێت لەرێگایەکی دوورەوە بچن بۆ ئەوەی کەس پێیان نەزانێ بۆ ئەو دانیشتنە دەچنو دانیشتنەکە سەرکەوتوو بێت.

٣- بەڵگەی سێیەمم ئەوەیە کاك نەوشیروان فەرمووی چەند پارەت پێویستە بۆ رێکخستنو بەرێوەبردنی دانیشتنەکە برۆ بەزیادەوە وەریبگرە، ئێستا سێ هەزار دینارم پێیە بۆ مەسرەفی ئەو سێ سەد پێشمەرگەیە کەلەوێ ئامادە دەبن.

٤- بەڵگەی چوارەمیشم کە لەهەمووی گرنگترە, وەکو خۆتان ئاگادارن ئەم چوار دەوڵەتە ئیقلیمییە، هەر چواریان ئەم رێکەوتنەیان پێناخۆشە، ئایا لەهەموو کوردستاندا بەهەر چواریان خاوەنی مەفرەزەیك نین کە بەهۆیەوە ئەم رێکەوتنە تێکبدەن، بۆیە من دەڵێم هیچ شتێکی وا روونەداوەو ئەمە نابێت بەهۆکارێك کە بەهەڵوەشاندنەوەی رێکەوتنەکە دواڕۆژی میللەتی کورد بخەنە مەترسییەوە، ماوەیەکی دوورودرێژە من لەلای ئێوە میوانم، لەبەر ئەوە سبەینێ هەر هەمووتان لەلای من میوانو بەدەستی خۆم خواردنتان بۆ دروستدەکەم، بزانن من چاکتر خواردن دروست دەکەم یان عبدالرحمن کەچێشت لێنەری بارزانی بووە ئێستا خواردن بۆ ئێوە دروست دەکات؟

بۆ سبەی نیوەڕۆ بەدەستی خۆم خواردنم دروستکرد کەپێکهاتبوو لەدوو قەلەمونو حەیوانێكو پێنج مریشك، کاتێك دەستمانکرد بەنانخواردن وەفدێکی حزبی شیوعیش ئامادەی نانخواردنکە بوون لەگەڵماندا بەبێ ئەوەی هۆکاری میوانداریيەکە بزانن، یەکێکیان برای بەرێزو دڵسۆزو کوردپەروەر کاك محمود حاجی فەقێ خدر بوو کەخەڵکی قەڵادزێیە، دۆستێکی باوەڕپێکراوو نزیکی منە.

رۆژی دوایی کاك مەسعود فەرمووی نەمزانیوە خواردنی وا خۆش دروستدەکەیتو منیشتان بەشدار نەکرد، گوتم خوابکات تۆ بەنانی من رازیبیت هەموو رۆژێك بەدەستی خۆم خواردنت بۆ دروستدەکەم.

لەماوەی ئەو سێ رۆژەی لەوێبووم هەموو بیرو هۆشێکم لەوەدا بەکاردەهێنا ئەم رێکەوتنە هەڵنەوەشێتەوە، چی لەتوانامدا بوولەدبلۆماسیەت بەکارم هێنا، ئەوەبوو هەموویانم گەیاندە باوەڕ کەمام جەلال ئاگاداری ئەو رووداوە نەبووەو، لەگەل کاك مەسعوددا گەیشتینە ئەو چارەسەرەی کەمام جەلال بەبروسکەیەك مەکتەبی سیاسی پارتی ئاگاداربکاتەوە لەوەی کەئاگاداری ئەو شەڕە نەبووە بۆ ئەوەی مەکتەبی سیاسی پارتی بتوانێت ئەنجامی خراپی ئەو شەڕە لەناو ئەندامانو لایەنگرانی خۆیاندا پینەبکات.

بەهەلم زانی کەپارەم زۆر پێیە، پێش ئەوەی بگەڕێمەوە بۆ لای مام جەلال، سەردانی ئەو ١٣ بریندارەی یەکێتیم کرد کە لەنەخۆشخانەکانی ئێران بوونو هەریەکە برێك پارەم بۆ خستنە ژێر سەرینەکانیانەوە، لە١٥٠ دینارەوە تا ٥٠٠ دینار بەپێی زامداریو باری ئابووریی پێشمەرگە بریندارەکان، ئەو پارەیە زۆر بێمنەت بوو چونکە پارەی یەکێتی بوو. کەئەم کارەم بۆ ئەندامانی سەرکردایەتی یەکێتی بەتایبەتی کاك نەوشیروانو د. فوئاد مەعصوم گێڕایەوە زۆریان پێ باش بوو دەستخۆشیان لێکردم.

هەوڵمدا مام جەلال ببینم، بەڵام چاوم پێنەکەوت. چوومە لای کاك نەوشیروان، ئەوەی کردبووم لەگەڵ پارتیدا هەموویم بۆ گێڕایەوە، ئینجا ئاگادارمکرد ئەوە بۆ چەند رۆژێك دەچێت چاوەڕوانم مام جەلال ببینم بەڵام وەڵامی نەداومەتەوە، خۆت باش ئاگاداریت هەرچی لەتوانامدایە بەکارم هێناوە، ئەو کارەتان بۆ بەمن ئەنجامدا کەبەتەمای رێکەوتن نەبوون، من بڵاوکراوەیەکتان لەسەر بڵاو دەکەمەوە. دوای ئەوەی زۆر هەوڵمدا لەگەڵ کاك نەوشیروان کەهەر دەبێ مام جەلال ببینم، هەواڵی لێگێڕامەوە کەبۆ رۆژی دوایی لەکاتی دیاریکراودا بچۆ چاوت پێی بکەوێت. کەچووم بۆ خزمەت مام جەلال رۆژێکی زۆر سارد بوو، لەبەر سەرماو بۆردومانی رژێم هاتوچۆ زۆر کەم بوو، چونکە لەهەمو ١٠ دەقیقەیەکدا دوو تۆپی بەرێگاو دەوروبەری بارەگاکەی مام جەلالەوە دەنا, لەکاتی دیاریکراودا گەیشتمە خزمەتی، هەموو ئەو هەوڵانەی لەگەڵ پارتیدابووم بۆ ئەوەی لەرێکەوتنەکە پەشیمان نەبنەوە بۆ مام جەلالم گێڕایەوە. هەردووکمان زۆر بەگرژی لەگەڵ یەکتردا دەدواین، مام جەلال گوتی: لەیەکەم رۆژەوە کە لەگەڵ سەرکردایەتی یەکێتی دادەنیشتین باس لەوە دەکرا کە لەگەڵ پارتیدا رێکبکەوین، تاکە کەس کەکۆنووسەکەی ئیمزا نەکرد من بووم، کاك رەفیق خۆ جارێ ئێمە رێکەوتننامەکەمان ئێمزا نەکردووە، ئەو جۆرە شتانە ئاساییە.

زۆر قسەم پێبوو بۆ وەڵامدانەوەی بەڵام لەبەر ئەوەی هیچ توانایەکم نەبوو بەناچاری یەکسەر گەڕامەوە بۆ سەرگەڵو بەنیازی ئەوەی لەو رێگایە تۆپێکم بەرکەوێتو لەدەست ئەو دوو سەرکردەیە نەجاتم بێت، ئەو کاتە دەیانگوت شەهیدی رێگای رێکەوتنەو هەردوولا دەیانگوت شەهیدی ئێمەیە. مام رۆستەم زۆر بەلایەوە سەیربوو کەلەو رۆژە ساردەدا بەناو ئەو تۆپبارانەدا دەگەڕێمەوەو لەوێ نامێنمەوەو بەپێی خۆم بەرەو مردن دەچم. بەڵام سوپاس بۆ خوا کەماوم بۆ ئەوەی لەساڵی ٢٠٠٠دا ئەم راستیەیە بڵاوبکەمەوە، ئەوەی من ئاگاداربووم کاك فەرەیدون عبدالقادرو د. فوئاد مەعصوم بەرەو قەلاتوکان بەرێکەوتبوونو رەنگە ئەوانیش

ئاگاداری ئەوە نەبووبن کەمەفرەزەیەکی پارتی بەغەدر لەناوبراوە.

## کورتەباسێك دەربارەی هاتوچۆم لەنێوان یەکێتیو پارتیدا

کاتێك لەلای یەکێتییەوە دەهاتم بۆ لای پارتیو بەپێچەوانەوە، کەدەگەیشتمە بارەگاکانیان بەناوی پشوودانەوە چەند سەعاتێك دەرگام لەسەرخۆم دادەخست، بەتەنها راپۆرتم لەسەر ئەو رووداوانەی روویداوە ئامادە دەکردو هاوپێچ لەگەڵ نامەکەدا کەدەیاندامێ تەسلیم بەسەرکردەی هەردوولام دەکرد. لەبەر ئەوەی نەوەك لەرێگا راپۆرتەکەم پێبگیرێتو توشی تەنگوچەڵەمە ببم لەمێشکمدا راپۆرتەکەم هەڵدەگرت هەتا دەگەیشتمە بارەگاکانی هەردوولاو هەر کاتێك ویستبێتم چاوم بەکاك مەسعود یان مام جەلال بکەوێت، دەرگایان لەسەر پشت بووە بۆ منو هەرگیز سەعاتێك رایاننەگرتووم بۆ چاوپێکەوتنو لەلایەن سەرکردایەتیو ئەندامانی هەردوولا رێزێکی زۆر تایبەتیم لێدەگیرا. هەروەها ئەو شارانەی بەناویاندا هاتوچۆم دەکرد بەنهێنی یان بەئاشکرا، بەهەموو شێوەیەك هاوکارییان دەکردمو خزمەتیان دەکردم، کادرانی حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران لەهەر شوێنێکدا منیان بدیایە بەپیرمەوە دەهاتنو خزمەتیان دەکردم. لەماوەی ئەو یانزە مانگەدا توشی هیچ گرفتێك نەهاتمو زۆر جار روویداوە ئەو شوێنەی پیایدا تێپەڕدەبووم بۆردومانی تۆپی لەسەر بووە بەڵام سوپاس بۆ خوا هیچ زیانێکم توش نەهاتووە.

بارەگای مەکتەبی سیاسی پ.د.ك. لەقوتابخانەیەکی گوندی راژان[٣٢] بوو کەخۆشیان، بەبلۆك نزیکەی ٣٠ ژووری تریان تیادا دروستکردبوو بۆ رێکخراوی هەموو ناوچەکانی کوردستان. لەم کۆشکەدا کاك علی عبدالله ژوورێکی تایبەتی خۆی هەبوو تیا دەحەوایەوە، لەو خانووەدا کە ٥٠٠ مەتر لەبارەگای م.س. دووربوو، کاك فازل میرانیو د. رۆژو چەند کەسێکی تر لەوێ دەخەوتن، بەڵام کاك هۆشیار زێباری هەر لەیەکێك لەو ژوورانەدا دەخەوت کەدروستیانکردبوو، هەروەها منیش یەکێك بووم لەو کەسانەی بەتەنها ژورێکم لەناو م.س. بۆ تەرخانکرابوو، بەڵام گەرماویان نەبوو. کاتێك بیستیان مام جەلال نیازی هەیە بێت بۆ ئەوێ بڕیاریاندا حەمامێك دروستبکەن، سێ ژوور کرابوو بەیەك بۆ چێشتخانەکەو کەس بۆی نەبوو بچێتە ژوورێ،

---

(٣٢) گوندی راژان دەکەوێتە ناوچەی تەرگەوەڕو مەرگەوەڕ لەسەر سنووری کوردستانی ئێران دوور لەکوردستانی باکوور بە ٣ کم، ئابووری ئەم دێیە لەسەر بەخێوکردنی ئاژەڵو کشتوکاڵ بەڕێوە دەچوو، لەساڵی ١٩٨٥دا خاوەنی زیاتر لە٢٦٤٠٠ سەرمەڕو (١٢٠٠) مانگا بوون، خەڵکی ئەم گوندە دەوڵەمەندترینو کاسبترین خەڵکی ئەو ناوچەیە بوون لەهەموو روویەکەوە.

ساردترین ئاو هەوای هەیە لەکوردستاندا، وەرزی سەرماوسۆڵەی، زیاتر لە(٦) مانگەو زۆر ساڵ بەبەفر پەڵە دەدات، یەکێك لەو کەسایەتییانەی لەدایکبووی ئەم گوندەیەو هەموو کوردستان دەیناسن بەڕێز سید موسایە کەنەوەی شێخ عبداللە نەهرییەو خەزووری د.عزت شەمزینیە، ئەم بنەماڵەیە یەکێکن لەو بنەماڵانەی گەورەترین فیدارکارییان پێشکەش بەکوردو کوردستان کردووە، سەرانسەری مێژوویان بەراستی جێی شانازییە چونکە چاویان لەماڵی میللەت نەبووە.

جارێکیان لەدانیشتنێکدا لەکاك مەسعود بارزانیم پرسی هۆی چییە گوندی راژانت هەڵبژاردووە بۆ ئەوەی بارەگاکەتی لێ دانێیت، کەساردترینو ناخۆشترین گوندە لەکوردستاندا؟ فەرمووی چەند باسی ساردیو زریانی ئێرە بکەیت هەر کەمە، بەڵام ئەوەندە نزیکم لەکوردستانی باکورو باشوو هەر کاتێك پێویست بکات بە(٢–٣) سەعات دەگەمە کوردستانی باکوورو بەهەمان کات دەگەمە کوردستانی باشووریش.

شایەنی باسە بارەگای م.س. لەهاویندا لەدەرەوەی گوندەکەبوو بەدووری ٣ کم، لەزستاندا دەگوازرایەوە بۆ ناو گوند، م.س. لەدوو ژوورو هۆڵێك پێکدەهات، خانووی دووەم هەم بارەگای پێشمەرگەبوو، هەم چێتخانە.

بەرامبەر بینای م.س. بینایەکی تر هەبوو شوێنی دەزگای بێتەل بوو کەراستەوخۆ پەیوەندی بەهەموو لقەکانی حزبەوە هەبوو. دوو تەنوریان هەبوو هەموو بەیانیەك هەر نەفەرەی دوو کولێرەیان لەگەڵ ماستو پەنیردا دەدایە، بەلاّم چایی دەبوایە خۆت لێتبنایە. خواردنی نیوەڕۆ دوو جۆر بوو، جۆرێکیان تایبەت بەئەندامانی م.س.بوو جۆرەکەیتر گشتی بوو، هەفتەی دوو جار گۆشت هەبوو هەموو رۆژێکیش برنجیان هەبوو، زۆر بەرێکوپێکی بەسەر ئەندامەکانیاندا دابەشیاندەکردو من یەکێك بووم لەو کەسانەی لەخواردنە تایبەتییەکەی ئەندامانی مەکتەبی سیاسییان بۆ دەهێنام. سێ کەس خواردنی دروستدەکرد کە لەلایەن پارتییەوە جێی باوەڕبوون، یەکێکیان ناوی عبدالرحمن بوو لەئەمریکاوە هێنابوویانەوە لەبەر ئەوەی چێشت لێنەری خودی مەلامستەفا بوو. هەموو سەیارەکانیان چەند جێبێکی ئیسپانیو چەند مێکزەمینیەك بوو، کاك مەسعود جێبێکی تایبەتی هەبوو، بەهەمان شێوە کاك علی عبداللە، بەلاّم کاك فازلو د. رۆژ بەهەردووکیان جێبێکیان هەبوو، کاك شەوکەت شێخ یەزدین جێبێکی هەبوو، مەسرورو مەقصود کوڕانی کاك مەسعود بەهەردووکیان رینۆ پێنجێکی نارنجییان هەبوو، لەرێکخستنو بەڕێوەبردنی کاروباری ناوخۆی پارتیدا ئیدارە هیچ گروپێکی سیاسی لەو رۆژەدا نەیاندەتوانی لەرێکوپێکیدا مونافەسەی ئەمان بکەن، ئازایەتییەکەشی بۆ خودی کاك علی عبداللە دەگەڕایەوە، بۆ نموونە ئەم پیاوە بەشێوەیەك بەسەر کاروباری ئابووری ناوخۆی خۆیاندا زاڵبوو ئەگەر بێتو نیو تەنەکە نەوتت پێویست بوایە ئەوە بەبێ نوسراوی کاك علی عبداللە نەیاندەدایێ (حیزب فەقیر میللەت دەوڵەمەند).

لەماوەی ئەو یانزە مانگەدا چەند جارێك چوومە سەردانی مەزاری خوالێخۆشبوو مەلامستەفا کە لەژێر دەوارێکدا بوو لەگوندی هەلەج. دواجاریان وا رێکەوت جەژنی قوربان بوو، زستان بوو بەفرێکی زۆر دەباری، کەسەرنجمدا خەڵکێکی زۆر لەگۆرستانەکەدا کۆببوونەوە، بەبێ ئەوەی تەماشای ئەملاو ئەولای خۆم بکەمو کەس ئاگادارم بکاتەوە، لەگەڵ بازیانی کوڕم یەکسەر چوینە ژێر ئەو دەوارەی کەمەزاری خوالێخۆشبوو بارزانی لێبوو، سەیرمکرد کاك مەسعود لەبەردەمی مەزارەکەدا بەچۆکدا هاتبوو چاوەکانی سوور ببوونەوە، یەکسەر رابردووی ئەو پیاوە مەزنەی کەعێراقو ئێرانو تورکیای هێنابووە لەرزین، دەهاتەوە بەرچاو کەدەتگوت کورد یەعنی بارزانیو بارزانی یەعنی کورد، ئەمەی دەهاتەوە بەرچاو، لەتاوا خۆمم بۆ نەگیراو دەستمکرد بەگریان، دوای پێنج دەقیقە لەهاتنی من کاك مەسعود چووە دەرەوەو کاك سداد بارزانی (برا بچووکی کاك مەسعود) هاتە ژوورەوە ئینجا دوای ٥ دەقیقە لەهاتنی ئەم بەڕێزە من مەزارەکەم بەجێهێشتو چوومە دەرەوە، کەسەیرمکرد کاك مەسعود چاوەڕوانی دەکردم، خواحافیزی لێکردمو بەرەو گۆڕستانی شەهیدانی زێوێ بەڕێکەوت. شەوێ کاك علی عبداللە فەرمووی عادەتی ئەمان وایە دەبێ مەسعود بارزانی یەکەم کەس بێت بچێتە سەر مەزارەکە، دوا بەدوای ئەم براکانی تری بەپێی تەمەنیان ئینجا مەکتەبی سیاسیو دوای ئەمان لجنەی مەرکەزیو لێپرسراوانو دوای ئەمان بەگشتی خەڵك دەچێتە ئەوێ، بەلاّم بۆیە

کەس ڕێگای لەتۆ نەگرت کە لەگەڵ کاك مەسعوددا بچیت چونکە تۆ نوێنەری (ی.ن.ك)یت، تۆ بەمیوان دەژمێردرێیت، ئافرەتانیش لەدوای نوێژی نیوەڕۆوە دێنە ئەوێو بەهەمان شێوە یەکەم کەس دایکی کاك مەسعود دێتە سەر مەزارەکە، دوابەدوای ئەم بەپلە دێتە خوارەوە.

## پەیوەندی پارتی دیموکراتی کوردستان بەکۆماری ئیسلامی ئێرانەوە

١- پارتی دەبوایە ڕۆژانە کۆماری ئیسلامی بەراپۆرت لەهەموو ڕووداوێك کەلەناو عێراقدا ڕوویدەدا, ئاگاداربکاتەوە.

٢- کۆماری ئیسلامی، مانگانە وەکو سوپای ئێرانی خواردنو نەوتو پارەی بەپارتی دەداو چەکی بەسەریاندا دابەشدەکرد کەلەگەڵ سوپاکەدا بۆ شەڕ دەیبردن، جاری وا هەبووە چەند مانگێك موچەکانیان دوادەکەوتو کەدەشهات ئێرانییەکان خۆیان پارەکەیان دابەشدەکردو دەبوایە ئەو کەسەی پارە وەردەگرێت ئیمزا بکات ئینجا پارەکە وەربگرێت، ئەو پارەیەش کەبۆیان دەهێنان کۆکراوەی بانقەکانی ئێران بوو لەپارەی دڕاوو ١٠ تومەنی.

٣- کێشەی هەرەگەورەی پارتی، ئازادی هاتوچۆکردن بوو لەناو ئێراندا چونکە من خۆم بەچاوی خۆم بینیم لەدووری ٥ کم لەبارەگای م.س.، ئەندامانی مەکتەبی سیاسییان رادەگرت داوای کارتی شوناسنامەیان لێدەکردن، ڕۆژێکیان بەڕێز شوکت نێرۆیی بۆی گێڕامەوە کەبەردەوام ڕۆژانە ٥٠٠ ئەندامی پارتی لەزیندانەکانی کۆماری ئیسلامیدانو زۆربەیان لەسەر ئەوە دەگیرێن کە لەشارێکەوە چوونەتە شارێکی تر بەبێ ئاگادارکردنەوەی (قەرارگا) یان بەرواری (عدم تعرض)ەکەیان ڕۆژێك یان دوو ڕۆژی بەسەردا تێپەڕیوە. بۆیان گێڕامەوە جارێکیان کاك علی عبدالله لەپشووی خۆیدا دەچێتە ماڵەکەی خۆی لەکەرەج، دوو پاسەوانی خۆی کەلەبەر دەرگاکەیدا پاسەوانییان دەکرد لەلایەن کۆماری ئیسلامی چەك دەکرێن لەسەر ئەوەی (عدم تعرض)ەکەیان دوو ڕۆژی بەسەردا چووبوو.

لەو دانیشتنانەدا کەلەگەڵ حاجی مستەفەویدا دادەنیشتین, لەرووی بارودۆخی کوردو کوردستانەوە بۆچوونی من بۆ سیاسەتەکانی دەرەوە باشتر بوو، هەستم دەکرد لەناخی خۆیدا بەو توانایەی من خۆشحاڵ نەبوو، وەکو لەپێشتردا باسمکردووە، ڕۆژانە خۆی دەهات بەشوێنمدا منی دەبردە لای خۆیان. ڕۆژێکیان لەو کاتەی داماننابوو زۆر دواکەوت، لەجیاتی ئەوەی سەعات ٩ بەدوامدا بێت سەعات ١١ تەلەفونی بۆ کردمو گوتی ببورە سەعات ١ دێم بەشوێنتا، ئینجا سەعات ٢ تەلەفونی بۆ کردمەوە گوتی سەعات ٤ دێمو سەعات ٥ تەلەفونی بۆ کردمەوە گوتی ببورە لەبەر ئەوەی زۆر سەرقاڵم سبەینێ سەعات ٩ دێم بەشوێنتا. بەیانییەکەی لەلێپرسراوی بارەگاکەی پارتیم پرسی کەناوی نادر خۆشناو بوو، زەحمەت نەبێت سەعات چەندە؟ گوتی نۆو پێنج دەقیقەیە، ئیتر منیش ڕۆیشتمو ئەوێم بەجێهێشت هەتا کاتژمێر ١١ی شەو نەگەڕامەوە، کەهاتمەوە کاك نادر خۆشناو پێی گوتم: ماڵ خراو ئەوە تۆ لەکوێی؟ ئێمەو کۆماری ئیسلامی لەبەیانییەوە شوێن نەماوە

بەدواتدا نەگەڕێین، ئەی تۆ لەگەڵ حاجی مستەفەویدا وادەت نەبوو؟! گوتم: کاك نادر ئەی من بەیانی پرسیارم لێنەکردیت تۆ گوتت کاتژمێر ٩,٠٥، گوتی: راستە، لێت پرسیم، ئینجا گوتم: وامدەزانی وەکو دوێنێ ئیشی هەیە بۆیە منیش چوومە دەرەوە، ئیتر لەدوای ئەو رۆژەوە حاجی مستەفەوی تەنها یەك دەقیقەش لەوکاتەی دیاریمان دەکرد دوانەدەکەوت.

لەئەنجامی ئەو هەموو دانیشتنانەی لەگەڵ کۆماری ئیسلامیدا سازمدا، بۆم دەرکەوت کەجانتای دبلۆماسی ئەوان ماف کوردی تێدانییە. بۆ نموونە جارێکیان منو مامۆستا علی عبداللهو مامۆستا کریم احمد سکرتێری حزبی شیوعی، هەرسێکمان لەبارەگای م.س. پارتی دانیشتبووین بەراوردمان دەکرد لەنێوان هەڵوێستی کۆماری ئیسلامیو رژێمی بەغدا بەرامبەر بەکورد، بەمنیان گوت: تۆ رژێمی بەغدامان بۆ هەڵسەنگێنە چونکە شارەزاتریت لێیان، گوتم: نەخێر من کۆماری ئیسلامیتان بۆ هەڵدەسەنگێنم، گوتیان کوا تۆ بەو رادەیە شارەزاییت لەسەر کۆماری ئیسلامی هەیە، گوتم لەماوەی دوو مانگدا ٧ جار دانیشتنم لەگەڵدا کردوونو ئەو شارەزاییەی لەسەر کۆماری ئیسلامی هەمە، لەسەر بەغدا نیمە، بۆچوونی سەدام بەرامبەر بەکورد ئاشکرایەو لێکۆڵینەوەی ناوێتو بەدەستەواژەیەك کۆتایی پێدەهێنم، سەدام دەڵێ: یەك بن دەنا بڕیارمداوە کورد لەعێراقدا نەهێڵمو بەوەش لێتان خۆشنابم کەنەتەوەی خۆتان بگۆڕن بە(عەرەب) هەرناتانهێڵم لەعێراقدا، پیاوبنو یەك بگرنو بەرامبەرم بوەستن هەتا لەناوم نەبردوون، بەڵام ئێران کەقسەیان لەگەڵدا دەکەیت دەڵێن ئێمە هەموومان ئیسلامینو ئیسلامیش سنووری نییە، بەراستی باشیان پێگوتوون (بەشەکر دوژمنی خۆیان دەخنکێنن)، گفتی هەموو شتێکت پێدەدەن بەڵام هیچیشت بۆ ناکەنو کەبۆ پەناهەندەیی دەچیتە لایان یەکەم پرسیار کەلێت دەکەن دەڵێن: (کوردیت یان ئیسلام).

جارێکیان لەشام پەیوەندیم بەباڵیۆزخانەی ئێرانەوە کرد بۆ ئەوەی چاوم بە موحتەشەمی بکەوێت کەباڵیۆزی ئێران بوو لەشام، دەمویست فیزەم بداتێ بچم بۆ تاران، کەچاوم پێی کەوت گوتی بەسەرچاو، بەڵام بۆی نەکردم، بەتەلەفۆن کاتێکمان بۆ چاوپێکەوتن دیاریکرد، لەکاتی دیاریکراودا لەبەردەرگای ژوورەکەی خۆیدا چاوەڕوانی دەکردمو ئەو خەڵکەی لەوێ دانیشتبوون ئیشیان هەبوو کەچاویان بەم پێشوازییە گەرمەی موحتەشەمی دەکەوت بۆ من، وایاندەزانی سیخوڕی ئێرانم، پێیان دەگوتم بەڵکو ئەو ئیشەمان بۆ تەواو بکەیت، بەڵام لەگەڵ ئەو هەموو موجامەلەیەدا هیچ شتێکی بۆ نەدەکردمو ئەم کابرایە گەورەترین دوژمنی کوردبوو، پاش ماوەیەك کرا بەوەزیری ناوخۆ لەئێران.

دوای ئەوەی رێکەوتننامەکەی نێوان یەکێتیو پارتی بەهۆی (خامەنەئی)یەوە مۆرکرا، بەجیا چاوم کەوت بە د. فوئاد مەعصومو مامۆستا عەلی عبداللە، پێیان گوتم: راستە ئێمە بەگوشاری علی خامەنەئی رێککەوتین، بەڵام ئەوە بەرهەمی ئەو هەوڵانەبوو کەلەگەڵ کۆماری ئیسلامی دابوت بۆ یەکخستنەوەی ئەم دوو حزبە، چونکە وەکو بیستومانەتەوە لەو کۆبوونەوانەدا کەلەگەڵ مستەفەویدا ئەنجامتدەدا، کۆماری

ئیسلامیت گەیاندبووە ئەو قەناعەتەی کەرێکەوتنی یەکێتیو پارتی، سودی هەیە بۆ ئەوان نەك زیان.

ئەو هەولآنەی لەنێوان یەکێتیو پارتی دابوومو ئەو کۆبوونەوانەی لەگەڵ کۆماری ئیسلامی ئەنجاممدا، لەمێشکمدا هەڵگرتو چاوەڕانی بارودۆخێکم کرد بتوانم بڵاویان بکەمەوە، ئەوا خوا درێژەی بەتەمەنم داو لەساڵی ٢٠٠٠دا راستییەکان بڵاودەکەمەوە.

لەو دوو هەوڵەی ساڵی ١٩٦٣و ساڵی ١٩٨٥ کەبۆ یەکخستنەوەی ئەو دوو گرووپە بەجەنگ هاتووەی گەلی کورد دابووم، بۆم دەرکەوت کەشێخ ئەحمەد بارزانی هەزار رەحمەت لەگۆڕی، راستی فەرموو (ئیشی کوردان پوچە). هاتمەوە سەرگەڵو لەوێ نیشتەجێ بووم، پاش ماوەیەك لەلایەن دانیشتوانی ئەم دێیەوە وەکو هەرکەسێکی سەرگەڵویی مامەڵەم لەگەڵدا دەکرا ، بەجۆرێك رێزیان لێدەگرتم کەبەروبوومیان دەردەچوو ئەوەندەیان بەدیاری بۆ دەهێنام دەتگوت خۆم خاوەن رەزو باخم. لەو بارودۆخەدا پەیوەندیم بەشێوەیەکی گشتی لەگەڵ ئەندامانی یەکێتی باش بوو، بەتایبەتی لەگەڵ د. فوئاد مەعصومو کاك نەوشیروانو کاك دلێرو کاك مستەفا چاورەش. کاك کۆسرەت کەدەهات بۆ سەرگەڵو بەبەردەوامی سەردانی دەکردمو دەرگای ماڵەکەم هەموو کاتێك بۆ هاولآتیو پێشمەرگەو سەرکردەکان ئاواڵەبوو، پاش ماوەیەك کاك نەشیروان پێی گوتم: دەتکەم بەئەندام مەڵبەند، بەئەدەبێکەوە وەڵامم دایەوە گوتم: من بەجۆرێکی تر خزمەتی ئەم رێبازە دەکەم.

جارێکیان د. فوئاد مەعصومو چەند برادەرێکیتر نانی نیوەڕۆیان لای من دەخوارد، لەکاتی نانخواردندا بروسکەیەکی مام جەلال هات کەدەبێ د. فوئاد وەکو نوێنەری یەکێتی بچێت بۆ ئێران. دوابەدوای ئەوە, یەکێتیو کۆماری ئیسلامی لەیەك نزیك بوونەوە, کۆمەڵێك پاسداری ئێرانی هاتن لەسەرگەڵو نیشتەجێ بوونو پاش ماوەیەك یەکێتی شانبەشانی کۆماری ئیسلامی هێرشێکیان بردە سەر کۆمپانیای نەوتی کەرکوك. چالاکییەکە، پێشمەرگەکانی یەکێتی بەسەرکردایەتی کاك نەوشیروان مستەفا ئەنجامیاندا، بەلآم کۆماری ئیسلامی بەناوی خۆیانەوە بڵاویانکردەوە، ئەوەی جێی سەرسوڕمان بوو ئەم هێزە گەورەیە، بەهەموو چەكو تفاقێکیانەوە چوونە ناو سنوور کۆمپانیای نەوتی کەرکوکەوە بەمەرجێك چواردەورەی کۆمپانیاکە بەسوپا تەندرابووو لەناو کۆمپانیاکەشدا تیمی هەواڵگری بەبەردەوامی هاتوچۆی دەکردو یەك دێی کورد لەدەوری کۆمپانیاکە نەمابوو چونکە هەموو دانیشتوانی دێکانیان گۆڕیبوو بەعەرەب. کاتێك یەکێك لەمەفرەزەکان دەگاتە ناوەڕاستی کۆمپانیاکەوە کەپێی دەگوترێت (ستاپلاین)و نزیك ئەو پرۆژەیەیە کەنەوت دەپاڵێوێت، ئەفسەرێکی سوپای عێراقی بەپلەی نەقیب ڕوودەکاتە سەرۆك مەفرەزەکەو پێی دەڵێ: (ولك شتسوی هنا) واتە ئەوە چی دەکەی لێرەو چەکبە، چونکە ئەو بەجاش تێگەیشتبوو، کورد بۆی نەبوو بچێتە ئەو جێگایە، ئەگەر جاشیش بێت، فەرماندەی مەفرەزەکە بەهێمنی وەڵامی دەداتەوەو دەڵێت: ئاقڵ ئێرە کوردستانەو ئەوەش نەوتی کوردستانە داگیرتان کردووەو دەستتان بەسەر خێروخێراتەکەیدا گرتووە،

ئەمە خاکی ئێمەیەو تۆ لێرە بێگانەیت، ولآتەکەمت داگیرکردووەو قسەشم پێدەڵێیت، چاك بزانە من جاش نیم بەڵکو پێشمەرگەی یەکێتیم، هاتووم ئەم خاکە لەداگیرکەر پاك بکەمەوە، ئینجا زەحمەت نەبێ تۆ چەکەکەتمان بەرێ.

سەدام لەسەر ئەم چالاکییەی یەکێتی کە لەچوونو گەڕانەوەیاندا هیچ کەسێك لەپیاوانی رژێم هەستیان پێنەکردبوو، کۆبوونەوەی بەهەموو کارەبەدەستانی پارێزگای کەرکوك کردو لەگەڵ بەڕێوەبەری ئاسایشو هەواڵگری سلێمانیو بەڕێوەبەرایەتی ئاسایشو هەواڵگری گشتیدا کۆبۆوە، لەکۆتایی کۆبوونەوەکەدا بڕیاریدا بەلەسێدارەدانی هەندێکیانو گرتنی هەندێکیانو دوورخستنەوەی هەندێکی تریان، هەریەکەو بەپێی پلەوپایەی خۆیو دوورو نزیکی لەرووداوەکە سزای دابوونو پێی گوتبوون ئەو هەموو پارەیەی بەناوی پاراستنیولآتەوە سەرفی دەکەن یەکێك لەناو شۆڕشەوە نەهات هەواڵێکتان بۆ بهێنێت، کەواتە ئێوە چەند کاتە چالاکی چیتان ئەنجامداوە؟ بێجگە لەراپۆرتی درۆودەلەسە. صدام لەجیاتی ئەوەی بۆ چارەسەر کردنی کێشەی کورد بەخۆیدا بچێتەوە کەچی زیاتر رقو کینەی لەلا دروستبوو, لەدوای ئەو رووداوە وردەوردە دەستیکرد بەگوێزانەوەی هەموو دێهاتەکانی چواردەوری کەرکوك. هەزار رەحمەت لەباوباپیری ئەو پێشمەرگانەی ئەو کارەیان ئەنجامدا، ئەمە بەڵگەیەکی گەورەیە لەسەر پاکیو دڵسۆزیو فیداکاریی ئەو پیاوانە، ئافەرین سەرکردە بۆ رۆژێك سەربازیت نەکردبێت ئەو پیلانە رێکوپێکە دابنێیتو بەسەرکەوتوویی بگەڕێیتەوە، ئەمە یەکێکە لەو نمونانەی دەریدەخات کەکورد لەسەرانسەری مێژوودا شۆڕشەکانی بەجەنگ نەدۆڕاندووە، بەڵکو تەنها بەسیاسەت دۆڕاندوویانە، بەتایبەتی لەکاتێکدا سووربوون لەسەر ئەوەی واز لەدووبەرەکیو براکوژی نەهێنن لەناوخۆیاندا، ئەمە یەکێك بوو لەو خەنجەرە ژەهراوییانەی کرا بەپشتی پرۆسەی بەرەوپێشچوونی بزووتنەوەی کوردایەتی لەکوردستانی باشوورو برینداركردنی دەروونی هەموو نیشتمانپەروەرێك لەگۆڕەپانەکەدا.

لەرێگای رێکخستنەوە ئاگاداری کاك قادری حاجی عەلییان کردبوو کەفەرماندەی فەیلەقێك، لەکۆتەڵ رادەوەستێت بەدووربین سەیری سورداش دەکاتو دەڵێت شاری قوم بەچاوی خۆم دەبینم. هەواڵ بەرژێمی بەعس گەیشتبووە کەهێزێکی گەورەی سوپای ئێران لەناوچەی سەرگەڵو بەیارمەتی یەکێتی جێنشین بوون، بەڵام ئەو هێزەی کەرژێمی بەغدا باسی دەکرد تەنها لە٧٠ سەرباز زیاتر نەبوون کەچەند ماتۆڕێکی سووریان پێبوو هاتوچۆیان پێدەکرد، بەڵام بۆ تورەکردنی رژێمی بەغدا لەیەکێتی، دەهاتن ماتۆڕەکانیان بەکۆمەڵ رادەگرتو بەناو خەڵکدا هاتوچۆیان دەکرد، ئەوەبوو رژێم ئەم کارەی بۆ هەرس نەکراو بە٩ فڕۆکە سەرگەڵوی بۆردومانکرد. من ئەو نیوەڕۆیە لەماڵی کاك عبدالرحمن سەرگەڵویی میوان بوونم، دوای نانخواردن بەرەو سەرگەڵو هاتمەوە، کەفڕۆکەکان دەستیان بەبۆردومانکرد بەناچاری منو عبدالرحمن لەپەنا بەردێکدا خۆمان شاردەوە تا بۆردومانەکە تەواوبوو، ئینجا کەوتینەوە رێ بۆ ماڵەوە، چاوم بەخەڵکێکی زۆر کەوت

بەپێچەوانەی ئاراستەی من بەرەو بەرگەڵو رایاندەکرد، لەکۆمەڵی یەکەمم پرسی کوێ بەرکەوتووە؟ گوتیان ماڵی رەفیق پشدەری کەسی نەماوە، توشی کۆمەڵی دووەم هاتم لێم پرسین کوێ بۆردومانکراوە؟ گوتیان بارەگای رەفیق پشدەری وێرانبووە، خەریك بوو هەردوو قاچم لەئیش بکەوێت، ئەگەر لەبەر عەیبە نەبوایە نەمدەتوانی برۆم، کابرایەك رووبەڕووم هات ناوی عەبدول حاجی محمود بوو گوتی مژدەم بەرێ کوڕەکانتو برازاکەت هەموویان سەلامەتن، بەڵام خانووەکەتان بەتەواوی روخاوە. لەو کاتەدا دەستم بۆ خوای گەورە هەڵبڕیو پڕ بەدڵ سوپاسم کرد کەمناڵەکانمو هەموو دانیشتوانی سەرگەڵو سەلامەتن. بەرەو ناو دێ هاتم تا گەیشتمە سەرچاوەی کانییەك، لەوێ کاك حامیدی حاجی غالیم دی کەئەو کاتە ئەندامی مەڵبەندبوو، بەدووری ١٠ مەتر لەوەوە پاسداری ئێرانی دوو ماتۆڕسایکلیان پێبوو راوەستابوون، کاك حامید گوتی مناڵەکانت سەلامەتن، گوتم سوپاس بۆ خوا ئەمجارەش نەجاتمان بوو، ئەو پاسدارە پاڵەوانانەی کەخۆیان بەسەر ئێمەدا بادەدەن بۆ لەناو دێکەدا ماونەتەوە، ئەگەر ئەوان راست دەکەن رژێم لەکۆتەڵەو ٢ سەعات لێرەوە دوورە، بۆ بەپێ ناچن بەرامبەر ئەوان بوەستنو لێیانبدەن، پێم ناڵێیت ئەمانە خێروبەرەکەتیان چییە بۆ ئێمە؟ کەکاك حامید گوێی لەم قسانەی من بوو دیاربوو دڵخۆشبوو، بۆیە پیاوانە تراکتۆرێکی هێناو هەموو پاسدارەکانی سواری تراکتۆرەکە کردو لەگوندەکە دووری خستنەوە. کەگەیشتمەوە ماڵەوە هەزار جار سوپاس بۆ خوا کەبازیانو رەوەزی کوڕمو ئارازی برازام سەلامەت بوون، بەڵام دەموچاویان بەبارووتی ناپاڵمەکە رەش هەڵگەڕابوو، لایەکی خانووەکە رووخابوو، فڕۆکەکان ئەوەندە بەکتوپڕی دایان بەسەرماندا کە لەناودێکەدا تەنها وەهابەکەچەڵ فریاکەوت بەرەشاشێکی دۆشکە تەقەیان لێبکات، بەڵام دۆشکەیەك بەرامبەر ٩ فڕۆکە چی پێدەکرێت. رۆژی دوایی کاتژمێر ٤ ی سەر لەبەیانی لەگەڵ هەموو خەڵکی دێکە چووینە دەرەوەی دێ بۆ خۆحەشاردان لەفڕۆکە، دەوروبەری کاتژمێر ١١ گوێم لەبڵندگۆی مزگەوتی سەرگەڵوبوو هاواری دەکرد رەفیق پشدەری بگەڕێتەوە بۆ ناو دێ میوانی هاتووە. کەچووم سەیرمکرد دایکی بازیانو خوشکم لەگەڵ چەند خزمێکدا، برازاکەی خۆمیان بەبوکی هێنابوو بۆ بازیانی کوڕم، کاتێك کەدێکە بەمەیان زانی دەستیانکرد بەپێکەنینو توانج گرتن، گوتیان وەختی بووك گواستنەوەیە، خانوەکەتان رووخاوەو وێرانبووە، منیش داوام لەبوك کرد بگەڕێتەوە بۆ سلێمانی، بەڵام گوتی من لەئامۆزاکەم زیاترنیم، چارەنووسی هەردووکمان بەیەکەوەیە. دوای مانگێك بازیانو بەیانو رەوەزم نارد بۆ لای کاك مەسعود لەسەر داوای خۆی کەگفتی پێدابووم چی بکات بۆ مەسروری کوڕی ئەوەش بۆ بازیانو رەوەز دەکات. دوای چەند مانگێك لەرۆیشتنی ئەوان بۆ ئێران، کاك قادری حاجی عەلی هات بەشوێنمدا، بەیەکەوە چوین بۆ لای مام جەلال، دوای نانخواردنی نیوەڕۆ دووبەدوو دانیشتین، لەشێوازی قسەکانی بۆم دەرکەوت دەیەوێت بچم بۆ دەرەوەی وڵات، بەڵام بەشی زۆری کادرانی یەکێتی وا لەم مەسەلەیە حاڵی ببوون گوایە من دەچم بۆ لندن پەیوەندی بەدەوڵەتەکانی دەرەوە دەکەم، هەندێکیان پێیان دەگوتم بەهەر ١٠ پەنجەکەت ئیمزامان بۆ بکە

بۆ هاریکاریکردن لەگەڵ CIA، وایاندەزانی من سیخوری نێودەوڵەتیم، بەڵام تەنها منو مام جەلال دەمانزانی ئەم چوونەم بۆ دەرەوە بۆچییە؟ کادیران هەرچی قسەیەکیان لەو بارەیەوە بۆ دەکردم من هەر سەرم دەلەقاند، چونکە هیچ کام لەوانە راستییەکانیان نەدەزانی.

لەسەرەتای ساڵی ١٩٨٧ هەواڵم پێگەیشت کەکاک ئیدریس بارزانی کۆچی دوایی کردووە، مانگێك بەسەر پرسەکەدا تێپەری، ئینجا لەگەڵ بازیانو رەوەزو بەیاندا چووەمە گوندی سلیڤانە بۆ بەشداریکردن لەپرسەکەدا، بەیانم نارد بۆلای دایکی کاك مەسعودو بۆ خۆمان چوینە پرسەی پیاوان. لەو کاتەدا کاك مەسعود لەناوچەی بادینان بوو تەنها کاك دڵشاد بارزانی سەرپەرشتی پرسەکەی دەکرد، ٣ رۆژ ئێمەیان هێشتەوە لەسەری سێهەم رۆژدا روخسەتی رۆیشتنمان وەرگرت، چوینە راژان بۆ سەردانی مامۆستای بەرێز کاك علی عبدالله، لەدانیشتنەکەدا ئاگاداریکردم کەسەرداری حەمەی ئەورەحمان ئاغاو محسن دزەیی لەلەندەنەوە بۆ پرسەکەی خوالێخۆشبوو کاك ئیدریس بارزانی هاتوونو بیستویانە کەتۆ لەم ناوەیت حەز دەکەن چاویان پێت بکەویت. گەرامەوە سلیڤانە چەند سەعاتێك لەخزمەتیاندا دانیشتم، لێم پرسین کەی دەگەرێنەوە؟ گوتیان نزیکەی هەفتەیەکی تر، منیش بەپەلە نامەیەکم بۆ مامۆستا ابراهیم احمد نوسیو دامە دەستی، ئینجا خۆمو منداڵەکانم گەراینەوە بۆ نەغەدە. لەو ماوەیەدا لەسەرچاوەیەکی باوەرپێکراوەوە بیستم کەکاك دڵشاد بارزانی بەئەندامی مەکتەبی سیاسی لەجێگای ئیدریس بارزانی دادەمەزرێنن، لەم بارەیەوە پرسیارم لەکاك دڵشاد کرد گوتم: بیستومە تۆ دەچیتە جێگای کاك ئیدریس؟ لەوەڵامدا گوتی: من دەخوێنمو کۆلیج تەواو دەکەم، ناتوانم ئەو کارە بگرمەدەست. نێچیر لەسەرتادا هیچ نەبوو وەکو هەموو نەوەکانی تری مەلامستەفا ئەمیش نەوەی مەلامستەفا بوو، دوای نەمانی مەلامستەفا تەنها دوان لەکورەکانی مەلامستەفا سەرپەشتی بنەماڵەو پارتییان دەکرد، کەئیدریس نەما نێچیری کوری یەکەمجار بەلێپرسراوی پاراستن دامەزرا، دوایی کرا بەئەندامی مەکتەبی سیاسی.

دوای شەش مانگ لەکەرەج پرسیارم لەمامۆستا جەرجیس فتح الله کرد کەهۆی چییە محسن دزەیی شەش مانگە لێرە ماوەتەوە لەکاتێکدا بەمنی گوت دوای یەك هەفتە دەگەرێمەوە بۆ لەندەن؟ لەوەڵامدا گوتی تەنها ئەم لەسەروەتو سامانی بارزانی ئاگادارە کەچەندەو لە چ بانقێك هەڵگیراوە، بۆ ئەوەی بزانن کەبەشی ئیدریس لەدوای (فائزی) ئەو ساڵانە کەچووەتەسەری، چەندە!.

هاتمە تاران لەمیوانخانەی فردەوسی دابەزیم، دوای ئەوە چاوم بەکاك رفعەت کەوت کەلێپرسراوی یەکێتی بوو لەتاران، بۆ ئەوەی یارمەتیم بدات بچم بۆ لندن. کاربەدەستێکی کۆماری ئیسلامی دیاریکرابوو بۆ چاوپێکەوتن لەگەڵ ئەو پەناهەندانەی دەیانەوێت لەئێرانەوە بچن بۆ هەندەران، کاك رفعەت شێوازی چاوپێکەوتنەکەی لەگەل ئەو دەزگایەدا بۆ دیاریکردم. کەچوومە ئەوێ زۆر بەساردییەوە مامەڵەیان لەگەڵدا کردمو هاتوچۆیەکی بێسوودیان پێکردم. ماوەی شەش رۆژمان بەخۆشی لەماڵی مامۆستا هەژاری شاعیر

لەکەرەج بردەسەر بەو نیازەی منو کوڕەکانمو بوکەکەم هەر هەموومان بەیەکەوە بچین بۆ هەندەران، بەلاّم کەزانیمان ئەم چاوەڕانییە زۆری پێدەچێت داوامان لەمامۆستا هەژار کرد خانوویەکمان بۆ بگرێت، ئەوەبو لە گەوهەردەشت خانویەکی بۆ گرتینو سێ مانگ لەوێ ماینەوە، بەهۆی مامۆستا هەژارەوە د. شیرازیمان ناسیو لەماڵەکەی لەتجریش، سەردانمان دەکرد. رۆژێکیان د. کمال خۆشناو هات بۆ لامان، لەبەیانیەوە تا ئێوارە لەلامان مایەوە، فەرمووی کورد داوای حوکمی زاتی دەکات بەلاّم ئەم ژیانەی ئێوە سەربەخۆیی زاتییە نەك حوکمی زاتی.

## پەیوەندی لەگەڵ ئێرانداو هەڵاتنم

لەدوای دوو مانگ بە(ابوعلی)یان ناساندم کە لەنوسینگەی سەرۆکوەزیران بوو، بەهۆی ئەم پیاوەوە وردەوردە کاربەدەستانی ئێرانم دەناسیو هەتا دەهات زیاتر هاتوچۆیان دەکردمو زۆر لێم نزیکبوونەوە، کارگەیشتە ئەوەی لەهەفتەیەکدا چوار دانیشتنیان لەگەڵمدا ئەنجام دەداو هەموو وتووێژەکانیشمان لەسەر عێراق بەگشتیو کورد بەتایبەتی بوو، پرسیاریان لەوە دەکرد ئایا چۆن سەرۆکی عێراق دەروخێت؟ چۆن لەمیللەتی کورد نزیکببینەوە؟ کەی ئەو رۆژە دێت کەگەلی کورد باوەڕی بەئێمە بێت؟ لەماوەی ئەو چەند مانگەدا چاوم بەبەشێکی زۆری لێپرسراوانی ئێران کەوت، هەرچییەکم لەگەڵ مستەفەویدا دەربارەی کێشەی کورد باسکردبوو، بەهەمان شێوە لەگەڵ ئەمانیشدا دووبارەم کردەوە، بەلاّم ئەمجارەیان دوای گفتوگۆیەکی زۆر گەیشتمە ئەو باوەڕەی کەکۆماری ئیسلامی، بەئەندازەی تاڵە موویەك نیازی یارمەتیدانی کوردیان نییە، زۆر نەرمونیان بوون لەگەڵمداو بەهەموو شێوەیەك دەیانویست چی پێویستییەکمان هەیە بۆمان دابین بکەنو رێزێکی تایبەتییان لێدەگرتم، منیش بەهەمان شێوە رێزم لێدەگرتنەوە، بەلاّم من، لەناخی خۆمدا دەمزانی ئەوان بە چ نیازێك ئەو رێزە زۆرەم لێدەگرن، هەموو هەوڵێکی ئەوان لەگەڵ مندا بۆ ئەوەبوو کەبمکەن بەئەڵقەلەگوێی خۆیانو چۆنیان بوێت ئاوا هەڵسوڕێم، منیش هەمو هەوڵێکم لەگەڵ ئەواندا بۆ ئەوەبوو کەبزانم چییان بۆ کورد بەگشتیو لەسەر یەکێتیو پارتی بەتایبەتی پێیە، ئەم بێنەوبەردەیەی من لەگەڵ کۆماری ئیسلامیدا ٧ مانگی خایاند.

دوای ئەوەی توانیم هەندێك زانیارییان لەسەر یەکێتیو پارتی لێوەرگرم ئینجا نامەیەکم بۆ کاك مسعود نوسی گوتم دەمەوێت چاوم بەخۆت یان یەکێکی باوەڕپێکراوی خۆت بکەوێت هەندێك زانیاری زۆر گرنگم پێیە کەدەمەوێت جەنابتانی لێئاگاداربکەمەوە. رۆژی دوایی مامۆستا هەژار پێی راگەیاندم کەسبەینێ سەعات ٤ی عەسر، مامۆستا علی عبدالله لەکەرەج لەماڵی خۆیان چاوەڕێت دەکات. یەکترمان بینیو بۆ ماوەی چەند سەعاتێك دانیشتین، لەهەموو ئەو هەڵوێستو پیلانانەی کەکۆماری ئیسلامی نیازی جێبەجێکردنی هەیە ئاگادارمکردەوە، گوتی: رایان بەرامبەر بەمردنی کاك ئیدریس چیبوو؟ گوتم: گوتویانە الحمدلله کەرزگارمان بوو لەدەستی. ئینجا هەواڵم بۆ مام جەلال نارد کەچاوم پێبکەوێت، وەلاّمیدامەوە گوتی: د.فوئاد لەتارانە،

منیش تەلەفونم لەگەڵ کرد بەڵام نەمانتوانی یەکتر ببینین چونکە ئەو لەسەر گەڕانەوە بوو. دوای کەوتم بۆ بارەگای یەکێتی لەدۆڵەکۆگێ بەڵام ئەوێشی بەجێهێشتبوو، لەوێ هەرچی زانیارییەکم لەلابوو کردم بەراپۆرتێكو لەسەر فەرمانی مام جەلال دامە دەست نێردراوێکی خۆی.

کەزانیم کۆماری ئیسلامی بەرامبەر کورد هیچی باشی پێ نییەو دەیانەوێ رامبکێشنە ناو تۆڕە سیخوڕییەکانی خۆیانەوە، داوام لەخێزانە تازەکەمو کوڕەکانو بوکەکەم کرد بگەڕێنەوە بۆ سەقز بەنیازی هەڵاتن لەدەستی کۆماری ئیسلامی، پێم گوتن کەگەیشتنەوە ئەوێ خۆتان حازر بکەنو چاوەڕوانی من بکەن تا دەگەمە لاتانو هەوڵ بدەن خانوویەکتان بەرامبەر ئیتلاعات دەستکەوێت بۆ ئەوەی راستەوخۆ لەژێر چاودێری ئەواندا بن نەوەك لەرێی بەکرێگیراوەکانیانەوە هەواڵی ئێمەیان پێبگات. کەئەوان گەیشتنە ئەوێو لەجێبەجێکردنی ئەو پیلانەی بۆم دانابوون دڵنیابووم، سەیارەیەکی تایبەتیم گرتو بەرەو سەقز بەڕێکەوتم. دوای ١٢ سەعات لەگەیشتنم بۆ لای ئەوان، لەسەقز لەلایەن کۆماری ئیسلامیەیەوە دەستگیرکرامو لەژورێك دایاننام حەمام بوو، دوای ٦ سەعات منیان بەچاوبەستراوی لەوێ هێنایە دەرەوەو لێکۆڵینەوەیان لەگەڵدا کردم، گوتیان تۆ پەیوەندیت بەنوسینگەی سەرۆك وەزیرانەوە هەیەو دەبوایە پێش ئەوەی تاران بەجێ بهێڵی نوسینگەی سەرۆك وەزیرانت بەتەلەفون ئاگادار بکردایتەوەو بە(ابو علی)یت بگوتایە رێگام بدەن بۆ سێ چوار رۆژ بچم بۆ سەقز، ئێستاش کەتۆمان دەستگیرکردووە بەتاوانی هەڵاتن لەدەست دەسەڵاتی کۆماری ئیسلامی، بە(خائن) لەقەڵەمدراوی!

بەڵام من هەر لەتاران وەڵامی ئەم لێکۆڵینەوەیەم ئامادە کردبوو چونکە ئەوە یەکەم جار نەبوو کەتوشی لێکۆڵینەوە ببم لەژیانمدا، وەڵاممدایەوەو گوتم: من عەشق هەڵیگرتووم، چونکە من لەم تەمەنەدا ئافرەتێکم دەستکەوتووە کە ١٨ ساڵ لەخۆم منداڵترەو دوای ١٢ رۆژ لەگواستنەوە، منی بەجێهێشتو بەناچاری هاتەوە بۆ ئێرە چونکە لێرە مامۆستایە، من بەم کارە دنیام لێهاتەوە یەك بۆیە خۆمم بۆ نەگیراو ناچاربووم بەبێ ئەوەی پەیوەندیتان پێوە بکەم ئۆتۆمبیلێکم گرتو هاتم بۆ سەقز، ئەگەر دەڵێن ئێستا دەگەڕێمەوە بۆ تاران، راست دەفەرموون من هەڵەم کردووە، ئێستاش هەرچی مامەڵەیەکم لەگەڵدا دەکەن پێی رازیم. ئەوانیش هەموو قسەکانی منیان بەتەلەفون گەیاندە تاران کە لەوەڵامدا گوتیان: دەبێ سبەینێ بەزووترین کات بگەڕێتەوە بۆ تاران. گوتم: مادام وایە حەز دەکەم خزمەتێکتان بکەم، سبەی شەو هەر هەمووتان لای من میوان دەبنو دوو سبەی بەیانییەکەی دەگەڕێمەوە تاران، گوتیان ئێمە زۆرین، گوتم خۆ ٣٠٠٠ کەس نابن، وەڵامیاندایەوە نەخێر ٣٠٠ کەسین، گوتم زۆر ئاساییە، ئینجا چاویان کردمەوەو تا دەرگای دەرەوە بەڕێیان کردمو پێیان گوتم سبەی شەو هەموو لەلای تۆ میوانین، وەڵامم دانەوە (چەشم). کەبەجێم هێشتن رەوەزی کوڕم گوتی ئەو ناپیاوانە بەندیشیان کردوویت کەچی تۆ میواندارییان دەکەیت، گوتم کوڕم ئەوە ئیشی تۆ نییەو نایزانیت.

گەیشتمەوە ماڵەوە، ئەو شەوە هەموو پێویستییەکانی خۆمانمان پێچایەوەو کەرۆژ بووەوە هاوسەرەکەم زۆر ئاسایی دەوامی قوتابخانەکەی کرد کەلێی مامۆستا بوو. دوای ئەوەی کەهاتەوە ماڵەوە، پێکەوە چووین ١٢ پاکەت شیرینیمان کڕیو کۆستەرێکمان راسپارد عەسرێکی درەنگ بێت بەدوامانـد، لەکاتی دیاریکراودا هەموو سواری پاسەکە بووینو بەرەو مەهاباد کەوتینەرێ، وا خۆمان نیشاندا کەخێزانەکەمو بووکەکەم تازە بووکنو بەبوکی دەیانبەین بۆ مەهاباد، کەدەگەیشتین بەخاڵی پشکنین پێش ئەوەی پرسیارمان لێبکەن دەستبەجێ چەند پاکەتێك لەو شیرینییانەمان دەدانێو دەمانگوت: ئەوە شیرینی ئەو بوکانەیە، ئەوانیش لەخۆشی شیرینییەکان هیچیان لێنەدەپرسین. شەو گەیشتینە مەهاباد، چووینە ماڵی دۆستێکی خۆم، دوای پشوودانێك کاتژمێر ١٢ی شەو بەرەو رەزائییە کەوتینەوەرێ، کەگەیشتینە ئەوێ هێشتا بانگی بەیانی نەدابوو، لەچێشتخانەیەك نانێکی چاکمان خواردو نوێژەکانمان کردو کەوتینەوە رێ بۆ سلیڤانە. کەگەیشتینە ئەوێ تازە خۆر خەریکبوو دەردەکەوت، دەستبەجێ خۆم بەبرا بارزانییەکان ناساند ئەوانیش ئێمەیان بردە بارەگایەکی تایبەتی خۆیان، ئینجا هاتینە خوارەوە شتومەکەکانمان لەپاسەکە داگرتو بەبرا شوفێرەکەم گوت: کرێی ئاسایی خۆت چەندە؟ گوتی (ئەوەندەیە) منیش چەندی گوت دوو ئەوەندەم پێدا، گوتی ئەوە بۆ؟ گوتم ئێمە لەدەست کۆماری ئیسلامی رامانکردووە بۆیە ئەو پارە زیادەت دەدەمێ کە نە خۆت نە ئێمە توشی کێشەو گرفت نەکەیت، ناوت ناهێنم ناوم مەهێنە، ئەگەر ناوم بهێنیت تەنها خۆت زەرەر دەکەیت، لەوەڵامدا گوتی: مادام تۆ لەدەست ئێران راتکردووەو بەقاچاغی هاتویتە ئێرە من کرێیەکەی خۆشمت لێوەرناگرمو ناویشت ناهێنمو بەقاچاغی لەشنۆوە دەگەڕێمەوە، بەڵام من رازی نەبوومو کرێکەی خۆیم بەزیادەوە پێدا.

## پەنابردن بۆ بنەماڵەی بارزانی

هەواڵم بۆ کاك مەسعود نارد کەڕامکردووەو پەنام بۆ تۆ هێناوە. کاك نێچیرڤانو کاك دڵشاد بارزانی هاتن بۆ لام، ئەوان وا تێگەیشتبوون کەمن لەدەست یەکێتی رامکردووە، بەڵام بۆم روونکردنەوە کە لەدەست کۆماری ئیسلامی رامکردووە، چونکە ئەو سیاسەتەی ئەوانم بەلاوە پەسەند نەبوو، راستە من لەگەڵ حکومەتی عێراقیدا (بەعس) هاوکاریمکردووەو ئەمە ئاساییە چونکە من هاوڵاتییەکی عێراقیم, بەڵام لەگەڵ کۆماری ئیسلامیدا هاوکاری بکەم بەسیخوڕی نێودەوڵەتی لەقەڵەم دەدرێم. ئینجا کاك نەوچیرڤانو کاك دلشاد بەجێبەکەی کاك مەسعود کە لەخاڵەکانی پشکنیندا راناگیرێت ئێمەیان بۆ ئەو بارەگایە گواستەوە کەتەنها هاوینان لێی دادەنیشتن، چونکە زستانان سەرماکەی زۆر سەخت بوو. بەخەڵکی دێکەیان گوت ئەوە ماڵەشێخە هاتۆتە ئێرە. من نەدەهاتمە ناو دێیەکە بۆ ئەوەی کەس چاوی پێم نەکەوێت. تا ماوەی ١٥ رۆژ لەو خواردنانەی کەئەندامانی م.س. دەیانخوارد بەئامادەکراوی بۆ دەناردین، دوای ١٥ رۆژەکە پێیان گوتین هەموو شتێکتان دەدەینێو خۆتان ئامادە بکەن. لەماوەی ئەو چوارمانگو نیوەدا کەلەوێ بووین بۆمان

هـەبوو بەهـەموو شـێوەیەك چـیمان پێویـست بوایـە لەگەنجینـەی م.س. بمانهێنایـە، بـۆ نمونـە هـەموو پێشمەرگەیەکی پارتی مانگانە تەنها تەنەکەیەك نەوتی هەبوو، بـەڵام هەفتـەی یـەك بـەرمیل نـەوتیان بەئێمـە دەدا، بەشێوەیەکی زۆر دۆستانەو برایانە رێزیـان لێـدەگرتین، وەکـو یـەکێك بـین لەبنەماڵـەی بـارزانی، بـەڵام لەرووی رامیارییەوە ئێمە بۆیە چووبووینە ئەوێ تا لەدەسـت کۆمـاری ئیـسلامی رابکـەینو بـچین بـۆ تورکیـا، چونکە نەماندەتوانی چیتر لەئێراندا بمێنینەوەو پارتی سنوورەکەی بەتورکیاوە بوو بۆیە چـوینە ناویانـەوە، لەماوەی ئەم چوار مانگو نیوەدا، ئـەوەی بەمێشکمدا هاتبێـت خـستومەتە سـەر کاغـەزو وەکـو پێـشنیارێك ناردومەتە بەردەم کاك مەسعود. شەوێکیان کاك عمر دەبابە هاتە لامان بۆ ئـەوەی قـایلم بکـات ئێـران بـەجێ نـەهێڵم، پـێم گـوت: هاتووینەتـە دەرەوە بـەنیازی تورکیـا بـەرێ کـەوتوینو لەوێـشەوە بـۆ دەرەوەی وڵات. هەروەها کاك علی عبداللەش خۆی لێم دەشاردەوە بۆ ئەوەی باسی رۆیشتنەکەی خۆمی لەگەڵدا نەکەمـەوە، پاش ماوەیەك گەیشتمە ئەو باوەڕەی کەکاك مەسعودو کاك نەوچـیرڤان بـەڕێمان ناکـەنو دەماندەنـە دەسـت کۆماری ئیسلامیو لەرێگای ئەوانەوە دەبینە داردەستی کۆماری ئیسلامی. لە١٩/١١/١٩٨٧ لـەرێگای بازیـانی کوڕمەوە وەڵامم بۆ چەند دۆستێك لەگوندی راژان نارد کەبێن بەنهێنی بیـانبینم، باسـی ئـەوەم لەگـەڵ کـردن کەدەمەوێت رابکەم، ئەوانیش مەردانە هەموو شتێکیان بۆ ئامادەکردم کەچۆن بکەوینە رێ. پرسیاری مـاوەی رێگاکەمان لێکردن؟ گوتیان لەراژانەوە بۆ تورکیا بەپێ ٨ سەعاتە. ئـەو شـوێنەی کـەلێوەی دەکەوتینـە رێ سێگۆشەکەی نێوان ئێرانو تورکیاو عێراق بوو، ژیان لەم ناوچەیەدا تـەنها لـە١٥/٦ــەوە تـا ١/٨ بەردەوامـە، چونکە لە٥/٨ەوە بەفر دەبارێت تا کۆتایی مانگی سێو هیچ کەسێك لەدوای ئـەم بـەروارەوە ناتوانێـت لـەوێ بژی. لەگەڵ دوانزە کەسی دێیەکەدا بەنهێنی رێککەوتین کەلەم گەشتەماندا لەگەڵمانـدا بـنو ئاگادارمـان بـن بۆ ئەوەی بەنهێنی بڕۆین، بڕیار وابوو چوار لەوانە لەگەڵ خۆماندا بنو هەشتیشیان لەپێـشمانەوە بەماوەیـەك بڕۆن.

## هەڵاتن بۆ تورکیا

١٠ی شەو بەرێ کەوتین, ماڵەکەمان وەکو خۆی بەجێهێـشت, پەتۆیـەکی گـەورەمان بـەدەرگای دەرەوەدا کردو وامان نیشاندا کـە لـەژوورەوەین. دوای سـێ سـەعات لـەرێگابڕین زریـانێکی تونـد هـەڵیکرد چـاو چـاوی نەدەبینی، بەناچاری هەمووومان دانیشتین, من دەمگوت: دەگەڕێمەوە, قاچاخ نیم لەکۆماری ئیسلامیو ئەگەر قاچاخیش بم خۆ ماڵو منداڵەکەم قاچـاخ نـین. بـەڵام هـیچ کـام لـەماڵو منداڵـەکانم قـسەکەی منیـان پەسـەند نەکرد. لەدوای دوو سەعات زریانەکە خستی، کەسەیردەکەین ئـەو هەشـت کەسـەی لەپێـشمانەوە دەرۆیـشتن لێمان دابڕابوون، کەوتینەوەرێ, لەهەندێ جێگادا یەك مەتر بەفر بارییبوو، لەهەندێکی شوێنی تردا نیو مـەترو لەهەندێك شوێن ٥ سم بارییبوو، هەندێك جار بەشوێنێکدا دەرۆیشتین بەفرەکـەی لـەوەدابوو هـەرەس بێنێـت, پاش ماوەیەك بۆ جاری دووەم زریان دەستی پێکردەوە، ئـەمجارەیان هەریەکـەو لـەلای خۆیـەوە شـایەتمانی

هێناو گەردنی یەکترمان ئازادکرد، رۆژ بۆوەو لەناکاو کابرایەك لەو چۆڵەوانییەدا پەیدابوو, وامانـدەزانی پاسدارە، نزیك بۆوە بینیمان پێشمەرگەیەکی دیموکراتە ناوی کاك خالد بوو، منی دەناسیو دووربەدوور گوێی لەمشتومڕمان بوو کەدەمانەوێت بگەڕێینەوە, گوتی: تازە رێگەتان نادەم بگەڕێنەوە, ئەوەندەی ئاگادار بم تۆ کوردێکی نیشتمانپەروەریت بۆیە چەند لەتوانامدابێت یارمەتیتان دەدەم, ئەوەی کێشەی بۆ ئێوە دروستکردووە ئەو ئافرەتانەیە, من لەگوێزانەوەیاندا یارمەتیتان دەدەم. ئینجا قسەکەی خۆی بردەسەر.

زریانەکە وردەوردە هێور بۆوە, دانیشتین نانی نیوەڕۆمان لەسەر ئەو بەفرەدا خوارد، یەکێك لەو گونیانەی کەپێمان بوو سوتاندمانو بەبەفرەکە چامان لێناو پشوویەکی تەواومانـدا. ئێوارەکەی لەکاتـژمێر ٥ دا بۆ جاری سێیەم زریان دەستی پێکردەوە، بەڵام پێش زریانەکە بەنیو سەعات کاك خالد لەسەر رەزامەندی خۆمان بەجێی هێشتین، زریانی ئەمجارەیان لەهەردوو جارەکەی تر توندتربوو، چوار کەسەکەی لەگەڵماندابوون لەبەر ئەوەی شارەزا نەبوون بەجێیان نەدەهێشتین دەیانگوت: ئەگەر مردن لەرێگاماندا بێت ئەوا با پێکەوە بمرین. بەهۆی توندیو ساردی زریانەکە ئەمجارەیان بەتەواوەتی خۆمان بۆ مردن ئامادەکردو سات نا ساتێك دەمانگوت ئێستا رەق دەبینەوەو منیش بەبەردەوامی دەمگوت تاوانباری گەورە منم. سوپاس بۆ خوا ئەمجارەشیان نەمردینو زریانەکە هێوربۆوەو بەرەو کوردستانی باکوور کەوتینەڕێ، ٣٠٠مەتر دوور لەگوندەکە سەیرمکرد ئەو چوار کەسەی لەگەڵماندابوون رایاندەکێشاین بۆ ئەوەی لەو شوێنەدا کەپیایدا دەڕۆین نەوەستین چونکە توانامان نەمابوو, دەبوایە هەموو دە هەنگاوێکیش رابوەستین تۆزێك پشو بدەین، دوایی کەگەیشتین پێیان گوتم ئەو نێوانە, سەرەکەی بەستوویەتی بەڵام لەژێرەوە ئاوە، بۆیە نەماندەهێشت لەوێ بوەستن چونکە ئەگەر بشکایە دەکەوتنە ناو ئاوەکەو دەخنکان. کاتژمێر ٨ی شەو گەیشتینە گوندی ئەشکەوتان، هەزار جار الحمدلله کە سێ جار لەمردن رزگارمان بوو. یەکەم شت کەلەگەڵیان کردین کەدەترسان قاچمان رەش بوبێتەوەو سەرما بردبێتی، سوژنێکیان هێناو کردیان بەقاچماندا، کەزانییان هەمووومان هەستی پێدەکەین، ئاوێکی شلەتێنیان هێنا دەموچاوو دەستو قاچمانیان شۆرد، ئینجا بەزۆر چایەکی زۆریان دەرخوارد داین، ئەو ماوەیەی نێوان راژانو ئەشکەوتانمان بە٢٢ کاتژمێر بڕیو پێش ئێمە، ئەوانەی گەیشتبوونە ئەوێ سێ کەس بوون تەنها یەکێکیان مابوو, دوای ئێمەش بەچوار رۆژ دوو کەس بەرێگاکەی ئێمەدا دێن بەڵام یەکێکیان رەق دەبێتەوە. ئەو رێگایە ساڵانە چەندەها کەسی تیا رەق دەبێتەوە، یان قاچی رەش دەبێت، منیش لەخۆشی ئەوەی کە بەسەلامەتی رزگارمان بوو حەیوانێکم کرد بەقوربانی، دوای یەك رۆژ حەسانەوە, لەترسی کوڕانی مەلامستەفا بەپەلە گواستمانەوە بۆ گوندی شێخان.

هەموو دانیشتوانی ئەو ناوچەیە، هاوسۆزی PKK بوون, کەزانییان بنەماڵەیەکین لەپێنج کەس پێکهاتووینو لێمان قەوماوەو لەدەست حکومەتی عێراق رامانکردووەو لەئێرانیش قاچاخینو بەبێ ئاگاداری

کاك مەسعود راژانمان بەجێهێشتووە، بەهەموو شێوەیەك پشتگیرییان لێدەکردین‌و یارمەتییان دەداین، تەنانەت شەوان ئەگەر بمانویستایە لەماڵێکەوە بچین بۆ ماڵێکی تر پاسەوانییان دەکردین, بەهیچ شێوەیەك سڵیان لەو بازگەیە نەدەکردەوە کەکیلۆمەترێك لێمانەوە دوور بوو. ئەم هەڵوێستە مەردانەیەی خەڵکی ئەم ناوچەیە متمانەیەکی زۆری بۆ دروستکردم بەرامبەر بەخەڵکی ئەو ناوچەیەو بۆم دەرکەوت ئەگەر یەکێك لەگەڵ خوای خۆی‌و نیشتمانەکەیدا راستبکات‌و بەبێ بەرامبەر هەوڵیان بۆ بدات ئەوە لەهەر پارچەیەکی کوردستان دابنیشێت خوا سەرفرازو خۆشەویستی دەکات لەناو ئەو خەڵکەداو رێزێکی زۆری لێدەگیرێت, هەروەها بۆم دەرکەوت کەکوردستان هێشتا یەك پارچەیە بەڵام بۆ کێ؟ بۆ ئەو کەسەی بەدڵێکی فراوان‌و بێ فرتوفێڵ هەوڵ بۆ سەربەرزیی نیشتمانەکەی دەدات‌و رۆژو شەوی بۆ سەروەری میللەتەکەی تەرخانبکات.

دوای تێپەڕبوونی ١٢ سەعات بەسەر گەیشتنمان بۆ دێیەکە، بۆمان دەرکەوت کەهەموو سەلامەتین، ئینجا بەتەنها منیان بردە ژوورێك چاوم بەپیاوێك کەوت تەمەنی چل ساڵ دەبوو, خەڵکی ئەو ماڵە نەبوو، دانیشتین ماوەی سەعاتێك دووبەدوو گفتوگۆمانکرد لەکۆتاییدا بۆم دەرکەوت ئەم پیاوە کادرێکی پێشکەوتووی پەکەکەیە، هەرچەندە خۆی وا پیشان نەدەدا, هەوەها بۆم دەرکەوت کەئەویش لەتورکیا قاچاخە. باسی رابردووم بۆ کرد بۆم گێڕایەوە کە لەساڵی ١٩٨١ لەشام بەهۆی کاك عزیز عەقراوییەوە لەلای حکومەتی سوریا پەناهەندەبوو لەیانەیەکی سەربازی لەشام دایاننابوو، لەکاتی میوانداریکردنی مندا بەڕێز عبدالله ئوج ئالانم لەهەمان میوانداریدا ناسی، دوای ئەوە چەند جارێکی‌تر لەو یانەیەدا چاومان بەیەکتر کەوتەوە. دوای ئەم باسەم بۆ ئەو پیاوە, ئەو خزمەتە گەرموگوڕە کراین کە لەسەرەوە باسمکرد، ١٣ رۆژیشمان لەشەمدینان بردەسەر بەبێ ئەوەی کەسێك حکومەتی تورکیا لەئێمە ئاگادار بکاتەوە. هەروەها لەو ماوەیەدا بۆم دەرکەوت کەئەمانە پارتێکن لەناوخۆیاندا زۆر دڵسۆزن‌و باوەڕیان بەجەماوەر زۆرەو جەماوەری سەرانسەری کوردستانی باکوور باوەشیان بۆ کردونەتەوەو بەهەموو شێوەیەك هاوکارییان دەکەن چونکە وەکو پرسیارمکرد لەو خەڵکە دەیانگوت: ئێمە زۆر دڵنیاین لەوەی کەسەرکردەکانمان ئەڵقەلەگوێ نین‌و خیانەتمان لێناکەن، بۆیە ئێمە خۆمان‌و ماڵ‌و منداڵمان لەم رێبازەدا بەختدەکەین. بەراستی ئەم هەڵوێستەی هەردوولا جێی سەرنج بوو لەلای من, لەناخی خۆمدا بۆچوونێکم بۆ دروستبوو کەئەگەر پارچەیەکی کوردستان بەتەواوەتی رزگاربێت ئەوە کوردستانی باکوورە, چونکە جەماوەرو سەرکردە یەك گوتارو رەفتاریان هەیەو ئەگەر لەکوردێکی بەشی سەرووی کوردستانی باکوور لەگەڵ کوردێکی خوارووی‌و لەکوردێکی رۆژهەڵات‌و رۆژئاوای کوردستانی باکوور بپرسیت کێ سەرکردەی کوردەو کێ کورد رزگاردەکات؟ هەر هەموویان دەڵێن عبدالله ئۆج ئالان. بۆنموونە لەسەرەتای مانگی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٩٩دا بەبرادەرانی م.س. حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێرانم گوت: لەدە کوردی ئێرانم پرسی کەخەڵکی مەهاباد بوون باوەڕتان بەکێیە کوردستان رزگار بکات؟ نۆ کەسیان گوتیان عبدالله ئۆج ئالان، کەواتە ئەگەر خۆتان چاك نەکەن ئەو تەنها

کەسەشتان لەگەڵدا نامێنێت. لەساڵی ١٩٩٦ لەدێی رێزان لەشێخ محمدخالد بارزانیم پرسی، پەکەکە لەکوێیە؟ دەستی درێژکردو گوتی ئەوەتا لەو شاخەن، گوتم نەخێر، لەزێی گەورەوە بەرەو بادینان ٩٠٪ی خەڵك لەگەڵ پەکەکەدان.

دوای تێپەڕبوونی ١٤ رۆژ لەشەمدینان، بەڵگەنامەی ساختەیان بۆ دروستکردین بۆ ئەوەی بتوانین پێی بگەینە ئەستەمبول، کە بەقاچاغی لەشار دەرچووین میت گرتینی، هەندێك پرسیارو وەڵامیان لەمن کردو هەندێك ئازاری بازیانی کوڕمیاندا، ئینجا منیان بردە بەڕێوەبەرێتی پۆلیس. لەوێ بەڕێوەبەر چەند پرسیارێکی لێکردم، لەکاتی وەڵامدانەوەدا بەدەستی ئەنقەست ٦٠٠ دۆلارم لەگیرفانی کراسەکەمەوە بەردایەوە سەرمێزەکەی، چونکەوام بیستبوو هەموو کارمەندانی تورکیا بەرتیل دەخۆن، کەچاوی بەپارەکە کەوت بۆی هەڵگرتمەوەو گوتی: بەرۆژوی؟ گوتم انشاءالله، گوتی تۆ لەباوکم دەکەیت, من پێم وایە ئێوە خێزانێکی خراپ نین, بەو جلوبەرگەی کە لەبەرتاندایەو بەو پارەیەی کەویستت بیدەی بەمن دەتەوێ منداڵەکانت رزگاربکەیت، بەپێی ئەو ئیفادەیەی لێت وەرگیراوە رای دەزگای میت هەمووی دژ بەتۆیە, بەڵام بۆ خواو لەبەر خاتری دەموچاوی تۆو ئەو دو ئافرەتەی کەلەگەڵتایە پارەکەتم لێوەرگرەوەو ئیشەکەشت بۆ ئاسان دەکەم لەبەر ئەوەی کەمانگی رەمەزانەو لێقەوماوی.

لەدوای تێپەڕبوونی سەعاتێك ناردی لەسەر حسابی خۆمان سەیارەیەکی فۆردی ستێشنی سوری بۆ بانگکردین، شتومەکەنیان خستە ناوی، خەریك بوو سواربین منیان بۆ لای بەڕێوەبەری پۆلیس گەڕاندەوە, کەئەمجارە چوومەوە کابرای میت لای دانیشتبوو گوتی: خاڵۆ گیان تۆ بەپێی یاسا هیچت لەسەر نیەو ئەم سەیارەیە تا شاری وان دەتبات، بەدەست ئەم (میت)انە بێت تۆ دەبێ لێرە بمێنیتەوەو رەنگە مانگێکیشتان زیاتر پێ بچێت، خوا قبوڵ ناکات ئێوە ئافرەتتان لەگەڵدایە تووشی ئەو ئەشکەنجەیە ببن. بەڵام کابرای میت زۆر هەوڵیدا ئێمە بمێنینەوە، بەڕێوەبەری پۆلیس بەگوێی نەکرد، ئینجا گوتم یەك داواکاریم هەیە, ئەگەر بکرێت جەنابتان لەجێی خۆتان نەجوڵێن چونکە ئێمە ئەگەر لەرێگای وان بگیرێینەوە ئەوا تەلەفون بۆ تۆ دەکەن بۆ ئەوەی تۆش ئاگادارمان بیت نەگیرێین‌و دوامان نەخەن، ئەفسەرەکە لەوەڵامدا فەرمووی: انشاالله درێغی ناکەم، سواری سەیارەکە بووین‌و رۆیشتین، سوپاسی یەزدانم کرد کەئەو کابرایەی بۆ کردین بەهۆکارێك بۆ رزگاربوونمان. کاتێك گەیشتینە ناوچەی هەکاری، جارێکی تر پۆلیسی تورکی دەستگیریان کردینەوە، لەژوورێك دایاننایین‌و ئێمە لەترسی ئەوەی لەپشکنیندا هیچمان پێنەگرن هەرچی بەڵگەنامەیەکی عێراقیمان پێبوو لەپاسپۆرت‌و ناسنامە، هەمویمان فرێدایە ئاودەستەوەو کونەمشکمان لێبوو بەقەیسەری. ئەفسەرێك هات کاغەزێکی بەدەستەوە بوو پرسی کامتان رەفیقن؟ ئینجا ناوی هەموومانی بەتەواوی هێنا، لەوەڵامدا گوتمان ئێمە ئەو ناوانە نین, هەر پێنجمان دوای ئەمە دەستمانکرد بەنوێژو نزاو پاڕانەوە لەخوای مەزن کەلەم کێشەیەشدا فریامان بکەوێت‌و رزگارمان بکات (تا ئێستاش نازانین ئەو ناوانەیان چۆن بەراستی

دەستکەوتبوو) ماوەی دوو سەعات دایاننااین کەس لێی نەپرسینەوەو هەر هەمووما قورئانەکانی بەرباخەڵمان دەرهێناو دەستمانکرد بەقورئان خوێندنەوە، لەم کاتەدا یەکێك لەئەفسەرەکانی پۆلیس هاتە ژوورەوەو پێی گوتین هەستن خۆتان حازر بکەنو بڕۆن، هەموان هەستان بەڵام من هەر بەردەوام سوورەتی (یس)م دەخوێند، کەبینی من ئەوەندە سورم لەسەر تەواوکردنی سورەتەکە دەستیکرد بەگریان، ئێمەش دوابەدوای ئەو هەموو دەستمانکرد بەگریان، بەراستی دەربڕینی ئەو ساتە بەنووسین زۆر زەحمەتە، دەسەڵاتی خوا ئاشکرابوو کەدیویست ئێمە لەو تەنگوچەڵەمانەی دێنە رێگامان رزگاربکات.

ئەوەی لەو رێگایەدا تێبینیم کرد ئەوەیە لەناو هەموو کۆمەڵێکدا چاکو خراپ هەیە ئەگەر دوژمنیش بێت. ئێمە کە بەناو کوردەکاندا رۆیشتین پەکەکە یارمەتیداین چونکە کوردبوون، بەڵام کەهاتینە ناو دەسەڵاتی تورکەکانەوە دوو بەش دەسەڵاتدار بوون یەکێکیان پۆلیسو ئەوەی تریان میت ، هەردووکیان تورك بوون بێجگە لەخوا گیانیش کەسی ترمان شك نەدەبرد یارمەتیمان بداتو پارەیەکی زۆریشمان پێبوو، بەڵام کەس پارەی وەرنەدەگرت, ئەگەر بەدەست میت بوایە کەدوژمنی هەموو مرۆڤایەتین بەگشتیو کورد بەتایبەتی, چونکە بەلای ئەوانەوە خوا کوردی بۆ کوشتن دروستکردووە، حەزیان دەکرد لەیەکەم ساتەوە هەر پێنجمان لەناوبەرن، بەڵام پۆلیسەکان وانەبوون, کەچاویان پێمان دەکەوت بەزەییان پێماندا دەهاتەوە, ئازادیان دەکردین.

## پەنابردن بۆ UN

سوپاس بۆ خوا بەسەلامەتی گەیشتینە وان, شەوێك لەوێ ماینەوەو بەیانییەکەی بۆ ئەستەمبوڵ بەرێکەوتین. دوای ماوەیەك، لەبەر ئەوەی جەوازەکانمان نەمابوو کوڕەکانو بووکەکەم ناردەوە بۆ عێراق چونکە بڕیاری لێبوردنی گشتی ساڵی ١٩٨٨ لەلایەن رژێمەوە دەرچووبوو، کەلەوە دەچوو بەبێ جەواز دەرچوونیان بۆ هەندەران سەرکەوتوو نەبوبێت. ئەو ماوەیە زۆرمان هەوڵدا لەرێی قاچاخچییەوە جواز دروستبکەین، بەڵام چەند جارێك دەستیان بڕینو پارەکەیان خوارد، بۆیە من پێم باش بوو مناڵەکانم بگەڕێنەوەو خۆمو خێزانم بەتەنیا ماینەوەو ئەستەمبوڵمان بەجێهێشت چوین لەئەنقەرە دانیشتین، چونکە لەوێ خزمێکی دایکی بازیانی کوڕمی لێبوو کە لەساڵی ١٩٥٨ هاتبوونە لامان، ئەم ماڵە زۆر یارمەتییان دەداین بۆ راپەڕاندنی کارەکانمانو چی تر دەستمان نەبڕن، بەڵام لەرێگای ئەمانیشەوە هیچمان بۆ نەکرا. ئینجا بەناچاری لەگەڵ خێزانەکەمدا لە١٩٨٨/٢/٩دا چوینە بارەگای UN. لەئەنقەرە زۆر چاوەڕوانمانکرد ئەوەبوو لێپرسراوەکەیان لەژوورێکی سەرەوە چاوی بەخێزانەکەم کەوتبوو کە لەبەردەم دەرگاکەدا لەتاوی سەرما هاتوچۆی دەکرد، نوێنەرێکی بۆ لای نارد پێی گوت:وەرە ژوورەوە داوات دەکەن، گوتی هاوسەرەکەشم لەگەڵدایە، ئینجا پێکەوە چووینە ژوورێ، ئافرەتێکی ئەڵمانی ناوی ئەنگرێت بوو نوسراوێکی داینێ کەتیایدا نوسرابوو بەیانی کاتژمێر ٩ چاومان پێتان دەکەوێت، چونکە زۆر درەنگ بوو. لە٨ی

بەيانييەوە تا ١,٣٠ی نيوەڕۆ چاوەڕوانمان كرد ئينجا وەڵامی داينەوە، بەدەموچاوماندا دياربوو كەزۆر ماندووين.

كەگەيشتينەوە ماڵەوە يەكی دوو ركات نوێژی سوپاسگوزاريمان بۆ خوا كرد كەشەونخوونی‌و شەونوێژو قورئان خوێندنی شەوی پێشووتری لێوەرگرتبووين‌و بەو شێوازە چووينە ژوورەوە، چونكە ئێمە هيچ بەڵگەنامەيەكی عێراقيمان پێ نەمابوو، ئەگەر بەزەيی خوا نەبوايەوا بەئاسانی چاومان پێيان نەدەكەوت.

بەيانی كاتژمێر ٩ بەو كارتەی كەكچە ئەڵمانييەكە پێی دابووين چووينە ژوورەوە, لەهۆڵێكی گەورە دانيشتين نزيكەی ٤٠ كەسی تری لێبوو كەزۆربەيان ئێرانی‌و عەرەبی سوريابوون، تەنها دوو كوردی ئێرانيان تيادابوو، سەعات ١٠ بانگيانكردم بۆ ژوورەوە گوتيان وەرگێڕت دەوێت يان نا؟ گوتم ئينگليزی دەزانم. بەڵام وەرگێڕەكە هەر بەديارمانەوە مايەوە. چەند پرسيارێكيان لێكردم: بۆچی هاتويتە ئێرە؟ بۆ لەعێراق راتكردووە؟ بۆ لەئێران نەمايتەوە؟ چۆن بەو ليزەپاسە دروستكراوە گەيشتيتە لای من؟

منيش باسی بەسەرهاتەكانی خۆمم بۆ كردن لەگەڵ عێراقداو باسی ئەوەم كرد كە لەبەنديخانەی عێراق بەربووم‌و كاتێك صدام بوو بەسەركۆمار چووم لەلەندن دانيشتم‌و لەدەزگای مافی مرۆڤ لەوێ بەدوورودرێژی هەموو ئەو ئازارو ئەشكەنجەيەی لەعێراقدا درابووم بۆم باسكردن، لەسەر ئەمە لەئێزگەی **BBC** بەشی پانۆراما چاوپێكەوتنێكيان لەگەڵداكردم‌و بەبێ ئەوەی داوای پەناهەندەييان لێبكەم, لەلايەن دەزگايەكی رەسمی بەريتانييەوە نامەيەكيان ئاراستەكردم دەڵێن: خۆشحاڵين بەوەی كەبچيت لە **Home Office** خۆت بناسێنيت بۆ ئەوەی پەناهەندەييت بدەنێ، بەڵام دوای ١١ مانگو بيست رۆژ چوومەوە كوردستانی رزگاركراو، پەيوەنديمكرد بە ی.ن.ك‌و هەوڵێكی زۆرمدا پارتی‌و يەكێتی رێكبخەمەوە. گۆڤاری **Economest** لەساڵی ١٩٨٦دا ئەم هەواڵەی منی بڵاوكردبووەوە كەوەفدێك بەسەرۆكايەتی رەفيق پشدەری لەهەوڵدايە بۆ رێكخستنی يەكێتی‌و پارتی، خۆيشی يەكێتييە. ئەمە بووە هۆكارێك كەكۆماری ئيسلامی هەوڵبدەن كاريان لەگەڵدا بكەم بەڵام من رازی نەبووم‌و رامكردو پەنام بۆ پ.د.ك. بردو چوار مانگو نيويش لای ئەوان مامەوە، كەهەستمكرد لەوانەيە ئەوان تەسليم بەئێرانم بكەنەوە لەوێش رامكردو بەقاچاخ هاتم بۆ توركيا، لەوێ بە٢٢ سەعات گەيشتينە يەكەم دێی توركی ئينجا بەرێكەوتين، ئەگەر پياوەتی ئەفسەری پۆليسی شەمزينان نەبوايە ميت دەيانگرتين‌و تەسليم بەئێران يان عێراق دەكراينەوە، لەئەستەمبوليش سێ جار قاچاخچی ئێمەيان هەڵخەڵەتاندو لەبەرئەوەی پارەمان پێنەمابوو هەروەها لەعێراق لێبوردنی گشتی دەرچووبوو، هەروەها منيش باوەڕم بەحكومەتی عێراق نييە، كوڕەكانم‌و بوكەكەم ناردەوەو خۆم‌و خێزانەكەم مانەوە، چونكە تەواو لەو باوەڕەدابووم كەئەگەر بگەڕێمەوە بەغدا, صدام دەمكوژێت، بۆيە لەبەر ئەوەی لەئێران‌و عێراق‌و توركيا قاچاخم‌و خێزانەكەشم خەڵكی ئێرانە، هانام بۆ ئێوە هێناوە، بەڵكو يارمەتيم بدەن.

لەكاتێكدا دەستمكرد بەكفتوگۆكردن لەسەرەتاوە تەلەفونی بۆ دوو كەسی تر كردو گوتی وەرن ئێوەش

ئاگاداری قسەکانی ئەم پیاوە بن. کە بەتەواوەتی لەقسەکانم بوومەوە یەکسەر گوتیان ئەوە تۆمان وەکو پەناهەندەیەکی UN قبوڵکرد، بەڵام یەك مەرجم هەیە، دەمەوێت کتێبێك لەسەر کورد دەربکەمو مادام تۆ ئەو هەموو زانیارییەت لەلایە پێم باشە ئەو کتێبە پێکەوە دەربکەین، گوتم: کاتێك لەلەندەن لەتەلەفزیۆنی BBC دەرکەوتبووم خاوەن کتێبخانەیەکی دەوڵەمەند بەهۆی کوردێکەوە هاتە لام بۆ شوقەکەم کە لە(نیل گوین هاوس) دابەزیبووم لەناوچەی (چێڵسی)، گوتیان کرێی یەك ساڵی شوقەکەت لەپێشەوە دەدەینو مانگانەش ئەو پارەیەت دەدەینێ کەخۆت دیاریدەکەیت، تەنها ئەو زانیارییانەی لەلاتە بیاننووسە، بەهەر زمانێك بێتو ئیتر بەجێی بێڵە بۆ ئێمە خۆمان وەریدەگێڕین بۆ ئەو زمانەی کەبمانەوێت، ٦٠٪ی قازانجەکەی بۆ تۆو ٤٠٪ی بۆ ئێمە، بەڵام من بەو کارە رازی نەبووم, هەروەها لەئێران شاعیرێکی بەناوبانگمان هەیە ناوی هەژارە, بەهەمان شێوە هەوڵی لەگەڵدام بەڵام هەر نەمکردو لەگەڵ تۆشدا نایکەم، هەرچەندە ئێستا ئیشەکەم لەبەردەستی تۆدایە، چونکە ئەو کتێبە بۆ ئەمڕۆی کورد باش نییە.

دوای ئەوەی لێکۆڵینەوەکەیان لەگەڵماندا نزیکەی ٢ سەعاتی خایاند, کارتێکی پەناهەندەییان بۆ کردم کەمانای ئەوەبوو لەUNوەرگیراوینو ١٠٠ دۆلاریشیان دامێ گوتیان ئەمە کرێی خانوەکەتە، ئافرەتە ئەڵمانییەکە کارتی تایبەتی خۆی دامێو پێی گوتم بۆت هەیە هەموو رۆژێك سەردانی UN بکەی، ژمارەیەکی تەلەفونیان دامێ بۆ ئەوەی ئەگەر توشی کێشە هاتم تەلەفونیان بۆ بکەم، گوتیان پێویست ناکات لەگەڵ خێزانەکەتدا گفتوگۆ بکەین چونکە بەهۆی تۆوە وەکو ئەوە وایە قسەی ئەویشمان وەرگرتووە, نوسراوێکیشت دەدەینێ بۆ بەڕێوەبەرایەتی ئەنقەرە کەئەم پیاوەو خێزانەکەی لەلای UN پەناهەندەن. گوتم: ئەگەر دەتانەوێ یارمەتیم بدەنو لەدەست عێراقو ئێرانو تورکیا رزگارم بکەن ئەم نوسراوەی کەداوتانە بەمن بۆ پۆلیس, ناوەکەی منی لەسەر لابەنو ناوێکی خوازراوم بۆ لەسەر بنووسن، زۆرم هەوڵ لەگەڵدان بەڵام گوتیان ئێمە UNینو کەس ناتوانێت حساب بۆ نوسراوی ئێمە نەکاتو نوسراوەکانمان لەهەموو شوێنێك دەخوات.

ئینجا لای ئەوان هاتمە دەرەوە چووم بەرەو هۆڵەکە بۆ چاوەڕوانیکردنی تەواوبوونی نوسراوەکانمان, لەوێ چاوم بەهاوسەرەکەم کەوت زۆر گرژ بووبوو، لەترسا لێوی وشك بوو بوو چونکە من لەژوورەوە زۆرم پێچوو، بەڵام کەمنی بینی بەپێکەنینەوە بەرەوڕووی رۆیشتمو پێم گوت: (لەخوا بەزیاد بێت وەرگیراین) هاتەوە سەرخۆیو رەنگی کرایەوە. لەم کاتەدا ژنێکی فارس لێمان هاتە پێشەوە گوتی: (اقا خواهش میکنم باهم حرف نزنید)واتە بەیەکەوە مەدوێن چاویان لێتانەو گوێشیان لێتانە، دەستی راکێشا بۆ سەقفەکە بینیم کامێرای تەلەفزیۆنییان دانابوو بۆ چاودێریکردنی وێنەو دەنگی ئەو خەڵکەی کەلەوێ دادەنیشن، منیش وەڵامم دایەوە تازە وەرگیراین. ئەوەی لەوێ بوو هەمووی سەری سوڕما چونکە هەندێکیان بۆ دوو ساڵ دەچوو لەوێبوون هێشتا وەرنەگیرابوون.

کاتێك ئێمەیان نارد بۆ بەڕێوەبەرایەتی پۆلیسی ئەنقەرە–بەشی پەناهەندەیی, لێکۆڵینەوەیەکی یەکجار زۆریان لەگەڵداکردم، لەهاتنە دەرەوەم لەوێ لەو نوسراوە کەوتمە گومان، گوتم ئەمەشم پێبێت ئەگەر بیانەوێت بمگرن هەر دەمگرن، لەوێ پێیان گوتم دەبێ هەفتەی دوو جار سەردانمان بکەیتو خۆشیان هاتن لەگەڵما خانوویان بۆ گرتم، بۆ ئەوەی ناونیشانەکەم بزانن‌و بەبەردەوامی لەژێرچاودێری ئەواندا بم، هەر بۆیە گەڕامەوە بۆ UNو لەم هەڵوێستەی تورکیا ئاگادارم کردنەوەو دووپاتمکردەوە بۆیان کەدەمانگرن، ئەوەبوو UN بەڵگەنامەکانیان بۆ تەواوکردین کەبەڕێمان بکەن بۆ هەندەران، بەڵام دوای تێپەڕبوونی چەند مانگێك لەلایەن تورکیاوە دەستگیرکراین‌و ماوەی پێنج ڕۆژ منیان بەندکرد، من هاوسەرەکەم تێگەیاندبوو کەنەڵێیت کوردی ئێرانم‌و زمان دەزانم، بەڵکوو خۆت پیشان بدە کەکوردییەکەش بەتەواوەتی نازانی هەر ئەوەیە کەڕولاڵ نیت، من بەندیخانەم زۆر بینیوەو زۆر دەستگیر کراوم، بەڵام یەکەم جار بووم بەندکردنی ئاواهی ببینم، ئەویش ئەوەبوو بەیانیان کاتژمێر ٧ دەهاتن بەشوێنمدا دەیانبردمە میوانخانەیەك, لەژوورێکی میوانخانەکەدا گفتوگۆیان لەگەڵدا دەکردمو ئازارو ئەشکەنجەیان دەدام تا سەعات ١ی شەو، دوای ئەوە دەیانبردمەوە ماڵەوەو پێیان دەگوتم نابێت بێیتە دەرەوەو دەرگا لەکەس بکەیتەوە. چاوم لێبوو سەیارەیەکی بیجۆی سور بەرامبەر شوقەکەم راوەستابوو بۆ چاودێریکردن، لەماوەی ئەم پێنج ڕۆژە خێزانەکەم توشی نەخۆشییەکی ژنانە بوو، بۆیە بەناچاری ئێمەیان بردە نەخۆشخانەیەکی سەربازی، لەچوونە ژوورەوەدا لێپرسراوی پرسگەکە نەیهێشت چاودێرەکان بێنە ژوورەوە لەگەڵمانداو یەکێك لەپرسگەکە لەگەڵماندا هات ئێمەی بردە نهۆمی چوارەم بۆ لای پزیشکی شارەزا، بەتورکی پێم گوت دەتوانم بەتەلەفون لێرەوە قسە لەگەڵ ئەو لێپرسراوەی UN بکەم کەپەیوەندی پێمانەوە هەیە؟ گوتی فەرموو، کەپەیوەندیم پێوەکردن کچە ئەڵمانییەکە (ئەنگرێت) گوتی: وەرنە لام بەهەر شێوەیەك بێت، من کێشەکەتان چارەسەردەکەم. پزیشکەکە لەدوای چارەسەرکردنی خێزانەکەم رووی تێکردمو گوتی: ئێوە چین‌و چۆن گەیشتونەتە ئەم نەخۆشخانەیە؟ منیش بەسەرهاتەکەی ناو تورکیام بۆ گێڕایەوە، پێی گوتین راکەن، ئەمە قاتی چوارەمە، بچنەوە ژێر زەمینەکە چایخانەیەکی لێیە، ئێوە لەدەرگای راستەوە هاتوون، بەڵام ئەمجارە لەدەرگای چەپەوە بڕۆنە دەرەوە کەس ناتانبینێت, بۆ کوێ دەچن بچن، گوتمان: ئەی تۆ چی دەکەی؟ گوتی من چوزانم ئێوە کێن، بەتەنها هاتوون‌و بەتەنها رۆیشتوونەتە دەرەوە.

سواری تەکسییەك بووین، سەعات ١٠ گەیشتینە بارەگای UNو ئەنگرێتمان بینی, بەسەرهاتی خۆمان بۆ گێڕایەوە، ئینجا (دە) دەقیەقەیەك ونبوو دوایی هاتەوە گوتی: ئێستا باڵیۆزی UN دەچێتە وەزارەتی دەرەوەی تورکیا بۆ چارەسەرکردنی کێشەکەی ئێوەو ڕێتان بدەن بڕۆن بۆ هەندەران, ئینجا تا کاتژمێر ٤ی پاش نیوەڕۆ لەهۆڵی پرسگە دانیشتین، کەوەڵامیان نەدامەوە زانیم هیچیان بۆ نەکراوە، بۆیە بەیەکەوە هاتینە دەرەوە، زۆر بەبێ تاقەتی‌و دڵتەنگی‌و راشکاوانە تەلەفونم بۆ مامۆستا ابراهیم احمد کرد لەلەندەن،

بەڵام لەوێ نەبوو، ئینجا تەلەفونم لەگەڵ کاك صباح حەمەسعید کرد, باسی خـۆمم بەدوورودرێـژی گێڕایـەوەو پێم گوت بەناچاری دەچم خۆم تەسلیمی باڵیۆزخانەی عێراق دەکەم چونکە بڕیـارێکی لێبـوردنی دەرکـردووە تەنها مام جەلال ناگرێتەوە، بەڵام ئەم پیاوە باشە زۆری پێ ناخۆش بوو دەسەڵاتیشی نـەبوو، هەربۆیـە دوای داخستنەوەی تەلەفونەکە زانیم هەموو دەرگاکانم لێداخراوە. بەرەو باڵیۆزخانەی عێراقی رۆیشتین لەوێ خـۆم پێ ناساندن، زۆر بەساردییەوە مامەڵەیان لەگەڵداکردم. لێپرسراوەکە تەلەفونی بۆ سـەروو خـۆی کـردو دوای داخستنەوەی تەلەفونەکەی، لێی پرسیم تۆ کام رەفیق پشدەریت؟ گوتم ئەوەندەی بـزانم تـەنها یـەك رەفیـق پشدەری هەیە ئەویش منم، کارمەندانی باڵیۆزخانـە بێجگـە لـەدوانیان هـەر هـەموویان هـاتن بـۆ سـەیرمان، بەماوەی چارەکە سەعاتێك لیزەپاسـیان بـۆ کـردین‌و بردیاننـە ژوورەوە، بـەڵام بـاڵیۆز گـەڕابۆوە بـۆ عێـراق، لێپرسراوەکە گـوتی: بۆچـی خـۆت تەسـلیم دەکەیتـەوە؟ گـوتم وەکـو بیـستومە بڕیـاری لێبـوردنی گـشتیتان دەرکـردووەو منـیش لـە UNوەرگیرابـووم، بـەڵام تورکیـا دەیویـست تەسـلیم بـەئێرانم بکاتـەوەو لەدەسـت تورکەکان رامکردووەو خۆم هاوێشتۆتە باڵیۆزخانەکەتانەوە بۆ ئەوەی یارمەتیم بدەن دەست ئـەمان نەکـەوم، لێپرسراوەکە گوتی بەیانی سەیارەیەکی پاسی گەورەی ٤٤ نەفـەری لەعـەرەب‌و تورکمـان‌و دوو کـوردو تـۆش لەگـەڵ ئەمانـە بـەرێ بکـەوە بـۆ عێـراق, ئینجـا پێـی گـوتم: ئـەو پۆلیـسە تورکـەی لـەدەرەوە راوەسـتاوە ئەفسەرێکی سیخوڕی تورکە, ئێمە ئێستا بەسەیارەی باڵیۆزخانەکـە دەتنێرینـەوە ماڵـەوە، جانتایـەك لەگـەڵ خۆتـدا بێنـە بـۆ ئـەوەی سـیخوڕە تورکـەکان بـزانن کـەخۆت تەسـلیم بەئێمـە کردۆتـەوەو دوایـی خۆمـان دەتبەینەوە، ئەمشەو لەماڵەوەبەو بەیانی سەعات ٨ی بەیانی وەرن بۆ ئێرە.

کاتێك لەبەردەرگای ماڵەوە دایانگرتم گوتیـان ئەگـەر سـبەینێ هـەتا ٨,٣٠ نەگەیتـە لامـان مانـای ئەوەیـە تووشـی گرفـت هاتویـت‌و ئـەو کاتـە خۆمـان بەدواتـدا دەگـەڕێین. دوای دوو سـەعات لەرۆیـشتنی ئـەوان، ٣ ئۆتۆمبیلی سپی بەرامبەر ماڵەکەمان راوەستان‌و زەنگیان بۆ لێداین، بەگەرمی سڵاویان کردو داوایـان لێکـردم لەگەڵیاندا بچمە دەرەوەو بەخێزانەکەشمیان گـوت هـیچ مەترسـە ئێـستا دەیهێنینـەوە. ئینجـا منیـان لەگـەڵ خۆیاندا بـرد بـۆ میوانخانەیـەك بـۆ لێکۆڵینـەوە، لەژوورێکـدا دایاننـام‌و پێـنج کـەس دانیـشتبوون‌و دەوری ١٠ کەسـێکیش لـەدەرەوەی ژوورەکـە راوەسـتابوون، دوای ئـەوەی دانیـشتم پـسکیت‌و شـیریان بـۆ هێنـام، یەکێکیان‌وا خـۆی نیـشاندا کـەزۆر گەورەیـە بـەڵام تـەنها لەگوێدرێـژێك گـەورەتر بـوو، زۆر بـەفیزەوە قـسەی دەکرد، گوتی: بگەڕێیتەوە عێراق لەسێدارەت دەدەن، بەڵام لێرە بمێنیتـەوە دوای ٢٤ سـەعاتی‌تر حکومـەتی تورکیا شوقەیەکت بۆ دەگرێت‌و سەیارەیەکت دەداتێ‌و بەمامۆستای سیخوڕی دادەمەزرێنن بۆ ئەوەی وانەی سیخوڕی بەمیتی تورکی بڵێیتەوە، وەکو سەرنجمانداوە لەم چەند وەختەدا تۆ لەم بوارەدا شارەزایت. گـوتم: لەکەیەوە ئاوا نەرمونیانن لەگەڵمدا، من ٥ رۆژ لەخزمـەتی ئێوەدابـووم، جاربـەجار بەدەسـت هەڵتاندەواسـیم‌و هەندێك جار بەقاچ‌و هەندێ جاریش فەلاقەتان دەکردم، کەمانـدووش دەبـوون سـواری سـەیارەتان دەکـردم‌و

بەئەنقەرەدا دەتانگێڕام، ئەوا بۆ ٤٨ سەعات دەچێت لەخوا بەزیادبێت كۆماری عێراق بڕیاری لێخۆشبوونی گشتی دەركردووە بۆ هەموو ئەوانەی چەكیان بەرامبەری هەڵگرتووە تەنها یەك كەس نەبێت، ئەویش جەلال تاڵەبانییە، ئەو لێخۆشبوونە منیش دەگرێتەوە.

كاتێك بەسەیارەكە منیان دەبردەوە، یەكێكیان لەناو سەیارەكەدا دوو مشتەكۆڵەی بەسەرمدا كێشاو گوتی بگەیتە ئەوسەری زاخۆش دەتهێنینەوە.

سەعات ٦ی بەیانی چووینە دەرەوە، لەباخچەیەكی نزیك باڵیۆزخانەی عێراق دانیشتین، كەدەرگا كرایەوە ئێمەش لەگەڵ خەڵكەكەدا چووینە ژوورەوە، دەستمان لەسەر دڵمان بوو هەتا بەسەلامەتی گەیشتینە سەر پردەكەی زاخۆ، كەپەڕینەوە گوتم سوپاس بۆ یەزادنی مەزن كەدەست میتی توركی نەكەوتین‌و رزگارمان بوو، انشاءالله رۆژێك دێت هەموو دانیشتوانی توركیا بەگشتی‌و كورد بەتایبەتی رزگاریان دەبێت لەمیت‌و لەدەست ئەو شەش ئەفسەرە توركییەی هەموو میت بەڕێوە دەبەن.

## هاتمەوە بۆ عێراق

لەجیاتی بڵێم لەكوردستانی باكوورەوە هاتومەتەوە كوردستانی باشوور, دەبێت لەبەر خاتری دوژمنان بڵێم لەسلۆپییەوە هاتمەوە زاخۆ. پەڕینەوە ناو عێراق‌و لەوێ تەسلیمی بەشی جەوازاتیان كردین، لەو روانگەیەوە كەئێمە خۆمان تەسلیم بەباڵیۆزخانەی عێراقی كردووە لەئەنقەرەو لەوێشەوە دەبێ تەسلیم بەئاسایشی زاخۆ بكرێین، بەلام لەكاتێكدا لەوێ وەستابووین لێكۆڵینەوە دەستی پێكرد، ئیفادەیان وەرگرتین‌و ناونیشانی سلێمانییان لێوەرگرتین بۆ ئەوەی لەكاتی پێویستدا پەیوەندیمان پێوە بكەن. كەهاتمە دەرەوە سەیرمكرد كوڕەكانم لەسەر ئەو تەلەفونەی لەتوركیاوە بۆم كردبوون لەكاتی دیاریكراودا چاوەڕوانییان دەكردم، كەچاومان بەمان كەوت هاوسەرەكەم بەگریانەوە باوەشی كرد بەكوڕە گەورەكەمدا لەخۆشی ئەوەی رزگارمان بوو لەدەست توركەكان. شەو گەیشتینەوە سلێمانی، شەش ساڵ بوو چاوم پێی نەكەتبوو، ئینجا چووینە ماڵی كەمالی برام. دوای سێ رۆژ لەگەیشتنم، ئاسایشی سلێمانی ئاگاداریان كردمەوە كەدەبێ رۆژی شەممە بچم بۆ ئاسایشی گشتی لەبەغدا، لەهەمانكاتدا دەزگای هەواڵگری سلێمانی گوتیان دەبێ شەممە چاوت بە(منظومة)ی كەركوك بكەوێت، بەلام من لەوە ئاگادارم كردنەوە كە لەهەمان رۆژدا دەبێت لەئاسایشی گشتی بم لەبەغدا، گوتیان ئێمە رۆژی هەینی كاتژمێر ١٠ی بەیانی چاوەڕوانت دەكەین.

رۆژی هەینی كاتژمێر ١٠ی سەرلەبەیانی خۆم‌و رەوەزی كوڕم گەیشتینە پرسگەی (منظومة)ی كەركوك، دوای خۆناساندن، كەچوومە ژوورەوە، چوار كەس دانیشتبوون، لەبەر ئەوەی هەموویان جلی مەدەنییان لەبەردابوو نەمزانی كامیان ئەو عەقیدەیە كەناردوویەتی بەشوێنمدا، چەند پرسیارێكیان لێكردم‌و گوتیان: بۆ چویت‌و بۆ هاتیتەوە؟ ئیدریس بەچی مرد؟ فایلێكیان خستە بەردەستم ناوی ئەڵقە لەگوێكانی CIAی تیا

تۆمار کرابوو، گوتیان رای خۆت بەرامبەر ئەم ناوانە دەربڕە، لەمەودوا بەتەمایت چی بکەیت؟ گوتم: تەنها من ئەمبەرو ئەوبەرم نەکردووە، ئیدریس بارزانی رۆژێکیان بەچاوی خۆی چاوی بەئەفسەرەکانی کۆماری ئیسلامی دەکەوێت کەزۆر بەخراپی مامەڵە لەگەڵ دیلە کوردە عێراقییەکاندا دەکەن چونکە سوننی مەزهەبن، ئەم مامەڵەیەی کۆماری ئیسلامی کاردانەوەیەکی سلبی دروست دەکات لەسەر باری تەندروستی ئیدریس بارزانیو کاتێك دەگەڕێتەوە ماڵەوە دەستنوێژ تازە بکاتەوە (جەڵدەی دڵ) لێی دەداتو دەمرێت چونکە خۆی لەوەوپێش نەخۆشی دڵی هەبوو. کەناوی کاك ئیدریسو کاك مەسعودو ئەندامانی م.س.و لیژنەی مەرکەزیی پارتیم لەو فایلەدا بینی کەدایانە دەستم, گوتم: توشەرەفتان کەس باوەڕ دەکات ئەگەر بڵێن (قصیو عدی) سیخوڕی CIAین؟ ئەی چۆن باوەڕ دەکەن کەکوڕانی مەلامستەفا بارزانی سیخوڕی CIA بن، بەڵام ئێوە خۆتان پاڵتان بەکوردەوە نا بچنە شاخو دژایەتی ئێوە بکەن، ئینجا بەسەرهاتێکم بۆ گێڕانەوە گوتم: گومان لەوەدا نییە هەریەکە لەئێوە ناوی یانەی سەلاحەدینی بیستووە لەبەغدا، دوای ئاشبەتاڵەکە شەوێکیان نزیکەی ٤٠٠ کەسێك لەژنو پیاوی کورد لەوێ بووین، هەندێك لەمانە هەڵدەپەڕینو هەندێکیان بەقسەوە خۆی خەریك کردبوو، هەندێکی تریش بەگۆرانی گوتن, لەناکاو ١٠–١٢ ئەفسەرو پۆلیسی فریاکەوتن خۆیان بەناو یانەکەدا کرد گوتیان کوا سەرۆکی یانەکە؟ (ئەو کاتە سەرۆکی یانەکە کاك فایەق وشیار بوو کە لەهەمانکاتدا بەڕێوەبەری تاپۆی گشتی بوو، بەڵام لەو کاتەدا لەوێ نەبوو), گوتم: لێرە نییە، چیتان دەوێت؟ یەکێکیان کەموقەدەم بوو گوتی: ئەوە چییە ئێوە ناچن بنوونو بەتەما نین بەم سەعات ١٢ی شەوە ئێرە چۆڵ بکەن؟ هەستن فەرموون یانەکە داخەنو بڕۆنەوە ماڵەوە. منیش لەداخا دەستبەجێ تەلەفونم کرد بۆ هەموو ئەو شوێنانەی کەدەمزانی لەشەودا ئێشکگری لێیە، بۆ وەزارەتی بەرگری، وەزارەتی ناوخۆ، بەڕێوەبەرایەتی ئاسایشی گشتی, بەڕێوەبەرایەتی موخابەراتی گشتیو بەڕێوەبەرایەتی ئیستخبارات, بەڕێوەبەرایەتی گشتی پۆلیسو بەڕێوەبەرایەتی گشتی فریاکەوتن، بەهەموویانم گوت: نازانم ئێمەی کورد چۆن بجولێینەوە، دەچینە شاخ توانجمان لێدەگرن، دێینەوە شارو دەست دەکەین بەگۆرانیو هەڵپەرکێ پێمان دەڵێن ئەوەش قەدەغەیە، ڕێگاچارەیەکمان بۆ بدۆزنەوە, نازانین چی بکەین باشە؟ من ناوم رەفیق پشدەرییە ئێستا کۆمەڵێك ئەفسەرو پۆلیس داویانە بەسەر یانەی سەلاحەدین لەعرصاتی هندییە, دەڵێن یانەکە داخەنو بڕۆنەوە ماڵەوە. پاش تێپەڕبوونی سەعاتێك کۆمەڵێکیتر هاتنە ژوورەوە گوتیان کوا رەفیق پشدەری؟ گوتم: فەرموون، گوتیان ئەوەی ئەو کارەی لەگەڵ ئێوە کرد لەخۆیەوە هاتووەو بۆتان هەیە تا بەیانی هەڵپەڕن.

ئینجا گوتم: ئێستا ئێمە نازانین لەگەڵ ئێوەدا چۆن بجولێینەوەو دەستیشمان ناگاتە سەرکردایەتیتان، لەگەڵ ڕێزم بۆ ئێوە هەرچەندە نازانم کامتان عقید (فلان)ـە, تۆ بەمن دەڵێیت لەمەودوا چی دەکەیت؟ لەوانەیە سبەینێش بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی هەمان پرسیارم لێبکاتەوە؟ منیش دەڵێم زانیارییەکی باشم

بەرامبەر حکومەتەکانی ئێران‌و تورکیاو سوریا پەیداکردووە لێرەش رەنگە ئێوە نەناسم بەڵام سەرکردایەتی باش دەناسم, ئەگەر لێم بگەڕێن‌و بەو راپۆرتانەم لەگەڵ نەکەن کەسیخوڕەکانتان لەسەر من لەمەودوا بۆتان دەنێرن، ئەوە لەماڵێ خۆم دادەنیشم.

دوای ئەوەی لەقسەکانم بوومەوە گوتیان ئێمە بەسەیارەی خۆمان بەڕێت دەکەین بۆ بەغدا، یان تا گەراجی بەغدات دەگەیەنین ئەگەر رازی بیت‌و رەحمەت لەدایك‌و باوکت, پەیمانیشت دەدەمێ هەتا من لێرەبم نایەڵم جارێکی تر بانگت بکەنەوە بۆ ئێرە.

یەکێ لەم پیاوانە گەیاندمی بۆ گەراجی بەغداو لەوێ خۆی جانتاکەی بۆ هەڵگرتم تا لای سەیارەکەو گوتی: حەز دەکەم خۆمت پێ بناسێنم (مقدم کریم)، منیش گوتم تۆ بۆ ئەمە لەگەڵ من دەکەیت؟ گوتی شایەنی ئەوەی. ئینجا سواری سەیارە بووین چووم بۆ بەغدا لەمیوانخانەی باخان دابەزیم. کەگەیشتمە ئەوێ کوڕێکی گەنج لەبەردەرگای میوانخانەکەدا وەستابوو، گوتی من چاوەڕوانی تۆم دەکرد، بەخێربێیت سەرچاو، لەکاتی گەیشتنەکەت دواکەوتویت، من ناوم شێخ لەتیفەو خاوەنی ئێرەم، کاك کەمالی برات برادەرێکی زۆر خۆشەویستمە رایسپاردووم کەچاوەڕوانی جەنابتان بکەم. ئینجا بەبیری هێنامەوە کەجارێکیان لۆرییەك شتومەکی گیراوە کاتی خۆی من بۆم بەرداوە، بەڵام من هەر ئەو بەسەرهاتەم نەدەهاتەوە یاد، ئەو پیاوە ئێستا کەچاوی پێم دەکەوێت زۆر رێزم لێدەگریت، خۆزگە ئەوانەی لەبیرمن‌و لەسێدارە رزگارم کردوون بەنیوەی ئەم پیاوە منیان لەبیربوایە. پاش ماوەیەك کەمالی براشم گەیشتە ئەوێ‌و ئەو شەوەمان پێکەوە بردەسەر، بەیانی بەکارێکی خۆی چووە دەرەوەو کەبۆ نیوەڕۆ هاتەوە پرسیاری لێکردم گوتی چاوت بەبەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی کەوت؟ گوتم دوو جار تەلەفونم بۆ بەدالەی گشتیی ئاسایش کرد گوتم دەمەوێت قسە لەگەڵ بەڕێوەبەری گشتی بکەم، گوتیان لەوێ نییە، بۆم دەرکەوت ئەو کابرایە نایەوێت چاوی پێم بکەوێت، لەبەر ئەوە من سبەینێ دەڕۆمەوە.

ئێوارە چوینە ماڵی کابرایەکی عەرەب (ناوی ناهێنم لەبەر ئەوەی ئێستا لێپرسراوێکی گەورەیە لەبەغدا), کەگەیشتینە ئەوێ بانگی ئێوارەی دابوو، خۆی‌و ماڵ‌و منداڵی خەریکی نانخواردن بوون, کەئاگاداریان کردەوە هەموویان بەگەورەو بچووکەوە بەپیرمانەوە هاتن، منیش بەرۆژو بووم لەبەر ئەوە دانیشتم لەگەڵ ئەواندا دەستمکرد بەنانخواردن، ئینجا باسی ئەوەم کرد هاتووم بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی ببینم‌و پێیان گوتم لەوێ نییە، لەبەر ئەوە سبەینێ دەگەڕێمەوە، گوتی: من ئەو ماڵ‌و منداڵانەم کەئێستا دانیشتوون نانیان لەگەڵدا دەخۆم دڵنیام کردوون لەوەی من لەگەڵ ئەو رژێمەدا نیم بەڵام دەست لەکار بکێشمەوە دەستبەجێ دەمکوژن‌و ئەگەر رابکەم کەسوکارم لەناو دەبەن، تەنها چاوەڕوانی رەحمەتی خوا دەکەم کە بەسەلامەتی لەمانە رزگارمان بێت، تۆ بەر بڕیاری لێبوردنەکە کەوتویت، شت بەدەستەوە مەدە، کەس ناتگرێت چونکە باجی خۆت داوە، بەیانی بڕۆرەوە سلێمانی لەماڵی خۆت دانیشەو کاسبی خۆت بکە، پەیوەندی بەکەسەوە

مەکە، ئینجا گوتی: بەتەمای چ جۆرە کاسبییەکی؟ گوتم زۆر ماندووم چەند مانگێك دەحەسێمەوە، ئینجا یا لەهەولێر یا لەبەسرە نیشتەجێ دەبم، گوتی ئەی منالەکان؟ گوتم بۆیان نییە لەهیچ فەرمانگەیەك دابمەزرێن چونکە پێشمەرگەبوونو هاتونەتەووە، بەڵام دایکیان بەهۆی کەمالی برامو شێخ جەعفەری پارێزەر مۆڵەتی نانەواخانەیەکیان وەرگرتووە، گوتی دوای ئەو هەموو هەوڵەی تۆ دات بۆ کورد, کەسێك نەبوو برێك پارەیان بداتێ کاسبییەك بکەن، ئاخرزەمانە, خێزانی رەفیق پشدەری واسطە دەکات بۆ وەرگرتنی مۆڵەتی نانەواخانە! گوتم بەمەش لێمان رازی نەبوون، شتێکیان بۆ دروستکردو بەهۆی ئەوەوە مۆڵەتەکە بەناوی ئەمەوەیە ١٢ سەعات دەیخەنە بەندیخانەوە، شێخ جەعفەر کەئەمە دەبیستێتەوە پێیان دەڵێت ویژدانتان بێت خراپە گەیشتە ئەو رادەیەش.

گەڕامەوە سلێمانی، دوای سێ مانگو نیو چوم لەهەولێر نیشتەجێ بووم بەو نیازەی لەوێ کارگەی (ئالف) دابنێم کە٥٠-٦٠ هەزار دیناری تێدەچێت، بەڵام چەند کەسێکی دڵسۆز هانیاندام لەجیاتی ئەوە (پرۆژەی بەخێوکردنی جوجەسازی مشروع متكامل للدواجن[٣٣]) دابنێم، منیش لەسەر قسەی ئەوان

[٣٣] شەش کەس بووین لەهەولێر رەزامەندیمان بۆ کردنەوەی ئەم پرۆژەیە بۆ هاتەوە، یەکەم کەس من بە ١٤ مانگ تەواومکرد، کەشەڕی عێراقو ئەمریکا دەستی پێکرد پێش ئەوەی بیکەمەوە رامگرت، کەراپەڕینەکە روویدا سەلامەت بوو، کەسوپا هاتەوە رووبانکردبووە ئەو پرۆژەیەی منو ئامێرێکی زۆریان تالانکردبوو، لەدوای ئەوان هێزی فەرهوود هەندێك شتی تریان بردبوو، ئینجا کەهەولێر کەوتبووە ژێر چنگی بەرەی کوردستانییەوە، نیشتمانپەروەرەکانمان لەجیاتی ئەوەی پارێزگاری بکەن ئەوانیش بەشێکی تریان تالانکردبوو، هانام بۆ مام جەلال برد ئەویش فەرمووی: ١٦ پێشمەرگەت بۆ دەنێرم پارێزگاری پرۆژەکەت بۆ بکەن، منیش گوتم من خۆم بۆ بەخێو ناکرێت ئێنجا ئێستا دەتوانم ١٦ پێشمەرگە بەخێو بکەم. هانام بۆ کوردی بەغدا برد، فوئاد عارفو مامۆستا مسعود محمدو د. کمال مەزهەر بڕیاریاندا یارمەتیم بدەن، کاك مەسعود محمد هات بۆ هەولێر، بۆ ئەم مەبەستە چاوی کەوت بەکاك مەسعود، کاك مەسعود بەڵێنیدا ئەم پرۆژەیەم بۆ ئاوەدان بکاتەوەو کاك محسن دزەیی لەپرسەیەکدا لەهەولێر پێی راگەیاندم کەئەم پرۆژەیەت بۆ ئاوەدان دەکەنەوە، دوای شەش مانگ (کاك شێرکۆی عمری عەولا شەل) هاتە لام، گوتی: چەند رۆژێکە هەواڵێکم پێیە دەمەوێت پێت رابگەیەنم, مامم (مامۆستا علی عبداللە) سکرتێری پارتی دیموکراتی کوردستان پێی راگەیاندبووم کەپێت بڵێم کاك مەسعود بارزانی فەرموویەتی ئێستا پارەمان نییە, کەی بوومان بۆی ئاوەدان دەکەینەوە، گوتم راست دەکەیت نییەتی، کەمەلامستەفای باوکی مرد تەنها ٩٧ ملیۆن دۆلاری بەجێهێشتووە، ئەوەی لەنێوانماندا راوەستابوو گوێی لەم قسەیە بوو، ئەندازیار عبدالخالق حوێزی بوو گوتی: ناترسیت بتکوژن؟ گوتم زۆرم بۆ کردوون, ئەوان من ناکوژن. رۆژێکیان مام جەلال پێش هەڵبژاردنەکەی ١٩٩٢ بەچەند رۆژێك بەمامۆستا مسعود محمدی گوتبوو با رەفیق بێت چاوم پێی بکەوێت بۆ مەسەلەی پرۆژەکەی، چووم بۆ لای مام جەلال بۆ خانووەکەی عزت دووری، کەچوومە ژوورەوە کاك سعدی پیرە هات بۆ لام گوتی: فەرموو مام جەلال لەسەربان چاوەڕوانت دەکات، چوومە سەربان لەوێ چاوم بەبەڕێز مام جەلال کەوت، قۆڵی کرد بەقۆڵماو گوتی ئێستا چیت بۆ بکەم؟ گوتم تەنها یەك قاعەم بۆ تازە بکەنەوە لەگەڵ بیرەکەدا هیچی ترم ناوێت، فەرمووی زۆر ئاسانە بۆت دەکەم، ئینجا زۆر سوپاسم کردو بەجێم هێشت، لەسەر ئەم بەڵێنەی مام جەلال ئەوەندە هاتوچۆم کرد لەئەنجامدا خەمی ئەوەم نەبوو کەپرۆژەکەم بۆ ئاوەدان ناکەنەوە، بەڵکو خەمی ئەوەم بوو کەپێڵاوەکانم لەو رێگایەدا بدرێتو پارەم نەبوو پێڵاوی تازە بکڕمەوە.

کاتێك پارتی دەستی بەسەر هەولێردا گرت، لەساڵی ١٩٩٧وەزارەتی کشتوکاڵ هەستا بەبەستنی کۆنگرەیەکی گەورەو فراوان بۆ باسکردن لەکارەکانی ئەو ساڵەی کەتێپەڕبووەو دانانی پیلانێك بۆ سەرخستنی پرۆژەی کشتوکاڵی لەو ناوچەیەدا بۆ ساڵانی داهاتوو، هاتن تەنها بۆ خاوەن پرۆژە گەورەکان بوو، بەڵام راستی شانۆگەرییەکی زۆر بەهێزو سەرنج راکێش بوو، بەداخەوە ئەگەر ١٠٪ی ئەو بەڵێنانەی کەدایان بۆ سەرخستنی کشتوکاڵ لەناوچەکەدا ببردایەتە سەر ئەو خەڵکە زۆر سوودمەند دەبوو، بەنامەیەك ئاگاداری سەرپەرشتیاری کۆنگرەکەم کردەوە دەمەوێت باسێك لەسەر پرۆژەی بەخێوکردنی جوجەڵە دابەزێنم،وەزیری کشتوکاڵ (ابو حكمت)وەڵامی دامەوە گوتی: دوای ئەوەی کە د. رۆژ وتەکانی خۆی تەواو دەکات سەرە دێتە سەر لێکۆڵینەوە لەسەر پرۆژەکان، ئینجا تۆش چیت پێیە بیڵێ، دوای ئەوەی رێگایاندام، هەستام بۆ قسەکردن, پێشەکی خۆم ناساند بەجەماوەرەکەو گوتم: ئێمە تەنها ٦ کەس بووین لەهەولێردا مۆڵەتی کردنەوەی ئەو پرۆژەیەمان وەرگرت، من توانیم بە ١٤ مانگ ٨ هۆڵو مەفقەسو کارگەی ئالفو بیرێكو شەش خانوو بۆ

دەستمکرد بـەدانانی. دوو جـار لەبەڕێوەبەرایـەتی ئاسایـشی گـشتیو موخابـەرات بـانگکرام بـۆ لێکۆڵینـەوە، گوتیان: تۆ ئەو هەموو پارەیەت لەکوێ بوو کەئەو پرۆژەیەی پێ دابمـەزرێنیت؟ ئـەم پـارە زۆرە یـان جـەلال تاڵەبانی یان مەسعود بارزانی یان دەوڵەتێکی بێگانە داویانە بەتۆ، چونکە تـۆ کەهاتیتـەوە تـەنها ١٠٠ دۆلارت پێبوو، منیش یەکە یەکە ناوی ئەو بازرگانانەم پێگوت کەئەو پارەیەیان دامێو گوتم: لەوانـە جـەنابی سـەردار جاف ٢٠٠ هەزار دینـاری داومـەتێ، عقیـد محمـود احمـد ٢٥ هـەزاری دینـاری داومـەتێ، هـەروەها کەسـوکارم هەریەکە ١٠–١٥ هەزار دیناریان دامێ، هەروەها ٧٠ هەزار دیناریـشم لـەبانقی کـشتوکاڵی وەرگرتـووە، ئینجـا گوتیان: ئەی ئەو سەیارە بەرازیلییەت لەکوێ بوو، گوتم شەوکەت بەگی جاف دۆستێکی خۆشەویـستم بـووەو بەسەر یەکەوە زۆرمان هەبوو, کوڕەکەی ناوی سەرتیپ جافە ئەم سەیارەیەی پێشکەشکردم.

## کوردکوژە

کوردکوژەی ئەو سەدەیەی کەتێپەڕی, لەسێ جەولەدا خۆی لەنێوان ئەو دوو لایەنە زلهێزەدا دەبینێتەوە.

جەولەی یەکەم: ساڵی ١٩٦٣ دەستی پێکردو لە١١ ئازاری ١٩٧٠ کۆتایی هات.

جەولەی دووەم: ساڵی ١٩٧٧ دەستی پێکردو ١٩٨٨ کۆتایی هات.

جەولەی سێهەم: ئەنجامی کۆتایی هەڵبژاردنەکەی ساڵی ١٩٩٢ بەلای منـەوە گـرنگ نـەبوو بـەڵام ئـەوەی بەلامەوە گرنگ بوو چۆنیەتی پیادەکردنی هەڵبژاردنەکە بوو، بەبێ ئاژاوەو کوشتار، چونکە ئەمـە گـەورەترین دەستکەوت بوو بۆ گەلی کـورد، مـن زۆر مەترسـی ئـەوەم هـەبوو کـە لـەنێوان ئـەو چـوار دەوڵەتـە ئیقلیمییـە کەکوردستانی تیا پارچە پارچەکراوە تەنها عێراق ببێـت بـەهۆکارێك ئـەم ئەزموونـە هەڵوەشـێتەوە، چـونکە ئێران‌و تورکیاو سوریا ئەو کاتە لەناو کوردستانی باشووردا هیچ جۆرە بنکەیەکی جەماوەری ئەوتۆیان نەبوو، هەربۆیە چووم بۆ بەغدا بۆ لای ئەو کوردە نیشتمانپەروەرانەی دانیشتووی ئـەوێن‌و چـاوم بەبەشـێکی زۆریـان کـەوتو دوای وتووێـژکردن لەگەڵیانـدا تـەنها سـێ بـەڕێزیان بـەڵێنیان دامـێ ئەگـەر هـاتو ئـەم هەڵبژاردنـە ئاژاوەیەکی تیا رووبدات لەهـەچ لایەنێکیانـەوە بێـت ئـەوان بەپەلـە بگەنـەوە ئێـرە بـۆ چارەسـەرکردنی ئـەو کێشەیەو نەهێشتنی روودانی براکوژی بۆ جارێکی تر لەکوردستاندا، چونکە ئـەوان دۆسـتێکی نزیکـی بـەڕێزان

---

کرێکارو خانوویەك بۆ نوسـینگەی خـۆمو گەنجینەیـەكو رێگایـەكی ٣ کـم درێـژ, تـەواو بکـەمو کارەبـای بـۆ رابکێـشم، ئـەو کاتـە لەسـەر ئـەم کـارەم سـێ سوپاسنامەم لەوەزارەتی کشتوکاڵی رژێمەوە بۆ هاتەوە لەسەر تەواوکردنی پرۆژەکەم بـەم مـاوە کەمـە، ئینجـا بەسـەرهاتی پرۆژەکـەم بەدووردرێـژی بـۆ گێڕانەوەو گوتم: دوێنێ دوو فایلی گەورەتان دا بەمن کەباسی لەئایندەی وەزارەتی کشتوکاڵ دەکـرد، کەسـەرنجمدا ئێـوە بەتـەمان لەئاینـدەدا کیـانێکی سیاسی دابنێن بۆ وڵاتو ئەمەش لەبەرژەوەندی دەوڵەتە ئیقلیمییەکاندا نیە. بەڵام جارێ ئێمە پـێش دانـانی کیـانێکی سیاسـی بـۆ خۆمـان پێویـستیمان دانانی ژێرخانێکی ئابووری هەیە بۆ ئەموڵاتە کە بەیەك ملیـار دینـار سویـسری هـەموو پرۆژەکـان ئـاوەدان دەکەنـەوە، یـەکێك لەوانـە پرۆژەکـەی منـە، بـا لە٨٠٪ی قازانجەکەی بۆ ئێوە بێتو لە٢٠٪ی بدەن بەمن، دوای یەك ساڵ داهاتی وەزارەتی کشتوکاڵ مانگانە نزیکەی ١٠ ملیۆن دینار دەبێـتو ٥٠٠ کرێکـار ئیش دەکات.وەزیری کشتوکاڵ نوسراوێکی ئاراسـتەی ئەنجومـەنیوەزیران بـۆ کـردم، لەسـاڵی ١٩٩٧ دا نێـچیرڤان بـارزانیو د. رۆژ گفتیـان دامـێ کـەبۆم ئاوەدان بکەنەوە، لەمانگی تەمووزی ساڵی ١٩٩٩ د. رۆژ شاویس گوتی ئەی پرۆژەکەت؟ گوتم ئیتر من کاسبی ناکەم، سیاسەت دەکەم.

مام جەلالو کاك مەسعودنو دڵسۆزی میللەتی کوردن، ئەوەی هاندەری من بوو بۆ ئەنجامدانی ئەو کارەو بزوێنەری هەستی نەتەوایەتی ئەو بەڕێزانە بوو، چاوەڕوانیکردنی ٤٠ ملیۆن کورد بوو بۆ سەرکەوتنی میللەتی کورد بەسەرکەوتنی ئەم ئەزموونە.

زۆر بەدڵنیاییو خۆشحاڵییەوە گەڕامەوە هەولێر، نامەیەکم لەرێگای کاك فەرەنسۆ حەریرییەوە ئاراستەی بەڕێز کاك مەسعود بارزانی کردو بەدوورودرێژی ئەم چاوپێکەوتنە سەربەخۆیەی خۆمم لەگەل ئەو سێ بەڕێزەدا تیا تۆمارکرد، دوای ماوەیەك ویستم چاوم بکەوێتەوە بەکاك فەرەنسۆ، کاتێك لێپرسراوی پرسگەکە بینیمی یەکسەر گوتی: فەرموو بچۆرە ژورەوە، وەڵامم دایەوە نەخێر ئاگاداری بکە، بەپرتاو رۆیشتو زۆر لەسەرخۆ گەڕایەوەو گوتی: لەوێ نییە !

دوای چوار ساڵ بۆم دەرکەوت کاك فەرەنسۆ لەبنەڕەتەوە ئەو کارەی منی پەسەند نەکردبوو، دیاربوو لەناو خۆیاندا بەهۆی ئەو دەستە ناپاکانەوە کەسەر بەرژێمنو لەدەوری کاك مەسعود کۆبوونەتەوەو زاڵن بەسەریدا بڕیاری تێکدانەوەی ئەزموونەکەیان دەرکردبوو، بەڵام ویستی جەماوەرو هێزێکی نێودەوڵەتی لەم بڕیارە بەهێزتربوونو نەیانهێشت ئەو نیازانە بۆ ماوەیەك سەربگرێت. دوابەدوای ئەمە سەردانێکی سلێمانیم کردو چوومە خزمەت کاك نەوشیروان, کەگەیشتمە ئەوێ یەکسەر فەرمووی: دەمێکە دیارنیت، گوتم: لەبەغدا بووم, ئینجا ئەو کارەی ئەنجاممدابوو بەدوورودرێژی بۆم گێڕایەوە، فەرمووی: زانیم شتێکت لەبن سەردایەو شتی باشیش نەبێت لەتۆ ناوەشێتەوە، من دڵنیات دەکەم شەڕ نابێتەوەو ئەوانیش بیکەن ئێمە نایکەین، جا کاك رەفیق پێشم خۆشە دەورت هەبێتو خۆت بەلایەکدا ساغکەیتەوە، گوتم: هەروا دەمێنمەوە، گوتی: ئەوە هەڵبژاردنە بۆ سەرۆكو حزب بەرای تۆ کێ دەردەچێت؟ گوتم پێم خۆشە وەکو حزب یەکێتی دەرچێتو وەکو سەرۆك مسعود بارزانی دەرچێت، بەڵام یارەبی خوایە مام جەلال دەرچێت. گوتی: ئەوە یەعنی چی؟ گوتم حەز دەکەم یەکێتی دەرچێت لەبەرئەوەی حزبێکی چالاكو رێکخراوە، حەزدەکەم کاك مەسعود دەرچێت لەبەر ئەوەی پیاوێکی ئارامو لەسەرخۆیە، بەڵام دەڵێم خوایە مام جەلال دەرچێت چونکە ئەگەر کاك مەسعود نەمێنێت دڵشاد لەدوای دێتو بەدوایدا نهادو سودادو وەجیهـ و... هتد، بەڵام ئەگەر مام جەلال نەمێنێت ئیتر کەسی لەدوای خۆی دانەناوە.

قۆناغی یەکەمی ناکۆکییەکان بەپەرۆ راوەشاندن دەستی پێکرد، لەبەهاری ١٩٩٤دا ئەگەر بچویتایە بۆ هەوارگەو سەیرانگاکانی کوردستان کەئەو بەهارە یەکەم بەهاربوو خەڵك بەو شێوە ئازادیو کامەرانییە رووبکاتە سەیرانگاکان، چاوت دەکەوت بەو خەڵکە چۆن بەوشەی ناشرین توانجیان لەحزبەکەی بەرامبەری خۆیان دەداو پڕوپاگەندەیان بۆ حزبی خۆیان دەکرد، ئەنجامی ئەو زیادڕەوییە لەدڵسۆزی هەریەکە بۆ حزبی خۆی چەندەها جار وایکرد خەریکبوو خوێن بڕژێت، بەڵام کەهەردوو سەرکردە بەمەیان زانی دوای ماوەیەکی زۆر ئەم دیاردەیەیان قەدەغەکرد.

قۆناغی دووەم لـەهێرش بردنەسـەر یـەکتر لـەدەزگاکانی راگەیاندنـەوە دەسـتی پێکـرد بەشـێوەیەکی زۆر توندوتیـژ، یەکـەم کـەس کەپڕوپاگەنـدەی بـۆ حزبەکـەی خـۆی دەکـردو هێرشـی دەبردەسـەر حزبەکـەی بەرامبـەری، لەتەلەفزیۆنـدا مامۆسـتا حـاجی محی‌الـدین معـروف بـوو بەرێوەبـەری پـەیمانگای مەڵبەنـدی مامۆسـتایان بەشـێوەیەکی زۆر ناشـرین لەسـەر کـەناڵی تەلـەفزیۆنی پارتییـەوە پڕوپاگەنـدەی دژی یـەکێتی دەکرد لەهەولێر، دوابەدوای ئەو بەماوەیەك مامۆستا نازم عومەر بریکاری وەزارەتی پێگەیاندن لەتەلـەفزیۆنی یەکێتییەوە وەڵامی دەداتەوە بەهەمان شێوە.

قۆناغی سێهەمی رووداوەکان بەشەڕی کوردکوژە دەستی پێکرد چونکە کاتێك حەسۆ میرخان لێپرسـراوی پشدەرو مەنگوڕو مامـەش بـوو, لەسـاڵی ١٩٦٤دا چـەند مـوڵکێکی دەبێـت لـەو ناوچـانە، نـازانم چـۆنو بـە چ شێوەیەك بووبوو بەموڵکی، لەنیسانی سـاڵی ١٩٩٤دا علـی کـوڕی حەسـۆ میرخـان, خۆی‌و چـەند بارزانییـەك چوون بۆ قەڵادزێ بـەو نیـازەی دوکانـەکانی بـاوکی وەرگرێتـەوە، لەئـەنجامی ململانێکردنـی نێوانیـان فتیلـی شەڕی براکوژی داگیرسا.

ئەوەبوو لەسەرەتای شەڕی براکوژیدا هێزەکـانی یـەکێتی, پارتییـان لەهـەولێر دەرکـرد، لـەو ماوەیەشـدا کەهەولێری بەدەستەوەبوو رێگای بەئێراندا هێرش بکاتە سەر بارەگاکانی دیموکراتی ئێران کەنزیکـەی ٢ کـم لەخاڵی پشکنینی کۆیەوە دوورە، من بەهۆی چەند دۆستێکمەوە لەناویاندا سـەر لەبەیانییەکـەی دەسـتبەجێ بەهەواڵەکەم زانی، بـۆ دڵنیـابوونم لەسـەلامەتییان سـەردانی بارەگاکـانم کـرد لەهـەولێرو گەیـشتمە بـەردەمی بارەگاکـە, بەپاسـەوانەکەم گـوت مـن رەفیـق پـشدەریم, ئـەم بەیانییـە هـەواڵی هێرشـی هێزەکـانی کۆمـاری ئیسلامیم بیستووە بۆ سەر بارەگاکانتان لەکۆیە، مـاڵی مـن مـاڵی دیموکراتـە، پێیـان رابگەیەنـە کـەدەرگای ماڵم ئاواڵەیـە بـۆ پێـشوازیکردنو میوانـداریکردنتان، ئـەوەبوو ١٣ رۆژ کۆمەڵـە کەسـێکم لـەدیموکرات لـەماڵی خۆمدا خزمەتکرد، بەشانازییەوە چی لەتوانامدابوو درێغیم نەکردو بۆم ئەنجامدان. هەموویان لەقوتابخانەیـەك بوونو ژمارەیان زیاتر لە٥٠٠ کەس بوو، چەند جارێك سەردانمکردن بۆ ئەوەی لەخزمەتیاندا بم، داوام لێکـردن کەدەمـەوێت خواردنیـان بـۆ دروسـتبکەم، گوتیـان ئـەوا بـۆ ٧ رۆژ دەچـێت چـامان نەخواردۆتـەوە، تـەنها میوانداری چامان بکە, بۆ رۆژی دوایی دوو شاگردم لەبازاڕەوە هێناو خۆمو بازیـانی کـوڕم چـامان بـۆ لێنـان، یەکێك لەکارمەندانی UN پرسی: تۆ لەچ گروپێکی سیاسی‌و سەر بەکێی، گوتم من نـاوم رەفیـق پـشدەری‌یە, سەر بەهیچ گروپێکی سیاسی نیم، کوردم دانیشتوی کوردستان, ئەمانەش کوردنو ئەو کـارەی مـن کردوومـە Tea Partyیە, واتە ئاهەنگی چـا خواردنـەوە، ئێمـەی کـورد هـەموو بـرای یـەکترین لەهەرچـوار پارچـەکەدا، کارمەندەکەی UN زۆر خۆشحاڵبوو بەقسەکانم گوتی کەوابێ منیش چایەك دەخۆمـەوە. بـۆ ئاگاداریتـان UN سەرپەرشتی دەکردنو بەشی زۆری گروپە سیاسییەکان خزمەتیانکردن.

لەکاتی سەردانی ئەم حزبـە بـۆ حـزبو لایەنـەکان بـەناوی سوپاسـکردنیان لەسـەر یارمەتیـدانیان لـەکاتی

لێقەومانەکەیانـدا, سـەردانی منیـشیان کـرد. پـاش تێپـەڕبوونی ماوەیـەك بەسـەر کارەسـاتەکەدا سـەردانی دەفتەری سیاسییانم کرد لەهەولێرو پێم گوتن: دوو سەعات پێش ئـەوەی کۆمـاری ئیـسلامی لێتـان بـدات, د. فوئاد مەعصوم لەو هێرشە ئاگاداری کردبوونەوە, ئەمەش وایکـرد تـەنها چـەند مریـشکێکتان تیاچـێت‌و هـیچ زیـانێکی ترتـان لێنەکـەوێت، ئەگـەر یـەکێتی مەبەسـتی لـەناوبردنی ئێـوە بوایـە کـەمێکتان رزگارتـان دەبـوو لەدەست سوپای کۆماری ئیسلامی, باشتروایە کە لەگەڵ یەکێتیدا تێکی نەدەن، چـونکە لەگـەڵ لێـرە تـرازان یان دەبێت لـەناو پارتیـدا بتوێنـەوە یـان هـەتا دوزخورمـاتوو نەوەسـتنەوە, پـارتی ناتانگرێتـە خـۆی‌و لـەناو بەعسیـشدا وەك موجاهیـدینی خـەڵقتان لێـدێت، ئـەوەی چارەسـەرە بـۆ ئێـوە ئەگـەر یـەکێتی وتوێـژی لەگەڵداکردن زۆر توند مەبن چونکە ئەگەر بگەڕێنەوە بارەگاکەتان لەکۆیەوەکو لەهەردوو حزبەکەدا بن وایە.

لەسەردانێکمدا بـۆ م.س. (ی.ن.ك) لەهـەولێر، دووبـەدوو لەگـەڵ جـەنابی د. فوئـاد مەعـصوم دانیـشتین‌و بەدووردرێژی باسی هەڵوێستی خۆم‌و سەردانەکەم بۆ دەفتەری سیاسی دیموکرات کردو پێم گوت: دوژمنانی ئێوە بەتێکڕایی باسی نابەجێیی ئەو کارەی ئێوە دەکەن‌و دۆستانیشتان هیچ بەڵگەیەکی دروستیان پێ نییـە بۆ بەرگری لێکردنتان، خەڵکی بەوە قایل نابێت کەپێیان بڵێن لەبەر ئـەوەی هـیچ سـنورێکمان بەدەسـتەوە نەماوە ناچارین لەگەڵ ئێرانـدا بەرژەوەندییـەکانمان یەکبخـەین بـۆ سـوودوەرگرتن لەسـنوورەکەیان، هـەرگیز جـەماوەری کـورد بـەوە رازی نابێـت سـوپای ئێـران لەسـایەی حزبێکـی کوردیـدا دەسـتدرێژی بکاتـە سـەر حزبێکی‌تری کوردی.

سوپاس بۆ خوا پاش ماوەیەك لەسەر ئەنجامی‌وتوێژکردن لەنێوان یەکێتی‌و دیموکراتدا، برا دیموکراتـەکان گەڕانەوە بارەگاکانی خۆیان‌و تەنها ئێران لەم نێوانەدا سـوودمەندبوو، چـونکە تـوانی بـەهۆی ئـەم کارەیـەوە سـاردی لـەنێوان کـوردی ئێـران‌و کـوردی عێراقـدا دروسـتبکات، هێـشتا بـرینی هێرشـەکەی پـارتی‌و کۆمـاری ئیسلامی بۆ سەر دیموکراتەکان سارێژ نـەبوو بـوو بـەهۆی یەکێتییـەوە کـەجارێکی تـر بریندارکرانـەوە، بـەڵام بەراسـتی هەڵوێـستی جـەماوەر بەرامبـەر دیموکراتـەکان جێـی سـەرنجبوو، بەتایبـەتی دانیـشتوانی کۆیـە، خەڵکەکە زۆر دڵسۆزانە دەرگایماڵەکانیان خستە سەرپشت بۆ پێشوازیکردن لێیان، ئەمەش کاردانەوەی ئەو بەدەمەوەهاتنـەی خـەڵکی کوردسـتانی ئێـران بـوو کـە لەرەوەکـەدا ١٩٩١ لەسـەر داواکـاری دیمـوکرات دەرگاکانیان بۆ خەڵکی کوردستانی باشوور خستە سەرپشت‌و بەهەموو شێوەیەك کۆمەکیان دەکردن.

ئـەوەی ئـەرکی سەرشـانی دیموکراتـە لـەم بارودۆخـەدا هێنانـەوە جێـی دڵـی کـوردی ئێرانـەو لـەرێگای بڵاوکراوەکانیانـەوە بـۆ ئـەو خەڵکـەی روونبکەنـەوە کەسـاردی نێـوان کـوردی ئێـران‌و کـوردی عێـراق تـەنها لەبەرژەوەندیی حکومەتی عێراق‌و ئێرندایە هیچی تر.

کاتێك هەولێر بەدەست ی.ن.ك. بوو, ژمارەیەکی زۆر لەنیـشتمانپەروەرو خێرخـوازانی دەرەوەو نـاوەوەی وڵات هەوڵیان لەگەڵدادا بـەبێ شـەڕو کوشـتار, هـەولێر لـەهێزە چـەکدارەکان چـۆڵ بکـات بـۆ ئـەوەی لەگـەڵ

پارتیدا دانیشنو لەسەر چۆنیەتی بەڕێوەبردنی هەولێر وتووێژ بکەن، بەلآم یەکێتی بەم چارەسەرە قایل نەبوو بەڵکو دەیگوت دەبێ پارتی چارەسەر بۆ هەموو کێشەکانمان دابنێت ئینجا ئێمە هەولێر لەهێزی چەکدار چۆڵ دەکەین. کاتێك بەڕێز مام جەلال فەرمووی (پارتی دەبێ بەدووربین سەیری هەولێر بکات)وای لەپارتی کرد کەهەموو رێگاچارەیەك پەسەند بکات بۆ ئەوەی دەست بەسەر هەولێردا بگرێتەوە، ئەوەبوو پارتی لە٣١/ئاب/١٩٩٦ سوپای رژێمی بەعسی هێنایە سەر هەولێر بەبەرچاوی ٩٥٪ی دانیشتوانەکەوە بۆ لێدانی هێزەکانی یەکێتی.

کاك خورشید شێرە کەپارێزگاری هەولێربوو, لە٣٠/ئاب/١٩٩٦ لەهاوینەهەواری صلاح الدین کۆبوونەوە بەزۆربەی کادیرانی پارتی دەکاتو دەڵێت: ئێمە مەبەستمان لەم هێرشە بۆ سەر هەولێر گرتنەوەیەتی بەهەرچی شێوەیەك بێت، هەتا ٧٢ سەعاتی تر ماڵ بۆ ئێوەو سەر بۆ ئێمە. ئەوەبوو توانییان بەهۆی یارمەتی تانکەکانی سوپای عێراقی لەهێرشەکەیاندا سەرکەوتووبنو هەولێر بگرنەوە. ئەو هێزە کەهاتەوە ناو هەولێر بەجۆرێك مامەڵەیان لەگەل خەڵکی هەولێردا کرد بەتایبەتی لەگەڵ ئەو کەسانەی سەر بەیەکێتی بوون، مەگەر تەنها صدام حسین لەگەڵ کوێتو خەڵکی کوێتدا کردبێتی، لەماوەی ئەو ٧٢ سەعاتەدا کەبۆیان دیاریکرابوو هەرچی خوا پێی ناخۆش بێت ئەنجامیاندا لەتالآنکردنو دزیو کوشتنو فڕاندنو دەستدرێژیکردنە سەر ناموس، ئینجا لێپرسراوانیان خۆشبەختانە توانییان دوای ٧٢ سەعاتەکە, بەرەڵلآییەکەی ناو هەولێر کۆنترۆڵ بکەن، بەلآم: پاش باران کەپەنك.

کاك فەرەنسۆ حەریری لەوتارێکیدا لەسەر تەلەفزیۆن بەشانازییەوە گوتی: سوپای عێراقیمان بۆ حەوت رۆژ بەکرێ گرتبوو، رژێمیش لەئێزگەو تەلەفزیۆنو رۆژنامەکانیدا بلاویانکردەوە کەسوپای عێراقی بەسەرکردایەتی قصی صدامو یارمەتی کوردە دڵسۆزەکانی (شمال) توانییان هەولێر پاك بکەنەوە لەئەڵقەلەگوێکانی ئێرانو ئەم کارەمان جێی پێشوازیکردن بوو لەلایەن جەماوەرەوەو لەئەنجامدا ئەو ئەفسەرانەی بەم کارە هەستابوون (نوط شجاعة)یان درایە.

ئەوەی جێی سەرنجبوو تالآنچییەکان کەماڵێکیان تالآندەکرد دەیانگوت فەرمانی کاك مەسعودمان پێیە، بۆ نموونە لە١٩٩٦/٩/١ نادر لەقلەق کەئامر مەفرەزەیەکی جاش بوو, هەڵدەکوتێتە سەر ماڵی مەلامەجید گوێڕی بۆ تالآنکردنی، ئەویش لەتاوا هانا بۆ باوکی مامۆستا سەعد مەلاعبداللە دەبات، ئەمیش بەنادر لەقلەقو پێی دەڵێت: کوڕە شەرم ناکەیت، تۆ نازانیت ئەمە ماڵی کێیە؟ ئەویش لەوەلآمدا دەڵێت: باش دەزانم، بەلآم من ئەو کارەم بەفرمانی کاك مەسعود ئەنجامداوە. لەچەند رووداوێکی ئاوادا خەڵك بۆی روونبووەوە کەهەموو ئەو خراپەکارییانە بەفەرمانی بنەماڵەی مەلامستەفای بارزانی ئەنجامدرابوو.

حزبەکەی بارزانی پەیتا پەیتا لەبلاوکراوەکانیدا پڕوپاگەندەی بۆ ئەوە دەکرد کەرژێم دان بەمافەکانی کورددا دەنێتو بەم زوانە بەیاننامەیەك لەم بارەیەوە لەنێوانماندا دەردەچێت، بەلآم ئەوە ساڵی (٢٠٠٠)ەو

هێشتا ئەو بەیاننامەیە دەرنەچوو! !

حزبەکەی بارزانی تەنها بەوەوە نەوەستایەوە کەهەولێر بگرێتەوە، بەڵکو شکاندنی هێزەکانی یەکێتی بەهەل زانیو هەتا سنووری ئێران دوایانکەوتن، مانەوەی هێزەکانی یەکێتی بۆ ماوەی ئەو ٤٠ شەوەی لەنزیك سنووری ئێران مانەوە، هۆکارێك بوو بۆ خۆ کۆکردنەوەو پیلاندانانو هێرش بردنەسەر هێزەکانی پارتی دوای گەڕانەوەی هێزەکانی رژێم بۆ شوێنەکانی خۆیان، ئەگەر یەکێتی گوشاری نێو دەوڵەتی لەسەر نەبوایە ئەوا دڵنیام نەك هەولێر, بەڵکو هاوینەهەواری سەلاحەدینو زۆر شوێنی تریشی لەپارتی پاکدەکردەوەو تەنها بەکۆیە قایل نەدەبوون.

دوای تێپەڕبوونی ٢٠ رۆژ بەسەر کارەساتی ٣١/ئاب, سەردانێکی سکرتێری پ.د.ك. مامۆستا علی عبداللەم کرد، پرسیاری لێکردم ئایا خەڵك چۆن باسمان دەکات؟ بارودۆخی ئێستای هەولێر چۆنە؟ کاتێ یەکێتی لێرەبوو باشتربوو یان ئێستا؟ دواڕۆژمان چۆن دەبێت؟ لەوەڵامدا گوتم: یەکێتیی نیشتمانی بەهۆی سلبیاتەکانیانەوە لە٣٥٪ی دانیشتوانی هەولێریان لەگەڵدا مابوو، لایەنگرانی ئێوە نزیکەی ٦٥٪ بوو، بەڵام ئێستا ٦٪ی جەماوەرتان لەگەڵدا نەماوەو هیچ کوردێکی نیشتمانپەروەر لەو باوەڕەدا نەبوو ئێوە دەست بخەنەوە دەستی صەدامو بەیەکەوە بێنەوە هەولێرو تاڵانکردنی حەڵاڵ بکەن بۆ دەستو دایرەکانتان، ئەم کارانەتان زۆر زەحمەتە سڕینەوەی لەمێشکی خەڵکداو دواڕۆژتان زۆر تاریکە، بەڵام سیاسەت بەرو پشتی نییەو ئەگەر لەکاتی ئەم شکستەی یەکێتیدا ئێوە دەستی ئاشتی بۆ مام جەلال درێژ بکەن سەرمایەیەکی گەورە دەبێت بۆ ئێوە چونکە ئەگەروا نەکەنو بارودۆخەکە بەم شێوەیەی بمێنێتەوە, سەرئەنجامەکەی بەنەمانی کورد تەواو دەبێت.

مامۆستا یونس رۆژبەیانی بەبێدەنگی دانیشتبوو تەنها گوێی دەگرتو هیچ بەشداری نەکردین، کەکۆتاییم بەم قسانە هێنا مامۆستا علی عبداللە وەڵامەکەی ئەوەندەبوو تەنها هەردوو دەستی بەنزمی پانکردەوە دەتگوت سواڵکەری بەر مزگەوتی گەورەیە، کەئەمە دوو مانا دەبەخشێت (یان ئاگام لێنەبووە، یان بێدەسەڵاتم).

هەفتەیەك دوای ئەم سەردانەم جارێکی تر چوومەوە خزمەتی مامۆستا علی عبداللەو باسی نەبەزی برازام بۆ کرد کە بەبیانووی ئەوەی جەلالییە, ئاسایشی هەولێر بردوویانە، زۆر ئازارو ئەشکەنجەیان داوەو ٩٠٠ دۆلارو ٦٠٠ دیناریان لێسەندووە، لەکاتێکدا ئەو تەنها کوڕێکی کاسبەو لەبازاڕی دۆلارەکە ئیش دەکات، لەئەنجامدا نامەکەی منی ئاراستەی کاك مەسعود کردو پاش ماوەیەك لەئاسایشی گشتییەوە ناردیان بەشوێنمدا گوتیان بچۆ لەمەسیف چاوت بەمامۆستا کریم سنجاری بکەوێت. کەگەیشتمە ئەوێ, ئەو لێپرسراوەم نەدەناسی کەبردیانم بۆلای، پێی گوتم کاك مەسعود نامەیەکی ئاراستەی ئێوە کردووە، بەڵام ئێمە بێبەرین لەو کارە، گوتم لەگەڵ ئەوەی تانکتان هێناوەتە شارەکەوەو خاوەنی ابراهیم خەلیلیشن کەچی

هێشتا خەڵکی رووت دەکەنەوە ! کەزانی قسەکانم زۆر رەق‌و قورسن, گوتی:وا باشترە چاوت بەکاك کەریم سنجاری بکەوێت.

کاتێك چاوم بەکاك کریم سنجاری کەوت ئەمیش بەهەمان شێوە فەرمووی ئێمە ئاگاداری ئەو دەستدرێژییە نین کەکراوەتە سەر برازاکەی جەنابتان. ئیتر لەمە زیاتر لەسەر ئەو مەسەلەیە نەرۆیشتم‌و ئەمە هۆکارێك بوو بۆ ئەوەی بتوانم چەند جارێکی تر چاوم بەم پیاوە بەرێزە بکەوێتەوەو لەهەموو چاوپێکەوتنەکانیشمدا باسم لەو هۆکارانە دەکرد کەدەبنە هۆی بەدەستهێنانی خۆشەویستی‌و نزیکبوونەوەی جەماوەر لەپارتییەوە، جەختم لەسەر ئەوە دەکرد بیر لەکوشتنی مام جەلال نەکەنەوە (کە بەهەمان شێوە یەکێتیشم ئاگادار کردۆتەوە بیر لەکوشتنی کاك مەسعود نەکەنەوە)و بۆم دووپات دەکردەوە رزگارکردنی کوردستان بەبێ یەکبوونەوەتان زۆر زەحمەتە. لەدوای ۳۱ی ئابەوە زۆر بەگەرمی هاتوچۆی دەزگای پاراستنی پارتی‌و دەزگای زانیاری یەکێتیم دەکرد, لەئەنجامی هاتوچۆکردن‌و نزیکبوونەوەم بۆم دەرکەوت پاراستن دەزگایەکە لەرێژەی دەزگاکانی موخابەراتی عیراقی‌و میتی تورکیدایەو ئەم دەزگایە ۹۰٪ لەخزمەت کوڕانی مەلامستەفاو نێچیرڤان بارزانیدایە بەتایبەتی دوای ئەوەی کەبەرێز مسرور بارزانی بەسەرۆکی ئەم دەزگایە دامەزرا ئیتر ۱۰٪ی لەبەرژەوەندی خەڵك‌و میللەتدا بەکار دەهێنرێت، بەڵام دەزگای زانیاری ٤٩٪ی لەبەرژەوەندی یەکێتی نیشتیمانیدایەو لە٥١٪ی لەبەرژەوەندیی میللەتەدایە.

**تێبینی**

*لەسەرانسەری جیهاندا ئەم دەزگایانە هەیە بەتایبەتی لەدەوڵەتە پێشکەوتوەکاندا, ئومیدەوارم کەی سنوری کوردستانی باشور گەیشتە شاخی حەمرین, لەبەر شارەزاییم لەم دەزگایانەدا وەکو کارمەندێکی پرسگە لەم دەزگایە کاربکەم بۆ خزمەتی کوردو کوردستان.*

گەیشتمە ماڵی شێخ محمدخالدی کوڕی شێخ احمد بارزانی لەگوندی رێزان, بەپاسەوانەکەم راگەیاند دەمەوێ چاوم بەجەنابی شێخ بکەوێت، بەڵام پاسەوانەکە ماوەیەك لەبەردەرگا رایگرتم، ئینجا چووە ژوورەوە بۆ لای جەنابی شێخ‌و پێی راگەیاند رەفیق پشدەری دەیەوێ چاوی پێت بکەوێت. بەپەلە خۆی هات بۆ پێشوازیم‌و لەپاسەوانەکە تووڕەبوو، منیش گوتم گلەیی لەو مەکە ئەو چوزانێت من کێم، ئینجا دوو بەدوو چووینە ژوورەوە بۆ ناو کۆشکەکەی لەوێ چەند بارزانییەکی بەتەمەنی بانگکردو باسی پەیوەندییەکەی منی بەو بنەماڵەیەوە بۆ کردن‌و گوتی: ئەم پیاوە هەر کاتێك کورد دوچاری مەترسی بوو‌بێت هانای بۆ من هێناوەو دڵنیام لەوەی کەمام جەلال ناردویەتی، گوتم سێ چوار ساڵیش دەبێت لەتەلەفزیۆندا نەبێت چاوم بەمام جەلال نەکەوتووە، گوتی ئەی مەسعود؟ گوتم ئەویش هەروەها، فەرمووی من هەواڵتم لەمەسعود پرسیوە دەیگوت دەیبینم، گوتم عبیداللە خەونی بەرێزانەوە دەدی‌و صدام لەناوی برد، بەراستی شوێنەکەت زۆر خۆشە، چاکت رازاندۆتەوە، لەکێڵگە ئەوروپییەکان دەچێت، ئینجا گوتم ئایا تۆ ئاگات لەبارودۆخی ئێستای

کورد نییە؟ رۆژ نییە چەند جارێك رەحمەت بۆ شێخ ئەحمەدی باوکت نەنێرم کەدەیفەرموو: (ئیشی کوردان پوچە)، هێشتا ئێمە کیانێکی سیاسیمان نییە مام جەلالو کاك مەسعود ئەم شەڕە براکوژییەیان بۆ هەڵگیرساندین؟ ئەگەر لەم دووبەرەکییەدا بەردەوام بن لەوە دەچێ زۆر لەم شوێنە خۆشەدا نەمێنیتەوە چونکە ئەم سیاسەتەی کاك مەسعود پیادەی دەکات، یاریکردنە بەئاگر، نەدەکرا رێگات لەکاك مەسعود بگرتایەو نەتهێشتایە حسین ئاغای سورچی[٣٤] بکوژێتو ماڵەکانیان تالان بکرێت؟ ئەنجامدانی ئەم کارە رەنگدانەوەیەکی زۆر خراپی دەبێت بۆ هۆزی بارزانو چواردەوری خۆتان کردووە بەدوژمن. جەنابی شێخ فەرمووی: من ئاگادار نەبووم لەم کارەو دەبوایە پێش روودانی ئاگادارت بکردمایەتەوە، چونکە نەمدەهێشت بیانکوشتایە، گوتم ئەی چۆن رێگاتدا کاك مەسعود دەست بخاتەوە دەستی صدام حسێن کە بەکوشتنی ٨٢٠٠ بارزانی تاوانبارە ٣٦یان براو ئامۆزاو کەسوکاری خۆتان بوون, ئەی بیرتان چووەوە بەعسییەکان چییان بەئافرەتە بارزانییەکانی قوشتەپە کرد، بارزان بەلای خەڵکەوە هەمیشە مەشخەڵی رزگارکردنی کوردستان بووە بەڵام ئێستا ٧٠٪ی جەماوەرتان لێتەکیوەتەوەو ئەگەر رێگاچارەیەك بۆ ئەم بارودۆخەی ئێستای کوردستان نەدۆزنەوە ئەوا ئەم ئەزموونی ئازادییە لەدەست هەموو کوردێك دەچێتو ئەو کاتە ئێوەش ناتوانن لەبارزان بمێننەوە، راستە ئێستا پارەو دەسەڵات لای ئێوەی بارزانییە بەڵام زۆربەی جەماوەرتان لێ تەکیوەتەوە بەتایبەتی نزیکەکانی خۆتان. گوتی من هیچ پەیوەندییەکی سیاسیم بەمەسعودەوە نییەو خەڵکێکی زۆر خراپ لەدەوری کۆبوونەتەوە، نهادی برای لەژیانیا دوو تەقەی نەکردووە ئێستا هەموو شتێك بەدەست ئەوە، بەشێوەیەك باسی عبدالمهیمن بارزانی کرد کەرووم نایە بینوسم. ئەو شەوە لەخزمەتی شێخ محمد مامەوەو بەحەوت بارزانییەکەی فەرموو ئاگاتان لەخۆتان بێت مێشکتان تێکنەدات، گوتم ئەو قسەیەیان بۆ دەگێڕمەوە کە لەساڵی ١٩٦٣ بەشێخ احمد بارزانیم گوت: ئەگەر بارزانی

---

[٣٤] حسین ئاغای سورچی: پێش هێرش بردن بۆ سەر حسین ئاغا بەچەند مانگێك چوومە گوندی کەلەکین، بۆی گێڕامەوە چەند رۆژێك بەر لەدانیشتنەکەمان فەرەنسۆ حەریری هاتبوو بۆ لامان، ئاگاداریکردمەوە کەزۆر چاودێری ئەو ٢٠ ماڵە بارزانییە بکەم کەلێرەن، منیش پێم گوت ئێمە شاخین, کێو نین؟

من لەو رۆژەوە هەستم بەناکۆکی کرد لەنێوان هۆزی سورچیو بنەماڵەی بارزانیدا، ئەوەبوو بەفەرمانی کاك مەسعود هێرشیان بردەسەر دێی کەلەکینو حسین ئاغایان کوشتو هەموو دێکەشیان تاڵانکرد، بەڵام عمر ئاغایان بەردەست نەکەوتبوو چونکە لەتاران بوو.

کاتێك عمرئاغا گەڕایەوە بۆ هەولێر چومە خزمەتی بۆ سەرخۆشیکردن، باسی ئەو ستەمەی بۆ کردم کەلێیان کراوە، گوتم راستە ئێوە کێشەی عەشرەتایەتیتان هەبوو بەڵام ئەوە ئاشکرایە کەئەم کارە لەسەر فەرمانی سەرکۆماری عێراق لەلایەن کاك مەسعودەوە ئەنجامدراوە لەسەر ئەوەی بارزان تکریتی بەنامە پەیوەندی پێوە کردبوویت لەدوای تەواوبوونی دانیشتنەکەی ڤیەننا پێی گوتبووی کاغەزی سپیت بۆ ئیمزا دەکەین بەمەرجێكواز لەم کوردایەتیو حزبایەتییە بێنە،وەڵامت دابوەوە: من چەند کاتە خزمەتی ئێوەم کردووە بەڵام لەئێستا بەدواوەوە بڕیارمداوە تامردن خزمەتی گەلو نیشتمانەکەم بکەم.

ساڵی ١٩٨٣ لەسەر فەرمانی مام جەلال منو بازیانی کوڕمو دوو پێشمەرگە بەنهێنی چووینە دێی کەلەکین بۆ لای حسین ئاغاو عمرئاغا، لەماوەی ئەو پێنج رۆژەدا کەلەوێ ماینەوە داواکارییەکانی مام جەلالمان بۆ خستنەڕوو، ئەوانیش فەرموویان ئەگەر بێتو مام جەلالو کاك مەسعود رێکبکەون ئەوا ئێمە ٣ ملیۆن دیناریان پێشکەش دەکەین، ئینجا پێش گەڕانەوەمان کلاشینکۆفێکی تازەیان پێشکەش بەبازیانکردو ٢٥٠٠٠ دیناروو دەمانچەیەکی تازەیان بەدیاری بۆ مام جەلال دامێ، بەڵام من تەنها دەمانچەکەم لێوەرگرتنو گوتم مام جەلال پێی راگەیاندووم پارە وەرنەگرمو دەمانچەکەم تەسلیم بەمام جەلال کرد.

ئەم هەڵوێستە برایانەیەی عمرئاغاو حسین ئاغام بەهەمان شێوە بۆ کاك مەسعود گێڕایەوە لەکاتی هاتوچۆ کردنم لەنێوان یەکێتیو پارتی.

بچێتە سەر ئیمپراتۆریەتی ماوەت بۆ لەناوبردنی جەماعەتی ابراهیم احمد، دووبەرەکی بەرپا دەبێتو پاش ٢٠ رۆژ یان ٢٠ هەفتە یان ٢٠ مانگ یان ٢٠ ساڵ یان ١٠٠ ساڵیتر ئەگەر کابرایەك جەمەدانییەکی سووری لەسەر بێت هەموو خەڵك نەفرەتی لێدەکەنو لەتاوا دەیشارێتەوە.

جێی سەرنجە من لەساڵی ١٩٦٣دا ئەم پێشبینییەی خۆمم بەشێخ ئەحمەد بارزانی گوتووەو ئێستا ساڵی ٢٠٠٠ـە, تەنها ٣٧ ساڵ بەسەر ئەو قسەیەم تێپەڕیوە کەچی لەهەندێ شوێنی کوردستان جامانەی سوور نابینیتو لەبەشێکی زۆریشیدا زۆربەی خەڵك لێیان بێزارە، ئاخۆ دوای ٥٠ ساڵی تر چارەنووسی جامانەی سوور لەکوردستاندا چی بێت؟

دوای ٣١ی ئاب بەچەند مانگێك سەردانی برای دڵسۆزو نیشتمانپەروەر کاك وشیار زێباریم کرد. هەموو سەردانێکم بۆ لای ئەم بەرێزە زیاتر لە٣ سەعاتی دەخایاند کەتیایدا باس لەبارودۆخی ئەو رۆژەی کوردستان دەکەین هەر یەکە بەبۆچونو لێکدانەوەی خۆمان. لەم سەردانەدا باسم لەوەکرد کەکێشەی کورد هەرگیز لەژێر سێبەری صدامدا چارەسەر ناکرێتو ئێوە تا ئاوا ناکۆك بن بەهیچ شێوەیەك رژێمی بەغدا ئاوڕتان لێناداتەوەو بایەختان پێناداتو ئێوەش بەبێ یەکتر کێشەی کوردتان بۆ چارەسەر ناکرێت. لەسەردانێکی ترمدا بۆ لای ئەم پیاوە گوتم: من دەزانم کەی رێکدەکەون؟ هەر کاتێك یەکگرتووی ئیسلامیو بزووتنەوە, بوون بەیەك ئێوە لەترسان رێکدەکەون, چونکە ئەگەر ئەو دوانە بوون بەیەك ئێوە لاواز دەبن. لەوەڵامدا فەرمووی: راست دەکەیت.

ئینجا پێم گوت کەی صدام روخا ئێوە رێکدەکەون, هەروەها کەی ئەو دوو حزبە بوون بەیەك, ئێوە رێکدەکەون. گوتی: راست دەکەیت. گوتم چاکترین رێگاچارە بۆ ئێوە ئەوەیە کە لەسەر بەرژەوەندیی گەلی کورد رێکبکەون، چۆن لەنێوان کۆشکی سپیو کرێملندا تەلەفونێك هەبوو پێیان دەگوت (هێڵی سوور)[٣٥] بەهەمان شێوە وا پێویست دەکات لەنێوان مام جەلالو کاك مەسعوددا هێڵی سوور هەبێت بۆ ئەوەی کاتێك صدام رووخا پەیوەندییان بەیەکەوە هەبێت بۆ دەست بەسەراگرتنی خانەقینو کەرکوكو سنجارو شێخانو زەممارو تەلەعفەر. لەماوەی ئەو ٦–٧ رۆژەدا کەوڵات وروژاوەو هێشتا بارودۆخەکە لەلایەن حکومەتی تازەوە کۆنترۆڵ نەکراوە، بۆ ئەوەی حکومەتی تازە جێی خۆی بەتەواوەتی بکاتەوەو بارودۆخەکە هێور بێتەوە وتوێژتان لەسەر ئەم ناوچە تازە ئازادکراوانە لەگەڵدا بکات نەك لەسەر ئەو شارانەی کەخۆتان لەساڵی ١٩٩١ەوە بەدەستانەوەیەو من دڵنیام لەوەی کەجارێکیتر شەڕ لەنێوان یەکێتیو پارتی نابێتەوە, چونکە بۆتان روون بووەوە بەشەڕ کێشەکان کۆتایی نایەت، ئەوەتا ئێوە توانیتان بەیارمەتی سوپای عێراق یەکێتی

---

[٣٥] سەرۆکی هەردوو دەوڵەتی روسیاو ئەمریکا بەهۆی ئەم هێڵە نهێنییەوە راستەوخۆ پەیوەندییان بەیەکترەوە دەکرد، نەوەکو لەپڕ فڕۆکەوانێك یان هەر هێزێکیتری سەربازیتر لەخۆیەوە بەکارێکی نابەجێ هەستێتو وڵاتەکەی بەرامبەری, بەبێ ئاگایانە وەڵامی بداتەوەو لەئەنجامدا جەنگی سێیەمی جیهانی بەرپابێت.

راوبنێنه سەر سنوور بەڵام ئەوان توانییان بەدەستو بازوی خۆیانو بەیارمەتی راجیمەی ئێرانی وەڵامتان بدەنەوەو ئەگەر گوشاری نێودەوڵەتییان لەسەر نەبوایە هەولێریشیان لێدەسەندنەوەو ئەگەر هاوپەیمانی ناتۆ (تورکیا) نەبوایە لەم هێرشەی دوایی، یەکێتی هەتا دهۆكو زاخۆ نەدەوەستانەوە، ئێستا هەردوولاتان تاقەتتان لەشەڕ چووەو بۆتان دەرکەوتووە کەصدامیش کێشەی کورد چارەسەر ناکات، بۆیە باشتروایە پێش رووخانی صدام ئێوە لەنێوان خۆتاندا رێکبکەونو ببنەوە بەیەك، چونکە ئەگەر صدام روخاو مام جەلال لەقەڵاچوالانو کاك مەسعودیش لەهاوینەهەواری سەلاحەدین بێتو هەر ئاواهی نارێك بن ئەو کاتە دەبێ بڵێین کاتی خۆی لەکوردستانی باشووردا ئێمە چەند ناوچەیەکی ئازادکراومان بەدەستەوەبوو.. لەبەر ئەوەی من دڵنیام جەنابتان رێزێکی تایبەتییان هەیە لەلای کاك مەسعود، داوات لێدەکەم ئەم پێشنیارەی من بخەیتە بەردەم کاك مەسعود بەڵکو پەسەندی بکات چونکە ئەو کارە لەبەرژەوەندیی هەموو گەلی کوردە.

جەژنێك لەساڵی ١٩٩٨دا چوومە خزمەت کاك مەسعود بۆ جەژنە پیرۆزە، پێی گوتم: ئەوە بۆ وا سەرت سپی بووە؟ گوتم لەخەفەتو مەراقی تۆ چونکە ئەوەندە خەفەتت لێدەخۆم. پاش تۆزێك ویستم بچمە دەرەوە کاك عبدالله ئاگرین پێی گوتم: کاك مەسعود دەفەرموێت نەڕوات با بێت لەلامان دانیشێت. ٢٠ دەقیقەیەك لەخزمەتی مامەوە دوای ئەوە روخسەتم لێوەرگرتو هاتمە دەرەوە چوومە خزمەت کاك وشیار زێباری، بەڵام هێشتا لەخەو هەڵنەستابوو، منیش لەدیوەخانەکەیدا دانیشتم کۆمەڵێك خەڵکی تریشی لێبوو، لەپڕ گوتیان جەنابی شێخ هات، پیاوێکی چوارشانەبوو عەگاڵێکی رەشو جامانەیەکی سوری بەسەرەوەبوو، عەبایەکی رەشیشی دابوو بەسەر شانیدا، کەهاتە ژوورەوە بەکوردی قسەی کرد، منیش چووم بەخێرهاتنم کردو پێم گوت: (لەلای ئێمە کابرایەك هەبوو ناوی عەلی حەسەن ئاغای مەنگوڕ بوو، سەرۆك هۆزی مەنگوڕ بوو، لەخاڵی پشکنینی شارۆچکەی رانیە لەپۆلیسێك دەدات، کەقایمقام بەمە دەزانێت دەچێتە لای عەلی ئاغاو پێی دەڵێت: تۆ لەم رۆژانەدا وێنەت لەگەڵ سەرۆك صدامدا دەرچووە، بۆ تۆ جوان نییە لەپۆلیسێك بدەیت، ئەویش دەڵێت: شێخ حسێنی بۆسکێن گەورەترین پیاوە لەناوچەی رانیەو پشدەردا لەبەنزینخانەیەکی بەغدا پۆلیسێکی عەرەب لەسەر بەنزین لێی داوە منیش تۆڵەی شێخ حسین لێرە دەکەمەوە) کابرای عەرەب گوتی: قوربان تۆ من ناناسیو نازانی من کێمو بۆچی هاتوومو چی روویداوە؟ من نوێنەری صدامو هاتووم لەگەڵ کاك وشیاردا چاوم بەکاك مەسعود بکەوێت، چونکە بارودۆخی صدام ترسناکەو لەوانەیە لەم رۆژانەدا ئەمریکا بەفڕۆکە لێی بداتو دژایەتی تریشی بکات، دەمەوێت بزانم ئێوە هەڵوێستتان چی دەبێت؟ چونکە بەیارمەتی سەرۆك صدام حسین هەولێرتان گرتەوە ئەگەر سوپای ئەو نەبوایە جلال هاوینەهەواری سەلاحەدینیشی دەگرت، منیش گوتم: یاڕەبی لەجیاتی جارێك ئەمریکا ملیۆنێك جار لەصدام بدات، بەڵام ماڵە کوردەکان پارێزراوبێت، مەسعود بارزانی سەرۆکی کوردەو ئێمە هەموومان لەژێر فەرمانی ئەوداین، تاکە هەڵە کەهەیبێت ئەوەبوو کەدەستی خستەوە ناو دەستی صدام حسین،

مام جەلال‌و کاك مەسعود بران‌و صدام بەتەمای ئەوە نەبێت دوژمنایەتی یەکتر بکەن.

لەم کاتەدا پاسەوانەکانی کاك هۆشیار بەپەلە دیوەخانەکەیان بەجێهێشت‌و چووبوون بەکاك هۆشیاریان گوتبوو، شێخمان میوانەو کاك رەفیق تێکیداوە، سەیرمکرد کاك هۆشیار بەپەلە هات، بەدەستێکی تەوقەی لەگەڵ شێخدا کردو دەستەکەی تریشی خستبووە سەرشانی من، گوتم جەنابی شێخ من سکرتێری ئەم پیاوەم، من سیاسی نیم بەڵکو قسەکانی ئەم لەبەر دەکەم‌و دەیڵێمەوە, ئەو بەمنی گوتووە کەدۆستانی حکومەتت بینی‌وایان پێ بڵێ‌و ئەو لەلای تۆ ئێستا قسەکان دەگۆڕێت، کاك هۆشیار فەرمووی: دوێنێ شەو کاك مەسعود باسی تۆی دەکردو سەلامی لێدەکردیت. گوتم ناوێرێت‌و نایەوێت من ببینێت چونکە بەرامبەر من مادەی پێ نییە بەرگری لەخۆی بکات.

زیاتر لەپانزە کەس لەوێ دانیشتبوون زۆربەیان بەتەمەن بوون, یەکێکیش لەوانە کاتی خۆی مامۆستای کاك هۆشیار بوو، بەشێکی تریان خەڵکی ئاکرێ بوون‌و بەسۆرانی‌و بادینانی وتوێژیان دەکرد، من بەعەرەبی قسەکانم بۆ جەنابی شێخ دەکرد بۆ ئەوەی باش تێبگات‌و خۆی گێل نەکات، ئاگاداربووم کەئامادەبوان تێکرا بەقسەکانم خۆشحاڵ بوون.

رۆژێکی هەینی سەردانی حاکم رشید عبدالقادر (سەرۆکی دادگای تەمییزی هەرێمی کوردستان)م کرد لەماڵەوە، باسمان لەبارودۆخی ئەو رۆژەی کوردستان دەکرد بەتایبەتی رووداوی ٣١/ئاب، حاکم رشید زۆر خۆی بەبێدەسەڵات نیشانداو گوتی: سەد خۆزگە هەردوو دەستم ببڕدرایەتەوەو لەدامەزراندنی پ.د.ك. بەشدار نەبوومایە. کاتی خۆی من زیاتر لە٢٢ ساڵ ماڵم لەبەغدابوو، دۆستایەتیم لەهەموو روویەکەوە لەگەڵ خەڵکدا زۆر باش بوو، بۆیە چوومە بەغدا کەسەردانی ئەو برا کوردانەی ئەوێ بکەم‌و لەنزیکەوە بۆچونیان لەسەر بارودۆخی کوردستان وەرگرم بەتایبەتی لەسەر رووداوی ٣١ی ئاب، چونکە کوردی بەغدا بەهەموو شێوەیەك دەوری بەرچاویان هەبوو لەزۆربەی گۆڕانگارییەکاندا، بەڵام کەچوومە لایان بەشی زۆریان لەترسی دەزگای ئاسایش نەیاندەوێرا رای خۆیان بەرامبەر ئەو رووداوە دەربڕن, لەگەل ئەوەشدا لەهەمو کۆڕێکدا باس لەو رووداوە دەکرا کەچۆن مسعود بارزانی دەستی خستە دەستی صدامەوە بۆ لاوازکردنی کورد. چاوم بەکاك فوئاد عارف کەوت‌و پرسیارم لێکرد چۆن دەڕوانیتە رووداوی ٣١/ئاب؟ چونکە تۆ لەمن باشتر مەلامستەفا دەناسیت، ئایا ئەوەی مەسعود و نێچیر بارزانی پێی هەستان جێی سەرسوڕمان نییە کەبۆ کۆنترۆڵکردنی هەولێر دەستیان خستە دەستی رژێمەوە؟ ئێستا ئەگەر هەڵبژاردن بکەیت لەکوردستانی باشووردا بەتایبەتی لەهەولێر کە بەچاوی خۆیان تانکی رژێمیان بینی, لەوانەیە پارتی ٦٪ بهێنێت، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ئەگەر بۆ چاککردنی بارودۆخی کوردستان دانیشنەوە هێشتا هەر ئەوان سەرکەوتوون. راستە مام جەلال لەسەر سنوورەو خەیمەکەی ٥ کم لەسنووری ئێرانەوە دوورە، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کەجەماوەری بەدەستەوە نەماوە، کاك فوئاد عارف گوتی: تۆ پشتگیری لەکامیان

دەکەیت؟ گوتم: من بەهیچ جۆرێك پشتگیری لەصدامو دۆستانی ناکەم، گوتی: مسعود بەناچاری ئەو کارەی ئەنجامداوەو ئەگەر وای نەکردایە نەمانی مسۆگەر بوو، گوتم کاك فوئاد تۆ دوای هەرەسەکە بۆت گێڕامەوە گلەییت لەمەلامستەفا کردووە کە لەسەرەتای شۆڕش لەساڵی (١٩٧٤)ەوە منتان گلدایەوە تا ئێستا، لەکاتێکدا بۆ سەفەری یەك رۆژی هاتبوومو هەتا هەرەس چاوت بەمن نەکەوت لەگەڵ ئەوەشدا ژوورەکانمان بەتەنیشت یەکەوە بوون، لەوەڵامدا مەلامستەفا دەڵێت خەتای کوڕەکانم بووە دوو تفم لێکە. ئێستا زۆر لام سەیرە کەتۆ بەو شێوەیە پشتگیری لەکارێك دەکەیت کە بەسەرۆکایەتی نێچیرو قوصەی ئەنجامدراوە، بەداخەوە ئێمە لەمێژە دۆستین، بەڵام من تۆم نەناسیبوو ئەوەندە سەر بەرژێمیتو پشتگیری لێدەکەیت.

لەکۆتایی وتووێژەکەماندا پێم گوت: بەو بۆنەیەوە کەئاوا لەگەڵ مەسعود بارزانیدا نێوانتان خۆشە، نامەیەکم بۆ مەسعود بارزانی بۆ بنووسە بەڵکو پرۆژەکەم بۆ چاك بکاتەوە، گوتی زۆر سەیرە تۆ لەوساکەوە قسەی پێ دەڵێیتو ئێستا داوای چاککردنەوەی پرۆژەکەتی لێدەکەیت. منیش گوتم: ئەو لەپارەی خۆی بۆم چاك ناکاتەوە بەڵکو لەپارەی (بیت المال)، منیش یەکێکم لەو میللەتە.

پاش ماوەیەك چاوم بەبرایەکی دڵسۆزو کوردپەروەر کەوت کەیەکێکە لەدکتۆرەکانی بەغدا، فەرمووی: زۆر بەناشرینی لەگەل کاك فوئاددا قسەت کردووە، لەگەڵ ئەوەشدا کەئێوە چەند شەوێك لەماڵیاندا میوان بوونو خزمەتی زۆری کردوون، گوتم: لەمەش زیاتری بۆ کردووم، دوو ساڵ پێش ئێستا کەهاتم نەشتەرگەری چاوم کرد پارەی هەموو ئەو ماوەیەی بۆ دابووم کە لەئوتێل مابوومەوە، بەڵام ئەمانە هەمووی لەلایەكو ٣١ی ئاب لەلایەك، نازانم ئەمانە چۆن بەزەییان بەو رەنجەی باوکی میللەتی کورد(مەلامستەفا)دا نایەتەوەو بەبێ بیرکردنەوە ئەو کارە نابەجێیانە ئەنجامدەدەن.

لەساڵی ١٩٥٨ـەوە کەچوومەتە ریزەکانی خەباتەوە، هاوەڵەکانی بەندیخانەو ئەو برا پێشمەرگانەی کە لەشاخ پێکەوە بووین شاهیدن کەمن، لەئاشتیو لەشەڕدا، لەبەدەسەڵاتیو بێدەسەڵاتیمدا هەموو مەبەستێکم خزمەتکردنی ئەم گەلو نیشتمانە بووە بەبێ جیاوازی، بەڵگەم بۆ قسەکانم هەموو ئەو نامەو پێشنیارو راپۆرتانەیە کەپێشکەشم کردووە بەزۆربەی دەزگاکانی پارتی بەتایبەتی دوای ٣١ ئاب کەهیچ شێوازێك نەما بەکاری نەهێنم، لەپاڕانەوەو سکاڵاو پێشنیارکردنو خۆبردنەپێش، بەڵام بێسوودبوو، تا ئێستاش نامەکانم لەلایان ماوە، بێجگە لەمانەش چەندەها راپۆرتی جۆراوجۆرم دەنوسی کەشێوازی نزیکبوونەوەیانم لەجەماوەرەوە تیا روونـدەکردەوە، هەروەها بەرزکردنەوەی باری ئابووریی ئەو خەڵکەی لەژێر دەسەڵاتیاندایە، بۆ نموونە پێشنیارم کرد بەچەند ملیۆن دینارێك (کەبۆ ئەوان هیچ ناکات) هەموو زیانە ماڵیو گیانییەکانی لەدانیشتوانی هەولێر کەوتووە چارەسەردەکەن، سەرئەنجام گەیشتمە ئەوەی کەمن دوای کڵاوی بابردوو کەوتوومو ئەمان میوانن، میوانیش دوای ساتێکیتر بێت یان چەند ساڵێك هەر دەڕوات، هەروەها دڵنیابووم لەوەی کەکوڕانی مەلامستەفا بارزانی بەهیچ شێوەیەك بارگەی نەتەوایەتی (الشحنة الوطنية) یان

تیادا نەماوە، بۆیە بڕیارمدا لەسەریان بنووسم.

هەرچەندە کەچاوم بەزۆریك لەلێپرسراوانی پارتی کەوتووە بەهەمان شێوە چاویشم کەوتووە بەبرادەرانی یەکێتیو زۆر بەدوورودرێژی بەتایبەتی لەگەڵ برای بەڕێز د. فوئاد مەعصومدا, باسی ئەوەم بۆ کردوون کەئێوە بەبێ پارتی ناتوانن فیدراڵی بەدەست بێننو چارەسەری ئێوە بۆ کامەرانی لەکوردستاندا هەڵدانەوەی پەڕەیەکی سپییە لەنێوانتانداو چاوپۆشیکردنتان لەو کارەی کاك مەسعودو بەجێهێشتنی بۆ مێژوو، ئێستاوەکو برا بەبێ رقو کینە دەستبخەنە ناو دەستی یەکتر چونکە ئەگەر ئەم جارە هێرشیان بۆ بەرن لەوانەیە سوپای فەرەنسی یان ئەڵمانی بەرەوڕووتان بێتەوە. ئەگەر بمەوێت هەموو ئەو چاوپێکەوتنانەی لەگەل لێپرسراوانو خەڵکدا لەسەر ئەم رووداوە ئەنجاممداوە تۆمار بکەم, ئەوە بەدوو کتێب کۆتایی نایەت، هەر بۆیە بەم رووداوە کۆتایی پێ دێنم:

جارێکیان کەسایەتیی ناسراوی عەرەب (مامۆستا عبدالجلیل پەرتۆ) لەزەمانی پادشایەتیدا دەچێتە خزمەت عبداللاله (وەصی)، سکرتێرەکەی وەصی یەکسەر باسی بارودۆخی ئەو رۆژەی عێراقی بۆ دەکاتو دەڵێت: ئەو دزیو واسطەو کاسبی حەرامو بەرتیل خواردنەی ئێستا هەیە هەرگیز لەپێشتردا نەبووەو کەس ئەم ولاتە بەهی خۆی نازانێتو هەموو هەوڵێکی ئەو خەڵکە بۆ گیرفان پڕکردنەو بەس، مامۆستا جلیل پەرتۆ کەگوێی لەم قسانە دەبێت هەڵدەستێت بڕوات سکرتێرەکە پێی دەڵێت دوای پێنج دەقیقەی تر کاتی ئەوە دێت بچیتە لای خاوەن شکۆ, جوان نییە ئێرە بەجێ دەهێڵێتو دەچیتە دەرەوە، مامۆستا عبدالجلیل لەوەلامدا دەڵێت: بڕوات هەبێت ئەو قسانەی کەجەنابت کردت من لەوە زیاترم پێ نییە بەخاوەن شکۆی بڵێمو نێوان ژوورەکەی تۆو ژوورەکەی (وصی) تەنها یەك مەترە ئیتر چ پێویست دەکات من بچمە لایو کاتی لێبگرم.

## باسێکی پارێزگای هەولێر

هەولێر بەیەکێك لەکۆنترین شار دادەنرێت لەجیهانداو لەساڵی ١٩٩٩دا بڕیارێك لەلایەن (الامم المتحدە) دەرچوو کەدەبێت پارێزگاری لەم شارە بکرێتو بەیەکێك لەشارە مێژووییەکانی جیهان تەماشا بکرێت. لەکاتێکدا کەعوسمانییەکان لەناوچەی کوردستاندا دەسەڵاتداربوون چەند موچەخۆرێکی خۆیان بۆ پارێزگاریکردنی بەرژەوەندییەکانیان لەم ناوچانە دامەزراند، کەدەوڵەتی عوسمانی نەما بەشێکیان گەڕانەوە تورکیاو بەشێکیان مانەوە، هەولێریش یەکێك بوو لەو ناوچانەی کەبەشێکی تیادا مایەوە، بەدرێژایی مێژوو هیچ ناکۆکییەك لەنێوان ئەو تورکمانانەو کورد رووینەداوە، چونکە کورد ئەوانی بەمیوان زانیوەو خوڕەوشتی کورد وایە رێز لەمیوان بگیرێت. لەسەرەتای دامەزراندنی حکومەتی عێراق لەساڵی ١٩٢٢ لەسەرژمێرییەکدا روونبۆوە کەتەنها ٧ خێزانی تورکمان لەهەولێر هەبووە، دوای راپەڕینە مەزنەکە بەچەند مانگێك هەندێك لەو کەمایەتییە تورکمانانەی لەهەولێرن, دەچنە لای کاك مەسعودو داوای مافی تورکمانی لێدەکەن، ئەویش

لەوەڵامدا دەڵێت هەموو مافێکتان دەدەینێ، بەڵام ئەمە خاکی کوردستانە، یەکێك لەبرادەرە تورکمانەکانی هەولێر بەناوی (......) قەصاب پێی گوتم نەدەبوو کاك مەسعو وای پێ بگوتینایە، سەیر لەوەدابوو ئەم پیاوە بەرەچەڵەك کوردبوو. تورکیا بەناوی خزمەتکردنی تورکمانەکانەوە ١٣ ملیۆن دۆلاری لەرێگای خاچی سووری تورکی (کەمیت بەرێوەی دەبات) بەسەر تورکمانەکاندا دابەشکرد، ئەم کارە هانی زۆرێك لەخەڵکانیدا لەبەر پارەکەو کەمدەرامەتییان خۆیان بەتورکمان بنوسنو لەئەنجامدا تانسۆچیلەر لەچاوپێکەوتنێکی تەلەفزیۆنیدا گوتی: ئێمە خاوەنی ٣ ملیۆن تورکمانین لەباکوری عێراق.

**ئەو هۆکارانەی کەیارمەتی سەرخستنی ئەم پیلانەی تورکیایدا**

١- برسێتیو نەداری.

٢- ئەو خەڵکە لەتاو رۆحی خۆیو خۆپاراستن لەدەست چەکدارەکانی کوردستان دەچووە پاڵ تورکمانەکان چونکە کەس نەیدەتوانیو ناتوانێت بەرامبەر ئەمان بوەستێت.

٣- زۆرێك لەچڵکاوخۆرەکانی رژێم بۆ پاراستنی خۆیان پەنایان بردە بەر حزبی تورکمان.

٤- سەرەکیترین هۆکار دەگەرێتەوە بۆ ئەم دوو حزبە باڵادەستەی لەکوردستاندان، خۆم ١٢ ساڵ دانیشتوی هەولێر بووم, لەماوەی ئەو چەند ساڵەدا ئاگادار بووم لەدوای راپەرینەکە ماف خەڵك لەلایەن ئەم دوو حزبەوە پێشێل دەکراو لەلایەکی تریشەوە ئەو پارە زۆرەی لەابراهیم خلیلو لەدەرەوەی وڵات بۆیان دەهات کاك نەوشیروان واتەنی(لەنێوان خۆیاندا نیوە بەنیوە بەشیاندەکرد)، بەڵام ئەم بەشکردنە لەنێوان خۆیاندا تەنها بۆ گیرفان پرکردنی خۆیان بوو بەبێ ئەوەی بیر لەمیللەت بکەنەوەو بەم پارە زۆرە دەیانتوانی نەیەڵن میت پارە لەدەرەوەی وڵاتەوە بێنێتو لێرە خەڵکی پێ بکرێتو خۆیان هەموو ئەو پارەیەیان هەڵنەگرتبا بۆ خۆیانو بەشی ئەو خەڵکەشیان لێبدایە ئەوسا کەس ئاوڕی لە تورکمانەکان نەدەدایەوە.

ئاشکرایە تورکیا لەساڵی ١٩٧٤ـەوە بەشێکی لەقوبرص داگیرکردووەو لێی ناکشێتەوە، هەولێریش بەهەمان شێوە تازە بوو بەقاعدەیەکی پتەوی تورکمان لەکوردستاندا کەهۆکارەکەی سەرکردەکانی خۆمانن. ئێستا تورکمانەکان ئەوەندە پشتئەستورن، دەڵێن ئەگەر بێتو پارتی یان یەکێتی ئازارمان بدەن سوپای تورکیا لەسەر ئێمە دێتە وەڵامو دادەبزێتە شارەکانی کوردستان بۆ بەرگریکردن لێمان، ئەوەبوو ساڵی ١٩٩٩ پارتی بەنیو سەعات هەموو هەولێری لەمیت پاککردەوە، بەڵام ئەم کارە ٢٤ سەعاتی نەخایاندو لەوەزارەتی ناوخۆی پارتییەوە گوتیان هەموو ئەو کەسانەی کەبەم کارە هەستاون سزادەدرێن، بەڵام رەنگە ئەگەر پارتی لەو کارەی پاشگەز نەبوایەتەوە رووداوەکەی ٣١/ئابی لەبیر خەڵك دەبردەوە، مام جەلال لەوتارێکیدا فەرمووی(پێش ئەوەی هێرش بکرێتە سەر عێراق داوامکرد تورکیا لەشەری کەنداودا بەشدار نەبێت چونکە تورکیا ناکشێتەوە)، لەگەڵ ئەوەشدا زۆرێك لەتورکمانەکان ناوێرن پەیوەندی بەمیتەوە بکەن, دەڵێن

دواڕۆژێکی ڕەش چاوڕەوانییان دەکات، بەڵام بەجۆرێك ئاڵۆزوبلۆز بووە ئەوانەی نیشتمانپەروەرو دڵسۆزن‌و خزمەتکاریی کەس قبووڵ ناکەن, دوور خراونەتەوە یان دەربەدەرکراون وەکو پارێزەری کوردپەروەر کاك محمود ئەحمەد کەئێستا لەهەندەرانە.

## هەڵوێستی چوار دەوڵەتی داگیرکەری کوردستان بەرامبەر بەکورد

**عێراق‌و بەعس:** ڕووداوی ۳۱/ئاب باری سیاسیی ڕژێمی بەعسی لەجاران بەهێزتر کردو کەوتنە جموجۆڵ لەکوردستانی باشوورداو دەستوپێوەندەکانی بەعس هەوڵیاندەدا یەکێتی بەلای خۆیاندا رابکێشن‌و بانگەوازیان بۆ ئاشتبوونەوەی هەردوو حزبەکە دەکرد بەپاساوی ئەوەی دوای ئاشتبوونەوەتان, کێشەی کورد چارەسەر دەکەین‌و لەم کارەشدا مەبەستیان ئەوەبوو کە:

١- سۆزی ئەمریکاو بەریتانیاو دەوڵەتەکانی تری جیهان بەرامبەر بەکورد کەمبکەنەوە.

٢- بەجەماوەری کورد بڵێن سەرکردەکانتان ناتوانن بەبێ ئێمە وڵات بەڕێوەبەرن.

٣- چەوساندنەوەی کوردی شارە ئازاد نەکراوەکان حەڵاڵ بکەن.

دەزگا ئەمنییەکانی ڕژێم وەکو جاران کەوتەوە گەڕ لەناو کوردستاندا بەتایبەتی لەهەولێر، لەوانەیە هێزەکانی صدام ئەوەندەیان توانا پێ مابێت چۆن هەولێریان گرتەوە بەچەند سەعاتێك سلێمانیش بەو شێوەیە بگرنەوە، بەڵام تازە دەزگای موخابەراتی عەرەبی شۆفینی ناتوانێت لەکوردستاندا ئۆقرە بگرێت‌و وەکو جاران تیایدا بژی‌و فەرمان بەسەر خەڵکیدا بکات، بەڵام هەموو هەوڵێکیان بۆ ئەوە دەبێت ئاژاوە بخەنە ناومانەوە.

**تورکیا:** عوسمانییەکان بەهۆی ئەو خەلافەتە ئیسلامییەی کە لەباوباپیرانیانەوە بۆیان بەجێما, توانییان هەموو دەوڵەتە عەرەبییەکان‌و کوردستانی خۆمان بخەنە ژێر دەسەڵاتی خۆیانەوە، ئەو کەلتورە مێژووییە ئیسلامییەی لەمۆزەخانەی ئەستەمبولدایە لەهیچ دەوڵەتێکی‌تری ئیسلامیدا نییە، کەواتە کوردیش بەهەمان شێوە لەژێر دەسەڵاتی تۆڕانییەکاندا بووەو لەوڕۆژەوە کەمال ئەتاتورك دەسەڵاتی گرتەدەست هەتا ئیمڕۆ کورد بەرهەڵستی ئەو ستەمەیان کردووە کە لەلایەن ئەم دەسەڵاتەوە لێی کراوەو لەئەنجامی ئەو دژایەتییەیاندا بۆ کورد, ئێستا تورکیا بەیەکێك لەدەوڵەتە قەرزارەکان دەژمێردرێت‌و ئەمە نەبۆتە پەند بۆی، تائەو جەنەڕاڵانە تورکیا بەڕێوەبەرن بەبەردەوامی لەلایەن کوردو خوشەویستانی کوردستانەوە بەرهەڵستی دەکرێن. بلێند ئەجەویدی زمانحاڵی ئەو جەنەڕاڵانە بەبەردەوامی لەوتارەکانیدا بەئاشکراو بەنهێنی ناڕەزایی خۆی بەرامبەر بەکورد دەردەبڕێت‌و هیچ پێشنیارێك قبوڵ نییە کەبەرژەوەندیی کوردی تیا بێت.

سەیر لەوەدایە کاتێك هانی پارتی دەدات بۆ لێدانی یەکێتی, بانگەواز بۆ ئاشتبوونەوەیان دەکات، بەڵام ئەوەی ئێمە دەبێ ڕەچاوی بکەین ئەوەیە کەتورکیا ڕازی نابێت کورد لەکوردستانی باشووردا خاوەنی فیدراڵی بێت‌و بەشداریکردنی بەمەرج بگرێت بۆ دانیشتنەوەی ئەو دوو حزبە بەشەڕهاتووەو ئاشکرا بڵێت نە

حکومەتی کوردیمان بیستووە نە میللەتی کورد، ئیتر چۆن دەبێت دڵی پێخۆش بکرێتو متمانەی بدرێتێ.

**سوریا:** لەگەڵ ئەوەدا کەبارودۆخی کورد لەسوریا زۆر جیاوازە لەتورکیا بەڵام هەتا ئێستاش بەمهاجر ناو دەبرێن بەمەرجێك زیاتر لە٣ ملیۆن کورد لەسوریادا دەژین.

بانگێشتکردنی کاك مەسعود لەلایەن (حافظ الاسد)ەوە بۆ سوریا جێی سەرنجی هەموو جیهان بوو، ئەوەی جێ باس بوو ئەو پێشوازیکردنە گەرمە لەلایەن جەماوەرەوە بەفەرمانی سەرۆکی سوریا بوو چونکە ئەمە یەکەم جارە سەرکردەیەکی کورد بەو جۆرە لەلایەن سوریاوە پێشوازی لێبکرێت، کاك فلك الدین کاکەیی لەلێدوانێکیدا بۆ کەناڵەکانی تەلەفزیۆن لەگەڕانەوەیاندا فەرمووی: من لەخزمەت کاك مەسعوددا بووم بەچاوی خۆم ئەو پێشوازییە گەرمەی جەماوەری سوریام بینی بۆ خودی کاك مەسعود بارزانی. بەڵام من کاك فلك الدین بناسم سیاسەتمەدارێکی کۆنەو چاك دەیزانی کەسوریا, مەبەستی دوور خستنەوەی کاك مەسعودبوو لەتورکیاو ئەمریکاو ئیسرائیل, هەروەها بیخاتەوە ریزی ئۆپۆزیسیۆنی عێراقیو چیتر لەگەڵ تورکیادا لەپەکەکە نەدات، چونکە سەرۆکی سوریا مەترسی لەسیاسەتی تورکیاو ئیسرائیل هەیە وەك دەوڵەتێکی عەرەبی, لەهەمانکاتدا دۆستایەتییەکی زۆری لەگەل عبدالله ئۆج ئالاندا هەبوو، بەڵام ئەوەی جێی سەرسوڕمانە ئەو هەموو داکۆکییە لەمافی کورد دەکاتو تا ئێستا مافی بەکوردی سوریا نەداوە.

**ئێران:** کەخومەینی دەسەڵاتی گرتەدەست جەماوەری کوردستانی رۆژهەڵات چاوەڕوانی دانپیانانی مافەکانیان بوون، بەڵام نەك هەر دان بەمافەکانی کورددا نەنرا، بەڵکو بڕیاری جەنگی لەگەڵیانداو زۆر بەداخەوە سەرۆك محمد خاتەمیش هیچ بایەخێکی بەچارەسەرکردنی کێشەی کورد لەئێراندا نەدا، کەچی هەوڵی رێکخستنەوەی یەکێتیو پارتی گرتبووە ئەستۆی خۆی. ئێستا بەناوی سیاسەتو بەرژەوەندیی کوردی باشوورەوە یەکێتی دۆستایەتییەکی زۆر بەهێزی لەگەڵ کۆماری ئیسلامیدا هەیە.

**دەوڵەتە عەرەبییەکان:** هەموو دەوڵەتە عەرەبییەکان زۆر چاك دەزانن کە لەسەر دەستی سەرکردەی کورد صلاح الدین ئەیوبی فەلەستین ئازادکراوە، بەڵام تاکە سەرکردەیەکی عەرەب کەدانی نابێت بەوەی کورد لەساڵی ١٩٢٢ بەزۆر بەعەرەبەوە بەستراونەتەوەو پێویست دەکات کەکورد خاوەنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی خۆی بێت بەڕێز سەرۆکی لیبیا معمر قەزافیە کەدژ بەبۆچوونی هەموو ئەو سیاسەتمەدارە عەرەبانەیە کەلەگەل چەوساندنەوەی کورددان، لەناو کۆمەڵەی وڵاتانی عەرەبی تەنها قەزافیو ئەسەد گوتیان: گوێزانەوەی کورد لەلایەن صدام حسینەوە گەورەترین شەرمەزارییە بۆ عەرەب. هەروەها سیاسەتمەداری بەڕێزو بەناوبانگ مشعان الجبوری گوتی: پەسەندترین کار ئەوەیە دەسەڵاتی عێراق مافی سەربەخۆیی بەکورد بدات چونکە لەپاداشتی ئەو کارەمان, کورد دەبنە گەورەترین پاڵپشت بۆمان.

دانیشتوانی کوردستانی باشوور بەتێکڕا بیروبۆچوونی رای ئۆپۆسیزیۆنی عێراقی (عەرەب)ی لا ئاشکرایە کەدەیانەوێت کورد چەك هەڵگرێتو حکومەت بڕوخێننو بەسەر لاشەی کوردەوە بچنە سەر تەختو بەئێمەش

بلێین ئێمە هەموو ئیسلامین‌و دۆستایەتیمان زۆر کۆنەو ئەوە سەدام نەما ئیتر چیتان دەوێت بۆ خۆتان لەماڵەوە دانیشن ئێمە خزمەتتان دەکەین. ئەگەر خوانەخواستە پێیان بلێیت ئێمە دەمانەوێ حکومەتێکی سەربەخۆی کوردی دابمەزرێنین ئەو کاتە پیاوەکانیان بۆیمباخی ڕەش دەبەستن‌و ئافرەتەکانیشیان جلی ڕەش دەپۆشن‌و دەڵێن: (ئەی ئەوە نییە صدام حوکمی زاتی داونەتێ, بۆ شوکری خوا ناکەن, بڕۆن سەیری کوردی ئێران بکەن بزانن دەوێرن بەکوردی ناوی مناڵەکانیان بنێن، ئاگاتان لێیە لەتورکیا چۆن مافی کورد پێشێل کراوە) ئەوسا ناچارمان دەکەن بلێین بەفیدراڵیش ڕازین، ئینجا پێمان دەڵێن ئێوە ناتوانن ئیدارەی خۆتان بکەن، ئەوە چەند ساڵە دوو پارچەن، بەراستی جێی مەترسی دەبن بۆ عێراق، چونکە ئەگەر یەکێکتان دەرەقەتی ئەوی تر نەهات ئەو کاتە هێزی بێگانە دێنێتە ناوەوە بۆ پارێزگاریکردن لەخۆتان‌و بەو شێوەیە دەسەڵاتتان بەسەر پارێزگاریکردنی سنوورەکاندا نامێنێت‌و هەر سوپایەك پێی خۆش بوو بەبێ ترس دێتە ناوەوە.

بەشی زۆری ئەو برا عەرەبانەی لەدەست سەدام ڕایانکردووە لەژوورێکی ئوتێل لەشام یان لەئێران‌و ئەوروپادا خەبات دەکات، کەهاتە سەر حسابیش دەیەوێت حوکمی زاتیش بەکورد نەدات، لەگەڵ ڕێزمدا بۆیان زۆرێك لەو حزبە ئۆپۆزیسیۆنە عێراقیانە بەو شێوەیە بیر لەمافی کورد دەکەنەوە، من بەتایبەت سوپاسی تەنها سێ کەسم کردووە لەعەرەب ئەوانیش (الاسدو قەزافی) کەهەموو کورد قەرزاری ئەم دوو بەڕێزەن، هەروەها سیاسەتمەداری عێراقی مشعان الجبوری.

هەرکاتێك ئێوە لەبڵاوکراوەکانتاندا بەیانێکتان دەرکرد کەکورد میللەتێکی سەربەخۆیەو مافی ئەوەی هەیە خاوەنی دەوڵەتی خۆی بێت, ئەو کاتە هەموو کوردێك دەستتان بەسنگەوە بۆ دەگرێت، ئێمەی کورد هیچ کێشەیەکمان لەگەڵ نەتەوەی عەرەب نییە، بەڵام ئێمە ڕەخنەمان لەهەڵوێستی ئەو عەرەبانە هەیە کەبەرامبەر بەکورد, شۆفێنیانە بیر دەکەنەوە، ئێستا ئێوە خاوەنی یەك بست خاکی ڕزگارکراو نین لەعێراقدا بەئاشکرا، هەرکاتێك گڵۆپی سەوزتان بۆ داگیرسێنرا بۆ لەناوبردنی صدام, ئەگەر نیەتتان لەگەڵ کورد پاك بێت ئەو کاتە دەتوانن خاکی کوردستان وەکو پێگەیەکی سەربازی خۆتان بەکاربهێنن‌و شان بەشانی شۆڕشگێڕە قارەمانەکانی کوردستان بەرەو لەناوبردنی ڕژێم بکەونەڕێ‌و سەرئەنجام هەموومان دەبین بەخاوەنی عێراقێکی دیموکراتی پێشکەوتوو، هەر یەکەمان لەناوچەکانی خۆماندا وەکو دوو دراوسێی دڵسۆزی یەکتر, ڕۆژگار دەبەینەسەر.

ئەگەر بەهەوڵی هەموو گروپە سیاسییە کوردەکان نەبوایە بەتێکڕا, ئەو ڕاپەڕینە مەزنە سەرنەدەکەوت بەتایبەت پارتی‌و یەکێتی، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کەئەوانیتر هیچیان نەکردووە، بەڵکو هەرهەموویان جێی باوەڕو متمانەی گەلی کوردن‌و دەستێکی باڵایان لەسەقامگیربوونی ئاسایشی شارەکاندا هەبووە, بەڵام لەگەڵ ڕێزمدا بۆ هەندێکیان لەجیاتی ئەوەی لەکاتی شەڕی یەکێتی‌و پارتی هەریەکەیان خۆی بداتە پاڵ

یەکێك لەم دوو زلهێزە بۆ گەرمکردنی شەڕەکە, ئەگەر هەموویان بەیەکەوە هێزی سێهەمیان دروست بکردایە، لەئەوپەڕی ڕاستەوە بۆ ئەوپەڕی چەپ, هەروەها حزبە ئیسلامیەکانیش پێکەوە، ئەو کاتە کێشێکی دیارو بەرچاویان دەبوو، دەیانتوانی بەهەر هەموویان نەیەڵن ئەو ئاگرە بەو شێوەیە کڵپە بسێنێت. ئێستا من نازانم (یەکگرتوو یەکبوون) گوێ لەپێشنیارەکانی من دەگرن بۆ یەکگرتن؟ یان ئەوانیش وەکو یەکێتیو پارتین هەرچەندە بۆچوونەکانیشیان لەیەك نزیکە کە لەساڵی ١٩٦٣ەوە تا ئێمڕۆ هەر بەجیا کاردەکەنو گوێ لەپێشنیاری کەس ناگرن، چونکە ئەگەر ئەو دوانە یەك بگرن کوتلەی سیهەمی گۆڕەپانی کوردستان دروستدەکەن، دەتوان بەحیکمەتی ئیسلام زۆرێك لەو ئاژاوەو شەڕوشۆڕە چارەسەر بکەن، بونموونە: پێش هەرەسەکە مامۆستا ابراهیم احمدو علی عەسکەری پێشنیار بۆ مەلامستەفا دەکەنو دەڵێن: تۆ دانیشەو ئاشبەتاڵ مەکە سەرپەرشتی ئەم شۆڕشە دەکەین دوای دوو ساڵی تر ئەم شۆڕشە دەبێتە گەورەترین شۆڕش لەجیهاندا، بەڵام مەلامستەفا پیشنارەکەی پشتگوێ خستو قسەکەی شای پەسەندکرد، ئەم بارودۆخەی ئێستا کوردی تیایە سەرەنجامی پیادەکردنی پیلانەکانی شای ئێرانە.

**ئینگلیزو ئەمریکا:** ساڵی ١٩٨١ لەلەندەن, لەحکومەتی بەریتانیام پرسی: بۆ کوردستانتان کردە چوار پارچە؟ گوتیان باپیرانمان ئەوەیان کرد، گوتم: وەکو خۆی لێبکەنەوە، گوتیان جارێ زەحمەتە، گوتم صدام دەمێنێ؟ گوتیان: نامێنێ, گوتم ئێمە دەبین بەحکومەت؟ گوتیان دوای چارەسەرکردنی کێشەی فەلەستین.

ئەم دوو دەوڵەتە زلهێزە لەساڵی ١٩٢٢ بەزۆر کوردستانی باشوریان بەحکومەتی عێراقەوە لکاندو لەساڵی ١٩٤٦دا (ترومان)ی سەرکۆماری ئەمریکا، ڕوسیای ئینزارکرد کە لەماوەی چەند ڕۆژێك سوپای ڕوسیا لەئازەربایجانی ڕۆژئاوا (کوردستانی ئێران) نەکشێنێتەوە ئەوا بەهەموو شێوەیەك لێیدەدرێت، ئەوەبوو ئاشبەتاڵی بەکۆماری مەهاباد کرد. هەروەها هەر ئەمانیش ئاشبەتاڵیان بەشۆڕشی مەلامستەفا کرد، کوردستان بەئاشکرا (تعریبو تەبعیسو ئەنفالو کیمیاباران) دەکرا، کەس دەنگی ناڕەزایی بەرزنەدەکردەوە، هەر ئەمان نەیانهێشت دوای جەنگی کەنداو، صدام بروخێت. دوای ڕاپەڕین، بەبەرچاوی ئەمریکاوە صدام بەهەموو هێزێکەوە هاتەوە کوردستان کەچی هەر هەڵوێستیان نەگرتو بۆش تا لەپشوەکەیدا گوێی لەئاژانسی دەنگوباسی ڕۆیتەر نەبوو کەسێ ملیۆن کورد بەرەو لەناوچوون دەچنو، بۆشیش لەپشودانو گەشتوگوزاردایە، حکومەتی ئەمریکی هەڵوێستی وەرنەگرت. دوای ئەمە پشتگیرییان لەکورد کردو بەناوی مرۆڤایەتییەوە هێزی ئەنچەرلیکیان بۆ دانایین کەبمانپارێزن, لەگەل ئەوەشدا بەریتانیا داوایکرد هێڵەکە لە٣٤دا بێت بەڵام ئەمریکا لەبەر ئەوەی بەرژەوەندی لەوەدابوو کەنەوتەکە بکەوێتە لای صدام، هێڵەکەی لە٣٦ دانا، لەو ڕوانگەیەوە کەئەمریکا دەڵێت (ئێمە کێشەکان بەڕێوەدەبەین, چارەسەریان ناکەین). مادلین ئۆڵبرایت بانگێشتی بۆ ئاشتبوونەوەی یەکێتیو پارتی کردو گوتی: دەبێ نوێنەری تورکیا لەدانیشتنەکاندا بەشداربێت، چونکە خۆیان دەیانزانی بەشداریکردنی تورك مانای سەرنەکەوتنی ئاشتییە

لەناوچەکەدا، هەروەها هەفتانەو مانگانە لەدەزگاکانی راگەیاندنەوە بەردەوام دووپاتی پارچەپارچە نەکردنی خاکی عێراق دەکەنەوە بۆ ئەوەی کورد بیر لەسەربەخۆیی خۆی نەکاتەوە. سەیر لەوەدایە لەکوردستانی باشووردا ئاوەدانی بەرپاکردووە، کەچی یارمەتی تورکیا دەدات بۆ وێرانکردنی کوردستانی باکوورو دەستگیرکردنی عبدالله ئۆج ئالانو پشتگوێ خستنی مافی ٢٥ ملیۆن کوردو ئێستا تەواوی کورد چاوەڕوانی ئەوە دەکات کەئەمریکا واز لەو سیاسەتە دوو فلیقانەیە بێنێتو لەگەڵ کوردستانی باکورو باشوور هەوڵ بدات بۆ یارمەتیدانی هەموو کورد.

## سیاسەتی نێودەوڵەتی بەرامبەر کورد لەساڵی ٢٠٠٠دا

هەتا نەوت لەعێراقدا هەبێت روسیاو صینو فەرەنسا بەهۆی بەرژەوەندییەکانی خۆیانەوە لەگەڵ رژێمی بەغداو ئەو پەیوەندییە بازرگانییە بەهێزەی نێوانیان, بەهیچ جۆرێك پشتی صدام بەرنادەنو هەموو هەولێکیان بۆ مانەوەی صدام دەبێت، بەڵام ئەگەر صدام ئەو پەیوەندییە رەت بکاتەوە ئەو کاتە لەماوەیەکی کەمدا لەناویدەبەنو ئەمریکا, نەوتەکە دەخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە بەشەریکایەتی بەریتانیا، بەکوردیش دەڵێن ئەوا صدام نەماوەو حکومەتی بەغدامان بۆ روخاندن بڕۆن بۆ خۆتان لەماڵەوە دانیشن.

ئەم راستییانە لەسەر دەورەبەرەکانمان ئەوە دەگەیەنن کەکەم تا زۆر هەموویان لەسەر ئەوە رێککەوتوون کوردنەبێت بەدەوڵەت, هەرچەندە زۆریان لەناو خۆیاندا لەسەر زۆر شت نارێکن. ئەو خەڵکە دڵسۆزەی کوردستانی باشوور هەموو بەیەك دەستو یەك بۆچوون بۆ لەناوبردنی رژێمی دیکتاتۆری، لەکوردستاندا راپەڕینە مەزنەکەی ١٩٩١یان بەرپاکرد، بۆ ئەوەی بتوانن بەئازادیو کامەرانی لەولاتی خۆیاندا بژین, جەماوەر بەگشتی باوەشیان بۆ یەکێتیو پارتی کردەوەو لەساڵی ١٩٩٢دا هەمو خەڵك بەپەرۆشەوە بەرەو سەندوقەکانی دەنگدان بەرێکەوتن بۆ ئەوەی بیانکەن بەدەمڕاستی ئەم میللەتە، بەڵام زۆر بەداخەوە, بەهۆی دووبەرەکی نێوانیان, کوردستانی باشوور بوو بەکالایەكو کڕینو فرۆشتنی بەسەروەکراو خەڵکێکی گومناو, بەماوەیەکی کەم لەهیچەوە بوون بەخاوەن پارەیەکی زۆرو چارەنووسی ئابووریی کوردستانی باشوور کەوتە ژێردەستی چەند بازرگانێکی جەنگو چەندەهایان بەناوی سەرکردایەتیو لێپراسراوێتییەوە هەرچی سەرچاوە ئابورییە گرنگەکانی ولاتەکە هەبوو دەستیان بەسەریدا گرتو هەندێکیان گەیشتونەتە وەزعێکەوە کە بەهیچ شێوەیەك لەنرخی جلوبەرگو خواردنو کرێی خانوو باری ئابووریی ئەو خەڵکە داماوە ئاگادارنین، ئەوەتا ژمارەیەکی زۆر لەگەنجانمان کە لەهەمووولاتێکدا گەنج, بنیادنەرەی پێشکەوتنی شارستانییەتە, لەلای ئێمە لەبەر نەبوونیو بێ ئیشیو نائارامی بارودۆخەکە پۆل پۆل ئەم ولاتە بەنرخە بەجێدەهێڵنو روودەکەنە هەندەران بۆ ئەوەی بتوانن بەشێکی مافەکانیان لەوێ دەستەبەر بکەن. بەگوێرەی سەرژمێری خۆراك لەUN, دانیشتوانی سنووری هەرێمەکەمان ٣,٣٤٠,٩٣٣ کەسەو لەباشوورو ناوەندا ٣,٥ ملیۆن هەیە، زۆر راستە ژیان لەهەرێمەکانی کوردستاندا جێی بەراوردکردن نییە لەگەڵ ژیان لەژێر دەسەڵاتی

بەغدا، بەڵام ئەو خەڵکە بۆ بەراوردکردنێکی بچووك لەگەڵ رژێمدا ئەم راپەڕینەی ئەنجام نەدا بەڵکو بۆ گۆڕانکارییەکی گەورە لەهەموو لایەنەکانی ژیان ئەنجامیدا، دووبەرەکییەکان تەنها بەیەکێتیو پارتییەوە نەوەستا بەڵکو سەریشی کێشاوە بۆ نێوان پارتیو پەکەکە, ئەمەش لەئەنجامی خۆ بەزلزانینو لەبەرچاوگرتنی بەرژەوەندی تایبەتیو گوێنەدان بەبەرژەوەندیی کوردستان چونکە پارتی هەستی بەزوو گەورەبوونی حزبی پەکەکە کردو مەترسییەکی گەورەی بۆ دروستبوو کەکەس باسی ئەم نەکاتو متمانەی جەماوەر لەدەستبدات، هێرشی کردەسەر هەموو بارەگاکانیان کەزانی خەڵکێکی زۆر لەناوچەی بادینان بەگشتی پشتگیرییان لێدەکەنو لەبارزانییەکانیش دوو بارزانی گەیشتبوونە پلەی سەرکردایەتی لەناویاندا، لەکاتێکدا دەیتوانی کەس لەناو بارەگاکانیاندا نەکوژێتو ئاوو کارەباو ئازوقەی لێببڕینایە هەموویان بەناچاری خۆیان تەسلیم دەکردو خوێن نەدەڕژا، لەدەستگیرکردنەکەی عبدالله ئۆج ئالان کەمادلین ئۆلبرایت سەری سوڕمابوو لەو هەموو ناڕەزایی دەربڕینەی خەڵك بەرامبەر گرتنی عبدالله ئۆج ئالان، کاك نێچیر ئەو رۆژەی کرد بەپشووی رەسمی بەناوی دامەزراندنی قوتابیانەوە, ئەمەش بۆ خۆ بردنەپێش لەتورکیا، هەروەها کاك سەفین دزەیی بەرامبەر بەگەشت پێکردنی ٤٤ کەس لەخزمانی خۆی بۆ تورکیا بەبێ لێپرسینەوە هەرچی زانیارییەك کەدەستی کەوتبوو لەسەر دانیشتنەکەی فرانسوا میترانو حزبە کوردستانییەکان بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد, هەمووی دابوو بەتورکیا.

کاتێك ئەریتریا لەئەسیوبیا جیابۆوە رۆژنامەنوسێکی جیهانی دەچێ بۆ ئەریتریا بۆ ئەنجامدانی راپرسی، چاوی بەهاوڵاتییەك دەکەوێت پێی دەڵێت: ئیستاتان باشترە یان ئەوسا؟ هاوڵاتییەکە دەڵێ جیاوازییەکی وامان نییە بەڵام ئەوەی دڵخۆشکەرە، دراوسێکەم بۆتە وەزیرو کاتی خۆی بەپاسکیل هاتوچۆی دەکردو سەیارەی نەبوو، بەهەمان شێوە ئێستاش لەخۆی نەگۆڕاوەو هەر بەپاسکیل ئیشی شەخسی خۆیو ماڵو منالی ئەنجام دەدات، لەگەڵ ئەوەشدا کەسەیارەیەکی حکومی دەیهێنێتو دەیبات بۆ دەوام، بەڵام بۆی نییە بۆ کاری خۆی بەکاری بهێنێت, لەبەر ئەوەی بە(بیت المال) کڕدراوە.

ملك فەیصلی یەکەم کە لەبنەماڵەیەکی هاشمییە, حەز ناکات ئەو سەیارەیەی کەدەیبات بۆ کۆشکی پاشایەتیو دەیهێنێتەوە ماڵەوە بۆ کاری خۆی بەکار بهێنێت، لەگەشتێکدا بۆ لەندەن لەبەر بێ پارەیی سەیارەیەکی نیوداش بە(قیست) دەکڕێو وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا دەبێتە کەفیلی، ئەوەی من ئاگادارم کوڕە بچوکەکەی مسعود بارزانی کە لەسەرەتاییە, ئەو سەیارەیەی هاتوچۆی پێدەکات بایی ٢ ملیۆن دینارە.

رۆژگارێك بوو تاکە رۆژنامەیەك نەمابوو لەجیهاندا باسی ئازایەتیو قارەمانێتی باوکی گەلی کورد مەلامستەفا بەوێنەوە بڵاونەکاتەوە، کارامەییو توانای ئەم پیاوە جێی باسی هەموو جیهان بوو، ساڵی ١٩٦٩ لەهەنگاریابووم بەیەکێکیانم گوت: کوردستان, نەیزانی... گوتم: کەرکوك, هەر نەیزانی... گوتم: بارزانی،

ئینجا سەری بۆ راوەشاندمو پێکەنیو تەوقەی لەگەڵ کردم. زۆرێك لەخەڵك لەسەر ئازایەتی پەڕینەوەی بارزانیو ٥٠٠ کەس لەروباری ئاراس بۆ روسیا, مناڵەکانیان ناو دەنا ئاراس. تەرمەکەی بارزانی کە بەهەر شارو شارۆچکەو ناوچەیەکدا تێدەپەڕی لەکوردستاندا, گەورەو بچووكو ژنو پیاوو پەککەوتە هەرهەموویان دەهاتنە سەرجادەکان بۆ پێشوازیکردن لەتەرمی بارزانی, هەزارەها کەس خۆی بەقوربان دەکرد، من خۆم ئەو رۆژە پارەم قەرزکرد بۆ بەشداریکردن لەرێوڕەسمی بەخاك سپاردەکردنی لەبارزان.

کاك مەسعود... کاك نێچیر بارزانی... ئێوە نەوەی ئەو زاتە شۆڕشگێڕەن، بەهۆی ئەوەوە خاوەنی ئەو هەموو سامانو سەروەتە نەبڕاوەیەنو بەشی زۆری کوردستانی باشوور لەژێر دەسەڵاتی ئێوەدایەو بەهۆی بارزانییەوە خاوەنی گەورەترین سەرمایەی جەماوەری بوون لەکوردستانی باکوورو رۆژهەڵاتو رۆژئاوادا، بۆ نەتانتوانی پارێزگاری لەو سەرمایە جەماوەرییەی خۆتان بکەن, خەباتگێڕانی هەرچوار پارچەکە لەژێر ئاڵاکەی بارزانیدا کە لەلایەن پێشەوا قازی محمدەوە پێی سپێردرابوو، خوێنی خۆیان لەپێناوی سەروەری کوردستاندا دەڕشت، لەبیرتان چووەوە کاتێك تەرمی بارزانیتان بەتەیارە لەئەمریکاوە برد بۆ ئێران تەواوی کوردی ئێران چۆن بەدڵسۆزانە بەپیرتانەوە هاتن؟ چۆن دەستتان تێی چوو دوای بەخاك سپاردنی باوکتان لەوێ، بەماوەیەکی کەم پێش سوپای ئێران کەوتن بۆ لەناوبردنی شۆڕشی کورد لەئێران، بەراستی باوکتان بەو کارە لەمەزارەکەیدا شەرمەزارکرد، ئینجا دوای ئەمان هێرشتان بردەسەر خەباتگێڕانی کوردستانی تورکیا لەگەڵ سوپای تورکیادا لەکاتێکدا رۆژگارێك بوو کوردستانی تورکیا گەورەترین پاڵپشتو دالدەبوو بۆ شێخ سەلام بارزانی لەو رۆژەدا کەدژایەتی حکومەتی بەغدای دەکردو بێجگە لەمان دالدەی تری نەبووە، لەوە دەچێ ئاگاداری ئەوەنەبن کەدژایەتی کردنتان بۆ پەکەکە, دژایەتیکردنتانە بۆ ٢٥ ملیۆن کوردی کوردستانی باکوور.

ئەوەی جێی سەرنجو سەرسوڕمانە هەتا خۆم تانکەکانی حکومەتی عێراقم نەبینی (٣١/ئاب) لەهەولێر بەهیچ شێوەیەك بڕوام نەدەکرد کەرۆژێك لەرۆژان نەوەی مەلامستەفا بارزانی, بەناوی بەرژەوەندیی گشتییەوە دەست بخەنە ناو دەستی صدام حسینی تاوانبارەوە، هەرگیز باوەڕم نەدەکرد کاك نێچیری کوڕەزای مەلامستەفا, لەگەل قوصەی صدام حسینی دوژمنی مەلامستەفا بارزانی بەیەکەوە بێنە هەولێر بۆ لێدانی حزبێکیتری کوردستان. ئەوەی جێی داخە خۆ بەزلزانین هەڵی خەڵەتاندنو بەمانەشەوە نەوەستان, بەڵکو گەورەترین دوژمنی کوردتان هێنایە ناو خاکی پیرۆزی کوردستانی باشوورەوە کەهاوپەیمانەتی ناتۆیەو لەراگەیاندنەکانیشتانەوە بەشانازییەوە باستان دەکرد، بەکردەوەکانتان هەرچی باوکتان بەهەموو تەمەنی خۆی دروستیکردبوو, ئێوە لەماوەی چەند ساڵێکی کەمدا هەموویتان روخاند. ئێستا کەباسی سەرکردە پایەبەرزەکانی کورد دەکرێت لەناوو دەرەوەی وڵاتدا ناوی شێخ مەحمودی نەمرو شێخ سەعیدی پیرانو قازی محمدو عبداللە ئۆج ئالان بەنموونە دەهێنرێنەوە، بەکردەوەکانتان ناوی باوکتان لەو لیستە پیرۆزەدا

سـرپیوەتەوە، توخـوا گوناهتـان نەگەیـشتواتان لـەناوی ئـەم زاتـە پـیرۆزە کـرد، ئـەوە پاداشـتتی ئـەو سەربەرزییەیە کەبۆ ئێوەو هۆزی بارزانی بەجێهێشت؟

ساڵی ١٩٩٩ سەردانی سکرتێری تایبەتی کاك مەسعود، بەڕێز کاك مەسرور بـارزانیم کـرد، لەسـەردانەکەدا گوتی: کاك رەفیق لەبیرتە ساڵی ١٩٨٦ باوکم پێی گوتیت: چی بۆ مەسروری کوڕم بکەم ئەوەش بۆ بازیـانو رەوەزی کوڕت دەکەم؟ گوتم: منیش لەوەڵامدا بەباوکتم گوت نەهیچ بۆ مەسرور دەکەیتو نەهیچ بـۆ بازیـانو رەوەزیش دەکەیت، ئینجا بەکاك مەسرورم گوت: دەترسم تـۆش وەکـو باوکـت بیـت چـەند جارێـك تـا ئێـستا ویستومە چاوم پێتان بکەوێت نەمتوانیوە، گوتی بەگۆڕی بارزانی نـەمزانیوە تـۆ لەهـەولێریت, لـەم قـسانەدا کاك سەروەری سکرتێری کاك مەسرور هاتە ژوورەوە گوتی: کاتەکەت تەواو بووە تەنها ٢٠ دەقیقە بوو، گـوتم ئەم ژوورە بەجێ ناهێڵم تا قسەکانم تەواو نەکەم, بەم شێوەیە سەعاتو نیوێك لەگـەڵ کـاك مەسـروردا باسـی دوو شتی سەرەکیم کرد، یەکەمیان باسـم لـەگرنکی ئاشـتبوونەوەیان لەگـەڵ یـەکێتی، دووەمیـان: بـەمافێکی شەرعی خۆمی دەزانم کەبەسەرهاتی ژیانی خۆم بنوسم، گوتی چی دەڵێیت بۆت بکەم، گوتم پارێزگاریم بکە، گـوتی: بـڕۆ بینوسـە لەسـەر مـن, بـەڵام ئـەولا لەسـەر خـۆتو دوای هەفتەیـەکیتر تەلـەفونم بـۆ بکـەرەوە چاپەکەشی ئێمە بۆت دەکەین. بەڵام هەتا ئێستا وەڵامیان نەداومەتەوە.

زۆر سوپاسی مامۆستای تێکۆشەرو کوردپەروەر مامۆستا جمال عبدول دەکـەم کەزەمینەسـازی بـۆ کـردم بۆ دەرکردنی بەرگی یەکەمی کتێبەکە، دوای دەرچوونی, ١٠٠ دانەم لەسلێمانی دابەشـکرد، ئینجـا چـوومەوە هەولێر، ١٠٠ دانەشم لەوێ بەسەر کادرانی پارتیو هەندێك لایەنـە سیاسـییەکانیتر دابەشـکرد، بازیـانی کـوڕم لەهاوینەهـەواری صـلاح الدینـەوە دەسـتی بەدابەشـکردن کـرد، رەوەزی کوڕیـشم لەئەنجومـەنی وەزیـرانو دادگاوە، ماوەیەك چاوەڕوانیم کرد, دوای دابەشکردن ئینجا دەستمکرد بەچاوپێکەوتن لەگـەڵ ئـەو کەسـانەی کتێبەکەیان خوێندۆتەوە.

رووم کردە دەزگایەکی پارتی, هەرچـەندە لێپرسـراوی دەزگاکـە دۆسـتێکی دێرینمـە, ئەگـەر جـاران پێـنج خولەك رایانبگرتمایە ئەمجارە نیو سەعات زیاتر مامـەوە. یـەکێك لـەو دوانـەی پرسـگەکەیان بـەڕێوە دەبـرد, لەبەر ئەوەی ناسیاوبوو لەتەریقیدا خۆی شاردەوە، بەڕێیان کـردم بـۆ ژوورێـك یەکـەم جـاربوو بـچم، تەوقـەم لەگەڵدا کردن، سەری پەنجەیان دامێو زۆر بەساردییەوە بـەخێرهاتنیان کـردم، چـەند لاپـەڕەیـەك پرسـیاریان ئامادە کردبوو بـۆ ئـەوەی کەچـاویان بـەمن کـەوت لـێم بپرسـن، زۆر بـەگرژی پرسـیاریان لەسـەر عبـدالرحمن زەبیحی کـرد, دەتگـوت توتنیـان خـواردووە، هەڵسام گـوتم: ئێـوە پاراسـتنن؟ گوتیـان نـەخێر. هەرچـەندە تەمەنیان لەنێوان ٢٥–٣٠ ساڵ دەبوو بەڵام وا دۆگما کرابوون وایاندەزانی مەلیکە بچکۆل ماوە، کەدەستمکرد بەوتوێژ لەگەڵیانداو باسی شوێنی ئێستای کوردم بـۆ کـردن لـەدنیای سیاسـەتدا، زۆر لەمەترسـییەکانی سـەر کوردستانم بۆ شیکردنەوە، بارودۆخیان لەگرژییەوە گۆڕا بـۆ پێکـەنین، هەرچـەندە چـەند لاوێکـی رۆشـنبیری

پـارتی بـوون بـەڵام لەعنـەت لەبێدەسـەڵاتی, چـونکە ئەوانـە خـاوەنی قەڵـەمن‌و ئیمـرۆش چـەك‌و پـارە دەسەڵاتدارە.

دوای ئـەوەی لـەو مـاوە کەمـەدا شـارەزاییەکی باشـیان لەسـەر مـن پەیـداکرد، گوتیـان: تـۆ کەئەوەنـدە پەیوەندیت باشە لەگەڵ کاك مەسعودو مام جەلالدا بۆ هەڵناسی بەئاشتکردنەوەیان؟ گوتم مـن لـەکۆتایی ئـەو کتێبەدا کە لەبەردەستاندایە نوسراوێکم ئاراستەی بەڕێز کـاك مەسـعودو بـەڕێز مـام جـەلال کـردووە بـۆ ئـەو مەبەستە، ئێستاش خۆشحاڵ دەبم کەبنێرن بەشوێنمداو هەردووکیان دوو بەدوو بەتـەنها لەژورێکـدا دانیشن‌و لەئێستاوە بۆ شەش مانگی تر کەسیان لەگەڵ نەبێت، منیش لەو ماوەیەدا وەکو برا بچووکێك ژوورەکەیان بـۆ پاك دەکەمەوەو خواردنی باشیشیان بۆ دروست دەکەم‌و ئێوەش تەنها دەوری تەتەر ببینن, دوای تەواوبوونی ماوەکە ئێمە سنوورمان دەچێتە شاخی حەمرین, هەروەها کەرکوك‌و سنجارو تەلعفەرو دوبزو شێخان‌و زەممار رزگاردەکـەین، ئـەو کاتـە بەچـاوێکی رێـزەوە سـەیرمان دەکرێـت لەلایـەن هەرچـوار دەوڵەتـە ئیقلیمییەکـەو ئـەمریکاوە، بـەڵام دەزانم ئـەمان رێکناکـەون‌و ئـەوەی لـەدڵی ئـەو خەڵکـەدا پـەنگی خواردۆتـەوەو ناوێرێـت دەربیبڕێت, من هەوڵدەدەم لەبەشی دووەم‌و سێهەم‌و چوارەم‌و پێنجەمی زنجیرە باسـەکانی (کـورد دوژمنـی خۆت بناسە)دا بەپیشتیوانی خودا بیخەمە بەرچاو، گوتیان: حـەز دەکـەین هەنـدێك لـەو زانیارییانـەی لەلاتـە وەکو ریپۆرتاجێك لەبەر کامێرا باسی بکەیت، گوتم شتێکی باشە بەمەرجێك بۆ تەلەفزیۆن بێت‌و پەخشەکەش راستەوخۆ بێت، گوتیان تۆ لێرە ئەو هەموو قسانە دەکەیت ئاخۆ لەوێ چی بڵێـی؟ ئینجا بەگـەرمی بـەڕێیان کردم. کابرای پرسگە سەری سـوڕمابوو لـەو خواحافیزیـە گەرمـە. لەهاتنـە دەرەوەمـدا, لەرارەوەکـەدا چـاوم بەلێپرسراوی دەزگاکە کەوت، گوتم خزم ئەو تەڵەیەت بۆ نابوومەوە خۆشت دوور خستبووەوە.

چوومە هاوینەهەواری صلاح الدین, بیرم کردەوە گوتم: ئەگەر بمەوێت چاوم بـەکاك مەسـعودو کـاك نێـچیر بکەویت بەپێنج ساڵی تر بەرم ناکەوێت. بۆیە بڕیارمدا چاوم بەو لێپرسراوانە بکەوێت کـەجێی متمانـەی بـەڕێز کاك مەسعودن. سەردانی برای بەڕێز کاك کەریم سنجاریم کرد، گوتیان لێرە نییـە، ئینجـا تەلـەفونم بـۆ م.س. پـارتی کـرد, لەگـەل مامۆسـتایەکی بـەڕێزو رۆشـنبیردا قـسەمکرد کەئەنـدامی لیژنـەی مەرکەزییـە, داوای دیـاریکردنی کـاتێکم لێکـرد بـۆ چـاوپێکەوتنی، لەوەڵامـدا فـەرمووی دوای سـەعاتێکی‌تر وەرە لام، بڕیارمـدا لەماوەی ئەو سەعاتەدا سەردانێکی ئەندامێکی‌تری م.س. بکەم، بـەڵام قـەدەروابوو کەئـەویش لـەوێ نـەبوو، ناچار لەلای سکرتێرەکەی دانیشتم گوتی: دوێنی باسی کتێبەکەی تۆم کردووە، گوتم چۆن؟ گـوتی کابرایـەك هاتبوو بۆ ئێـرە خـاوەنی پێـنج شـەهید بـوو، دەیگـوت زۆر بـێ ئیـشم‌و داواکـارم لـەلای خۆتـان بەفەڕاشـیش داممەزرێنن هەر باشە، چـونکە مـن لـەناو خەڵکدا ناسـراوم‌و سـواڵم پـێ ناکرێـت، فـەرمووی کتێبەکـەی تـۆم نیشانداو گوتم: ساحێبی ئەم کتێبە باس لـەئازارەکانی تـۆ دەکـات‌و وەکـو هاوڵاتییـەك بـەرگریی لەمافـەکانت کردووە. ئینجا گوتی کاك رەفیق تۆ دوو ساڵە هاتوچۆی ئێرە دەکەیت، گوێم لەقسەت بووەو زۆر ئاسایی بوو

بەلامەوە، بەڵام ئێستا گرنگی قسەکانت لەوەدایە کەبووە بەکتێب، رەحمەت لەدایك و باوکت. ئینجا هەستام بەرەو نوسینگەی ئەو بەڕێزەی کەمەوعدم لەگەڵیدا هەبوو کەوتمەڕێ، لەوێ سەیرمکرد مامۆستا عبداللە ئاگرین چاوەڕوانی دەکردم. دوای باسکردنی هەندێك یادەوەری, فەرمووی ئەو کتێبەت چۆن دەرکرد؟ گوتم لەسلێمانی بەهۆی مامۆستا جمال عبدولەوە توانیم دەریبکەم. گوتی: دوێنێ کۆبوونەوەی م.س. هەبوو لەگەڵ کاك مەسعوددا, باسێکی کتێبەکەی تۆشمان کرد، راستە نوسینەوەی مێژووی خۆت مافی خۆتە بەڵام ئێستا کاتی نییە بۆیە حەزدەکەم وەکو برایەکی دڵسۆز پێت بڵێم کتێبیتر مەنووسە، گوتم بڕیارمداوە دەینوسمو کتێبی دووەم ئامادەیە بۆ چاپ، گوتی: وەکو دڵسۆزێك تکات لێدەکەم ئیتر مەنوسە، گوتم: ئەگەر خۆشم نەمێنم هەر دەردەچێت چونکە ئامادەم کردووە، گوتی: کاك رەفیق کاك مەسعود سەلامت لێدەکاتو دەلێ با هیچی تر نەنوسیت، گوتم: لەکتێبی یەکەمدا پێم راگەیاندوون ئەگەر رێکنەکەون کتێبی دووەم دەردەکەمو هەموو راستییەکان دەخەمە بەرچاو، چ ئەوەی خۆم پێی هەستاوم چ ئەوەی لەنزیکەوە ئاگادارم، گوتی: ئەگەر هەر دەینوسی باسی کاك مەسعودو مەلامستەفا مەکەو تەنها باسی پارتی بکە، گوتم من پارتی نەبووم, من بارزانی بووم، بەڵێنم بەخوای خۆم داوە کەراستییەکان بخەمە بەرچاوی میلەت، گوتی ئایا جەلالییەکان لێت خۆش دەبن تۆ ئەوە دەردەکەی؟ گوتم مێژوو مافی میللەتەو دەبێ بگاتە دەستیان، گوتی: من لەرۆژنامەدا دەربارەی ئاشتبوونەوەم نوسیوە. گوتم من رای خۆم بەرامبەر بەتۆ ئەوەیە کەکوردێکی نیشتمانپەروەرو پاکیو گومان لەوەدا نییە کەشتی چاك دەنوسی، گوتی: لەسەر چی دەنوسی؟ لەوەڵامدا باسی پێشەکی کتێبەکەم بۆ کردو گوتم: لەسەر ٣١/ ئاب بەتایبەتی زۆر بەزەقی دەنوسم، گوتی ناگاتە ٦٦ی جەلالییەکان، گوتم: خۆم تیایدا ژیاوم وەکو سلبیاتی هەبوو ئیجابیاتیشی زۆر بوو، لەبەشی سێهەمدا لەسەری دەنووسم، ئینجا گوتم: ئەی هاوپەیمانیەتی ناتۆ چی لێدەکەن؟ ئەی ئەو هەموو خروقاتانەی کەهەتانبووە؟ گوتی: ئەگەر هەر بڕیارتداوە کەبنووسی, باسی ئەودیویش بکە کەسوپای ئێرانیان هێنایە سەر دیموکرات، گوتم: ئەو رووداوانە بەبێ زیادو کەم وەکو خۆی دەنوسمو چاویشت بەکتێبەکە دەکەوێت، گوتی: ئەی بەسەرهاتەکانی عمر دەبابەو سەرەتای دروستکردنی یەکێتی؟ گوتم: ئەوە چاك روون دەکەمەوە چونکە ئێوە راستییەکەی نازانن و راستییەکەی لەلای منە, هەروەها رووداوەکەی ١١ ئازارو ناردنی مەلاکان لەلایەن صدامەوە بۆ تیرۆرکردنی مەلامستەفا دەخەمە بەرچاو.

لەناوەراستی وتووێژەکەماندا هەستمکرد ئەو پیاوەی بەرامبەرم دانیشتبوو, بۆ تۆمارکردنی قسەکانمان دانراوە، بۆیە رووومکردە مامۆستا عبداللە ئاگرین و گوتم: کارێکی نهێنیم پێتە حەز دەکەم بازیانی کوڕم گوێی لێنەبێت، ئینجا مامۆستا ئاگرین روویکردە کابراو گوتی: ئەوە پێی خۆش نییە کوڕەکەی خۆشی گوێی لەو قسانە بێت، ئینجا بازیان و ئەو پیاوە هەردوکیان دانیشتنەکەیان بەجێهێشت. لەکۆتایی دانیشتنەکەدا ویستم بڕۆم، بەڵام رێگای نەدامو گوتی: نیوەڕۆ لەلای منی، گوتم ئێوە خاوەنی ابراهیم خەلیلن لەبەر ئەوە

ئامادەنیم برنجو شلەی سادە بخۆم، گوتی ئێوە میوانی منن‌و کەبابتان بۆ دەهێنم، کەچوینە دەرەوە بازیانی کوڕم گوتی: کەباب‌و نانمان خوارد نەوەك نان‌و کەباب.

**تێبینی**

*تکام لەمامۆستا عبدالله ئاگرین کرد چۆن کتێبەکەم لەسلێمانی بەئاشکرا دەفرۆشرێت، مەمکەن بەسەلمان ڕوشدی ڕێگە بدە لێرەش بەئازادی بفرۆشرێت.*

نیوەڕۆیەکیان لەکاتژمێر ١٢دا بەڕێزێك هات بۆ ماڵەوە فەرمووی سکرتێری سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران کاك ڕەفیق فتح الله داوایکردووە تەلەفونی بۆ بکەیت، پەیوەندیم پێوەکرد فەرمووی سبەینێ سەعات ١٠ لەلای ئێمە مەوعدت هەیە، کەچووم بەڕێز د. ڕۆژ چاوەڕوانی دەکردم. کەچاوی بەمن کەوت لەجێی خۆی هەستاو هات بەپیرمەوە، هەردووکمان لەبەردەمی مێزەکەیدا دانیشتین فەرمووی: ئەم کتێبەت چۆن دەرکردو لەکوێ چاپتکردووە؟ کێ پاڵنەرت بوو بۆ ئەو کارە؟ ئایا مام جەلال بوو؟ لەسەر ئێمە زۆرت نوسیوە کەچی لەسەر ئەوان شتت نەنوسیوە، بۆچی پێشتر ئێمەت نەبینی؟ کتێبی تر نەنوسی باشترە. خۆم حازرکرد وەڵامی پرسیارەکانی بدەمەوە، کاك خالدی سکرتێر هاتە ژوورەوە گوتی: کاك ڕەفیق کاتەکەت تەنها ١٥ دەقیقەیە ئاگاداربە، گوتم من داوای چاوپێکەوتنم نەکردووە، ئەوە پەیوەندی بە د. ڕۆژ هەیە، ئەگەر دەڵێ ئێستا دەچمە دەرەوە، د. ڕۆژ فەرمووی: خالد پارەی بۆ سەرف بکە، گوتم من قەساب نیم گۆشتەکەم فرۆشتبێت‌و پارەکەم بۆ سەرف کەیت، ئینجا بەکاك خالدی گوت: مەوعدێکی ٩ بۆ ١٠ی بۆ دابنێ بۆ بەیانی.

ڕۆژی دوایی کەچوومەوە خزمەتی فەرمووی: دوێنی زۆر بەگرژی قسەت لەگەڵدا کردم‌و زۆر توندبووی، گوتم تۆ هاتبووی لەتەنیشتمەوە دانیشتبووی‌و من وامدەزانی لەگەڵ خوالێخۆشبوو نوری شاوەیسی باوکت کەخاوەنی مێژوویەکی بێگەردە، قسە دەکەم، بەڵام ئەمڕۆ لەجێگاکەی خۆت دانیشە، منیش وەکو مرۆڤێکی ئاسایی لەگەڵ سەرۆك‌وەزیراندا قسە دەکەم، بانگی کاك رفیق فتح اللەی کرد گوتی: چەند جار لەگەڵ کاك ڕەفیق دانیشتوم؟ گوتم ئەوەی داوای تۆو کاك مەسعودو کاك نێچیر بکات تا دەگاتە لاتان لەبیری دەچێتەوە بۆچی هاتووە، من دووساڵ پێش ئێستا داوای چاوپێکەوتنم کردووە لەگەڵ تۆدا، گوتی من تۆم لێرە دیوە. کاك ڕەفیق فتح الله بەئەدەبێکەوە فەرمووی: نەخێر قوربان چاوت پێی نەکەوتووە، گوتی: بڕۆن ١٠ هەزار دیناری بۆ سەرف بکەن‌و مانگی ٢٥٠٠ دیناری بۆ ببڕنەوە، گوتم: نامەوێت. گوتی بیت الماله، بۆ ناتەوێت؟ من بەپێی دەسەڵاتی خۆم دەیکەم, هی کەسی تر نییە.

ئینجا پرسیاری لێکردم هۆی چییە ئەم کتێبە دەنوسیت؟ دوای ئەوەی گەیشتمە ئەوەی کەئێوە ناگەنە یەکترو بەتەما نین ئاشتببنەوە, بەناچاری بڕیارمدا باسی ئەو ڕۆژگارانە بکەم کەخۆم بینیومەو تیایدا ژیاوم، گوتی: منو تۆ لەڕاژان یەکترمان ناسی، گوتم ڕاستە بەڵام لە٦٣دا من تۆم جارێکی تر بینیوە کە لەخزمەت برای گەورەمان خوالێخۆشبوو نوری شاوەیسدا بوویت، گوتی نایەتەوە یادم، ڕاستییەکان دەنوسی؟ گوتم

لەبیرتە ئەو کاتە لەهەوڵدانی ئاشتیدا بووم لەنێوان یەکێتیو پارتیدا تۆ جێگری مامۆستا علی عبدالله بووی لەپشووەکەیدا لێت پرسیم لای مام جەلال دێیتەوە دەنگوباسمان بۆ ناهێنیت، وەڵامم دایتەوە: نە دەنگوباسی ئێوە دەبەم بۆ ئەوانو نە هی ئەوان دەهێنم بۆ ئێوە, ئەوە کاری من نییە. بەڵام لەکتێبی داهاتووم ئەو راستییانە دەخەمە روو، پێم باشە دڵنیابیت لەوەی کەئەم کتێبەم بەیارمەتی هیچ کەسێك دەرنەکردووەو پەیوەندیم بەهیچ گروپێکی سیاسییەوە نییەو قینیشم لەهیچ کەسێك نییە، ئەوەی زۆر بەبەرگی یەکەمم پەست بێت صدام حسێنە, چونکە دوو نهێنی ئەوم بڵاو کردۆتەوە، یەکەمیان کە له١٩٧٦/٩/١١ داوای لێکردم مام جەلالی بۆ بکوژمو دووەمیان لەکودەتاکەی نازم گزاردا قەناعەتم پێکرد کەمن لەکوتەداکەدا بەشدار نەبووم، بەڵام لەم کتێبەدا دانم پیاناوە، پێشبینی دەکەم لەدوای ١٥ رۆژی تر صدام حسین داوای فڕاندنی من بکات، لەبەر ئەوە من لەبەیانییەوە خۆم دەشارمەوە بۆ ئەوەی لەبەرچاو نەبمو بەشی دووەم بەڕێکوپێکی دەربکەمو کاتێك ویستم بەشی یەکەم بنوسم شەش مانگ پێش دەست پێکردنم سەرنووسی باسەکانم بردە بەردەستی کاك مەسرور بارزانی، گوتی چیت دەوێت بۆت بکەین؟ گوتم پارێزگاریم بکەن، گوتی ئێرە لەسەر خۆمو ئەولاش لەسەر خۆت.

ئینجا گوتم لەبەشی دوەمدا بەدوورودرێژی بۆ جەماوەری روون دەکەمەوە کەئێمە نابین بەهیچ ئەگەر ئەم دوو حزبە نەبن بەیەكو ئاشت نەبنەوە، هەروەها چەندێك بزانم لەسەر ٣٠/ئاب هەمووی دەنوسم، گوتی نەخێر ٣١ی ئاب، گوتی (٦٦)یشت بەبیر نەچێو چۆن لەسەر ئێمە دەنوسیت لەسەر ئەوانیش بنوسە, هەروەها لەسەر سەفەرەکەی عمر دەبابەش بنووسە کەچووە سوریاو لەندەن پێش ئەوەی تەقە لەحکومەت بکەن، گوتم ئەمە خۆم پێی هەستاوم زۆر چاکی دەنوسم، گوتی براکانم کتێبەکەتیان خوێندۆتەوەو دەیانەوێت پێش ئەوەی بڕۆیت چاویان پێت بکەوێت. کەهاتنە ژوورێ خۆشحاڵی خۆم بەبینیان پشانداو گوتم: بازیانی کوڕم لەبازاڕی هەولێر چاوی کەوتووە بەخوشکی بەڕێزمان ناهیدە خانی دایکتانو چاكو چۆنی لەگەڵدا کردووە، ئەو دەفەرموێت تۆ کێیت؟ دەڵی من کوڕی رەفیق پشدەریم، بەساردییەکەوە وەڵامی سەلامەکەی دەداتەوە، لەکاتێکدا دایکی بازیان شیرینی کچی مارف رۆستەم بەگی بابان لەگەڵ دایکتاندا خزمی نزیکی یەکتربوون، من سڵاوو رێزم هەیە بۆ ناهیدەخان، ئەو گرژییەی هەیەتی بەرامبەر بەمن هی ئەوەیە کاتێك خانووەکەیان فرۆشت لەبەغدا من ئەشیای خەڵکی ترم کڕیبووەوە هی ئەوم نەکڕیبووەوە, بەڵام پێی رابگەینە لەوە زیاترم بۆ کردووە (کۆسیجینو برجنێف) هەریەکەیان نامەیەکیان ئاراستەی خوالێخۆشبوو نوری شاوەیس کردبوو، من ئەو دوو نامەیەو هەندێ شتی تری گرنگم بۆ مەکتەبی بارزانی رەوانەکرد، هەروەها لەکتێبی دووەمدا باسی خوشکە ناهیدەم کردووە کاتێك من چووم بۆ لای شێخ احمد بارزانی لەساڵی ١٩٦٣دا رێکخراوی پارتی پارەیان نەبوو, باوکیشت ئەو کاتە هاتبووەوە بۆ سلێمانی, بەڕێز ناهیدەخان لەگیرفانی خۆی پارەی ئەمسەرو ئەوسەری سەیارەکەی بۆ دام بۆ بارزان کە٥٥ دینار بوو. ئینجا هەستامو

گوتم: من مەکەن بەسلمان روشدی با کتێبەکەم ئازادانە لەهەردوولا بفرۆشرێتو چاوەڕوانی بەشی دووەمی کتێبەکەم بن. لەکۆتاییدا پرسیاری لێکردم ئەی پرۆژەکەت..؟ گوتم لەمەودوا سیاسەت دەکەم کاسپی ناکەم.

ڕۆژێك دوای ئەوە پێیان راگەیاندنم کەسبەینێ پێنجشەممە کاتژمێر ١٠ی سەرلەبەیانی دەبێ چاوم بەکاك (...) بکەوێت لەماڵەوە، منیش لەگەڵ بازیانی کوڕمدا پێشوەخت هاتینە دەرەوە, یەکەم جار روومانکردە پارێزگاو لەپرسگەکەم پرسی، گوتم من لەشەممەوە داوای چاوپێکەوتم لەگەل کاك فەرەنسۆ کردووە، وەڵامی نەبوو؟ گوتیان نەخێر، ئینجا گوتم نە دەیبینمو نە ئیشم پێیەتیو نە جارێکی تر دێمەوە بۆ ئێرە. ئەمە بەڵگەیەك بوو بۆ ناڕەزایی دەربڕینی کاك فەرەنسۆ بۆ ئەو کتێبە.

کاتژمێر ١٠ گەیشتمە ماڵی ئەو بەڕێزە پێی گوتین میوانم هەیەو لەو ماڵەی تەنیشتم دانیشن دەنێرم بەشوێنتاندا، پاش ماوەیەك خۆی هات بەشوێنمدا بردینیەوە ماڵەکەی خۆیو بەخێرهاتنێکی گەرمی کردین، گوتی دەمێکە موعجبم پێت بەڵام جێی متمانە نەبوویت لەلام، دوای ئەوەی ئەو کتێبەت دەرکرد ئێستا دەستخۆشیت لێدەکەم چونکە شتێکت کردووە کەس پێش تۆ نەیکردووە, ئەم بنەماڵەیە بەتایبەتی کەس نەیوێراوە ڕووبەڕوو لەسەریان بنوسێت، لەئەنجامدا بوون بەفەرعەون بەسەرمانەوە، جێی تۆ لێرە نەماوە, برۆ لەدەرەوەی وڵات باقی کتێبەکانی ترت بنووسە بۆ ئەوەی ئەو ئەمانەتەی لەلاتە بەسەلامەتی بیگەیەنیتە دەست ئەو میللەتە, ئینجا روویکردە کوڕەکەی گوتی: ئێمە فێڵمان لێکراوە با ئەمانە وەکو ئێمە تێنەکەون. گوتم ئەوەی لامە لێرە وەکو خۆی بڵاوی دەکەمەوەو ناچمە دەرەوەی وڵات، گوتی هەر دەنووسیو ناچیتە دەرەوەی وڵات بچۆ بۆ سلێمانی لەوێ خەڵکێکی ئازاو باشی لێیە پشتگیریت دەکەنو هەرچۆنێك بێت ئەوێ لێرە دیموکراتیترە, گوتم: من کوڕەکانم ماڵیان لێرەیەو خۆشم پرۆژەیەکی جوجەسازیم لێرە هەیە لەبەر ئەوە ئێرە بەجێ ناهێڵم، ئینجا گوتی کاك رەفیق: لەسێ شەممەوە کوڕانی مەلامستەفا برِیای تیرۆرکردنی تۆیان دەرکردووە, دەڵێم برۆ بۆ سلێمانی، گوتم پێری لەخزمەت د.ڕۆژو دوێنێ لەخزمەت عبداللە ئاگریندا بووم لەم.س، گوتی: کاکە گیان ئەوانەو هەموو دامودەزگای پارتی لەلای کورانی مەلامستەفا کاتبنو هیچیان دەسەڵات نیە، گوتم شەممە دەڕۆم چونکە دەبێ خۆم کۆبکەمەوە، گوتی: دەبێ هەرئێستا لێرە چویتە دەرەوە یەکسەر بەرەو سلێمانی بەڕێ بکەوێتو نەچیتەوە ماڵەوە، گوتم: زۆر سوپاست دەکەم، ئێستا دەڕۆم بەڵام کوڕەکانم بەتۆ دەسپێرم, ئەگەر کێشەیەك هاتە رێگایان ئاگات لێیان بێت چونکە کەسابەتەکەیان لێرەیە، گوتی: منیش کاتبم ناتوانمو هیچم پێناکرێت.

ئینجا پێش ئەوەی بڕۆم, لەگەڵ کوڕەکانمدا رێکەوتم کەبچم لەشوێنێك خۆم بشارمەوە، ئەوانیش بەشێوەیەکی ئاسایی خۆیان نیشانبدەنو ئەو موچەیەی د. رۆژ بۆی داناون وەریبگرنو لەماوەی دوو مانگدا ماڵەکەیان بکەن بەپارەو پرۆژەکەم بەجێ بهێڵن، هەروەها پێمگوتن کەی خانووتان لەسلێمانی گرت هەواڵم

بدەنێ دەگەمەوە لاتان. ئینجا روومانکردە ماڵی پیاوێکی نیشتیمانپەروەر, دوای ئەوەی شێوازی خۆمم گۆڕی توانی لەناو پارتی دەرمبکات, ماوەی دوو مانگو دە رۆژ خۆم ونکردو نەمهێشت کەس بزانێت لەکوێم.

بەڕێزان دوای ئەوەی لەبەرگی یەکەمدا ئەو خاڵانەم خستەڕوو کە لەئەنجامی ئاشتبوونەوەی یەکێتیو پارتیدا دەستەبەر دەکرێتو زۆر لەدڵسۆزانی کوردستان لەدەرەوەو ناوەوەی وڵات هەوڵیاندا بۆ ئاشتبوونەوەیان کەیەکێك لەوانە د. علی قەرەداغی بوو کەیەکێکە لەو کەسایەتییە ناوداره نیشتیمانپەروەرانەی هەستی نەتەوایەتی پاڵی پێوەنا بۆ هەوڵدان بۆ نزیکخستنەوەی مام جەلالو کاك مسعود لەیەکترو کۆتایی هێنان بەکێشە سەختەکەی نێوانیان، ئەوەبو چاوی کەوت بەبەڕێز مام جەلال، راگەیاندنەکانی یەکێتی بەخۆشحاڵییەوە ئەو هەواڵەیان بەجەماوەر راگەیاندو بەڕێز مام جەلال هەوڵوکۆششی ئەم بەڕێزەی بەخۆشحاڵییەوە نرخاند، بەڵام سێ ئەندامی سەرکردایەتیی ی.ن.ك. لەخزمەت د.علی قەرەداغیدا چوونە هاوینەهەواری صلاح الدين بۆ ئەوەی چاویان بەکاك مەسعود بکەوێت، کاك مسعود تەنها چاوی بە د.علی قەرەداغی کەوتو دەزگاکانی بارزانی ئاماژەیان بەم هەواڵە نەدا, ئەوە ئەگەر عەریفێکی میتی تورکی بوایە مەسعود بەرزانی چاوی پێی دەکەوت بەڵام چاوی بەو سێ ئەندامەی سەرکردایەتیی یەکێتی نەکەوت. هەروەها لەسەردانێکی خاتوو میتەرانو کۆشنەر بۆ کوردستانی باشوور, لەکاتێکدا بەرەو هەڵەبجەی شەهید دەکەونەڕێ مامۆستا جەمال عەبدول کەئەو کاتە پارێزگاری سلێمانی بوو پێیان دەڵێت بۆ شتێك بۆ کوردستان ناکەن؟ کۆشنەر دەڵێت: ئەمە هاوسەری سەرکۆماری فەرەنسایەو منیش لەفەرنسا دوو وەزارەتم لەدەستدایە, ئەم هاتنەی ئێمە مانای ئەوەیە ئێوە حکومەتن جائەگەر بەم شێوەیە بەبێ ئاژاوە سەرپەرشتی وڵاتەکەتان بکەن دوای شەش مانگی تر ئیعلانی حکومەتداری دەکەن.

ئەوەی بۆ مام جەلالو کاك مەسعود بارزانی رێکەوتووە ئەگەر بۆ شێخ مەحمودی نەمرو خوالێخۆشبوو قازی محمد رێبکەوتایە کورد لەو کاتەوە حکومەت بوو، ئەمە تەنها قسەی من نیە بەڵکو قسەی زۆربەی سیاسەتمەدارنی کوردستانی گەورەیە. بۆ نمونە لەدانیشتنێکدا ئەو دوو بەڕێزو نیشتیمانپەروەرەی لەکۆماری مهابادا بەشداربوون, جەنابی میرزا مەنافی کەریمی کەیەکێك لەوەزیرەکان بووەو جەنابی سەعیدخانی هەمایۆنی کەسکرتێرو سەرۆکی یاوەری قازی محمدبووە, ئەم وتەیەی سەرەوەیان فەرموو, هەروەها لەدانیشتنێکدا (کوڕی ڕەش)علی قازیی کوڕی قازی محەمەد، لەگەڵ شێخ مالیك کەنەوەی شێخ سەعیدی پیرانە, هەمان بۆچونیان هەبوو. منیش دەڵێم یاڕەبی منومام جەلالو مەسعود بارزانیو کاك نێچیر بەقوربانی کوردستان بین وەکو بەم شێوەیە بارودۆخی کوردستانی باشووریان ئاڵۆزکرد.

لەم کتێبەشدا, رای هەموو دەوڵەتە ئقلیمیەکانو دەوڵەتە زلهێزەکانی جیهانم روونکردۆتەوە بەرامبەر بەکوردو ئێستا کاتی ئەوە هاتووە چەند پێشنیارێکی خۆم بخەمە پێش چاو بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد لەکوردستانی باشووردا چونکە بۆم دەرکەوتووە ئەگەر خۆمان خەمی نەخۆین کەس خەممان ناخوات..

دوو گوڵی مێخەك لەیەك زەویو یەك سەرچاوە ئاو دەخۆنەوەو هەوا هەڵدەمژن, کاتێکیش ئەو دوو گوڵە دەپشکوێن هەردووکیان یەك بۆنیان هەیە تەنها رەنگیان جیاوازە, یەکێکیان سەوزە ئەویتر زەرد: ی.ن.ك. و پ.د.ك.

بەڕێزان مام جەلالو کاك مەسعود, من خودی خۆم گەیشتومەتە ئەو باوەڕەی ئێوە جارێکی تر بەتەمانین ببنەوە بەیەکو هەتا ئێوە سەرپەرشتی کوردستانی باشوور بکەن هەر بەسێ پارچەیی دەمێنێتەوە ئەگەر زیاد نەکات کەپارچەکانیش بریتین لەهەرێمی پارتیو هەرێمی یەکێتیو ئەو بەشەی لەژێر دەسەڵاتی رژێمدا ماوەتەوەو ئازاد نەکراوە.

بەڕێزان ئەگەر ئێوە بۆ بەرژەوەندی کوردستانی باشوور هەوڵدەدەن دوو رێگاچارەتان لەبەردەمدایە, یا ئەوەتا ئاشتبنەوەو هەردوو هەرێمەکە بکەنەوە بەیەك, یا ئەوتا, هەردووکتان ئیستیقالەی خۆتان پێشکەش بەحزبەکانتان بکەن, ئەمە دەبێتە مایەی سەربەرزی بۆتانو هەتا هەتایە مێژوو باستاندەکات, چونکە بەئیستیقالەکردنتان, دوای حەوت رۆژ پارتیو یەکێتی دەبنەوە بەیەك, ئەمەش رێگەخۆشکەرێك دەبێت بۆ یەکخستنی هەموو حزبە کوردستانییەکانیتر لەگەڵ یەکێتیو پارتی بەبێ جیاوازی, بەمەش بارودۆخی کوردستان گۆڕانکارییەکی زۆری بەسەردا دێت لەباری سیاسییەوە چونکە دەبێتە پاڵپشتێك بۆ کوردستانی باکوورو رۆژهەڵاتو رۆژئاوا، بەڵام ئایا ئێوە ئیستیقالە دەکەن..؟ نەخێر، چونکە هەندێك خەڵکی هەلپەرست هەیە کەبەرژەوەندییەکانیان بەئێوە بەڕێوەدەچێت, خەڵك رەوانەی سەر شەقامەکان دەکەن بۆ سازدانی خۆپیشاندان کەئێوە ئیستیقالە نەکەن.

بەڕێز مام جەلال, بەڕێزتان یەکێکی لەو کوردە رۆشنبیرو بەناوبانگانەی جیهانو بەتایبەتی لەبواری رۆژنامەگەریدا دەستێکی بالأت هەیە، تۆ خۆت لەساڵی ١٩٧٥دا لەبەیروت بۆت گێڕامەوە کەرۆژنامەی لیمۆندی فەرەنسی داوایان لێکردوویت کەبەشێکی گرنگی رۆژنامەکەیان بۆ بەڕێوە بەریتو ئێستا دوای تێپەڕبوونی٢٥ ساڵ کەسایەتییەکت لێدروستبووە لەجیهاندا نەوەك لیمۆندی فەرەنسی بەڵکو دەتوانیت (واشنتن پۆست) بەڕێوە بەریتو دەتوانیت یاداشتەکانی خۆت تۆمار بکەیتو وەکو چەرچڵ ناو دەربکەیت. دڵنیام لەوەی بەڕێز مام جەلال دوای خوێندنەوەی ئەم کتێبە, هەندێك لەبۆچونەکانی من پەسەند دەکات بەتایبەتی داواکارییەکەم بۆ ئیستیقالەکردنیان چونکە بەئیستیقالەکردنی ئەوان, کوردستانی باشوور لەو بارودۆخەی ئێستای رزگاری دەبێت، گومانم نیە لەوەی مام جەلال ئامادەیی تیایە بۆ ئیستیقالەکردن چونکە لەناوو دەرەوەی وڵات جێی خۆی کردۆتەوە, بەڵام ئایا کاك مەسعود بارزانی ئیستیقالە دەکات؟ لەوەڵامدا دەڵێم نەخێر.. چونکە صدامو جەنەراڵەکانی میتی تورکیاو مۆسادی ئیسرائیلیو C I Aی ئەمریکی بەوە رازی نابن.

بەڕێز کاك مەسعود: لەمانگی ١٩٩١/٣دا لەقەزای صدیق, لەماڵی عزەت بەگی دێگەڵە بەشاهێدی بازیانی

کوڕەو عومەری مام رەزاو حاجی ابراهیمی شیرخۆرو فڕانسۆ حەریری‌و عبدالمهیمن بارزانی‌و جەنابی عزەت بەگ، پرسیارم لێکردیت ئایا ئێوە چوار هەزار ملیۆن دۆلارتان پێیە؟ دەستت خستەسەر جانتکەت گوتت والله یەك دۆلارم پیٚ نیە. بەڵام ئێستا بەهۆی (بیت المال)ـەوە یەکێکی لەدەوڵەمەندەکانی جیهان. لەهەشتاکاندا, دەڵاڵەکانت خەریکبوون کێڵگەیەکت لەئوستورالیا بۆ بکڕن بەڵام ئێستا بەخۆت‌و کوڕەکانت‌و براکانت‌و نێچیر, بەو پارەیەی کە لە(بیت المال) دەستانکەووتوە دەتوانن بەشێك لەئوستورالیا بکڕن.

بەڕێز کاك مەسعود، والله راستم لەگەڵتدا, چونکە بەسەر یەکمانەوە هەیە, دوای ئەو کتێبەی کەدەرمکرد خەڵکێکی زۆرم دی لەوانەی پەیوەندیی رۆژانەیان بەتۆوە هەیە کەبۆم نیە لەترسی خواو ژیانی ئەوان ناویان بهێنم, پێم باشە بزانیت پارتی چی‌یە!

## پارتی دیموکراتی کوردستان سیٚ بەشە

یەکەمیان بریتییە لەکوڕانی مەلامستەفای بارزانی, تەنها ئەوەندە هەیە بەکوردی دەدوێن‌و لەهۆزی بارزانن ئەگینا حەیفە کوڕی ئەو پیاوە نەمرەبن, بەهۆی کردەوەکانتانەوە خۆتان سەیارە دەگرن بۆ قوتابیانی زانکۆو دەیانبەنە سەر مەزاری مەلامستەفا, نانیشیان دەدەنیٚ, ئینجا ئەو خەڵکە لەترسی ئەوە نەبیٚ کەئازاریان دەدەن هیچیان بەڕەزای خۆیان نەدەهاتن، لەکاتێکدا رۆژێك بوو لەهەلەج, خەڵك لەبەر سەرماو بەفرو باراندا لەجەژنەکاندا سەرەیان دەگرت بۆ زیارەتی مەزاری خوالێخۆشبوو مەلامستەفای بارزانی، هی وا هەبوو بەیانی زوو دەچوو نیوەڕۆ بەرێدەکەوت، بەڵام ئێستا لەساڵێکدا چەند جارێك خەڵك کۆدەکەنەوە حەوت کەس‌و پانزە کەس‌و بیست کەس پارەیەکی زۆریان دەدەنیٚ لە٢–٣ هەزار کە بەپیٚ لەهەولێرەوە بچنەسەر مەزاری مەلامستەفا لەبارزان ئینجا بەتەلەفزیۆن پیشانی ئەو خەڵکەی دەدەن. کاك نێچیر لەکۆبونەوەیەکدا فەرمووی پارتی هی بنەماڵەی بارزانییە بەکەیفی خۆمان هەڵیدەسوڕێنین.

بەشی دووەمی پارتی پێکهاتووە لەو کەسانەی دەستێکی باڵایان هەبووە لەئەنفال یان ئەوانەی لەلای رژێمی بەعس گەیشتبوونە پلەی وەزیر (أمناء)و ئەو هەلپەرستانەی خۆیان بەئێوەدا هەڵواسیوە بۆ بەڕێوەبردنی بەرژەوەندیەکانی خۆیان کەکورد نین‌و جامانەی سوریان بەسەرەوەیەو بەهۆی جامانەکانیانەوە بوونەتە خاوەنی پلەوپایە, ئەم کۆنگرەیەی دواییتان شاهێدە لەسەر قسەکانم.

بەشی سێیەم پێکدێت لەبەشە پاکەکەی پ.د.ك. کەشایەنی هەموو رێزێکن‌و ئەگەر ئێوە واز لەکوردستان‌و کوردو پارتی بێنن, دەچم وەك خزمەتکارێك لەخزمەت ئەو پیاوە بەڕێزانەدا دەبم‌و بارەگایان بۆ پاکدەکەمەوە چونکە هەموو هەوڵێکیان بۆ سەرفرازیی گەلی کوردە، پانزە ساڵ پێش ئێستا ئەم کتێبەم بنوسیبا کەس نەیدەکڕی‌و نەیدەخوێندەوە, چونکە ئێوە بتانگوتایە ئەم پیاوە خائینە هەموو کوردستان پێیان دەگوتم خائین، بەڵام ئێستا من‌و خەڵك بەتێکڕایی دەست رادەکێشین‌و دەڵێین کوڕانی مەلامستەفای بارزانی, رەنجی باوکیان بەفیڕۆدا بێئەوەی کەس بڵیٚ وانیە... ئێستا ئێوە خائینن!

دوای ئاشکرابوونی راستییەکان، چارەسەرکردنی کێشەی کورد لەم سێ رایە بەدەر نیە: یان ئەوەتا ئەو دوو بەڕێزە رێکدەکەون‌و بەهاریکاری هەموو حزبە کوردستانییەکانی تر ناوچەکە بەڕێوەدەبەن بۆ بەرژەوەندیی کوردو کوردستان نەك بۆ بەرژەوەندیی تەسکی حزبایەتی، یان ئیستیقالە دەکەن کەسەرئەنجامی ئەو کارەم دیاریکردووە, یان ئیستیقالەناکەن‌و تاکە رێگەو باشترین بۆچوون بەلای منەوە بۆ چارەسەرکردنی ئەو بارودۆخە ئالۆزەی کەئێستا دەیبەینەسەر ئەمەیە:

داوا لە UN دەکەین هێزێکی نێودەولی بێتە کوردستان بۆ سەرپەرشتیکردن‌و رزگاربوونمان لەخروقاتەکانی سوپاکانی عیراق‌و ئێران‌و تورکیا، رزگاربوونمان لەدەست ئەو ملیشیاتانەی کەدەستیان بەسەر کوردستانی باشووردا گرتووە, هەروەها تالانکردنی (بیت المال)ی میللەت‌و بەکارهێنانی لەمەرامە تایبەتییەکانی خۆیاندا, بنەبڕ بکرێت.

ئەمە خالێکی گۆڕان دەبێت لەڕووی ئارامی‌و سیاسی‌و ئابووری‌و ئیدارات بەرەو کوردستانێکی بێ ئاژاوە بۆ دانیشتوانی کوردستانی باشوور بەتایبەتی, هەروەها هۆکارێك دەبێت بۆ گوشار خستنەسەر هێزە نێودەولەتییەکانی جیهان لەلایەن کوردپەروەرەکانی دەرەوەی ولات بۆ ئەوەی سنورەکەمان پێچێتەوە شوێنی ئاسایی خۆی کەشاخی حەمرینە، لەهەمانکاتیشدا ئەو برایەتییەی نێوان ئێمەو کوردستانی باکور، ئینجا ئێمەو کوردستانی رۆژهەلات کەئێستا بەهۆی گرژی‌و بێ متمانەیی بەیەکتر لەمەترسیدایە، نامێنێت.

دوای تێپەڕبوونی چەند سالێك‌و دلنیابوون لەسەقامگیربوونی ئارامی لەسەرانسەری کوردستانی باشووردا, زەمینەسازی بۆ هەلبژاردنێکی سەرتاسەری لەناوچەکەدا لەژێر سەرپەرشتی نەتەوە یەگرتووەکاندا دەکرێت بۆ ئەوەی وەکو کۆسۆڤۆ, ئازادانە هەموو خەلك بەرەو سندوقەکانی دەنگدان بڕۆن‌و بێ غەلوخەش‌و تۆقاندن، دەنگ بدەن بەو کەسەی خۆیان هەلیدەبژێرن بەنوێنەری راستەقینەی گەلەکەیان, ئەو کاتە جەماوەر لەهەلبژاردنەکەیدا, خۆی چارەنووسی خۆی دیاریدەکات‌و سەربەخۆیی هەلدەبژێرێت.

ئیتر هەتا کەی لەبەر بەرژەوەندییە تەسکەکانی خۆتان, ئەو خەلکە بەوە چەواشە دەکەن گوایە داواکردنی سەربەخۆیی, لەبەرژەوەندیی جەماوەری کوردستانی باشوردا نیە, ئیتر هەتا کەی ئەو خەلکە لەڕاستییەکان گومڕا بکرێت، ئەم بارودۆخە ناهەموارەی کوردستان لەبەرژەوەندی ئێوەو ئەو چوار دەولەتە ئیقلیمییانەدا نەبێت لەبەرژەوەندیی کەسی تردا نیە هەر بۆیە دەبێ جەماوەر خۆی هەولبدات‌و سووربێت لەسەر سەرخستنی ئەم پرۆژەیە, هەروەها دەبێت ئەو کوردە دلسۆزو خەمخۆرو نیشتیمانپەروەرانەی لەهەندەرانن, دەورێکی گەورەو سەرەکییان هەبێت لەم بوارەدا.

**تێبینی**

*لەوانەیە ژمارەیەکی زۆری خەلك بەجۆرێکی ئاوەژوو لەم بۆچوونەی من تێبگەن‌و وا بزانن مەبەستم هێنانەوەی ئەمریکاو بەریتانیایە, بەلام من پێشتر هەلوێستی ئەو پێنج دەولەتە زلهێزەم بەرامبەر بەکورد*

*روونکردۆتەوەو ئەگەر خوا بیکردایە ئەوان رازیبونایە بەم پێشنیارەی من, ئەوکاتە وەکو بەشی زۆری دەوڵەتە عەرەبییەکانو بەڵقانو هۆنکۆنگو کۆسۆڤۆ, لەدوارۆژدا دەبوین بەحکومەتو بەئاسودەیی دەژیایین.*

کۆتایی نوسینی کتێبەکەم هاوکات بوو لەگەڵ هەڵبژاردنی شارەوانییەکان کە لەشاری مەلیك محمود (سلێمانی) ئەنجامدرا, ئەم کارە خۆی لەخۆیدا دیاردەیەکی شارستانییەو هەموو ئاینو بەرنامەیەك لەجیهاندا پشتگیری لێدەکات,وەك بیستراویشە ١٥٪ی ئەو خەڵکە بەشداری هەڵبژاردنەکەی نەکردووە, ئەمە مانای ئەوەیە دوای ئەو هەموو رووداوانەی لەدوای هەڵبژاردنەکەی ساڵی ١٩٩٢ روویداوە, هێشتا گەلی کورد بارگەی نەتەوایەتی تیادا ماوە.

ئەم هەڵبژاردنە ئەگەر لەهەولێریش ئەنجام بدرایەو کوڕانی مەلامستەفا بارزانی رازی بوونایە, ئەوە کارێکی زۆر پیرۆزو بەنرخ دەبوو, بەڵام هێشتا ئاواتەکانی من ناهێنێتە دی هەتا ئەم هەڵبژاردنە سەرتاسەری کوردستانی باشوور نەگرێتەوە.

داواکارم لە(ی.ن.ك) کەزیاتر نزیکبێتەوە لەو حزبانەی بەشداری هەڵبژاردنەکەیان کردووە, بەهەمان شێوە داوا لەو رێکخراوە سیاسییە بەشداربوانە دەکەم کەهەڵوێستێکی دیارو لەبەرچاویان هەبێت بۆ بەدیهێنانی ئاواتەکانی گەلی کورد.

**لەکۆتاییدا:** داوای بەخشینو لێبوردن لەهەموو کوردێکی بەشەرف دەکەم ئەگەر کەموکورێییەك لەدارشتنو بۆچونەکانم بەدی بکرێت، هەروەها ئەوەندەی لەتوانامدایە، بەهۆی ئەم کتێبەوە خوێنی خۆم لەسەر دەستم داناوە بۆ خزمەتکردنی کوردو کوردستان.

٢٠٠٠/٢/٧

## بنەماڵەی سید ئەحمەدی خانەقا

جوامێریو لێوەشاوەییو چاکەی ئەم بنەماڵەیە پاڵیان پێوە نام کەتۆزێك بەکورتی لەسەریان بنوسم:

پێم باشە لەباسی بەرێز سید ئەحمەدی خانەقاوە دەست پێبکەم کەیەکێك بوو لەو کوردە دیندارو تێکۆشەرو دڵسۆزانەی ئەگەر بەسەدان کتێبی لەسەر بنوسیت کە بە چ شێوەو لە چ بارودۆخێکدا ویستویەتی خزمەتی بزوتنەوەی رزگاریخوازی کورد بکات، هێشتا کەمە. ئەم پیاوە لەرۆژێکدا سەرگەرمی خزمەتکردن بووە کەبارودۆخی سیاسیی ئینگلیزەکان دەیانبرد بەرێوەو بەربەرەکانی زۆری ئەم پیاوەیان دەکردو ئازاریان دەدا بەڵام, ئەم پیاوە بەهیچ شێوەیەك گوێی نەداونەتێو بەمافێکی دینیو دنیایی خۆی زانیوە کە لەخزمەتی کوردو کوردستاندا بمێنێتەوە، ئەم بەرێزە خاوەنی خانەقایەك بوو کە بەبەردەوامی جێگای هەژارانو لێقەوماوانو بێلانەو بێ نەوایان بوو, بەشێوەیەکی گشتی لەخزمەتی هەموو کەسێکدا بوو کە بەمیوانداری تەکییەکە رازی بووبێت.

لەکودەتاکـەی ١٩٤١دا کەئەڵمانییـەکان چـوونە نـاو کەرکوکـەوە هـەوڵێکی زۆریانـدا ئـەو ئینگلیزانـەی لەشەریکەی نەوتی کەرکوکدا کاردەکەن هەموویان بگرنو بەدیلی بیانبەنەوە بۆ ئـەڵمانیا, بـەڵام خوالێخۆش بوو سید احمدی خانەقا رێگەی بەوە نەداو بەوە قەناعەتی پێکردن کەپێی گوتن ئێمەی عراقیش لەجەنگداین لەگەڵ ئینگلیزەکانداو ئێمەش بەبێگومان دیلمـان دەبێـت لـەلای ئینگلیـز, ئەوسـا دیـل بـەدیلیان پێدەکـەینو دەیانگۆڕینەوە، بەڵام کاتێك حوکمی پادشـایی بـەهۆی سـەرنەکەوتنی کودەتاکـەوە باڵادەسـت بـوو, مـستەر چـاپمن کەڕابـەرێکی سیاسـی ئینگلیزەکـان بـوو لەکـەرکوك، بەشـوێن سـید احمـددا دەنێرێـتو لەسـەرەتای چاوپێکەوتنەکەدا پێی دەڵێت، پێشەکی من زۆر سوپاست دەکـەم لەسـەر ئـەوەی کەنەتهێـشت ئەڵمانیـەکان ئێمە بەدیلی لەگەڵ خۆیان بەرن، بەڵام سیاسـەت وا پێویـست دەکـات کەئێمـە تـۆ دووربخەینـەوە بـۆ بـصرە بەتۆمـەتی ئـەوەی کـەتۆ سـۆزت هـەبووە بـۆ ئەڵمانیـەکان، لەئەنجامـدا راشـکاوانە ئـەم پیـاوە دینـدارە کوردپـەروەرە, کەهـەوڵێکی زۆری دەدا بـۆ ئـەوەی حکومـەتێکی کـوردی دابمـەزرێت، بـۆ دووەمـین جـار دوورخرایەوە بۆ بصرە. جا ئاشنایەتییەکەی بنەماڵەی ئێمەو بـەڕێز سـید ئەحمـەدی خانـەقا لـەوێوە دەسـت پێدەکات کەبۆ یەکەم جار بۆ بصرە دوور دەخرێتـەوە کاتێـك بـاپیرم لەسـاڵانی سـییەکاندا چـۆتە بـصرە بـۆ بازرگانیکردن بەتوتن, چاویان بەیەك دەکەوێتو بەهۆی ئەوەی کەهـەردوکیان کوردبـوون لـەو عەرەبـستانەدا دۆستایەتییەکی زۆر بەهێز دروست بووە لەنێوانیانـدا، ئـەو دۆسـتایەتییەی کـەباپیرم لەگـەڵ سـید ئەحمـەددا پێکیهێنا من هەوڵمدا نەفـەوتێ, بۆیـە دۆسـتایەتیم لەگـەڵ نـەوەکانی سـید ئەحمـەددا بـەهێزکرد، کـاتێکیش لەشـەریکەی نـەوتی کـەرکوك فەرمانبـەربووم هـەموو یەکـشەممانێك لـەوێ نـانم دەخـوارد. بنەماڵـەی سـید ئەحمەدی خانەقا خـاوەنی باشـترینو بـەپیتترین پارچـە زەوی بـوون لەهـەموو ناوچـەی کەرکوکـدا هـەروەها ناوچەی مەملەحەی کەرکوك بەشێك بووە لەم زەویوزارانە, ئەو بەشە ناوچەیەکی خۆییاوی بووەو بێجگـە لـەو کشتوکاڵەی کە لەزەوییەکانیاندا دەکرا دەستکەوتی خوێی ئەم ناوچەیە ئەگەر قورسایی مەسـرەفی تەکیەکـە نەبوایە زۆر بەچاکی بەشی دەکردنو پێی دەژیان، بەڵام هەرچییان دەسـتدەکەوت سـاڵانە لەبـەروبومی ئـەم زەویوزارانە, هەموویان بۆ ئەو خەڵکـە سـەرف دەکـرد کەهاتوچـۆی تەکییەکـەیان دەکـرد، هـەر بـەهۆی ئـەم دەوڵەمەنـدیو نەفـسیەت بەرزییەیانـەوە بـووە کەسـەریان بـۆ هـیچ حکومـەتێك دانەنەوانـدووەو لەهـەموو بارودۆخێکدا دەنگیان نێر بـووەو لەسـەر ئـەو نێرێتییـەی خۆشـیان بـووە بەبـەردەوامی کەدژایـەتیکراون، بـۆ نمونە: کۆمپانیای نـەوتی کـەرکوك کەسـەر بەحکومـەتێکی سـەربەخۆبوو (بـەریتانیا) هەرچـەند هەوڵیانـدابوو کەسید ئەحمەد بچێت بۆلایانو میوانداری بکەن ئەگەر بـۆ خـواردنی ژەمێکـیش بێـت، بـەڵام ئـەو دەیفـەرموو ناچم بۆ لایان چونکە پـێش ئـەوەی حکومـەتی عـیراق دامـەزرێت ئێمـە خۆمـان بەسـەرۆکایەتی مـەلیك شـێخ مەحمودی نەمر حکومەت بووین، ئەوان ئـەو حکومەتـەیان لێتێکـداوینو ئێـستا دەیانـەوێت مـن بـچمە لایـانو مەرحەباییان بکەم.

کوڕەکانی سید ئەحمەد، کاکە حسێنو کاکە حەمە، بەڕاستی جێی باوکیان ون نەکردبوو, بەهەمان شێوەی ڕێبازەکەی باوکیان هەڵسوکەوتیان دەکردو هەرچەندێك لەکوردایەتیو مەردایەتییان بدوێین هێشتا کەمەو بەو چەند دێڕەی لەسەریان نوسیومە تەوا نابێت، بۆیە پێم باشە کەهەندێك لەو نمونانەو لەو هەڵوێستە مەردانانەی ئەم پیاوانەتان بۆ باس بکەم کەبەرامبەر خەڵکی هەیانبووە.

لەقەیرانی کەرکوك لەنێوان تورکمانو شیوعیەکان لەساڵی ١٩٦٠, نزیکەی ٣٠٠٠ تورکمان پەنایان بۆ تەکییەی سید ئەحمەدی خانەقا بردبوو بۆ ئەوەی نەکەونە دەستی شیوعیەکان، کاکەحسێن ماوەی ئەو چەند ڕۆژەی لەوێ مابونەوە بەچاکترین شێوە خزمەتیکردن.

کاکەحسێن پیاوێکی ڕۆشنبیرو تێگەیشتوو نوسەر بوو, شارەزاییەکی تەواوی هەبوو لەزمانەکانی فارسیو تورکیو عەرەبیدا، زیرەكو پاكو دەستو دڵفراوان بوو. لەدانیشتنێکدا لەقادرکەرەم کەهەموو گەورەپیاوانو شێخانی ئەو ناوچەیە لەوێ ئامادە دەبن بۆ ئەوەی چاویان بەعزەت دووری بکەوێتو کاك حسێن یەکێك دەبێت لەو ئامادەبوانە، کاتێك عزەت دووری دەستدەکات بەباسی کورد زۆر بەشێوەیەکی نابەجێ دەڵێت هەمووتان ڕەگەزتان عەرەبییە، تاکە کەسێك کەلێی دێتە وەڵامو بەرپەرچی دەداتەوە، کاك حسێن دەبێت.

لەساڵی ١٩٦٢دا کاتێك لەبەندیخانەی کەرکوك بەندبووم, وەڵامم بۆ ناردن کەحەز لەکەنگرو ماست دەکەم, ئەوانیش (کنری کوڵاوو کنر بەماسیو کنر بەقاورمە)یان بۆ هەموو بەندکراوەکان نارد کەژمارەیان ١٥٠ بەندکراو بوو لەبەشی (محجر)، منیش لەسوپاسگوزاری ئەو کارەیاندا وەڵامم بۆ کاکە حسێن نارد کەئیمڕۆ تەکییەی سید ئەحمەدی خانەقا بۆ نانخواردنی نیوەڕۆ گوستراوەتەوە بۆ بەندیخانەی کەرکوك بەشی (محجر).

لەساڵی ١٩٥٢دا یەکشەممان لەکۆمپانیای نەوتەوە دەچووم لەوێ نانم دەخوارد، زیاتر لە ٢٠ کەسم دەبینی لەوێ خزمەتیان دەکردو زیاتر لە ٥٠ قوتابی کە لەکەرکوك دەیانخوێندو پارەیان نەبوو شوێن بەکرێ بگرن, لەوێ بەبێ بەرامبەر دەخەوتنو نانیان دەخوارد بەبێ ئەوەی کەسیان بناسن. هەروەها ڕێکەوتووە کەرۆژی هەینی چووم بۆ ئەوێ سەیرمکردووە لەبەر خەڵك جێگا نەماوە لەخزمەت شێخدا کەس دابنیشێت، ئەوانەی لەگەڵ منو لەدوای من دەهاتن هەموویان بەپێوە رادەوەستانو هەندێك جار لەنێوان ئەوانەی کەبەپێوە رادەوەستان کەسایەتیو گەورەپیاوانی شاری کەرکوکم دەبینی.

هەتا حوکمی مەلەکی لەئارادابوو ئەم پیاوانە لەلایەن مەلەکیەتەوە دژایەتی دەکران، بۆ ئەوەی نەوەکو جارێکی تر بزوتنەوەی کوردی لەمانەوە هەڵبداتەوە هەرچەندە کاك حسێن ئەندامی پەرلەمان بوو لەو کاتەداو یەکێك بوو لەوانەی سەرپەرشتی ئەو خەڵکانەی دەکرد کەچوونە بەغدا بۆ ئەوەی بیخەنە بەرچاوی حکومەت کەدەبێت میللەتی کوردیش وەکو هەموو میللەتانی دنیا سنورێکی دیاریکراوو سەربەخۆی خۆی هەبێت، چونکە (اتحادی هاشمی) کرابوو لەنێوان عێراقو ئوردنداو هیچی دیاریکراوی بۆ کورد تیانەبوو، ئەم وەفدە

کەگەیشتە بەغدا تەنها لەلایەن سعید قەزازەوە پێشوازی لێکراو میوانداریيەکی گەورەی بۆ کردن، لەکۆتایی میوانداریيەکەدا بەکاکە حسێن دەڵێت بەڕاستی ئەو هەڵوێستەی تۆ سەرنجی ڕاکێشامو پاڵی پێوەنام کەئەم میوانداریيەتان بۆ بکەم.

ئینجا دوای ئەوەی حزبی بەعس هاتە سەر حوکم چاویان کەوت بەدۆسێی ژیاننامەی ئەم بنەماڵەیەو کەزانیان زۆر بەگەرمی باڵیان بۆ بزوتنەوەی کوردی کردۆتەوەو بەهەموو شێوەیەك لەگەڵیاندان, ئەمانیش لەیەکەم ڕۆژی کاربەدەستبونیانەوە دژایەتییانکردن هەتا هەریەکەیان بەلایەکدا پەرتەوازەکردن. کاکە حەمەی خانەقا برای بچوکی کاکە حسێنەو دەرچووی کۆلێجی یاسابووەو پیاوێکی نیشتیمانپەروەرو دەستو دڵفراوانو دەروونپاك بووە, لە ١٩٦٣دا ئەرکی ئەوەی پێ سپێردرابوو کە لەنێوان حکومەتو بارزانیدا هاتوچۆ بکات بۆ پێکهێنانیان, بەڵام ئەو کۆپتەرەی هەڵیگرتبوو, بەهۆی (خەلەلێکی فەنی) نەزانراوەوە بەربۆوەو تەنها ئەو گیانی لەدەستدا، ئەم بەڕێزە زمانێکی تورکی زۆر چاکی دەزانی بەڵام لەداخی تۆڕانیەکان قسەی پێ نەدەکرد.

لە ١٩٦٩دا کەسەرۆك هۆزی ئاکۆ (عباس مامەندئاغا) لەبەغدا کۆچی دوایی کرد, بەتەلەفون بەکاك حسێنم ڕاگەیاندو پێمگوت کاکە حسێن ئەوە جەنابی مام جەلالو کاك حیلمی ڕاوەستاونو سڵاوو ڕێزیان هەیە بۆت, سبەی نیوەڕۆ ١٥٠ کەس لەلای ئێوە نانی نیوەڕۆ دەخۆن، کاتێك گەیشتینە ئەوێ خواردنی زیاتر لە٣٠٠ کەسی ئامادە کردبوو, لەگەڵ ئەوەشدا کەئەو کاتە باری ئابورییان بەرەو خراپی دەڕۆیشت.

ساڵی ١٩٧٤ لەگەڵ هاوسەرەکەمدا چوینە ماڵی سیدئەحمەدی خانەقا کەبەرامبەر تەکیەکەی بوو, کاتێك لەدەرگای دەرەوە چوینە ژوورەوە لەبەر خۆمەوە گوتم (سبحان الله)، من ئەم ماڵەم چۆن بینیوە ئێستاش چۆنە، بێدەنگییەکی سامناك ماڵەکەی داگرتبووو تۆزوخۆڵێکی زۆر بەداروديوارو پەنجەرەی ماڵەکەوە کەڵەکە ببوو, تەنانەت ئەو ڕێگایەی کەپیایدا چوینە ژوورەوە چەند سانتیمەترێك تۆزو خۆڵی لەسەربوو, جێ پێمان لەخۆڵەکەدا دەردەچوو، بۆم دەرکەوت کەزۆر دەمێکە ئەم داڵانە کەس هاتوچۆی پیادا نەکردووە. کەچوینە ژووری چاومان بەمریەم خان کەوت کەخوشکی کاکەحسێنو کچی سید ئەحمەدی خانەقایە, ئەم ئافرەتە یەکێکە لەئافرەتە ناودارەکانی کوردستان کە بەدینداریو ژیریو هێمنی بەناوبانگە, مێژوویەکی بۆ خۆی دروستکردبوو دەتوانیت لەڕیزی حەپسەخانی نەقیبی بژمێرێت، فەرمووی کەس هاتوچۆم ناکات، ئەو ئافرەتەی لەلامەو بەناو خزمەتم دەکات سیخوڕە بەسەرمەوە، بەڵام دوو کەس هەن وەفادارنو خزمەتم دەکەن, یەکێکیان د. عمر دزەيیيە ئەویتر شێخێکی عەرەبی حەویجەیە، ئەوە بۆ ماوەیەك دەچێت ئاسایشی گشتی کەرکوك وازم لێناهێنن دێنە سەرمو پێم دەڵێن کەئەم ماڵە بەجێ بێڵم. منیش کەگوێم لەمەبوو تەلەفونم بۆ بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی کەرکوك کردو پێمگوت من نایەم بۆ نانخواردنەکەی نیوەڕۆ چونکە ئێوە دژایەتی یەکێك لەبنەماڵە گەورەکانی کورد دەکەن کەهەموو تەمەنیان لەخزمەتکردنی فەقیرو

لێقەوماواندا بەسەربردووە بەبێ ئەوەی گوێیان دابێتە زمانو رەگەز، ئێستا داوا لەم ئافرەتە بەتەمەنە دەکەن کەجێنزرگەی باوباپیرانی خۆی بەجێ بهێڵێت. بەڕێوەبەری ئاسایش لەوەڵامدا گوتی ئەگەر بێیت بۆ لامو بەیەکەوە نانەکەمان بخۆین ئەوسا قسەی لەسەر دەکەین.

ماڵەوەم بەجێهێشتو روخسەتم لەمریەم خان وەرگرتو چووم بۆ نانخواردن لەگەڵیدا، لەدوای گەڕانەوەم, بۆ مریەم خانم باسکرد ئەم بڕیارە لەئاسایشی کەرکوکەوە دەرنەچووە بەڵکو لەسەرکردایەتی حزبی بەعسەوە, بەڵام بەڕێوەبەری ئاسایش پەیمانی داومەتێ کەوەکو ئاسایشی کەرکوک چەندێك لەتوانایدا بێت, جێبەجێکردنی ئەم فەرمانە دوادەخات هەتاکو من لەبەغدا رێگاچارەیەکتان بۆ دەدۆزمەوە. مریەم خان بۆی گێڕامەوە کەڕۆژێك بووە ٩ ژن ئیشیان تەنها چێشتلێنان بووە، جەژنان زیاتر لە ٥٠٠ کەس نانی بەیانی چەژنیان لەتەکیەکەدا خواردووە، هەروەها بۆی گێڕامەوە کەڕۆژێکیان کاکە حسینی خانەقا دەچێت بۆ پشدەر بۆ بەشداریکردن لەپرسەی عباس ئاغای گەورەی پشدەریدا ٤٠٠ سوارچاك لەگەڵ خۆی دەبات. لەدوای ئەم باسوخواستانە لەگەڵ مریەم خاندا خواحافیزیمان کردو هاتینە دەرەوە, بەڵام کەگەیشتمە دەرگای دەرەوەو ئاوڕم بۆ ئەو ماڵە بێنازە دایەوە, دڵم پڕبوو بۆیانو ئەم ئایەتەم بەبیرکەوتەوە کەخوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ إن الملوك إذا دخلوا قريةً أفسدوها وجعلوا أعزة أهلها أذلة وكذلك يفعلون﴾ صدق الله العظيم.

برای تێکۆشەر کاك عارف تەیفور کە لەبنەماڵەی سید ئەحمەدی خانەقایە, لەسەرەتای ١٩٩٩دا لەپرسەیەکدا لەهەولێر چاومان بەیەکتر کەوت، دوای یادکردنەوەی هەندێك لەبیرەوەرییەکانمان بەیەکەوە، گوتی: ئێمە تۆ بەنزیکترین خزمی بنەماڵەکە دەزانین، منیش گوتم: من خزمی ئێوە نیم بەڵام برایەکی پچوکی کاکە حسینو کاکە حەمە بوومو هەردەم خۆم بەخزمەتکاری بنەماڵەی سید ئەحمەد زانیوە.

**تێبینی**

*سید احمدی خانەقا لەسەخاوەتدا وێنەی نەبو, زۆرێك لەخەڵك بەحاتەمی تەیی کورد ناوی دەبەن, داوای لێبوردن لەو بنەماڵەیە دەکەم کە بەکورتی لەسەرم نووسیون.*

**Mr. Siddharth Chatrchi**
**UN Coordinator in Suleimani**

**Dear Sir**
**In the declaration of Human Right Freedom of believe is well reserved. I have published one book six months ago dealing about the Enemies of Kurds and the Second will appear soon. Please accept my book as you are the representative of UN and I would very much appreciate your help, in forwarding it to UN representative in the Middle East.**

Yours Sincerely
Rafiq Pishdary

## پێشەکی

بەداخەوە پیلانەکانی دوژمنی کورد بەتایبەتی دوژمنی ناوخۆ, لەمێژووی خەباتی ئێمەدا ئەوەندە زۆرن کەباسکردنیان بەبەرگو دوو بەرگ تەواو نابێ, بۆیە کەسێك بیەوێ بەراستگۆییو بێخۆدانە پاڵ حزبێك وپاکانەکردن بۆ هیچ لایەك ئەو مێژووە بنوسێت, ناچار دەبێ بەرگی سێیەم وچوارەم وپێنجەمیش بنوسێ تا بەرچاوی نەوەی نوێی گەل رۆشنبێتو بتوانێ دۆستو دوژمنی جیابکاتەوەو پەند لەهەڵەکانی رابردوو وەربگرێو بیکاتە مەشخەڵی عەقڵو هۆشی خۆی, تا لەدواجاردا گوڕی گەورەترو خێراتر بەو بزاڤە نەتەوەییە بدا.

لەخوێنەری ناشارمەوە کەهاندانو پشتگیریی ئەوانەی لەکوردستاندان یا بەتەلەفۆنو فاکس لەئەوروپاوە پەیوەندییان پێوەکردووم، هێزو تاقەتێکی زیاتری پێبەخشیم بۆ تەواوکردنی ئەو پرۆژەیەی بێلایەنانە دەستم پێکردبوو، ئەویش ناساندنی گەلەکەمانە بەدوژمنی ناوخۆی, بەو دوژمنەی بەکوردی دەدوێو لەهەمان نەتەوەیەو سەرسەختترین دوژمنیەتی.

بۆیە بەو پاڵپشتە مەعنەوییە گەورەیەو بەپشتبەستن بەخوا, وا بەرگی سێیەمیش کەوتە بەردەستی خوێنەر هیوادارم بتوانێ رۆشنایی زیاتر بخاتەسەر مێژووی گەلەکەمانو جێی متمانەو سوودبەخشین بێ بۆی, چونکە ئەم کتێبەم وەکو بەرگەکانی پێشوو نیە، هەروەها ئەوانیش کە ئینشاڵڵا بەدوایدا دێن" یادەوەریی کەسێکە لەناو روداوەکاندا ژیاوەو لەخۆشی و لەناخۆشیەکانیدا بەژداربووە. هەموو کەسێکیش دەزانێ من کابرایەکی حزبی نیمو دژی کەسیشم نەنووسیوە, بەڵکو چیم بینیوە وچی کراوە بۆ خەڵکم ئاشکراکردووە, با ئەموئەو پێیان ناخۆشبێت هەروەکو قورئانی پیرۆز فێرماندەکا ﴿ وقل الحق من ربك فمن شاء فليؤمن ومن شاء فليكفر﴾، منیش پەیماندەدەمو سوێند دەخۆم, کە لەبارەی مێژوو و بەسەرهاتی گەلەکەمان (ئەوەندەی لیێ ئاگاداریم) لەراستی کەمتر نەڵێم,

خەڵکیش ئازادن بڕوا دێنن یا نا, پێیان خۆشە یا نا. لەم بڕوایەوە سەرەتای ئەم بەرگەش، بەچەند تێبینییەك دەست پێدەکەم, بەو هیوایەی ئەگەر لەبەرگی پێشوودا ناڕۆشنی هەبووبێت یا شتێکم لەبیر چوبێ, خوێنەر بەم تێبینانە زیاتر بابەتەکەی لا روونبێتەوە..

**خزمەتکاری کوردو کوردستان**

**رەفیق پشدەری**

## سەر لێشێوانی بنەماڵە
## تێبینی لەسەر بەرگی دووەم

دوای ڕێککەوتنی جەزایر لەنێوان عیراق وئێران لە١٩٧٥/٣/٦دا باروذۆخی کوردستانی باشوور تووشی پەشێوی وئالۆزییەکی زۆر گەورەبوو, خەڵکی کوردستان لەسەرەتای ڕێککەوتنەکە تاراگەیاندنی ناوەرۆکەکەی، لەدڵەڕاوکێ و دوودڵییەکی زۆردا دەژیان, چونکە دەیانزانی پاشەڕۆژو ئەنجامی شۆڕشەکەیان لەبەردەم هەڕەشەی جددیدایە, کەسیش لەوە دڵنیا نەبوو کەباوکی شۆڕش" بارزانی لەئاست ئەو ڕێککەوتنە هەڵوێستی چی دەبێ ئەگەر هاتو دژی بەرژەوەندییەکانی شۆڕش وەستایەوە. ئاشکرایە کەبارزانی لەئاست دوابڕیاری شومی ڕێککەوتنی جەزائیر تەنها چوار ڕێگای لەبەردەمدا بووە:

١. خۆدانە دەست حکومەتی بەعس, کەئەمەیان قورسترین وسەختترین دەرگابووە رووی تێبکات, چونکە هەڵبژاردنێکی ئاوا جگە لەوەی کەشۆڕش‌و دەستکەوتەکانی بەبا دەدا، لەهەمانکاتدا خودی بارزانی و بنەماڵەکەشی ڕووبەڕووی هەڕەشەی مەرگ دەبوونەوە. بارزانی دوای ئەوەی لەسۆڤیەت گەڕایەوە بۆ کوردستان، بەشکۆدارییەوە پێشوازیکرا، بەجۆرێك کەجێی چاوەڕوانی نەبوو, بەڵام بەداخەوە ئەو زۆر نابەرپرسانە چۆوە بەردەم عەبدولکەریم قاسم و پێی گوت: (من سەربازی تۆم)و لەدانیشتنێکی‌تردا پێی گوتبوو (من قەیتانی قۆندرەکانتم) !

ئەم خۆدانەدەست و چوونەپێشەوەی بارزانی لەدەسەڵاتی ئەو کاتەی عێراق، بەهاو نرخی ئەو پیاوەی لەبەرچاوی سەرانی ڕژێمدا کەمکردەوە بۆیە بەردەوام وەك سەرۆك جاشێك مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرد نەك سەرکردەیەکی سیاسی, پاش ماوەیەکی کەم بارزانی دژی شۆڕشی ١٤ی تەموز چەکی هەڵگرت و بوو بەکەوا سپی بەرلەشکر, لەئەنجامدا حکومەتی عەبدولکەریم رووخا. دوای هاتنی بەعس بۆ سەر دەسەڵات لەعێراقدا پاش رووخانی دوو حکومەتی عەبولسەلام و عەبدولرەحمان بەیاننامەی ١١ی ئازار راگەیانرا بەڵام هەر زوو شەڕ لەنێوان حکومەت و شۆڕشدا دەستی پێکردەوە. هەموو ئەمانە وایان لەبارزانی کردبوو کەنەتوانێ بگەڕێتەوە ژێر دەسەڵاتی ڕژێمی بەعس.

٢. هەڵاتن بۆ ئێران" گەرچی ئەمرۆ هەموو دەزانین کەبارزانی ئەم ڕێگایەی هەڵبژارد **بەڵام** ئەمەشیان هیچی لەوەی یەکەمیان کەمتر نییە چونکە لەهەردوو حاڵەتدا شۆڕش بڵاوەی پێدەکرێ‌و گەل تووشی زیانی گەورە دەبێت. تاکە جیاوازیەك ئەوەیە کەلەم ڕێگایەیاندا گیانی ئەندامانی بنەماڵەکەی پارێزراو دەبێ‌و ژیانیان مسۆگەرە, با بەزەلیلی‌و ملشۆڕیش بێ, گەل و شۆڕشەکەشی بەقوربانی ئاسوودەیی و رزگاربوونی بنەماڵەبێ !

چونکە بەلای بارزانییەوە" ئەگەر گورگ پەلاماری مەڕ بدا گرنگ نییە مەڕەکان چییان بەسەردێت, بەڵکو گرنگ ئەوەیە شوان پارێزراو بێت. بۆیە من دڵنیام دوای هەرەسی ١٩٧٥ هەموو ئەو کارەسات و نەگبەتی‌و نەهامەتییانەی بەسەر گەلەکەماندا هاتووە" بەشی هەرەزۆری لەئەستۆی بنەماڵەدایە. چونکە ئەوان ئەگەر شۆڕشیان بەقوربانی بەرژەوەندیی تایبەتی خۆیان نەکردباو لەبەردەم دەسەڵاتی بەعسدا چۆکیان دانەدابا, ئەوا بەعسیش بەو ئاسانی‌و درندەییە نەدەکەوتنە گیانی گەلەکەمان.

٣–سێیەم ڕێگەی بەردەم بارزانی کەپەسەندترین ڕێگەو لەهەمووشیان سەختترە, ڕێی درێژەدان و بەردەوامی شۆڕشە, ڕێی ملکەچ نەکردن‌و ملنەدانە بۆ دوژمنان, ڕێی کوردستان یا نەمانە, شێخ عوبێدوڵا نەهری, شێخ سەعیدی پیران, شێخ

مەحمودی حەفید, قـازی محەمـەدو چـەندین شۆڕشـگێڕی نـاوداریتره.بـەڵام چ لەمەلایـەك دەكـەی خـۆی بەشـوێنكەوتووی پێغەمبەر بزانێو لەهەمانكاتدا كار بەو قسەیەی نەكات كە فەرموویـەتی (كلكـم راع وكلكـم مـسؤل عـن رعیتـه) بـەڵكو حـاڵی زمانی بڵێت (انا الراعی، ومسؤل عن نفسی فقط!).

٤–ئەم ڕێگەیەی بـەردەم بـارزانی، خۆكوشـتن بـوو. لەسـەرەتای دەركـەوتنی پیلانـە دوژمنكارییەكـەی جـەزائیر زۆربەی خەڵك بڕوای وابوو كەمەلامستەفا خۆی دەكوژێو ملشۆڕی قبوڵ ناكا. ئاشكراشە لەمێژووی خـەباتی گەلانـدا نموونەی ئەوهامان زۆرە كەپاش ئەوەی سەركردەی شۆڕش لەوە دڵنیا دەبێ كەبەرامبەر پیلانێكی وادایە كەناتوانێ خۆی بۆ بگیرێو بەرەنگاری بكا, لەترسی رسوابوون خۆی دەكوژێت تـا لـەیادەوەریو مێـژووی گەلـدا بەزینـدوویی بمێنێتەوە, نەك ژیانێكی زەلیلی قبوڵ بكات كە دواجار لەكەسێكی شۆڕشگێڕەوە, بۆ مرۆڤێكی بەرژەوەندپەرستی بگۆڕێت.

**كاك فوئاد عارف بۆی باسكردم كەدوای گەڕانەوەی بۆ بەغداو بینینی مەلامستەفا"**

پێی گوتبو دەبوو هەمیشە دەمانچەیەكت پێبوایە بۆ ئەوەی لەكاتێكی ئەوهادا یان خۆت كوشتبا, یان شا.

ئەو هەڵوێستە ترسنۆكانەیەی بارزانی هەمان هەڵوێستی سەدامم بیردێنێتەوە كەپاش ئەوەی لەشـەڕی دووەمـی كەنـداودا شكستی خوارد, هاوپەیمانان چەندین مەرجی رسواكەریان لەسەر سەپاند تا ئەوەی كەگوتیان دەبێ خودی خۆی بێتە سـەر تەلەفزیۆن و ملكەچیی بێ مەرج رابگەیەنێت! سەدام وەك فـسفس پاڵـەوان تـەنها بـۆ ئـەوەی گیـانی پـارێزراو بێـت هـەموو مەرجەكانی قبوڵ كرد. لەوكاتەدا سەرۆك موعەمەر قەزافی (دڵسۆزترین سـەركردەی عـەرەب بـۆ كـورد) هـاواریكردو گـوتی (ژەهرت خواردبا لەو ئیمزایە گەلێك باشتر بوو). هەرچەندە ئەو كارە لەمەلامستەفا زیاتر چاوەڕوانكراو بوو نەك لەدكتاتۆری بەغدا, چونكە سەدام لەداگیركردنی وڵاتێكدا تێكشكا, بەڵام مەلامستەفا شۆڕشی ڕزگاریخوازی گەلێكی بەبادا.

لەو كاتەدا كەبارزانی بڕیاری ئاشبەتاڵی داو بەرەو ئێران هەڵات, شۆڕش خاوەنی ١٥ ملیۆن فیشەكی تفەنگ و رەشـاش و نزیكەی ٥ هەزار گوللەتۆپ و هاوەن و لەشكرێكی زیاد لە٧٠ هەزار پێشمەرگە بوو, هـەروەها نزیكـەی ٤٠ هـەزار كیلۆمـەتری چوارگۆشە گردو شاخ و دەشتی لەبەردەستدا بوو. لەرووی ئازوقەو ئابووریشەوە رەنگە لەو ساتەدا دەوڵەمەندترین شۆڕشی رۆژهەڵات بوویێت. تاكە كەموكورییەكی شـۆڕش نـەبوونی سـەركردەی شـیاوو لێهـاتووبوو, بـەڵكو بەپێـچەوانەوە دەركـەوت كەخاڵی لاوازی شۆڕش هاوتەبانەبوونی نێوانی سەركردەو گەل بوو لەرووی گیانبەخشین و دڵسۆزی نواندن بۆ شۆڕش.

دیارە سەركردەی نەترس و جەربەزە دەتوانێت شۆڕش لەترسـناكترین و دژوارتـرین بـاردا رزگـار بكـات و گـەلێك بڕیـاری ژیانی بدات, زیاد لەوەش دەتوانێ نەك پیلانە نامرۆییەكان بەڵكو قەدەریش بـەپێی ویـستی خـۆی هەڵـسورێنێت, هـەروەكو شاعیری تونسی دەڵێت:

| | |
|---|---|
| **اذا الشعب یوماً اراد الحیاة** | **فلا بد ان یستجیب القدر** |
| **ولا بـــــد للیل ان ینجلي** | **ولا بد للقید ان ینكسر** |

بەڵام وەكو ئاماژەم پێدا, بارزانی بەشێوەیەك هەڵات و ئاشبەتاڵی لێكرد, كەنەك هەر لەناو كوردستاندا جێی سەرسامیو پرسیاربوو بەڵكو لەدەرەوەشدا ناوی كوردو شۆڕشەكەی

زڕاند. لەكتێبی (الحزب الدیمقراگی الكردستانی)كەلیژنەی ئامادەكار نووسیویەتیو لەسەرەتا

كانوونی دووەمی ساڵی ١٩٧٧دا دەرچووە هاتووە كاتێك شای ئێران بەبارزانی راگەیاند كە بەپێی ڕێككەوتننامـەی جـەزائیر دەبێت كۆمەكو یارمەتی لەشۆڕشی كورد ببڕێتو ڕێگە نەدات هیچ یارمەتیەك بەڕێگەی ئێراندا بەشۆڕش بگات, ئـاخۆ دەبـێ

هەڵوێستی سەرکردەی شۆڕش لەم بارەدا چۆن بوویێت؟ بارزانی گوتی (نحن شعبك, وما دمت راضياً عن اتفاقية الجزائر طوتؤمن مصالح ايران التى هى وطننا الام, لا يوجد لدينا ايضا اى شىء ضدها ونحن رهن اوامرك اذا قلت لنا موتوا نموت او عيشوا نعيش. لقد كنا مخلصين لك ولا نزال, وسوف نبقى هكذا فى المستقبل ايضاً ونأمل أن تستمر رعايتكم لنا ولقضيتنا دوماً... الخ) پاشان هەر لەهەمان کتێبدا, دوای تەواوبوونی خەجاڵەتنامەکەی بارزانی بۆ شا, لەلایەن دەستەی ئامادەکارەوە بەدواداچونێك بۆ ئەم نامەیە کراوە کەتێیدا هاتووە (ان هذه الاقوال التى اطلقها البارزانى فى طهران يوم ١٩٧٥/٣/١٢ بشكل متخاذل جداً لم يجبره احد على التفوه بها ولم تكن ايضاً تكتيكاً لعدة ايام, وقد تصرف هكذا بدلاً من ما كان يجيش فى صدر شعبه الجريح ومن الدفاع عن القضية فى هذا اللقاء, وقد اعقب اقواله هذه بقرار عدم المقاومة وانهاء الثورة, الامر الذى لايزال وسيبقى دوماً موضع شجب وغضب ابناء شعبنا المخلصين قاطبةً, وكذلك اصدقاء شعبنا الحقيقيين, كما ان هذه الاقوال والمواقف هى موضع استهزاء وعدم احترام الاعداء بالتأكيد ايضاً. وكانت تصرفات واقوال البارزانى فى تلك الجلسة موضع الاسى والالم الشديدين, ولا تعبر عن ارادة شعبنا بحالة من الاحوال وليس لها ما يبررها على الاطلاق, حيث ان الشاه كان انتهى من توقيع صك التآمر على شعبنا فى الجزائر طاعناً بذلك قضيتنا من الخلف وبشكل لااخلاقى ...).

بەم شێوەیە بارزانی خۆی بەدڵسۆزو گوێڕایەڵی شا ناساندو بەکردەوەش سەلماندی کە نەك هەر لاری لەناوەرۆکی رێککەوتننامەکە نىیە بەڵکو تەنها گوێڕایەڵبوونی لەسەرە بەرامبەر دەسەڵاتی تاران, با فەرمانەکانی ئەو دەسەڵاتە دژی گەلی کوردو شۆڕشەکەشی بێت, گرنگ ئەوەیە دڵی شا نەڕەنجێت و نەڵێت بارزانی بێوەفابوو. بۆیە ئەگەر هەندێ لەئەندامانی سەرکردایەتی بەو بڕیارەی شاو پارتی ناڕازیش بوبن, گفتوگۆشیان لەسەر کردبێت, ئەوا بارزانی هیچ لارییەکی لەبەردەم ئەم فەرمانە شاهنشاهییەدا نیشان نەداوە. بۆ نموونە لەکتێبی (الموساد فى العراق ودول الجوار, ص٢٠٤)دا هاتووە کەکاتێك بارزانی

بەیاوەری دکتۆر مەحمودو نوێنەری پارتی، شەفیق قەزاز لەتاران بەدەم بانگهێشتی شاوە دەچن تا لە١١ی ئاداری ١٩٧٥دا رێککەوتننامەی جەزائیریان پێ رابگەیەنێت, پاش ئەوەی شا ناوەرۆکی رێککەوتننامەکەیان بۆ ئاشکرا دەکات و داوایان لێدەکات کەکۆتایی بەشۆڕش بێنن, دکتۆر مەحمود هەڵوێست وەردەگرێتو ناڕەزایی بەرامبەر بڕیارەکەی شا دەردەبڕێت, ئەویش وەڵامی دەداتەوەو دەڵێت(انا اقول لك ما هو قرار ولا مكان للجدال والمناقشة), بێئەوەی بارزانی وشەیەك بڵێت کە لەبەرژەوەندی شۆڕشدا بێت. بۆیە مەلامستەفا یەکسەر تارانی بەجێهێشت و لە١٩٧٥/٣/١٣دا گەڕایەوە بۆ کوردستان, لەباڵەك چەند کۆبونەوەیەکی لەگەڵ مەسعودو ئیدریس و م.س. و لیژنەی مەرکەزیدا بەست. هەموو بەشداربوانی کۆبوونەوەکان جگە لەئەندامانی بنەماڵە" لەسەر ئەوە کۆك بوون کەدرێژە بەشۆڕش بدەنو لێنەگەڕێن پیلانەکانی دوژمن سەربگرێ, بۆیە کۆبوونەوەکان تا ١٩ی مانگ درێژەیان کێشا. لەم ماوەی شەش رۆژەدا (١٣- ٣/١٩) خەڵکی کوردستان چاوەڕوانی دوابڕیاری سەرکردایەتیی شۆڕشیان دەکرد تا بزانن چارەنووسی شۆڕشو خەباتیان بەکوێ دەگاتو, ئایا سەرۆکی شۆڕش لەنێوان کوردستانو نەماندا, کامیان هەڵدەبژێرێت ؟

مەلامستەفا کۆبوونەوەیەکیتری لەگەڵ شادا بەست, ئینجا بۆ ماوەی نیو سەعات بەنهێنی لەگەڵ مستەر X دانیشت، دوای ئەوە یەکسەر بڕیاری ئاشبەتاڵیدا. ئەم زنجیرە کۆبوونەوە یەك لەدوای یەکانەی مەلامستەفا لەگەڵ سەرکردایەتیی شۆڕش و سەرانی ئێرانو C.I.A تەنها بۆ دوو مەبەست بوو یەکەمیان: بڕوا بەسەرکردایەتیی شۆڕش بێنێت کەدەسبەرداری بیری شۆڕش بنو لەئاکامەکانی درێژەدان بەشۆڕش بیانترسێنێت و گیانی فیداکاریی کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان سارد

بکاتـەوە, دووەمیـان: هەوڵبـدات ژیـانو گـوزەرانی بنەماڵـە مـسۆگەر بکـاتو دەسـتکەوتو داهاتـەکانی شـۆڕش بـۆ ئێـران بگوازێتەوە.

مـەلامستـەفا لەکاتی کـۆبـونەوەکاندا هەرچی سـەروەت وسـامانی شۆڕش هەبوو هەموی

بـەلۆری رەوانـەی تـاران کـرد, ئینجـا بروسـکەی بـۆ هـەموو بارەگاکـانی پێـشمەرگە کـرد بـۆ ئـەوەی چـەکە قورسـەکانیان لەناوبەرنو بەچـەکە سـوکەکانیانەوە پەیوەنـدیی بەحکومـەتی ئێرانـەوە بکـەن, لەهـەمان بروسـکەدا داوای لێکردبـوون کـە لە١٩٧٥/٣/٢٦دا بەیەکجاری رووبکەنە ئێران وکۆتایی بەهەموو شتێك بینن.

لەهەمان کتێبی پێشوودا(ص ٨٠) هاتووە: (کانت هذه الاجتماعات لکسب الوقت, حیث کانت قیـادة البـارزاني قـد قـررت انهاء قرار تأریخي خطیر انتهت بموجبه ثورتنـا بـشکل مهـین وکـذلك نـضال الحـزب الـدیمقراطي الکوردسـتاني لـثلاثین سـنة اصبحت کلها مبتورة بما فیها ثورة ایلول). بەهەرحاڵ، مەلامستەفا بەفەرمانی شاو C.I.Aو بەئاگاداری ئیـسرائیل ئاشـبەتاڵی کردو لەکەرەج لەتاران پاڵیدایـەوە, ئەوانـەش کـە لەبەندیخانەبوونومەترسـی لێـدەکردن درێـژە بەشـۆڕش بـدەن, فـەرمانی بەئیدریسو مەسعود کرد بیانکوژێت, وەکـو محەمـەدئاغای میرگەسـوورو کوڕەکـانی, هەرچـی دیلـەکانی رژێمـی عـێراق بـوو کەژمارەیان ٣٠٠ سەرباز بوو تەسلیم بەئێرانی کردن, حکومەتی ئێرانیش کردنی بەدیارییەكو دانیەوە بەرژێمی عێراق.

مەلامـستەفا بـەم کـارەی پڕوپاگەنـدەی دوژمنـانی سـەلماند کـەدەیانگوت (هـەر کاتـێ ئێـران پـشت لەشـۆڕش بکـات, ئاشبەتاڵی لێدەکرێ) بۆیە لەئەنجامی ئـەم رووداوە بـەروونی دەرکـەوت کەئـەم بنەماڵەیـە تـەنها بـەدوای پـارەو دەسـەڵاتدا دەگەڕێنو دروشمەکانی شۆڕشو رزگاریی نەتەوەیی لای ئەوان لەسیاسـەتی چەواشـەکاریو هەڵخەڵەتانـدنی خـەڵك بـەولاوە هیچی تر نین, ئەمەش بۆ ئەوەی تا بتوانن زۆرترین سەرمایە کۆبکەنەوە, کەتەنها دوای ئاشبەتاڵ نزیکەی ٧٠ ملیـۆن دۆلارو ٤٥ ملیۆن دیناری عێراقیی سویسرییان رەوانەی بانکەکانی ئەمریکا کرد. جگە لەوەی کاتێ بنەماڵە گەیشتنە تاران, شـا ١٠٠ خانووی پێیـان بەخـشیو یـەك ملیـۆن دینـاری بـۆ مەلامـستەفا نـارد, ئەمـەش لەکاتێکـدا گـەلی کـورد لـەعێراق مـاڵ وحـاڵ وگوزەرانیان لەدەست دابوو و بەدەستی بەتاڵەوە لەترسی رژێمـی عـێراق هـەڵاتبوون, چـونکە بـەعس پـاش ئـەوەی ناوچـە ئازادکراوەکانی شۆڕش, کە لەساڵی ١٩٦١ەوە لەلایەن گـەلی کـوردەوە دەسـتکرابوو بـەڕزگارکردنیان, بـست بەبـستو گـرد بەگرد کەتا جەبەل حەمرین بـوو, هـەر هـەموو ئـەو ناوچـانە تـەنها بـەبڕیارێکی ترسـنۆکانە کەوتنـەوە بەردەسـتی بـەعسو خستنیەوە ژێر دەسەڵاتی خۆی, ئەمەش بۆ درێژەدان بەسیاسەتە نەگریسەکانی دەرهەق بەگەلەکـەمان کەیەکـەم هـەنگاوی بریتی بوو لەراگواستنی کوردەکانی خانەقین, جەلەولا, کفری, کەرکوك, دووز, شێخان, شنگارو تەلەعفەر تا سنووری دهـۆك وفایدە.

ئەو بازرگانییەی مەلامستەفا بەشۆڕشی کرد دەقاودەق وەك ئەو پەندە عێراقییە وایە کەدەڵێ: (یـشتری بـالمفرد ویبیـع بالجملە). پ.د.ك. سەرەتا حزبێکی سیاسی نەتەوەیی بوو, مەشخەڵی رزگارکردنی کوردستانی هـەڵگرتبوو, تـا ئـەو کاتـەی بنەماڵەو بەتایبەت مەلامستەفا دەستی بەسەرداگرت, لێرەوە کاتێك حزب وەك دامەزراوێکی نوێی سیاسـی لـەبزاڤی رزگـاریی گەلی کورددا دووبارە لەلایەن عەقڵی هۆزەوە کۆنترۆل کرایەوەو پێوانە شۆڕشگێڕیو سیاسییەکان گۆڕان بۆ دووریو نزیکی لەسەرۆك هۆزو بنەماڵە بۆ گرتنی دەسەڵاتو لێپرسراوەتی لەناو حزبدا. بنەماڵە بۆ ئەوەی بتوانێ بەتـەواوی پـارتی تەسـلیم بەئیرادەی خۆی بکا دەستیکرد بەنانەوەی گۆبەندو دوبەرەکی لەناو هۆزو تیرەو توێژەکانی ناو پارتیو لەرێگەی بەخشینی دەسەڵاتو بەپارە توانی خەڵکانی نەفس نزمو خائن بکا بەدۆستو لایەنگری خۆی, بێجگە لەوەی کەلەو کاتـەدا کۆمەڵگـەی کـوردی لـەرووی عەقڵیـەتو پێکهاتـەی کۆمەڵایەتییـەوە ئامـادەبوو بـۆ پێـشوازیکردن لەبنەماڵەیـەکی ئـاوا, چـونکە ئێمـە

لەمێژووەوە فێربوون کەسەرکردەو رابەر کاتێك دەسەلاَت دەگرێتەدەستو گەل شوێنی دەکەویَ کە بەپیی عەقلێەتی خەلك بجولێتەوە.

بۆیە دوای ئاشبەتالَ هەموو ئەو کادرو رۆشنبیرانە تا ئەو کاتەی بەناچاری خۆیان لەناو پارتیدا بینیبوّوە, دەستیانکرد بەدروستکردنی حزبو گروپی تر کە لەسەر بنەمای شۆرشگێرترو پێشکەوتووترو نوێتر بنیاتنراوە بەجۆرێك کەقۆناغیکی نۆی لەشۆرشو خەباتی گەلی کورد هاتە ئاراوە.

**تێبینی**

*بێجگە لەئەمریکا وئیسرائیل تەنها سیَ لایەنی ناوچەکە لەرێککەوتنی جەزائیرو ئاشبەتالَ, سوودمەند بوون:*

*١. محەمەد رەزاشا کەتوانی کۆتایی بەناکۆکیەکانی لەگەلَ رژێمی عیراق بێنێت لەسەر کەنداوی عەرەب، هەروەها توانی بەئاشبەتالَی شۆرشی کورد لەکوردستانی عیراقدا، بەگەلی کورد لەئێران بلَی کەکورد ناتوانیَ لەدەرەوەی دەسەلاَتی حکومەتی ئێران هیچ بکات..*

*٢. حکومەتی بەعس, دوای هاتنە سەرکاری بۆ دەسەلاَت لەعێراقدا, ئەمە گەورەترین سەرکەوتن بوو کەتوانی بەدەستی بێنیَ. گەلی کورد لەکوردستانی ژێردەستی بەعس لەپاش ئەم شکستە گەورەیە بەجۆرێك توشی بێئومێدی بوو کەماوەیەکی زۆرو رەنجێکی گەورەی ویست تا دووبارە متمانەی بەشۆرشی نویَو سەرکردایەتییەکەی پەیداکردەوە.*

*٣. مەلامستەفاو بنەماڵەکەی گەورەترین سوودمەند بوون لەو پلانەدا, چونکە بەهۆیەوە توانییان لەتاران، کەئەو کاتە وەکو پاریسی ئێستا وابوو، پال بدەنەوەو ژیانێکی خۆش بۆ خۆیان مسۆگەر بکەنو, بەئارەزوی خۆیان هاتوچۆی ولاَتانی رۆژئاوا بکەن جگە لەوەش بەدوورکەوتنەوەیان لەشۆرش هەرەشەی کوژرانو تیرۆرکردنیان لەخۆیان دوورخستەوەو دەستیانگرت بەکلاَوەکەی خۆیان تا با نەیبا, چش لەکلاَوی گەل. تاکە زەرەرمەند لەم ناوەدا, خەلَکی هەژارو رەشورووتی کوردستان بوو, کە بەهەزار دەردەسەریو نەگبەتی شتێکیان پێکەوەنابو تا لەسایەیدا بژین, بەلاَم ئەویش کرا بەقوربانی ئیسراحەتی بارزانی.*

پاش ئەوەی رژێمی عێراق لێبوردنی گشتی دەرکرد ژمارەی ئەوانەی لەسنوری ئێرانەوە هاتنەوە سەر مالَوحالَی تالاَنکراو, ١٧٠ هەزار کەس بوو. بەم شێوەیە مەلامستەفا بوو بەخاوەنی گەورەترین گالَتەجاری سیاسی لەمێژووی گەلی کورددا کە بەدلَنیاییەوە پاش خۆی کاریگەری خراپی لەسەر کەسایەتیو سایکۆلۆژیەتی تاکی کورد جێهێشتو, ئەم گوتەیەی خستە ژێر گومانەوە کەبەردەوام دۆستو دوژمن دەیلَێنەوە(کورد گەلێکی ئازایە).

**هەندیَ تێبینی تر لەسەر بەرگی دووەم**

هەندیَ لەو بەرێزانە کەبەرگی دووەمیان خوێندبۆوە لەوانەی خەلَکی ناوچەی بەمۆن, گلەیی ئەوەیان لاکردم کە من بەباشی باسی بنەماڵەی شەرەفبەیانیم کردووە, لەکاتێکدا ئەم بنەماڵەیە دەرەبەگن!

سەرەتا من نە بەباشەو نە بەخراپە باسی کەس ناکەم, من تەنها مێژوو دەنووسمەوە, چاکیو خراپی شتێکە پەیوەندی بەرووداوەکانەوە هەیە نەك حەزو لایەنگیری من, واتا من لەگێرانەوەی هەر شتێکدا ئەوپەری راستگۆییو بێلایەنی بەکاردێنم, جائەگەر ئەو نووسینە لەجێگایەکیدا بەدلَی کەسێك نەبیَ ئەوە خەتای من نییە, چونکە مێژوو ئەوە نییە کەتۆ حەزی لێدەکەی یان پێت ناخۆشە, بەلَکو رووداوێکە لەرابردوو, بەتالَیو سوێریو بەرزی ونزمی و ساردو گەرمیەوە,

کەسەکانو لایەنەکان لێی بەرپرسیارن, هەمووشمان ئەو پەندەمان لەبەرە کەدەڵێ: چ بچێنی ئەوە دەدوریەوە" بۆیە قسەی ئەو برا بەرێزانە دەرهەق بەبنەماڵەی شەرەفبەیانی لەراستیدا دوورە لەواقع و, چاك و خراپی لەراستیدا لەسەر بنەمای چینی دەرەبەگ/ جوتیار دیاری ناکرێ. لەمێژووی ئێمەی کورددا چەندین بنەماڵەی دەرەبەگ چاکەکارو لەهەمانکاتدا جوتیاری خراپ دەبینین, جیا لەوەش هەروەك لەبەرگی دووەمدا لەئاست ئەو بنەماڵە بەرێزە گوتومە کەبارەگای هێزی پێشمەرگە لەسایەی ئەوان لەناوچەکەدا دامەزرا. بۆیە دووبارە جەخت دەکەمەوە سەر شۆرشگێریو خانەدانیی ئەم بنەماڵەیە.

## ناوچەی پشدەرو رۆڵی عەباسی بایزی باوڵوو

### تێبینی لەسەر بەرگی دووەم

ناوچەی پشدەر, بەهۆی ئەوەی ناوچەیەکی شاخاویی سەختەو دەکەوێتە سنووری عێراق _ ئێرانەوە، دوای دروستبوونی دەوڵەتی عێراق، هەموو کات بۆتە دەروازەو لانکی جولانەوە شۆرشگێڕییەکانی گەلی کورد لەکوردستانی باشور, بەشێوەیەك کەلانکی کوردایەتی بوو بەناوی دووەمی شاری قەڵادزێ.

رژێمە یەك لەدوایەکەکانی عێراق, هیچ درێغییان نەکردوە لەپیادکردنی سیاسەتە دوژمنکارییەکانیان بەرامبەر بەم ناوچەیە. کارەسات و وێرانکارییە یەك لەدوای یەکەکانی شاری قەڵادزێ, کەدوایینیان وێرانکردنی تەواوی ناوچەی پشدەرو راگواستنی خەڵکەکەیو قەدەغەکردنی ژیان لەو ناوچە بەرفراوان و گرنگە بوو کە لەدرندەییدا, لەمێژووی هەموو ناوچەکەدا بێوێنەیە, ئەو کارەساتە ئەگەر لەلایەك بەڵگەی فاشیەت و دکتاتۆریەتی رژێمی بەعس بێ, ئەوا لەلایەکیترەوە ئەنجامی خۆراگری و ملنەدانی خەڵکی ئەم دەڤەرە شۆرشگێرەیە بەخواستە نائینسانیەکانی دکتاتۆری بەغدا کە لەمێژووی پرسەروەریی ناوچەکەدا مێژوویەکی دوورودرێژی هەیە.

هەر لەسەرتای دروستبوونی حکومەتی عێراقەوە خەڵکی ئەم ناوچەیە لەژێر سایەی دەسەڵاتی ناوچەی سەربەخۆدا ژیاون و دووربوون لەدەسەڵاتی پایتەخت. ئەو کاتە بابەکرئاغای سەلیم (بابەکرئاغای پشدەر) کەسەرۆکی هۆزی پشدەر بوو، توانی بەلێهاتوویی خۆی دەسەڵاتی هەموو ناوچەکە بگرێتەدەست, بەهەموو هۆزو خێلەکانیەوە. بەرادەیەك سەرکەوتوبوو کە لەسایەی دەسەڵاتیدا ئارامیو ئاسایش لەهەموو دەڤەرەکە بەرقەراربوو و کەدەکرێ لەمێژووی ناوچەکەدا بەسەردەمی زێرینی ناوبنێین. ئەمە وایکرد باری ئابوری گەشە بکاو بازاڕی نوێ لەشارۆچکەکەدا بکرێتەوە وەکو بازاڕی مینا کە لەسەرانسەری کوردستاندا خەڵك بۆ بازرگانی و کڕین و فرۆشتن روویان تێدەکرد، بۆیە کار گەیشتە ئەوەی خەڵکی بێگانەش بیر لەوە بکاتەوە بێت لەم ناوچەیەدا بژی, لەوانە زێدان عەرەب کەخەڵکی کازمیەی بەغدا بوو, حەمەی عەجەم و بەشیر عەلی کەخەڵکی ورمێ بوون.

لێهاتوویی بابەکرئاغا تەنها لەلایەنی ئیداریەوە نەبوو, بەڵکو ئەو تاکە سەرۆك هۆزبوو کە لەتواناو بایەخی ئینگلیز گەیشتوە لەسیاسەتی ئەم ناوچەیەدا بۆیە کەساڵی ١٩٥٦ هاتە بەغداو میوانم بوو، داوای لێکردم لەگەڵیدا بچم بۆ لای باڵوێزی بەریتانی لەبەغدا, بەڵام من وەڵامم دایەوەو گوتم: لەبەر ئەوەی ئینگلیزی باش نازانم, ناتوانم لەخزمەتتدا بێم.

بۆ ئەم مەبەستە کابرایەکی لەگەڵ خۆیدا برد بەناوی (م.ع) بۆ چاوپێکەوتنی باڵوێز. لەکاتی گفتوگۆدا باڵوێزی بەریتانی پێی راگەیاندبوو کەهاتنی ئەم" حکومەتی پاشایەتی عێراق بەتایبەت خودی نوری سەعید نیگەران دەکا, چونکە ئەوان

نایانەوێ ئینگلیز لەگەڵ هیچ سەرۆك هۆزێك پەیوەندی راستەوخۆی هەبێ. هەروەها پێیێ گوتبوو کەهەر کێشەیەکت لەگەڵ حکومەتدا هەبوو, دەتوانی بەئاسانی ماجد مستەفا ببینی, ئەویش ئێمە ئاگادار دەکاتەوە تا هاوکاریت بکەین.

سەرباریشی بابەکرئاغا هیچ کات هاوکاری ئینگلیزی نەکردووە بۆ جێبەجێکردنی نەخشە داگیرکارییەکانیان‌و نانەوەی کێشەو ئاژاوە لەگەڵ حکومەتی عێراق بەڵکو ئەو تەنها دەیویست کۆمەك لەدەسەڵاتی ئینگلیز وەربگرێ‌و دۆستایەتی لەگەڵیاندا ببەستێ. رەنگە هۆیەکیتری ئەم هەولانەی بابەکرئاغا بۆ بەستنی پەیوەندی لەگەڵ ئینگلیزدا بۆ ئەوە بوبێ کە لەداهاتوودا ئینگلیز بۆ رزگارکردنی ناوچەی پشدەر لەدەسەڵاتی بەعس پشتی بگرن. چونکە خەڵکی ئەم ناوچەیە بەردەوام لەهەوڵی خۆرزگارکردن بوون لەچەپۆکی رژێمە یەك لەدوای یەکەکانی عێراق. خەڵکی ئەم ناوچەیە چەندین جار دژی رەزا شای کۆنەپەرست راپەرین‌و لەو پێناوەدا چەندین شەهیدیاندا. ئەم ناوچەیە لەسایەی دەسەڵاتی بابەکرئاغا تا ساڵی ١٩٣٦ بەسەربەخۆیی مایەوە. لەو ساڵەدا بابەکرئاغا لەگەڵ حکومەتی مەرکەزیدا رێککەوت لەسەر ئەوەی ئیدارەی حکومەت بێتە ناوچەکە, ئەمەش بەچەند مەرجێك:

١. بەرێوەبەری ناحیەو سەرۆکی شارەوانی لەخزمەکانی خۆی بن.
٢. تاماوەی حەوت ساڵ خەڵکی ئەم ناوچەیە سەربازی نەکەن.
٣. مەشقی سەربازی لەقەڵادزێ بێ, دوای تەواوبونی مەشق ئەوجا سەرباز بۆ شوێنانی تر بگوازرێنەوە.

ئەم رێککەوتنە پاش گوشاری زۆری حکومەت بۆ سەر بابەکرئاغا سەپێنرا, بەڵام بەئاشکرا لاوازیی دەسەڵاتی حکومەتی عیراقی لەو کاتەدا لەناوچەی پشدەر دەبینرا, ئەگەر بۆ ماوەیەکی کەمیش بوبێ. خەڵکی ناوچەکەش تا ماوەیەکی دوورودرێژ بەچاوی بێگانە سەیری ئیدارەکانی رژێمیان دەکردو هەر بابەکرئاغایان بەمەرجەعی خۆیان دەزانی.

دوای شۆرشی ١٤ ی تەممووزو توندبوونی ناکۆکی و پەیدابوونی حزبایەتیی تەسك, پەشێوی کەوتە ناوچەکەوە, هۆزو تیرەو خێڵ وچینە جیاوازەکان بەسەر حزبەکاندا دابەشبوون, هەر حزبەو کاری بۆ هاندانی لایەنگرانی خۆی لەدژی لایەنەکانی تردا دەکرد, ئەمە سەرەتایەکی خراپ بوو لەناکۆکی کەئاغاکان بەردەوام رۆڵی خراپیان تیدا دەبینی. چونکە لەسەردەمی حوکمی ئەواندا هیچ جوتیارێك مافی موڵکایەتیی زەوی نەبوو, جگە لەوەی رێگربوون لەکاری بازرگانی بەتایبەتی کەبازرگانەکە لەخۆیان نەبا. دانان وکردنەوەی بازاڕیان قەدەغەکرد بۆیە سەرباری ئەوەی چەندین کەسایەتی ناوچەکە رۆڵی بەرچاویان بووە لەئاوەدانکردنەوەو پێشخستنی دەڤەرەکەدا بەڵام نەیانتوانی ببنە خاوەنی تەنها دوکانێکیش, بۆ نموونە لەبیستەکاندا حەوت کەس رۆڵی گەورەیان لەئاوەدانکردنەوەی قەڵادزێدا بینیووە بێ ئەوەی خاوەنی هیچ موڵکێك بن کەبریتین لەحاجی سادق (باپیرم), خدرە سپیلکە, مەولان, حاجی تاهیر, حاجی کەریم, حاجی حەمەرەش, بابەکر ئەحمەد.

بەهاتنی رژیمی بەعس لە١٩٦٨دا، ناکۆکییەکان قوڵتربوون وبەرەو مەرامە سیاسییەکان ئاراستەکران. بەعس هەر لەسەرەتای حەفتاکانەوە ئەم ناکۆکییانەی ناوچەی پشدەری قۆستەوە کەئەو کات پێیان دەگوت: ناکۆکیی نیوان نورەددین و میراودەلی، بەتایبەتی دوای دەرچوونی یاسای ژمارە ٩٠ ی ساڵی ١٩٧٥ کە تایبەتە بەریفۆرمی کشتوکاڵ. هۆکارێکی سەرەکی بۆ سەرکەوتنی پیلانەکانی بەعس لەو ناوچەیە دەگەڕیتەوە بۆ پشتبەستنی رژیم بەخەڵکانی پیاوکوژو نەفسنزم بۆ جێبەجیکردنی بەرنامەکانی.. بۆ نموونە عەریف بابەکر کەئامر مەفرەزەی ئیستخبارات بوو، دەیان کاروانی کوردی ئێرانی لەو رێگایانەدا تالانکردو چەندین کەسی لێ کوشتن وبریندارکردن، کەپێشتر کاروانەکان بەئازادی لەنێوان عیراق و ئێراندا لەرێگای ئەم سنوورەوە هاتوچۆیان دەکرد. نارەحەتکردنی هاووڵاتیان لەلایەن عەریف بابەکرەوە وای

لەخەڵکی ناوچەکە کرد لەئەنجامدا لیی راپەڕن تا لەگوندی گەناو کوشتیان, بەجۆریك کە تا ئێستا کەس نازانێ تەرمەکەی چی بەسەر هات.

دووەم پیاوی رژیم لەو کاتەدا حەمەسوورئاغای گویزیلێ بوو کە بەحسەینی حەمەسوور ئاغا ناسرابوو. ئەو کابرایە لەخراپەکردن و کوشتن گوتالان وجەردەیی وئازاردانی خەڵك بەولاوە هیچی تری نەدەزانی, لەژیانی خۆیدا ئەوەندە تاوانی کرد کەبەکتیبیك تەواو نابێ.

سێهەم پیاوی بەعس کەزۆر بەدڵسۆزیەوە نەخشەکانی رژێمی جێبەجێ دەکردو وەك سەگی هار لەو خەڵکە بەر بووبوو, عەباسی بایز باڵو بوو، ئەم کابرایە بەبنەچە خەڵکی گوندێکی ناوچەی سەنگەسەر بوو, دورستبوون وپەیدابونی بنەماڵەکەی بۆ سەردەمی عوسمانییەکان دەگەڕێتەوە, گوایە پاش ئەوەی عوسمانییەکان دێن بۆ ئەم ناوچەیە، لەیەکێك لەگوندەکان باڵوڵ ناوێك کەشوانێکی گێلۆکە بووە, دەیهێنن و وەك سوکایەتیکردن بەخەڵکەکە دەیکەنە دەمڕاست وناوی دەنێن بالول ئاغا, کەباپیری عەباسی بایزە.

عەباس دوای ئاشبەتاڵ، بوو بەباوەڕپێکراوی (وەکیل)ی ئاسایی قەلادزێو مانگانە ٨ دیناری هەبوو. لەبەر ئەوەی کەسێکی نەفسنزم بوو دەستی لەگەڵ رژێمدا تێکەڵکرد, کەتوانی سوود لەم کابرایە وەربگرێ بۆ ئەنجامدانی دزی, جەردەیی, پیاوکوشتن, تالانی, داوین پیسی و... هتد کەتەنها بەمەبەستی نانەوەی پشێوی وئالۆزی بوو. بۆ ئەم مەبەستە عەباس هێزیکی پێکهینابوو تاکو گورجتر فەرمانەکان جێبەجێ بکات, سەرەتا دەستیکرد بەبۆسەنانەوە بۆ هێزی پێشمەرگە, لەیەکەم دەستوەشاندنیدا چەند پێشمەرگەیەکی سۆشیالیستی دەستگیرکردو تەسلیمی رژێمی کردنەوە کەژمارەیان ١١ پێشمەرگەبوو کەتەنها یەکیکیان زیندانیکرا ئەوانی‌تر هەر هەموویان بڕیاری لەسێدارەدانیان بەسەردا درا کەئەمانەن: مەحمود حاجی محەمەد پاچکار, حەسەن سوور, خدر حەمەسوور بادینی, حەمەی هەمزە قەجەر, عەبدوللا حەسەن, فەرخە حاجی عەبدوللا, محەمەد مام ئەڵلاڕەش گەرمکان (کە لەبەر پیری بڕیاری لەسێدارەدانی کرا بەزیندانی), ئەحمەد حەسەن پێپان (ئەویش دوایی توانی لەدەست رژیم هەڵێت), حەسەن مەولود کەخەڵکی ئێران بوو. پاش گیرانی ئەم کۆمەڵە, کەسوکاریان چونە لای عەباسو پارەو دیارییەکی زۆریان بۆ برد تا کوڕەکانیان رزگار بکا هەرچەندە عەباس هەموو پارە ودیارییەکانی لێوەرگرتن بەلام هەر بەسێدارەدانی دان.

ئەو خوێنڕێژە پیاوی بنەماڵەشبوو, بەفەرمانی خودی مەسعود بەم کارانە هەڵدەستا, خۆی لەچەندین دانیشتندا بەئاشکرا گوتبووی سەر بەبنەماڵەیە.خۆم لەکابرایەکی سەر بەپارتی لەقەلادزێ, بیستبوم کەعەباس چەکداری پارتییە, لەکاتێکدا ئەو بەردەوام شانازی بەوەوە دەکرد کەپێشمەرگە دەکوژێ یان دەیانگرێ و تەسلیم بەرژێمیان دەکاتەوە, بەپێکەنینەوە دەیگوت: من راوە پێشمەرگەی یەکێتی دەکەم, تا ئیستا رەنگە زیاتر لە١٠٠ پیشمەرگەی یەکێتیم کوشتبێ.

لەساڵی ١٩٨٤دا گفتوگۆ لەنێوان یەکێتیو رژێمی بەعس دەستی پێکرد, لەو کاتەدا من نوێنەری یەکێتی بووم, بۆ راکێشانی سەرۆك جاشەکان بۆلای خۆمان پەیوەندیمان بەزۆریانەوە کرد, عەباس یەکێك بوو لەو سەرۆك جاشانە کەبۆ هەمان مەبەست چوینە لای کەپێشتر لەبۆسەیەکی هێزی پێشمەرگەدا برازایەکی کوژرابوو. من لەگەڵ بەڕێزان مامۆستا مەلامحەمەد دەلگەییو کاك حەمەسوور مینەعەرەب بەناوی پرسەوە چوینە لای لەناحیەی سەنگەسەر, دوای بەخێرهێنانو کەمێك ئیسراحەت, عەباس روویکردە منو گوتی: (ئێوەی یەکێتی خەڵکم لێدەکوژن ودێنە پرسەشم), منیش یەکسەر بەدەنگێکی بەرز گوتم: (قازانجە کەماوی, ئەگەر فریای خۆت نەکەوی رۆژێك سەرەی تۆش دێ). عەباس سوور هەڵگەڕاو قسەی بۆ نەکرا, چونکە دڵنیابوو من پشتم بەهێزی پێشمەرگە قایمە.

پرسەکەمان جێهیشتو دووبەدوو کەوتینە گفتوگۆ, لەپێناوی گەیشتن بەئامانجێکی باش, چوار جار لەنێوان عەباس وسەرکردایەتی یەکێتیدا هاتوچۆم کرد, لەکۆتاییدا سەرکردایەتی فەرمویان ئەم تاوانبارە دەبێ بێتە سەر ڕێی ڕاستو دەستبەرداری ئازاردانی هاووڵاتیان بێتو نەبێتە کۆسپی بەردەم شۆڕش لەناوچەکەدا. ئەوانەم هەموو پێڕاگەیاندو پێمگوت: ئەگەر وانەکەیت ناتوانی خۆت لەهەڕەشەی هێزی پێشمەرگەی یەکێتی بپارێزی.

لەیەکێك لەو شەوانەدا کەدووقۆڵی لەگەڵ کوڕە ١٢ ساڵەکەیدا بۆ گفتوگۆ لەدیوەخانەکەیدا دانیشتبووین, بەدەم قسەکردنەوە قاپێك وێسکیمان خواردەوە, کە لەراستیدا بەئەنقەست وامکرد بەشی هەرە زۆری دەرخواردی عەباس بدەم بۆ ئەوەی نهێنی پێبدرکێنم, ئەوەبوو لەو شەوەدا عەباس زۆر سەرخۆش بوو گوتی: (مادام عەفوو کرام, با ئەو راستیەت پێ بڵێم: لەم ژورەدا — مەبەست دیوەخانەکەیە —١٣ رۆژ بکوژانی ئەشرەف تاڵەبانی[1] برای مام جەلالو هەردوو کچەکەی" هێرۆو بەنازم حەشاردابوون). منیش گوتم: (ئەوەی رۆی رۆی, گرنگ ئەوەیە لەمەودوا خراپە نەکەی). بەڵام هەزار رەحمەت لەپێشینان کەگوتویانە تۆبەی گورگ مەرگە.

وەکو گوتمان بەعس بەمەبەستی دەستێوەردان لەناوچەی پشدەرو نانەوەی ئاژاوەو رێگەگرتن لەشۆڕش, پشتی ئەو پیاوەو هاوشێوەکانی دەگرت, بەڵام وەنەبێ بەعس تەنها لەناو ئاغاکاندا پیاوکوژی هەبووبێ, بەڵکو لەچینی جوتیارانیشدا توانی چەندین کسی وا بدۆزێتەوە ئەگەر وەکو عەباسیشی پێنەکرابێ ئەوە دڵسۆزی ئەوان ودوژمنی کورد بوون, لەوانە بابەکری وسوو کە بەبابەکری جوتیاران دەناسرا ناودارترینیان بوو, هەروەها محەمەد دەروێش باوزێو خلەژێرسێو عەزەی گوللەخوار کەناوبانگی خراپەکارییان دەرهەق بەخەڵك تا ئێستا لەسەر زمانی خەڵکی ناوچەی پشدەرە. لەناو رۆشنبیرانیشدا محەمەد حەسەن قەیسی سەرپەرشتیاری قوتابخانەی سەرەتایی, ببو بەزوڕناژەنی بەعس. ئەو کابرایە بەردەوام هەڕەشەی لەمامۆستا کچەکانی ئەو ناوچەیە دەکرد تا ببن بەبەعسی, دەیگوت ئەوەی نەبێ بەبەعسی بۆ باشووری عێراق دووردەخرێتەوە, بەڵام کچەکانی ئەم ناوچەیە هاوشانی برا شۆڕشگێڕەکانیان لەبەردەم شەپۆلە بۆگەنەکانی بەعسدا خۆڕاگربوون.

خوشکە گورجیە هاوسەری شەهید فاروقی مام عەلی نموونەی خۆڕاگری بوو لەناو کچانو ژنانی ئەم دەڤەرە, کاتێک وەڵامی ئەو بەعسیەی دابۆوەو گوتبوی (چیتان پێ دەکرێ بیکەن, بەڵام نابم بەبەعسی).

لەلایەکیترەوە بەعس تادەهات کێشەی نێوان گوندی نورەددین وئاغاکانی گەورەتر دەکرد, تابتوانێ لەو نێوانەدا ئەوەندە خوێن برژێ کەسارێژکردنی زەحمەت بێ, بۆیە تا ئەمرۆش ئەم گرفتە لەو ناوچەیە درێژەی هەیە.

دوای راپەڕینی ئاداری ١٩٩١و گەڕانەوەی خەڵکی ناوچەکە بۆ سەر زەویوزارو گوندە رووخاوەکانیان, دووبارە شەڕوهەرا لەنێوان ئەم دوولایەنە بەخەستی دەستی پێکردەوە, حزبە کوردستانیو عێراقییەکانیش لەجیاتی ئەوەی ئاو بەو ئاگرەدا بکەن, دەستیانکرد بەهاندانی خەڵك لەیەکتریو هەڵڕشتنی پارەو پایە بۆ ئەوەی بتوانن زۆرترین خەڵك لەزووترین کاتدا لەو ناوچەیە بەلای خۆیاندا رابکێشن. هەر حزبەو شەڕی بوو لەسەر ئەوەی کەفلان ئاغا یافلان سەرۆك هۆز یا سەرۆك جاش بکا

---

[1] شێخ ئەشرەف تاڵەبانی کەخاوەنی گوندی کەلکان بوو لەبناری کۆسرەت, لەتەمەنی ٦٠ساڵیدا لەشەوی ٢٩ —٣٠ /١٩٨٤/٦ بەفەرمانی عەباس لەگەڵ دوو کچیدا هێرۆو بەناز, سەعات یەکی شەو, کاتێك لەگەڵ خێزانەکەی لەسەربان نوستبوو, تیرۆرکرا. راستە شێخ ئەشرەف برای مام جەلال بوو، بەڵام پیاوێکی خانەدانی دوور لەسیاسەت وحزبایەتی بوو, هەروەها لەناو خەڵکی گوندەیدا (کەلەکان) زۆر خۆشەویست بوو.

بەئەندامی خۆی بۆیە دووبارە خەرمان سوتاندن ومەڕومالآت بەتالآن بردنو داگیرکردنی زەویو پیاوکوشتن کەوتەوە ناوچەکە.

هەرچەندە ئێستا تا رادەیەکی زۆر ئارامی لەهەموو ناوچەکەدا بەرقەرارە, بەلآم لەراستیدا کێشەکە چارەسەر نەکراوە, بەڵکو تەنها شەڕەکان بۆ کاتیکیتر دواخراون, چونکە داهاتی رۆژانەی زۆربەی خەڵکی ئەو ناوچەیە لەکشتوکاڵو زەوییەوەیە, کەئەمەش ناوەرۆکی کێشەکەیە. نابێ ئەوەشمان لەبیر بچێ کەئەم شەڕە گەورەیەی نێوان یەکێتی وپارتی لەدوای راپەڕین, کەسەرەتاکەی لەم ناوچەیەوە دەستی پێکردوە لەسەر ریزێك دوکان بوو کەتییدا چەندین تێکۆشەری گەلەکەمان شەهیدبوون, لەوانە شەهید عەلی نەبیو مام جوتیار. بێجگە لەوەش ئەم ناوچەیە لەلایەن رژێمەوە وێرانکراو ژێرخانی ئابوریی دوچاری تێکشکانێکی گەورەبوو, کە لەئەنجامدا بێکاریو نەدارییەکی زۆری لێکەوتەوە.

بیری تەسکی حزبایەتی وایکرد کەزۆر لەسەرۆك جاشو ئامر مەفرەزەو پیاوکوژەکانی دوێنێ, ببن بەخاوەن دەسەلآت و لێپرسراو لەناو شۆڕشدا. لەوانە عەباس کەتا پێش راپەڕین تاوانبارێکی گەورەی ناوچەکەبوو بەلآم پاش راپەڕین بوو بەیەکەم پیاوی پارتی لەناوچەکەدا. جگە لەوەی کەناوبراو بەرەسمیو بەئاشکرا دەستی لەگەڵ ئیتلاعاتی ئێرانی تێکەڵ کردبوو,ماڵەکەی لەمەڕ سەنگەسەری بوو بەبارەگای ئاشکرای ئیتلاعات, بەجۆرێك کەجەماوەر سەرسام بوون بەوەی کەکۆماری ئیسلامی چۆن پشت بەم پیاوە خوێنڕێژە دەبەستێ لەکاتێکدا دروشمی بەرگری لەچەوساوەکان (الدفاع عن المستضعفین)ی هەڵگرتووە؟! بەلآم راستە, لەسیاسەتدا ئەخلاق نییەو ئەگەر بتەوێ سیاسەتەکانت سەرکەوتوبێ, دەبێ ئەخلاقو یژدان بخەیتە لاوە, چونکە بەرژەوەندی, چەقی کاری سیاسییەو سیاسەتیش, کۆی ریگاو شوێنەکانی پاراستنیەتی.

بەرژەوەندی عەباس لەم کارەدا چەند خاڵێك بوون: دەستکەوتی پارەو پول, پاراستنی دەسەلآتی خۆیو خۆپاراستنی لەجەماوەرو یەکێتیی نیشتیمانیی کوردستان.

هەرچی ئێرانیشە, ئەوە ئاشکرایە بەرژەوەندییەکەی چییە, کۆکردنەوەی زانیاری لەسەر حزبە کوردییەکانی ئێرانو عیراقو دەستوەشاندن لەهێزی پێشمەرگەی کوردستانی ئێران. بەلآم خوا دوعاو هاواری هەزارانی قبوڵکرد کاتێك پاش ماوەیکی کەم خوشكو کچێکی عەباس رەدووکەوتنو هەریەکەو دەستی لاوێکی گرتو هەلآتن.

پاش فراوانبوونو تۆکمەبوونی دەسەلآتی یەکێتی لەناوچەکەدا بەهۆی ئەو گۆڕانکارییانەی روویاندا, عەباس هەستی بەهەڕەشەی جددی کردو زانی ئەگەر فریای خۆی نەکەوێ کەس ناتوانێ رزگاری بکا, بۆیە بەفەرمانو کۆمەکی بنەماڵەی مەلامستەفا خۆی گەیاندە باوەشی کۆماری ئیسلامیو هەلآت. لەئێران پێشوازییەکی گەرموگوڕیان لێکرد کەچاوەڕوان نەدەکرا. نەك هەر ئەوەندە بەڵکو لەهەموو روویەکەوە دەسەلآتیان پێدا, هەر لەسنووری تەمەرەچیان تا دەگاتە چۆمان تا بارەگاکەی لەخانە(پیران شهر) بەو سپێردرا. ئەویش دووبارە بەئارەزوی خۆی لەو سنورانە دەستیکردەوە بەدزیو جەردەییو کوشتنوبڕین. تاکە بیانووی ئەو کۆمەکەی ئێران بۆ عەباسو بەخشینی ئەو دەسەلآتە فراوانە پێی, ئەوەبوو کەعەباس دۆستی دێرینی کۆماری ئیسلامییە. خراپەکاریی عەباسو چەکدارەکانی تەنها کوردی عیراقی نەگرتەوە, بەڵکو ئەو لەو پیاوانە بوو کەدەڵێن: نانی لەپیاوکوشتندایە. بۆیە لەتەمموزی ساڵی ٢٠٠٠دا کەسوکاری عەباسو چەکدارەکانی, هاوولآتی کوردی ئێران (ئاکۆ حەسەن پوور) دەکوژن. لەئەنجامدا خەڵکی خانە لێیان رادەپەڕنو هێرش دەکەنەسەر بارەگاو ماڵی عەباسو تالآنیان دەکەن, پاشان هەمووی دەسوتێنن بەدوو سەیارەوە. لەم راپەڕینەدا هەندێ هاولآتی خانەیی زامدار دەبن. عەباس یەکسەر ناوچەکە جێدێلیو هەڵدێ, ئێران سوپایەکی تایبەت لەمیراوە بەهانای عەباسەوە دەنێرێ, پاشان

هەموویان ڕەوانەی هەولێر دەکاتەوە بۆ ژێر دەسەلاتی بنەماڵە, ئەوەش بەپێی ئەو پەندەی دەڵێ: (ماڵی قەڵب سەر بەساحێبیەتی). ئێستا تاران کەباسی عەباس دەکا دەڵێ: (اشراری عراقی اصل). ئێران بەم شێوەیە دەستی خۆی لەتاوانەکانی عەباس دەتەکێنی. بەلام بنەماڵەی بارزانی چۆن پاساوی تاوانەکانی ئەو پیاوکوژە دەدەن؟

## بۆچی لەدەست بنەماڵەو ئیتلاعات بەرەو تورکیا هەلاتم؟

ئەو کاتەی لەتاران لەگەڕەکی گەوهەردەشت بووم, بەیانیەك سێ لێپرسراوی کۆماری ئیسلامی ئێران هاتنە لام, یەکێکیان ناوی حسەین بوو کە لەدەفتەری سەرۆك وەزیران موسەوی سکرتێر بوو. ئاغای حسەینی گوتی: ئێمە نزیکەی ٧ ساڵە زانیاری لەسەر تۆ کۆدەکەینەوە, بۆیە زانیاریەکی تەواومان لەسەر تۆو بنەماڵەکەتان هەیە). پاشان دەستیکرد بەباسکردنی زۆری کەسوکارەکانم بەناوو ئیشوکارەکانیانەوە, بەجۆرێك شارەزا بوو کەسەرسامی کردم. گوتی: (موعامەلەی کوڕەکانت سێ جار تەواو بووە, بەلام ئێمە ڕێگەی لێدەگرینو هەڵیدەوەشێنینەوە, هەمووشی بۆ ئەوەیە دەستمان بەسەرتدا زاڵ بێت, ئێمە چاوەڕێی ئەو ڕۆژەمان دەکرد کەدێیتە بەردەستمان), لەدرێژەی قەسەکانیدا گوتی: (ئێمە بەرنامەمان ئەوەیە کەرێکخراوێك دابمەزرێنین, بۆیە دەبێ لەگەڵماندابیو ئەم کارەمان بۆ بکەیت, چونکە سەرپەرشتیەکەی دەدەینە دەست خۆت, ئێمەش هەموو هاوکارییەکت دەکەین تا نیوەی جەماعەتی جەلالو مەسعود پەیوەندیت پێوە بکەن, ئێمەش بەهەموو جۆرێك پشتگیریت دەکەین تا لەکارەکانتدا سەرکەوتووبیت و ببیت بەسکرتێری بەهێزترین حزبی کوردستان... سەرەتا یەك ملیۆن دۆلارو بیست ملیۆن تمەن دەخەینە بەردەستتو منداڵەکانیشت لەزانکۆ دادەمەزرێنینولەڕامسەر خانوویان بۆ دابین دەکەین.. وەلام بۆ هەموو کەسوکارت بنێرە تا لەیەك شوێن کۆیان بکەینەوە).

ئەم پێشنیازە گڵاوەی کۆماری ئیسلامی کەدژی کوردە, وای لێکردم بۆ ژێر دەسەلاتی پارتی هەلێم, ئەمەش بەو هیوایەی کەسەرکردایەتیی پارتی کۆمەکم بکات تاخۆمو ماڵو منداڵم لەکۆماری ئیسلامیو بەرنامە دوژمنکارییەکەی بپارێزم. کاتێك گەیشتینە گوندی سلیڤانە, یەکسەر لەگەڵ کاك دڵشادو نێچیرڤان بارزانی کۆبومەوەو باسی بارودۆخی خۆم بۆ کردن، پێم گوتن: من بۆیە ڕامکردووە چونکە ئامادە نەبوم ببمە پیاوی ئێرانو, بەم نیازە پەنام بۆ خزمەت برای گەورەمان کاك مەسعود هێناوە تا لەڕێگەی تایبەتی خۆیەوە بەرەو تورکیا دەربازمان بکات, بەلام تکام وایە تاشوێنمان ئاشکرا نەبووە بەزوترین کات کارەکەمان بۆ جێبەجێ بکەن. لەوەلامدا گوتیان: بەزوترین کات وەلامت دەدەینەوە. دوای دوو سەعات بەسەیارەی خودی کاك مەسعود ئێمەیان گواستەوەو بردیانینە بارەگای هاوینەهەواری م.س. لەوێ بەناوی ماڵی شێخ ناساندیانین. جێی باسە کەلەو ماوەیەدا خزمەتێکی زۆریان کردین, بەلام ئێمە لەڕاستیدا هەرچاوەڕێ بووین بۆ تورکیا بەڕێمان بکەن, خەڵکی گوندی ڕاژان هاتوچۆیان دەکردم, بەلام من نەمدەوەێرا سەردانی کەس بکەم نەوەك ئاشکرا ببم.

زۆر شەو لە سەعات نۆ بەدواوە سەردانی کاك عەلی عەبدوللام دەکرد. ماوەی چوار مانگ هەروا ماینەوە. تا ئێوارەیەك کاك ڕەنجبەری برازای مامۆستا عەلی عەبدوللا سەردانی کردین, گوتی: مامم سەلامت لێدەکاو منی ناردۆتە خزمەتت تا هەندێ قسەی ئەوت پێ ڕابگەیەنم, ئیمرۆ حاجی مستەفەوی لێپرسراوی ئیتلاعاتی ئازربایجانی غەربی لەبارەگای م.س. بوو, لەبەر ئەوەی بەفر ڕێگەی گرتووە نەهاتنە خزمەتت, ئێستا چاوەڕوان دەکەن تا ڕێگاکە پاکدەکرێتەوە بۆ ئەوەی بگەنە لات, یان تۆ بێیتە م.س. تا چاوت بەحاجی مستەفەوی بکەوێت, چونکە کۆماری ئیسلامی دەزانن تۆ لێرەیت بەلام نازانن بۆ زوير بوویو بڕیاریان داوە لەورمێ (ڕەزائیە) خانویەکی خۆشت بۆ تەرخان بکەنو چیت پێویستە بۆتی ئەنجام بدەن بۆ پشودان. گوتم: لەتاران, خەڵکی لەحاجی مستەفەوی گەلێك پایەبەرزترم بینیو لەخانویەك زیاتریان بۆ دەکردم,

بەلاّم ئامادە نەبووم دەست بخەمە ناو دەستیان. من پێویستم بەئێوە نییە ڕێگەی ئێرانم نیشانبدەن, بۆیە هانام بۆ ئیوە هێناوە چونکە باڵێکی سیاسی گەلی کوردن, تارزگارم بکەن نەك تەسلیم بەئێرانم بکەنەوەو بمکەن بەسیخوڕ, بەراستی چاوەڕوانی ئەوەم لەکاك مەسعود نەدەکرد. لەکۆتاییشدا پێم گوت: مامت چۆن چاوپۆشی لەوە دەکات لەژێر باڵی پارتیدا دژی گەلی کورد سیخوڕی بۆ ئێران بکەم؟ لەوەلاّمدا گوتی: من راسپێردراوم ئەوەت پێ رابگەیەنم، جەنابت بۆ لەمن توڕە دەبیت. کەوای گوت بۆم دەرکەوت کەمن زۆر بەتوڕەیی‌و گرژییەوە وەلاّمم داوەتەوەو زیاد لەپیویست دەنگم هەڵبڕیوە.

دوای ڕۆشتنی کاك ڕەنجبەر, بڕوام نەدەکرد ئەمە رای سەرکردایەتیی پارتی بێت, لەبەر خۆمەوە دەمگوت: دوور نییە ئەمە تەڵەی پاراستن بێ, یان دەسیسەی ئیتلاّعات بێ‌و لەڕێگای ڕەنجبەرەوە بێت. دوای گفتوگۆیەکی زۆر لەنێوان خۆماندا, بڕیارماندا کەخۆم سەردانی کاك عەلی عەبدوللاّ بکەم تا راستی ئەم هەواڵە تێبگەین. بۆ ئەم مەبەستە شەوی پاشتر، سەعات ٨,٣٠ گەیشتمە بارەگاکەی کاك عەلی, داوام لەپاسەوانەکان کرد بمبەنە لای. بەلاّم گوتیان نوستووە. کاتێك نزیك ژورەکەی بوومەوە ڕووناکی زۆرم بەدیکرد, بەلاّم کەپێیان گوت کاك ڕەفیق هاتووە ژورەکەی تاریك کرد. ئینجا بۆم ڕونبۆوە کەقسەکانی کاك ڕەنجبەر راستەو مامۆستا عەلیش هیچی پێ نییە تاکو لەگەڵمدا گفتوگۆ بکات. ناچار لەگەڵ بازیان‌و ڕەوەزی کوڕم گەڕاینەوە شوێنی حەوانەوەمان بۆ پشودان‌و لێدوان لەسەر ئەوەی چی بکەین باشە. سەرەتا بۆ پوچەڵکردنەوەی پیلانەکانی پاراستن‌و دەزگای ئیتلاّعاتی ئێرانی پەیوەندیم بەسەرۆك مسعودەوە بەهێزکرد ئەویش لەڕێگای راپۆرت نوسین دەربارەی بارودۆخی ئێستای کوردستان. هەفتانە دوو جار بۆچونی خۆمم ئاراستەدەکرد, تێیدا دڵسۆزی‌و فیداکاری خۆمم نیشاندەدا بەرامبەر بەپارتی‌و بنەماڵەو کۆماری ئیسلامی تا توانیم بڕوای پێبێنم کەنیازی چونە دەرەوەمان بۆ تورکیا نەماوە. لەو ماوەیەدا بەنهێنی لەگەڵ سێ کەسی گوندی راژان کۆبومەوە. باسی ئەوەم بۆ کردن کەچۆن بنەماڵەی بارزانی کوردستانیان تەسلیم بەئێران کردووە ئاواش نیازیانە من بەئێران بفرۆشن تا ببمە سیخوڕی ئێران. لەوەلاّمدا هەریەکیان ئامادەیی خۆی نیشاندا کەمن هەر کاتێك پێویستیم پێبێ تەواو یارمەتیم دەدەن. لەو ماوەیەدا پاراستن بڕوای تەواویان هێنابوو کەئێمە لەتواناماندا نییە لەراژانەوە بگەینە تورکیا چونکە دوو ئافرەتمان لەگەڵدایەو منیش تاقەتی ڕۆیشتنم بەناو بەفرو ناوچەی شاخاویدا نەماوە.

لەو ماوەیەدا کاك عومەر دەبابە هات بۆ راژان تا چاوی بەئەندامانی م.س. بکەوێت. لەو سەفەرەدا شەوێکیان سەردانیکردم, بارودۆخی خۆمم بۆ باسکردو داوام لێکرد کەلای سەرانی بنەماڵە بۆم تێبەکەوێت‌و بەوە قایلیان بکات کەبڕیارمداوە بۆ تورکیا سەفەر نەکەم. کاك عومەر لەم کارەدا سەرکەوتوبوو, گوتبووی کەرەفیق بەهۆی ناخۆشی ڕێگا نیازی نییە بچێت بۆ تورکیا. لەهەمانکاتدا ئامۆژگاریکردم کەناوچەکە بەرەو دەرەوەی سنووری ئێران بەجێ بهێڵم. هەر لەو ماوەیەدا زوو زوو چەند کەسێك سەردانیان دەکردم, کەلێرە تەنها دوو کەسیان باسدەکەم: یەکەمیان پاراستن بوو بەکاری تایبەتی خۆی دەهاتە لامان, دەنگوباسی دەوروبەری بۆ دەهێنام, لەهەمانکاتدا قسەکانمی دەکردە راپۆرت‌و بۆ سەروی خۆی دەنارد. کاتێك لەگەڵیدا دادەنیشتم باسی راپۆرتەکانی خۆمم بۆ دەکرد کەبۆ خودی مەسعودم دەنارد, دەمگوت: مەلامستەفای بارزانی کوردی بەجیهان ناساند, هەموو کورد دەبێ بەفەرمانی سەرۆك مسعود بجولێتەوە. هەروەها دەمگوت لەو ڕۆژەوە کاك نێچیرڤان بۆتە لێپرسراوی پاراستن هەموو جوڵەیەکی بەعس ئاشکرابووە. بەردەوام بەم جۆرە قسانە ئەو کادرەی پاراستم هەڵدەخەڵەتاند, لەهەمانکاتدا ڕێوشوێنم دادەڕشت بۆ هەڵهاتن بەرەو تورکیا لەدەست بنەماڵەی بارزانی و دەزگای ئیتلاّعاتی کۆماری ئیسلامی. دوایی بۆم دەرکەوت ئەو کابرایەی هەر بەناو کادرە, لەراستیدا پاراستنە, پاشان

ئاشکرابوو پەیوەندی بەبەعسیشەوە هەبوو. ئەم کابرایە لەسایەی پارتیدا ئازارو ئەشکەنجەی خەڵکی کوردو عەرەبی دەدا. لەساڵی ١٩٩٠ لەهەولێر هاتە لام گوتی کاك مسعود ناردومی, بەڵام من دەرگام لێنەکردەوە.

دووەم کەس پیاوێك بوو لەوانەی دڵسۆزی پارتی بون, ئەم پیاوە وای بۆ دەچوو کەهەتا بنەماڵەی بارزانی مابێت ئەوا کوردستان ئازاد نابێت. هەفتەی دوو جار سەردانی دەکردم, بەراستی زۆر جێی بڕواو متمانەم بوو, هەموو دەنگوباسو گۆڕانکاریەکانی پێم دەگەیاند بەتایبەتی ئەوانەی پەیوەندییان بەخۆمەوە هەبوو. لەبەر ئەوە داوام لێکرد سەردانەکانی کەم بکاتەوە مەگەر زۆر پێویست بێت. هەندێ جار بەشەو, ڕەوەز یاخود بازیانی کوڕمم دەنارد بۆ لای. ئێستا ئەم پیاوە لەهەولێرە. دوای ئەم ڕوداوو گیروگرفتانە سوپاس بۆ خوا لەدەستی کۆماری ئیسلامیو چەتەکانی بنەماڵەی بارزانی ڕزگارمان بوو, بەسەلامەتی گەیشتینە تورکیا ئەمەش بەهۆی سێ کوردی دڵسۆزی خەڵکی دێی ڕاژان. کەیەکێکیان گوتی ڕۆژی پێنج شەممەی داهاتوو زەماوەند دەکات, لەبەر ئەوە داوای لێکردم کەبازیانی کوڕمی لەگەڵدا بنێرم بۆ ئەوەی قسە لەگەڵ دایکی بکاتو گواستنەوەی بووك دوابخات. کاتێك من ڕەزامەندیم نیشانداو بازیان چوو بۆ ماڵی پیاوەکە, دایکی دەستی بۆ سنگی خۆی بردو بەکوڕەکەی گوت: شیری ئەم مەمکانەمت پێ حەرام بێت ئەگەر بەدڵو بەگیان یارمەتی ئەم ماڵە شێخە نەدەیت(لەوێ بەماڵی شێخ ناسرابووین)، ئەوەبوو بەپشتیوانی خواو بەهۆی یارمەتی ئەم کوردە خەمخۆرانە, بەسەلامەتی گەیشتینە سنوری کوردستانی خۆمان.

لێرەدا خوێنەری بەڕێز بۆی ڕوندەبێتەوە کەبۆچی لە١٩٩١/٣/١٣دا کاتێك مسعود پێی گوتم: (جەولەیەکەم بەدەستەوەیە لەکوردستان, پێم خۆشە لەگەڵمدا بیت, چونکە تۆ وەزیری دەستەڕاستەی ئایندەی). من لەوەڵامدا پێم گوتبوو: (دەبمە فەڕاش بەڵام لەگەڵتدا نایەم), چونکە ئەو بنەماڵەیە ئەگەر بتکەنە وەزیریش ئەوا هەر بەداگیرکەرانی گەلی کوردەوەت دەبەستنەوە. لەو ڕوداوەوە من بەیەکجاری دڵنیابوم کەئەم بنەماڵەیە ماهیەیان هەر ئەوەیە پیاوی داگیرکەران بنو سیخوڕییان بۆ بکەنو, هەر کاتێ خۆیان بوون بەکلکی داگیرکەران ئەوە گەلی کورد بەگشتی دەبێ لاساییان بکاتەوە, بۆیە لەبەر ئەوەی لەو کاتەدا خۆیان ئاڵقەلەگوێی ئیتلاعات بوون, قبوڵیان نەدەکرد کوردێك لەبەر بەرژەوەندی گەلی کورد ئامادە نەبێت بەقسەی تاران بکات.

## کۆمپانیا جیهانییەکانی نەوت لە پشت خیانەتی ٣١ ی ئابەوە بوون

قسەیەك هەیە دەڵێ سەلماندنی شتی ڕوون لەسەلماندنی شتی لێڵو تاریك قورسترە. ئەگەر ئەم قسەیە لەبواری فەلسەفەو فکردا ڕاستو تەواو بێ, ئەوا لەبواری سیاسەتدا تارادەیەکی زۆر ڕاست نییە. بۆیە ڕوداوە سیاسییەکان لەمێژوودا، بەشی هەرە زۆریان یەکلاکردنەوەو ئاشکراکردنی نهێنیەکانیان ئاسانە, بەمەرجێگ بەڕوحێکی بابەتییانەو بێلایەنە قسەی لەسەر بکەینو قسەکەر پێشوەخت هیچ بڕیارێکی لەسەر ڕوداوەکە نەدابێ تانوسینەکەی زۆرترین ڕاستی بگرێتە خۆیو دوور بێ لەسۆزر عاتیفە.

ئەمڕۆ زیاتر لەچوار ساڵ بەسەر ترسناکترین وگەورەترین ڕووداودا ڕۆیشتووە لەکوردستانی پاش ڕاپەڕین, یان ڕاستتر وایە بڵێم ترسناکترین ڕوداوو هەڕەشە لەدوای ئاشبەتاڵەوە کەڕوبەڕوی گەلەکەمانو شۆڕشەکەی بۆتەوە کەئەوەیش خیانەتی گەورەی ٣١ی ئابە. ئەگەر ئێمە بمانەوێ مێژووی خەباتو ڕزگاریی گەلەکەمان لەسەر بنەمای ڕوداوی گەورەو مەزن پۆلێن بکەینو, هەر ڕوداوە بکەینە سەرەتای قۆناغێکیتر, هەروەکو چۆن ١٩٩١/٣/٥ یەکەم ڕۆژی ڕاپەڕینەو

سەرەتای قۆناغێکی نوێیە بەبەراورد لەگەڵ ٣/٤ی هەمان ساڵدا, ئەوا بەهەمان شێوە, پێم وایە کە لە ٣١ی ئابەوە قۆناغێکی نوێو جیاواز هاتە کایەوە, قۆناغێك کەپێویست دەکا لەسەر هەموو کوردێكو هەموو مرۆڤدۆستێك بەخۆیدا بچێتەوەو بیربکاتەوە کە ٣١یئاب بۆ؟! گەلێك کە لەراپەرینێکی جەماوەری بێوێنەدا, هەموو دامودەزگاکانی بەعسی لەماوەیەکی کورتدا تێکشکاندو لەبری دکتاتۆریەتو تەعریبو تەبعیسو راگواستن, دروشمی ئازادی بەرزکردەوە, گەلێکی ئاوا چۆن قبوڵ ئەوە دەکا یەکێك لەحزبە گەورەکانی, لەو حزبانەی کە لەهەڵبژاردنێکی ئازاددا نیوەی دەنگەکانی بەدەستهێنا, چۆن قبوڵی دەکا هەمان ئەو تانكو سەربازانەی بەگژدا بکاتەوە کە تادوێنێ گوندەکانی دەرووخاندو شارەکانی کاول دەکرد ؟! ئەی چۆن حزبێك, گوایە دۆستو لایەنگرو ئەندامانی لەسەر بنەمای کوردایەتی کۆکردۆتەوەو کار بۆ رزگاری نەتەوەیی دەکا, لەهەمانکاتدا سوپاسی دڕندەترینو سەرسەختترین دوژمنی گەلەکەی دەکا؟! ئەی ئەو حزبانەی بەقسەو رۆژنامەو راگەیاندنیان، موزایەدە بەسەر جەماوەرەوە دەکەنو خۆیان بەدوژمنی سەرسەختی صدام دەناسێنن, بە چ بیانوو چ پاساوێك وەڵامی ئەو خیانەتە بێوێنەیە لەمێژووی گەلەکەماندا دەدەنەوە؟! نازانم دەبێ وەڵامی ئەو هەموو مەلاو شێخە لەرۆژی قیامەتدا بەرامبەر خوای گەورە چی بێ کاتێك پێیان دەڵێ بۆ بەم ئایەتەتان نەکرد ﴿ما لکم لا تقاتلون في سبيل الله والمستضعفين في الارض﴾؟ ئەدی رۆشنبیرە بێدەنگەکان, ئەوانەی ئامادەن لەسەر وردودرشتی باسەکان قسە بکەنو گۆڤار دەربکەنو کتێب بنوسن, ئەوانە چۆن لەبەردەم ئەو روداوە گەورەیە قەراقۆپی لێدەکەن؟ حاڵی ئەوانە بەراستی وەکو چیرۆکی پیرێژنەکەو ئەفلاتون وایە کەدەگێرنەوە گوایە رۆژێکیان پیرێژنێك بەلای چاڵێکدا دەڕوا, دەبینێ پیاوێك کەوتۆتە چاڵەکەوە, پیاوەکە دەستی بۆ درێژ دەکاو داوای یارمەتی لێدەکا, لەو کاتەدا پیرێژنەکە لێی دەپرسێ تۆ ئەفلاتونی فەیلەسوف نیت؟ ئەویش دەڵێ: بەڵێ. پیرێژنەکە پێدەکەنێو دەڵێ: تۆ لافی ئەوە لێدەدەی شت دەربارەی فەلەكو ئاسمان دەزانی بەڵام ئاگات لەژێر پێی خۆت نییە! بۆیە دەڕواو جێی دێڵێ. ئەو چاڵە کەدوژمنانی گەل لەرێگای حزبی بنەماڵەوە لە ٣١ی ئابدا بۆ گەلەکەمانیان نایەوە, ئەوەندە گەورەبوو کەهەر ئەموئەوی نەدەگرتەوە, بەڵکو منو تۆشو هەموو کوردێکی نیشتیمانپەروەرو هەموو عێراقییەکی شۆڕشگێری دەگرتەوە. چونکە لەراستیدا ئەم کارەساتە تاکتیکێك نەبوو پارتی لەبەرامبەر یەکێتیدا بیکات بۆ ئەوەی هەولێر بخاتەوە ژێر کۆنترۆڵی خۆی, بەڵکو ئاشبەتاڵێکی ئاشکرابوو لەسەر هەمان شێوەی ١٩٧٥, بەڵام ئەمجارەیان زەمەنەکە گۆڕابوو, حزبە شۆڕشگێڕەکان نەیانهێشت ئەوپیلانە سەربگرێ.

من وەکو بێلایەنێکی کوردو کەسێکی بەئەزمونو خاوەن مێژوویەکی دووردرێژ لەگەڵ بنەماڵەدا, بەئەرکی سەرشانی خۆم زانی کەراوبۆچونی خۆمو هەڵوێستم لەم نوسینەدا بخەمەڕوو, چونکە هیچ شتێك لەوە ترسناکتر نییە گەلێك, کارەساتو خیانەتو دوژمنەکانی خۆی لەبیر بکات, تا رادەی ئەوەی بەلایەوە گرنگ نەبێ بزانێ پێشکەوتنی تانكو زرێپۆشی دوژمن یانی چیو سوپاسکردنی بکوژی گەلێك چ واتەیەکی هەیە ؟

سەرەتا پێم باشە بەسادەترینو ناڕاسترین لێکدانەوە بۆ خیانەتی هەرە گەورەی ٣١ی ئاب دەست پێبکەمو بیکەمە دەروازەی چونە ناو باسەکەوە, ئەویش ئەو رایەیە کەژمارەیەك خەڵکی سیاسیو بەناو رۆشنبیر بەردەوام دووبارەی دەکەنەوە گوایە ئەم خیانەتە, ئەنجامێکی راستەوخۆی شەڕی ناوخۆیەو, بنەماڵە لەوپەڕی ناچاریدا پەنای بۆ بەعس برد. ئەم رایە، پێش هەموو شتێك هەڵاتنە لەهەڵوێستو خۆدزینەوەیەکی ئاشکرایە لەبەرپرسیاریەتیی مێژوویيو خۆشاردنەوەیە لەجەماوەر چونکە بەغداو بەعس تاکە رێگای بەردەمی بنەماڵە نەبوو, بەڵکو دەکرا رێگای قەڵاو منارەیان بۆ ئاشتیو رێکەوتن گرتبا, هەمووشمان باش دەزانین کەبنەماڵە ئەم شەڕەی کە لەساڵی١٩٩٤دا هەڵگیرساند لەپێناوی پارەی ئیبراهیم خەلیلدابوو نەك شتیتر. بنەماڵە، ئەو کاتەو ئێستاش ئەگەر بیەوێ شەڕ رابگرێو ئاشتی بۆ ناو ماڵی کورد بگێڕێتەوە ئەوە

دەکرێ بەیەك بڕیار ئەم کارە بکا, گەڕانەوەی داهاتی گەل بۆ هەموو حزبەکانی گەلو وازهێنان لەجاشایەتی بۆ ئەم وئەوی بێگانە. بۆیە من لەهەموو ئەوانە دەپرسم کەبەو بیانووە خۆیان لەهەڵوێستی نیشتیمانی دەدزنەوە, بۆچی لەئاست شەڕی ناوخۆدا هەڵوێستیان نەبوو؟ بۆچی زوو رێگەتان لەو شەڕە نەگرتو هەوڵی جددیتان بۆ ئاشتی نەدا؟ ئەو لایەنەش کەئامادە نەبوو شەڕ رابگرێ, بۆچی بۆ خەڵکتان ئاشکرا نەکردو دوژمنایەتیتان لەدژی رانەگەیاند بەپێی ئەم ئایەتە پیرۆزەی دەفەرموێت ﴿وأن طائفتان من المؤمنين اقتتلوا فأصلحوا بينهما, فأن بغت احداهما على الاخرى فقاتلوا التى تبغي ﴾؟ بەڵام لەراستییدا ئەم حزبانە بەتایبەت ئیسلامییەکان نەك هەر وایان نەکرد, بەڵکو گەورەترین قازانجیان لەدرێژبونەوەی شەڕەکەدابوو, چونکە لەکاتێکدا دوو حزبە گەورەکەی کوردستان بەیەکترەوە سەرقاڵ بوون, ئەوان بەرنامەی خۆیان دادەڕشتو بەئارەزووی خۆیان تەڕاتێنیان دەکرد. جیا لەوەی کەخودی شەڕەکە بۆ ئەوان زۆر پێویست بوو تا خەڵکی لەکوردایەتی ساردبکەنەوەو لەناو حزبی ئیسلامیدا بیانتوێننەوە, گوایە حزبی ئیسلامی, ئاشتیخوازەو گەل لەشەڕ دەپارێزێ. لەکاتێکدا حزبە ئیسلامیەکانی ئەفغانستان داروبەردی ئەم وڵاتەیان بەسەر یەکتریدا رووخاند. بۆیە ئەوان ئەگەر راست دەکەن دەبو هەر سەرەتا رێگەیان لەو شەڕە گرتبا یان هەڵوێستیان لەبەرامبەر لایەنی شەڕخواز بووبا. ئەگەر بیانویان ئەوەبێ ئێستا نازانن کێ شەڕی هەڵگیرساندو کێ رایناگرت, خۆ روونو ئاشکرایە کەئەم شەڕە بۆ درێژەی کێشاو بنەماڵە چۆن دەسبەرداری پارەی ئەم گەلە نابن ! شەڕی ناوخۆ لەنێوان دوو حزبی شۆڕشگێڕی نەتەوەییدا تارادەیەك سروشتییە, بەمەرجێك هیچیان کار بۆ دژایەتی بەرژەوەندییە نەتەوەییە باڵاکان نەکات. هەر لەکوردستانی خۆماندا حزبی دیموکراتو کۆمەڵی کۆمۆنیستی ئێرانی ماوەیەکی دوورودرێژ شەڕیان بوو, بەڵام هیچیان بیریان لەوە نەکردەوە دژی ئەوی تر پەنا بۆ تاران بەرن, لەکاتێکدا هیچ رژێمێك بەئەندازەی بەعسی عیراقو خودی صەدام بەرامبەر گەلی کورد دوژمنکار نییە, ئەنفالو کیمیابارانو تەعریبو تەبعیسو راگواستن لەهیچ ناوچەیەکی‌تری کوردنشین بەو شێوەیەی کوردستانی باشور, لەمێژوودا روینەداوە. رای دووەم کە لەهی یەکەم ساکارترە ئەوەیە کەدەڵێ تانكو گاردی کۆماری کەهێرشیان کردەسەر کوردستانو یەکێتی, وەڵامی هێرشی ئێران بوو بۆ سەر کۆیەو حزبی دیموکرات. ئەم رایە گەرچی بەراوردو خاڵی هاوشێوەی تێدایە بەڵام لەراستیدا هیچ بنەمایەکی تۆکمەی نییەو, وەکو ئەوە وایە بڵێی صەدامو ماندێلا وەکو یەك وان, چونکە دەیەها خاڵی هاوبەشیان هەیە. بۆ ئەم رایە جگەلەوەی ئەوەندەی تۆزقاڵێك راستی تێدا نییە, لەهەمانکاتدا گاڵتەکردنە بەعەقڵی خەڵك, کورد گوتەنی درۆیەکی شاخدارە چونکە:

١. لەشکری ئێران لەسەر داوای یەکێتی پەلاماری دیموکراتی نەداو بۆیە لەبری سوپاسکردنی سەرۆکی ئێرانی و, مسعود کردی بەرامبەر صەدام بەشی هەرەزۆری سەرکردایەتی و کادیرەکانی یەکێتی ئیدانەی هەڵوێستی کۆماری ئیسلامییان کرد.

٢. وەکو پێشتر باسمانکرد یەکێتی زوو حزبی دیموکراتی لەو هێرشەی کۆماری ئیسلامی ئاگادارکردەوە.

٣. پێشمەرگەی یەکێتی نەك هەر هاوکاریی ئەو لەشکرکێشیەیان نەکردو پێشی نەکەوتن،
بەڵکو کۆمەکی حزبی دیموکراتیان کرد.

٤. لەشکری ئێران, نە کوردی ئەنفال کردووە نە کیمیابارانی شارەکانی کردووە نە دێیەکانی رووخاندوە نە وەکو لەشکری صەدام، دڕندەو داخ لەدڵە بەرامبەر بەکورد.

٥. لەشکری ئێران لەهەموو حاڵەتێکدا لەکوردستانی عیراقدا بێگانەیە بۆیە بەزووترین کات پاشەکشەی کرد.

٦. ئێران پەلاماری یەك ناوچەی دیاریکراو و بچووکیداو لەدوورەوە بۆردومانی کرد.

٧. هیچ کات یەکێتی شانازی بەو کارە نەکردووە بەڵام پارتی نەك هەر شانازی بە٣١ی ئابەوە دەکات, بەڵکو هەموو ساڵێك لەیادی ئەو رۆژە شومەدا ئاهەنگ دەگێڕێ.

٨. وەکو ئاماژەمان پێدا زیانی حزبی دیمەکرات, تەنها دوو مریشك و رووخانی دوو سێ خانوو بوو, لەکاتێکدا گەلی کورد بەهۆی خیانەتی ٣١ی ئابەوە پەرلەمانو پایتەختو سەدەها پێشمەرگەی قارەمانی لەدەستدا, جگە لەوەی لەدەرەوە کوردی خستە هەڵوێستێکی شەرمنەوە, سەرۆکی دووەم حزبی کوردستان کە لەهەڵبژاردنی پەرلەماندا (گوایە) زۆرینەی دەنگی بەدەستهێنابوو, سوپاسی صەدامی کرد بۆ ئەو هاوکارییە بێوێنەیە لەگەڵ گەلی کورددا بۆ دەرپەڕاندنی حزبو دامودەزگای هەزاران شەهیدی رێگای رزگاری. بۆیە ئەوانەی لەو خیانەتە گەورەیە بێدەنگ بوونو نەوێران قسە بکەن, ئەوا با خۆیان بۆ مێژوو هەڵبگرن, چونکە مێژوو نەك هەر بەزەیی بەکەسدا نایەتەوە بەڵکو هەموو ئەوانە ریسوا دەکا کە لەسەر گەلەکەیان بەدەنگ نەهاتوون ئیتر بەهەر بیانویەك بێ, بنەماڵەش بەهەر بیانویەك پێش تانکەکانی گاردی کۆماری کەوتبوون ئێستا هەر پاساوێکی بۆ بێننەوە, لەسوکایەتیو ریسوایی زیاتر بۆیان نانوسرێ با هەموو ئەوانەش کەبێدەنگ بون لەترسان وەکو وشترمەل سەریان خستۆتە ناو چاڵەوەو لاشەیان بەدەرەوەیە, با باش بزانن ئەگەر ئەوان پەیوەندییان بەشەڕو خیانەتیشەوە نەبێ ئەوە دەرئەنجام شەڕو خیانەت ئەوانیش دەگرێتەوە, ئاگری گەورەش تەڕو وشك جیا ناکاتەوە.

بەرلەوەی بچینە ناو وردەکاریی بۆچوونەکانم لەسەر خیانەتی ٣١ی ئاب, با خوێنەری بەرێز بزانێ کەمن ئەو کارەساتە بەبەرنامەیەکی گەورەتر دەزانم لەوەی کەتاکتیکێکی پارتی بێ بۆ گرتنەوەی هەولێرو دەرپەڕاندنی یەکێتی, بەڵکو ئەم کارەساتە بەشێکە لەسیاسەتە نەگریسەکانی کۆمپانیا نەوتیە گەورەکانی جیهان کە لەلایەن پێنج دەوڵتە هەمیشە ئەندامەکانی نەتەوە یەگرتووەکانەوە سەرپەرشتی دەکرێن, بەتایبەتی ئەمریکاو بەریتانیا جونکە ئەم وڵاتانە بڕیاریانداوە کە بەهیچ جۆریك نابێ بیرە نەوتەکانی کەرکوك بکەوێتە ژێر دەسەڵاتی کوردی, هەر بۆیە دوای شەڕی دووەمی کەنداو و تێکشکانی لەشکری عێراق لەبەرامبەر هێزەکانی هاوپەیمانان بەسەرپەرشتی ئەمریکا, لەچوارچێوەی سەپاندنی مەرج بەسەر رژێمی عێراقدا هێڵی ٣٦یان دانا, کەبەشی هەرە گرنگو دەوڵەمەندی کوردستانی باشووری نەگرتەوە, بەو پێیەی ناڕاستەوخۆ دەسەڵاتی تەواوی خواروی هێڵی ٣٦یان بۆ رژێمی بەعسی رەفتارفاشی چۆڵکرد بۆ ئەوەی بەئارەزووی خۆی درێژە بەسیاسەتە دوژمنکاریەکانی دژی کورد بدا, لەتەعریب و تەبعیسو راگواستن, بەتایبەت لەناوچەکانی کەرکوك, شێخان, شنگارو تەلەعفەر.

هەر لەو چوارچێوەیەدا, ئێستا کۆمپانیاکانی نەوت بەهاوکاری C.I.Aو مۆساد پرۆژەیەکی گەورەتریان بەدەستەوەیەو کاری پێدەکەن, ئەویش نیشتەجێکردنی ئاوارە فەلەستینیەکانە لەو ناوچەیە لەبەرچاوی نەتەوەیەکگرتووەکان و بەئاگاداری خودی کوفی ئەنان ئەگەرچی ئەم پلانە لەرووە سیاسییەکەیدا، بەبەرژەوەندی ئیسرائیلو ئەمەریکاو خودی رژێمی عێراق کۆتایی دێت, بەڵام لەرووی ئابوریەوە کۆمپانیا گەورەکانی نەوت بەم کارە دەتوانن چواردەوری بیرەنەوتەکان مینڕێژ بکەن تا پێی کورد پێیان نەگات, بەم شێوەیە خۆیان لەمەترسی لەدەستدانی ئەو ناوچە هەرەدەوڵەمەندەی نەوت لەجیهاندا دەپارێزن. سەرەتای هەستکردنی ئەم کۆمپانیایانەش بەمەترسیی گەشەکردنو فراوانبونی دەسەڵاتی کوردی بۆ نزیك بیرە نەوتەکان, بۆ ئاداری ساڵی ١٩٩٥ دەگەڕێتەوە, کاتێك ی.ن.ك. بەهاوکاری حزبی شیوعیو پارێزگارانو زەحمەتکێشانو سۆسیالستو INC (کۆنگرەی عێراقی), پەلاماری رژێمی بەغدایان دا لەسنوورەکانی تەماس، کۆمپانیاکانی نەوت پاش ئەو پەلامارەو سەرکەوتنی لەزۆر قۆڵداو تێکشکانو کوژرانی ژمارەیەکی زۆر لەسوپای عێراق لەم سنوورانە بۆیان رونبۆوە کەئەگەر لەبەغدای پایتەختدا هەر گۆڕانێکی چاوەڕوانکراو رووبدا, ئەوە هێزە کوردییەکان بەئاسانی دەتوانن دەست بەسەر

بیرە نەوتەکاندا بگرن و بەهۆی کوردبوون و کوردنشینیی ناوچەکە, لەو ناوەدا بمێننەوە کەدواجار ئەوان دەوڵەمەندترین سەرچاوەی نەوتیان لەدەست دەردەچێ و دوچاری زیانی گەورە دەبن بەتایبەتی دوای ئەوەی کەیەکێتی توانی, پارتی لەهەولێر دەرپەڕێنێ و تەرازووی هێز لەناوچەکەدا بەبەرژەوەندی خۆی لاسەنگ بکات. دوای ئەوەی نەتوانرا هێزی کوردی تێك بشکێنرێ, لەلایەن رژیمی تورکیاو بەتایبەت دیکتاتۆر صەدامەوە بەچەك و جبەخانەو پارەو زانیاری, یارمەتی زۆری بنەماڵە کرا. هەرچەندە سەرەتا خەڵك ئەم قسانەی بەپروپاگەندەی حزبی وەردەگرت, بەڵام دوای ٣١ی ئاب و هاتنی لەشکری تورکیا لە ١٩٩٦ بۆ کۆمەکی بنەماڵە, بۆ هەموو خەڵك ئاشکرابوو کەبنەماڵە پیاوی بێگانەن. ئەو بارودۆخە ناهەموارەی کەبنەماڵە بەدەستی خۆی بۆ خۆی دورستکردبوو, بەجۆریك کەدڵنیابوون ناتوانن بەشەڕ هەولێر بگرنەوە ئەگەر پشت بەهێزی بێگانە نەبەستن, یەکێتیش مەرجی گەڕانەوەی پارتی بۆ هەولێر بەئاشتی بەبێ شەڕ, ئەوەبوو کەبنەماڵە داهاتی ئیبراهیم خەلیل بخاتەوە ژێر دەسەڵاتی پەرلەمان و حکومەتی شەرعی کە لەهەڵبژاردنێکی جەماوەریدا هەڵبژێردرابوو. بۆیە بنەماڵە هەمان ڕێگەی ڕێککەوتننامەی جەزائیری گرتەبەر بۆ بەرژەوەندیی تایبەتی خۆیان. ئەم کارە تەنها مەسعود بارزانی و نێچیر بەبەرنامەکەی ئاگاداربوون و ئەم دوانە, لەهەموو کۆبونەوەیەکی تایبەتییان لەگەڵ کادرانی پارتیدا جەختیان دەکردەسەر ئەوەی کەپارتی ناتوانی بەشەڕ هەولێر بگرێتەوە, کەئەمە بۆ خۆی ڕێگا خۆشکەربوو بۆ پەنابردن بۆ لەشکری سەدام.

لەهەمانکاتدا لەڕێگای پیاوە تایبەتیەکانیانەوە بەنهێنی پەیوەندییان لەگەڵ ڕژێمدا توندکردو لەکاتی گونجاو دەگەڕان بۆ ئەم کارە, کەنەك هەر کادرەکانی پارتی پێی ئاگادار نەبوون بەڵکو زۆر لەئەندامانی م.س. سەرکردایەتی چاوەڕوانییان نەدەکرد, کەپێشتر روونمکردەوە بەڕێز عەلی عەبدوڵلا، کەلێم پرسی بۆچی ئەم کارەتانکردوەو لەگەڵ لەشکری بەعسدا دژی کورد ڕێککەوتن؟ بەدەست پانکردنەوە تێی گەیاندم کەبێدەسەڵاتەو ئاگای لەو پلانە نەبووە, لەکاتێکدا نزیکەی شەش مانگ دوای ڕاپەڕینەکەی بەهاری ١٩٩١ کاتێك کەبینیم, دووبەدوو دەستمانکرد بەقسە, فەرمانی بەپاسەوانەکە کرد نەهێلێ کەس بێتە ژوورەوە, لەوەڵامی پرسیارێکدا ئەوەم بۆ باسکرد کە لە ١٩٩١دا لەقەزای دیانا چیم بەمەسعود گوت, عەلی عەبدوڵلا گوتی: بارودۆخی ئێستای کورد بەتایبەتی ئێمەی پارتی چۆن هەڵدەسەنگێنی و ڕات چیە؟ گوتم: ئایا ئێوە ئامادەن لەگەڵ یەکێتی ببنە یەك حزب؟ گوتی: نەخێر گوتم: کەواتە دواڕۆژ بەجۆرێك لەکەمی دەدەن کەبەرامبەر یەکێتی نامێنن.

کاتێك کاك مەسعود لەبەغدا گفتوگۆی دەکرد, من لەراژان بەبروسکە بەجفرە ئاگادارمکرد کە لەگەڵ سەدام ڕێکبکەوە. بەڵام ئەوەی لەساڵی ١٩٩١دا روویدا مانای ئەوە نیە کاك عەلی عەبدوڵلا مەبەستی بوبێ کوردستان تەسلیم بەدکتاتۆری بەعس بکرێتەوە, بەڵکو ئەو تەنیا مەبەستی ئەوەبوو کەگەلی کورد لەهێرشی سەدام بپارێزێ و پێشوەخت لەگەڵیدا ڕێکبکەوین. بەڵام ئەوەی لە ٣١ی ئابدا روویدا تەنها بۆ پاراستنی کورسیی بنەماڵەو خودی مەسعودو نێچیر بوو کە لەئەنجامدا تەنها گەلی کورد زیانی پێکەوت.

بەرای من لەزەمینەخۆشکردن و ئاسانکاری و جێبەجێکردن و سەرخستنی ئەم پیلانە گڵاوە دژی گەلی کورد, چەند دەوڵەت و کەسایەتیەك بەشداربوون, لەوانە:

**تورکیا:** ئەم دەوڵەتە بەردەوام پەیوەندی توندوتۆڵی لەگەل بنەماڵەدا هەبوو, هیچ کێشەیەکی لەگەڵ پارتیدا نەبوو ئەوە نەبێ کەیەکێتی ڕۆژبەڕۆژ گەورەتر دەبێ بەتایبەتی دوای گرتنی هەولێر, کەئەمەش مەترسی بوو بۆ سەر تورکیاو بەکرێگیراوەکانی میت لەهەولێرو ناوچەکانیتر. تورکمانەکانی هەولێریش نەیاندەتوانی وەکو جاران کۆمەکی میت و

حکومەتی تورکیا بکەن بۆیە تورکیا مەبەستی بو دووبارە بنەماڵە بێتەوە هەولێر بۆ پاکتاوکردنی کادرەکانی PKK و دوورخستنەوەی مەترسی.

**سوریا:** هەرچەندە دۆستایەتییەکی دێرینی لەگەڵ یەکێتیدا هەیە بەڵام پاش کۆنترۆڵکردنی هەولێر، ئەوان دەترسان ئەو تێکچوونەی تەرازووی هێزەکانی کوردستانی باشوور، خراپ بەسەر بەرژەوەندییە نەتەوەییە عەرەبیەکانیاندا بشکێتەوەو، دەترسان لەبەرەوپێشچونی یەکێتی رووەو ناوچەکانیتری پارتی لەنزیك سنووری سوریا ئینجا پەشێوی‌و ئاڵۆزی، ناوچە سەرسنووریەکان دابگرێ.

**ئێران:** ئەوانیش لەگەڵ تێکچوونی تەرازوی هێزدا نەبوون. ئێران سەرنەکەوتنی هێرشەکەی بۆ سەر دیموکرات بەدەستی یەکێتی دەزانی، دڵنیابوو لەوەی ئەگەر یەکێتی بکەوێتە سەر پێ‌و پێویستی بەئێران نەمێنێ، ئەوا نەك هەر رێ لەلەشکری ئێران دەگرێ بەڵکو خۆشی بەشداری دەکا لەسەرخستنی شۆڕشی کورد لەئێران. بەڵام هەرچی بنەماڵەیە
ئەوە لەگەڵ حزبی دیموکرات‌و ئۆپۆزسیۆنی کوردی رۆژهەڵاتدا، خوێن لەنێوانیاندایە.

نابێ ئەوەشمان بیر بچێت کەئەو سێ دەوڵەتە، لەو ماوەیەدا پێکەوە هەرچەند مانگ جارێك لەیەکێك لەپایتەختەکانی دیمەشق، تاران، ئەستەمبوڵ کۆدەبونەوە بۆ رێککەوتن لەسەر هەلومەرجی کورد لەعێراق و لەدوای ۳۱ی ئابەوە ئەم کۆبونەوانە کۆتاییان پێهات!! ئەمەش پاش ئەوەی رووداوەکان بەبەرژەوەندی ئەوان کۆتاییان هات.

**عێراق:** پاش تێکشکانی گەورەی عێراق لەکوێت، رژێم تا ۳۱ی ئاب نەیتوانی هیچ سەرکەوتنێك بەدەست بێنێ، بۆیە ئەم رووداوە بۆ لەشکرو رژێمی عێراق بەسەرکەوتنێکی گەورە تۆمارکرا. جگەلەوەی رژێم لەرێگای بنەماڵەوە توانی کێشەی کورد، کەچوبوە قاڵبی ئینسانیەوەو لەهەموو وڵاتە دەسەڵاتدارەکانی جیهان قسەی لەسەر دەکرا، توانی بچوکی بکاتەوەو پەیامێك بەجیهان‌و گەلی خێرنەدیوی عێراق بگەیێنێ‌و بڵێ ئێمە هەرکات بمانەوێ کوردستان دەخەینەوە ژێر دەسەڵاتی خۆمان. هەروەها ئەم رژێمە پاش ئەوەی ئەمریکا گلۆپی سەوزی بۆ داگیرساند بۆ پێشڕەویکردن بۆ هەولێر، وایزانی ئەمە سەرەتایەکی تازەیە لەدووبارە پەیوەندیکردنەوە بەئەمریکا. جگە لەهەموو ئەوانە، رژێمی بەعس بەم کارەی دەسکەوتی گەورەی بوو، توانی بارەگاکانی ئۆپۆزسیۆنی عێراق لەهەولێر تاڵان بکاو ئەندامەکانیان بکوژێ یان دەستگیریان بکاو بەرەو بەغدا بیانبا.

**مەسعود بارزانی و بنەماڵە:** ئەم لایەنە کەپەیوەندی راستەوخۆی بەو رووداوە هەبوو، ماوەیەکی زۆر بەر لەرووداوەکە لەرێگای راگەیاندن‌و کادرەکانیانەوە زەمینەسازی بۆ دەکرد، کاتێك دەیانگوت یەکێتیی بەپاڵشتی ئێران‌و بەهاوکاری هێزی بەدر، نیازیانە لەهەولێرەوە پەلاماری پارتی بدەن‌و هاواریان دەکرد هەولێر بۆتە لانکەی ئیتلاعات‌و سوپاکانی ئۆپۆزسیۆنی عێراق. لەو کاتەدا دەبوو یەکێتی هەر زوو بیزانیایە کەپارتی بەم قسانە دەیەوێ شەرعیەت بەپلانێکی گەورە بدا، بەڵام سەرکردایەتی یەکێتی نەیتوانی وەك پێویست لەو بارودۆخە بگەن، بەڵکو ئەوانیش بەبێ ئەوەی بزانن کەوتنە داوی دوژمنەوە، هەموو راگەیاندنەکانیان لەبارەی هاوکاریکردنی رژێمی بەعس‌و بنەماڵە، وەکو پروپاگەندە تەماشاکرد. هەر لەوماوەیەدا مام جەلال لەسەر تەلەفزیۆن بەئاشکرا هەرەشەی لەرژێمی عێراق دەکردو بەچقڵی دەچواندو دەیگوت پارتی دەبێ بەدووربین سەیری هەولێر بەکات‌و
لەمەولا فاتحە بۆ پارتی دەخوێنین.

ئەم قسانە, گەرچی پرۆپاگندەی سیاسی بوو, بەڵام پارتی بۆ جێبەجێکردنی پلانەکەی کەڵکی لێبینی. هەر بۆیە مەسعود بارزانی دەستیکرد بەداڕشتنی بەرنامەی چۆنیەتیی جێبەجێکردنی پلانەکە کەزۆر بەنهێنی بوو. لەبەرەبەیانی ئەو رۆژە شومەدا کەهێشتا خەڵکی قەڵاو منارە لەشیرین خەودابوون, بەدەنگی تۆپ خەبەریان بۆوە, کەپێشتر ماڵی ئێمە لەعەنکاوە بەیانیان بەزەنگی کەنیسە هەڵدەستاین. لەسەعات ١٠دا دەنگی زنجیرو گرمەی تانکەکانی گاردی کۆماری لەهەموو هەولێر هەڵدەستا, پەشێوی‌و ئاڵۆزییەکی وا کەوتەوە کەدزی‌و جەردەیی ئاوا لەهەولێر مەگەر تەنها هۆلاکۆ لە لەشکرکێشییەکەیدا بۆ سەر ئەم شارە, لەگەڵ خۆیدا هێنابێ.

فەرمایشتە جوانەکەی مامۆستا خورشید شێرە کە لە١٩٩٦/٨/٣٠ لەهاوینەهەواری سەلاحەدیندا گوتبووی, وەکو خۆی‌و بەزیادەوە کرا, کاتێك بەلەشکرەکەی راگەیاندبوو (سبەی لەهەولێر چیتان دەسکەوت هەتاکو ٧٢ سەعاتی‌تر, سەر بۆ ئێمەو ماڵ بۆ ئێوە).

جێی باسە بنەماڵەی بارزانی ئەوەندە داخ لەدڵو تووڕەبوون لەخەڵکی بەشەرەفی شاری هەولێر, سەرەتا ویستیان هەموو شوێنێك تالانبکەن بێگوێدانە هیچ دابونەریتێکی کوردەواری. بۆ نمونە: فەرمانیاندا بەتالانکردنی کتێبخانەو ئەرشیفە دەوڵەمەندەکەی مامۆستا رەشاد موفتی کەچەندین دەستنووسی بایەخداری تێدابوو. بەڵام خۆشبەختانە ئەو کەسەی جێبەجێکردنی فەرمانەکەی پێسپێردرابوو, ویژدانی رێگەی نەدا لەم تاوانە بەشداربێت بۆیە هەر زوو کەسوکاری مامۆستا رەشادی ئاگادارکردەوە بۆ ئەوەی ئەرشیفەکە بگوازنەوەو لەتالانکردن بیپارێزن. بنەماڵە, لەتالانکردنی کتێبخانەو ئەرشیفی مامۆستا رەشاددا مەبەستیان کەڵك وەرگرتن نەبوو لەو دەستنوسانە, بەڵکو تەنها مەبەستیان تالانکردن بوو, چونکە کاك عەدنان موفتی کوڕی مامۆستا رەشاد, دوای ئەوەی بوو بەلێپرسراوی مەڵبەندی ٣ی هەولێر توانی کاریگەری زۆر لەسەر هەموو دانیشتوانی هەولێر دابنێت‌و خەڵکی ئەو دەڤەرە زیاتر لەپارتی دووربخاتەوەو خزمەتێکی زۆری یەکێتی بکات. ئەوەی یارمەتی کاك عەدنان موفتیدا لەو کارەیدا سەرکەوتوبێت, جگە لەکارامەیی‌و دەستپاکی‌و لێهاتویی, ناوبانگ و رێزو خۆشەویستی بێسنووری بنەماڵەکەیان بوو لەهەولێر.

ئەوەی لە ٣١ی ئابدا بینیم نانووسرێت وناگوترێت, هاولاتیان سەریان سوڕمابوو کەچۆن لەشکری بەعسی فاشی بەسەرۆکایەتی قوسەی‌و بەهاوکاری بنەماڵە, توانی پەلاماری هەولێر بداتو پەرلەمانو هەموو وەزارەتەکان تالان بکا. یەکەم رۆژ کونجی ماڵم گرتو دەستمکرد بەسووڕاندنی میلی رادیۆکە, بەڵام بەبێ ئەوەی هیچ ببیستم کەدڵم خۆشبکا. بەیانی رۆژی ١٩٩٦/٩/١ لە ماڵ هاتمە دەرەوە گەیشتمە بارەگای م.س. یەکێتی, بینیم هەمووی تالانکراوە, لەحەوشەکەدا چەند تانکێك ئالای زەردیان هەڵدابوو, چەند سەربازێکی عەرەب لەگەڵ ئەفسەرێك وەستابوون کەخەڵك بەچاوێکی سەیر تەماشایان دەکردن, چواردەوریان بەچەکداری جلوبەرگ کوردی‌و جەمەدانەی سور گیرابوو, تا بیانپارێزن. ئەگەر ئەم وێنەیەم بەچاوی خۆم نەدیتبا هەرگیز باوەڕم نەدەکرد کەئەمە روویداوە.

سەدام کاتێك قسەی بۆ ئەفسەرانی گاردی کۆماری کرد لەبەغدا دەربارەی ئەو هێرشەیان گوتی: (استطاعت جحافلنا الخفیفة بقیادة مسعود البارزانی مع مساندة الجیش العراقی بأستعادة أربیل).تاریق عەزیزی وەزیری دەرەوەی ئەوسای عیراق لەیادەوەرییەکانی خۆیدا نوسیویەتی کەلەشکری عیراق لەسەر داخوازیی مەسعود بەهانایەوە چوو. سوپای عیراق لەم هێرشەدا پێکهاتبوو لە ٤٠ هەزار سەربازو ٣٠٠ تانك‌و٤٠ تۆپ. لەئەنجامی پەلامارەکەدا ٢٦ تانك تێکشکێنراو ١٠٠ سەرباز کوژرانو زیاتر لە ١٧٠ کەسیان زامداربوون. لەبەری گەلو یەکێتییش ٤٠٠ کەس شەهیدبوو, زیانێکی مادی‌و مەعنەویی

یەکجار گەورەش بەر بزوتنەوەی رزگاریخوازی کورد کەوت. هەرچی پێشمەرگەو خەڵکی مەدەنیو زامدارەکانی ناو نەخۆشخانەیە, پاش ئەوەی بەیدەست کران، هەموویان کوژران.

ئەمەریکا بەرامبەر ئەو پیشێلکارییەی عیراق هیچ هەڵوێستێکی جددی وەرنەگرت بەڵکو بۆ ئەوەی خۆی لەگلەیی بدزێتەوە، تەنها چەند موشەکێکی بەپرۆژەی بەخێوکردنی مریشکەوە نا لەباشووری عیراقو, دوو تانکی تێکشاویشی سوتاند! خۆ ئەگەر هاتبا ئەمریکا تەنها موشەکی بەلەشکری عیراقییەوە نابا لەهەولێر, هەموو لەشکرەکە بەپارتییەوە هەڵدەهاتن. بەڵام وەکو گوتمان پلانەکە لەلایەن کۆمپانیا جیهانییەکانی نەوتەوە زۆر بەوردی دارێژرابوو, بەجۆرێك کەهەرەشەی کورد لەسەر کەرکوك دووربخەنەوەو درێژە بەو باردۆخە ئاڵۆزەی عیراق بدەن, ئەوەش بەپێی یاسای نە شیش بسووتێت نە کەباب.

سەرەتا ویستیان ئەوەندەی لەتوانایاندایە کۆمەکی پارتی بکەن بۆ پێشڕەویکردن. ئەوەبوو هەموو چەكو جبەخانەکانیان خستەژێر دەسەڵاتی پارتی بۆ داگیرکردنی ئەم ناوچەیە. دوای ئەمە, پارتی هەر بەهەمان پاڵپشت زیاتر چووە پێشو یەکێتی دەستیکرد بەپاشەکشە لەبەرامبەر ئەو پلانەدا. بەم شێوەیە هێزی گەلو شۆڕشەکەی، لەبەرامبەر شۆڕشی چەواشەدا, لەسنووری ئێرانو لەسەر کێوەکان خۆی گرتەوەو کۆبونەوە.

## گەردەلوولی تۆڵە

پاش کۆبونەوەی هێزی هاوپەیمانی نیشتیمانیو تاوتوێکردنی بارودۆخەکە, سەعاتی سفر بۆ پەلاماردانەوەی حزبی بنەماڵەو رزگارکردنی هەموو ناوچەکانی کوردستان دانرا. ئەوەبوو پاش ٤٠ شەو بەسەر ٣١ی ئابدا, پەلاماردان دەستی پێکردو پارتی بەجۆرێك شکاو هەڵاتن کەمسعود ناچار بەناو رژێمدا, لەرێگای کەرکوکەوە خۆی گەیاندە هەولێر. لەهەمانکاتدا دەنگی تێکشکانە خێراکەی پارتی لەناو هەولێردا دەنگیدایەوەو بڵاوبۆوە, بۆیە ئەو بەرپرسە پارتییانەی بەهاوکاری بەعس لەهەولێر خۆیان داکوتابوو, بەشی زۆریان بەرەو شاری موسڵ هەڵاتنو بەشەکەیتریان لەگەڵ مەسعود بەرەو بارزانو بادینان هەڵاتن. بەڵام بەداخەوە مام جەلال دووبارە هەڵەیکردەوە کاتێك لەترسی لەشکری عیراقی هێرشی بۆ سەر هەولێر راگرت, چونکە ئەگەر رژێمی عیراق بەرگریشی لەهەولێر کردباو پەلاماری هێزی پێشمەرگەی دابا ئەوە پارتی زیاتر ریسوادەبوو، جگەلەوەش خەڵکی هەولێر بەگشتی خۆی بۆ راپەڕین دژی پارتیو بەعس ئامادەکردبوو هەروەکو ١١ی ئاداری ١٩٩١ کەلەم رۆژەدا جەماوەری ئەم شارە خۆڕاگرە سەلماندیان ئەوان دوژمنی بەعسو کوڕی شۆڕشو کوردن. مامۆستایەکی کۆیی, لەرۆژی راپەرینەکەدا لەهەولێر بەبەر ماڵی ئێمەدا هاتو رانکوچۆغەیەکی خورمایی لەبەردابوو تفەنگی برنەوی پێبوو, لەچواردەوریدا کۆمەڵێك هەرزەکاری گۆچان بەدەستی لێبوو" ئەو مامۆستایە کاتێك پەلاماری بارەگای بەعسیداو بەیەکەم تەقە یەکێکی لێ زامدارکردنو ئەوانیتری هەمووی بەدیل گرت, دڵنیام لەو رۆژەدا پاش خیانەتی ٣١ی ئاب ئامادەبوو لەوەش زیاتر بکاو ئەگەر ئێستا تیرۆر نەکرابێ ئەوە بەدڵنیاییەوە لەسەر بیروباوەڕە شۆڕشگێڕییەکەی, لەزیندانی ئاکرێدایە.

ئەو هەڵەیەی مام جەلال" ئەگەر بەبیانووی پاراستنی گیانی پێشمەرگە بووبێت ئەوە هەر دەکرد, تابتوانێ لەو نێوانەدا ئەوەندە خوێن برژێ کەساڕێژکردنی زەحمەت بێ, بۆیە تا ئەمڕۆش ئەم گرفتە لەو ناوچەیە درێژەی هەیە.

دوای راپەرینی ئاداری ١٩٩١و گەڕانەوەی خەڵکی ناوچەکە بۆ سەر زەویوزارو گوندە رووخاوەکانیان, دووبارە شەڕوهەرا لەنێوان ئەم دوولایەنە بەخەستی دەستی پێکردەوە, حزبە کوردستانیو عێراقییەکانیش لەجیاتی ئەوەی ئاو بەو ئاگرەدا بکەن, دەستیانکرد بەهاندانی خەڵك لەیەکتریو هەڵڕشتنی پارەو پایە بۆ ئەوەی بتوانن زۆرترین خەڵك لەزووترین کاتدا لەو ناوچەیە بەلای خۆیاندا رابکێشن. هەر حزبەو شەڕی بوو لەسەر ئەوەی کەفلان ئاغا یافلان سەرۆك هۆز یا سەرۆك جاش بکا بەئەندامی خۆی بۆیە دووبارە خەرمان سوتاندن ومەڕومالات بەتالان بردنو داگیرکردنی زەویو پیاوکوشتن کەوتەوە ناوچەکە.

هەرچەندە ئێستا تا رادەیەکی زۆر ئارامی لەهەموو ناوچەکەدا بەرقەرارە, بەڵام لەراستیدا کێشەکە چارەسەر نەکراوە, بەڵکو تەنها شەڕەکان بۆ کاتیکیتر دواخراون, چونکە داهاتی رۆژانەی زۆربەی خەڵکی ئەو ناوچەیە لەکشتوکاڵو زەوییەوەیە, کەئەمەش ناوەرۆکی کێشەکەیە. نابێ ئەوەشمان لەبیر بچێ کەئەم شەڕە گەورەیەی نێوان یەکێتی وپارتی لەدوای راپەڕین, کەسەرەتاکەی لەم ناوچەیەوە دەستی پێکردوە لەسەر ریزێك دوکان بوو کەتییدا چەندین تێکۆشەری گەلەکەمان شەهیدبوون, لەوانە شەهید عەلی نەبیو مام جوتیار. بێجگە لەوەش ئەم ناوچەیە لەلایەن رژێمەوە وێرانکراو ژێرخانی ئابوریی دوچاری تێکشکانێکی گەورەبوو, کە لەئەنجامدا بێکاریو نەدارییەکی زۆری لێکەوتەوە.

بیری تەسکی حزبایەتی وایکرد کەزۆر لەسەرۆك جاشو ئامر مەفرەزەو پیاوکوژەکانی دوێنێ, ببن بەخاوەن دەسەلات و لێپرسراو لەناو شۆڕشدا. لەوانە عەباس کەتا پێش راپەڕین تاوانبارێکی گەورەی ناوچەکەبوو بەڵام پاش راپەڕین بوو بەیەکەم پیاوی پارتی لەناوچەکەدا. جگە لەوەی کەناوبراو بەرەسمیو بەئاشکرا دەستی لەگەڵ ئیتلاعاتی ئێرانی تێکەڵ کردبوو, ماڵەکەی لەمەڕ سەنگەسەری بوو بەبارەگای ئاشکرای ئیتلاعات, بەجۆرێك کەجەماوەر سەرسام بوون بەوەی کەکۆماری ئیسلامی چۆن پشت بەم پیاوە خوێنڕێژە دەبەستێ لەکاتێکدا دروشمی بەرگری لەچەوساوەکان (الدفاع عن المستضعفین)ی هەڵگرتووە؟! بەڵام راستە, لەسیاسەتدا ئەخلاق نییەو ئەگەر بتەوێ سیاسەتەکانت سەرکەوتوبێ, دەبێ ئەخلاقو یژدان بخەیتە لاوە, چونکە بەرژەوەندی, چەقی کاری سیاسییەو سیاسەتیش, کۆی ریگاو شوێنەکانی پاراستنیەتی.

بەرژەوەندی عەباس لەم کارەدا چەند خاڵێك بوون: دەستکەوتی پارەو پول, پاراستنی دەسەلاتی خۆیو خۆپاراستنی لەجەماوەرو یەکێتیی نیشتیمانیی کوردستان.

هەرچی ئێرانیشە, ئەوە ئاشکرایە بەرژەوەندییەکەی چییە, کۆکردنەوەی زانیاری لەسەر حزبە کوردییەکانی ئێرانو عیراقو دەستوەشاندن لەهێزی پێشمەرگەی کوردستانی ئێران. بەڵام خوا دوعاو هاواری هەزارانی قبوڵکرد کاتێك پاش ماوەیکی کەم خوشكو کچێکی عەباس رەدووکەوتنو هەریەکەو دەستی لاوێکی گرتو هەڵاتن.

پاش فراوانبوونو تۆکمەبوونی دەسەڵاتی یەکێتی لەناوچەکەدا بەهۆی ئەو گۆڕانکارییانەی روویاندا, عەباس هەستی بەهەڕەشەی جدی کردو زانی ئەگەر فریای خۆی نەکەوێ کەس ناتوانێ رزگاری بکا, بۆیە بەفەرمانو کۆمەکی بنەماڵەی مەلامستەفا خۆی گەیاندە باوەشی کۆماری ئیسلامیو هەڵات. لەئێران پێشوازییەکی گەرموگوڕیان لێکرد کەچاوەڕوان نەدەکرا. نەك هەر ئەوەندە بەڵکو لەهەموو روویەکەوە دەسەڵاتیان پێدا, هەر لەسنووری تەمەرەچیان تا دەگاتە چۆمان تا بارەگاکەی لەخانە(پیران شهر) بەو سپێردرا. ئەویش دووبارە بەئارەزوی خۆی لەو سنورانە دەستیکردەوە بەدزیو جەردەییو کوشتنوبڕین. تاکە بیانووی ئەو کۆمەکەی ئێران بۆ عەباسو بەخشینی ئەو دەسەڵاتە فراوانە پێی, ئەوەبوو کەعەباس دۆستی دێرینی کۆماری ئیسلامییە. خراپەکاریی عەباسو چەکدارەکانی تەنها کوردی عیراقی نەگرتەوە, بەڵکو

ئەو لەو پیاوانە بوو کەدەڵێن: نانی لەپیاوکوشتندایە. بۆیە لەتەممووزی ساڵی ٢٠٠٠دا کەسوکاری عەباسو چەکدارەکانی, هاووڵاتی کوردی ئێران (ئاکۆ حەسەن پوور) دەکوژن. لەئەنجامدا خەڵکی خانە لێیان رادەپەڕنو هێرش دەکەنەسەر بارەگاو ماڵی عەباسو تاڵانیان دەکەن, پاشان هەمووی دەسوتێنن بەدوو سەیارەوە. لەم راپەڕینەدا هەندێ هاوڵاتی خانەیی زامدار دەبن. عەباس یەکسەر ناوچەکە جێدێڵیو هەڵدێ, ئێران سوپایەکی تایبەت لەمیراوە بەهانای عەباسەوە دەنێرێ, پاشان هەموویان رەوانەی هەولێر دەکاتەوە بۆ ژێر دەسەڵاتی بنەماڵە, ئەوەش بەپێی ئەو پەندەی دەڵێ: (ماڵی قەڵب سەر بەساحێبیەتی). ئێستا تاران کەباسی عەباس دەکا دەڵێ: (اشراری عراقی اصل). ئێران بەم شێوەیە دەستی خۆی لەتاوانەکانی عەباس دەتەکێنی. بەڵام بنەماڵەی بارزانی چۆن پاساوی تاوانەکانی ئەو پیاوکوژە دەدەن؟

## بەرقەراربوونی ئاشتی و چارەسەرکردنی کێشەکان لەرێگەی وتویژەوە

ساڵی ١٩٨٥–١٩٨٦ لەکاتی هاتوچۆکردنم لەنێوان یەکێتیو پارتیدا بەخزمەتی مامۆستا کەریم ئەحمەدو ابوحکمەت گەیشتم, مامۆستا عەزیز محەمەد ویستی بمبینێ بەڵام بۆم نەکرا, لەو کاتەدا کادرانی شیوعی لەرێگای سوریاوە بەئاشکرا هاتوچۆی ئێرانیان دەکردو دەهاتنە م.س. پارتی لەراژان. بۆچی ئەوکاتە ئاوارەیی شۆڕشگێڕی بوو, بەڵام ئێستا عەیبەیە؟ بێدەنگی ئەم حزبانەو کۆمەککردنیان بەبنەماڵەو سەرخستنی حکومەتە دەسکردەکەی, هۆیەکیتری روونەدانی جیابوونەوەی ناو پارتی بوو. ئەو حزبانە بەم کارەیان پشتی بنەماڵەیان قایمکردو دەستیانگرت, پاش ئەوەی بەعس گەڕاندنیەوە بۆ هەولێرو ناوچەکانیتر. لەدوای ئەم کارەساتە, شەڕی ناوخۆ چوە قۆناغێکی نوێوە, برینەکان قوڵتربوونو شەڕەکان فراوانتر. بنەماڵە پاش ئەوەی ئەم خیانەتەی بۆ چوەسەر زیاتر لەجاران پێی داگرت لەسەر ئاشتی نەکردن لەگەڵ یەکێتیو هێزە هاوپەیمانەکانو غرورێکی سەیر چووە کەللەیانەوە, وای لێهات تورکیا لەرێگای هێزی P.M.Fـەوەو ئەمریکا لەرێگای دەسەڵاتی سیاسیو موخابەراتی لەناوچەکەو، کۆماری ئیسلامیو پێش هەموشیان عیراق, بەناوی ئاشتییەوە بەئاشکرا دەست لەکاروباری ناوخۆی کوردستان وەربدەن.

هەڵەیەکیتری مام جەلالیش ئەوەبوو کەدەستیکرد بەگفتوگۆ لەگەڵ بنەماڵەدا بەنیازی گەڕاندنەوەی ئاشتی بۆ ماڵی کورد. ئەم کارەی مام جەلال جگەلەوەی کەدەنگی ناڕەزایی بەرامبەر هاتنی تانکەکانی رژێمی لەناو ریزەکانی پارتیدا کپکردەوە, لەهەمانکاتدا لەگەورەیی خیانەتی ٣١یئابی کەمکردەوە, بۆنمونە لەدوای گفتوگۆکان یەکسەر لەراگەیاندنەکانی یەکێتی دەسکرایەوە بەرێزگرتن لەبنەماڵەو بێدەنگبوون لەخیانەتەکە, کەئەمە بۆخۆی سەرکەوتنێکیتری بنەماڵەبوو. هەروەکو پێشتریش باسمانکرد هەرچوار دەوڵەتە ئیقلیمیەکە بەئاگاداری ئەمریکا دەستیان هەبوو لەسەرخستنی پلانەکە, کە لەلایەن کۆمپانیا جیهانیەکانی نەوتەوە بۆ زیاتر کۆکردنەوەی سەرمایە داڕێژرابوو. پارتیش لەلایەن هەرچوار دەوڵەتەوە لەیەکێتی پەسەندترە, هەربۆیە ئێران، کەپارتی هێرشی بۆ ناوچە سنووریەکانی هێنا هیچ دەنگی نەکرد, دوو ساڵ بەر لەو رۆژەش لەکاتێکدا پارتیو بزوتنەوە لەناوچە شاخاویەکاندا لەسەر سنووری ئێران خۆیان مەڵاسدابوو, هەرکاتێ یەکێتی هێرشی بکردبا یان ئەوان پەلاماری یەکێتییان دابا ئەوا تۆپخانەو راجمەی ئێرانی یارمەتیدەریانبوو, هەروەك چۆن لەقەڵادزێ روویدا کەبووە هۆی لەناوچوونی بنەماڵەیەکی ٧ کەسی تەنها پیاوەکەیان رزگاری بوو. هەڵوێستی ئەوکاتی ئەمریکا بەرامبەر ئەو هێرشەی ئێرانو دواتر هێرشەکەی رژێمی عیراق کەهەردووکیان لەبەرژەوەندی بنەماڵەو دوژمنانی گەلی کورددا بوو, لەخۆکرکردنو خۆدزینەوە زیاتر نەبوو. سەبارەت بەئاشتیو پاراستنی مافی مرۆڤیش لەکوردستان لەلایەن ئەمریکاوە من وای دەبینم, ئاشتی کەمەرجی یەکەمی پاراستنی مافی مرۆڤە

لەکوردستاندا, لەلایەن ئەمریکاوە هەرگیز کاری جددی بۆ نەکراوە, مام جەلالو کاک مەسعود کاتێ لەواشنتۆن بەئامادەیی وەزیری دەرەوە مادلێن ئولبرایت کۆبونەوەو دەستیان خستە ناو دەستی یەکترو وایان راگەیاند کەرێککەوتون, دوای ئەوە پارتی دەستیکردەوە بەفرتوفێڵ وخۆدزینەوە لەجێبەجێکردنی خاڵی تایبەت بەداهاتی ئیبراهیم خەلیل ئەوەش بەبیانوی خاڵی PKK. لەکاتێکدا ئەمریکا گەر مەبەستیبا ئاشتی بۆ ناوچەکە بگەڕێتەوە دەیتوانی لەماوەی بیستوچوار سەعات جێبەجێی بکا. نەك هەر لەوڕۆژە بەڵکو لە ١٩٩٦/٨/٣٠ کاتێك لە باڵوێزخانەی ئەمریکا لەلەندەن وەفدی هەردوولا بەئامادەبوونی ئەمریکیەکان کۆبونەوە. هەر ئەوکاتە ئەمریکا دەیتوانی رێگە لەو کارەساتە بگرێ. لەکاتێکدا ئەوان سێ مانگ پێش ئەم رووداوە ئاگاداری هەموو شتێك بوون. بیڵ کلینتۆن پاش ئەم خیانەتە بەوەندە کۆتایی هێنا کەگوتی: کورد دەبێت میللەت نەبێت, ئەگەر من روس بێنم واشنتۆنی تەسلیم بکەم, دەبێ پاسەوانەکەی خۆم بمکوژێ. ئەم قسەیەی کلینتۆن لەپڕوپاگەندەیەکی سیاسی بۆ حزبەکەی زیاتر نەبوو, چونکە ئەو ئەگەر راستی دەکردو ئەم کارەی بەخیانەتی گەورە دەزانیو بەرژەوەندی کوردی دەویست, ئەوا دەبوو لانیکەم پەیمانەکانی خۆی بەرامبەر بەکورد جێبەجێ کردبا لەکاتێکدا هیچ لەسەر ئەمریکا نەدەکەوت, بەڵکو بەپێچەوانەوە دەیتوانی بیکاتە پڕوپاگەندەیەکی سیاسیو لەهەمانکاتدا مرۆیی. لەمێژووی سیاسی ئەمریکادا پلان وپڕوپاگەندەی ئاوامان ئەوەندە زۆرە کەوامان لێ بکا دڵنیابین لەوەی ئەم قسەیە لەپڕوپاگەندە زیاتر نییە, بەڵکو هەوڵە بۆ خۆدزینەوەی لەرای گشتی گەلی ئەمریکی کەبەڵێنی پێدابوو نەهێڵێ سەدام پەلاماری کورد بداتەوەو درێژە بەسیاسەتە دژەمرۆییەکانی بدات لەم ناوچەیە.

بۆ نمونە: بەکرێگیراوە کوبییەکان بەیارمەتی ئەمریکا, بەفرۆکەو کەشتی چوونە دوورگەی (أم الخنازير) بەنیازی داگیرکردنو کودتا لەکوبا بۆ لەناوبردنی کاسترۆ. بەڵام هێزەکە تێکوپێك شکا، بەشی زۆری بەدیل گیران، یا خنکان، یاکوژران. ئەمە سەرکەوتنێکی گەورەبوو بۆ گەلی کوبا بەتایبەتی بۆ سەرۆك فیدل کاسترۆ، کەبووە هۆی مانەوەی کاسترۆو پیلانەکانی ئەمریکاش سەرکەوتوو نەبوون تاکو ئێستا. جۆن کەنەدی کەئەو کاتە سەرکۆماری ئەمریکا بوو گوتارێکی مێژوویی پێشکەش بەگەلی ئەمەریکی کرد دەربارەی ئەو ورووداوە کە لەسەرانسەری جیهاندا بڵاوبووەوە، دەستیکرد بەپاکانەکردنو پاڕانەوە بۆ بەرژەوەندی وڵاتەکەیو حزبەکەی کە (بەهیچ جۆرێك ئاگاداری ئەم بڕیارە نەبووم کە C.I.A پێی هەستاوەو یارمەتی ئەو خەڵکە کوبییانەی داوە، بۆیە بڕیارمداوە لەم مەسەلەیە بکۆڵمەوە). داڵاس کەچواردە ساڵو چوار مانگ بەرپرسی گشتی C.I.A بوو, لەبیرەوەرەیەکانی خۆی کەمامۆستا عبدالمعتصم تەرجەمەی کردوەتە سەر زمانی عەرەبی رونی کردۆتەوەو بەئاشکرا دەڵێت: (ئەم جۆرە رووداوە گرنگانە دەبێت بڕیاری سەرکۆماری لەگەڵدا بێت بۆ ئەوەی جێبەجێ بکرێت، من وا دوای ئەو هەموو ماوەیەی سەرپەرشتی C.I.Aم کرد خۆم لەو بەرپرسیاریەتیە کێشایەوە، چونکە بۆم نییە لەسەر ئەم کێشەیە هیچ شتێك بڵاوبکەمەوە تاکو راستیەکان ئاشکرا کەم).

وشەکانی داڵاس ئاشکرای دەکەن کەجۆن کەنەدی درۆ دەکات، منیش بۆم هەیە رای خۆم دەربڕمو بڵێم جەنابی بل کلنتۆن راستی نەکردو ئەگەر بێئەدەبی نەبێت لەرووی جەنابت درۆت فەرمو, ئاگاداری هەڵوێستو رەفتاری مەسعودو سەدام بویت. بۆ خاتری چاڵەنوتەکانو هەڵبژاردنەکەو بەرژەوەندی حزبەکەتەو ئەم فەرمانەی بەرێزتان C.I.A بەسەر بنەماڵەو سەدامدا سەپاندی رۆژگاریش کش مەلیکی تێدایە.

ئیستعماری ئەمریکی سیاسەتو پیلانی لەجیهاندا بۆ بەرژەوەندی خۆی دادەڕێژێ، سەرپەرشتی لەرێی کۆمپانیای نەوتی جیهانی ئەمریکی بکرێتو هەروەها بازاڕی چەك فرۆشتن زاڵ بێت بەهۆی ئاژاوەو ناکۆکیو شەڕ, ئەوی لەهەموو شتێك گرنگترە ئەوەیە کەهەرچی سەروەتو سامانی جیهان هەیە بخرێتە ناو بانکەکانی, ئەمریکا بەردەوامە لەم پیلانەو سیاسەتی

ئەوەیە هەر وڵاتو حکومەتێك نزیك بێتەوە خۆی تەسلیمی ئەمریکا بکات، هەمیشە ژێرخانی بەتاڵ دەبێت. جا میللەت برسی دەبن یان نەخۆش، یان دەکوژرێن, ئەوە گرنگ نییە.

ئەوەی باسی دەکەم مەسەلەیەك نییە هیچ حسابێکی بۆ بکات، تەنها هەر پێی بەرزبێتو ئەمریکا خۆش بێت.

ئەمریکا دەستێکی باڵای هەیە لەکودتا لەسەرانسەری جیهاندا، چ دوورخستنەوە یا هێنانەوەی سەرۆك وڵاتەکان، هەروەها دەست بخاتە ناو جەرگەی گروپە سیاسیەکان (ئۆپۆزسیۆن)و فەرمانیان بەسەردا بسەپێنێت, هەر سەرکردە یا گەورەی وڵاتێك یا گروپێك کە بەفەرمانی ئەو نەجوڵێتەوە ئەوە تیرۆرکردن یا گرتنو فڕاندن, یەکێك لەم سیانە بەرەنگاری دەبێتەوە. بۆ نمونە کاتێك دکتۆر محەمەد موسەدەقی سەرۆك وەزیرانی ئێران لەساڵی ١٩٥٣دا نەوتی ئێرانی خۆماڵیکرد, چڵکاوخۆرەکانی ئێران لەگەڵ شادا بۆ دەرەوەی وڵاتو بەفەرمانو پیلانی ئەمریکا هەڵاتن، ئەوەبوو ژەنەراڵ زوهەدی، کودەتای کرد بەسەر حکومەتی دکتۆر محەمەد موسەدەقداو شا گەڕایەوەو حوکمڕانیی ئێرانی گرتەوەدەست.

بەڵام ئیستعماری ئەمریکی جێی پێ لەقکردو ساڵی ١٩٧٩ بەیەکجاری ئێرانی پێبەجێهێشت. بەهەمان شێوە ئیستعماری ئەمریکی بەعسی هێنایە سەر حوکمو لەناو ئەو هەموو رۆشنبیرو سیاسەتمەدارانە, سەدام حسەینی هەڵبژارد تاکو ببێ بەسەرکۆمار. ئینجا شەڕی ئێرانی پێکردو دوای هەشت ساڵ کەجەنگ راوەستا، کوێتی پێ داگیرکردو ئەو بارودۆخەی ئێستای هێنایە کایەوە کە لەسایەیدا, هەموو دەوڵەتەکانی کەنداوی گیرۆدەی قەرزاریکرد، لەلایەکەوە بازاڕی فرۆشتنی چەك برەوێکی گەورەی هەیە لەلایەکی تریشەوە کڕینی نەوتو فرۆشتنی هاتە ژێر کۆنترۆڵی کۆمپانیای نەوتی جیهانی ئەمریکی.

یەکێك لەچالاکیەکانی دەزگای C.I.Aی ئەمریکا پلاندانانە بۆ فڕاندنی سەرکردەیەکی ناسراوی سیاسیی کورد، ئەمەش بەئاگاداری دەزگای میتی تورکیو دەزگای موسادی ئیسرائیلیو لەبەرچاوی هەموو جیهاندا کرا، ئەوەبوو عەبدوڵا ئۆجەلانی سەرۆکی PKK فڕێندراو درایە دەستی تورکیا، دوژمنی کورد.

ئەم هەڵوێستەی ئەمەریکا ئەوە دەگەیەنێت کەئەمریکا، هەرگیز رێگا بەکورد نادات لەبەڕێوەبردنی کاروباری خۆیاندا ئازاد بن، یان دەوڵەتێکی سەربەخۆو یەکگرتوویان هەبێت، هەروەها ئەوەش دەگەیەنێت کەهەر پارت یان سەرکردەیەکی کورد، ئەگەر ملکەچی رێنماییەکانی ئەمریکا بەتایبەتی لەکوردستاندا، نەبێت ئەوا چارەنووسی بەچارەنووسی دکتۆر عەبدولڕەحمان قاسملو، دکتۆر شەرەفکەندیو عەبدوڵا ئۆجەلان دەگات. هەروەها ئەو سەرۆكو سەرکردەیەی فەرمانەکانی ئەمەریکا جێبەجێ دەکاتو گوێڕایەڵی رێنماییەکانی دەبێت ئەوا وەکو بنەماڵەی بارزانی دەبێتە خاوەن ماڵو سامانو پارەی زۆرو هێزێکی چەکداری گەورەشی دەبێت.

بەڵام لەراستیدا خیانەتی نەتەوەییو نیشتمانی مایەی سەرشۆڕیو قوڕبەسەرییە، ئەوەتا وەکو دەبینین بنەماڵەی بارزانی بڕوای گەلی کوردیان لەدەستداوەو نزیکەی ٩٠٪ی کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان چاکەیان ناڵێن، هەرچی رێژەی ١٠٪ی کەماوەتەوە, لەژمارەیەکی بەکرێگیراوی میتو موسادو دامودەزگا داپڵۆسێنەرەکانی بەعس زیاتر نین.

## دیگۆل کردی، ئەدی ئێوە بۆچی نایکەن

لەبەرگی دووەمدا باسی ئەوەم کرد کەسەرۆکی هەردووك حزب پێویستە بۆ چارەسەری شەڕی ناوخۆ دەست لەکار بکێشنەوە. هەروەها گوتبووم کەپێشنیازێکی ئاوا، بەو ئەندازەیەی لەسەر شانی مەسعود بارزانی قورسە (تارادەی مستحیل) ئەوا لەبەرامبەر پیاوێکی شۆڕشگێڕی وەك جەلال تاڵەبانی دڵنیام کارێکی ئاساییە بەمەرجێك دڵنیابێت لەوەی کەکێشەکان بەو رێگایە چارسەر دەکرێو بنەبڕ دەبێ. من خۆم گومانم نییە لەوەی بەرێز جەلال تاڵەبانی لەبەر ئەوەی

بەخۆی, خۆی دروستکردووەو بەرەنجو لێهاتوویی خۆی سەرکردایەتی یەکێتی گرتۆتە دەست، بەدەست لەکارکێشانەوەی لەسەرکردایەتیی حزبەکەی, لەدڵی خەڵکو جەماوەری کوردستانو وڵاتانی جیهانیشدا هەر جێی رێزو خۆشەویستی دەبێ، بەڵام کەسێکی وەکو مەسعود کەدەسەڵاتەکەی میراتی بابیەتیو بەپێی یاساکانی خێڵ کەوتۆتە دەستی, ئەوە هیچ کات نەیتوانیوە ئەو دەسەڵاتە بەئاقاری خزمەتکردنی نەتەوەی کورددا ئاراستە بکا، بەڵکو هەردەم هەموو کوردو پارتی کردووە بەقوربانی بنەماڵەو خواستەکانیان, بۆیە ناوێرێ بیر لەو کارە بکاتەوە.

لەمێژووی سیاسیی زۆر لەگەلانی جیهاندا سەرکردەی راستگۆو شۆرشگێری وامان بینیوە کە لەپێناوی جەماوەردا دەستیان لەکار کێشاوەتەوەو پۆستی سەرکردایەتیو سەرۆکایەتییان بۆ نەوەی نویو گەل چۆڵکردووە. دیگۆلی فەرەنسی نمونەیەکی بەرچاوی ئەو حاڵەتەیە، کە لەکاتی داگیرکردنی پاریسدا, تاکە سەرکردەیەکی سەربازی بوو کەئامادە نەبو مل بۆ ئەو واقعە بدا، بۆیە لەبەریتانیاوە دەستیکرد بەسەرلەنوێ رێکخستنەوەی خەڵکی فەرەنساو بەرەمزی نەتەوەیی فەرەنسا ناوزەدد کرا. بەڵام لە ١٩٦٨دا پاش ئەوەی خوێندکارانو لاوانی فەرەنسا لەچوارچێوەی ئەو پەشێویو ئاڵۆزیەی هەموو رۆژئاوای گرتەوە (١٩٦٤ لەواشنتۆن، ١٩٦٨ لەپاریس)، پاش ئەوەی ئەو خوێندکارو لاوە فەرەنسییانە رژانە سەر شەقامو خۆپیشاندانی گەورەیان سازدا بێ ئەوەی هیچ داوایەکی ئاشکراو رەوایان هەبێ، دیگۆل دەستی لەکار کێشایەوەو خۆی خانەنشین کرد. جگە لەوەش گیڤارا نمونەی هەرە گەورەی ئەم هەڵوێستە خەمخۆرەی گەل بوو.

بەهەر حاڵ... بەرای من سەرەکیترین هۆ کەپێشنیازێکی ئاوا بنەماڵە بنەبڕ دەکاتو نەکراوە، جگە لەهۆکاری خێڵەکی، هۆکاری خیانەتە. چونکە پاش ١٩٧٥و ئاشبەتاڵی بنەماڵە بەشۆرشی کورد، دوژمنان بۆیان دەرکەوت کەدەکرێ لەرێگای ئەو بنەماڵەیەوە گورزی کوشندە لەناوەوە لەکورد بوەشێنرێ، بەتایبەتی پاش ئاشبەتاڵ کەخەڵکی شۆرشگێرو کوردپەروەر لەدەرەوەی بنەماڵە کۆبوونەوەو دەستیان بەدامەزراندنو رێکخستنی حزبی نوێی کوردی کرد، بۆ درێژەدان بەخەباتی رزگاری نەتەوەیی. لێرەوە بنەماڵە وەکو بۆمبی کاتی, دووبارە خرایەوە ناو شۆرش. ئەگەرنا ئەوا دەبوو ٢٣ ساڵ پێش ئێستا مەسعود بەقسەی برای بەرێز پرۆفیسۆر دکتۆر کەمال مەجیدی کردبا کەرووبەروو داوای دەست لەکارکێشانەوەی خۆیو باوکیو سەرکردایەتیی پارتی کردبوو لەپارتی بەمەبەستی خزمەتکردنی کورد، کە لەخوارەوە دەقی ئەم قسەیە بۆ خوێنەری بەرێز دەگوازمەوە، بەو هیوایەی زیاتر بۆی رۆشن بێت دوژمنی کورد کێیە: (في اجتماع مسعود البارزاني في برنهام مع العضو سردار حمه اغا وجمال علمدار والدكتور جمال الصالحي مع عدآخر من الأكراد سنة ١٩٧٧, شرح لنا مسعود تفصيل العلاقات الكردية– الأمريكية وبعد أن أنهى حديثه أقترحت عليه بأن يقوم كافة اعضاء اللجنة المركزية للحزب الديمقراطى الكردستانى بمن في ذلك هو و والده مصطفى بتقديم استقالتهم من الحزب ثم الأعتزال عن السياسة كليا لكي يفسحوا المجال للكوادر الجديدة في حزبهم لقيادته. واكدت له بأن القيادة القائمة قد فشلت في مهمتها وانفضحت عمالتها. ولو سمع مسعود كلامي وحاول ان يستفيد ولو قليلا من أقتراحي هذا في ذلك الحين لكان بالأمكان التخلص من القتال الدموي الذي أستمر بين حزبه وحزب جلال الطالباني. إلا ان مسعود أعتقد خطأ بأنني أقصد تحقيره وتحقير والده وقيادة حزبه. لقد حاولت مدة ساعة كاملة لكى أقنعه بأن أقتراحي وجيه وضروري لإنقاذ الشعب الكردي من المصائب التي جلبها الحزبان الكرديان. ولو سمع مسعود نصيحتي وحاول ان يجد فائدة واحدة من أقتراحي لكان الشعب الكردي في حالة أحسن بكثير مما هو عليه الآن. ولكن القاتل يبقى قاتلا كما تؤكد البحوث العلمية في الجرائم. ومنذ ذلك الحين أشعر بالفخر لأنني تجنبت هؤلاء القتلة ورفضت الكلام معهم بل قضيت معظم وقتي اعمل مع أبناء شعبي لفضحهم وفضح

علاقاتهم بالمخابرات المركزية حاثا أبناء الشعب الكردي المنكوب على مقاطعتهم وعزلهم واعتبارهم اعداء هذا الشعب) (النفط والأكراد– بقلم كمال مجيد- بروفيسور في جامعة كاردين في بريطانيا، ١٩٩٧، ص١٥٣)

بەم شێوەیە ئەو بنەماڵەیە بوونەتە بەردی ناوکانی، نەخۆیان ئاودەخۆنەوەو نەرێگا دەدەن خەڵك ئاو بخواتەوە. بەتایبەت دوای ئاشبەتاڵ، چونکە تا ئەوکاتە پارتی گەورەترین حزب بوو، بەڵام دوای ئەو کارەساتەو هەڵاتنی بنەماڵە لەبەرپرسیاریەتیی مێژوویی خۆی، خەڵکی کوردستانی باشوور بەخۆیاندا چونەوەو بیریان لەرێگای حزبێکی تازە کردەوە بۆ رزگاری. ئەو گۆڕانکارییە وایکرد ئەندامانی پارتی دابنیشنو لەسیاسەت دوور بکەونەوە لەرچەی مەلامستەفا کەچووە کەرەجو خۆی گوتەنی(دەستیکرد بەخوداپەرستی!) یان لەرێگای یەکێتیو حزبە تازەکان درێژە بەشۆڕشی نوێو خەباتەکەی بدەن.

بۆیە بنەماڵەو پارتی بەمەبەستی رێگرتن لەسەرکەوتنی شۆڕشو بەدیهاتنی ئامانجەکانی, ناچار پەیوەندییانکرد بەخەڵکانی جاشو دژەشۆڕش بۆ دووبارە خۆدامەزراندنەوەو پێگرتنەوەیان. بەتایبەتی دوای راپەڕینی بەهاری ١٩٩١ کەجەماوەر بەپاڵپشتی هێزی پێشمەرگە، توانییان کوردستانی باشوور لەژێر چنگی داگیرکەران دەربێنن. لەدوای ئەو وەرچەرخانە گەورەیە لەبزاڤی رزگاریی نەتەوەکەماندا پارتی بەبەرنامە دەستیکرد بەپارە هەڵرشتن بۆ پیاوانی پێشوی رژێمو پارێزگاریکردنیان، لەوانە تەحسین شاوەیس لەگەرمیانو عەباس بایز باڵو لەپشدەرو حمەخانی حاجی دارا لەزەڕایەنو چەندین دوژمنی تری کوردو کوردستان.

ئەو حاڵەتی کۆبوونەوەی کۆنەجاشو بەعسی لەپارتی, وەنەبێت هەر بڕیارێکی سیاسی سەرکردایەتیی پارتیو بنەماڵە بووبێ، بەڵکو دوورنییە ئەمە نەخشەیەکی گەورەتر بێو لەلایەن رژێمی عێراقەوە دارێژرابێ بۆ پارێزگاریکردنی پیاوەکانی خۆی لەدەست جەماوەری راپەڕیوو حزبە تێکۆشەرەکان. بۆیە بەعس لەپاداشتی ئەمەدا هەرگیز کۆمەکی مادیو مەعنەوی لەپارتی نەبڕیوە، کەئاشکراترینو زەقترینیان خیانەتی ٣١ی ئاب بوو، کەئەگەر تا ئەو کاتە پەیوەندی نێوان بنەماڵەو رژێم بەنهێنی بووبێ، ئەوا لەو رۆژەوە ئاشکرابوو کەبەعس ئامادەیە بەهێزترینو باشترین سوپای خۆی بەکاربێنێ بۆ پاراستنی دەسەڵاتی بنەماڵە کەدرێژبوونەوەی ناڕاستەوخۆی دەسەڵاتی بەعسە.

بەکورتی دەمەوێ بڵێم پێکهاتەی پارتی لەدوای ئاشبەتاڵو بەتایبەت دوای راپەڕین ناچێتە خانەی حزبی شۆڕشگێڕی کوردییەوە، بەڵکو دروستکراوی بێگانەیە کە لە ١٩٧٤وە لەکاری تێکدەرانە زیاتر هیچیتری نەکردووە. بۆیە دڵنیام ئەگەر لەکوردستاندا هەڵبژاردنێکی ئازاد بکرێ، ئەوا جگە لەپیاوانی رژێمو ئەڵقەلەگوێکانی داگیرکەران، کەسی تر دەنگ بەو بنەماڵەیە نادا. بەپێچەوانەی حزبە شۆڕشگێڕە کوردییەکان، کەلایەنگرو ئەندامەکانیان کوڕانی رۆژانی سەختو شۆڕشن. لایەنگرانی بنەماڵە وەنەبێ هەر لەکوردستانی خۆماندا خەڵکانی کوردپەروەر نەبن، بەڵکو لەبەر مێژووی پیسیان لەهەر چوارپارچەکەدا بوونەتە دوژمنی کورد لەهەر جێیەك بن، وەکو لەخوارەوە باسی دەکەم:

١– کوردستانی باکوور(تورکیا): بنەماڵە بەهۆی هەڵوێستی دوژمنکارانەی بەرامبەر دانیشتوانی ئەم ناوچەیەو بەهاندانی رژێمی تورکی، وایکردووە پارتی بەردەوام وەك لەشکرێکی تورکی تەماشا بکرێ کە لەئەستەمبوڵەوە رێنمایی دەکرێ. بۆیە PKK هەر لەرۆژی دامەراندنیەوە تا ئەمڕۆ لەلایەن پارتیەوە سەرسەختانە دوژمنایەتی دەکرێ، لەو چوارچێوەیەدا چەندین جار پێش لەشکری تورك کەوتوون. هەموو ئەوانە وایکرد کوردەکانی تورکیا ئەو بنەماڵەیە نەفرەت بکەنو دژایەتی حزبەکەیان رابگەیەنن. لایەنگرانی پارتی لەو بەشە گەورەیەی کوردستاندا تەنها ئەوانەن کەپیاوی رژێمی تورکن. بۆیە دڵنیام ٥٪ی خەڵکی کوردستانی باکور, لایەنگری پارتی نین.

٢- کوردستانی ڕۆژئاوا (سوریا): بەهۆی دەستێکەڵکردن‌و هاوکاری بنەماڵە لەگەڵ میت‌و موسادو موخابەراتی عێراق‌و وەستانیان دژی خەباتی ڕەوای کەلی کورد لەسوریا, بەتایبەت پاش هەوڵە زۆرەکانی حافز ئەسەد بۆ دوورخستنەوەی پارتی لەبەعس‌و دواجار بێهیوابوونی لەپارتی لەپاش ٣١ی ئابەوە، جگە لەدژایەتیکردنیان بۆ PKK, هەموو ئەوانە وایکرد کەپارتی لەو ناوچەیەدا لایەنگری بەرێژەیەکی بەرچاو روو لەکەمی بکات.

٣- کوردستانی ڕۆژهەڵات (ئێران): لەدوای ١٩٦٣وە نزیکبوونەوەی بنەماڵەی بارزانی لە شای ئێران، بەشێوەکی ئاشکرا بنەماڵە دەستیکرد بەدژایەتیکردنی حزبە کوردییەکانی ئێران. ئەوەبوو مەلائاوارەو فایەق کەدوو کادری ناسراوی حزبی دیموکرات بوون شەهیدکران. بەهاتنی کۆماری ئیسلامی بۆ سەر کار, پارتی گورجتر نەخشەکانی تارانی جێبەجێ دەکرد بۆ لەناوبردنی حزبی دیموکرات‌و کۆمەڵە، بۆ ئەم مەبەستە هەموو هێزو تواناکانی خۆی خستە خزمەتی چەسپاندنی دەسەڵاتی کۆماری نوێ لەئێران، ئەو شوێنانەی حکومەتی ئێران دەستی پێی نەدەگەیی, لەبەر سەختی یان دووری لەناوەندی دەسەڵات، ئەوا پارتی لەشکرکێشی دەکردەسەرو وەك هێلکەی پاککراو دەیبەخشیە رژێمی ئێران. خەڵکی ئێران هەرگیز ناتوانن ئەو ڕۆژانە لەبیر بکەن کەخودی مەسعود بارزانی سەرپەرشتی ئەو هێرشانەی دەکرد دژی گەلی کورد لەئێران‌و هەرەشەی لێدەکردن کەدەبێ گوێڕایەڵی فەرمانەکانی بنەماڵە بن کە لەراستیدا فەرمانی تاران بوو. لەکاتێکدا یەکێتی پەیوەندی کوردانەی توندوتۆڵی لەگەڵ حزبەکانی ئێراندا هبووەو، چەندین جار کۆمەکی کردوون بەتایبەت حزبی دیموکرات. خودی شەهید دکتۆر قاسملوش هاوڕێ‌و هاوخەباتێکی نزیکی مام جەلال بوو. لەشۆڕشی ئێراندا، یەکێتی هاوشانی برا کوردەکانی لەو ناوچەیە دژی شا ڕاپەڕی‌و بەشداری کاریگەری کرد لەبەشی کوردستاندا. تاکە گلەیی‌و گازندەیی کوردەکانی ئێران لەیەکێتی ئەوەیە کە لە ١٩٩٦دا ئێران لەدژی دەسەڵاتی ئەواندا هێرشیکردە سەر سەرکردایەتی حزبی دیموکرات لەکۆیە. کە پێشتر راستیی ئەم مەسەلەیەمان روونکردەوە. ئەوەی جێی داخە ئەوەیە کەسەرکردایەتیی حزبی دیموکرات ئەو راستییە دەزانن کەیەکیەتی ئاگاداری کردوونەوە لەو هێرشە، بەڵام تاکو ئێستا خۆیانی لێ بێدەنگ دەکەن‌و بۆ کوردی ڕۆژهەڵاتی راناگەیەنن کەیەکیەتی چۆن هەوڵیداوە بیانپارێزێ. بەڵام هەرچی پارتییە, ئەوە چەندین جارو لەچەندین کات‌و شوێنی جیاوازدا گورزی جەرگبڕی لەبزاڤی کوردی ئێران داوە، کەخەڵکی کوردستانی ئێران هەرهەمووی دەزانێت.

٥- کوردستانی باشوور(عێراق): لەپاش ڕاپەڕینەوە خەڵکی کوردستانی باشور بەهای پارتییان بۆ دەرکەوت، بەڵام بەهۆی کۆمەکی ماددی رژێمەکانی عێراق‌و تورکیاو نەیارانی کورد، بنەماڵە توانییان خۆیان لەگۆڕەپانەکەدا بسەپێنن. ئێستا پاش شەڕی دوورودرێژی ناوخۆ, کوردستانی ئازاد بەسەر دوو ئیدارە سەرەکیدا دابەشبووە، هەرێمی یەکێتی کەئەگەرچی لەپاش ٣١ی ئابەوە لەرووی جوگرافیەوە لەهەرێمی پارتی بچووکترە، بەڵام ئیدارەیەکی دیموکراتی‌و کوردانەی تێدایە، کە لەسایەیدا هەموو حزب‌و ڕێکخراوە شۆڕشگێڕەکان ئازادانە کارە سیاسییەکانی خۆیان ئەنجامدەدەن‌و زۆرجار لەو سنوورەدا هەڵبژاردنی فراوان ئەنجامدراوە کەدواترینیان هەڵبژاردنی شارەوانیەکان بوو کە خەڵك بەوپەڕی ئازادییەوە متمانەی خۆیان بەنوێنەرانی یەکێتی بەخشی.

هەرچی هەرێمی پارتییە ئەوا زەبروزەنگی دەسەڵات‌و کۆمەکە ئاشکراکانی لەشکری تورك‌و عێراق وایکردووە خەڵك لەترسان نەوێرن ناڕەزایی دەربڕن‌و بڵێن نا. بەتایبەت پاش ئەوەی لە٣١ ئابدا تانکەکانی گاردی کۆماری عێراق بەئاشکرا لەهەولێردا هاتوچۆیان دەکرد بێ‌ئەوەی ئەمریکا هیچ هەڵوێستێکی جدی وەربگرێ. ئەمە وایکرد کەخەڵك پارتی وەك ئەمری واقیع وەربگرن‌و نەوێرن رووبەڕووی بوەستن. بەڵام لەناخیاندا لەپارتی‌و بنەماڵەی بارزانی دەبێزن‌و خەون بەو ڕۆژەوە

دەبینن کەئەو بارە قورسە لەسەر شانی میللەتەکەیان لادەچێو بۆیەکجاری لەکۆڵیان دەبێتەوە، هەر بۆیە پارتی بەردەوام خۆی لەهەڵبژاردنەکان دەدزێتەوەو ناوێرێ خۆی بداتە دەست خەڵك. چونکە دڵنیایە لەهەڵبژاردنێکی وەك شارەوانیدا ٢٠٪ی دەنگەکان زیاتر ناهێنێ، ئەگەر نوێنەری هەموو حزبە کوردیەکان بەیەکێتییەوە تێیدا بەشداربن.

## راستیی رووداوەکانی ساڵانی ١٩٦٣ تا ١٩٨٤

لەبەرگی دووەمدا بەکورتی باسی ئەم ماوەیەم کردووەو ئاماژەم بەوەداوە کەباسەکە دەپچڕم، ئێستاش بەپێویستی دەزانم بیخەمە بەر باس تاخوێنەر زیاتر ئاگاداربێ بەرروداوە گرنگەکانی ئەو کاتەو هەڵەو کەموکورتی هەموو لایەك. هەمووشمان دەزانین ئەو ماوەیە بۆ گەلی کورد زۆر گرنگو پڕ بایەخەو، لەبەرئەوەی زۆر لەکادرە ناسراوەکانی ناو پارتی، ئەوانەی بەخەم راستیی گەلەکەیانەوەن داوایان لێکردم کەچی دەزانم لەسەر ئەو ماوەیە ئاشکرای بکەم.

پاش شۆڕشی تەمووز، مەلامستەفا فەرمانی بەسەرۆك هۆزەکان کرد چەك دژی شۆڕش هەڵبگرن، چەند سەرۆك هۆزێك ئەم فەرمانەی بارزانییان جێبەجێ کردو رووبەڕووی لەشکری عەبدولکەریم قاسم وەستانەوە. لەئەنجامدا چەکداری هۆزەکان شکانو بڵاوەیان لێکرد، مەلامستەفا پاش ئەم تێکشکانە لەناوچەی بەرواری باڵا لەسەر سنووری تورکیا خۆی شاردەوەو، خۆی خستە بارودۆخێکی تاریكو نادیار چونکە هیچ حکومەتێك ئامادە نەبوو بەپەنابەر وەریبگرێ، هەروەها ئەمریکا، ئێران، تورکیاو سوریا هیچ کامیان وەڵامی نامەکەیان نەدایەوە. بۆیە ناچار هاواری لێهەڵساو پەنای بردەبەر عومەر دەبابەو مەلاماتۆڕو عەلی عەسکەریو مام جەلال، یەکەیەکە چاوی پێیان کەوتو گفتوگۆی لەگەڵداکردنو، لەئەنجامدا توانی پشتگیری ئەمانە بۆ لای خۆی رابکێشێ. ئەوەبوو ئەم شۆڕەسوارانە, بوون بەکەوا سپی بەر لەشکرو، توانییان بەتێکڕایی برادەرانی لیژنەی مەرکەزی، مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد بۆلای خۆیان رابکێشن، لەدواییشدا بڕیاری شۆڕشی ئەیلول لە ١١ی ئەیلولی ١٩٦١دا درا.

لەو کاتەدا مامۆستای مەزنو رۆشنبیرو نووسەرو ئەدیبو سیاسەتمەداری بەناوبانگ ئیبراهیم ئەحمەد کەسکرتێری پ.د.ك. بوو, سەرپەرشتی بەشی زۆری ناوچەی سۆرانی دەکرد. پلانو پرۆگرامی بۆ دەکێشاو بەخۆی سەرپەرشتی هەموو کۆبوونەوەو بڵاوکراوەو ئیزگەی دەکرد. کادرو پێشمەرگەکانی پارتی بەگیانێکی فیداکارییو پڕ لەشۆڕشگێرییەوە دەستیانکرد بەجێبەجێکردنی بەرنامەکانی، تا وایلێهات لەسەر فیداکارییو ماندوو نەبوون, پێشبڕکێ کەوتە ناویان. هەموو ئەوانە وایانکرد گۆڕانی چاك بەسەر کوردستانی باشووردا بێ بەتایبەت ئەو ناوچانەی حزب سەرپەرشتی دەکرد. کوردەکانی ناوچەی دیالە، کەرکوك، سلێمانی، هەولێرو هەموو ناوچە کوردنشینەکانی ترو هەتا کوردەکانی بەغداش هەموویان لەگەڵ ئەم باڵەی حزبدا هاوکاربوون.

م.س. کەبارەگاکەی لەماوەت بوو هەر فەرمانێکی دەرکردبا جێبەجێ دەکرا. جەماوەر بەگشتی ئاغا، شێخ، مەلا، مامۆستا، قوتابی، ئەفسەر، سەرباز، جوتیار، کرێکار، کاسبو کارمەند, هەر هەموویان فیداکاری شۆڕش بوون. ئەوەی لەهەموو ئەوانە دڵسۆزتر بوو پۆلیس بوو کەگەورەترین دەوریان هەبوو لەرێکخستنو سەرخستنی شۆڕشداو ٩٠٪یان پەیوەندییان بەشۆڕشەوە کردو بەشی هەرە زۆری مەخفەرەکانیان بەچەكو هەموو کەلوپەلەکانیانەوە تەسلیم بەشۆڕش کرد. پارتی لەسایەی ئەو فیداکارییەی گەلی کورد نواندی, لەهەموو جوڵەیەکی حکومەت ئاگاداربوو و هیچ شتێکی لێ ون نەدەبوو. هەموو هاوڵاتییەکی خۆی بەپێشمەرگە دەزانیو بەردەوام ئەم ناوەیان لەسەر زاربوو.

هەر کاتێ پێشمەرگە روویان کردبا گوندێك بەگەرمی پێشوازی دەکران و میوانداریيان دەکردن. ئەم بارودۆخە دوژمنی ترساند. چونکە یەکەم جاربوو ئەم ناوچەیەی کوردستان بەو جۆرە ئاسایش و ئارامی بەخۆیەوە ببینێ و رژێم نەتوانێ دەستی تێوەربداو تێکیبدا. هەرچەندە پێشینان گوتویانە چەم بێ چەقەڵ نابێ، سەرباریشی رژێم نەیتوانی لەبەرامبەر ئەم شۆڕشە هیچ هۆزێکی کورد تیژبکاو دژی شۆڕش چەکداری بکا. ئەو بارودۆخەی ناوچەی سۆران بەشێکی زۆری بۆ لێهاتوویی ئیدارەی مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەدو م.س. دەگەڕێتەوە. هەرچی ناوچەی بادینانە ئەوا لەلایەن خودی مەلامستەفاو بەفەرمانی تایبەتی خۆی بەڕێوە دەچوو. حزب لەو دەڤەرە دەسەڵاتی نەبوو، بەڵکو بنەماڵە ئیدارەی ئەم ناوچەیەیان دەکردو کردبوویانە موڵکی خۆیان(من المعلوم أن البارزاني كان رئيساً للبارتي منذ تأسيسه، إلا أن الذين عملوا بالقرب منه في الحزب يعرفون أنه لا يؤمن بالعمل الحزبي الصحيح، وأبرز دليل على ذلك هو منعه لأي نشاط حزبي في منطقة بارزان دوما، وكان يعتبر الحزب قوة ثانوية ويحاول التقليل من دوره القيادي ويستفيد منه فقط لأغراض معينة) (الحزب الديمقراطي الكردستاني، اللجنة التحضيرية، اوائل كانون الثاني، ١٩٧٧).

لەهەموو دەڤەری بادیناندا چوار ئاغا حوکمیان دەکرد کەهەموو شتێك و هەموو دارایی

لەژێر کۆنترۆڵی خۆیاندابوو، هیچ یاسایەك نەیدەتوانی سنوور بۆ دەسەڵاتیان دابنێ. واتە حزبایەتی لەو ناوچەیەدا قەدەغەبوو. ناوچەکانی بادینان بەمجۆرە دابەشکرابوون:

١- ناوچەی زاخۆ/ عیسا سوار حوکمی دەکرد.

٢- ناوچەی دهۆك/ عەلی خەلیل.

٣- ئاکرێ و شێخان/ حەسۆ میرخان.

٤- ئامێدی/ سەعد حاجی شەعبان.

ئیدارەو دەسەڵاتی ئەم ناوچەیە, بەبەراورد لەگەڵ ناوچەی سۆرانی ژێر ئیدارەو دەسەڵاتی ئیبراهیم ئەحمەد لەهەموو روویەکەوە جیاوازبوو. خەڵکی بادینان سەدەها جار دەهاتنە لای مەلامستەفاو شکاتیان لەدەسەڵاتداران دەکرد بەڵام بێسوودبوو چونکە دەسەڵاتی ئەو ئاغایانە لەراستیدا لەلایەن خودی بارزانییەوە بەخشرابووو، بارزانی هەر خۆی خاوەنی بڕیارو فەرمان بوو، هەموو توانای خۆی بۆ کۆکردنەوەی سامان و دەسەڵاتی زیاتر بوو (لم تؤمن قيادة البارزاني يوما بالقيادة الجماعية بمعنى الكلمة، بالرغم من تحدثها عنها. ومن الغريب أن هذه القيادة أحتفظت بهذا الرأي حتى بعد النكسة، لقد وضعت هذه القيادة كل الأمكانيات المالية والعسكرية وغيرها دوما في يديها واعتبرتها ملكا شخصيا لها وأخذت تتصرف بها دون رقابة) (س.پ، ل ٣٦).

لەگەڵ هەموو ئەمەشدا دوژمنانی کورد ناچاربوون حساب بۆ شۆڕشی ئەیلول بکەن چونکە شۆڕشەکە سەرنجی ناوەوەو دەرەوەی بەلای خۆیدا راکێشاو لەدۆست و دوژمنی گەیاند کەگەلی کورد چەند شۆڕشگێڕو فیداکارە بۆیە هەموو لایەك دژی ئەم شۆڕشە بەخۆکەوت, رژێمی عیراق ئەو حزبانەی نیازی گرتنە دەسەڵاتیان هەبوو تادەوڵەتە ئیقلیمییەکان, ئیسرائیلیش هەوڵیدا بۆ بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی خۆی کەڵك لەم شۆڕشە وەربگرێ هەرچەندە شۆڕشەکە بەناوی پارتیەو بەسەرۆکایەتی مەلامستەفا ناوی دەرکردبوو, بەڵام لەراستیدا کاروباری دەسەڵات دوو سەرکردە دەیانبرد بەڕێوە, ناوچەی بادینان کە لەلایەن خودی مەلامستەفاوە سەرپەرشتی دەکرا, سۆران کە لەلایەن مەکتەبی سیاسی و مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد بەڕێوەدەچوو.

شۆڕش تادەهات بەهێزترو فراوانتر دەبوو, تاسەرەنجام بەهۆی ئەو پلانەی دانرابوو،

حکومەتی عەبدولکەریم روخا، بەعس حوکمی گرتەدەستو پاش گفتوگۆیەکی دوورودرێژ لەگەڵ شۆڕشدا نەگەیشتنە یەك, بۆیە شەڕ لەنێوانیاندا هەڵگیرسایەوە. سەرەتا حکومەتی مەرکەزی لەناو خۆیاندا بوون بەدوو بەشەوە, بەشێکیان بەسەرۆکایەتی عەبدولسەلام عارف توانی دەسەلات لەعێراق بگرێتە دەست, هەروەها بەعسیەکان کەمیشێل عەفلەق سەرۆکایەتی دەکردن. لەئەنجامدا حزبی بەعس دوورخرایەوەو عەبدولسەلام عارف بوو بەسەرکۆمار. عەبدولسەلام عارف دوای ماوەیەك کەزانی بەهیچ جۆرێك ناتوانێت بەسەر شۆڕشی کورددا زاڵ بیت, بەفێڵ پەنای بۆ گفتوگۆبرد تا بتوانێ لەو رێگەیەوە پشتی شۆڕش لەزەوی بدا. بۆ ئەو مەبەستە کاك (ك) [٢] لەلایەن عەبدولسەلامەوە نێردرایە م.س.

---

[٢] کاك (ك) لەساڵی ١٩٩٩دا دووبارە ئەم باسەی بەوردی بۆ گێرامەوە, بەداخەوە هەر لەهەمان ساڵدا بەنەخۆشی دڵ کۆچی دوایی کرد کەماوەی دوو ساڵ بوو (واتە لەساڵی ١٩٩٧ەوە) لەناو جێگا کەوتبوو. ئەوەی بۆ گێرامەوەو منیش سوێندم بۆ خوارد کە لەکتێبەکەمدا ناوی نەهێنم. خەڵکێکی زۆریش ناوی ئەو پیاوە دەزانن و ئاگاداری ئەم رووداوەن, هەرکاتێك ئەوان ناویان بردو باسیانکرد منیش دەڵێم راستە !

لەماوەت, پێی گوتن: من لەلایەن خودی عەبدولسەلامەوە نێردراوم, دەمەوێت رووبەڕوو پێتان رابگەیەنم کەسەرۆك ئامادەیە کێشەی کورد جێبەجێ بکات بەمەرجێك مەلامستەفا لەسەرکردایەتیی شۆڕش دوور بخرێتەوە. وەڵامی م.س. و مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد ئەوەبوو پێی گوتن بەکاك (ك) بڵێن جاریکیتر بەمنیازە گڵاوەوە رووبکاتە ئەم ناوچەیە خراپی بەسەردێتو هەموو ژیانی لەبەندیخانە دەباتەسەر, ئێمە یەك حزبمان هەیە ئەویش پارتییە کە لەسەرانسەری کوردستاندا بەسەرۆکایەتیی مەلامستەفا بارزانی, سەرپەرشتی ئەم شۆڕشەمان دەکات.

دوای ئەوە حکومەتی مەرکەزی، نوێنەری تایبەتی عەبدولسەلام عارف کاك (ك)ی ناردە لای خودی مەلامستەفا بۆ هەمان مەبەست، سەرەتا گفتوگۆکان بەنهێنی بوو پاشان بەئاشکرا، بەبارزانییان راگەیاند کەعەبدولسەلام ئامادەیە کێشەی کورد لەسەر مێزی دانوستان چارەسەر بکات بەمەرجێك باکوری عێراق بەتەواوی بخەنە ژێر دەسەڵاتی خۆت، بەواتایەکی تر حکومەتی مەرکەزی دەیویست دەسەڵاتی پارتی نەمێنیو تەنیا بارزانی ببێتە هەموو شتێك لەکوردستاندا.

ساڵی ١٩٦٧ لێپرسراوێکی ئەمنی بەغدا ئەمەی بۆ باسکردم، بەڵام لەبەرئەوەی هێشتا لەژیاندا ماوە ناوی ناهێنم. بەمەبەستی جێبەجێکردنی مەرجی رژێم, مەلامستەفا هاتە ناوچەی سۆرانو لەگەڵ حاجی عەبدولڕەزاق پارێزگاری ئەوسای سلێمانی کەوتە گفتوگۆکردنی ئاشکرا (لەبەرگی دووەم بەدورودرێژی باسی ئەمەم کردووە).

مەلامستەفا لەمیانەی خۆسەپاندنی بەسەر پارتیو بنەبڕکردنی هەموو نەیارەکانیدا، زۆر بەوردی دەستیکرد بەنەخشەکێشان بۆ ئەم کارە، بۆ ئەوەی بتوانێ بەهەموو کەسێکی رابگەیەنێ کەپارتی، واتا بارزانیو بەس. هەر لەو ماوەیەدا حکومەتی ئێران, مەکتەبی سیاسی ئاگادار دەکاتەوە لەوەی کەچەند چەکدارێك تەقە لەمەخفەرێکی سوپای ئێرانی دەکەن، هەرچەندە ئەم کارە هیچ زیانی لێنەکەوتەوە، بەڵام ئێران بەرپرسیاریەتیی روودانی ئەم کارەی خستە ئەستۆی م.س. چونکە لەسنووری ئەوان روویدابوو. مامۆستا سدیق ئەفەندی بەفەرمانی م.س. دەچێت بۆ لێکۆڵینەوەو بەدواداچوونی ئەم کارە, لەئەنجامدا ئەوانەی بەم کارە هەستاون دەسگیر دەکرێن کەژمارەیان ١٢ کەسەو لێپرسراوەکەیان کاك ئەحمەد تۆفیقە کەخەڵکی کوردستانی رۆژهەڵاتەو کادرێکی ناسراوی حزبی دیموکراتی ئێرانە. ئەم

کابرایە پاش دەسگیرکردنی یەکسەر دان بـەوەدا دەنێت کەئـەم کـارەی بەفـەرمانی خـودی مەلامـستەفا ئەنجامـداوە. ئـەم رووداوە لەراستیدا زۆر ترسناکە، چونکە بەئاشکرا دەرکـەوت کـەبارزانی دەیـەوێ م.س. توشـی گرفتـی گـەورە بکـا لەگـەڵ حکومەتی ئێران کەخۆی لەو کاتەدا هیچ پەیوەندییەکی پتـەوی لەگـەڵ ئێرانـدا نـەبوو، بـەڵام دوور بـەدوور ئاگـاداری ٩٠٪ی هەموو پەیوەندیو هاتوچۆکانی م.س. و حکومەتی ئێران بوو، مەلامستەفا بەم کـارە ویـستی لـەئێران بگەیـەنێ کـە م.س. ناتوانێ سنوورەکان بپارێزنو, ئەم جۆرە کارانە بەبێ بارزانی کۆتاییان نایەت.

دوای ئـەم رووداوە, م.س. گرووپـی ئیـبراهیم ئەحمـەد دەسـتدەکەن بەکۆبوونـەوەو ئـەم رووداوە بـەزەنگێگی ترسـناک دادەنێن، چونکە مەلامستەفا بەم کارە دەیەوێ سەرنجی ئێران بۆ لای خۆی رابکێشێو لـەو رێگایـەوە ئابلۆقـە بخاتـە سـەر م.س. ئەویش بەداخستنی سنووری ئێران بەروياندا. بۆیە مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد بـۆ خـۆی دەسـت دەکـا بەلێکۆڵینـەوە لەگەڵ ئەحمەد تۆفیقو بۆ ئەم مەبەستە چەندین پرسیارو گفتوگۆی لەگەڵدا ساز دەدا، پێی گوت: (تاکە رێگامان کەهـەبێت هاتوچۆی لێوە بکەین بۆ دەرەوەی وڵات ئێرانە، وەکو دەزانی ئێمە گەمارۆمان لەسەرە، ئازوقەو خۆراك بەپارە بۆمان دێت, ئەگەر سنوورمان لێداخەن تووشی تەنگوچەڵەمەی گەورە دەبین، ئـەوەی تـۆ کردووتـە دژی شۆڕشـەکەمانەو زیـانێکی گەورە دەبەخشێت).

دەنگوباسـی ئەحمەد تۆفیق بەهەموو کوردسـتاندا بـڵاوبـۆوە، ئـەوانەی لەدەوروپشـتی مەلامستەفابوون داوایـان لێـدەکرد کـەوەکو سـەرۆکی پ.د.ك. پێویـستە بڕیـار دەربکـا بـۆ دەسـگیرگردنی هـەموو ئەوانـەی ئەحمەد تۆفیقیان گرتووەو چەکدارەکانیان چەککردووە. هەرچی پیاوە نیشتمانپەروەرو مەزنەکان بوو وەکو کاکـەزیادئاغا، عەباس ئاغای مامەندئاغا، شـێخ لـەتیف شـێخ مـەحمودو مامۆسـتای نووسـەرو سیاسـەتمەدار مەسـعود محەمـەد, ئەمانـە هەموویان داوایان لەبارزانی دەکرد کەبڕیاری بەپەلە نەداو ئاگاداری بارودۆخەکەبێ کە لەچ بارێکی ناسکدایە، پێیان دەگـوت ئەحمەد تۆفیقو چەکدارەکانی لەخۆڕا نەگیراون، بۆیە پێویـستە لــەگەڵ م.س. گفتوگۆ بکـەی تاراسـتی رووداوەکـەمان بـۆ دەردەکەوێ.

جەنابی عەباس ئاغا پێشنیازی ئەوەی کرد کەخۆی بچێ بۆ لایان بۆ لێکۆڵینەوە لـەو رووداوە بـەڵام مەلامـستەفا بـەپێی ئەوەی سەرۆکی پارتییە بەقسەی کەسـی نـەکرد. هـۆی سـەرەکی ئـەم هەڵوێستەی بـارزانی ئـەوەبوو لـەوە دەترسـا دوای لێکۆڵینەوە بۆ هەموو خەڵك ئاشکرا بێ کەبارزانی دەستی لەم کـارەدا هـەبوو، بێجگـە لـەوەی ئەمـە هـەلێکی بـاش بـوو بـۆ ئەوەی دەسەڵاتی خۆی بەتەواوی بەسەر م. س بسەپێنێ، هەر بۆیـە سـێ پێـشمەرگەی لەگـەڵ راسـپاردەیەك بـەرەو م.س بەرێکرد بۆ ئەوەی هەموو ئەوانەی لەگرتنو چەککردنی ئەحمەد تۆفیقو چەکدارەکانی بەشداربوون, بنێرنـە لای بـارزانی تـا زیندانیان بکات.

ئەو سێ پێشمەرگەیەی پاسەوانی مەلامستەفابوون, بۆ ئەم کارە کەوتنەڕێ. کەدەگەنە گونـدی مالومـە بـۆ حەسـانەوە، شەو روودەکەنە ماڵە جوتیارێك، خاوەن ماڵ رێزێکی زۆر لەمیوانەکانی دەنێ، چـونکە پاسـەوانی خـودی بـارزانینو بـەکاری تایبەتی جەنابیان هاتوونو مێزەری سوریان بەستووە. پاش ئەوەی خـواردن ئامـادەبوو فـەرموویان لێـدەکا، کەدێنـە سـەر سفرە سەرنجی خواردنەکە دەدەن سوکایەتی بەخاوەنی ماڵەکە دەکەنو دارکارییەکی باشی دەکەنو پێی دەڵێن: کـەزانیت ئێمە بارزانین بۆچی چێشتی ساوەرمان بۆ دادەنێیت، لەبری ئەوەی حەیوانمان بۆ سـەربڕیو برنجمـان بـۆ لێنێیـت. خـاوەن ماڵەکە روودەکاتە دادگای شۆڕشو سکاڵا دەکاو پێیان دەڵێ: من جوتیارێکی هەژارم، لەوە زیاتر توانام نەبووە.

ئەم سێ پێشمەرگەیە لەبەرئەوەی ئاگاداری ناوەرۆکی نوسراوەکەبوون وایاندەزانی کەس ناتوانێ لەقسەیان دەربچێو چییان ویست دەبێ بۆیان بکرێ. پاش ئەوەی دەگەنەم.س، نوسراوەکە دەدەنە دەستیان کەتێیدا هاتووە: (بەپێی ئەوەی کەمن سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستانم بڕیارمدا هەموو ئەوانەی کاك ئەحمەد تۆفیقیان چەککردووەو دەستگیریانکردووە، لەحزب دەربکرێن، چونکە ئەوانەی بێ بڕیاری من بەو کارە هەڵساون منیان ئاگادار نەکردۆتەوەو، دەبێ سدیق ئەفەندیم بەبەندکراوی بۆ بێنن بۆ لێکۆڵینەوەو سزادان، بۆ ئەم مەبەستەو لەبەر گرنگی رووداوەکە سێ پێشمەرگەی تایبەتی بارەگای خۆم نارد تا فەرمانەکە وەکو خۆی جێبەجێ بکرێ بەبێ دواکەوتن، ئەگینا بەرپرسیار دەبن).

مەکتەبی سیاسی, یەکەم هەنگاوی لەسەر سکالآی جوتیارەکەی گوندی مالومە کەئازارو ئەشکەنجە درابوو, هەرسێ پێشمەرگەکەیان خسە بەندیخانەوە، پاشان لەسەر داواکەی مەلامستەفا کۆبوونەوەیان کرد. رۆژ بەرۆژ بارودۆخەکە توندتر دەبوو بەهۆی بڕیارە توندو ناپەسندەکانی مەلامستەفا کەچەندین کەسی بەبێ هۆ بەندکردبوو. بۆ نموونە دکتۆر عەزیز شەمزینی ماوەیەك بوو لەسەنگەرسەر بەندکرابوو، عەلی حەمدی لەکاتێکدا یەکەم کۆبوونەوەی پارتی لەماڵی ئەواندا ئەنجامدرابوو لەبەندیخانە بوو, لێپرسراوی گەلاڵە بەفەرمانی بارزانی لەئاودەست بەندکرابووو هەر ئاغاو کوێخایەك سکاڵایەکی لەکادرێکی حزبی کردبێت, یەکسەر گیراوە یان دوورخراوەتەوە.

بەهەر حاڵ نامەکەی بارزانی بۆ مەکتەبی سیاسی ئەم خاڵانەی بەئاشکرا تێدابوو:

١- بارزانی دەیەوێ سدیق ئەفەندی لەبارەگای خۆی زیندانی بکا.

٢- هەموو ئەوانەی بڕیاری گرتنی ئەحمەد تۆفیقیان داوە دەبێت لەحزب دووربخرێنەوە، واتا ئەندامەکانی مەکتەبی سیاسی.

٣- نوسراوەکە ئاشکرای دەکا کە بەبڕیاری بارزانی، ئەحمەد تۆفیق تەقەی لەمەخفەری ئێران کردووە، بەمەبەستی ئەوەی مەکتەبی سیاسی لەگەڵ ئێران تووشی کێشە بکاو خۆی لەئێران نزیك بکاتەوە. دوای ئەم روداوە مەکتەبی سیاسی گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە لەئاست ئەو داخوازییەی بارزانی تەنیا دوو رێگای لەبەردەمدایە: یەکەمیان جێبەجێکردنی فەرمانەکانی سەرۆكو بنەماڵەکەی، کەبەزیانی شۆڕشی گەلەکەمان کۆتایی دێت. دوومیان: رەتکردنەوەی نوسراوەکە کەئەمە بەواتای دابەشبوونی شۆڕش دێت بەسەر دوو بەش، لایەکیان سەرۆك هۆزێکی نەزان بەرێوەی دەبات، لاکەیتریان م.س. مەکتەبی سیاسی بەپێی ئەو راپۆرتانەی بۆی بەرزدەکرایەوە لەرێکخستنەوەیان بەهۆی سەردانی خودی کادرانی م.س بۆ ناو خەڵك, بۆیان دەرکەوتبوو کەزۆرینەی خەڵك بەتایبەتی لەناوچەی سۆران لەگەڵ ئەواندان‌و پشتگیریان لێدەکەن، هەروەها ئەوەشیان بۆ ئاشکرابوو کەناکۆکیی نێوان مەلامستەفاو م.س لەناو خەڵکیدا بڵاوبۆتەوەو جەماوەر پێی ئاگادارە. لەلایەکی تر مەلامستەفا بەهۆی وتوێژی لەگەڵ عەبدولسەلام عارفی دیکتاتۆرو شۆڤێنی‌و دوژمن بەگەلی کورد, توانی خۆی لەرژێم نزیك بکاتەوەو بەهۆی ئەوەوە دەسڵاتی حکومەت لەناوچەکەدا قایمتربوو، خەڵکی ئەمەیان بەتاوانی خودی مەلامستەفا دەزانی چونکە عەبدولسەلام بەرادەیەك شۆڤێنی بوو دەیگوت کورد لەبنچینەدا عەرەبن‌و هەموو عەشیرەتەکانی جاف، سورچی، هەرکی، زێباری، دزەیی‌و هەمەوەند.. هتد هەرهەموویان عەرەبن! هەر ئەو دکتاتۆرە بوو بڕیاری ژمارە ١٣ی دژی حزبی شیوعی دەرکرد کە بەپێی ئەم بڕیارە کوشتنی خەڵکی شیوعی حەلاڵکراو هیچ یاسایەك لەسەر کوشتنیان نەما.

مەکتەبی سیاسی لەئەنجامی گفتوگۆو چاوپێکەوتنی خەڵکی, گەیشتنە ئەو باوەڕەی کەهێزو توانای ئەوان بەرامبەر خودی مەلامستەفاو بنەماڵەکەی بەم جۆرەیە:

١- جەماوەر بەگشتی لەسەرانسەری کوردستاندا, بەهەموو چین و توێژەکانیەوە پشتیوانی لەمەکتەبی سیاسی دەکەن.

٢-هەموو رێکخراوەکانی پارتی لەناوچەی سۆران و لەبەشێکی بادینان و شارە عەرەبنشینەکانی وەکو بەغدا، ٩٠٪ بۆچووونیان لەگەڵ مەکتەبی سیاسییە.

٣- هێزی پێشمەرگە لەناوچەی سۆران ٩٠٪ی بۆچوونیان لەگەڵ مەکتەبی سیاسییە.(لەبیرمان نەچێت کەمەلامستەفا بەهیچ جۆرێك نەیدەتوانی بەرامبەر م.س. هێز بەکاربێنێت، هەرچەندە ئەوە ئامانجی عەبدولسەلام عارف بوو.

هەموو ئەمانە وای لەمەکتەبی سیاسی کرد بەخۆیدا بچێتەوەو دان بەوەدا بنێ کەئەوان بارزانییان دروستکردوەو گەورەیان کردووە.

مەلامستەفا بەمەبەستی کۆنترۆڵکردنی زیاتری ناوچەی سۆران و کەمکردنەوەی دەسەڵاتی حزب و بەهێزکردنی توانای خۆی، هاتە ناوچەی سۆران و بارەگاکەی لەحەوزی دوکان دانا. لەیەکەم رۆژی چاوپێکەوتنی لەگەڵ حاجی عەبدولرەزاق لەرێگای سلێمانی رووبەڕوو پێی گوت: (من مرۆڤێکی موسڵمانم و نازانم حزبایەتی چییە، خوا رازی نابێت چیتر موسڵمان بکوژرێت، من هەرگیز بەوە رازی نەبووم، ئەمە تاوانی حزبییەکانە...).

حاجی عەبدولرەزاق لەدووەم چاوپێکەوتنیدا ئاگاداری مەلامستەفای کرد کەسەرکۆمار عەبدولسەلام عارف بەهەموو توانایەکی پشتگیری دەکات و یارمەتی دەدا. بۆیە رۆژ بەرۆژ نێوان مەلامستەفاو دکتاتۆر عەبدولسەلام عارف خۆشتر دەبو، پەیوەندییە نهێنی و ئاشکراکانی نێوانیان تادەهات پتەوتر دبوو. بارزانی توانی ئەو پەیوەندییە بۆ بەرژەوەندی خۆی و کەمکردنەوەی دەسەڵاتی م.س. بارزانی لەهەموو کۆڕوکۆبوونەوەیەکی جەماوەریداو بەئاشکرا هاواری دەکردو دووبارەی دەکردەوەو دەیگوت: هیچ کێشەیەك بەشەڕ کۆتایی نایەت، ئێمە موسڵمانین و بەئاشتی دەکەوینە گفتوگۆو کێشەی کورد لەگەڵ حکومەت چارەسەر دەکەین. هەتاهەتایە شەڕ نابێتەوە.

دەربارەی شۆڕشی ئەیلولیش دەیگوت: من ئاگادار نەبووم کەجەماعەتی ئیبراهیم ئەحمەد ئەم شەڕەیان هەڵگیرساند، ئەمە کاری حزب بوو. هەر بۆیە بەناوی پارتی دووبەرەکییان دروستکردووە لەناو ئاغاو جوتیارو شێخ و مەلاو چەندەها هێرشیان برۆدتە سەر ناموسی خەڵك. مەلامستەفا بەمجۆرە ناوی دەبردن: عومەر تەنەکە، بلەی ئەحەرەش، حلمی عەلی ناشەریف[٣]، جەلۆمەلۆ، حەمەئەمین قەرەج. لەژێرەوەش دەستیکرد بەبوختانکردن بۆ کادرانی پارتی ئەوانەی لەگەڵ م.س. بوون و، هەرکەسێك هاتبا لای ٥-٥٠ دیناری دەدایە. کاتێك لەگەڵ شیوعییەکان دادەنیشتن پێی دەگوتن ئاگاداری ئەو شتە نارێکوپێکانە نیم لەبەرامبەرتان کراوە، بەڵکو ئەمانە هەمووی کاری ئیبراهیم ئەحمەدو جەماعەتەکەیەتی. لەگەڵ لێپرسراوانی حزبە سیاسییەکانی ئێران دەیگوت: (جەماعەتی

---

[٣] حلمی عەلی شەریف: دەرچووی زانکۆی موستەنسریەی بەغدایە. رۆشنبیرو سیاسەتمەدارێکی ناسراو, چەندین کتێبی مێژوویی و ئەدەبی خستۆتە کتێبخانەی کوردییەوە. هەروەها رۆژنامەنوسێکی بەتواناو کەم وێنەبوو. چەندین کەسی لەبواری سیاسەت و رۆشنبیریدا پێگەیاندووە. ئەوکاتەی پێکەوە پێشمەرگە بووین سەلماندی کەپیاوێکی زۆر ئازاو فیداکارە. یەکەم کەس بوو کە لەکۆنگرەی بەغدا ماهیەتی مەلامستەفای ناسی, لەو کۆبوونەوەیەدا گوتی: کابرایەك ئیهانەی ئێمە بکات و توانجمان تێبگرێت و جوێنمان پێبدات چۆن بەسەرۆك هەڵیدەبژێرم. ئەگەر هەموو ئەندامانی کۆنگرە بەقسەی ئەویان کردبا ئێستا مەلامستەفا دەبوو بەئەفسانەو بنەماڵەش دەسەڵاتیان نەدەبوو, کوردیش گیرۆدەی ئاشبەتاڵ نەدەبوو هەروەها بەخیانەتی ٣١ی ئاب جەرگی نەدەبرا. مامۆستا حلمی ساڵی ١٩٩٨ کۆچی دوایی کرد, هەزار رەحمەتی لێبێت.

ابراهیم ئەحمەد ناهێڵن هیچ جۆرە چالاکییەکتان دژی ئێران هەبێت. ئەگەر هەوڵو دەسەڵاتی من نەبا ئەوا ئێوە یان زیندانی دەکران یان تیرۆر کرابوون، یان تەسلیم بەئێران کرابوونەوە). لەکاتێکدا مەلامستەفا نەك هەر خەڵکی شۆڕشگێڕو کوردپەروەری زیندانی دەکرد، بەڵکو زۆر ناشرین ڕەفتاری لەگەڵدا دەکردن، بۆ نموونە دکتۆر عەزیز شەمزینیی مێژوونووس, لەزیندانی بارزانیدا زۆر ڕەفتاری ناشیاوی لەبەرامبەردا کرابوو، هەروەها کاتێك لەگەڵ سەرۆك هۆزو کوێخاکاندا کۆببایەوە پێی ڕادەگەیاندن کە(جەماعەتی ئیبراهیم ئەحمەد جوتیارەکانتان لێ هاندەدەنو دەیانەوێ زەویەکانتان لەدەست دەربێنن. ئێمە چەند کادرێکمان لەسەر ئەو بیروباوڕانە گرتووەو لەسێدارەیان دەدەین، چما ئێمە شۆڕشمان کرد تا ماڵی خەڵك داگیرکەین؟).

لەدرێژەی بوختانەکانیدا بۆ م.س. دەیگوت: من سەرۆکی پارتیمو بەهەموو شێوەیەك پشتگیری لەئێوە دەکەم. ئەوانیش لەبەرامبەر ئەوەدا کەبارزانی ڕێگە لەکادرانی پارتی دەگرێ دەست لەکێشەی زەویوزار وەربدا کە لەگەڵ جوتیارەکاندا هەیانە، بەڵێنیان پێدا لەگەڵیدابنو ئەڵقەلەگوێو داردەستی بۆ پشتی هەر کەسێك کەدژایەتی بکا. لەهەمانکاتدا هەر ئاغاو سەرۆك هۆزو خاوەن زەوییەك لەگەڵیدا نەبا دوژمنایەتی دەکردو گرفتی بۆ دەنایەوە، زۆریانی ناچارکرد زەویوزارەکانیان جێبێڵنو بەرەو ئێرانو وڵاتە ئیقلیمیەکان هەڵێنو زەویوزارەکانیشیان بەسەر کادرانی پاراستندا دابەشکرا. لەگەڵ ئەوەشدا هەندێك سەرۆك هۆز خۆیان تەسلیمی بارزانی نەکرد، لەوانە حەمەڕەشیدخانی بانەو عەباس ئاغای سەرۆك هۆزی ئاکۆ. هەرچەندە بارزانی هەوڵیدا بەنهێنی کێشەی زەوییان بۆ دروست بکا، بەڵام هەر سەرکەوتوو نەبو.

لەو ماوەیەدا بارزانیو بنەماڵە چەندین تاوانی گەورەیان دەرهەق بەگەلی کورد ئەنجامدا، لەهەموویان ئاشکراترو بەناوبانگتر ئەو دادگایەبوو کە بەناوی قەسابخانەی کانی ماسی دایاننا کەکانیو ئاوێکە لەگوندی قەرەتۆغان، دەکەوێتە باشووری ڕۆژهەڵاتی شاری سلێمانیو چوار کیلۆمەتر لێوەی دوورە. مەلامستەفا بۆ کۆنترۆڵکردنی شاری سلێمانیو ترساندنی خەڵکو دواجار ملکەچ پێکردنی م.س. ئەم کارەیان کرد کە لەرووداوەکەی زەعیم سدیق کەمتر نەبوو هەرچەندە ئەم کارەساتە ئێستا ٣٧ ساڵی بەسەردا تێپەڕیوە، بەڵام ۆرئەمە یەکێکە لەتاوانە گەورەکانی مەلامسەفاو بنەماڵە دەرهەق بەگەلی کورد کە بەداخەوە لەلایەن نووسەرو سیاسەتمەدارانی کورد وەك پێویست ئاوڕی لێنەدراوەتەوە. ئەم تاوانە گەورەیە بەفەرمانی خودی بارزانی بوو، دادگاکە لەلایەن عەریف جەبارو حەمەی دەروێش نادر، سالە پیر، ئەحمەد سەر، حسێن ئیبراهیم دەروێش، حسێن فارس، عوسمان ئامە،
مستەفا (مچەی) بابەگەورەو بایز شێخ محەمەد حوسە جێبەجێ کرا کەپەلاماری ناوچەی سلێمانیان داو دادگایەکیان لەگوندی کانی ماسیدا دانا کەزیاتر لە ١٠٠ هاوڵاتی لەم تاوانەدا کوژراو برینداربوون کە بەداخەوە تەنها وێنەو ناوی ١٢ کەسیانم لایە، وا لەخوارەوە بۆ خوێنەری دەخەمە بەردەست. ئەم کارەی بارزانیو بنەماڵەکەی دژی هەموو بەهاو پێوانە ئاینیو کوردیەکان بوو، ئەمە تەنها لەرژێمی داگیرکەرو دوژمن بەگەلی کورد دەوەشایەوە،
بگرە ئەم کارەساتە لەوکاتەدا هیچ رژێمێکی داگیرکەری کوردستان نەیتوانیوە بەو ئاشکراییەو بەو جۆرە ئەنجامی بدا. بۆیە ئەم بنەماڵەیە هەر دەبوو لەو ڕۆژەوە دوژمنایەتییان بۆ گەلی کورد ئاشکرا بوایەو خەڵکی بیانزانیایە کەئەم بنەماڵەیە ئەگەر دەسەڵاتیان بێ چی دەکەن.

ئەم تاوانە لەلایەن پیاوەکانی بنەماڵەوە بەجۆرێکی وا ئەنجامدرا کە لەمرۆڤ ناوەشێتەوە، بۆ نموونە ئەورەحمان ساڵح خلەبنجوو کەکادرێکی ناسراوی حزبی شیوعی بوو پاش لێدانو ئازاردانێکی زۆرو سوکایەتی پێکردن، بەنزین کرا بەهەموو

گیانیداو سوتێنرا. محەمەد سەیدعەلی کەتا ئەو رۆژە زیندانیی خۆیان بوو هەر لەهەمان ئەو رۆژەی ئازاد کرابوو، لەماڵەوە لەکاتی ریشتاشیندا لەبەرچاوی ماڵو منداڵەکەی رایانکێشاو هێنایانە دەرەوە بۆ کوشتن، خێزانەکەی قورئانی بەرەو پیریان بردو لەبەریان پاڕایەوە کە لەبەر خاتری خواو منداڵەکانی نەیکوژن، بەڵام فەرمانی مەلامستەفا بوو کەدەبێ بکوژرێت، بۆیە بێبەزییانە لەبەرچاوی خێزانەکەی شەهیدیان کرد. مەلامحەمەد ئەمین هێڵەك کەچوار تاوانباری کانی ماسی دێنە لای و بەبیانووی ئەوەی شارەزایی لەباشو خراپی برنج هەیە داوای لێدەکەن لەگەڵیاندا بچێ بۆ بازاڕ بۆ کڕینی برنج. ئەویش لەدڵسافی خۆی لەگەڵیاندا دەچێت، کاتێك دەگەنە مەیدانی برنج فرۆشەکان لەدواوە چوار گوللەی پێوە دەنێنو شەهیدی دەکەن. عومەری مام عەلی دوای کوشتنی بەبێ ویژدانانە پەنجەی دەبڕنەوە تا ئەنگوستیلەکەی لەدەست دەربێنن.

هەر لەو کارەساتەدا چەندین کەس بریندار بوو کەئەمە ناوی هەندێکیانە کەمن بیرم ماون: کەریمی عەبەخڕە، ئیسماعیل ئیبراهیم ناسراو بەئیسماعیل پاکدان، عەلی حسەین ناسراو بەعەلی سەعیدچاوەش.


عبدالرحمان صالح


صالح أمين قادر


نوری حمدی علی


صالح عرب


عبدالله


حمدی خسرو


ملاعلی


سعید لاله


عارف حسن


ملا محمد أمین


عمر مام أمین


عمر مام علی

## کۆنفراسی ماوەت، بەمردوویی لەدایك بوو

مەلامستەفا لەیەکەم رۆژی کە لەگەڵ پارێزگاری سلێمانی حاجی عەبدولرەزاقی نوێنەری دکتاتۆر عەبدولسەلام عارفدا کۆبۆوە، وەکو باسمانکرد دەستیکرد بەپلانداتان دژی م.س. پارتی دیموکراتی کوردستان، بەجۆرێك کەهەموو خەڵك بەناکۆکییەکان ئاگاداربوون. بۆیە زۆر مرۆڤی نیشتمانپەروەرو خێرخواز هەوڵیاندا لەو نێوانەدا قسەیەکی خێر بکەن، بەڵام بێسوود بوو. ناچار م.س. بریاری کۆنفرانسێکیدا لەماوەت. کۆنفراسەکە بەسەرپەرشتیی مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەدو کاك نوری شاوەیس بەڕێوەچوو. هەردووکیان لەکۆبوونەوەکەدا زۆر توندبوون، بەشداربوانی کۆنفراسی ماوەت بەگشتی بڕیاریاندا

كه مەلامستەفا لەسەرۆكایەتی حزب دووربخرێتەوە. بەڵام ١٣ ئەندام لەوانە رایان وابوو كەئەم كارە, گرژییەكە زیاتر دەكاو دوور نییە لەئەنجامدا چەك بەكاربهێنرێ.

بۆ ئەم مەبەستە چەند كەسێكی بەشداری ناو كۆنفراسەكە پێشنیازی ئەوەیانكرد كەبچنە لای مەلامستەفاو چاویان پێی بكەوێت بۆ چارەسەركردنی كێشەكان بەئاشتی. لەوانەی ئەم ئەركەیان خستە سەرشانی خۆیان حەبیب محەمەد كەریم، دكتۆر فوئاد جەلال، عەلی سنجاری، یەدوڵا فەیلیو عەبدولڕەحمان گۆمەشینی. بەڵام ئەم كۆمەڵە لەم كارەیاندا سەركەووتوو نەبوونو، لەئەنجامی كۆبوونەوە بەكۆمەڵو دوو بەدوو لەگەڵ مەلامستەفا هەر هەموویان بوونە لایەنگرو پیاوی ئەو. لەكاتێكدا مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد كاتێك پێی گوتن: مەلامستەفا چاوی میللەتە، ئەی كەچاو تووشی شێرپەنجە بوو چی لێدەكەن، بەگشتی وەڵامیاندایەوە: ئەو كاتە ناچار دەبین چاوەكە دەربێنین.

سەرەتا بەشداربوانی كۆنفراس بڕیاریاندابوو ناوەرۆكی كۆنفراسەكە ئاشكرا نەكرێ تاكو هەڤاڵانی رۆیشتوو بۆ لای مەلامستەفا دەگەڕێنەوە. بەڵام كەهەواڵ بڵاوبۆوە بوونەتە پیاوی بارزانی، ناوەرۆكەكە بۆ هەموو خەڵك ئاشكرا كرا. بەڵام بارزانی هیچ بایەخی بەبڕیاری كۆنفراس نەداو زۆر بەساردی وەریگرتو، ئامادەیی خۆی نیشاندا كەبۆ ئەوە هێرش بكاتە سەر ئیمپراتۆریەتی ماوەت، هەروەها بەئاشكرا گوتاری لەسەردەدانو باسی دەكردن.

بەرای من ئەو بڕیارەی م.س. گرنگو راست بوو، بەڵام بەداخەوە ئەو بڕیارە دەبوو ئەو كاتە بدرایە كەمەلامستەفا لەگەڵ عەبدولكەریم قاسمدا كۆبۆوەو پێی گوت: (من سەربازی تۆم). ئەگەر لەو كاتەدا ئەو بڕیارە درابا ئەوا كورد لەبنەماڵە رزگاری دەبوو تووشی ئاشبەتاڵو تەسلیم بوونەوە نەدەبووو، كورد نەدەبوو بەداردەستی بنەماڵە كە بەئارەزووی خۆیان ئەملاوئەولای پێ بكەنو بۆ بەرژەوەندی خۆیان بەكاری بێنن. بۆیە هەموو ئەوانەی بڕیاری شۆڕشی ئەیلولیاندا تووشی هەڵەی گەورەبوون. من لەو كاتەدا خۆم لەو ناكۆكییە پاراستو نەمویست ببمە ئارد لەنێوان ئەو دوو بەرداشەدا. پێشتر رای خۆم دەربارەی مەلامستەفا رونكردۆتەوە، چونكە من لەوكاتەدا هیچ لایەكیانم بەراست نەدەزانی. كوردی هەژاریش كە لەنێوان ئەو هەموو ئاژاوەو شەڕەدا ببوو بەقوربانی, هیچ رێگایەكی لەبەردەمدا نەمابوو رزگاری بكا، بەجۆرێك كەحاڵی كورد (البحر أمامكم والعدو وراءكم) بوو, ئەگەرنا ئەوا دەبوو روو بكەیتە هەندەرانو لەو بارودۆخە ناهەموارە خۆت رزگاری بكەی.

جەماوەری كوردستان سەریان سوورمابوو, چەندەها پرسیاریان دەربارەی بارودۆخی كوردستان دەكرد، دەیانگوت ئایا دەكرێ ئەوانەی بڕیاری شۆڕشی ئەیلولیانداو مەلامستەفایان كردە سەركردە, ئەمڕ لێی جیاببنەوەو ناكۆكی بكەوێتە نێوانیان؟ ئەمەیان لەچیو ئەوەیان بۆچی؟ خەڵكی، هەمووی قسەوباسیان هەر ئەوەبوو ئایا ئەم شەڕە روودەدا؟ ئایا رۆلی حكومەت چی دەبێ؟ ئەم پرسیارانە عەرەبەكانیش لەكوردیان دەكرد،

بەجۆرێك كەبارێكی ناهەمواری دروستكردبوو. چونكە ئەو پێشمەرگانەی دوێنێ دژی دوژمن

لەیەك سەنگەردا وەستابوون ئەمڕۆ لولەی تفەنگەكانیان ئاراستەی یەكتر كردووەو دەستیان خستۆتە ئێخەی یەكتر. مەلامستەفا دەیگوت شەڕ لەگەڵ حكومەتی دكتاتۆریو دژ بەكورد نابێتەوەو جارێكی تر من تەقە لەرژێم ناكەم, بەڵام فەرمانی كوشتوبڕو شەڕی لەگەڵ م.س. رادەگەیاند. كەسوكاری شەهیدانی شۆڕشی ئەیلول پرسیاریان دەكرد مادام وەكو دەڵێن كێشەكانمان بەگفتوگۆ نەبێ چارەسەر ناكرێ ئەی ئەو هەموو شەهیدە بۆ؟

مەلامستەفا لەمیانەی پاكتاوكردنی م.س. دەستیكرد بەخۆئامادەكردن بۆ كۆنگرەی شەشەم لەقەڵادزێ، بیری لەوە دەكردەوە بەهەر رێگایەك بێ رۆشنبیرانو نیشتمانپەروەرانو سیاسەتمەدارانو ئەفسەران بۆلای خۆی رابكێشێو تێیان بگەیەنێ كەپارتی بەبێ بارزانی ناتوانێ هیچ هەنگاوێك بنێو لەكارەكانیدا سەركەتوو نابێ. هەر لەو چوارچێوەیەدا

مەلامستەفا کەزانی ناتوانێت بەو ئاسانییە بەسەر باڵی م.س. بەتایبەت ئیبراهیم ئەحمەد زاڵ بێت کە ٩٥٪ی رێکخراوی پارتی هەڵوێستی سیاسییان بەراست دەزانی، ناچار کەوتە هەوڵدان لەگەڵ مام جەلال، دەستیکرد بەنزیکبونەوە لێیو پێی دەگوت: تۆ لەلوقمان دڵسۆزتری بۆ منو جێی باوەڕمی، من بێ تۆ هیچ بڕیارێك نادەم.

بارزانی ئەم وشانەی لەچەندین دانیشتندا بۆ ماستاوچییەکانی چواردەوری خۆی دەکردو وایزانی بەتەواوی لەمام جەلال نزیکبۆتەوە، داوای لێکرد کەببێتە سکرتێری پارتی دیموکراتی کوردستان. بۆ هەمان مەبەست حکومەتی عێراق بەسەرۆکایەتی عەبدولسەلام داوای لەمەلامستەفا کرد بەهەر جۆرێك بێت شتێکی وابکات جەلال تاڵەبانی رازیبێت, چونکە دەیانزانی بەبێ مام جەلال بەتەواوی بەسەر رێکخراوی پارتیدا زاڵ نابێت، لەهەمانکاتدا حکومەتی عەبدولسەلام عارف لەچەند رێگایەکەوە داوایان لەمام جەلال کرد بۆ ئەم مەبەستە. ئەوەی من لەزمانی خوالێخۆشبوو کەریم قەرەنیم بیست، کەیەکێك بوو لەوانەی بۆ ئەم مەبەستە لەگەڵ مام جەلال هەوڵیداوە، ئەوەبوو مام جەلال بەهیچ شێوەیەك ئەمەی قبوڵنەکردووە. هەمان سیاسەتو پلان لەگەڵ مامۆستاو سیاسەتمەدار عەبدولرەحمان زەبیحی پیادەکرا، بەڵام ئەویش سەری نەگرت.

## کۆنگرەی قەڵادزێ سەرکەوتنی بارزانی بوو

بارزانی نەخشەی بۆ پیاوەکانی دادەنا کەچۆن دەتوانن خەڵکی بۆلای خۆیان راکێشنو
کاریان تێبکەنو ئامادەیان بکەن بۆ کۆنگرەو پەلاماردانی م.س. ئەو کارە بەشێخ محەمەد هەرسینو اسماعیل عارف سپێردرا بۆ دەرکردنی بڕیارێکی توند دژی م.س. بۆ چەواشەکردنی جەماوەریش پێی گوتن دەبێ هەڵوێستێکی توند بەرامبەر رژێم وەربگرن.

## رێوڕەسمی شەشەمین کۆنگرەی پارتی لەقەڵادزێ لەتەمووزی ساڵی ١٩٦٤دا

سەرەتا مەلامستەفا گوتاری پێشکەشکرد، لەوتارەکەیدا بەتوندی هێرشی بردەسەر م.س.بەتاوانباری سەرەکیی دانان لەهەموو روویەکەوەو، گوتی دوو کەس بوونەتە هۆی ئەوەی کێشەی کورد بەم قۆناغە خراپەی بگاو دووبەرەکی تێبکەوێ, هەروەها گوتی: من ئامادەم هەموو فەرمانەکانتان جێبەجێ بکەم. ئنجا نارەزایی خۆی نیشاندا دەربارەی هەڵوێستی رژێمی دکتاتۆری عێراق کەهیچ هەنگاوێك بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد نانێت. لەناو ئەندامانی کۆنگرەدا دوو بۆچوون هەبوو:

١- بەشێکی زۆریان هەڵوێستو بۆچوونیان میانڕەوبوو، لەسەرخۆبوونو نیازی چارەسەرکردنیان هەبووو، دەیانویست نەهێڵن هیچ لایەك هێز دژی ئەویتر بەکاربێنێ. دەیانگوت دەبێ لیژنەی مەرکەزی تازە پێك بهێنرێت ئەویش لە م.س. ئەندامانی کۆنگرەی شەشەم. بۆ ئەم کارە ژمارەیەکی زۆر لەئەندامانی کۆنگرە ئامادەگیری ئەم پێشنیازەیان تێدابوو، لەوانە د.مەحمود عەلی عوسمان، د. فوئاد جەلال، یەدوڵلا فەیلی، عەلی سنجاری، باسە چەندین هۆی جیاوازی وایکردبوو ئەم کەسانە لەسەر ئەم رایە کۆببنەوەو یەکبگرن.

٢- بەشی دووەمی ئەندامانی کۆنگرە هەڵوێستیان زۆر توندبوو، لەوانە شێخ محەمەدی هەرسینو ئیسماعیل عارف کەپیلانەکانی مەلامستەفایان وەکو خۆی جێبەجێ دەکردو بەموو لێیان لانەدەدا. لەناو ئەم کۆمەڵەدا هاشم عەقراوی، عەزیز عەقراوی، ئیسماعیل مەلاعەزیزو رەمەزان عەقراوی. ئەمانە دەیانویست باڵی م.س. لەحزب دوربخرێنەوەو هەر هەموویان

گەورەترین سزا بدرێن. لەکۆتایی کۆنگرەدا، بەپێی بریاری مەلامستەفا، سەرکردایەتی پارتی پاش پاکتاوکردنی باڵی م.س. لەکۆنگرەی شەشەم لەقەلادزێ لەمانگی تەمووزی ساڵی ١٩٦٤ بەم جۆرەی خوارەوە دانرا:

١- حەبیب محەمەد کەریم* سکرتێری پارتی
٢- د. مەحمود عەلی عوسمان ئەندامی مەکتەبی سیاسی
٣- مستەفا قەرەدەغی ئەندامی مەکتەبی سیاسی
٤- ئیسماعیل عارف ئەندامی مەکتەبی سیاسی
٥- هاشم عەقراوی ئەندامی مەکتەبی سیاسی
٦- ساڵح یوسفی ئەندامی لیژنەی مەرکەزی
٧- عەزیز عەقراوی ئەندامی لیژنەی مەرکەزی
٨- د. فوئاد جەلال ئەندامی لیژنەی مەرکەزی
٩- یەدوڵلا کەریم سنجاری ئەندامی مەکتەبی سیاسی
١٠- عەلی سنجاری ئەندامی مەکتەبی سیاسی
١١- نوعمان عیسا ئەندامی مەکتەبی سیاسی
١٢- ئیسماعیل مەلاعەزیز ئەندامی مەکتەبی سیاسی
١٣- شێخ عومەر هەرسین ئەندامی مەکتەبی سیاسی
١٤- محەمەدئەمین بەگ ئەندامی مەکتەبی سیاسی
١٥- عومەر شەریف ئەندامی مەکتەبی سیاسی
١٦- رەمەزان عەقراوی ئەندامی مەکتەبی سیاسی

بەم کارە بەشی زۆری کادرانی پارتی وایاندەزانی ناکۆکیو دوبەرەکی کۆتایی هاتو بەهیچ شێوەیەك باڵی م.س. ئیبراهیم ئەحمەد ناتوانن خۆیان بگرنەوەو، ئەم کۆمەڵەی کەبارزانی لەسەرکردایەتی پارتی داینان وایاندەزانی کەئەمان جێی م.س. دەگرنەوە. بەڵام مەلامستەفا دوای ئەوەی بۆی دەرکەوت ناتوانێ بەو ئاسانییە باڵی م.س. بەتایبەتی ئیبراهیم ئەحمەد بشکێنێ، کەوتە پەیوەندیکردن بەمام جەلالەوە بۆ راکێشانی بۆ ریزی خۆیو دوورخستنەوەی لەهیلۆو سەنگەری ئیبراهیم ئەحمەد.

لەکۆنگرەی قەلادزێ کۆمەڵێك رووداو هاتنەگۆڕێ کەجێی خۆیەتی بەخاڵ دیارییان بکەین:

١. د. مستەفا قەرەداغیو محەمەد ئەمین بەگو عومەر شەریف بەبێ هەڵبژاردن لەلایەن مەلامستەفاوە دانران! دکتۆر مستەفا قەرەداغی لەبەر ئەوەی لەدەرەوەی وڵات بالوێزی عێراق بووە، پەیوەندیی تایبەتی هەبوو بەوڵاتە بێگانەکان، بۆ بەرژەوەندیی تایبەتی خۆیو بنەماڵە جێی بایەخ بوو.

٢. مامۆستا ساڵح یوسفی لەکۆنفرانسی ماوەتو کۆنگرەی شەشی قەلادزێ بەشداری نەکرد.

٣.ئیسماعیل عارف بەهۆی خزمایەتی لەگەڵ هاوسەری ئیدریس بارزانی بەناچاری بوو بەئەڵقەلەگوێی بنەماڵە، هەر بۆیە کەوتە بەربەرەکانیکردنی باڵی م.س.

---

* ئەم کابرایە پێش کۆنگرە تەنانەت ئەندامی کۆمیتەی ناوەندیش نەبوو.

٤.شێخ محەمەدی هەرسین دوای ئاشبەتاڵ بەداخەوە ئینجا ماهیەتی مەلامستەفای زانی، لەئاوارەیی لەتاران تیرۆرکرا.

٥.عەزیز عەقراوی شۆڕشی بەجێهێشتو پاڵیدا بە بەعس، ئەوەبوو کرا بەوەزیر، پاشان لە دەست بەعس رایکردو چووە بارەگای م.س. لەراژان، کاتێك زانی تیرۆر دەکرێ بەرەو

تورکیا هەڵات.

٦. ئیسماعیل مەلاعەزیز شۆڕشی جێهێشتو هاتە پاڵ حکومەتی بەعس.

٧. دکتۆر مەحمود عەلی عوسمان دوای ئاشبەتاڵ ئەم بنەماڵەیەی ناسی، ئەوەبوو لەساڵی ١٩٧٧دا کتێبێکی، بەناونیشانی (الحزب الديمقراطي الكردستاني– اللجنة التحضيرية– تقييم راستیەکانی خستەڕوو.

٨. حەبیب محەمەد کەریم دوای ئاشبەتاڵ هاتە پاڵ رژێمو چەند کەسێکی بەگرتدا کەدرانە دادگای بەعس، بەندە یەکێکبوو لەوانە(لەبەرگی دووەمدا باسمکردووە). ئەم کابرایە دوای راپەڕین (١٩٩١) هاتەوە خزمەت بنەماڵەو بوو بەئەندامی لیژنەی(المراقبة والتفتيش)!

٩. هاشم عەقراوی شۆڕشی بەجێهێشتو هاتەپاڵ رژێمی بەعس, کرا بەپارێزەر ئینجا وەزیر. ئەم کابرایە لەو رۆژەوە کەبارزانی چاوی بەنوێنەری عەبدولسەلام عارف کەوت، لەژێرەوە پەیوەندی لەگەڵ حکومەتدا هەبوو.

١٠. مامۆستا عەبدولڕەحمان گۆمەشێنی کە لەراستیەکان بەتەواوی گەیشتو لەهەڵوێستو

پلانی بنەماڵە شارەزابوو بەیەکجاری پارتی جێهێشتو هاتە پاڵ یەکێتی.

کۆنگرەی شەش لەئەنجامدا بەو بڕیارە کۆتایی پێهات کەباڵی م.س. دووربخرێنەوەو هەموو سەروەتو سامانی حزب تەسلیم بەئەندامانی مەکتەبی سیاسی تازە بکرێت کە لە تەمووزی ساڵی ١٩٦٤ لەکۆنگرەی شەش هەڵبژێردران، لەلایەکی تر کۆنگرە داوای لەرژێمی عێراق کرد کەحاڵەتی نەشەڕ نە ئاشتی نەهێڵێو بەزووترین کات دان بەمافاکانی کورددا بنێتو، لەو بارەیەوە پێویستە هەڵوێستی روون بێت.

بەشی زۆری ئەو خەڵکانەی لەشۆڕشدا بوون، لەهەڵوێستو بڕیاردانەدا بوون بەسێ بەشەوە: بەشی یەکەمیان ئەو ئەفسەرانەبوون کەکەوتنە ژێر کاریگەریی بارزانی. لەبەر ئەوەی بارزانی لەزۆر رووەوە بارودۆخی باشتربوو کەوتە پلاندانانو بەراشکاوی گفتوگۆی لەگەڵ ئەندامانی کۆنگرەدا دەکردو دەیگوت بەهیچ جۆرێك چۆك بۆ رژێمی عەبدولسەلام دانادەم. زۆر لەئەفسەرەکان چوونە پاڵ مەلامستەفا هەندێکیان نەبێ کەدانیشتن، ئەمەش قۆڵو بازووی بارزانی بەهێزتر کرد. هەندێکیتر لەئەفسەرەکان، مەلامستەفا پەیوەندی پێوەکردن، بەڵام رازی نەبوون لەگەڵیدا کاربکەن، لەوانە عەقید نامق حەوێزی.

بەشی دووەمی خەڵك کەکاسبو کارمەندو مامۆستاو قوتابی بوو چوونەوە ناو ماڵو منداڵی خۆیان, سەری خۆیان کزکردو پاڵیان نەدا بەهیچ لایەك.

بەشی سێهەمی خەڵك: ئەوانەی لەناو پارتی بوون بەتێکڕایی چوونە پاڵ باڵی م.س. لەناویاندا چەند ئەفسەرێك هەبوون کەپێشتر بەفەرمانی حزب هاتبوونە شاخ، لەوانە کاك کەمال موفتیو کاك نەوشیروان مەستی. لەدواجاردا کۆنگرەی شەش شەڕی لێکەوتەوەو چەك کەوتە نێوان باڵەکانی پارتی. بەتایبەتی لەلایەن سەرپەرشتیارانی کۆنگرە وەك کاك نوری شاوەیس کەرۆڵێکی سەرەکی لەدەرچوونی ئەو بڕیارە خوێناوییەدا هەبوو.

من زوو زوو سەردانی برادەرانی مەکتەبی تەنفیزیم دەکرد کەبارەگاکەیان لەگوندی هەڵشۆبوو، رۆژێکیان ئاگاداریانکردم کەکاك نوری شاوەیسو کاك عەلی عەبدوڵلا لێرەن، لەدووری پانزە دەقیقە لەبارەگای مەکتەبی تەنفیزی، بەڵام لەلایەن پاراستنەوە لەژێر چاوێریدابوون. چوومە خزمەتیان کە لەژێر کەپرێکدا دانیشتبوون، پێیان راگەیاندم کەچوونەتە خزمەت

مەلامستەفاو پێیان گوتووە ئێمە لەرێگای رەفیق پشدەریەوە وەلاممان بۆ ناردووی کەدژی ئەم دووبەرەکیەینو بەم هەڵوێستە رازی نین، گوتیان لەکاتی گفتوگۆماندا لەگەڵ مەلامستەفا کەباسی تۆ هات، یەکسەر پرسیاری لێکردینو گوتی: بۆ رەفیق دیار نییە؟ بۆیە بۆمان دەرکەوت کەرێزی تۆ زۆر دەگرێ، بۆچی ناچیتە لای سەردانی بکەیت؟، ئەوێ بۆ تۆ گەلێك لێرە باشترە لەپاڵ مەکتەبی تەنفیزی. گوتم: نەخێر نیازی چوونم نییەو، ئەگەر بشچم بەراشکاوی ئاگاداری دەکەمەوە کەکاك نوریو کاك عەلی بەهیچ جۆرێك منیان ئاگادار نەکردۆتەوە کەمن بێمە خزمەتت تا پێت رابگەیەنم ئەوان دژی ئەم دووبەرەکیەنو لەگەڵ بۆچوونی م.س. نین.

لێرەدا دوو پرسیار دێتە پێشەوە، ئەگەر لەمام جەلال بپرسین ئایا نوری شاوەیس کەهەولی لادانی مەلامستەفای دا لەپارتی، ئایا لەسەر بڕیاری م.س. چووە لای مەلامستەفا؟ هەرچەندە مامۆستا عەلی عەبدوللا لەسەر بڕیاری گشتی لێرە مابۆوەو نەچوو بۆ ئێرانو بەنهێنیو کاروباری حزبی بەرێوەدەبرد، ئایا ئەمیان بەفەرمانی حزبو م.س. لەگەڵ نوریدا چووە پاڵ باڵی مەلامستەفا یان بەرای خۆی؟

مەلامستەفا دەستیکرد بەپلانداانان بۆ پاراستنی بەرژەوندی خۆی، بۆیە فەرمانی دەرکرد

کەدەبێ هێزی پێشمەرگە، ئەوانەی جامانەی سووریان لەسەرە، جلوبەرگی هێزی پێشمەرگە بکەنە بەریان تا لەم رێگایەوە بنەماڵەو کەسوکاریان لەبەرگی پێشمەرگەدا فەرمانەکانی بنەماڵە جێبەجێ بکەن. ئیدریسو مەسعود ئەم فەرمانەیان یەکسەر جێبەجێ کرد. ئەم کارەی بارزانی بۆ ئەوەبوو کەجیاوازی لەنێوان بارزانیەکانو خەڵکانیتردا نەهێڵێو، لەلایەکیتر لەرێگای رێکخستنی زیاتری هێزی پێشمەرگەوە خۆی بەهێز بکا، هەروەها ئەمە بکا بەنامەیەكو بۆ هەموو دۆستو دوژمنی خۆی بنێرێ، بۆ ئەوەی تێبگەن کەبارزانی خاوەنی دەسەڵاتێکی گەورەیە لەسەرکردایەتیکردنی پارتیدا. کوردیش دەڵێ: گورگەو لەبەرگی مەڕدایە.

## دەستپێکردنی پەیوندییەکانی بارزانی

مەلامستەفا لەساڵی ١٩٦١دا کاتێك لەسەر سنوور بوو هیچ حکومەتێك بەپەنابەر وەرینەگرتو، دوای ئەوەی باڵی م.س. چوونە ئێران توانی بەسەر کوردستاندا زاڵبێت، هەر لەو ماوەیەدا بەناوی پشوودان بۆ راوکردن چوو بۆ دۆڵەڕەقە. کاکەزیادئاغاو عەباس ئاغاو شێخ لەتیف بۆ ماوەی پانزە رۆژ جێگری بوون. ئینجا یەکەم حکومەت کەپەیوەندی پێوەکرد رژێمی ئێران بوو، لەگەڵ نوێنەری رژێمی شا بەنهێنی کۆبۆوە، پاشان لەرێی چەند سیاسەتمەدارێکی کورد لەدەرەوەی وڵات پەیوەندی لەگەڵ حکومەتی ئیسرائیل پەیداکرد.

بارودۆخی ئەو رۆژەو ئەو پەیوەندییانەی لەگەڵ ئیسرائیلدا، وایکرد شەڕ لەگەڵ رژێمی عەبدولسەلام عارفدا دەست پێبکاتەوە. گرووپی م.س. هەرچەندە لەئێران بوون بەڵام بەهۆی رێکخستن، لەو گۆڕانکارییەی نێوان مەلامستەفاو رژێمی عەبدلوسەلام عارف ئاگاداربوون، ناچاربوون لەسەر بارودۆخی ئەو رۆژە بڕیاربدەن لەگەڵ هەموو چەکدارەکانیان بۆ کوردستان بگەڕێنەوەو تەنها مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد مایەوە.

پەندێکی کوردی هەیە دەڵێت ئەگەر برا لەپشت برا بێ، مەگەر قەزا لای خودابێت. بۆیە پشتی بارزانیو شۆڕشەکەیان گرت. پێکەوە رووبەڕووی سوپای رژێمی عەبدولسەلام عارف بوونەوەو چەند هێرشێکیان بردەسەری کەدەنگیدایەوە، بەجۆرێك کەدوژمن شکاو ئەم شەڕانە بوونە داستان.

### کاکەزیادئاغای کوڕی ئاغای کۆیە

یەکێکە لەبنەماڵە بەرێزەکانی کورد، لەکوردستانی باشوورو باکووردا بەناوبانگ‌و ناسراوان، هەرچەندە سەرمایەداربوون بەڵام لای هەموو چینەکانی کوردستان رێزیان لێگیراوە، خودی کاکەزیادئاغا مرۆڤێکی رۆشنبیرو نیشتمانپەروەرو سیاسەتمەداربوو، کۆمەکی کۆماری مهابادی کردووە، رێزێکی تایبەتی لای پێشەوا قازی محەمەد هەبوو، بۆیە نامەی تایبەتی بۆ نوسیبوو کەمەلامستەفا وەربگرێت. دوای ئاشبەتاڵ هاتە لەندەن، یەکێك لەکوڕەکانی ناردە لامو پێی راگەیاندم کەتەشریفی دەیەوێت بگەڕێتەوە، بۆ ئەم مەبەستە لێپرسراوانی بەعسم بینی‌و کارەکەم بۆ راپەڕاند.

ئەو رۆژە گەڕایەوە بەغدا لەفرۆکەخانە هۆڵی شەرەفیان بۆ کردەوە، زۆر رێزیان لێگرت ئەوەش لەبەر خاتری خودی خۆی نەك لەبەر بەندە، چونکە لەخزمەتیدابوومو بەرەوپیریەوە چووبووم. منیشیان ئاگادارکردەوە کەپێویست ناکات ئەم پیاوە مەزن‌و نیشتمانپەروەرە بێتە ئاسایشی گشتی تاوەکو هەموو کوردێك کەشۆڕشی بەجێهێشتووەو گەڕاوەتەوە راپۆرت بنوسێت. چونکە لەهەموو ژیانیدا هیچ پەیوەندی بەبێگانەوە نەبووە.

بەندە زۆر نزیك بووم لێی، بەهۆی ئەوەوە زۆر لەنهێنییەکانی خۆی ئاگاداری کردووم،

یەکێك لەمانە کەوا ئاشکرای دەکەم ئەوەیە: قازی محەمەد ئاگاداری دەکاتەوە کەمەلامستەفا بەناوی چارەسەرکردن دەچێتە تەورێز، لەوێ بەنهێنی چاوی بەسەرکۆماری ئازربایجان دەکەوێ، لەدوای گفتوگۆ بەڵێنیان پێدەدا کەهەموو ئەو هێزەی لەگەڵیدابوو بۆ پاڵپشتی کۆماری مهاباد، تەسلیم بەکۆماری ئازەربایجان بکات ئەوەش لەپێناوی ئەوەی کۆماری مهاباد لاواز بێت. پێشەوا بەمە دەزانێت بەخۆی دەچێتە تەورێزو لەگەڵ نوێنەری حکومەتی روسیا کۆدەبێتەوەو گفتوگۆی لەگەڵدا دەکات کەئەمە چ زیانێکی گەورە بەکۆماری مهابادو ئازربایجان دەگەیەنێت، دووبەرەکییەکی وشك لەنێوانیاندا پەیدا دەکات‌و، پێشەوا تاوانەکەی دەخاتە پاڵ سەرکۆماری ئازەربایجان نەك مەلامستەفا. نوێنەری حکومەتی روسیاش یەکسەر هەڵوێست وەردەگرێت‌و نارەزایی نیشاندەداو ناهێڵێت ئەم پیلانە سەربگرێت. جەنابی سەعیدخان هومایۆنی کەخوشکەزای قازی محەمەدەو لەیاوەرانی پێشەوا بوو، لەساڵی ١٩٨٧دا ئەمەی بۆ گێڕامەوە گوتی: دوای ئەو هەڵوێستەی مەلامستەفا کەویستی پێڕەوی بکات، پێشەوا کەتە گومان لەمەلامستەفا بۆیە نەیهێشت ئاگاداری هەموو شتێك بێت بۆ ئەوەی کۆمارە ساواکەیان لێ تێکنەدات.

### عەباس ئاغای مامەند ئاغای سەرەك هۆزی ئاکۆ

سەرۆك هۆزێکی نیشتمانپەروەرە، ژیانی لەپێناوی خزمەتی نەتەوەی کورد تەرخانکردبوو، هەمیشە ئامادەو فیدارکار. لەسەردەمی پاشایەتیدا بۆ رزگارکردنی کوردستان، ماڵو هۆزەکەی بارەگای سەرەکی بوو بۆ هەموو حزبە سیاسییەکانی

کوردستانی باشوورو کوردستانی رۆژهەلات بەتایبەتی بۆ پارتی دیموکراتی کوردستان.

مەلامستەفا دوای گەڕانەوەی بۆ عێراق، نزیکترین سەرۆك هۆز لێی جەنابی عەباس ئاغا بوو، بەجۆرێك کاتێك بەنهێنی لەگەڵ مەلاماتۆڕ کۆدەبێتەوە پێی رادەگەیەنێ کەهەر هێرشێك بۆ سەر عەباس ئاغا واتە بۆ سەر شێخ ئەحمەدی بارزان (سبحان من يغير الأحوال)، بەڵام مەلامستەفا لەو رۆژەی هاتە حەوزی دوکان بەزۆری میوانی عەباس ئاغابوو کە لەسەرکەپکان بوو، کەوتە باسی عەباس ئاغا دەیگوت: هەولی لەناوبردنی م.س.جەماعەتی ئیبراهیم ئەحمەد دەدات.

وایزانی عەباس ئاغا پشتگیرییان دەکات، ئەوەبوو هەڵوێستی بەئاشکرا نیشاندا کەئەمە دەبێتە هۆی دووبەرەکی لەناو شۆڕش‌و زیانێکی گەورە لەسەرانسەری کوردستاندا بەکورد دەگەیەنێ. هەر بۆیە عەباس ئاغا لایەنی حەقی گرت ئەویش باڵی م.س. گروپی ئیبراهیم ئەحمەدبووو پشتگیریکردن.

مەلامستەفا لەبەرچاوی خەڵك بەئاشکرایی پیشانیدا کەعەباس ئاغا رێزی تایبەتی هەیە، بەڵام پیلانی بۆ دانابوو، هەرچەندە ویستی لەپایەی ئەم زاتە نیشتمانپەروەرە کەم بکاتەوە بەڵام هیچی بۆ نەکرا. دوای ئەوەی مام جەلال‌و برادەرەکانی بەیارمەتی عەباس ئاغا هەڵاتن، بارزانی ویستی بەئاشکرا بەربەرەکانی بکات‌و سووکی بکات، بەڵام سوپاس بۆ یەزدانی مەزن هیچی لەگەڵدا بۆ نەکرا.

بەندە بەهۆی ئەوەی کە بەئاشکرا لەدامودەزگا ئەمنییەکانی حکومەت بووم، ئەم شایەتیە دەدەم کەعەباس ئاغا بەهیچ جۆرێك پەیوەندی بەحکومەتەوە نەبووو، کەتەشریفیشی هاتە بەغدا لەنەخۆشخانەی سوپا لەسەربازگەی رەشید وەرگیرا بەهۆی خودی من بوو، حکومەت رێزی لەخودی خۆی دەگرت چونکە پیاوی بێگانە نەبوو.

### شێخ لەتیفی شێخ مەحموودی حەفید

چەند لەسەر ئەم کەڵەمێردە بنووسرێت هێشتا کەمە. لەهەموو رویەکەوە ئازا، دڵئاوا، لەگەڵ گەورەو بچووکدا سادەوساکار، دەوڵەمەندو هەژارو شاو گەدا هەر هەموویانی بەیەك چاو تەماشا دەکردین. ماڵەکەی چ لەسلێمانی یا لەگوندی داریکەلی بارەگای سەرەکیی هەموو حزبە سیاسییەکان بوو چ لەکوردستانی باشوور یا کوردستانی رۆژهەڵات بەتایبەتی بۆ پ.د.ك. هەموو نیشتمانپەروەرو هەژارو هەناسەساردێك، دەرگای هەمیشە لەسەرپشت بوو، پەیوەندی بەخودی خوالێخۆشبوو سەرکۆماری مهابادەوە هەبوو، جگە لەوەی ئەندامی کارای پ.د.ك. بووە. کاتێك مەلامستەفا بۆ شاری سلێمانی دوورخراوەتەوە شێخ لەتیف یارمەتیەکی زۆریدا، هەر ئەویش یارمەتیدا بۆ ئەوەی لەسلێمانیەوە هەڵێت. خوالێخۆش بوو مەلیکی کوردستان فەرمووبووی لەتیفی کوڕم تاجی مەلەکیی لەسەری خۆی کردەوەو خستیە سەری مەلامستەفا.

دوای ئەوەی دووبەرەکیەکە رۆژ بەرۆژ زیاتر پەرەی سەند خۆی نەدا بەهیچ لایەکداو پشتگیری خودی مەلامستەفای نەکرد. بەڵام بارزانی دەسەڵاتی بەتەواوی بەسەر کوردستاندا گرت‌و باڵی م.س. دوورخستەوە، ئەو کاتە بەئاشکرا کەوتە بەربەرەکانیکردنی خودی شێخ لەتیف و سوکایەتی پێکرد. شێخ لەتیف کاتێك لەبەغدا لەگەڕەکی یەرموك خانووی گرتبوو رژێم دوو کلاشنکۆفیان دابوویە بۆ بەرگریکردن لەخۆی، بەڵام بەبێ فیشەك! من فیشەکم بۆ بردو یارمەتیمدا. لەلایەن رژێمەوە خرابووە ژێر چاودێری توندەوەو، کاتێك لەنەخۆشخانە کەوتبوو، لەلایەن بنەماڵەوە هیچ بایەخی پێنەدراو، بەو شێوە شکۆدارەی کە لەبەغداوە هێنرایەوە بۆ سلێمانی لەئەنجامی هەوڵوکۆششی من بوو کەتوانیم لەسەردەمی گزاردا ئۆتۆمبیلی پۆلیسی فریاکەوتن‌و چەند لێپرسراوێکی ئاسایش لەگەڵ تەرمەکەیدا بێنم. سەرەڕای ئەوەی هیچ پەیوەندییەکی بەرژێمەوە نەبوو هێشتا بەدۆستیان دانەدەناو وەکو دوژمن تەماشایان دەکرد. گرنگی پێنەدان‌و دوژمنایەتییەکەی مەلامستەفا بەرامبەر ئەم زاتە لەبەر ئەوەبوو کەدەترسا جێی بگرێتەوە[٤].

[٤] رێزم هەیە بۆ ئەو سێ سەرکردە ناسراوەی لەسەرەوە زۆر بەکورتی باسمکردن. کاکە زیادئاغا دوای ئاشبەتاڵ‌و گەڕانەوەی بۆ بەغدا ئینجا ماهیەتی مەلامستەفای بۆدەرکەوت، لەگەڵ ئەوەشدا نامیلکەیەکی لەسەر ئەو نهێنییانەی کەدەیزانین بڵاوکردەوە. هەروەها خوالێخۆش بوو عەباس ئاغا لەکارستانی بوو ئینجا دڵی خۆی کردەوە، شێخ لەتیف لەکارستانی راهیبات بوو ئەویش لەداخی دڵی خۆی چەند قسەیەکی دەکرد. منیش دەڵێم: بەڕێزان

## سەرکەوتنەکانی بەتالیۆنی ٩ی هێزی قەرەداغ بەسەر سوپای عەبدولسەلام عارفدا

لەبەرگی دووەمدا بەدووردرێژی باسی ئەوەم کردووە کەهەوڵێکی زۆرمدا کەشێخ ئەحمەد بارزانی نەهێڵێت مەلامستەفا هێرش بباتەسەر باڵی م.س. لەماوەت. کاتێك لەگەڵ نوێنەری شێخ ئەحمەد گەیشتینە خزمەت مەلامستەفا، دوای ئەو هەموو سوکایەتییەی کەبارزانی پێی کردمو جوێنی زۆر ناشیرنو هێرشی بردە سەر کەسوکارم، لەگەڵ ئەوەشدا پشتم لەشۆڕش نەکرد، ئەوەبوو کەشەڕ دەستی پێکردەوەو چومە خزمەت برادەرانی مەکتەبی تەنفیزی[٥] کەبارەگاکەیان لەگوندی هەڵشۆ بوو، ئاگادارمکردن کەئامادەم وەکو پێشمەرگە لەخزمەت شۆڕشدا گیانی خۆم بەخت بکەم. برادەرانی م.س. ئەم هەواڵەیان بیستبوو کەهەموو بڕیارێك دەبوو خودی مەلامستەفا لێی ئاگادار بێت بەجۆرێك مەکتەبی تەنفیزی بۆیان نەبوو هیچ بڕیارێك بدەنو لەژێر چاودێری چەند جامانەسورێکدا بوون. بۆیە شیرازەی پێشمەرگە تێکچوو، بۆ نموونە عەزیز عەقراوی دانرا بەئامر هێزی قەرەداغ بەڵام نەیتوانی سەرپەرشتی هێزەکە بکات، چونکە بەشی زۆری پێشمەرگە رێکخراوبونو ئەو بارودۆخەی ئێستایان باش هەڵسەنگاندبوو، وایان زانیبوو ئەمە سوپایەکی نیزامییە فەرمان جێبەجێ دەکات. هەروەها حسابی بۆ ئەوە نەکردبوو خاوەن بیروباوەڕو کۆیلەی ئەو نین! !

هەرچی بەکاك عەلیو نوری گوتبوو دەربارەی من، بوو بەپاڵپشتێك بۆم. کاك نوری مەلامەعروفیان لەجیاتی کاك عەزیز عەقراوی دانا بەئامر هێزی قەرەداغ. منیشیان ئاگادارکرد کە لەگەڵ کاك نوری دەبێت بەپێشمەرگەو دوایی بڕیارێکی لەسەر دەدەین. گوتم: لەئەنجامی ئەو رووداوەی کە لەنێوان بارزانیو باڵی م.س. روویدا بەشێکی زۆر لەپێشمەرگە ئازاکان ئێستا لەماڵی خۆیان دانیشتون، ناسیاویەکم لەگەڵیاندا هەیە کاتێك کە لەبەمۆ بووم، دەتوانم یەکەیەکە پەیوەندییان پێوە بکەم بۆ ئەوەی بێنەوە ریزی پێشمەرگە، ئەمەش سودێکی گەورەی دەبێت بەڵام باش بزانن ئەمانە بەجەماعەتی ئیبراهیم ئەحمەد ناسراون دوایی راپۆرتی زۆرم لەسەر دێت. دکتۆر مەحمود عوسمان گوتی: ئەمە سوود بەشۆڕشەکەمان دەبەخشێت، زۆرمان پێ باشەو پشتت دەگرینو چاومان لێت دەبێت.

بەرەو جێی دیاریکراو رێگامان گرتەبەر، کاك نوری ئامر هێزو عەقید عەبدوڵڵا(عەبە کەلەك) جێگری ئامر هێز، چوینە خزمەت شێخ لەتیفی شێخ مەحمود لەداریکەلی. لەوکاتەدا سوپای رژێمی عەبدولسەلام نیازی هێرشی هەبوو، بۆیە دەستیکرد بەتۆپبارانکردنی

ئەزمڕ، کاك نوریو بەندە کەوتینەڕێو گەیشتینە ناو پێشمەرگە لەقەرەداغ.

کاك تاهر شێخ رەئووف جێگری هێزی قەرەداغ بوو کەژمارەی هێزەکە ١١٥٠ پێشمەرگە دەبوو، ناوچەکەی خۆیان بەجێهێشتبوو بەتێکڕایی لەقەرەداغ کۆببونەوە, لەشکرێکی بێسەرووبەربوو، رۆژانە ژمارەی ١٠ پێشمەرگە زیاتر دەچووە

ئێوە لەیەکەم رۆژەوە زاتی مەلامستەفاتان ناسی، بۆچی یەکێکتان هەوڵتان نەدا جێی ئەو بگرنەوە, ئەگەر هەوڵتان داباو راستییەکانی ئەم پیاوەتان دەرخستایەو پاڵتان بەباڵی م.س. بدایە ئێستا کوردستانی سەربەخۆمان دەبوو. راستە ئێوە هەوڵێکی ئێجکار زۆرتاندا کەئەم دووبەرەکییە دروست نەبێت, تەنها ئێوەی بەڕێز لەیەکەم رۆژەوە رووبەڕووی مەلامستەفا راوەستان بەڵام لەهەمانکاتدا پشتیتان بەرنەدا، کاتێکیش هەموو شتێکی کۆنترۆڵکرد ئیتر هیچ بایەخێکی بەئێوە نەدا.

[٥] مەکتەبی تەنفیزی بەفەرمانی خودی مەلامستەفا دانرابوو، بەو نیازەی کەجێگای باڵی م.س. گروپی ئیبراهیم ئەحمەدی دەگرتەوەو شۆڕش بەهێز دەکەن لەئاستی پێشمەرگەی ریزی رێکخستن. بەڵام بەداخەوە لەبەر چەند هۆیەك سەرنەکەوتن، نەك هەر جێگای ئەوانیان نەگرتەوە بەڵکو شیرازەی پێشمەرگەو رێکخراوەکان تێکچوو، چونکە بەفەرمانی ئەمانە بوون بەئەندام لەکۆنگرەی شەشەمی قەلادزێو پێشمەرگەو رێکخراو بایەخیان پێنەدانو لەئەنجامدا ٢٪ی ئەندامەکانی چوونە پاڵیان.

ماڵەوەو دادەنیشتن. کاک عەزیز عەقراوی وایزانییبوو هەروا بەئاسانی جێگای کاک کەمال مفتی دەگرێتەوە، ئینجا لەجیاتی مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد، حەبیب عەبدولکەریم بەفەرمان دەکرێتە سکرتێری پ.د.ك. بەم شێوەیە شیرازەی هێزەکە تێکچوو. شایەنی باسە کاک تاهر شێخ رەئووف هەوڵێکی زۆری دابوو کەچارەسەرێك بدۆزێتەوە بۆ ئەم گیروگرفتانەی، رۆژانە لەهەوڵدابووەو دریغی نەکردووە. بەڵام کێشەکە گەلێك گەورەتر بوو باری زۆر قورس بوو.

ئەم بارودۆخەی سەرەوە بوو بەهۆی ئەوەی جێگرەکانی کاک نوری لەداریکەلی بمێننەوە. بەندەش جێی جێگرەکانو لێپرسراویەتیی دارابیم گرتەدەست. پێشمەرگەکانی بەتالیۆنی ۹ بەتێکرایی مانیان گرت، دەیانگوت دەبێت دکتۆر رەفیق بکرێتە ئامر بەتالیۆنی ۹، هەندێك پێشمەرگەی گەرمیان وەك کاک نوریو د.مەحموود عەلی عوسمان داوایان لێکردم ئەم ئەرکە وەربگرم، بۆیە بوم بەئامر بەتالیۆنی ۹. بەندە پەیوەندیکرد بەهەموو ئەو برا پێشمەرگە کۆنانەی کە لەیەکەم رۆژی شۆڕشەوە خەباتیان دەست پێکردبوو بەڵام بەهۆی دووبەرەکی دانیشتبوون. ئەوانەی بەدەنگمەوە هاتنو یەکسەر هاتنەوە لەوانە: عەزەی حەمەخەنانو عەزەی ئەورەحیم. راستە هێزی قەرەداغ بەژمارە زۆربوو، بەڵام ئەم ۱۲ پێشمەرگەیەی کەهاتن ورەی هەموو هێزەکەیان بەرزکردەوە، چونکە بەجۆرێ ناسرابوون کەپێویستە هەر یەکێك لەمانە پەیکەرێکی بۆ دروست بکرێت. هەرچەندە تەنها عەزەی حەمە خەنان ماوە بەڵام نانی شەوی نییە، منیش لەو هەژارترم! کەچاوم پێکەوت خۆم شاردەوە چونکە گیرفانم بەتاڵ بوو!

بەمەبەستی خۆڕێکخستنو خۆ ئامادەکردن بۆ رووبەڕووبوونەوەی دوژمن، کاک نوری مەلامەعروف ئامر هێزی قەرەداغ کۆبوونەوەیەکی بەهەموو لێپرسراوەکانی کرد، دەستیکرد بەقسە دەربارەی بارودۆخی ئەوەی کە بە چ جۆرێك دەتوانین بەسەر سوپای رژێمدا زاڵ بین. لەئەنجامی ئەم کۆبوونەوەیە دوو بۆچوون هاتە کایەوە، یەکەمیان ئەوەبوو کەپێویستە هەموو هێزەکە بچێتە شاخی بەمۆو پاشەکشە بکەین، ماوەیەك لەوێ بینو بحەسێینەوە ئینجا بەتەواوەتی خۆمان رێکخەینەوە ئینجا بگەڕێینەوە هێرش بەرینەسەر دوژمن.

کاک نوری رووی لەمنی پرسی تۆ دەڵێیت چی؟ گوتم: من ئامادەنیم ئەو بڕیارە جێبەجێ بکەم، ئەگەر رێگاشم بدەیت دەچمەوە بەغدا، هاوسەرەکەم دەوڵەمەندە، کەی ئێوە گەڕانەوە بۆ قەرەداغ منیش دێمەوە. من بەم ماوەیە شارەزای برا پێشمەرگەکان بووم، کەموکورییەکی زۆریان هەیە بەشێوەیەك زۆریان پێڵاویان لەپێدانیە، رووتو برسین، بە ۵۰۰ دینار کێشەکانیان جێبەجێ دەکەم، بەڵێنتان پێدەدەم دوای چەند رۆژێك هێرش دەبەینە سەر سوپای دوژمن، ئیتر یا هەموومان شەهید دەبین چونکە خۆم لەپێشتانەوە دەڕۆمو، بەجۆرێك هێرش دەبەینە سەر دوژمن ئینشاللا جێدەستمان دیار دەبێت.

ئینجا کاک نوری پرسیاری لەکاك ئەحمەد بانیخێلانی کرد کەڕای ئێوە چییە؟ مامۆستا ئەحمەد بانیخێلانی گوتی: من لەگەڵ رای دووەمم, بڕی هەزار دینارم لایە هی مەکتەبی سیاسییە کەهەندێك شتی تایبەتیان بۆ بکڕم، دەتوانم ئەوەی لەو پارەیە ماوەتەوە بیدەمە دەست جەنابتان. پاشان پرسیاری لەکاك حەمید بەرواری کرد کەئامر بەتالیۆنی ٥ بوو ئایا رای تۆ چییە؟ گوتی: من راناکەم، دەچمەوە سنووری ناوچەی خۆم کەزەنگەنەو بەشێك لەناوچەی داودەیە، من کەهاتوومەتە ئێرە رامنەکردووە بەڵام عەزیز عەقراوی بەزۆر هێنامی. کاک نوری گوتی: زۆر جار سەربازێك دەبێتە هۆی سەرکەوتنی لەشکرێکی روخاو. ئینجا سوپاسی بەندەی بچوکتانی کردو گوتی: منیش لەگەڵ بۆچوونی تۆم کاك رەفیق، ئینشاللا سەرکەوتوو دەبیت. ئینجا بڕی ۵۰۰ دیناریان دامێ.

یەکەم شت ۲۸۰ پێڵاوی لاستیکم کڕی بەنرخی (ماشان) بە ۲۷۵ فلس، بڕی۱٥دینارمان

دا بەسابوون، بایی ٥٠ دینار کراسمان کڕی. سی رۆژ گۆشتو نانمان خوارد، رۆژی ٦ گیسکمان سەر دەبڕی کەگیسکی بە ٥ دیناربوو.

پێشمەرگەکانم کۆکردەوە, گوتارێکم پێکەشکردن گوتم: سی رۆژە ئێوە بەگشتی هەر هەمووتان خەریکی خۆشتنو خواردنو پشودانن, ئایا پرسیارم لێناکەن ئەمە چییە؟ ئەمە نەمەولودی پێغەمبەرە (صلی الله علیەوسلم) نە ژنم هێناوەو جەژنیش نییە، ئەگەر میوانداریش بێت یەك رۆژە، بوونمان لێرە بۆتە هۆی ئەوەی دانیشتوانی گوندی سێوسێنانو گوندی ئالیاوە توانجمان لێبگرن، ١٥ رۆژ پێش ئێستا لەماڵێك بووم، کاتی نانخواردن گوێم لەهاوسەری خانەخوێ بوو گوتی دکتۆر رەفیق هەر خۆی قەڵەودەکات, کەی ئەمانە پێشمەرگەن، عەرەبی حەویجە لەقۆپین، رۆژ نیە ٧ – ١٠ پێشمەرگە ریز بەجێ نەهێڵێتو روونەکاتەوە ماڵی خۆی، زۆرتان لەبەمۆوە دەناسم، لەجەولەی ناوچەی هەڵەبجەو گەرمیان بەیەکەوەبووین، بیرتانە جەماوەر چۆن بەپیرمانەوە دەهاتن، ئێستا کەدانیشتوانی ناوچەکە پشتمان تێدەکەن، ئایا ئامادەن کەبۆیان بسەلمێنن ئێمە پێشمەرگەی کوردستانین, یان با بەیەکجاری چەك دابنێینو رووبکەینەوە ناو ماڵو منداڵی خۆمان؟ چ رێگایەك بگرینەبەر، رووبەرووی دوژمن بوەستین یا پشتی تێبکەینو کوردساتنیان تەسلیم بکەین؟ زیاتر لە٣٨٠ پ.م.بەیەك دەنگ هاواریانکرد یاکوردستان یان نەمان.

بۆیە یەکسەر لێپرسراوانی بەتالیۆنی ٩و بەندەی خزمەتکاری کوردو کوردستانو حسەینی حاجی محێدین یاریدەدەری ئامر بەتالیۆنو، هەر سێ سەرلق عەزەی حەوا، حسەینی خەلیفە مالك، کامیلی مەلاوەیسیو هەموو سەرپەلو سەردەستەکان کۆبووینەوە لەگەڵ برا پێشمەرگەکان بەسەرکردایەتی عەزەی حەمەخەنان. یەکەم کارمان لەسەعات چواری شەو بۆسەیەکمان لەنزیك گوندی تەکیەی قەرەداغ نایەوە، بەیانیەکەی کەرۆژ هەڵهات لەگەڵ ٣٥ پێشمەرگە کەوتینە بۆسەی سوپاو هەر چواردەورمان گیرابوو، جێگا بەرزەکان بەدەست ئەوانەوە بوون. هەرچەندە لەکاتی بۆسەداناندا ئێمە ٣٨٠ پێشمەرگە بووین، بەڵام تەنها منو ٣٥ پێشمەرگە کەوتینە ناو ئەم بۆسەیەوە. لەهەمانکاتدا فرۆکە هات بۆردومانی کردین، بلام لەجیاتی ئەوەی راکەین ئێمە هێرشمان بردە سەریان بۆیە شکانو هەلاتن. شەڕ چەند سەعاتێك بەردەوام بوو، نوسراوێکم ئاراستەی ئامر هێز عەقید نوری کرد، پێم راگەیاند کەیەك پیشمەرگە زامدارە فیشەکێك بەر بەلەکی کەوتووە، زامەکەی زۆر سووکە هەر زوو چارەسەرمکرد، لەو شەڕەدا ٢٣٥ فیشەکمان بەدوژمنەوە ناوە. دەستکەوتمان چەند تەنکەرو دوو فەردە برنجو فەردەیەك شەکرو چەند کیلۆیەك چا لەگەڵ دوو تاوەی پڕ لەکوللەی لەرۆن سورکراوبوو. دوژمن هەرچی کوژراوو زامداریان هەبوو لەگەڵ خۆیان بردیان، هەندێك فیشەکی کلاشینکۆف بەدەسکەوت کە لەرژێم جێما. بەجۆرێك نزیکبووینەوە لەیەکتر کەخەڵکی گوندی ئەم ناوە بەتایبەتی گوندی سێوسێنان وایانزانیوە کەئێمە کەسمان نەماوە، چونکە فرۆکەکان هێرشێکی زۆریان هێنایە سەرمان، کاتێك شەڕ تەواوبوو چامان لێنابوو نانمان دەخوارد، کەپیاوو ژنو منداڵی گوند بەگریانەوە هاتنە لامان کەدیتیان ئێمە سەرکەوتنمان بەدەستهێناوە گریان بو بەگۆرانیو هەڵپەڕکێ.

ئەو کاتەی چوومە خزمەت کاك نوری ئەوەندە رێزی لێگرتم شەرمەزاریکردم، گوتم: سوپاس بۆ خواو پێشمەرگەو دانیشتوانی ناوچەکە, من تەنها پێنج فیشەکم تەقاندوە. دوای ئەم هێرشە بەچەند رۆژێك سوپای دوژمن هێرشی هێنایەوە سەرمانو پێشمەرگەکانی بەتالیۆن ٩ بەرامبەریان وەستان, ئەم جارەشیان لەسایەی خوای گەورە سەرکەوتین.

**دوو روداوی گرنگ لەکاتی ئەو شەڕەدا :**

کاتێك بەرەوڕووی دوژمن دەرۆیشتین سەعات ٨ی شەوبوو جارێ دوژمن هەر تۆپبارانی دەکردین، نەفەرێك هاتە لام گوتی: دکتۆر رەفیق کاری تایبەتیم پێتە، من توانای ئەوەم نیە بەرامبەری ئم شەڕە راوەستم چونکە نەخۆشم، رەوانەم بکەوە بۆ هەڵشۆ، دەچمە لای مەکتەبی تەنفیزی فیشەکت بۆ پەیدا دەکەم، تکام ایە دوو پێشمەرگەم لەگەڵ بنێریتو ئەم هەواڵە بڵاونەکرێتەوە. منیش یارمتیمدا.

دوای تەواوبوونی شەڕ برایەکی جوتیار هاتە لام گوتی: من بێستانی کاڵەکم هەیە، گوێدرێژەکەمم برد برێك لێکەمەوە لەشار بیفرۆشم، کاتێك سەرنجمدا بێستانەکەم هەمووی رندراوە, ماوەی دوو سەعات گەڕام یەك کاڵەکەم دۆزیەوە. گوتم: خۆت باش دەزانی ئەم شاخە ئاوی نییە، دوژمن بەتۆپباران ئاگری تێبەرداوە، ئێمە نزیکەی ٤٠٠ پێشمەرگە بووین زمانمان لەتینوویەتییان وشك بوو ئاو نەبوو بیخۆینەوە، کاتێك بێستانەکەی تۆمان چاوپێکەوت دەستمانکرد بەخواردنی, ئێمەی رزگارکرد، ئەگینا بەشی زۆرمان دەخنکاین، هەرچی تۆ دەڵێیت بەسەرچاو، بڕی ٣٠ دینارم پێیە هەر هەمووی بۆ تۆ بێت. گوتی: منساڵی بایی ٢٥ تا ٣٥ دینارم دەفرۆشت، لەگەڵ ئەوەشدا فەقیر حاڵم، بەڵام مادام ئێوە بەم جۆرە ئازان پارە وەرناگرم. شایەنی باسە کەدارایی بەتالیۆنەکە هەمووی ٣٠ دینار بوو، ١٥ دینارم پێدا. حزب فەقیر، میللەت دەوڵەمەند.

ئینجا ئێمە لەهەموو لایەکەوە دەستمانکرد بەهێرش بردنەسەر سوپا، تەنهادوو لەو شەڕانە باسدەکەم. ئێوارەیەکیان ٥٠ پێشمەرگەبوین هاتینە سەر قەرەداغ کاتێك
کەسەربازەکان نانی ئێوارەیان دەخوارد، ١٥ کەسمان بەجۆرێك لێیان نزیك بوینەوە، دەمانچەی حەوت تیریان دەگەیشتێ، کەدەستڕێژمان لێکردن هەر یەکە بەلایەکدا هەڵاتن، زاڵ نەبووین کەبتوانین دەستگیریان بکەین. لەدادگای شۆڕشی بەعس یەکێ لەتاوانەکانی من ئەوەبوو کەدەیانگوت تۆ ئەو سەربازانەت کوشتووە. لەبەر ئەم شەڕو نەبەردییانەی هێزی پێشمەرگە دانیشتوانی ناوچەکە بەتێکڕایی بەرامبەر پێشمەرگە گۆڕان، کەروومان تێدەکردن بەجۆرێك بەپیرمانەوە دەهاتن خزمەتێکی زۆریان دەکردین، بەشی زۆری ئەو برا پێشمەرگانە کەدانیشتبوون هاتنەوە ریزی براکانیانو رووبەڕووی دوژمن وەستان. ئەوەبوو دەستپێشخەری کەوتە دەست ئێمەو بەردەوام لەچالاکیدا بووینو، لقی مامۆستا ئەحمەد بانیخێڵانیش بەردەوام بوو لەهێرش بردنەسەر سوپای دوژمن. ئێمە یەکەم کەس بووین کەتوانیمان بچینە ناو نەخۆشخانەی سوپا لەدەربەندیخان کەمەبەستمان دەستگیرکردنی خۆفرۆش ئامر فەوج عەقید فایەق بوو، چونکە زۆر ئازارو ئەشکەنجەی هاولاتیانی دەدا.

بۆ دەستگیرکردنی عەقید فایەق, ئەوەی یارمەتیداین کەبچینە ناو نەخۆشخانەکە هاوولاتیی نیشتمانپەروەر کاکەحەمەی حاجی مەحموودی (پونگڵە)ی هاروونی بوو، کە لەگەڵماندا هاتو هەموو فیداکارییەکی نواند بەڵام بەداخەوە دوو رۆژ پێش هێرشەکەمان عەقید فایەق نەخۆشخانەکەی بەجێهێشتبوو، بۆیە بەناچاریو بەسەلامەتی گەڕاینەوە.

لەگەڵ ئامر هێز کۆبوینەوە ئاگادارم کرد گوتم: گەورەترینو گرنگترین ناوچەی گەرمیان کەسنووری بەتالیۆنی ٩یە سنوورەکەی شاخی حەمرینە, بەشی زۆری ئەم ناوچەیە چۆڵکراوە، چڵکاوخۆرەکانی میری لەنێوان کفریو کەلارو نزیك جەلەولا هاتوچۆ دەکەن و بەشی زۆری پێشمەرگە خەڵکی ئەم ناوچانەن, وا سێ مانگە بەفەرمانی عەزیز عەقراوی هاتوینەتە قەرەداغ بەڵام ئێستا پێویست ناکات چونکە بارودۆخ لەناوچەکەدا ئارامە. بەڕێزتان بارەگاکەتان لێرەیە، تکام وایە لەبەر بەرژەوەندی گشتی رێگامان بدەیت هێزی بەتالیۆنی ٩ بگەڕێتەوە شوێنی خۆی. گوتی: رازیم بەڵام دەبێت

چالاکیو فیداکاریتان وەك ئێستا هەر لەبەرچاوبێت، چۆن کاك کەمال موفتی شەمەندەفەرێکی گرت تۆش کاری لەمە گەورەتر بکەیتو جێدەستتان دیاربێت.

بەڵێنمان پێدا کەهەرچی لەتوانامانداپە بۆ شۆڕش درێغی نەکەین، بۆیە بەمەبەستی

گەڕانەوەمان لەگەڵ برایانی سەرلقو سەرپەلو سەردەستەو ئامرو یاریدەدەری بەتالیۆن کۆبوونەوەمان کرد، نەخشەمان داڕشتو، بیرمان لەوە کردەوە هەڵوێستو پلانمان لەبەرامبەر دوژمنو چڵکاوخۆرەکانی هەبێت. دانیشتوانی ناوچەکەو سێ لق هەریەکە شوێنیان بۆ دیاریکراو ئەوانەی بۆ بۆسە دانرابوون کەوتنەڕێ بێئەوەی لەیەك گوند لابدەن. چونکە دوژمنانمان ئەوەندە بێ ترس هاتوچۆدەکەن هەرچی مەترسی هەبێت لەپێشمەرگە نەیانماوە، ئێوە کەزۆرتان خەڵکی ناوچەکەن بەشێکتان بارودۆخی ئابوریتان باش نیە، وا ئەو پارەیەی هەمانە کەبڕی ٢٤٠ دینارە، ٢٠ دیناری بۆ بارەگای بەتالیۆن دەگێڕمەوە، ئەوەیتری تەسلیم بەکاك حسەینی حاجی محێدین دەکەم کە بەسەر ئەو برا پێشمەرگانەدا دابەشی بکات. حزب فەقیر، میللەت دەوڵەمەند. کامیلی مەلاوەیسیو عەزەی حەواو عەریف کازم هەریەکە لەگەڵ ١٢ پێشمەرگە لەلقەکەی خۆیان بوون کەوتنەڕێ بۆ بۆسەدانان.

قەرەداغمان بەجێهێشت، بەیانیەکەی بەرەو گوندی دەرواز دەهاتین، تازە خوشکان خەریکی مانگاو مەڕو بزن دۆشین بوون، لەخۆشی ئەوەی پێشمەرگە بەرەو ئاوایی دێت هاوار هاوارو هەلهەلە دەستی پێکرد، دانیشتوانی گوند بەتێکڕایی بەپیرمانەوە هاتن لەپێش هەموویانەوە جەنابی کاك حەمەی تۆفیق راوگەل، کوێخاو خاوەنی گوندەکە دەستی خستە ناو دەستم گوتی: دکتۆر رەفیق دەمێکە چاوەڕوانی ئەو رۆژەم دەکرد.

بەجۆرێك پێشوازی لێکردین نانوسرێت, رێزوو سەخاوەتی ئەم پیاوە مەزنە رێگای نەداین دابەش بین بەسەر ماڵانەوە کەژمارەمان نزیکەی ٣٢٠ پێشمەرگە دەبوو. شەوو رۆژێك ماینەوە، بۆ نانخواردن پێکەوە بووین، بەڵام بۆ کاتی پشودان دابەش دەکراین، لەو ماوەیەدا مانگایەكو چوار مەڕو گیسکیان بۆ سەربڕین. حزب فەقیر میللەت دەوڵەمەند. بەڵام بەداخەوە تۆفیق ٢٦ کەسی لەهێرشە بەدناوەکانی ئەنفال ون بوو، ئێستا خۆیو هاوسەرەکەی لەمحمودییەی بازیان ژیانێکی سەخت بەسەردەبەن، بەهۆی ئەوەی گیرفانم بەتاڵە نەمتوانیوە سەردانی بکەم، دیارە بارودۆخی خراپە وەکو من چونکە سەر بەهیچ حزبێك نییە! لەگوندەکە پێشوازیم لەخەڵك دەکرد، بەڵام چاوەڕوانی ئەوەم دەکرد کەدەنگی سەرکەوتنی پێشمەرگەم بۆ بێت. کاتێك پێشمەرگەیەك لەلقی کامل وەیسی زەنگەنە هەواڵی سەرکەوتنی بڵاوکردەوە، داوام لەکاك محەمەد تۆفیق کرد کەدوای نان خواردن دەمەوێت گوتارێك پێشکەش بەدانیشتوانی ئەم گوندە بەرێزە بکەم. لەوتارەکەدا بەدوورودرێژی باسی دڵسۆزیو فیداکاریو خۆبەختکردنی پێشمەرگەم بۆکردن, لەهەمانکاتدا پێم گوتن ئەگەر ئێوە بەم شێوەیە پشتیوانی لەئێمە نەکەن، بەهیچ جۆرێك سەرکەوتن بەدەست نایەت. لەدرێژەی قسەکانمدا ئاماژەم بەسەرکەوتنی هێزی پێشمەرگەداو گوتم: لقی کامل وەیسی زەنگەنە بۆسەیەکی لەتاقەکانی کفری ناوەتەوە چڵکاوخۆرەکانی دوژمن کەوتونەتە ناویو کەسیان لێ رزگارنەبووە، کوژراوو زامدارو دیلی زۆریان هەیە، ئەمە یەکەم سەرکەوتنمانەو ئینشائەللا چاوەڕوانی سەرکەوتنی گەورەتر بن.

دوای ئەمە بروسکەیەکم بۆ ئامر هێزی قەرەداغ رەوانەکرد ئەمە کورتەکەیەتی:

**بۆ ئامر هێزی قەرەداغ: عقید نوری مەلامەعروف**

**لەرەفیق پشدەری، ئامر بەتالیۆنی (٩) ەوە**

**راپۆرتێك دەربارەی بارودۆخی ناوچەکەو هەواڵی ئێمە :**

*دوای سلاو... سەرەتا پێویستە لەوە ئاگادارت بکەمەوە کەئێمە ئەوپەڕی برایەتیمان بەهێزە لەگەڵ یەکداو سوێند بەسەری یەك دەخۆین، تەنها گیروگرفتێك کەهەمانبێت فیشەکە، بەجۆرێك پەیوەندیمان بەجەماوەر بەهێزە ٩٩٪ی دانیشتوانی ناوچەکە لەگەڵ شۆڕشدان، ژمارەمان گەیشتۆتە ٤٥٠ کەس، کاتێك رۆژی تەنگانە بێتە پێشێ ٢٠٠٠ هاوڵاتی پشتگیریمان دەکەن، پیاوە ناسراوەکانی ناوچەکە رێزمان لێدەگرن‌و بەگشتی یارمەتیمان دەدەن، لەوانە جەنابی مستەفا بەگی جاف‌و بەشی زۆری کۆێخاکانیان بەتایبەتی هی رۆغزایی‌و تەرخانی‌و هارونی‌و میکائیلی‌و باشتی‌و کەملی‌و وێسوجانی‌و نەورۆلی‌و کێلەکۆیی. حاجی ئیبراهیم شاتری بڕی ٥٠٠ دیناری بۆ هێنام بەنهێنی، ئاغاکانی زەنگەنە شایانی باسکردنن بەتایبەتی رۆستەم ئاغا کەهەموو سەروەت‌و سامان‌و توانای لەپێناوی کوردو کوردستان تەرخانکردووە. ئاغاکانی ناودەشت خراپ نین، ئێستا لەسەرانسەری ناوچەکە بەدوای پیاوی خراپدا دەگەڕێن کەئەوەندە کەمن بەنووکی دەرزی نادۆزرێنەوە، پیاوخراپەکان کونەمشکیان لێ بۆتە قەیسەری، کار بەرەو ئەوە دەڕوا ئەم ناوچەیە سەرانسەری بەرامبەر پیاوانی میری‌و چڵکاوخۆرەکانی داخراوبێت. هەروەها پەیوەندیم بەرێکخراوی کفری‌و سەرقەڵا کرد، ئێستا ئاگاداری یەکترین‌و، چەند پێشمەرگە کەسەر بەجەماعەتی مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەدبوون دانیشتبوون پەیوەندیم پێوەکردن چەند کەسێکیان هاتنەوە ریزی پێشمەرگە. بەڵام ٦ پێشمەرگەی هێزی خەبات رایانکردو هاتنە لای ئێمە، ناچاربووین وەریانبگرین، ئێمە نە دەزگای ئاسایشین نە پۆلیس، ئێمە پێشمەرگەین‌و رووبەرووی دوژمن راوەستاوین.*

## تێبینی

*١–حاجی حەمەجان کەپیاوێکی جاف بوو پیاوێکی دەوڵەمەندو ناسراوە، ئێمە وەکو هەموو پیاوە ناسراوەکانی ناوچەکە سەردانمانکردو رێزمان لێگرت، بەڵام بەساردییەوە بەخێرهاتنی کردین. لەو شەوانە لەگەڵ حەوت چەکداریدا هاتە لامان و بەشێوەیەکی زۆر ناشیرین گوتی: من خاوەن ٧٠ چاڵ گەنم‌و جۆم هەروەها ٥٠٠ سەر مەڕم لەنزیك سەرقەڵا هەیە، ئێستا کەهاتوومەتە بارەگاکەتان دەبینم بریتیە لەیەك فەردە برنج‌و ئاردو شەکرو یەك تەنەکە رۆن لەگەڵ چوار کیلۆ چا، ئێوە گون رووتن. ئەم قسانەی گوت‌و سواری ولاغەکانیان بوونەوەو گەڕانەوە شوێنی خۆیان.*

*منیش برووسکەیەکم بۆ هێزی قەرەداغ لێدا پاشان بۆ بارەگای بارزانی گوتم: حاجی حەمەجان مانگی بڕی ٢٥٠ دینارمان پێشکەش دەکات, تەشریفی هاتبوو یەك سندوق فیشەکی ئینگلیزی‌و بڕی ٢٥٠ دیناری تەسلیم کردم، پێویستە شۆڕش رێزی لێبگرێت، تکام وایە ئێوەش نووسراوێکی ئاراستە بکەن چونکە ئەم پیاوە جێی رێزی ئێمەیە.*

*دوای بروسکەکەی من بەسێ رۆژ حاجی حەمەجان هاتە لامان، ئەمجارەیان بەرێزەوە دیاری بۆ هێنابووین، نزیکەی ١٠ چەکداری لەگەڵدا بوو، بەدوورودرێژی بۆی باسکردم کەهێزی سوپای گەڕۆك بەفەرماندەیی تەها شەکرچی هاتونەتە سەر گوندەکەو ئازارو ئەشکەنجەیەکی زۆری دانشتوانی گوندەکەیان داوە، بەڵام من ئەو کاتە لەدەرەوەی گوندبووم, ئینجا گوتی: لەئێستاوە بەپێشمەرگەم دابنێن، کەی هێرشتان بردەسەر دوژمن*

*لەخزمەت ئێوەدا دەبم و بەهەموو توانایەکمەوە یارمەتیتان دەدەم.*

*بەڵام ئەو کابرایە نە فیشەك نە پارەی بۆ نەهێنابووین, بۆیە ئەم بروسکەیەم بەکراوەیی ناردبوو تا بزانم هەڵوێستی دوژمن چۆن دەبێت، قسەم بۆ برا پێشمەرگەکان کرد گوتم: سوپاس بۆ یەزدانی مەزن هەتاکو دوژمنان بەم جۆرە گەوج و ئاوا بێمێشك بن بەهیچ جۆرێك مەترسییان لەسەر کوردستان نابێت.*

*٢- تەها شەکرچی: ئەفسەرێکی خوێنمژبوو, لەکۆیە ٨ کەسی لەبەرچاوی دانیشتوان لەسێدارەدا.*

بۆ دانانی نەخشەی تازە لەگەڵ هەموو لێپرسراوانی بەتالیۆنی ٩ لەبارەگاکەماندا کە لەئاوەسپی بوو لەسەرووی خان رۆستەم ئاغا, کۆبووینەوە. پێشەکی لەپێشمەرگەکانم پرسی ئایا هیچ گلییەکتان بەرامبەر من هەیە، ئایا من دزم؟ کەشەڕ دەبێت لەپێشەوەی ئێوە نیم؟ بەگشتی وەڵامیان دامەوە گوتیان ئێمە هیچ گلەییەکمان لەتۆ نیە. گوتم: من کەخۆم دزی نەکەم ناهێڵم ئێوەش دزی بکەن. لەئەنجامی گفتوگۆو لێکۆڵینەوە بۆ پڕکردنەوەی پێداویستیی لێپرسراوەکان، رێککەوتین یاریدەدەری ئامر بەتالیۆن و سەرلق و لێپرسراوی ئازوقە مانگی ١٢ دینار, سەرپەل و سەردەستە مانگی حەوت دیناریان هەبێت.

**بۆ ئامر هێزی قەرەداغ عقید نوری مەلامعروف**

**لەرەفیق پشدەری ئامر بەتالیۆنی (٩) ەوە:**

*راپۆرتێك دەربارەی بارودۆخی ناوچەکە و بەشێك لەهەڵوێستەکانمان کەرووبەڕووی دوژمن وەستاوین دەیخەمە بەرچاوتان، هەرچەندە رۆژانە هەر هێرشێکمان کردبێتە سەر دوژمن بەبروسکە ئاگاداری ئێوەو هەرەوەها بارەگای بارزانیمان کردۆتەوە. ئێستا لەسەرانسەری ناوچەی گەرمیان بەهیچ جۆرێك دوژمن دەسەڵاتی ئەوەی نییە بەشەو لەماڵی خۆی بخەوێت، بەرۆژیش ناتوانێت ئازارو ئەشکەنجەی هاوڵاتیان بدات، لەسەرقەڵاو کفری و باوەنورو دەربەندیخان بەکرێگیراوانی دوژمن ناتوانن بەقەدەر یەك مەتر دیواری میری بەجێ بهێڵن...*

*مەفرەزەیەکی سەربازی لە ١٠ سەرباز پێکهاتووە و لەنێوان سلێمان بەگ و گوندی قۆری چای ئازارو ئەشکەنجەی هاوڵاتیان دەدا، لەرێکخراوی کفری چەند راپۆرتێکم بۆ هات کەدەبێت هیچی تر رێگا بەم تاوانبارانە نەدەیت. لەگەڵ لقی حەسەنی خەلیفە مالك چوینە سەریان دوای شەڕێکی نیو سەعاتی چوارمان لێیان بەدیل گرت و رەوانەی ئێوەمان کردن، خۆشمان بەسەلامەتی گەڕاینەوە.*

*ئەو شەوەی عارف عەبدولرەزاق ویستی کودەتا بەسەر عەبدولسەلام عارفدا بکات، لەگەڵ لقی کامیل مەلاوەیسی زەنگەنە چوینە ناو توزخورماتو دوو سەعات ماینەوە کۆنترۆڵی شارەکەمان کرد، بۆ ئەم مەبەستە لەگەڵ دوو ئەندامی رێکخراوی توزخورماتو نەخشەمان دارشتبوو، سەعات ٨ی شەوو لەجێی دیاریکراو چاوەڕوانمان بن، بەڵام نەهاتن. سوپاس بۆ یەزدانی مەزن وەکو نەهاتن زیانیان لێنەداین، بەڵام ئەگەر شارەزامان لەگەڵ بایە بەشی زۆری کاربەدەستەکانمان بەدیل دەگرت. لەو چالاکییەماندا بەیەك شەو لەیەك سەعاتدا هێرشمان بردە سەر کفری و سەرقەڵاو دەربەندیخان بەو نیازەی ناحیەی باوەنور بگرین، لەگەڵ لقی عەزەی حەوادا چوین بەداخەوە سەر نەکەوتین، دووبارە بەسەلامەتی گەڕاینەوە.*

*لەسەر داوای ئامر هێز عقید نوری مەلامعروف چوومە خزمەتی، بەنهێنی کۆبووینەوە ئاگاداریکردم کەبارەگای بارزانی تۆپێکیان بۆ ناردووم بۆ بۆردومانکردنی نمرە ٨.*

لەئەنجامی لێکۆڵینەوە هەردووکمان گەیشتینە ئەو باوەڕەی ئەمە فێڵێکی سیاسییە تا کۆمپانیای نەوتی کەرکوک لەمەولا پارەی زیاتری بداتێ، ئەمە زیانێکی گەورە دەبەخشێتو دەبێتە هۆی رووخانی ژێرخانی وڵاتەکەمان. تۆپەکەی بۆ بەتالیۆنی ٩ نارد، سەرپەرشتیاری تۆپەکە عەزیز حەمید مۆریاسی بوو، ٢١ گوللەی لەگەڵ بووو کەهی جەنگی جیهانی یەکەم بوو! دووری ٣,٥ کیلۆمەتر دەرۆیشت، جارێکیان هێرشمان بردەسەر سەربازگەیەك بەڵام هیچ سودێکی نەبوو، چونکە چەند گوللەتۆپێك نەتەقینەوە، ئەوانیش هاتنە دەستو بەهاوەن وەڵامیان داینەوەو ناچار بەسەلامەتی پاشەکشەمان کرد. پاشان بەتێکڕایی پێشمەرگەکانو لێپرسراوان کۆبونەوەیەکی فراوانمانکرد، دوو شەو لەسەریەك بەدوورودرێژی باسی بارودۆخی ئێستەمان کرد, گوتم بەندەی بچوکتان لەیەکەم رۆژەوە وەکو برایەك لەخۆشیو ناخۆشیدا لەگەڵ ئێوە ژیاومو هەندێك جار بەدەستی خۆم خواردنم بۆ دروستکردوون، لەهەمانکاتدا دکتۆری بەتالیۆنەکەو هی ناوچەکەشم. لەو شەش مانگەی گەڕاینەوە ناوچەکە ٧٠ چالاکیمان کردوە، یەك زامدارمان بووە! دەیەها سوپاسنامەمان بۆ هاتووە. لەمانە ٣٠یان هی مەکتەبی تەنفیزی بووە، دانیشتوانی ناوچەکە کەدەمانبینن دەگەڕێینەوە بەتێکڕایی دێن بەپیرمانەوەو بەخۆشەویستیو رێزلێنانی پێشمەرگەوە پێشوازیمان دەکەن کەپێشتر هەرگیز ئەمە نەکراوە. چالاکییەکانمان دەنگی داوەتەوە، بەتایبەتی لەسنووری کوردستانو لێرەوە گەیشتووە بەخاکی عەرەب.

دوژمن تووشی سەرسامی بووە بەتایبەتی لەم ناوچەیە، تاقە کەسێك نییە دەنگوباسمان بباتەوە بۆ رژێمی عەبدولسەلام عارف. بۆ نموونە رۆژێکیان رژێم کادرێکی پارتی لەرێکخراوی کفری ناردبوو بۆ لای بەندەی بچوکتان تا بزانن ژمارەمان چەندەو جۆری چەکمان چییە. هەر بۆیە لەنێوان خۆماندا کۆبوینەوەو بۆمان دەرکەوت کەهیچ دەنگوباسێکیان دەربارەی ئێمە نییە، رەنگە دوژمن تەنها ٣٪ی هەواڵی ئێمە بزانن.

لەو ماویەدا لەرێگای رێکخراوو دڵسۆزو نیشتمانپەروەرانەوە بەتایبەتی لەهێزی قەرەداغ، ئاگادارکراینەوە کەدوژمن نیازی هێرشێکی گەورەو فراوانی بۆ سەر بتالیۆنی ٩و بەتالیۆنی ٥ هەیە. لەدوزخورماتو فرقەی دوو, لەقەڵاو کفری فرقەی شەش نیازیانە ناوچەکە بەتەواوی لەپێشمەرگە پاك بکەنەوە ئینجا تاڵانو ئازارو ئەشکەنجەو گرتنی هاووڵاتیان دەست پێدەکەن. بۆیە بەهەموو برادەرانم راگەیاند کەحەز دەکەم ئێوە بڕیارێك بدەن، بەندەش جێبەجێی دەکا، چونکە دوو رێگامان لەبەرە: راکەینو ئینسحاب بکەینو ناوچەکە بەجێبهێڵینو تەسلیم بەدوژمنی بکەینو رووبکەینە بەمۆ، یان قەرەداغ. یا پارێزگاری ناوچەکە بکەینو رووبەڕووی دوژمن راوەستین، من خەڵکی ئێرە نیەم، بەڵام ئێوە ئێستا کەئامادەی ئەو کۆبوونەوەیەن ژمارەتان ٤٥٠ پێشمەرگەیە, لە٩٠٪تان خەڵکی ناوچەکەن، دوو سەعات ئێوە بەجێدێڵم تا بڕیارێك دەدەن، هەردوو بڕیارەکە گەورەن، بڕیاری چۆڵکردن راکردنی تێدایە، جارێکیتر جەماوەر باوەڕی بەپێشمەرگە نامێنێت، بڕیاری شەڕ ئێجگار خەتەرناکە چونکە جیاوازییەکی زۆر هەیە لەنێوان چەکی ئێمەو چەکی رژێم، بەڵام ئێمە خاوەن هەقینو بەبیروباوەڕوە دەجەنگین، من بەبروسکەی نهێنی ئاگاداری کاك نوریم کردۆتەوە کەدوای ٦ رۆژ وەڵامت دەدەمەوە چونکە کۆبوونەوەی لەسەر دەکەین.

کاتێك ویستم بێمە دەرەوە تاکو بڕیار بدەن بەگشتی هەڵسانو بەیەك دەنگ گوتیان (یا کوردستان یا نەمان)، ئیتر بەشی زۆرمان لەخۆشیدا گریاین، من وەکو منداڵی ساوا گریام ژیر نەدەبوومەوە، لەخۆشی هەڵوێستی ئەو فیداکارانەی

کەگیانی خۆیان بەخت دەکەن لەپێناوی رزگارکردنی کوردستان. یەکسەر نەخشەمان کێشاو پێش ئەوەی دوژمن هێرش بێنیتە سەرمان کاروباری خۆمان دابەشکرد.

لەبەر رۆشنایی بڕیارو نەخشەکانی کۆبوونەوەکە, پەیوەندیمان بەدانیشتوانی ناوچەکە

کردو بەتێکڕایی ئاگادارمانکردن‌و بۆمان دەرکەوت کە بەدڵو بەگیان لەگەڵ ئێمەن. پێمان راگەیاندن کەسوپای دکتاتۆر عەبدولسەلام عارف بەهەموو هێزێکەوە هێرشمان دێنێتەسەر، ئێمە بەهیچ جۆرێك ناوچەکە چۆڵ ناکەین، ئەمە بڕیاری ئێمەیە ئەگەر هەر هەمووشمان شەهید بکرێین رووبەڕووی دوژمن رادەوەستین و شەڕی جەبهەیی لەگەل دەکەین، رەنگە وردەوردە بکشێینەوە، بەڵام بەشەڕ نەك بەهەڵاتن، شەڕی پارتیزانی دەکەین، بەڵام بەپێی بەرژەوەندی خۆتان هەڵوێست وەربگرن، چۆن بۆ ئێوە باشە ئێمە رازین، روودەکەنە هەر ناوچەیەك، واباشە لەئێستاوە خاوەن ئاژەڵەکان ئاگادار بکەنەوە بەپەلە بەرەو بناری قەرەداغ برۆن‌و دورکەونەوە، هەرچەندە ئاگاداری ماڵ‌ومنداڵ‌و شتومەکەکانتان بن کەمە.

دوای ئەمە چەند گوندێکیان دەستنیشانکرد تا خانویەك بکەنە عەمباری خواردن، بۆ پاسەوانیکردنی عەمبارەکان پێشمەرگەو هاوڵاتییەکمان دانا. پێشمەرگە بەمجۆرە دابەشکرا: ١٥٠ کەس شەڕی جەبهە بکاو ٢٠ کەسیش برینداەکان بپارێزن، ٥ کەسیش بۆ کاروباری ناوخۆو بێتەل لەگەڵ ١٠ تەتەر پۆستەچی. شوێنێکمان بۆ نەخۆشخانە دانا جێگای ٤٠ کەسی دەگرت, ئەم شوێنە دوو برینپێچو هەندێك دەرمانی لێبوون هەموو شتمان بۆ ئامادەکردن، بەمجۆرە خواردنیان بدرێتێ: بەیانیان ماستو هێلکە، نیوەرۆ برنجو شلەو گۆشتی مریشك‌و ئێواران شۆربا. هەریەکێکمان کوژراین یەکسەر لەشوێنی خۆی تەرمەکەی بنێژن، زامدار دەگوازرێتەوە بۆ نەخۆشخانە، بەهیچ جۆرێك رێگای ئەوە نادەین کەس خۆی بەدەستەوەبدات، پاشان بەئاشکرا بۆ پیشمەرگەکانم روونکردەوە کەسەروەت‌و سامانمان چەندە، پێم گوتن بڕی ٧هەزار فیشەکمان پاشەکەوت هەیە، لەبەر بێ فیشەکی تەقەکردن قەدەغەیە، کەی دوژمن هێرشی هێنایە سەرمان هەتا نزیك نەبێتەوە دەست بەپەلەپیتکەی تفەنگدا نانێن، کەی هێرش بۆ سەر ناوچەکە هات یەکسەر بارەگای بەتالیۆن دەگوازینەوە بۆ گوندێك لەپشتی ئاوایی رۆستەم ئاغای زەنگەنەو، هەموو شەوێك کۆبوونەوەی خۆمان دەکەین، چونکە هاتوچۆکردن بەرۆژ قەدەغەیە، بەڵام لەکاتی پێویستدا بۆ گواستنەوەی زامدار رەوایە. دوای راگەیاندنی ئەم بڕیارانە هەموومان دابەشبووین‌و گەڕاینەوە شوێنی دیاریکراوی خۆمان بۆ جێبەجێکردنی هەموو ئەو نەخشانەی دامانڕشتبوو.

ماڵئاواییمان لەیەکترکردو گەردنی یەکترمان ئازادکردو روومانکردە قاپی خودا بەو

هیوایەی سەرکەوتوو بین ئینشاللا. بەپێی فەرموودەیەی (من لم یدافع عن دینە وعرضە فهو لیس منا). بۆیە بڕیارماندا داروبەردی کوردستان لەدوژمن بکەین بەئاگر. لەماوەی دە رۆژ هەموو ئەو بڕیارو نەخشانەی کێشابوومان بەتێکڕایی جێبەجێ بوو، لەچاوەڕوانی دوژمندا دەست لەسەر چەك وەستابووین.

دەنگوباسی دوژمن کەنیازی هێرشی هەبو بۆ سەرمان رۆژانە چ بەنامە یا لەرێگای خەڵکی نیشتمانپەروەرەوە ئاگادار دەکراینەوە. منیش بەبروسکەو نامە ئاگاداری هێزو مەکتەبی تەنفیزیو بارەگای بارزانیم دەکرد کە لەهەموو رویەکەوە ئامادەین. سەرجەم دانیشتوانی ناوچەکە لەگەڵ شۆڕش خەریکی خۆ ئامادەکردنبوون. خەڵکەکە ئەوەندە فیداکاری ئەم خاکەبوو کەیەك خێزان رووی نەکردە ژێر دەسەڵاتی رژێمی عەبدولسەلام عارف، مەڕوماڵاتیان گواستەوە بۆ بناری شاخی قەرەداغ، بەبارزانیم راگەیاند کەئێمە تەنها پێویستمان بەفیشەك هەیە، تکایە بەپەلە یارمەتیمان بدەن. لەبارەگای هێز ئاگاداریانکردم کەعەقید نوری‌و محەمەدئەمین بەگ پشدەری لێپرسراوی دارایی شۆڕش چووبوو بۆ سەردانی کاك حمید بەرواری، دوای چاوپێکەوتنیان بەرەو ئێوە دەکەونەڕێ، لەفلان گوند چاوەڕوانتانن. منیش بەپیریانەوە چوم بەڵام لەرێگا

تەگەرەیەکم هاتەڕێ، لەگوندێکی جاف جوتیارێك جوتی دەکرد هاتە سەر ڕێگاکەم و بەشێوەیەکی زۆر ناشیرین قسەیکرد، منیش زللەیەکم لێدا، ئینجا ڕێگام گرتەبەرو دوای دوو سەعات ڕۆیشتن بەخۆمدا چوومەوە زانیم هەڵەبووم، گەڕامەوە گوندەکە رووم‌کردە ماڵی جوتیارەکە دیتم ماڵەکەی بەرەو ناحیەی سەرقەڵا باردەکات، داوای لێبووردنم لێکردو دەستەکانم ماچکرد، ئەویش گوتی: بەمەرجێك بەیەکەوە نانێك بخۆین، دوای نان خواردن کەهەڵسام بڕۆم ئەویش کەوتە دوام، بۆ ماوەی ٢٠ دەقیقە داوام لێکرد بگەڕێتەوە رازی نەبوو، ئینجا بوو بەپێشمەرگە! گەیشتمە ناوچەی زەنگەنە لەگوندێك بەخزمەتیان گەیشتم, بەگەرمی بەخێرهاتنم کردن و بەناوی بەتالیۆنی ٩ی هێزی قەرەداغ خۆشحاڵیی خۆم بەهاتنیان پیشاندا.

کاك نوری زۆر تووڕەو گرژ بوو، دەلەرزی, گوتی: من ئامر هێزی قەرەداغم و لێپرسراوی ناوچەکەم, بەفەرمانی بارزانی داوام لەپێشمەرگە حەسەن زەنگەنە کردوە لەگەڵ ئێمە بێتە بارەگاکەتان زۆر بەناشیرینی وەڵامی داومەتەوە, بەقسەی منی نەکرد بۆیە داوام لێکردوە چەك بێت. گوتم: کوانێ پێشمەرگە حەسەن زەنگەنە؟ کەهات داوام لێکرد چەکەکەی دانێ‌و پێم گوت تۆ لەئێستاوە دەستبەسەریت، بڕۆن بیبەنە بارەگای بەتالیۆن‌و زیندانی بکەن.

دوایی بۆم دەرکەوت ئەو پێشمەرگەیە، سەردەستەیەو بۆیە هاتۆتە ناوچەکە تا لەگەڵ پیشمەرگە بەپێی نەخشەکە بێتە شوێنی دیاریکراو بۆ ئەوەی چاوەڕوانی هێرشی دوژمن بکات، کاك نوری داوای لێکردبوو لەگەڵیدا بێت، ئەویش دەڵێت ڕێگا کراوەیە بەتەنها بڕۆین، دڵنیابە سەلامەت دەبێت، ئەویش دەڵێت دەبێ چەك بێ، ئەویش وەڵامی دەداتەوەو دەڵێ جارێ شەڕمان لەڕێگادایە ئەگەر ئامادەیت جێی من بگریتەوە من رازیم، پێشمەرگە بەرەنگاری دوژمن راوەستاوە تۆ دونیایەك دوریت لەشەڕو هێشتا دەترسیت.

حەسەن زەنگەنە لەبارەگای بەتالیۆن لەبەندیخانە دەبێت کەگوێی لەدەنگی تۆپ دەبێت، نامەیەك بۆ من دەنووسێت: دکتۆر رفیق من وا بەبێ چەك چوومە لای برا پێشمەرگەکانم، کامیان شەهیدکران چەکەکەی هەڵدەگرم‌و دەچمە شوێنی، ئەگەر پێشمەرگە زامداربوو خۆم لەکۆڵی دەکەم تاکو بەزووترین کات دەگاتە نەخۆشخانە.

پاشان بەبروسکە ئاگاداری ئامر هێزی قەرەداغ کاك نوریم کردو تێر گریام، پێم گوت

حەسەن زەنگەنە بەبێ‌چەك چوو بۆ جبهە، گوللەتۆپێکی پێکەوت‌و هەردوو قاچی پەڕی‌و شەهیدبوو! دوای ئەمە لەخزمەت کاك نوری‌و کاك حەمەئەمین بەگ بەرەو بارەگای بەتالیۆنی ٩ کەوتینەڕێ کە لەئاوەسپی بوو، لێپرسراوی ئازووقە کاك فائق خانەقینی بەجۆرێك پیشوازی لێکردن سەریان سوورما کەبەمجۆرەو بەم شێوەیە رێکوپێکن، گوتم شەڕ لەئان‌وساتدایە، دەنا پێشمەرگە لەخزمەتتاندا دەبوون. بەدوورودرێژی بۆم باسکردن کەچۆن نەبێت ئینشائەللا باسی سەرکەوتنمان لەسەرانسەری کوردستاندا بڵاودەبێتەوە.

گرفتی گەورەم لەگەڵ شەهید کاك حەسەن زەنگەنەو کاك حەمەئەمین بەگ پشدەری بوو کەکاك نوری پاڵپشتی بوو. جەنابی حەمەئەمین بەگ لەو کاتەدا پێی گوت بۆ بەرژەوەندی تایبەتی خۆت ئەو پێشمەرگانە گومانمان لێیان هەیەو کادری ناسراون‌و سەر بەجەماعەتی ئیبراهیم ئەحمەدن، دووریان بخەرەوە بابچنەوە ماڵی خۆیان دانیشن‌و، لەهەمانکاتدا ئەو تاقمە پێشمەرگەیەی کە لەهێزی خەبات رایانکردووەو هاتونەتە ئێرە بە بەندکراوی رەوانەی هێزی خەباتیان بکەوە، ئەو کاتە بارزانی‌و کاك عبدالوهاب ئەتروشی‌و ئەندامانی م. تەنفیزی رێزێکی تایبەتی بۆ تۆ دادەنێن، بۆچی خۆت پیاوخراپ دەکەی‌و دوارۆژی خۆت تاریك دەکەی، ئێمە هەموو دەنگوباسی تۆمان لایە، کاك نوری پاڵپشتتەو پارێزگاریت زۆر لێدەکات. کاك نوری لایەنگری قسەکانی دەکردم، لەسەرخۆ گوتم: لەسەعاتی یەکەم کەکەوتینەڕێ بەڕێزتان ئەم نەخشەیەم بۆ

دەکێشیت، من باسی ئەمەت بۆ دەکەم کەخۆمان ئامادەکردووە رووبەرووی دوژمن چۆك دانەدەین‌و راوەستین خۆمان بەخت بکەین، تۆش دەگەڕێیتەوە سەر هەمان باسی جەماعەتی ئیبراهیم ئەحمەدو سالآنی پێشوو.

سوپاس بۆ یەزدانی مەزن ئیمڕۆ رۆژی سێهەمە وا لەسەعات چواری بەیانییەوە دەنگی تۆپ هات، ئەمە مانای ئەوەیە هێرشی سوپای دوژمن دەستی پێکرد، جەنابی حەمەئەمین بەگ من رابەری ئاسایش نیم، لێپرسراوی پۆلیسیش نیم، پێشمەرگەم، چەکم هەڵگرتووەو بەرامبەر بەدوژمن راوەستاوم، توانیومە ئەو برایانەی لەگەڵیاندام ماوەی نزیکەی حەوت مانگە یەك بۆچوون‌و بیروباوەڕمان هەیە ئەویش شەڕی دوژمن بکەین، جەماعەتی ئیبراهیم ئەحمەد لەناو ئێمەدا نییە، بەڵام لێپرسراوی بێتەل‌و ئەو ئەفسەرەی لێپرسراوی جفرە بوون لەگەڵ پێشمەرگە رێککەوتوون لەنێوان خۆیاندا ئاژاوە بنێنەوەو من دور بخەنەوە، من ئەمە باش دەزانم و رێزیان زۆر لێدەگرم‌و تەنها لای تۆ ئەمەم باسکرد. ئەو پێشمەرگانەی دوای دووبەرەکیەکە چووبوونەوە ناو ماڵومنداڵیان، بەنامەی من هاتنەوەو ئەو پێشمەرگانەی لەهێزی خەبات بوون رایانکردووە هاتوونەتە ئێرە، ئەمانە هەموویان ژمارەیان نزیکەی بیست پێشمەرگە دەبوو، بەهۆی چالاکی‌و فیداکارییان دانرابوون بۆ شەڕی جەبهە، ئێستا لەخەتی پێشەوە دەجەنگن، کەی هێرشی دوژمنمان لەسەر نەما شەڕ تەواوبوو، ئەگەر فیداکارییەکەیان چەکیان دەکەین‌و بەندیان دەکەین دەیاننێرینەوە بۆ هێزی قەرەداغ!

هەرچەند یەکترمان باش دەناسی رێزم هەبوو بۆی‌و نێوانمان زۆر خۆش بوو. زۆرم گوت لەم بابەتە، بەڵام بێسوودبوو، لای ئەو گرنگ ئەوەبوو کەس ناوی باڵی م.س. جەماعەتی مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد نەهێنێ، دوژمن زاڵ دەبێت، یا پێشمەرگە ناوچەکە چۆڵدەکات ئەمانە هیچی گرنگ نییە. بەڵام راستیدەکرد من چاوم دەنوقاندو خۆم لێ کەڕ کردبوو.

کادرێکی باڵی م.س.، کاك فایەق کەلاری ناسراو بەفایەقەکوێر دەهاتە ناو بەتالیۆن و پێشمەرگەکانی باڵی م.س. رێکدەخست، هەروەها لێپرسراوی بێتەل‌و برایەکی تریش تەنزیمی پێشمەرگەیان دەکردو دەیگوت تەنها مەلامستەفا کورد رزگار دەکات، هەرچی من بووم برا پێشمەرگەکانم بەیەك چاو تەماشا دەکرد کەچۆن رووبەڕووی دوژمن راوەستین.

گوتم: جەنابی حەمەئەمین بەگو کاك نوری سوپای دوژمن هێرشی هێنایە سەرمان دەنگی فڕۆکەش دێت، هەرچی زووترە ئێرە بەجێ بێڵن بەرەو هەڵشۆ تەشریفتان بڕوات بەسەلامەتی دەگەن، ئینشائەللا من لێرە چاوەڕێی چەك‌و تەقەمەنی دەکەم کەبۆم بنێرن. روومکردە برا پێشمەرگەکانم‌و بارەگای پێشمەرگەمان بۆ جێی دیاریکراو گواستەوە.

یەکەم رۆژ کەشەڕ دەستی پێکرد (ئابی ١٩٦٥)، پێشمەرگەی ناسراو خەڵکی کفری کاك ئەحمەدی حاجی سەمین شەهیدبوو، پاش ئەوەی رووبەڕوی دوژمن پێی گیردەکاو هەرچەندە سەرلقەکەی عەریف کازم پێی دەڵێت بائینسحاب بکەین هەڵناستێت، فیداکاری‌و ئازایەتی‌و چالاکی ئەم کەڵەپیاوە لەمیشکم دەرناچێت. دوای چوار رۆژ شەڕ، لەگەڵ کاك حەمید بەرواری لەگوندێکی چۆڵی زەنگەنە لەژوورێکی چۆڵدا بەتەپاڵە ئاگرێکمان کردبۆوە نان‌و چامان خوارد. لەژێر تۆپ‌و رەشاش‌و تەقەی تفەنگ، دوای شیکردنەوی بارودۆخی ئەو کاتەو لەبەر بەرژەوەندیی گشتی هەتا بتوانین چالاکی بنوێنین و بەرامبەر سوپای دوژمن

راوەستین، ئەم بڕیارەمان داو بەبروسکە هێزمان ئاگادارکرد . . .

**لەئامر بەتالیۆنی ٥ حەمید بەرواری‌و لەئامر بەتالیۆنی ٩ رەفیق پشدەریەوە**
**بۆ ئامر هێزی قەرەداغ عەقید نوری مەلامەعروف**

*لەم سەعاتەوە بووین بەیەك هێزو پێکەو رووبەرووی سوپای دوژمن فرقەی شەش‌و فرقەی دوو دەجەنگین, چاوەڕوانی جێدەستمان بن چونکە هەرگیز ناوچەکە چۆڵ ناکەین.*

**تێبینی**

*١- من ئەم پێشنیازەم بەو نیازەوە کرد تا بەهۆی حەمید بەرواری بەپەلە یارمەتی‌و فیشەکمان بدەنێ، بەڵام ئەویشم بەخۆمەوە سوتاند، چونکە حەمید بەرواری کوڕی بنەماڵە بوو، بەڵام ئێستا برازای مەسعودەو برای نێچیرڤانە، بەتایبەتی دوای ئەوەی لەجیاتی ئیدریس تەقەیان لێکرد، شاهدی بەچاودیتە زۆریان ماون چ لەخەڵك ناوچەکەو پێشمەرگە، لەوانە دوو سەرلق کەناویان عەزەی حەواو عەزیزی حەمەخەنانە.*

*٢-چەند جارێك ئەمە روویدا کەسەربازەکان دەگەڕێن بەشوێن پاتاڵ لەگوندە چۆڵەکان‌و لەماڵاندا دەبینن خانوویەك پڕە لەنانەڕەق‌و دۆینەی وشککراو، سەربازەکان دۆینەکە دەبەن بۆ ئەفسەرێك ئەویش رووەدەکاتە سەربازێکی کوردو پرسیاری لێدەکات ئەوە چییەو چۆن دەخورێت؟ ئەوانیش دۆینەکە دەخەنە ناو ئاوی ساردو شلی دەکەنەوە، ئەفسەرەکە دەیەوێت کەوچکێکی لێبخوات بەڵام دایدەنێتەوەو دەڵێت: تۆپ‌و فرۆکەو تانکیان نییەو ئەمە خواردنەکەیانە، ئینجا بەرامبەرمان راوەستاون!*

*٣- هەڵوێستی عەشیرەتی جاف: مستەفا بەگی جاف[٦] داوای کردبووم بەپەلە لەشوێنی دیاریکراو بگەمە لای. کەچوومە خزمەتیان ژمارەیەکی زۆری دانیشتوانی ناوچەکە لەپیاوە ناسراوەکانی تیرەکانی جاف لەوێ بوون، بەشی زۆریان کەکوێخابوون دەمناسین، ئەو پیاوە مەزن‌و گفتوگۆ خۆشە فەرمووی کەدەنگی فرۆکەو تۆپ دێت ئینجا گوێم لەگوللەی فیشەکی پێشمەرگە دەبێت بەدەنگێکی بەرز هاواردەکەم قەزات لەگیانم برای پێشمەرگەی قارەمان، کاکە، وا خۆمان هاتووینە ریزی پێشمەرگە دەچینە جەبهە تاکو لەمەودوا خەڵکی وا بەمن‌و جەماعەتەکەم بڵێ. ماوەی پێنج رۆژە تاکو خۆمان کۆکردۆتەوە ژمارەمان ٣٨٠ چەکدارە ئێمە عەشایەری قورسین بەهاسانی هەڵناستین و لەهەر بەرەیەکمان دابنێن ئامادەین. گوتم: شەوی رابردوو ئاگرێك رووناکیەکەی زۆر بەرزبوو، بەهەڵە واتێگەیشتم کە لەدوژمن نزیك بوومەوە، بینیم سێ خوشکی گەنج نانیان دەکرد، پرسیارم لێکردن ئەم هەموو نانەتان بۆ چییە؟ گوتیان: ئێمە ناترسین بەم جۆرە نزیك بووینەتەوە لەسوپای دوژمن. ئەم نانەمان بۆ برا پێشمەرگەکانە خۆ ئێمە لەدکتۆر رەفیق زیاتر نین.*

*ئاو لەچاوم هاتە خوارێ شەرمم کرد بڵێم من هەوم. ئینجا بەمستەفابەگم گوت: هەزار جار سوپاسی یەزدانی مەزن‌و ئێوەی عەشیرەتی جاف‌و رۆڵەکانی خوالێخۆشبوو کەریم بەگی جاف کەبەم جۆرە یارمەتیمان دەدەن، ئەگەر ئێوە نەبوونایە ئەم سەرکەوتنەمان نەدەبوو, بەهۆی ئێوەیە پشتمان قایمە، شەڕەکەتان کردووەتە هی خۆتان بەڵام بەناوی پێشمەرگە تەواوبووە. ئێمە گیروگرفتمان تەنها فیشەکە , ئێستا زیاد لە ٣٠٠ پێشمەرگە لەجەبهەیە رووبەرووی دوژمن*

---

[٦] مستەفا بەگی جاف: یەکێك لەسەردارەکانی عەشیرەتی جاف، کەسایەتییەکی پایەدارو سیاسەتمەداری نیشتمانییە، رادەبەدەر زیرەك، ئازا، رووخۆش‌و نانبدە. بەشداری بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردی کردووەو رێچکەی باوکی، کەریم بەگی جافی گرت کەئەویش شانبەشانی شێخ مەحموودی حەفید لەشۆڕشەکانیدا بەشداریکردووە. مستەفا بەگ چوار زمانی دەزانی ئینگلیزی، عەرەبی، فارسی‌و تورکی.

*راوەستاوە هەریەکەیان ٢٠– ٣٠ فیشەکی پێیە، ئێوە نزیکەی ٤٠٠ کەس دەبن وا جامانەکەم وەکو سواڵکەری بەردەرکی مزگەوت رادەخەم ئێوەش دەستی یارمەتیم بۆ درێژکەن. نزیکەی حەوت هەزار فیشەکیان داینێ.*

*جێی باسە شیوعییەکان شانبەشانی ئێمە راوەستان و بەسەرۆکایەتی کاك عەتا تاڵەبانی بەشداربوون لەرووبەڕووبوونەوە دژی سوپای دکتاتۆری عەبدالسلام عارف.*

لەکاتی کۆبونەوەمان لەبارەگای بەتالیۆن ئاگاداریانکردین کەکاك عەتا تاڵەبانی بەخۆیو هێزێکەوە تەشریفی هاتووە، هەموومان بەپیریەوە چووین خۆشحاڵی خۆمان دەربڕی. ئەویش لەکۆبوونەوەکە لەگەڵماندا بەشداربوو، داوام لەسەرلق کاك کامل مەلاوەیسی زەنگەنە کرد کەمۆڵگەی سوپای فرقەی دوومان بۆ دیاریبکەن، ئەویش بەدوورودرێژی هەموو شوێنەکانی سوپای دوژمنی خستە بەرچاومانو، پێی گوتین کەلەم دوو رۆژەی پێشوودا فەوجێك بەجۆرێك نزیك بووەتەوە تەقەی دۆشکەکانیان دەگاتە گوندی رۆستم ئاغا. ئەم
فەوجە نیازی پەڕینەوەی هەیە بۆ ئەوبەری ئاوەسپی تا بگاتە ناوچەی جاف.

هەروەکو گوتم سوپای نیزامی روو لەهەر شوێنێك بکات دەتوانێت زاڵبێت، بۆیە تەنها دوو رێگا هەیە لەبەرامبەریدا، یان بۆی چۆڵ کەینو راکەین یان رووبەڕووی راوەستین، جا بەشەڕی پارتیزانی یا بەشەڕی بەرەیی، ئێمە دو رۆژە لەبەر بێ فیشەکی ناتوانین شەڕی پارتیزانیشی لەگەڵدا بکەین، بەڵام ئێستا بەم شێوەیە کەئەم نەخشەمان داناوە ئینشائەللا سەرکەوتوو دەبین. کێشەی فیشەکمان جێبەجێ بوو، مستەفابەگی جاف لەگەڵ کوێخاکانو پیاوە ناسراوەکانی تیرەکانی جاف هاتبوونە لامان زیاد لەحەوت هەزا فیشەکیانبۆ هێنانیو رۆستەم ئاغاش[7] دوو هەزار فیشەکی بۆ ناردبووین، بۆیە ئێمە خۆمان رێککەوتین بەم جۆرەی خوارەوە پەلاماری دوژمن بدەین: لەسەعات سێی ئەم شەوە چوار سەرلق هەریەکەی ژمارەی ١٥ پێشمەرگەی لەگەڵدا دەبێت، کاك حەسەن خەلیفەمالكو کاك کامل مەلاوەیسیو عەزەی حەواو عەزەی حەمە خەنان و کاك حسەین حاجی محێدین کەیاردەدەری ئامر بەتالیۆنە ٤٠ پێشمەرگەی لەگەڵ دەبێتو لەپشتی ئەم چوار سەرلقانە دەبێت لەکاتی شکانیان، خۆشم لەگەڵ کاك حەسەن خەلیفەمالك بەشداربووم. بەکاك عەتا تاڵەبانیم گوت ئەمە شەڕی جەبهەیە، منیش هەر شوێنێکم بۆ دادەنێن ئامادەم شانبەشانی ئەو برا پێشمەرگانە هێرش ببەمەسەر دژومن.

سوپاس بۆ یەزدانی مەزن لەم هێرشەدا دوژمن ١١ رەبایەیان چۆڵکردو ئێمە یەك زامدارمان نەبوو، زیانمان نەبوو، بڕی ٢٣٠٠ فیشەکمان بەدوژمنەوەنا.

شیوعییەکان هێزێکی چەکداریان هەبوو، بارەگای تایبەتی خۆیان هەبوو، بەڵام لەسنووری بەتالیۆنی ٩ بوون، زۆر رێکوپێك بوون لەهەموو روویەکەوە. پەیوەندیمان ئیجگار زۆر بەهێزبوو، مامۆستای بەرێز مەلائەحمەد بانیخێلانی سەرپەرشتی ئیدارەی دەکردن. کاك عەتا تاڵەبانی لەکۆتایی شەڕەکەدا لەگەڵ هێزەکەیدا کەبریتی بوو لە٥٠ پێشمەرگە گەڕانەوە، بەگەرمی لەخزمەتیان ماوەیەك رۆیشتین سوپاسمانکردن بۆ ئەو هەڵوێستەیان.

سوپای دوژمن روویانکردە ناوچەکە بۆ ئەوەی پاکسازی پێشمەرگە بکەن بەڵام دانیشتوانی ناوچەکە بەتێکڕایی زەنگەنەو جاف بوونە کۆسپ لەبەردەم ئەو سیاسەتانەی دوژمن. رۆڵەکانی کەریم بەگی جاف شەڕی ئاوباریکیان تازەکردەوە، سوپاس بۆ خوا دوای ١٥ رۆژ جەنگ سوپای دوژمن بەناچاری کشایەوە، زیانی ئێمە برینداربوونی ١٩

---

[7] رۆستەم ئاغا: سەردارێکی عەشیرەتی زەنگەنەیە، نیشتمانپەروەرێکی دڵسۆزە، قوربانی زۆری لەپێناوی خاکی کوردستان بەخشیوە. مرۆڤێکی نابندەو چاونەترس، بەدرێژایی ژیانی پشتیوانی هێزی پێشمەگەر بووە.

پێشمەرگەبوو کەیەکێکیان وەفاتی کرد، لەوانە پێنجیان هی باڵی م.س. بوون, ١٣ پێشمەرگەمان شەهیدبوون یەکێکیان ئەحمەد حاجی حەمەسەمین دانیشتووی کفری، ٣ کەسیان هی باڵی م.س. بوون، ژمارەی ١٤ هاوولاتیش شەهیدبوون، هەشتیان هی یەك خانەوادەبوون کەباوکیان بەتەنها رزگاری بوو لەبۆردومانی فرۆکە, هەرهەموویان شەهیدبوون. بەڵام زیانی دوژمن لەفرقەی دوو هەروەها لەفرقەی شەش ئەمەبوو:

١- فرۆکەیەکی مێك کەوتە خوارێو فرۆکەوانەکەی کوژرا.

٢- ژمارەی کوژراویان لەنێوان ٤٢٠-٤٥٠ سەرباز بوو.

٣- زیاد لە ٧٠٠ زامداریان هەبوو.

٤- چەند ئوتومبێلێکیان تێکوپێك شکان.

دوای تەواوبوونی شەڕ بەهۆی دانیشتوانی ناوچەکە گرفتی ئازوقەمان نەما، یەك هاوولاتی یا پیشمەرگە روی لەمیری نەکرد، هەرچی کێشە بێت تووشمان نەبوو، تەنها لێپرسراوی لاسلکیو لپێرسراوی جفرە کێشەی شەخسی زۆریان بۆ دروستکردم، خۆی گەیاندە لای بارزانیو چەندین درۆی بۆ هەڵبەستبووم گوایە من جەلالیم.

سەردانی ماڵە شەهیدەکانمان کردو یەکە بەیەکە بەسەرمانکردنەوە، هەر ماڵەی بڕی ٣٠ دینارمان دانێ، سەردانی گوندی بەکربایفم کرد، کەدوو برای پێشمەرگە شەهیدببوون بەشداریان کردبوو لەکۆماری مهاباد، هەموو بەتێکڕا دەستیانکرد بەگریان، تەماشای منیان کرد، کاك حسەین حاجی محێدین روویکردە من کەمنیش بگریم، کاغەزێکم لەگیرفانم دەرهێنا داوام لێکردن کەفاتیحا لەسەر باوکم دادەن، بروسکەکەم بۆ خوێندنەوە کە لەبەتالیۆنی حاجی قەلای کۆییەوە بۆم هاتبوو، ئیمرۆ ٧ رۆژە باوکم لە ١٩٦٤/٨/٢٧ وەفاتی کردووە، پاشان بەنهێنی بەکاك حسەین حاجی محێدینم راگەیاند کەمن بۆ باوکم نەگریم گلەییم لێناکرێت.

سەردانی پیاوە ناسراوەکانی زەنگەنەو جافم کرد، یەکەم کەس چوومە خزمەتی مستەفابەگی جاف لەچەمی شۆر، سوپاسم کردنو ئینجا روومکردە هاوسەرەکەی گوتم برسیمە، قبوڵییەکی سووری بەگزادەم بۆ لێبنێن، شەوو رۆژێك پشوومدا، مستەفابەگ فەرمووی ئەمجارەش نەکوژرایت، خوا گەورەیە بۆ جارێکی تر.

**بروسکەیەکی ئاشکرا لەبەتالیۆنی ٥وە بۆ ئامر هێزی قەرەداغ**

*بەهێزێکی هاوبەش رووماکردە نزیکی شاخی ئاشداغ بۆسەیەکمان دانا دووبەدوو سەرپەرشتیمان دەکرد, ٤٠٠ پێشمەرگەم لەگەڵ بوو نزیکەی ٣٠ سەعات ماینەوە، سوپای دوژمن کشایەوەو بەملشکاوی ناوچەکەی بەجێ هێشت. هەزار جار سوپاس بۆ خوا کەبەمجۆرە سەرکەوتنمان بەدەستهێنا.*

لەئامر هێزی قەرەداغ و مەکتەبی تەنفیزی چ بەبروسکە یا نامە بەناوی دکتۆر مەحمود عەلی عوسمانو حەبیب محەمەد کەریم بەبۆنەی سەرکەوتنمان پیرۆزباییان لێکردم. هێزی قەرەداغ بەنامەو بروسکە ئاگاداریانکردم کەبارزانی داوایکردوویت، دوای پرسیارو لێکۆڵینەوە دەرکەوت کەلێپرسراوی بێتەل پاراستن بوەو هەفتانە راپۆرتی لەسەر من رەوانەی مەکتەبی بارزانی کردووە کەمن لەهەموو دانیشتنو کۆبوونەوەیەکدا گوتارێکم دژی خودی بارزانی داوە.

دوای ٧ رۆژ کەشەڕ تەواوبوو ئینجا هەشت هەزار فیشەکم بۆ هات، ئینجا زانیم هۆی چییە کەبەم جۆرە بەربەرەکانیم دەکەن!

لەکاتی شەڕدا رۆژی سێ جار داوای فیشەکم دەکرد، تەنها ئەوەی یارمەتیدایین کاکەحەمەی فرج بوو، کە لەگەڵ بەتالیۆنەکەی هات بەهاوارمانەوە، بەگەرمەوە بەخێرهاتنمانکردن، خۆشحاڵ بوین بەهاتنیان، بەڵام شەڕ تەواوببوو، ئەمانە لەسەر بروسکەکەی بارزانی وایانزانیبوو ماندەگرمو ناچمە خزمەتی، تەماشامکرد خەریکە کێشەم بۆ بێتە پێشێ، یەکسەر رێگام گرتەبەر، هەموو شتێکم تەسلیم بەیاریدەدەرەکەم کاک حسەین حاجی محێدین کردو حسابیشم لەگەڵ عەقید نوری کرد.

بەرەو گوندی یەندزێ بارەگای م.س.کەوتمەڕێ. کاتێك گەیشتمە لای کاك حەمەی عەزیزو کاك نافز جەلال، منیان بردە لای کاك حەبیب محەمەد کریمو د. مەحموود عەلی عوسمانو کاك موحسین دزەیی, ئەوانیش بەپیرمەوە هاتنو بەجۆرێك بەخێرهاتنیان کردم سەرم سوڕما، بەڵام چونکە هیچیان بەدەست نەبوو، گوتیان کاتێك بروسکەکانت دەهات یەکەم جار گومانمان برد، بەڵام کەڕاپۆرتمان وەرگرت بۆمان دەرکەوت کوژراوو زامداری سەربازەکان گەلێك لەوە زیاترە تۆ باستکردوە، بەراستی جێدەستت لەسەر لەشکری دوژمن دیاربوو. منیش پرسیارم لێکردن: ئێوە گازندەتان چییە لەمن؟ د. محمود گوتی: ئێمە تۆمان کردە ئامر بەتالیۆن بەڵام رۆژێك بەنامەیەك ئێمەت بەسەرنەکردەوە، پاشان ئایا راستە دەڵێن گوتارت دژی بارزانی خوێندۆتەوە؟ گوتم: ئەمە دووەم جارە تووشی هەڵە نەبم، یەکەم جار لەجیاتی ئەوەی رووبکەمە خزمەت مەلامستەفا چوومە لای کاك حلمی، دووەم جار کاك عەلی عەبدوللاو کاك نوری شاوەیس ئاگاداریانکردم کەجەنابی مەلامستەفا داوات دەکات بەڵام بەقسەی ئێوەم کردو نەچوومە لای، سوپاس بۆ خوا کە نەکوژرام.

خوێنەری بەڕێز، چ راست یا درۆ وایان بۆ گێڕامەوە کاتێك باسی سەرکەوتنەکانم کرابوو، بارزانی گوتبووی ئەم سەگبابە کەی دەکوژرێتو رزگارمان دەبێت لەدەستی. لەکاتێکدا تاکە تاوانی من خزمەتکردنی گەلی کوردو بەرگریکردن بوو لەکوردستان. برادەرانی م.س. رایان وابوو کەنوسراوێك ئاراستەی بارزانی بکەن دەربارەی من پاشان خۆم بچمە خزمەتی. کاك موحسین دزەیی گوتی: نازانین کەی دێتەوە رەنگە ئەم سەفەرە زۆری پێ بچێت، خۆت بچیتە خزمەتی باشترە چونکە دەزانین دەمت بیگاتێو قسەی لەگەڵ بکەیت کۆتایی بەم گرژیە دێنیت. دوو شەو لەخزمەتیان بووم. بەرەو پێنجوێن کەوتمەڕێ، لەماوەت دوو شەو مامەوە مامۆستا عەلی حەمدی حەزی دەکرد کە لەخزمەتیدا چەند شەوێك بەیکەوە بین، لەئەنجامی ئەم میواندارییەی زۆر شتم بۆ روونبۆوە، گوتی: ئەمە شۆڕشەو دەبێت خۆڕاگر بیت، باپێت بلێم تۆ تاوانباریت کەجەماعەتی ئیبراهیم ئەحمەدی، کەدەچیتە خزمەت مەلامستەفا ناتکوژێت، بەڵام چەکت دەکەن ئینجا رەوانەی بەندیخانەی ماوەت دەکرێیت. وەکو دەبینی ئێمە بەرۆژ هەموو لەدەرەوەینو بەشەویش کاتی نوستن دەچینەوە ژوورەوە، ئەم بارودۆخەی ئێستا شتێکی سیاسیەو ئەم مانگە تەواو دەبێت.

گوتم: لەبەر ئەوەی حزبی نیمو جەماعەتی مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد نیم هەرچەندە شانازی پێوە دەکەم، ئامادە نیم چەك بکرێمو بەند بکرێم، ئەو چوار سەربازە عەرەبەی دوێنێ کەهەریەکە دوو دینارم دانێ، دور لەکفری بەشەش سەعات بەپێ چووین گرتمانن، ئێستا لەگەڵ ئەوان بخرێمە بەندیخانە؟ هەرگیز قەبوڵی ناکەم مەلامستەفا لەبری ئەوەی زیاتر لەجاران رێزم لێبگرێتو پاداشتم بداتەوە بمخاتە بەندیخانەوە، عەلی حەمدی نیم بەمە رازی بم، دەچم خۆم تەسلیم بەرژێم دەکەم لەو وەزعە باشترە، لەهەڵساندا پێی گوتم: برادەرێکی دڵسۆزمان هەیە لەم ناوچەیە بچۆ بۆ خزمەتی، ناوی شێخ رەزا شێخ تەهایە لەگوندی تەرەتوولۆ، ئێمە ئاگاداری دەکەینەوە یارمەتیت دەداو ئێمە ئاگاداری دەکەینەوە.

گەیشتمە خزمەت حەمەڕەشیدخانی بانە دوو شەو لایان مامەوە، مەجیدخان فەرمووی سەرمان لێبدە، ئێمە لەگەڵ مەحموود بەگی گۆڵێ قسە دەکەین کەیارمەتیت بدا. نوسراوەکەی مەکتەبی سیاسیم تەسلیم کرد، بڕوا ناکەم تەماشای

کردبێت چونکە بەجۆرێك باسیانکردبوو کەوا دەرکەوت مەلامستەفا زیاتر رقی لێم پەیدابوو، بۆیە کاك عەبدولوەهاب ئەتروشی یەکسەر داوای گرتنی کردبووم. ئەو ماوەیەی لەگوندی گۆخلان لەماڵی مەلای گوندەکە بووم خزمەتێکی زۆریانکردم. بەزۆری دەچومە لای پاسەوانەکانی مەلامستەفا کە بەدووری ٥٠ مەتر یەکێکیان بێدەنگ چاوە تیژەکانی دەبڕیە من، هاتوچۆی د. خالد حمەسەعیدم زۆرکرد دوجار سەرم لەحەمەڕەشیدخانو شێخ ڕەزادا، کاك سابیر ئەحمەدی مینەڕەنان پێمی گوت ٥ کلانشینکۆفم بدەیتێ وا دەکەم یگەڕێیتەوە شوێنی خۆت بەئامر بەتالیۆن، بەقسەکەی پێکەنیم گوتم: بەرتیلیش بدەم ئینجا بچم خۆم بەکوشت بدەم؟!

ڕۆژگار هاتو ڕۆیشت من هەر لەو بارودۆخەدا بووم, دنیام لێ تاریك بوو خەریکبووم شێت بم، دوای ١٦ ڕۆژ دوو بارزانی هاتن خەبەریان دامێ کەبارزانی لەسەعات چواری بەیانیەوە گوندی بەجێهێشتووە، داوایان لێکردم منیش بکەومەڕێ (١٩٦٥/١٢/٢٠) بەرەو ئەو شوێنەی بارزانی رووی تێدەکات کەگوندی دارۆخان بوو.

ڕۆژێك بەفر دەباری، ٢٠ سانتیمەتر باریبوو، لەنزیك بارزانی بە ١٠٠ مەتر دەرۆیشتم بەدەنگە بەرزەکەی خۆم سڵاوم لێکردو، وەڵامەکەی ئەوەبوو جامانە سورێك هات، پاشان بوون بەسێ کەس یەکێکیان پاسەوانی تایبەتی خۆی بوو کە لەبەغدا لەگەڵی بوو منی دەناسی، لەرێگا ئیشارەتی بۆ دام کەدوور نیە مردن چاوەڕوانت بکات.

کاتێك گەیشتینە ماڵی حەمەڕەشیدخان گوتم: جەنابی خان ئەم شەو لەماڵی ئێوە دادگایی دەکرێم، هەرچی خراپە رووبەڕوو پێم دەڵێن بۆشم نییە بەرگری لەخۆم بکەمو وەڵام بدەمەوە، ئەوجار چەکم دەکەنو ڕەوانەی لای کاك عەبدولوەهاب ئەتروشیم دەکەن، ئینجا دەمکوژن، ئایا خان من تاوانبارم تاوام لێبکرێ؟ تۆیش شاهیدی ناحەق، ڕۆژێك دێت ئەمە دەکرێتە کتێب.

خان گوتی: ئەمە موشکلەیە بۆ منیان دروستکرد، باش دەزانم ئەوە پیلانی کێیە، سوکایەتیە بۆ خودی من کە بەناحەق رەفیق پشدەری بکوژن لەبەرئەوەی شکاتت لەمەلامستەفا کردوە لای شێخ ئەحمەد بارزانی کە بەئازایی خۆت بویتە ئامر بەتالیۆنو پیاوەتی کەس نییە. من لەراست خۆمەوە زۆر هەوڵم بۆ دایت بەڵام سودی نەبوو، ناتوانم هیچت بۆ بکەم، چارت ئەوەیە سەعاتێك زووتر راکەیت، ناتوانم یارمەتیت بدەم، قەرزاری دونیاو قیامەت دەبم، ئێستا بەفر دەبارێت کەس بەدەرەوە نییە هەتاکو زووترە هەڵسە. خوداحافیزت بێت ئینشائەللا بەسەلامەتی دەگەیتە ناوماڵو منداڵەکانت. گوتم: بارزانیەکان منیان تەسلیم بەئێوە کرد، بارزانی شەو ئەحواڵم دەپرسێت ئایا بۆ بەڕێزتان زیانی نابێت؟ خان فەرموی: کاك رەفیق من لێپرسراوی بەندکردنی تۆ نیم، ئەم بارزانیانە نەیانگوت ئەمە بەندە. ئینجا بانگی بەختیاری مجیدخانی کردو پێی گوت خواردنی بۆ بێنە تا بەسك بەتاڵی بەناو بەفردا نەڕوات. دوای ئەوەی نانم خوارد خوداحافیزییم خواستو ڕێگام گرتەبەر، گەیشتمە بەر ماڵی شێخ ڕەزای شێخ تەهای چوێسە لەگوندی تەڕەتووڵوو، یەکسەر چوومە ژوری ژنان کەخواردنیان ئامادە دەکرد، داوای شێخم کرد، یەکسەر کوڕەکانی هاتن بەخێرهاتنیان کردم ئینجا جەنابی شێخ ڕەزا هات بەدووروردرێژی هەموو شتێکم بۆ باسکرد. فەرمووی دانیشە ئێستا٧٠ بارزانی میوانی منن دڵت هیچ نەکات، تووشی نارەحەتی نابیت.

خواردنێکی خۆشو گەرمیان بۆ هێنام، تێرم خواردو ترس لەلەشمدا نەما، دوای سەعات ٨ی شەو بەڕێیان کردم تاکو گەیشتینە گوندی کواواو دەرەگورگان، ئەوەی لەگەڵم هات یەکسەر گەڕایەوە، منیان لەژێرخان دانا، ژوورەکە دوو مانگای لێبەسترابوەوە، بەڵام زۆر پاکو خاوێن بوو، بەیانیەکەی شۆرباو مریشکیان بۆ سورکردبومەوە، نیوەڕۆکەی برنجو شلە،

نـانی ئێـوارەم مریـشکی سـوورەوەکراو بـوو، یـاخوا مـاڵی شـێخ رەزا هـەزار جـار ئـاوەدان بێـت کـەبێ ئـەوەی بیانناسـم یارمەتییاندام.لەو کاتەوە تا ئێستا چاوم پێیان نەکەوتووەتەوە،

سوپاس بۆ خواو بۆ بنەماڵەی چۆیسە.

ئێوارە سەعات چوار ئەندامێکی ناسراوی پاراستن هاتە ناو گونـدو پرسـیاری لەخـەڵکی گوندەکە کـرد کەسـی غـەریب نەهاتۆتە ئێرە؟ من لەبەرئەوەی لەپەنا خەڵکێکی خاوەن بیروباوەڕدابووم کەباش ئاگاداری روداوەکەم بوون، بەهیچ جۆرێك مەترسیم بوو.

## خۆتەسلیمکردن بەڕژێم

شەوی پاشتر سەعات ٧ لەگەڵ هاولاتیەکی ئەویێ ڕێگامان گرتەبەر. سەعـات شـەشـی بەیانی گەیشتمە گوندی راوگان دێی شێخ لەتیفی حەفیدو لاماندا، من بەتەنها لەژوورێك بووم دەرگام لەسەر خـۆم داخـست، سەعات ٨,٣٠ لەژورەکە هاتمە دەرێ بانگی ئەو برا بەرێزەم کرد کە لەگەڵم هاتبوو گوتم: ئەو تفەنگە ماڵی خۆمە پێشکەشی تۆ بێت، برێك پـارەم پێیـە بەشـیدەکەین، وا بـەرەو پادگـای سـوپا دەڕۆم، دەرزی تفەنگەکـە دەردێـنمو لەسـەر کانیەکـە دایدەنێم, کەگەیشتمە سەربازگە تۆ دەرزی تفەنگەکە بەرەو موبارەکت بێت. گوتی: پارەم ناوێت، لەمنیش دڵنیابـە چـونکە بـەڵێنم بەشـێخ رەزا داوە بەسـەلامەتی دەتگەیەنمـە شـوێنی خـۆتو، بـڕی ٩٠ دینـارت لـەبری تفەنگەکـە دەدەمـێ. پـارەم لێوەرنەگرت، خوداحافیزیم لێکرد، بەداخەوە ئەم هاولاتییە ئێستاش نەمدیتەوە تا لەخزمەتیدابم.

رووەکردە سەربازگەکە، ٢٠ مەترم مابووو بگەمە بەردەرگا سەرەکییکە سەربازێك هـاواریکرد راوەسـتە هیـچیتر نەیەیتـە پێشەوە. گوتم: هاتووم خۆم تەسلیم بکەم. گوتی: برۆ دوای یەك سەعاتیتر وەرەوە.

گیرفان گەڕام پارچە کاغەزێکم نەدۆزیەوە، چونکە دوو سەعات پێشتر هەرچی نووسراوێکم پێبوو بـاشو خـراپ، سـپیو رەش هەموویم خستە ناو سۆپای ماڵەکەو سوتاندم، ئینجـا داوای پارچـە کاغـەزێکم لێکـرد، نـاوی خـۆم بـۆ نوسـی: رەفیـق پشدەری، ئامر بەتالیۆنی ٩, هاتووم خۆم تەسلیم بکەم.

دوای ٥ دەقیقە دوو سەرباز بەرەوڕوم هاتنو بردیانم بۆ ژێر چـادری ئـامر فـەوج کـە لەگـەڵ دوو ئەفـسەردا دانیـشتبوو، دەستیانکرد بەپرسیار بۆ ماوەی یەك سـەعات. پێـشەکی ئـامر فـەوج ئـەم قـسە نایابانـەی لەگەڵدا کردم کەهـەرگیز لـەبیرم ناچـێتەوە، گـوتی: تـۆ چـەتەی تاوانباریـت، رووبـەڕووی سـوپای عێراقـی راوەسـتاویت، ئێـوە سـەر بـەئێرانو ئینگلیـزن، بەیارمەتی ئەوان دەجەنگن، ژمارەتان ناگاتە ٥٠٠ چەتە، بـارزانی تاوانبـار ناتوانێـت حکومـەتی کـوردی دابمـەزرێنێ، ئەمـە خەونە کورد حکومەتی هەبێت. دەتانەوێ عێراقی عەرەب بکەنە دوو بەش، باش بزانن ئەوەی لەئێمە دەکوژرێـت شـەهیدە، چونکە پارێزگاری نیشتمانەکەمان دەکەین، تەماشای خۆت بکە بزانە لەمرۆڤ دەکەی؟

وەڵامم نەدایەوە، کەزانی لەسـاغ ناکـەمو مانـدوومو چـاوم هەڵنایـە، ریـش هـاتوو جلوبـەرگو جامانـەی سـەرم قوڕاویـە، کۆتایی بەقسەکانی هێنا ئەوجا منی بردە گەرماوی تایبەتی خۆی. خۆم شوشت، جلوبەرگی تازەم لەبەرکردو ریشم تاشـی، بەرگی سـەربازیم لەبـەرکرد، بردمیانـە ژوری دکتـۆرو خـەوتم. ئەمـە بـۆ مـن پـشتیوانێکی بـاش بـوو, دوای ئـەوە هاتمـەوە سەرخۆم, هەستمکرد گێژمو مێشکم شت وەرناگرێت، چونکە لەبارودۆخێکی تازەدا دەژیم.

لەساڵی ١٩٥٦ـەوە کەدەسـتمدایە سیاسـەت خـەڵکم ناسـی، لەسـاڵی ١٩٦١ تـا کۆتـایی ١٩٦٥ لـەئازارو ئەشـکەنجەدام، جێگای خۆم کردبۆوەوە لەناو جەماوەردا، دڵسۆزو خۆشەویست بووم، لەئازاکانی شۆڕشی ئـەیلول ناسـرابووم، دانیـشتوانی

ناوچەی بەمۆو بەشێکی گەرمیان سوێندیان بەسەرم دەخوارد، بەکوردێکی دڵسۆزو نیشتمانپەروەر ناویان دەهێنام و رێزی تایبەتیم هەبوو, خۆم بەخۆمم گوت رەفیق ئێستا تۆ چیت؟ بەندە لەژێر چادرێکی سەربازی دانیشتوەو رابردوم سڕایەوە، لەمرۆڤێکی نیشتمانپەروەرو شۆڕشگێڕ هاتمە ریزی چڵکاوخۆرەکانی میری، پاشەڕۆژم چۆن دەبێت! ئەی کەسوکارم و برادەرەکانم چیم پێدەڵێن، خۆم داوەتە دەم ئاوەوە مەلەوانیش نازانم، بەهەرحاڵ لەهەموو روێکەوە لەباروذۆخێکی تاریکدا دەژیم، گێژم لەشێت دەکەم. بارزانی و بنەماڵەکەی سەریان لێشێواندم و تووشی ئەو بارودۆخە نەخوازراوەیان کردم. لەبەرخۆمەوە دەمگوت دەك ماڵتان وێران بێ وەکو ماڵی منتان وێرانکرد. بەڵام کورد دەڵێ ئەو نانە نانە ئەمڕۆ لەخوانە. ئەوەندە دوودڵ و پەشێوبووم لەشێت دەچووم. نەمدەزانی چی دەکەم و چیم بەسەردێ، ئەوە پاداشتی بارزانی بوو بۆ من بەرامبەر ئەو شەڕو بەرەنگارییانەی بەرامبەر رژێم نواندم. بەڵام راستە: (لا يصلح الناس لا سرات لهم، ولا سرات اذا جهالهم سادوا). واتە خەڵك نابێ بەبێ سەر, سەریش سەر نییە ئەگەر نەزان بێ.

بەیانیەکەی بەهەلیکۆپتەر منیان گواستەوە بۆ بارەگای فرقەی دوو لەکەرکوك، لەوێ

دە رۆژ مامەوە, تەنها چوار کەسم بینی: ئیبراهیم فەیسەڵ ئەنساری فەرماندەی فرقەی دوو، عقید روکن عەزیز توفیق، رائد محەمەد زهاد لێپرسراوی ئیستخباراتی فرقەی دوو، هەروەها نەقیب سالم حسەین یاردەدەری لێپرسراوی ئیستخباراتی فرقەی دوو. ئەم چوار کەسە بەردەوام وتوویژیان لەگەڵمدا هەبوو کەوا لەخوارەوە هەندێ لەشتە گرنگەکانی ئەو گفتوگۆیانە دەخەمە روو:

١– یەکەم پرسیاریان دەربارەی ناوم، ساڵ و شوێنی لەدایکبوونم، ژمارەی چەکدارەکانم و،

جۆری چەکەکانمان بوو.

٢– پرسیاری ئەوەیان لێکردم کەیارمەتیمان لەکوێوە بۆ دێ، چونکە بڕوایان نەدەکرد ئەو شەڕە گەورانەی ئێمە بەتفەنگی برنەوی ئینگلیزی و هۆڵەندی ئەنجامدرابێت.

٣– بڕوایان نەدەکرد کە لەهێزی پێشمەرگەدا تەنها ئەوەندە بریندارو شەهیدەمان هەبووبێت کەپێم گوتن. بۆیە دەیانگوت ئێوە زیاتر لە ١٩٠ کوژراوو ٤٠٠ بریندارتان هەیە.

٤– باوەڕیان نەدەکرد کەئێمە پەلاماری دەربەندیخان و ناوچەی دوزخورماتوومان دابێت. بەڵکو دەیانگوت خەڵکی ناوشار بوو بەم کارە هەستاون، چونکە پێیان وابوو ئێمە لەتواناماندا نییە ئەو هەموو رێگایە بۆ ئەو ناوچانە بەپێ ببڕین.

٥– توانیم بڕوایان پێبێنم کەناوی کەس لەرێکخراوەکانی کفری, دوزخورماتوو, سەرقەڵا, کەلارو باوەنوور نازانم، چونکە من بەوە تاوانبارم کەسەر بەجەماعەتی ئیبراهیم ئەحمەدم.

لەکاتی گفتوگۆمدا لەگەڵ ئەو چوار لێپرسراوە بۆم دەرکەوت کەئەمانە تەنها بڕوایان بەهێز هەیە. کێشەی سەرەکی من لەگەڵیاندا ئەوە نەبوو کەنمدەزانی چۆن لەگەڵیاندا وتوویژ بکەم بەڵکو من لەبەر ئەوەی زۆر بەراشکاوی و راستەوخۆ قسەم لەگەڵ دەکردن گومانیان لێ پەیدا کردبووم، بۆیە دەیانگوت: تۆ خۆت بۆ ئەو پرسیارانە ئامادە کردووە و جێی گومانی ئێمەی. دوایی منیان بەرەو بەغدا برد، بەبیانوی ئەوەی نەوەك هێزی پێشمەرگە هەوڵی تیرۆرکردنم بدەن لەرێگادا ٢٠ سەرباز پاسەوانییان دەکردم. کەگەیشتینە وەزارەتی بەرگری منیان بردە لای شەفیق دەراجی لێپرسراوی ئیستخباراتی سوپاو یاریدەدەرەکەی عەبدولرەزاق نایف. دوای ئەوە بردیانم بۆلای سوپاسالار عەبدولڕەحمان عارف و بۆ رۆژی دوایی گەیاندمیانە لای عەبدولسەلام عارف. لەوێ سەرلەنوێ هەموو ئەو پرسیارانەیان لێکردمەوە کەپێشتر بیستبووم، بەهەمان شێوە دووبارە بڕوایان بەوەڵامەکانم نەدەکردو تەنها عەبدولڕەحمان عارف و شەفیق دەراجی پاڵپشتم بوون. چونکە

لەڕێگای منەوە زۆر زانیاریی‌و ڕاستییان لەسەر ژمارەی کوژراوو بریندارەکانی هێزی پێشمەرگە پێگەیشت کەپێشتر لەلایەن گەورە ئەفسەرانی هێزی سەربازییەوە ژمارەی ناڕاستو هەڵەیان پێ ڕادەگەیاندن. بۆیە دوای ئەمە ڕێگایاندام سەردانی ماڵەوە بکەم. سەعات ١٠ی شەو گەیشتمە ماڵەوە, کەدەرگایان لێکردمەوەو چومە ژووری بەو بەرگەوە بینیانمو سەیری باڵتۆکەی دەستیان کردم، یەکسەر بۆیان ئاشکرا بوو کەمن شۆڕشم بەجێهێشتووە بۆیە کەسیان وەڵامی سەلامەکەیان نەدامەوە. دایکم گوتی: یاخوا بەخێر نەیەوە ئەمەشت کرد ڕەفیق. ئەمە وای لێکردم سەردانی خزمو کەسوکارم نەکەم. دوای ئەوە پێم گوتن من بەیانی لێرە نابم دەچمەوە لای شەفیقی برام لەقەڵادزێ. خێزانەکەم گوتی کێشەمان نەبووەو لەهیچیشمان کەم نەبوو ئەمەت بۆ کرد؟ بەیانی تیرۆرت دەکەن‌و دەڵێن ڕەفیق تاوانباربوو بۆیە کوژرا، بەڵام ئەگەر لەناو هێزی پێشمەرگەدا کوژرابای ناوت بەشەهید دەڕۆی. لەدواڕۆژدا چی بەمنداڵەکانم بڵێم؟ من لەگەڵت دانانیشم. کەمال گوتی: ڕووم دەکردە خزمو برادەران بەپیرمەوە دەهاتن ئیتر شەرم دەکەم لەماڵەوە بچمە دەرەوە.

بەدووردرێژی باسی خۆمم بۆ گێڕانەوە چۆن لەسەرەوە نوسیوومەو دەقی قسەکانم باسکرد هەتاکو ئەم سەعاتەی گەیشتمە ماڵەوە، ئینجا دوو ڕۆژ کەسمان لەماڵەوە نەچووینە دەرەوە، هەر چوارمان ڕێککەوتین کەکاسبی بکەمو ڕێگای باوکو باپیرانم بگرمەبەر، هەر بۆیە لەشەقامی جمهوری لەباڵەخانەی محەمەد بوننیە شوقەیەکم بەناوی (مکتب کمال للتجارة والقمسیون) بۆ کاسبی کردەوە. عەبدولڕەحمان عارف ٢٠٠٠ هەزار دیناری دامێ‌و عەبدولسەلام عارفیش ٥٠٠ دینار.

## دەربارەی پەیوەندییەکانم لەگەڵ حکومەتی عێراقدا

هۆی ئەو بایەخ پێدانەی ڕژێم بەمن لەبەر ئەوەبوو کەخۆم تەسلیم کردەوە, پروپاگەندەی ئەوەیان بۆ کردم گوایا من سکرتێری مەلامستەفابووم، لەگەڵ ئەوەی کەمن هەر لەسەرەتاوە پێم گوتبوون، ناوم ڕەفیق پشدەرییەو فەرماندەی بەتالیۆنی ٩ بووم. ئەم پروپاگەندەیەی ڕژێم لەسەر من لەزۆر ڕووەوە کەڵکی بۆم هەبوو چونکە توانیم لەو ڕێگایەوە زۆر لەکێشەو نەهامەتییەکانی گەلەکەم بۆ گەورە لێپرسراوان باس بکەم. هەر ئەوە وایکرد لەماڵەوەش ڕێزم لێبگرن پاش ئەوەی بۆیان دەرکەوت کەمن هەر بەبەلاش خۆم تەسلیم بەرژێم کردووە دەنا بەفکرو هۆش هەردەم لەخزمەت گەلەکەمدام. پاش تێپەڕبوونی مانگێك هەستمکرد لەلایەن سیخوڕەکانی ڕژێمەوە چاودێری دەکرێم. چونکە گومانیان لێم هەبووو ئەم کارەی منیان بەدەسکیسەی شۆڕش دەزانی، بۆیە ئەو دەمانچەیەی لەسەرەتادا بۆ پارێزگاریکردن لەخۆم دابوویانمێ، لێیان سەندمەوە. بۆ جاری دەیەم داوایان لێکردم ڕێکخراوەکانی پارتییان بۆ دەستنیشان بکەم، دوای ئەمە دڵنیابووم کەگەورە لێپرسراوانی سوپای ڕژێم گومانەکەیان گۆڕاوەتە ڕق لەمن. بۆیە کێشەیان بۆ دروستکردم بەڵام عەبدولڕەحمان عارفو شەفیق دەراجی پشتیان گرتمو دەربازیانکردم.

پشتگیریی ئەوانە بۆمن قازانجی زۆربوو، بۆ نموونە کاتێك سالار تۆفیق سادقی ئامۆزام کەپێشمەرگەی شۆڕش بوو شەهیدبوو، وا بڵاوکرایەوە کە لەقەڵادزێ بەتفەنگی دوژمن شەهیدکراوە، بۆیە چومە کەرکوك بەو نیازەی لەوێوە بچمە قەڵادزێ بۆ سەرخۆشی لەمامم. لەکەرکوك لەتەنیشت کاربەدەستێکی ئیستخبارات دانیشتبووم لەم کاتەدا نامەیەکیان بۆ هێناو سەیری منی کردو گوتی: لەبەغداوە بروسکەمان بۆ هاتووە گوایە دەتەوێت بۆ ناو هێزی پێشمەرگە ڕاکەی، بەڵام ئێمە وەڵامیان دەدەینەوە کەکوڕی مامت لەگەڵ پێشمەرگەکاندا کوژراوەو تۆش دەتەوێت بچیتە سەرەخۆشی. ئەوەبوو لەپیاوەتی خۆی ئاگاداری عقید غانم مصباحی کرد تا ڕێگابدەن بەئاشکرا پرسەی بۆ دابنێمو، بڕێك برنجو شەکرو ڕۆن‌و چای بۆیان نارد، منیش دوای ئەوە گەڕامەوە.

بێ ئەقڵیو شۆڤێنی پیاوەکانی رژێم لەلایەکو دڵسۆزی ماڵەوەمان دایکمو هاوسەرەکەمو کەمال لەلایەکیتر وایان لێکردم کەهەڵوێستە دوژمنکارییەکانی مەلامستەفاو عەبدولوەهاب ئەتروشیم لەبیربچێتەوە. هەروەها وای لێکردم بەخۆمدا بچمەوەو بڕیاربدەم بەهیچ شێوەیەك گیانی تۆڵە بەسەرمدا زاڵ نەبێو لەخزمەتکردنی هەر خەڵکێك کەهانام بۆ دێنێ، درێغی نەکەم. هەروەها بڕیارمدا ئەوەندەی پێم بکرێ قەناعەت بەلێپرسراوانی رژێم بێنم بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد. ئەم کارە وایکرد خۆشەویستی ماڵەوەو خەڵك بۆلای خۆم رابکێشمو دەروونیشم ئاسودەبکەم.

دوای ماوەیەك سەرکۆماری عێراق عەبدولسەلام عارف لەباروودۆخێکی نادیاردا، لەکاتی سەردانی بۆ پارێزگای بەسرە، کۆپتەرەکەی لەزوبێر کەوتە خوارەوەو مرد. ئەم رووداوە بوو بەهۆی ئەوەی عەبدولرەحمان عارفی برای بکرێ بەسەرکۆمار. لەسایەی ئەم زاتەوە گۆڕانکاری باش بەسەر عێراقدا هات بەکوردو عەرەبیەوە وەکو باسمکردووە. بەش بەحاڵی خۆم توانیم لەو ماوەیەدا لەسەر پێی خۆم راوەستمو رووبەڕوو لەگەڵ سەرکۆمارو لەگەڵ حزبە سیاسییەکانی عەرەب دروستکرد.

## رووداوەکانی ساڵی ١٩٦٦... ئایا ٦٦ چییە؟

لێرەوە بەکورتی دێمە سەر باسی باڵی م.س. جەماعەتی ئیبراهیم ئەحمەد:

هەرچەندە مەلامستەفا دوای کۆنگرەی قەڵادزێ (شەشەمین کۆنگرەی پ.د.ك)و هێرشەکەی بۆسەر ماوەتو باڵی م.س.و هەڵاتنیان بۆ ئێران، دوای ماوەیەك هەموو هێزەکەیان لەسەر داوای عەباس ئاغاو رەزامەندی مەلامستەفا گەڕایەوە پاڵ شۆرش. ئەوەبوو هاتنە دۆڵەڕەقە, مام جەلالو کاك عومەر دەبابەو کاك حلمی عەلی شریفو کاك عەلی عەسکەری لەپەنا عەباس ئاغا رۆژگاریان بەسەردەبرد. مەلامستەفا لەرێگای پاراستنەوە زانیاری ئەوەی پێدەگات کەجەماعەتی ئیبراهیم ئەحمەد پەیوەندییان بەدەرەوە پچڕاوە، بۆیە ئەمە بەهەل دەزانێ بۆ لەناوبردنیان چونکە بەبڕوای ئەو، ئەم جەماعەتە لەداهاتوودا دەبنە هەڕەشەی گەورە بۆ سەر بنەماڵە.

مەلامستەفا بۆ بەرژەوەندی تایبەتی خۆی پاسەوانە تایبەتیەکانی نارد بۆ لای عەباس ئاغاو برادەرانی م.س. بەمام جەلالو عومەر دەبابەو عەلی عەسکەریو کاك حیلمی راگەیاندبوو کەبۆ بەرژەوەندی گشتی وای پەسەند دەکەم بێنە ئێرە لەحاجی ئۆمەران دانیشن. بۆ ئەم مەبەستە لەرێی رێکخراوەوە راستی ئەو وەڵامەیان پێگەیشتو بەپەلە ئاگادارکرانەوە کەداواکردنی مەلامستەفا بۆ پشوودان نیە. لەلایەکیتر عەباس ئاغا پێی راگەیاندن کەمەلامستەفا بڕیاری لەناوبردنی داون، بۆیە ئێوە لەبەرامبەر بەرژەوەندیو ژیانی خۆتان بەرپرسیارن، ئەوانیش پاش گفتوگۆ لەناو خۆیاندا گەیشتنە ئەو باوەڕەی کەئەمە پیلانەو بارزانی دەیەوێت لەو رێگایەوە تیرۆریان بکات، بۆیە دۆڵەڕەقەیان جێهێشتو بەنهێنی رایانکرد. مەلامستەفا کەئەمەی بیست زۆر توڕەدەبێتو یەکسەر چەند جامانەسورێك دەنێرێت بۆ هەڵوێست وەرگرتن بەرامبەر عەباس ئاغا، بەڵام سەرۆك هۆزێکی ناسراوی نیشتمانپەروەری ئاکۆییو خاوەنی هێزێکی تایبەتی وا ئاسان نیە بۆ بارزانی کەبیکوژێت، بۆیە ئەو هەڵوێستەی عەباس ئاغا دەکرێ وەك داستانێك تەماشا بکرێت. پاش ماوەیەکی کەم لەسەرانسەری کوردستان دەنگوباسی راکردنی ئەم کۆمەڵە بڵاوبۆوە.

کاك عەلی مام رەزا کەکوڕی پورمە بەهۆی خزماتیەوە هاتوچۆمان هەبوو، بەڵام بەهیچ جۆرێك پەیوەندی سیاسیم لەگەڵدا نەبوو، لەگەڵ ئەوەی دەمزانی سەر بەباڵی م.س. جەماعەتی ئیبراهیم ئەحمەدە بەڵام نەمدەزانی پلەی حزبی چییە. دوای هاتنی مامەو حلمی، ئینجا زانیم کەلێپرسراوی رێکخراوی باڵی م.س. شەو لەناکاو کەهیچ ئاگام لەخۆ نەبوو کاك

حیلمیو عەلی مام رەزا هاتنەماڵەوە بۆ لام لەبەغدا کەماڵمان ئەوکات لەئیسکانی غەربی بەغدابوو، بەگەرمی بەخێرهاتنم کردنو خۆشحاڵی خۆم بۆ دەردەبڕینو ڕێزێکی زۆرم لێنان، پاشان روم لەکاك حیلمی کرد گوتم: پێشینان راستیان گوتوە: کێو بەکێو ناکەوێ بەڵام چاو بەچاو دەکەوێ، ئەوە وایکرد دەست بکەین بەوتوێژ.

سەرەتا کاك حلمی پرسیاری بارودۆخی خۆمی لێکردم، منیش بەدوورودرێژی باسی خۆم بۆ کرد ئینجا گوتم: لەهیچ روییەکەوە کێشەم نییە، ئێستا مەکتەبی بازرگانیم هەیە لەباڵەخانەی بوننیە بەناوی (کمال للتجارة والقومسیون)و دوو وەکالەتم هەیە. گوتی: گومانم نییە شارەزاییەکی باشت هەیە بەرامبەر حوکمەتو خودی عارف خۆیو دەزانی چۆن بیر دەکاتەوەو هەڵوێستی بەرامبەر کێشەی کورد چۆنە. گوتم: عەبدولرەحمان عارف جیاوازیێکی زۆری لەگەڵ سەرۆکەکانی پێشوودا هەیە، چەند جار دووبەدوو لەکاتێکدا کەسوپاسالاری عێراق بووو ئێستا کەسەرکۆمارە، دەربارەی کێشەی کورد باسم لەگەڵ کردووە ئامادەیی تێدایە بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کوردو هەڵوێستی ئیجابیە، جیاوازی ناکات لەنێوان عەرەبو کورد. بەڵام عەبدولرەحمان، ژەنەراڵەکانی سوپا هێنایانە سەر تەختی دەسەڵات، ئەو شەوەی لەروسیا گەڕایەوە لەفرۆکەخانە بەچاوی خۆم سەرنجمدا چۆن عەبدولرەزاق نایف دەستیگرتو لەگەڵی ڕۆیشت، لەکاتێکدا عبدالرحمن بەزازو عەزیز عەقیلی دانیشتبوون، واتە عەبدولڕەحمان عارف دەسەڵاتی تەواوەتی بەسەر کورسیەکەیدا نییەو ناتوانێت بەبێ فەرمانی ژەنەراڵەکانی سوپا بڕیارێك بدا بەتایبەتی عەبدولرەزاق نایف.

گوتی: ئێمە سەرپەرشتی شۆڕشێکمان کرد توانیمان لەماوەیەکی کەمدا بەشی زۆری جەماوەر لەدەوروپشتی ڕێکخراوی پارتی کۆبکەینەوەو هێزی پێشمەرگەمان بەجۆرێك ڕێکخست کەدوژمنمان سەرسام کرد، بەڵام بارزانی هێزی هۆزەکانی کۆکردەوەو هاتە سەرمان ئێمەش بۆ بەرژەوەندی گتی نەمانویست رووبەڕووی بوەستینو شەڕی لەگەڵدا بکەین تاکو ریسەکەمان نەبێتەوە بەخوری، ئێستا بارزانی بەو عەقڵیەتە خێڵەکییەی خۆی دەسەڵات بەڕێوەدەباتو بارودۆخەکە بەرەو هەڵدێر دەبات، ئەو دکتاتۆریەتەی بارزانی بۆتە هۆی ئەوەی تێکڕای ئەندامانی پارتیو هێزی پێشمەرگە داوامان لێبکەن بێینە لای ئێوە بۆ گفتوگۆو دۆزینەوەی ڕێگەچارە. ئێمە بەناوی م.س. هاتووین کە لەگەڵ حکومەت دانوستان بکەین، ئەگەر هەڵوێستیان ئیجابی بێتو لەماوەیەکی کەمدا دان بەمافی کورددا بنێنن، ئەوا دەتوانین کوردستان لەدەسەڵاتی خێڵەکی رزگار بکەینو، ئەگەر هەڵوێستیان سلبی بێت یەکسەر بەغدا بەجێ دەهێڵینو چۆن هاتوین ئاواش دەگەڕێینەوە. ئینجا گوتی: بۆیە بەنهێنی روومانکردۆتە لای تۆ بۆ ئەوەی بچیت چاوت بەخودی سەرۆك عەبدولرەحمان عارف بکەوێت تا لەهەڵوێستی ئێمە ئاگاداری بکەیتەوە، ئێمە چاوەڕوانی وەڵامین.

لەگەڵ کاك عەلی مام رەزا ڕۆیشتم بەرەو ماڵیان کە لەگەڕەکی بغداد جدیدە بووو، چومە خزمەتی مام جەلال، دوای سڵاوو وتوێژ دەربارەی بارودۆخی ئێستاو هەموو ئەو باسانەی کەکردم لەگەڵ کاك حلمی، هەموویم وەکو خۆی بۆ باسکرد. مامە گوتی: ئایا ژەنەراڵەکانی سوپا باوەڕیان بەدیموکراتیەت هەیە، دان بەمافی کورددا دەنێن، پشتگیریمان دەکەن، کێشەی کورد جێبەجێ دەکەن، هەڵوێستیان دەبێت، ئیجابی یا سلبی دەبێت؟ گوتم: الیس الصبح بقریب، ئەگەر رووبەڕوویان ببنەوە ئەوجار تێدەگەی حوکمەتێکی سەربازیە، بەڵام خودی عەبدولڕەحمان دەیەوێ کێشەی کورد چارەسەربکاتو من شایەتی بۆ ئەوە دەدەم.

سەعات یەکی شەو هاتینەوە بۆ ماڵی خۆمانو تا سەعات سێی بەیانی لەگەڵ کاك حلمی قسەمان کرد. بۆ بەیانی چووم بۆ لای عەبدولڕەحمان عارفو هەموو قسەکانی مام جەلالو حلمی عەلی شەریفم بۆ باسکرد. دوای ئەوە ئاگادارم کردن کەبۆ نانی نیوەڕۆ لەماڵی عەبدولرەحمان جەلیل کەمەلامستەفا ناوی لێنابوو جەلیل چەرمەگا دەعوەتنو ئێوارەکەی

سعات چوار لەکۆشکی کۆماری لەگەڵ سەرۆك کۆدەبنەوە. ئینجا بۆ دووەم جار لەماڵی کاك عەلی سەردانی مام جەلالم کرد، دەقی قسەکانم بۆ گێڕایەوە گوتم: عەبدولرەحمان عارف خۆشحاڵی خۆی دەربڕی بۆ ئەم قسانەو سڵاوو ڕێزی هەبوو، هەروەها بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی عبدالجلیل ئەحمەدو بەڕێوەبەری استخباراتی سوپا شەفیق دەراجی کەوتنە جموجوڵو زۆر بایەخیان پێدا، هەموومان لەسەر ئەوە کۆکبوین کەئەم هەلە لەکیس نەدەین بگرە عەبدولرەحمان گوتی: دەبێ هەموومان بایەخ بەم ڕووداوە بدەین بۆ جێبەجێکردنی. لێپرسراوانی سوپا بەشدارن، پێم وایە کۆبوونەوەکەی سبەی ئێوارە زۆر فراوان دەبێت.

گەڕامەوە ماڵەوە، کاك حلمی چاوەڕوانی دەکردم، ئاگادارمکردو پێم ڕاگەیاند کەئەم میوانداریە بۆ گفتوگۆیە، بۆیە لەدامودەزگای ئەمنی هەردوو بەش ئەمنو استخباراتو نوێنەری سوپا بەشداردەبن، ئەوانە بگەنە باوەڕ کەئەم کێشەیە بەم جۆرە جێبەجێ دەبێت ئەو کاتە سەرۆك یەکسەر ڕەزامەندی نیشاندەدات.

لەکاتی دیاریکراودا گەیشتینە بەردەرگای ماڵی عەبدولجەلیل ئەحمەد، هێشتا لەئۆتۆمبیلەکەی دانەبەزیبووین یەکسەر بەپێرمانەوە هاتن بەجۆرێك پێشوازییان لێکردین کەجێی سەرسوڕمان بوو لای پاسەوانەکانی. بەئۆتۆمبیلێکی ڤۆکس واگن سێ کەس دابەزین: مام جەلالو حلمیو من. لەو لێپرسراوانەی پێشوازییان لێکردین شەفیق دەراجیو عەبدولرەزاق نایفو عبدالجلیل ئەحمەدو چەند کەسێکی تر کەناوم لەبیرنەماون، ڕێزێکی تایبەتییان لێگرتین، دوای سڵاوو چاکو چۆنیو نانخواردن، دەربارەی هاتنیانو بارودۆخی ئێستاو کێشەی کوردو دەستێوەردانی دەرەوەی وڵات، ماوەی سێ سەعات گفتوگۆ کرا. بەندە لەماوەی ئەم سێ سەعاتە ڕەنگە هەر دە دەقیقە قسەم کردبێت, من گوێم دەگرت، کاك حلمی دووجار بەنهێنی ئاگاداریکردم کەئەگەر ئەوان رازیبن با وێنەمان نەگرن، وەڵامم دایەوە ئەمانە ئاسایشن لای ئەمان ئەمە زۆر گرنگەو منیش حەز بەوێنەگرتن ناکەم.

مام جەلال لەکۆبۆنەوە سێ سەعاتییەکەدا لەسەر کێشەی کورد گوتی: ئێمە سەرۆك هۆزێك نین، نەهاتوین چەکتان بۆ هەڵگرین یان داوای هیچ یارمەتیەکتان لێبکەین، ئێمە نوێنەرین بەناوی گروپێکی سیاسی کوردییەوە هاتووین، خاوەن بیروباوەڕینو بەدڵێکی پاکو بەئیمانەوە هاتوین کە لەگەڵ حکومەتی عەبدولرەحمان کۆببینەوە بۆ جێبەجێکردنی کێشەی کوردو دانانی بەمافی ڕەوای کورد، کەئەمە لەدواجاردا دەبێتە مایەی گۆڕانکاری لەسەرانسەری عێراق، یارمەتیدانو هۆکاری بەهێزبوونو پشتگیریمان ئەوەیە کەئایا ئێوە گەیشتوونەتە ئەو باوەڕەی بەشەڕ ناتوانن دەست بەسەر کوردستاندا بگرنو کێشەی کورد کۆتایی پێ نایەت، عێراق پێکهاتووە لەدوو نەتەوەی کوردو عەرەب, ئایا ئێوە گەیشتونەتە ئەو باوەڕە؟ ئەگەر وەڵامتان سلبی بوو ئێمە چۆن هاتووین ئاواش دەگەڕێینەوە، ئەگەر وەڵامتان ئیجابی بوو بەردەوام دەبین لەوتوویژو گفتوگۆو کێشەکەمان زۆر بەئاسانی جێبەجێ دەکەینو ئەنجامەکەی سوودبەخش دەبێت بۆ هەموو دانیشتوانی عێراق.

قسەی نوێنەرانی حکومەت لەچەند خاڵێك لەیەکچوون کەدیاربوو پێشتر لەنێوان خۆیاندا قسەیان لەسەر کردبوو کەبریتی بوو لە: لەسەدی چەندی دانیشتوانی باکوری عێراق لەگەڵ ئێوەدان؟ هێزی پێشمەرگەتان چەندە؟ چۆن دەتوانن بەرامبەر بارزانی ڕاوەستن کاتێك بارزانی لاوازبوو؟ ئەو کاتە ئێران دەوری چۆن دەبێت؟ ئێوە چیتان لەئێمە دەوێ؟ وەڵامی مامەو حلمیش بەم جۆرە بوو: دان بەمافی کوردو کێشەی کورددا بنێن، ئەو کاتە ئێمە گەورەترین هێز دەبین لەکوردستاندا، هەر کاتێك ڕژێمی شا کێشەمان بۆ دروست بکات ئێمەش کێشەی بۆ دەنێینەوە.

ئینجا مام گوتی: کاك رەفیق من ئەو دانیشتنانەم زۆر دیوە بەم جۆرەی ئێستا بەگەرمی گفتوگۆیان لەگەڵدا کردووم بەڵام زۆری پێنەچوە وەڵامەکەیان بەفرۆکە داوینەتەوە، وادیارە ئیشمان بۆ دەکەنو ڕێزێکی تایبەتی تۆ دەگرن، بۆیە

ئەگەر بتوانیت بەقسە خۆشەکانی خۆت لەگەڵیان بدوێیت بۆ بەردانی برادەرەکانمان، ئەگەر بێتو بتوانیت ئەمە بکەیت ئەوا لەهەموو روێکەوە ئێمەو تۆ سودبەخش دەبین.

چومە نێوان کاك عبدالجلیل ئەحمەدو شەفیق دەراجی گوتم: تکایەکم هەیە لای بەڕێزتان بۆ منە، ئەگەر بەدەممەوە بێن ئەوا لەناو خەڵك دەگۆڕێیتو بەباشی باسی ئەم هەڵوێستەم دەکەنو، بەناوی منەوە تەواو دەبێت چونکە کەس نازانێت ئەم کارە بۆ مامەو حلمی کراوە، ئینجا گوتم: جەلالو حلمی داواکارییەکان هەیە لای بەڕێزتان ئەویش ١١ کەسیان گیراوە کەسەر بەرێکخراوی خۆیانن، بڕیاری بەردانیان بدەن لای ئەوان زۆر گرنگە، بۆ ئێوەش زۆر ئاسانە، بەردانیان دەبێتە مایەی نزیکبوونەوەی باوەڕو بەهێزکردنی پەیوەندیتانو، هەر کاتێك لەگەڵیاندا رێککەوتن دەتوانن لەجیاتی ١١ کەس کەبەرتانداون ١١١ کەسیان لێبگرنەوە. بەبێ لێکۆڵینەوە بڕیاریاندا هەر ١١ کەسیان بەربدەن، من بۆ جێبەجێکردنی ئەو خاڵە گرنگە مامەوەو چومە ئاسایشی گشتی، سوپاس بۆ یەزدانی مەزن بەربوون. ئەوەی لەبیرم ماوە ناوی دوو لەو برا بەڕێزانەیە، یەکێکیان لە لەندن نیشتەجێیەو خاوەنی چەند ملیۆنێك پاوەنە کەلەم دواییە هاتبوو بۆ سلێمانی خۆی پێنیشان نەدام! دووەمیان برای بەڕێزو رۆشنبیرو نیشتمانپەروەرو سیاسەتمەدار پزیشکی ناسراو کاك فوئاد خۆی لەکاتێکدا ئەم کارە ناکەمە هی خۆم، چونکە لەسەر داوای حلمیو مامە بەربوون.

## تێبینی

*١–کوردەواری دەڵێت تەڕت بکەمو قوتت بدەم. دانیشتنەکە بەم شێوەیە سەرنجی راکێشام، مام جەلالو کاك حلمی وام دانان ئەمانە مامۆستا یا کاربەدەستی گەورەن، یا دکتۆرنو بەرامبەرەکانیان تەندورستیان باش نییە، بەجۆرێك لاوازو بێدەسەڵاتو فەقیربوون جارجار دەمویست لەجیاتی ئەوان قسە بکەم. هەرچەندە لەپەنجاکانەوە هەردووکیان دەناسم. بەڵام تا ئەو کاتە نەمدەزانی بەرامبەر بەبێگانە چەند بەهێزن. لەو کاتەدا خۆم بەخۆم دەگوت رەفیق عەیبی ئەم دوو کابرایە ئەوەیە رەگەزیان کوردە.*

*٢– شەو درەنگ گەڕامەوە ماڵەوە بەدووروردرێژی هەموو روداوەکانم بۆ دایکمو هاوسەرەکەمو کمال گێڕایەوە، پێیم وابوو دواڕۆژم زۆر تاریك دەبێتو ئەمەی من پێی هەستام کارێکی خەتەرناکە بۆیە بڕیارمدا ئاگاداریان بکەم. پێشەکی لەگەڵ کاك عەلیدا قسەم کرد، ئەویش وای پەسەندکرد کەکاك حلمیو مامە ئاگاداربکەمەوە کەبۆ کاك حلمیم باسکرد گوتی: ئێمە بەبڕیاری گشتی ئەم رێگایەمان گرتۆتەبەرو خۆت دەزانی ئێمە نوێنەرین, گومانم نییە تووشی تەنگوچەڵەمەیەکی گەورە دێین لەراستیشدا کارێکی خەتەرناکە، بەڕای من دوو کێشەی گەورەمان دێتە پێش: یەکەم لەگەڵ بارزانی، دووەم لەگەڵ حکومەت کەتۆ بەهیچ جۆرێك ئاگادارنیتو تاوانبارنیت، ئێمە لەهەموو روویەکەوە یارمەتیت دەدەین پشتگیریت دەکەین. راستیانکرد, ئەم قسەیان بردەسەر بەدڵو بەگیان بەهیچ جۆرێك جیاوازییان لەگەڵ مندا نەکرد.*

من ئاگادار نەکرابووم، خۆیان ئەو رێگایان گرتەبەر، چ باڵی م.س. یا حکومەت، گومان نییە لەوەی ماوەیەك بوو باڵی م.س. بەنهێنی لەگەڵ حکومەتی عارف پێوەندییان هەیەو هەردوولا بەندەیان دەستنیشانکردووە بۆ ئەوەی بگەنە یەك، چونکە یەکەم سەعات کەئاگاداری کاربەدەستانی حکومەتم کرد لەسەرو هەموویانەوە سەرۆك عەبدولرەحمان عارف, رەزامەندی خۆی پیشاندا بۆ کۆبوونەوەوهەڵوێستو بۆچوونو پلانی رژێم ئەوەبوو کەسەرانسەری کوردستان هێزی سێهەم لەو هۆزانە پێکبهێنن کە لەیەکەم رۆژی شۆڕشی ئەیلولی ١٩٦١ چەکیان رووبەڕووی حکومەت هەڵگرتووە، بۆ ئەم مەبەستە لەرێگای بەندەوە پێوەندیم بەچەند سەرۆك هۆزێك کرد وەکو هۆزی پشدەر، چەند نووسراوێکم لەرێگای کمالی برام ناردو

دووجار بەخۆم چووم بەنهێنی چاوم پێیان کەوت, لەئەنجامی ئەم هەوڵدانە سێ کەسیان بەناوی نوێنەری هۆزی پشدەر تەشریفیان هێنایە بەغدا کەئەم بەڕێزانە بوون: بابەکر محمود حاجی ئاغا میراودەلی, هەمزە باپیر بابەکرئاغا میراودەلیو حەسەن ئەحمەد ئاغای بیشیر میراودەلی. هەڵوێستو بۆچوونو پلانی رژێم وابوو کەسەرانسەری کوردستان هێزی سێهەم لەو هۆزانە پێکبهێنن کە لەیەکەم رۆژی شۆڕشی ئەیلولی ١٩٦١ چەکیان رووبەڕووی حکومەت هەڵگرتووە، بۆ ئەم مەبەستە لەرێگای بەندەوە پێوەندیم بەچەند سەرۆك هۆزێك وەکو هۆزی پشدەر، چەند نووسراوێکم لەرێگای کمالی برام و دووجار بەخۆم چووم بەنهێنی چاوم پێیان کەوت, لەئەنجامی ئەم هەوڵدانە سێ کەسیان بەناوی نوێنەری هۆزی پشدەر تەشریفیان هێنایە بەغدا کەئەم بەڕێزانە بوون: بابەکر محمود حاجی ئاغا میراودەلی, هەمزە باپیر بابەکرئاغا میراودەلیو حەسەن ئەحمەد ئاغای بیشیر میراودەلی.

میواندارییەکی بێوێنەیانکردنو رێزێکی تایبەتیان لێنان، لەگەڵ زۆربەی کاربەدەستانی میری کۆبوونەوە لەوانە: سەرکۆمار عەبدولڕەحمان عارفو وەزیری ناوخۆو سوپاسالارو بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتیو بەڕێوەبەری دەزگای سوپاو چەندین کاربەدەستیتر.

لەیەکەم کۆبوونەوەیان لەگەڵ کاربەدەستانی رژێم, هەموویان چ بەنوسین یان بەقسە بەدوورودرێژی باسی بارودۆخی ناوچەی پشدەرو بێتواتەیان دەکرد. دەیانگوت لەو رۆژەی مەلامستەفا نوێنەری تایبەتی خۆی, حەسۆ میرخان بەکاربەدەستی ناوچەی پشدەرو عەلی شەعبان بەکاربەدەستی بێتواتەو رانیە دانا, ئەم دوو تاوانبارە بەجۆرێك ئازارو ئەشکەنجەی دانشتوانی ناوچەکە دەدەن کەهەرچی خودا پێی ناخۆشە دەیکەن، لێپرسراوانی حکومەت گوتیان: ئێمە بۆ ئەوەی بەرهەڵستی لەم دوو تاوانبارە بکەین، بۆ بەرژەوەندی عێراقو بەتایبەتی ناوچەی پشدەرو رانیە، ئامادەین بەهەموو توانایەك یارمەتیتان بدەین، باشترینو چاکترین رێگاچارە ئەوەیە خۆتان حوکمی ناوچەکەتان بکەن وەکو سالانی ١٩٣٦-١٩٤٢، هەمو کاربەدەستان لەخۆتان بێت, قائمقامو بەڕێوەبەری ناحیەو سەرۆك شارەوانیو رابەری پۆلیسو، بەهێزی چەکداری خۆتان ناوچەکە بپارێزن.

نوێنەرانی پشدەر گوتیان ئەو پلانەی ئێوە بەتەواوەتی چارەسەری بارودۆخی ئێستای ناوچەکە ناکات, بەڵکو ئالۆزتری دەکات، چونکە بەبێ یارمەتی ئێوە هیچمان پێناکرێتو کەیارمەتیمان لەئێوە وەرگرت ئەوا ئێمە چووینە خانەی فرسانەکان. ئێوە ئەگەر دەتانەوێت نوێنەرانی مەلامستەفا نەك هەر لەپشدەرو رانیە بەڵکو لەسەرانسەری کوردستان کەسیان لەدەورو پشت نەمێننو دانیشتوانی ناوچەکە بەتێکڕایی رووبەڕوویان راوەستن ئەوا کێشەی کورد لەرێگای جەماعەتی جەلال تاڵەبانی جێبەجێ بکەن، ئەو کاتە هەموو دانشتوانی کوردستان لەرۆشنبیرو نیشتمانپەروەرو دڵسۆزان, ئینجا ئێمەو هەموو هۆزەکان بۆ بەرژەوەندی گشتی بەتایبەتی بۆ بارودۆخی ناوچەکە بەتێکڕایی پاڵپشتی جەماعەتی جەلال تاڵەبانی دەبین، دوای ماوەیەکی کەم ئارامی بۆ ناوچەکە دەگەڕێتەوەو بارزانی تەنها یارمەتی دەرەوەی بۆ دەمێنێو لەناوەوە خەڵکێکی بێگانەو زۆر کەمی بەدوا دەکەوێت.

ئەم وەڵامە وای لەکاربەدەستانی میری کرد کۆبوونەوەیتر لەنێوان خۆیاندا بکەن کە لەئەنجامدا دوو بۆچوونیان هەبوو، یەکەم: بۆچوونو هەڵوێستی نوێنەرانی پشدەریان پەسەندکرد بەتایبەتی عەبدولڕەحمان عارف کەزۆری لەلا گرنگ بوو، بەڵام پشتگوێ خرا. دووەم: بەخەتەرناکیان زانی بەمجۆرە جەماعەتی مام جەلال بەهێزبێت.

**تێبینی**

*١- بۆ ئەم نەخشەیەی میری پەیوەندیم بەجەنابی عەباسی مامەندئاغا سەرۆك هۆزی ئاکۆ کرد بەڵام بەهیچ جۆرێك بەپیر ئەم هەڵوێستە نەچوو بەڵکو دژی راوەستا.*

*٢- هەروەها پەیوەندیم بەجەنابی شێخ لەتیفی شێخ محمودەوە کرد فەرمووی باوی ئەو جۆرە نەخشانە نەماوە, دونیای ئیمڕۆ جیاوازەو جەماوەر بەتایبەتی داوای کێشەی کورد دەکات بۆ جێبەجێکردنی.*

*٣- ئەم هەڵوێستە بەتەواوەتی پوچەڵ بووەوە، خۆم دەوری سەرەکیم هەبوو، ئەوانەی رێنموونییان دەکردم مامۆستای بەرێز ئیبراهیم ئەحمەد بوو.*

*٤-حکومەت ئاگاداری کاروباری حەسۆ میرخان و عەلی شەعبان بوو, مەلامستەفاش باسی باروودۆخی ناوچەکەی بۆکرابوو کە پێویستە لەجیاتی حەسۆ میرخان یەکێکیتریان بۆ بنێرێت، چونکە تاوانەکانی یەجگار زۆر زەقە. بەڵام وەڵامی مەلامستەفا هەر ئەوەبوو: ناوچەکەتان پیاوی تێدا نییە، ئێوە خراپن، هەر حەسۆ میرخان بۆ ئێوە باشە، دووجار لەسەردانی هاوڵاتییانی ناسراودا بۆ لای مەلامستەفا پێی گوتبوون: ئێستا دەنێرم بەشوێنیدا چارەسەری دەکەمو سزای دەدەمو یەکێکیترتان بۆ دەنێرم. کەنوێنەران دەگەڕانەوە قسەکانی بارزانییان بەخۆشییەوە بڵاودەکردەوە، راست دەینارد بەشوێن حەسۆدا، ئەویش دەستکەوتی مانگێکی دەبرد بۆ ئدریس بارزانی, کاتێك حەسۆ دەگەڕایەوە لەجاران زیاتر ئازارو ئەشکەنجەی خەڵکی دەدا, دەستی دەکرد بەپارە کۆکردنەوەو دزیو دادگاییکردنی خەڵك. خودای مەزن بەجۆرێك تۆڵەی خەڵکی لێسەندەوە کەئێستا گۆڕی پیسە تا کوڕەکانی بچنەسەری، عەلی کوڕیشی بەفەرمانی نێچیرڤان شەڕی قەڵادزێی بەپارە کرد کەسەرەتای شەڕی ناوخۆبوو لەدوای راپەڕینەوە.*

**عەبدولرەحمان عارف و هۆی چارەسەرنەکردنی کێشەی کورد**

یەکەم سەرکۆمار کە لەعێراقدا حوکمی عێراقی گرتبێتەدەست و هیچ جیاوازییەکی لەنێوان کوردو عەرەبدا نەکردبێت، ئەم زاتە گەورەبوو، هەموو هەڵوێستو بیروباوەڕو بۆچوونی ئەوەبوو کێشەکانی کەهەیە بەتایبەتی هی کورد چارەسەر بکات، بۆ ئەم مەبەستە پشتگیری سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیرانی جەنابی د. عەبدولرەحمان بەزازی کرد بۆ لێکۆڵینەوەو وتووێژو سەلماندنی مافی کورد، ئەویش لەرێگای خۆیەوە هەوڵێکی زۆریداو، لەو کاتەی ژەنەراڵەکانی سوپا حوکمیان بەدەست بوو لەپشت عەبدولرەحمان عارفەوە لەبارودۆخی ئەو رۆژەدا گوتی: ئەگەر بەپەنجەی دەست چەکدار لەم شاخانە بمێنێت، کێشەکە بەشەڕ کۆتایی نایەت.

لەسەردەمی بەزازدا کەبڵاوبوەوە دەبێت کێشەی کورد بەئاشتی جێبەجێ بێت، ژەنەراڵەکان قینو رقیان لێ هەڵگرت، بەجۆرێك لەدژی ئەو رۆشنبیرو سیاسەتمەدارە راوەستان، ئەگەر دوور نەخرابایە، لەوانەبوو بەنهێنی تیرۆری بکەنو، هەموو ئەو حزبە سیاسیانەی کەنیازی ئەوەیان بوو بەکودەتا بێنە سەر حوکم بەنهێنیو ئاشکرا بەناڕەوایی دەریانبڕی کەبەزاز مرۆڤێکی کۆنەپەرستەو دەیەوێت عێراق بکاتە دوو پارچە.

عەبدولڕەحمان عارف وەکو سەرۆکەکانیتر، ژەنەراڵەکان چواردەوریان گرتبوو, بەسەر ئیشوکاریدا زاڵبوون, توانای ئەوەی نەبوو بڕیاری یەکلاخەر بدات, ئەوەندە بێدەسەڵات بوو بەرامبەر ژەنەراڵەکانی ناچاربوو لەهەموو شتێك پرسیاریان پێ بکات، هەرچی حزبە ناسیۆنالیستە عەرەبیەکانیشە ئەوا نەیاندەویست کێشەی کورد چارەسەر بکرێت بەڵکو هەموو هەوڵێکیان بۆ ئەوەبوو کورد لەعێراقدا رەش بکەنەوە. بۆیە عەبدولرەحمان عارف تووشی گرفتی گەورەبوو. بۆیە حزبەکان لەهەوڵی جدیدابوون بۆ ئەوەی بێنە سەر حوکمو عەبدولرەحمان عارف لەدەسەڵات دووربخەنەوە، بەڵام ئەو پێی وابوو

گاردی کۆماریو هەموو سەرۆکەکانی دەزگاکانی ئاسایش پشتگیری دەکەنو لەگەڵیدان بەتایبەت بڕوای بەعەبدولرەزاق نایف بوو.

شایەنی باسە لەو کاتەدا ناصریەکانیش لەجموجوڵی گەورەدابوون بۆ کودەتا، پڕوپاگەندەی ئەوەیان دەکرد کەئەوان ئەگەر دەسەڵات بگرنە دەست دەتوانن کێشەی کورد بەئاشتی چارەسەر بکرێ. بەعسیەکانیش بەهەمان شێوە لەجموجوڵی ئاشکراو نهێنیدابوون بۆ هەمان مەبەست، بۆیە سەریان بەهەموو کونو قوژبنێك دەکرد بۆ گەیشتن بەم ئامانجەو پڕوپاگەندەی ئەوەیان دەکرد کەکێشەی کورد یەکەم گرفت دەبێت چارەسەری بکەن.

لەو ماوەیەدا هەرجموجوڵێکی نهێنی دژی عەبدولرەحمان عارف کرابا، ئەحمەد حەسەن بکر ئاگاداری دەکردەوە، بۆ نموونە: کاتێك، عارف عەبدولرەزاق ویستی کودەتا بکات، بەعسیەکان بەهەموو توانایەکیانەوە پشگیری عەبدولرەحمانیان کردو نەیانهێشت ئەو پلانە سەربگرێت، عبدالرەزاق پاش گیرانی عەبدولڕەحمان بڕیاری بەردانیدا، کەئەمە نیشانەی لەخۆبردوویی‌و دڵفراوانییەتی.

## تێبینی

*١– هەموو ئەو هەڵوێستو پیلانەی لەسەرەوە بەکورتی باسمکردن لەلایەن دەزگاکانی ئاسایشی دەوڵەتەوە ئاشکراو زانراون، ئەوانیش چ بەتەلەفۆنو چ بەنامە ئاگاداری عەبدولرەزاق نایف، سعدون غیدان، شفیق دراجی، ئیبراهیم داود، عبدالجلیل ئەحمەدیان دەکردەوە، ئەوانیش کەموزۆر ئاگاداری عبدلڕەحمان عارفیان دەکرد کەبارودۆخەکە بەتەواوەتی لەبەرژەوەندی جەنابیاندایەو ئاسایشی گشتی توانیویەتی هەموو جوڵەیەك کۆنترۆڵ بکات. لەشەوی کودەتادا سەعات ١٢ عەبدولجەلیل ئەحمەد چووە لای عەبدولرەحمان عارف لەکۆشکی کۆماریو پێی ڕاگەیاند کەئەمشەو کودەتا دەکرێتو بەڵگەی تەواوم بەدەستە، عەبدولرەحمان عارف گوتی ئێمە تەواو ئامادەین.*

*سەرباریشی، کودەتا ئەنجامدراو سەرکەوتووبوو، هەموو ئەوانەی لەدەورو پشتو دۆستی عبدوڕحمان بوون هەموویان بەشداری کودەتاکەبوون تەنها عبدالجلیل ئەحمەد نەبێ، ئەویش لەبەرئەوەی دەستی هەبوو لەناکۆکیو دووبەرەکی نانەوە لەنێوان باڵی م.س. بارزانیدا لەسێدارەیان نەداو بەریانداو، بیستم کەسەدام ئوتومبێلێکی بەدیاری بۆ ناردبوو.*

*چەند سیاسەتمەدارێکی کوردیش دەوریان لەو کودەتایە هەبوو، چونکە وایاندەزانی لاوازی عبدالرحمان عارفە کەکێشەی کورد چارەسەر نابێو ئەگەر لەدەسەڵات دووربخرێتەوە ئەوا زەمینەی چارەسەر دێتە پێشەوە. هەموو ئەو ئەفسەرانەی ئەو تاوانە گەورەیان کرد عێراقیان بەگورگان سپاردو، بەدەستی خۆیان دەسەڵاتیان تەسلیم بەبەعس کرد، لەدواجاریشدا خۆیان بەدەستی بەعس تیرۆرکرانو تەنها ئیبراهیم داود نەبێت کەسەرلەشکری کۆشکی کۆماری بوو.*

*٢– لە١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ـەوە تاکو ئێستای ساڵی ٢٠٠٠، چوار هەلی گەورە بۆ کورد هاتۆتە پێش بۆ ئەوەی کێشەی کورد بەئاشتی چارەسەر بکرێ، بەڵام بەداخەوە سەرکردایەتی کورد نەیتوانیوە وەك پێویست کەڵك لەو هەلانە وەربگرێت، بەڵکو زۆر جار بەهەڵە مامەڵە لەگەڵ بارودۆخەکە کراوە وەك چۆن لەگەڵ عبدالکریم القاسم کرا. خۆ ئەگەر لەسەردەمی عبدالرحمان عارفدا هەردوو باڵی شۆڕش لەگەڵ حکومەت گفتوگۆیان کردبا، ئەوا بەدەسکەوتی گەورەوە دەگەڕانەوە. بۆ نموونە: کاتێك عبدالرحمان عارف سوپاسالاری عێراق بوو چومە خزمەتی لەماڵەوە، دوو سەعات دووبەدوو گفتوگۆمان لەسەر بارودۆخی عێراق کرد, پێی گوتم: ڕەفیق ئەگەر دەسەڵاتی تەواوم بەسەر عێراق هەبێت، ئەوا دڵنیابە کێشەی کورد*

*بەئاشتی چارەسەردەکەم، چونکە بەشەڕ کۆتایی نایەت، بەڵام ئایا بەڕای تۆ بارزانی واز لەیامەرتیو کلکایەتی بۆ ئێرانو ئیسرائیل دەهێنێت، چەند حەز دەکەم هەردوولا*

*جەلال تاڵەبانیو مەلامستەفا پێکەوە بێن بۆ لام تا کێشەکە چارەسەر بکەین.*

بەگشتی لەناو سەرکردایەتی عبدالرحمان عارف دوو بۆچوون بەرامبەر بەکێشەی هەبوو: ١-عبدالرحمان عارفو بەشێك لەژەنەراڵەکانی سوپا وەکو ئیبراهیم فیصل الانصاری, بۆ بەرژەوەندی گشتی عێراق وایان بەباش دەزانی کە بەهەموو توانایەکەوە پشتگیری لەباڵی م.س. جەماعەتی مام جەلال بکەنو یارمتییان بدەن تا دەسەڵاتیان بەسەر هەموو کوردستاندا بڕوات، چونکە بەبڕوای حکومەت ئەوانە هیچ پەیوەندیەکیان بەدەرەوە نەبوو.

٢- دەسەڵاتی گەورە هی سەرکردە گەورەکانی سوپا بوو کە لەعەبدولرەحمان عارف بەهێزتربوو کەئەمانە پێیان وابوو ئەگەر جەماعەتی مام جەلال دەسەڵات بەسەر کوردستاندا بگرن ئەوا هەڕەشە لەبەرژەوەندیەکانی عەرەب دەکەن، چونکە ئەمان پارتێکی ڕێکخراوو نەتەوەیین. لەلایەکیترەوە بەم شێوەیە بارزانی ئەوەندە لاواز دەبێت کەخۆی دەخاتە ناوباوەشی شاو ئیسرائیل، سەردەستەی ئەم رایە عبدالرزاق نایف بوو. بۆیە ئەم رایە نەیهێشت جەماعەتی مام جەلال بەهێزبن، لەبەرامبەردا جەماعەتی مام جەلال ئاگاداری ئەوەبوون کەگۆڕانگاری لەدەسەڵات بەڕێوەیە، بۆیە پێیان وابوو هەر گۆڕانێك رووبدات، کێشەی کورد چارەسەر دەبێت.

## کودەتای تەمووزی ساڵی ١٩٦٨

لەبەرگی یەکەمدا باسی ئەوەم کرد کەسەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران عبدالرزاق نایف لە٣٠/تەمووز/١٩٦٨ لەدەسەڵات دورخرایەوە، ئەوەبوو بەعسیەکان دەسەڵاتیان گرتەدەست، بەهۆی ئەوەی رابردوویان بەرامبەر بەگەلی عێراقو کورد بەتایبەتی ئەوەندە پیس بوو، لەکاتی گرتنە دەسەڵاتیاندا جەماوەریان ئێکجار کەم لەگەڵ بوو بەتایبەتی کورد کە بەپەنجەی دەست دەژمێردران، بۆ نموونە لەهەموو ڕێکخراوەکەیاندا یەك بەڕێوەبەری ناحیەی کوردیان هەبوو.

بەعسیەکان پێش هاتنیان بۆ سەر دەسەڵات پەیوەندی نهێنیان بەهەردوو باڵی پارتیەوە (بارزانیو م.س.) هەبو، بەڵام باڵی م.س. بەجۆرێك لەگەڵ رژێمی بەعس لەیەکتری نزیکبوونەوە کەهەڵوێستی سیاسییان تا رادەیەکی زۆر وەك یەك بوو. سەرەتا جێی سەرسوڕمان بوو کەبەعسیەکان بەو شێوەیە پشتگیری ئەو جەماعەتەیان دەکردو، بەهەڕەشەیان نەدەزانی بۆ سەر خۆیان. بەڵام هەر زوو دوای ساڵو نیوێك ئەو شهر العسله کۆتایی هاتو گومان کەوتە نێوان هەردوولا.

بەعسیەکان لەکوردستاندا توانییان دەست بخەنە ناو باڵی م.س. بەو نیازەی دووبەرەکیو ئاژاوە بنێنەوە. بۆیە بەئاشکرا پشتگیری تارق ئەحمەد داودیان کرد (لەبەرگی یەکەمدا باسمکردووە). هەرچەندە بەعسیەکان پیلانو نەخشەیان بەهۆی دەسەڵاتە فراوانەکەیانەوە ورد دراێژرابوو، بەڵام بۆیان نەچووەسەرو خراپ بەسەریاندا شکایەوە، ناچاری وای لێکردن کەپاکانە بۆ خۆیان بکەنو بڵێن ئەم کارە ئەفسەرێك پێی هەستاوە ئێمە سزای دەدەین کەوا لەخوارەوە بەکورتی بۆ خوێنەری بەڕێزی رووندەکەمەوە کەهەڵوێستی مام جەلال لەسەرەتادا لەگەڵ بەعسیەکاندا چۆن بوو پاشان چۆن بەپلەی ١٨٠

بایدایەوە بۆ دژایەتیکردنی توندی بەعسیەکان.

لەسەر داوای برای گەورەم مام جەلال هاتمە کەلارو لەماڵی حەمەی مام وەلی کۆبووینەوە، دوای تەواوبوونی کۆبوونەوەکە یەکسەر گەڕامەوە بۆ بەغدا. لەوێ چاوم بەبەشی زۆری سەرکردە بەعسیەکان کەوتو دەقی قسەکانی مام

جەلالم پێ راگەیاندن. پێم گوتن مام جەلال توورە بووە بەجۆرێك رقی هەستابوو وایدەزانی مـن ئـەوەم کـردووە دەیگـوت: ئێستا کەمانگی یەکی ساڵی ١٩٦٩یە، بەزووترین کات چارەسەری ئەو بارووٚدخە نەکەن‌و بەڵێنمان پێنەدەن کەئەوانـەی بـەو ئیشە هەستاون سزایان دەدەن، ئەوا بەناوی م.س. پێیان رابگەیەنە کەپشتیان تێدەکەین‌و بەیەکجاری پەیوەنـدی نێوانمـان دەپچرێت.

دوابەدوای ئـەو ئاگادارکردنـەوەی مـام جـەلال, بەعـسیەکان ناچـاربون هیـچی‌تر دەسـت لـەکاروباری م.س. وەرنـەدەن. بەعسیەکان دوای ئەم رووداوە بۆیان دەرکەوت کەمام جەلال کەسێکی ئاسـایی نیـەو نـاتوانن فێڵـی لێبکـەن‌و، لەبەرئـەوەی مەلامستەفا پەیوەندیەکی بەهێزی لەگەڵ ئێران‌و ئیسرائیلدا هەبوو بۆیە نەیاندەتوانی هیچ دانوستانێکی لەگەڵدا بکەن. بۆیە بەناچاری پشتگیری باڵی مەکتەبی سیاسییان دەکرد.

لەناو بەعسیەکاندا بەگشتی دوو بۆچوون هەبوو:

١– ئەوانەی پێیان وابوو یارمەتیدانی باڵی م.س. جەماعەتی مام جەلال خەتەرێکی گەورە دروست دەکات‌و لەبەرژەوەندی بەعسدا نییە، بەڵام بارودۆخەکە وادەخوازێ هـیچ هەڵوێـستێکی دوژمنکارانـەی ئاشـکرایان بەرامبـەر نـەنوێنرێت. رۆژێکیـان بەندە لەگەڵ کادرو دۆستێکی رژێمی بەعس باسی ئەوەم دەکرد کەبۆچی یارمەتی باڵی م.س. نادەن تـاکو شـاخی بـەمۆیان بکەوێتە ژێر دەسەڵاتو بارەگایان لەو ناوچەیەدا هەبێت، یەکسەر قـسەکانمی بـڕی‌و گـوتی: ئەمـە زۆر خەتەرناکـە بـۆ ئێمـە کەبارەگایان بکەوێتە سەرسنوور. سەدام‌و ئەحمەد حەسەن بەکر لەگەڵ ئەم رایەدابوون.

٢– ئەم جەماعەتە پێیان وابوو پێویستە حکومەت بەهەموو توانـــایەك پشـــتگیری باڵـــی م.س. بکات چونکە لەرێگای ئەوانەوە کێشەی کورد چارەسەر دەکرێت، ئەوەش لەو بڕوایەوە کەئەمانـە هـیچ پەیوەنـدییان بـەهێزە دوژمنکارەکـانی دەرەوە نیـەو دەیـانگوت رێککـەوتنمان لەگەڵیانـدا دەبێتـە هـۆی ئـەوەی دوارۆژێکـی دیمـوکراتی‌و سەربەخۆ بۆ هەموو عێراق دابین بکرێ‌و، هەر لەو کاتەشدا دەستی دراوسێکانمان لـەناو خـاکی عێراقـدا دەبـڕین. ئەگەرچـی ژمارەی ئەمانە زۆر نەبوو بەڵام بەعس هەر هەموویانی لەسێدارەداو کەسـیانی نەهێـشت، لەسـەروو هەموویانـەوە عبـدالخالق السامرائی.

لەپێنجی ئازاری مانگی ١٩٧٠ لەماڵی ئێمە لەبەغدا لەسەر داوای بەعس لەگەڵ بـاڵی م.س. کۆبوونەوەیـەکمان ئەنجامـدا، لەدانیشتنەکەدا بەعسیەکان پاکانەیان دەکردو دەیانگوت ئەگەر رێکیش بکەوین ئەوا ئێوە باڵێکن لەکێشەی کورد. لەشەوی ١١/١٠ی هەمان مانگ لەکاتێك (عێراق النور) لەژێر چـاپدا نیـوەی چـاپکرابوو, سـەدام داوای لەئەحمـەد حەسـەن بـەکر کـرد کەدەبێت بەخۆت ئاگاداری وەزیـری رۆشـنبیری بکـەیت بۆ ئـەوەی رۆژنامەکـە دەرنەچـێت، وەزیـریش بەتەلـەفۆن لەگـەڵ مامۆستای بەرێز حلمی عەلی شەریف گفتوگۆ دەکاو پێـی رادەگەیـەنێ کەفـەرمانی راگرتنـی رۆژنامەکـە لەدەسـەڵاتی ئـەودا نییە.

### دەسکەوتەکانی ساڵی ١٩٦٦:

١– زانکۆی سلێمانی کرایەوە.

٢– پارێزگای دهۆك راگەیەنرا.

٣– ئیدارەی دهۆك‌و سلێمانی‌و هەولێر تەسلیم بەکورد کرا.

٤– بڕیاردرا کەجەژنی نەورۆز وەك بۆنەیەکی رەسمی کوردی دانی پێدابنرێ.

٥- ئێزگەی کوردی لەبەغدا لەنیو سەعاتەوە کرا بەبەردەوامی.

٦- دوو قوتابخانە بۆ دەرچوانی شەشەمی ئامادەیی‌و سێی ناوەندی کرایەوە، ژمارەیەك لەوانەی کەسەر بەباڵی مەکتەبی سیاسی بوون وەرگیران.

٧- عیراق النور کەزمانحاڵی باڵی مەکتەبی سیاسی بوو دەرچوو.

٨- گۆڤاری بەیان لەبەغدا دەرکرا.

٩- هەفتانە عێراقی هاوکاری‌و روناکی‌و رزگاری سلێمانی دەرچوو.

**تێبینی**

*لەگەڵ ساڵح مەهدی عەمماشدا چووینە خزمەت سەرکۆمار ئەحمەد حەسەن بەکر پێم گوت: کەچومەوە ماڵەوە بینیم لەبەردەرگای ماڵمان دوو تەنەکە دانراوە پڕ کراوە لەخۆڵەمێش، ئاگری لێ بەرزدەبێتەوە, رووم لەدایکم کرد گوتم ئەوە چییە؟ گوتی ئەوە ئاگری نەورۆزە. گوتم ئێمە ماڵە سیخوڕمان پێدەڵێن ئاگری نەورۆزی چی! گوتی کوڕم ئێمە هەرچی بین کوردین. صالح عەمماش گوتی جەنابی سەرۆك بڕیار بدەن لەسەر ئەوەی کەنەورۆز جەژنێکی کوردییە، ئەمەش بەدەستپێشخەری جەنابتان دادەنرێت. سەرۆك گوتی: لەگەڵ شەفیق دەراجی لەسەر شێوەکەی رێکبکەون منیش ئیمزای دەکەم. بەدوورودرێژی ئاگاداری مامۆستای بەرێز ئیبراهیم ئەحمەدم کردەوە، پێم راگەیاند کەسەعات ١٠یان بۆ داناوی بۆ ئەوەی چاوت بەشەفیق دەراجی بکەوێت تا بەیاننامەکە دەربکەین لەسەر ئەوەی کەنەورۆز جەژنی کوردانە، چونکە ئەحمەد حەسەن بەکر رەزامەندی فەرمووە.*

**روونکردنەوەیەك لەسەر چەند هەڵوێستێکی باڵی م.س. لە ٦٦ەوە تاکو ١٩٧٠/٣/١٠:**

١- دەربارەی یارمەتی‌و کۆمەککردنی هاوڵاتیان: لەیەکەم رۆژی پەیوەندییان بەحکومەتی عەبدولرەحمان‌و رژێمی بەعسەوە لەهەموو عێراق بەگشتی‌و بەتایبەت لەکوردستان بەهەموو توانایەکیانەوە پشتگیری هاوڵاتیانیان دەکردو دەیانپاراستن. لەهەر شوێنێك مافی کورد پێشێل کرابێت یەکسەر ئەندامانی م.س. دەگەیشتنە سەر رووداوەکەو چارەسەریان دەکرد, بەتایبەتی لەکەرکوك. هەر کاتێك کێشە لەنێوان کوردو عەرەبی بەعسی رویدابا یەکسەر خودی کاك عەلی عەسکەری گەیشتۆتە جێی رووداوەکەو تاوانباری سزاداوە. زۆر جار رووداوەکە بەجۆرێك پەرەی سەندووە لەکۆشکی کۆماری قسەی لەسەر کراوە. بۆ نموونە لەکەرکوك ئەفسەرێك بەبێ ئیزنی موختاری گەڕەك دەچێتە سەر ماڵێك لەگەڕەکی تەپەی مەلاعەبدوڵلا, ئازارو ئەشکەنجەی خاوەن ماڵو هاوسەرەکەی دەدا، کاك عەلی عەسکەری لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەك دەچێتە سەر ماڵی ئەفسەرەکە لەرێگای وێستگەی شەمەندەفەرو تۆڵەی ماڵە کوردەکەی لێدەکاتەوە. هەروەوها لەشاری سلێمانی چەند جارێك ئەوانەی سیخوڕی دەزگاکانی ئاسایشی گشتی بوون، ئازاری خەڵکیان دابوو بۆیە خەڵکەکە هاواریان بۆ لای خودی مام جەلال بردبوو، ئەویش بەهێزێك پێشمەرگەوە چووبووە سەر رووداوەکەو گەورەترین سزای تاوانبارانی دابوو، پێی راگەیەندبوون کەرێگە نادەیەن بەهیچ شێوەیەك مافی کورد پێشێل بکرێت.

کاك محمدی حاجی تاهیر لێپرسراوی سلێمانی ئاگاداری مام دەکات کەتاوانبار محەمەد حاجی ئیبراهیم چەرمەگا بەهۆی دەزگاکانی ئاسایش‌و سوپاوە بۆتە خاوەن دەسەڵاتێکی گەورەو ئازاری خەڵك‌و هاوڵاتیان دەداو بەشێوەیەکی ئاشکرا سەرانە لەبەشی زۆری بازرگانەکان وەردەگرێت. مام جەلال یەکسەر لەگەڵ هێزی پێشمەرگە دەچێتە سەر ن ووسینگەکەی‌و

کەلوپەلەکانی تێکوپێك دەشکێنیّو فڕێیان دەداتە سەرشەقامو لەبەرچاوی خەڵك دەیشکێنن، بەڵام ئێستا ئەگەر بچێتە قەڵاچوالانو هاوار بۆ مامە بەریت رەنگە نەتوانێت بەهاوارتەوە بێت چونکە ئێستا سەرۆکی هەرێمە.

٢- لەبارەی پەیوەندیەکانی رژێمی بەعسو باڵی م.س. ئاشکرایە کەحکومەتی عبدولرەحمانو رژێمی بەعسی لەیەکەم رۆژەوە کۆمەكو پشتگیری باڵی مەکتەبی سیاسیان کرد بۆ ئەوەی لەرێگای پێشمەرگەکانیانەوە بەتەواوی دەست بەسەر کوردستاندا بگرن، ئەم خاڵە رۆژانە بنەماڵەو ئەوانەی سەر بەخۆیانە باسی دەکەنو دەڵێن جەماعەتی جەلال تاڵەبانی لەگەڵ سوپای رژێم هێرشی هێناوەتە سەر هێزی پێشمەرگە لەساڵی ١٩٦٦. لەدانیشتنم لەگەڵ برایانی بەڕێز د.عەبدوللا ئاگرینو د. رۆژ نوری شاوەیس گفتم پێدان کە لەکتێبی دووەمدا باسی ئەو شتە بکەم، بەڵام وا لەبەرگی سێیەمدا باسی دەکەم.

قەستەم بەخوا، ئەمەی دەربارەی رووداوەکان دەیڵێم هەمووی راستە، هەر لەکۆبوونەوە نهێنییەکەی مەلامستەفا لەگەڵ نوێنەری حکومەتی عەبدولسەلام عارف (کاك -ك)و پاش هاتنی مەلامستەفا بۆ حەوزی دوکانو کۆبوونەوەکەی لەگەڵ پارێزگاری ئەوسای سلێمانی حاجی عەبدولرەزاقو هەتا رۆژی ١٩٧٠/٣/١٠، هەموو ئەم رووداوانە دەخەمە بەرچاوی سیاسەتمەدارو رۆشنبیران تا بەبێ شێواندنو دەستێوەردان ئاگاداری چۆنیەتی رووداوو گۆڕانکارییەکانی ئەو مێژووەمان بن.

پێشتر بەتێروتەسەلی ئاماژەم بۆ کۆنگرەی قەڵادزێ کردبوو کە لەمانگی تەمووزی ١٩٦٤دا بەسترا، ئێستاش بەنیازم ئەو رووداوانە بنووسم کە لەساڵی ١٩٦٦ەوە هەتا مەلامستەفاو م.س. دەکەم بەتایبەتی لەماوەی نێوان ١٩٦٤-١٩٦٦.

دوای کۆنگرەی قەڵادزێ بەفەرمانی مەلامستەفا ئەندامانی م.س. هەڵبژێردران، بەڵام نەیانتوانی جێگای باڵی م.س. بگرنەوە، ئەمانە لەژێر دەسەڵاتی تەواوی بنەماڵەدا بوونو کەسیان بۆی نەبوو رووبەڕوو بەمەلامستەفا یان مەسعود یان ئیدریس بڵێ پشتی چاوت برۆیە. گرتن، بەردان، کوشتن، دزی، داگیرکردنی سەروەتو سامان، ژن هێنان، تەڵاقدان، گەورەکردنو دەوڵەمەندکردن، بێ دەسەڵاتکردنو هەژارکردن، هەر هەمووی تەنهاوتەنها بەدەست بنەماڵەبوو. هەموو کاربەدەستانیش بەفەرمانی بنەماڵە دانرابوون وەکو: عەبدولوەهاب ئەتروشیو عەلی شەعبانو حەسۆ میرخان کەناوبانگی تاوانیان بەهەموو کوردستاندا بڵاوبۆوە، دانیشتوانی حەوزی دوکانو قەڵادزێو رانیەو تەوێڵەو بیارەو هەموو ناوچەکانیتر هاوارو ناڵەیان بوو بەدەستیانەوەو شەوو رۆژ لەخواو پێغەمبەرو شێخو مەشایخان دەپاڕانەوە کە لەدەستیان رزگاریان بێت.

بنەماڵە جیاوازیەکی ئاشکرای دەکرد لەنێوان سۆرانو بادیناندا، هەرچەندە جامانە سوورەکان جلوبەرگی پێشمەرگەیان لەبەرکردبوو بەڵام دەسەڵات هی بنەماڵەبو. بۆ نموونە ساڵی ١٩٦٥ لەسەردانێکی مەلامستەفا بۆ ناوچەی پێنجوێنو کۆبوونەوەی لەگەڵ ئێرانیەکاندا, لەگوندی ساواجی بەئاشکرا ٦٠٠ برنەوی دارشوشەی ژمارە ١٧ی وەرگرت، بەڵام هەر هەمووی لەحاجی ئۆمەران بەسەر ئەو بادینیانەی لەگەڵیدابوون دابەشکرد.

مەلامستەفا ئەوەندە لەخۆی بایی ببوو پشتی لەسەرۆك هۆزەکان کردبوو، پێی وابوو هەرچی هێزی پێشمەرگەیە پەیوەندی بەوانەوە دەکات بەتایبەتی دوای رووداوی ماوەت. هەر لەوماوەیەدا پەیوەندی دەرەوەیان بەهێزکرد، بەتایبەتی لەگەڵ ئێرانو ئیسرائیلدا. هەرچەندە هەوڵیاندەدا ئەو پەیوەندییانە بشارنەوە بەڵام هەر ئاشکرابوو، هەموو ئەوانە وایکردبوو جەماوەر لێیان بێزار بێت. بەڵام هەتا مامو حلمی نەهاتنە بەغداو لەگەڵ حکومەت کۆبوونەوەیان نەکردو رێکنەکەوتن

بنەماڵە نەیاندەزانی جەماوەر چەند لێیان بێزارە. دوای ئەوە بۆیان دەرکەوت کەباڵی م.س. خاوەنی رێکخستنێکی پتەوو هێزی پێشمەرگەیان زۆرەو پێشمەرگە بەپەرۆشەوە پەیوندییان پێوە دەکات.

کاتێك مامو حلمی دوای کۆبوونەوەکانیان کەوتنە جێبەجێکردنی نەخشەکانیان, لەماوەیەکی کەمدا دەسەڵاتیان بەسەر چەند بارەگایەکی پارتیدا گرت، زۆر ناوچەیان لەپارتی پاك کردەوە کەیەکەم ناوچە گەرمیان بوو، ئەو بەتالیۆنەبوو کەئەز ماوەیەك سەرپەرشتیم کردبوو. حکومەتی عەبدولرەحمان عارفو هەموو دەزگاکانی, گرنگی زۆریان بەو روداوانە داو لایان سەیربوو کەچۆن جەماوەرو هێزی پێشمەرگە لەهەموو لایەك لێیان هاتونەتە دەست، بۆیە داوای لەهەموو قائد فرقەکان کرد کەیارمەتی باڵی م.س. بدەن، تا وای لێهات پشتگیریو یارمەتیەکان بەئاشکرا ئەنجامدەدرا. ئەوە بەردەوام بوو تا هاتنی رژێمی بەعسیش لەساڵی ١٩٦٨، لەدەرەوە وا باس لەکورد دەکرا کەدوو هێز هەیە یەکەمیان باڵی م.س. جەماعەتی جەلال تاڵەبانییە کەبەشی زۆری رووناکبیرو مامۆستاو نیشتمانپەروەریان لەگەڵدایەو حکومەتی مەرکەزی پشتگیریان دەکات، دووەم جەماعەت بارزانییەکان بوون کەئێران بەئاشکرا پشتگیری دەکردنو یارمەتی دەدانو پەیوەندییان لەگەڵ ئیسرائیلدا هەبوو. کتێبی (الموساد في العراق ودول الجوار، ص٢١٧) باس لەخودی مەلامستەفا دەکاو دەڵێ: (وربما يرجع السبب الى طبيعة البارزاني نفسه، فقد كان شعبه غير متجانس، ويتكون من قبائل تحارب أحداها الأخرى. ان البارزاني هو أبرز زعماء شعبه، لكنه لم ينجح في توحيده لذا بقي زعيما لقبيلة ليس الا)، لەلاپەڕە ٢٠١یشدا هاتووە (البارزاني يزور أسرائيل سراً في منتصف نيسان ١٩٦٨)و لەلاپەڕە ٢٠٢دا دەڵێ (فقد اكد كرون وليكوب لرئيس الموساد أنه ورغم المساعدات المقدمة للبارزاني لا أحد يتوقع أن تؤدى عن فائدة ما).

هەرچەندە پەیوەندی نێوان بارزانیو ئیسرائیل تادەهات بەهێزتر دەبوو، بەتایبەت دوای چوونی بۆ ئیسرائیلو زیادبوونی یارمەتی بۆی، بەڵام لەناوەوە رۆژ بەرۆژ لاوازتر دەبوو چونکە باڵی م.س.لەناوەوە وردەوردە بەهێز دەبوو تا وای لێهات زۆربەی شارەکان کەوتنە ژێر کۆنترۆڵیانەوە، بوونە خاوەنی ٧٠٠٠ پێشمەرگەو ٨٠٠٠ میلیشیاو بەجۆرێك بەهێزبوون کەرژێمی بەعس چاوەڕێی نەدەکرد. بۆیە رژێم هەوڵیدەدا بیانهێنێتە ژێر کۆنترۆڵی خۆی.

پێشتر باسی ئەوەم کرد کەرژێم لەرێگای تاریق ئەحمەد داود, هەوڵیاندا ئەو پلانە جێبەجێ بکەن بەڵام سەرکەوتوو نەبوو. بۆیە سەدام حسەینو ئەحمەد حەسەن بەکر رقو قینیان لەباڵی م.س. هەڵگرتو، توانای خۆیان بۆ لەناوبردنی لەشەوی ١١/١٠ مانگی ئازاری ساڵی ١٩٧٠ بەگەڕ خست. هەرچەندە لەناو حزبی بەعسدا بەشێکی زۆری سەرکردایەتییان ئەمەیان پێ باش نەبوو، بەڵام دوا قسە لای سەدامو ئەحمەد حەسەن بەکر بوو.

## پەیوەندییەکانم لەگەڵ ئەندامانی مەکتەبی سیاسی

یەکەم پەیوندیم لەگەڵ باڵی م.س. لەو کاتەوە دەستی پێکرد کەبەڕێزان مام جەلالو حلمی عەلی شەریف هاتن بۆ بەغدا بۆ گفتوگۆ لەگەڵ حکومەت. پێشتر باسی ئەوەم کرد کەئەو کاتەی لەشاخی بەمۆ بووین کاك حیلمی هەڵوێستی لەبەرامبەرمدا سیاسی بوو، بەڵام لەکوردەواریدا میوان خۆشەویستە بەتایبەتی کەدوو کەسایەتی نەتەوەکەمان بن.

ئەو کاتەی تەسلیم بەحکومەت بومەوە، خزمو دۆست و هاوسێکانم هاتوچۆیان نەکردمو رێزیان نەدەگرتم، پێم گەیشتبۆوە کەدەڵێن رەفیق بۆتە سیخوڕی رژێم, لەکاتێکدا دەزگاکانی ئاسایشو سوپا رایان لەسەر من یەکجار خراپ بوو، گومانیان هەبوو لەمنو پێیان وابوو بەفەرمانی بارزانی هاتووم بۆ تیرۆرکردنی کاربەدەستانی رژێم. دوای هاتنی عەبدولرەحمان عارف بارودۆخی من بەرەو باشی چوو لەهەموو رووێکەوەو بووم بەکاسبی ماڵی خۆم، باری ئابوریم زۆر

بەرەو باشی دەچوو، لای خەڵك روونو ئاشكرا بو كەمن خراپەی كەسم ناویٚو نامەویٚ كەس بـەگرت بـدەمو ئـەو نهێنیانـەی كەدەیانزانم، بۆ رژێم نایاندركێنم. ویژدانم ئاسودەبوو بۆیە هیچ گرنگیم بەپروپاگندەی خەڵك نەدەدا.

سەرەتا مەترسییەكی زۆر گەورەمان هەبوو لـەهاتنی مـام جـەلالو كـاك حیلمـی چـونكە دەترسـام بـبن بـەپیاوی رژێـمو رووبەرووی بارزانی بوەستن وەك چەند سەرۆك هۆزێك. گلەییم لەعەلی پورزام دەكردو پێم دەگوت ئەو كێشەیە چییە تووشی منت كردووە؟ لەوەڵامدا دەیگوت ئێوە خراپ لەكێشەكە گەیشتوونو بەخۆڕایی خۆتان خراپ مەكەن, چاوەڕێی ئاخرەكـەی بكەن. لەرۆژی سێهەمدا نوێنەرانی باڵی م.س. لەگەڵ نوێنـەرانی سـەرۆك عەبـدولرەحمان عارفـدا كۆبوونـەوەو دەسـتیانكرد بەگفتوگۆ.

پـاش ئـەم كۆبوونەوانـەی مـام جـەلالو كـاك حلمـی لەگـەڵ حكومـەت، بەغـدایان بەجێهێـشتو گـوم بـوون. كاتێـك كەتەشـریفیان لـەپڕا پەیـدابوونو هاتنـە نوسـینگەكەم لەبەغـدا، لەگـەڵ جـەنابی بـرای گـەورەم مامۆسـتا عەبـدولڕەحمان زەبیحیو چەند پێشمەرگەیەكدا بوون، بەڵام ئەمجارەیان بەئاشكرا. لەنزیكەوە لەهەڵوێستی برایانی م.س. گەیشتبووم بۆیـە یەكسەر چوومە بەردەمیان راوەستاوم گوتم: مـن لـەپێناو رزگـاركردنی كوردسـتان خـۆم بـەخت دەكـەم، بـاوەڕی تـەواوم بەئێوەی ئازیزو بەڕێز هێنا. لێرەدا هەرچی هەمە لەخزمەت ئێوەدایە, نوسینگەو تەلەفۆنو ئۆتۆمبێلو سـەروەتو سـامانم, هەروەها چیم پیٚ دەسپێرن بۆتان جێبەجیٚ دەكەم.

لەكاتی رێككەوتنی نێوان باڵی م.س.و حكومەتی عبدولرەحمان عارفدا, بەرێز ئیبراهیم

ئەحمەد لەسەر بڕیاری م.س. لەتاران نیشتەجیٚ بوو. دوای ئەم رێككەوتنە جەنابیان گەڕانەوە بەغدا. لەو كاتـەدا گەیـشتمە خزمەتیانو بەخێرهاتنم كردن. دوای ١٠ رۆژ پێیان راگەیاندم كەجـەنابیان لەماڵـەوە چـاوەڕێم دەكـا، كەگەیـشتمە خزمـەتی فەرمووی برادەران بەگشتی باسی چالاكیو هەڵسوڕاویت دەكەن، لەیەكەم رۆژەوە كەگەیشتومەتە بەغدا باسی دڵسۆزی تـۆ دەبیستم. بۆیە كۆمەڵێك پرسیارم هەیە دەبێت وەڵامم بدەیتـەوە، كێـشەكانت چـییە؟ سـەروەتو سـامانت چـییەو مانگانـە چەند بەشت دەكات؟ پەیوەندیت چۆنە لەگەڵ حكومەتو كامیان دیاری وەردەگریٚ؟

بەراستگۆیی وەڵامی هەموو پرسیارەكانم دایەوە. گوتی لەم سەعاتەوە یەكسەر پەیوەندیت بەخۆمەوە دەبێتو بەبیٚ من یـەك هـەنگاو نانێیـت، رۆژانـە لەماڵـەوە بم یـان لـەبارەگا دێیتـە لام، لەئێـستاوە پەیوەنـدیت لەگـەڵ كاربەدەسـتانی مـیری بەتایبـەتی (...) بـەهێز دەكـەی، لەدیاریـەكی ٢٥٠ فلـسی تـا ٢٥٠ دینـاری بـۆت هەیـەو بـا كەسـیش پێـی نـەزانێت، چـیت خەرجكرد وەرە یەكسەر بۆت سەرف دەكەمەوە، تكام وایە هیچم لیٚ مەشارەوە، لەئەمڕۆوە تۆ مانگانە سـی دینـارت هەیـە, لەم سەعاتەوە بۆ هەر دەعوەتێك بچم تۆ لەگەڵمدا دێیتو وەكو ئێمە رەفتار دەكەی, هەروەها هەوڵدەدەین هەر گیراوێكمان هەبێت لای رژێم لەرێگای تۆوە بەری بدەین، بۆ ئەوەی خەڵكی وەكو ئێمە دڵسۆزی تۆ بۆ كورد بزانن.

بەهۆی ئەوەی گوێرایەڵی تەواوی ئیبراهیم ئەحمەدم دەكرد لەلایەن مەكتەبی سیاسییەوە

رێزی زۆرم لێدەگیراو وردە وردە لەناو رژێمیش بووم بەسەنتەرێكی گـرنگ، لەلایـەن خـودی عارفـەوە كۆبوونـەوەی زۆرم كردو گفتوگۆی زۆرمان كرد، لێپرسراوەكانی تریشم بەدیاری دەمچەور كرد، دایكم زۆر گلەیی لێدەكردم چونكە زۆربەی شـتە بەنرخەكانم كرد بەدیاری لەوانە پێنج فەرشی ئێرانـی كەنرخـەكانیان لـەنێوان ٩٠–١٦٠ دینـار دەبـوو. وای لێهـاتبوو سـەدام گوتبووی زۆربەی ئەو ماڵانەی چوومەتە لایان دیاری رەفیق پشدەری لێبووە. من دەمزانی كەدەسەڵاتدارانی بـەعس بـەپارە هەموو شتێك دەبەخشنو زانیاری زۆر گەورە ئاشكرا دەكەن، بۆیە نامەم بـۆ مەسـعود بـارزانی نـاردو داوام لێكـرد یـەك دوو ملیۆن دینارم بۆ بنێرێت تا زانیارییان بۆ بنێرم، بەڵام ئەو هیچ وەڵامی نەبوو.

بەرادەیەك لەگەڵ سەرکۆمارو کاربەدەستە گەورەکانی رژێم تێکەڵببوم لێم کەوتبوونە گومان، رۆژێکیان عەبدولخالق سامەرائی گوتبوی ئێوە چۆن بروا بەرەفیق پشدەری دەکەن، ئەو کابرایە موخاباراتە. زۆر جار کە لەگەڵ برایم ئەحمەد دەچووەمە لای وەزیرێك من دوای برایم ئەحمەد دەهاتمە دەرەوە، کەلێیان دەپرسیم بۆ دواکەوتی راستیەکەم پێ دەگوتن. شەوێکیان سەعات دوانزە جەنابی رەجەب عەبدولمەجید (جێگری سەرۆك وەزیران‌و زەیری ناوخۆ) ئاگاداریکردم کەبەیانی دەچینە باکوری عێراق، سەعات یەکی شەو چومە خزمەت مام جەلال خەوتبوو، پرسم پێکرد بۆ ئەم سەردانە، تا رازی نەبوو نەچووم لەگەڵیدا.

## روداوەکانی دوای بەیاننامەی ئاداری ١٩٧٠ (بەبڕیاری مام پەیوەندیم بەبارزانیەوە کرد)

لەدوای بەیانی ئاداری ١٩٧٠, بارودۆخی وڵات گۆڕانی گەورەی بەسەردا هات. بارزانی بوو بەدۆستی نزیکی بەعس‌و هەموو هێزو توانای لەخزمەتی بەعسدابوو، بەعسیەکان دەیانگوت بارزانی هی ئێمەیە. ئەمە وایکرد مەکتەبی سیاسی بچن لەگەڵ بارزانی دابنیشن‌و بۆ بەرژەوەندی گەلەکەمان رێك بکەون، منیش چاوەڕوانی ئەوەم دەکرد وەکو ئەندامەکانیان هاتوچۆی بارزانی بکەم و بەغدا بەجێ بهێڵم‌و بەرەو کوردستان بگەڕێمەوە.

کاتێك برادەرانی م.س. هاتنە لام پێیان راگەیاندم کە لەگەڵ مەلامستەفا باسی تۆمان کردووەو گوتومانە پەیوەندیەکی پتەوی لەگەڵ لێپرسراوانی حکومەتدا هەیە، بارزانی ئەمەی زۆر پێخۆش بووەو حەزی کردوەو بچیتە خزمەتتی، مەلامستەفا پێی گوتبوون: پێم باشە رەفیق لەبەغدا بمێنێتەوەو پەیوەندی هەر بەئیبراهیم ئەحمەدەوە هەبێت. ئیبراهیم ئەحمەد کەهاتە لام پێی گوتم: رەفیق من بەرژەوەندی تۆم دەوێت، مانەوەی تۆ لەهەموو روێکەوە سوودبەخش دەبێت، لەدوارۆژدا خەلك دەستت بۆ درێژ دەکاو دەڵێن: ئەمەیە رفیق پشدەرییە، بۆیە بیری لێ مەکەوەو بەقسەم بکە. گوتم مامۆستا ئەگەر بەگەورەیی خۆت لێم قبوڵ بکەی بەهیچ جۆرێك من رازی نیم لەفەرمایشتەکانت دەربچم، بەڵام مانەوەم لای حکومەت جێی گومانەو خەڵکیش تانەوتەشەرم لێدەدەن، جگەلەوە ماڵەوەمان بەتایبەت دایکم‌و کەماڵی برام رازی نین لێرەبم، بۆیە تکا دەکەم یارمەتیم بدەیت بگەڕێمەوە بۆ کوردستان. گوتی: گومانت نەبێت کەتەنها بەرژەوەندی تۆم مەبەستە، راستە ئەم رێگایە زۆر سەختە بەڵام لەو ماوەیەدا شارەزایی باشمان لەتۆوە پەیداکرد، بۆیە دڵنیام سەرکەوتوو دەبیت، ئەم کارە بۆ خۆت‌و خانەوادەکەت‌و دواجار گەلەکەت سودێکی گەورەی هەیە. لەئەمڕۆوە پەیوەندیت پتەوتر بکە لەگەڵ حکومەت‌و، دڵنیابە لەخۆم زیاتر کەسی‌تر بەم کارە نازنێت, لەنێوان حۆشماندا جفرەیەك دادەنێم کەتەنها خۆم‌و خۆت تێی بگەین.

ئەم قسانەی مامۆستا وایکرد قەناعەت بێنم. بۆ ئەم مەبەستە نەخشەیەکی تازەم داڕشت. سەرەتا لەهەموو ئەو کەسانە دوورکەوتمەوە کە لەناو حکومەتدا دەسەڵاتداربوون‌و سەر بەمەکتەبی سیاسی یان بارزانی بوون‌و هەموو پەیوەندیەکم لەگەڵ شۆڕشدا پچڕی، ئەمە وایکرد حکومەت گومانی لێم کەم بێتەوە، بەڵام کوردو نیشتمانپەروەرەکان لێم کەوتنە گومان‌و، لەناو خۆیان دەیانگوت رەفیق سیخوڕی رژێم‌و پیاوی میریە، منیش لەبەرخۆمەوە دەمگوت گرنگ ئەوەیە من خزمەتی شۆڕش دەکەم، چش لەوەی خەڵکی نەزان دەیڵێ، ئێستا سوپاسی خوا دەکەم کەتوانیم لەو رێیانەوە خزمەتی گەورەی گەلەکەم بکەم.

دایکم‌و کەماڵی برام سەرەتا زۆر گلەییان لێدەکردم دەیانگوت بۆ لەگەڵ جەماعەت نەچوویتەوە کوردستان. هاتوچۆی بەردەوامی نوێنەرانی سەرکردایەتی شۆڕش بۆ ماڵەوەمان لەبەغدا تێی گەیاندن کەرەفیق لەپێناوی کوردو کوردستان ماوەتەوە.

پاش یەکگرتنەوەی باڵی م.س.و بارزانی، زۆر لەسیاسەتمەدارو روناکبیرانی کورد بەدەسکەوتێکی گەورەیان دادەنا، هەموو کوردەکانی دەرەوەو ناوەوە پێیان وابوو کەبارزانی دەسەڵاتی شیاو بەبرادەرانی مەکتەبی سیاسی دەبەخشێت، بەڵام بەپێچەوانەوە بارزانی بەپێی عەقڵە عەشایرەکەی خۆی هەموویانی خستە ژێر چاودێری پاراستنەوە، کەئەمە بۆ بەعسیەکان جێگای دڵخۆشی بوو. ئەمە گەلی کوردی لەتواناو لێهاتوویی خەڵکانێکی وەکو مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد، عەلی عەسکەری، نوری شاوەیس، نوری ئەحمەد تەها، جەلال تاڵەبانیو عومەر مستەفا (عومەر دەبابە) بێبەشکردو ئیتر بەعسییەکان لەخۆشییان خەریکبوو شاگەشکە دەبوون.

## دیدار لەگەڵ مام جەلالدا

مام جەلال داوای لێکردم کەپەیوەندی بەمەلامستەفاوە بکەم، بۆ ئەوەی ڕێگاچارەیەك بدۆزینەوە, پێی گوتم بەباشی دەزانم لەڕێگای خۆتەوە یەکسەر پەیوەندی بەخودی مەلامستەفاوە بکەی لەپێناو پاراستنی بەرژەوەندی وڵاتەکەمان، چونکە تۆ لای بارزانی ناسراویتو دۆستو دوژمن گومانی نیە لەدڵسۆزی تۆ بۆ ئەم گەلە، ئەم جارە ئەمریکا نیازی وایە بارزانی بکەن بەحکومەت. ئەوجا من بەتەنیا بیرم لێکردەوە، زۆر شتم لا ئاشکرابوو لەوانە، من پەیوەندیم بەمامۆستا ئیبراهیم ئەحمەدەوەبوو بەدڵنیاییشەوە بارزانی گومانی لەمن هەیەو حەزی بەو پەیوەندییە نییە ئینجا هۆی قسەکەی برای بەڕێز مام جەلالم لێکدایەوە کەگوتی: بارزانی بڕوای بەجەلال تاڵەبانیو جەماعەتەکەی نییە. بۆیە لەدڵی خۆمدا دەمگوت ئایا دەبێت بارزانی بڕوا بەوە بێنێ کەمن پەیوەندیم بەشۆڕشەوە بووە؟ پێشتر باسی ئەوەم کردووە کە لە ١٩٦٦ەوە هەتا ١٩٧٣ پەیوەندیم بەبارزانییەوە لەڕێگەی مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەدەوەبوو، هەروەها کەس بەم پەیوەندییەی نەزانیوە.

بەرەبەیانێك سەردانی کاك عەبدولوەهاب ئەتروشیم کرد لەهۆتێل مارتینز لەبەیروت ئامادەییم نیشاندا کەپەیوەندی بەشۆڕشەوە دەکەم، بەڵام هەر دوودڵ بووم. کاك عەبدولوەهاب خۆشحاڵی دەربڕیو گوتی بارزانی ئاگادار دەکەمەوە. کەگەڕامەوە بەغدا خاتوو زەکیە ئیسماعیل هاتە لام[8]، پێمگوت ئامادەم گیانی خۆم لەپێناو رزگارکردنی کوردستان بەسەرکردایەتی بارزانی بەخت بکەم, ئەویش خۆشحاڵی خۆی نیشاندا گوتی ئەمە خزمەتێکی گەورەیە. خاتو زەکیە گوتی: بەیانی دەچم بۆ خزمەت بارزانی، هەندێ پارەت دەدەمێ هێلکەی پێ بکڕە چونکە لەحاجی ئۆمەران هیلکە نیەو لەبەغدا کەمە، ئنجا لەگەڵ نامەکەتدا وەکو دیارییەکی خۆت دەیبەیت، منیش پێی دەگەیەنمو پێی دەڵێم ڕەفیق دەبێت پەیوەندی بەخودی تۆوە بێت، چونکە ڕەفیق لەپاراستن دڵنیا نیە. جگەلەوەی بەگشتی پاراستن لەم جۆرە کارانەدا جێی بڕوا نییە.

### تێبینی

*١–لەجیاتی ناوی خۆم ناوێکی نهێنیم بۆ خۆم دانا بەناوی بەیروت مارتینز، تەنها بەندەو کاك مەسعود ئەوەمان دەزانی, بەڵام سەیر ئەوەبوو داموودەزگا ئەمنییەکانی حکومەت پێیان*

---

[8] خاتوو زەکیە ئیسماعیل: ئافرەتێکی ڕۆشنبیرو سیاسەتمەداری ناسراوە لەعێراقو لەوڵاتە عەربیەکاندا. بەداخەوە دوای هەرەسی شۆڕشی کورد (١٩٧٥) هەڵوێستی سیاسیی گۆڕاو ڕێگەی خزمەتکردنی رژێمی عێراقی گرتەبەر کە بەزۆری من وای بۆ دەچم ئەمە لەلایەکەوە هۆی کاریگەری حەبیب محەمەد کەریم بووبێت لەسەری کەخستیە سەر ئەم ڕێگەیە یان کاك مەسعود بارزانی ئەم ڕۆڵەی پێ سپاردبێت تا هاوکاری بەعس بکات بۆ راپەڕاندنی کاروباری تایبەتی رۆژانەی خۆی.

*زانیبوو! باشە چۆن؟!*

*٢- من سەرەتا لەرێگەی شەفیقی برامەوە پەیوەندیم بەنووسینگەی بارزانیەوە کرد.*

*٣- لەیەکەم رۆژی پەیوەندیم لەگەڵ بنەماڵەدا مامۆستا ئیبراهیمو عومەر دەبابەو مام جەلالم ئاگادارکرد، هەرچەندە مەسعود بارزانی لەنامەکانیدا پێی دەگوتم کەنابێت مام جەلال ئاگاداری هیچ بێت. برادەرانی م.س. خۆشحاڵ بوون بەوەی کەپەیوەندیم بەبنەماڵەوە هەیە، مام جەلال پێی گوتم: من خۆم ئاگادارم کردی کەرۆژێك زووتر پەیوەندییان پێوە بکەی باشترە.*

لەبەرگی یەکەمدا باسی ئەوەم کردبوو کەسەدام حسێن لەدیدارێکدا (١٩٧٦/٩/١١) رایسپاردم کەمام جەلال تیرۆر بکەم، بەڵام لەبەرئەوەی رازی نەبووم ئەو فەرمانە جێبەجێ بکەم فەرمانی دەستگیرکردنم دراو لە ١٩٧٦/٩/١٤دا بەفرمانی سەدام بەبێ ئەوەی دادگایی بکرێم ماوەی نزیکەی ٢٠ مانگ زیندانیکرام.

## بەندیخانەی سەدام

پاش ئەو بیست مانگە بەبیست ساڵ حوکمدرامو رەوانەی بەندیخانەی ئەبوغرێب کرام، بیست مانگ لەخزمەتی پیاوکوژەکانی سەدام حسەیندابووم. بەڕێوەبەری بەندیخانە ئەفسەرێك بوو بەپلەی عەقید کە لەبەرئەوەی نەببو بەبەعسی بۆ ئەو شوێنە دوورخرابۆوە، بەڵام عەربێکی قەومی بوو. دووجار بۆ لێکۆڵینەوە داوایکردم، جارێکیان پێی گوتم: ئەگەر شتێکت شاردۆتەوە لەنهێنییەکان ئاگادارم بکە، لەپاداشتی ئەوە لەژوورێکی تایبەتی داتدەنێمو لەو خەڵکە خراپە دوورت دەخەمەوە. دوای ئەو، عریف جواد هاتو ئەویش هەمان پرسیارو گفتوگۆی لەگەڵ کردم بەڵام ئەمەیان سەر بەموخابەراتی گشتی بوو. لەوەڵامی هەردووکیاندا گوتم: لەدادگا دانم بەهەموو تاوانەکانمدا نا، داوامکرد دوای ٤٨ سەعات لەسێدارەم بدەن، بەڵام بەفەرمانی سید النائب حوکمەکەم کرا بە ٢٠ ساڵ. ئەوەم گوتو لەدڵی خۆمدا گاڵتەم بەعەقڵیان دەکرد. دوای ئەوە بەڕێوەبەری ئاسایشی بەندیخانە ئێمەی بردە هۆڵی ژمارە ٣ کەهۆڵی تاوانبارەکان بوو، گوتی: لەم هۆڵە ژوورێکتان بۆ چۆڵ دەکەم تا بەتەنیا تێیدا بخەون، با ئەوانیتر لەهۆڵەکەدا بنوون. بەڵام من هۆڵەکەم پێ باشتربوو لەعەزیەتدانی زیندانییەکان. دوای رۆشتنی بەڕێوەبەر ماوەی ١٠ دەقە هەموو زنیدانییەکان هەر سەیریان دەکردین. روومکردە زیندانییەکان گوتم: برایانی کۆمەڵە لەسەر ئێوە زۆریان لێداوم، من رەفیق پشدەریمو ئەوەش شەفیقی برامە. ئینجا برایانی کۆمەڵە بەپیرمانەوە هاتنو بەگەرمی پێشوازییان کردینو خۆشحاڵی خۆیان دەربڕی.

## دیدارو سەردانەکانی ناو زیندان

لەیەکەم رۆژەوە خەڵکێکی زۆر دەهاتنە لامان، بەجۆرێك کەکاتمان نەبوو لەگەڵ کەسوکارمان قسە بکەین ئەوەش لەبەرئەوەی وا بڵاوبۆوە کەئێمە کوژراوین. چونکە ماوەی شەش مانگ بێ هەواڵ بووین.

من لەساڵی ١٩٦٦ـەوە تا ١٩٧٦/٩/١٣ هەر کەسێك هاتبێتە ماڵم بەدەست بەتاڵیو نائومێدی نەمناردۆتەوە. هەر لەو ماوەیەدا زیاتر لە ٢٠-٢٥ کەسم لەسێدارە رزگارکردوە، هەروەها رەنگە ژمارەی ٥٠٠ کەسم بەردابێتو ١٠٠ کەسیشم دەوڵەمەند کردبێ. هەر هەموو ئەوەش بەبێ بەرامبەر. بۆیە لەکاتی لێقەومانمدا ٧٠٪ی ئەو چاکەیە هاتەوە رێگام، خەڵکێکی زۆر لەکاتی سەردانمدا بەدیارییەوە دەهاتن منیش هەموویم بەسەر هاورێ زیندانییەکانمدا بەبێ جیاوازی دابەش دەکرد.

زیندانی ئەبوغرێب یەکێکە لەزیندانە گەورەو ناخۆشەکانی رژێمی بەعسی عێراق، بەجۆرێك کە لەناوەوەیدا چەندین کەسی شۆڕشگێڕو رۆشنبیری تێدایە. وا لەخوارەوە هەندێك لایەنو بەشی ئەو زیندانە باس دەکەم:

١- بەشی گرتووخانە (قسم الموقف): ئەم بەشە بەناو سەر بەبەندیخانەبو بەڵام لەراستیدا سەر بەئەمنو موخابەراتی گشتی بوو. بەڕێوەبەری بەندیخانە لەبەرئەوەی بەعسی نەبوو حەزی بەئەمن نەدەکرد، بەڵام ناچاربوو فەرمانەکانیان جێبەجێ بکات. رۆژانە دووجار سەرژمێر دەکراین، هەفتانە سێ جار بۆ ماوەی دوو سەعات لەبەر گەرمای هاوین یان لەبەر سەرمای زستان رایاندەگرتین، گوایە یەکێك دیار نییە. لەو بەشەدا رۆژنامەی (الثورة)یان بۆ دەخوێندینەوەو باسی هەڵوێستی حزبی بەعسیان بۆ دەکردین. هاتوچۆو سەردان لەو بەشەدا زۆر زەحمەت بوو، زوو زوو بەناوی جموجوڵی سیاسییەوە لەناو هۆڵەکاندا ئاڵوگۆڕیان پێدەکردین کەئەوە بۆ ئێمە زۆر ناخۆش بوو. لەهەمانکاتدا لەو بەشەدا چوار کەسیتری تێدابوو کەزۆر خراپ لەگەڵماندا دەجولانەوە کەبریتی بوون لەمەئموور هادی، عریف جواد، فلاح، عبدالسادە. بەندکراوەکان نزیکەی ١٠٠٠ کەس دەبوون، لەوانە ٦٠٠ کەسیان کوردبوون, لەناو کوردەکانیشدا ٣٠٠ کەسیان لەسەر سیاسەت گیرابوون. هەرچی بەندکراوە عەرەبەکانە تەنها سێ کەسیان رێکوپێك بوون: حەسەن مستەفا، ئەبو زهیر- کەکاتی خۆی ئامر کولیەی عەسکەری بو لەسەر حزبی شیوعی گیرابوو، عەزیز عقیلی[٩]. ئەوەی سێیەمیان کاتی خۆی وەزیری بەرگری بوو، پێشتر بەهۆی عقید عەزیز تۆفیق یەکترمان ناسیبوو. بەجۆرێك لەگەڵ عقیلی تێکەڵ بووینو ببووینە هاوڕێ کاتێك کەئازادکرامو خواحافیزیم لێخواست گریا. کەپێم گوت ئەبو عقیل بۆ دەگری گوتی: لەبەر دوو هۆ دەگریم یەکەمیان لەزینداندا کوردم ناسی، کاتێك ئازایی‌و فیداکاری ملازم جوامێرم بینی خۆم لەبەرچاو کەوت. دووەمیش ئێستا تۆو کاکە شەفیق دەرۆنو بەتەنها جێم دێڵن. گوتم بەڵام ٤٠٠ بەندکراوی عەرەبت لەگەڵدایە. گوتی من گومانم لەهەموویان هەیەو لێیان دەترسم، بەداخەوە لەزینداندا بۆم دەرکەوت کەتەنها کورد دۆستمە. دوای ئەوە وتم کە هاتیە دەرەوەو بویتە سەرکۆمار ئەو قسانەی خۆت لەیاد نەکەی.

## ٢-ماسۆنی‌و بەهائیییەکانی ناو زیندان:

بۆ ماوەی چوار مانگ لەیەك هۆڵدا پێکەوەبووین، ئەمانە لەخەڵکی هەموو ناوچەکانی عێراقیان لەگەڵدابوو بەکوردەوە. ژمارەیان کەم بوو تەنها نزیکەی ٣٠ کەس دەبوون، لەوانە کەسی ناسراو د.عبدالجبار ریزلی برای خوشکە ئاسیا هاوسەری زانای خوالێخۆشبوو تۆفیق وەهبی بەگ, لەگەڵ گۆرانیبێژی کورد عەزیز عەلی. زۆر رێکوپێك بوون لەناو خۆیانو لەگەڵ خەڵکیشدا، هەرچی خراپەیە روویان تێنەدەکردو خۆیان لێ بەدوور دەگرت. بەڵام زەحمەت بوو تێیان بگەی‌و بزانی چ رێکخراوێکیان لەپشتە هەیە، چەند هەوڵمدا نەمتوانی ئەو نهێنییە بزانم. بەڵام ئەوەی بۆم دەرکەوت ئەوەبوو کەئەمانە بۆ کورد پیێ نییە، نە چاك، نە خراپ.

---

[٩] عقیلی کاتێك وەزیری بەرگری بوو دەیگوت پێویستە بۆمبی ئەتۆمی بەکوردستاندا بدرێت. بەڵام دادگای شۆڕشی بەعس فەرمانی لەسێدارەدانیدا، دایکی بەمەبەستی رزگارکردنی پەنای بردەبەر مەلامستەفا، ئەویش نووسراوێك ئاراستەی سەرۆك ئەحمەد حەسەن بەکر دەکات. ئەوەبوو فەرمانی لەسێدارەدانی لادراو بە ٢٠ ساڵ زیندانی حوکمدرا. لەناو زیندانیشدا کوڕێکی مەسیحی بەناوی مەناف کرابوو بەچاودێر لەلایەن بەعسییەکانەوە، لەکۆتاییدا بەعس لەزینداندا دەرمانخواردی کردو کوشتیان.

شتێکی سروشتیيە پیاو لەناو زینداندا کۆمەڵێك خەڵك دەبینێ کەئیدارەی زیندان دژی زیندانیيەکان بەکاریان دێنێ. ئەم جۆرە خەڵکە هەڵوێستو بیروبۆچونیان بەرامبەر بەئێمە زۆر خراپ بوو، وەك: یوسف، صفا، محسنو کازم بەسراوی، کەهەر یەکەیان لەسەر بڕیاری دەزگای موخابەراتی گشتی لەلایەن دادگای شۆڕشەوە بە٢٠ ساڵ زیندانی حکومدرابوون، لەگەڵ ئەوەشدا لەزیندان ئێشوکاریان تەنها سیخوڕیکردن بوو بەسەر کوردەکانەوەو، هەرچی خراپیان لەدەست هاتبا بەرامبەر بەئێمە دریغیان نەدەکرد.

دوای دوو هەفتە لەزیندانی, مامۆستا سدیق ناسراو بەئەبو هۆشیار ماوەی سەعاتێك زیاتر باسی تاوانبار یوسفی بۆ کردم کە بە چ جۆرێك ئازارو ئەشکەنجەی کوردەکان دەدات. لەدڵی خۆمدا گوتم پیاوێکی تێدا نییە تەمبێی بکا، بۆیە بەمامۆستام گوت: تۆ سێ کەسی خۆت لەگەڵ کاك حازم یوسفیو هۆشیاری کوڕتو سدقی ئیمساعیل بەجەنابتەوە چوار کەسن، بۆچی دەستێك لەم کابرا خراپەکارە ناوەشێنن؟ لەوەڵامدا گوتی: ئەمە بەئێمە ناکرێتو، داوای لێکردم کەمن بەو کارە هەڵبستم. ئەوە بوو یەکسەر چوومە بەردەمی یوسفو گوتم: تۆش وەکو ئێمە بەندکراوی، شەرم ناکەی خۆت لەئێمە کردووە بەئاغا؟ گوتی من زۆر ڕێز لەتۆ دەگرمو وەکو مامم تەماشات دەکەم. ئەوجا پێم گوت تۆ بەئاشکرا ئازارو ئەشکەنجەی کوردەکان دەدەی، پاشان بەهەموو هێزو توانای خۆم زللەیەکم لێداو لەناو زیندانییەکان شکاندم، ئەویش لەتاوان هاواری بردەبەر بەڕێوەبەری بەندیخانەو شکاتی لێکردم. بەڵام خۆشبەختانە توانیم خۆم لەسزا ڕزگار بکەم، ئەگەر نا ئەوا شەش مانگ لەژوورێك (محجر) بەتەنها زیندانی دەکرام.

دوای ئەمە یوسف چاوترسێن بوو. لەناو ئەو ٦٠٠ بەندکراوە کوردەدا نیوەیان لەسەر سیاسەت گیرابوونو نیوەیتریشیان بەتاوانیتر. لەناو ئەو زیندانیە کوردانەدا مرۆڤی باشو خراپی تێدابوو، نموونەی ئەو کوردە زیندانیە باشانە کاك حەمە موچوڕکەی پێنجوێنی بوو کە بەباخەوان ناسرابوو، ئەم کابرایە ڕۆشنبیرو نیشتمانپەروەرێکی ناسراوبوو. هەروەها مرۆڤی وای تێدابوو کەئەگەر بتەوێ باسی خراپەکانی بکەی ئەوا بەکتێبێك تەواونابێت. وا لەخوارەوە هەندێك لەو ناوانەو بەرێژەی سەدی رادەی خراپییان دیاری دەکەم:

١- ئەحمەد حاجی پێنجوێنی بەرادەی ١٠٠٪ خراپ بوو.

٢- بلەی رەشید بەحری بەهەمان شێوە.

٣- سیف الله کاکەیی ٨٠٪.

٤- خەلیل جمهوری ٦٠٪.

٥- موحسن یەزیدی ٦٠٪.

٦- حەسەن یەزیدی ٥٠٪.

٧- داود باغستانی کەخراپەی بێسنووربوو، ئەم کابرایە لەناو زیندانیشدا بەپیلانو فەرمانی موخابەرات دەجووڵایەوە کە بەراستی کەسێکی خەتەربوو. دوایی بەفەرمانی موخابەرات لەزیندان ئازادکراو نێردرایە لای بنەماڵەی بارزانی تا ببێتە خزمەتکاری بنەماڵە، ئێستاش بەفەرمانی نێچیرڤان نەبێت ناجووڵێتەوەو بوە بەچڵکاوخۆری ئەوان.

هەروەها ئەحمەد حاجیو بلەی رەشید بەحری هیچیان لەداود باغستانی کەمتر نەبوو. دەربارەی بارودۆخی بەشی گرتووخانە لەزیندانی ئەبوغرێب دەڵێم: ئەم بەشە لەرووی ئیداریەوە سەر بەبەندیخانەی گشتی بوو بەڵام لەراستیدا سەر بەبەڕێوەبەرایەتی ئەمنی گشتیو موخابەراتی گشتی بوو. بەڕێوەبەری زیندان ئەفسەرێکی نەتەوەیی بوو، لەبەرئەوەی نەچووبووە ریزی حزبی بەعسەوە لەپلەکەی خرابوو. بەڵام لەبەرئەوەی خوێڕیو بێ کەسایەتی بوو نەیدەتوانی سەرپێچی

ئـەو فـەرمانو ڕێنماییانـە بکـات کـە لـەدامودەزگاکانی ئەمنــەوە بـۆی دەهـاتو لـەپێناوی پاراسـتنی پۆسـتەکەی وەکـو بەڕێوەبەری

زیندان، سەرلەبەری فەرمانەکانی جێبەجێ دەکردو بەموو لێی لا نەدەدا.

چوار کەس هەبون لەو زیندانەدا گوایە بەپێی فەرمانەکانی دامودەزگا ئەمنیەکان ڕەفتاریان دەکـرد بـەڵام بـەردەوام ئـەو ڕێنماییانەیان دەبەزاندو زۆر بەتوندی مامەڵەیان لەگەڵدا دەکردین.

لەهەمانکاتدا لەناو زیندانیدا کۆمەڵێکی زۆر لەکوردی خۆڕاگرو خـاوەن بیروبـاوەڕ هـەبوون، کەچـەند لەسـەریان بنوسـین کۆتایی نایەت، چونکە ئەمانە نە ملکەچی ئەمنو ئیستخبارات بوون نە هیچ نهێنیەکیان بۆ ڕژێم درکاند. هەروەها لەزیندانـدا کۆمەلاخەڵکێ بێتاوان هەبوون کە لەبەرئەوەی فیشەکێك لەناو باری ئێسترکەیدا دۆزرابووەوە بەپێشمەرگە تاوانبـار کرابـوو، یان لـەکاتی ڕوودانـی هێرشـێکدا بـەبێتاوانی گیرابـوو، ژمارەیـان ٣٠٠ کـەس دەبـوو. ئەمانـە لەسـەر دەسـتی بـرا ڕۆشـنبیرو مامۆستاکان فێری خوێندنو خوێندەواریو گیانی   شۆڕشگێڕی بـوون، بەشـی هـەرە زۆریـان پـاش ئازادبوونیـان لەزینـدان پەیوەنـدییان بەڕێکخراوەکانـەوە کـرد. دەزگاکـانی ئـەمن لەبەندیخانـە سـەریان لـەخۆڕاگری ئـەم بەندکراوانـە سـووڕمابوو. لـەڕێگای سـەردانەوە هـەموو دەنگوباسـێکی دەرەوەمـان پێدەگەیـشتو لـەناو خۆمانـدا یەکـسەر بڵاومـان دەکـردەوە. دۆستایەتیو برایەتیمان زۆر خۆش بوو، بەرادەیەك کەهـەرگیز ئـەوەم بیرناچـێتەوە جارێکیـان لـەمانگی ڕەمـەزان سـەردانی برایەکم کرد کە لەهۆڵێکیتر بوو, من لەبەرئـەوەی بـەڕۆژوبووم زۆر برسـیو تینـوو بـووم، پـێم گـوتن بەسـەری مـام جـەلال سوێندم بدەن تا ڕۆژوەکەم بشکێنم. کاك ئاوات عەبدولغەفور گوتی قەلمان هەیە، کاك عومەری سەید عەلی گـوتی وەرە لای ئێمە نان بخۆ، پاشان کاك عومەر باڵێكو چوار کەوچك برنجی بۆ ناردم تـا دڵنیـام بکـات لـەوەی کەئـەم خواردنـەیان هەیـە، دوایی بۆم دەرکەوت کاك ئاوات لەبری قەل ساواری هەبوو, لای کاك عومەر نانم خوارد.

لەناو ئەو برادەرە خۆشەویستانەدا هەرگیز بەڕێزان مام خدر سێکانیان, کاك مامەند،  مام حەمیـد کـۆییم بـیر ناچـێتەوە کەئەمانە نموونەی هاوڕێی دڵسۆزو خۆڕاگربوون. باوکی کاك مامەند لەسـێدارەدراو دایـكو خوشـکێکی بیـست سـاڵ حـوکمی زیندانیان بەسەردا درا، لەگەڵ ئەوەشدا ئەم پیاوە چۆکی بۆ بەعس دانەداو لەسەر خۆڕاگری خۆی مایەوە.

مام حەمید کۆییش کوڕێکی پیشمەرگەی هەبوو شەهید بوو, کوڕێکی تریشی لەبەنیخانەدا

لـەژێر ئـازارو ئەشـکەنجەدا شـەهید بـوو، ئەمانـە وای لێکردبـوو هەنـدێ جـار لـەڕووی دەروونیـەوە هەڵدەچـوو. لـەناو ئێزیدیەکانیشدا چەندین نموونەی خۆڕاگریم بینی، لەوانە شەش لەبرا ئێزیدیەکان پێیان دەڵێن ئەگەر بێتو دان بەوەدا بنـێن عەرەبنو ئیمزای بکەن ئەوا ئازادتان دەکەین، بەڵام ئامادە نابن ئەم کارە بکەن. کاتێك بەوەم زانی چوومە لایان پـێم گـوتن من نوێنەری مام جەلالو بارزانیم، جەنابی تەحسین بەگی ئێزیدی کەمیری ئێوەیـە جێـی بـاوەڕی منـەو دۆسـتێکی نزیکمـە، بۆیە بەناوی هەرسێکیانەوە داواتان لێدەکەم کەئەو داوایەی بەعسیەکان جێبەجێ بکەن، زۆر لـەم قـسانەم بـۆ کـردن بـەڵام بێکەڵك بوو، گوتیان تۆ جێی باوەڕی ئێمەیو هەموو شتێکت بەقسە دەکەین، بەڵام ئێمە کوردینو ئامادەنین ببین بەعەرەب ئەگـەر هـەموو ژیانیـشمان لەزینداندا بەسـەربەرین. سـاڵی ١٩٨١ لەلەنـدەن ئەمـەم بـۆ جـەنابی تەحـسەین بـەگی ئێزیـدی گێڕایەوە. بەداخەوە ئێستا تەنها ناوی سێ کەسیانم بیرماوە: شێخ عەتا، مشکۆ، ئەبو کادح کەناوی مانع بوو.

هەروەها لەناو بەندیخانەدا چەندین شۆڕشگێڕیتر هەبوون کەئامادەبوون تا دوا هەناسە لەسـەر بیروبـاوەڕی خۆیـان پـێ دابگرن، وەکو: مامۆستا حسەین ڕەزا, حەمید کەریم  شانەیی، مامۆستا هادی، جاسم محەمەد سەلیم، خدر عـەلی ئەحمـەد، عومەر سەیدعەلی، ئەنوەر حەسەن، خۆشناو محەمەدئەمین، ئەرسەلان بایز، ئـاوات عەبدولغـەفور، کـوردۆ  قاسـم, ئەحمـەد

مەولود، عەلی بچکۆل، جەبار فەرمان. لەناو هەموو ئەمانەدا حسەین رەزاو جاسم محەمەد عەلیو خدر عەلی ئەحمەدو خۆشناو محەمەدئەمین سەلماندیان کە بەڕاستی خۆڕاگرو شۆڕشگێڕن.

## تێبینی

*١- لەو ماوەیەدا بەبۆنەی ئەوەی سەدام حسەین بوو بەسەرکۆمار لێبوردنی گشتی دەرچوو، بەڕێوەبەری بەندیخانە بەم بۆنەیەوە هاتە لامانو کۆبوونەوەی پێکردینو ئەو هەواڵەی پێ ڕاگەیاندین. فەلاح گوتی: ئێوە بەرناکەون. کاک عومەری سەید عەلی وەڵامی دایەوە گوتی: قرار واضح. ئنجا فەلاح درێژەی پێداو گوتی: رەفیق تۆ بچۆ دەرێ چونکە ئەم برِیارە تۆ ناگرێتەوە لەبەرئەوەی تۆ دوو دەعوای ئەمنی دەرەوەت لەسەرە. بەکوردیو بەکورتی گوتی تۆ سیخوڕی جولەکەو ئێرانیت. تومەس ئەو هەوڵو دەنگوباسەی*

*بەمەکتەبی بارزانیم داوە ئەوانیش بەئیسرائیلو ئێرانیان فرۆشتوە.*

*ئەوەی ئێستا لەدڵمدایەو دەمەوێت بیخەمە بەرچاوی هەموانەوە ئەوەیە کەهەڵگری ناوی پێشمەرگە، ئەم ناوە پیرۆزە، خاوەنەکەی ئەگەر پشتی کردە دوژمنو لەکاتی شەڕدا سەنگەری چۆڵکرد، مافی ئەوەی نییە بێتەوە ریزی شۆڕشو جارێکیتر دەسەڵات یان لێپرسراوێتی بگرێتەوە دەست.*

*٢- ئەوانەی لەبەردەمی دامودەزگا سەرکوتکەرەکانی رژێمدا خۆیان بۆ رانەگیراو لەپێناوی پاراستنی گیانیاندا ئیعترافیان لەسەر هاوسەنگەرو هاورێبازەکانیان کردو لەکاتی دادگاییکردنیاندا شایەتییان لەهاورێکانیاندا، هەرکاتێك لەزیندان دەرچوون بۆیان نییە تێکەڵی سیاسەت ببنەوەو بچنەوە ریزی حزبەکان، بەڵکو پێویستە ئەم جۆرە کەسە رووخاوانە کە لەزیندان دەردەچن خۆیان لەبەرچاوی خەڵك ون بکەن، توخنی سیاسەت نەکەونەوەو لەکۆروکۆمەڵی سیاسی دوورەپەرێزبن، جگەلەوەی کەدەبێت پلەوپایەی گەورەیان نەدرێتی، بەرپرسیارێتی نەگرنەدەست چونکە بەزۆری لەکاروبارییاندا رووبەرووی بارودۆخی دژوارتر دەبنەوە ئەوساکە دووبارە خۆیان پێناگیرێتەوەو دەبنەوە بەمایەی رووخانی ئەو ئەزموونەمان کەبەری خوێنی شەهیدانە.*

لەوەوە دڵنیابووم کەکێشەی من پەیوەندی بەخودی سەدامەوە هەیە. دوای ئەوە ئەو برا دڵسۆزانەی لێبوردنەکە گرتنیەوە خواحافیزییان لێکردمو بەجێیان هێشتم، منیش خۆشحاڵیم بەئازادبوونیان دەربڕی. روومکردە برای گەورەو ئازیزم کاکە شەفیق کەدەموچاوی سورهەڵگەڕابوو گرژی پێو دیاربوو, پێی گوتم: ئێستا زانیم کەتۆ سیخوڕی ئیسرائیلو ئێرانیت، هیچ باوەڕم پێت نەماوە، پێشتر پێم وابوو ئەوەی کردمان لەپێناوی کوردو کوردستاندا بووە. لەو جۆرە قسانە زۆری گوت بەڵام من بەهیچ جۆرێك وەڵامی کاکە شەفیقم نەدایەوەو ناچاربووم بگریم. کەبینی دەگریم بێدەنگ بوو, ئەملاو ئەولای ماچ کردم.

لەئێمە خراپتر کوڕێکی کامل چادرچی بوو کەئەویش وەك ئێمە بەر لێبوردنەکە نەکەوت. ئەوەبوو هاتە لام پێی گوتم: مام رەفیق خەریکە مێشکم بتەقێ، تکایە چارەیەکم بکە. گوتم: وەرن دوام بکەون. بەماوەی ٥ سەعات ٧٠٠ قەرەوێڵەی ئاسنمان گواستەوە، دوای ئەوە بەجۆرێك ماندووبووین کەهێزمان تێدا نەماو یەکسەر خەوتین. دوایی ئێمەیان گواستەوە بۆ هۆڵێك هەموو زیندانیەکانی بەتاوانی دەرمانە بێهۆشکەرەکان زیندانی کرابوون. ٢٤ سەعات پێش ئەوە لەگەڵ برا کوردە شۆڕشگێڕەکاندا زیندانی بووم ئێستاش لەگەڵ خەڵکی خراپەکاردا. فەلاحی سیخوڕ بەلاماندا رەت دەبوو توانجی تێدەگرتین دەیگوت: رەفیق تۆ ١٧ ساڵت ماوە، بەڵام شەفیق تۆ دوو ساڵت ماوە. بۆ بەیانی, رۆژی سەردانی بوو. ئەوەبوو وەکو

جاران ماڵەوەمان هاتن‌و دایکم لەپێشەوە دەرۆیشت، هەموویان ورەیان بەردابوو تەنها دایکم‌و کەمال نەبێت کەبەجۆرێك ورەیان بەرز بوو لەرێگا بەدەم قسەی خۆش‌و گاڵتەوە هەموومانیان هێنایە پێکەنین. دایکم گوتی: لەم هەفتەیەدا خەونم بینیوە ئێوە بەردەبن، دوای ئەوە روویکردە کاکە شەفیق پێی گوت: ئاگات لەرەفیق بێت‌و دڵی عادز مەکە. هەروەها دڵخۆشی دایەوەو داوای لێکرد کەخۆڕاگر بێت چونکە تەنگانە بەری کورتە. دوای ئەوە کات تەواوبوو, وەکو رۆژان گەڕانەوە بۆ ماڵەوە. ئێوارەکەی رووباری کچم تەلەفۆن بۆ سەدام حسەین دەکات بەبۆنەی بونە سەرکۆماری. سەدام پێی دەڵێت خۆت بناسێنە، ئەویش دەڵی من ناوم رووبارەو کچی رەفیق پشدەریم. سەدام دەڵێت: سەید رەفیق چۆنە؟ رووبار وەڵامی دەداتەوە دەڵێ: تۆ خۆشیت خستە ماڵی هەموو کەس تەنها ماڵی ئێمە نەبێت، چونکە باوکم هێشتا لەزینداندایە. ئەویش دەڵێ: باوکت بەربووە، چونکە ئەو بڕیارە ئەویش دەگرێتەوە. رووبار دەڵێ: ئیمڕۆ هەتاکو سعات ٢ لای باوکم بووین لەبەندیخانەی ئەبوغرێب. سەدام پێی دەڵێ: قسەی من یەکەو باوکت بەربووە، بەیانی دێتەوە لاتان.

من‌و شەفیقی برام لەناو زینداندا ئاگامان لەو شتانە نەبوو، کاتێك نیوەی شەو لەبەندیخانە بەرێوەبەر هاتە لامان، کەگەیشتە لای من بەگەرمی سڵاوی لێکردم گوتی رەفیق چیتان بۆ بکەم؟ گوتم ئەگەر بمانگوازنەوە بۆ لای باخەوان‌و عومەر سادق زۆر مەمنون دەبین. بەپێکەنینەوە گوتی: من لەماڵەوەبووم جێگرەکەم ئاگاداریکردم کەدەربارەی رەفیق پشدەری پرسیاریان کردووە، لەقسەکانیدا زانیم کەئەوە سەرکۆمارە پرسیاری کردووە. منیش خۆم هاتم راستییەکەی بزانم، سەرکۆمار پرسیاری ئەوەی لێکردین کەبۆچی تا ئێستا رەفیق پشدەریتان ئازاد نەکردووە، ئێمەش وەڵاممان داوەتەوە لەبەرئەوەی دوو تاوانی دەرەوەی لەسەرە, واتە سیخوڕە. ئەویش گوتبووی من رەفیق دەناسم شتی وا ناکات (رفیق ما یضرب تختە چروك) بۆیە فەرمانیدا بۆ بەیانی ئازاد بکرێین.

سەعات ١٢ی شەو ئاگادارکراین خۆمان بپێچینەوە, دوای ئەوە ئێمەیان بردە لای بەرێوەبەری بەندیخانەی گشتی کەسەعاتێك داینایین قسەی خۆشی بۆ کردین, دەیگوت: بڕوا ناکەم هیچ گلەییەکتان لەئێمە هەبێت. لەو کاتەدا لێپرسراوێکی موخابەراتی هاتە ژوورەوە گوتی: تەلەفۆن بۆ ماڵەوە بکە کە لەسەعات شەشی ئێوارە بێن بۆ بەندیخانە تا لەگەڵیاندا بچیتەوە بۆ ماڵەوە. تکام وایە خەڵك کۆنەکەنەوەو لەدوو ئۆتۆمبێل زیاتر نەیەن. سەعات دوو تەلەفۆنم لەگەڵ ماڵەوە کردو ئاگادارمکردن کەسبەی بێن بۆ لام. لەکاتی خواحافیزیمدا لەگەڵ کاك عومەر سادق کە بەناهەق، ماوەی ٢٠ سال حوکم درابوو زۆر دڵگران بووم بوی. سەعات ٨ گەیشتمە ماڵەوە، باس ناکرێت لەخۆشیان کەسوکارو خزم‌و دۆستەکانم چییان بۆ کردم, شەوی عارفەبوو، جەژنمان لەماڵی خۆمان کرد لەبەغدا. دووەم رۆژ هەموومان نزیکەی ٧٠ کەس دەبووین جەژنمان لەماڵی برای ئازیزو دڵسۆز کاك حەمەو کاك ئەحمەد کوڕانی مام وەلی لەگوندی ئەحمەدئاوای ناوچەی کەلار بەسەربرد.

سێیەم رۆژی جەژن لەسلێمانی بوین لەماڵی کەمالی برام. لەناو خۆماندا ئەوەمان بەباش زانی بۆ کەمکردنەوەی بارگرانی لەسەر خەڵك تا هاتوچۆی بەغدا نەکەن، بۆ ماوەی حەوت رۆژ پیاوان لەماڵی حەسەنی برام‌و ژنانیش لەماڵی شەفیقی برام لەقەڵادزێ دانیشن. بەهۆی ئەوەی ئێمە کە لەبنەماڵەی حاجی سادقە درێژین‌و خزمەتێکی زۆری خەڵکمان کردووەو وا بڵاوبێوە کەئێمە سەرنگوم کراوین، بەجۆرێك پێشوازی کراین‌و خەڵك هاتە لامان کەخۆمان لامان سەیربوو. ئەمەبوو بەهۆی ئەوەی سەرەنجی رژێمی بەعس راکیشێ، رێکخراوی بەعس لەرانیەو سەنگەسەرو قەڵادزێ هاتنە لامان. داوایان لێکردم بەرامبەر ئەم هەڵوێستەی سەدام حسەین لەبەرامبەر مندا لەکاتێکدا من (وەکو نوێنەری رێکخراوەکان دەیانگوت) ئەو هەموو تاوانەم بەرامبەر بەرژێمی عێراقی کردووە، داوایان لێکردم بەو بۆنەیەوە قسە بۆ خەڵك بکەم‌و باسی چاکەی رژێمی بەعسیان

بۆ بکەم تا خەڵك هانبدەم بێن بەبەعسی و ئەوانەش کەچوونەتە شاخ بیانهێنمەوە ناو رژێم. ئەوەبوو سەیری براکانم کردو ئەوانیش بەچاو پێیان گوتم وەڵامیان بدەوە. بۆیە پێم گوتن: ئێمە بەبێتاوان گیرابووین، تەنها تاوانێکمان ئەوەبوو کەکوردبووین, رژێم خراپترین و ناشیرنترین کردەوەیان لەگەڵدا کردین، ئێمە بەمافی خۆمان بەربووین و، خەڵکانی شاخ خاوەنی بیروباوەڕن و بەقسەی من پەشیمان نابنەوە, ئێوە ئەگەر
راست دەکەن گفتوگۆیان لەگەڵدا بکەن و داواکانیان جێبەجێ بکەن تا لەشاخ بێنە خوارەوە.

دوای ئازادبوونم ئەمە یەکەم جاربوو لەگەڵ کادیرانی رژێمی بەعس رووبەڕوو ببمەوەو بەسلبی قسەیان لەگەل بکەم. دوای ئەمە بیرم لەوە کردەوە لەداهاتوودا چ بکەم؟ هەنگاوی یەکەم نووسراوێکم ئاراستەی برای گەورە مام جەلال کرد، بۆم روونکردبۆوە کەمن ناتوانم لەو بارودۆخەی رژێمی بەعسدا بژیم و، پێم راگەیاند کەدەمەوێت بێمە ناو شۆڕشەوەو خزمەت بەگەلەکەم بکەم، چ لەشاخ بێت چ لەهەندەران. لەهەمانکاتدا بۆم نووسیبوو پێویستم بەچارەسەری دەروونی هەیەو پێویستە ماوەیەك پشوو بدەم. وەڵامی مام جەلال زۆر ئیجابی بوو، پێی باش بوو یەکەم هەنگاو بچمە دەرەوە. ئەوەبوو کەوتمە خۆ ئامادەکردن و یەکەم شت ماڵەوەم بەیەکجاری گواستەوە بۆ شاری سلێمانی, لەلایەن خەڵکیشەوە پێشوازیەکی باش کراین، بەڵام بەداخەوە لەو کاتەدا لەپڕ برای ئازیزو هاوڕێی بەندیخانەم کاکە شەفیق لە ۱۹۸۰/۱/۳۰ کۆچی دوایی کرد، ئەم کارەساتە هەموو بەرنامەکانمی دواخست. شەفیقی برام دوای شەش مانگ لەئازادبوونمان کۆچی دوایی کرد، کاتێك لەبەندیخانەی تایبەتی موخابەرات بووین ماوەی ١٦ مانگ کەسوکاری خۆی نەدی. لەکاتی لێکۆڵینەوەدا رۆژێکیان کاسێتێکی بەدەنگی من بۆ لێدەدەن پێی دەڵێن ئەوە رەفیقی براتە دان بەتاوانەکانی خۆیدا دەنێت, تۆش کەدەتەوێ رزگاربیت پێویستە وەکو ئەو بکەی. کاکە شەفیق کەگوێی لەدەنگم دەبێت لەهۆش خۆی دەچێت و دەبووڕێتەوە، ئەمە یەکەم جاربوو نیشانەی نەخۆشی دڵی لێدەربکەوێت. خۆڕاگری ئەم قارەمانە شایەنی باسکردنە، چونکە لەزینداندا کەمن ئەوانەی خۆ دەگرن و چۆك بەرامبەر دوژمن دادادەن. من لەزینداندا زۆر لەوانەم بینی کەنەیانتوانی خۆیان بگرن و هەر زوو ورەیان بەرداو ئیعترافیان کرد، هەندێك لەوانە هەر لەلێکۆڵینەوە لەزینداندا خۆیان راناگرن و بێتاقەتی و ترسی خۆیان ئاشکرادەکەن. حەق وایە ئەوانەی لەزیندان بەردەبن جارێکیتر رێگایان نەدرێت تێکەڵ بەسیاسەت و حزبایەتی ببنەوە، چونکە ناتوانن نهێنی بپارێزن و پیاوی ئەو بوارە نین.

لەماوەی پرسەی شەفیقی برامدا دوکان و بازاڕ داخراو خەڵك بەگشتی بەشداری خەممان بوو. رۆژی دووەم روومکردە ئەو بەرێزانەی سەرپەرشتی پرسەکەیان دەکرد لەوانە حەمەسووری مینەعارەب و کاك هۆمەری حاجی موساو حەسەنی برام, پێم گوتن: دەبێ تەگبیرێك دانێن بۆ ئەو خەڵکەی دەوروبەری قەڵادزێ تا بەبرسیەتی نەگەڕێنەوە، با هەرچی کەبابخانە هەیە کەباب بۆ ئێرە بهێنن، چونکە زیاد لە ۷۰۰ میوان هاتووە. گوتیان: ئێمە ئەو کێشەیەمان لەناوخۆماندا جێبەجێ کردووە، هەرچی خەڵکی قەڵادزێیە لەگەڵ خۆی سینی خواردن بێنێ بۆ ئێرە، بەڵام بۆ نان خواردن بچنەوە ماڵی خۆیان چ ژن چ پیاو. هاوسەرەکەی شەهید عەلی عەسکەری هات بۆ پرسەکە پێی گوتم: کە لەئۆتۆمبیلەکە دابەزیم پرسیارم کرد ئەو قەرەباڵغیە چییە؟ کێ وەفاتی کردووە؟ وەڵامیان دامەوە گوتیان شەفیقی برای رەفیق پشدەرییە، ئەم پیاوە ئەوەندە باش بووە کەهەموو خەڵك بۆی دلگرانە. ئەوجار خۆم ئاشکرا کردو رێزی زۆریان لێگرتم و بەئۆتۆمبێل منیان هێنا بۆ پرسەکە. هاوسەرەکەی خاڵە شەهاب بەهەمان شێوە لەگەڵ سۆرانی کوڕیدا بۆ پرسەکە هات و دوو رۆژ لامان مانەوە، دایکی سۆران گوتی: لەهەموو پرسەیەك بۆ شەهاب دەگریم، بەڵام لەم پرسەیەدا هەموو گریانەکەم بۆ شەفیقی براتە. چونکە کاتی لێقەومانم ئێوە زۆر بەهانامانەوە هاتن، ئەوەتا سۆران نایەوێت بگەڕێتەوە سلێمانی، چونکە تۆی زۆر خۆش دەوێت.

هەواڵ بەمام جەلال دەگات کەرەفیق کۆچی دوایی کردووە، بۆیە دەفەرموویێت تا ماوەی ٢٤ سەعات لەسەر رەفیق دەنووسم. دوایی وەڵامی بۆ دەچێت کەئەوەی کۆچی دوایی کردووە رەفیق نیە بەڵکو شەفیقی برایەتی. منیش گوتم: هەتا لەژیاندا ماوم حەز دەکەم بەدستو قەڵەمە زێرینەکەی خۆی تەنها (٥) دێرم لەسەر بنوسێ. سبحان من یغیر الأحوال.

لە١٩٨٠/١٢/٢٨ لەگەڵ برای بەرێزو دڵسۆزم مام ساڵح سورچی لەسنووری عێراق دەرچووم. ئەوەبوو بەئۆتۆمبێلی کاك عومەر سورچی چوینە کوێت کە لەسەر داخوازی من خستبویە بەردەستمان. لەوێ چوینە ماڵی ئەبو حەیدەر کەپیاوێکی خزمەتگوزارو نیشتمانپەروەر بوو و هەمیشە دەرگای ماڵی لەسەر پشت بوو بۆ هەموو کەسێك. لە ١٩٨٠/١٢/٢٩و لە ١٩٨١/١/٤ تەلەفۆنم لەگەڵ برای بەرێزو خۆشەویستم مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد کرد، ئاگادارم کردەوە کە لە ١٩٨١/١/٥ سەعات نۆی شەو بەکاتی لەندەن دەگەمە لای. لەکاتی دیاریکراو گەیشتمە لەندەن، بەڵام لەترانزێت دوایان خستم. لەوێ چەندین پرسیاریان لێکردمو پێیان گوتم دیارە بەپێی ئەو پارە زۆرەی پێتە نیازت نیە بگەڕێیتەوە بۆ عێراق، هەروەها گوتیان ئەو هەموو میوەو دیارییە چییە لەگەڵ خۆتدا هێناوتە. لەدواجار دوای دوو سەعات رێگایان دامو فیزەی سێ مانگیان دامێ. کە لەفرۆکەخانە دەرچووم د.لەتیف رەشیدو کاك هەڵۆ ئیبراهیم ئەحمەد چاوەروانیان دەکردم، سەرەتا ئەوەم بۆ روونکردنەوە کەبۆچی دواکەوتم و داوای گەردن ئازاییم لێکردن.

## لە لەندەنیش وازم لەبڕواکانم نەهێنا

پاش گەیشتنم بەلەندەن دیاریەکانم تەسلیمی کاك د. لەتیف رەشید کرد بۆ دابەشکردن. بۆ ماوەی دە مانگو بیست رۆژ لە لەندەن مامەوە, مانگی یکەم لەئەپارتمانێکدابووم کە لەدووری ٥٠٠ مەتر بوو لە VICTIORIA فکتۆریا, دوایی گواستمەوە بۆ گەڕەکی CHELSI لەباڵەخانەی NILGWIVHOUSE ئەپارتمانێکم گرتو مامەوە. تاکو ئەو رۆژەی لەندەنم جێهێشت، هەر کاروبارێکی خودی یان سیاسیم هەبوایە لەرێگەی برایانی بەرێز د.لەتیف رەشیدو د. سەلاح حەمەسەعید ئەنجامم دەدا، بۆیە بەبێ ئاگاداری ئەو بەرێزانە هیچ هەنگاوێکم نەدەنا، شایەنی باسە کەئێمە لەنێوان خۆماندا تەبابووینو هیچ کێشەیەکمان نەبوو ئەمەش هەموو بۆ مامۆستای گەورەو بەرێز ئیبراهیم ئەحمەد دەگەڕێتەوە.

من کەهاتمە دەرەوەی وڵات بەنیازی چارەسەرکردنو پشوودان بوو، بەڵام بەجۆرێك تەندروستیم باش بوو رێگام نەکەوتە لای هیچ دکتۆرێك ئەمەش هەمووی لەگەورەیی خودابوو. پاشان بەهۆی رێنمایی مامۆستای بەرێز ئیبراهیم ئەحمەدو رێگاپێدانی مام جەلال توانیم بەیارمەتی د.لەتیف رەشید خزمەتێکی زۆری وڵاتەکەم بکەم، کەجێدەستی خۆم لەخزمەتکردنی کوردو کوردستاندا لەو دەربەدەریە دیارخەم، کەوا لەخوارەوە بەکورتی باسی هەندێك لەو لایانانە دەکەم بەتایبەتی لەسەر خودی ئەو مامۆستا بەرێزانەی کۆچی دواییان کردوەو ماوەیەك لەخزمەتیاندابووم. خوالێخۆش بوو تۆفیق بەگو خوالێخۆش بوو عەلی کەمال کەحاتەمی تەیی کوردان بوو، خوالێخۆشبوو مامۆستای گەورە ئیبراهیم ئەحمەدو، خوالێخۆشبوو کاکی کان عومەر مستەفا.

پێنجەم رۆژ بەهۆی کاك د.لەتیف رەشید تەلەفۆنم لەگڵ برای گەورە مام جەلال کرد کەئەو کاتە لەلیبیا بوو، هەموو ئەو ئاگادارییانەی هەمبوو بەدوورودرێژی باسمکرد، ئەویش فەرمووی نوسراوێکم بۆ بنوسە. ئینجا داوای لێکردم سەردانی باڵوێزخانەی لیبیا بکەم لە لەندەنو گوتی هەوڵبدە لەئەمنیستی، بەسەرهاتی خۆت باس بکەو با لەگۆڤارەکەیان بۆت بڵاوبکەنەوەو، هەوڵبدە هەموو ئەو ئازارو ئەشکەنجەیە کەدراوی بڵاوبکرێتەوە. چوار جار چوومە باڵوێزخانەی لیبیا، جاری یەکەم لەگەڵ جەنابی مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەدو د.لەتیف رەشید چووم، ئەوانیش بەباڵوێزی لیبیایان ناساندم کەناوی

ئیبراهیم بوو، پێشەکی بروسکەیەکم دایێ بۆ دۆستی دێرینی گەلی کورد، لەبروسکەکەدا بەدوورودرێژی باسی هەڵوێستی رژێمی بەعسو درندەیی ئەو رژێمەم بەرامبەر بەگەلی عێراق بەگشتیو گەلی کورد بەتایبەتی کردبوو. جەنابی بالویز گوتی: سەرۆك معەممەر قەزافی دەڵێت: ئەو چوار حکومەتە (عێراق، ئێران، تورکیاو سوریا) ئاسودەیی بەخۆیانەوە نابینن، کێشەی کورد چارەسەر نەکەن، بەتایبەتی تورکیا کەرۆژ بەرۆژ رووبەرووی کێشەو گرفتی ئابووری گەورە گەورە دەبێتەوەو قەرزەکانی زیاد دەکات، ئەمانە وا لەتورکیا دەکەن ببێتە داردەستی ئەمریکا لەناوچەکە. لەدرێژەی قسەکانیدا باڵوێزی لیبیا ئاماژەی بەوە کرد کەسەرۆك معەمەر قەزافی لەگەل تاوانبار ئەحمەد حەسەن بەکرو وەزیری دەرەوەی تورکیاو کاربەدەستانی حکومەتی ئیسلامی ئێران باسی ئەوەی کردوە کەکێشەی کورد لەرێگای ئاشتیەوە نەبێت چارەسەر ناکرێت.

دوای یەك سەعات خواحافیزیمان لەباڵوێز کرد. پاش ئەوەی ژمارەی تەلەفۆنەکەمی وەرگرت دوای چەند رۆژێك لەسەر داوای بەرێزی سەردانمکرد لەباڵوێزخانە, کەدانیشتین گوتی ئەگەر پێویستت بەپارەی چارەسەرکردن هەیە لەنەخۆشخانە ئێمە ئامادەین ئەو ئەرکە بگرینە ئەستۆ، منیش سوپاسم کردو گوتم لەو رۆژەوە لەو دۆزەخەی سەدام حسەین رزگارم بووە تەندروستیم بەجۆرێك باشە کەپێویستیم بەحەبی سەر ئێشەش نیە.

لەکاتی کۆبوونەوەم لەگەڵ باڵوێزی لیبیا بۆ جاری سێیەم، بەرێزیان گوتی: حکومەتی لیبیا بەناوی میوانداریەوە داوا دەکا ئەگەر دەتوانی سەفەربکەی هەموو خەرجیەکەت دەگرینە ئەستۆ. دووبارە سوپاسی جەنابی باڵوێزم کردو داوای لێبوردنم لێکردو هیوای تەمەندرێژیو سەلامەتیم بۆ ئەوو سەرۆك معەممەر قەزافیو گشت گەلی لیبیا خواست.

## دیدار لەگەڵ رێکخراوی لێبوردنی نێودەوڵەتی

پاش ماوەیەك کاکە د.لەتیف رشید ئاگاداریکردم کە لەکاتێکی دیاریکراودا دێت بۆ لام بۆ ئەوەی پێکەوە بچین بۆ میواندریەك، چومە خزمەتیو چووینە چێشتخانەیەکی لاچەپی بچووك کەپێنج مێزی نانخواردنی لێبوو کەتەنها ئێمەو دوو ئینگلیزی لێبوو، بۆیە چووینە ئەو چێشتخانە چۆڵە تا لەمەترسی رژێمی بەعس دوورکەوینەوە چونکە لەو کاتەدا هەموو وڵاتە زلهێزەکان چاوپۆشییان لەتاوانەکانی بەعس دەکرد بەتایبەتی روسیاو ئەمریکاو بەریتانیاو فەرەنساو ئەڵمانیاو چین. ئەو وڵاتانە بەرژەوەندییان لەو بێدەنگیە هەبوو لەبەرامبەر کوشتوبڕو تاوانەکانی بەعس بەرامبەر بەکوردو کوردستان، بەڵام بۆ ئەو رۆژە میواندارییکردن لەکورد زۆر گرنگ بوو و، جێی سوپاسە کە(عەم ناجی) باسی چۆنیەتی گرتنی منی دەکرد لەلایەن رژێمی بەعسەوە. د.لەتیف رەشید ئاگاداریکردم لەئەمنیستی کاتێکیان بۆ داناوم بۆ ئەوەی چاوپێکەوتنم لەگەڵدا بکەن، کچێك کەنوێنەریان بوو، دوو سەعات گفتوگۆی لەگەڵ کردم منیش هەموو بەسەرهاتی خۆم بەدوورودرێژی بۆ گێڕایەوە.

کچەکە گوتی: ئێمە ئەو رووداوە لای خۆمان تۆمار دەکەین بەڵام بڵاوی ناکەینەوە لەگۆڤارەکەماندا، چونکە ئەمە لەساڵی ۱۹۷۷ روویداوە ئێستاش ساڵی ۱۹۸۱ـە, منیش گوتم لە ۱۹۷٦/۹/۱٤ گیرامو لەساڵی ۱۹۷۷دا بەردرام و بەم شێوەیەی کەبۆم باسکردی منیان ئازارو ئەشکەنجەداوە، ئەوەی لەگەڵ من کراوە لەگەڵ ئاژەڵدا ناکرێت، وا ئێستاش رووبەرووی ئێوە راوەستاوم گوایە دەزگاکەتان بەرگری لەمافی مرۆڤ دەکات لەجیهاندا کەچی ئەوەش وەڵامی ئێوەیە. پاشان ئەو رۆژەم هێنایەوە بەرچاوی کەپاسەوانەکانی دیکتاتۆری بەغدا چۆن ئازاریان دەدام، کچەکە دوای ئەوە گۆڕانێکی سەیری بەسەرداهات، رەنگی دەموچاوی گۆڕا ئینجا گوتی من ناونیشانی د.لەتیف رەشیدم لایە هەرکاتێك بەشێکی سیاسی

ویستی لەسەر پێشێلکردنی مافی مرۆڤ لەعێراق زانیاری کۆبکاتەوە ئەو کاتە پەیوەندی بەدکتۆرەوە دەکەم بۆ ئەوەی ئاگادارت بکاتەوە.

### دیدار لەگەڵ BBC دا

هەر لەگەڵ د.لەتیفدا سەردانی بەشی پانۆرامای BBCم کرد، مستەر RICHARD جێگری بەشی پانۆرامامان بینی ئەویش هەموو پرسیارەکانی کە لەئەمنیستیو چێشتخانەکە لێیان کردبووم بەزیادەوە سێبارەی کردەوە، منیش وەڵامەکانم دایەوە، گوتی: لەم رۆژانە تەلەفۆنت بۆ دەکەم. دوای چوار رۆژ بەتەلەفۆن ئاگاداریکردم کەدەیەوێت بمبینیت. لەسەر داوای خۆی یەکترمان بینی گوتی: ئامادەیت کە لە BBC وێنەت بڵاوبکەینەوەو لەسەر رژێمی عێراق بدوێیت؟ گوتم زۆر خۆشحاڵ دەبمو سوپاستان دەکەم کە لەسەر بارودۆخی عێراق بدوێم، چونکە بۆ بەرژەوەندی وڵاتەکەم مایەی سودبەخشینە.

بۆ ئەم مەبەستە کاتمان دانا، بەڕێوەبەرایەتی بەشی وێنەو تۆمارکردنی BBC هەر هەمویان لەئاپارتمانەکەدا هاتنە لامو لەچواردەوری ئەو ناوچەیە پاسەوانیان دانابوو بۆ پارێزگاریکردن. لەکاتی وێنەگرتنو تۆمارکردنی قسەکانمدا دوو جار ئەو قسەیەیان دووبارە کردەوە بەجۆرێك قسەبکە ئینگلیزیەکەت پچڕ پچڕبێت، چونکە وێنەکانی پێشووت دەڵێی لەئاهەنگدایت، ئەو بەرنامەیە زیاد لە ٤٠ ملیۆن کەس دەیبینێت، بەم جۆرە خەڵك بڕوات پێناکات. پاش تەواوبوون گوتی: پرسیارێکم هەیە لەجەنابت ئایا تۆ دەوری ئەکتەریت بینیوە؟ گوتم کورد ژمارەیان زیاد لە ٤٠ ملیۆن کەسن تەنها لەعێراق نزیکەی ٢ملیۆنمان زیاتر بەدەست دوژمنانی کوردەوە لەم بارەی مندان. لەکۆتاییدا هەموویان بەناسینم خۆشحاڵ بوون، چەند وێنەیەکیان بۆ یادگاری لەگەڵدا گرتم, گوتیان: دوای یەك هەفتەی تر لە بەشی پانۆرامای BBC پەخشی دەکەین. لەمانگێکدا شەش جار تەلەفۆنیان لە BBCیەوە بۆ دەکردم، دەیانگوت ئەم هەفتەیە پەخشی دەکەین.

ئەم کارە سەرنجی مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەدو کاك عەلی کەمالی راکێشا، دەیانگوت ئەو خەڵکە بەجۆرێك تەماشای کەسێتی تۆ دەکەنو رێزت لێدەگرن کەپێشتر وێنەی نەبوو، منیش دەمگوت جیاوازی پیاوان لەگوندی هەرموتەش هەیە. هەر ئەم هۆیە وایکرد بێ ئەوەی داوای پەنابەری سیاسی بکەم خۆیان ئەم پێشنیازەیان پێشکەشکردم، کەتەنها دوو برایەتری بەڕێزی کورد بەمجۆرە نووسراویان ئاڕاستەکرابوو، بەڵام من پەنابەری سیاسییم وەرنەگرتو ئەوەبوو لەندەنم بەجێهێشتو گەڕامەوە کوردستان، خۆم هاویشتەوە ناو ئەو دۆزەخو ئازارو ئەشکەنجەیەی داگیرکەرانی ئەم وڵاتە بەسەر کوردیان سەپاندووە، بۆ ئەوەی بتوانم لەناوەوە خزمەتی کوردو کوردستان بکەمو لەو پێناوەدا گیانی خۆم ببەخشم.

حکومەتی بەریتانیا بەمەبەستی بازرگانی لەگەڵ رژێمی عێراق لەسەر پرۆژەیەك بەنرخی ٥٠٠ ملیۆن دۆلار رێککەوتن، ئەمە وایکرد پرۆگرامی پەخشی BBC دوابکەوێو، لەکاتی پەخشی چاوپێکەوتنەکەی مندا ٨٠٪ی وێنەو قسەکانی منیان بڕیبوو. لەساڵی ١٩٨١ لە BBC بەشی پانۆراما بەرنامەکە پەخش کرا لەژێر ناوی پێشێلکردنی مافی مرۆڤ لەعێراق، لەبەرنامەکەدا باسی ئەو ئازارو ئەشکەنجەیە کرا کەرژێمی بەعس دەیبارێنێتە سەر گەلی عێراق، پێشکەشکەری بەرنامەکە گوتی: ئەمەش نمونەی ئەو حاڵەتە خراپەی گەلانی عێراقە بەدەست رژێمی بەعسەوە. لەو کاتەدا وێنەی بەندەی خزمەتکاری کوردستانیان پیشاندا بەجلوبەرگی کوردیەوەو جامانەیەکم لەسەربوو، لەخوارەوە بەخەتێکی گەورە نوسرابوو (پشدەری)، ئەو رووداوە بۆ ئەو کاتە وەرچەرخانێکی گەورەبوو لەچوارچێوەی گەیاندنی دەنگی کورد بەجیهان دەسکەوتێکی گەورەبوو.

**تێبینی:**

*١-سالّی ١٩٨١ رێکخراوێك بەبۆنەی جەژنی نەورۆزەوە ئاهەنگێکی لەلەندەن سازدا. کاتێك چوومە هۆڵەکە ئەوەندەی نەمابوو دەرم بکەن، لەبەرەئەوەی من ئەمجۆرە رەفتارانەم زۆر بەرامبەر کرابوو تەقەی سەرم دەهات. ئومێدەوارم ئەو مامۆستایەی ئەو کردەوەیەی بەرامبەرم کرد ئێستا پشتی لەنیشتمان نەکردبێ و لەناو نازو نیعمەتی لەندەندا" وڵاتەکەی خۆی لەبیر نەچوبێتەوە.*

*٢- پاش بڵاوبوونەوەی چاوپێکەوتنەکەم بەم هەموو کەموکورییەوە لە BBC لەگەڵ میستەر ریچارد, بۆ جارێکیتر کۆبووینەوە. داوام لێکرد کەدانیشتنێکم لەگەڵ کاربەدەستێکی حکومەتی تاتچەر بۆ رێکبخات بۆ ئەوەی لەگەڵیاندا کۆببمەوە، لەوەڵامدا گوتی ژمارەی تەلەفۆنەکەت لامە بۆ ئەم مەبەستە ئاگادارت دەکەمەوە. دوای ٤٨ سەعات تەلەفۆنی بۆ کردم پێی راگەیاندم کەکۆبونەوەکەی بۆ رێکخستووم. لەو کاتەی ئەوان دایان نابوو لەهەمان شوێنی دیاریکراو لەگەڵیاندا کۆبوومەوە کەجگە لەمستەر ریچارد دوو کەسیتری لێ بوو، لەم کۆبوونەوەیەدا ئەم گفتوگۆیەمان کرد:*

*سەرەتا من گوتم: بۆچی کوردستانتان کرد بەچوار پارچە؟ لەو کاتەدا لەسەر کاغەزێکی سپی ئیشارەتی +م بۆ کردن کەمەبەستم لەچوارپارچەی کوردستان بوو. گوتیان: باوباپیرانمان ئەوەیان کردووە، ئێستاش راستکردنەوەی ئەم هەڵەیە کارێکی زەحمەتە چونکە ئەو چارەسەرە هەلومەرجێکی دەولی پێویستە. ئەوجا گوتم: ئایا ئێمە دەبین بەحکومەت؟ گوتیان: دوای چارەسەرکردنی کێشەی فەلەستین. گوتم: یانی هەزار ساڵی تر. گوتیان: هەرکاتێك کێشەی فەلەستین چارەسەرکرا ئەوە گەورەترین کێشە لەرۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا کێشەی کورد دەبێتو لەو کاتەدا ئێوە دەبن بەحکومەت. گوتم: ئەی دیکتاتۆر سەدام حسێن وەك سەرکۆماری عێراق دەمێنێ؟ گوتیان: رژێمی سەدام نامێنێ بەڵام گرنگ ئەوەیە ئێوە یەکڕیزبن.*

*لەدرێژەی قسەکانمدا گوتم: پێویستە ئێوە لەهەموو روویەکەوە یارمەتیمان بدەنو، هیچ نەبێت حکومەتی ئەمەریکا لەکێشەی کورد ئاگادار بکەنەوە، چونکە پێدەچێت ئەوان لەچ کونو قوژبنێکی جیهاندا هەیە کەمەبەستم نەوتە تا هەڵیبلوشن.*

*کۆبونەوەیە لای ئەوان تۆمار کراوەو الله اعلم.*

من سەرەتا ویستم بەتەنیا نەچم بۆ ئەم کۆبونەوەیە، بەڵام کەس ئامادە نەبوو لەگەڵمدا بێت چ وەك گوێگر چ وەك وەرگێـــــــڕ. لەكاتی گفتوگۆكانمدا پرسیاری ئەوەیان لێكردم كەئەگەر سەدام حسێن دانی بەچارەسەری کێشەی کورددا نا ئەوا هەڵوێستم چی دەبێت؟ لەوەڵامدا گوتم هەردوو دەستی ماچ دەکەم، چونکە من هیچ کێشەیەکی خودیم لەگەڵیدا نیەو، هەر کاتێك ئەمە بکات ئەوا کورد بەگشتی وەك دۆستێکی خۆی تەماشای دەکات.

هەر لەکاتی گفتوگۆکانماندا وێنەیەکی خودی زۆریان گرتم، کەدواجار بۆم دەرکەوت گرفتی ئێمە لەوەدایە خاوەن کیانێکی سیاسی سەربەخۆ نین، ئەگەر نا سیاسەتمەدارانی کورد لەسیاسەتمەدارانی بێگانە گەلێك زاناترو دیپلۆماسیترنو زۆر بەئاسانی دەتوانن گفتوگۆیان لەگەڵدا بکەنو بڕوایان پێبێنن.

هەموو ئەو ماوەیەی کە لەلەندەن لەخزمەت ئەو مامو برایانەدا مامەوە چەندین کاری گرنگو باشمان ئەنجامدا کەوا لەخوارەوە بەکورتی هەندێکیان باس دەکەم:

لەو ماوەیەدا هەفتەی جارێك لەگەل مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەدو کاکە عەلی کەمالو کاکە عومەر مستەفاو کاك دکتۆر لەتیف رەشیدو دکتۆر حەمەساڵح سەعید پێکەوە سەردانی بەڕێز مامۆستا تۆفیق وەهبی بەگمان دەکرد، هەندێ جار کاك

عومه‌رو كاك له‌تیف له‌به‌رئه‌وه‌ی له‌ده‌ره‌وه‌ بوون بۆیان نه‌ده‌كرا له‌گه‌ڵماندا بێن، هـه‌روه‌ها مـانگی دوو جـار یـان سـێ جـار له‌سه‌ر سفره‌ رازاوه‌و خواردنه‌ خۆشه‌كه‌ی داده‌ گه‌لاوێژخان كۆده‌بووینه‌وه‌، به‌قسه‌ خۆشه‌كانی مامۆستا ئیـبراهیم ئه‌حمـه‌دو خواردنه‌ به‌تامه‌كه‌ی داده‌ گه‌لاوێژ كاتێكی خۆشمان به‌سه‌رده‌برد، هه‌روه‌ها كاكی كاكان‌و كاكـه‌ دكتـۆر لـه‌تیف هـه‌مان جـۆر میواندارییان بۆ ده‌كردین منیش هه‌فته‌ی جارێك ئـه‌و ده‌عوتـه‌م بـۆ دووبـاره‌ ده‌كردنـه‌وه‌، لـه‌كاتی كۆبوونه‌وه‌كانـدا باسمـان له‌كێشه‌ی كوردو رێگه‌چاره‌ی ده‌كرد، به‌م جۆره‌ كاتمان ده‌برده‌ سه‌ر، كاتێك ده‌گه‌ڕاینـه‌وه‌ ماڵـه‌وه‌ مـات‌و مـه‌لول چـاوه‌ڕێی ره‌حمه‌تی خودامان ده‌كرد.

## زانای كورد تۆفیق وه‌هبی به‌گ

مامۆستاو زاناو مێژوونووسی به‌ناوبانگی كورد تۆفیق وه‌هبی به‌گم به‌هۆی خوالێخۆشبوو هاوسه‌ره‌كه‌م شیرین مه‌عروف رۆستم به‌گی بابان ناسی، له‌رێی خزمایه‌تییه‌كه‌یانه‌وه‌.

لـــه‌زه‌مانی مه‌له‌كیـــه‌ت دوو جـــار به‌خزمـــه‌تی گه‌یـــشتم، ته‌ماشـــای ده‌موچـــاویم ده‌كـــردو بێـــده‌نگ داده‌نیـــشتم گـــوێم له‌فه‌رمووده‌كانی ده‌گرت، ساڵی ١٩٨١یش له‌له‌نده‌ن به‌هه‌مان شێوه‌ گوێم بۆ ده‌گرت، زۆر جار براده‌ران پێیـان ده‌گـوتم بـۆ قسه‌یه‌ك ناكه‌یت؟ منـیش وه‌ڵامـم ده‌دانـه‌وه‌ ئـه‌و رووداوه‌ی ئـه‌و باسـی ده‌كـات له‌زه‌مه‌نێكـدا بـووه‌ كه‌هێـشتا ئێمـه‌ لـه‌دایك نه‌بووبووین.

بۆ من جێگای شانازی بوو كه‌ له‌گه‌ڵ ئه‌م زاته‌ مه‌زنـه‌دا تێكـه‌ڵاویم پـه‌یداكردبوو، به‌ڕاده‌یـه‌ك كـه‌جێی سه‌رسـووڕمان بـوو هه‌تا لای كوڕه‌كانیشی سزاو سروشت. كوڕه‌كانی به‌وه‌ رازی نه‌بوون كه‌ئێمه‌ هه‌موو هه‌فته‌یه‌ك به‌كۆمه‌ڵ ده‌چـووینه‌ لای، زۆر جار پێی ده‌گوتم حیسابی تۆ جیایه‌، هه‌ر رۆژێ نا رۆژێ سه‌رم بده‌یت.

تێكه‌ڵیمان به‌ڕاده‌یـه‌ك پـه‌یدابوو كـه‌جارێكیان هـه‌ردوو كوڕه‌كـه‌ی له‌یـه‌كتر توڕه‌بـوون مامۆسـتا تۆفیـق داوای لـه‌من كـرد ئاشتیان بكه‌مه‌وه‌، دوو جـار دوای كاتـژمێر چـواری شـه‌و كوڕه‌كـانی ته‌لـه‌فۆنیان بـۆ كـردم‌و پێیـان گـوتم باوكمـان تووشـی ناره‌حه‌تی دڵ بووه‌و به‌په‌له‌ داوات ده‌كات. كه‌ده‌گه‌یشتمه‌ خزمـه‌تی داوای لێـده‌كردم گـۆرانی بـۆ بڵـێم، منـیش بـه‌م ده‌نگـه‌ ناخۆشه‌ی خۆم ناچار ده‌بـووم گـۆرانی بـۆ بڵـێم. چـه‌ندین جـار به‌ده‌سـتی خـۆم پـه‌رده‌پلاوم بـۆ لێنـاوه‌. ئـه‌م زاتـه‌ مه‌زنـه‌ كه‌به‌رامبه‌ری ده‌وه‌ستایت هه‌ستت به‌شه‌رم ده‌كرد، واتده‌زانی له‌به‌رامبه‌ر باوكت یان باپیرت یان مامۆستایه‌كی گه‌لێك مـه‌زن وه‌ستاویت، كه‌ده‌چووینه‌ خزمه‌تی هه‌موومان ده‌ستیمان ماچ ده‌كرد، یه‌كه‌م كه‌س كاكـه‌ عـه‌لی كـه‌مال ده‌سـته‌ به‌نرخـه‌كانی ماچ ده‌كرد، سه‌ره‌تا لام سه‌یربوو كاك عه‌لی كه‌مال كه‌ (حاته‌می ته‌ی)ی كوردان بوو به‌ڵكو زیـاتریش" چـۆن ده‌سـتی خـه‌ڵك ماچ ده‌كات.

به‌ڵام دوایی وام لێهات رۆژی واده‌بوو دوو جار ده‌چوومه‌ خزمه‌تی‌و هه‌ردوو ده‌سـته‌كانیم ماچ ده‌كرد. له‌كاتی گفتوگۆ له‌گه‌ڵیدا هه‌وڵمدا هه‌ندێ له‌رابردووو نهێنیه‌كانی بزانم، كاتێـك بمزانیایـه‌ ته‌ندروسـتی باشـه‌ هـه‌ر پرسیارێك به‌مێشكم هاتبایه‌ لێم ده‌كرد، به‌ڵام هه‌موو كات ئه‌و لـه‌من زانـاتر بـوو، ئـه‌و قه‌سـپه‌ی مـن ده‌مخـوارد ده‌نكـه‌كانی له‌گیرفانی ئه‌ودابون، هه‌موو كاتێك ئه‌گه‌ر پرسیارێكی هه‌ستیارم لێكردبا به‌فه‌ره‌نـسی وه‌ڵامـی ده‌دامـه‌وه‌، پاشـان ده‌یگـوت ره‌فیق ئه‌وه‌ وه‌ڵامی نیه‌ له‌كاتێكدا ده‌یزانی كه‌من فه‌ره‌نسی نازانم. له‌هه‌مانكاتدا من ئه‌وه‌نده‌م سوود له‌و پیـاوه‌ وه‌رگرتـووه‌ كه‌نانوسرێت به‌تایبه‌ت له‌بواری سیاسه‌ت‌و چۆنیه‌تی مامه‌ڵه‌كردن له‌گه‌ڵ بێگانه‌دا. ئه‌و كتێبانـه‌ی كـه‌من بـڵاوم كردوونه‌تـه‌وه‌ ئه‌گـه‌ر ئـه‌م زاتـه‌ له‌ژیانـدا مابـا هیـچیانی نه‌ده‌خوێنـده‌وه‌. چـونكه‌ له‌سـاڵی ١٩٨١دا هـه‌مویم بـه‌ده‌می بـۆ گێڕابوویـه‌وه‌ كـه‌

لەراستیدا زۆر پێخۆشحاڵ بوو، بەڵام رازی نەدەبوو بڵاوی بکەمەوە بەڵکو پێی دەگوتم بینوسەو لەشوێنێکی ئەمینی دابنێ، پاش خۆت هەر کاتێك وختی هات با کوڕەکانت بڵاوی بکەنەوە. جار جارەش ئەگەر پرسیارێکم لێکردباو بەدڵی بووبا ئەوا بەکوردی وەڵامی دەدامەوە, لەو رێگایەوە هەندێ نهێنیم پێدرکاند.

رۆژێکیان پێم گوت: ئینگلیزەکان گوتیان ئێوە دەبن بەحکومەت، بەدوورودرێژی هەموو گفتوگۆکانم بۆ ئینگلیزەکان بۆ گێرایەوەو پێم گوت دەمەوێت رای تۆش بزانم. گوتی: من دەمرمو ئەو حکومەتە نابینم, رەنگە کوڕەکانمان ئەو رۆژە ببینن، لەبارودۆخێکی وەك ئیمرۆدا بەریتانیەکان بەرژەوەندیەکانی خۆیان بۆ هیچ گەلێك تێکنادەن. گوتم بەرای تۆ ئەمریکیەکان یارمتیمان نادەن؟ لەوەڵامدا فەرمووی ئەمریکیەکان تازەکوورەن، رەنگە لەدواڕۆژدا لەوردەکاری کێشەی کورد شارەزا بن ئەو کاتە بایەخی کوردستانیان لەروی داراییەوە بۆ دەردەکەوێت.

رۆژێکیان فەرمووی: (رەفیق من هەموو ژیانم بۆ خزمەتی کوردو کوردستان بووە، تۆ رۆژێکیان لام بووی کەچەند پزیشکێك لەسەرم کۆبوونەوەو دانیشتنیان بۆ کردووم، خۆت ئاگات لێیە کەرایان وابوو من تەنیایم پێوە دیارە، ئەوەش لەدوای نەمانی دایکی سزاو سروشتەوە بەسەرم هات، من لەژیاندا عاشقی سێ شت بووم بەڵام هەرسێکیان دەکەم بەیەك ئەویش کوردستانو کتێبەکانمە. بەداخەوە لەدوای رووخانی مەلەکیەت هێشتا خۆمان نەگرتبوو شۆڕشمان بەرپاکرد، ئەوەبوو لەماوەیەکی کەمدا دووبەرەکی کەوتە ناومانەوە، کەبەیاننامەی ١١ی ئادار بڵاوکرایەوە هەموو بیروبۆچونو هەڵوێستی خۆم لەنامەیەکدا رەوانەی مەلامستەفای بارزانی کرد، داوام لێکرد ئەم دەسکەوتە گەورەیە لەکیس نەدەن ئەویش لەرێگای یەکبوونو یەکریزی ناوخۆتانەوە دەستەبەر دەبێت، بەتایبەت لەگەڵ جەماعەتی ئیبراهیم ئەحمەد، ئەوەبوو یەکیانگرتەوە، پاشان لەساڵی١٩٧٤ شەڕ دەستی پێکردەوە تا ساڵی ١٩٧٥، لەو ساڵەدا ئاشبەتاڵ روویدا کەگەورەترین کارەسات بوو بەسەر کوردا هات، بۆیە ئەو بیروبۆچوونەی پێشتر بەرامبەر مەلامستەفا هەمبوو گۆڕاو، بۆم ئاشکرابوو کەکابرایەك سەرۆکی عەشیرەت بێت ناتوانێت حکومەتی کوردی دابنێتو بەرێوەی ببات. من هەر کاتێك لەگەڵ سیاسەتمەدارێکی بێگانە گفتوگۆم کردبێت یەکەم قسەو دواقسەی ئەوەبووە کە پێویستە خۆتان یەکبخەن ئەوجا داوای یارمەتی لەوڵاتانی بێگانە بکەن. بۆیە ئەم شۆڕشەی ئەورۆ (١٩٨١) لەکوردستان بەرپابوە دڵخۆشکەرەو جێگای باوەڕە، بەمەرجێك بتوانن هەموو کوردێکی ناوچەکە لەدەوری رێکخراوەکەیان کۆببنەوەو یەکریزیان بپارێزن).

جەنابی تۆفیق وەهبی بەگ لەدرێژەی قسەکانیدا گوتی: (رەفیق، چوار ئەفسەرەکە عیزەت عەزیزو مستەفا خۆشناو محەمەد قودسیو خێروڵا کە بەفەرمانی عبدالالە لەسێدارەدران لەوەسیەتنامەکەیاندا ئیشارەتیان بەمەلامستەفا کردووە بەڵام بەناو نا).

کاتێك چوومە خزمەتیو خواحافیزیم لەخۆیو کوڕەکانی کرد کەببوون بەهاورێیەکی دڵسۆزو خۆشەویستم، هەموویان دلگرانی خۆیان بۆ کۆچکردنم دەربڕی، هەزار رەحمەت لەگۆڕەکەت ئەی ئەو پیاوەی هەموو ژیانی خۆت بۆ خزمەتی گەلەکەت تەرخانکرد.

## مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد

هەرچی مامۆستاو برای گەورەو کوردپەروەر ئیبراهیم ئەحمەدە ئەوا سەرەتای ئاشنایەتیم لەگەڵیدا بۆ زەمانی مەلەکیەت دەگەڕێتەوە، ئەو کاتەی پارێزەری جوتیارە چەوساوەکان بوو دەهاتە قەڵادزێ، ئەو کاتە من ناویم بیست پاش ئەوەی ناوبانگی لەناوچەکەدا بڵاوببووەوە، ئەو کاتە دەمم نەبوو قسە بکەم تەنها گوێم دەگرت، بەڵام ئەوەم دەزانی کەمن کوردمو

سەر بەنەتەوەو ولاتێکی داگیرکراوم بۆیە لەکانگای دڵمەوە حەزی کوردایەتیم پەیداکردبوو. سەرەتای ناسینم بەهۆی دوو برای بەرێزەوەبوو کەحەمەسوری مینەعارەبو کوڕی پورم عەلی مام رەزابوو، کەئێوارەیەکی بەهار لەگەڵ چەند کەسێك دەرۆیشتین بەمنیان گوت دوامان کەوە، پاش ماوەیەك گەیشتینە بەردەم پیاوێك کەتەماشای گردی حوسنی دەکرد، ئەو پیاوە دەیویست هۆی ئەوە بزانێت کەبۆچی ناوی ئەم گردەیان ناوە حوسنی! ئەو ئێوارەیە حەوت کەس دەبوین، دیاربوو کەئەم پیاوە عەلیو حەمەسووری دەناسی، کاك عەلی وەڵامی پرسیارەکەی دایەو گوتی: لەسەردەمی دەسەڵاتی تورك لەم ناوچەیەدا، تورکێکی زاڵم خەڵکی ئەم دەڤەرە دەچەوسێنێتەوە بۆیە بابەکرئاغای گەورە دەنێرێت بۆلایو نامەیەکی دەداتێ، هەڵگری نامەکە کەناوی حوسنی بەگ دەبێت لەکاتی خوێندنەوەی نامەکەدا بۆ کابرای تورك، دەیدەنە بەر دەمانچەو دەیکوژن، گوایە لەو گردە کوژراوەو نێژراوە.

رۆژگار هاتو رۆی، من بوم بەیەکێك لەو چوار کەسە نزیکەی مامۆستای خوالێخۆشبوو، ئەم پیاوە لەسەرانسەری کوردستاندا جێدەستی دیاربوو بۆیە کاتێك کۆچی دوایی کرد تەرمەکەی بەو هەموو شکۆی رێزەوە هیندرایەوە خاکی وەتەن تا لەباوەشی دایکی گەورەدا کوردستان ئارام بگرێ. منیش وەك هەر هاولاتیو کوردپەروەرێك لەپێشوازی تەرمەکەیدا بەشداربووم ئەویش بەهۆی برایەکی دڵسۆزی خاوەن ئۆتۆمبێل. لەمەراسیمی ناشتنی تەرمی پیرۆزیدا لەپەنایەك راوەستابووم، ئەوەی تەنیشتم باسی ئیبراهیم ئەحمەدی بۆ خەڵك دەکرد، لەو کاتەدا هەستم بەغەریبی دەکرد! بەهاوسەرەکەم ئێران فەیزوڵا بەگو کچەکەم (رووبار) گوت: بچن سەرەخۆشی لەدادە گەلاوێژخانو دایکی کاکە پاڤڵ بکەن، کاتێك دەگەنە بەردەمی هیرۆخان بەدادە گەلاوێژخان دەڵێت ئەمە هاوسەرەکەی رەفیق پشدەرییە، ئینجا گەلاوێژخان ئەحواڵی من لەهاوسەرەکەم دەپرسێت، خۆشم کاتێك لەپرسەکە هاتمە دەرەوە برای خۆشەویستم دکتۆر لەتیف رەشید کەمنی بینی خۆشحاڵی خۆی نیشانداو ئەملاولای یەکتریمان ماچ کرد گوتی: کاتێك مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد لەنەخۆشخانەبوو ئاگاداریانکردەوە کەرەفیق پشدەری کتێبی نووسیوە، لەناوەرۆکەکەیدا دووجار داوای لێکردوی کەواز لەسیاسەت بێنی، بەڵام مامۆستا گوتبوی: وەڵامی بۆ بنێرن بابنوسێت چونکە زۆر شت دەزانێت.

کاتێك ویستم لەرێگەی دۆستێکەوە جارێکیتر چاوم بەدکتۆر لەتیف بکەوێتەوە، ئەم دۆستە تەگەرەی هێنایە بەر رێی دیدارەکەو لەئەنجامدا نەمتوانی بیبینمو گفتوگۆی لەگەڵدا بکەم. لەبەر هەڵوێستی نامۆی ئەم دۆستە، بڕیارمدا بۆ یەکجاری پەیوەندی لەگەڵدا دابڕم. کاك هەڵۆ یەکێك بو لەوانەی لەگەڵ تەرمەکەدابوو، کاتێك بینیمی زۆر دڵخۆش بوو بانگی هاورێی برای خۆی کردو بەقاو گوتی: ئەمە مامتە وەرە بەپێشوازیەوە.

بەندە لەگەل ئەو بنەماڵەیە تێکەڵاوییەکی زۆرم هەبوو، زۆرمان بەسەر یەکەوە هەیە، رابردوویەکی دوورودرێژو چەند ساڵەمان بەیەکەوە بەسەربرد، بەڵام ئێستا بەنامەش لەگەڵ ئەو بنەماڵەیە بەسەرکردنەوەی یەکترمان نەماوە، بڕیارمداوە ئینشائەڵلا دوای تەواوکردنی بەرگی پێنجەمی زنجیرە کتێبی "کورد دوژمنی خۆت بناسە" کتێبێکی سەربەخۆ لەسەر ئەو پیاوە مەزنە بنوسم، بۆ ئەوەی بتوانم بەتێروتەسەلی باس لەو زاتە گەورەیە بکەم هەروەها بۆ خوێنەری روون بکەمەوە بۆچی ئاشقی ئەو پیاوە مەزنەبووم. بەڵام لێرەدا پێم باشە ئەگەر بەکورتیش بێت هەندێك لایەنی مەزنی ئەو پیاوە بخەمە روو.

ئەم زاتە لەروی زیرەکیو شارەزاییەوە پرۆفیسۆرێکی سەربەخۆبوو، کاتێك لەگەڵ سیاسەتمەدارانی بێگانەی دۆستو دوژمن دادەنیشت دەکەوتنە پرسیارکردن لێیو پێیان دەگوت چی بکەین باشە؟ وەکو قوتابی لەبەردەستیدا بێدەنگو

بەرێزەوە گوێیان بۆ شل دەکرد: لەوانە: یاسر عەرەفات، سالّح مەهدی عەمماش، ئەحمەد ئەمین مەحمود، ناجی تالیب، رەجەب عەبدولمەجید، سەدیق شەنشەل، ئەحمەد حەسەن بەکرو چەندین کەسایەتیی ناسراویتری پایەبەرز.

لەنزیکەوە ئاگاداربووم کەئەو خەلّکە چ رێزکیان لەو پیاوە دەگرتو، من هەموو ئەوەی کەفێری بومو زانیم لەو زاتە پیرۆزەوە بو، هەروەها یارمەتیدامو پشتی گرتم بۆ ئەوەی بمپارێزێت لەهەڵەو لەهەمانکاتدا پێبگەم، بۆیە هەرچەند لەسەر ئەو پیاوە بنوسم کەمە. جارێکیان دوای هەشت سەعات بیرکردنەوەو خۆماندووکردن بۆ دارشتنی نامەیەك بۆ سەرۆکی لیبیا دۆستی دێرینی نەتەوەکەمان، کاتێك نامەکەم تەواوکرد بەمامۆستای خۆم بەرێز ئیبراهیم ئەحمەدم نیشانداو پێم گوت: تکایە مامۆستا چاوێکم بۆ بەم نامەیەدا بخشێنە، کەتەماشایکرد پێکەنیو نامەکەی گۆری, لەبری ئەوە نامەیەکیتری نوسی لەچوار دێر پێکهاتبوو، کاتێك چوومە لای بالوێزی لیبیاو نامەکەم دایە دەستی بەرێزیان نامەکەیان بۆ شوێنی مەبەست بەرزکردەوە، دوایی دلّنیابووم بەهۆی ئەو چوار دێرەی مامۆستا، بالّوێزو حکومەتی لیبیا ئەو رێزە زۆرەیان لەمن گرت.

ئەم زاتە لەگەلّ ئەو پایە بەرزەی کەهەیبوو لەهەمانکاتدا پیاوێکی سادەو ساکاربوو، جلوبەرگو خواردن بەلایەوە هیچ گرنگیەکی نەبوو، زۆر جار پێم دەگوت ئەو جلوبەرگە لەتۆ نایەت، دەیگوت دەلّێی تۆو کاك تەها محێدین بران، چونکە هەردووکتان حەز بەجلوبەرگی جوان دەکەن. چەند جارێکیش بەیەکەوە لەدوای چوونە دەرەوەمان لەمالّەوە پێم فەرمووە کەبرسیمە بابرۆین لەم چێشتخانەیە نان بخۆین، دەیفەرموو برسیتە یان حەز دەکەی کرێکارەکانی ئەو چێشتخانەیە لەخزمەتت راوەستن، وەرە بابچینە ئەم لاکۆلانە، خواردنەکەی لە ٨٠٪ هەرزانترە، ئەم پیاوە بەجۆرێك رەفتاری لەگەلّ دەوروبەری خۆیدا دەکرد واتدەزانی لەهەموویان بچووکترە.

خەمی هەرەگەورەی ئەو پیاوە، تەنهاو تەنها رزگارکردنی کوردستان بوو, بەجەستە لەلەندەن دەژیا بەلام بەگیانو دلّ لەکوردستاندا بوو. رۆژێکیان سەعات دووی پاش نیوەرۆ لەمالّی ئەوان لە WALTIONG لەهۆلّەکە دانیشتبووم، مامۆستا لەمەدبەخەوە بانگیکردم گوتی: بیستوومە لەکوردستان زۆر گەراویتو زۆربەی شوێنەکانیت بینیوە، ناوی گوندێکی کوردستانم پێ بلّێ کەجوان بێت وەکو ئەو نمە بارانەی ئێستا لەدەرەوە بەسەر ئە دەرختە سەوزەو گلّە پاکو گولّە جوانانە دەبارێت. منیش هەرچەند بیرم کردەوە کە لەکوردستاندا چ گوندێکم بینیوە کەوەکو ئەم دیمەنە سروشتییە جوانو سەرنج راکێش بێت هیچم بەخەیالّدا نەهات، مامۆستا گوتی ناخۆشترین گوند لەکوردستان کەهاتبێتە بەرچاومو تەنها بۆیەك شەو تیا مابمەوە گوندی (...)ـە، بەلام هەموو ئێرە بەقوربانی ئەو گوندە ناخۆشە بێت، رەفیق پێت وایە رۆژێك دابێت کوردستان سەربەخۆ بێتو مالّی ئێمە لەو گوندە بێت!

ئەو پیاوە مەزنە ئەوەندە کەسێکی رۆشنبیربوو ئەگەر پارەی بەشی نانخواردنی رۆژێکی لەگیرفاندابا نیوەی دەدا بەکتێب، شەوێکیان دووبەدوو لای کاك عەلی کەمال دەگەراینەوە، لەناو پاسێك لەتەنیشت یەك دانیشتبووین باسی کوردستانمان دەکرد، لەو کاتەدا جابیەکە پێی گوتین: ئێو دەبوو لەوێستگەی ڤیکتۆریا دابەزینایە، بەلام سێ خالّ لەو ویستگەیە تێپەرین کەچی دانەبەزین، دەمۆچاویشتان لەوە ناکات بۆ پارەکە بێ! مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد وەلامی دایەوە تاپارەکەی بداتێ، کچە جابیەکە گوتی من بۆ پارەم نەبوو, ئێمە هەر دەگەرێینەوە ڤیکتۆریا ئەو کات دابەزن، پاشان بەمامۆستام گوت تۆ چیت بەو سەرئێشەیە داوە، واللە ئەگەر بەندە دەستی شیعرم هەبوایە یان دەستی نووسین ئەوا هەرگیز سیاسەتم نەدەکرد، مانەوەی تۆ لەلەندەن گومت دەکات, جێگای شیاوی تۆ شاخە بەرزەکانی کوردستانە. بۆیە کاتێك گەیشتمەوە ناوزەنگ بارەگای سەرکردایەتیی یەکێتی، بەناوی مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەدەوە ئاگاداری مام جەلالو کاك نەوشیروان مستەفام کرد

پێشمەرگەیەکی ئاسایی ژیان بەسەر بەرێت.

دوایی لەرێگای کاك شازاد صائیب وەڵامی مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەدم دایەوەو پێم راگەیاند کەمامو کاك نەوشیروان دەڵێن ژیان لێرە زۆر سەختەو، لەترسی دوژمن زووزوو لەم شاخ بۆ ئەو شاخ دەگوازینەوە، ئێرە بەهیچ شێوەیەك بۆ ژیانی مامۆستا ئیبراهیم ناشێت.

رۆژێکیان مامۆستا پرسیاری لێکردم گوتی: من هەموو شتێکی تۆ دەزانم، نهێنیت نەماوە لای من ئاشکرا نەبێتو، باشیش دەزانم رۆژێك لەرۆژان یاداشتنامەکانی خۆت تۆمار دەکەیتو هەرچییەك دەربارەی من دەنووسی گەردنت ئازابێت، بەڵام حەز دەکەم دڵی خۆتم بۆ بکەیەوە تا بزانم چی لەدڵتدایەو شەرم دەکەی پێم بڵێیت، لەو رۆژەوەی دەستت داوەتە سیاسەت کام رۆژو ساڵەت بەردەوام لەبیرەو لەیادت ناچێت؟ ئازارو ئەشکەنجەی سەدام حسەینە یان چیە؟ زۆر خۆشحاڵ دەبم ئەو راستیانەم پێ بڵێیت.

گوتم: ئەوەی بیری لێدەکەمەوەو هەرگیز لەیادم ناچێت، ئەوە نیە کەسەدام حسەین ئازارو ئەشکەنجەی داوم، چونکە من توانیومە تۆڵەی لێبکەمەوەو چی خراپە بەرامبەری کردوومە. من ئەوەی بیری لێدەکەمەوەو خەفەتی پێوەدەخۆم ئەوەیە کەماوەیەکی دوورودرێژی تەمەنم بەخۆڕایی رۆیشت، ئەویش جەنابتو هەموو برادەرانی ئێرە ئاگادارن لەیەکەم رۆژی کەکاك حلمییو مام جەلال تەشریفیان هێنا بۆ بەغداد تا لەگەڵ عەبدولرەحمان عارف رێکبکەون، تاکو ئەو رۆژەی بەیاننامەی ١١ی ئادار دەرچوو تا دوای ئەوەی کەئێوە خۆتان بەدەستی خۆتان رێکخراوکەتان تواندەوەو چونە پاڵ شۆڕشی مەلامستەفا, لەو کاتەدا ئێوە داواتان لێکردم کەبۆ بەرژەوەندی گشتی لەگەڵ حکومەتو لەناو دامودەزگای ئەمنیدا بمێنمەوە، دوای سێ ساڵ مام جەلال رووبەڕوو پێی گوتم لەرێگەی خۆتەوە راستەوخۆ پەیوەندی بەخودی مەلامستەفاوە بکە، راستە بەهۆی ئێوە بەتایبەتی جەنابت توشی هیچ هەڵەیەك نەبوومو خەڵکێکی زۆرم ناسی بەتایبەتی سیاسەتمەدارانی عەرەبو خزمەتێکی زۆری میللەتی خۆم کرد، بەڵام لەساڵی ١٩٦٦ەوە تا ئاشبەتاڵی ساڵی ١٩٧٥ هەموو ئەوەی لەو ماوەیەدا کردمان بەباچوو، چونکە بنەماڵەی بارزانی توانییان سەرکەوتن بەدەست بهێننو سەروەتو سامانێکی زۆر کۆبکەنەوە، بەڵام من بەپێچەوانەی ئەوان، ئەوەی لەحکومەتیش دەستم دەکەوتو لەگەڵ ئەوەی هەمبوو لەپێناوی بارزانیدا سەرفمکرد.

مامۆستا ئیبراهیم گوتی: رەفیق لەبیرتە ساڵی ١٩٦٧ پێم گوتی مەلامستەفا سەرکەوێتو ژێرکەوێت کورد نامێنێت، بەیانیەکەی هاتیەلامو نانی بەیانیمان بەیەکەوە خواردو هەوڵێکی زۆرم لەگەڵ دای تا بڕوات بەو قسەیە پێبێنم، ئێستا ساڵی ١٩٨١ەو وا دیارە بڕوات بەو قسەیە هێناوە!! دوای ماوەیەك گفتوگۆ، بێ ئەوەی تەواو قایلبم بێدەنگیمان لەباسەکە کرد، بەڵام ئەوەی لەساڵی ١٩٩٦دا روویدا وای لێکردم بڕوا بەقسەکانی مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد بکەم چونکە کارەساتی ٣١ی ئاب وای لێکردم بەروونی بڕوا بەوە بێنم کەهەم سەرکەوتن هەم تێکشکانی بارزانی، تیاچونە.

پێش ئەوەی لەندەن بەجێبێڵم چومە خزمەت مامۆستا ئیبراهیمو بنەماڵەکەی، یەکە یەکە خواحافیزم لێخواستنو سوپاسکردن کەئەو ماوەیە بەم جۆرە میوانداریيان کردمو رێزیان لێگرتم کەڕەنگە لەو ماوەیەدا زیاتر لە ١٥٠ جار یەکتریمان بینیبێ، لەکاتی خواحافیزیدا دوعای تەمەندرێژیو بەختەوەریم لەدڵێکی پاکەوە بۆ دەخواستن، بەتایبەتی بۆ مامۆستاو مامی دڵسۆزو خۆشەویستم ئیبراهیم ئەحمەد.

**دکتۆر لەتیف رەشید**

کە لەفرۆکەخانەکەی هیپرۆ لەلەندەن دابەزیم، کاکە هەڵۆی کوڕی مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد بەدکتۆر لەتیفی ناساندم کەلەم کتێبەدا زۆر ناوی ئەو زاتەم هێناوە بەڵام ئەو
گەلێك لەوە زیاترە پێویست بەمن بکات باسی بکەم.

دکتۆر پیاوێکی رۆشنبیرو سیاستمەدارە، یەکەم دانیشتنمان لەچێشتخانەیەکدابوو لەگەڵ هەندێك لەبیانیە ئینگلیزەکان دانیشتین کەپێشتر لەم کتێبەد باسمکرد، لەکاتی وتووێژ پرسیاریان لێکرد خەڵکی چ شارێکیت لەئینگلترا؟ گوتی من کوردم، دوبارە هەمان پرسیاریان لێکردەوە، ئەمجا گوتی: تەمەنم ١٧ ساڵان بوو کە بەنیازی خوێندن هاتم بۆ ئینگلترا، ئێستا ئەندازیارم، بەڵام من کوردمو لەدایکبووی سلێمانیم لەکوردستانی عێراق. من پێم سەیربوو کەبۆچی ئینگلیزەکان ئەو پرسیارەیان لەدکتۆر کرد، بەڵام کاتێك گوتیان ئەمە یەکەم جارە مرۆڤێکی بێگانە کەخەڵکی ئێرە نەبێت بەم جۆرەی تۆ بەزمانی ئینگلیزی بدوێت، بڕوات هەبێت ئینگلیزیەکی رەسەنی خەڵکی ئێرە ئاوا رێکوپێك قسە ناکات. ئەو ئینگلیزیە باشەی دکتۆر ببوو بەکیشەیەکی گەورە بۆ من، چونکە ئینگلیزیەکەی من لەچاو هی ئەو دووکەڵی دەکرد، هەرکاتێك پێکەوە دانیشتنمان لەگەڵ ئینگلیزەکان بکردبا من تەنها گوێم دەگرتو وەڵامی هیچم نەدەدایەوە ئەگەرچی باشیش لەپرسیارەکان تێدەگەیشتم. ئەو هەموو ماوەیەی لەگەڵ ئەو بەڕێزانە پێکەوەبووین بەبێ فەرمانی ئەوان نەجوڵامەوە، بۆ نموونە یەکەم جار لەلەندەن لەئاپارتمانێك بووم، بەرێز د.لەتیف پێی گوتم: لەبەرەئەوەی فلانە کەس بەئێرە دەزانێ پێویستە بگوازیەوە، نابێت لەگەڵی دابنیشیت، بۆیە بەیانیەکەی زوو لەو شوێنە گواستمەوە.

ئەو برا دڵسۆزە بەفەرمانی مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەدو مام جەلال لەهەموو روێکەوە کۆمەکی دەکردمو هەمیشە بەیەکەوە بووین، بەڵام لەپرسەکەی مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەددا چاوەڕوانی ئەوەم دەکرد بۆ پێنج دەقەش بەسەرم بکاتەوە، بەڵام لەبەرئەوەی زانیبووی من یەکێتی نیمو سەربەخۆمو وردە وردە دەستمکردوە بەنوسینی ئەو نهێنیانەی دەیانزانم، لەهەمانکاتدا کابرایەکی لێقەوماوو دەستکورتمو خاوەنی دوانزە سەر خێزانمو لەیەك خانوودابن، خۆی لێ بەدوور دەگرتم. هەروەها گومانم نیە لەوەی کەجەنابی مامۆستای خوالێخۆشبوو کاتێك فەرموبووی تەلەفۆن بۆ من بکە من وا دەکەم یەکتر ببینین، هەر د.لەتیف وایکرد ئەو کارە سەرنەگرێ، هەرچەندە (أن بعض الظن أثم). ئەو ماوەیەی لەخزمەت کاکە لەتیفدابووم یارمەتی زۆری دام و پێمەوە ماندوو بوو، هەمیشە ئۆتۆمبێلو ماڵەکەی بۆ من لەهاتوچۆو بەردەستدا بوو، هەرچەندە من کتێبەکانم بۆ نارد بۆ ئەوەی بیخوێنیتەوە بەڵام ئەو بابەتەکانی لەمەڕ دوای ساڵی ١٩٨١ی دەیخوێندەوە چونکە هەر هەموو نهێنیەکانمی بەدوورودرێژی دەزانی.

## کاك عەلی کەمال

ئەو پیاوە یارمەتی زۆری هەژارو لێقەوماوانی کوردی داوە، بەتایبەتی خوێندکارە کوردە ئاوارەکانی لەندەن. زۆر خوێندکاری لەدەرەوەی وڵات پێگەیاندوە، بۆیە هەرچەند لەسەر خانەدانی ئەو پیاوە بنوسین تەواو نابێت.

دوای گەیشتنم بۆ لەندەن بەحەوت رۆژ, مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەدو کاك عەلی کەمال تەشریفیان هێنا بۆ لامو، لەو ماوەیەی کە لەلەندەن بووم هەموو هەفتەیەك دوو یان سێ جار یەکترمان دەبینی بۆیە زۆر چاك شارەزای نهێنیەکانی ژیانی یەکتربووین، ئەگەر ئێستا لەژیاندا مابێ و کتێبەکانی منی کەوتبا بەردەست ئەوا دڵنیام لەدوای ساڵی ١٩٨١ەوە دەیخوێندەوە چونکە هەموو ئەو شتانەی ئەو کاتە دەمزانی بۆیم گێڕابووەوە. ئەو پیاوە دەیزانی من رۆژێك لەرۆژان یادداشتەکانی خۆم بڵاودەکەمەوە، بۆیە رۆژێکیان پێی گوتم: کوڕە رەفیق کەمردیشم نهێنییەکانی من بڵاو مەکەرەوە، بۆ

سەباحی کورم زۆر خراپە. لەو کاتەدا دەستی بۆ ئەو دوو کەسە درێژکرد کەدانیشتبوون، تا ئێستاش یەکێکیان لەژیاندا ماوە، لەوەڵامدا گوتم: لەقینی سەباح و سزاو سروشت هەرچی دەیزانم لەسەر تۆو مامۆستا تۆفیق بەگ دەینوسم و بلاوی دەکەمەوە. گوتی: کەگیرابوی یەکەم جار لەوە دەترسام باسی نهێنییەکانی من بکەی و بەگرتم بدەی، وەڵامم دایەوە گوتم: ئەو نهێنیەی تۆ کەدەمزانی و نەمدرکاند یەکێکە لەو هەزار شتەی لەگەڵ خۆمدا پاراستبووم.

پاشان بەکاک عەلیم گوت من بەدووروردرێژی ئەوەم خستە بەردەم مەکتەبی بارزانی کەدەتوانم بەپارەیەکی زۆر چەند سەرکردەیەکی رژێمی بەعس بۆ لای خۆمان رابکێشین و لەرێگای ئەوانەوە کێشەی کورد بەرەو چارەسەرکردن بەرین، لەراپۆرتەکاندا ئەوەم بەبارزانی راگەیاندبوو کەئەم کارە لەگرتنی هەولێرو سلێمانی گرنگترە، بەلام رای مەکتەبی بارزانی ئەوەبوو ئێمە بەبەرتیل مافی کورد وەرناگرین، ئێمە شۆڕشمان هەیەو بەهێزی پێشمەرگە ئەژنۆ بەخەڵکی عۆجەو تکریت دادەدەین، ئەو پارەیە بەسەر خێزانی پێشمەرگەدا دابەش دەکەین، من تا دوای ئاشبەتاڵ و دەرچوونی کتێبەکەی د.مەحمود علی عوسمان لەساڵی ١٩٧٧ ماهیەتی ئەو بنەماڵەیەم بۆ دەرنەکەوتبوو و نەمدەزانی ئەوانیش وەکو ئاغاکانی عۆجە، پارەو دەسەڵات لایان هەموو شتێکەو ئەوەی لای ئەوان حیسابی بۆ
نەکرێت خێزانی پێشمەرگەو جەماوەرە.

کاکە عەلی گوتی: من نەمدەزانی کە لەرێگای پارەوپوولەوە دەمانتوانی ئەو کارە ئەنجام بدەین، هەروەها نەشمدەزانی کە لەرێگای تۆوە دەتوانین بەم کارە هەستین، وەڵلاهی من درەنگ بەم شتەم زانی دەنا ئامادەییم تێدابوو بۆ ئەم مەبەستە ملیۆنێك تا دوو ملیۆن دینارت بدەمێ. کاتی خۆی بەرێز کاك عەلی کەمال داوای لێکردبووم کەزەعیم سدیق تیرۆر بکەم چونکە دەستی بەخوێنی گەلی کورد سوورببوو، هەروەها ئازارو ئەشکەنجەیەکی زۆری خەڵکی دەداو خەڵکێکی بێتاوانی زۆری زیندەبەچاڵ کرد، بەمەبەستی تیرۆرکردنی ئەم تاوانبارە زۆر خۆم لێ نزیککردەوە زۆر سەردانیم دەکرد، دەمویست لەدوای تیرۆرکردنی مەترسی بۆ سەر خۆم و کەمالی برام نەبێت، چونکە ئەو خزمەتە جۆراوجۆرەی کەمن بەشۆڕشم دەکرد، گەلێ گەورەتربوو لەتیرۆرکردنی تاوانبارێك، لەهەمانکاتدا ئەم کابرایە ماڵەوەی بەبێ ژمارەیەك پاسەوان جێنەدەهێشت، بۆیە تەنها رێگای تیرۆرکردن ئەوەبوو بۆی بچمە ماڵەوەو لەکاتی میوانداریدا بیکوژم، کەئەم کارەش لەسەدا سەد بەم شێوەیە ئاشکرا دەبوو، بۆیە دەبوو راکەین و ریسەکەمان بکەینەوە بەخوری.

**تێبینی**

*کاتێك لەتەمموزی ساڵی ١٩٦٨ بەعسیەکان هاتنە سەر حوکم ماهیەتیان بۆ خەڵك دەرکەوت و خاڵی لاوازییان بەئاشکرا زانرا کەبریتی بوو لە پارەو جنس، من لەگەڵ دوەمیان بەهیچ جۆرێك پەیوەندیم نەبوو، هەرچی پارەیە ئەوەبوو کاریگەری بەسەر بەعسیەکانەوە لەوە سەرچاوەی دەگرت کاتێك ئەوان هاتنە سەر دەسەڵات بەشی هەرە زۆریان هەژاربوون و دەتوانم بڵێم هیچ نەبوون، من لەو کاتەدا ژمارەیەکی زۆریانم دەناسی و توانیم لەرێگای ماست و پەنیرو هەنگوین و گوێزو جارجارە فەرش، خۆمیان لێ نزیك بخەمەوە، پاشان دەستیانکرد بەپارە کۆکردنەوەو کۆمپانیادانان، من وامزانی کەئیتر تێریان خواردو گیرفانیان پر بوو کەچی دوایی بۆم دەرکەوت ئەوان هەر دەڵێن (هل من مزید)، پاشان رۆژگار هات و رۆیشت و هەموو گەلی عێراق بۆی دەرکەوت ماهیەتی بەعس پارەو سێکس و دەسەلاتە، بۆ نموونە چەند جارێك نازم گزار دەیگوت کاکە رەفیق: ئەمانە کەی تێر دەخۆن؟ سەرکردەیەکی تری بەعس رۆژێکیان گوتی: پارچە ئەرزێك لەگەرەکی مەنسوریە هەیە*

*بەناوی عەبدوڵلا لوتفیە، بزانە پێی ناڵێیت بمداتێ چونکە من خزمەتی کوردم زۆر کردوەو ئامادەم خزمەتی زۆر زیاتریش بکەم.*

*ئەو تازە دەوڵەمەندانەی ئێستا پەیدابوون دەستکردی بەعسن، خەڵکی وا دەناسم ١٤ ملیۆن دۆلاری جێهێشتو کەس هەر باسیشی ناکات.*

هەزار رەحمەت لەگیانی پاکت کاکە عەلی کەمال, ئینشائەللا جێگای ناوەراستی بەهەەشتە.

لەکاتێکدا ئەوەم دەربارەی خوالێخۆش بوو دەنووسی لەرۆژی هەینی لەبەروری لەکام مزگەوت نوێژ بکەین، وەلامم دانەوە گوتم دەچینە مزگەوتی عەلی کەمال.

## عومەر مستەفا ناسراو بەعومەر دەبابە.

برادەران بەگشتی ناویان بەکاکی کاکان دەهێنا، ئەوەش لەخۆشەویستیو رێزەوەبوو. ئەو پیاوە مامۆستایەکی رۆشنبیرو نیشتمانپەروەرو سیاستمەدارێکی ناسراوبوو، چالاکیو فیداکاریو خۆبەختکردنی ئەم زاتە داستانێکی سەربەخۆیە کەمن بەکورتیو بەچەند دێرێك باسیدەکەم، ئەوەی کاکە مەم لەکتێبی یەکەمیدا لەسەر ئەو زاتەدا بلاویکردۆتەوە زۆر کەمە, ئەوەی یەك رۆژ لەنزیکەوە لەگەڵ ئەم زاتە ژیابێتو شارەزای رابردوی بووبێت دەزانێ کە بەکتێبێکی سەربەخۆ تەواو نابێت، هەرچەندە من لەبەرگی یەکەمو دووەمدا باسمکردوە بەلام دووبارە باسی لێوە دەکەمەوە.

کاتێك گەیشتمە لەندەن دووەم ماڵ کەسەردانیم کرد ماڵی خوشکی گەورەو بەرێزم سورەیا خانی کچی مەلای گەورەی کۆیەبوو، دوای چەند رۆژێك کاکە عومەر تەلەفۆنی بۆ کردمو دوای سلاوو رێز پێی گوتم سەردانی سورەیاو منداڵەکانیت کردوە؟ گوتم دووەم ماڵ سەردانی ئەوانم کردوە، نانی بەیانیو نیوەرۆو ئێوارەم لەگەڵ خواردون ئینجا گەڕاومەتەوە ماڵەوە. کاکە عومەر هەرکاتێك چووبا بۆ دەرەوەی لەندەن لەکاتی گەڕانەوەیدا یەکسەر پەیوەندی پێوەدەکردم، کاتێکیش کۆچی دوایی کرد کاکە نەبەزی کوڕی گەڕایەوەو سەردانیمکرد، زۆر تەماشایکردمو نەیناسیمەوە هەتا لەپڕ پێم گوت من رەفیق پشدەریم، بەدڵێکی پڕ لەگریانەوە گوتی ئەوە مامە رەفیقە!

## تێبینی

*لەسەرەتای گەڕانەوەی بارزانیدا لەهەموو دانیشتنێکدا باس باسی عومەر دەبابە بوو، چونکە بارزانی زۆر پێی موعجیب بوو، بەلام دوای دووبەرەکیەکە, بوو بەعومەر تەنەکە. تا ئێستا کەسانێك هەن قسەی ناشیرین بەم سەرکردە کوردە دەڵێن، ئەمانە جۆرە خەڵکێکن هەقو ناهەق جودا ناکەنەوەو هەموو خەمێکیان کۆکردنەوەی پارەو دەسەلات گرتنەدەستە، هەروەها رازیکردنی مەسعودو نێچیرڤانی سەرۆکیان هەر بەو پێیەی کەبارزانی پێرەوی دەکرد، بەلام من لەیادی ئەم شۆرەسوارەدا دەڵێم هەزار رەحمەت لەگیانت ئەی کەڵەپیاوی شۆرشگێڕو گەورە.*

## ڕۆیشتنم بۆ سوریا

کاتێك لەفرۆکەخانەی سوریا دابەزیم برایانی بەڕێز کاك شازاد سائیب[١٠] و کاك ئاوات عەبدولغەفور[١١] و دارۆی شێخ نوری پێشوازییان لێکردم، لەسەر داوای خۆم گوتم لەبەرئەوەی ئێستاش دوو هەزار پاوەنم پێماوە دەچمە ئوتێل، بەبانیەکەی کاك شازاد صائب تەشریفی هێنا بەشوێنمدا بۆ ئەوەی نانی نیوەڕۆ پێکەوە بخۆین، بەلام لەپرسگەی ئوتێلەکە چوار کارمەندی ئاسایشی سوریای لێبوو, پاش ئەوەی کەناوی منیان پرسی بردمیان بۆ بەڕێوەبەرایەتی ئاسایشی گشتی سوریا، هەرچەندە کاك شازاد هەولیدا کەمنیان لەدەست دەربهێنێت بەلام بەقسەیان نەکرد، لەوێ کاربەدەستێکی ئاسایش بەتوندی گوتی: تۆ لەلەندەنەوە لەلایەن موخابەراتی عێراقیەوە نێردراوی، ئێمە هەموو زانیاریەکمان لەسەر تۆ هەیە، بۆیە واباشە خۆت دان بەتاوانەکاندا بنێی دەنا تووشی ئازارو ئەشکەنجەی زۆر دەبی. گوتم راستە من لەموخابەرات بووم بەلام لەساڵی ١٩٧٦ەوە لەلایەن رژێمی عێراقەوە گیرام‌و، کاتێك لەلەندەن بووم سەردانی باڵوێزی سوریام کردوەو خۆم پێناساندوە، چوار رۆژ پێش ئێستا ملحق العسکري السوري لەلەندەن هاتە لامو سەردانی کردمو داوای لێکردم کەبەیانیەکەی پێکەوە بچین بۆ سوریا، بەلام من لەبەر چەند هۆیەك نەمتوانی ئەو کاتە بەقسەی بکەم, لەو کاتەدا ژمارەی تەلەفۆنی ملحەقەکەم دایێ بۆ ئەوەی خۆی تەئکید لەو مەسەلەیە بکات، هەروەها پێم گوت: پاشان من کادرێکی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانمو ئەو برایانەی دوێنێ پێشوازییان لێکردم نوێنەری یەکێتین لێرە, من لەدەستی رژێمی بەعسی عێراقی رامکردووە ئێستا ئێوە ئاوا پێشوازیم لێدەکەن؟ دوای چوار سەعات منیان بەردا بەلام ئەو شتانەی کەپێم بو هەر هەموویان بەسەر خۆیاندا دابەشکردبوو کەهەموویان کەلوپەلی زۆر چاك بوون، بۆیە دەستم کرد بەکۆکردنەوەیان و یەك شتم بەجێ نەهێشت، ئینجا داوای بەرتیلیان لێکردم, منیش گوتم خۆشم سیخوڕم فلسێك نادەم. دوای ئەوە چوار مانگو دە رۆژ لەسوریا مامەوە.

### ئاگاداری

کاتێك لەلەندەن بوم، جارێکیان مام جەلالم بینی فەرمووی: ئەگەر ڤیزەت هەبایە لەگەڵ خۆم بۆ ئێرانم دەبردی. بەلام لەبەر ئەوەی ڤیزەم نەبوو نەمتوانی لەگەڵیدا بچم، بۆیە بەنیازی وەرگرتنی ڤیزە لەسوریا سەردانی باڵوێزخانەی ئێرانم کرد لەدیمەشق.

سەرەتا وامدەزانی وەرگرتنی ڤیزەی ئێران لەرێگەی باڵوێزی ئێرانییەوە کارێکی ئاسانە، چونکە ئەمە یەکەم جاربوو سەردانی بارەگایەکی رەسمیی حکومەتی ئێرانی بکەم بۆ کارێکی خۆم، بەلام پاش ئەوەی ١٥ جار باڵوێزی ئێرانم بینی بۆ وەرگرتنی ڤیزە بێسوود بوو، ئەو کابرایە هەرچەندە هەتا سەردانی باڵوێزم بکردبا بەپیرمەوە دەهاتو پێشوازی گەرمی لێدەکردم بەرادەیەك کاتێك دوو کوردی لێقەماو هاتن‌و بینییان بەرپرسی باڵوێزخانەی ئێران ئاوا پێشوازیم لێدەکات، گوتیان دیارە دەسەلاتت زۆرە بۆیە ئاوا بەگەرمی پێشوازیت لێدەکەن، هەر ئەم کابرایە هەموو جارێك کەپێم دەگوت ڤیزەم

---

[١٠] شازاد سائیب: دەرچووی کۆلێجی ماف، تێکۆشەرێکی شۆڕشگێڕو چاونەترس، زیرەك‌و رۆشنبیرێکی خۆڕاگرِ، نیشتمانپەروەرو سیاسەتمەدارێکی ناسراوی کوردستانە، لەبنەماڵەیەکی ناوداری شاری سلێمانییە.

[١١] ئاوات عەبدولغەفور: پیاوێکی زیرەك‌و ئازاو نیشتمانپەروەرو رۆشنبیر بوو، لەبەندیخانە یەکترمان ناسی، لەناوزەنگ یەکترمان گرتەوە لەسوریاش کەوتینەوە لای یەك، لەبەندیخانەدا نموونەی خۆڕاگری بوو لەدەرەوەشدا نموونەی شۆڕشگێڕی. پرشنگ خانی هاوسەری لەبەندیخانەدا لەناو خوشکانی تردا دیار بوو لەچالاکی‌و خزمەتگوزاریدا، وەختە بڵێم گەلێك لەئاوات بەوەفاترە.

دەوێت هەر دەیگوت (چشم)، هەر زووش دەیگوت (فردا). بۆیە ڤیزەکەیان هەر بۆ نەکردم لەگەڵ ئەوەی چوار مانگ هاتوچۆم کردن بەڵکو بەم هەفتە ناهەفتەکەی تر خۆیان لەم کارە دەدزیەوە. لەو رۆژەوە من بڕیارمدا جارێکی تر بۆ هیچ کارێك روو لە باڵوێزی ئێرانی نەکەم‌و، بەبرادەرەکانی خۆمم گوت: با بەهەمووومان یەکێك بدۆزینەوە تاکو تێمان بگەیەنێت وشەی (چشم‌و فردا) لە چ کاتێکدا بەکار دێت‌و بۆ وا شوومن. باڵوێزی ئێرانی ئەو کات ناوی محتشمی بوو کەدوایی بوو بەوەزیری ناوخۆی کۆماری ئیسلامی‌و، لەبەرئەوەی کابرایەکی توندڕەو بوو لەکار دوورخرایەوە. ئەو چوار مانگەی سوریا زۆر بەخۆشی‌و کامەرانی بەسەرچوو، ئەویش بەهۆی ئەو برا بەڕێزانەی لەوێ بوون، وەکو د.مەحمود عەلی عوسمان[١٢] و ئاوات عەبدولغەفورو مالی د.خالید حەمەسەعیدو مالی د.فواد مەعسوم‌و خوشکە نەرمین عوسمان خوشکی شەهید جەعفەرو عەزیز عەقراوی کەمیوانی حکومەتی سوریا بوو لەیانەی سەربازی دابەزی بوو و هەر بەهۆی ئەمەوە عەبدوللا ئۆجالانم ناسی، بەڵام ئەو کاتە شارەزاییەکی باشم لەسەری نەبوو. لەو کاتەدا (١٩٨١) تازە ناوی پارتی کرێکارانی کوردستان بڵاودەبۆوە.

لەسوریا زۆر ئێوارە لەگەڵ د.شادمان مەستی پێکەوە دەچووینە چایخانەیەك دادەنیشتین. شەوێکیان خاوەن چایخانەکە هاتەلامان گوتی دەمەوێت چەند پرسیارێکتان لێبکەم، چونکە بەراستی سەرم لەئێوە سوڕماوە، من ئێوە هەر پێکەوە دەبینم، بەیەکەوە دەڕۆن‌و بەیەکەوە دێنەوەو بەیەکەوە قسە دەکەن، توخوا پێم نالێن ئێوە چ کارەن‌و کێن؟ پێمان گوت: ئێمە کوردی عێراقین‌و لەترسی رژێمی بەعس هەڵاتووین‌و هاتین بۆ ئێرە، کاتێك لێرە دادەنیشین باسی رژێمی عێراقی دەکەین یەکمان خۆی بەدکتاتۆر سەدام‌و ئەوەی‌ترمان خۆی دەکات بەئۆپۆزسیۆن. کەکابرا ئەوەی بیست زۆر کەیفی پێمان هات.

لەبارەگای یەکێتی لەسوریا چەند کەسێکمان لەخۆمان کردبوو بەلێپرسراوی هەمیشەیی، من عایدی خواردن ئامادەکردن بووم، هەر کادیرێك لەدەرەوەی سوریا هاتبا دەبوو لەوێ نان بخوات. هەندێك لەو کادیرانەی دەهاتن لەترسی بۆڵەبۆڵی من ئەگەر لەدەرەوەش نانی بخواردبا کاتێك دەهاتە لای ئێمە دووبارە نانی دەخواردەوە. هەرچی د.شادمان بوو لێپرسراوی قاپ‌وقاچاخ شتن بوو، جاری وابوو ئەوەندە بێزار دەبوو پێی دەگوتم رەفیق گیان خواردن لێ مەنێ، هەفتەی یەك جار نان دەخۆین بەسە.

ئێوارەیەکیان کابرایەك هاتە بارەگای یەکێتی داوای منی کرد، منیش لەگەڵیدا چووم، پاش ماوەیەك کەگەڕامەوە باش بوو ئەندامێکی مەکتەبی سیاسی لێبوو، ئەویش برای بەڕێز کاك عومەر دەبابەبوو کە لەماڵی خوالێخۆشبوو د.خالید حەمەسەعید دابەزیبوو. منیش ئاگادارمکرد کەئەم کابرایە بۆچی هات بۆ لام‌و بۆ کوێ چوو، پێم گوت ئەم کابرایە نێردراوی (مدیرية المخابرات العامة)ی سوریا بوو منی بۆیە برد، لەوێ داوای ئەوەیان لێکردم کەبۆ یەکجاری لێرە بمێنمەوەو ببم بەسیخوڕی رژێمی سوریا، پێم گوتن ماوەی چوار سەعات گفتوگۆم لەگەڵدا کردن بۆ ئەوەی بڕوایان پێ بێنم کەمن ناتوانم

---

[١٢] دکتۆر مەحمود عەلی عوسمان: دەرچووی کۆلێجی پزیشکی، مرۆڤێکی رۆشنبیرو نیشتمانپەروەرو سیاستمەدارێکی ناسراوە. کاتێك لەسوریا بوو هەفتەی دوو جار دەمبینی‌و نانم لەماڵی ئەودا دەخوارد، چ خواردنێکم بەدڵ بوایە بۆیان ئامادە دەکردم. یەکێك گوتبووی: تۆ ئەندامی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانیت کەچی دەبینم ئەوەندەی سەردانی دکتۆر مەحمود دەکەیت ئەوەندە سەردانی ئێمە ناکەی. پێم گوت: خێزانی دکتۆر مەحموود کچی کاکە زیادئاغایە، باوکی لەپاریسەوە تەلەفۆنی بۆ کردووە کەمن دێمە سوریا دەبێت چاودێری‌و خزمەتم بکەن، هەروەها گوتبووی: ئێمە قەرزاری رەفیقین‌و هەرچەند خزمەتی بکەین لەچاکەی دەرناچین. دکتۆر مەحموود دەیگوت: ئەگەر شوقەکەمان بچووك نەبوایە بۆ یەکجاری میوانداریمان دەکردیت، بۆیە داوای لێبوردنت لێدەکەین.

ئەم کارە بکەم، بۆیە کاتێك دڵنیابوون من نابمە پیاوی ئەوان گوتیان: دوای ٤٨ سەعاتی‌تر دەبێت سوریا بەجێ بێڵیت. کاك عومەر کەزانی وەزعەکە چۆنە بڕیاریدا ٢٠٠٠ دۆلارم بۆ سەرف بکات، هەر ئەو شەوە چوومە الخطوط الجویة البولندیةو بلیتێکم کڕی بە ٧٠٠ دۆلار، بەیانیەکەی زوو چوومە باڵوێزخانەی پۆڵەنداو لەوێش ڤیزەیەکم بۆ سێ مانگ وەرگرت.

دوای تەواوکردنی کارەکانمو خۆ ئامادەکردنم بۆ سەفەر، بۆ دڵنیایی زیاتر هاتمە ماڵی برای گەورەم مام جەلال ئەوانیش بێئەندازە خزمەتیانکردمو بۆ شەوی دووەم سەعات ٢ بەئۆتۆمبێلەکەی مام جەلال چوومە فڕۆکەخانەو ڕۆیشتم. کەگەیشتمە وارشۆی پایتەختی پۆڵەندا لەئوتێل FOURM دابەزیم، دوای ٧ ڕۆژ لەوێ گواستمەوەو چومە دەرەوەی شار لەوێ ئاپارتمانێکم گرت. لەو ماوەیەدا برای دڵسۆزم کاکەحەمەی فەرەج بۆ گەشتوگوزار سەردانی ئەوێی کردبوو، یەکترمان بینیو چەند ڕۆژێك بەیەکەوە بوین، لەبەرئەوەی من ئینگلیزم دەزانی ببومە چاوساغیان. لەو ماوەیەدا کودەتای سەربازی لەپۆڵەندا روویدا، لەئەنجامدا بڕیاریاندا هەرچی بێگانەیە نەهێڵن بێتە ناو وڵاتیانەوەو ئەوانەش کە لەناوەوەن بەتایبەتی رەش پێستەکان هەموویان دەربکرێن، من بۆ ماوەی ٤٢ ڕۆژ دوای ئەم بڕیارە مامەوەو کەس پرسیاری لێنەکردم، چونکە جلوبەرگم وەکو ئەوان بوو، بەرادەیەك کەکاتێك کاکەحەمەی فەرەج یەکەم جار منی بینی نەیناسیمەوە. ئینجا هاتمە ئەستەنبوڵ.

کەگەیشتمە ترانزێت لەتورکیا بۆ ماوەی ٢ سەعات زیاتر دانیشتم، چونکە توانام نەمابوو ڕێگا ببڕم لەبەرئەوەی لەوکاتەدا مەیخۆربووم شەو ڕۆژ یەك بتڵ ویسکی‌و یەك چارەك ڤۆدگام دەخواردەوە. دوای تەواوبوونی ڕێوڕەسمی ترانزێت سواری ئۆتۆمبێل بومو هاتمە ناو شاری ئەستەنبوڵ لەوێ لەئوتێلی یوزن دابەزیم. کەهاتمەوە سەر خۆمو ماندویی سەفەرم نەما خۆم بەخۆمم گوت: رەفیق تۆ باوکت حاجی‌و دایکت حاجی عەیب ناکەی ئەو مەشروبە دەخۆیتەوە، وەرە پیاوبەو مەشروب تەرك بکە. ئینجا بەخۆمم گوت: ناتوانم، پاشان گوتم کوڕە پیاوبەو مەخۆرەوە. دوای ئەوە هەستامو ئاوێکم بەخۆمدا کردو دەستنوێژم گرتو دوو رکاعەت نوێژی سونەتم کرد، پاشان گوتم: خوای گەورە پەیمانت دەدەمێ هەتا لەژیاندا مابم نەخۆمەوە. ئێوارەکەی بۆ پیاسەکردن هاتمە دەرێ، لەرێگا چاوم بڕیە ئەو شووشە مەشروبانەی دانرابوون: ویسکی، شێری، جن، عارەق‌و شەراب، چەند دەقیقەیەك وەستامو بەخۆمم گوت: تۆ پەیمانت بەخوا داوە بۆت نیە بیشکێنی، لەو ڕۆژەوە دەمم لێی نەداوەتەوە کەوا بزانم مانگی کانونی دووەمی ساڵی ١٩٨٢ بوو.

دوای ئەوەی ٤ ڕۆژ لەئەستەنبوڵ مامەوە هاتمە دیاربەکر، لەوی هەموو ئەوشتە بەنرخانەی پێم بون فرۆشتم. لەو کاتەدا ١٠٠ پاوەنم لە WESTERN BANK بەحەواڵە بۆ هات بۆیە پارەیەکی باشم دەستکەوت. دوای ئەمە بەهۆی کەسێك کەناونیشانەکەیم لابوو هێنامیە ماردین، بەپارەی خۆمو بەیارمەتی ئەو برا بەڕێزانە ئۆتۆمبیلێکی مونشەئەمان گرت، کەبرایەکی ئەرمەنی کورد سایەقی بوو کەسەر بەرێکخراوێکی ئەرمەنی بوو کەلێپرسراوەکەیان لەسوریابوو و دۆستی یەکێتی بوو. لەرێگەی خۆیانەوە شتێکی وایان ڕێکخست گوایە وەفدێکی ئەرمەنی لەعێراق هەن‌و ئەو دەچێت دەیانهێنێتەوە، منیش عێراقیمو مافی گەڕانەوەم بۆ عێراق هەیە، بەرێ کەوتین‌و سەعات ١٠ی شەو گەیشتینە ئیبراهیم خەلیل، لەوێ لەخاڵی گومرگ لەبەرئەوەی هیچم پێ نەبوو بەئاسانی دەربازم بوو.

دوای ئەوە هاتینە بەشی جەوازات، تەماشای سجلەکەیان کرد بینییان هیچ کارێکی قەدەغەم لەسەر نیە، بەڵام سیخوڕەکە پرسیاری لێکردم گوتی: حاجی هۆی چییە ئەوەندە لەدەرەوەی وڵات ماویتەوە؟ گوتم من پارەدارمو پێویستم بەپشوودان هەبوو چونکە دڵم ناساغە. دوای ئەمە هەندێ شتی بێنرخم دانێ بۆیە هەمووی سەعاتێکم پێنەچوو ڕێگایاندا بڕۆین. بەرەو موسڵ کەوتینەڕێ، کەگەیشتین ئەو برا بەڕێزانەی لەگەڵمدابون کاغەزێکیان پێ نوسیمو پێیان ئیمزا کردم

کەبەسەلامەتی گەیشتوومەتە جێ، هەر ئەو شەوە چوومە هەولێرو لەماڵی شەفیقی مەلایان باوکی خەرمان خانی هاوسەری کەماڵی برام مامەوە، بڕی ٢٥ دینارم لەکاك شەفیق وەرگرت، بەیانیەکەی زوو چوومە ماڵی برادەرێك، لەوێ کەماڵی برام هاتە لامو بەهۆی ئەویشەوە چوومە بەستەستێن لەوێوە خۆم گەیاندە ناوچەی ئازادکراوی قەلاتوکان، ئەوجار چوومە ناوزەنگ کەبارەگای سەرکردایەتیی یەکێتیی نیشتمانی لێبوو، لەپرسگەی مەکتەبی سیاسی کاك حەمەدیارو کاك ئاسۆ لێپرسراوانی پرسگەکە زۆر ڕێزیان لێگرتم، جەنابی مام جەلالیش هەمان شەو دووجار تەلەفۆنی بۆ کردمو ئەحواڵی پرسیم، دادە هێرۆخانیش تەلەفۆنی لەگەڵداکردم، لەهەمان ماوەدا کاك د.کەمال خۆشناو سەردانیکردم، دوای دوو شەو جێگایەکی تایبەتیان بۆ دابین کردم.

لەو کاتەدا بەفرێکی زۆر باریبوو کەژیانێکی سەختو سەرمای بەدوای خۆیدا هێنابوو, ئێمەش تازە لەو نازو نیعمەتەی ئەوروپاوە هاتبووینەوە، کەبۆ من وەزعێکی ناخۆش بوو. هەموو بارەگایەك بەشی خۆی زەخیرەی زستانی خستبوو، لەنەوتو دارو ئاردو شتومەکیتر تەنها ئێمە نەبێت، کەشەش کەس بووین کوڕو براو خوشکەزاو کوڕەپور. یەکەم شت تەوالێتو گەرماوێکم بەو زستانە سەختە دروستکرد، کەناچاربووین بەو زستانە سەختە تەنها بەرۆژ خۆمان بشۆین چونکە حەمامەکە بەنایلۆن چواردەوری گیرابوو شەوانەش بەهۆی تیشکی روناکی گڵۆپەکان دەردەکەوت. دوای ئەوەی خۆمان رێکخستو کەلوپەلی پێویستمان بۆ زستان دابینکرد حەسابینەوە، دوای ئەوە هەموو ئەو سەرکردانەی رێزیان لێگرتینو دەعوەتیان کردین رووبەڕوو پێم گوتن: چی زەحمەتەو پێتان ناکرێ بەبەندەی بچوکتانی بسپێرن ئامادەم بۆتانی ئەنجام بدەم. گوتیان: سەختترین شتو گرنگترینیان لای ئێمە کەپێمان هەڵناسوڕێت زەخیرەیە. یەکسەر دەستمانکرد بەگواستنەوەی خواردەمەنی لەقەڵادزێوە بۆ ناوزەنگ وبەنرخی حکومەت دەمانفرۆشتەوە. ئەم خواردەمەنیانە لەناو شاردا لەرێگای جەماڵی برامو فەخریەی خوشکم کۆدەکرایەوەو بەهۆی بازیانو جەلالو مەریوانو محەمد بەولاغ دەیانگەیاندە ناوزەنگ.

لەناو بەشێکی سەرکردایەتیو کادیرانی یەکێتیدا مقۆمقۆی ئەوە بڵاوبۆوە کەرەفیق پشدەری چۆن لەسوریاوە هاتەوە عێراقو گەیشتەوە ناوزەنگو چۆن ئەوهەموو کەلوپەلو خۆراکە لەقەڵادزە کۆدەکاتەوەو دەیهێنێتە ناوزەنگو بەنرخێکی زۆر هەرزان دەیفرۆشێتەوە ! رۆژێکیان مام جەلال ئەو پرسیارانەی لێکردم, لەوەڵامدا گوتم: من کەچومە قەڵادزێو حەوت رۆژ مامەوە ٢١ کەسم بینی کەبەشی زۆریان پارتیو شیوعی بوون بەشەکەیتریشیان یەکێتی بوون. پاشان ناوەکانیم پێ گوت، بەناوی خۆم داوام لێکردن کەخۆراکمان بۆ کۆبکەنەوەو، گوتم لەبری ئەوەی پارەم بدەنێ بۆ ئەوەی بیگەینمە شۆڕش زەخیرەم بەنرخی حکومت بۆ پەیدابکەن.

لەلایەکیترەوە لەلایەن خزمانو برادەرانو بەشێك لەرێکخراوە حزبیەکان توانجیان تێدەگرتم دەیانگوت: رەفیق بۆتە کاروانچیو خەریکی چێشتخانەو هوتێل دانانەو ئازوقە دەفرۆشێتەوەو لەو رێگایەوە سامانێکی زۆری کۆکردۆتەوە. دەشیانگوت ئەو خواردنەی رەفیق لەرێگای بەعسەوە دێتو رەنگە لەداهاتودا هەمووومان ژەهرخواردو بکات، هەرچەندە لەهەموو ناوزەنگدا دوو کەس ڤیدیۆو تەلەفزیۆنی هەبوو کەمام جەلالو من بووین، شەوانە پێشمەرگە بۆ پشوودان دەهاتنە لامو ماڵەکەم ببوو بەقەرەباڵغترین بارەگای پێشمەرگەکان، جگە لەچەندین خزمەتیتر. جارێکیان هاوسەری جەنابی شێخ عزەدین سیاسەتمەداری کوردستانی ئێران گوتی: ئەم بارەگایە زۆر رێکوپێکە ئەگەر لەمەهاباد بوایە کرێیەکی باشی دەکرد، ئینجا بەم جۆرە پێشوازی لەپێشمەرگەکان دەکەن؟

رۆژێکیان خواردنێکی تایبەتی و خۆشم بۆ نەخۆشخانەی شۆڕش برد، کەبریتی بوو لەدوو جۆر برنجو دوو جۆر شلەو گۆشت و کاستەر. پێشتریش تەلەفزیۆن و ڤیدیۆیەکم پێشکەش کردبوو. جەنابی مام جەلال دوای رۆژێك لەم کارە پرسیاری لێکردم گوتی: رەفیق دوێنێ چیت بۆ نەخۆشخانەی شۆڕش کردوە؟ منیش زۆر لەسەرخۆ گوتم: شتێکی هاکەزایی، گوتی: دەك خوا موەفەقت نەکات، دەبوو ئەو کارە من بیکەم بەلاَم بەمن ناکرێت، بەراستی تۆ حاتەمی تەیی کوردانی، دەبوایە نیوەی سەروەت و سامانی کورد هی تۆ بوایە.

## شەڕی نێوان هێزەکانی کۆماری ئیسلامی و پارتی دیموکراتی کوردستانی ئێران

کاتێك کەشەڕی نێوان یەکێتیی نیشتمانی و حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران لەساوان روویدا مام گوتی: رەفیق بزانم چیمان بۆ دەکەی؟ منیش شەش فەردە ئاردم بەهۆی خزمانی گوندی شێنێ کرد بەناوساجی و بەرەو دەشتی ساوان بەرێمکرد کەمام جەلال سەرپەرشتی شەرەکەی دەکرد. کاتێك پێی رادەگەیەنن ئەوەیان بۆ هاتووە بەپێشمەرگەکان دەڵێت سەرەبگرن ئینجا بەدەستە بەنرخەکانی خۆی دابەشی دەکات.

هەرچەندە من بەگشتی ئەم شەڕانەم بەزیانی گەورە دادەنا بۆ گەلەکەمان و، کاتێك شەڕ لەنێوان حزبە کوردیەکانی کوردستانی عێراق روویداو هەواڵی شکانی حزبی شیوعی و پارتی و سۆشیالیستم بیست زۆر پێم ناخۆشبوو بەکارێکی خراپم دانا بۆ ئەوساو داهاتووی رۆژی کورد. لەوکاتەدا خدر مەعسوم کەپیاوێکی ئازاو زیرەك و نیشتمانپەروەرو لەخێزانێکی ناسراوی کۆیی بوو، هەروەها ئەندامی سەرکردایەتی یەکێتی بوو سەردانیکردم و بەدوورودرێژی باسی سەرکەوتنەکانی یەکێتی بۆ کردم بەسەر پارتی و حزبی شیوعیدا. باسی بەدیلگیرانی کەریم ئەحمەدی بۆ کردم و تێکشکاندنی چەند مەفرەزەیەکی پارتی کە لەدەشتی هەولێربوون، گوتم: کاکە خدر ئەم قسانە لای من مەکە، چونکە من دژی شەڕی براکوژیم و لەداهاتووشدا زیانی گەورەی بۆ گەلەکەمان دەبێت، من بمزانیبایە ئەوە وەزعی شۆڕشی کوردە هەرگیز روم نەدەکردە ئێرە. ئینجا سەردانی برای بەڕێز مام جەلالم کرد، دوای ئەوە گەڕامەوە بارەگاکەی خۆم و بەماڵەوەم گوت: لەمڕۆوە سەردانی هیچ بارەگایەکی یەکێتی مەکەن، خەتی تەلەفۆنیشم پچڕاندو، کاتێك کاك ئەحمەد حدادم بینی کەکادرێکی حزبی دیموکراتی ئێران بوو بەمەبەستی ئاشتی هاتبووە ناوزەنگ، پێم گوت: من دەمەوێت لەیەکێك لەشاخەکانی کوردستان چادرێك هەڵدەم و لەوێوە بۆ بەرژەوەندی وڵاتەکەم بەپێی توانا کار بکەم[١٣]. رۆژێك پێش گواستنەوەم لەناوزەنگ برای زۆر بەڕێزم کاك مولازم عومەر عەبدوڵلا نانی نیوەڕۆی لەگەل خواردین، دوای نان خواردن بۆم روونکردەوە کەمن هەرچەندە لێرە دەڕۆم بەلاَم لەهەر شوێنێك بم لەخزمەتی یەکێتیدام و، بەو چەند کەسەی لەگەڵمدایە دەتوانم خزمەت بکەم. ئەو ماوەیەی لەریزی یەکێتیدا بووم، پەیوەندییەکانم بەبێ فەرمانی سەرکردایەتی یەکێتی نەدەجوڵامەوە.

ئەو ٧ رۆژەی لەقەڵادزێ بەنیازی دەستوەشاندن لەبنکەی پۆلیسی قەڵادزێ و گرتنی شارەکە مامەوە، لەپەیوەندی بەردەوامدابووم لەگەل مام جەلال. ئەوانەی بەڕێز خاڵە هەمزە سەرپەرشتی دەکردن، ئامادەنەبوون بەشدارییکەن چونکە بەئاشکرا لایەنگیری حکومەت بوون. خاڵە هەمزە هەرچەندە بەناو پۆلیس بو بەلاَم دڵسۆزو بەدەسەلاَت بوو، لێپرسراوی

---

[١٣] لەو ماوەیەدا داوام لەهیچ کەسێکی یەکێتی یەکێتی نەکرد ریزی یەکێتی بەجێ بهێڵێت، بەلاَم ئەوانەی سەردانیان دەکردم بەئاشکرا پێم دەگوتن کەئەم شەڕە لەبەرژەوەندی گەلەکەماندا نییەو پێویستە هەموومان دژی بوەستین.

بنکەی پۆلیسی قەڵادزێ بوو. پێش جێبەجێکردنی نەخشەکە خاڵە هەمزە گوتی چەند کەسێك هەن گوایە لەو کارەدا بەشدار دەبن، بەڵام جێی گومانن. بۆیە ئێمەش وازمان لەکارەکە هێنا. من گەڕامەوە بۆ ناوزەنگو مەسەلەکەم بۆ مام جەلال گێڕایەوە.

دوای ماوەیەك بەهەشت وڵاخەوە ناوزەنگمان بەجێهێشتو بەرۆژ بەبەرچاوی خەڵکییەوە هاتینە دەرەوە، سەرەتا چوینە گوندی شێنێو لەوێش لەماڵی دۆستی دێرینی بنەماڵەکەمان کوێخا عبدوللا ماینەوە، دوای ئەوە چووین بۆ گوندی وەردە لە کوردستانی ئازادکراوی ئێران، لەوێ بوینە دراوسێی کاك سەعید کوێستانی رابەری تەشکیلاتی سەردەشت، دوای ئەوە دەستمکرد بەسەردانی بارەگاکانی حزبی شیوعی و سۆشیالستو دیموکراتی ئێران، ئەوانیش بەگەرمی پێشوازییان لێکردم.

لەلایەن حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێرانەوە موهەندیس ئاریان لەبارەگای خۆی لەبێتووش چاوی پێمان کەوت، گوتیان چەکو یارمەتیت دەدەینو، داوات لێدەکەین کەهەندێك خەڵك هەن لەقەڵادزێ زۆر دژایەتیمان دەکەن بۆمان لەناو بەریت. پێم گوتن: ئایە ئێوە ئامادەن تا لەگەڵ پارتی دیموکراتی کوردستان ئاشت ببنەوەو من ببمە ناوبژیکەر لەنێوانتاندا. بۆ ئەم مەبەستە نوسراوێکم ئاڕاستەکردنو وێنەیەکیشم ئاراستەی کاك مەسعود کرد لەرێگای بازیانی کوڕمەوە، لەم نوسراوەدا بارودۆخی ئێستای کوردستانم لەسایەی شەڕی براکوژی باسکردبوو، نیازی خۆم ئاشکراکردبوو بۆ ئەوەی بەکاری ناوبژیوانی هەڵستم، وەڵامی بارزانی ئەوەبوو کەوا ئێمە لەئێستاوە شەڕمان راگرتو، گوتبووی: ئێمە هەموو یارمەتیەکتان دەدەین تا سەرکەوتوو بن لەکارەکانتان. هەرچەندە بارزانی بۆ ماوەی چوار رۆژ بازیانی کوڕمی لای خۆی هێشتبووەوەو رێزێکی زۆری لێگرتبوو، بەڵام ١٪ی بەڵێنەکانی جێبەجێنەکرد.

بۆ هەمان مەبەست پەیوەندیم بەهەموو ئەو کەسانەوەکرد کە لەماڵی خۆیان دانیشتبوونو

پەیوەندییان بەهیچ رێکخراوێکەوە نەبو، داوام لێکردن بەئەرکی نیشتمانی خۆیان هەڵبستن بۆ ئەوەی بتوانن هەموومان ئاوێك بەو ئاگرەدا بکەین کەخەریکە هەموو خەرمانی کورد دەسوتێنێ، هەموویان وەڵامیان ئیجابی بوو، هەرچەندە ئەو کاتە ئێمە تەنها گەورەبوو بۆ سەر ئەو حزبانەی پێیان دەگوتن حزبی شەش کەسی.

برایانی یەکێتی کەبەم جموجوڵە ئاشکرایەی منیان زانیبوو بەهەڕەشەیان دانابوو بۆ سەر خۆیانو پێشتر کاتێك بەمام جەلالیان گوتبوو فەرمووبووی کەخەبەریان دامێ رەفیق جیادەبێتەوە پێم گوتن با جیابێتەوە هیچی پێناکرێ، بەڵام کەزانی خەڵکی ناوچەکە وا لەدەورم کۆدەبنەوە بڕیاری گرتنی دامو فەرمووبووی: ئێستا رەفیق خەتەرە. سوپاس بۆ خوا کەهاتن بۆ گرتنمان، تەنها منو موختار عەبدوڵا حاجی غەریب لەوێ مابووین، چونکە ئەگەر برادەرانیتر لەوێ بووبان تەسلیم نەدەبوینو ئەوانیش ئێمەیان دەکوشت.

سەعات چوار یا پێنجی ئێوارە بەبەندکراوی گەیشتینە ناوزەنگ، لەوێ لەیەکتریان جیاکردینەوەو یەکسەر موختار عەبدوڵا حاجی غەرییبیان گولەبارانکرد، منیش بەفەرمانی مام جەلال زیندانیکرام. دوای ٢٤ سەعات دایکمو رووبارو رەوەزو قادری برام سەردانیان کردم، کەچاوم پێیان کەوت یەکسەر گریام، ئەمە یەکەم جاربوو لەزینداندا چاوم بەدایکم بکەوێتو بگریم، چونکە پێشتر لەهەموو ئەو بەندیخانانەی بینیبووم بنکەی پۆلیس، ئاسایش، موخابرات نەگریابووم. بۆ نموونە لەزیندانەکانی ئەمنو فەلوجەو رومادیو خانەقینو کفریو کەرکوکو هەولێرو موسڵ کەدایکم دەهاتە لام بەخۆشحاڵیەوە بەپیریەوە دەچوومو دەستە پیرۆزەکانیم ماچ دەکرد، بەڵام بەندکردنی ئەم جارەم جیاوازە, لەبەرئەوەی هۆی گریانەکەم سێ شت بوو، یەکەم: هەرگیز بڕوام نەدەکرد کورد دەسەڵاتی هەبێت لەبەر هەر هۆیەك بێت من بگرێت، دووەم: ئەو

رەفتارەی لەو زیندانیەدا لەگەڵم کرا لەهیچ بەندیخانەیەکیتردا نەمبینی بوو، سێیەم: پێشتر لەدوژمنانی گەلی کوردم بیستبوو کەهەر کاتێك کورد دەسەلاتی هەبێت زاڵمە، لەو رۆژەدا باوەرم بەوە هێنا.

دوای ٢٦ رۆژ بەبەندکراوی گواسترامەوە بۆ باوزێ، لەوێ ١٠ رۆژ لەژورێکدا بەتەنها مامەوە کەئازارێکی دەروونی زۆرم بینی، ئینجا گواسترامەوە بۆ بەرگەلو. رابەری بەندیخانەکە کاك عومەر عەزیز گوتی: تۆ بەفەرمانی سەرکردایەتی لێرەیت بۆیە من هیچ دەسەلاتم نییە، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا خزمەتێکی زۆری کردم کەهەرگیز لەبیرم ناچێت. منیان بردە بەندیخانەی گشتی کەهەموو جۆرە بەندکراوێکی تێدابوو، بۆیە لەنان خواردن مانم گرت، لەو کاتەدا کاك ئاوات عبدولغەفور هات مانگرتنەکەی پێشکاندمو ژوورێکی تایبەتی بۆ دروستکردم، لەو ژوورەدا لەگەڵ دوو بەندکراوی تری سیاسیدا بوم، کاك ئاوات حەیوانێکیشی بۆ ناردم کە لەگەڵ دووبەندکراوەکەدا خواردم. دوای پەنجا رۆژ لەزیندانی بەربووم. برایانی بەرێز کاك مستەفا چاورەش و[14] کاك مولازم عومەر فەرموویان: لەمرۆوە سەربەستیت بەکەیفی خۆت دەتوانیت رووبەکەیتە هەرشوێنێكو ئەگەر بریاری دەرەوەی ولاتیشتدا ئێمە یارمەتیت دەدەین. گوتم بۆ هیچ لایەك نارۆمو ئێرە بەجێ ناهێلم چونکە دلنیام ئێوە لەدوارۆژدا گفتوگۆ لەگەڵ حکومەتدا دەکەن، ئەو کاتە منیش بەیاننامەتان لەسەر دەردەکەم. ئەوەبوو پاش ماوەیەك گفتوگۆ لەنێوان یەکێتیو حکومەت دەستی پێکرد لەهەمانکاتدا جەژنی نەورۆز هاتە پێشێ، من هەر لەسەرگەلو مامەوەو نەهاتمە خوارەوە، من رای خۆم بۆ خەلکانی دەورووپشتم دەربری‌و گوتم: ئەو کۆبوونەوە زۆرەی خەلك بەدەوری سەرکردەکانی یەکێتی بەو شێوە ئاشکرایە زیانێکی گەورە بەیەکێتی دەبەخشێت، چونکە ئەمە دەبێتە مایەی ئەوەی سەدام حوسێنو بەعسییەکان بەگشتی مەترسی یەکێتی بۆ سەر خۆیان بزانن. دوایی بەیەکجاری لەگوندی سەرگەلو جێگیربووم.

خەلکی سەرگەلو کەبەم جۆرە یارمەتی‌و خزمەتیان کردم هەرگیز لەبیرم ناچێتەوە، بەتایبەت برایانی خۆشەویست کاك ئەسعەد حاجی حەسەنو عەبدولرەحمان وەستا محەمەد کەتا ئێستا دۆستایەتی‌و برایەتیمان هەر بەردەوامە.

گوندی سەرگەلو لە ٤٠٠ مال پێکدێت کەبەگشتی خانەدانو نیشتمانپەروەرنو، مالەکانیان هەموو کاتێك شوێنی حەوانەوەی هێزی پێشمەرگە بووە. کاتی وا هەبوە ٣ هەزار پێشمەرگە لەو گوندەدا نادراوە. جێی خۆیەتی گەرەکێك یان قوتابخانەیەك یان شەقامێك بەناوی ئەم گوندەوە ناو بنرێت. دوای ئەوە چوومە قەلادزێو ماوەیەك لەخزمەتی مامۆستا مەلای دەلگەیی مامەوە کەخزمەتی زۆری کردم، دوای دوو هەفتە لەخزمەتی ئەو برا بەرێزو بەوەفایە چوومە لای جەنابی مام جەلال، ئەویش بەفەرمانێك منی وەك نوێنەری یەکێتی داناو ناردمی بۆ چاوپێکەوتنی مستەشارەکان بۆ ئەوەی بێنە ریزی شۆرش، تەنها بۆم نەبوو لەگەڵ دوو سەرۆك جاشدا دانیشتن بکەم ئەویش تەحسین شاوەیسو قادر فەرەج بوون. بەلام لەگەڵ زۆربەی سەرۆك جاشەکان کۆبوونەوەم کرد، ئەوەی لێرەدا پێم باشە باسی بکەم ئەو گفتوگۆو چاوپێکەوتنانەیە کە لەگەڵ دوو سەرۆك جاشدا ئەنجاممدا.

---

[14] برای بەرێزو دلسۆزم کاك مستەفا چاورەش لەیەکەم رۆژم کە بەبەندکراوی گەیشتمە سەرگەلو هەلوێستێکی بێوێنەو جوانی بەرامبەر بەمن هەبوو کەهەرگیز لەیادم ناچێ.

**یەکەم**/ حەمەخانی حاجی دارا لەزەڕایەن

شەو سەعات نۆ گەیشتمە گوندی زەڕایەن، لەوێ چوومە ماڵی حەمەخان، بەپەلە پێشوازییانکردم. سەرەتا وایانزانی کوڕی حاجی ئەحمەدمو لەبەغداوە هاتوومو زەویم داگیرکراوەو بۆ ئەوە هاتوم زەویەکەم بۆ وەرگرنەوە، یەکسەر پێی گوتم: بەیانی دەچم زەویەکەت بۆ وەردەگرمەوە. هەرچەندە ویستم خۆمیان پێبناسێنم بەڵام بەهۆی مشتومڕی ناوخۆیان بواریان نەدام. منیش بیرمکردەوە وام پێ باشبوو لێیان گەڕێم لەناو خۆیاندا درێژە بەقسەکانیان بدەن لەسەر کێشەی زەویوزارەکانیان کەبۆ من هەموی نهێنی زۆر گرنگ بوون. بۆم دەرکەوت کەهەم لەناو خۆیاندا کێشەی زەویوزاریان زۆرە هەم لەگەڵ رژێمدا کێشەیان هەیە، هەروەها بۆم دەرکەوت بەچ جۆرێك ئازارو ئەشکەنجەی خەڵك دەدەن بۆ پارە پەیداکردنو کەناکۆکییەکانیان لەسەر دابەشکردنی دەسکەوتەکانە، هەروەها هەموو پیلانەکانیانم بۆ دەرکەوت کەبۆ داگیرکردنو دەست بەسەراگرتنی سەروسامانی خەڵك دایاننابوو. ئینجا باسی رژێمی بەعسیان کرد کە بەچ جۆرێك سووکایەتییان پێدەکاتو دوای ئەوەی خزمەتێك بۆ بەعس ئەنجام دەدەن چەند بەسوکی تەماشایان دەکەن، هەروەها لەناوخۆیاندا گوتیان لەکاتی هێرش بردن بۆ سەر مۆڵگەی سوپای ئێرانی یان بارەگاو بنکەی هێزی پێشمەرگە، ئێمە قوربانی دەدەینو پاکسازی ئەنجام دەدەینو، هەواڵەکان بەبروسکە دەگەیەنینە ئامر فەوج، ئەویش دەیکاتە پیاوەتی خۆیو بەسەروی خۆی دەڵێت من ئەمشەو دەستم لەدوژمن وشاندو فلانە جێگام ئازادکرد، دوای بیستو چوار سەعاتیش کەدەمانەوێت سەردانی ئامر فەوجەکە بکەین پاسەوانەکەی پێمان دەڵێت: جەنابی ئێستا لەحەمامە یان دەڵێت ماندوەو خەوی لێکەوتوە بۆیە ناتوانێ کەس ببینێت.

لەو دانیشتنەدا ئەوەندەیان لەم جۆرە قسانەکرد کە بەچوار لاپەڕە تەواو نابێت. کاتێك سەعات بوو بە ١٢ی شەو حەمەخان گوتی: ئێستا دەچین دەخەوینو بەیانی ئینشائەللا زەویەکەت بۆ وەردەگرمەوە. منیش گوتم: قوربان رێگام دەدەیت دوو قسە لەخزمەتتدا بکەمو خۆمت پێ بناسێنم، من کوڕی حاجی ئەحمەد نیمو ناوم رەفیق پشدەریە، نوێنەری کێشەی زەویوزاری کەس نیم بەڵکو نوێنەری کێشەی هەموو زەوی کوردستانم لەعێراقدا، نێردراوی هیچ ئاغایەك نیم بەڵکو نێردراوی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانو بەفەرمانی مام جەلال هاتوومە لات. کەوام گوت کابرا رەنگی گۆڕاو تف لەقورگیدا گیربوو. گوتی: برۆن گیسکێك سەربڕنو چامان بۆ لێنێن.

تا چواری بەیانی گفتوگۆمان کرد، پێم گوت: بۆ بەرژەوەندی خۆت وا باشە لاپەڕەیەکی سپی بکەینەوە. هەرچیم دەگوت ئەو لەوەڵامدا دەیگوت مام جەلال هەموو رێگایەکی لەمن گرتووە. لەدوای ئەو هەموو گفتوگۆیە گوتی: شەڕم لەگەڵ مەکەنو مەیەنە سەرم منیش شەڕتان ناکەمو پەلامارتان نادەم. لەکۆتاییدا بانگی خوارزاکەی کرد گوتی لەگەڵ رەفیقدابە تا بەسەلامەتی دەیگەیەنیەوە ماڵی خۆی لەسلێمانی یان هەر شوێنێك کەخۆی دەیەوێ.

**دووەم**/ خدر رەشید بەحری

ئەم کابرایە شانبەشانی رژێمی بەعس بەفەرمانی بنەماڵەی بارزانی بۆ بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان چەکی دژی کوردو کوردستان هەڵگرتبوو، برایەکی ئەم سەرۆك جاشە بەناوی ئیبراهیم رەشید بەحری لەبارودۆخێکی نادیاردا تیرۆر کرابوو، ئەویش لەترسی گیانی خۆی دوو هاوڵاتی گرتبوو بۆ ئەوەی سەرنجی یەکێتی بەلای خۆیدا رابکێشێ, یەکیان ناوی مامە رەزای ناوگردان بوو ئەوەیتریان ناوی حاجی سابیر باوکی کاکە حەمەی پێشمەرگەبوو. بەندە لەگەڵ جەنابی برای گەورەو

بەڕێز کاکە حەمەی کوڕی خوالێخۆش بوو شێخ قادری چوێسە چووینە لای کاك خدر لەناوچەی پێنجوێن، کە لەموجەمەع شانەدەری لەمەکتەبێکدابوو لەگەل ٢٥ چەکداردا. قسەو گفتوگۆمان دەست پێکرد، سەرەتا باسی بارودۆخی ئێستاو گفتوگۆکانی نێوان رژێمی بەعسو یەکێتیم بۆ کردو، تێمگەیاند کەناتوانێت دژی شۆڕش بوەستێتو وا باشە لەگەڵماندا رێکبکەوی. دەربارەی گرتنی ئەو دوو هاولاتییە بێتاوانەش پێم راگەیاند ئەم کارە بۆ تۆ زیانبەخشە. جەنابی کاکە حەمە گوتی: من بەفەرمانی جەنابی شێخ هاتووم، ئەو زۆر ناڕازیە بەرامبەر ئەو کارەی تۆ کردوتە،

هەروەها مەحمودی براشت.

خدر گوتی: من برام کوژراوە بۆیە ئەم دوو کەسەم گرتووە. گوتم: کاکە حەمە تاوانی نیە لەکوشتنی ئیبراهیمی براتدا، ئێوەش لەناوخۆتاندا دوژمناتیتان زۆرە، ئەگەربێتو ئەم دوو هاولاتیە بکوژن ئەوا خۆتان توشی دوژمنایەتی هەموو یەکێتی دەکەن. بەلام من رێگایەکت نیشاندەدەم کەزۆر ئاسانە ئەگەر جەنابت ئەنجامی بدەیت دەتوانیت تۆڵەی براکەت بکەیەوە، ئەویش ئەوەیە یا لەماڵەوە دانیشەو خەریکی کاروکاسبی خۆتبە یان وەرە ناو ریزی شۆڕشەوەو لەپێناوی کوردو کوردستان تێبکۆشە. دوای ئەم گفتوگۆیە خواحافیزەمان خواستو گەڕاینەوە بۆ خزمەتی جەنابی شێخ قادری چوێسە.

لەوێ بەناوی یەکێتی زۆر سوپاسم کردو پێم گوت ئەم سەرکەوتنەمان بەهۆی جەنابی کاکە حەمەو فەرمانی ئێوەی بەڕێزە بوو.

**تێبینی**

*ئەو قسانەی لەحەمەخانی حاجی دارام بیست لەسەر خراپەکاری حزبی بەعسو رژێم لەهەموو سەرۆك جاشەکانم دەبیستەوە، بەلام ئەوەی جێی سەرسوڕمان بوو ئەمانە لەگەڵ ئەوەشدا پیاوی بەوەفای بەعس بوون. رەنگە هۆی سەرەکی ئەوەی ئەم مێزو سەرۆك جاشانە نەدەهاتنە پاڵ شۆڕش ئەو ناکۆکییە بووبێ کە لەنێوان یەکێتیو پارتیدا هەبو، کەبنەماڵەی بارزانی هۆی سەرەکی بوون. بۆیە لەکاتی راپەڕینەکەی بەهاری ١٩٩١، سەرۆك جاشو موستەشارەکان رۆڵی سەرەکییان بینی لەدەرپەڕاندنی رژێمی بەعس. پێشتریش باسی ئەوەم کرد کەعیزەت دووری لەکاتی کۆبوونەوەی لەگەڵ سەرۆك جاشە هەلاتووەکان لەبەغدا چۆن پێیان دەڵێ ئێوە هۆی سەرەکی لەدەستدانی کوردستان بوون لەبەعس.*

### کورد بۆ نەبووە بەدەوڵەت؟

یەکێك لەو پرسیارانەی بەردەوام مێژوونوسو رۆشنبیرانی ئێمە دووبارەی دەکەنەوەو هەریەکە لەڕوانگەی خۆیەوە وەلامێکی بۆ دیاریدەکاتو هۆکارەکانی ریز دەکا، ئەو پرسیارەیە کەکورد بۆ نەبووە بەدەوڵەت؟ هەمووومان دەزانین کورد یەکێکە لەگەلە هەرەدێرینەکانی ئەم ناوچەیەو، دوو هەزار ساڵ بەر لەئێستا خاوەنی دەوڵەتێکی فراوانو بەهێزبووە کەبەدەوڵەتی "میدیا" ناسراوە. بەلام لەدوای رووخانی ئەم دەوڵەتە، کورد

پەژمورده بوەو هەرچی هەوڵێکی لەو پیناوەدا داویەتی، بێسود بووە.

هەندێك لەنووسەرو رۆشنبیران پێیان وایە کەئیسلام هۆکاری سەرەکی پەرتەوازەبوونی کوردو دروستنەبوونی دەوڵەتی کوردییە، بەلام بەڕای من ئەو هۆکارە، ئەو کاریگەرییە گەورەیە، نییە کەئەوان دەیڵێن، چونکە فارسو تورك وەکو کورد موسڵمان بوونو ئیسلام، نەك نەبوو بەڕێگر لەبەردەم دروستبوونی دەوڵەتی سەربەخۆیان، بەڵکو بوو بەباشترین هۆکار بۆ چەسپاندنی ئیمپراتۆریەتەکانیانو داگیرکردنی گەلانیتری موسڵمان بەناوی ئاینەوە. فارسەکان لەسایەی ئاینی ئیسلام،

ئێمڕۆ موزایەدە بەسەر هەموو جیهانی ئیسلامییەوە دەکەنو خۆیان بەخمخۆری ئەم ئۆمەتە دەناسێننو (مرجع اعلی)ی هەموو شیعەی جیهانن، هەرچی تورکیشە کەمێژوویان لەم ناوچەیەدا لە ٦٠٠ سال زیاتر نییە لەرێی ئاینی ئیسلامەوە توانییان گەورەترین ئیمپراتۆریەت لەرۆژهەلات دابمەزرێننو زمانو ئەدەبو رێورەسمی تورکی لەهەمو ناوچەکاندا بلاوبکەنەوە، کەئێستاش هەموو تورکێك شانازی بەو رۆژەوە دەکات کەتوانییان سنوری دەسەلاتیان بگەیەنن بەبۆسنەو هەرسكو ئەلبانیا لەرۆژهەلاتداو, لەرۆژئاواشدا خۆیان لەئیتالیاو فەرەنسا نزیك بکەنەوە. بۆیە راست نیە بلێین ئیسلام هۆی سەرەکی دروستنەبوونی دەولەتی کوردییە، بەلکو کورد خۆی نەیتوانیوە کەلك لەئیسلام وەربگرێو وەکو عەرەبو تورکو فارس بۆخۆی بەکاری بهێنێت.

ئیسلامبوونی کورد کەموکورتییەکەی لەوەدایە کەتەنها لەبواری نوێژو رۆژوو و خوێندنی زانستە شەرعیەکاندابووە، بەلام هەرچی نەتەوەکانیترە لەگەلّ ئەم کارانەشدا لەناو ئیسلامدا سیاسەتیان بۆ بەرژەوەندی نەتەوەی خۆیان کردووە. کورد پێش موسلمان بوونو دوای موسلمان بوونیشی خەمی دروستکردنی دەولەتی نەبووەو، ئەگەر بشبووبێ ئەوا خیانەتو دوژمنی ناوخۆ نەیهێشتووە سەربگرێ. ئەو گلەییانەش کە لەسەلاحەدین ئەیوبی دەکرێ لەجێی خۆیدا نییە، چونکە ئەو کات ئەو رابەرە کوردە ئەرکە ئاینیەکانی خۆی راپەراندوەو، هەرگیز بەبیریدا نەهاتووە دەولەتێك بۆ کورد دروست بکات.

هەندێکیتر پێیان وایە رۆژئاواو ئەوروپا بەهۆی سەلاحەدین ئەیوبییەوە رقیان لەکورد داگرتووە، چونکە ئەم کابرایە لەکاتی خۆیدا لەشەری خاچپەرستەکاندا زیانی زۆری لێداون، ئەم رایە زۆر لەراستییەوە دورە. چونکە ئەگەر کورد یەك جار لەرێگای سەلاحەدینەوە زیانی لەرۆژئاوا دابێ، ئەوا تورکەکان کەئێمرۆ نزیکترین دۆستیانن چەندین جار زیانی گەورەیان لێداون. راستە رۆژئاوا لەمێژووی نوێدا رۆلی سەرەکی هەبووە لەدروستنەبوونی دەولەتی کوردیو پەرتەوازەبوونی کوردو پارچەپارچەبوونی کوردستان، بەلام ئەمە ئەوە ناگەیەنێت رقیان لەکورد بێ، بەلکو ئەم کارەیان بۆ بەرژەوەندیی ئابووریی خۆیان ئەنجامدا، هەروەها لەرێی پارچەپارچەکردنی کوردستان بارێکی وای ناوەتەوە لەناوچەکەدا کەهەر کاتێك بیەوێت، دەتوانێت ئاژاوە بنێتەوەو دەست لەناوچەکە وەربدات.

بەرای من سەرەکیترین هۆی دروستنەبوونی دەولەتی کوردی، وەك لەچەندین جێگادا باسمکردوە، بوونی دوژمنی ناوخۆیە، چونکە نابێت چاوەرێی دوژمنی دەرەکی بکەین بێتو دەولەتمان بۆ دروست بکات، لەو بوارەدا پێویست بەوە ناکات گلەیی لەبێگانە بکەین، کورد دەلێ دار کرمی لەخۆی نەبێ نارزێ. کورد تا ناوەراستی سەدەی نۆزدەهەم خاوەنی چەندین میرنشینی سەربەخۆبووە کە لەسایەی هەر یەکێکیاندا سەدەها هەزار کورد دوور لەدەسەلاتی بێگانە ژیاون، بەلام هەرگیز سەرۆك هۆزو میرنشینەکان نەك هەر ئامادە نەبوون لەگەلّ یەکتری رێکبکەونو دەولەتێك دروست بکەن بەلکو بەردەوام لەبیری لەناوبردنی یەکتردابوون. زۆر جار ئەو سەرۆك هۆزو دەسەلاتدارانە بۆ لەپشتدانی برا سەرۆك هۆزو دەسەلاتدارە کوردەکانیتر پەنایان بردۆتەبەر دوژمنانی گەلی کوردو دەستیان کێشاوەتە سەر مالی براکەیان. میرنشینە کوردییە گەورەکانی سۆران, بابان, ئەردەلان, بۆتان هەرگیز لەگەلّ یەکتر تەبانەبونو شەرِ لەنێوانیاندا بەردەوامبووە، بگرە لەناو خۆشیاندا بۆ گرتنی دەسەلات برا برای دەکوشت، بۆ نموونە لەمیرنشینی باباندا لەماوەی ٣٧ سالدا, پێنج برا لەسەر دەسەلات یەکتریان کوشتوە ئەوەش بەپشتبەستن بەبەغدا یان تاران. لەکاتێکدا ئەگەر تەنها دوو میرنشین یەکیان گرتبا دەیانتوانی دەولەتی کوردی رابگەیەنو تورکو فارس ملکەچی خۆیان بکەن.

یەکەم هەوڵی راستەقینەی ئێمە بۆ دروستکردنی دەوڵەتی کوردی لەشێخ مەحمودەوە دەست پێدەکات لە ١٩١٩/٥/٢٣، بەڵام ئینگلیز کە لە ١٩٢٠/٦/١٧ ویستی حکومەتی عەرەبی دامەزرێنێت، کوردستانی باشووری خستە سەر عێراقی عەرەبی بۆ ئەوەی پارسەنگی سوننە لەعێراقدا راست بکاتەوەو نەهێڵێت شیعە زۆرینەی عێراق پێکبێنن.

بەم شێوەیە خەونی دەوڵەتی کوردییان تێکداو ڕێگەیان نەدا هیچ کەس لەو بوارەدا

سەرکەوتووبێت. ئینگلیز بەم کارە دوو ئامانجیان پێکا، یەکەمیان دروستکردنی هاوسەنگی لەنێوان سوننەو شیعە لەعێراقدا، دووەمیان پارچەپارچەکردنی کورد، کە بەهەردوو ئامانج مەبەستیان بوو بارێکی وا دروست بکەن پرپێ لەئاژاوە بۆ ئەوەی هەرکاتێك مەبەستیان بوو دەست لەناوچەکە وەربدەن. بۆ نموونە کاتێك ئینگلیز یارمەتی شێخ مەحمودیان دەدا مەبەستیان ئەوەبوو گوشار بخەنە سەر تورك تا گوێرایەڵی فەرمانەکانیان بن‌و، کاتێك زانییان تورك هاتوونەتە ناو بازنەی بەرژەوەندیەکانی خۆیان نەك هەر یارمەتیەکانیان راگرت بەڵکو بەئاگرو ئاسن شۆڕشەکەیان تواندەوەو شێخیشیان دەستگیرکرد. دوای دروستبوونی دەوڵەتی عێراقی، لەگەڵ هەردوو دەوڵەتی ئێران‌و تورك رێککەوتن لەسەر لەناوبردنی کورد. بەشێوەیەکی گشتی، وەکو باسمکردووە هەڵوێستی ئەو چوار حکومەتەی کوردیان بەسەردا دابەشکراوە سلبیە، ئەم دەوڵەتانە لەکاتی توندترین شەڕو هەرای نێوان خۆیاندا، لەسەر لەناوبردنی کورد کۆك‌و تەبان. هەرچی حکومەتی بەعسە لەهەرسێ دەوڵەتەکەیتر بەرامبەر بەگەلەکەمان توندترو دوژمنکارانەترە، بەجۆرێك کەئەوەی رژێمە یەك لەدوای یەکەکانی عێراق بەسەر کوردیان هێناوە نەك هەرسێ دەوڵەتەکەیتر بەرامبەر بەکورد نەیانکردووە، بەڵکو لەجیهاندا شتی وا نەبووە، بەتایبەتی دوای هاتنی حزبی بەعس بۆ سەر دەسەڵاتو پاش ئەوەی دکتاتۆر سەدام دەسەڵاتی گرتەدەست، لەو کاتەوە کورد رووبەڕووی پرۆژەی گەورەی جینۆساید بۆتەوە، لەو چوارچێوەیەشدا سەدان گوندو چەندین شار کاولکران‌و چەندین ناوچە کیمابارانو ئەنفالکرا. ئەوە تەنها بەمەبەستی قڕکردنی گەلی کوردبوو.

بەڵام سوپاس بۆ خوا سەدام لە ١٩٩٠/٨/٢ گەورەترین گەمژەیی کرد کاتێك کوێتی داگیرکرد، ئەو دەوڵەتە عەرەبیەی تا دوێنێ بەملیۆنان دۆلاری دەبەخشیە بەعسیەکان لەدوای داگیرکردنی کوێتەوە خرایە سەر عێراقو کرا بەنۆزدەهەمین پارێزگاو، تاوانبارترین پیاوی سەدامیان کردە پارێزگاری کەعلی حەسەن مەجیدە، ئەویش کارێکی پێکردن ئیسرائیل بەفەلەستینیەکانی نەکردووە. ئەمە وایکرد رۆژئاوا بەسەرکردایەتی ئەمەریکا کۆببێتەوە بۆ لێدانی عێراقو دەرپەڕاندنی لەکوێت، ئەوەبوو لەشەوی ١٦–١٩٩١/١/١٧ پەلاماری لەشکری بەعسیاندا لەکوێتو کارێکیان پێکرد با بەدەواری شەڕی نەکردبێ. شایەنی باسە تا ئەو کاتە حکومەتو حزبە عەرەبیەکان ماهیەتی راستەقینەی بەعسیان نەدەزانیو، پێیان وابوو سەدام تەنها دوژمنی گەلی کوردە، بەڵام خوای گەورە وایکرد ئەو لەشکرە بەعسیەی بەپاسەوانی عەربیان دەزانیو بەپارەو سامانی ئەوان دروستببوو، پەلاماری خۆیانیداو ماڵوسەروەتو سامانیانی تاڵانکرد. تاکە سەرکردەی عەرەب کەهەڵوێستی بەرامبەر کورد باش بێت سەرۆك موعەممەر قەزافییە کە لە ١٩٧٩/١٠/١ لەکۆنگرەی بنغازی لەلیبیا پشتگیری بۆ کورد راگەیاندو گوتی: کورد مافی خۆیەتی سەربەخۆ بێت. هەرچی سەرکردە عەرەبەکانیترە ئەوە نەك بەباشە بەڵکو بەخراپەش ناوی کورد ناهێنن. بەتایبەت حزبە بەناو ئیسلامییە عەرەبەکان و ئیخوان موسلمین‌و هەموو حزبە ئیسلامییە عەرەبە توندڕەوەکان‌و پیاوە ئاینیە ناسراوەکانیان وەکو د.یوسف قەرزاوی بەرامبەر ئەم هەموو تاوانەی بەعس بێدەنگبوون کە بەناوی ئیسلامەوە بەرامبەر کورد ئەنجامی دا، وەکو ئەنفال کەئەمڕۆ درێغی ناکەن لەیارمەتیدانی حزبە ئیسلامییەکانی کوردستان کەئەمەش بریتییە لەنەخشەیەکی گەورەتری حکومەتە عەرەبیەکان. بۆ نموونە (الاغاثة الاسلامية العالمية) کەرێکخراوێکی رژێمە عەرەبیەکانەو بەناوی ئیسلامەوە پارە لەعەرەبە موسڵمانەکان کۆدەکاتەوە، کار بۆ ئامانجە

سیاسییەکانی عەرەب دەکات نەك بۆ ئیسلام. لێرەدا پێم باشە هەندێك پرسیار لەئیسلامیە عەرەبەکان بکەم، بۆچی هیچ حزبێکی ئیسلامی رۆژێك لەرۆژان نەیگوت کوردیش وەکو عەرەبو فارسو تورکو هەر نەتەوەیەکیتری موسڵمان مافی ئەوەی هەیە دەوڵەتی هەبێت؟ لەکاتێکدا ئێمە بەناوی ئەنفالەوە ١٨٢ هەزار هاوڵاتیمان بێسەروشوێن کران، بۆچی کۆنگرەی وڵاتانی ئیسلامی بەیاننامەیەکی دەرنەکردو روونی نەکردەوە کەئەم کارە، دژی شەریعەتی ئیسلام بووە؟ ئەو رێکخراوە ئیسلامیانەی کەدێن مزگەوت لەکوردستاندا دروست دەکەنەوە بۆچی رۆژێك نەیانپرسی ئەم مزگەوتانە کێ روخاندوونیو بەچ ناوێك وایان لێکراوە؟ بۆچی لەدوای راپەرینەوە چەندین رێکخراوی خێرخوازی رۆژئاوا بەژدارییان کرد لەئاوەدانکردنەوەی کوردستاندا بەڵام هیچ رێکخراوێکی عەرەبی ئیسلامی بەریاڵێك بەژداری نەکرد؟ ئەم دەوڵەتو حزبە ئیسلامیانە کوردستانیان بەجۆرێك پشتگوێ خستووە کەبۆ بەرژەوەندیو کاری تایبەتی خۆیان نەبێت ئاوڕی لێنادەنەوە، لەوە سەیرتر ئەوەیە کەحزبە ئیسلامیەکانی کوردستان بەدۆستو لایەنگرانی خۆیان دەزانن، بۆ نموونە کاتێك حزبی یەکبوونی ئیسلامی لەهەڵەبجە کۆنگرە دەبەستێ پرس بەئێران دەکەن تا یەکێك بکەن بەرابەر، ئێرانیش داوایان لێدەکات کەعەلی عەبدولعەزیز بکەن بەرابەر، بەڵام کاتێك کوردێکی موسڵمان داوایان لێدەکات لەسەر خیانەتی ٣١ی ئاب هەڵوێستیان هەبێت دەڵێن ئێمە رای سەربەخۆمان هەیەو ملکەچی قسەی خەڵك نابین. بەهەمان شێوە حزبە عیلمانیە کوردستانیەکانیش لەبری ئەوەی کێشەکانیان لەناوخۆو لەکوردستاندا چارەسەربکەن دەچن لەلەندەن یان لەواشنتۆن لەسەر دەستی لێپرسراوە بێگانەکان کێشەکانیان چارەسەردەکەن، وەکو ئەوەی مام جەلالو مەسعود بارزانی لەواشنتۆنو لەندەنو ئەستەمبوڵ کردیان.

بەهەر حاڵ، کورد لەسایەی ئەم ریسوابونەی رژێمی بەعس لە ١٩٩١/٣/٥ راپەریو توانی ناوچەیەکی بەرفراوانی کوردستانی عێراق ئازاد بکات. دوای راپەرین رۆژئاوا بەناوی پاراستنی مافی مرۆڤەوە هێڵی ٣٦ی دژەفرینی لەکوردستاندا دانا، کەتەنها ناوچەیەکی کەمی کوردستانی گرتەوەو، هەروەکو لەبەشەکانی پێشوودا باسمکردووە ئەم کارە تەنها بەمەبەستی دورخستنەوەی دەسەڵاتی کوردی بووە لەبیرەنەوتەکانی کەرکووك.

راپەرین ئەو هەلە گەورەیە بوو کەپاش لاوازبوونی رژێمی عێراقیو کرانەوەی دەزگاکانی جیهان بەرووماندا، نەمانتوانی وەکو پێویست کەڵکی لێوەربگرین. راستە دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستانو وڵاتانی رۆژئاوا رۆڵی خراپیان هەبوە لەو بارەیەوە، بەڵام لەهەمووی گرنگترو کاریگەرتر، ناتەبابوونو نەگونجانی ناوخۆمانە، دوژمنی ناوخۆ زۆر ترسناکترە لەدوژمنی دەرەکی. هەموومان دەزانین دوای راپەرین حزبە کوردستانیەکان لەسەر دەسەڵاتو پارە شەریان دەست پێکردو، هەموو دەسکەوتەکانی راپەرین بەپەرلەمانو حکومەتی هەڵبژێردراویشەوە خرایە بەردەم هەرەشەی لەناوچوون. بەتایبەتی کوردیان لەسەر سینیەك داناو خستیانە بەردەم سەدام حسەینو رژێمە گڵاوەکەی، تەنها بۆ بەرژەوەندی بنەماڵەکەی خۆیان.

## میرابۆی کورد

لەخوێنەری ناشارمەوە کەمن هەر لەسەرەتای نووسینی بەرگی یەکەمی (کورد دوژمنی خۆت بناسە) مەبەستم بنەماڵەی بارزانی بووە، چونکە گەلەکەمان هیچ پێویستیەکی بەوە نییە کەپێی بگوترێ رژێمی عێراقی یان تورکی یان ئێرانی یان سووری دوژمنتە، هەموو کوردێك هەرکە لەدایکدەبێتو راستو چەپی خۆی لەیەك جیادەکاتەوە دەزانی ئەمانە دوژمنی سەرسەختی کوردن. بەڵام دوژمنی ناوخۆ ئەو خائینەیە کە لەبەرگی شۆرشگێردایە، ئەوەی نیشتمان دەفرۆشێت و تەسلیم بەدژومنی دەکاتەوە وەك ئاشبەتاڵو خیانەتی ٣١ی ئابو ناوی لەخۆی ناوە نیشتمانپەروەر، ئەوەی هەر خەریکی پارە

كۆكردنەوەو دزینی سامانی خەڵكە وەك داهاتی ئیبراهیم خەلیلو خۆی بەخەمخۆرو دەمڕاستی گەلی كورد دەزانێ، ئەوەی پیاوی موساد, ئتلاعات, موخابەراتی عێراق, میتی توركیو CIAیەو دەڵێ من سەربەخۆمو لەپێناوی گەلدا تێدەكۆشم، ئەو دوژمنە پێویستی بەروونكردنەوەو ئاشكراكردن هەیە، كورد گوتەنی گورگەو لەپێستی مەڕدایە.

لەمێژووشدا نموونەی لەو جۆرانە زۆرن كەماوەیەك لەرێگای درۆو فێڵەكانیانەوە خەڵكیان چەواشەكردووەو تەفرەیان داون، بەڵام هەرگیز نەیانتوانیوە ئەم درۆیە هەتاهەتایە لەخەڵك بشارنەوە. میرابۆی فەرەنسی نمونەیەكی ئاشكرای ئەم جۆرەیە، كەرۆشنبیری گەورەو نیشتمانپەروەرو مێژوونووسی بەناوبانگی گەلی كورد كاكە د.كەمال مەزهەر لەكتێبی (زانستی مێژوو یان مێژووی مێژو)دا باسیكردووە. میرابۆ لەسەرەتای شۆڕشی فەرەنسیدا لەرێگای فرتوفێڵەكانیەوە وای لەخەڵك گەیاندبوو كەئەو خەمخۆری شۆڕشو بەوەفای گەلی فەرەنسییە، خەڵكی فەرەنسا ناویان نابوو خەتیبی شۆڕش. كاتێك ئەم كابرایە مرد سەرجەم گەلی فەرەنسی غەمباری خۆی راگەیاندو بەهەزارها كەس لەگەڵیدا چون بۆ گۆڕستانو، لەگۆڕستانی پیاوچاكو پیاوە گەورەكاندا ناشتیان. بەڵام كاتێك شۆڕش سەركەوتو دەسەڵاتی پاشایەتی لەفەرەنسا بەدەرنراو هەموو ئەرشیفو نهێنیەكانی كۆشكی پاشایەتی كەوتە دەست جەماوەری شۆڕشگێڕ، دوای ئەوەی جەماوەر سەیری نوسراوەكانی سەردەمی پاشایەتییان كرد بینییان میرابۆ لەژێرەوە بەنهێنی هەموو خزمەتێكی دەسەڵاتی پاشایەتی كردووەو بەردەوام هەواڵو زانیاری بەكۆشكی پاشایەتی گەیاندوەو فەرمانەكانی جێبەجێ كردوون، ئەمەش لەبەرامبەر بەخششی زێڕو زیوی پاشایەتی. هەر بۆیە جەماوەر سەرسام بوونو لەرقان چوون تەرمەكەیان لەگۆڕ دەرهێنایەوەو لەگۆڕستانێكی لاچەپ ناشتیانو ناویان لەدەفتەری خیانەتدا تۆماركرد.

د.كەمال مەزهەر لەگێڕانەوەی ئەم رووداوە دەیەوێت وانەیەكی مێژوومان فێربكات كەخۆی هەر لەسەرەتای گێڕانەوەی ئەم رووداوەدا دەڵێت كەس بۆی نییە تا سەر مێژوو هەڵخەڵەتێنێ, بۆیە ئەم رووداوە دەكاتە بەڵگەی سەلماندنی ئەو رایەی خۆی, كەوا منیش بۆ هەموو میللەتی كوردی ئاشكرا دەكەم كەمەلامستەفای بارزانیو بنەماڵەكەی, میرابۆی كوردنو چۆن میرابۆ نەیتوانی تا سەر فێڵ لەمێژوو بكات، بەهەمان شێوە بنەماڵە ناتوانێت. جیا لەو هەموو كەموكورتیەی لەكتێبەكانمدا لەسەر ئەو بنەماڵەیە دەرمخستووە، وا لێرەدا هەندێكیتر لەو بەڵگانە دێنمەوە تا گومان لەو راستیە نەمێنێ.

لەدوای دامەزراندنی حكومەتی عێراقو پاش ئەوەی كوردیان بەزۆر بەعێراقەوە لكاند، لە ١٤ی تەموزی ١٩٥٨ بەسەركردایەتیی عبدولكەریم قاسم شۆڕش بەرپابوو دژی دەسەڵاتی پاشایەتی، ئەم سەركردەیە لەو كاتەدا دانی بەمافی كورددا ناو گوتی (العرب والأكراد شركاء في هذا الوطن) ئەمە گەورەترین رووداو بوو بۆ گەلەكەمان لەو كاتەدا.

ئەم سەركردەیە بەكردەوە سەلماندی كەدۆستی گەلی كوردەو تا ئێستا كورد سەرۆكێكی عێراقیی وای بەخۆیەوە نەدیوە، بەڵام دوای ئەوەی بارزانیی لەدەرەوە هێنایەوە كوردستان كەنزیكەی ١٠ ساڵ بوو لەدەربەدەریدا بوو و هەموو دەوڵەتە ئیقلیمیەكان بەتایبەتی ئێران دژی هاتنەوەی بوون, هەر لەو كاتەدا بارزانی بەعەبدولكەریم قاسمی گوت قەیتانی پێڵاوەكەتم، سەركردەی ئەو كاتەی عێراق بۆ زیاتر سەلماندنی نیازپاكی بەرامبەر بەگەلی كورد رێگای بەبارزانیدا تا پ.د.ك. دروستبكاتو بەرەسمی كاری خۆی بكات، بەڵام بارزانی لەبری سوپاسكردنی عەبدولكەریم قاسم پاش ماوەیەكی كەم دەستیكرد بەپەیوەندیكردن بەسەرۆك عەشیرەتو ئاغاكانەوە بۆ چەكهەڵگرتن لەدژی حكومەتی قاسم، ئەمەش بەپیلانی كۆمپانیاكانی نەوتی جیهانی، چونكە لەو كاتەدا تاكە دۆستی گەلەكەمان قاسمو دەوڵەتەكەی بوو. لەو كاتەدا حزبی شیوعی لەسەر ئەم جموجۆڵانەی بارزانی بەیاننامەیەكی دەركرد كەتیایدا هاتبوو چەند سەرۆك عەشیرەتێك بۆ رووخاندنی حكومەتی

قاسم یەکیانگرتووە، ئەمانە کۆنەپەرستن‌و دەسکردی کۆمپانیاکانی نەوتی جیهانین. لەو کاتەدا من وەك هەر هاولاتیەك بڕوام بەوە نەهێناو وامزانی حزبی شیوعی درۆ لەگەڵ خەڵکدا دەکات. بەلام پاش ئەوەی لەساڵی ١٩٩٧ کتێبی (النفط والاکراد)ی پرۆفیسۆر د.کەمال مەجیدم بینی، بۆم دەرکەوت کەئەم بەیانەی حزبی شیوعی ڕاست بووەو، ئەم کارەی بارزانیش میرابۆئاسا، فێڵێکی گەورەبوو. لەلاپەڕە ١٧٥ی کتێبی ناوبراودا هاتووە ١٩٧٤ هو الذي فرض اتفاقیة الجزائر).

هەر بۆیە لە١٩٦١/٩/١١ بڕیاری شۆڕشی ئەیلوول درا، کە لەبەرگی دووەمی ئەم کتێبەدا بەدووروودرێژی باسمکردووە. دوای ئەمە مەلامستەفا بەنهێنی لەگەڵ دکتاتۆر عبدولسەلام عارف لەرێگەی هاولاتیەکی خەڵکی سلێمانی رێککەوتنێکی بەپەلەی ئەنجامدا بۆ دەست بەسەراگرتنی شۆڕش‌و دوورخستنەوەی باڵی م.س. جەماعەتی ئیبراهیم ئەحمەد.

پاشان بەهۆی ڕوودانی بارودۆخێکی تایبەت‌و دروستبوونی هەڕەشە لەسەر دەسەلاتی بەعس، پریماکۆفی رووسی کەئەو کاتە پسپۆڕی کاروباری عێراق بوو و دوایی بوو بەسەرۆك وەزیران، وەك نێردراوی حکومەتی سۆڤیەت گەیشتە بەغدا. هەموو ئەمانە وایکرد بەیانی ١١ی ئادار دەربچێت کەبۆ کورد دەسکەوتێکی گەورەبوو و پێویست بوو بپارێزرێ. بەلام بەهۆی خوێنرێژی سەدام‌و پاشان هەلوێستی نابەرپرسانەی بارزانی‌و خۆتەسلیمکردنی بەئێران, ئەو دەسکەوتە گەورەیە لەبارچوو. هەر لەو ماوەیەدا (١٩٧٣) بارزانی بۆ جاری دووەم سەردانی ئیسرائیلی کرد، ئەمە وای لەبەعس‌و عەرەبەکان کرد قینی زیاتر لەگەلی کورد هەلبگرن‌و بیر لەوە بکەنەوە کەچۆن زیاتر گەلی کورد لەناوبەرن، بۆیە ئەگەر سەردانی یەکەمی بارزانی بۆ ئیسرائیل لەساڵی ١٩٦٨دا قازانجێکی بەگەلی کورد گەیاندبێ ئەوا لەسەردانی دووەمدا زیانی گەورەی لێدا، چونکە دوای ئەو سەردانە یەکسەر لەساڵی ١٩٧٤دا شەڕ لەنێوان ڕژێم‌و شۆڕشدا دەستی پێکردەوەو، دوای ئەوە لەجەزائیر رێککەوتن لەنێوان سەدام حسەین‌و شای ئێران ئەنجامدرا. هەر لەو ماوەیەدا بارزانی بڕیاری ئاشبەتاڵیدا. دوایی بنەماڵە لەرێگای پاراستنەوە وایان پڕوپاگەندە کرد گوایا ئەو کارەساتە پیلانێکی نێودەولەتی بووە بۆ سەر شۆڕش، بەلام لەبیرمان نەچێت (یقولون بأن الشعب الکردي تعرض الی مؤامرة دولیة وکانت السبب الرئیسي من حدوث النکسة، حتی یزرعو الیأس في نفوس أبناء هذا الشعب، بینما الذي حدث کان مؤامرة محلیة لتأمین مصالح النظام الرجعي الایراني والحکم التکریتي في العراق علی حساب شعبنا. وبارکت الولایات المتحدة الأمریکیة والجهات الرجعیة في المنطقة هذه المؤامرة. ولعبت بعض الدول دور الوسیط بین بغداد وطهران، والأسباب الرئیسیة لحدوث ما حل بالثورة داخلیة، ولو کنا نحن ثورة بمعنی الکلمة نملك قیادة مضحیة لم تکن حرکتنا لتزول حتی لو حیکت مؤامرة ضدها بل ربما کانت تضعف فقط، أن أقوالهم کلها هي بالطبع للتستر علی فشلهم ولتغطیة أخطائهم وعدم تحملهم للمسؤلیة عن طریق اتهام الغیر) (تقییم مسیرة الثورة الکردیة وانهیارها—اللجنة التحضیریة،١٩٧٧، ص٩٣) سەرباری هەموویشی (استلم البارزاني مبلغ ملیون دینار من ایران بعد النکسة مباشرة، ان هذا الأمر یعتبر متاجرة بمصلحة الشعب، کما أنه منافي للشرائع السماویة والأنسانیة والضمیر والوجدان، ولم یوزع من هذه المبالغ علی عوائل الشهداء والعجزة) (س.پ. ل٩٠-٩١).

پاشان بۆ بەرژەوەندی تایبەتی بنەماڵەکەیان هانی خەڵکیاندا تاکو بچنە ئێران (انهم سعوا کل السعي لجلب المزید من أبناء شعبنا الی أیران لکي یتشرد الجمیع في بلاد لا تحترم حقوق الأنسان ولا یسمح فیها بأي نشاط سیاسي) (س.پ. ل٨٦) بۆ ئەوەی ئەم کارەشیان بۆ سەربگرێ دووبارە وەکو عادەتی خۆیان دەستیانکردوە بەدرۆکردن‌و گوتیان دەمانەوێت درێژە بەشۆڕش بدەین، بەلام کاتێك (عبر المسؤلون في أیران عن عدم موافقتهم علی ذلك ترکوه فعلا، ولم یدافعوا کما یجب حتی عن اللذین عوقبوا من قبل أیران باعتقالهم أو تسلیمهم للعراق بسبب هذا النشاط، ولم یقولوا لهذه الدولة انهم المسؤلون عن الوضع ولیس هؤلاء. ولم یبق کمؤیدین لهم سوی بعض عناصر جهاز الباراستن المعروف، الذي یشکل الان عماد حزبهم

وعائلتهم) (س.پ. ل٨٨). نەك هەر ئەوەندە بەڵكو بەعەقڵی عەشائیری خۆیان دەیانگوت بێجگە لەئێمە کەسیتر بۆی نییە باسی سیاسەت بکاتو، هەر حزبێك لەژێر هەر دروشمێکدا جگە لەپارتی سیاسەت بکات، ئەوە دیارە دژایەتی بنەماڵەی بارزانی دەکات (أن بارزاني وأبنائه واتباعهم القياديون لازالو يعتبرون أنفسهم قيادة الشعب الكردي، ويعتقدون خاطئين من ليس معهم لا يملك حق القيام بنشاط سياسي ولا هو بمخلص، وان هذا الموقف هو موضع أستغراب وشجب كل كردي) هەر بۆ چەواشەکردنی خەڵك تەحسین شاوەیسو قادر فەرەجیان ناردەوە بۆ ناو رژێم، لەناو خەڵکیشدا وایان بڵاوکردەوە کەئەمانە بەفەرمانی ئەوان بۆ کاری رێکخستن هاتونەتەوە کوردستان، کە لەراستیدا مەبەستیان ئەوەبوو لەرێگای ئەوانەوە بەچەکی رژێم دەست لەشۆرشی نوێ بوەشێنن، وەکو چۆن مامە ریشەیان شەهیدکرد. ئەو بنەماڵەیە هیچ کات درێغی نەکردووە لەدژایەتی گەلی کورد، تەنانەت (وصلوا في محاربة من يخالفهم الرأي الى حد التشهير واستعمال السلاح والقتل، وأبرز مثال على ذلك هو تحريضهم لعناصر عشائرية موالية لهم لا تفهم واقع الوضع الذي يعيشه شعبنا لقطع الطريق والأعتداء المسلح على مفرزة من البشمركة تتكون من أربعين شخصاً كانت مكلفة بمهمة وطنية في كردستان العراق من قبل الأتحاد الوطني الكردستاني الأمر الذي أدى الى استشهاد معظمهم وفقدان أثر الأخرين، أظهرت هذه المجموعة عن حقدها على كل فئة أو قوة وطنية تناضل بمعزل عما تريده قيادة البارزاني) (س.پ، ل١٠٣).

ئەم کارە شەڕانگێزو ئاژاوەگێڕانەی بنەماڵە لەزیان زیاتر بەکوردی نەگەیاندوە بۆیە کاتێك لیڤی ئەشلولی نوێنەری ئیسرائیل لای بارزانی، دوای گەڕانەوەی بۆ ئیسرائیل لێی دەپرسن ئامانجی کوردەکان چییە؟ دەڵێت (أن البرزاني يرغب في الحفاظ على الوضع الراهن، ولا يرغب بمعالجة المشكلة الكردية ولا يحمل لقب الثائر الأبدي) (الموساد في العراق ودول الجوار، تأليف شلومو نكديمون ت. بدر عقيلي، ص١٨٨).

بارزانی کەبۆ کورد ئاوا بووە بەڵام بۆ بێگانە ملکەچو گوێرایەڵ بووە، بۆیە گلەیی لێناکەم کە بەعەبدولکەریم قاسم دەڵێ قەیتانی پێڵاوەکەتم، هەرچەندە درۆی لەگەڵدا کردو دوژمنی سەرسەختی بوو، بەڵام بۆچی بەرامبەر شای خائین گوتوویەتی (عندما أبلغ الشاه البارزاني ان اتفاقية الجزائر تلزمه– أي الشاه– بقطع مساعدات أيران عن الثورة الكردية وكذلك كل المساعدات التي كانت تأتيها عن طريق أيران... الخ، وأراد ان يعرف رأي ورد فعل البارزاني حول هذه المسألة وماذا سيفعل؟ كان جواب البارزاني بأختصار مايلي: نحن شعبك وما دمت راضياً عن أتفاقية الجزائر وتؤمن مصالح أيران التي هي وطننا الأم، لايوجد لدينا أيضاً شيء ضدها ونحن رهن اوامرك، اذا قلت لنا موتوا نموت او عيشوا نعيش. لقد كنا مخلصين لك ولانزال وسوف نبقى في المستقبل ايضا ونأمل أن تستمر رعايتكم لنا ولقضيتنا دوما). (س.پ . لیژنەی ئامادەکار, ل ١٠٤).

خوێنەری بەڕێز، خوشکو برای هاوزمانو هاوخەمم. هەمومان دەزانین کەخوێندنەوەی مێژوو زۆر جیاوازە لەخوێندنەوەی حیکایەتی بەرئاگردان, چونکە ئەگەر حیکایەت نووسینێکی خەیاڵی بێو بەشی زۆری بۆ کات بەسەربردن بێت، ئەوا ئەرکی سەرەکی لەخوێندنەوەی مێژوودا پەند لێوەرگرتنو هەڵوێست وەرگرتنە. مێژوو رووداوەکانی ژیانە لەرابردوودا کەدەبێ ببێتە تاقیکردنەوەو ئەزمون لێوەرگرتن بۆ داهاتوو. کەسێکیش لەمێژووەوە چاکەو خراپەو دۆستو دوژمن لەیەکتری جیا نەکاتەوە ناکرێت بەمرۆڤێکی

دروستو ساغ دابنرنێت. رەنگە فێربوون لەرووداوەکانی رابردوو خاڵێکی جیاکەرەوەی ئینسان بێت لەگیانلەبەرانیتر. مرۆڤێك هەڵەیەك بکاو دووبارەو سێبارەی بکاتەوە دیارە هەرگیز باش نابێو خۆی لەچاڵەکانی بەرپێی پێ ناپارێزێ، پێغەمبەریش(د.خ) فەرموویەتی (المؤمن لا يلدغ من حجر واحد مرتين) واتە ئیماندار دووجار لەکونێکەوە پێوە نادرێ، هەر کاتێکیش ئەوە روویدا، دیارە ئیمانداری تەواو نییە, بەواتایەکیتر مرۆڤێکی سروشتی نییە. چونکە بەپێی قورئان مرۆڤی

بێئیمان‌و کافر بەئاژەڵو بگرە کەمتریش دانراوە (أنهم كالانعام بل هم أضل سبيلا). بۆیە ئاساییە کەمێگەلەمەڕێك کاتێك یەکەمیان لەشوێنێك هەڵدەدیرێ ئەوانیتر پەندی لێوەرنەگرن تووشی هەمان هەڵدیران دەبن، خۆ ئەگەر شوانەکە فریایان نەکەوێ یەکیان لێدەرناچێ. بەڵام مرۆڤ بەهۆی عەقڵو پەندوەرگرتن لەئەزمونەکانی پێش خۆی، خۆی لەو چاڵانە دەپارێزێ کەئەوانەی پێش خۆی تێی کەوتبوون، چونکە زانیاری بەبێ کردەوە هیچ جیاوازییەکی ئەوتۆی نییە لەگەڵ کردەوەی بێ زانیاری، هەروەك ئیمامی شافیعیش دەفەرمووێ:

لو كان العلم بدون عمل شرف لكان أشرف خق الله أبليس

خوێنەری خۆشەویست: تۆ دەزانی من ئەم کتێبەم بەخوێنی خۆم نووسیوە، بەبێ ئەوەی کەس کۆمەکم بکاو دەستم بگرێ بەم کارە هەستاوم‌و ئامادەم لەپێناوی راستی‌و خزمەتکردنی گەلەکەمدا خۆم بخەمە بەردەم هەموو مەترسییەك. چونکە من لەبەرامبەر ئەو بنەماڵەیەدا کەسێکی بێتواناو بێدەرامەت‌و بێ هیچ عەشیرەتێکی وام کەبەرگریم لێبکات، حزبەکانیش گەرچی هەریەکە هەندێك لەقسەکانی پێخۆشە، بەڵام من بۆ هیچیانم نەنووسیوەو سەر بەهیچیان نیم. من تەنها لەگەڵ جەماوەرم‌و بۆ جەماوەر دەنووسم.

من خاوەنی دوانزە سەر خێزانم‌و لەیەك خانوودا دەژین‌و حاڵی حازر خاوەنی هیچ سەرچاوەیەکی دیاریکراوی ماددی نین‌و بەدرێژایی گەرمای هاوین نەمانتوانی موبەریدەیەك بکڕین. بەڵام بنەماڵەی بارزانی سەدەها کۆشك و هەزارەها ئوتومبێل و ملیۆنان دۆلاریان هەیە. پاسەوانی من خۆم‌و دوو کوڕەکەمن، هی ئەوان هەزاران چەکدارو پیاوکوژ، ئەوە جگە لەوەی لەکاتی پێویستدا دەوڵەتە ئیقلیمیەکانیش بەفریای ئەو بنەماڵەیە دێن.

لەرێگای ئاگادارکردنەوەی جەماوەر لەهەموو راستییەکانی شۆڕشی کوردو دەستنیشانکردنی دوژمنی ناوخۆ. بۆیە ئەوەی من بەقەڵەمە سێ دیناری‌و مێزەرە شڕو کۆنەکەم کردوومەو لەداهاتووشدا دەیکەم، ئەوان لەتوانایاندا نییە.

بەهەموو ئەو کتێبانەی کەنووسیومن ئەوەندەم بەسە کەخۆم ویژدانی خۆم‌و جەماوەر لێم رازی بێ، سوپاس بۆ خوا کەچەندین جار منی لەمەرگی راستەقینە پاراست، ئینشائەللا بۆ ئەوەبووە کەپەیامی خۆم بەگەلەکەم رابگەیەنم, چیم دیووەو چیم زانیوە بیخەمە سەر کاغەزو بیدەمە دەست رەش‌وڕووتی گەلەکەم تا ببێتە مایەی بەرچاوڕۆشنی‌و دواجار چارەسەرکردنی کێشەی گەلی کورد. تەنها تکام لە خوێنەری کورد ئەوەیە کەچیتر لەمافەکانی خۆی بێدەنگ نەبێ، تاکەی رێگا دەدەی بنەماڵەیەك موزایەدە بەخوێنی تۆوە بکاو لەسەر شانی تۆو لەسایەی رەنجی تۆدا سەروەت‌و سامان کەڵەکە بکاو بەملیۆنان دۆلار لەبانکەکانی جیهاندا قایم بکا؟!

هەموو دیوەخانە گەورەکانی ئەوان کەناهێڵن لەدەرگاکەی بچیە ژوور، هەموو ئوتومبێلە گرانبەهاکانی ئەوان کەبەبێ ئەدەبی بەلاتدا رەت دەبن، هەموو کۆشك و بارەگاکانیان کەچەندین پاسەوانی هەیەو بەسەعات لەپرسگەکانیاندا دەتوەستێنن، هەموو جلوبەرگ‌و زێڕو زیوەکانیان کەتۆ خەونی پێوە دەبینی، هەموو ئەمانەو زیاتریش هی تۆو ئەو خەڵکە رەشوڕووتەیە کەبوونەتە سوتەمەنی شۆڕش‌و راپەڕینەکان کەئەمڕۆ دووبارە دەیکەنەوە شەڕی ناوخۆو لەناوبردن‌و کاولکردنی ئەو کوردستانە ئازادەی کەگەل هەزاران نەوەی خۆی بۆ کردووە بەقوربانی.

کاکی خوێنەر، خوشکی بەڕێز، لەخوێندنەوەی ئەم کتێبە بۆت دەرکەوت کەبەندە چەند هەوڵی داوە بۆ یەککگرتنی حزبە کوردییەکان‌و رێکخستنیان لەبۆتەی بەرەیەکی بەرفراوانی نیشتمانیی گەورەدا تا لەسایەیدا شۆڕشەکەمان سەر بکەوێ‌و چۆك بەدوژمن دابدەین‌و لەو هەموو شەڕوشۆڕو وێرانکاریە رزگارمان بێت. هەروەها ئەوەشت بۆ دەرکەوت کەمن بەتەنیاو

بەفەرمانی سەرکردایەتیی شۆڕشی گەلەکەمان چوومە ناو قولایی دەزگای موخابەراتی عێراقیو گەیشتم بەعەبدولرەحمان عارفو سەدام حسەینو هەموو گەورە بەرپرسەکانی ئەم ڕژێمە، ئەمەش تەنها بۆ خزمەتی شۆڕشو گەلی کورد بووە. چونکە لەو ڕێگایەوە توانیومە چەندین زانیاری گرنگ بۆ شۆڕش بنێرمو یارمەتی خەڵك بدەم بەبەردانی دیلەکانیان یان سووککردنی حوکمەکانیان، بەپارەپێدانو ڕزگارکردنو دەربازکردنیان، بەداڵدەدانو شاردنەوەیان کەئەمڕۆ ژمارەیەکی زۆریان لەژیاندا ماونو دەستەڵاتی گەورەیان هەیە لەشۆڕشداو، هەندێکیتریان چوونەتە هەندەرانو ژمارەیەکیشیان شەهیدبوون.

لەو ماوەیەدا بڕوای تەواوم بەوە هات کەسەدام، تاوانبارو خوێنڕێژێکی بێوێنەیەو ناکرێ هەرگیز چاوەڕێی ئەوەی لێبکرێ کە بەئاشتی، بچووکترین مافی گەلی کورد بداتو، ئەوەشم بۆ ئاشکرابوو کەئەم کابرایە بەڕادەیەك ڕقی لەکوردە کەچاوی هەڵنایە یەکێك ببینێ بەکوردی قسە بکات. دوای بەیانی ١١ی ئاداریش کەنەمانتوانی بەباشی کەڵکی لێوەربگرینو، پاش ئەوەی باڵی م.س خۆی هەڵوەشاندەوە، من هەر پەیوەندیم بەشۆڕشو نیشتمانپەروەرانەوە نەپچرا ئەمەش بۆ زیاتر پێشخستنی کیشەکەمان. بەهەرەسهێنانی شۆڕش لەلایەن بنەماڵەوەو ڕاگەیاندنی ئاشبەتاڵیش من, خۆبەخۆو بێ هیچ ڕێنماییەکی شۆڕش لەهەوڵەکانی خۆم نەکەوتم، بۆیەو زیاتر لەجاران خۆم لەسەدام نزیککردەوە تا بتوانم ئەوەندەی هێزم تێدایەو توانام هەیە دووبارە شۆڕش دەست پێبکەینەوە، لەوپێناوەشدا یەکەمین چەکداری شۆڕشی پاش ئاشبەتاڵ، کەحەمەی مەلاشەریف بوو من دامەزراند، هەروەها پەیوەندیم بەمام جەلالەوە کرد لەبەیرووت کەئەویش داوای لێکردم پەیوەندی بکەم بەو خەڵکانەی کەبەڕێزیان داینابوون بۆ سەرکردایەتیی شۆڕش. دوای گیرانیشم لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە (١٤/٩/ ١٩٧٩) بەفەرمانی سەدام حسەین، لە زیندانیشدا وازم لەبڕواو هەڵوێستەکانم نەهێنا کە بەقودرەتی قادر ڕزگارم بوو و بەرەو لەندەن ڕۆیشتم, لەوێش لەگەڵ سیاسەتمەدارانی گەلەکەمانو ڕۆشنبیرانی، پەیوەندیم توندتر کرد بۆ زیاتر خزمەتکردنی نیشتمانەکەمان. لەوێ لەگەڵ ئیبراهیم ئەحمەدو د.لەتیفو عومەر دەبابەو عەلی کەمالو تۆفیق وەهبی بەگو چەندین نیشتمانپەروەریتر پێکەوە لەخزمەتی کوردو کوردستاندا لەهەوڵدابووین، لەوێ بەهەموو روویەك هەوڵمدەدا دەنگی گەلەکەم بەجیهان بناسێنمو تاوانەکانی ڕژێمی بەعس ئاشکرا بکەم، هەر بۆیە یەکەمین کوردبوم لەکەناڵی BBC لەساڵی ١٩٨١ چاوپێکەوتنم ئەنجامداو باسی مەینەتییەکانی گەلی کورد بەتایبەتی عێراق بەگشتیم کرد لەسایەی ڕژێمی بەعسدا، هەروەها گەورەبەرپرسانی زۆربەی باڵوێزخانەکانی جیهانم لەوێ بۆ هەمان مەبەست بەسەرکردەوە.

لەکۆتاییدا، پێم باشە هەندێك ڕاستیو نهێنیتری تایبەت بەبنەماڵە بخەمە ڕوو بەو هیوایەی خوێنەر دڵنیابێت کەماهیەتی ئەو بنەماڵیە هەر ئەوەیە کەمن باسمکردووە. چونکە سروشتی مرۆڤ وایە تا بەڵگەی زیاتری بۆ بێنینەوە زیاتر دڵنیا دەبێت. خوای گەورە لەقورئاندا لەچەندین جێگادا وەسفی ئەخلاقو بڕوای ئیبراهیم پێغەمبەری کردووەو چەندین بەڵگەی گەورەی خوایی نیشاندەدات، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەو پێغەمبەرە مەزنە داوا لەخوا دەکات بەڵگەی زیاتری بۆ بهێنێتەوە لەسەر مەزنیو گەورەیی خۆی کاتێك دەفەرمووێ (أرني كيف تحيي الموتى) واتە خوایە نیشانمبدە مردوو چۆن زیندوو دەکەیتەوە، خوای گەورەش لەوەڵامدا پێی دەفەرمووێ (أو لم تؤمن). واتە ئایا تۆ بڕوات نەهێناوە، ئەو دەفەرمووێ (بلى ولكن ليطمئن قلبي) واتە بەڵی بڕوام هێناوە بەڵام مەبەستم ئەوەیە دڵنیابم. منیش بۆ ئەوەی خوێنەر لەماهیەتی ئەو بنەماڵەیە دڵنیا بکەمەوە هەندێکیتر لەو نهێنییە گەورانەی ئەو بنەماڵەیە ئاشکرا دەکەمو دەڵێم ئەم بنەماڵیە لەکوردستاندا هیچ نین جگە لەباندێکی مافیا. ژمارەیان ٢٥٠ کەس دەبێت، بەڵام توانیویانە بەفڕوفێڵ زیاتر لە ٢٥٠ هەزار کەس لەدەوری خۆیان کۆبکەنەوە, سەرپەرشتیاری سەرەکی ئەم دەزگایەی مافیا حەمایل خانی دایکی مەسعود بارزانییە.

**تێبینی لەسەر حەمایل خان**

ئـەو ژنــە زێبارییــەو مــامی بــەپیلانی مەلامــستەفا کــوژراوە. دوای ئاشـبەتاڵ رۆژێکیــان عوبیــدوڵڵای کــوڕی مەلامــستەفا لەمێرگەسوور گوتارێکی پێشکەش کرد، لەوتارەکەیدا هێرشی کردبووە سەر حەمایل خان، یـەکێك لـەئامادەبووەکان کـەئامر لیوایەکی لەشکری عێراقی بوو هاتە لام پێی گوتم کەعوبێدوڵڵا لەمێرگەسوور هێرشـی کردۆتەسـەر مەلامـستەفاو بەتایبـەتی حەمایل خان. بۆیە داوای لێکردم بچمە لای عوبیدوڵڵا قسەی لەگەڵدا بکەم چونکە ئەمە کردەوەیەکی ناشـرینەو جـوان نییـە پیاو لەوتاردا قسەی ناشرین بەژن بڵێ. منیش چوومە لای عوبیـدوڵڵاو ئامۆژگـاریم کـرد، پـێم گـوت ئەمـە کردەوەیـەکی زۆر ناشرینە کەتۆ قسە بەژن بڵێی. ئەو لەوەڵامدا گوتی مامی ئەم ژنە زێبارییە بەفەرمانی مەلامستەفاو شێخ ئەحمەد کـوژراوە، بۆیە لەناخی خۆیدا رقی لەئێمەیەو لەیەکەم رۆژی هاتنی ئەو ژنە بۆ نـاو ئێمـە، گـەورەترین ئاژاوەمـان کەوتۆتـە نـاوو بۆتـە مایەی دووبەرەکی لەنێوانماندا.

**تێبینی**

*١- شێخ محەمەد هەرسینی کەدۆستێکی دێرینی بارزانی بوو، لـەکاتی شۆڕشـدا بەرپرسـی فرۆشـگابوو, دوای ئاشـبەتاڵ داوایان لێکرد ئەو سەرمایەیەی لایەتی کەبڕی سێ ملیۆن دیناربوو تەسـلیمی بنەماڵـەی بکاتـەوە. لەوەڵامـدا پێـی گوتبـوون منیش وەکو ئێوە کوڕی مەلامستەفاو لەبنەماڵەم، شۆڕش نەماوە بۆیە ئـەم پارەیـە هـەقی خۆمـە. شـایانی باسـە تـاوەکو ئاشـبەتاڵ هـەموو قـازانجی ئـەو فرۆشـگایە بـۆ حـەمایل خـان بـوو، بـەڵام کاتێـك ئـەو ژنـە، ئـەو وەڵامـە لەشـێخ محەمـەد هەرسینەوە دەبیستێ، فەرمان دەدا بەکوشتنیو بەدەستی پیاوانی بنەماڵە دەکوژرێ.*

*٢- خوشکە مارگرێت یەکەم ئافرەت بوو لەشۆڕشی ئەیلولدا، هەر لەیەکەم رۆژەوە دژی داگیرکەران چەکی هەڵگرت. ئەم ژنە لەلایەن جەماوەرەوە خۆشەویستو بەرێزبوو، حەمایل خان گومانی وابوو کـەمارگرێت لەگـەڵ مەلامـستەفادا پەیوەنـدی هەیە. کاتێك کەبارزانی بەگومانی حەمایل خانی زانی مارگرێتی دوورخستەوە بۆ ناوچەی بادینانو لەوێ دەست بەسـەریکرد بۆ ئەوەی حەمایل خان گومانی نەمێنێ، بەڵام حەمایل دەسـتبەرداری گومانەکـەی نـەبوو بۆیـە بـارزانی فـەرمانی کوشـتنی مـارگرێتی دەرکـرد ئـەوەبوو یەکـسەر تیرۆرکـراو بـاوکی مارگرێـت لەترسـان بـەرەو کوێـت هـەڵات. دوای ئاشـبەتاڵ کاتێـك بەسەردان هاتەوە عێراق لەئاسایشی گشتی بۆ ئیفادە بانگکرا، لەو کاتەدا منیش لەوێ بووم کەئەم نهێنییەی درکاند.*

**دابەشکردنی دەورەکان لەناو بنەماڵەی بارزانیدا**

بنەماڵەی بارزانی، تۆڕی مافیایەکەی خۆیان بەم شێوەیە دابەشکردووە:

١-ئەندامانی بنەماڵە کە لێپرسراویەتیان هەیە لەپارتیدا شێوەیەی خوارەوەیە:

ئەندامانی بنەماڵە کەلێپرسراویتیان هەیە لەحزبو لەحکومەتدا:

- مەسعود مستەفا محەمەد عەبدولسەلام بارزانی ـ سەرۆك.
- نێچیر ئیدرس مستەفا بارزانی ئەندامی مەکتەبی سیاسیو سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.
- هۆشیار محمودئاغا محەمەد زێباری خاڵی مەسعود ـ ئەندامی مەکتەبی سیاسیو لێپرسـراوی مەکتـەبی پەیوەندییـەکانی دەرەوە.

– عبدالمهیمن سلیمان عەبدولسەلام بارزانی کوڕی ئامۆزای مەسعود ــ ئەندامی یەدەگی کۆمیتەی ناوەندیو لێپرسراوی ئیدارەی فەرماندەی لەشکری کوردستان ــ فلك.

– سیداد مستەفا بارزانی سەرپەرشتیاری مەکتەبی سەرۆك.

٢–مەکتەبی سیاسی پارتی ٩ کەسە، ٣ کەسیان سەر بەبنەماڵەیە.

٣– لێپرسراوانی بنەماڵە لەفەرماندەیی لەشکری کوردستان (فلك) ئەمانەی خوارەوەن:

– مەسعود مستەفا بارزانی ــ فەرماندەی گشتی فلك.

– عبدالمهیمن سلیمان عەبدولسەلام بارزانی ــ لێپرسراوی ئیدارەی فلك.

– قاسم بارزانی ــ لێپرسراوی هەواڵگری گشتی فلك.

– لیوا بابەکر زێباری خزمە دایکی مەسعود ــ لێپرسراوی فەرماندەیی دهۆك.

– وەجیه مستەفا بارزانی ـ لێپرسراوی فەرماندەیی ی سەفینو لیوای تایبەتو سەرپەرشتیاری تۆپخانە.

– بەهزاد لوقمان مستەفا بارزانی ــ لێپرسراوی سوپای بارزان.

– مەنسور مەسعود مستەفا بارزانی ــ لێپرسراوی حیمایەی بارەگای بنەماڵە.

– شوکت شێخ یەزدین ــ وەزیری ئەنجومەنی وەزیران.

٤–لێپرسراوانی بنەماڵە لەپەیوەندیەکانی دەرەوە:

– هۆشیار محمودئاغا محەمەد زێباری خاڵی مەسعود ــ لێپرسراوی مەکتەبی پەیوەندیەکانی دەرەوە.

– دڵشاد مسەفا بارزانی ــ نوێنەری پارتی لەئەڵمانیا.

– سەیوان سابیر مستەفا بارزانی ــ نوێنەری پارتی لەفەرەنسا.

–فەرهاد لوقمان مستەفا بارزانی ــ نوێنەری پارتی لەئەمریکا.

٥–لەسنوری ناوچەی سۆران قەزای سۆرانو قەزای مێرگەسوور، پارتی مەبەستیەتی لێپرسراوەکان بارزانی بن، لەوانە:

– لەلقی ١٠ی سۆران شەجیع بارزانی لێپرسراوی لقوعەدۆ کەریم بارزانی کارگێڕی لق.

– رەزا خالید بارزانی لێپرسراوی ئاسایشی سۆرانو مێرگەسوورو چۆمان.

**چەند تێبینیەك لەسەر سامی عەبدولرەحمان:**

١– لەکاتی هەڵبژاردنی پەرلەماندا لەدهۆك ئەم کابرایە بەفەرمانی بنەماڵە درایە بەر هێلکەو تەماتەی رزیو، بەڵام پاش ماوەیەکی کەم بوو بەدەمڕاستو دەهۆڵچی ئەم بنەماڵەیە، لەکاتێکدا خۆی ئەندام نیە تیایاندا!

لەدانیشتنێکی بەرەی کوردستانیدا مام جەلال رووبەڕوو پێی گوتبوو تۆ هەشت ملیۆن دینارو ئیزگەیەکی رادیۆت لەرژێمی بەغدا وەرگرتبوو، دەڵێ بۆ هەر من وەرمگرتووە! ئەی بۆ لەمەسعود بارزانی ناپرسی کەئەم هەموو یارمەتیەی لەرژێمەوە بۆ دێت؟ بەڵام ئێستا خۆی ناوێرێ بپرسێ بۆچی لەشکری بەعس لە ٣١ی ئاب ئاوا بەهانای بنەماڵەوە هات!

دوای راپەڕین سامی بەناوی نەخۆشی چووبووە بەغدا، لەوێ چاوی بەسەدام کەوتو

لەسەر تەلەفزیۆن دەرکەوت. دوبەدوای ئەمە کەهاتەوە، حزبەکەی (پارتی گەلی دیموکراتی کوردستان)ی هەڵوەشاندو چووە ریزی پارتی کەدیارە ئەمە فەرمانی سەدام بووە. ئەم کابرایە ئێستا گەورەترین دستی هەیە لەئاژاوەگێڕان و خۆشکردنی شەڕی براکوژی.

ئیسحاق عیبادی کەئەفسەرێکی ئیسرائیلی بوو، هەردەم لەگەڵ سامیدا بووە لەهاتوچۆکانی بۆ بینینی بەرپرسە ئیسرائیلیەکان لەوانە گۆڵدا مائیر کەسەرۆکی حکومەتی ئەوسای ئیسرائیل بوو(الموساد فی العراق، ص٢٢٠). ئەمە بەلگەیەکی ئاشکرای خیانەتکاری لەمێژینەی ئەم کابرا سەر بەگۆبەندەیە، هەروەها ئاماژەیەکی روونە بۆ ئەوەی کەسامی هەردەم گوێڕایەڵی بێگانەبووە، چونکە بەپێی عورفی دیبلۆماسی، سامی مافی ئەوەی نیە سەرۆك وەزیرانی وڵاتێك ببینێ ئەگەر بۆ کاری موخابەراتیو جاسوسی نەبێت.

بۆیە ئەم کابرایە لەیەکەم رۆژی دەست تێکەڵکردنی لەگەڵ سیاسەتدا تەنها ئاگری خیانەتو گوێڕایەڵبوونی بۆ بێگانە خۆشکردوە. لەکاتی کودەتای ساڵی ١٩٦٣دا لترسی کوشتن هانای بۆ پارتی برد، کاك عەبدوڵلا کانیمارانی بەئۆتۆمبێلەکەی خۆی دەیگوازێتەوە بۆ کۆیەو لەمەرگ رزگاری دەکات، بەڵام ئێستا خەڵکی گلەیی لەبنەماڵەی کاك عەبدوڵلا دەکەنو دەڵێن نەدەبوو ئەو کابرایە ئاژاوەگێڕەتان رزگار کردبا، ئەوەش لەبەرئەوەی بنەماڵەیەکی رۆشنبیرو نیشتمانپەروەرن.

٢- ئەم بنەماڵەیە لەرۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا خاوەنی گەورەرین سەرمایەن. دوای ئاشبەتاڵ زانراو ئاشکرابوو کەئەم بنەماڵەیە ٧٠ ملیۆن دۆلارو ٤٥ ملیۆن دیناریان لەبانکدایە، خوێنەری بەڕێز هەرچەندە من لەو کاتەدا ئەمە دەنوسم حاسبەم لەبەر دەستدایە، بەڵام لەبەر سەرقاڵیو بێکاتی بۆ تۆی بەڕێزی جێدێڵم تا حسابی بکەیو بزانی ئەم سەرمایەیە لەساڵی ١٩٧٥ەوە تا ئەو ساڵەی ئەم نوسینە دەخوێنیتەوە بەسودی بانکەوە تا ئێستا بووە بەچەند،. ئەوە جگە لەوەی کەئەم بنەماڵەیە وەکو نەهەنگ لەهەموو لایەکیان وەرگرتووەو دەستیان بەسەر هەموو داهاتو سەروەرتو سامانی خزمەتگوزایدا گرتووەو لەدەرەوەی وڵاتدا چەندین پرۆژەو کۆمپانیاو شەریکەو ئوتێلو چێشتخانەی گەورە گەورەیان هەیەو، حاڵی حازر خاوەنی ملیارێكو سەدو حەفتا ملیۆن دۆلارن. ئەوە بێجگە لەوەی ساڵانە مووچەی ١٥ هەزار چەکدار لەحکومەتی تورکیا وەردەگرن، بۆ هەر چەکدارێك ٢٠٠ دۆلار, جگە لەوەی مانگانە یەك ملیۆن دۆلار یارمەتی لەهەمان حکومەت بەرامبەر شەڕکردنی دژی PKK وەردرەگرن.

٣-شێوازی کارکردنی بنەماڵە، موخابەراتیی رووتە. لەیەکەم رۆژی دەستبەسەراگرتنی ئەم بنەماڵەیە بەسەر پارتیدا لەلایەن مەلامستەفاوە دەستیانکرد بەتەسفیەکردنی نەیارانی سیاسەتەکانی خۆیان. بەتایبەتی دوای کۆنگرەی شەشەمی قەڵادزێ، کە لەدوای ئەم کۆنگرەیەوە بنەماڵە توانی بەیەکجاری دەست بەسەر پارتیدا بگرێ.

٤-ئەم بنەماڵەیە، لەرێگای دەزگا جۆراوجۆرەکانی راگەیاندنەوە بەردەوام خەریکی تەفرەدانی خەڵكو هەڵخەڵەتاندنیان هەموو عێراقو گۆڤارو رادیۆو کەناڵە تەلەفزیۆنە جۆراوجۆرەکانیانو وەزارەتی رۆشنبیرییان خستۆتە خزمەتی خۆیان. لەهەر چوار پارچەی کوردستاندا چەندین رۆشنبیرو نوسەریان راستەوخۆو ناڕاستەوخۆ کڕیوە، هەر بۆیە بڕیاری کوشتنی منیشیاندا چونکە ئامادە نەبووم ببمە زوڕناژەنی ئەوان. ئەمڕۆ لەهیچ ناوچەیەکی کوردستانداو لەژێر دەسەڵاتی هیچ حزبێکی کوردیدا بەئەندازەی پارتی بڵاوکراوەو نوسین لەسەر کوردایەتی دەرناچێت، بەڵام لەواقیعدا هیچ حزبێك بەو ئەندازەیە خائینو دژەکورد نیە. لەناو هەموو ئەو دەزگایانەی پارتیدا گوڵان کە لەلایەن خودی نێچیرەوە سەرپەرشتی دەکرێو رووی راگەیاندنی پاراستنە، ئەم دەزگایە لەهەموویان بەدناوترو گڵاوترە.

٥-ئەم بنەماڵەیە بەتەواوی پشتیان بەدەوڵەتە ئیقلیمیەکان بەستوە، ئم دەوڵەتانەش

بۆیە یارمەتییان دەدەن چونکە دڵنیان لەوەی کەئەم بنەماڵەیە مەترسی نین لەسەر بەرژەوەندیەکانیانو کار بۆ سەربەخۆیی کوردستان ناکەن. بەڵگەی ئاشکرای ئەوەش ئەو هەموو شەڕانەیە کەدەوڵەتە ئیقلیمیەکان لەسەر ئەو بنەماڵەیە کردویانەو دەیکەن، کە لەراستیدا شەڕە لەسەر بەرژەوەندیەکانی خۆیان. هەر ئەوەش وایکردوە سنوری دەسەڵاتی ئەوان تا رادەیەك بێدەنگو ئارام بێت، وەکو هەولێر. چونکە ئەم شارە بارەگای نهێنیی هەموو دەزگاکانی موسادو موخابەراتی عێراقیو سی ئای ئەیو میتی تورکیو ئیتلاعاتی تێدایە، کە بەهەر هەموویان کار بۆ پاراستنی بەرژەوندییەکانی خۆیان دەکەن. بەڵام کاتێك مەسعود بارزانی دێت بۆ هەولێر هەزار پاسەوانی زیاتر لەگەڵدایە، چونگە گەلو جەماوەری لەگەڵدا نیە، دڵنیام لەداهاتودا چۆن لوقمان دوای ئاشبەتاڵ, بارزانی لەئێران جێهێشتو لەنامەیەکدا بۆ باوکی نوسیبووی من توانام نەما ئیتر جێت دێڵمو دەچمە بەغدا, بەهەمان شێوەش رۆژێك دێت سوداد وا بەمەسعود بڵێ‌و، چۆن لەزاخۆ خەڵك پەلاماری گومرگی ئیبراهیم خەلیلیاندا، بەهەمان شێوەش جەماوەری شاری قەڵاو منارە لەبچوکترین هەلدا رادەپەڕنو شاربەدەریان دەکەن.

٦–ئەم بنەماڵەیە گوێیان بەهیچ پێوەرو ئەخلاقێکی کوردەواری نەداوە. بۆ نموونە:

أ–ساڵی ١٩٦٥ کاتێك بارزانی هاتە گوندی لەنگەدێ(ناوچەی پێنجوێن)و بەمیوانی مایەوە، کە لەو کاتەدا ئەحمەدی مینەڕەندان خاوەنی گوندەکەبوو، کاتێك ئەو نۆکەرەی لەبەردەستی بارزانیدابوو هاتوچۆی دەکرد بینی کچێکی جوان لەو گوندەدا هەیە، بۆیە هاتە لایو پێی گوت لەماڵی ئەحمەد مینەڕەندان کچێکی زۆر جوان هەیە ناوی سەبرییە. بارزانی یەکسەر بەشوێنیدا دەنێرێ. کاتێك کچەکە دەبینێ بارزانی پێی دەڵێ: دەمەوێت بتکەمە کچی خۆم، ئەویش وەڵامی دەداتەوە دەڵێ: هەموو ئافرەتانی کوردستان کچی تۆنو شانازیشت پێدەکەن، بارزانی درێژە بەقسەکانی دەدا دەڵێ: دەمەوێت بتدەم بەسابیری کوڕم. کچەکە پێی دەڵێ: من لەساڵی ١٩٥٩وە دەستگیرانم هەیەو دراوم بەبەهائەدینی حاجی سەفەر، بەڵام مەلامستەفا بەدەستو پێوەندەکانی خۆی دەڵێ بچن بەخزمو کەسوکارەکانی بڵێن خۆشی بێو ناخۆشی بێ ئەمە بووکی بارزانییە. لەو کاتەدا خۆم لەو ناوچەیەدا بووم کەزێڕو جلوبەرگەکانی بەهائەدینیان لەسەبریە کردەوەو بۆ ماڵی حاجی سەفەریان ناردەوە، هەروەها لەوێش بووم کەهەڵپەرکێکەیان لەبەردەم ماڵی بەهائەدین کرد بۆ سوکایەتی پێکردنو دەربڕینی دەسەڵاتی خۆیان.

ب– عوبەیدوڵڵای کوڕی گەورەی مەلامستەفا ژنێکی ئاسوری هەبوو و خاوەنی منداڵێکیش بوو، بەڵام بارزانی فەرمانیدا بیکوژن، هەتا ئەمڕۆش نازانرێت تەرمەکەی چی بەسەر هات.

ج– لەناوچەی باڵەکایەتیدا چەندین روداوی لەو جۆرە رویداوە کەوای لەخەڵکی ناوچەکە کردوە بەگشتی دژی ئەم بنەماڵەیە بن. بۆ نموونە بارزانی زۆر ژنی ئەم ناوچەیەی لەدەستو پێوەندەکانی مارەکردوە دوای ئەوەی بەتەڵاقدانیداون. یەکێك لەوانە بەبارزانی دەڵێ تۆ ئامادەی دەستبەرداری ژنەکەی خۆت بێت تا مێرد بەیەکێکیتر بکات، بارزانی بەم قسەیە توڕە دەبێو یەکسەر فەرمانی کوشتنی دەدا. ژنێکیتریش بەهەمان شێوە لەتاو پاراستنی ناموسو کەرامەتی خۆی ملکەچی فەرمانی بارزانی نەبوو بۆیە خۆی کوشت.

٧–ئەو بنەماڵەیە دوژمنی سەرسەختی هەموو عەشیرەتە کوردپەروەرو نیشتمانپەروەرەکان بوونو، لەرێگای دژایەتیکردنی ئەو عەشیرەتانەوە خۆیان بەسەر کوردستان سەپاندوە. لێرەدا بەباشی دەزانم بەکورتی تیشك بخەمە سەر هەڵوێستی نابەرپرسانەو دوژمنکارانەی ئەو بنەماڵەیە بەرامبەر ژمارەیەك لەعەشیرەتە ناودارو ناسراوەکانی گەلەکەمان. بنەماڵە لەمێژووی دوژمنایەتیکردنی عەشیرەتە کوردیەکاندا خاوەنی لاپەڕەیەکی خوێناویو پڕ لەخیانەتە، لەو رێگایەدا

چەندین گوندیان سوتاندوەو چەندین هاولاتی کوردیان کوشتوە، لەدواجاریشدا لەرێگای درۆو بوختانەکانیانەوە ناوبانگی ئەو عەشیرەتانەیان زڕاندوە تا خۆیان بەتاکە عەشیرەتی کوردپەروەر بناسێنن کە لەراستیدا ئەمەش یەکێکیترە لەفێڵە گەورەکانی ئەم بنەماڵەیە. هەروەها بەڵگەیەکیتری دیکاتۆریو ملهوڕی بنەماڵەی بارزانیە بەرامبەر گەلی کورد بەگشتیو عەشیرەتە ناسراوە کوردپەرەوەرەکان بەتایبەتی کەهەر لەسەرەتای پەیدابوونیانەوە ئەمە کاریان بووە تا تا ئیمڕۆ. ئەمەی خوارەوە نمونەیەکی رەفتارەکانیانە بەرامبەر عەشیرەتە کوردیەکان.

### عەشیرەتی سورچی.

سەرۆکی ئەم عەشیرەتە لەناوچەی سۆران حوسێن خدرئاغا سورچیو عومەر خدرئاغای سورچییە لەگوندی "کەلەکین"ی سەر بەناحیەی خەلیفانی پارێزگای هەولێر. لەشەستەکانی سەدەی رابردووەوە تا ئێستا پەیوەندییەکی دۆستانەی توندم لەگەڵ ئەم دوو پیاوەو عەشیرەتەکەیاندا هەیە. عومەرئاغا لەسەرەتای شۆڕشی ئەیلولەوە لەگەڵ هێزی پێشمەرگەدا بووەو رۆڵی سەرەکی هەبووە لەچالاکییەکانی سنووری خەلیفان. بەسەرکردایەتیی ئەو زاتە ناحیەی حەریر لەسەرەتای شۆڕشدا لەدەست رژێمی عێراق ئازادکرا، هەروەها توانی مەخفەرەکانی کەلەکینو خەلیفانو گەلی عەلی بەگو خەلان ئازاد بکا. بۆیە دوای ئەم چالاکییە فراوانانە ناوو ناوبانگی خۆیو عەشیرەتەکەی لەناو هەموو کوردستاندا بلاوبووەوە. بارزانی کەزانی ناوی عەشیرەتی سورچیو ناوی عومەرئاغا خەریکە جێگەی خۆیو عەشیرەتەکەی دەگرێتەوە دەستیکرد بەبەرنامەدانان بۆ زڕاندنی ناوودەنگیان. بۆیە دوای ماوەیەکی کەم لەو داستانانە بارزانی بۆسەیەکی بۆ عومەرئاغاو عەشیرەتەکەی نایەوە تا لەناویان بەرێ. بەلام یەکێك لەوانەی فەرمانی کوشتنی عومەرئاغای پێدەدرێت هەواڵەکە زوو دەگەیەنەتە لای عومەرئاغا، ئەویش لەترسان شۆڕش بەجێ دەهێڵێو دەچێتە ناو رژێم. ئەو عەشیرەتە لەوساتەوە تا راپەڕین هیچ پەیوەندییەکیان بەبنەماڵە نەما. ساڵی ۱۹۸۳ مام جەلال منی ناردە لای ئەو عەشیرەتە بۆ گفتوگۆو دانوستان.

ئەو عەشیرەتە لەمێژووی خۆیدا چەندین هەڵسوکەوتی جوامێرانەی بەرامبەر گەلەکەمان نیشانداوە، بۆ نموونە ساڵی ۱۹۸۸ کاتێك رژێم دۆڵی بالیسانی کیمیابارانکرد، خەڵکی ناوچەکە هانایان بۆ ئەم عەشیرەتە برد تا فریایان بکەون، زەیدی کوڕی عومەرئاغا بەهانایانەوە دەچێو هەموو برینداره‌کانیان دەگەیەنێتە نەخۆشخانەی سەربازی. لەنەخۆشخانە کابرایەك بەزەید دەڵێ تیمارکردنی برینداری چەکی کیمیاوی بەفەرمانی رژێم قەدەغەیە، ئەگەر بریندارەکە سەربازی لەشکری عێراقیش بێو بەهەڵە پێکرابێ. بۆیە ئەو خەڵکەی دەرزییان لێدەدرێ دەرمان نییەو ئاوی مقەتەرە. زەید کەگوێی لەمە دەبێ دەچێتە لای ئەفسەری بەرپرسی نەخۆشخانەکەو بەتوڕەییەوە فەرمانی پێدەکات کەدەبێ ئەو بریندارانە تیمار بکرێن، بەلام ئەفسەرەکە پێی دەڵێ ئەو کارە لەدەست مندا نیەو فەرمانی سەرکردایەتیی شۆڕشە. زەید دەمانچەکەی دەردەهێنێو دەیخاتە ناودەمیو بەزۆر هەموو بریندارەکانی پێ تیمار دەکات. ئەم رووداوە، دوایی زەیدو عەشیرەتەکەی تووشی گیروگفتی زۆر کرد لەگەڵ رژێم.

نموونەیەکیتری جوامێریی ئەو عەشیرەتە ئەویە کاتێك سەدام لەسەرەتای راپەڕیندا حوسێن ئاغای سورچیو چەند کەسێکیتر بانگ دەکاو داوایان لێدەکا هەریەکە لەگەڵ هەزار چەکداردا بچن بۆ باشوری عێراق بۆ رووبەڕووبوونەوەی راپەڕینی شیعەکان، حوسێن ئاغا وەلامی دەداتەوەو بەزیرەکی خۆی بڕوا بەسەدامو داروده‌ستەکەی دەهێنێ کەنابێ یەك کورد لەدامرکاندنەوەی راپەڕینی باشوردا بەشداربن (وەفیق سامرائی ئەمەی باسکرد). هەروەها کاتێك لەهەولێر کۆبوونەوە

بە ٤١٥ مستەشار دەكرێو بەناوی سەركردایەتیی بەعسەوە پێیان رادەگەیەنرێ كە لەمەودوا لەهەر گوندێكدا یەك پێشمەرگەی لێبێت هەموو گوندەكە كیمیاباران دەكرێ، یەكەم كەس كەلەو كۆبوونەوەیەدا دەستی نارەزایی بەرزكردەوە عومەرئاغای سورچی بوو كە لەبەرپرسەكەی پرسیبوو ئایا ئەوەی ئێوە لەكوردستان ئەنجامیدەدەن، لەشاریشدا دووبارەی دەكەنەوە؟ ئەوانیش گوتبویان نەخێر، ئەوجار عومەرئاغا گوتبوی گوندەكەی من كەلەكین نزیكەی ٥٠٠ماڵە، ئایا ئەگەر كورێك لەماڵێك لەو ماڵانە چووە ناو پێشمەرگە ئێوە هەموو گوندەكە كیمیاباران دەكەن؟ ئەوانیش دەڵێن بریاری سەركردایەتیی شۆڕشە كەدەبێت هەموو گوندەكە وێران بكرێت.

ئەم هەڵوێستەی عومەرئاغا وایكرد لەكۆی ٤١٥ موستەشارەكە ٤٠٩یان دەنگی نارەزایی خۆیان بخەنە پاڵ دەنگی عومەرئاغاو بەرامبەر ئەو بریارە بوەستنو تەنها شەش موستەشاریان لەگەڵ بریاری بەناو ئەنجومەنی سەركردایەتیی شۆڕشدا دەبن.

دوای ئەمە رژێم لەسەعات نۆی بەیانیەوە تا پێنجی ئێوارە دەرگایان لەسەر دادەخات، لەو هەشت سەعاتەی زیندانیكردنی ئەو ٤٠٩ موستەشارەدا، لەناو خۆیاندا دەستدەكەن بەگفتوگۆ، لەئەنجامدا بریاردەدەن ئەگەر ئەمجارە رزگاریان بێ ئەوا لەداهاتودا هەموو توانایەكی خۆیان دژی رژێم بكاربهێنن. لەكاتی راپەرینیشدا ئەو بەڵێنەیان بردەسەر، تەنها ئەو شەش موستەشارە خۆفرۆشە نەبێت كە بەبریارەكە رازیبوون. شایانی باسە ئێستا یەكێكیان لەگەڵ بنەماڵەدایە كەناوی میرزایەو خەڵكی كۆیەیە.

سورچیەكان لەكاتی راپەریندا رۆڵی سەرەكییان هەبوو لەراماڵینی بەعسو رزگاركردنی
ناوچەكانی خۆیانو سەرجەم ناوچەكانیتر بەتایبەتی كەركوك. دوای راپەرین كاتێك مەسعود بارزانی گەیشتە قەزای سۆران لەماڵی عزەت بەگی دەرگەڵەا لەگەڵ عومەرئاغاو حوسێن ئاغا كۆبۆوە، دوای كۆبوونەوەكە كاتێك عومەر ئاغاو حسێن ئاغا هەڵسان برۆن، مەسعود لەخزمەتیاندا چوو تا گوندی كەلەكین.

سورچیەكان سەرەتا یارمەتیەكی زۆری بنەماڵەیانداو چەندین ئوتومبێل و پارەیان پێدان. تا لە ١٩٩٦/٥/٢٩ مەسعود داوای لەعومەرئاغا كرد میوانداری بكا، ئەویش وەڵامی دەداتەوە دەڵێ ئێمەی پارتی پارێزگاران لەگەڵ هەموو حزبە كوردیەكان لەیادی شۆڕشی ئیسلامیدا لەكۆماری ئیسلامی ئێران دەعوەت كراوین، بۆیە هەركاتێك لەو سەردانە هاتینەوە ئاگادارت دەكەینەوە. دوای ئەوەی عومەرئاغا لەگەڵ حزبە كوردیەكان كارەكانیان تەواو دەبێت، لە ١٩٩٦/٦/٩ دەسەڵاتدارانی ئێران ئاگاداریان دەكەنەوە كە ١٠ی مانگ لەتارانەوە بۆ ورمێ بەفرۆكە بەرێ دەكرێت لەوێشەوە بەئۆتۆمبێل بۆ كوردستانی عێراق. دوای خۆئامادەكردنی نوێنەری حزبە كوردیەكان بۆ گەرانەوە بۆ كوردستان، سكرتێری ئاغای محەمەدی دێتە لایانو پێیان دەڵێ: ئەوەی سورچیە با بمێنێتەوە، چونكە كارمان پێیانە. لەهەمان رۆژدا بەفەرمانی مەسعود لەحاجی ئۆمەران بۆسە بۆ عومەرئاغا دەنرێتەوە، لەسپیلكیش بۆ حسەین ئاغا. بەڵام لەبەرئەوەی عومەرئاغا لەئێران دەمێنێتەوەو لەكاتی دیاریكراودا ناگاتەوە كوردستان، تەنها حسەین ئاغا كەوتە ناو بۆسەوەو لەسپیلك دەستگیركرا. بۆیە كاتێك بنەماڵە دڵنیادەبێت عومەرئاغایان بۆ دەستگیرناكرێو پلانەكەیان سەرناگرێ، هەمان رۆژا حسەین ئاغا ئازاد دەكەن. دوای ئازادكردنی فەرەنسۆ هەریریو كەریم جومعەو عەریف حوسێن رۆژانە دەچنە لایو پێی رادەگەیەنن كەئەم كارە بەفەرمانی مەسعود بارزانی نەبوە، بەڵكو بەهەڵە روویداوە، بەم قسانە تەنها مەبەستیان ساركردنەوەی حوسێن ئاغاو دروستكردنەوەی متمانەبووە.

لەهەمان ماوەدا كەریم جومعە لە ١٥ی مانگدا نامەیەك لەمەسعود بارزانی بۆ حسێن

ئاغا دەباو پێی رادەگیەنێ کەسبەی نیوەڕۆ، مەسعود لەلای تۆ میوان دەبێ. حوسێن ئاغا بەتەواوی دڵنیادەبێتو، یەکسەر فەرمان بەهەموو ئەو چەکدارو کەسوکارەی کرد کە لەچواردەوری گوندی کەلەکین لەئامادەباشیدابوون بڵاوەی لێبکەن، کەژمارەیان نزیکەی ٣ هەزار چەکدار دەبو، لەوانە جەمیل ئاغای سورچیو زەیدی کوڕی عومەرئاغای سورچی کەبرازاو زاوای حسێن ئاغا بوو. زەید دەچێتە لای حسین ئاغاو پێی دەڵێ ئەو فەرمانەی تۆ نە لەبەرژەوەندی عەشیرەتو نە لەبەرژەوەندی کوردە، بنەماڵە درۆت لەگەڵدا دەکەنو خیانەتت لێدەکەن، تۆ مامی منیتو من برازاتم، ناڕۆمو بەتەنها جێتناهێڵمو نایەڵم ئەو هێزەش بڵاوەی لێبکا. بەڵام حوسێن ئاغا دەڵێ مەسعود من ناکوژێت چونکە من هیچم بەرامبەری نەکردوە. لەدواجاردا حوسێن ئاغا فەرمان بەزەید دەدا کەدەبێ خۆی بڕواو هێزەکەش بڵاوەی پێبکرێت، ئەوانیش بڵاوەی لێدەکەن. بنەماڵە ئەمە بەهەل دەزانێو رۆژی پاشتر سەعات پێنجی بیانی لە ١٩٩٦/٦/١٦دا لەشکری بنەماڵە پەلاماری گوندی کەلەکین دەدەنو حوسێن ئاغا بەبرینداری دەگرنو دەیکوژن. دوای ئەوە لەشکری بنەماڵە هەموو گوندی کەلەکینیان تاڵانکرد, دارەکانیان سوتاندو نەوتیان کردە ژێر رەگەکانیان.

لەدوای ٣١ی ئابیشدا جمیل ئاغای برای حسێن ئاغا گیراو پاشان کوشتیان. دوای ئەم رووداوە هەر سەرکردەو کادیرێکی پارتیم بینیبێ، لەبەرامبەر ئەو رووداوەدا دەیگوت: ئەمە باشترین کاری مەسعود بارزانی بوو، واتە رووداوەکەی کەلەکین. تەنها شێخ محەمەد خالید بارزانی نەبێت کەکارەکەی بەکردەوەیەکی خراپ دادەناو، کاتێك چووم بۆ لای پێی گوتم: ئەگەر زوو هاتبای بۆ لامو ئاگادارت کردبام، نەمدەهێشت ئەم کارەساتە رووبدات.

دوای ئەو کارەساتە کەوتمە لێکۆڵینەوە تا بزانم بنەماڵەی بارزانی بۆچی وایانکرد. پاش بەدواداچوونو لێوردبوونەوە سەرەداوی زۆر زانیاریم کەوتەدەست کەبڕوای پێهێنام کەئەم کارەی بنەماڵە بەفەرمانی خودی سەدام بووەو دژی دروشمی رزگارکردنی ولایەتی موسڵ کە لەلایەن پارتی پارێزگارانەوە بەسەرکردایەتیی عومەرئاغا بەرزکرابووەوە, کەوا لێرەدا بەکورتی بۆ خوێنەری دەخەمە سەر کاغەز.

هەمووما دەزانین پارتی پارێزگاران بەسەرکردایەتیی عومەرئاغای سورچیو خزمو کەسوکارەکانی دامەزراوە، لەرووی سیاسیشەوە خاڵی جیاکەرەوەی ئەم حزبە لەهەموو حزبە کوردییەکانیتر زەقکردنەوەی کیشەی ولایەتی موسڵە، کەدەیانگوت بەشێکی دانەبڕاوە لەکوردستانو پێویستە وەکو کەرکوك بەکوردستانی داگیرکراوی دابنێن. هەروەکو لەکتێبەکەی کاك نەجم عومەرئاغای سورچیدا (مصیر ولایة الموصل) دەردەکەوێ. ئەو پێداگرتنەی پارتی پارێزگاران لەسەر کێشەی ویلایەتی موسڵ وایکرد سەرنجی زۆر رووناکبیرو سیاسەتمدار، لەناوەو لەدەرەوەی کوردستاندا بەلای خۆیاندا رابکێشن.

عومەرئاغا زۆرجار باسی ئەوەی بۆ کردووم کەوڵاتە داگیرکەرەکانی کوردستان لەسەر ئەم دروشمە گرفتیان بۆ ناوەتەوەو داوای لێدەکەن دەستبەرداری ئەو دروشمە بێت. ئەوەشی بۆ گێڕامەوە کەجارێکیان لەئەنقەرە سەڵاح عومەر عەلیو عەلی سنجاری داوایان لێکردووە کەواز لەکێشەی ولایەتی موسڵ بێنێت. هەروەها ئەوەی بۆ باسکردم ئەو کاتەی عومەر ئاغای سورچیو نەجم سورچیو میستر کیلەر لەژنێف بۆ گفتوگۆ لەسەر کێشەی موسڵ کۆبوونەوە، کە لەئەنجامدا رێگایان پێدرابوو ماوەی چارەکە سەعاتێك لەسەر کێشەی ویلایەتی موسڵ قسە بکەن, پاش ئەوەی نووسینێکیان لەسەر ئەم بابەتە دایە دەست بەرپرسانی ژنێف, ئەوان لەوەڵامدا رۆژێکیان بۆ دیاریکردبوون بۆ ئەم مەبەستە. لەهەمان هۆڵدا لەنزیك عومەرئاغاو کاك نەجم، سێ نوێنەری رژێمی عێراق دانیشتبوون کەبارزان تکریتی بەرپرسی یەکەمیان بوو و دوو کەسەکەیتریان یەکێکیان مەسیحییەك بوو بەناوی ئەبو محەمەد. هەرسێکیان پێیان رادەگەیەنن کەکاغەزێکی سپی

بەئیمزای بارزان دەخەن بەردەستیانو، ئازادن چی دەنووسن تا بۆیان جێبەجێ بکەن، بەمەرجێك ئەو گوتارەی لەسەر کێشەی ویلایەتی موسڵە نەخوێندرێتەوە. عومەرئاغا لەوەڵامدا پێیان رادەگەیەنێ کەدەستەبەرداری ئەم بیروباوەڕە نابێو گوتارەکەیان پێشکەش دەکەن. بەڵام بارزان تکریتی وازی لێناهێنێو هەر لەهەولێدا دەبێ بۆ بڕوا پێهێنانیان، کاتێکیش دڵنیا دەبێ لەوەی کەئەوان گوتارەکەیان هەر دەخوێننەوە بەعومەرئاغا دەڵێ پێم باشە بزانی مادام وایە تۆو هەموو بنەماڵەکەت لەناودەبەین, عومەر ئاغاش بەرەقی وەڵامی دەداتەوە دەڵێ من بەجلوبەرگی کوردی لەو هۆڵە دێمە دەرەوە ئینجا تۆ ئەگەر زات دەکەی بمکوژە.

دوای ئەوەی عومەرئاغا ئەوەی بۆ گێڕامەوەو کارەساتی کەلەکین رویدا, بەتەواوی بڕوام بەوە هات کەسەدام لەپشتی ئەم رووداوەیە. بۆیە تا چەند ساڵێك داوی ئەم رووداوەش من هەر گومانم هەبوو لەو کارەساتەو دڵنیابووم کەئەو کارەی بنەماڵەی بارزانی، لەوە گەورەترە کەخەڵك تێی گەیشتووە، چونکە من بەتاقیکردنەوە بۆم دەرکەوتووە کەبنەماڵە بەو شێوەیە کارێك ئەنجام نادات ئەگەر فەرمانی دەوڵەتانی لەسەر نەبێت. هەمووشمان دەزانین کەپارتی پارێزگارانو عەشیرەتی سورچی، لەدەرەوە دۆستی زۆریان هەیە، بۆیە بەردەوام پرسیارم لەخۆم دەکرد کەچۆن ئەم کارە ئەنجامدرا؟ هەتا ئەوەبوو لەمانگی ٩ی ساڵی ٢٠٠٠دا لەکاتی نانخواردنم لەگەڵ عومەرئاغای سورچی پێم گوت: من هێشتا گومانم هەیە لەهۆکارە راستەقینەکانی ئەو کارەساتە؟ بەو شێوەیە هێنامە قسەو راستییەکانم پێدرکاند, کەوا لێرەدا دەیخەمە بەردەستی خوێنەران تا بزانن بنەماڵەی بارزانی چۆن بەفیتی بێگانە ئاگر لەماڵی کورد بەردەدەن. هەرچەندە تا ئەو رۆژە زیاتر لەبیست جار لەسلێمانی لەگەڵ عومەرئاغا دانیشتبوومو گفتوگۆم کردبوو، بەڵام ئەوە یەکەم جاربوو بەم شێوەیە بکەوێتە قسەکردن لەسەر رووداوی کەلەکین، منیش بڕیارمدا ئەو راستییانە بۆ هەموو خەڵك ئاشکرا بکەم. عومەر ئاغا بەم شێوەی رووداوەکەی گێڕایەوە:

### عومەرئاغای سورچی و پرۆژەی کۆنفیدراڵی کوردو تورکدا

سەرکردەیەکی موخابەراتی عەسکەری تورکی بەناوی (جەم) پەیوەندی پێوەکردمو پێی راگەیاندم کەحکومەتی تورکی بەتایبەت سەرۆك تورکوت ئۆزال بەهەموو جۆرێك پشتگیریتان دەکات بۆ دامەزراندنی کۆنفیدراڵییەك لەنێوان تورکو کورددا بۆ ویلایەتی موسڵ. هەروەها پێی راگەیاندم کەپاش ماوەیەکیتر داوا دەکرێم بۆ تورکیا تا لەگەڵ ئۆزالدا قسە لەسەر ئەو بابەتە بکەین، گوتی دەبێ ئەو قسەوباسە تا رۆژی راگەیاندنی نهێنی بێت. حەوت رۆژ پێش مردنی ئۆزال گەیشتمە ئەنقەرە، لەوێ لەیەکێك لەئۆتێلە گەورەکان ژوورێکیان دامێ. سەرەتا سکرتێری حزبێکی تورکیم بینی کەناوی تورکش بوو. ئەو کەسەی منی بردەلای, ئەفسەرێك بوو بەپلەی عەمید، زمانی عەرەبیو کوردی بەباشی دەزانی، هەر هەمان ئەفسەر بردمیەلای سەرۆك ئۆزال. لەکاتی گفتوگۆدا پێی گوتم: بڕیارمداوە شتێك بۆ ئێوە بکەم، چونکە بڕوام هاتووە کەئێوە زوڵمی زۆرتان لێکراوەو ناڕەحەتیتان زۆر بینیوە، بۆیە دەمەوێ یارمەتیان بدەم تا ببنە حکومەت. ئینجا داوای لێکردم کەئەم کارە تا رۆژی راگەیاندنی بەوپەڕی نهێنی بمێنێتەوە، هەروەها کارێکی وا بکەم لەماوەی ١٠ رۆژدا سی سەرکردەو سیاسەتمەداری ناسراوو سەرۆك عەشیرەتی گەورەی کوردی بگەیەنمە خزمەتی. کەسەرکردە جەم, هەموو کارئاسانیەکیان بۆ دەکات لەسنووری تورکیاوە تا ئەنقەرە ئەوسا کۆبوونەوەیەکی فراوان ئەنجامدەدەینو رایدەگەیەنین کەئێمە بڕیارمانداوە موسڵ بەشێکی کوردستانەو لەلایەن تورکو کوردەوە بەڕێوەدەبرێ, پاش چەند ساڵێك بۆ یەکجاری حکومەتی کوردی رادەگەیەنین.

سـەرۆك ئـۆزال(قـسەكە هـی عومـەرئاغایـە) ئەوەشـی پـێ گـوتین كەپێویـستە لەهـەمان كۆبوونـەوەدا نوێنـەرانی كـورد بەیاننامەیەك بۆ حكومەتی توركی ئیمزا بكەن كەتێیدا بەڵێن بدەن ساڵانە یان ملیارێك دۆلار بدەن بەحكومـەتی تـوركی یـان لە ٢٥٪ی داهاتی نەوت. بۆ جێبەجێكردنی ئەم كارەش توركەكان گوتیان ئێمە هەموو شتێكمان ئامادەكردووە. عومـەرئاغا لەدرێژەی قسەكانیدا گوتی دوای تەواوبوونی كۆبوونەوەكە بەدڵخۆشی هاتمە دەرێو بڕیارمدا لـەماوەی دیـاریكراودا ئـەو ٣٠ كەسە كوردە ئامادە بكەم. بۆ ئەم مەبەسـتە یەكـسەر پەیوەنـدیم كـرد بەنـەجمو داوام لێكـرد كەبـەزوترین كـات بـەم كـارە هەڵبستێ، بەڵام بەداخەوە دوای ٧ ڕۆژ لەم كۆبوونەوەو بڕیارانە توركۆت ئۆزال لەبارودۆخێكی نادیارو ئالۆزدا كۆچـی دوایـی كرد. پاش ئەمەش بۆ ماوەیەكی كەم سەركردە جەم, كـە لەفڕۆكەیـەكی هەلیـكۆپتـەردا بـوو، موشـەكێـكی ئـاراستـــەكراو لـەگـەڵ یاوەرەكانیدا كوژرا كە لەنـاویـانـدا

ئەفسەرێكو سكرتێرەكەی كەئافرەت بوو, بەركەوتن.

شـایانی باسـە لـەكاتی گفتوگـۆكردنی عومـەرئاغا لەگـەڵ ئۆزالـدا، كۆمپانیایـەكی نـەوتی ئـەمریكی بـڕی ٥ ملیـۆن دۆلار لەبانكێكی سویسری دادەنێ بەناوی پێنج سەركردەی پارتی پارێزگاران، بـەو مەرجـەی هـەركاتێك كـورد ببێـت بەدەوڵـەتو ویلایەتی موسڵ بێتە ژێردەستیان ئەوا دەبـێ لـەبری ئـەو پێـنج ملیـۆن دۆلارە ٧ ملیـۆن دۆلار بدرێتـەوە هـەمان كۆمپانیـا، هـەروەها پـڕۆژەی بـیرە نەوتـەكانی كوردسـتان بدرێتـە هـەمان كۆمپانیـا كـە بـەنرخی ڕۆژ نـەوتیان پـی بفرۆشـێ. پـارەی كۆمپانیاكە لەبانكی سویسرا بەناوی عومەر خدر سورچی، عبدالقادر بریفكـانی، ئـاكۆ عـەباس مامەنـدئاغا، ئیـبراهیم حـاجی مەلۆ، مستر كیلەر دانرابوو. بەڵام عومەرئاغا، دوایی بەو چوار كەسەیتر رادەگەیەنێ كەئەم پارەیە هی گەلی كوردەو بەناوی حكومەتەكەیەوە خراوتە بانكەوە، بۆیە كەس بۆی نییـە یـەك دۆلاری بـەبێ ڕەزامەنـدی هـەر پێنجیـان لێ رابكێـشێ. كاتێـك عومەرئاغا زانی عبدالقادر بریفكانیو ئیبراهیم حاجی مەلۆو میستر كیلەر دەیانەوێ پارەكە لەنێوان خۆیانـدا دابـەش بكـەن، خۆی دەگەیەنێتە سویسراو هەموو پارەكە بۆ كۆمپانیاكە دەگێڕێتەوە. پەیوەندی ئەم ڕووداوە بەمەسەلەی توركۆت ئۆزالو دروستكردنی كۆنفدراڵی كوردی ـ توركی لەسـەر ویلایـەتی موسـڵ ئەوەیـە كەئـەم مەسـەلەیە نـەك هـەر لەلایـەن توركیـاوە بەجدی وەرگیراوە بەڵكو لەلایەن كۆمپانیا نەوتە گەورەكانی جیهانیشەوە لەئانوساتدابووە.

هەر لەچوارچێوی ئەم كارەدا ئۆزال پێش ئەوەی عومەرئاغا ببینێت بەماوەیەكی كەم مام جەلالو كاك مەسعودی لەگەڵ خۆیدا بۆ سعودیە بردبوو، چونكە ئۆزال بڕوای وابوو كەئەگەر سـعودیە بـەم كـارە ڕازیببێـت ئـەوا دەكرێـت سـەرجەم وڵاتـە عەرەبییەكانیترو ئەمریكاش رازی بكرێ. كاتێك دەگەنە سعودیە, ئۆزالو مام جەلالو كاك مەسـعود لەلایـەكو مـەلیك فهـدو ئەمیرخالیدو ئەمیرعەبدوللاو ئەمیرسوڵتان لەیەلاكیتر كۆبوونەوەیان ئەنجامـدا، لەدانیـشتنەكەدا ئـۆزال باسـی چەوسـاوەیی كوردو ئازارو ئەشكەنجەكانیان دەكاتو دەڵـێ كـورد مـافی خۆیانـە دەوڵـەتی سـەربەخۆیان هـەبێ، بـەم كـارە جگەلـەوەی كەچاكە لەگەڵ ئەم گەلەدا دەكەین لەهەمانكاتدا هـۆی سـەرەكی ئـاژاوەو نائـارامی لەناوچـەكەش بنـبڕ دەكـەین، بۆیـە بـۆ بەدیهێنانی ئەم مەبەستە، پێویستە ویلایەتی موسڵ لەعێراق جیابكرێتەوەو بەڕێوەبردنی بدرێتەدەست توركو كورد. مەلیك فهد بەئینگلیزی وەڵامیان دەداتەوەو چەند جارێك لەسەر یەك دەڵێ NO شتی وانابێت، هەرچـەندە ئـۆزال هەوڵـدەدا بـڕوای پێبێنێ بەو پێشنیارە بەڵام ئەو هەر دەڵێNO. بۆیە كۆبوونەوەكە بەبێ هیچ ئەنجامێك كۆتایی پـێ دەهێنرێت. دوای ئـەوە بەماوەیەكی كەم ئۆزال بەدوای عومەرئاغادا دەنێرێو ئەوەی پێ رادەگەیەنێ كەپێشتر باسمكرد.

دوای ئـەوەی ئـەو زانیاریانـەم دەسـتکەوت، بـڕوای تـەواوم بـەوە هـات کـەکوژرانی سـەرۆك ئـۆزالو سـەرکردە جـەم بەدەسیـسەی C.I.Aو موسـادو میتـی تـورکی بـووە. مەسـعود بـارزانیش بـۆ جێبـەجێکردنی فـەرمانو داخوازییـەکانی موخابەراتی عێراقیو ئەو دەزگا سیخوڕییانە, پەلاماری گوندی کەلەکینی داو ئەو کارەساتەی خولّقاند.

لێرەدا سـەرنجەدەدەین سـعودیە ئامادە نـەبوو لەکاتی ئەوپەڕی ناکۆکـی لەگـەڵ ڕژێمـی

عێراقیدا ملکەچی بڕیارێك بێت کە بەبڕوای خۆیان دژی نەتەوەی عەرەبە. بەڵام لەناو ئێمەدا بنەماڵە نەك هەر زۆر بەئاسـانی بـەبێ دواکـەوتن فەرمانـەکانی دوژمـن جێبـەجێ دەکـا بـەڵکو هـیچ کـات درێغـی نـەکردووە لەزڕانـدنی نـاوی عەشــیرەتە کوردپەروەرەکانو تاوانبارکردنیـان

بەخائینو خۆفرۆشو پیاوی بێگانە، کەخۆیان لەراستیدا داهێنەری خیانەتو خۆفرۆشین.

## عەشیرەتی برادۆست

ئەم عەشیرەتە لەوەچەی خانی لەپ زێڕینن، ئەو پیاوەی قەڵای دمدمی لەئێراندا دروستکرد. ئەمانە لەئێرانەوە بۆ عێـراق هـاتوون بۆیـە ئێـستاش لـەئێران، لـەورمێو دەوربـەریو لەمەرگـەو شـنۆو ناوچـەی برادۆسـت هـەن، هـەروەها لـەتورکیا لەشەمزینان. دوژمنایەتیکردنی بنەماڵەی بارزانی بەرامبەر ئەم عەشیرەتە، لەو کاتەوە دەست پێدەکات کەبنەماڵە دەستیان بەسەر عەشیرەتەکانی شێروانیو دۆڵەمەڕیدا گرت کەسنووریان لەگەڵ عەشیرەتی برادۆستە. لەسییەکانی سەدەی رابردوودا بارزانییەکان هێزێکی زۆریان کۆکردەوە پەلاماری عەشیرەتی برادۆستیان داو شەڕ دەستی پێکرد، لەئـەنجامی ئـەو شـەڕەدا چـەند گونـدێکی برادۆسـت وێرانکـران وەك: لـەم گوندانـە گونـدی مـەلای شـەکی کەهـەموویان مـەلازادەبوونو هـەژارو کەمدەرامەت بوون کەگوندەکەیان چۆڵ نەکرد بەڵکو مەلای گوند (مەلاسعید) قورئـانی پـیرۆزی هـەلگرتو بـەرەو لەشـکری بارزانییەکان چوو، کاتێك پێیان گەیشت داوای لێکردن بۆ خاتری ئەو قورئانە هیـچمان لێمەکـەن، بـەلام بارزانییـەکان پـاش پاڕانەوەی مەلاسەعید، قورئانەکەیان لێوەرگرتو مەلاسـەعیدو هـەموو خـەڵکی گوندەکـەیان بەگـەورەو بـچوکەوە کوشـت. پاش چەند رۆژێك برادۆستییەکان پەلاماری بارزانییەکانیان داو لەناوچەکە دەریانپەڕاندن. پـاش چـەند سـاڵێك بارزانییـەکان کۆبوونەوەو دیسانەوە پەلاماری عەشیرەتی برادۆستیان دایەوەو گونـدەکانی دەشـتەهێرتو لێلکـانو چـەند گونـدێگیتریان سوتاندو تالآنیانکردو چەند رۆژ شەڕ لەنێوان هەردوولا بەردەوام بوو، ئەوەبوو چەند سەرۆك عەشیرەتو ئاغـای کوردسـتانی ئێران نامەیان بۆ شێخ رەشید لۆلان (شێخی عەشیرەتی برادۆست) نارد تێیدا گوتبوویان کەتۆ چـۆن لەگـەڵ مەلائیکەتـەکان شەڕ دەکەی کەمەبەستیان بارزانییەکان بوو. ئەویش وەڵامیدانەوە کەئەم مەلائیکەتانە پاش ماوەیەکی کـەم بۆلای ئێـوەش دینو دەگـەنە خزمەتتـان. ئەوەبوو پـاش ماوەیەکـی کـەم بارزانییەکان

لەشەڕی برادۆستییەکان شکانو بەرەو ئێران هەڵاتن.

پاش ماوەیەکی کەم کاتێك لەیەکێك لەگوندەکانی سـیلوێ بـۆ نـانخواردن کۆدەبنـەوە بارزانییـەکان هـەموویان دەکـوژن. پاش ئەوە بارزانییەکان لەترسان هەڵاتنەوە بۆ کوردستانی عێـراقو پـەنایان بـۆ عەشـیرەتی برادۆسـتی هێنـا, عەشـیرەتی برادۆستیش زۆر رێزی لێگرتنو بەخێراتنی کردنو لەگوندی خەنیرە کەگوندێکی برادۆستییانە لەسـەر سـنووری کوردسـتانی ئێرانە لەرۆژهەڵاتی گوندی لۆلان، جێیان کردنەوە، بەڵام بارزانییەکان پاش ماوەیەکی کەم خۆیـان تەسـلیم بـەرژێمی عێـراق کردەوە، تەنها مەلامستەفاو چەند کەسێك نەبێ لەناو عەشیرەتی برادۆسـتی مانـەوە، لـەو ماوەیـەدا عەشـیرەتی برادۆسـتی گەورەترین خزمەتیانکردن. پاش چەند رۆژێك محمودبەگ کەسەرۆکی عەشـیرەتی برادۆسـتی بـوو هێزێکـی لەبرادۆسـتیەکان

لەگەڵ مەلامستەفادا نارد بۆ ناوچەی بارزان، لێپرسراوی ئەو هێزە حسەین بەگی مەجیدخانی برادۆست بو کەئێستاش لەلای مەسعود بارزانی زیندانییە لەمەسیف بەبێ هیچ تاوانێك، جگە لەوەی ئێستا تەمەنی هەشتا ساڵ زیاترە، لەکاتێکدا ئەم کابرایە نەك هیچ تاوانێکی دەرهەق بەبنەماڵە ئەنجام نەداوە بەڵکو مەلامستەفاشی لەدەست حکومەتی بەعس رزگارکردووە.

کاتێك مەلامستەفا بەرەو سۆڤیەت ڕۆیشتن محمودبەگ یارمەتی‌و کۆمەکی خزم‌و کەسوکارەکانی دەکرد لەموسڵ، بگرە محمودبەگ یارمەتی لەسەعید قەزاز وەرگرت‌و چو بۆ لای شێخ ئەحمەدی بارزان کەئەو کاتە نەفی کرابوو بۆ بەسرە, لەوێ پێی ڕاگەیاندبوو ئامادەیە هەر داوایەك شێخ ئەحمەد هەیبێ بۆی جێبەجێ بکات. بارزانی یەکەم کەس بوو کە٥٠٠ تفەنگی ئینگلیزی لەرژێمی عێراق وەرگرت بۆ شەڕی برادۆستیەکان شانبەشانی رژێمی عێراق، کە لەئەنجامدا پاش شەڕێکی درێژخایەن برادۆستییەکان ناچاربوون بچنە سنووری ئێران‌و تورکیا، ئەوەش لەپاداشتی ئەو هەموو چاکەیەی برادۆستییەکان لەگەڵ بنەماڵەدا. پاش ئەوەی عەبدولکەریم قاسم هاتە سەر دەستەڵات گفتوگۆ لەنێوان برادۆستیەکان‌و حکومەتی بەعس دەستی پێکرد، ئەوەبوو دانووستانەکە سەری گرت‌و هەموو برادۆستیەکان گەڕانەوە ناوچەکانی خۆیان. لەبەهاری ١٩٦١دا دووبارە بارزانییەکان شەڕیان بەبرادۆستییەکان فرۆشتەوە، ئەمجارەیان برادۆستییەکان بەسەر بارزانییەکاندا زاڵبوون‌و تەواوی گوندەکانی دۆڵەمەڕییان لەبارزانییەکان پاککردەوەو تا نزیك مێرگەسوور ڕاویاننان، بەڵام حکومەتی بەعس بەفریایان هات‌و فڕۆکەو تۆپ‌و تانکی رژێم بووە پاڵپشتی بارزانییەکان‌و چەندین ناوچەیان بۆردومان کردو خەڵکی بێتاوانیان کوشت بەڵام هەر نەیانتوانی برادۆستییەکان بشکێنن، ئەوەبوو حکومەت هەڕەشەی کردو گوتی ئەگەر برادۆستییەکان پاشەکشە نەکەن ئەوا سەرجەم ناوچەکە وێران دەکەین, ئەوانیش بەمەبەستی پاراستنی ژیانی هاوڵاتییان گەڕانەوە سنوورەکانی خۆیان.

کاتێك شۆڕشی ئەیلولیش دەستی پێکرد برادۆستییەکان وەکو هەموو عەشیرەتێکی کوردپەروەر رۆڵی سەرەکییان هەبوو لەسەرخستنی شۆڕشەکەدا، ئەوەبوو کەریم خان لەگەڵ هێزێکی گەورە چوو بۆ ناوچەی باڵەك‌و پەلاماری بنکەو بارەگا سەربازییەکانی رژێمی عێراقیدا، لەهەمانکاتدا لەشکرێکی گەورەی بارزانییەکان بەسەرکردایەتی مەلامستەفا لەبارزانەوە بەرەو باڵەکایەتی بەرێدەکەوێ، لەرێگا تووشی کاروانێکی برادۆستییەکان دەبن کەبەبێ چەك لەدیاناو رەواندزەوە بەرەو ناوچەکانی خۆیان دەگەڕانەوە، لەشکری بارزانییەکان ڕێگایان پێدەگرن‌و بەفەرمانی مەلامستەفا هەموویان دەکوژن، لەناویاندا سێ منداڵ بەچەقۆ سەربڕان، پاشان هەموو کاروانەکەیان تاڵانکرد. کاتێك کەبارزانییەکان دەگەنە باڵەکایەتی، فەرمانی کوشتنی کەریم خان دەردەکەن بەڵام لێپرسراوی ناوچەکە وەڵامیان دەداتەوە دەڵێ چۆن دەبێ پێشمەرگەیەکی قارەمانی وەك کەریم خان بکوژن، پاشان بارزانی دەڵێ دەبێ بەزوترین کات کەریم خان بکوژن بەڵام هەندێك کوردپەروەر خۆیان دەگەیەننە لای کەریم خان، ئەویش لەگەل لەشکری برادۆستی لەدۆڵی باڵەکایەتی دەچێتەوە بەرەو ناوچەکانی خۆیان، هەتا لەهاوینی ساڵی ١٩٦٢دا مەلامستەفا لەگەڵ هێزێکی گەورەی بارزانییەکان‌و ژمارەیەکی زۆر لەهێزی پێشمەرگە بەناوی کوردایەتییەوە پەلاماری عەشیرەتی برادۆستی دایەوە، لەئەنجامدا شەڕێکی گەورەی چەند ڕۆژە بەرپابوو کە لەئەنجامدا برادۆستییەکان دووبارە ئاوارەی ئێران‌و تورکیا بوونەوە. تا ساڵی ١٩٧٠ کەبەیانی ١١ی ئادار دەرچوو دووبارە عەشیرەتی برادۆستی گەڕانەوە ناوچەکانی خۆیان بەو ناوەی کەهەموو شتێك کۆتایی هات بەڵام ماوەیەکی کەمی نەبرد کەبارزانییەکان کەوتنەوە پیلاندانان‌و شەڕفرۆشتن بەعەشیرەتی برادۆستی، کەوای لەکەریم خان‌و ئامۆزاکانی‌و هەندێك لەپیاوەکانی کرد پەنا بۆ رژێم بەرن‌و لەناوچەی موسڵ جێنشین بن تاکو ساڵی ١٩٧٥.

## عەشیرەتی شێروانی:

شێروانییەکان یەکێکن لەو عەشیرەتە کوردپەروەرانەی کە لەشۆڕشەکانی گەلەکەماندا چەندین شەهیدیانداوەو رۆڵی گەورەیان هەبووە لەخەباتی رزگاریخوازی گەلەکەمان، لەگەڵ بارزانییەکاندا بەشداری گەورەی شۆڕشیان کردووە دژی رژێم، بەڵام هەر کاتێك بنەماڵە هەلی بۆ هەڵکەوتبێ دەستیان لەو عەشیرەتە وەشاندووەو لەپشتەوە خەنجەریان لێداون.

بنەماڵە سەرەتا بەسەر شێروانییەکانیدا سەپاند کەدەبێ کەجەمادانەی سوور لەسەر بنێن، بەڵام ئەوان بەمە رازی نەبوون. لەو کاتەدا سەرۆك عەشیرەتی شێروانی عوزێرئاغای سەرۆکانی بوو، کەنەوەی حەسەن بەگی کاکەیی بوو, پێیان دەگوت میرنشینی شێروانی. لەو کاتەدا بارزانییەکان بەسەر شێروانییەکاندا زاڵبوون لەرێگای خاتوونی خوشکی ئەحمەدئاغای بیرسیاوەی کەخێزانی سۆفی محەمەد بوو کەباوکی مەلامستەفایە. ئەحمەدئاغاش ئامۆزای عوزێرئاغای سەرۆکانی بوو. بەڵام هەر یەکەیان جێنشینی گوندێك بوون. بنەماڵە, ئەحمەدئاغایان چەواشەکردو پێیان گوت ئەگەر تۆ هاوکاریمان بکەی بۆ کوشتنی عوزێرئاغا ئەوا دەتکەین بەسەرۆك عەشیرەتی شێروانی، ئەوەبوو ئەحمەدئاغا هەڵسا بەکۆکردنەوەی هێزێکی ١٥٠ کەسی لەخێڵی بەرۆژی کەپێیان دەڵێن بارزانی، بەڵام لەراستیدا بارزانی عەشیرەت نییە بەڵکو لەچەند گوندێك پێکهاتووە. کەبەرۆژیو زێباری هێرشیان کردە سەرگوندی سەرۆکانیو عوزێرئاغایان کوشت لەگەڵ کوڕە گەورەکەی رەشیدو دووبرای حاجی عەزیزو خوارزایەکی ساڵح, گوندەکەشیان بەشێوەیەکی دڕندانە سوتاندو تاڵانیانکرد، لەو کاتەوە ناکۆکی لەنێوانیاندا دەستی پێکرد. کۆمەڵێك لەشێروانییەکان کەوتنە لای ئەحمەدئاغای بیرسیاوەیو کۆمەڵێکیتریان کەوتنە لای میرای کوڕی عوزێرئاغای سەرۆکانی کەئەو کاتە تەمەنی ١٨ ساڵ بوو.

میرا دوای دوو ساڵ پەنای بۆ ساڵح بەگی برادۆستیو سەمەدبەگی هاروونەیی برد کە خاڵو خوارزای یەکترو هاوسنووریش بوون. ئەوەبوو لەهەرسێك لا هێزێکیان کۆکردەوەو پەلاماری بنەماڵەی بارزانییاندا توانییان تا سەر جۆی رێزان سنوورەکەیان لێ پاك بکەنەوەو نزیکەی ٣٠-٥٠ کەسیان لێبکوژن. بۆ ماوەی سێ ساڵ توانییان هەموو ئەو ناوچەیە لەبارزانییەکان پاکبکەنەوە. لەهەمان ماوەدا هێزێك لەعەشیرەتی سوورچیو زێباریو شێروانیو مزووری کۆبوونەوەو هێرشیان بردەسەر گوندی بارزانو توانییان گوندەکە بگرن، عەبدولسەلام بارزانی لەترسان بەرەو ئێران رایکرد، ئێرانیش عبدولسەلامی تەسلیم بەعوسمانیەکان کردەوە. لەو کاتەدا دەوڵەتی عوسمانی ویلایەتی موسڵی بەڕێوە دەبرد، ئەم ناوچەیەش سەر بەویلایەتی موسڵ بوو. عوسمانیەکان، ساڵی ١٩١٤ عەبدولسەلامیان لەسێدارەدا, چونکە ناوبراو کەلێپرسراوی گومرگی پردی نێوان زێبارو بارزان بوو پارەیەکی زۆری لەرێگای باجەوە کۆکردەوە، هەرهەمووی بۆ خۆی برد، لەکاتێکدا دەبوو تەسلیم بەوالی برادۆستی بکا. هەروەها کاروانێکی برادۆستی لەبۆسەیەکدا قەتلوعام کردبوو. پاش دامەزراندنی دەوڵەتی عێراقی عەرەبی، لێبوردنی گشتی بۆ بارزانییەکان دەرکراو گوندی بارزان ئاوەدانکرایەوەو شێخ ئەحمەد کرا بەسەرۆکی بارزانییەکان، ئەحمەدئاغای بیرسیاوەی لەسەر خیانەتەکانی خۆی هەر بەردەوام بوو، ئەوەبوو کچەکەی خۆی (مەحبوبی)دا بەمەلامستەفا کەخوارزای خۆی بوو، شێخ ئەحمەدیش بۆ دەربڕینی سۆزو وەفاداری خۆی بەرامبەر ئەحمەدئاغا بەنهێنی بەرەشیدی برازای ئەحمەدئاغای گوت ئەگەر تۆ مامی خۆت بکوژی ئەوا دەتکەم بەسەرۆك عەشیرەتی شێروانی. رەشید لەساڵی ١٩٢٣دا مامی زەهرخواردوو کردو کوشتی.

هەر لەو ساڵەدا میرای عوزێرئاغا کۆچی دوایی کرد. دوایی ئەمە قورتاسی مەلاموسا کەئامۆزای عوزێرئاغابوو, پەیدابوو دەستیکرد بەدژایەتیکردنی بنەماڵە، بەڵام مەلامستەفا هەر زوو کەهەستی بەوە کرد خوشکی خۆی دا بەنوری بەگی رێزانی

کەئامۆزای قورتاسی مەلاموسا بوو، دوای ئەوە یەکسەر مەلامستەفا داوای لەنوری بەگ کرد قورتاس بکوژێ، ئەویش بۆ جێبەێکردنی ئەم فەرمانە هێرشی کردە سەر گوندی کەکلەیی‌و قورتاسیان کوشت، دوای ئەمە بنەماڵە بەتەواوی دەستیانگرت بەسەر شێروانی‌و مزووری سەروژوریێ‌و دۆڵەمەڕی‌و ناوچەیەکی فراوانی زێبارییەکان. کە تا ئەمڕۆ لەرێگای ئەو خیانەت‌و دوژمنکارییانەی بنەماڵە توانیویانە ئەو ناوچانە لەژێر دەسەتەڵاتی خۆیاندا بهێڵنەوە.

## عەشیرەتی هەرکی:

ئەم عەشیرەتە کوردستانی سوریای لێدەرچێ لەهەموو پارچەکانی‌تری کوردستاندا هەن.

لەکوردستانی تورکیا لەم ناوچانەدا هەن: هەکاری، وان، ئەرزەرۆم، ماردین، بنگلو، لەکوردستانی ئێرانیشدا لەم ناوچانەدا هەن: ورمێ، ئازەربایجانی غەربی، لوڕستان. لەکوردستانی عێراقیشدا لەپارێزگاکانی دهۆک‌و موسڵ‌و هەولێرو گوندی قەرەچەتان لەناوچەی سلێمانیدا هەن‌و. ژمارەیەکیشیان لەدیالە دەژین. ئەم عەشیرەتە وەکو هەموو عەشیرەتە کوردەکانی‌تر، لەشۆڕش‌و راپەڕینەکانی گەلەکەماندا رۆڵی بەرچاویان هەبووە. لەکوردستانی تورکیا کاتێك شێخ سەعیدی پیران شۆڕشی راگەیاند، هەرکیەکان رۆڵی بەرچاویان هەبوو لەپشتگیریکردنی شۆڕش، زێرۆ بەگی هەرکی کە لەتایفەی سیدان بوو، لەکوردستانی ئێرانەوە خۆی گەیاندە کوردستانی تورکیا بۆ بەشداریکردن لەشۆڕشدا. شایانی باسە عەشیرەتی هەرکی لەسێ تایفە پێکدێت: مەندان، سەراتی، سیدان. حارسی باندوری هەرکی، کەباپیری ئەحمەدئاغا بووە، لەگەڵ سمکۆ ئاغای شکاك بەشداری شۆڕشی کردوە. ئەم پیاوە پۆستی رابەری گشتیی هێزە چەکدارەکانی شۆڕشی گرتەدەست، هەروەها جیهانگیر ئاغای کوڕی حاجی ئاغای هەرکی لەتایفەی مەندان‌و پیرۆت ئاغای سەعیدئاغای مەندان بەشداری بەرچاوی ئەم شۆڕشەیان کرد، بەگشتی هەرکییەکان لەسەرەتای شۆڕشی سمکۆ ئاغا تا کۆتایی، رۆڵی بەرچاویان هەبووە. زێرۆ کوڕی حارس لەکۆماری مەهابادیشدا رۆڵی سەرەکی هەبوە لەسەرخستنی ئەو تاقکردنەوەیەداو، لەبەر قارەمانیەتی پلەی جەنەراڵی پێ بەخشرا.

پاش هەرەسی شۆڕشی شێخ سەعیدی پیران‌و لەسێدارەدانی شێخ سەعید، شێخ

عەبدوڵلا کوڕی شێخ عەبدولقادری نەهری کەیەکێك بوو لەرابەرانی شۆڕش، بەرەو کوردستانی ئێران بەرەو لای زیرۆ ئاغا هەڵات، تورکەکانیش دەستیانگرت بەسەر خاوخێزان‌و هەموو سەروەتەکەی لەتورکیا. شایانی باسە شێخ عەبدالله تاکە سەرۆك عەشیرەت بوو لەو هەشتاوچوار عەشیرەتەی کەتوانی لەدەسەلاتی تورکەکان هەڵێ‌و خۆی بەدەستەوە نەدا. زیرۆ ئاغا بەمەبەستی یارمەتیدان‌و رزگارکردنی خاوخێزان‌و کەسوکاری شێخ عەبدالله پەلاماری ناوچەی شەمزینانی کوردستانی تورکیا دەدات‌و هەموویان رزگار دەکاو بەرەو کوردستانی ئێران دەیانهێنێت، هەروەها لەو پەلامارەدا ١٢٠ سەربازی تورکی کەچوار کەسیان ئەفسەری گەورەبوون بەدیلی گیران، کەدواتر لەکوردستانی ئێران ئازادکران. ئەمانە هەموو بەڵگەی شۆڕشگێڕی‌و کوردپەروەری ئەو عەشیرەتەیە کەمن لەترسی درێژدادڕی بەوەندە کۆتایی پێدێنم، ئەگەرنا ئەوا ئەو عەشیرەتە نموونەی لەو جۆرەیان ئەوەندە زۆرە مەگەر بەکتێبێکی گەورە تەواو بێ.

بەڵام بارزانییەکان لەرێگای ناوناتۆرەو بوختانەکانی خۆیانەوە، ناوی ئەم عەشیرەتەیان زڕاندوەو ئەو راستییانەیان لەخەڵك شاردۆتەوە. بارزانیەکان لەسیەکانی سەدەی رابردووەوە پەلاماری ناوچەی هەرکی نیشینەکانیاندا بەمەبەستی کۆنترۆڵکردنی. دوای روخانی کۆماری مەهاباد هەرکییەکان دەستیانداوە چەك‌و درێژەیان بەشەڕەکانیاندا لەگەڵ حکومەتی ئێران، کەزیرۆ ئاغا سەرکردایەتی ئەو شەڕانەی دەکرد. پاش ئەوە زیرۆ ئاغا لەسەردەمی پاشایەتیدا گەڕایەوە بۆ

عێراق، ئەوەبوو یەکسەر بۆ ماوەی چوار مانگو دوو ساڵ گیراو، پاش ئەوەی چەندین جار لەلایەن کەسوکارەکانیانەوە مەڕوماڵاتو پارەو پولێکی زۆریان سەرفکرد بۆ ئازادکردنی بەڵام بێسوود بوو، هەتا ئەحمەدئاغا هاتە لای شێخ مەحمود کە لەناوچەی داریکەلی بوو لەساڵی ١٩٥١. شێخ مەحمود بەدوای شێخ قادری برایدا نارد بۆ دانانی رێوشوێنی ئازادکردنی زیرۆ ئاغا، شێخ مەحمود نامەیەك بۆ وەصی دەنوسێو دەیداتە دەست شێخ قادری برایو، پێی رادەگەیەنێ کەنابێ لەدەسەڵاتدارانی حکومەتی عێراق بترسێ، ئەویش وەڵامی دەداتەوە دەڵێ لەکەس ناترسم، ئەوجا شێخ مەحمود پێی دەڵێ برۆ بەوەصی بڵێ: مامت دەڵی ئەگەر جیاوازی لەنێوان کوردو عەرەبدا نیە بۆچی زیرۆ ئاغا دەگرن، ئەو پیاوە لەکوردستانی ئێران هەرچییەکی کردوە پەیوەندی بەئێوەوە نیە. هەروەها شێخ مەحمود بەشێخ قادر دەڵێ: بزانە ئەگەر بەپارەو سامان بەری دەدەن ئەوا چییان دەوێ دەیاندەینێ، ئەگەرنا ئەوە بابزانن من شێخ مەحمودی چاونەترسم پێدەڵێن، بۆیە لەئاسمانیش بێت لەدەستیان دەردێنم. پاشان شێخ مەحمود دەڵێ دیارە ئەوانە دژی کوردن بۆیە ئەو کارەیان ئەنجامداوە.
لەدوای ئەوە ئەحمەدئاغا لەگەڵ شێخ قادر دەچنە بەغداو لەئوتێل سمیرأمیس دادەبەزن، لەوێوە هەواڵ دەگاتە وەصی عبدالالە، ئەویش داوایان دەکا. شێخ عبدالقادر لەگەڵ مەجیدی برای زیرۆ ئاغاو لەگەڵ ئەحمەدئاغای کوڕی زیرۆ ئاغا دەچنە لای وەصی. شایانی باسە شێخ مەحمود بەشێخ قادری گوتبوو ئەو دوانە بۆ شاهیدی لەگەڵ خۆیدا بەرێ، ئینجا وەصی دوای ئەوەی نامەکەی شێخ مەحمود دەخوێنێتەوە دەڵێ: دیارە مام(واتە شێخ) توڕە بووە. پاشان دەڵێ هیچ پێویستی نەدەکرد مام خۆی توڕە بکات، یان ئێوە بنێرێ بەڵکو دەبوو خۆی یەکسەر چووبا زیرۆ ئاغای لەزیندان دەرهێنابا. دوای ئەوە یەکسەر فەرمانێکی مەلەکی دەرچوو بۆ ئازادکردنی زیرۆ ئاغا. زیرۆ ئاغا لەگەڵ عەشیرەتی هەرکی چوونە ناوچەی بیاو لەنێوان خەلیفانو بارزان. دوای نزیکەی ١٥ رۆژێك دوو ژن کەیەکیان گەنج بوو, هاتنە ناو هەرکییەکانو چوونە لای زیرۆ ئاغا، ئەویش پرسیاری لێکردن ئێوە کێنو بۆ هاتوون؟ گوتیان ئێمە هەردووکمان خێزانی ئەسعەد خۆشەوین. ئەم کابرایە دۆستی نزیکی مەلامستەفابوو، کە لەروسیا لەگەڵیدابوو, دوای گەڕانەوەی بارزانی بوو بەلێپرسراوی هەموو ناوچەی بادینان.
ژنە بەتەمەنەکە گوتی ئێمە لەبەرئەوەی لەگەڵ زێبارییەکاندا ناخۆشیمان هەیەو ئێستا ئەسعەد لێرە نییە، بۆیە پەنامان بۆتان هێناوە تا ئەو ژنە گەنجە لەلای ئێوە ئەمانەت بێ تاکو ئەسعەد دێتەوە، چونکە ئەگەر زێبارییەکان پەلامارمان بدەن ئەوا سومعەی شێخە بارزانییەکان دەزڕێت. هەرکییەکانیش وەك عەشیرەتێکی رەسەنی کورد ئەو داوایەیان جێبەجێ دەکەن. پاش ماوەیەك ژنەکە، کەناوی ئاسیابوو، داوا لەزیرۆ ئاغا دەکا بیباتەوە بۆ ماڵی باوکی لەکوردستانی ئێران، بەڵام زیرۆ ئاغا پێی رادەگەیەنێ کەتا بارزانی لەروسیا نەیەتەوە ناتوانم رێگات بدەم بەهیچ لایەکدا برۆی. بەڵام ژنەکە هەر لەسەر ئەو خولیایەی خۆی دەمێنێ. بۆیە پاش ماوەیەك بەدرۆ خۆی نەخۆش دەنوێنێ بۆ ئەوەی بینێرنەوە بۆ ماڵی باوکی، بەڵام دوای ئەوەی دکتۆر دەیبینێ، درۆکەی ئاشکرا دەبێو ئەو رێگایەشی لێدەگیرێ. دوای ماوەیەکیتر ژنەکە دەڵێ بمبەنە ماڵی فەتاح ئاغای هەرکی، چونکە کچە پورێکم لەوێیە. دوای ئەوەی دەیبەنە ئەوێ لەوێ داوا لەکچە پورەکەی دەکا بیبەنەوە ماڵی باوکی، فەتاح ئاغاش بەڵێنی پێدەدا کە لەبەهاری داهاتوودا داوایەکەی بۆ جێبەجێ بکات. ئەوەبوو فەتاح ئاغا لەساڵی داهاتوودا کچەکەی تەسلیم بەماڵی باوکی کردەوە. پاش گەڕانەوەی مەلامستەفا، ئەحمەدئاغا لەخزمەتی بابیدا زیرۆ ئاغا دەچێتە لای بارزانی ئەویش زۆر بەگەرمی پێشوازییان دەکاو بۆ نانی نیوەڕۆ بانگهێشتی دەکا، لەکاتی هەڵساندا مەلامستەفا بەزیرۆ ئاغا دەڵێ: با فەتاح ئاغا سەردانی من نەکا. زیرۆ ئاغا بەمەلامستەفا دەڵێ بۆچی؟ مەلامستەفا دەڵێ: چونکە ژنەکەی ئەسعەدی ناردەوە ماڵی بابی، لەکاتێکدا ئێمە لەگەڵ عەشیرەتی باوکی ئەو ژنەدا ناخۆشیمان هەیە، بۆیە نەدەبوو فەتاح ئاغا وای لەگەڵ ئێمەدا کردبا. هەر چەندە زیرۆ ئاغا هەوڵدەدا بارزانی بڕوا پێ بێنێ بەراستی رووداوەکەو

تێی بگەیەنێ کەئەو، پێویستە وەکو باوکێك هەڵسوکەوت بکا چونکە هەموو گەلی کورد چاوەڕێی دەستی ئەون‌و پێویست ناکا سەرۆك عەشیرەتێکی ناسراو لەخۆی توڕەبکا، بەڵام سوودی نابێت. دوای ئەمە ئەحمەدئاغا لەگەڵ باوکیدا دەگەڕێتەوە، هەرچەندە زیرۆ ئاغا بەو قسانەی بارزانی زۆر توڕە دەبێ بەڵام بەسەر خۆی ناهێنێ. دوای ئەوە دەچنە ئوتیلێك لەئوتێلەکانی بەغدا، لەوێ سەیدخان‌و فەتاح ئاغاو محێدین دەچنە خزمەت زیرۆ ئاغا تا لەگەڵیاندا بچێت بۆلای بارزانی، هەرچەندە زیرۆ ئاغا بەبیانوی ئەوەی ئەو چۆتە بەخێرهێنانەوەی بارزانی دەیەوێ خۆی لەو داوایە بدزێتەوە بەڵام بێکەڵك دەبێ، چونکە ئەوان زۆر داوای لێدەکەن کەهەر لەگەڵیاندا بێت. بۆیە ناچار زیرۆ ئاغا لەگەڵ ئەحمەدئاغای کوڕیدا دەچنە لای مەلامستەفا، سەرەتا کەدەچنە دیوەخان، بارزانی لەوێ نابێ، بۆیە شێخ سادقی برازای مەلامستەفا دوو جار دەچێت داوا لەبارزانی دەکات تا بێت بۆ بەخێرهێنانی میوانەکان بەڵام بارزانی نایەت، لەجاری سێیەمدا کەدێتە ژورەوە زۆر بەساردی بەخێرهێنانی میوانەکان دەکا. پاشان دادەنیشێ‌و پاکەتێکی لۆکس دەردەهێنێ‌و جگەرەیەك دادەگیرسێنێ، بارزانی سەر بەرزدەکاتەوەو بەزیرۆئاغا دەڵێ: پێم نەگوتی بەفەتاح بڵێ هاتوچۆم نەکات؟ زیرۆ ئاغا دەڵێ: پێم نەگوتبوو بەڵام ئەوە پێم گوت, لەمڕۆوە هیچ هەرکییەك نابێ لەگەڵ تۆدابێ. دوای ئەوە فەتاح ئاغا دێتە لای مەلامستەفاو پێی دەڵێ: پێم نالێی تۆ بۆ لەمن توڕەی. ئەو دەڵێت: برۆ لەزیرۆئاغا بپرسە پێت دەڵێ. دوای ئەمە مەلامستەفا پشتێنەکەی فەتاح ئاغا دەگرێ‌و بەدیواریدا دەدا. لەو کاتەدا محێ لەفەتاح توڕە دەبێ‌و پێی دەڵێ: ئەمە بۆیە زیرۆئاغا دەیگوت با نەچینەلای مەلامستەفا، خەتای تۆ بوو دەنا ئێستا بارزانی ئاوای پێنەدەکردین. دوای ئەوە بڵاوەیان لێکرد، لێرەوە ناخۆشی‌و کوشتار لەنێوان هەرکی‌و بارزانییەکان دەستی پێکرد، ئەمە راستی شەڕی بنەماڵەیە لەگەڵ عەشیرەتی هەرکیدا، نەك کوردایەتی. بەم جۆرە بارزانیەکان لەبری ئەوەی ببنە پاڵپشت بۆ خەباتی عەشیرەتە کوردپەروەرەکان، بوونە خەنجەری دەستی دوژمنان.

### عەشیرەتی دۆڵەمەڕی:

ئەو عەشیرەتە لە ٣٤ گوند پێکهاتووە کەسەر بەقەزای سۆرانن، سنووری دراوسێکانیان هۆزی برادۆست‌و هۆزی شێروانی‌و گوندی هەودیانە، کەنیوەی دانیشتوانیان ئاسوورییە. ئەم عەشیرەتانە بەگشتی لەناوخۆیاندا بەئارامی‌و بەبێ کێشە دەژیان‌و هیچ ناکۆکییەك لەنێوانیاندا نەبوو. دوای ئەوەی تەریقەی ئاینی لەنێوانیاندا بڵاوبۆوە، شێخ عەبدولسەلام بارزانی یەکەم، لەم رێگایەوە دەسەڵاتێکی ئاینی گەورەی بەدەستهێنا. کاتێك عەبدولسەلام بارزانی دووەم کە بەعەبدولسەلام کوێرە ناسرابوو پەیدابوو، بەهێزی چەك بەتەواوەتی دەسەڵاتی بەسەر بەرۆژی‌و شێروانی‌و مزوورییەکاندا گرت، ئەوجا دەستیکرد بەپیلاندانان بۆ ئەوەی دەست بەسەر دۆڵەمەڕییەکاندا بگرێت، ئەوەبوو لەشکرێکی گەورەی کۆکردەوەو هێرشی کردەسەریان، شەڕ بۆماوەی حەوت رۆژ بەردەوام بوو بێ ئەوەی هیچ لایەك سەر بکەوێ. دوای ئەوە عەبدولسەلام پەنای بردەبەر مەلاو ریش سپی ناوچەکەو، بەکۆمەڵ هەموویانی ناردەسەر رەسول ئاغا کەسەرۆکی دۆڵەمەڕییەکان بوو. کە لەدواجاردا توانییان باوەڕی پێ بێنن تا لەگەڵ عەبدولسەلامدا ئاشت بێتەوە.

دوای ئەوەی پێیان راگەیاند کەعەبدولسەلام دان بەهەڵەی خۆیدا دەنێ‌و پەشیمانە لەو کارەی‌و درێژەدانی شەڕیش زیانی زۆر بەناوچەکە دەگەیەنێ، ئینجا رەسول ئاغا رەزامەندی دەربڕی بۆ ئاشتی، هەموو مەلاو ریش سپییەکانی کۆکردەوەو پێی راگەیاندن کەئاشتی لەنێوان دۆڵەمەڕی‌و بنەماڵەدا راگەیاندراوە، لەو رێککەوتنەدا تەنها دوو ریش سپی دۆڵەمەڕییەکان ئامادە نەبوون چونکە لەشێخ عەبدولسەلام‌و بارزانییەکان بەگومان بوون. ماوەیەك ئاشتی‌و هاتوچۆ لەنێوان ئەو دوو

لایەنەدا بەردەوامبوو، عەبدولسەلام توانی لەو ڕێگایەوە دۆڵەمەریەکانو رەسول ئاغا لـەخۆیو بارزانییـەکان دڵنیـا بکـا. تـا ڕۆژێك شێخ عەبدولسەلام بەناوی میـوانی دەچـێتە نـاو دۆڵەمەڕییـەکان، لـەپڕ دەسـت دەکـا بەچـەککردنیان، رەسـول ئاغـا دەگرێو لەبەرچاوی کوڕە گەورەکەی ئەسعەدئاغا، کەئەو کاتە تەمەنی حەوت ساڵانەبوو، دەیکـوژێ. ئـەوجا عەبدولـسەلام هێرش دەباتەسەر عەبدولرەحمان ئاغا کەبرای رەسول ئاغایە لەگوندی شیروکەیی، پاش ئەوەی بەبرینداری دەیگرێ ئەویش دەکوژێ. پاش ماوەیەکی دوورودرێژ بارزانییـەکان توانییـان بەشـی زۆری دۆڵەمەڕییـەکان بـۆلای خۆیـان رابکێـشنو شـەڕی دۆستو دوژمنیان پێبکەن، تەنها ئەسعەدئاغای شێتنە نەبێ کەچۆکی بۆ دانەدان هەرچەندە چەند جار بارزانییەکان هـەوڵی تیرۆکردنیاندا. ئەوەبوو ساڵی ١٩٣٣، مەلامستەفا بۆسەیەکی بۆ دانا بەڵام بەرنەکەوتو رزگاری بوو. تا بنەماڵە ناچـاریانکرد پەنا بەرێتەبەر حکومەت، ئەمەش گەورەترین سەرکەوتن بوو بۆ مەلامستەفا. چونکە مەلامستەفا لەو ڕێگایەوە تـوانی زیـاتر بەناوی کوردایەتییەوە دۆڵەمەڕییەکان تەفرە بدات، بۆ نموونە کوڕی عەبـدولرەحمان (مـیری شـیروکەیی)، بـوو بەپاسـەوانی تایبەتی مەلامستەفا تا لەشەڕێکدا کوژراو، ئێستا کوڕێکی سەرلەشکری مەسعود بارزانییە.

ئەم بنەماڵەیە بەپێی بەرژەوەندییەکانی خۆیان لەگەڵ دۆڵەمەڕییەکاندا جووڵاونەتەوە، بۆ نموونە لەسـاڵی ١٩٦١دا شـێخ ئەحمەد بارزانی هانا بۆ ئەسعەد ئاغای شێتنە دەبات، ئـەویش شـەش مـانگ بەماڵومنداڵـەوە دەیانـژیێنێ. دۆڵەمەڕییـەکان لەراپـەڕینی سـاڵی ١٩٩١دا بەشـداری بەرچـاویان بینـی، بۆیـە کاتێـك مەسـعود بـارزانی دێتـەوە کوردسـتانی ئـازاد، پلانـی سەرەتای ئەوەبوو کەئاڵای ئاشتی لەسەرانسەری کوردستاندا لەنێوان هەموو کورددا جێگیر بکا، بۆیە جەنابی عیـزەت بـەگ دەرگەڵەیی دەچێتە لای سەعیدئاغاو پێی رادەگەیەنێ کەکاك مەسعود دەیەوێت سەردانت بکات، ئەو لەوەڵامـدا خۆشـحاڵی خۆی نیشاندەدا. کاتێك مەسعود بارزانی دەگاتە نزیك گوندی سارداو، داوا لەهەموو ئـەو سـۆرانییانە دەکـات کـە لەگەڵیـدان بگەڕێنـەوە، چـونکە ئـەو گەیـشتووە بەشـوێنێکی ئـەمین. کاتێـك مەسـعود دەگاتـە دیوەخانەکـە روودکاتـە سـەعیدئاغاو لەبەرچـاوی هـەموو ئامـادەبوان دەڵێـت: میللـەتی بـارزان، ئـەز پەشـیمانم لەهـەموو غەلـەتی بـابی مـن مەلامـستەفا لەگـەڵ ئەسـعەدئاغای شـێتنە، سـەعیدئاغا دەڵـێ: گـەورەم فـەرموو دانیـشە. ئەمـە یەکـەم جـار بـوو ئاشـتی لـەنێوان بنەماڵـەو دۆڵەمەڕییەکان دوای ئـەم هـەموو شەڕوشـۆڕە بـەردەوام بێـت. مەسـعود بـارزانی مـاوەی چـوار مـانگو بیـست ڕۆژ میـوانی سەعیدئاغا بوو، لەو ماوەیەدا مەسعود ٥٠٠ کەسـی لەگـەڵ بـوو و ڕۆژانـە زیـاتر لـە ١٠٠ کـەس سـەردانیان دەکـرد. ئەمـەش یەکێکە لەرەوشتە باوەکانی بنەماڵەی بارزانی، کاتێ ئەمانە میوانداری کەسێکیان کرد یان بەمیوانی چوونە لای، لەپـشتەوە خەنجەری لێدەوەشێنن. هەفتەیەك دوای ٣١ی ئابی ١٩٩٦ نێـچیر بـارزانی نووسـراوێك ئاراسـتەی سـەعیدئاغا دەکـات داوای لێدەکات کەبێتە قەزای سۆران بۆ ئەوەی چاوی بەمەسعود بکەوێ، هەروەها نیوەڕۆ دەعوەتی مەسعود بێت. ئەویش لەگەڵ کوڕەکەی محەمەد عەلی بەدەم بانگکردنەکە دەچێت، بەڵام بنەماڵەی بارزانی وەکو عادەتی خۆیان دەستبەسەریان دەکەنو تا ئەمڕۆ بێسەروشوێنن.

## ڕۆشنکردنەوەی لایەنە شاردراوەکان

من بەهۆی ئەوەی ماوەیەکی دوورودرێژ لەگەڵ ئـەو بنەماڵەیـەدا ژیـاومو پەیوەنـدیی تونـدوتۆڵم هـەبووە لەگـەڵ گـەورەو بچوكو ژنو پیاوو گەنجو پیرو دۆسـتو دوژمنیانـدا، توانیومـە زانیارییـەکی تـەواو بەدەسـت بێـنم دەربـارەی سـەرهەڵدانو پەیدابوونی ئەم بنەماڵەیە لەکوردستاندا. هەمووشمان دەزانین کەئەم بنەماڵەیە رۆڵێکی گەورەو بەرچاویان هەبووە لەهەموو ئەو ڕووداوانەی پەیوەندییان هەبووە بەژیانو مێژوی کوردەوە.

## بنەچەی بنەماڵەی بارزانیەکان

سەدوپەنجا ساڵێك بەر لەئێستا کابرایەکی نەناسراوی قژنەی چڵکن، وەك مشکی هەڵاتوو لەبیابانی عەرەبەوە بەعەگاڵو دشداشەوە لەسنووری سوریاوە بەنێو خێڵی شەممەڕەوە پێی نایە خاکی کوردستانو لەنێو ئێزیدییەکاندا جێگیربوو، جلوبەرگی ئەوانی لەبەرکردو چووە سەر ئاینی ئەوان. ئەم کابرا نەناسراوە باپیرەگەورەی مەلامستەفای بارزانی بوو.

لەو ماوەیەدا کە لەناو ئێزیدیەکاندا مایەوە هەوڵی زۆریدا کەبەلای خۆی رایبکێشێو بیانهێنێتە ژێر دەسەڵاتی خۆی، بەڵام سوودی نەبوو، چونکە ئێزیدیەکان لەوە زیرەکتر بوون کەیەکێکی وا بتوانێ کاریان تێبکاتو، لەسەر رێبازی ئاینیو نەتەوەیی باوباپیرانیان لایان بدات. لەبەرئەوە ئەم کابرایە ناچاربوو ئەو ناوچەیە بەجێبێڵێتو روویکاتە ناوچەی زێبارییەکان. وەکو دەگێڕنەوە ئەم کابرا عەرەبە لەناو زێبارییەکاندا فێری کوردی بووە، هەندێکیش دەڵێن نەخێر، هەر بەخۆی ئێزیدی بووە. من هەندێ بەساڵداچووی ئەوانم بینیوە دەیانگوت: ئەم بنەماڵەیە ئێزدینو تا ئێستاش هەندێ موڵکیان لەناو ئێزدیەکاندا ماوە، کەماوەیەکی زۆر بەر لەئێستا لەژێر دەستیاندابووە. بەڵام ئەمە لەراست ناچێ، چونکە هەرچەندە بارزانییەکان وەك ئێزدییەکان جامانەکانیان دەبەستنو لەهەندێ هەڵسوکەوتیان بەئێزدییەکان دەچن، بەڵام لەراستیدا زۆر لەئێزدییەکان جیاوازن. ئێزدییەکان بەگشتی مرۆڤدۆستو خاوەن پیاوەتین، بەپێچەوانەی بارزانییەکان کەئەم سیفەتانەیان تێدا نییە.

هەر یەکێك لەئێمە، هەموومان بنەچەمان هەیەو باپیرانی خۆمان دەناسینو دەتوانین چەند پشتێکمان بژمێرین، بەڵام مەلامستەفا، سەرۆکی ئەفسانەیی کورد کەماوەیەك دەسەڵاتی بەسەر هەرچوار بەشەکەی کوردستاندا هەبوو، بەڵکو بەهۆی پارەو دەسەڵاتەکەی دەستی دەگەیشتە دوورترین شوێن لەجیهاندا، دەبوا لانی کەم دە پشتی خۆی هەڵدایەو ناوی بهێنابان کەچی لەدو تا سێ پشتی خۆی زیاتری نەدەناسی.

من لێرەدا مەبەستم ئەوە نیە خوانەخواستە توانج بگرمە هیچ خێڵو هۆزو بنەماڵەیەك بەڵام دەمەوێ ئەوە بخەمەڕوو کەهەندێ بنەماڵە، لافی هەندێ شت لێدەدەن کە لەراستیدا وانین. من لێرەدا توانج ناگرمە بارزانییەکان کە لەدورگەی عەرەبەوە هاتون و بەبنەچە عەرەبن, بەڵکو ئەوەم بەلاوە ناپەسەندە کەخۆی بە کوردێکی رەسن دادەنێو، ئەم هەموو دوژمنایەتییەشی لەگەڵ کورددا کردووە. بیلالی حەبەشی کەکەس نەیدەزانی خەڵکی کوێیەو لەکوێوە هاتووە ئەوەندە مرۆڤێکی پاكو لەخواترس بووە پێغەمبەر (د.خ) دەربارەی گوتوویەتی کەبەهەشت جێگایەتی. کەواتە ئەی بارزانی، تۆ کە بەرەگەز عەرەبی چۆن هەستی نەتەوایەتی رێگای ئەوەی لێنەگرتی کەسەردانی وڵاتی جولەکە بکەیتو، کار بکەیت بۆ بەرژەوەندی ئەوان؟ لەکاتێکدا دەزانی جولەکە دوژمنی عەرەبە.

پێشتر ئەوەم بۆ خوێنەری خۆشەویست باسکرد کەبارزانی هەموو کاتێك هەوڵیداوە بۆ ئەوەی کۆسپو رێگر لەبەردەم میللەتی کورددا دابنێ تا بەئامانجەکانی خۆی نەگات. بەگشتی بنەماڵەی بارزانی بەردەوام لەدژی بەرژەوەندی کورددا بوون. کاتێکیش شۆڕش لەبەرژەوەندییاندا نەبوایە پشتیان تێدەکرد.

وەك لەسەرەوە باسمانکرد باپیرەگەورەیان ئەو کابرا نەناسراوە عەرەبەبوو کە لەبیابانی عەرەبستانەوە هاتبوو، ئەم کابرایە لەناو ئێزدیەکاندا کوڕێکی بووە ناوی عبداللە بووە، ئەمیش کوڕێکی بووە ناوی عبدولسەلامی یەکەم بووە، ئەمیش کوڕێکی بووە ناوی شێخ محەمەدبوو، ئەویش پاش خۆی کوڕێکی بەناوی شێخ عەبدولسەلامی دووەم بەجێهێشت. ئەمیش پێنج کوڕی جێهێشت بەناوی شێخ ئەحمەد، شێخ بابۆ، مەلاجوج، مەلامستەفا، محەمەد صدیق. ئەمان بەهۆی ئەوەوە زمانی عەرببیان زانیوەو لەئاینو شەرع شارەزابوون توانییان کاریگەریی خۆیان بەسەر جوتیارە سادەکاندا بسەپێنن.

لەهەمان ڕێگاوە ناوبانگیان بڵاوبۆوە، لەم ڕێگایەوە دەرگای خێریان لێکرایەوەو دەسەڵاتیان فراوانبوو. جیا لەهەموو ئەمانە دەستیانکرد بەکۆکردنەوەی زەوییوزارو موڵكو سامان بۆ ئەوەی داهاتوی خۆیان مسۆگەر بکەن. کابرای نەناسراوی بێناوی باپیرە گەورەیان دەستێکی باشی هەبووە لەکۆکردنەوەی پارەو کڕینی زەوییوزاردا. عبدوللای کوڕیشی مرۆڤێکی ساویلکە بوو هیچ ئاگای لەجیهانی دەوربەری خۆی نەبووە. عبدولسەلامی کوڕی گۆشەگیر بووەو تێکەڵ بەخەڵك نەبووە، بەڵام شێخ محمدی کوڕی عبدولسەلامی یەکەم پیاوێکی کارامەو لێزان دنیادیدە بووەو توانیویەتی بەناوی پەیڕەوکردنی ڕێبازی نەقشبەندییەوە توانیویەتی خەڵکێکی زۆر لەخۆی کۆبکاتەوەو نازناوی شێخیەتی بەدەست بهێنێو ئەوانەی دوای خۆیشیو، بەم هۆیەوە دەسەڵاتی خۆی بەسەر ناوچەکەدا سەپاندو هەموو عەشیرەتو هۆزو تیرەکانی دەوروپشتی ملکەچی خۆی کرد. ئەم شێخ محەمەدە لەناو خەڵکدا بەپیاوێکی ئاینی گەورەو سەیر ناوی دەرکردو نازناوی جێنشینی شێخ ڕەزای نەهرییان لێنابوو. پاش مردنی شێخ محمود، شێخ عبدولسەلامی دووهەمی کوڕی، بەزەبری هێزو ئەو پارەو ماڵە گەورەیە کە لەباوکیەوە بۆی بەجێمابوو، هەروەها بەهۆی دووبەرەکیو ناکۆکی نانەوە لەنێوان هۆزەکانی دەورەبەریدا، توانی دەسەڵاتی خۆی بەسەر چوار عەشیرەتو هۆزی دراوسێدا بسەپێنێ هەر لەعەشیرەتی بەڕۆژ تا دەگاتە مزووری ژووروو شێروانیو پاشان دۆڵەمەڕی، بەبێ ئەوەی گوێبداتە شتێك لەو کارانەی کەشێخ عبدولسەلامی دووهەم ئەنجامیدا لەپێناو زیاترکردنی دەسەڵاتو بەرفراوانکردنی ناوچەی نیشتەجێی بارزانییەکانو زۆرکردنی دەستوپێوەند کەپاشتر کوڕو کوڕەزاکانی لەسەری بەردەوام بوون تا ئەمڕۆ. بەکارهێنانی جامانەی سور کە بەسەر ئەو چوار عەشیرەتەی سەرەوە سەپاند، ئەمانە پێشتر جامانەی سوریان نەدەبەستو تارادەیەك جامانەی سور بوو بەدروشمی بارزانییەکان، ئەوەی شارەزای ناوچەکە نەبێت لای وایە هەرکەس جامانەی سووری بەسەرەوە بێت بارزانییە، تەنانەت هەندێ لەسۆرانییە سەختەچییەکان جامانەی سوور بەکاردێنن بۆ ئەوەی خۆیان وا پیشان بدەن کەدڵسۆزی بنەماڵەی بارزانین یا بۆ ئەوەی لەخاڵەکانی پشکنیندا داوای ناسنامەیان لێنەکەن یا کارێکیان دەبێ لەفەرمانگەیەکی حکومیدا زوو بۆیان جێبەجێبکەن. ئەم کارەشیان بووە هۆی ڕقوتووڕەییو بێزاری لەناو خەڵکدا. لەگەڵ ئەمەشدا هەندێك لەئەندامانی ئەو چوار عەشیرەتەو زێبارییەکان ملکەچی ئەم بڕیارە نەبوونو بەشێکی زۆریان بەناچاری پەنایان بردەبەر دەسەڵاتی ناوەندی حکومەت، سەرباریشی پەیوەندییان کرد بەشۆڕشەوەو بوون بەپێشمەرگە. بەڵام سورچییەکان تووشی گەلێك ئازاربوون بەدەست ئەم بنەماڵەیەوە، کاتێکیش خۆیان هاویشتە باوەشی حکومەتەوە هەر لەبەرئەوە بوو لەدەست سوکایەتی پێکردنی بارزانیەکان ڕزگاریان ببێ، کاتێکیش هەلیان بۆ هەڵکەوت گەڕانەوە بۆ ناو ڕیزەکانی شۆڕش. هەرچەندە کاتێکیش لەناو ڕژێمدا بوون بەنهێنی کۆمەکی هێزی پێشمەرگەیان کردووە. بەپێچەوانەی قسەی مەسعود بارزانی کەدەڵێ: سورچییەکان هەر بۆ ئەوە دروستکراوان لەدژی شۆڕش چەك هەڵگرن. بەڵام هەر سورچییەکان بوون لەڕاپەڕینی ١٩٩١دا هەموو ناوچەکانی خۆیان لەڕژێمی بەعس پاککردەوە، پاشان بۆ ئازادکردنی ناوچەکانیتر بەڕێ کەوتن بەتایبەتی بۆ شاری کەرکوك. بۆیە شەش ڕۆژ دوای ڕاپەڕین تەرمی شەش شەهیدی سورچی گەیشتەوە ناوچەکانی خۆیان. ئەم شەهیدانە لەڕزگارکردنی شاری کەرکودا گیانی خۆیان بەخشی، ئەوە لەکاتێکدابوو کەهێشتا مەسعود بارزانی و بنەماڵەکەی نەگەیشتبوونە ناوچەی کوردستان.

پاش مردنی عبدولسەلامی دووهەم, مەلاعبدولرەحمان کەکوڕەزای شێخ عەبدولسەلامی یەکەم بوو, جڵەوی شێخایەتی گرتە دەست. ئەمەش بوو بەهۆی پەیدابوونی ڕقو کینە لای کوڕەکانی شێخ عەبدولسەلامی دووهەم چونکە ئەمانە خۆیان بەشایستەتر دەزانی بۆ ئەوەی شێخایەتی بگرنەدەست، لەبەرئەوە ئەمانە دەسەڵاتی ئاینیو دنیاییشیان لەکیس چوو،

مەلامحەمەد سدیقی برای لەمانگی ئەیلولی ساڵی ١٩٢٧دا لەنزیك هاوینەهەواری چیای شیرین مەلاعبدولرحمانیان کوشت، پاش ئەم رووداوە دەسەڵاتی ئاینی کەوتە دەست شێخ ئەحمەدو دەسەڵاتی دنیاییش کەوتە لای مەلامستەفا.

لێرەدا جێی خۆیەتی خوێنەری بەڕێز وەکو من سەرسام بێت بەرامبەر بەگۆڕانەکانی ئەم دنیایەو، بپرسێ چۆن کابرایەکی نەناسراوی کۆڵ بەپشت توانی ببێتە خاوەنی عەشیرەتێکی گەورەو گەورەترین سامانو سەرمایە لەناوچەکەدا.

لەساڵەکانی ١٩٣١-١٩٣٢دا باری گوزەرانی ناوچەکە زۆر خراب بوو، بەشێوەیەك کەخەڵك لەبرسان دەمردنو هەموو تواناو هێزی خۆیان بۆ دابینکردنی گوزەرانی رۆژانەیان بوو، بارزانی ئەو بارودۆخەی بەهەل زانی بۆ سەپاندنی دەسەڵاتی خۆیو ناوبانگ دەرکردن، هەر بۆیە لەو ماوەیەدا بەرەنگاری حکومەتی عێراق بۆوە.

پاش ئەوەش کەحزبی هیوا دامەزراو بەسەدان کەس لەرۆشنبیرو نیشتمانپەروەران چونە ریزی ئەو حزبە، لێپرسراوانی ئەو حزبە، لەتەمموزی ساڵی ١٩٤٣دا بڕیاریاندا خۆیان لەمەلامستەفا نزیك بکەنەوەو بزووتنەوەکەی وەك کارتێکی گوشار بۆ سەر رژێم بەکاربێنن ئەمەش. لەمانگی تشرینی یەکەمی هەمان ساڵدا مەلامستەفا توانی دەست بەسەر ناوچەی بارزاندا بگرێو هەموو هێزەکانی حکومەت لەو ناوچانە بەدەربنێ. ئەمەش بوو بەهۆی ئەوەی ژمارەیەك لەئەفسەرە کوردەکانی ناو سوپای عێراق کەسەر بەحزبی هیوا بوون پەیوەندی بەمەلامستەفاوە بکەن، کە لەئەنجامدا بوو بەهۆی ناودەرکردنی بارزانی.

### تێبینی

*لەسەردەمی عبدولکەریم قاسمدا، کۆبوونەوەیەك لەنێوان سەرۆك عبدولکەریمو مەلامستەفاو ئەحمەد زێباری لەوەزارەتی بەرگری لەبەغدا دەبەسترێ، ئەمەش بەمەبەستی ئاشتکردنەوەی بنەماڵەی بارزانیو زێبارییەکان کەتاکە عەشیرەت بوون ملیان بۆ بارزانییەکان نەدابوو، هەر لەبەرئەمەش بوو چوونە پاڵ حکومەت. لەو کۆبوونەوەیەدا، ئەحمەد زێباری بەعبدولکەریم قاسم دەڵێ: ئەگەر مەلامستەفا راست دەکاو دەڵێ خاوەن عەشیرەتێکی دێرینم با پێنج پشتی خۆی هەڵبدات، جەنابی سەرۆك ئەم عەشیرەتە بێ بنچینەن. من دەتوانم ناوی دوازدە پشتی خۆمت بۆ هەڵبدەم. دوای ئەوە مەلامەستەفا تووڕە دەبێتو کۆبوونەوەکە جێدێڵێت.*

# پــاشکــۆ

## نامەگەلێکی کراوە بۆ سەرۆك و سەرکردەی ولاتـانی جیهـان

### نامەی یەکەم

**نامەیەك دەربـارەی رووداوی تەقـاندنەوەی بەنزینخانەی شەقلاوە لە ١٩٩٥/٥/٧دا**

**بۆ بەڕێز کۆفی ئەنـان سکرتێری نەتەوە یەکگرتووەکان**

ئەم رووداوە کەبوو بەهۆی کوشتنو بریندارکردنی زیاتر لە ٢٢ کەس لەهاولاتییان کە لەنێوانیانـدا دوو کارمەنـدی نەتـەوە یەکگرتووەکانی تێدا بـوو، ئەڵقەیـەکیتر لـەزنجیرەی کـارە تیرۆریـستییەکانی دژ بەگـەل لەلایـەن بنەماڵـەی بارزانییـەوە، ئەمەش لەسەر فەرمانی دەوڵەتەکانی دەوروبەر، مەبەستی سەرەکیش لەم تەقینەوەیە کوشتنی دوو کەس لەکارمەنـدەکانی رێکخراوەکانی نەتەوەیەکگرتووەکان بوو.

پێش رووداني ئەو کارەساتە بەچەند رۆژێك، لەهاوینەهەواری سەلاحەدین کۆبوونەوەیەك سازکرا کەسودادی مەلامستەفاو کەریم سنجاری لێپرسراوی دەزگای تیرۆریستی پاراستن سەرپەرشتییان دەکرد، حسەینی حەمەسوور ئاغای میراودەلی بانگ کرابـوو بـۆ ئـەو کۆبوونەوەیـە. سـەرەتای کۆبوونەوەکـە، سـودادی کـوڕە مەلامـستەفا دەسـتی بەقـسەکردو بەحـسەینی حەمەسوور ئاغای گوت: حکومەتی ئێـران یارمـەتی ئێمـەی داوە لـەگرتنو کوشـتنی حەسـەن کوێـستانیداو ئێـستاش هـەر بەردەوام یارمەتیمان دەداو پشتگیریمان دەکا، لەبەرئەوە لەسەر ئێمە پێویستە هاوکاری ئێران بکەینو پاداشتی چاکەکانی بدەینـــەوە، حکومـــەتی جمهـــوری ئیـــسلامی داوای لەئێمـــە کـــردووە دوو کارمەنـــدی رێکخراوەکـــانی ســـەر بەنەتـــەوە یەکگرتووەکانیان بۆ بکوژین کەهەردوکیان جولەکەن، ئێمـەش ئـەم کۆبوونەوەیـەمان کـردووەو تۆشمـان بـانگ کـردووە بـۆ ئەوەی بەیەکەوە لەم مەسەلەیە بکۆڵینەوەو پلانێك دابنێین بۆ جێبەجێکردنی ئەم کارە.

بەم شێوەیە سوداد بارزانی مەسەلەکەی بۆ پیاوی دڵسۆزی بنەماڵەکەیان حسەینی حەمەسوور ئاغای مـیراودەلی باسـکرد کەچەندەها پەیوەندی گومان لێکـراوی هەیـە لەگـەڵ هـەردوو حکومـەتی عێـراقو ئێرانـدا. نـاوبراو ئامـادەیی تـەواوی خـۆی پیشاندا بۆ جێبەجێکردنی تاوانەکە. هەر لەو کۆبوونەوەیەدا بەنزینخانەیەکی نزیـك شـەقلاوەیان دەستنیـشانکرد بـۆ شـەوی جێبەجێکردنی تاوانەکەیان. یەکەم جار خاوەنی بەنزیخانەکەیان دەستگیرکردو بنزیخانەکەیان دایـە دەسـتی یـەکێکیتر کـە بەکرێگیراوی پاراستن بوو. ئەمیش برێك T.N.Tخـستە نـاو عـەمبارێکی بەنزینخانەکـەوەو خـۆی ئامـادەکرد بـۆ ئـەو کاتـەی تاوانەکە جێبەجێ دەکرێ. پاشان رێککەوتن لەسەر چۆنیەتی جێبەجێکردنی تاوانەکە بەم شێوەیەی خوارەوە:

کاتێ ئەو دوو کارمەندەی جولەکەیە بەرەو شەقلاوە بەئۆتۆمبێلەکەی خۆیان کە لەجۆری کرۆلای یابانییە دەکەونـەڕێ، پاراستن بەبێتەل حسەینی حەمەسوور ئاگادار دەکاتەوە ئەویش ئامادە دەبێ هـەر کـات ئۆتومبێلەکـە بگاتـە بەنزینخانەکـە بیتەقێنێتەوە.

دوای کۆتـایی هـاتنی کۆبوونەوەکـە، حـسەینی حەمەسـوور شـوێنی کۆبوونەوەکـە بـەجێ دێڵـێو بـەرەو شـەقڵاوە دەکەوێتەڕێ. کەدەگاتە ئەوێ، یـەکێك لـەپیاوەکانی رادەسـپێرێ کـەناوی تەحـسین خرواتانیـیە لەتەپۆڵکەیـەکی بەرامبـەر بەنزیخانەکەدا خۆی جێگیر بکـات لـەلای رۆژهەڵاتـەوە، هـەروەها ئـامێرێکی کـۆنترۆڵی دایەدەسـت لەوانـەی کـە لـەدوورەوە کاریـان پێـدەکرێ بـۆ تەقاندنـەوە. ئەوەشـی تێگەیانـد کـەدەبێ زۆر لەئامادەباشـیدا بـێ بـۆ چـاودێریکردنی بەنزینخانەکـە بەدووربین, ئامێرە بێتەلەکەشی هەڵگرێ بۆ وەرگرتنی زانیاری لەکەریم سنجارییەوە دەربارەی کاتی بەرێکەوتنی سـەیارەی کارمەندەکان.

لە ١٩٩٥/١٢/٧ کەرۆژی روودانی کارەساتەکەیە، تەحسین خرواتانی بەبێتەل ئاگاداردەکرێتەوە کەوا ئۆتۆمبێلەکە دەگاتە ئەوێو خەریکی وەرگرتنی بەنزین دەبێ, دەست دەنێ بەدوگمـەی ئامێرەکـەداو بەنزیخانەکـە دەتەقێتـەوەو ئەنجامەکەشـی کوژرانو برینداربوونی بیستو دوو کەس بوو لەنێویانـدا دوو کارمەندەکـەی نەتـەوە یـەکگرتووەکان کـە لەسـتافی پۆلیـسدا کاریان دەکرد.

پاش تەقینەوەکە هێزی پۆلیسو ئاسایش دەگەنـە شـوێنی رووداوەکـە بـۆ لێکۆڵینـەوە. ژمارەیـەکی زۆر خـەڵکیان گـرت لەوانەی لەوێ بون کە لەنێویاندا یەکێك لەپیاوەکانی حسەینی حەمەسووربوو کەبەشداریکردبوو لەجێبەجێکردنی تاوانەکەدا کەناوی مەحمود... بوو، دوای کەمێك لێکۆڵینەوە مەحمود دەڕوخێو دان بەوەدا دەنێ کەدەستی هەبوە لەجێبـەجێکردنی تاوانەکەداو دەڵێ: من بەفەرمانی حسـەین حـەمـەسـوور بەشداریمکردووە لەو کارەدا ئەویـش فـەرمـانی لەسـوداد بـارزانیو کەریم سنجاری وەرگرتووە.

ئەم دەنگوباسـە لەناو خەڵکدا بڵاوبۆوە، لەبەرئەوە کەریم سنجاری بۆ پەردەپۆشـکردنی تاوانەکە فەرماندەدا بەگرتنی هەموو ئەوانەی تاوانەکەیان جێبەجێکردووەو رەوانـەی بەندیخانـەی ئاکرێیـان دەکـا کـەبریتی بوون لە: حسەین حەمەسوور ئاغا، عەلی ئاغا، مستەفا ئاغا، فەرهەنگ هیرانی، عومەر گرکۆو براکـانی، تەحـسین خرواتـانیو مەحمود..

لەلێکۆڵینەوەکەدا ئەوەش دەرکەوتووە کەتەحسین، پێشتر دوکتۆرێکی ئێرانی سەر بەپارتی دیموکراتی ئێرانی کوشـتووە لەئۆردوگای هەریر، کاتی خۆی وا بڵاوبوو لەناو خەڵکدا کەئەم دوکتۆرە بەکرێگیراوی ئیتڵاعـاتی ئێرانـە هـەروەها دەرکـەوت کەمەحمود پیاوی ئێرانەو یەکێکە لەپیاوکوژەکانی سەر بەئیتڵاعات.

بـەم شـێوەیە بنەماڵـەی بـارزانی، خۆیـان لـەو تاوانـە دزیـەوەو خـستیانە ئەسـتۆی کەسـانێکیترو هـەموویان رەوانـەی بەندیخانە کران. ئم گیراوانە لەبەرئەوەی سەر بەعەشیرەتێکی گەورەو بەهێزن ناتوانرێ لەسێدارە بدرێنو بەرەڵاکردنیـشیان دەبێتە مەترسییەك بۆ سەر ئاسایشی ئەندامانی بنەماڵە.

لەکاتی خۆیدا دەنگوباس بڵاوبۆوە گوایە ئەم تەقینەوەیە بەفەرمانی قوسەی کوڕی سەدام حسەین ئەنجامـدراوە. بەهـەر حاڵ ئەم تاوانە بەڵگەیەکیترە لەسەر دڕندایەتیو هەڵوێستی نامرۆڤانەی ئـەم بنەماڵەیـە دەرحـەق کەسـانێك کەهاتوونەتـە ئەم وڵاتە بۆ خزمەتکردنی میللەتەکەی، لەهەمان کاتیـشدا بەڵگەیـە لەسـەر وابەسـتەیی و ی بنەماڵـە بـۆ دوژمنـانی میللـەتی کورد.

**دڵسۆزتـان**

**رەفیق پشدەری**

**تێبینی:**

من نووسەرێکی کوردم، لەبیروبۆچووندا سەربەخۆم، دەربارەی دیکتـاتۆر سـەدام حـسەین دەنووسـم، چـونکە ماوەیـەکی دوورودرێژ لەگەڵیدا ژیاوم. هـەروەها لەسـەر بـارزانیو بنەماڵەکـەی دەنووسـم، لەسـەر جـەلال تاڵـەبانیو هـەموو سـەرکردە کوردەکان دەنووسم ئەوانەی کەپەیوەندیم هەبوە لەگەڵیاندا هەر لەساڵی ١٩٥٦ـەوە تاوەکو ئێستا.

تا ئێسـتا دوو بەرگم لەم بوارانەدا چاپـکردووە بەناوی (کورد دوژمنی خۆت بناسـە) لـەم دوو بەرگـەدا بـۆ دەرخـستنی راسـتییەکان، ئـەوەی کەبەسـەرمدا هـاتووەو بینیومـە بەشـێوەیەکی راسـتیو بەویژدانـەوە دەیخەمەروو، لەمەشدا مەبەستم رازیکردنی ویژدانی خۆمو خزمەتکردنی گەلـە سـتەمدیدەکەمە، بەشـی سـێهەمی کتێبەکـەم خەریکە دەکەوێتە دەست خوێنەران. ئەمەش بوو بەهۆی ئەوەی خەڵك متمانەم پێبکەنو زانیاریم بخەنە بەردەست، چـونکە بڕوایان پێم هەیەو دەزانن لەرێگەی راست لام نەداوەو مەبەستیـشم هـەر دەرخـستنی راسـتییەکانەو بەڵگەشـم لایـە لەسـەر راستیو دروستی قسەکانم دەربارەی تەقینەوەکەی بەنزینخانەی شەقڵاوە لەو کەسانەی کەبەچاوی خۆیان دیویانە.

ئاگاداریش کراومەتەوە کەبنەماڵەی بارزانیو دیکتاتۆر سەدام حسەین فەرمانیانداوە بەتیرۆرکردنم، هەولێرم بەجێهێـشتو بەخاووخێزانەوە رامانکرد بۆ سلێمانی.

**نـامەی دووەم**

***بەمەبەستی چارەسەرکردنی کێشەی گەلی کورد لەسایەی هەر سێ حکومەتی سەدامو مام جەلالو کاك مەسعود***

***بۆ بەڕێز کوفی ئەنـان - سەرۆکی نەتەوە یەکگرتووەکان***

بەرێز کۆفی ئەنان، سەرۆکی نەتەوە یەکگرتووەکان، بەرپرسی پاراستنی ئاشتی لەجیهانو یەکەم لێپرسراوی مافی مـرۆڤ لەسەرانسەری جیهاندا.

سەرەتا، پاش ئەوپەڕی رێزو سڵاوم حەزدەکەم سوپاسی خۆم وەك هاوڵاتییـەکی کـوردی کوردسـتانی باشـور ئاراسـتەی بەرێزتان بکەم، بـۆ دەرکردنو جێبـەجێکردنی بڕیـاری ٩٨٦، کـە لەسـایەیدا بـارێکی گرانـی سـەر هـەموو گـەلانی عێراقـی خێرنەدیو سـووك کـراو، ژیـانو گـوزەرانی خـەڵکی بەگـشتی باشـترکرد. هـەروەها لـەرێگای پـرۆژە یـەك لـەدوای یەکـەکانی ئاوەدانکردنەوە ئەمرۆ کوردستان دووبارە، بەرەو ئاوەدانیو دامەزراندنەوەی گونـدە کاولکراوەکـانو شـارە وێرانکراوەکـانی هەنگاو دەنێت.

جەنابی سـەرۆك... ئاشـکرایە لای جـەنابتان کەرژێمـەکانی رۆژهـەڵات بەگـشتی، لەسـەر ئـاگرو ئاسـن دامـەزراونو گـوێ بەپرنسیپەکانی دیموکراسیو مـافی مـرۆڤ نـادەن، لەبـەرێوەبردنی دەسـەڵاتە تۆتالیتـاریو دیکتاتۆریـەکانیان. بـەبڕوای مـن لەهەر هەموو ئەو رژێمانە درندەترو فاشیتر، رژێمی بەعسی عێراقە کە لەماوەی دەسەڵاتیدا گـەلانی عێـراق بەگـشتیو کـورد بەتایبـەتی تووشـی گـەورەترین نەهامـەتی بـوون لەمێـژووی خۆیـانو جیهانـدا. ئـەم رژێمـە هـیچ کـات درێغـی نـەکردوە لەپیادەکردنی سیاسەتە نائینسانییەکانی بەرامبەر بەگەلەکەمان، کەکاولکردنی سـەدەها گونـدو وێرانکردنـی چـەندین شـارو کیمیابارانکردنی هەڵەبجەو ئەنفالکردنو بێسەروشوێنکردنی ١٨٢ هەزار هاوڵاتی، بەڵگەی ئاشـکرای دڕندایـەتی ئـەو رژێمـەن بەرامبەر بەگەلی کورد.

بۆیە گەلەکەمان لەدژی ئەم ڕژێمە دڕندەیە پەنای بردەبەر شاخەکانی کوردستان کەبۆ ئێمە بەردەوام تاکە هاوڕێی بەوەفابوون، لەوێوە شۆڕشی ڕزگاریخوازی گەلی کورد بەرامبەر بەسیاسەتە دوژمنکارییەکانی بەعس دەستی پێکرد، لەوپێناوەشدا چەندین هەزار شەهیدو قوربانی درا. بەڵام لەبەر پشتگیری زۆربەی وڵاتانی جیهان بەگشتیو عەرەب بەتایبەتی بۆ ئەم ڕژێمەو بێدەنگبوونیان لەبەرامبەر تاوانە گەورەکانی دەرهەق بەگەلی کوردو، کاولکردنو ڕاگوێزانی هەموو گوندەکانی سەر سنوورو بەکارهێنانی چەکە کۆکوژە قەدەغەکراوەکان لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە بەرامبەر بەشۆڕشەکەمانو، بێدەنگبوونی نەتەوە یەکگرتووەکانو ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی، لەبەر هەموو ئەوانە شۆڕشەکەمان توشی قەیران هاتو ڕێگا لەبەدیهێنانی ئامانجەکانی گیرا. بەڵام دوای ئەوەی ڕژێمی دوژمنکاری بەعس لەعێراقدا پەلاماری کوێتیداو تاڵانیکردو بیرە نەوتەکانی تەقاندەوەو بەبێ گوێدانە هیچ بڕیارێکی جیهانی، ژینگەی لەکەنداوا پیسکرد، دەمامکی ڕووی ئەم ڕژێمە دەرکەوتو ڕووە ناشیرنەکەی بۆ هەموو لایەك ئاشکرابوو. دوای ئەمە وڵاتانی جیهان بەسەرپەرشتی ئەمەریکا کۆبوونەوە بۆ گەڕانەوەی ئاسایش بۆ ناوچەکەو دانانی سنوورێك بۆ سەرچڵییەکانی بەعس. بۆیە توانرا لەماوەیەکی کەمدا ڕژێمی بەعس لەکوێت دەرپەڕێندرێت. ئەم ڕووداوە هەلێکی گەورەبوو بۆ گەلی کورد، هەر بۆیە ماوەیەکی کەم دوای ئەم ڕووداوە، کورد لەکوردستانی عێراق ڕاپەڕیو سەرجەم دەزگاکانی بەعسی دەرکرد.

لەسایەی ئەم ڕاپەڕینەدا کورد بەئازادی خۆی شادبوو کەسەرەتاییترین مافی گەلانە لەجیهاندا. لەو چوارچێوەیەشدا نەتەوە یەکگرتووەکان بڕیاری پاراستنی گەلی کوردیاندا لەپەلاماری لەشکری دکتاتۆری عێراق. بۆ ئەم مەبەستە هێڵی دژەفڕینی ٣٦یان کرد بەسنووری قەدەغکراو لەفڕۆکەکانی بەعس. بەڵام ئەوەی جێگای داخە بۆ گەلی کورد ئەوەیە کە بەپێی ئەم بڕیارە, ناوچە هەرە دەوڵەمەندو گرنگەکەی کوردستانی باشوور کەرکوك، خانەقین، شێخانو تەلەعفەر، لەژێر دەسەڵاتی بەعسدا مایەوە.

ڕەنگە جەنابیشتان باش بزانن کەئەم ناوچەیە بۆ ئێمە وەکو قودس وایە بۆ فەلەستینییەکان کەئێستا بەعس ئازادانە ڕۆژانە بەرنامەکانی تعریبو تەبعیسو تەهجیری تێدا پیادە دەکا، کەدواییینیان پرۆژەی جێنشینکردنی ئاوارە فەلەستینییەکانە لەکەرکوك، کەبەدڵنیاییەوە دەزانن ئەم کردەوەیە بۆ داهاتووی ئاسایشی ناوچەکە چەند سامناکە.

بەڕێز جەنابی سەرۆکی نەتەوە یەکگرتووەکان: ئەمڕۆ گەلەکەمان سوپاسی یەزدان دەکا کەهەلێکی بۆ ڕەخساوە تا ئازادبێو بێ ترس لەگەڵ خێزانەکانیان بژینو خەون بەسپێدەیەکی ڕووناکترەوە ببینن. ئەم بارودۆخە لای گەلەکەمان ئەوەندە دڵخۆشکەرەیە وەکو خەون وایە، چونکە ئەمە یەکەم جارە لەمێژووی کۆنو نوێماندا لەم ناوچەیە، لەژێر چەپۆکی ڕەشی دەوڵەتە ئیقلیمییەکان ڕزگارمان بێت. لەو ماوە کەمەی ئازادیشماندا بۆ هەموو جیهانمان سەلماند کەئێمە گەلێکین تینوی ئازادیو دیموکراسین، هەر بۆیە ساڵێك دوای ڕاپەڕین، بووین بەخاوەنی یەکەم پەرلەمانی بەڕاست هەڵبژێردراوی گەل کەهەموو حزبەکان بەڕاستو چەپیانەوە ئازادانەو بێ هیچ سانسۆرێك بەشدارییان تێداکرد، کەئەم پرۆسەیە لەڕۆژهەڵاتدا تا ئێستا بێوێنەیە. بەڵام ئەوەی جێی داخە لەم بارەیەوە ئەوەیە کەپاش ماوەیەکی کەم شەڕی ناوخۆ یەخەی گرتینو تووشی پارچەپارچە بوونو پەرتەوازەبوونی کردین, کەمۆتەکەی شەڕ زیانێکی ئێجگار گەورەی لێداین. هەروەها مەترسی گەڕانەوەی بەعسی خستەوە بەر دەرگاکانمان، بەتایبەتی دوای ئەوەی لە ١٩٩٦/٨/٣١، لەسەر داوای مەسعود بارزانی سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستان، کەپێشتر لەپەرلەمانی هەڵبژێردراودا نیوەی کورسییەکانی بەدەستهێنابوو، بۆ بەرژەوەندی بنەماڵەو حزبەکەی خۆیان تانکەکانی گاردی کۆماری ڕژانە ناو پایتەختی کوردستانو پەرلەمانیان داگیرکرد. لەو بەرەبەیانەدا سەدەها تانکی گاردی کۆماری سەدام حسەین پەلاماری ئەم شارەیان داو بەبۆمباکانیان سەرجەم خەڵکی

ئەم شارەیان لەخەو راپەراند. ئەم لەشکرە درندەیە هەر چەندە بەگاڵتە تۆپیان دەگرتە شارەکە، بەڵام خەڵکی بەراستی دەمردن. دوای ئەمە بنەماڵەی مەسعود لەناوچە هەرە دۆڵەمەندەکەی کوردستانی ئازاددا بوون بەپاشاو دەستیانگرت بەسەر هەموو داهاتەکانی کوردستاندا، کە لەراستیدا داهاتی سەرجەم گەلی کوردستانە، بەبێ رەچاوکردنی بیروباوەڕو ئاینو حزبەکان. بەڵام ئەم بنەماڵەیە وەك چۆن لەهەڵگیرساندنی شەڕی ناوخۆ گوێیان بۆ کەس نەگرتو دەستبەرداری نیازە گڵاوەکانیان نەبوون، بەهەمان شێوە هەموو بانگەوازو لەبەر پاڕانەوەکانی کۆمەڵانی خەڵکی کوردستانیان پشتگوێ خست، بەهەموو چینو توێژەکانیەوە.

بەڕێز لێپرسراوی مافەکانی مرۆڤ لەجیهاندا: هەموو کەس لەکوردستاندا دەزانێت من سەر بەهیچ حزبێکی سیاسی نیمو پاکانە بۆ کەس ناکەم، سێ بەرگی کتێبەکەشم (کورد دوژمنی خۆت بناسە) کە لەکوردستان بەکوردیو لەئەوروپا بەعەرەبی بڵاوبۆتەوە بەئاشکرا ئەو راستییەی پێوە دیارە. چونکە من لەرێی ئەزمونی مێژوویی زیاتر لەچل ساڵم لەناو سیاسەتو، ژیانم لەگەڵ خودی عەبدولڕەحمان عارفو سەدام حسەینو مەلامستەفاو مەسعود بارزانیو مام جەلالو سەرجەم سەرکردە کوردو عەرەبەکانی پەیوندار بەکێشەی کورد، بۆم دەرکەوتووە کەهۆکاری هەرە گەورەی نەهامەتییەکانی گەلی کوردو ئاژاوە لەم ناوچەیەدا لەسایەی بنەماڵەی مەلامستەفابووە کەئێستا دەستیان بەسەر پارتی دیموکراتی کوردستاندا گرتووەو بۆ بەرژەوەندی خۆیان بەکاری دێنن. لەو چوارچێوەیەشدا توانیویانە ملیارێكو سێسەدو حەفتا ملیۆن دۆلار لەبانکەکانی ئەوروپاو تورکیا دابنێنن. لەکاتێکدا من لە ١٩٩١/٣/١٣دا کاتێك مەسعود بارزانیم بینی پێی گوتم خاوەنی دۆلارێك نیە !

سەرۆکی خۆشەویست کۆفی ئەنان: ئەم سەروەتە موڵکی گەلی کوردە، سامانی هەژارانو سەرجەم هاوڵاتییانە، بەڵام لەبەرئەوەی ئێمە هیچ دەزگایەکی یاساییمان نییە لەسەروی سەرۆك حزبەوە, بۆیە ناچارین پەنا بەرینەبەر جەنابتان وەکو لێپرسراوی یەکەمی سەرجەم مرۆڤایەتی، تا بتوانین لەرێگای جەنابتانەوە چارەیەك بۆ ئەم گرفتە گەورەیە دابنێین، کەچارەنووسی گەلێکی پێوە بەستراوەتەوە. چونکە وا خەریکە ئەم بنەماڵەیە هیواکانی هەزارەها ساڵەی گەلێکی زیاتر لە ٤٠ ملیۆن کەس بەبا دەدەنو، ئەگەر ئێوە هیمەتێك نەکەنو فریامان نەکەون هیچ رێگرێك نییە لەوەی ئەو بنەماڵەیە دووبارە دەستی بەعس رابکێشنەوە سەر کوردستانو، ئەگەر لەدوای خیانەتی ٣١ی ئابدا هێزە نیشتمانپەروەرو شۆڕشگێڕەکانی کوردستان لەرێگای بەرەی نیشتمانییەوە توانییان هەموو ناوچە داگیرکراوەکان بێجگە لەشاری هەولێر لەژێر چنگی بەعسیەکان دەربهێننەوە، ئەوا رەنگە بەگۆڕانی هەلومەرجی سیاسی ناوچەکە، بەعس بەیەکجاری لەرێگای بنەماڵەی بارزانیەوە لەکوردستاندا رەگی خۆی دابوکتێتەوە.

چارەسەرکردنی ئەو بارودۆخەش تەنها بەوە دەبێت کەبەڕێزتان کار بکەن بۆ ئەوەی کوردستانی ئازاد بخرێتە ژێر چاودێری نەتەوە یەکگرتووەکانو لەژێر دەسەڵاتی حزبە کوردستانییەکان دەربهێنرێت، بەو رێگایە دەتوانن چۆن خۆراك بەیەکسانی لەکوردستان دابەش دەکەن بەهەمان شێوە ئاشتیو ئازادیو ئارامی ناوچەکەش بپارێزن. ئەم کارەش گەورەترین چاکە دەبێت بەرامبەر بەگەلەکەمان.

دەکرێ دوای ئەمەش بەچەند مانگێك لەرێگەی هەڵبژاردنێکی ئازادو دیموکراسیەوەو لەژێر سەرپەرشتی ئێوە، سەرجەم دەزگا حکومییەکان بەپێی ئەو دەنگانە دابەشبکەن کەحزبەکان لەهەڵبژاردندا بەدەستی دەهێنن.

لەکۆتاییدا هیوادارم بەڕێزتان بەچاوێکی جدییەوە ئەم نامەیە بخوێننەوە، چونکە گەرچی یەك کەس ئەم نامەیەی نووسیوە، بەڵام بڕوا بفەرموون کەئەمە داخوازی سەرجەم گەلی کوردستانە کەتەنها لەرێی جەنابتانەوە جێبەجێ دەبێ. بەهیوای ئەوەی بە بەرپرسیاریەتی مێژوویی خۆتان هەڵبستن لەم رووەوە، چونکە ئێمە لەرێگای هەڵوێستو کردەوەکانی

جەنابتان لەناوچە جیاجیاکانی جیهاندا ئێوەمان وا ناسیوە کەپیاوی ئەرکە قورس و زەحمەتەکان و خەمخۆری ئاشتی و ئاسایشن لەسەرجەم گۆی زەوی.

**برای دڵسۆزت**
**ڕەفیق پشدەری**

## تێبینی

یەکەم: هەموومان دەزانین و دڵنیاین کەهۆی نەهامەتیەکانی گەلانی عێراق بەکوردو عەرەبیەوە، هۆی ٩٠٪ی کێشەکانی ناوچەکە بەگشتی، شەخسی سەدام حسەینە کەمن دڵنیام ئەمریکا نایەوێ لەئەمڕۆدا بیروخێنێ، بەڵکو ئەوان بەردەوام دەڵێن سەدامێکی لاوازی دکتاتۆرمان پێ باشترە لەکەسێکی ناتەبا لەگەڵ بەرژەوەندییەکانمان و بەتواناو دیموکراتی. ئەمە وای لەخەڵکی کوردستان کردووە کەبەگشتی ڕەخنەیان لەئەمریکا هەبێ، چونکە پێیان وایە ئەمریکییەکان تەنها بۆ بەرژەوەندیەکانی خۆیان ئەو بارودۆخەیان ئاوا بەهەڵواسراوی ڕاگرتووە.

لەکاتێکدا چۆن سەدام لەبەشی دەسەڵاتی خۆیدا دەستی بەسەر سامانی گەلانی عێراقدا گرتووە، بەهەمان شێوە بنەماڵەی بارزانیش لەسنووری دەسەڵاتی خۆیاندا بوونەتە باندێکی گەورەی مافیاو دەستیان بەسەر هەموو سەروەت و سامانی کوردستاندا گرتووە.

دووەم: ڕاستە لەدوای ڕاپەڕینەوە بەعس و دەزگا ئاشکراکانی لەکوردستان دەربەدەرکران، بەڵام دەزگا نهێنی و موخابەراتییەکانی عێراق و ئێران و تورکیاو چەندین وڵاتیتر ئەمڕۆ لەکوردستاندا بەهۆی نەبوونی حکومەتێکی بەهێزو یەکگرتوو لەناوچەکەدا توانیویانە دزە بکەنە کوردستان و کارە دوژمنکارییەکانیان دەرهەق بەگەلەکەمان ئەنجام بدەن، بەتایبەتی دوای دروستبوونی شەڕی ناوخۆو فراوانبوونی دووبەرەکی لەنێوان هەردوو حزبی دەسەڵاتدار, یەکێتی و پارتی.

سێیەم: ناوچەکانی کەرکوک و خانەقین و تەلەعفەرو سنجارو شێخان کەناکەونە ناو سنووری هێڵی ٣٦، ئەمڕۆ لەژێر دەسەڵاتی بەعسدا تووشی کاولکردن و ڕاگوێزان بوون. ڕۆژانە چەندین خێزانی کوردی کەرکوک بەرەو کوردستانی ئازاد دەردەکرێن و لەبری ئەوان عەرەبی عێراقی یان فەلەستینی جێنشین دەکرێن. ڕێکخراوە خێرخوازەکان و دەزگا بەرپرسەکانیش دوور لەزێدی باوباپیرانیان خانویان بۆ دروست دەکەن، کەئەمە بۆ خۆی بەشداریکردنە لەسیاسەتی ڕاگوێزانی کوردو جێنشینکردنی عەرەب لەجێگایاندا.

چوارەم: من لە ٢٠٠٠/٣/١ دا نامەیەکم بۆ بەڕێز نوێنەری نەتەوە یەکگرتووەکان لەسلێمانی نووسی و لەدوا لاپەڕەی بەرگی دووەمی کتێبەکەمدا بەئینگلیزی بڵاومکردەوە. لەو نامەیەدا داوام لێکردبوو تا یەکتر ببینین بۆ ئەوەی لەهەندێ شت ئاگاداری بکەمەوەو گفتوگۆ لسەر هەندێ بابەتیتر بکەین. بەڵام تا ئێستا وەڵامی نەبووە، بۆیە ئەم جارەیان ناچاربووم ڕاستەوخۆ لەگەڵ جەنابتان پەیوەندی بگرم.

## نامەی سێیەم

## بۆ بەڕێز/ کۆلن پاوەڵ ـ وەزیری دەرەوەی ولاّتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا

لەشاری خۆشەویستیو ئاشتییەوە, شاری سلێمانی" لەکوردستانی عیراق بۆت دەنووسم. کەمن ئەو کوردانەی ناوی (کۆلن پاوڵ) نەناسن, چونکە رۆژێك جێی خۆی لەدڵی هەموو ئەوانەدا کردبۆوە کەتامەزرۆی ئاشتی بوون لەسەرتاسەری جیهاندا.

ئاشکرایە کەهیچ متمانەو ئاشتییەك بونی نییە لەگەڵ دیکتاتۆر صدامدا, ئەگەرچی خەڵکانێکی زۆر چاوەڕوانی دەستگیرکردنی سەدام حسێن بون بۆ روبەڕوکردنەوەی لەدادگاییەکی دادپەروەرانەدا بۆ کردنەوەی تولّەی خەڵك لەهۆلاکۆی عیراق. بەلاّم بەداخەوە وا بۆ دەساڵ دەچێت گۆڕانکارییەکان زیاتر بەرەو خراپی دەچێت.

رەنگە بارودۆخی ناوچەی ئێمە بەبەراورد لەگەڵ ناوەڕاستو باشوری عیراق باشتربێ, بەلاّم چاوەڕوانی باشتربوین. لێرەشدا هەڵوێستی ئەمریکاو بارودۆخی ئێستاو رێگاکانی چارەسەرکردنیم رونکردۆتەوە, پڕ لەهیواشم کەئەوەی نوسیومە تێیبگەیو سەیری بارودۆخو پێشنیارەکانیشم بکەی. هەروەها بەچاوی خۆشەویستیو بەزەییەوە تەماشای ئەو گەلە بکەنو لەگەڵ مندا دەستپێشخەری چاکەبنو لەخوای گەورەش داواکارم کەئەم داواکارییەم بۆ بێنێتەدی..

نوسەرێکی سیاسی کوردم وناوم (رەفیق پشدەری)یە، شانازیش بەوەدەکەم کە کوردم.. بۆ ماوەیەکی زۆریش لەگەڵ سەدامدا کارم کردوەو پەیوندییەکی باشم هەبووە لەگەڵ دەسەلاّتدارەکانی حکومەتی عراق. چەندین جاری دەستگیرکراوم کەدواهەمینیان ساڵی ١٩٧٦بوو لەلایەن رژێمی سەدامەوە,بەهۆی خیانەت نەکردنم لەگەلەکەمو ولاّتەکەم.

لەساڵی ١٩٥٨دا کارم لەگەڵ مەلامستەفای بارزانی کردوەو پێشتریش بەتەواوی بنەماڵەکەیانیم ناسیوە, بۆ ماوەیەکی زۆریش لەریزەکانی پارتی دیموکراتی کوردستاندا خەباتم کرد. پاش هەرەسهێنانی بزووتنەوەی کوردی یەکەم کەس بووم یەکەم بارەگای هێزی چەکدارم لەچیای قەندیل دامەزراند. ئەمەو یەکەم کەسیش بووم کەهەستام بەگەیاندنی زانیاری بۆ دەستەی دامەزرێنەری یەکێتی نیشتمانی کوردستان لەساڵی ١٩٦٣ تاکو ١٩٨٦, هەولّوتەقەلایەکی زۆرمدا تاکو پەیوەندیی نێوان هەردوو حزب (یەکێتی نیشتمانی کوردستانو پارتی دیموکراتی کوردستان) پتەو بکەمو هەر لەو ساڵەشدا گۆڤاری (ECONOMIST)ی ئینگلیزی، لەیەکێك لەناونیشانەکانیدا هاتبو (بەسەرکردایەتی رەفیق پشدەری وەفدێکی ئاشتی پێهکات بۆ ئاشتبونەوەو پتەوکردنی پەیوەندیی نێوان هەردوو حزبە سەرەکییەکەی کوردستانی عێراق – پارتیو یەکێتی). لەسێ بەرگی کتێبەکەمدا شێوەی پەیوەندیی نێوان خۆمو بنەماڵەی بارزانیم خستۆتە بەرچاو, بەلاّم دوژمنایەتیی ئێستام بۆیان لەدوژمنایەتییانە بۆ گەلی کورد. لەگەڵ هەڵوێستە ئیجابییەکانم لەگەڵ بزاڤی کوردایەتیدا, ئەوانەی منیان دەناسی بەئاگان کەتالّە مویەك لەرێبازی خەباتی کوردایەتی لامنەداوە. بەلاّم حاڵی حازر سەر بەهیچ حزبو رێکخراوێك نیم, چونکە بڕوام بەوە هاتووە کەمادام بنەماڵەی بارزانی زۆرترین ناوچەکانی کوردستانیان لەبەردەستدابێو زۆرینەی داهاتی کوردستانیش

بچێتە خەزێنەی ئەوانەوە.. مەحالە هەرگیز رێگەبدەن‌و بهێڵن کێشەی کورد چارەسەر بکرێ, بەبەردەوامی رێگەگری بەردەم رزگاربوونی کوردن, لەکتێبەکانمدا ئەمەم سەلماندووە..

بەرێز مامۆستا کۆڵن پاوڵ...

نووسینەکانم لەسەر وڵاتانی دەوروبەر هەرەمەکی دانەرێژراوە.. نووسینم بەشێوەیەکی سەلبی لەسەر ئێران لەمامەڵەکردنی نزیکەوەی خۆمەوە لەگەڵ حکومەتی ئێرانی بۆ دۆزینەوەی چارەسەرێك بۆ مەسەلەی کورد هاتووە. بەلاّم نەك هەر شکستم تیا هێناوە بەڵکو هەوڵی بەلای خۆدا راکێشانیان لەگەڵدا کردم و هەرەشەو مەترسیی سەر منداڵەکانم‌و خێزانەکەمیان لێکردم بۆ ئەوەی حزبێکی کوردی پێکبێنم‌و بۆ بەرژەوەندی ئەوان کاربکەم. هەر بۆ ئەو مەبەستەش سەروەت‌و سامانێکی زۆریان بۆ تەرخانکردم کەهەرگیز خەویشم پێوە نەدەدی, سەرباریشی رەتمکردەوەو لەگەڵ ماڵ‌ومنداڵەکانم بەرەو تورکیا هەلاّتین.. لەوێش هەمان شتیان رووبەرووکردمەوە, بەلاّم بەشێوازێکی‌تر. چەند جارێکیش توندییان بەرامبەرم بەکارهێنا تا وەك مامۆستایەك بۆ مخابەراتی تورکی کاربکەم. لەوێشەوە خۆم گەیاندە سوریاو چاوپێکەوتنیان لەگەڵ بەرێوەبەری موخابەراتی سوری (علی دبی) لەساڵی ۱۹۸۱دا بەزۆر بۆ رێکخستم, داوای ئەوەی لێکردم کەکار بۆ حکومەتی سوری بکەم بەلاّم

کەئەویشم رەتکردەوە داوای بەجێهێشتنی سوریای لێکردم‌و چەند رۆژێکی بۆ دیاریکردم.

ئەمەو چەندین زانیاری زیاترم دەربڕیوە لەنووسینەکانمدا.

لەبەرئەوەی رەخنەم لەهەموو حزبەکانی کوردستان گرتووەو هەندێك لایەنی قێزەونم ئاشکراکردوون, قینەبەرایەتی بۆ دروستکردم لەلایەن ئەوانەوە. هۆکاری مانەوەم لەسلێمانی ئەوەیە چاکتر بەدی ناکەم بۆ حەوانەی خۆم‌و خێزانەکەم. چوار پاڵپێوەنەری سەرەکی‌و پشتیوان بۆدەرکردنی کتێبەکانم هەن کەئەوانەن:

۱– برواربوونم بەخوای گەورەو پارێزگاری لەمن.

۲– هەستکردنم بە بەرپرسیاری لەبەرانبەر چارەنوسی گەلەکەم.

۳– هاندانی خەڵکانێکی زۆرو پشتیوانیکردنم بەتوندی.

٤– بوونی ئازادیی چاپەمەنی لەسلێمانیدا. بلاّوبونەوەی بەرگی دووەم وسێهەمی کتێبەکەم لەبازارەکاندا ئەوە دەسەلمێنی, کەتێیدا داوام لەهەردوو سەرکردە (جەلال تاڵەبانی‌و مەسعود بارزانی) کردووە دەست لەکاربکێشنەوە چونکە ئەوانە سەرچاوەی ململانێی دوو حزبەکەن, هەروەها داوام لەUN کردووە هێزێك دابمەزرێنن بۆ کۆتاییهێنان بەناکۆکی نێوان ئەو دوو حزبە بەزەبری هێزو, داماڵینی چەك‌و ئەنجامدانی هەڵبژاردنێکی ئازاد, ئەو کاتە دەردەکەوێ کەئایا بنەماڵەی بارزانی دەتوانن لە١١٪ بێنن لەدەنگەکانی گەل؟ من بەدڵنیاییەوە دەڵێم نەخێر.

ئەو کاتەی ئاشتی بۆ وڵات دەگەرێتەوەو داد دەچەسپێت ئەوا من جەخت دەکەمەوە سەر ئەوەی ٦٥٪ی کوردە کۆچکردووەکان دەگەرێنەوە خاکی خۆیان, چونکە زیاتر لە ۲۰۰ هەزار کوردی باکوری عێراق لەدەرەوەی کوردستان دەژین, ئەوەش تەنها بۆ هەلاّتن لەدەست بنەماڵەی بارزانی بەسەر داهاتی کوردستانداو, شەڕی ناوخۆو ئاوارەیی‌و سوکایەتی, کەس حەزی پێناکات‌و, ئەو کاتەش دەردەکەوێ کە ۹۷٪ی گەلی کورد پشتگیری بەرنامەی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەکات, منیش کەسێکی ئەوەندە ریزپەرنیم تا لەو کاتەدا بێجگە لەکوردستانی خۆشەویست بەهیچ شوێنێك رازیبم.

بەرێز.. وەزیری دەرەوەی ئەمریکا....

من ژیانی خۆم و بنەماڵەکەم خستۆتە خزمەتی گەلی کوردو کێشە رەواکەی, هەروەها

هەموو سامان و ئەوەی هەمبووە. ئەوەش کە لەژیاندا دەستمکەوتووە تەنها رەزامەندی خـواو خـەڵکانی خـاوەن بڕوابـووە. پاشماوەو میراتم تەنها ئەو کتێبەیە کەتا ئێستا سێ بەرگیم لێدەرکردووە, هەگبەکەشم زۆر لەوە زیاتری تێدایە کەلێرە بـوار نیە بینوسم تا لەولآت بەسەلامەتی دەرم دەکەن بۆ شوێنێکی سەلامەت تا بتوانم شۆڕشە فکرییەکەم کۆتـایی بێـنم. خـواش ئاگادارە کەمن شتێکم نەنوسیوە تەنها ئەوە نەبێت کەویژدانم بەسەرمیدا سەپاندووە. ناوەڕۆکەکەشی بریتیە لەمێژوویـەك کە بەسەر کورددا هاتووە, راستیەکانم بەوردییەکی زۆرەوە نوسیوەو تەنها باسی ئەو شتو روداوانەم کردووە کەتێیدا ژیاوم و بەچاوی خۆم بینیومـە, لەگـەڵ خـستنەڕوی رێوشـوێنی چارەسـەرکردنی کێـشەی گـەلی کـورد بـەپێی بـارودۆخی ئێـستاو هۆکارەکانیشم بەوردی رونکردۆتەوە.

هەروەها بەئاشکرا سیاسەتی ئەمریکیم دەرخستووە کە چ رۆڵێکـی سـلبی هـەبوە بەرامبـەر بـە کێـشەکەمان لـەڕابردو و داهاتودا, نەك هەئەوەندە بەڵکو بوونەتە بەردێك لـەڕێی دروسـتبوونی دەسـەڵاتێکی کـوردی.. بەتایبـەتی لـەکاتی نـاڕەزایی دەربڕینی ئەمریکا بۆ دابەشکردنی عێراقو دواجار چاوپۆشی لە کەمایەتیو نەتەوەکانی خاکی عێراق, ئەم سیاسەتە لەگـەڵ بەرژەوەندیی ئێرانو تورکیاو سوریاو عێراقیش گونجاوە.

١– هەڵوێستی ئەمریکا بەرامبەر بە(کۆماری مەهاباد), لەساڵی ١٩٤٥ لەو کاتەدا سـەرۆکی کۆچـکردوی ئـەمریکا (ترۆمـان) هەڕەشەیەکی توندی لە(ستالین) کردو پێی راگەیاند: (ئەگەر سوپای سور لەماوەیـەکی دیـاریکراودا پاشەکشە نەکـەن لەناوچەکە,ئەوا ئەمریکا ناچاردەبێ هەمو هێزەکانی دەریا, ئاسمان, وشکایی, بەکاربێنێ بۆ هێرشکردنەسەر سوپای سور)، ئەمە بوە هۆی پاشەکشەی سوپای سورو دواجار روخانی کۆمارەکەو لەسـێدارەدانی سـەرۆکەکەی (قـازی محەمـەد)و چـەند هاوڕێیەکی کە ١٢ کەس بوون.

٢– رێکەوتنی جەزائیر کە لەنێوان محەمەد رەزاشاو سەدام حسین ئەنجامدراو سەرۆکی جەزائیری هواری بومدیەن نێوانی دەکـردن, بـوو بـەهۆکاری هەرەسـهێنانی بزووتنـەوەی کـوردی لەعێراقـدا لەسـاڵی ١٩٧٥.. نەخـشەکە لەلایـەن مخابـەراتی ئەمریکییەوە داڕێژرابوو, سەیر لەوەدا ئەوەیە مستەفا بارزانی کارەکەی بۆ ئەنجامدان کەدژی ویستی گەلی کوردبوو.

٣– بۆردومانکردنی هەڵەبجە بەشێوەیەکی دڕندەو بەچەکی کیمیاویو کوشتنی بەکۆمەڵی خەڵك...لەکاتی خۆیشیدا بێدەنگیەکی زۆری لێکرا.

٤– پـاش کـۆڕەوی ٣ ملیـۆن کـوردی سەرلێـشێواو بـەرەو سـنورەکانی نێـوان عێـراقو ئێـرانو تورکیـا بـۆ خۆڕزگـارکردن لەمەترسیی حکومەتی عێراق لەپاش خۆیان, هەرچی هەیانبوو جێیانهێـشت بـۆ پارێزگـاری لـەژیانی خۆیـان. پـاش ئـەوەش وڵاتانی رۆژئاواو ئەمریکاو بەریتانیاو فەرەنسا هێزێکی سەربازییان پێکهێنا بۆ پاراستنی میللەتی کـورد لەحکومـەتی عێـراق لەئەنچەرلیك, ئەوەبوو هێڵی ٣٦ کرا بەناوچەیەکی پارێزگاری کوردەکان ئەمەش بۆچوونی ئـەمریکابوو کەسـەپاندی بەسـەر بەریتانیاو فەرەنسا.

ئەم بڕیارەش ناڕەوابوو دژ بەگەلی کورد, کەبووە هۆی ئەوەی ٢/٥ی خاکی کورد چوە ژێر دەسـتەڵاتی حکومـەتی عێـراق وەکو (کەرکوكو خانەقینو سنجارو شێخان) کەئێـستا لـەژێر بـەزەیی حکومـەتی عێراقیـدانو تـەرحیلو تـەعریب دەکـرێنو بەرەو زیندانەکان راپێچ دەکرێن.

٥– واقیـع سـەلماندی کەئەنـچەرلیك رێگـەی بەسـوپای تورکیـدا بـەئارەزووی خـۆی پـێ بخاتـە ناوچـە کوردییـەکانو لـە ١٩٩٦/٨/٣١یشدا سوپای عێراق بەنەخشەیەك لەموخابەراتی ئەمریکییەوە، هاتە شاری هەولێرەوە.

٦- لەچوارچێوەی ململانێی ناوخۆیی هەردوو حزبەکەی کوردستانی عێراق, خۆشحاڵی میللەتی کورد نەدەپێورا بەرامبەر بەئیمزاکردنی رێککەوتنی واشنتۆن بەئامادەبوونی وەزیری دەرەوەی ئەمریکاو لەبەرچاوی خەڵك. زۆر کەسیش وایاندەزانی کەحکومەتی ئەمریکا دەستەڵاتێکی کوردی دروست دەکات، بەڵام لەپڕ ئەم خەونە جوانە بەباچوو, لەو کاتەشدا حکومەتی ئەمریکی دەبوایە وەفدێکی باڵای خۆی بکردایە بەسەرپەرشتیار بۆ جێبەجێکردنی ئەم رێکەوتنە لەنێوان هەردوولا, دەشبوایە بەرامبەر لایەنی سەرپێچیکەر هەڵوێستێکی توندی وەربگرتایە, من دڵنیام لەوەی کەئێوە مەبەستتان نەبووە ئەو رێکەوتنە جێبەجێ بێت چونکە ئێوە بەدڵنیاییەوە ئاگاتان لەپەیوەندییە گوماناوییەکانی بنەماڵەی بارزانی هەیە لەگەڵ وڵاتەکانی ناوچەکە. بەبەڵگە سەلماندوومە کەبوونی دەسەڵاتی بنەماڵەی بەرزانی کە بەسەر زۆربەی ناوچەکانی کوردستانی عێراق, بۆتە رێگر لەبەردەم رزگاری میللەت, چ جای چەسپاندنی ئاشتی لەناوچەکەدا.

**بەڕێز وەزیری دەرەوەی ئەمریکا :**

داوای لێبوردن دەکەم کەئەم مافەم بەخۆمداوە ئاگادارتان بکەم لەمامەڵەو پەیوەندییە سیاسیەکانتان کەتەنها لەگەڵ بنەماڵەیە, بەمەش دەنگو هەڵوێستی میللەتتان پشتگوێ خستوەو من بەچەندین بەڵگە ئەو راستیەم خستۆتەڕوو کەئەم بنەماڵەیە لەمێژووی گەلی کورددا لەپێناوی لەناوبردنی ویستی گەلی کورد چەند خائینن.

لەسێیەم دانیشتنی دادگاییکردنم لەتەمموزی ١٩٧٨ لەلایەن حکومەتی عێراق, وەك بەرگری لەخۆم ئەوەم روونکردەوە کەمن تاوانبار نیم تا دادگایی بکرێم, بەڵکو تاوانبار سەرۆکی عێراقو رژێمەکەیەتی, من هەمیشە راستیم گوتوەو رێنماییم کردوون بۆ شتێك کەمایەی خێرو چاکسازییە بۆ عێراق بەعەرەبو کوردو کەمایەتییە بێسەرپەرشتەکانی تریشەوە, ئەوەی بە ئەحمەد حسن بەکرو صدام حسینو سەرکردەو بەرپرسەکانیترم دەگوت لەدانیشتنەکانو کۆبوونەوەکانو راپۆرتەکانمدا, لەبارەی بارودۆخی ناوخۆو دەرەوەی عێراق بوو لەگەڵ رێگاچارەکانی بەبەڵگەوە. بۆیە گەیشتمە ئەو بڕوایەی کەسەرکردایەتی دەسەڵاتی عێراق لەدەرەوە بەڕێوەدەبرێ نەك خۆی, خۆی بەڕێوەبەرێ, چونکە تەنها شێت بۆ بەرژەوەندی خۆیو خەڵك هیچ ناکا, خۆ ئەوانیش شێت نین.

یەکێك لەخاڵە سەرەکییەکان کەپەیوەندی بەئەمریکاو کێشەی کوردەوە هەیە کە بەدووروودرێژی لەکتێبەکانمدا باسمکردووە, ئەوەیە ئەگەر دەسەڵاتی عێراق دەیەوێ کورسی (هلمز) بلەقێنێ, واتە سەفیری وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکای ئەوکات لە تاران, ئەگەر بیانەوێت سیاسەتی ئەمریکا لەرۆژهەڵاتی ناوەڕاست بهەژێنن, ئەوە پێویستە رژێمی عێراق مافی سەربەخۆیی تەواو بەکوردەکان بدا, ئەوەش بەبڕوای تەواوەوە ئەوکات خۆشەویستی گەلی کورد بۆ لای خۆی رادەکێشێو وردەوردە لەرێگای کوردەکانی عێراقەوەو بەپشتیوانی دەسەڵاتی عێراق, رژێم دەتوانێ ئێرانو تورکیا پارچەپارچە بکاو ئەویش بەلێکدانی کوردەکانی هەردوو وڵات بەکوردەکانی عێراقەوە دواجار رزگارکردنی عەرەبەکانی ئەهوازو ئەسکەندەرونە. چونکە لەئێرانو تورکیا چەندین نەتەوەیتر هەن, لەئێران فارس, ئازەر, کورد, عەرەب, بلوچ, کەمایەتییتر, لەتورکیاش تورك, کورد, ئازەر, عەرەب, ئەرمەنو چەند نەتەوەیەکیتریش هەن. بەو شێوەیە سنووری رژێمی عێراقی فراوان دەبێت تا ئەوریێزو ئەنکەرە, هەروەها رژێم دەبێتە بەهێزترین دەوڵەت لەناوچەکە ئەوەش بەهۆی کوردەکانەوەو تاهەتایە لەمەترسی ئێرانو تورکیا دووردەکەوێتەوە. هەموو ئەوە هیچ لەسەر دیکتاتۆر سدام ناکەوێ, تەنها راکێشانی خۆشەویستی کوردو رزگارکردنیان لەشای ئێرانو علمانیەت, چونکە گەلی کورد تەواوەو بێ کەموکوڕیەو ئەوەی

پێویستی پێیەتی تەنها سەرکردایەتییەکی دانایە. سەبارەت بەسەدام من دەستی خۆم لێتەکاندووە چونکە هیچ خێری تێدانییە, ئەوەشم سەلماندووە کەئەو بۆ یەکێك لەولاتە زلهێزەکان کاردەکات, من لەهەموو تەمەنی خۆمدا هیچ کات بەقەد ئەوە پەشیمان نیم کەدوو جار بۆم هەلکەوت سەدام بکوژم بەلام ئەنجامم نەداوە, بەهەرحال کات بەسەرچووە.

من لەکاتی خۆیدا بۆ سەدامم روونکردەوە کەبەڕێز (هلمز) کەئەو کاتە سەرۆکی موخابەراتی مەرکەزی ئەمریکی CIAبوو، واقیعیش ئەوەی سەلماند کەچۆن سیاسەتی ئەمریکا وای لەهلمز کرد ببێتە سەفەیری ئەمریکا لەتاران, لەپشت ئەم کارە شتێکی نهێنیو سامناك نەبوو دژی بەرژەوەندیو ویستی ولاتانی دراوسێ, بەلام ئەمانە بێکەلك بوون بۆیە لەو رۆژەوە من زانیم کەسەدام کۆتایی پێهات.

لێرەدا پرسیارێك لەبەڕێزتان دەکەم... بۆچی بیر لەگرتنەخۆی کێشەی کورد ناکەنەوە, بۆچی گەلی کورد بەلای خۆتاندا راناکێشن بۆ تێکشکاندنی ستەمکارانو ملهوڕانی ناوچەکە, پاش ئەوەی راستەوخۆ رزگاریان دەکەن. ئێمە گەلێکی دێرینو رەسەنین, مێژووش شایەتە کەئێمە وەکو نقوومبووی ناو دەریا واین کەپەنا بۆ چیلکەداریش دەبات, بۆ نابنە کەشتی رزگارکەری ئێمە؟ بۆچی نامانکەنە دیواری بەهێز دژی تێکدانو ناخۆشیو ملهوڕی؟

بەبەرنامەڕێژی CIAو بەجێبەجێکردنی لەلایەن گەلی کوردەوە کە لەژێر ستەمی دەسەلاتدا دەینالاندا, راپەڕین لەکوردستانی عێراقدا روویدا, رژێمی عێراقیش بەهەموو تواناو هێزی خۆی توایەوە کەئێستاش بەشێکی لەو هێزانەی ماوەو دەم نادەمێك هەڕەشەی پێ لەئاسایشی کەنداوو ناوچەکە دەکات, سەدام وەکو سەگی دڕی بەستراو بەزنجیر وایە, کەسەری زنجیرەکە لەژێر مێزی کۆبوونەوەی سەرکردە ئەمریکییەکانە.

لەچاوتروکانێکدا گەلی کورد توانی ٩٥٪ ی خاکی کوردستانی عێراق رزگاربکاو پاشان دوو حزبە دەسەلاتدارەکەی کوردستانی عێراق هاتنو لەسەر کورسی دەسەلات پال کەوتن, بەبێ ماندووبوون، واقیعیش ئەوەی سەلماند. کاتێك لەشکری عێراقی پەلاماری کوردستانی دایەوە گەل لەگەل هەموو حزبەکانیتردا بەرەو سنوورەکان هەلاتن, ئەو کاتە لەچواردەوری مەسعود بارزانی تەنها ١٥ کەس هەبوو, بۆیە زۆر بەتووڕەییەوە مێزەرەکەی بەزەوییداداو بەمام جەلالی گوت: (بۆچی واتکرد بگەڕێمەوە کوردستانی عێراق, لەکاتێکدا لەمەنزلگای خۆم لەئێران بەئارامی دەژیام), دوای دامەزراندنی ناوچەی ئەمنیو ئەنچەرلیك, پالەوانی دۆڕاو بارزانی، گەڕایەوە سەر کورسی دەسەلات.

لای ئێوەی بەڕێز ئاشکرایە کەئێمە بەشێکین لەجیهانی سێیەم, نەزانی بالی بەسەرماندا کێشاوە, ئێوە چیتان چاوەڕێ دەکرد لەچارەنووسی گەلێك کەخۆی تەسلیمی میلیشیایەك کردبێ کەسێکی وەکو مەسعود بارزانی سەرکردایەتی بکات, لەسەر ئێوە پێویست بوو کەدوای رزگاربوونمان بەڕەلامان نەکەن, پێویست بوو بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ ولاتتان پاراستبا, تا گەل هەست بەدلنیایی تەواو بکات بەبێ هیچ خۆسەپاندنێکی سەربازی میلیشیاکان. پاشان ئەنجامدانی هەلبژاردنێکی ئازادانە کەلێژنەیەکی نێودەولەتی سەرپەرشتی بکا, بەو شێوەیە فێری بەڕێوەبردنی ولاتمان بکەن ئەوکات لێمان گەڕێن. ئێوە چیتان چاوەڕوان دەکرد کەپڕ بێ لەبەروبوومی زۆر کەبنەمالەی بارزانی, بەوپەڕی بێ ویژدانییەوە دەستی بەسەردا گرتبێت, جگە لەبێنەواییو نەبوونی, ئەگەر بڕیاری نەوت

بەخۆراك نەبووبا ئەوا خەلکی یەکتریان دەخوارد.

ئەی سەرۆكو رابەرانی حکومەتی ئەمریکی... پێم وانیە ئێوە, ئێمە وەك خۆتان ببینن. ئێوە لەئەمریکا دوو حزبی بەربەرەکانتان هەیە, (حزبی دیموکراتیو حزبی کۆماری), لەگەل ئەو هەموو جیاوازیەی کە لەنێوانیاندایە بەلام ئامانجی

سەرەکییان خزمەتکردنی گەلی ئەمریکیە, زیانەکانی رووبەڕووبوونەوەی یەکتر زیان بەبەردێك ناگەیەنێ لەئەمریکاو منداڵێکی بچووکیش ناگرێتەوە.

مـن لێـرە گاڵتـە بەحزبـەکان ناکـەم بـەڵام جیـاوازی ئێمـەو ئێـوە ئەوەیـە کەدەمەقاڵـەی ئێـوە لـەخراپترین حاڵەتیـدا شەڕەجنێوە, لای ئێمە شەڕەتفەنگ. من گلـەیی لەبنەماڵـەی بـارزانی ناکـەم لەپەیوەندییـە گوماناوییـەکانیان لەگـەڵ وڵاتـە دراوسێکانو جیهاندا ئەگەر لەپێناوی خزمەتی خاکەکەی خۆیاندابێت. بـەڵام ئـەم پەیوەندییانـە تـەنها خزمـەت بەبنەماڵـەی بارزانی دەکاتو ئابڕووی هاووڵاتی کورد لەبەرچاوی جیهـان دەشـێوێنێ. بەمامەڵـەکردنتان لەگـەڵ چـەند کەسـێكو بەچـەند رووپەكو پشتگوێ خستنی ویستی گەل ئەوا گومان دەکەم کەئێوە لەو راستییەوە دووربن. من لەهەرسێ بەرگی کتێبەکەمدا ئەوەم سەلماند کەستەمو ملهوڕی لەکوردستان کۆتایی نەهاتووە, ئەوەی گۆڕاوە تەنها رووەکانە, ناوەرۆك وەك خۆیەتی.

ئێوە بەپشتیوانیتان لەبنەماڵەی بارزانی ئەوە دەسەلمێنن کەئێوە بەرنامەتان بۆ ئەو بارودۆخـە داڕشـتووە چـونکە گـەل لەژێردەستیاندا دەناڵێنێ. من کتێبەکانم بۆیە دەرکردووە تا رێگا لەبەردەم خەڵکدا رۆشـن بکەمـەوەو چـاویان بخەمـە سـەر راستی, کتێبی یەکەمم لەسلێمانی دەرکردو لەهەولێر بڵاومکردەوە یەکسەر لەلایـەن بنەماڵـەی بـارزانی دەسـەڵاتدار بڕیـاری تیرۆرکردنم دەرکرا. پاشان بەرگی دووەمو سێەمی کتێبەکەم لەسلێمانی دەرکرد, ئەوەتا ئێستا من لەگەڵ خێزانەکەمـدا کـە ١٩ کەسین لەبارودۆخێکی سامناکدا دەژین کەمەرگ هەموو کاتێك هەڕەشەمان لێدەکات, نازانین کەی بەکرێگیراوانی بارزانی یان ئێرانی یان تورکی یان عێراقی لێمـان دێتـە ژوورێ تـا کۆتاییمـان پـێ بێـنن. ئـەوە لەبـەر ئـەوەی لەکتێبەکانمـدا باسـی بەرنامەو دوژمنایەتی ئەو لایەنانەم کردووە بەرامبەر بەگەلی کورد. لەبـەر ئـەوە لـەخوا دەپاڕێمـەوەو داوا لـەئێوەش دەکـەم وەك باوکێكو رزگارکەرێك کـە لەگـەڵ خێزانەکەمـدا رزگـارم بکـەن لەدەسـتی دوژمنـانو لەسـلێمانی دەرمـان بێـنن بـەهێزی سەربازی زیاتر لەهی دوژمنانو بمانگەیەننە ناوچەیەکی ئارام لەجیهاندا کەدەستی بەکرێگیراوانی پێنەگات. تـا ئـەو کاتـەش داوا لەبەڕێزتان دەکەم کەپارێزگاری ئەمنیم بگرنە ئەستۆ, ئەوەش بزانە کە لەبەر خراپی بارودۆخمان نـەبا داوای یارمـەتیم لێ نەدەکردی, بەڵێنیش بێ لەمنەوە کە لەگەڵ یەکەم زرێپۆشی هێزەکانی هاوپەیمانانـدا بگەڕێمـەوە کاتێـك بڕیـاری رزگـاری کوردستان دەدەن. بەڵام لێرەدا پرسیارێکیتر دێتە پێشەوە ئەویش ئەوەیە کەئایا ئێـوە رێبـازی سیاسـەتی دوژمنکارانـەی خۆتان بەرامبەر بەئێمە دەگۆڕن یان هەروەکو خۆی دەیهێڵنەوە؟ ئایا سیاسـەتی ئێـوە دەسـتوورەو نـاگۆڕێ؟ شـای ئێـران لەخەڵکە نزیکەکانی رژێمی ئەمریکابوو, کاتێك کاری تەواوبوو وەکو مشکی تۆپیـو کلکیتـان گـرتو فڕێتاندایـە دەرەوە, شـا لەفڕۆکەکەی خۆیدا بەئاسمانەوە بۆ پارچە زەوییەك دەگەڕا کەتێیدا بنیشێتەوە بـۆ ئـەوەی تـەرمی خـۆی تێـدا بشارێتەوە لەکاتێکدا خاوەنی پێنجەم لەشکربوو لەهەموو جیهاندا. کەواتـە ئێـوە کارئاسـانیتان بـۆ کۆمـاری ئیـسلامی کـرد بـۆ گرتنـە دەستی دەسەڵات لەئێران, بەڵام من دەبینم دوژمنایەتییەکی گەورەتان لەنێوان خۆتانو گەلی ئێراندا
دروستکرد, کەلێنێکتان نایەوە کەزەحمەتە پڕبکرێتەوە.

هیوادارم چاو بەسیاسەتەکانی خۆتاندا بخشێننەوە بەتایبەت بەرامبەر بەگەلی ئێمەی لێقەوماو, داواکارم لەخوای گەورە بەزەیی بخاتە دڵتانەوە بۆ رزگاربوونمان وەکو گەلو رزگاربوونم لەگەڵ بنەماڵەکەمداو دوورخستنەوەم بۆ ناوچەیەکی ئارام تا رۆژی رزگاری, کەهیوادارم نزیك بێت. لەکۆتاییدا ئەوپەڕی رێزو سلاوی ئێمە بۆ تۆو بەرپرسانیتری دەسەڵاتدار لەولاتەکەتاندا.

هاوپێچ وێنەیەك بەزمانی ئینگلیزی لەگەڵیدا کەبۆ لایەنە بەرپرسەکانم ناردووە, کۆی گشتی ٢٤ لاپەڕە.

**دڵسۆزتان**
**رەفیق پشدەری**
**٢٠٠١/٥/٧**

**نامەی چوارەم**

**بەڕێز / تۆنی بلێر ــ سەرۆك وەزیرانی بەریتانیا...**

پاش رێزو سلاوێکی زۆر...

سلاو و رێزی نیشتمانپەروەریتان لەکوردستان ئاراستە دەکەمو رێزیشم بۆ سەرجەم نیشتمانپەروەرانی بەریتانیای مەزن هەیە, ئەو بەریتانیایەی بەئیمپراتۆری بێ خۆرئاوا ناسراوە پێشتر بەزەبری چەكو ئێستاش بە سیاسەت.. سلاو لەشاری شۆڕشگێڕانەوە, سلاو لەنۆکەری گەلی کورد رەفیق پشدەری..

بەڕێز... من نووسەرێکی سیاسیی کوردم, سۆزی خاكو نیشتمانەکەم هانیاندام کەئازادیو ژیانی تەبای گەلەکەم وەکو ئەرکێك بگرمەئەستۆو لێرەدا چەند رابردوێکی ژیانی سیاسیی خۆم روونەدەکەمەوە..

لەگۆڕەپانی سیاسیدا بەدەستی خۆم, خۆم دروستکردووەو سەرەتای ١٩٥٦ ئاشنای بنەماڵەی بارزانی بووم, پەیوەندییەکی پتەو لەنێوانماندا دروستبوو, بۆ ماوەیەکی زۆریش جێی متمانەی مستەفا بارزانی بوومو لەساڵی ١٩٥٣دا بەڕێز جەلال تاڵەبانیم ناسیو بەهەمان شێوە جێی متمانەی ئەویش بوومو تێکەڵیم لەگەڵ سەرجەم سەرکردە سیاسییەکانی کورد هەبووەو درێغیم لەهیچ خزمەتێکی کورد نەکردووە.. بۆ ماوەیەکی زۆریش لەگەڵ جیهازی مخابەراتی عێراقی وەکو دووجەمسەر کارم کردووە تاکو ئاشکرابوونم لەساڵی ١٩٧٦...

لەنزیکیشەوە سەرۆکە عێراقیەکانم ناسیوە, سەرەتا بەعەبدوالکریم قاسم دەست پێدەکاو کۆتایەکەشی بەصدام حسین. وەکو کەسێکی نزیکیش مامەڵەم لەگەڵ عبدالرحمان عارفو صدام حسین کردووەو مامەڵەکردن لەگەڵ چەندینیتریش لەسەر داواکاری صدام حسین بووە کە لەوکاتەدا متمانەی تەواوی پێبەخشیبووم, بەلام لەکاتی دادگاییکردنم (١٩٧٦/٩/١٤) لەدادگای بەعسدا، دادوەر لێی پرسیم بۆچی خیانەتت لەصدام حسین کردووە لەکاتێکدا بەخۆشەویستو ناز پێدراوی ئەو دەناسرێیت؟ گوتم ئەرشیفی حزبی بەعسم بەپێی دەسەلاتم پشکنیوەو هیچ وشەیەکم تێدا بەدی نەکرد کەمافی کوردی تیابێو دەستم بۆ هەردوو چاوم برد گوتم راستیان جەلالە ئەوەیتر مەسعود, هەموو شانازیەکم ئەوەیە کەکادرێکی کوردمو

هەموو کارەکانم بۆ بەرژەوەندی کوردەو بە بەردەوامی پەیوەندیم لەگەڵدا دەکردن تاکو هەرەسی شۆڕشی بەرزانی لەساڵی ١٩٧٥دا..

لەپێش دەستگیرکردن‌و زینداینکردم لەموخابەراتی عێراقی لەساڵی ١٩٧٦، یەکەم کەس بووم کەبارەگای کوردی دامەزراند کەپاشان بوو بەبارەگای (ی.ن.ك). لەکاتێکیشدا کە لەنووسینگەی دکتاتۆر سدام حسین کارم دەکرد یەکە بەیەکە هەواڵی دامەزراندنی (ی.ن.ك)م بۆ دەستەی دامەزرێنەر رادەگەیاند, ساڵی ١٩٨٥ بەئەنجامێکی سەرکەوتوو توانیم (پ.د.ك)و (ی.ن.ك) پێك بێنمەوەو لەرۆژنامەیەکی ئینگلیزی بەناوی Economist بلاوبکرێتەوە کە بەسەرۆکایەتی رەفیق پشدەری وەفدێك هەردوو حزبی (ی.ن.ك)و (پ.د.ك)ی کۆکردەوە لەژێر ئاڵای تەبابیدا. پاشان رووەکردە کۆماری ئیسلامی بەدوای چارەسەرکردنی کێشەی میللەتی کوردو لەگەڵ بەرزترین دەسەڵاتی ئێرانی کۆبوومەوە بۆ ئەم باسە, بەڵام بێهودەبوو. جگە لەوەش هەوڵی ئەوەیاندا کەکاریان لەگەڵدا بکەم‌و پارەی زۆریان خستە بەردەستم بۆ ئەوەی بمکڕن‌و حزبێکی نوێ دروستبکەم بۆ سووکایەتیکردن بەکورد, لەگەڵ ئەوەشدا رەتمکردەوەو دووبارە بەهەڕەشەکردن لەخۆم‌و خێزانەکەم هەوڵی تەواویاندا کەکاریان بۆ بکەم‌و رەتمدانەوەو گوتم ناتوانم. ناچار ئێرانم بەجێهێشت. لەوێشەوە
لەگەڵ خێزانەکەمدا رووەمانکردە تورکیاو لەوێش بەهەمان شێوە پارەیان خستەڕوو بۆئەوەی
کاریان بۆ بکەم بەڵام دوای رەتکردنەوەم, ئازارو ئەشکەنجەیاندام، دوایی گەڕاینەوە بۆ عێراق ... پێش ئەمەش ساڵی ١٩٨١ لەسوریا چاوپێکەوتنێکم لەگەڵ علی دبی کردوە بەمەرجێك بەزۆر برام بۆ لای لەکاتێکدا لەبارەگای ی.ن.ك بووم لەسوریاو داوای کارکردنی لێکردم‌و گوتیشی کەچاوپێکەوتنێکت لەگەڵ سەرۆك حافز ئەسد بۆ دیاریدەکەم‌و پلەوپایەیەکی بەرزیشم بۆ دادەنێن, بەڵام پاش رەتکردنەوەم هەڕەشەیان لێکردم کە بەزۆرترین کات سوریا بەجێبهێڵم. ئەمانەم لەهەرسێ بەشی کتێبەکەمدا بەدووروردرێژی باسکردووە, لێرەدا دەمەوێت ئەوە روونکەمەوە ئەو دوژمنە ناوبراوانە کەمن دووچاریان بۆمەتەوەو پاشان پەرەپێدان‌و گەشەکردنی حزبە سیاسییەکانی کوردستان, نامۆبوون بۆ دژایەتی وڵاتانی دەوروبەری هەرێمەکە, پشت گوێخستنی جیهان بۆ مەسەلەی کوردو خیانەتە بەردەوامەکانی چەند سەرکردەیەك لەکوردو بەتایبەتی بنەماڵەی بارزانی, بڕیاری دەست پێکردنی (شۆڕشێکی بیری)داوەو لەهەگبەکەشیدا زۆرلەوە زیاتری تێدایە لەسەر صدام‌و موخابەراتی عێراقی‌و بنەماڵەی بەرزانی‌و ئەوانەش کەدژایەتی میللەتی کورد دەکەن, بەڵام بەهۆی نەبوونی دراوی پێویست‌و مەترسی وەزعی ئاسایش, کە واهەست دەکەم زیندانی کرابم‌و لەگەڵ ئەوەشدا مەترسی چواردەورم هەیەو ناشتوانم سنورەکانی دەوروبەر ببڕم‌و ئەمەش پاڵی پێوەنام کەهەوڵی سۆز راکێشانی ئێوەی بەڕێز بدەم‌و داوای پەنابەریتان لێبکەم لەگەڵ خێزانەکەمدا تاکو بمانبەنە دەرەوەی کوردستان.. کتێبەکانم لەکوردستاندا بلاوبوونەتەوە بۆ داوای خستنەڕووی راستیەکان‌و جگە لێرەش لەئەوروپاو چەندین وڵاتانی‌تری جیهانیش, بەڵام لەسنوری ژێر دەسەڵاتی بنەماڵەی بەرزانی تا ئێستا بلاونەبوونەتەوە لەبەرئەوەی بەرگەی راستییەکان ناگرن.

بەرێز.. کورتە باسێك لەسەر دژایەتیکردنی سیاسەتی بەریتانی بەرامبەر بەکورد دەخەمە بەرچاو, سەرەتای باسەکەش لەجیاکردنەوە دەستی پێدەکات, خوای گەورە مرۆڤی دروستکردووە, یەکێك عێراقی بێت یا ئێرانی یا سوری‌و تورکی بێ, ئەگەر بکۆڵینەوە تەماشا دەکرێت هەموو لەیەك دەچێت بێ هیچ پێویستیەك بەلایەنی جوگرافی‌و ئەگەر لەعەرەبێك پرسیاربکرێ جەزائیریە یا سعودیە یا لەکوێ‌و کوێی‌تر منیش دەڵێم چ زیان بەخشێکە گەر چوار پارچەکەی کوردستان هەریەکیان ببێت بەوڵاتێکی سەربەخۆ لەسایەی پیرۆزی کوردو خاکی کورد..

ئەگەر پرسیار لەهاوولاتیەکی کورد بکرێ دەڵێت ئامانجی یەکبوونەوەی خاکی کوردە، گەر لەحزبەکانیش بدوێین هەریەك لەناوچەو پارچەی خۆیدا داوای مافی مرۆڤ دەکات, بۆ نموونە وەکو کوردستانی عێراق داوای مافی خۆمان لەعێراق دەکەین‌و بەهەمان شێوەش لەپارچەکانی تریشدا, کوردیش لەهەرکوێ بێ هەر کوردەو یەك مافیان هەیەو رۆژێکیش دێت هەموو کورد دەبنەوەیەك دژی دەستەگەریی عەرەب‌و فارس‌و تورك, ئەوانەش بەئاگابن کە بەویژدانەوە قسەدەکەن لەو تاوانانەی کەبەریتانیا پێی تاوانبارە بەرامبەر بەمافی ٤٥ ملیۆن کورد, لەکاتێکدا کەکوردستانیان کرد بەچوار پارچەوە تائێستاش عەرەب‌و فارس‌و تورك لەمێژویاندا هیچ پەیوەندییەکی پتەویان نەبووە بەلاّم بەرامبەر بەکورد بێ هیچ گفتوگۆکردنێك هەریەکەیان خاوەنی کورسییەکن لەدەرەوەی مێزی گفتوگۆکردن لەکاتی چەڵەمەیەکی کوردی یاخود هەنگاوێك..

دەمەوێت ئەوە روونبکەمەوە بۆتان کەمن منداڵ نیم بەرد بگرمە پەنجەرەو دواتر هەڵێم, لەبەشی سێهەمی کتێبەکەمدا (کورد دوژمنی خۆت بناسە) کۆبونەوەکانی BBCم کە لەلەندەن ئەنجامداوە بەشێوەیەکی تێروتەسەل باسکردووە لەگەڵ سێ کەسدا کەیەکێکیانم لەخەیاڵە ئەویش بەڕێز ریچاردبوو کەجێگری بەڕێوەبەری بەشی دووی پانۆرامابوو(مانگی ١٠ی ١٩٨١), سەرەتا کەپرسیاری دابەشکردنی خاکی کوردستانم لێکرد گوتی ئەم کارە هی باوباپیرانمانە, بێئەوەی دوانەکەیتر لاری بنوێنن!

بەڕێز.. لێرەدا پرسیارێك هەیە کە لەمێژە لەناخمدا رەنگدەداتەوە, بۆماوەی ١١ مانگ لەلەندەن ماومەتەوە لەم ماوەیەدا هەستم بە هیچ نامۆییەك نەکردو ئەمەش هەڵوێستی هەموو کوردێکە کەلەوێ دەژی, میللەتی بەریتانی بەمانای وشە رۆشنبیرن, حکومەتێکی یەکسان‌و دیموکراتیە لەسنوری دەوڵەتی خۆیدا, بەلاّم لەدەرەوەی سنور بەشێوەیەکیترە, تا ئێستاش بەرچاونەکەوت حکومەتی ئینگلیزی هەڵوێستێکی هەبێ بەرامبەر بەکورد کەدابەشکراون‌و دراونەتە دەستی چەند نەتەوەیەکیتر, ئەوا من لەپاڵ دەنگی ئەو کوردانەم کەناسیۆنالیست نین، هەروەها لەپاڵ دەنگی حکومەتی ئێرانیم لە ٣ خاڵدا:

١–حکومەتی ئەمریکی روخێنەری بناغەی هەموو ولاّتێکە کەدەستی تێ خستبێ..

٢–حکومەتی ئەمریکی هیچ کارێك ناکات کەخرابێتە بەردەستی..

٣–بنەماڵەی بارزانی بۆ موخابەراتی ئەمریکی کاردەکەن, سیاسەتی ئەمریکی لەڕووی نۆکەرەکانی, بەکۆیلەکردنیانە.

وابزانم بەڕێزتان بەئاگان لەگیروگرفتەکانی میللەتی کورد کە لەمێژوودا لەسەردەستی ولاّتانی دەوروبەر بەسەرماندا هاتووە، بۆ نموونە لەسێدارەدانی شێخ سەعیدی پیران‌و چەند هاوڕێیەکی کە ٤٨ کەس بوون لەسەردەستی تورك. تیرۆرکردنی سەرکردەی کورد ئیسماعیل اغا سمکۆ بەفەرمانی رەزا شاو لەسێدارەدانی قازی محەمەدو ١٢ هاوڕێی. تیرۆرکردنی هەردوو سەرکردەی کورد د. عبدوالرحمان قاسملوو د. شەرەفکەندی لەسەر دەست‌و فەرمانی حکومەتی ئێران, کۆتاییشیان رفاندنی عبداللە اوجلان بوو لەسەردەستی تورکیاو راپێچکردنی بۆ زیندانەکانی تورکیاو گوشار خستنە سەرو بەزۆرەملێ لەخشتەیان بردو لەبەرچاوی کوردیان خست بەلاّم بەداخەوە مەلامستەفای بارزانی یەکەم سەرکردەبو کە نۆکەریی خۆی بۆ دەرەوە سەلماند ئەمەشم لەبەشی سێهەمی کتێبەکەمدا بلاّوکردۆتەوەو دەشیسەلمێنم کەرۆژێك میللەتی کورد تۆڵەی خۆی لەبنەماڵەی بارزانی دەکاتەوە..

بـەگوێرەی هەواڵـە گرنگـەکانی کەبیـستوومە لەسـەر (موخابـەراتی هـەر چـوار وڵاتەکـە) جگـە لـەوەی کەمێـژووش سەلماندویەتی چەندین پیلانیان داڕشتووە بۆ لەناوبردنی بزووتنەوەی کورد لەهەر جێیەك بوویێت.. بۆم دەرکەوتووە وەکو دووپشکن کەخۆیان داکوتیو نیشتەجێ بوون دەرناچنەوە, چونکە نابینان, نابیناش چۆن راستییەکان دەبینێ..

حزبە دەسەڵاتدارەکانی کوردستان بیچنەخشەو بێهێزن, زۆربەی کاتیش خۆیان دەدزنەوە لەراستییەکانو چەند هاوکاری بکرێن ناتوانن چارەسەرکردنی کێشەکانی کورد بخەنەڕوو لەهەر پارچەیەکی کوردستان بێ. سەدان رێکەوتن لـەنێوان حزبـە کوردییەکانو وڵاتانی دەوروبەر سازکرا لەسەر مافەکانی کورد.. داواکارییەکانیش هەمووی بێ وەڵامن..

بەڕێز: لەبەر کورتـی ماوەی بەڕێزتـان بەچڕی سیاسـەتی ئێوەم خسـتە بەرچاو بەرامبەر

بەمیللـەتی کـورد. دەڵـێم بەلایـەنی سیاسـەتی سـوریاوە.. تورکیـا دەسـتی بەسـەر ئەسـکەندەرونە گرتـووەو ئیـسرائیلیش لەجۆلان نیشتەجێ بووە, سەرکردە سورییەکان شۆڤێنییانە مامەڵە لەگەڵ میللەتی کورد دەکەنو بەگەورەترین مەترسییان دادەنێن, ئەو کوردانەی ٤ هەزار ساڵە لەخاکی سوریا دەژین کەخاکی باوباپیریانە, سەرۆك حافز ئەسد دوری خستنەوە لـەو خاکەو عەرەبی لەخاکی کورددا نیشتەجێکرد بۆ ئەوەی دڵنیابێ لەسنوری نێـوان عـەرەبیو تورکیـا ناویـشی نـا (پـشتێنەی سەوز).

٣ملیـۆن کـورد لەسـوریا دەژی بـێ هـیچ پێناسـەیەك کـەبوونی نەتـەوەیی کـورد بـسەلمێنێو, بێبەشـن لەهـەموو مافـە مرۆڤایەتییەکان, ئەگەر لە بەرپرسیارێکی سوری پرسیار بکرێ دەڵێـت هـیچ کێـشەیەکمان لەگـەڵ کوردەکـانی سـوریا نیـە چونکە خاوەنی هیچ شتێك نینو سوریاش کوردی نیە, ئەم کوردانە کـوردی تورکیـانو لـەخاکی سـوریا نیـشتەجێ بوونـە.. دەبێ سزای نکوڵیکردن لەبوونی نەتەوەیەك چی بێ لەیاساداو کێش لە راستییەکان دەکۆڵێتەوە؟ ئەوەی منداڵێك لـەدایکی برفێنێ بیداتە دەستی بێگانەیەكو بیکەن بەبەندە دەبێ دوارۆژی ئەو منداڵە چی بێ.. کوا مافی مرۆڤ, لەکوێیە؟

خاکی کورد دزراوەو دان بەنەتەوەی کورد نەنراوە, ئەمە تاوانێکە کەمێژوو لێی بێدەنگ نابێ, رۆژگار تێدەپـەڕیو مێـژوو تۆماری دەکاتو دەنگی رەواش بەرزدەبێتەوە..

سەبارەت بەتورکیا ٢٥ ملیۆن کوردی تێدا دەژیو ئەوانیش بێ هیچ پێناسەیەكنو بەتورکی شاخ دەناسرێنو لەژێر زوڵـمو ستەمی تورك دەژین، ئەوەش سەیرە کەتا ئێستا سەرکۆماری تورکیا بێئاگایە کە ٢٥ ملیـۆن کـورد لـەخاکی تورکیـا دەژی, لەیەکێك لەوتارەکانیدا گوتی بەهیچ جۆرێك ناوی کوردو حکومەتی کوردیم نەبیستووە...

لەمانگی پێنجی ئەمساڵ دەزگای راگەیاندنی تورکی بڵاویکردەوە کەبلێند ئەجەوید بەهیچ شـێوەیەك رازی لەسـەر بـوونی حکومەتێکی کوردی نیە لە کوردستانی عێراق.. ئەمـە بـیروڕای چـەندین جەنـەراڵیترە کەسـەرکردەکەیان بلێنـد بەچەواشـەو هەڵەترین سیاسەت دەجوڵێنەوە کەبووە هۆی روخاندنی ئابوری تورکیاو بە ١٠٠٠–٢٠٠٠ ملیار دۆلار وڵاتەکەی هەڵناسێتەوەو دەریشکەوت کەبۆ ماوەی ١٥ ساڵ, ١٥٠ ملیار دۆلار دژی PKK سەرفکراوەو مێژوو چاکترین بەڵگەیە کەوەچەکانی هۆلاکـۆو جەنگیزخـان ماوەی مانـەوەیان لەتورکیادا ٦٠٠–٧٠٠ سـاڵی

نەخایاندووە بەڵام کوردەکان بۆ ماوەی ٥٠٠٠ ساڵ دەبێ تێدا دەژین..

سەبارەت بەئێران.. حکومەتی مادی کوردی لـەپێش ٢٠٠٠ سـاڵ ژیـاوە لـەئێرانو ١٥٠ سـاڵ حـوکمی کـردووە، کۆمـاری کـوردیش لـەئێران بۆمـاوەی ١١ مـانگ بەسـەرۆکایەتی قـازی محەمـەدو لەسـاڵی ١٩٤٥دا حـوکمی کـردوە. ئەمانـە بەڵگـەن کەمیللەتی کورد خاوەنی دەسەڵات بوونە.. لەگەڵ ئەوەشـدا لەبەرپرسـێکی ئێرانـی پرسـیار بکـرێ لەوەڵامـدا دەڵـێ.. ئـاین

سنوری نیە, لەگەڵ ئەمەشدا کوردەکانی ئێران ناتوانن لەقوتابخانەکاندا بەزمانی کوردی بخوێنن, هەرکاتێ جوتیارێکی کوردو هاووڵاتیەکی فارس بەیەکسانیو بەیەك چاو تەماشاکران ئەوکاتە دەڵێین ئاشتی سنوری نیە..

ماددەی بێهۆشکەری هیرۆیین لەکوردستاندا بەنرخێکی کەم دەفرۆشرێو بەشێوەیەکی زۆر بەربڵاوە بەڵام لەناوچەکانی فارس بەتوندترین شێوە چارەسەر دەکرێتو جاروباریش دەگاتە حوکمی لەسێدارەدان ئەمەش پرنسیپی (ماڵی خۆت رێکخەرەوەو ماڵی دراوسێکەت تێکبدە)یە, ئا ئەمەیە حوکمڕانی ئیسلامی؟

سەبارەت بەعێراق... عەرەب بەگشتیو عێراق بەتایبەتی ئاگادارن کەئینگلیز حکومەتی عێراق بۆ بەکارهێنان بۆ بەرژەوەندی خۆی پێکهێناوە بەتایبەتی بۆ نەخشە سیاسیەکان.. دواجاریش بەشێك لەکوردستان خرایە ژێردەستی عێراقو ناوی کوردستانی باشوری نا عێراق, بۆ ماوەی ٨٠ ساڵ دەچێت کورد ژیانێکی ناهەموار دەژی لەژێر دەسەڵاتی عێراقدا کە بەهەموو شێوەکانی تەعریبو تەبعیسو ئەنفالو کیمیاباران لەناودەبرێن. ساڵی ١٩٧٤ بۆردومانی شاری قەڵادزێ کراوەو ساڵی ١٩٨٨ شاری هەڵبجە کیمیابارانکرانو گەرمیان ئەنفالکرانو ١٨٢ هەزار کەس زیندەبەچاڵ کرانو چەندینیتر لەسێدارەدران...

تاوانەکانی سەدام بێکۆتایینو هیچ دکتاتۆرێك کارە بەدڕەوشتەکانی ئەم ناکاتەوە
کەبەرامبەر بەمیللەتی کورد کردویەتی, ئەوەش لەبیرناکرێت هەڵوێستی سەرۆکی لیبیایە کەسەرزەنشتی تاوانەکانی صدام دەکات کەبەرامبەر بەکورد کراوە بەوەش سەرۆك قەزافی تاکە سەرکردەی عەرەبە ئەم هەڵوێستەی هەبێ, جێی داخیشە کە١٣ ملیۆن عەرەبی عێراقی تەنها (مشعان الجبوری)ی خەڵکی موصلێ تاوانەکانی سەدامی تۆمەتبارکردو کۆکوژی کوردی پرۆتیستۆکرد کاتێك گوتی کوردەکان بوون کە١٢ کەسیان لەخێزانەکەی کوشتووە
لەشەڕێکدا لەنێوان پێشمەرگەو سوپای عێراقدا. هەر ئەویشە بانگەوازیدا بۆ
پێکهێنانی حکومەتی کوردی بۆئەوەی عەرەبی عێراق بەئاسایش بژین.

بەڵام جێی خۆشحاڵی بوو کەسەدامی دکتاتۆر هەستا بەدەست بەسەراگرتنی کوێتو بوو
بەهۆی هەڵگیرساندنی جەنگی کەنداو پاشان راپەرینی لێکەوتەوەو بەچەند رۆژێك ٩٥٪ی کوردستان پاککرایەوە لەهێزەکانی رژێمو جەلادەکانی سەدام, ئینجا سەرکردەکانی کوردستان گەڕانەوە کوردستانو دەسەڵاتیان گرتەدەست.

لە ١٩٩١/٣/١٣دا بەڕێز مەسعود بارزانی بەئامادەبوونی چەند لایەنگرێکی داوای لێکردم لەگەڵیدابم لەجەولەکردنیدا بۆ دەوروبەری کوردستانو وەزیری دەستە راستیش بم, وەڵامی من ئەوەبوو نۆکەرێك بم زۆر باشترە لەوەی وەزیری دەستە راستبم لای تۆ, ئەمەم لەبەشی دووهەمو سێهەمی کتێبەکەمدا شیکردۆتەوە..

لەپاش کۆڕەوو دەربەدەربوونی ٣ملیۆن کورد بۆ پاراستنی گیانی خۆیان, هەرسێ وڵاتی ئەمریکاو بەریتانیاو فەرەنسا بڕیاری پێکهێنانی هێزێکی سەربازی لەئەنجرلیك دەرکرد بۆ پاراستنی کوردەکان لەهێرشە عێراقییەکان بۆسەر میللەتی کوردو هێڵی ٣٦ دیاریکرا کەسنوری ئارامی کوردەکان بێ...

هێڵی پانی ٣٦ بڕیارێکی ستەمکارانەبوو دژی گەلی کورد چونکە٢/٥ی خاکی کوردی خستە ژێر دەسەڵاتی تەواوی حکومەتی عێراقو هەریەك لەخانەقینو کەرکوكو سنجارو شێخانو تەلەعفەر، ئێستا کێڵگەی تاقیکردنەوەکانی دکتاتۆریەتی (صدام حسێن)ە بۆ تەعریبو تەرحیلو...هتد. بەم بەشکردنەش ئازارەکانی ساڵی ١٩٢١ زیندووبوونەوە لەکاتێکدا کەکوردستان دابەشکرا, ئەوکاتە حکومەتی بەریتانی دەیتوانی بەرەنگاریی ئەم

بڕیارە بکات, ئەو کاتەش میللەتی کورد سەرجەم مەینەتییەکانی بیردەچۆوە, دەبوایە لەجیاتی هێلی ٣٦, هێڵی (٣٤و٣٢) بوایەو بەمەش ئێوە بەشداری ئەو تاوانەن کە بەدابەشکردنی کورد کراوە..

راستییەکانیش سەلماندیان کەهێزەکانی ئەنجەرلیك تەنها بۆ خزمەتی سیاسەتەکانی خۆتانەو رێگەتاندا بەهێزی سەربازی تورکی بۆ ئەوەی بێنە ناوچەکانی کوردستانەوەو لە ١٩٩٦/٨/٣١دا کارتی سەوزتان بەحکومەتی عێراقی بەخشی بەهەمان شێوە بێنە ناوچەکانی کوردستانو بوون بەهۆی کوشتنو لەناوبردنی چەندین کەسو سەرەتای نەخشەکەش لە مخابەراتی ئەمریکییەوە دارێژرابوو لەسەر بڕیاری ئێوەی بەڕێز...

سەبارەت بەکێشەو ململانێیە ناوخۆییەکانی نێوان هەردوو حزبی سەرەکی لەکوردستان

لەهەنگاوی یەکەمدا خەڵکی کوردستان واحاڵی بووبوون کەئەمریکا بڕیاری پێکهێنانی دەسەڵاتێکی کوردی داوە لەسەرداوای هەردوو سەرۆك جەلال تالەبانیو مەسعود بارزانی بۆ ئەمریکا سەبارەت بە رێکەوتنی ئاشتی لەواشنتن, منیش یەکێك بووم لەو کەسانەی فرمێسکی خۆشیم هەڵدەڕشت بۆ نەمانی کێشە کوردییەکان بەڵام ئەو خەونە بوو بەتۆزو خەیاڵو ماوەیەکی زۆری خایاند...

لێرەشدا ئەمریکا سەلماندی کەهیچ مەبەستێکی ئاشتی نیە لەم کۆبوونەوانەدا. دەشبوایە وەفدێکی سەرپەرشتیار بەچاودێری ئەمریکا، سەرۆکایەتیی ئەو پرۆسەیەی بکردایە، پاشان ئەم پرۆسەیە شکستی خواردو لێرەشدا دەڵێم سیاسەتی ئەمریکی ناڕازییە بەو رێککەوتننامەیەو بەئاگاشە لەپەیوەندیی نێوان CIAو بنەماڵەی بارزانیو وڵاتانی دەوروبەریش... من وەکو خۆم بەبەڵگەوە مەترسیی ئەم بنەماڵەیە بۆ سەر میللەتی کورد دەسەلمێنم هەروەها لەسێ بەشی کتێبەکەمدا باسمکردوە کەچەندین خیانەتی گەورەیان بەرامبەر بەکورد کرووەو تا ئێستاش رێگەی بەدیهێنانی خواستەکانی کوردیان گرتووە.

سەرۆکی بەڕێز..

داوای لێبوردن دەکەم ئەگەر ماف بەخۆم بدەم ئەم باسە بخەمە بەرچاوتان بەڵام مەبەستم روونکردنەوەی ئەو لایەنانەیە کەلای بەڕێزتان شاراوەنو ئاگادارتان بکەم کەمامەڵەو سیاسەتتان لەگەڵ چەند کەسێکی کەمدایەو چاوتان لەویستی گەل نوقاندوە, چونکە مامەڵەکردنتان لەگەڵ بنەماڵەی بارزانیو جلەوشلکردن بۆیان تەنها لەخزمەتی بەرژەوەندی ئەم بنەماڵەیەدایەو دەسەڵاتیان زیاتر دەکاتو کۆسپ دێنێتە بەر رێگەی رەوتی ئاشتی.

من گلەیی لەبنەماڵەی بارزانی ناکەم بۆ پەیوەندییە گوماناوییەکانیان ئەگەر لەگەڵ دەوڵەتانی ناوچەدا کە لەخزمەتی نیشتمان و هاوڵاتی کورددا بوون. بڕواش ناکەم بەڕێزتان ئەم واقیعەتان لەبەرچاو نەبێت بەڵام پشتگوێی دەخەن, بەڵگەشم پشتگیریتانە بۆ بنەماڵەی

بارزانی و چاوپۆشیکردن لەکردەوەکانیان.

بەڕێز حکومەتی تاجی بەریتانیا.. ئێوە کەخاکی کوردستانتان دابەشکرد لەپێناو بەرژەوەندی خۆتاندابوو, ئەوە پلانێك بوو داتانڕشت. لێرەدا دەمەوێ تیشکی زیاتر ئاراستەی ئەم مەسەلەیە بکەم بۆ دەرخستنی راستیو تا ئەو تاوانە گەورەیە بخەمە بەرچاوتان کەتەواوی گەلێکتان گیرۆدەی کرد, کوردستان پێش هەموو شتێك لەجوانترین ناوچەکانی جیهانە, خاکێکی بەپیتو سامانێکی ئاژەڵی زۆر ئەویش بەهۆی زۆری کشتوکاڵو سەرچاوەکانی ئاو. سامانێکی گەورەی لەنەوت, ئاوی سازگار, زنك, ئەڵماس, زێڕ, کریستاڵ, یۆرانیۆم, هەروەها بەردی مەڕمەڕ...هتد.

ژمارەی دانیشتوانی نزیکەی ٤٥ ملیۆن کەسە, داهاتی خاکەکەی ١٢٠ ملیۆن کەس دەژێنێت. لێرەدا دەمەوێ بەچەند خاڵێك ئەوکاریگەرییانە دەربخەم کەکار دەکەنەسەر بارودۆخەکە:

١- ئەو سامانو داهاتە هەرسێ نەتەوەی فارس, تورکو عەرەبی هاندا کەتەماع بکەنە کوردستان و هەمیشە لەهەوڵی داگیرکردنیدا بنو رەگەزی کورد لەناوبەرن, زیاد لەمەش هەوڵیاندا ئاسەواری نیشتمانی ببڕیننەوە لەرێگەی بەکارهێنانی چەكو سیاسەتو پیلانگێران. هەموانیش لەسەر ئەوە یەکدەنگن کەهیچ کامیان بەتەنیا دەستپێشخەری نەکات بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد. مێژوو سەلماندوویەتی کەبارودۆخی گرژیو دوژمنایەتی لەنێوان دەوڵەتانی ناوچەدا هەرچەندێك بووبێت بەڵام موخابەراتی هەرچوار دەوڵەتی تورکیا, ئێران, سوریاو عێراق هەمیشە یەك بوون بۆ لێدانی هەر بزووتنەوەیەکی کوردی کەمەترسی هەبێت لەسەر سەروەری یەکێك لەدەوڵەتانی ناوچەکە.

٢- بەهۆی ململانێی ناوخۆ, گەلی کورد چوار شتی لەدەستدا:

أ- ئاسایشو ئارامی لەدەستدا.

ب- بزاڤی بازاڕو بازرگانی شلۆق بوو.

ج- قەوارەی کوردی لەوەدا لاوازکرد کەبەرەو باشتر هەنگاوبنێتو دوژمنانی لێمان هارکرد.

د- ٥٠٪ی داهاتی کوردستان بوو بەسوتەمەنی جەنگ, هەروەکو بەڕێزان وینستۆن چەرچلو ئایزنهاوەر گوتویانە: جەنگ براوەو دۆڕاوی تێدانیە.

٣- ئەگەر سەردانێکی ناوچەکانی چوار دەوڵەتەکە بکەن کەتورکو فارسو عەرەبی تیا دەژی, پاشان سەردانی کوردستان لەهەرچوار هەرێمەکەدا بکەن جیاوازی گەورەتان بۆ دەردەکەوێت لەرووی ئاوەدانیو رێوبانو بزاڤی بازرگانی, ئەوساکە بۆتان دەردەکەوێت

کەهەموویان هیچ حسابێك بۆ کوردستان ناکەن و بەناوچەیەکی کاتی دەژمێرن.

لەماوەی ٨٠ ساڵی رابردوودا کەکوردستان داگیرکراوە زۆر گۆڕانکاری هاتۆتەدی, ئەگەر لیژنەیەك پێکبهێنن و بچنە بنجوبنەوانی مەسەلەکە دەبینن کەعێراق٦٠٪ی کوردستانی لەدانیشتوانە ئەصلیەکەی چۆڵکردووەو عەرەبی تێدا نیشتەجێکردووە، لەتورکیا ٥٥٪ی کوردستان چۆڵکراوەو تورکی تێدا نیشتەجێکراوە. لەئێران٤٠٪ی کوردستان چۆڵکراوەو ئازەرو فارسی تێدا نیشتەجێکراوە، لەسوریا ٢٥٪ی کوردستان چۆڵکراوەو ئێستا عەرەبی تێدا نیشتەجێیە. هەروەها نزیکەی ٢ ملیۆن کورد بەزۆرو لەترسان لەهەرچوار دەوڵەتەکەوە خاکی خۆیان بەجێهێشتوەو روویانکردۆتە هەندەران.

٤- (عم ناجی) لەوەدا سەرکەوتنت بەدەستهێنا کەبەم دابەشکردنەت ئاژاوەت لەنێوان کوردو عەرەب و فارس و تورکدا نایەوەو بەری سیاسەتی (پەرتکە, زاڵبە)ت دووریەوە کەسیاسەتی پێنج دەوڵەتە زلهێزەکەیە بەرامبەر گەلی کورد.

یەکێتی سۆڤیەتو چین: بانگەوازکەرانی مارکس و لینین و ماو, ئەو کۆمۆنیستە دڵسۆزانەی وەکو دەڵێن دروشمی کۆمۆنیزمیان هەڵداوە، ئەم بانگەوازانەیان تەنها بۆ خزمەتی بەرژەوەندی خۆیانە. یەکێك لەدروشمەکانی کۆمۆنیزم دەڵێت (هەموو گەلێك مافی چارەی خۆنوسینی هەیە) بەڵام کاتێك باسی مافی چارەی خۆنوسینی کورد دێتە پێشەوە، ئەو بنەمایە پوچەڵ دەبێت و وەکو تیمساح دەمیان لەئاست گەلی کوردا دادەپچڕن کاتێك داوای هاوکاری دەکات و لەدەستی ستەمی حکومەتەکان هاواری بەرزدەکاتەوە. بانگەشەکەرانی کۆمۆنیزم لەهەردوو دەوڵەتدا ئەوساو ئێستاش بێشەرمانە هاوکاری دکتاتۆر سەدام حسێن بوون بۆیە راستە کەگوتراوە حەیا قەترەیەکە کەتکا,

دەتکێت...ئەمانە هەمیشە بەرهەڵستکاری پێکهێنانی حکومەتی کوردی بوون.

فەرەنسا: ئەی وڵاتی ئەوین و جوانیو ئەدەب و شارستانی, هەڵوێستی مەردانەی سەرۆکی کۆچکردوو بەڕێز فرانسوا میتران هەمیشە لەبەرچاوی کوردە بەو پێشنیازەی بۆ ئاشتیو کۆتایی هێنانی شەڕی ناوخۆ پێشکەشی کرد, بەڵام ئەو چی دەسەڵاتە ئەگەر تەماع، چاوی بنەماڵەی بارزانی کوێر کردبێتو نۆکەری هانیدابن کەبەیاننامەی ڕێککەوتننامەکە بەتورکیا بفرۆشن. هەڵوێستی ئێستای حکومەتی فەرەنسا زۆر لاستیکییە, ئەم حکومەتە لەپێناو دەستکەوتی دارایی لایەنگری دکتاتۆر سەدام حسێنو بەرژەوەندی گەلێکیان پشتگوێ خستووە.

ئەمریکاو بەریتانیا: ئەی ئەو دوو دەوڵەتەی لەرووی سەربازیو سیاسیو ئابوری دەستتان بەسەر جیهاندا گرتووە... زاڵدەستیتان وای لەهەرچوار دەوڵەتی ناوچەکە کردووە کەڕاستەوخۆ یاخود ناڕاستەوخۆ لەپێناو بەرژەوەندیی ئێوەدا کاربکەن. شتێکی بەڵگەنەویستیشە کەئێوە بیر لەتورەکردنی ئەم چوار دەوڵەتە ناکەنەوە لەپێناو میللەتێك نەیناسنو بڕوای پێنەکەن. بەڵام هۆی هاوکاریکردنتان لەگەڵ بنەماڵەی بارزانی بڕوای تەواوتانە کەئەمانە مەترسییان بۆ سەر بەرژەوەندییەکانتان لەناوچەکەدا نییەو کەس لەدۆستانتان زویرناکەن, چونکە ئەمان وەکو خۆراکی قوتوبەند وەهان دوای ماوەیەك کاتێك هەوای تێدا نامێنێت خراپ دەبێت, ئەمان هیچ هەستێکی شۆڕشگێڕی کوردایەتییان بۆ سەربەخۆیی تێدانییە. هەروەکو پێشتریش روونمکردەوە سیاسەتتان دەرهەق گەلی کورد تەمومژاوییە, چونکە بەیاننامەکانتان هەمیشە دژی پێکهێنانی حکومەتی کوردییە, ئەمریکاو بەریتانیا لەرووی سیاسەتو پێڕەو یەکدەنگن کەرێگە نەدەن کورد قەوارەیەکی نەتەوەیی دامەزرێنێت. تەنانەت بەزەییتان بەسەرکردە کوردەکانیشدا نایەتەوە چ دوژمن بێت یان دۆست, ئێوە لەناوی دەبەن ... مێژوو شایەتی ئەم قسەیەمە.

مەلیکی کوردان, کۆچکردوو شێخ مەحمودی حەفید, دوای ئەوەی حکومەتەکەیان رووخاند، دوورتان خستەوە هەر لەبەر ئەوەی لەگەڵ پێڕەوی ئێوەدا نەدەگونجا. شەهید قازی محەمەدی سەرکۆماری مەهاباد لەئێران, دوای ئەوەی کۆمارەکەیتان رووخاند لەلایەن رەزاشای ئێران لەسێدارەدرا، چونکە لەگەڵ سیاسەتی ئێوەدا نەدەگونجا.

مەلامستەفا بارزانی, سەرکردەی گەلی کورد" رۆژێك لەرۆژان سەرکردایەتی بزوتنەوەی کوردی دەکردو کورد لەهەر چوار بەشەکەدا گوێ لەمستی ئەو بوون. لەوانەیە لەسەرەتادا هاوکاریکردنی لەگەڵ حکومەتی بەریتانیا لەبەرژەوەندی گەلی کورددا بووبێت بەڵام ئەوە، بوو بەلەکەیەك بەناوچەوانیەوە, چونکە کاتێك بارزانی چووە ریزی کۆماری کوردستان لەمەهاباد لەسایەی سەرۆك قازی محەمەددا سەرەتا وەرنەگیرا چونکە گومانی لێدەکرا, بەڵام پاشتر بەهۆی تەزکیەی چەند کەسایەتییەکی کورد کەپەیوەندییان بەکۆماری کوردستانەوە هەبوو, مەلامستەفا بارزانی لەگەڵ گروپەکەیدا وەرگیرا. کاتیکیش کۆماری کوردستان رووخا مەلامستەفا لەگەڵ پێنج سەد کەس لەپیاوەکانی بۆ روسیا هەڵاتو لەوێ خراپترین مامەڵەیان لەگەڵداکرا, چونکە خۆیو تاقمەکەی جیاکرانەوەو هەردوو کەسیان بەجیا لەشوێنێکدا دانران, مەلامستەفاش کاری وای پێ سپێردرا کەشایەنی سەرکردەیەکی کورد نەبێت, ئەوەبوو بۆ ماوەی سێ ساڵ لەدوکانێکدا قەسابی دەکرد, پاشان وەکو خۆڵڕێژ ڕێگەوبانی پاکدەکردەوە, ماوەیەکیش ئاشەوان بوو. ئەم مامەڵە نامرۆییانە سزای بوون بەهۆی چاوپێکەوتنێکی لەگەڵ بالۆێزی ئەمریکی لەتارانو دەست تێکەڵکردنی لەگەڵیاندا, ئەوەبوو سۆڤێتییەکان بەوە تاونباریانکرد کە بەفەرمانی ئەمریکا هاتوە بۆ روسیا. لێرەدا پشتگوێ خستنی کەسایەتییەکی ناوداری وەك مەلامستەفا بارزانیو بچوککردنی, دەروازەی هەزار پرسیار دەکاتەوە.

لەساڵانی ١٩٥٩—١٩٧٥ مەلامستەفا خاوەنی گەورەترین دەسەڵات بوو لەهەموو کوردستاندا هەتا ڕێککەوتننامەی جەزائیر لەنێوان صەدام و شای ئێران کە بەپیلانی ئەمریکا بوو. سیاسەتی بارزانی، بوو بەهۆی ڕووخاندنی بزووتنەوەی کورد کەتا ئەو کاتە گەلی کورد بزووتنەوەیەکی شۆڕشگێڕی بەو قەوارەیە بەخۆیەوە نەدیبوو. نەدەبوو ئەمریکاو بەریتانیا بەو شێوەیە پاداشتی مەلامستەفا بدەنەوە. ئەو ڕێککەوتننامە ستەمو بەدە, نەك هەر بزووتنەوەی کوردی لەناوبرد بەڵکو مێژووی مەلامستەفای بارزانیشی لای
خاوەن مەبدەئەکان بۆ یەکجاری سڕیەوە.

دوای ٢١ ساڵ دەبینین هەمان بارودۆخ دووبارە دەبێتەوە, ئەوەبوو لە ٣١ی ئابی ١٩٩٦دا سوپای عێراق بەڕۆژی نیوەڕۆو بەفەرمانی دەوڵەتانی زلهێز( ئەمریکاو بەریتانیا) سنووری کوردستانی باشووری بەزاندو شاری هەولێرو چەند ناوچەیەکیان داگیرکرد ئەوەش دوای وەدەرنانی ئەو حزبە کوردییانەی بانگەشەیان بۆ سەربەخۆیی دەکردو بەخیانەت ڕازی نەبوون. پێشڕەویکردنی سوپای عێراق بەبەرچاوی هێزەکانی ئەنچەرلیك بوو کەهێزە چەکدارەکانی بارزانی بەسەرکردایەتیی بەڕێزان مەسعوودو نێچیروان بارزانی پێشیان کەوتبوون، تا ئەمڕۆش ئەو میلیشیانە ڕووبەری بەرفراوانی خاکی کوردستانیان داگیرکردووە کە بەناڕاستەوخۆ لەلایەن ئیدارەی حکومەتی عێراقییەوە بەڕێوەدەبرێ. هەروەها بنەماڵەی بارزانی دەستی بەسەر زیاتر لەدوو ملیار دۆلار لەماڵی گەلی داماو گرتووە، نەك هەر ئەمە بەڵکو بەهۆی سامانەکەیانو دەسەڵاتیان لەلای چوار حکومەتی دراوسێ (عێراق، ئێران، سووریا، تورکیا) جەزرەبە بەخەڵك دەگەیەنن لەراستەوە بۆ چەپ، دەکوژنو دەبڕنو خەڵك ئاوارە دەکەنو ماڵ دەڕووخێنن، بۆ نموونە کوشتارەکەی گوندی کەلەکین کەتێیدا سەرۆکی عەشیرەتی سوورچی حسەین ئاغایان کوشتو گوندەکەیان تاڵانکرد کە لە٤٠٠ ماڵ پێکدەهاتو تەڕووشکیان پێکەوە سووتاند. ئەمە لە ١٩٩٦/٦/١٦ ڕوویدا کە لە١٥ی هەمان مانگدا مەسعوود بارزانی نامەیەکی بۆ سەرۆکی عەشیرەتەکە نارد تێیدا ئاگاداریکرد کەڕۆژی پاشتر دەبێتە میوانی، بەخۆیو چەکدارەکانیەوە.. زۆریتر لەم نموونانە هەیە، خەڵکیش دەمبینن دەپرسن: (چۆنیت هێشتا ماویت؟) هەموو گوناهێکیشم دەربڕینی ڕاستییەکانە.
گەورەم سەرۆك ...

پرسیارێك هەیە زۆرم بۆ دێنێتو دەمەوێ لەبەڕێزان سەرۆك وەزیرانی بەریتانیاو وەزیری ئاسایشی نەتەوەیی ئەمریکی بکەم، ئەویش ئەوەیە: ئایا سیاسەتی ناڕەواتان دەرهەق گەلی کورد، دەستوورێکی نەگۆڕە؟ ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە کەئێمەش وەك باقی گەلانی جیهان ئازادبین؟ ئازادکردنمان تەنها فەرمانێکی پێدەوێ لەگەڵ هەڕەشەیەك لەبەکرێگیراوەکانتان لەناوچەکەدا بەتایبەتی جەنەڕاڵەکانی تورکیاو دکتاتۆر سەدام حسەین کەواز لەکوردستان بێننو گەلی کورد ئازاد بکەن ، ئەمەش لەلای خۆیەوە دەبێتە مایەی جێگیربوونی تورکو عەرەب لەعێراقو سوریا ئنجا بەرقەرابوونی ئارامی لەئێرانو ناوچەکەشدا، ئەمەش لەئەنجامی ئەو گۆڕانکارییانەی لەعێراقو تورکیاو سووریا دێنەدی. ئەمەش ئەگەر ئێوە بەراستی دەتانەوێ ئارامی لەناوچەکەدا بەرقەرابێت.

ئنجا هەرچەندە هەموو سەروەرییەك، بەرژەوەندیو ئایدۆلۆجیای خۆی هەیە، هەروەها هەرچەندە من سەر بەهیچ حزبێکی کوردستانیو هیتر ینمو لەدواجاردا هیچ پابەندبوونێکی
سیاسیم نییە کەبمبەستێتەوە، ئەوە بیروڕام پێچەوانەی بیروڕای هەندێك حزبی کوردییە.

بەنسبەت چارەسەرکردنی کێشەی کوردی، بیروڕای من بیروڕای کۆمەڵانی خەڵکی کوردستانە کەڕزگاربوونی یەکجارەکییە لەمیلیشاکان، ئەمەش دەبێتە مایەی کۆتایی هێنانی دەسەڵاتی بارزانیو سەرفرازبوون لەهەر زاڵدەستییەکی

ملهوڕانــە، ئەوســاش دەوری حزبــە کوردییــەکان ســەرهەڵدەدات کــە بەڕاســتی بانگەشــە بــۆ کوردایــەتی دەکــەن. بــیروڕای حزبەکانیش وایە کەهەریەکەیان کار بۆ پاراستنی خۆیو رازیکردنی ئێوەو دەوڵەتانی ناوچەکە دەکەن، ئنجا ئەمانــە تــا لــەم مانۆڕەی جەنگی سارد لەپێناو پاراستنی خۆیـان دەبنـەوە، تـەنها ٣٠٪یـان بـۆ گـەل پێـدەمێنێت. بـەکورتی حزبـەکان کـار دەکەن کەبارودۆخەکە وەکو خۆی بمێنێتەوە، ئەمەش لەگەڵ بەرژەوەندیو سیاسەتو پلانەکانی ئێوەدا دەگونجێت. ئێـوە لەرۆژی راپەرینەکەی کوردستانی باشوور هەتا ئەمڕۆ مامەڵەتان لەگـەڵ گەلدانـەبووە، تـەنها تیـشك دەخەنەسـەر بنەماڵـەی بـارزانیو هەنـدێ جـار تیـشکەکە بۆماوەیـەکی کـەمو بێـسوود راسـتو چـەپ دەکـات. ئـەوەی دەزگاکـانی راگەیانـدن بڵاویانکردەوە دەربارەی پێشکەشکردنی خزمـەتگوزاریو یارمـەتی بەتـەواوی بەدەسـتی گـەل نەگەیـشتووە، ئـەوەی گـەل سوودی لێبینیوە تەنها ئەوەیە بەشێکی کوردستان، بەبەراورد لەگەڵ ئەوانـەی لـەدەرەوەی هێڵـی ٣٦دان بـەئارامی ژیـاوە، هەروەها بڕیاری نەوت بەخۆراك میللەتی لەتیاچوون رزگارکرد، ئنجا ئاوەدانکردنەوەی ناوچەکەش بەردەوامە هەرچەندە زۆر سستە.

بەرگی یەکەمی کتێبەکەمم لەهەولێر دەرکرد کە لەگەڵ خێزانەکەمدا لەوێ دەژیام، ئنجا دوای ئـەوەی ئەنـدامێکی پـارتی ئاگاداریکردم کەبنەماڵەی بارزانی حوکمی کوشتنی داوم هەروەها سەدام حسەین فەرمانیداوە لـەرێی بنەماڵـەی بارزانییـەوە بمفڕێنن، لەگەڵ خێزانەکەم هەڵاتین و رومـانکردە شـاری سـلێمانیو لـەوێ بـەرگی دووەمو سـێیەمی ئـەم کتێبـەم دەرکـرد. ئێستاش لەگەڵ خێزانەکەمدا کە ١٩ کەسین، لەمەترسیدا دەژینو چاوەڕێی مەرگین، نازانین کەی بەکرێگیراوەکانی بـارزانی یا ئێران یا تورکی یا عێراقی بەسەرماندا دەدەنو لەناومان دەبەن. بۆیە هاوار بۆ خوا دەبەمو پەنا بۆ لای ئێوە دێـنم وەکـو باوکو رزگار تا لەگەڵ خێزانەکەمـدا رزگارمـان بکـەنو بـەهێزی سـەربازی کەدەسـەڵاتی دوژمنـانم دەسـتیان پـێم رانـەگات، لەسلێمانی دەرمان بکەنو بمانگەیەننە هەر شوێنێکی جیهان کەدەستی ئەو ستەمکارانەی پێنەگات، هەتا ئـەو کاتـەش تکـا لەبەڕێزتان دەکەم بمانپارێزنو ئەگەر پێویستمان بەپاراستن نەبوایە تکام لێنـەدەکردن. بـۆ زانیاریـشتان تائێـستا فلـسێکم لەهیچ حزبێك وەرنەگرتووە، شتێکی بەڵگەنەویستیشە کەئەوانە یارمەتیم نەدەن... ئێستاش

ئێمە هیچ داهاتێکمان نییە مەگەر پیاوچاکانی ئەم میللەتە شتێکمان بدەنێ.

کاتێك بەڕێز بوتروس غالی ئەمینداری گشتیی UN بو، دەستی لەکار کێشایەوە گوتی: (سیاسـەتی ئـەمریکام پـێ قـووت ناچێتو ناشتوانم بەرەنگاریان بوەستم بۆیە دەست لەکارکێشانەوەی خۆم رادەگەیەنم). بەڵام من بـوتروس غـالی نـیم, هـیچ پۆستێکم نییە تادەست لەکار بکێشمەوە، هەروەها بەرێز عەبدوڵلا ئۆجەلانیش نیم تاببمە مایەی مەترسی بۆ سەر ناوچەکە، چونکە نەحزبم هەیە, نەهێزێکی چەکدار.

هەموو داواو تکام لەبەڕێزتان ئەوەیە کەخۆمو خێزانەکەم لەو گێروگرفتە رزگاربکەن کـەتێی کـەوتووین، چـونکە ژیانمـان لەمەترسیدایەو هیچ دەسەڵاتێکیشمان نییە. تکاش دەکەم دیدارێکم لەگەڵ بەڕێزتان یاخود جێگرێکتان لێرە لەسلێمانی یان لەهەر جێیەکیتری جیهان بۆ سازبکەن بۆ ئەوەی سیاسەتی نالەبارتان دەرهـەق گـەلی کـورد بـۆ روونبکەمـەوە، هـەتا ئـەو کاتەش داواکارم بمانپارێزن، ئەگەر بشتانەوێ ئەوە کارێکی ئاسانە بۆ ئێوە.

لەکۆتاییدا سلاَوو رێزم.

هاوپێچ ١٥ لاپەرە بەزمانی ئینگلیزی کەکورتەی سێ کتێبەکەمە لەگەڵ ئەو نامەیەی بۆ

بەرێز کۆفی ئەنانم ناردووەو نامەیەکیش کەبۆ بەرێز کۆلن پاوەڵ ـ وەزیری دەرەوەی ئەمریکام ناردووە.

**دڵسۆزتان**
**خزمەتکاری کوردو کوردستان**
**رەفیق پشدەری**
**٢٠٠١/٦/٧**

Fax:00442077138812

**مكتب ديلان، ومنه ليد رفيق البشدري**

## نامەی پێنجەم

**بۆ بەرێز سەرکردەو برای گەورە کاك (موعەممەر قەزافی)**

پاش رێزو سلاَوی بێپایانم

سەرەتا سلاَوی خوات لێبێت، داواکارم لەخوای گەورە سەرکەتووت بکات بۆ هەر کارێك کە مایەی سوودو بەرژەوەندییە بۆ مرۆڤایەتی, خوا بتپارێزێ بۆ خزمەتکردنی مرۆڤایەتی،

بەتایبەت چەوساوەکان بەتایبەتیش گەلی کورد.

ئەی سەرکردەی دژایەتیکردنی ستەمو چەوسانەوە..

من نووسەرو سیاسییەکی کوردم لەباکووری عێراق، هەموو ژیانم لەپێناو خزمەتکردنی گەلی کورددا بەسەربردووە، هیچ کاتێك درێغیم نەکردووە لەخزمەتکردنی وڵاتەکەم بەپێی توانا، لەو هاوپێچانەی کە لەگەڵ نامەکەمدا بۆ بەرێزتانم رەوانەکردووە ئەوەندەی زانیاری تێدایە لەسەر من کەبەسە بۆ ناساندمو تاکو جەنابتان بزانن کە (من کێم).

ئەوەی پاڵی پێوەنام بۆ نووسینی ئەوەی کەبۆ بەرێزتانم نووسیوە دوو شتە:

یەکەمیان: بەرێزتان یەکەم سەرکردەی عەرەبن کەبەو شێوە جدیيە هاوسۆزبێ لەگەڵ گەلی کوردو چەندین خزمەتی پێشکەش بکا کە لەناو هاوشێوەکانیدا بێوێنە بێ، چونکە مێژوو شایەدە لەسەر دەست پێشخەرییەکانی جەنابت لەگەڵ تورکیا، عێراق، ئێران، سوریا لەرێگای راگەیاندنو دیدار بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کوردی، هەروەها هاندانی کورد بۆ بەردەوامبوون لەسەر دامەزراندنی دەوڵەتی کوردیو رزگارکردنی گەل لەناخۆشیو نەهامەتی. بۆیە ئەگەر ئەو چوار دەوڵەتەی هەر یەکێکیان بەشێکی کوردستانیان داگیرکردووە گوێیان لەئامۆژگاریو رێنماییەکانی جەنابت گرتباو کاریان پێکردبا ئەوا بارودۆخیان لەسەدا سەد بەرەو باشتر دەرۆیی، بەتایبەت تورکیاو عێراق. بەڵام لەبەرئەوەی ئەم وڵاتانە تەنها کار بەفرمانەکانی ئەمریکا دەکەنو بەپێی بەرنامەکانی ئەوان دەجووڵێنەوە، جەنەراڵەکانی تورکیاو دیکتاتۆر سەدام وێنەی دیلێکی بێ دەسەلاَتن، رێنماییەکان لەCIA وەردەگرن، بەبێ بیرکردنەوە لەئەنجامەکانی، پاش پانزە ساڵ لەشەڕی جەنەراڵە تورکەکان لەگەڵ پەکەکەدا رژێمی تورکی نزیکەی ١٥٠ ملیار دۆلاریان وەکو خەرجی جەنگ سەرفکردووە،

لەکاتێکدا هەموو جیهان بەئاشکرا تێکچوونی باری ئابوورییان دەبینن. بەو شیچوەیە بۆ ئەمریکا دەست بەسەراگرتنیان ئاسان دەبێ، حاڵی ئەوان وەکو هەموو ئەو دیکتاتۆرە کوێرانە وایە کەخۆیان نەزان دەکەن لەبەرامبەر ئەو راستییە حاشا هەڵنەگرەی بریتیە لەوەی، هیچ دەسەڵاتێك لەسەر زەوی ناتوانێ دوو شت لەبەین بەرێ، کەبریتین لە: ئاین، نەتەوە.

سەرۆکی فەرماندە

کاتێك من لەگەڵ سەدام حسێندا کارم دەکردو، جێی متمانەو باوەڕی بووم، هەموو سەرکردە بەعسییەکان بڕوایان پێدەکردمو گوێیان لەئامۆژگارییەکانم دەگرت، بەو سیفەتەی کەئەو کات یەکێك بووم لەوان، خوا دەکەم بەشایەد لەسەر ئەوەی کەمن بەپێی توانا هەوڵمداوە سەدامو لێپرسراوان رازیبکەم بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کوردی بەشێوەیەکی ریشەیی، ئەمەش لەکۆتاییدا دەبوو بەهۆی فراوانبوونی سنووری عێراق هەتا شاری تەورێز لەئێران و ئەنقەرە لەتورکیا، ئینجا رزگارکردنی عەرەبی ئەسکەندەرونەو ئەهوازی لێدەکەوتەوە. بەڵام بینیم سەدام کاری بۆ ئەوە کرد کەنداوی عەرەب تەسلیم بەمحمد رەزاشا بکات لەپێناو دانوستان بۆ لەناوبردنی بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردی لەساڵی ۱۹۷۵ کەدواجار بو بەهۆی خیانەتی سەرکردەی کورد مەلامستەفای بارزانی کەرۆڵی خیانەتکارانەی بینی لەهەرەس پێکردنی بزوتنەوەی کوردای‌و دابەزاندنی ورەی شۆڕشگێڕە کوردەکان. بۆیە بەشداریکردنم لەگەڵ نازم گزار لەهەوڵە کودەتاییەکەی دژی سەدام، دوژمنایەتیم بۆی تەنها لەو کاتەوە دەستی پێکرد کەبێهیوابووم لەوەی هەڵوێستێکی مرۆڤدۆستانەی نیشتمانپەروەرانەی لێبوەشێتەوە وەك سەرۆکێك لەبەرامبەر گەلەکەی.

بڕوابوونم بەخوای گەورە بەڕەوایی کیشەکەم، وایلێکردم لەبەخشندەیی خوا بێهیوا نەبم، هەروەکو لەپەرتوکە پیرۆزەکەیدا فرمانی پێکردووین. بارودۆخ وایلێهات دەرفەتی ئەوەم بۆ رەخسا کەلەگەڵ سەرکردەکانی کۆماری ئیسلامی ئێران نزیك ببمەوە ئەو حاڵەتەم دووبارە کردەوە وەکو چۆن پێشتر لەگەڵ سەدام حسەین کردبووم. سەرانی ئێرانم هاندا بۆ لەخۆگرتنی کێشەی کوردو چارەسەرکردنی یەکجارەکی، کە لەئەنجامدا دەبووە هۆی فراوانبوون لای سنووری ئێران تا چیای حەمرین لەکوردستانی عێراق بەڵام.. بێکەڵك بوو.

بەهەمان شێوە کاتێك چاوم بەبەرێوەبەری موخابەراتی سووری کەوت لەدیمەشق، پەرژیمە سەرهەمان بابەت، وەڵامیان ئەوەبوو کە بەزووترین کات سوریا جێبێڵم ئەگەر نا...؟

دووەم: لەگەڵ جیاوازی گەورە لەپلەوپایەو ئاستدا، بینم کەمن لەگەڵ بەرزتاندا بەتەواوی لە سێ خاڵدا پێك دەچین:

أ- ئاینی ئیسلام کردووینە برا.

ب- بەهێزی گیانی نیشتمانپەروەری، هەرکەسە بۆ وڵاتی خۆی.

ج- هەڵوێستی توندوتۆڵی بەرێزتان لەبەرامبەر سەرکردەو برا لێپرسراوەکانت لەنەتەوەی خۆت، ئەوەش خاڵی هاوبەشمانە.

شتێکی ئاشکرایە کەمن بەجەنابت بەراورد نەکرێم چونکە بەرێزتان سەرکردە (موعەمەر قەزافی) سەرۆکی کۆماری لیبیان، من(رەفیق پشدەری) هاوڵاتییەکی کوردم، هێزی من بڕوابوونمە بەخواو چەکەکەم کەقەڵەمەکەمەو پشتوپەنام گەلەکەمە، هاوزمانە دڵسۆزەکانم. چونکە من نە سەرۆك عەشیرەتمو نە سەرکردەی حزبمو دینارێکیشم نیە. ژیان‌و شۆڕشە فکرییەکەم کەدەستم پێکردووە بەپشتیوانی مرۆڤە چاکەکارەکانە لەهەموو شوێنێك، رەنگە خوێنەر بەبچووکم بزانێ کاتێك دەبینێ هیچ تانك‌و تۆپێکم لەپشت نیە بەڵام پشتیوانم وشەی هەقە.. هەڵوێستی بەرێزتان لەبەرامبەر گەلی کوردی بێنەوا لەبیر ناکرێ، من ئێستا هەوڵی کۆکردنەوەیان دەدەم لەکتێبێکی سەربەخۆدا، لەگەڵ ئەوەی من لەهەر سێ

بـەرگی کتێبەکەمـدا پەرژاومەتـە سـەر وتـارو هەڵوێـستە مرۆڤدۆسـتەکانی بـەڕێزتان کـەپڕە لەهەسـتی راسـتگۆیی‌و نیشتمانپەروەری.

سەرکردەی بەڕێزم...

بەدرێژایی چەرخەکان گەلی کورد دەناڵێنێ، تەنانەت راپەڕین برینەکانی ساڕێژ نەکرد بەڵکو قوڕەکـەی خەسـتتر کـردەوە چونکە سەدام هێشتا دەسەڵاتی بەسەر ئەو بەشەدا ماوە کەبنەماڵـەی بـارزانی داگیریـانکردووە لەکوردسـتان بەشـێوەیەکی ناڕاستەوخۆ، ئەمـەو هەسـتکردنم بەلێپرسـراویەتی، پـاڵی پێوەنـام کەرێگـە بەرەوپێـشەوە بـبڕم بـەو هیوایـەی بـەڵکو خـوا دەرگایەکی رەحمەت بکاتەوە. شایانی باسە من تەنها ئـەو رێگایـەم نەگرتۆتەبـەر. لەسـاڵی ١٩٦٣ هـەروەها لەسـاڵی ١٩٨٥ هەوڵمدا بۆ لەیەکتر نزیککردنەوەی بیروبۆچوونی لایەنە شەڕکەرەکانی حزبـە کوردییـەکان بـۆ یـەکگرتنیان‌و کۆتـایی هێنـان بەململانێی خوێناویی نێوان گەل، کە لەهەر سێ بەرگی کتێبەکەمدا بەدوورودرێژی بـاسمکردووە... هـۆی نەچوونیـشم بـۆ ناو حزبە کوردییەکان تەنها لەبەرئەوەبوو نەبمە لایەنێك‌و بتوانم رۆڵی چاکەکاری خۆم بگێـڕم بـۆ رزگـارکردنی ئـەو میللەتـە. هەر بۆیە لە ١٩٩١/٣/١٣ مەسعود بارزانی لەبەرچـاوی ژمارەیـەك لـەهاوکارەکانی داوای لێکـردم کـە وەکـو وەزیـری دەسـتە راست لەگەڵی بم... منیش وەڵامم ئەوە بوو: "فەڕاشیم پێ باشترە لەکارکردن لەگەڵ ئێوە"..

پاش خیانەتی گەورەی بنەماڵەی بارزانی لەئابی ١٩٩٦دا، کاتێك بوون بەڕێ نیشاندەری سـوپای دیکتـاتۆر سـەدام حـسەین بـۆ داگیرکردنـی کوردسـتانی ئـازادکراو.. ئینجـا پـاش سـەرنەکەوتنم لەهەوڵـەکانم بـۆ دورخستنەوەیان لەرێبازی خیانەت، بڕیارمدا کەدەستبکەم بەپرۆژەی نووسینی (کورد، دوژمنی خۆت بناسە) بـەو هیوایـەی ببێتە چرای رۆشنکەرەوەی رێگای بـەردەم خـەڵك، شـانازی نـەبێ مـن یەکـەم هـاوڵاتی بێپـشتوپەنای کـوردم بـەو جـۆرە رووبـەرووی سـتەم‌و دوژمنکـاری بوومەتـەوە، بـەجۆرێك بەرامبـەر ملـهوڕیی بنەماڵـەی بـارزانی وەسـتاوم‌و تاکـە چـەکم قەڵەمەکەمە.

بەرگی یەکەمم لەهەولێر دەرکرد، بەهۆی خێرەومەندێکی نزیك لەبنەماڵەی بارزانـی زانیم کەبنەماڵە، بڕیاری ستەمکاری کوشتنی منیان دەرکردووە، هەروەها بەفرمانی سەدام ئـەرکی رفانـدنی منیـان بەزینـدوێتی پێ سپێرابوو تا بمدەنەوە دەست رژێمی عێراق، بۆیە بەرەو سلێمانی هەڵاتم کەشوێنی دەسەڵاتی تاڵەبانییە، لەوێ هـەردوو بەرگی کتێبەکەم دەرکرد. جێی خۆیـەتی ئـەوە بڵـێم کـەتا ئێـستا کـەس رێـی پێنـەگرتووم لـەدەرکردنی کتێبـەکانم لەگـەڵ ئەوەش کە بەنهێنی دەرمکردووەو بەبێ رەزامەندی کەس.

بۆ نزیکبوونەوەی ئەو دوو حزبە نەیارە ئێستا لەدەرکردنی بەرگەکانی کتێبەکەم وەستاوم کەبۆتە مایەی هەڕەشـەیەکی گەورە لەسەر ژیانم، نازانم لەتوانای جەنابتاندایە کەئاسایش‌و ئارامیم لەسلێمانی بۆ دابین بکەن تا ساتی دەرچـونم لـەوڵات، ئەوەش بەداواکردنتان لەبەڕێز جەلال تاڵەبانی کەبمپارێزێت. لەبەرئـەوە داوادەکـەم بـەو هیوایـەی یـەکێك وەڵامـم بداتـەوە، چونکە من نامەم بۆ زۆرێك لەسەرکردەکانی جیهان ناردووە.. لێرەدا زۆر لەسەرکردە کوردەکان لێم دەپرسن نیازت چـییە؟ ئەگەر نیازت پلەوپایەیە ئەوا لەیەکەم هەڵبژاردنی ئازادانەی گەلدا تۆ زۆرتـرین دەنـگ مـسۆگەر دەکـەیت، ئەگـەر مەبەسـتت پێکهێنانی حزبە، ئەوە کارە بۆ تۆ ئاسانە. وەڵامی من هەمیشە ئەوەبووە کەمن هۆکاری ئاسـانترم لەبەردەسـتدا بـووە بـۆ پلەوپایەی بەرز بەڵام نەمویستووە چونکە ئامانجم نەبووە، هیچ کاتێکیش هەوڵنادەم حزبێکی شۆڕشگێڕی کـوردی دروسـت بکەم، چونکە هەرچەندە ژمارەی لایەنگرانم زۆر بێ ناچار دەکرێم لەگـەڵ دەوڵەتـە دراوسـێکاندا هاوکـار بم.. بـەڵام ئامـانج‌و

نیازی من: راگەیاندنی شۆڕشێکی فیکرییە کەجیهانی تاریکی کورد رووناك بکاتەوەو، عەقڵەکان لەکۆیلایەتی رزگاربکاو، بیروباوەڕی کورد یەکبخا.

من بەنوسین هەوڵم بۆ ئەوەدا، بۆیە سێ بەرگی کتێبەکەم لەژێر ناوی (کورد دوژمنی خۆت بناسە) دەکرد، کەتێیدا باسم لەسەرۆك دەوڵەتو سەرکردە حزبییەکان کردووە بەڕادەی دوژمنایەتییان بۆ گەلی کورد، بارودۆخی ئێستای گەلی کوردم خستۆتەڕوو لەگەڵ رێوشوێنەکانی چارەسەری. هەموو ئەوانەم بەدووردرێژی لەسێ بەرگی کتێبەکەمدا باسم کردووە، لەگەڵ ئەو نامەیەدا بەپاشکۆیەك کورتەی کتێبەکەم بۆ رەوانەکردووی کە لە١٥ لاپەڕە پێکهاتووەو بەزمانی ئینگلیزی نووسراوە. هەروەها نامەیەکیش بۆ بەڕێز کوفی ئەنان کە لە٣ لاپەڕە پێکهاتووە، نامەیەکییش بۆ بەڕێز کۆڵن پاوڵ کە لە٥ لاپەڕە پێکهاتووە، هەروەها نامەیەکی ١٠ لاپەڕەییم بۆ بەڕێز تۆنی بلێر ناردووە. نامەیەکیش بەزمانی عەرەبی بۆ بازاڕی هاوبەشی ئەورووپی ناردووە، هەموویان لەبارەی کێشەی گەلی کوردو رێگاچارەکانیەتی. من بۆیە ئەو داوایەم لەبەڕێز کۆفی ئەنان کردوە چونکە گەیشتومەتە بڕوایەك، ئەویش ئەوەیە کەناکرێ لەخۆسەپاندنی بنەماڵەی بارزانی رزگارمان بێ بەبێ هێزێکی سەربازی نێودەوڵەتی، سەبارەت بەئەمریکاو بەریتانیاش ئەوا لەنامەکانمدا باسی هەڵوێستی نامرۆڤانەی ئەوانم کردووە دەرهەق بەگەلی کورد لەهەموو قۆناغێکدا.

بۆیە لە٢٠٠١/٤/٢٨ دەستمکرد بەناردنی نامەکانم بەو شێوەیەی کە لەبەردەستتاندایە، ئەمەش بۆ ئەوەی نیشانیانبدەم کەهاوڵاتیەکی بێدەسەڵاتم لەگەڵ ئەوەشدا چەوساوەیی کورد بۆ هەموو جیهان دەردەخەم، بەڵکو ئەوە خوایە, بەخشندەیی خوا بچێتە دڵیانەوە.

برای گەورەم... سەرۆکی فەرماندە...

لێرەدا دەمەوێ ئەوەتان بۆ دەرخەم کەمن لەژیانێکی سەختدا دەژیم، مەترسی چواردەوری تەنیوم لەگەڵ خێزانەکەمدا کە لە١٩ کەس پێکهاتووە، لەستەمی ئێران، تورکیا، عێراق، سوریاو بنەماڵەی بارزانی دەترسم لەخێزانەکەم، بایی ئەوەندەشم نیيە کەبتوانم لەسلێمانی لەگەڵ خێزانەکەمدا دەرچم، ناشوێرم لەسنووری ئەو وڵاتانە بدەم چونکە لەنوسینەکانمدا باسی رووداوی گەورەو تاوانبارانەم کردوون لەرێگای کتێبەکانیشم بڵاوم کردوونەتەوە، ئەوەو هیچ سەرچاوەیەکمان نیيە کەپشتمان بگرێ.

بۆیە داوا لەبەڕێزتان دەکەم کەکار بکەن لەپێناو مرۆڤایەتیداو دەرمان بکەن لەو وڵاتە بۆ شوێنێك کەتێیدا بەردەوام بم لەبڵاوکردنەوەی بەرگەکانی تری کتێبەکەم (چونکە لەهەگبەی مندا زۆری تێدایە لەسەر سەدامو بنەماڵەی بارزانی). ئەوەی من ئێستا لەهەگبەمدایە بارودۆخەکە رێگا بەنووسینی نادات لەوڵاتی خۆمدا.

لەکۆتاییدا هیوادارام بەڕێزتان هەردەم لەشساغو تەندروستو تەمەن درێژبن، ئەو کارانەش لەدەست جەنابتاندایە بۆیە من چاوەڕوانم، هەرچەندە تەلەفۆنم نیيە بەڵام ئەوە ژمارەی فاکسە کەدەکرێ لەو رێگایەوە پەیوەندیم پێوەبکەیت، هەزار هەزار سوپاسو سڵاو بۆ بەڕێزتان.

**خزمەتکاری کوردو دڵسۆزتان**

**رەفیق پشدەری**

**نووسینگەی دیلان ( ٠٠٤٤٢٠٧٧١٣٨٨١٢)**

## نامەی شەشەم

### بۆ خانمی بەڕێزو شکۆدار مەدام میتران لەگەڵ پێزانیندا

پاش سڵاو و ئەوپەڕی ڕێز...

ئەی خاوەنی بەسۆزترین دڵ بۆ گەلی کورد, سەرەتا دەمەوێ خۆمت پێ بناسێنم: من ناوم (رەفیق پشدەری)یە, نووسەرێکی کوردمو لەسەر ئەو ڕووداوو بەسەرهاتانە دەنووسم کە بەسەر گەلەکەمدا هاتووە.

لەسلێمانیدا نیشتەجێم لەباشووری کوردستان, زیاتر لە٤٥ ساڵم لەژیانی خۆم لەپێناوی خزمەتکردنی گەلی کوردو کێشە ڕەواکەیدا بەسەربردووە. ئەو ئەقڵو سەرمایەو توانایەی خوا پێی بەخشیوم خستومەتە خزمەتی ڕزگاریی گەلی کورد.

بەڵام چۆن بەو ئامانجە دەگەین, لەکاتێکدا دووبەرەکی, ئێمەو سەقامگیریو ئاشتی لێك دابڕاندووە. لەوەش کارەساتبارترو خراپتر, دەسبەسەراگرتنی بنەماڵەی بارزانییە بەسەر پارتیو دواجار بەسەر زۆرینەی خاکی کوردستاندا. چونکە ئەو بنەماڵەیە ئەوساو ئێستاش ڕێگربوون لەبەردەم ویستی گەلی کوردو, بەردی سەرەڕێی ڕزگاری بوون. لەهەرسێ بەرگی کتێبەکەمدا (کورد دوژمنی خۆت بناسە), رادەی خیانەتی ئەو بنەماڵەیەم ڕوونکردۆتەوە بەتەنیشت باسکردنی کارەساتباریی گەلی کورد بەدوورودرێژی.

ئەی خاوەنی دڵی گەورە...

زمان لەهەڵبژاردنی وشەی ستایشو پیاهەڵدانی شایستە بەتۆ دوودڵە, چونکە پێشکەشکردنی سۆزی جەنابتان بۆ گەلەکەمان لەسەرو هەموو پیاهەڵدانو ڕێزێکە. بڕم نییە جگە لەسەردانو هاتوچۆی جەنابت نەبێت لەخاکی کوردستانو لەناو خەڵکەکەیدا, کەس بەو ڕادەیە ئامادەبووبێ. تۆ بویتە ڕێچکەشکێنی ئەم کارە لەناو هەموو هاوشێوەکانت لەجیهاندا. بەڵام ئەوەی ئەو خۆشەویستییەی لێکردینە تاڵی, ئەو هەوڵە نەزۆکە بوو کەویستیان لەڕێگایەوە چرای ژیانت بکوژێننەوە.

بڕوام وایە خاوەنی هەمان دەست هەوڵی تیرۆرکردنی منیدا کاتێك بەرگی یەکەمی کتێبەکەم لەهەولێر دەرکرد, هەر ئەوەش وای لێکردم بەخێزانەوە بەرەو سلێمانی هەڵبێم.

سەرەتادا ڕەنگە پێت وابێ عەقڵم تێکچووە کاتێك بزانی پیاوێك لەگەڵ خێزانەکەیدا ڕووبەڕووی بنەماڵەی بارزانیو هەندێك حزبی کوردیو دەوڵەتە ئیقلیمییەکان بۆتەوە, بگرە لەکتێبەکانیدا هێرش دەباتەسەر هەموو ئەوانەی دژایەتی گەلی کورد دەکەن بەچاوپۆشی لەتواناو پایەیان. لەهەمانکاتدا هیچ حزبو عەشیرەتێکی لەپشت نییە, خۆیو قەڵەمەکەیەتی! بەڵام من پشتئەستورم بەوەی کەئەوان فەرامۆشیان کردووە: ڕەزامەندی خوا, ئینجا ڕەزامەندیو سۆزی خەڵکانی خاوەن بڕوا. چونکە دوژمنانی من بڕوایان بەخوا نییەو هیچ حساب بۆ خەڵك ناکەن. بۆ زانیاریشت ئەوەی من لەکتێبەکانمدا نووسیومە هیچ نییە جگە لەدەربڕینی هەستی کوردو هیواکانیان کەخۆیان دەترسن دەریببڕن, من هیچ نیم جگە لەئاوێنەیەك بۆ گەلی کوردی چەوساوە بەڕۆژی ڕووناك لەبەرامبەر جیهاندا.

ئەوەی لەسێ بەرگی کتێبەکەمدا نووسیومە, تەنها ٤٥٪ی ئەوەیە کە لەجانتاکەمدایە،

بەڵام ڕووداوە بەردەوامەکانی کوردستان ڕێگە نادەن کەپەیامی خۆم تەواو بکەمو هەموو نهێنییەکانی دوژمنی ڕاستەقینەی گەلەکەم بخەمە بەردەست.

هەر بۆ نموونە دوو خیانەت بیری بەڕێزتان دێنمەوە:

١- فرۆشتنی بڕیارەکانی ئاشتی (دبلن) لەلایەن بنەماڵەی بارزانییەوە بەدەزگای میتی تورکی, ئەو ڕێکەوتنەی بەدەستپێشخەری مسیۆ فرانسۆ میتران بوو, ئەم خیانەتە دواجار, بووە هۆی هەرەسهێنانی هەوڵە جدیەکانی چارەسەری دوژمنایەتی نێوان بارزانیو تاڵەبانی.

٢- چارەنووسی گەلی کورد خستنە ژێردەستی سەدام حسینی ملهوڕ لە ١٩٩٦/٨/٣١دا,

کە لەمێژووی خیانەتدا بێوێنەیە.

لەسێ بەرگی کتێبەکەمدا هەموو ئەو نهێنیو شتە شاراوانەی پەیوەندییان بەرووداوو بەسەرهاتەکانی ١٩٨٥ تا ٢٠٠١ هەیە خستوومەتەڕوو. هەر لەسەرۆکە یەك لەدوای یەکەکانی عێراقو وڵاتەکانی ناوچەکەو سیاسەتەکانیان بەرامبەر بەگەلی کورد, تا حزبە کوردییەکانو کەسایەتییە سیاسییەکان بەتایبەتی بنەماڵەی بارزانیو خیانەتەکانیان لەمێژوودا. بەپشتیوانی خواو هەوڵی جەنابتانو پشتگیری چەوساوەکانی گەلەکەم ئەو پەیامە تەواودەکەم, چونکە هەمیشە ڕاستی سەردەکەوێو هیچ شتێ بەسەریدا زاڵ نابێ. هەروەها لەکتێبەکانمدا ئەو مەترسییەم خستۆتەڕوو کە لەکودستاندا لەئارادایە, ئەگەر گۆڕان بەسەر بارودۆخە سیاسییەکەدا نەیەت, چونکە بارودۆخەکە تادێ خراپترو خراپتر دەبێ.

جیهان لەبەرامبەر بنەماڵەی بارازانیدا کە بەکەیفی خۆیان گاڵتە بەویستی گەلی کوردو بنەماکانی ئەو گەلە دەکەنو, لەهەمانکاتدا هیچ تەکانو هەنگاوێك بەکێشەی کورد نادەن, جیهان بەو بێدەنگییەی لەپلانێکی دوژمنکارانە بەرامبەر گەلی کورددا بەژداری دەکەن, بۆیە دەوڵەتەکانی ناوچەکەش پشتگیری بنەماڵەی بارزانیەکان دەکەن. ئەم کارە دەرفەتی ئەوەیان بۆ دەڕەخسێنێ دەسەڵات بەسەر کوردستاندا بگرنو دواجار کارەساتی ١٩٧٥ دووبارەبکەنەوە, کاتێك هەرەسیان بەشۆڕشی کوردی هێنا بەڕابەرایەتی بارزانی لەو کاتەدا.

پێم وایە هەواڵی ئەو ژمارە کۆچبەرە کوردانەت پێدەگا کەڕۆژانە کوردستان جێدێڵن, لەکاتێکدا ئەگەر کۆچکردن بۆ هەموو خەڵك شیاوو ئاسایی بێت, ئەوا زیاتر لە٨٠٪ی خەڵکی کۆچیان دەکردو نیشتمانیان بەرەو چارەنووسێکی نادیار جێدەهێشت. ئامانج لەوکارەش تەنها دەستەبەرکردنی ژیانێکە لەسایەیدا بەئارامی بژین.

گەلی کورد بۆ ئەوە دژی دەسەڵاتی صدام ڕانەپەڕی تا میلیشیاکان دەسەڵاتی سەربازی خۆیان بسەپێنن, من بەناوی خۆشەویستیو ئاشتی بانگت دەکەم, بەناوی مرۆڤدۆستی, کەدەستی هاوکاریمان بۆ درێژبکەی بۆ گۆڕینی ئەو بارودۆخە.

لەکتێبەکانمدا پێشنیارێکم لەگەڵ کورتەی کتێبەکەم پێشکەش بەبەڕێز کۆفی ئەنان کرد لەپێناو ڕزگارکردنی گەلی کورد, داوام لەبەڕێزتان لەو بارەیەوە ئەوەیە پشتیوانی پێشنیارەکەی من بۆ بەڕێز کۆفی ئەنان بکەنو لەئەوروپادا بڵاوییکەنەوە, پاش ئەوەی وەریدەگێڕنە سەر زمانی فەرەنسی, بۆ چەککردنی میلیشیاکانی کوردستانو ڕاگەیاندنی هەڵبژاردنێکی ئازاد لەژێر چاودێری دەسەڵاتێکی نێودەوڵەتی. ئەوکاتە هەموو جیهان بۆی دەردەکەوێو دان بەوەدا دەنێن کەئێمە گەلێکی دڕەندەنین. هەموو ئەوەی لەکوردستاندا ڕوویداوە, گوناهی ئێمە نییەو هی سەرکردەکانمانە, لەو کاتەشدا بنەماڵەی بارزانی لە١١٪ی دەنگەکان زیاتر لەکوردستاندا بەدەست ناهێنن.

خانمە دادپەروەرەکەم... ئەی دایکی کوردان:

ببە بەهۆی ڕزگاربوونمان بەر لەوەی لەناوبچین, دەستی یارمەتیم بۆ درێژ بکە, چونکە ڕەنگە خوابمکاتە هۆی ئاشکرابوونی نادیارەکانو ڕۆشنکردنەوەی لایەنە تاریکەکانی ژیانی گەلەکەمو دواجار ڕاگەیاندنی شۆڕشێکی فکری. ئەگەر ئەو پەیامەی خۆم نەگەیەنمە سەرو هەموو ئەوەی دەیزانم نەیخەمە سەر کاغەز ئەوا خۆم بەگوناهبار دەزانم, هیوادارم خوا

بە بەخشندەیی خۆی دڵت نەرمبکا بۆ هاوکاریکردنمو کارکردن بۆ رزگارکردنی ئەو گەلە. ئەوکات تۆ دەبیـە هێمـای ئـازادیو ئاشتی لای ملیۆنانی گەلی کورد.

من لەگەڵ خێزانەکەمدا کە لە١٢ کەس پێکدێ لەخانوویـەکی کرێدا دەژیـن, کـچەکەمو مێردەکـەیو منداڵـەکانی تریـشم لەخانوویەکی تردا, بۆ پاراستنی گیانی خۆمـان نـاتوانین دەسـت بـۆ هـیچ کارێـك ببـەین. ژیانمـان لەسـەر ئـەو یارمەتییەیـە کەخەڵکی بەشەرەفی گەلەکەمان لەهەموو لایەکەوە پێمان دەبەخشن.

نازانم کەیو لەچ وەختێکدا یەکێك لەچـڵکاوخۆرەکانی صـدام یـان بنەماڵـەی بـارزانی یـان هـی دەوڵەتـە داگیرکـەرەکانی ناوچەکە خـۆ بەماڵەکەمانـدا دەکـا بـۆ لـەناوبردنمان, لەکاتێکـدا هـەموو گونـاهـ و تـاوانی مـن قەڵەمەکەمـە, کەڕاسـتییەکانی پێدەردەخـەم, چـونکە سـوپاس بۆخـوا کتێبـەکانم بـوون بەشۆڕشـێکی رونـاکبیری, هەرچـەندە لەوڵاتـەکانی دراوسـێدا قەدەغەکراوە, بەڵام لەهەمانکاتـدا لەهـەموو شـوێنێکدا بڵاوبۆتـەوە تـا گەیـشتووە بەئەوپـەڕی ئـەوروپا. بۆیـە مـن لەلایـەن دەوڵەتانی ناوچەکەو بنەماڵەی بارزانی داواکراوم کەزیندانی بکرێم. دەبێ ئەو راستیەش بڵێم کەتا نووسینی ئەم نامەیە هـیچ گوشارێکم لەلایەن تاڵەبانی یان حزبەکەی نەخراوەتەسەر, جگە لەوەی هیچ هاوکارییەکیان نەکردووم تەنها ئەوە نەبێ رێیان پێداوم لەژێر دەسەڵاتی ئەواندا بەئاشتی بژیم.

هیوام گەورەیە کە بەجەنابتان بگەم تا ئـەوەت بـۆ دەرخـەم کـە لەلامـە لەسـەر ئـەو راسـتیو رووداوانـەی روویانـداوەو لەکوردستاندا روودەدەن. بەڵام هیچ دەروازەیەکم نییە تا لێیەوە لەگەڵ خێزانەکەم دەربچم بۆ دەرەوەی وڵات. داوا لـەخوا دەکـەم کـەهاوکاریم بکـا, ناشـزانم چـۆن بۆتـان دەرەخـسێ هۆکارەکـانی دەرچـوونی خـۆمو خێزانەکـەم بەسـەلامەتی دەرەخسێنن, بێ ئەوەی هیچ دەستێکی چەپەڵ پێم بگا.

**خزمەتکاری کوردو کوردستان**
**رەفیق پشدەری**

هاوپێچ لەگەڵ ئەم نامەیەدا کەبۆ بەرێزتانم ناردووە, هەموو ئەو پێشنیارانەم بۆ لایەنـە پەیوەندیـدارەکان نـاردووە, هـەر لەبەرێزان کولن پاولو تۆنی بلێرو بازاڕی ئەوروپی هاوبەشو کۆمەڵی وڵاتانی عەرەبی. لەگەڵ کورتەی هـەر سـێ کتێبەکـەم بەزمانی ئینگلیزی. ئەگەر حەزتکردو ویستت وەڵامم بدەیەوە ئەوا با بەپێی ئەم ژمارە فاکسە بێت.

FAX: 00442077138812 لەوێشەوە بۆ دەستی (رەفیق پشدەری) .

## نامەی حەوتەم

### بۆ بازاڕی هاوبەشی ئەوروپی

پاش ڕێزو سڵاوی پێزانینم..

ئەی قیبلەی کوچکردووەکانی کوردستان, لەمنەوە هەزار سڵاوو سوپاس بۆ ئێوە بەرانبەر ئەو هاوکارییەی پێشکەشی کوردە بێنەواکانی دەکەن کە لەغەریبیدا دەژین لەهەر
ولاتێکی ئەوروپی, لەئێمەوە سڵاو بۆ ئێوە.

وەکو هەر کوردێکی نیشتمانپەروەر کە لەهەرکوێیەك بێ, شانازی بەڕەگەزی خۆمەوە
دەکەم, ناسراوم بەرەفیق پشدەری, هەروەکو گەلەکەم ئارامیو ئاسایشم بەخۆمەوە نەبینیوە لەو ڕۆژەوە کەهەستم بەبوونی خۆم کردووە, ئەوەتام لەگەڵ خێزانەکەمدا کە لە ١٩ کەس پێکهاتووە، ژیانێکی ناخۆش بەسەردەبەینو چاوەڕێی مەرگ دەکەین کە لەهەر ساتێکدا لێمان بێتە ژووری. لەکاتێکدا هیچ گوناهێکم نەکردووە ئەوەندە نەبێ سێ بەرگی کتێبێکم دەرکردووە بەناوی (کورد دوژمنی خۆت بناسە) کەتێیدا ئەو زانیارییانەم نووسیوە
کەهەندێك لێی بێئاگانو زۆرینەی خەڵکی دەیزانن, بەڵام کەس ناوێرێ بینوسێ.

من ئەو کارەم تەنها بۆ ئەوە کردووە تا ئەوە بۆ جیهان ڕۆشنکەمەوە کەراستی باری ئێمە چۆنەو ئەو نەبوونیو ناسۆرەش بخەمەڕوو کەدووچاری گەلەکەمان بۆتەوە, هەروەها هۆکارەکانی ئەو ئەنجامەو تاوانباری راستەقینەی ئەو بارودۆخەو چۆن دەتوانین سەرە ڕێی ڕزگاری بدۆزینەوە. لەم نامەیەدا ١٥ لاپەڕەی ناوەڕۆکی سێ بەرگی کتێبەکەم بەزمانی ئینگلیزی بۆ ڕەوانەکردن.

ئەی دەسەڵاتدارو سەرکردەکانی وڵاتانی ئەوروپای بەڕێز, ئەی ئەوانەی وڵاتەکەتان بەئاشتیو ئارامی دەژی, پێم خۆشە سوپاسو پێزانینی خۆمتان ئاڕاستە بکەم, لەبەرانبەر ئەو سۆزو خۆشەویستییەی دەیبەخشن بەکوردە پەناهەندەکان, ئەوانەی پەنایان بۆ وڵاتانی ئەوروپی هێناوە بۆ ئەوەی بەئارامی بژین... ٤٥ ملیۆن کورد چاودێری شێوەی گرتنە باوەشی ئێوە دەکا بۆ ئەو ئاوارە کوردانەو چۆن هەوڵدەدەن وا هەستبکەن کە لە سەرخاکی نیشتمانی خۆیان دەژین, ئەویش لەسایەی ئەو ڕێزو خۆشەویستییەی لێیان دەگرن.

ئەی سەروەرانی دەوڵەتی سوید...

لێرەدا ئەوپەڕی سوپاسو منەتباری گەلی کوردتان پێڕادەگەیەنم بەهاوکاریکردنتان بۆ هەزارەها خێزانی کورد, هەرچی تایبەتە بە بڕیاری پەرلەمانی سویدی لەمانگی پێنجدا, ئەوا هەرچی کوردە خۆی بەقەرزداری ئەو بڕیارە دەزانێ, کە بەهۆیەوە هەست بەئینسانیەتو لیپرسراوی دەکەن کەتەنها بەو حاڵەتە ئینسانییە هەستکردن بەلێپرسراوی بەرجەستە دەبێت, بەبانگەوازکردن بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کوردو ڕۆشنایی خستنە
سەری لەجیهانی سێیەمدا, جیهانی ستەمکارو تاریکایی. هیواو دوامەبەستم ئەوەیە
لەبەڕێزتان کەوەڕەز نەبن لەپێشکەشکردنی کۆمەكو هاوکاری بەئێمە تا ڕۆژی ڕزگاری.

ئەی سەرکردەکانی ئەوروپا, ڕابەرانی مرۆڤایەتیو بەزەیی..

کاتێ کوردێك هەواڵی دەرکردنی خێزانە کوردە کۆچکردووەکانی لای ئێوە دەبیستێ, لە تورکیا, عێراق, ئێران, سوریا، دەزانێ ئەمە واتای چاوەڕوانکردنی چارەنووسی ڕەش دەگەیەنێت کەرەنگە بەمەرگ کۆتایی بێت. بۆیە داوا لەبەڕێزتان

دەکەم بەچاوی بەزەیی بڕواننە کوردە ئاوارەکان کەڕەنگە تێکدەری تیابێت, بەڵام چەم بێ چەقەڵ نابێت, بۆیە داواکەم دووبارە دەکەمەوە کەکوردە کۆچبەرەکان تەسلیم بەگورگە برسیەکان نەکرێت.

بەڕێز حکومەتی هۆڵەندی پایەبەرز

سەرەتا داوای لێبوردن دەکەم لەسەر ئەوکارەی هەندێك لەئەندامانی گەلی زۆرلێکراومان لەمانگی پێنج ئەنجامیاندا, چونکە بەڕاستی دڵگران بوین بەو کارەی هەندێك لەبراکانمان ئەنجامیاندا کەهۆکارەکەی هەر بێزاریو بێ هیوایی بوو. بەڵام مامەڵەکردنتان بەو شێوەیەو لێبوردنتان لەوەی کەروویدا, بووە مایەی سەرسوڕمانو پێزانینی هەموو کوردێك. لەهەمانکاتدا بەو بڕیارە سوپاسێکتان تۆمارکرد لەمێژووی گەلی کورددا لەبیرناکرێ لەبەرامبەر ئەو خۆشەویستیو رێزەی بۆ گەلی کوردتان نواند.

ئەوەش قەرزێکە لەگەردنماندا رۆژێك لەرۆژان دەتاندەینەوە. هەر بۆ زانیاریتان سەروەتو سامانی گەلی کورد لای بنەماڵەی بارزانی گەمارۆدراوە کەئەمڕۆ ئەم بنەماڵەیە دەستیان بەسەر پارتیو بەشی هەرە زۆری کوردستاندا گرتووە, کەناوچە ستراتیژیو گرنگەکەیە. بەڵام ئەو رۆژە هەردێ کەگەلی کورد مافەکانی خۆی وەربگرێتەوە, پاش ئەوەی کۆتایی بەدەسەڵاتی بنەماڵەی بارزانی دەهێنرێت بەسەر کوردستاندا, ئەو کاتە قەرەبووی هەموو ئەو زیانانەتان بۆ دەکەین کەبرا کوردەکانمان لێیان کردوون. گەلی کوردیش هەرگیز هەڵوێستە چاکەکانی ئێوە لەیاد ناکات, کاتێکیش دەوڵەتی کوردی دادەمەزرێ ئەوا بازرگانیمان تەنها لەگەڵ بازاڕی هاوبەشی ئەوروپی دەبێت.

بەڕێزان, لێپرسراوان لەئەورووپا...

لێشاوی رۆژانەی کوردە پەنابەرەکان بۆ ئەوروپا بارێکی گرانە بەسەر ئابووریی نەتەوەییتان, بۆیە لێرەدا پێم باشە هۆیەکانی ئەو کۆچەتان بۆ بخەمەڕوو. گەلی کورد نزیکەی ٨٠ ساڵە بەسەر چوار پارچەدا دابەشکراوەو لەژێر دەسەڵاتی هەریەك لەتورکیا, عێراق, ئێران, سوریا دەژین. لەگەڵ جیاوازی شێوازی پیادەکردنی سیاسەتە دوژمنکارییەکانیان دەرهەق بە گەلی کورد لەمێژوودا, بەڵام هەرچواریان لەهەوڵەکانی تواندنەوەی گەلی کورد هاوشێوەن, بۆیە شتێکی ئاساییە هاووڵاتیی کوردی بەشەرەف بەپێی ئەو توانایەی هەیەتی, لەدەستی ئەو چوار دەوڵەتە بەرەو ئەوروپا هەڵێ.

کێشە رەواکەی ئێمە تا ئەمڕۆ بەهەڵواسراوی ماوەتەوە, تایبەت بەئێمەی نیشتەجێ لەکوردستانی باشوور (عێراق) ئەوا ئێمەش بوینە سێ بەش, بەشێك لەدەرەوەی هێڵی٣٦ـەو لەوانە ٢/٥ی لەژێر دەسەڵاتی صەدامی دکتاتۆردا دەژین, ئەمانە لەسادەترین مافی هاووڵاتی کوردی بێبەرین, بەشی دووەمیان لەژێر دەسەڵاتی (ی.ن.ك)و حزبە نیشتمانپەروەرەکانیتر دەژین, ئەم هەرێمە لەگەڵ بچوکی بەبەراورد لەگەڵ ناوچەی سێیەمدا, لەهەمانکاتدا خەڵکێکی زیاتری تیادا دەژی. لەم ناوچەیە هەست بەئازادی رادەربڕینو رۆژنامەو دڵنیایی دەکەی. بوونی من لەگەڵ خێزانەکەمدا لەسلێمانیو دەرکردنی هەرسێ بەرگی کتێبەکەم بەبێ ئەوەی کەس رێم لێبگرێ, باشترین بەڵگەن لەسەر ئازادی رادەربڕینو گوتنی راستی کەبنەماڵەی بارزانی قبوڵیان نەکرد. بەڵام لەم ناوچەیەدا لەبەر کەمی داهات، وەزعی کاسبکار خراپەو فەرمانبەری هەژاریش جار وایە بیری دەچێتەوە کەی دوا مووچەی وەرگرتووە. هەرچی بەشی سێیەمە ئەوا لەژێر دەسەڵاتی بنەماڵەی بارزانیدا دەژین کەدەسەڵاتیان بەسەر حزبی پارتی دیموکراتی کوردستاندا گرتووە, لەو بنەماڵەیەشدا بارزانی خاوەنی دوا رایە, ئەمانە هەموو داهاتی کوردستانیان بۆ خۆیان هەڵگرتووە, داهاتەکان لەگەڵ گەلی کورددا بەم شێوەیە بەشدەکەن ( ONE FOR YOU TEN FOR ME). لەم ناوچەیەشدا ئازادی تەواو هەیە بەڵام بەجۆرێکیتر, دەبینین موخابەراتی هەرچوار

دەوڵەتو ئیسرائیل بەئارەزووی خۆیان جرتوفرت دەکەنو گەلی بێدەسەلاتیش کوێرو کەڕولاڵەو هیچ دەسەلاتیان نییە. ژێردەستەنو بێتوانا, سەرانی بنەماڵەی بارزانیش هەردێو پارەو سامانی زیاتر کۆدەکەنەوە.

لەبەرەبەیانی ٢٠٠١/٦/٧ لەرێی هەواڵە جیهانییەکان بیستم سەرکردەی کورد، نێچیرڤان بارزانی بەسەرۆکایەتی وەفدێك هاوڕێ لەگەڵ کاك سەفین دزەیی بەسەردانێك گەیشتوونەتە ئەوروپا, لەو چوارچێوەیەدا چاویان بەوەزیری دەرەوەی بەلچیکا کەوتووە, هۆی سەردانەکەش پێشکەشکردنی سوپاس بوو لەبەرامبەر هەڵوێستی مرۆڤانەی بازاڕی ئەوروپی هاوبەش لەئاست گەلی کوردو هەوڵەکانیان بۆ دۆزینەوەی رێگەچارە بۆ کێشەی گەلی کورد. لێرەدا بەباشی دەزانم ئەوەتان پێرابگەیەنم کەکاك نێچیر بارزانی بەرێوەبەری راستەوخۆی دەستتێوەردانی لەشکری رژێمی عێراقو داگیرکارییەکەی بوو بۆ هەولێر, هەروەها کاك سەفین دزەییش ئەو کەسە بوو کەرێکەوتنی ئاشتی نێوان جەلال تاڵەبانیو مەسعود بارزانی فرۆشت بەتورکیا, ئەو رێکەوتنەی بەسەرپەرشتی خوالێخۆشبوو فرانسۆ میتران هاتەکایە. بۆ ئاگاداریشتان هۆی سەردانیان بۆ لای ئێوە دوای ئەوە دێت کەزانییان بازاڕی ئەوروپی هاوبەش خەریکە رێگاچارە بۆ کێشەی کورد دەدۆزنەوە, تا دواجار رێگا لەم کارە بگرن, ئەوەش بەفرمانی سەرانیان لەموخابەراتی تورکیاو عێراق.

بۆیە دەبینین کوردی بێنەوا پلەی رۆشنبیری هەرچەندە زۆربێتو لەهەر ئاستێکی کۆمەڵایەتیدا بێت, لە هەوڵدایە هەرچی هەیەتی بیفرۆشێت بۆ هەڵاتن لەنیشتمانو خۆدانە دەست چارەنووسێکی نادیار لەغەریبایەتیدا هەتا مردن, هەر ناوە ناوە ئەوە دەبیستین کەکۆمەڵێك خنکاون, یا مردوون یا زیندانیکراون, یا پاش ئیفلاسبوون بەدەستبەتاڵی دەگەرێنەوە, هەموو ئەوانە تەنها بۆ ئەوەیە بەئاسایشو ئارامی بژین. بەپێی هەندێك ئامار رێژەی زیاتر لە٢ ملیۆن کورد لەهەر چوار پارچەی کوردستان لەدەرەوەی وڵاتدا دەژین, خۆ ئەگەر وەزع ئاوا بڕوا پێم وایە ئەو ژمارەیە زیاد دەکا بۆ ٤ یا ٥ ملیۆن کۆچبەر, ئەگەر هۆکارەکانی کۆچکردن بۆ هەموو کەس فەراهەمبێ ئەوا ٨٠٪ی گەلی کورد دەرۆنو هەموو شتێك جێدێڵن. دەربڕین لەو حاڵەتەو وێناندنی شتێك نییە بتوانرێ بەوشە یان بەڕستە لەچەند وەرەقەیەکدا دەربڕێ, چونکە کۆچکردن حەز نیە وەکو کاك مەسعود بارزانی بۆ یەکێك لەگۆڤارە تورکییەکان دەریبڕیبوو, کاتێك لەچاوپێکەوتنیدا گوتبووی(کوردەکان بۆیە کۆچدەکەن بۆ ئەوروپا تا ئارەزووە جنسییەکانیان تێربکەن). بەڵام کاك مەسعود بارزانی ئەو قسەیەی سەلماند کەدەڵێ (مرۆڤ بۆچوونێکی نابێو شتێك لەخەڵکیدا نابینێتەوە, ئەگەر خۆی حەزی لێی نەکاو پیادەی نەکا).

جوتیارێکی کورد کەئامادەبوو لەسەر بستێکی زەوییەکەی بکوژرێ, ئەمڕۆ دەبینین بەهەرزانترین نرخ دەیفرۆشێ بۆ ئەوەی بگا بەئەورپا, رۆشنبیری کوردیش کە لەپێناو وشەی راستدا باوەشی بەگوللەدا دەکرد, ئەمڕۆ زێدو کەسی خۆی جیدێڵێ تا لەرۆژئاوا بەنامۆییو سوکی بژی, بۆیە مرۆڤ تەنها لەگەڵ بوونی قەوارەی خۆی هەست بەدڵنیایی دەکا.

ئەی سەروەرو سەرکردەکانی بازاڕی ئەوروپی مەزن.. ئەو گرفتە چارەسەر نابێو پۆلی کۆچبەران ناوەستێ بەجێبەجێکردنی ئەو رێککەوتنەی خوارەوە نەبێ, بەچاودێریو سەرپەرشتی ئێوە نەبێ بەشێوەیەکی ئاشکراو دیار.

١-بەرەزامەندی نەتەوە یەکگرتووەکانو بەفرمانی سەرۆك کۆفی ئەنان هێزێکی سەربازی یەکگرتوو پێکبهێنرێ بەدەر لەتورکیا-روسیا-چینو وڵاتە عەرەبیەکان.

٢-لەسەر ئەو هێزە سەربازییە یەکگرتووە پێویستە هەژموونی خۆی بسەپێنێ بەسەر کوردستانی باشووردا (عێراق) وەکو (کۆسۆڤۆ)و هێزە چەکدارەکان لەچەکەکانیان دابماڵێ بەتایبەت بنەماڵی بارزانی.

٣-بەڕێوەبردنی وڵات لەلایەن ئەو هێزە سەربازییەو پاککردنەوەی لەبەکرێگیراوە سیخوڕییەکانی وڵاتانی دراوسێ.

٤-چاودێریکردنی پەیوەندییەکانی هەندێ حزبو کەمکردنەوەی پەیوەندییان بەجیهان بەتایبەتی بنەماڵەی بارزانی.

٥-گێڕانەوەی ئەو سامانەی لەلایەن بنەماڵەی بارزانییەوە دەستی بەسەرداگیراوەو لەبانکەکانی جیهاندا قایمکراوە, یان کارگەو کەلوپەلەکانیان کە بەزیاتر لە٢ ملیار دۆلار مەزەندە دەکرێو گێڕانەوەی ئەو سامانە بۆ ژێر سەرپەرشتی لێژنەیەکی راوێژکاری, کە بەرەزامەندی نەتەوە یەکگرتووەکان بەکاربهێنرێ بۆ دامەزراندنی کارگەو کۆمپانیاو پرۆژەی خزمەتگوزاری, ئەوەش دەبێتە هۆی ئەوەی ٥٠-٧٠ هەزار کرێکارو پسپۆڕ ببێتە خاوەنی کار ئینجا گرفتی بێکاری چارەسەردەبێ.

٦-پاش سەقامگیریو باڵکێشانی ئاسایش, ئامادەکاری بۆ هەڵبژاردنێکی دادپەروەر بکرێ بەچاودێری لێژنەیەکی راوێژکاری نێودەوڵەتی, کەرێگا بەفێڵ یا دەستێوەردانی دەرەکی نەدا, پاشان دامەزراندنی پەرلەمانێکی ئازادی هەڵقوڵاو لەهەناوی گەل, ئەو کاتە بڕیارە کوردییەکانی لەپێناوی بەرژەوەندی گەلی کورددا دەبێ دوور لەهەر دەستێوەردانێکی بیانی یان ناوچەیی, بەم جۆرە رێگاو ئاسۆیەکی باشتر بۆ هاووڵاتی کوردی دەکرێتەوە, پاش جێبەجێکردنی ئەم بڕیارانە ئەوا من ٩٩٪ دڵنیام کەئەمانە روودەدەن:

١-کوردستانی باشوور لەچڵکاوخۆرەکانی سەدام پاکدەبێتەوەو سوپای عێراقی تا سنوری راستەقینەی کوردستان پاشەکشە دەکات لەلای چیای حەمرین, عەرەبە داگیرکەرەکانیش لەخاکی کورد دەردەپەڕێنرێنو خاوەنی راستەقینەی لەشوێن نیشتەجێ دەبنەوە.

٢-دادگاکردنی ئەوانەی دەستیان هەبووە لەبێهێزکردنی گەلی کورددا پاش دەسبەسەراگرتنی سەروەتو سامانیان.

٣- گەڕانەوەی ٦٥٪ی کوردە کۆچبەرەکان لەئەورووپاو جیهانی دەرەوە, ئەوکاتە رێگای کۆچکردن دەبێتە رێی ئەو کەسانەی لەکوردستاندا شوێنێك نیە بیانگرێتە خۆی, چونکە لەخراپە زیاتریان نەکردووە.

٤-گۆڕان بەسەر بارودۆخی کوردەکانی تورکیا, ئێرانو سوریادا دێتو ئەم رژێمانە بەدڵنیاییەوە سیاسەتی خۆیان بەرامبەر کورد دەگۆڕن, چونکە ناتوانن دوژمنایەتی ٤٥ ملیون کورد بکەن, چونکە کورد لەهەر کوێیەك بێت لەو کاتەدا دەبێتە پشتیوانی ئەو حکومەتە کوردییە نوێیە, رۆژێکیش دێت هەرچوار پارچەی کوردستان یەکبگرێت.

٥-دەوڵەتێکی کوردی ئاری میانڕەو پێکدێت لەناوچەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستو هاوسەنگی سەربازیو ئابووری دێتە ئاراوە, کە لەسایەیدا ناوچەکە ئارامی بەخۆیەوە دەبینێ هەتا هەتایە, هەروەها پردی هاوکاری ئابووری نێوان ئەورووپاو رۆژهەڵات دێتەکایەوە.

لەکۆتاییدا داوا لەبەڕێزتان دەکەم بەچاوی سۆزەوە بڕواننە گەلی کوردو, کار بۆ دابینکردنی ژیانو ئاسایش بۆ منو خێزانەکەم بکەن تا ئەو کاتەی هاوکاریمان دەکەن بۆ دەرچوونمان لە وڵات بەبێ گرفت, تا پرۆژەکانی خۆم تەواو بکەم لەپێناو گەیاندنی دەنگی گەلەکەم بە جیهان, خوا پشتیوانەو جگە لەو خوای تر نی یە.

**پاشبەند:** نموونەی هەرسێ ئەو نامەیەی بۆ بەڕێز کولن پاول وەزیری دەرەوەی ئەمریکاو بەڕێز تۆنی بلێر سەرەك وەزیرانی ئینگلتراو بەڕێز کۆفی ئەنان لێپرسراوی نەتەوە یەکگرتووەکان لەگەڵ کورتەی هەرسێ بەشی کتێبەکەمتان بۆ رەوانە دەکەم.

لەکۆتاییدا هەزار سوپاس‌و رێزم

**خزمەتکاری کوردو کوردستان**

**رەفیق پشدەری**

مەکتەب دیلان (FAX: 00442077138812)

**لەویشەوە بۆ دەستی رەفیق پشدەری**

## نامەی هەشتەم

**بەڕێز سەرۆکی کۆمەڵەی وڵاتانی عەرەبی.. مامۆستا عەمرو موسا**

**بەڕێز نوێنەرایەتی وڵاتانی عەرەبی ئەندامە هاوکارەکان..**

سڵاوێکی برایانە..

سڵاوی خوات لێبێ ئەی بەڕێز ئەمینداری گشتی‌و بەڕێزان نوێنەرانی وڵاتانی پایەدار لەکوردستانەوە, لەنەوەکانی سەلاحەددین سڵاوی ئێمەتان لێبێت, بەڕێزتان بەدرێژایی سالْ تەنگوچەڵەمەی زۆر هاتۆتە رێتان‌و, چارەسەرکردنی زەحمەت بووە بۆتان, هەروەها لەبەر نەبوونی کات, لەوانەیە بپرسن نووسەری ئەم نامەیە دەبێ کێ بێ, لەکاتێکدا هیچ هێمایەك بۆ خاوەنەکەی نەکراوە کەئایا سەرۆکی دەوڵەتێکە یا سەرکردەی حزبێکە یا سەرۆك عەشیرەتە, لەکاتێکدا بۆ کۆمەڵەی سەرانی ئەو ولاتانە دەنوسێ کەنەتەوەیەکە زمانی قورئانی پیرۆز زمانیەتی.

لەهاووڵاتییەکی بێزار کە لەسەر زەوی باوباپیرانی لەکوردستانی باشور دەژی کە بەزۆر لکێنراوە بەوڵاتی عێراقەوە, ناوم رەفیق پشدەرییە, بەسەربەرزییەوە شانازی پێوە دەکەم کە لەدایك‌و باوکێکی کوردم, شێوەی زوڵم‌و زۆری سەپێنراو بەسەر رۆڵەکانی کوردستان کەوڵاتی منە, ئەمە وای لێکردووم ٤٥ ساڵی تەمەنم لەکاری سیاسەتدا بەسەربەرم, ئەوەی بینیم لەناخۆشی‌و چەوسانەوە وەك هەموو رۆڵەکانی گەلەکەم, لەوانەیە هەندێکیان بەختیان لەمن باشتر بووبێت لەو ناخۆشییەی کەبینیومە.

بێزاریم لەواقیعی حاڵ لەکوردستان‌و شەڕانگێزی وڵاتانی دراوسێی دەوروبەرمان‌و, رەقی هەڵوێستی وڵاتانی جیهان بەرامبەرمان‌و لەبیرکردنمان لەلایەن مرۆڤایەتییەوە پاڵی پێوەنام کەئەو شتانەی بینیومە لەبارەی بارودۆخی خۆمانەوە کەهەندێ کەس نایزانن‌و کەسانێکیش ناوێرن باسی بکەن بخەمەڕوو، کارم بۆ ئەوە کردووە کەخاڵ بخەمە سەرپیتەکان‌و بەئەمانەتەوە نووسیومە, ئەوەی بەسەرم هاتووەو بینیومە لەپەرتوکێکدا بەناونیشانی (کورد دوژمنی خۆت بناسە) هەتا ئێستا سێ بەشی ئەو پەرتوکەم بەچاپ گەیاندووەو, هێشتا لەتورەکەکەمدا زۆر ماوە, لەوانەیە کەسێك لێم بپرسێ کەچەندم دەستکەوتووە لەدەرکردنی سێ بەشی ئەو پەرتوکە؟

بەڵێ حوکمی سێدارەم بۆ دەرکرا لەلایەن بنەماڵەی بارزانی‌یەوە کەدەستی بەسەر حزبی پارتی دیموکراتی کوردستاندا گرتووە لەکوردستانی باشوور, هەروەها ئەمری رفاندنم بۆ دەرکرا لەلایەن سەدام حوسێنی سەرۆکی عێراقەوە, گومانی تێدانیە کەوڵاتانی دەوروبەر رازی نین لێم, چونکە نووسیومە لەسەریان بەدڵیان نەبووە, بارودۆخی ژیانم گەیشتە ئەو

ڕادەیەی کە لەشاری سلێمانی ژیان بەسەر ببەم لەژێردەسەڵاتی ی.ن.ك بەسەرۆکایەتی بەڕێز جەلال تاڵەبانی. بەڕاستی دەڵێم بەبێ هیچ درۆودەلەسەو ریاکارییەك پرسم بەکەس نەکردووە بۆ دەرکردنی پەرتوکەکانم, هیچ یەکێك لەحزبە کوردستانییەکان دەستی یارمەتی بۆ درێژ نەکردووم, ئەمەو بەڕێز تاڵەبانیو یەکێ لەدامودەستەکەی نەبوونەتە ڕێگر لەبەردەممدا کەخۆی دەسەڵاتی ناوچەکەی بەدەستە, هەرچەندە من لەپەرتوکەکەمدا ناوی بەڕێزیو حزبەکەیم هێناوە, بەلام شێوەی سەربەستی بیرو بۆچوونو چاپکردن بەسەر ناوچەکەدا زاڵە, چەندەها بەڵگە هەیە ئەمە دەسەلمێنێ کەئێستا پەرتوکەکانم لەبازاڕدا خەڵکی دەیخوێننەوەو لەناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی بنەماڵەی بارزانیو چوار ولاتە ناوچەییەکەی دەوروبەری کوردستان, قەدەغەکراوە.

سەبارەت بەقازانجکردنی من لەدەرکردنی ئەم پەرتووکە ئەوەیە یەکەم: ویژدانی خۆم ئاسودەکردووە. دووەم: ڕۆشنکردنەوەی بیری خەڵك بەڵکو نەوەکانی داهاتوومان هەمان هەڵەی ئێمە دووبارە نەکەنەوە. سێیەم: ڕاگەیاندنی ڕاپەڕینێکی ڕۆشنبیری کاربکات بەهەڵکێشانی توندوتیژیو ڕەگداکوتانی خۆشیو ئاشتی بەهاوکاری خوای گەورە.

سەرۆکی بەڕێز, ئەندامانی کۆمەڵە, لێژنەی بەردەوام, تکام وایە زۆری لاپەڕەکانی نامەکەم بێتاقەتتان نەکاتو بگەنە کۆتاییەکەی. لەسەرەتای بلاوبوونەوەی مرۆڤایەتییەوە لەرەچەڵەکی ئادەم دروودی خوای لێبێ مرۆڤایەتی دابەشبووە بەپێی نەتەوەو هۆزایەتی (وجعلناکم شعوبا وقبائل لتعارفوا), هەموو گەلێك بڕوای بەدروستکەر هەیەو سروشتی خۆی, بەلام هەندێك ئاینی ئاسمانی دەگرێتە خۆیو هەندێك کەسیش بتپەرستن, بەگەیەنەرێك لەنێوان خۆیو دروستکەرەکەی دایدەنێ, گەلی کوردستان وەك هەموو گەلێکی بەرز بەپێی مێژوو خۆی خاوەنی پێغەمبەرو پەرتووکە. پێغەمبەرەکەی زەردەشت بوو (د.خ) هەروەها پەرتوکە ئاسمانیەکشی ئاڤێستا بوو کەکۆمەڵێك پەرتوکی پیرۆز بوو. فەرمانی پەرستنی خودای گەورەو دستنیشانکردنی باشەو خراپە کردووە, دەرکەوتنی ئەمەش لەنزیکی ناوەڕاستی سەدەی حەوتی پێش زاین بووە, هەتا داهاتنی قەڵەمڕەوی ئیسلام. ئەمەو قورئان شاهدی بەشەرەفو کەرامەتو بەرەکەتی خاکی کوردستانە, کاتێ نوح (د.خ) دوعای بۆ کرد, کەیەکەم دەرکەوتنی ڕەگەزی مرۆڤایەتییە دوای تۆفان (ربی انزلنی منزلا مبارکا وانت خیر المنزلین)... (فاستوت علی الجودی) ئەمەش یەکێکە لەشاخەکانی کوردستان, هەروەها بەڵگەنامەی باوەڕپێکراو هەیە دەیسەلمێنێ نەتەوەی (ابراهیم خلیل) (د.خ) کەکوردە, لەناوچەی بێتواتە سەر بەقەزای ڕانیە هەندێ شوێنەوار ڕاستی ئەم بەڵگەیە دەسەلمێنن.

لەسەرەتای دەستپێکردنی پەیامی محەمەد (د.خ), لەناو یاوەرەکانیدا کوردیان تێدابوو کەیەکێکیان ناوی (گاوان) بوو کەعەرەب ناویان لێنابوو (جابان)ی کوردی. گەلی کورد لەسەرەتای دەستپێکردنی ئیسلام، ئاینی ئیسلامی لەخۆ نەگرت نە بەخۆشی نە بەزۆرداری. لەو سەردەمەدا ڕابەرایەتی هێزی ئیسلام لەدەستی (سعد ابن ابی وقاص)بوو(ر.خ), بەلام بەرەنگاربوونەوەیەکی بەهێزی ڕووبەڕووبووەوە لەلایەن گەلی کوردەوەو گۆڕستانی هاوەڵەکانی لەدۆڵی سماقوڵیە سەر بەقەزای کۆیە لەکوردستانی عێراقو گۆڕستانی هاوەڵەکانی لەدۆڵی هاوەڵەکان سەر بەقەزای ڕانیە لەکوردستانی عێراقو دۆڵی شەهیدانو چەند جێگایەکیتر. شەڕە گەورەکەی جەلەولا لەکوردستانی عێراق چۆك دانەدانو نەبەزاندنی کوردەکان لەشەڕەکاندا دەیسەلمێنێ کەکورد ٩٨٪ بەبیرو بڕوایەکی تەواوەوە ئاینی ئیسلامیان گرتبووە خۆ. ڕازیبوونیان بەئاینی ئیسلام لەوەوە سەرچاوەی گرت کەباشترەو ڕاسترە. ئەمەش سەپاو نیە بەسەر گەلی کورد بەڵکو لەوێش مەسیحیو یزیدی دەبینرێو هیچ کام لەوانە نکوڵی نەتەوەیەتی کوردی ناکا بەڵکو شانازی پێوە دەکەن. زیندوترین نموونە گوندی

(هرموتە)ی سەر بەقەزای کۆیەیە, خەڵکی مەسیحی تێدایەو خاوەنی چەند شەهیدێکن لەرێگای ئازادی کوردستان. بگرە هەندێ نموونە هەیە لەسەر ئەوەی گەلی کورد خاوەنی مێژوویەکی پرشنگدارە لەمێژووی مرۆڤایەتی. خۆ ئەگەر بێت گەشتێك بەنێو گۆڕستانەکانی وڵاتە عەرەبیەکان بکەین. لەکەم جێگا دەبینین هەندێ گۆڕی کوردی تیانەبێ کەشەهیدی شەڕەکانی بەرزکردنەوەی ئاڵای ئیسلامو پاراستنی ئازادیو یەکرێزی خاکی عەرەبن, بێلێکدانەوەی جیاوازی هەردوو نەتەوەکە, ئەمەش بەهۆی سێ خاڵەوە، یەکەم: ئەگەر ئاینی ئیسلام جێبەجێ بێ, ئەوا وەك ئەمڕۆمان نابێ کەجیاوازی نەتەوایەتی دەبینرێ, بۆ نموونە یەهودیەکان گەورەترین دوژمنن بۆ ئیسلام لەگەڵ ئەوەشدا پێغەمبەر (د.خ) فەرمان دەدا بەپاراستنی مافی هاووڵاتی یەهودیو زاڵ نەبوون بەسەریاندا لەژێردەسەڵاتی ئیسلامدا، دووەم: هاووڵاتی کورد راهاتووە لەگەڵ رێزگرتنی خەڵکی غەریبو یارمەتیدانی لەکاتی پێویستیدا. سێیەم: بەشایەتی نووسەرانی عەرەبو بێگانە هاووڵاتی کوردی تامەزرۆی ئازادیەو دژی زوڵمو کفرو زۆرداری دەبێتەوە, نزیکترین نموونەش (صلاح الدین الایوبی)یە کەکوردە بەڕەگەزو نەتەوە, لەبەرزترین دەسەڵاتدا بیری لەدامەزراندنی ولاتێکی کوردی نەکردەوە بەڵکو هەستا بەسەرخستنی ئیسلامو بەرزی عەرەب, بوو بەدووەم ئازادکەری قودس دوای گەورەمان حەزرەتی عومەری کوری خەتاب(ر.خ). لەگەڵ ئەوەشدا شوێنەوارو روداوی مێژوویی دەیسەلمێنێ کەسەڵاحەدینی ئەیوبی خەڵکی گوندێکی سنوری شاری هەولێرە بەڵام زۆر کەس نەتەوایەتی ئەوە رەتدەکەنەوە.

ئەمەو کورد زۆر لە رۆشنبیرو نووسەرو لێکۆڵەرەوەی هەیە وەك ئەحمەد شوقی, زەهاوی, ئبن خەلەکان, مستەوفی, ئبن صلاح شارەزووری, جعفر المدنی بەرزنجی, عبدالرحمن الکوردی بەڵام هۆکاری دروستنەبوونی وڵاتێکی کوردی یەکگرتوو دەگەڕێتەوە بۆ سادەیی کوردی موسڵمانو تێگەیشتن لەئاین تەنها (جێبەجێکردنی پێنج فەرزەو خوێندنەوەی فقەو شەریعەت)و بەکارنەهێنانی ئاین لەکردارە سیاسییەکان وەك فارسو تورکو عەرەب, کەئەم سێ نەتەوەیە تاوەکو ئێستا ئاین بۆ جێبەجێکردنی دەسەڵاتو دامەزراندنی خۆیان بەکاردەهێنن.

ئاینی ئیسلام رێگای بەزوڵمو چەوساندنەوەی نەتەوەکان نادا, سەبارەت بەنەتەوە هەڵوێستی ئاین ئاشکرایە (لا فرق بین عربی واعجمی الا بالتقوی).

ئەی ئەوانەی ئاڵای ئیسلام بەرز دەگرن لەبرایانی عەرەب, ئایە خوای گەورەو میهرەبان نووسراوێکی ناردووە کەدەستی یارمەتی رانەکێشن بۆ گەلێکی لێقەوماو؟

ئایە نووسراوێکی خوا هەیە بۆ ئینکاری نەکردنی ئەوەی بەئێمە دەکرێ؟

ئایا نوسراوێك هەیە بۆ خۆگێلکردن لەگەلێك کەحەقی خۆیەتی ناوی لێبنرێ گەلێکی ئیسلام؟ راستییەکانیش ئێستا ئەوە دەسەلمێنن. گوندێکی کورد هەرچەندە دانیشتوانی کەم بێت مزگەوتی لێیە بۆ نوێژکردن, وەڵامیش هەمیشە نە... هەر خواش گەورەیە.

هەڵوێستی وڵاتانی ئەوروپا بەرامبەر نەتەوەی کورد دوژمنکاری پێوە دیارە. هەرچەندە لەدوای جەنگی جیهانی دووەم کێشەی کورد بەرز دەرکەوتو بڕیاردرا بەدامەزراندنی وڵاتێکی کوردی کەپایتەختەکەی موسڵ یان ئورفە بێ, بەڵام لەبەرژەوەندی بەریتانیاو فرنسا, فایلی کوردیان داخست, هەروەها لینین دەستێکی تەواوی هەبوو لەگەڵ مستەفا کەمال ئەتاتورك کەرێککەوتن لەسەر دانەمەزراندنی وڵاتێکی کوردیو مبالەغە ناکەم کەدوژمنکارییان وەك دەستورێك وابوو بۆمان. دەشبێ بەرژەوەندی تایبەتیی خۆیان بێ, یا وەك هەندێك دەڵێن دوژمنایەتی ئەوروپا بۆ کورد لەسەر ئەوەیە کەصلاح الدین پێیانی کرد لەشەڕی خاچپەرستەکان. ئەوروپا هەڵوێستێکی مێژوویی خراپی هەبووە بۆ رێگەگرتن لەدامەزراندنی وڵاتێکی

کوردی. لە ١٩١٩/٥/٢٣ شێخ مەحمود هەوڵیدا بۆ چەسپاندنی دەوڵەتێکی کوردی, بەڵام لە ١٩٢٠/٦/١٧ کاتێ بەریتانییەکان ویستیان حکومەتی عێراق دامەزرێنن دوای لەناوبردنی حکومەتی شێخ مەحمودی نەمر، کوردستانی باشوریان لکاند بەوڵاتی عێراقەوە. بۆ ئەمەش دوو مەبەستی سەرەکیان هەبوو، یەکەم: دۆزینەوەی هاوسەنگی لەنێوان سوننەو شیعە, چونکە شیعە زۆرینەن لەعەرەبەکانی عێراق، دووەم: هەڵگیرساندنی نائارامیو نەهێشتنی سەقامگیری لەناوچەکەو هاتنە ژوورەوەیان بۆ ناوچەکە لەکاتی پێویست لەپێناو بەرژەوەندییە تایبەتییەکان لەسەروو بەرژەوەندییە گشتییەکان.

لەدوای دامەزراندنی حکومەتی عێراق بەماوەیەکی کەم, عێراقو ئێرانو تورکیا رێککەوتن لەسەر دانانی پرۆگرامێك بۆ لەناوبردنی بزوتنەوە نەتەوەییە کوردییەکان لەهەر جێگایەك هەن. لەڕاستیشدا دەرکەوت هەرچەندە وڵاتانی ناوچەکە ناکۆك بن لەنێوان خۆیاندا بەڵام

رێککەوتون لەسەر لەناوبردنی شۆڕشەکانی کورد, لەهەر جێگایەك سەرهەڵبدات.

لەمیانەی پێشبڕکێی لەناوبردنی نەتەوەی کورد, عێراق دراوسێکانی پێشدایەوەو دەستیکرد بەدڕندەیی کەپێشبینی ناکرێ.. بەڵێ.. رژێمە عێراقییە یەك لەدوای یەکەکان, کەمتەرخەمییان نەکرد لە لەناوبردنی گەل, بەڵام لەدوای کودەتاکەی حزبی بەعس لە١٩٦٨/٧/١٧ ئەشکەنجەدانو لەناوبردن گەشەی سەند لەعێراقدا کەرژێمی عێراق توانی بێسڵکردن ٤ هەزار گوندو بکاتو دەرکردنیان لەناوچەو شارە گەورەکان وەك ناوچەی قەڵادزێ, هەروەها بۆردومانکردنی هەندێ شار بەگازی کیمیاوی وەك هەڵەبجەو لەسەرتاشدا دەرکردنی هەزاران کورد بۆ ئێران بەبیانووی ئەوەی فەیلینو مافی نیشتەجێبوونیان نیە لەسەر خاکی عێراق. لەوکاتەشدا ویستم بکەومە نێوان ئەو رووداوەوە لەلای بەعسییەکان چونکە ئەو کاتە جێگای متمانەیان بووم بەڵام وەڵامیان ئەوەبوو بۆم کەئەوانە(فەیلییەکان) زۆربەیان (بازاڕی شۆرجە)ی ناودار بەڕێوەدەبەنو ئێمەش پێویستمان بەکەلوپەلەکانیانە, دواتریش هەموو کەلوپەلەکانیان دەستی بەسەرداگیرا. دواتر دەستکرا بەرووداوی ئەنفالی بەدناوو, دوا تاوانی سەدام بەرامبەر گەلی کورد گۆڕینی ناوی گوندە کوردییەکان بوو. لەقەزای مخمور ناوی گوندی سەرگەڕان نزیك کەندێناوەی گۆڕی بەقدس, بەبۆچوونی خۆی بەم کارەی گەلی فەلەستینی خەڵاتکردەوە.

باشە بۆ یەکێك لەگوندەکانی باکوری هەڵنەبژارد یا بۆچی گوندی (عوجە) بۆ نموونە یان تکریت. هەروەها لەشاری کەرکوك هەستا بە گۆڕینی زۆر لە گوندەکان بەناوی گوندەکانی فەلەستین وەك حەیفا, یافا, تل ئەبیب. گەلیش بێزارەو هاوار دەکاو جوابیش نیە.

مەبەستی هەموو ئەمانەش پاکتاوکردنی نەتەوەی کوردە, لەگەڵ ئەوەشدا برا موسڵمانەکانمان لەجیهانو بەتایبەتی لەوڵاتە عەرەبییەکاندا کەمتەرخەمن لەکێشەکەمانو بێدەنگی دەمی داخستوون, ئەوەی زیاتر مایەی پێکەنینە ئەوەیە دەبینین دۆن کیشۆت (سەدام حسین) خۆی بە پاڵەوانی سەردەم دەزانێت بۆ رزگارکردنی عەرەب لەچنگی دوژمنکاری زایۆنیزم, دەبینین لاوان لەپایتەختی وڵاتە عەرەبییەکان ئەوانەی بەرژەوەندی خۆیانیان نەدەزانی, خۆپیشاندانیان دەکردو هاواریان بەپاڵەوانی نەتەوەی عەرەبدا دەکردو بەڕۆڵەی (جەمال عبدولناصر)ی کۆچکردو و وەچەی (کوڕی خەتاب)یان دادەنا.

بەڵام رۆژگار هاتو سەدام حسین کارێکی گێلانەی کردو کوێتی داگیرکردو ئەو میرنشینەی کرد بەپارێزگایەکی تری سەر بەعێراق بەناوی گەڕانەوەی لق بۆ بنچینە, ئەمەش لە ١٩٩٠/٨/٢, علی حسن مجیدی تاوانباریشی کرد بەحاکمی عورفیی ئەو شارە (کوێت)و لای خۆیەوە وڵاتانی کەنداو کە بەملیارەهایان پێشکەش بەبەعسییەکانی عێراق کرد کاتێك جەنگیان دژی ئێران هەڵگیرساند.

ئێستا وێنەکە ئاشکرابوو, دێوە مەزنەکە رووی دزێوی دەرکەوتو گەلی کوێت باجەکەیاندا, دەرکەوت کەسەرکردەی خاوەن هەڵوێستو شەریف سەدام حسین کەجەنگی دژ بەکورد بەرپاکرد بۆ پاراستنی ئاسایشو ئاشتی نەبوو هەروەك خۆی بەتوندی بالۆرەی بۆ دەکرد, ولاتە عەرەبییەکان بێئاگابوون, ئێوەی دەسەلاتدارانی عەرەب کەئەژدیهاکەتان بەپارەی خۆتان گەورە کردو ئەوکاتەش کەبرسی بوو, بەئێوەیداو هەڵیلوشین.

سەرجەم سەرکردەکانی ولاتە عەرەبییەکان داکۆکییان لەسەدام کردو چاوپۆشییان لەتاوانکارییەکانی کرد بەرانبەر گەلی کورد, جگە لەسەرکردە معمر قەزافی نەبێت کەدەستپێشخەری کردو داکۆکی لەمافەکانی کورد کرد لەزیاتر لەشوێنێکدا, کە بەدەیەها جار دەژمێردرێت, لەوانە لە ١٩٧٩/١٠/١ کاتێك لەکۆنگرەی بەنغازی لەلیبیا, پاڵپشتیو هاوکاری خۆی بۆ کورد دەربڕی لەوتارێکدا کەتیایدا هاتبوو: (مافی کوردەکانە کە حکومەتێکی کوردی پێکبێنن).

بەلام سەبارەت بەسەرکردەکانی عەرەب, نازانم بۆچی ناوی کورد نایەتە سەر زمانیان, تەنانەت رێکخراوە ئیسلامییەکانی وەك ئیخوانی موسلمین, کوانێ پیاوانی ئاینی ناسراو کەگوتارو وانەو گفتوگۆکانیان سەبارەت بەئاین تەلەفزیۆنو رادیۆکانی پڕکردووە, بەلام بێدەنگبوون بەرانبەر مەینەتییەکانی گەلی کوردی موسڵمان وەك بێدەنگی گۆڕستانەکانە, خوا لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت (غلبت الروم في ادنى الارض وهم من بعد غلبهم سيغلبون في بضع سنين لله الأمر من قبل ومن بعد يومئذ يفرح المؤمنون) پێویست بەروونکردنەوەی ئایەتەکە ناکات, بەلام دەمەوێت ئەوە بیربخەمەوە کەپێغەمبەرو هاوەڵەکانی کەپێشڕەوی ئێمەن, نیگەران بوون بەسەرکەوتنی فارسە بتپەرستەکان بەسەر رۆمانیەکانی خاوەن کتێب, هەر بۆیە دوعایان کرد بۆ رۆمەکان کەسەرکەون بەسەر فارسە ئاگرپەرستەکاندا لەوکاتەدا, لەگەڵ ئەوەشدا کەرۆمەکان لەسەر ئاینێکیتر بوون بەلام هەرخۆشحاڵبون.

ئەی ئەهلی ئیسلامو قورئان, ئایا صەدامی دیکتاتۆر لەبتپەرستەکان درندەتر نیيە, ئایا ئێمە نزیکترنین لەخاوەن کتێبەکان, بۆچی کار بەسوننەتی پێغەمبەر ناکەنو پاڵپشتمان ناکەن بۆ سەرکەوتن بەسەر زوڵمو ستەمدا, باپیرەی ئێمە صلاح الدین پێشڕەوی ئێوەی کرد بۆ سەرکەوتنو ئێوەش ژێردەستەبوون, دە ئێوەش پاڵپشتمان بن لەکاتی سەرفرازیتاندا.

من بانگەشە بۆ جەنگ ناکەم کەخەڵك بێننە سەر شەقامەکان بۆ خۆپیشاندان. کۆمەڵی ولاتانی عەرەبی چ زەرەر دەکات کاتێك ئیدانەی خوێنڕشتنی نەتەوەی کورد بکاتو دژی پاکتاوکردنی کوردان بێت لەلایەن دوژمنانی نەتەوەی عەرەبەوە.

بەڕێزان: یارمەتیم بدەن بۆ بەرزکردنەوەی ئالایەك کە بەجیهانی نیشاندەینو لەسەری بنووسین وریابن لەمێژوو.. مێژوو رەحم بەکەس ناکات. پاش شۆڕشی ساڵی ١٩٥٨, جڵەوی دەسەلات بەدەست عەرەبەوە بوو, سەرۆکی عێراقی ئەو کاتە عبدلسلام عارف لەشەستەکاندا, بەدەنگی بەرز بەخەڵکی گوت, بنچینەی کورد عەرەبن, بەهۆی ژیانیان لەشاخەکان زمانیان گۆڕاوەو وشەکانیان شێوازیتری وەرگرتووە لەعەرەبییەوە بۆ ئەو شێوەیەی ئێستا لەسەرین, پاشان هانی جەلادەکانیدا بۆ سەر خەڵکی کوردستانو گوتی (ماڵەکانیان حەلاڵی ئێوە بێو سەریشیان بۆ ئێمە) لەکاتی خۆیشیدا کەسێك ئیدانەی ئەو کردارەی نەکرد جگە لەخوالێخۆشبوو محسن الحکیم کەتەنها ئیدانەکەری عەرەب بوو.

لەکاتی دامەزراندنی سوپای فەلەستین لەسەردەمی سەرۆکی عێراقی عبدالکریم قاسم بەناوی رزگارکردنی قودس یەکەم سوپا کەدامەزرا بەشدارییانکرد لەهێرشکردن بۆ سەر خاکی کودستانو لەناوبردنی خەڵکەکەی وەك دانەوەی چاکەی صلاح الدینی باپیرمان. هەروەها سوپای عەرەبی سوری بەرابەرایەتی فهد الشاعر بەشداریکرد بۆ لەناوبردنی بزووتنەوەی کوردو

خەڵکەکەی، لەبیریان چوو چاکەی صلاح الدینی باپیرمانو چاکەی میوانداری سورییەکان. لەگەڵ ئەوەشدا سەرۆکی کۆچکردوو حافظ الاسد بۆ سەرکردەی کورد عبدالله ئۆجەلان جێگای شانازی سەرجەمی گەلی کورد بوو کەتەنها سەرۆکێکی کورد میوانداری سەرۆکێکی ئۆپۆزسیۆنی کورد بکات. بەڵام کۆتایی ئەو لەخۆگرتنە نەگەیشتە ئەنجام کاتێ بەپلانێکی داڕێژراو لەلایەن CIAو موسادو میتی تورکیو موخابەراتی سووری، عبدالله ئۆج ئالان تەسلیم بەمیتی تورکی کراو ئەنجامەکەشی ئەوەیە کەئەمڕۆ دەبینین.

ئێمە نەپشتمان هەیەو نە دراوسێیەکی باش بەمەبەستی فێربوونمان بەوشەی چاك بەڵام داخی گەل درێژەی نابێ.

لەکاتی داگیرکردنی جەزائیر لەلایەن فەرنساوە هەرچەندە فەرەنسا خاوەنی دەسەڵاتو

توانا بوو بەڵام رازیبوو سەربەخۆیی بەگەلی جەزائیر ببەخشێ, تەنها لەبەرئەوەی جەزائیر

رازینەبوو بەسەربەخۆیی نەبێ, ئەوەبو دیگۆل وەڵامی داواکانی گەلی جەزائیری دایەوەو دەستی لێان هەڵگرت. ئەگەر بێت راپرسی لەناو ٣ ملیۆن کوردی سوریاو ٧ ملیۆن کوردی عێراق بکەین دەبینین ٩٥٪ی داوای جیابوونەوەو سەربەخۆییو دامەزراندنی حکومەتی کوردی دەکەن, چونکە سەردەمی خودموختاری بەسەرچوو هەرچەندە کەسیش نەیبینی.

سەرۆکی بەڕێز.. بەڕێزان سەرکردەی وڵاتە عەرەبیەکان...

سوپاس بۆ ئێوە لەسەر ئەوەی کردتان بەهەڵوێستی دڵتان نەك بەکردەوە. بەڵام هەمووتان دەزانن کێشەکەمان لەسەر شانۆی گەڕانە بەدوای چاکسازی لەئەوروپا, دەردەکەوێت وڵاتانی بازاڕی ئەوروپا بڕیاری گرتنەخۆی کێشەی کوردیان داوەو بەڵکو ئەم جارەیان نیەتیان راست بێتو حەزبکەن بەچارەسەری ئەم کێشەیە...

ئەی سەرکردەکانی وڵاتە عەرەبییەکان, گازەندەتان بەرامبەر گەلی کورد سەردانەکەی سەرۆکی بزووتنەوەی کورد، کۆچکردوو مەلامستەفا بارزانیە بۆ ئیسرائیل کە لەبەشی سێیەمی کتێبەکەم (کورد دوژمنی خۆت بناسە) ئاماژەم بەدوو سەردانی بۆ ئیسرائیل کردووەو بەشداری تەکنیکییەکان لەسوپای ئیسرائیل بەشەڕکردن بەرامبەر سوپای عێراق شانبەشانی هێزەکانی بارزانی. لەکاتی سەرۆکایەتی عبدالسلام عارف سەرۆکی وڵاتی عێراق کۆبوونەوەیەك لەقاهیرە بەسترا بەئامادەبوونی هەردوو سەرکردە, کۆچکردوو جەمال عبدالناصرو بەڕێز جەلال تاڵەبانی سکرتێری ئێستای یەکێتیی نیشتمانیو بەڕێز فواد عارف کەسایەتیی ناسراوی کورد, هەرسێ لا گەڕان بەدوای کۆتایی هێنان بەکێشەی کورد بەئاشتی لەگەڵ وڵاتی عێراقدا.

لەکۆتایی کۆبوونەوەکەدا مامۆستا جەلال تاڵەبانی رایگەیاند کەهەڵوێستی سەرۆکی مسر باشبوو, لەراستیشدا هیچ باشێکمان نەبینی. دەڵێم دەبوایە سەرۆك عبدالناصر بەخۆی بکەوتایەتە ناو کێشەکەو لەگەڵ نوێنەرانی کورد بگەڕایەتەوە بۆ چاوپێکەوتن لەگەڵ عبدالسلام عارفو بەچارەسەرکردنی کێشەی کورد رازیبکردایە چونکە ئەو کاتە قسەو رای سەرۆك عبدالناصر کاریگەری گەورەی هەبووە لەسەر سەرۆکەکانی وڵاتە عەرەبیەکان.

هەرچەندە بەڕێزی سۆزی هەبووە بەرامبەر گەلی کورد بەڵام خاوەنی هەڵوێستی سەرەتاو کۆتایی لەنێوان سەرۆکەکانی وڵاتانی عەرەبی سەرۆکی بەڕێز معمر قەزافیە, فایلی مێژووی کورد لەشەستەکاندا دووپاتی دەکاتەوە کەچارەسەری کێشەی کورد لەدەستی گەورەکانی وڵاتی عەرەبی بووە. بەڵام تا ئەمڕۆ هیچ هەڵوێستێك دەرنەکەوت بۆ کۆتاییهێنان بەکێشەی بەگەلێکی چەوساوەو زوڵم لێکراو کە نە چارەسەری هەیەو نە هێز.

تێڕوانینمان بەرامبەر گەلی فەلەستینو گەلی باسك.

گەلی فەلەستین خاوەنی پشتێکی گەورەو ئەستووره گەرچی بەجدی دەرنەکەوتووەو گەلی باسك رۆشنبیری لەدراوسێی ئەوروپیەکانی فێردەبێ.

لەبەشی سێیەمی پەرتوکەکەم ئاماژەم بەبنەچەی بنەماڵەی بارزانی کردووە کەعەرەبن‌و خواش دەزانێ لەچ جێگایەکی دورگەی عەرەبیەوە هاتوە. ئەمەش زانیارییەکە هەتا بارزانیش نەیدەزانی..! ئەویش بوو بەشداریکرد لەگەڵ دڕندە سەدام حسێن‌و محەمەد رەزاشا بەفەرمانی C I A بۆ شکستهێنانی شۆڕشی کورد لەساڵی ١٩٧٥ کەئەمەش خیانەتێکی گەورەبوو, دوابەدوای ئەویش بەڕێز مەسعود بارزانی خیانەتێکی گەورەتر لەوەی باوکی ئەنجامدا کە لە ١٩٩٦/٨/٣١ چاوساغی سوپای عێراقی کرد بۆ سەرخاکی کوردستانی ئازادو تەنها منو چەند کەسانێك نین ئەو مێژووە لەبەربکەن‌و بینووسن بەڵکو راستییەکان دەدوێن‌و مێژووش دەنووسێ.

هەلۆێستی مامۆستای بەئەمەكو بەڕێز ئەحمەد حەمروش‌و هاوەڵەکانی ناکێشرێ بەئاڵتون کەکۆشش دەکەن بۆچارەسەرکردنی کێشەی کوردو قەرزاری کەسیش نین لەوانەی هەلۆێستیان نیە.

بەلام هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ (وذكر ان نفعت الذكرى), تکام لەخوای گەورەیە روناکی بخاتە دڵتانەوەو بەچاوی خۆشەویستی‌و سۆزەوە سەیری ئەم گەلە بکەن‌وسەیری ئەم گەلە بکەن کاربکەن بۆ ئەوەی دەستتان هەبێ لەرزگارکردنی ئەم گەلە(من يعمل مثقال ذرة خيرا يره).

هاوپێچ, نامەیەك بۆ بەڕێز کولن پاول‌و نامەیەك بۆ بەڕێز تۆنی بلێرو نامەیەك بۆ سەرۆکانی

وڵاتانی بازاڕی ئەوروپی هاوبەش نامەیەکی زمانی ئینگلیزی کورتکراوە بۆ هەرسێ بەشی کتێبەکەم, خوا هیدایەتم بداتو تەنها خواش خۆی بەتوانایە.

لەکۆتاییشدا داوای لێبوردن دەکەم گەر بێت‌و سنورم بەزاندبێ لەنووسینەکەمدا, بەلام

(اللهم انى بلغت, اللهم فأشهد)، ئەمەو سلاوم بۆ سەرجەم برایانی عەرەب لەهەر کوێ هەن, ئەوانەی داکۆکی لەمافەکانی کورد دەکەن لەژێر سێبەری نەتەوەی عەرەب (سوریاو عێراق) بەتایبەتی سەرۆك معمر قەزافی.

لەکۆتاییدا لەگەڵ سلاو خۆشەویستیم

**خزمەتکاری کوردو هاوڕێی عەرەب**

**رەفیق پشدەری**

**سلێمانی-عێراق**

فاکسی مەکتەب دیلان (٠٠٤٤٢٠٧٧١٣٨٨١٢)

## نامەی نۆهەم
## نهێنی و زۆر تایبەت

### بەناوی خوای گەورەی میهرەبان

**بەڕێز سەدام حسەین/ سەرۆکی دەوڵەتی عێراق**

دوای ڕێزو سڵاو

ئەمە ئامۆژگارینامەیە نەك هەڕەشەنامە" بیرخەرەوەیە نەك تەمبێ, کەخزمەتکاری گەلی کوردو کوردستان، ڕەفیق پشدەری بۆ سەرۆکی دەوڵەتێکی دەنێرێ ڕاست وایە بگوترێ گەندەڵی ئیداری لێکیهەڵوەشاندو لەڕووخاندایە, تەنها خواش چارەنووسی ئەم گەلە داماوە دەزانێ.

سەرۆکی ڕێزدار: بڕواناکەم لەبیرت چووبێتەوە کەتا مێژوویەکی نزیك متمانەی نێوان منو تۆ سەد دەر سەدبوو, تەنانەت جارێکیان دوای مشتومڕێکمان تۆ فەرمووت: (منو تۆ لێکتر دەچین, من لەبنەماڵەیەکی دەوڵەمەند نیم کەچی توانیم بەخۆم, خۆم پێبگەیەنم, جەنابیشت هەروەها... هەردەڵێی لەباوکو دایکێك بووین). ئینجا لەشوێنی خۆت هەڵسایتو ئەملاوئەولامت ماچکرد... بەڵام ماشەڵا چەرخی گەردوون چۆن دەسووڕێ! زەمانە تێپەڕیو برایەتیمان وەرگەڕایە دوژمنایەتی, ئەوەبوو دووجار هەوڵمدا بتکوژم بەڵام دەستم تێت نەچوو. دوای ئەوە جەلادەکانت بەدڕندانەترین شێوە ئەشکەنجەیاندام هەتا هەستمکرد مەرگ دەستی لەملم ناوە بەڵام لەدواساتدا تۆ فەرمانتدا ئەشکەنجەدانم ڕاگرنو برینەکانم چارەسەربکەن, پاشان کاتێك سەرۆکایەتیی دەوڵەتت گرتەدەست فەرمانی لەسێدارەدانمت هەڵوەشاندەوەو لەزیندان ئازادت کردم هەرچەندە یەکێك لەو تۆمەتانەی پێی تاوانبارکرابووم سیخوڕیکردن بوو بۆ ئیسرائیلو ئێران... من لەلای خۆمەوە شوکرانەبژێری خودای گەورەم کەدەستمی بەخوێنت سورنەکردو ڕێگەی لەتۆش گرت کەبمکوژی, کەئەمە تەنها بۆ ئەوە بوو بۆ ئەم ڕۆژەم بێڵێتەوە تائەم نامەیەت بۆ بنووسم بەشکو ببێتە مایەی خێروخۆشی بۆ گەلی عێراق بەگشتیو گەلی کورد بەتایبەتی... کەسیش نازانێ ڕۆژگار چی بۆمان ناوەتەوە, بەڵام: (اللهم انی بلغت, اللهم فأشهد) ...

بەڕێز سەرۆك

دەمەوێ بەکورتی ئەو ڕووداونەی بەسەر کوردستانی باشوردا هاتوون بخەمە خزمەتت" لەدامەزرانی حکومەتی مەلیك مەحمودەوە هەرچەندە بەزۆری پێم وایە کەبەڕێزتان ئاگاداری بەسەرهاتەکانی کوردستانن, بەڵام سەرباریشی دەمەوێ هەندێ مەسەلەتان بیر بخەمەوە ...

ڕووداوەکانم بەسەر نۆ بەشدا قۆناغبەندی کردوە کەئەمانەن:

١- حکومەتی بەریتانیا پلانی بۆ ڕووخاندنی حکومەتی مەلیك مەحمود داڕشتو ڕووخاندی, دوای ئەوەی دەستگیریشی کرد بۆ دەرەوەی وڵاتی دوورخستەوەو پاشان کوردستانی باشوری بەزۆر خستەسەر دەوڵەتی عێراق.

٢- گەلی کورد ٣٦ ساڵ ژێردەستەی دەسەڵاتی پاشایی بوو, هەرچەندە کێشەکەمان لەکارنامەی دیپلۆماسیدا نەبوو بەڵام ئەو دەسەڵاتە مافی هاوڵاتی عەرەبی عێراقی پێبەخشینو لەئەنجامدا دەرگاکانمان لەڕوودا کرانەوە, بۆ نمونە کورد چەندین

جار پۆستی سەرۆك وەزیران, وەزیری بەرگری, وەزیری ناوخۆو سوپاسالاری عێراقی گرتەدەستو, لەکۆی ١٤ پارێزگاکەی ئەو سەردەمە ١١ پارێزگاریان کوردبوون. لەسەردەمی پاشایەتیدا" پارێزگارو سەرۆکی دادگاو بەڕێوەبەری پۆلیسو بەڕێوەبەری شارەوانیو بەڕێوەبەری فەرمانگەی سەربازگیری لەکەرکوك کوردبوون،٩٥٪ی هێزی پۆلیسو ٧٥٪ی هێزی سەربازی فیرقەی دوو ٨٥٪ی دانیشتوانی پارێزگاکە کوردبوونو ١٥٪ـەکەیتر تورکمان بوون. گۆڕستانی کەرکوك دیارترین شایەدە کەتا ئەو کاتە یەك مردووی عەرەب لەوێ نەنێژراوە.

٣- دوای ڕاگەیاندنی پرنسیپی (کوردو عەرەب لەم نیشتمانەدا بەشدارن) لەلایەن سەرکردەی کۆچکردوو عەبدولکەریم قاسمەوە لەسەروبەندی شۆڕشی ١٤ی تەمموزی ١٩٥٨دا, باری کورد باشتربوو چونکە ڕێگەی پێدرا حزبایەتی بکات, ئەوەبوو پارتی دیموکراتی کوردستان بەسەرۆکایەتیی مەلامستەفای بارزان ڕاگەیەنرا ئینجا ڕۆژنامەیەكو دوو گۆڤاری کوردی دەرکرا. گەلی کورد چاوەڕێی کاری باشتری لەسەرۆك قاسم دەکرد بەلام مەلامستەفا بەهۆی خۆسەپاندنی بەسەر پارتیدا بەپاڵپشتی مەکتەبی سیاسی, هەموو ئاواتەکانی لەگۆڕنا.

٤- کودەتای ساڵی ١٩٦٣ بەعسییەکانی بەشەمەندەفەری ئەمریکی کردە دەسەڵاتدار, ئینجا بەیاننامەی ژمارە ١٣یان دەرکرد کە بەبێ سڵکردنەوە ڕێگەی بەکوشتنی کۆمۆنیستەکان دەدا, هەریەکە لەبەڕێزان عەبدولسەلام عارفو ئەحمەد حەسەن ئەلبەکرو سەدام حسەین لەچۆنیەتی لەناوبردنی نەتەوەی کورددا هاودەنگ بوون, بەڵام ڕێڕەوی سەرۆك عەبدولڕەحمان عارف جیاوازبوو کەهەوڵیداو بەکردەوە تێکۆشا کەکێشەی کوردی بەیەکجاری چارەسەربکات، بەڵام جەنەڕاڵەکانی سوپای عێراق بەسەرکردایەتیی تاوانبار عەبدولڕەزاق نایف بەرگیری جێبەجێکردنی ئەو هەنگاوەیان لێکرد.

ئێوە بۆ پاکتاوکردنی گەلی کوردو لەناوبردنی ڕەگەزەکەمان دەستتان نەپاراست, ئێوە تەعریب, تەبعیس, ئەنفال, زیندەبەچاڵکردن, بەناپاڵمو کیمیایی بۆمببارانکردن, لەسێدارەدان و لەناوبردنی ١٨٢ هەزار کوردتان جێبەجێکرد, ڕێبازەکان یەکبوون ئامانجیش هەر یەك بوو, بەڵام وریابە: ڕۆژان ڕۆژی بەدوودا دێتو ستەمکار هەر گیرۆدە دەبێت.

٥- دوای ئەوەی سوپای عێراق, کوێتی داگیرکرد ئەمریکا سەرکردایەتیی سوپایەکی ئەوروپی کردو جەنگێکی وێرانکەری دژی عێراق بەرپاکرد کەهاوسەنگییەکانی تێکداو لەئەنجامدا لەکوردستان ڕاپەڕین کراو ئەو بارە هاتەدی کەکورد لە٨٠ ساڵەوە چاوەڕێی دەکرد, ئەوەبوو سوپای عێراق لەماوەی چەند هەفتەیەکدا وەك تەمی بەر خۆر هەڵبرینگاو دەنگوباسی کوردستان بوو بەوێردی سەرزاری هەموو جیهان.

٦- کۆچوڕەوی ٣ ملیۆن کورد بەرەو سنورەکانی ئێرانو تورکیا کاریگەری خۆی نواندو کەناڵەکانی دەنگوباس بڵاویانکردەوە, جیهان شتی وای بەخۆیەوە نەدیبوو, هەڵاتنی کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان لەترسی زۆرداریی بەعس وایکرد کەهێڵی پانی ٣٦ دیاریبکرێتو چەند هێزێکی هاوپەیمانان لەبنکەی ئەنچەرلیکی تورکیا جێگیربن. ئەم هەلومەرجە ئەمنییە بوو بەمایەی ڕاگەیاندنی هەڵبژاردنو دامەزراندنی پەرلەمانی کوردیو دواجار پێکهێنانی حکومەتی کوردی.

٧- پاوانکردنی دەسەڵات لەلایەن حزبە کوردییەکانو دەستگرتن بەسەر داهاتەکانی خالی ئیبراهیم خەلیل وایکرد پارەوپولی زۆر کۆبێتەوەو ئەمەش لەئەنجامدا بوو بەمایەی لەبیرچوونەوەی کێشەی کوردو چارەنووسی گەلی کورد, ئەوەبوو ئاگری ئاژاوە هەڵگیرساو شەڕی ناوخۆ لەنێوان حزبە کوردییەکاندا بەرپابوو.

٨- لە٣١ی ئابی ١٩٩٦دا نەگبەتییە گەورەکە ڕوویداو پەردە لەرووی دوژمنی ڕاستەقینەی کورد هەڵماڵرا ئەویش کاتێك مەسعود بارزانی کردەوەیەکی ئەنجامدا هیچ خائینێك جگە لەئەو" پرکێشی نەکردوە بیکات, ئەوەش هێنانی سوپای عێراق بوو بەفەرماندەیی (قصی) بۆ داگیرکردنی کوردستانی ئازاد.

گەورەم ئەی سەرۆك: ڕووداوەکانی ئەم ساڵانەی دوایی‌و گۆڕانکاریی ناوچەکە کاریکیانکرد هاوڵاتی کورد بیرێکی دروستی لەلا گەڵاڵە بێت‌و بیروباوەڕە چەوتەکانی ڕاستبکاتەوە. جا ئەگەر ئەم کتێبەم" ١٥ ساڵ لەمەوبەر بڵاوبکردایەوە خەڵکی بەر هێلکەو تەماتەیان دەدام.

هەرچەندە سەر بەهیچ حزب‌و لایەنێك نیم و دان بەهیچ دەسەڵاتێکدا نانێم هەروەها پشت بەعەشیرەت یا ماڵ‌و سامانێك نابەستم, بەڵام توانیم کتێبی (کورد دوژمنی خۆت بناسە) بەسێ بەرگ دەربکەم. دیارە هۆی ئەوەی کەخەڵکی بەپەرۆشەوە ڕوویان لەکتێبەکەم کردو بەنهێنی بڵاوبوونەوەی لەهەموو لایەکداو لەژێر دەسەڵاتی بنەماڵەی بارزانیداو, بەئاشکرا لەسایەی دەسەڵاتی یەکێتیی نیشتمانی‌و لەچاپدانەوەی لەئەورووپاو میسرو گەیشتنی کتێبەکەم بەدەستی هەموو کەسێك لەوانەی پەرۆشی زانینی ڕاستیەکانن نیشانەی سێ شتە, یەکەم: ڕەزامەندی خودا, هەروەکو پێغەمبەر (د.خ) فەرموویەتی (اعظم الجهاد کلمة حق عند سلطان جائر), دووەم: چەندیەتیی وشیاربوونەوەی خەڵکی جگەلەوەی گەل بەهێزترین پاڵپشتە مرۆڤ پشتی پێ ببەستێت. بۆ ئاگاداری بەڕێزیشتان تێچوی لەچاپدانی کتێبەکەم‌و بژێوی خۆم‌و خێزانم لەسەر پیاوچاکانی نانبدەو نیشتمانپەروەرە, سێیەم: یەکێتیی نیشتمانیی کەهەڵوێستی وای هەیە هەندێك کەس قێزیان لێدێتەوە بەڵام ئازادی چاپەمەنی‌و دەربڕینی بیرورا بەشێوەیەك ناوچەی دەسەڵاتەکەی

گرتۆتەوە مەگەر تەنها وڵاتانی ئەسکەندناڤیا ئازادی وایان بەخۆیانەوە بینیوە.

دوای ٨٠ ساڵ لەکۆیلایەتی, ڕاپەڕین کراو گەل ئازادی بەدەستهێنا هەرچەندە ئەو ئازادییە ئەوە نەبوو کەخەڵك ئاواتی بۆ خواستبوو بەڵام گەل ئەوەی بەلاوە پەسەندترە لەسایەی بنەماڵەی بارزانیدا بژی" بەهەموو ستەمکاری‌و هەڵوێستێکی نابەجێیان کەدژی پێکهێنانی دەسەڵاتێکی کوردییە, نەك لەسایەی بەعسدا بژی کەزیندەبەچاڵ بکرێت‌و لەناوببرێت. مەبەستم ئەوەیە لەوانەیە پیاوەکانت بیری گەڕانەوە بۆ کوردستان‌و سەرلەنوێ داگیرکردنەوەیت بەگوێدا بدەن. بەڵام وریابە, بڕوات بێت تەنانەت خاك‌و خۆڵی کوردستانیش تۆی ناوێت, بەرواڵەت فریو نەخۆیت. ئێستا ١١ ساڵ بەسەر ڕاپەڕیندا تێپەڕیوە, نەوەیەکی نوێ پێگەیشتووە کەئەوەندەی قسەوباسی دەربارەی زەبروزەنگ‌و زۆرداریی سایەی بەعس بیستووە کە بەلای بیرکردنەوە لەرازیبوون بەزاڵدەستیی بەعسدا ناچێت, چونکە ساڵانێکی زۆر: کردەی ئێمەو بردەی ئێوەبوو.

گەورەم سەرۆك: لەوانەیە لەهۆی نووسینی ئەم نامەیەم لەدوای ئەو هەموو ساڵەو لەم بارودۆخەدا بپرسیت.. جا ماوەیەکە ڕادیۆو کەناڵەکانی سەتەلایت, هەواڵی سەرکۆماری پێشووی یۆگسلاڤیا — سلۆبۆدان میلۆسۆڤیچ بڵاودەکەنەوە کەئێستا لەزینداندایە لەلایەن دادگای تاوانەکانی جەنگ لەلاهای, لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا دەکرێت.

سیاسەتمەداران جەختدەکەن لەسەر تیاچوونت, بەڕێزیشتان چاك دەزانن کەدوژمنانت لەساڵی ١٩٩١ەوە بۆت لەبۆسەدان‌و پلان بۆ دەستگیرکردنت دادەڕێژن. بەم بۆنەیەوە من ئەم شایەدییە دەدەم کەجارێکیان لەگەشتێکدا بۆ وڵاتانی کەنداو, ئاگادارم کردیت کەنەچیت, چونکە پلانێك بۆ دەستگیرکردنت لەکاتی گەشتەکەدا دانراوە, لەوەڵامدا گوتت: (کاك ڕەفیق, من ئەوەندە نەوێر نیم کەبەو ئاسانییە خۆم بەدەستەوە بدەم). ئینجا چەکێکی ئەوەندەی قوتوولکەیەك لەگیرفانی پانتۆڵەکەت دەرهێناو فیشەکێکی گەورەت لێدەرکردو گوتت: (پێش ئەوەی بهێڵم بەئاواتیان بگەن, ئابەم فیشەکە خۆم دەکوژم).

دەزانم بەڕێزت ئەوەندە نەوێرو بوودەڵە نیت, بەڵام بڕواش ناکەم ئەمجارە بەخۆکوشتن ڕزگارت بێت, چونکە دوژمنەکەت زۆرزانترەو بارودۆخیش گۆڕاوە.. تەواو لەو باوەڕەشدام کەڕۆژێك دادێت, دەبیستین سەرۆك سەدام حسینی سەرکۆماری

عێراق, دەستگیرکراوەو دراوە بەدادگای تاوانەکانی جەنگ. خۆ لەوانەیە بەڕێز سلۆبۆدان بتوانێت داکۆکی لەخۆی بکات یان خەلکێك بۆ پشتگیرکردنی, خۆپیشاندان ساز بکەن, بەلام تۆ بەهۆی تاوانەکانت بۆ لەناوبردنی گەلی کورد کە لەسالی ١٩٦٣وە جێبەجێیان دەکەیت, هیچ بەهانەیەك فریات ناکەوێتو برواش ناکەم گوێت لەدەنگی یەکێك بێت لەشەقامەکاندا پشتگیریت بکات.

هەفتەیەکە سەر دێنمو سەر دەبەم هەتا ئەم پرسیارە بەمێشکمداهات: ئێمە, بەپێی ئەزموونی چەند سالەمان لەگەل سەرۆکە یەك لەدوای یەکەکانی عێراق, بڕوا ناکەین فەرمانڕەوایەکی دادپەروەر لەعێراقدا ببینین, خۆ ئەگەر بارودۆخیش ئەمەی رەخساندو خوا سەرکردەیەکی دادپەروەری بۆمان نارد ئەوە دوژمنایەتیی رەگداکوتاوی نێوان عەرەبی عێراقو کورد, هێشتا بەو ئاسانییە لەبیرناچێتەوە.. ئەگەر بێتو ئەم مەسەلەیەش پشتگوێ بخەین ئەوە بنەمالەی بارزانی ملۆزممانە, چونکە هەرکاتێك بارودۆخی عێراق تێکچوو, ئەوان هاوکاریی حوکمی نوێ دەکەنو دەسەلاتی خۆیان بەسەر ناوچەکەدا دەسەپێنن, بۆچی؟ لەبەرئەوەی مەحالە بنەمالەی بارزانی, لەگەل یەکێتیی نیشتمانیی کوردستاندا رێکبکەوێت, جگەلەوەی ئێمە تەواو لەو باوەڕەداین کەکورد, بەهۆی بنەمالەی بارزانی یەکناگرنو ئێمە دلنیاین, هەروەها ئەزموونی چەند سالەمان سەلماندی کەبنەمالەی بارزانی, هەرکە بۆی هەلکەوێت، جارێکیتر مەرگەساتی ٣١ی ئابی ١٩٩٦, لەگەل سوپای دەسەلاتی نوێی عێراقدا جێبەجێ دەکات, ئیتر ئەو دەسەلاتە هەرچییەك بێت!

لێرەدا ولائی مەلامستەفا بارزانی بۆ شای ئێران بەبیری بەڕێزت دێنمەوە.. شای ئێران دوای ئەوەی رووخاندیان, مەلامستەفا دەستبەجێ لێی هەلگەڕایەوەو وەلائی بۆ بەڕێز ئایەتوللا خۆمەینی نواند کاتێك لەئەمریکاوە تەلەفۆنی بۆ کردو ئامادەیی خۆی دەربڕی بۆ قوربانیدان لەپێناو بەرژەوەندیی کۆماری ئیسلامی. جا لەبەرئەوەی گیا لەسەر بنجی خۆی دەڕوێتەوە, ئەوە جووتە کوڕی بارزانی, مەسعوودو ئدریس, ئەو وەسیەتەیان جێبەجێکردو شار بەشارو شاخ بەشاخ, پێش سوپای کۆماری ئیسلامی کەوتن, سەرقافلەچیی ئەم خیانەتکارییەش بەڕێز فرەنسۆ حەریری بوو کە لەشاری شنۆ سەرکردایەتیی چەکدارە بارزانییەکانی کرد بۆ داگیرکردنی کوردستانو دایەدەست کۆماری ئیسلامی.

بۆیە بەوپەڕی قایلییەوە دەلێم: ئایا کورد, لەپرۆسەی گۆڕینی رژێمی بەعس لەعیراق،

یا گۆڕینی سەدام بەفلانیتر, چی دەستدەکەوێت؟ مەگەر سەندنەوەی تۆلەی ئەوانەی بەعس رۆلەکانی لەسێدارەدران یا خانوویان رووخێنرا, یا ئەشکەنجەدران یا ئاوارەکران..

سیاسەتی دەولەتە عەرەبییەکانو بیروبۆچوونی سەرکردەکانیان (جگە لەسەرۆك قەزافی), بەرهەلستیکردنی بیری پێکهێنانی قەوارەیەکی کوردییە. سیاسەتی دەولەتە ئەورووپییەکانیش بەهەمان شێوەیە, هەموان دژی پێکهێنانی دەولەتی کوردین, تەنانەت حزبە کوردییەکانش جاروبار گوێمان لەلێپرسراوێکیان دەبێت کەتەواو دژی دابەشکردنی عێراقو پێکهێنانی دەولەتێکی کوردییە.

بەڕێز سەرکۆماری عێراق: ئێستا منو بەڕێزت, لەم بارەماندا لەیەك خالدا بەشدارین.. جا لەوەتەی هەرسێ بەرگی کتێبەکەم دەرکردووە, مەترسی لەسەر ژیانمە. ئینجا لەکاتێکدا ئێستاو تۆزێکیتر تیادەچم, کەچی داوای پێکهێنانی دەولەتی کوردی دەکەمو بەشێوەیەك بانگەشەی بۆ دەکەم کەتەواو لەو باوەڕەدام بەئامانج دەگەم. بەڕێزیشت چنگت لەدەسەلات گیرکردووە هەولدەدەیت کۆلەکەکانی حوکمت قایمتر بکەیت تا نەیارەکانت جەزرەبە بدەیت, لەناکاو ئاژانسی دەنگوباسی عێراق هەوالێك بلاودەکاتەوە کە: کاتژمێر ئەوەندەی فلان رۆژ بەڕێزتان وتارێکی گرنگ پێشکەشدەکەن. لەکاتژمێری دیاریکراویشدا, بەڕێزتان رایدەگەیەنن کەحکومەتی عێراق بڕیداوە دان بەتەواوی مافەکانی شیعە لەباشوورو

کورد لەباکووردا بنێت, هەروەها عێراق بۆ سێ حکومەتی هاوبەشو هاوکار لەسایەی سستەمێکی فیدراڵ دابەش بکات: حکومەتی شیعە لەباشوور, حکومەتی سوننە لەناوەڕاستو حکومەتی کوردی لەباکوردا. ئینجا رایدەگەیەنیت کەهێزە سەربازییەکانت, دەمودەست لەکوردستان دەکشێنەوەو دەچنە شاخی حەمرین, هەروەها خاکی کورد لەو عەرەبانە چۆڵ دەکرێت کە لە١٩٥٨/٧/١٤ـەوە بۆ ئەوێ راگوێزراون, بەڵام سوپای عێراقی, کوردستان وا چۆڵ ناکات کەبیداتەدەست حزبە سیاسییە کوردییەکان بەڵکو بۆ ماوەی دوو ساڵ دەدرێتە دەست UN هەتا وادەی هەڵبژاردنێکی ئازاد دێت.. ئەمجارەش کورد فێربووە چۆن نوێنەرەکانی خۆی هەڵبژێرێت. دوای ئەمەش میلیشیاکان چەك دەکرێنو هەرچی ماڵو سامانێك کەبنەماڵەی بارزانی بەتاڵانی بردووە, کە بەزیاتر لەدوو ملیار دۆلار (لەوانەشە من بەکەمترم دانابێت) دەیخەملێنم, لێیان بسەنرێتەوە.

جا ئەم بەیاننامەیە کەئینشائەڵڵا دەریدەکەیت, دەبێت هەتا دواسات نهێنی بێت, چونکە جگە لەگەلی عێراق, هیچ دەوڵەتێك لەجیهاندا, لەگەڵ ئەم بیرەدا نییە" جێبەجێکردنی ئەم پرۆژە مەزنەش لەلایەن بەڕێزتانەوە ئەم ئەنجامانەی لێدەکەوێتەوە:

١- دوای چارەسەرکردنی کێشەی سەرەکیی ناوخۆی عێراق کەئەویش مەسەلەی شیعەو کوردە, دەوڵەتانی دراوسێو ناوچەکە, هەروەها دوژمنانی خودی صدام حسین بەهانەیان نامێنێت کەببنە مەترسی بۆ سەر حکومەتی نوێی عێراق.

٢- UNو جیهان چیتر بەهانەیان نامێنێت کەصەدام حسەین بەتاوانباری جەنگ بژمێرن, ئینجا بارەکە دەگۆڕێتو صەدام دەبێت بەپاڵەوانی ئازادیو بەدیهێنەری ئاشتی.

٣- تۆ (لەدوای سەرۆکی کۆچکردوو جەمال عەبدولناسر), بەهۆی بەدەستهێنانی بڕواو پشتگیریی ٩٩٪ی گەل, دەبیت بەتاکە سەرکردەی ریزی سەرکردەکانی دەوڵەتە عەرەبییەکان کەئەمەش هاوسەنگیی نێوان ئەو سەرکردانە تێکدەدات.

٤- تۆ دەبیتە فاکتەری بەهێز بۆ گۆڕینی نەخشەی ناوچەکە. لەوانەشە CIA بەکرێگیراوێکی لەناوچەکەدا وەك (جەنەراڵەکانی تورکیا) بۆ بەرپاکردنی جەنگ دژی عێراق تەرخان بکات بەڵام هیچیان بۆ ناکرێت, چونکە هیچی وایان بەدەستەوە نییە تا یەك کەس بەرەوابوونی ئەم جەنگەیان قایل بکەن, ئەمە جگە لەوەی ئەوسا دەوڵەتانی دراوسێ, کە لەزەبری عێراق دەترسان, چونکە هێزەکەی لەچەکدابوو, ئەمجارە جگە لەوەی لەبری بەسەربازکردنی چەند سەد هەزار یاخود ملیۆنێك کەس, ئەمجارە گەلی عێراق بە٢١ ملیۆنەکەیەوە دەبن بەسەربازی دڵسۆزو دلێر لەسایەی ئاڵای عێراقی ئازادو سەربەرزدا.

لێرەدا نابێت شیعەی ئێرانو سوریاو لوبنانو جیهان لەبیر بکەین کە بەهەموویانەوە پشتگیریی سەدام حسەینی دۆستی گەل, بەدیهێنەری ئاشتیو پاڵەوانی چاونەترس دەکەن.

٥- کوردو شیعە ئەو نەهامەتییانەیان لەبیردەچێتەوە کە بەسەریانتدا هێناوە، ئنجا وێنەت لەهەموو ماڵێكو بەسنگی هەموو عێراقیو کوردو شیعەیەکدا دەبینرێت لەهەرکوێ بێت.

٦- دەبیت بەیەکەم سەرکردەی خۆشەویست لەهەموو جیهاندا لەلای ئازایخوازو ئاشتیخوازو مرۆڤدۆستان.

ساڵی ١٩٨١ لەلەندەن، بەرنامەی پانۆرامای بەشی عەرەبی ئیزگەی BBC دیدارێکیان لەگەڵمدا سازدا، بێژەرێکیان لێمی پرسی: (ئەگەر سەدام حسەین دان بەمافی کورددا بنێتو داواکانتان بێنێتەدی، هەڵوێستت چی دەبێت؟) گوتم: (دەستبەجێ دەستی ماچ دەکەم).

هەموویان بەم وەڵامە دڵخۆش بوونو چەند وێنەیەکیان بۆم گرت، چونکە بەم وەڵامە بۆم سەلماندن کەئێمە، بۆیە دژایەتیی سەدام دەکەین چونکە ئەو دژایەتیی گەلی کورد دەکات، کاتێکیش ئەو دەبێتە پاڵەوانی ئازادیو ئاشتی، ئیتر پێویست ناکات ئێمە دژایەتیی بکەین، بەڵکو من بەخۆم، بەشانازییەوە بۆ دەستنوێژ, ئاو بەدەستیدا دەکەم.

بەڕێز سەرۆك: بۆ زیاتر روونکردنەوەی هەڵوێستم دەڵێم: ئامانجی بەروداوم پێکهێنانی قەوارەی کوردییە. جا لەدوای دەرکردنی هەرسێ بەرگی کتێبەکەم، نامەم بۆ کۆڵن پاوەڵ، تۆنی بلێر، عەمرۆ مووساو بازاڕی ئەورووپیی هاوبەش نارد، بیرم لەوەکردەوە کەپێش ئەوەی یەکێك لەپیاوەکانت نامەکەت بۆ بێنێت، خۆم بەفاکس یان لەرێگەیەکی ترەوە بینێرم. بۆ زانیاریشت، دوانامە کەناردوومە لە ٢٠٠١/٦/٢٦دا بوو پێش دادگاییکردنی سلۆبۆدان، دوای ئەوە بیرم لەم نامەیە بۆ تۆ کردەوەو دەستمکرد بەنووسینی. هەرگیز بیر لەوەش نەکەیتەوە رستەیەکم بەوە لێکبدەیتەوە گوایە داوای لێبوردن دەکەم، مەسەلەکە بازرگانییە، بەڵام بەشێوەیەکیتر، ئاڵوگۆڕی بەرژەوەندییە (ئازادم بکە، کەسبم دەکەیت)، بەشێتیشم تێنەگەیت کەداوای ئەم شتە گەورەیەت لێدەکەم کەجێبەجێی بکەیت، ئەوەی لەسەر بەڕێزتە ئەوەیە بەوردی بیری لێبکەیتەوەو راستیی مەسەلەکان لەبەرچاو بگریتو نامەکەم بەشێنەیی بخوێنیتەوە، ئنجا بەسەربازێکی نەناسراوم بژمێرە کەهاوار بۆ سەرۆکی دەوڵەتێك دەباتو رێنمایی دەکات لەپێناوخێرو خۆشیی تەواوی نەتەوەیەك، ئەوسا منیش لەرۆژی قیامەتدا لای پەروەردگار پاکانە بۆ خۆم دەکەمو دەڵێم: اللهم انی بلغت، الله فاشهد.

تێبینی: زۆر هەوڵمدا ئەم نامەیە دەستاودەست بگاتە لای بەڕێزت بۆ ئەوەی لەموخابەراتی جیهانیی بپارێزم، بەڵام کەسم دەستنەکەوت، ئەمەم بۆ بکات. ناچاربووم لەرێی ئەو ئیمێڵەوە بینێرم کە لەکەناڵی ئاسمانیی عێراقی دەستمکەوت بەو هیوایەی هەتا بەردەستی موخابەراتی جیهان نەکەوتووە، بگاتە دەستی بەڕێزت.

**کۆی گشتی ٢٣لا پەڕە**

**دۆستی هەموو عەرەبو ئازادیخوازێك**
**خزمەتکاری کوردو کوردستان**
**رەفیق پشدەری**

Email:Rawaz-Sadiq.@hotmail.com
**لەویشەوە بۆ رەفیق پشدەری** ( ٢٠٠١/٧/١٨ )

## نامەی دەهەم

### بۆ هەموو کوردێکی نیشتمانپەروەر

بۆ هەموو کوردێکی نیشتمانپەروەری دانیشتووی هەندەران، ئەوانەی بەتەنگ کەسوکارو هاوزمانەکانیانن لەکوردستانی باشوور، بەتایبەتی بەرێزان:

**د. کەمال میراودەلی**

**د. جەمال نەبەز**

**د. نەجمەدین کەریم**

**پرۆفیسۆر ئەسعەد خەیلانی**

**د. مەحموود عەلی عوسمان**

**مامۆستا جەمال عەلەمدار**

بەرێزان : سەرەتا تکادەکەم خۆشەویستیو رێزی زۆرم قبوولْ بفەرموون، هیوادارم لەشساغو خۆشحالْ بنو گیانی کوردایەتیتان هەر لەجۆش‌وخرۆشدا بێت.

خوشکو برا کوردەکانم لەهەندەران، بەتایبەت ئەو بەڕێزانەی لەسەرەوە ناوم هێناون: من لەڕێی هەرسێ بەرگی کتێبەکەم (کورد دوژمنی خۆت بناسە)، زۆر لایەنی شاراوەو نهێنیی شۆڕشی رزگاریخوازی گەلەکەمانم ئاکشراکردو، گەلەکەمانم لەچەندین راستی ئاگادارکردەوە، بەو هیوایەی بتوانم خزمەتێکی بزاڤی رزگاریخوازی گەلەکەمان بکەمو لەدواجاردا خەباتی نەپساوەمان لەو قەیرانە دەربکەین کەتێی کەوتووە.

بەڕێزان: ئێوە دەزانن کەگەورەترین رێگر لەبەردەم بەئاکام گەیشتنی سەرجەم شۆڕشەکانمان, بوونی دوژمنی ناوخۆیە کەبەردەوام هۆی سەرەکی شکستەکانمانو لەمپەری رێی دروستبوونی دەوڵەتی کوردی بووە هەروەکو لەهەرسێ بەرگی کتێبەکەمدا جەختم لەسەر کردووەو سەلماندوومە کەدوژمنی ناوخۆی هەرەگەورەو نەیاری سەرسەختی شۆڕش، بنەماڵەی بارزانی بووە کەئێستاش لەسەر هەمان سیاسەتی دژە کوردی خۆیان، لەپێناو بەرژەوەندییە تایبەتییەکانیان گاڵتە بەموقەدەراتی گەلەکەمان دەکەن.ئەم بنەماڵەیە وەکو جاڵجاڵۆکە، بەجۆرێك تۆری دەسەلاتی خۆیان دامەزراندووە مەگەر بەهۆی نەتەوە یەکگرتووەکانو لەڕێی خودی بەڕێز کوفی ئەنانەوە رزگارمان بێت، هەر بۆ هەمان مەبەست لەکتێبەکەمدا نامەیەکم ئاڕاستەی بەڕێزیان کردووە کەپێشتر لەرێی فاکسەوە بەزمانی ئینگلیزی گەیاندمە لای جەنابیان.

بەڕێزان، ئەی ئەو کوردپەروەرانەی لەهەندەرانو ژمارەتان زیاتر لە٢٠٠ هەزار کوردە، ئەی ئەوانەی درێغیتان نەکردووە لەکۆمەککردنی کەسوکارتان لەکوردستانی ئازیزدا، بەتایبەتی ناوبراوانی سەرەوە: ئەمڕۆ بارودۆخی کوردستانی باشوورو رەوتی رووداوەکان، ئەو ئەرکەتان دەخاتە ئەستۆ کەهەریەکەتان لەئاست خۆیەوە کار بۆ سەرخستنی ئەوپێشنیارە بکات کە لەراستیدا داخوازیی سەرجەم گەلی کوردە لەباشوور، کەئەمڕۆ لەترسی کوژرانو دەسەلاتی بنەماڵە، ناوێرن لەپرۆژەیەکی وادا بەشداری بکەن، ئەگەرنا ئەوە من دڵنیام کەلانی کەم ٩٥٪ی گەلی کورد لەگەڵ ئەو داوایەدایەو هیوا بۆ ئەو رۆژە دەخوازێت کە لەواقیعدا جێبەجێ بێت.

لەکۆتاییدا هیوادارمو داوام ئەوەیە کەهەمووتان لەگەڵ ئێمەدا دەستبەکاربن بۆ ئەم مەبەستە، کەتاکە رێگەی رزگاربوونمانە لەکارەساتەکانی ئەمڕۆو هەرەشەکانی سبەینێ.

**خزمەتکاری کوردو کوردستان**

**رەفیق پشدەری**

ئەوانیش توندوتیژیو پرۆسەی چەوساندنەوەو سەرکوتکردنی گەلانی خۆیان بەگشتیو لەدژی گەلی کورد بەتایبەتی پیادەکرد. جا هەروەکو لەبەشەکانی کتێبەکەم ( کورد دوژمنی خۆت بناسە)دا باسمکردووە، ململانێو ناکۆکی لەنێوان ئەم دەوڵەتانە هەرچەند توند بێت بەڵام لەئاست لەناوبردنی گەلی کورددا کۆك و تەبان، ئەگەر پەیوەندیی دیپلۆماسی لەنێوانیشیاندا بپچڕێت یان ئاڵوگۆڕی بازرگانییان نەمێنێت ئەوە ئاڵوگۆڕی زانیاریو داهێنانی ڕێوشوێنی تایبەت و تاقیکردنەوەی نوێ بۆ لەناوبردنی گەلی کوردو سەرکوتکردنی شۆڕشو بزوتنەوەکانی، هەمیشە لەبرەودایەو ڕێگەی هاتوچۆکردنی یەکتریان لێناگرێت...

مرۆڤ بەچی مرۆڤە؟ یا ئەوەیە لەخواو لێپرسینەوەی ڕۆژی دوایی دەترسێت، یا لەسزای یاسایەکی دادپەوەر یا لەشەرعێکی مرۆیی دەترسێت کەئەقڵێکی هۆشمەند دایڕشتووە وەکو یاساکانی حەمورابی لەسەردەمی کۆندا، یان بڕیارەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان یان کۆمەڵگەیەکی هاوچەرخ گەلاڵەی کردووە.

ئەم یاساوڕێسایانە بەری ڕێگە لەمرۆڤ دەگرن کەکاری خراپ و دژوار نەکات... بەڵام چاوەڕێی چی لەکەسانێك دەکەیت کەوڵاتێك بەڕێوەدەبەن و دەزگای موخابەراتیان لەژێردەستدایە بەڵام خۆیان بڕوایان بەخواو کتێبە ئاسمانییەکان نییە؟ کەسانێك دەستی دادو یاسا پێیان ڕاناگات و کەسیش نازانێت ڕەچەڵەك و بنەچەیان چییەو ئەو فێرگەیەی تەواویانکردووە نەڕووناکی بەخۆیەوە بینوە نەفریشتە چۆتە ناوی...دیارە دڕندەییو بێبەزەیییایەتیو زۆروستەم، خەسڵەتی دیاری ئەم جۆرە کەسانە دەبێت.

بەکورتی، مافی هاووڵاتیبوونی کورد لەهەرلایەکی خاك و نیشتمانی خۆیدا بێت پارێزراو نییە، چونکە بەهاووڵاتیی پلە دوو لەقەڵەم دەدرێت و دەبێت لەبۆتەی نەتەوەی تورك یان فارس یان عەرەبدا بتوێتەوە تابژی، خۆ ئەگەر لەوەندە زیاتری ویست ئەوە دەبێت خاك و شەرەفی خۆی بفرۆشێت و ببێت بەسیخوڕ... ئەمەش سەرەتای لەناوچوونیەتی. خۆئەگەر کوردێکی سەربەرزرو نیشتمانپەروەرێکی پاك بێت ئەوە زیندان و ئەشکەنجەدان و دەردیسەری لەپێشیەتی.

ڕێگەچارەی سێیەم هەڵاتنە بۆ هەندەران، بۆ دەرەوەی وڵات تاکەمێك لەمافەکانی مرۆڤ دەستبکەوێت، ئەمەش ئەگەر خوا بۆی ڕێکخست و لەدەریا نەخنکا یان بەگوللەی پۆلیسی سەر سنوورە نێودەوڵەتییەکان نەکوژرا، ئنجا کەدەستگیردەکرێت بەنابووتی سنووڕداش دەکرێتەوە، ئەم هەڵاتنەش تەنها لەتوانای خەڵکی پارەدارە...

خوێنەری خۆشەویست:

باپێکەوە لاپەڕەکانی مێژوو هەڵبدەینەوەو شتێك دەربارەی مێژووی خەباتی نەپساوەی گەلی کوردستان بزانین.

مێژوونووسان، زۆر بەدەگمەن" دەشتوانم بەدڵنیاییەوە بڵێم تائێستا

باسی تێکشکانێکی سەربازییان تۆمارنەکردووە کەبووبێتە مایەی ڕووخان یان لەدەستدانی دەسەڵاتێکی کوردی، یان باسی هەوڵێکی کوردییان کردبێت بۆ ڕزگاربوون لەزۆروستەمی گەلانی

دراوسێ لەنزیکەی(٢٠٠٠)ساڵ لەمەوبەرەوە، واتە لەو رۆژەوە کەحکومەتی میدیای کوردی رووخاوە. هەموو ئەو نسکۆیانەی هاتوونەتە رێگەمان و بوون بەهۆی زیان پێگەیاندن و تێکشکانی سیاسیمان هەروەها لەدەستچوونی چەندین هەلی زێڕین بۆ سەربەخۆییمان و بنیاتنانی ئیدارەیەکی کوردی" هەموو ئەمانە لەسۆنگەی فاکتەری سیاسی بوون.

بۆ سەلماندنی راستیی ئەو رووداوانە باسی دو لەشکرکێشی سەربازی دێنمەوە کە لەمێژوودا کراونەتە سەر کوردستان و سەرچاوە مێژووییەکان باسیانکردووە. یەکەمیان لەشکرکێشییەکەی ئەسکەندەری مەکدۆنییە کەمێژوونووسان نەبەردیی گەلی کوردیان لەبەرنگاریکردنی سوپای ئەسکەندەری مەکدۆنی تۆمارکردووە کاتێك ئەوهێزانە بۆ گەیشتن بەخاکی ئیمپراتۆریەتی فارس، بەکوردستاندا تێپەڕبون و چۆن ئەسکەندەری مەکدۆنیو سوپا زەبەلاحەکەی تووشی زەرەروزیانێکی گەورەی ماڵیو گیانی بوون لەسەردەستی شەڕڤانانی کورد ئەوەش هەر لەسۆنگەی ئەوەی کەکورد نەیویستووە سوپایەکی داگیرکەر بەخاکیاندا گوزەربکات با نیازیشی نەبووبێت زیانیان پێبگەیەنێت. بۆ کوردیش ئەوەندە شانازییەی بەسە کەسەرکردەیەکی بەناوبانگی یۆنانی وەکو ئەسکەندەری مەکدۆنی، لەیادداشتەکانیدا بەبوێریو قارەمانیی گەلی کوردستاندا هەڵبدات.

لەشکرکێشیی دووەم لەسەردەمی فتووحاتی ئیسلامیدابوو بەسەرکردایەتیی یاوەری پایەبەرز سەعد کوڕی ئەبو وەقاص (ر.خ) کەئەویش رووبەڕووی بەرگریکردنێکی توندی وەها بۆوە کە شەڕەکانیدا دژی گەلانی تر، نەیدیبوو.

شایەنی باسە کەگەلی کورد لەبەرئەوە نەبوو نەهاتە ریزی ئیسلام کەلەبەردەم سوپای ئیسلامدا تێکشکابێت یاخود لێی ترسابێت، چونکە چەندین گۆڕی یاوەرانی پێغەمبەر (د.خ) لەخاکی کوردستاندا هەن کەنیشانەی ئازایەتیی کوردن و بەڵگەی شەڕکردنیانە دژی سوپای ئیسلام، شەڕی جەلەولا لەکوردستانی عێراقدا دیارترین بەڵگەی ئەو بەرەنگاریکردنەیە، بەڵکو کورد لەباوەڕی تەواوی بەوەی کەئاینی ئیسلام ئاینێکی تەواوی بێکەموکوڕییە، بوو بەئیسلام. لەم بارەیەوە کتێبە پەیوەندارەکانی مێژووی ئیسلام ئاماژە بەوە دەدەن کەوەفدێکی کورد بەسەرۆکایەتیی (جابان ـ گاوان) ی کورد سەردانی خودی پێغەمبەری کردووەو ئیسلامبوونی خۆی و گەلی کوردی لەحزووری پێغەمبەری خوادا راگەیاندووە ئەمەش پێش ئەوەی فتووحاتی ئیسلامی دەست پێبکەن.

لێرەدا مەبەستم ئەوەیە کە تائێستا فاکتەری سیاسی، هۆکاری سەرەکیبوو بۆ پێکنەهێنانی قەوارەی کوردی نەك فاکتەری سەربازی. دەبینین کاریگەرترین چەکێك کەئیمپراتۆریەتی فارس و ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لەدژی کورد بەکاریان هێنابێت سیاسەتی (پەرت بکە ـ زاڵ بە)بوو. بەدرێژایی ٥٠٠ ساڵی فەرمانڕەوایی عوسمانییەکان، ئەمانە بەردەوام و بەهەمو رێگەیەك هەوڵیاندا میرنشینە کوردییەکان لەناوبەرن، ئەوەش یان لەرێی تواندنەوەی ئەو میرنشینانە لەناو ئاینی ئیسلامدا وەك دەوڵەتێکی ئیسلامی کەسەرۆکەکەی خەلیفەی پێغەمبەری خوایەو دیارە بەگوێکردنی خەلیفە ئەرکی سەرشانەو ملنەدان بۆ فەرمانەکانی گومڕایی (ضلالة) یە، کەئەمەش خۆی لەخۆیدا جۆرە گومڕاییکردنێکە

شۆڤێنیسته عەرەبەکان و هەندێك لەوانەی لەئیسلام تێنەگەیشتوون و بەئیسلامییە توندڕەوەکان دەناسرێن، پێڕەویدەکەن. ئاینی ئیسلام و پێغەمبەری خوا لەم جۆرە کردەوانە بەرین، دیارترین نموونەش بۆ ئەمە یاوەری ڕێزداری پێغەمبەر، سەلمانی فارسییە(ر.خ). جا هەرچەندە پێغەمبەری خوا(د.خ) دەیگوت: ( سەلمان سەر بەئالی بەیتە)، بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا هەمیشە بە (سەلمانی فارسی) ناوی دەبرد، واتە پێغەمبەری خوا، نکوولّی لەڕەگەزی فارسیی یاوەرەکەی نەدەکرد. زۆر نموونەی تریش لەم بارەیەوە هەیە.

شایەنی باسە کەسادەوساکاریی مرۆڤی کوردو پابەندبوونی بەئاینی ئیسلامەوە، هەرچەندە تەواویش لێی حاڵی نەبووە، ئەمە ڕێگەی بۆ فارس و تورك خۆشکرد کەکورد بۆ مەبەستی خۆیان بەکاربێنن. دەبینین ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، سوننەی کوردی هاندەدا لەشیعەی کورد بدەن. ئەم ململانێ‌و شەڕو پێکدانانە ناکۆکی زۆرو توندیان لەنێوان میرنشینە کوردەکان دروستکردو وایانکرد خوێن بکەوێتە نێوانیان، کەجاروباریش لەبری فاکتەری مەزهەبی ئاینی، فاکتەری تەماع بەکاردەهێنراو زۆربەی شەڕی نێوان فارس و تورك، کورد لەپێشی پێشەوەی سوپای شەڕکەردابوونە.

دوای جەنگی یەکەمی جیهانی‌و تێکشکانی ئەڵمانیا بەرامبەر هێزی هاوپەیمانانی ئەوسەردەمە، ویستی خوا وابوو کەدڵی دەوڵەتە هاوپەیمانەکان نەرم بێت بۆ پێکهێنانی دەوڵەتی گەورەی کوردی کەپایتەختەکەی یا شاری(ئورفە) بێت لەتورکیا، یان شاری مووسڵ. ئەو دەوڵەتە کوردییەی کەتۆبۆگرافیاو دیمۆگرافیاو جلوبەرگ و زمانی دانیشتوانەکەی هەروەها مێژووەکەی" هەموو ئەمانە لەبەردەم خوا شأیەدی دەدەن کە لەگەڵ و ولأتانی دەوروبەری جیاوازەو خاوەنی مافێکی پێشێلکراوەو تەنها پێویستی بەدانپیانێکە هیچیتر.

بەلاّم بەریتانیاو فەرەنساو ئەمریکا، لەپێناو بەرژەوەندییە تایبەتییەکانیان، لەبڕیاریان سەبارەت بەپێکهێنانی دەوڵەتی کوردی پەشیمان بوونەوەو پرۆژەکەیان بەجارێك هەڵوەشاندەوەو دەستیانکرد بەپشتگیریکردنی مستەفا کەمال ئەتاتورك بۆ دامەزراندنی کۆماری تورکیاو ڕووبەڕووی کورد وەستان. تەنانەت سەرکردەی شۆڕشی بەڵشەفی‌و دامەزرێنەری پارتی کۆمۆنیستی یەکێتیی سۆڤێتی جاران، لینین، پشتگیریی پێکهێنانی دەوڵەتێکی کوردی نەکردو پشتی مستەفا کەمال ئەتاتورکی گرت و لەسەرکوتکردنی گەلی کورددا هاوکارییکرد. بەمەش بلۆکی سۆشیالیست، دەستی خستە ناو دەستی بلۆکی سەرمایەداری ئەورووپی‌و هێزی سەربازیی ئەمریکییەوە بۆ فرۆشتنی گەلی کورد لەبازاڕی بەرژەوەندییە سیاسییەکاندا بە کۆیلەسێنی تورك و فارس‌و عەرەب و ...ئەوەیان پشتگوێ خست کەژمارەی گەلی کورد لە٤٠ ملیۆن کەس زیاترە.

لەراستیشدا چەندیەتی‌و چۆنایەتیی بەرژەوەندیی دەوڵەتە هاوپەیمانەکان بۆ ڕێگەگرتن لەپێکهێنانی دەوڵەتی کوردی‌و بەرەنگاریکردنی پرۆژەکە، هەرچییەك و هەر چۆنێك بووبێت ئەوە ناگاتە گەورەیی ئەو تاوان و مەرگەساتەی بەسەر گەلی کوردیان هێنا لەهەشتا ساڵ لەمەوبەرەوە هەتا ئەمڕۆ. لەو بڕوایەشدام کەئێستا ئەوان هەستیان بەهاوکێشەو لێکدانەوە هەڵەکانیان کردووە، زیاد لەوەش دەتوانم سوێند بخۆم

کەدامەزراندنی دەوڵەتی کوردی لەسەروبەندی دوای جەنگی یەکەمی جیهانی ڕۆڵی سەرەکیی دەبوو بۆ سەقامگیرکردنی ئاشتی لەناوچەکەدا چونکە تەنها دەسەلأت و قەوارەی کوردییە کەدەتوانێت بەر لەو نەتەوەو گەلانەی دراوسێ بگرێت کە ئاژەوەگێڕن و ئارەزووی بلأوکردنەوەی تیرۆریان هەیە لەجیهاندا.

لە۱۹۱۹/٥/۲۳ دا مەلیکی کوردستان شێخ مەحموودی حەفید هەوڵیدەدا دەوڵەتێك بۆ کورد دامەزرێنێت، بەلأم کاتێك بەریتانییەکان پلانیان بۆ پێکهێنانی حکومەتی نوێی عێراق دارِشت، لە۷/حوزەیران/۱۹۲۰دا بزوتنەوەی کوردییان بەسەرۆکایەتیی شێخ مەحموود لەناوبردو کوردستانی باشووریان بەدەوڵەتی تازە پێکهێنراوی عێراق لکاندو گەلی کوردیان بەدەسەلأتی نوێی عێراق فرۆشت بەبێ‌ئەوەی پرس بەگەلی کوردستان بکەن کەئایا بەم بەکۆیلەکردنەی گەل و خاکی کوردان، رازی‌دەبن یان نەء؟

بێگومان کۆیلە پرسیار ناکات... ئەوەندەی هەیە دەفرۆشرێت و دەکڕدرێت...جا دەوڵەتە هاوپەیمانەکان بەم شێوەیە مامەڵەیان لەگەڵ گەلی کورددا کرد، پرسیارەکەش لێرەدا ئەمەیە: بۆچی ئەوها کوردیان هەڵسەنگاند؟. ئایا ئەو دەوڵەتە زلهێزانە، لەسەر بەکۆیلەکردنی گەلان راهاتوون یاخود چی؟

بەریتانیا دوای ئەوەی بڕیاریدا دەوڵەتی عێراق دامەزرێنێت لێنەگەڕا هیچ جۆرە کۆسپێك بەری ڕێی ئەو پرۆژەیەی بگرێت. لێرەدا حکومەتی کوردیی شێخ مەحموودی حەفید لەسلێمانی، کۆسپی بەر ڕێگەی ئەو پرۆژەیە بوو. ئیتر شەڕ لەنێوان سوپای نیزامیی ئینگلیزو هێزی عەشایەری کوردی بەسەرکردایەتیی شێخ مەحموود لەدەربەندی بازیان دەستی پێکردو لەئەنجامدا، بەهۆی نابەرابەریی هێز، هێزەکانی شێخ مەحموود دوای قوربانیدانێکی زۆر، تێکشکان و شێخی قارەمان دوای بەرەنگاریکردنێکی پاڵەوانانە، بەبرینداری لەپاڵ تاشەبەردێکدا دەستگیرکرا کەئەمڕۆ ئەو بەردە بە( بەردە قارەمان) ناوی دەرکردووەو بەئاسەوارێکی پیرۆزی مێژوویی دەژمێردرێت. پاش ئەوە مەلیکی کوردستان درا بەدادگایەکی سەربازی، ئەفسەرێکی ئینگلیز دەستیکرد بەدادگاییکردنی‌و چەند تۆمەتێکی دایە پاڵ بۆ ئەوەی تاوانباری بکات و حوکمی لەسێدارەدانی بدات. ئەوەبوو تۆمەتی سەرکردایەتیکردنی گروپێك چەتەی چەکداری دایە پاڵ کەکارو کردەوەیان کوشت وبڕو جەردەیی‌و دەستدرێژکردنە بۆ سەر شکۆی سەروەریی پاشای عێراق و پەلاماردانی سوپای ئینگلیز گوایە ئەم سوپایە لەهەوڵ و کۆششدابوو بۆ سەقامگیرکردنی ئارامی‌و ئاسایش لەناوچەکەدا.

شێخ مەحموود بەوپەڕی ئازایەتییەوە بەرپەرچی ئەو تاوانە پووچەلأنەی دایەوەو رەخنەی لەودادگاییکردنە ستەمکارانەیەی ئەوان گرت لەگەڵ درۆودەلەسە بێ‌بناغەکانیان، هەروەها رایگەیاند کەئەو، خاوەنی مافێکی شەرعییە لەوەی دەیکات چونکە بەرەزامەندیی گەلی کوردستان و بەپێی راپرسییەکی جەماوەری بۆتە مەلیك. ئنجا لەناکا، زۆر بەتوندی پەڕۆیەکی پێچراوی دەوری قۆڵی دەکاتەوەو کاغەزێکی قەدکراوی لێ دەردێنێت. هەروەکو لەکوردستانیشدا باوە، کاغەز قەدناکرێت و بەقۆڵەوە نابەسترێت مەگەر زۆر خۆشەویست یان پیرۆز بێت. کاغەزەکە دەقێکی تۆما ولسنی سەرۆکی ئەمریکی تێدا تۆمارکرابوو کەساڵی ۱۹۱۷ دەرچووبوو، لەچواردە بڕگە پێکدەهات دەربارەی

بەرقەراکردنی ئاشتی لەجیهاندا، دووەم بڕگەی بڕیارە جاڕنامەکە پەیوەندیی بەنەتەوەی کوردەوەبوو کەجەختیدەکرد لەسەر دانی مافی تەواو بەگەلی کورد وەك هەرگەلێکی تری جیهان.

شێخ مەحموود بەدەرخستنی ئەم بڕیارەی سەرۆکی ئەمریکی بەو شێوەیەو لەوکاتەدا، هەروەها هەڵوێستی قارەمانانەیو پلەوپایەی لەلای گەلی کورد بوونە مایەی ئەوەی حوکمەکەی کەم بکرێتەوەو سزای لەسێدارەدانی لەسەر هەڵبگیرێت. سەرباریشی حکومەتی بەریتانیا نەك هەر دانی بەمافی رەوای گەلی کورددا نەنا بۆ پێکهێنانی دەوڵەتی کوردی بەڵکو، بەزەبری چەك رووبەڕووی شۆڕشی چەکداریی کورد وەستاو بوو بەمایەی ئەو دەردیسەریەی هەتا ئەمڕۆ کورد بەدەستیەوە دەناڵێنێت. لێرەدا بۆیەکا ئەم مەرگەساتە مێژووییە بەبیر مرۆڤی کورد دێنمەوە تابۆ هەتاهەتایەو نەوە دوای نەوە یادی بکەنەوە.

دیارە ئەم هەڵوێستە هیچ دادپەروەرییەکی تێدانەبوو، روخاندنی حکومەتێکی کوردی کە لەخاکی کوردستاندا دامەزرابێت و بەپیلان و فەرمانی بەریتانیای مەزن، کوردستان بخرێتە سەر عێراقی عەرەبی، ئەمە دوورە لەدادپەروەرییەوە.

هەروەها دانانی مەلیك فەیسەڵی یەکەم وەکو پاشایەك لەعێراقداو دان نەنان بەمەلیك مەحموود وەکو مەلیکی کوردستان، ئەمیش دادپەروەری نییە، مەلیك مەحموود کە بەبەراود لەگەڵ مەلیك فەیسەڵ لەرووی پلەوپایەو دەسەلاَت و کەسایەتییەوە لەئەو کەمترنەبوو، جگە لەوەی شێخ مەحموود لەکۆڕوکۆمەڵی نێودەوڵەتیو سیاسیدا لەمەلیك فەیسەڵ ناودارترو ناسراوتربوو. بەلاَم بەریتانیا پاساو بۆ ئەم کردەوەیەی ناهێنێت.

لێرەدا نابێت ئەوەمان لەیاد بچێت نەوەی ئێستای بەریتانیاییەکان بەداخ و پەژارەیەکی زۆرەوە دان بەو کردەوە ناڕەوایەی باوباپیرانیاندا دەنێن کە هەڵەیەکی گەورەیان کردووە. شایەنی باسە کە لەبەرگی سێیەمی کتێبەکەم (کورد دوژمنی خۆت بناسە) بەدوورودرێژی وتووێژی بەرپرسێکی ئیدارەی نوێی بەریتانیام هێناوەتەوە کە لەگفتوگۆیەکی لەگەڵمدا، دانی بەو هەڵە گەورەیەی باوباپیرانیدا ناوە کەکاتی خۆی دەرهەق بەگەلی کورد کردوویانە.

قسە دێت و دەڕوات ئنجا سەر لەنوێ دەگەڕێینەوە سەر پرسیارە سەرەکییەکەمان کەئایا بەرەی زلهێزو زاڵدەستی جیهان، لەمیانەی وەستانیدا رووبەڕووی ئیرادەی گەلی کوردستان و شەرعیەتدان بۆ پێکهێنانی دەوڵەتی کوردی، چی دەوێت؟

هەروەکو لەوەوپێش باسی کردەوەی بەریتانیای مەزنم لەگەڵ شێخ مەحموود کرد کەحکومەتی کوردیی رووخاند، ئنجا دروستکردنی سەدام حسەینی ئەمڕۆ کە لەگۆڕەپانی سیاسیدا چیدەکات کە بەملیۆن خەڵکی عێراق و بەتایبەتی گەلی کورد لەدەست زوڵم و زۆرو ستەمی دەناڵێنن.

لەبەرامبەریشدا کردەوەی ئەمریکا لەسەردەمی سەرۆك ترومان کاتێك کۆماری مهابادی رووخاند ئنجا دواتر کۆماری ئیسلامیی لەئێراندا دروستکرد لەگەڵ رۆڵی ئەم دەوڵەتە لەپشتگیریکردنی تیرۆر لەجیهاندا. بەلاَم ئەوەی جێی داخە، ئەو قەڵەمەی کەسەرۆکی ئەمریکی ـ ترومان فەرمانی رووخاندنی کۆماری مهابادی پێئیمزا کرد کە لەئەنجامیدا قازی محەمەدی سەرکۆماری مهاباد لەسێدارەدرا، هەمان

قەڵەمی وەکو دیارییەکی مێژوویی پێشکەشی حکومەتی ئیسرائیل کرد، ئەویش دوای ئەوەی هەر بەو قەڵەمە مافی ئیسرائیلی تۆمارکرد بۆ راگەیاندنی دەوڵەتیان لەخاکی فەلەستین.

رێککەوتننامەی شوومی جەزائیر (ئاداری ١٩٧٥) بەئاگاداریو پلانی (C.I.A)بوو، ئەنجامدەری پیلانەکەش پیاوێکی خۆیان بوو (مەلامستەفا سەرکردەی شۆڕشی کورد) کە بەداخێکی زۆرەوە دەڵێم ناوبراو شایەنی ئەو پلەو پۆستە نەبوو کە لەئەنجامی چەند هۆکارێکی دەرەکی پێی بەخشرا (لەسێبەرگی کتێبەکەم: کورد دوژمنی خۆت بناسە، باسمکردووە) چونکە هەر ئەوەندەی مەلامستەفا لەیەکەم دیداریدا چاوی بەهنری کیسنجەر کەوت ئیتر پشتی لێکردەوەو ئیرادەو بەرژەوەندییەکانی دەزگای (C.I.A) ی لەبەرچاو نەگرت و ئەوەی لێکنەدایەوە کەئەو بەرژەوەندییانە لەسەرووی بەرژەوەندیی گەلانی جیهانەوەن، بۆیە مەلامستەفا خۆی بۆ هیچ ئەنجامێك تەیار نەکرد.

ئنجا سەرلەنوێ رووداوە سەیروسەمەرەو مەرگەساتئامێزەکانی ٣١ی ئابی ١٩٩٦ دێنینەوە یادو دەڵێین: سەرۆکی یەکێك لەدوو حزبە سەرەکییەکەی کوردستان، دەروازەی سنووری کوردستانی بۆ سوپای ستەمکار ئاوەڵاکردو یاریدەیدا کەتانك و زرێپۆش و گاردی کۆماریی رژێمی بەعس، قەدەغەی بینای پەرلەمانی کوردستان ببەزێنن و گلاّوی بکەن، ئنجا شاری هەولێر داگیربکەن کە بەخوێن و قوربانیدانی خەڵکەکەی، لەراپەرینی ١٩٩١دا ئازادکرابوو. لەکاتێکدا مەسعود بارزانی" هاوکاری پاڵەوانی هێزی داگیرکەر لەسەر سنووری تورکیا ـ ئێران لەشێرین خەودابوو. تەنانەت ئەم مەرگەساتەش پیلانێکی داڕێژراوی دەزگای (C.I.A) بوو.

مێژوو ئەم رووداوانە لەبیرناکات، هەڵوێستی دەوڵەتە زلهێزەکانی تۆمارکردووە کەچۆن لەپێناو بەرژەوەندیی خۆیان" کوردستانیان بەسەر چوار پارچەدا دابەشکردو ئێستاش بەهاوکاریی هەرچوار دەوڵەتی ناوچەکە (کە کوردستانیان بەسەردا دابەشکراوە) دەبنە کۆسپی بەری رێگەی دامەزراندنی قەوارەیەکی سیاسی بۆ کورد.

بەڵام ئەزموونی ئێستای گەلی کورد لەم بەشەی خاکی کوردستان لەباکووری عێراقدا" لەگەڵ هەموو کەموکوڕیو ناتەواوییەکی، مایەی رێزو سەربەرزیی هەموو کوردێکی بەشەرەف و ئازادیخوازە. ئەم ئەزموونە نوێیە دیموکراسییە، کەئاسایش و ئارامی تێدا بەرقەرارە، لاپەڕەیەکی نوێی لەبواری پەیوەندیی نێوان کوردو حکومەتی ئەمریکیدا هەڵداوەتەوە کەنیشانەی ئەوەیە مەسەلەی کورد، جارێکی تر کەوتۆتەوە ناو گۆڕەپانی سیاسیو، بۆتەوە بەوێردی سەرزاری سیاسەتمەداران و، دەشێ ئەمە رێگە خۆشکردنێك بێت بۆ پێکهێنانی دەوڵەتی کوردستانی گەورە.

کەواتە ئەمریکا دەبێت بەئەزموونە کۆنەکانیدا بچێتەوە، چونکە دەرەنجامی سوودو سەرکەوتنی ئەم ئەزموونە" یان لەدەستدانو رووخانی، بەپلەی یەکەم لەئەستۆی ئەمریکایەو، بەپلەی دووەمیش لەئەستۆی خودی جەلال تاڵەبانی و مەسعود بارزانیدایە.

**رۆڵی دەزگای ( C.I.A ) لەرووی گۆڕینی سیاسەت و حکومەتەکان لە جیهاندا**

هەر لەسەرەتای حەفتاکانی سەدەی رابردووەوە هەتا ئەمڕۆ، دەزگای موخابەراتی ئەمریکی لەهەوڵو تەقەلادایە بۆ سەپاندنی ئیرادەو دەسەلاتی ئەمریکی بەسەر جیهاندا. دیارە شتێکی بەڵگەنەویستە کەفاکتەری ئابووری، چەکێکی کاریگەرە ئەویش ئەگەر بەهۆشێکی کراوەو ئاراستەی دروست بەکار بهێنرێت، چونکە دارایی و سامانی زۆروزەوەندی بەردەستی ولاتە یەکگرتووەکان و دەزگا کارامە موخابەراتییەکەی" هۆی ئەو سەروەری و زاڵدەستییەیە کەئەمریکا لافی پێوە لێدەدات.

وەکو دەشزانین مەردوم بەگشتی، لەهەموو ئان و سەردەمێکدا" بەتایبەتی لەدوای سالانی حەفتاکانەوە لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە زۆربەی ئەو گۆڕانکارییانەی بەسەر سستەمی سیاسی یان ئیداریی هەندێك دەوڵەتدا هاتووە دەستکیسەی دەزگای موخابەراتی ئەمریکییە(C.I.A). بۆ نموونە دەکریٚ ژیاننامەی سەرۆکایەتیی سیٚ سەرکردە لەجیهاندا بێنینەوە کە ئەم قسەیەمان دەسەلمێنن:

**١ ـ سەرۆکی کۆچکردوو محەمەد ئەنورە سادات:**

سەرۆك سادات لەساڵی ١٩٧٠ دوای کۆچی دوایی سەرۆك جەمال عەبدولناسر، پۆستی سەرۆکایەتی کۆماری میسری وەرگرت، بەئازاترین و دڵسۆزترین و لێوەشاوەترین سەرۆك دەوڵەتێکی عەرەبی دەژمێردرێت.

لەسەرەتای ماوەی فەمانڕەواییدا سیاسەتی سۆشیالیستییانەی سەرۆك عەبدولناسری گرتەبەرو تا دەهات پەیوەندیی لەگەڵ یەکێتیی سۆڤێت(جاران) سەقامگیرتر دەکرد. ئەم سەرۆکە هەموو خەمێکی چارەسەرکردنی قەیرانی ئابووریی میسربوو، هاوکات هەوڵیدا سنوورێك بۆ ئەو دەستدرێژییانەی ئیسرائیل دانێت کەبەردەوام رووبەرووی حکومەتە یەك لەدوای یەکەکانی میسر دەبۆوە، لەم رووەوە ئاگری شەڕی ئۆکتۆبەری هەڵگیرساند ئەویش لەڕێی یەکخستنی رای گشتیی عەرەبی دژی ئیسرائیل، لەم رووەوە سوپای میسر ئەوپەڕی ئازایەتی نواندو توانی هێڵی بارلێف ببەزێنێت. خۆ ئەگەر دەستێوەردانی خێرای ئەمریکا نەبوایە ئەوە سوپای عەرەب بەسەرکردایەتیی سوپای میسری" زۆربەی خاکی ئیسرائیلی دەگرت، بەلام ئەمریکا لەرێگەی ناوبژیوانییەوە شەڕەکەی راگرت بۆ تاوتوێکردنی ململانێیەکە.

لێرەدا تەرازووی هێزی ئیسرائیل بەسەر هێزی دەوڵەتە عەرەبییەکاندا داشکا ئەوەش بەهۆی تەکنەلۆجیای ئەتۆمیی ئیسرائیل هەروەها پشتگیریکردنی ئەمریکا بۆی، ئنجا سادات بۆی دەرکەوت کەرێگەچارەی سەربازی" بەرامبەر ئیسرائیل کەڵك ناگرێت بۆیە پەنای بۆ رێگەچارەی ئاشتی برد ئەوەبوو هەنگاوێکی هێند بوێرانەی نا، لەناو هەموو سەرکردەو سەرۆکەکانی عەرەبدا تاك بوو.

سەرەتا کێرڤی پەیوەندییەکانی لەگەڵ یەکێتیی سۆڤێتیی جاراندا بە ١٨٠ پلە ئاوژوو کردەوەو لەهەمانکاتدا پەیوەندییەکانی لەگەڵ ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا پتەوترکرد، چونکە سەیریکرد بەخششی بلۆکی سەرمایەداری بەبەراورد لەگەڵ بلۆکی سۆشیالیستی خەنیمدا زۆر زیاترە. جگە لەوەی پەیوەندییەکانی لەگەڵ یەکێتیی سۆڤێت بارتەقای خواست و ئامانجەکانی ئەم نین کە لەپێش هەموویانەوە چاککردنی ئاستی بژێوی هاوولاتیی میسرییە.

پاشان سەرچڵییەکی زۆر ئازایانەی نواند کەسەری زۆربەی سەرۆك دەوڵەتانی جیهانو بەتایبەتی سەرۆکە عەرەبەکانی سوورهێنا کاتێك" وەکو سەرۆکی گەورترین دەوڵەتی عەرەبی، بۆ بەرقەراکردنی ئاشتی سەردانی ئیسرائیلیکرد. سادات بەم هەنگاوەی، سنوورێکی بۆ قەیرانی نێوان میسرو ئیسرائیل دانا کەئەوپەڕی کاریگەری هەبوو لەسەر دەوڵەتی میسر ئەوەش بەهۆی پێگەی پێشەنگی میسر لەریزی دەوڵەتە عەرەبییەکاندا. ئنجا رای گشتیو جەماوەری میسری، لەدژی سادات هەڵسان کەهێزەکانی ئاسایش ناچاربوون هەڵمەتێکی دەستگیرکردن جێبەجێ بکەنو ژمارەیەکی زۆریان لەخەڵك قەرەپەستی زیندانەکانی میسرکرد. ئنجا ژمارەیەکی زۆر لەسیاسەتمەدارو کەسایەتیی میسری، ولاتیان بەرەو هەندەران بەجێهێشت، بەلام سەرباری هەموو ئەمانە، نهێنیەکانی سادات بەپەنهانی مانەوە هەتا راستییەکە دەرکەوتو خەڵك بۆی ئاشکرابوو کەئەوەی سادات کردی، تەنها لەپێناو گەلی میسردابوو، چونکە بەو کارەی توانی ئەو زەوییانە وەربگرێتەوە کەئیسرائیل داگیری کردبوون. سادات لەرێی ئەومێژووەی تۆمکاریکرد، خۆی کرد بەقۆچی قوربانیی گەلەکەی، ئنجا دەرگای زیندانەکان ئاوەلاکرانو ئەوەی لەزندانەکاندابوو ئازاد کرا مەگەر زیندانییەك لەسەر شتی سیاسی گیرابێت، پاشان زۆربەی ئەوانەی لەدەرەوە بوون گەڕانەوە کەیەکێکیان سەرۆکی ئەرکانی سوپای میسر بوو.

ئنجا دوای ئەوەی بارودۆخی ئابووریی میسر گۆڕاو کاریگەریی بەسەر تاکی میسرییەوە دەرکەوتو دەوڵەت خاکی لەژێردەستی ئیسرائیل دەرکردەوە، جیهان بڕوای بەدروستیی هەنگاوو بیرکردنەوەی سادات هێنا.

ئەو سیاسەتمدارە کە لەبواری سەربازیشدا کارامەبوو، ماوەی ژیانی بەپاکیو دڵسۆزی بۆ گەلەکەی بەسەربرد. لەماوەی سەرۆکایەتییەکەیدا پەیوەندییەکانی لەگەڵ ئیدارەی ئەمریکیدا لەپێناو خزمەتکردنی ولاتو گەلەکەی بەکارهێنا بەبێ ئەوەی بیر لەبەرژەوەندیی کەسایەتیی خۆی بکاتەوە.

کەواتە بەکرێگیراوی چی بێت ئەگەر نیەتی کارو ئەنجامەکەی خزمەتکردنی گەل بێت؟ بەلام بەداخەوە هەندێك سەرتوندو دەمارگیر لەحزبە ئیسلامییەکان، بەهۆی بیرتەسکیو نەشارەزاییان لەئاینی ئیسلامو مێژووی پێغەمبەری خۆشەویست(د.خ) هەروەها بەهۆی تێنەگەیشتنیان لەئایەتەکانی قورئانی پیرۆز بەرگەی لەو جۆرە هەڵوێستانە ناگرن. زۆیش بەداخەوە کەبینیمان چۆن خالید ئیسلامبوولی لەمانۆڕێکی سەربازیدا، ساداتی تیرۆرکرد. کەواتە کامیان شەهیدە؟ چونکە ئەگەر راپرسییەك لەناو گەلی میسردا ئەنجام بدرێت بەزۆری لەسوودی سادات دەکەوێت نەك ئیسلامبوولی.

لێرەدا دەمەوێ رووداوێکی مێژوویی بەبیر خوێنەر بێنمەوە ئەویش رێککەوتننامەی حودەیبییەیە کەپێغەمبەر(د.خ) لە کۆتایی ساڵی شەشەمی کۆچی (٦٢٧ز)دا لەگەڵ قورەیشدا مۆریکرد. جا لەکاتێکدا خودی پێغەمبەری خوابوو سوور دەیزانی ئەوان کافرو موشریکن، بەلام لەپێناو کوژانەوەی ئاگرو سەربەرزیی ئیسلام رێککەوتننامەیەکی ئاشتیی بۆ ماوەی دەساڵ مۆرکرد کەرێکەوتننامەکە سەلماندی، بوو بەبەرکەت بۆ موسڵمانان، چونکە دوو ساڵی پێنەچوو لەفەتحی مەککەدا ژمارەی شەڕکەری موسڵمان گەیشتە دە هەزار کەس. بۆ دروستیی ئەوەی هێنامەوە نموونەو بەڵگە زۆرە بەلام ئێمە دەمانەوێت

بڵێین و بەدڵیش بۆ هەموو خەڵکی دەخوازین ئەوەیە کە لەهەموو بیروباوەڕو ڕچەیەکدا لەزیادەڕەوی دووربکەونەوە. چونکە وەکو بینیمان، سادات هەرچەندە لەئیدارەی ئەمریکی نزیك ببۆوە بەڵام چەند پەیوەندییەکی ئابووری و سیاسیی لەگەڵ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەستبوو کەئیدارەی میسر هەتا ئەمڕۆ لەسەری دەڕوات.

هەرچەندە ئەوەی ساداتی تیرۆرکرد سەر بەگرووپێکی ئیسلامی سیاسیبوو، بەڵام ڕێکخەرو پلان دارێژەی نەخشەکە( بەپێی قسەی خەڵك) دەزگای(C.I.A) بوو، هۆیەکەشی ئەوەبوو کەبەڵێ راستە ئەوەی سادات کردی خزمەتی بەبەرژەوەندییەکانی ئەمریکا لەناوچەکەدا گەیاند، بەڵام ئەو لەپاڵ ئەمەدا مەبەستی خزمەتکردنی وڵاتی خۆی بوو، ئەو لەو پەیوەندی بەستنەدا نەبوو بەسیخوڕ، چونکە هۆکاری بنەڕەتی بۆ تێرۆکردنی هەستی بەتینی نیشتمانپەروەریبوو کە (C.I.A) هەستی پێکردو لەوەترسا ماوەیەکی تر ئەو هەستی نیشتمانپەروەرییە بەبارێکی تر بتەقێتەوە. بەواتایەکی تر، سادات جێی بڕوای ئەوان نەبوو، گەشتەکەشی بۆ ئیسرائیل نەخشەو پلانی دەزگای موخابەراتی ئەمریکی نەبوو بەڵکو زادەی هەستێکی رووتی نیشتمانی بوو... خواش ئاگاداری ناو دڵ و دەروونی هەمومانە.

**٢ـ بیریسترۆیکای سەرۆکی رووسی ـ گۆرباچۆڤ:**

لەشۆڕشی ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩١٧وە تا رۆژی رووخانی سۆڤێت، سەرۆکایەتیی یەکێتیی سۆڤیەت کەسایەتییەکی بوێرو کراوەی وەك سەرۆك گۆرباچۆڤی بەخۆیەوە نەبینیوە. راشکاوی و دیموکراتییەتی ئەم پیاوە هەروەها باوەڕی بەئازادی گەیشتە ئاستێك دانی بەهەموو ئەو تاوانانەدا نا کەئیدارەی سۆڤێتی" لەسەردەمی لینینەوە لەژێر دروشمی بەرژوەندیی وڵات دژی گەلی رووسی ئەنجامیداوە. هەروەها ئەوەشی ئاشکراکرد کەچۆن ستالین، وڵاتی بەزەبری هێز بەرێوەدەبرد، ئنجا مەرگەساتی گەلی رووسیای بۆ جیهان ئاشکراکرد کە لەسەر دەستی سۆڤێتییەکان چەشتی چونکە تەنانەت سیاسەتمەدارو شاعیرو ئەدیب و پرۆفیسۆرو دکتۆرەکانیش لەو بەڵایە رزگاریان نەبوو. دوو ملیۆن هاووڵاتیی رووسی بەتاك و بەکۆمەڵ لەزیندان و گرتووخانەکاندا لەئەنجامی لەسێدارەدانیان یاخود رەق هەڵاتنیان لەتاو سەرمای سیبریا کەلەوێ بەرووتی زیندانی دەکران، گیانیان لەدەستدا.

گۆرباچۆف، لەگەڵ ئەوەی خۆی ئەندامێکی پارتی کۆمۆنیستی سۆڤێتی بوو، پەردەی لەسەر هەموو تاوانەکانی ستالین هەڵماڵی. هەرئەوەندەی پۆستی سەرۆکایەتیی حزب و دەوڵەتی وەرگرت، تەخت و بەختی سۆڤێتی لەرزاند کەبۆ ماوەی زیاتر لەحەفتا ساڵ، نیوەی جیهانی کۆنترۆڵ کردبوو. بیروباوەڕو هەست ونەستی خەڵکی بەشێوەیەك راتەکاند" لەدەوڵەتێکی وەکو پۆڵەندا، کە لەژێر کاریگەریی سستەمی کۆمۆنیستدابوو، حکومەت پێ بەپێی ئەو گۆڕانکارییانەی کەگۆڕباچۆف بەسەر ئایدیۆلۆجیای پارتی کۆمۆنیستدا دەیکرد" هەڵبژاردنی بۆ پارتی دەسەڵاتدار ئەنجامدەدا. ئەمە کاریگەریی زۆری لەسەر رەوتی هەڵبژاردنەکان هەبوو کە لەئاکامدا ئەو گەلەی ماوەیەکی زۆر بڕوای بەکۆمۆنیزم هەبوو، دەنگی بۆ پارتی کۆمۆنیست نەداو بەمە کۆمۆنیستەکان دۆڕاندیان. لەهەمانکاتدا ئەو گۆڕانکارییانەی

گۆرباچـۆف زەمینــەی بەربەســتی دەســتکردی نێــوان هــەردوو ئــەڵمانیای لەرزانــدو ئــەوەبوو دیــوارە بەناوبانگەکە رووخا.

دوای جـەنگی دووەمـی جیهـانی، یـەکێتیی سـۆڤێت بـەهۆی توانـاو هێـزی سـەربازی کەبـەرەنگاری داگیرکەران دەبۆوە ناوی (شوورەی ئاسنین)ی لێنرا. مێـژوو بۆمـان دەگێڕێتـەوە کەخاکی رووسیا کاتی خـۆی تێکـشکانی دوو سـوپای هەرەگـەورەی جیهـانی بەخۆیـەوە بینیـوە ئـەویش پـەلاماری نـاپلیۆن پۆناپارتـە لەسـەردەمی ئەلکساندەری تساری رووسیا کـە لەئەنجامـدا سوپاکەی شکاو بـەهۆی ئەمـەوە ئیمپراتۆریەتەکەیشی رووخا، ئنجا سوپای نازیست کەخاکی رووسیا ژەهـراوی تێکشکانی دەرخـوارد داو لەئەنجامدا بەرلینی پایتەختی نازیستەکان رووخا.

گۆرباچۆف بەئاشکراکردنی لایەنە شاراوەکان‌و پێشێلکارییە سیاسییەکان‌و مرۆییـەکان لەیـەکێتیی سۆڤێتدا " راستەقینایەتیی شوورە ئاسنینەکەی دەرخست کەژەنگاوی ببوو و لەرووخاندابوو.

بـەپێی لێکدانــەوەی زۆربـەی سیاسـەتمەدارەکان، سـەرەتای پرۆسـەی ئاشـکراکردنی راسـتییەکان لەرووی سیاسەت‌و ئیدارەی حکومەتی ئەوسای رووسیا، دەگەڕێتـەوە بـۆ دووەمـین دیـداری گۆرباچـۆف لەگـەڵ تاتـشەری سـەرەك وەزیرانـی ئـەو دەمـەی بـەریتانیا کـەناوی بـە(ژنـی ئاسـنین) دەرکردبـوو. دیـدارە دواینیەکە سێ سعاتی خایاندبوو و کاریگەریی زۆری لەسەر گۆرباچۆف هەبوو لەرووی گۆڕینی ڕێڕەوی سیاسـەتەکانی. چـونکە خـاتوو تاتـشەر، دوای دیدارەکـە، حکومـەتی ئـەمریکی‌و دەوڵەتـە عەرەبییـەکان، کەهاوپـەیمانی بـوون، راسپارد کـەهاوکاری‌و کۆمـەکی سـەرۆکی رووسـی بکـەن‌و لـەو پـرۆژە مێژووییـەدا پشتگیری بکەن کەکاریگەرییەکی گەورەی دەبێت لەسـەر سیاسـەتی نێودەوڵـەتی لەجیهانـدا. پەیوەنـدیی نێوان رووسیاو دەوڵەتانی رۆژئاوای وەکو بـەریتانیاو ئەمریکاو فەرەنساو ئەڵمانیاو کەنـەداو ئوسـتراليا بـەکردەوە پتـەوبوو، بەشـێوەیەك کەمێـژووی پەیوەنـدیی لەوەوپێـشی، نێوانیـان شـتی وای بەخۆیـەوە نەدیووە.

هەرچـەندە مـن ئـەوەی دەربـارەی (C.I.A) دەگوترێـت بـەدوور دەزانم کەدەسـتی لـەو گۆڕانکارییـە سەیرەی بیروباوەڕو سیاسەتی سەرۆکێکی رووسیدا هەبێت تا چوارچێوەو ئیدارەی دەوڵـەتێکی گـەورەو ئەفسانەیی وەك یـەکێتیی سـۆڤێت بڕووخێنێـت‌و، گوایـە ئـەو دەزگایـە دەسـتێکی بـاڵای هـەبوو لـەرووی کارتێکردن لەسەر سەرۆك گۆرباچۆف، بەڵام ئەوە هەواڵێکە لـەیادەوەریی مرۆڤدا بنج دادەکوتێت‌و هـەر لەسەر زاران دەبێت. چونکە گۆرباچۆف کەسەرۆکایەتیی دەوڵەتێکی مەزنی بەدەست بوو" دەوڵـەتێك کـە بــەتاقی تــەنیا دەیتــوانی رووبــەڕووی ئــیرادەی ئــەمریکا لەجیهانــدا بوەســتێت" زەحمەتــە جــۆری کارتێکردنی(C.I.A) لەسەری، بزانرێت!

بـەڵام مـن لـەلای خۆمـەوە دەڵـێم ئـەم ئەنجامـە شـایەنی هـەموو هـەوڵ‌و تێکۆشـانێك بـووە، هـەروەها بـۆ هێنانەدیی ئامانجی لەم جۆرە هەڵدەگرێت ئەوەی لەهیچ شەرع‌و بیروباوەڕێکدا نـەهاتووە، پێڕەوبکرێت. دیارە کاری ئەوهاش خۆی لەبەرامبەر هەوڵدانی راسـتەقینەدا بـۆ ناگیرێـت‌و جێبـەجێکردنی گۆڕانکـاریی

ریشەیی ئەوها، گرێدراوی فاکتەری کەسایەتی و رادەو رێژەی خێرو شەڕە لەو کەسایەتییەدا، هەروەها ئیرادەو سووربوونی پێدەوێت جگە لەهەلومەرجی گونجاو بۆ ئاسانکردنی جێبەجێکردنی هەوڵەکە.

جا ئەگەر هتلەرو ستالین و چاوچیسکۆو سەدام، لەگەڵ گۆرباچۆفدا بەراورد بکەین جیاوازییەکی زۆر گەورە بەدیدەکەین. ئەو چوارەی پێشەوە هەروەها زۆری تر لەوانەی مێژوو بۆمانی تۆمارکردووە، تەنانەت ئەگەر گرۆی ئادەمیزادیش لەسەر زەوی تۆڵەی لێنەسەندبنەوە ئەوە خوای گەورە، هەرگیز لەکردەوەکانیان خۆش نابێت. بەڵام گۆرباچۆف، ئەوە مرۆڤایەتی لەسەر زەوی سوپاسگوزاریی دەکات و رەحمەتبوونی بۆ دەنێرێت، داواکاریشین لەخوای گەورە کە لەپای کۆمۆنیستبوونی ببورێت. چونکە گۆرباچۆف، ئیزگەو رۆژنامە جیهانییەکان رۆژانە هەواڵی کردەوە چاکەکەی بۆ لەناوبردنی بلۆکی رۆژهەڵات باسدەکەن کەماوەیەکی زۆر بەشێکی گەورەی جیهانی لەژێر رکێفدابوو. لەسەرەتاشدا کۆسپی گەورەی هاتەرێ، چونکە چەند ئەندامێکی پایەبەرزی K.G.B لەکۆمۆنیستە توندڕەوەکان هەوڵیاندا کودەتای بەسەردا بکەن بەڵام ئەو پیلانەکانیانی تێکشاند.

جا هەڵوێستی رووسی هەرچەندە لەرووی هاوسۆزیی لەگەڵ مەسەلەی گەلی کوردستاندا سلبی بوو" چونکە دوا هەڵوێستی سلبییان لەگەڵ سەرکردەیەکی کورددا (عەبدوڵڵا ئۆجەلانی سەرۆکی P.K.K) بوو کاتێک رێگەیان نەدا پەنا بۆ رووسیا بەرێت کاتێک ویستی خۆی دەرباز بکات و ئەوەبوو دەردەسەری و زەحمەتیی زۆری هاتە رێ کەنەك هەر زیانی بەخودی خۆی گەیاند بەڵکو زیانی بۆ هەموو گەلی کوردهەبوو، بەڵام لەبەرامبەردا ئێمە وەك گەلی کوردستان هیچ هەڵوێستێکی مرۆییمان لەبەرێز گۆرباچۆف نەبینوە... سەرباریشی، ئەوە من لەشاخ و چیا سەرکەشەکانی کرودستانەوە رێزو سڵاوی ئاراستە دەکەم.

## ٣ـ بەرێز سەدام حسەین سەرکۆماری عێراق

سەیرترین کەسایەتییە کەبۆ ماوەی نیو سەدەو تا ئەمرۆ، حوکمی عیراقی کردبێت، بێگومان کۆتاییەکەشی سەیرتر دەبێت. لێرەدا دەمەوێت کورتەیەك دەربارەی کەسایەتی و ئاوات و خوەلیای ئەم سەرۆکەی عیراق بخەمە بەرچاو کەمێژوو لەریزی سەرکردە خوێنرێژەکاندا ناوی تۆمار دەکات.

ا ـ حەزکردنی بەسێکس بێئەندازەیە. جارێکیان لەدەرچوونێکدا بەهیلۆکۆپتەر، کە بەسەر شاخی حەمرینەوە دەبێت لادەداتە لای خێزانێکی مەڕداری کورد کەخەڵکی دەوروبەری خانەقین دەبن. سەرۆك، سێ کیژیان لەلا دەبینێت کە لەجوانیدا هاوتایان نییە، کەرۆیشتەوە هەرسێکیانی لەگەڵ خۆیدا برد ئەوەش بەوناوەوە کەپۆشتەیان دەکات و فێری خوێندن و زانستیان دەکەن، نرخی سێ کچەکەشی بۆ باوکیان بەجێهێشت ئنجا رۆیشت، پیاوەکەش هیچ دەسەڵاتێکی نەبوو.

ب ـ چاوچنۆکی: چاوچنۆکیی سەدام بێسنوورە، چونکە دەبێت کۆشکەکانی لەهەموو کۆشکەکانی وڵات بەرزترو ڕازاوەترین، بەگرانبەهاترین ئەڵماس و مرواری و پارچە زێڕ رازێنرابنەوە. دەبینین لەم جۆرە کۆشکانەی سەرۆك لەهەموو عیراقدا هەن. تەنانەت جلوبەرگیشی، نابێت کەس لەهی ئەو جوانتر لەبەربکات. جارێکیان، کەهێشتا جێگری سەرۆك بوو، لەپرسەیەکدا یەکترامان بینی، بەرامبەر یەك

دانیشتبووین، کاتێك هەڵسا بڕوات سڵاوێکی بەتایبەتی ئاراستەکردمو بزەیەکی واتاداری بۆم کێشا. گرەوم لەگەڵ هاوەڵەکەمدا کرد کەمەبەستی لەوسڵاوو بزەیە، جلوبەرگە ڕێکوپێکەکەم بووە. دوای ماوەیەك کەدیمەوە لێمی پرسی: ئەریٚ قوماشی ئەو دەستە جلەت لەکویٚ پەیداکردووە؟...جا بۆ خۆ لادان لەرق و تووڕەیی ئەم پیاوە، وامکرد لەوەدوا پێش ئەوەی ببینم، پۆشاکم هەمیشە شێواو بێت.

ج ـ هێز: هەر لەسەرەتای خۆ سەپاندنی بەسەر عێراقدا هەوڵیدا هێزێك بەدەست بێنێت کەپاڵپشتی بکات و دوژمنی لێدووربخاتەوەو کۆڵەکەی فەرمانداریەکەی قایم بکات. بودجەیەکی گەورەی بۆ دەزگای موخابەراتی عیراقی تەرخانکردو جڵەوی بۆ شلکرد تا بناغەی فەرمانڕەواییەکەی لەناو وڵاتدا پتەوبکات و، لەهەمان کاتدا دراوسێکانی بترسێنێت، ئنجا دوا هەواڵی دۆست و دوژمنی بەدەست بخات. دەبینین لەو لەشکرکێشییە سەربازییەی وڵاتانی هاوپەیمان بۆ سەر عیراق، دەزگای موخابەراتی ئەمریکی، ئامێرێکی بیستنی زۆر بەتوانای دۆزییەوە کەهەموو ناوچەکەی کۆنتڕۆڵ کردبوو. هێزی هاوپەیمانەکان دوای ئەوەی شوێنەکەیان دیاریکرد بەفڕۆکە بۆردومانیانکرد. ئەو ئامێرە لەئەنجامی لەخۆبایی بوونی سەرۆك سەدام حسەین دۆزرایەوە کاتێك لەرێی تەلەفزیۆنی عیراقەوە پەیوەندییەکی نهێنیی تەلەفزیۆنی لەنێوان دەسەڵاتدارانی سعوودیەو کوێت بڵاوکردەوە کە لەپێناو دژایەتیکردنی رژێمی عیراق وتووێژیان بوو.

جا ئاشکراکردنی ئەو پیلانە لەئیزگەکانی عیراقدا، توانای تەکنەلۆجیای گەورەی بیستنی لەعیراقدا خستە ڕوو، ئنجا لەئەنجامدا بوو بەهۆی تێکشکاندنی ئامێرەکە.

د ـ حەزی دەستەڵات: ئەم غەریزەیە لەهەموو مرۆڤێکدا هەیە، بەڵام مەرج ئەوەیە سنوور تێنەپەڕێنێت هەروەکو لای سەرکۆماری عێراقدا بەدیدەکرێت. دەبینین ئامۆزایەکی خۆی بەکوشتدەدات لەبەرئەوەی کۆمۆنیستە، ئەوەبوو دەمانچەی بەمامی خۆیدا تا کوڕەکەی پیٚ بکوژێت. لەلایەکی ترەوە ئەوەی بەسەر حسەین کاملیدا هێنا هەر لەگیرکردنی لەخانووەکەیدا هەتا کوشتنی، هەر ڕێی تێناچێت. لەولاوە لەبواری رازیبوونی بەمەرجەکانی UN دەست بەسنگەوە دەگرێت و ئیمزای دەکات. هەموو ئەمانە لە سیفەتی ناپاکیکردنە کەبۆتە سیمای، چونکە مەگەر تەنها مەرگ لەهەندێك شتی بگێرێتەوە، من بەنیرۆنی زۆرداری دەزانم کەئەگریبینای دایکی‌و ئۆکتاڤیای هاوسەری کوشت و لەکۆتاییشدا خۆی کوشت.

لەزیندان کە بەهەندێك لەو دەستوپێوەندانەی گەیشتم کەرقی لێیان هەڵساوە، لێیانم بیست کەمن تەنها کەسێکم لەسزای سەرۆکی عیراقی رزگارم بووبێت، چونکە سەدام بەزەیی بەدوژمنیدا نایەتەوە...

باشە لەو کوشتوبڕەی بەسەر کوردیدا هێنا چی دەستکەوت؟ مەگەر قین و تووڕەیی نەوەی شەهیدان و راگوێزراوەکان و زیندانییەکان.

دەڵێن جارێکیان هەق و ناهەق پێکەوە ڕێیان دەکردو ئەم گفتوگۆیە لەنێوانیاندا روویدا:

ناهەق: من سەرم لە تۆ بەرزترە.

هەق: من پێیەکانم لەهی تۆ جێگیرترن.

ناهەق: من لەتۆ بەهێزترم.

هەق: من لەتۆ زیاتر دەمێنمەوە.

ناهەق: بەهێزو داراکان لەگەڵ مندان.

هەق:﴿ وكذلك جعلنا في كل قرية أكابر مجرميها ليمكروا فيها وما يمكرون الا بانفسهم وما يشعرون .

هەق: ئەگەر ماوەیەکی تریش بووبێت نەوەکانم هەردەتکوژنەوە.

هەموو پرۆسەکانی کۆکوژی کەسەدام بەناوی ئەنفال‌و بۆردوومانی کیماوی لەکوردستاندا ئەنجامیدان، هەروەها چەندین تاوانی تر دەرهەق بەگەلی کوردستان تەنها قین‌و نەگبەتییان هێنایە سەر خودی خۆی‌و حکومەتەکەی کە ئەوەبوو بەچاوی خۆمان بینیمان چۆن لەماوەیەکی کەمدا، هێزەکانی لەکوردستان دەرپەڕێنران.

لەهەرسیێ بەشی کتێبەکەمدا ( کورد دوژمنی خۆت بناسە) ئاشکرام کردووە کەحزبی بەعس لەعێراقدا چۆن بەشەمەندەفەرێکی ئەمریکی حوکمی گرتە دەست‌و (C.I.A) لەپشت هەموو جووڵەو هەنگاوێکی بووە، جگە لەوەی ئەو دەزگایە هەر لەسەرەتاوە داینەمۆی سیاسەتی حزبی بەعس بووە لەعێراقدا.

یەکەم دەرکەوتنی سەدام لەدەستەڵاتدا دوای شۆڕشی ١٧ی تەمووزی ١٩٦٨بوو کاتێک حزبی بەعس کودەتای بەسەر حوکمی عەبدولڕەحمان عارفداکرد پاشان لە٣٠ی تەممووزدا عەدولڕەزاق نایفی وەك سەرەك وەزیران لەپۆستەکەی لادا ئنجا بەعسییەکان بەتەواوەتی حوکمیان خستە ژێر دەستی خۆیان‌و سەدام حسەین لەبواری سیاسیدا سەریهەڵدا کە لەئەنجامدا ئەمە، بوو بەمایەی دامەزراندنی بەئەندامی ئەنجومەنی سەرکردایەتیی شۆڕش.

لێرەدا بەکورتی هەندێك هەڵوێست‌و رووداو دەخەمە بەرچاوی خوێنەر تا پێڕەوی سیاسەتی حکومەتی عێراقی بۆ دەربکەوێت:

١ـ هەڵوێستی خیانەتکارانەی ئەحمەد حەسەن ئەلبەکر دەخەینە بەرچاو کاتێك دەزگای موخابەراتی ئەمریکی هەوڵیدەدا زانیاری لەسەر تانکی رووسیی T.62 دەستبکەوێت تا ئاستی توانای هێرشبردن‌و بەرگریکردنی ئەم تانکە نوێیەی بۆ دەربکەوێت. دەزگای موخابەراتی ئەمریکی لەرێی دەستوپێوەندو سیخوڕەکانیانەوە زۆر هەوڵیاندا ئەو زانیارییانەیان دەستبکەوێت بەلاَم تەنانەت لەرێی هەندێك دەوڵەتی بەناو سۆسیالیستی سەر بەبلۆکی خۆیشیان هیچیان دەستگیرنەبوو کەئەو زانیاریدانەیان بەناپاکییەکی سەربازی لەقەڵەمدا. بەلاَم سەرۆکی کۆچکردووی عێراق ـ ئەحمەد حەسەن ئەلبەکر چەند پسپۆڕێکی سەربازیی ئەمریکی بانگێشت کرد کەسەردانی عیراق بکەن تا بەخۆیان ئەو تانکە ببینن‌و ئامانجیان لەو رووەوە بێننەدی. ئەوەبوو لیژنەیەکی پسپۆڕی سەربازیی ولاَتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هاتن بۆ عێراق، ئنجا تانکەکەیان پارچەپارچەکردو دوای تاوتوێکردنێکی تێروتەسەلی بەشەکانی، پێکیانەوە نایەوە.

٢ـ شەڕی عێراق ـ ئێران کەهەشت ساڵی خایاندو تێیدا بەملیۆنان خەڵکی لەهەردوولا تیاچوو" سەرەتاکەی لەکۆبووەوەیەکی ئەنجومەنی نیشتمانیی عێراقیدا دەستی پێکرد کاتێك سەرۆك سەدام حسەین، بەبێ راوێژکردن یا راپرسییەك لەنێوان ئامادەبوان کەمتەقیان لەخۆیان بڕیبوو، جەنگی لەدژی ئێران راگەیاند. ئنجا بەهۆی پشتگیریی میسرو عەرەبستانی سعوودیو کوێت، جەنگ درێژەی کێشا، لەکاتێکیشدا سەرۆکی عێراقی بینی ناتوانێت درێژە بەو جەنگە بدات کەنیشانەکانی تێکشکانی عێراقی پێوەدیاربوو، ئەمە وای لەحکومەتی ئەمریکاو دەوڵەتانی دۆستی عێراقو چەند دەوڵەتێکی ئەوروپاکرد بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ گوشار بخەنە سەر حکومەتی ئێران بۆ راکرتنی شەڕ. ئەوەبوو کۆچکردوو ئیمامی خومەینی لەوتارێکیدا راگرتنی شەڕی خوێناویی نێوان هەردوو دەوڵەتی راگەیاندو روونیشیکردەوە کەبەو کارەی، هەردەڵێت ژەهراو دەخواتەوە...واتە ئەگەر گوشاری دەرەوە نەبوایە شەڕی رانەدەگرت.

**٣ ـ داگیرکردنی کوێت:**

هاوکات لەگەڵ زیادبوونی تەماعکارییەکانی (C.I.A) لە کەنداو هەروەها ئارەزوویان بۆ سەپاندنی دەسەڵاتیان لەناوچەکەدا" بەهەموو شێوەیەك هەوڵیاندا عێراق بۆ داگیرکردنی کوێت راکێشن یا قەیرانێك بخولقێنن کەبواری دەستێوەردانیان لەکاروباری ناوچەکەدا بۆ برەخسێنێت، ئەم پیلانەشیان تەنها لەگەڵ دەستەڵاتدارانی عێراقدا سەریگرت کاتێك ناهۆشیاریی ئەم سەرۆکەی عەرەبیان بۆ دەرکەوت کەچەند بەسووك سەیری دەوروبەری دەکات، ئەم خەسڵەتەش نەگبەتییەکی گەورەیە بۆ وڵاتێك پیاوێکی نەشیاو دەست بەسەر دەسەڵاتو کاروباریدا بگرێت. بۆنموونە بەرێز ئایزنهاوەر ـ سەرۆکی پێشووی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا گوتبووی: زۆر دەترسم کەسێك ئەم کورسییەم بگرێت لەکاروباری جەنگ نەزانێتو هەلومەرجی شەڕ لەبەرچاو نەگرێت، چونکە دەتوانێت هەر بەپەنجەنان بەچەند دوگمەیەکدا جەنگێکی بێکۆتا بەرپا بکات. کەواتە کەسی گونجاو بۆ شوێنی گونجاوە.

سێ رۆژ پێش ئەوەی عێراق پەلاماری کوێت بدات، جۆن کەیلیبریکاری وەزیری دەرەوەی ئەمریکا" لەبەردەم کۆنگرێس لەوەڵامی پرسیاری ئەوەی کە ئەگەر عێراق پەلاماری کوێت بدات ئایا بەرتەکدانەوەی ئەمریکا چی دەبێت؟ ناوبراو سەرەتا ویستی خۆی لەوەڵامدانەوە بدزێتەوە ئنجا گوتی: (حکومەتی ئەمریکا هیچ جۆرە پەیماننامەیەکی هاوبەشی داکۆکی لەگەڵ دەوڵەتی کوێتدا نییە..)، ئنجا دوای سێ رۆژ سەربازی عێراقی چووە ناو خاکی کوێتەوە لەکاتێکدا ئەمریکا خۆیشی تێنەگەیاند. بەڵام کاتێك (C.I.A) بەئامانجی خۆی گەیشت و رای جیهانیی کۆکردەوەو یەکخست، لەشکری ئەمریکا سەرکردایەتیی لەشکری هاوپەیمانیەتی جیهانیی کرد بۆ گرتنەوەی کوێت، ئنجا بنکەیەکی سەربازییان لەناوچەکەدا دامەزراندو بەمە خەونێکی دێرینی خۆیان هێنایەدی. لەبەشی سێیەمی کتێبەکەم(کورد دوژمنی خۆت بناسە) ئەو رووداوانەم بەدوورودرێژی باسکردووە.

لێرەدا تەنها ئەوەندەم لەدەست دێت ئاخو حەسرەت بۆ گەلی عێراق هەڵکێشم بۆ ئەو رۆژە رەشەی لەسایەی دەستەڵاتی فەرمانڕەوا پێی گەیشتووە. لە ٢٠٠١/٧/١٨دا نامەیەکم لەرێی پۆستەی

ئەلکترۆنییەوە بۆ سەرۆکی عێراقی نارد کەهەمووو شتێکم تێدا روونکردەوە تەنانەت رێگەچارەی بەئاوات گەیتشتنیشم بۆ دیاریکرد بەڵام بێئەوەی ئامۆژگارییەکانم جێ بگرن.

## دەزگای موخابەراتی عێراقی

مێژووی دامەزراندنی ئەم دەزگایە لەعێراقدا بۆ سەردەمی یەکەم حوکمی پاشـایەتی و دامەزراندنی حوکمەتی عێراق دەگەڕێتەوە. ئەم دەزگایە رۆڵێکی
دیـاری هـەبووە لـەڕووی پارێزگـاریکردن لەسـستەمی پاشـایەتی لەولاتـدا. هـەروەها پاراسـتنی سیاسـەتمەدارو سـەرکردە ناسـراوەکان، لەهەمانکاتـدا کوتـەکێك بـووە سـەری هـەوادارانی بیروبـاوەڕی کۆمـۆنیزم و نیـشتمانپەروەری کـوردی کوتاوەتـەوە کـەپیاوانی دامودەزگـا ئەمنییـەکان دەسـتگیریان دەکـردن و قەرەپەسـتی گرتووخانـەو زیندانـەکانیان دەکـردن. بـەلام هەرچـۆنێك بووبێـت، مەسـەلەی زاڵدەستیی دامودەزگا ئەمنییەکان و سەرکوتکردنی گەلی عێراق شێوە دادپەروەرییەکی تێدابووە، چونکە وەنەبێت هەرکەس بگیرایە لەسێدارە بدرایە یا زیندانیکردنی هەتاهەتایی بەشی بوایە بەڵکو، ئەو کەسە دەدرا بەدادگایـەکی سـەربازی کەبەڵگـەی تـەواوی لەبەردەسـتدا دەبـوو و دوو شایەدیـشی بـۆ پاڵپـشتی بەڵگەکان بـەکاردەهێنا، ئیتر کەسـی تۆمـەتبار یا لەسـێدارە دەدرا، یـا رەوانـەی زینـدانی نـوگرە سـەلمان دەکرا، یا چەند رۆژێك لەگرتووخانە دەست بەسەردەکرا یا ئازاد دەکرا. ئەوەی هـەبوو جاروبـار دادگـای سەربازی لەچەند ئەفسەرێك پێکدەهێنرا کە بەئارەزووی خۆیان خەڵکیان دادگاییدەکرد.

لەوسـەردەمەدا بەرێوەبـەری دەزگـای ئـەمن (ئاسـایش) بـەرێز بەهجـەت عەتیـە بـوو کـەپیاوێکی سیاسەتمەدار، زرنگ و لەناو خەڵکدا ناسراوو بەشان و شکۆبوو. دەزگاکـەی بـەرێکوپێکی بـەرێوەدەبردو بارودۆخی ولاتی کۆنترۆڵ کردبوو. هـەتا رۆژێـك خوا کردی کەئەم بەرێوەبەرەی دەزگـای ئـەمن، خاوەن شـکۆ عـەبولئیلاهو سـەرەك وەزیـران نـووری ئەلـسەعیدی لـەرێی ئـەو راپـۆرتانـە ئاگـادارکرد کەبـەهۆی سـیخوڕەکانیەوە دەگەیـشتنە بەردەسـتی، بـۆی دەرکـەوت کـەجموجووەلیکی گومانـاوی لەلایـەن چـەند سەرکردەو ئەفسەرێکی سوپاوە لەئارادایە کەعەبدولکەریم قاسم رێبەریانـە. ئەوەبوو شـۆڕش هەڵگیرسـاو لەیەکـەم رۆژیـدا(١٤ی تـەمووزی ١٩٥٨) بەندییـە سـیاییەکان ئـازادکران و زینـدان و گرتووخانـەکان چۆڵکران، ئنجا بریار دەرکرا کەزیندانی نوگرە سەلمان مۆربکرێت. دوا بـەدوای ئەمـە فەرمانـدرا بەهجـەت عەتیە دەستگیر بکرێت و درا بەدادگای شۆڕش کەئەویش لەسۆنگەی ئەوەی نـاوبراو پـشتگیریی حـوکمی پاشایەتی کردووەو بەرامبەر ئیرادەی گەل وەستاوە، حوکمی لەسێدارەدانی دەرکرد.

لەسـەرەتای شـۆڕشـدا سـوپا زۆر شیلگیرانەو بەتونـدوتۆڵی هاوکـاریی جـەماوەری دەکـرد بۆیـە تـوانی رژێمی پاشایەتی برووخێنێت و دەستوپێوەندەکانی بگرێت کەژمارەیەکی کەمیان لەمردن رزگاریـان بـوو. ئـەو شۆڕشـە جەماوەرییـە، بـوو بەمایـەی یـەکگرتنی چـین و تویـژە جیاجیاکـانی گـەل بـەلام حزبـە سیاسییەکان لێنەگەڕان گەل بەکامی دڵی بگات، چونکە هەرزوو دەستیانکرد بەدووبەرەکی نانـەوە لـەناو خەڵکداو کەلێنێکی گەورەیان لەناو جەماوەردا دروستکرد.

لـەماوەی ململانێـی نێـوان حکومـەتی عەبدولکـەریم قاسـم و ئـەو کۆسـپ و تەگەرانـەی دەهاتنـە رێـی، دەزگـای موخابـەراتی دەوڵـەت رۆڵێکـی گـەورەی لەئاژاوەنانـەوە بینـی، ئەمـەش بـەهۆی لاوازی دەزگاکـەو خـراپ بـەکارهێنانی هـەروەها هەڵـسوکەوتی نەشـارەزاو هەڵەکارانـەیان لەگـەڵ حزبـە عـەرەبی و

کوردییەکاندا، چونکە پیاوانی ئەم دەزگایە وەکو کوێر وابوون، بۆ نموونە منیان لەسەر ئەوە گرت گوایە ئەندامی پارتیم لەکاتێکدا واش نەبوو. زۆر نموونەی تری لەم بابەتەش هەیە.

دەزگای ئەمنیی لەمەڕ عەبدولکەریم قاسم، هەرچەندە لەئەگەری روودانی کودەتا ئاگاداریکرد بەڵام پیلانەکان بۆ ڕووخاندنی دەسەڵاتەکەی، بەهێزتر بوون. چونکە پێش کودەتاکە یەکێك لەسەرکردە بەعسییەکان لەوانەی لایەنگری عەبدولکەریم قاسم بوو پلانی کودەتاچییەکانی بۆ قاسم ئاشکراکردو بەوردی ناوی یەکەیەکەیانی‌دا، بەڵام سەربارێشی کودەتاکە روویداو بەعسییەکان دەسەڵاتیان گرتەدەستو قاسمیان راپێچی ئیزگەکرد تا ناوی ئەو سیخوڕەیان بداتێ کەئەو زانیارییانەی لەسەریاندابوو. ئەوەبوو عەلی ساڵح ئەلسەعدی، بەخۆی لێپێچینەوەی لەگەڵ قاسمو هاوڕێکانیدا کرد بۆ ئەوەی دان بەناوی سیخوڕەکەدا بنێن کەئایا لەناویاندایە یا نەء ! بەڵام عەبدولکەریم قاسم سووربوو لەسەر ئەوەی ناوەکە نەدرکێنێتو ناوی ئەو کەسە هەر ئاشکرانەبوو.

**پێکهێنانی دەزگای موخابەراتی عێراقی**

ئەو کەسەی ئەم دەزگایەی لەعێراقدا دامەزراند (Mr.X) هاوولاتییەکی عێراقیی بەڕەگەز عەرەبو دەرچووی یەکێك لەزانکۆیەکانی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکابوو. ئەم پیاوە شارەزایی هەبوو لەرێکخستنو کاری ئەندامانی دەزگاکەو رێکخستنیان بەشێوەی هەرەمی‌هێشوویی، چونکە بازنەی کارەکە بەم شێوەیە تەواو دەبێتو ئەگەر دەنکێکی ئەو هێشووە بپچڕێت ئەوە پەیوەندیی لەناو چوارچێوەی بازنەکەدا دەپچڕێت.

ناوبراو دوای تەواوکردنی پێکهێنانی بەشو لقەکان هەروەها دابەشکردنی کارو فرمان بەسەر بەشەکاندا کە لەرووی تیۆرییەوە دەزگای موخابەراتی عێراقی ئامادەکرا بۆ کارکردن، راپۆرتی خۆی بەرزکردەوە. سەرکردە بەعسییەکان زۆر بەزەحمەت توانییان ئەم ئیدارە نوێیە وەرگرن، سەربارێشی بەفەرمانی ئەحمەد حەسەن ئەلبەکر رەزامەندی دەرچوو دەستکرا بەکار. بەڵام دەسەڵاتدارانی عێراق داوایان لە(Mr.X) ی دامەزرێنەرکرد ولات بەجێبێڵێت و هەتا ئاگاداری دەکەنەوە لەلوبنان بمێنێتەوەو هەموو پێداویستییەکی مانەوەو حەوانەوەشیان بۆ دابینکرد بەمەرجێك تەنها بەئاگاداریی دەستەڵاتدارانی عێراق نەبێت، نەیەتەوە .

پیاوێکی هەتا بڵێت پسپۆڕبوو لەبواری کاری موخابەراتیدا، لەو ماوەیەشدا کە لەگەڵیدابووم زۆر نهێنیی دەزگای موخابەراتم بۆ ئاشکرابوو، زانیاریی گرنگی پێدام، بەڵام بەهۆی بارودۆخی سیاسیی هەریەکەمان کەیەکینەدەگرتەوە، بیستو پێنج ساڵە نەمبینیوە.

دەسەڵاتی عێراقی هەموو هۆکارێکی بالای تەکنەلۆجیی بۆ ئەم مەبەستە دابینکردو لەپێناو پەرەپێدانی دەزگاکە پشتی بەشارەزاو پسپۆڕی تری لێهاتوو بەست. ئەم دەزگایە ئەگەرچی سەرەتا بەپێی سستەمێکی ئەمریکی بەڕێوەدەچوو بەڵام بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ لەژێرکاریگەریو رێنماییەکانی دەزگای K.G.B ی رووسی، وەرگەڕایە سەر رێرەوی بلۆکی سۆسیالیستی. بەکورتی،

دەزگـای موخابـەراتی عێراقـی، ٩٥٪ی پێـڕەوی کـاری لـەرۆمانیا، کۆریـای بـاکوور، کووبـا، ئـەڵمانیای دیموکرات( ئەوسا)، بولگاریاو چیکۆسلۆفاکیا وەرگرت.

شـایەنی باسـە ڕێوشـوێن و ڕێبـازی کـاری سـستەمی سۆشیالیـستی" دابینکردنـی پێداویـستییەکانە هەروەها پشتبەستن بەزۆرترین ژمارە لەکارمەندانی دەزگاکە بۆ زانینی هەواڵ و زانیاری دەربارەی گەل و ئاشکراکردنی سادەترین زانیاریی ڕۆژانە دەربارەیان. بۆنموونە: هاووڵاتی (ئازاد) خـاوەنی هەشت سـەر خێزانـە، داهـاتی سـاڵانەی بیست هـەزار دینـارە، سـەر بـەهیچ حزبێکـی سیاسـی نییـە، لەفەرمانگەیـەکی حکومیـدا کارمەنـدە. ئـەم ئـازادە ڕۆژانـە ڕاپـۆرتی لەسـەر دەنووسـرێت دەربـارەی سـەعاتی دەرچـوونی لەماڵەوە کەبۆ نانەواخانە ڕۆیشتووە، ئنجا چۆتە دوکـانی وشکەفرۆشێك و ئەوەو ئەوەی کڕیـوە، پاشـان سەردانی فلاَن قەسابی کردووەو ئەوەنـدە کیلـۆ گۆشـتی کڕیـوە، دوای ئـەوە بەتاکسییەك گەڕاوەتـەوە بـۆ ماڵـەوە، لای عەسر چووە بۆ لای فلاَن سەرتاش سەری چاك بکات، ئنجا چووە بۆ فلاَن یانەو لـەوێ لەگـەڵ فلاَن و فلاَنـدا دانیـشتووە. شـەو سـەعات ئەوەنـدە گەڕاوەتـەوە بـۆ ماڵـەوە. جگـە لـەم زانیارییانـە شـتی تـر ئەگەر هەبێت دەربارەی پەیوەندیی بیژۆك.

بـەم شـێوەیە ڕۆژانـە زانیـاری دەربـارەی هـەر گومـان لێکراوێـك کۆدەکرێتـەوەو دەخرێتـە دۆسـیەوە بـا ڕێژەی گومان لەسەر ئەو کەسە ١٪ یش بێت، ئنجا ئەم زانیارییانە هەڵدەگیرین هـەتا لـەناکاو ئـەو کەسـە، بەتۆمەتی ئەوەی سەر بە حزبێکی سیاسییە، دەستگیر دەکرێت. جا دەزگای موخابەرات ئەگەر ویستیان ئەم ئازادناوە بەکاربێنن ئەوە زانیارییەکان لەدژی بەکاردێنن و تۆمەتێکی سـووکی دەدەنـە پـاڵ. ئیتر بـەم شێوەیە بەرامبەر هەموو هاووڵاتییەك دەکرێت و بەمەش دەتوانن گەل جڵەو بکەن هەروەکو لەگەڵ خەڵکی عێراق لەباکوورەوە هـەتا باشـوور کردوویانـە، واتـە بچووکترین تایبەتمەندیی هـاووڵاتی تۆماردەکەن بـۆ زانینی خاڵەکانی لاوازی ئنجا بەکارهێنانیان بۆ کۆنترۆڵکردنی ئەوکەسە، بۆ ئەمەش دەزگای موخابەرات بایەخ بەوەرزش و ڕەیسز( پێشبڕکێی ئەسپ)دەدات هـەروەها کردنـەوەی مـەلهاو گـازینۆو ڕێـستۆرانت بـۆ ئاسانکردنی کاری موخابەرات لەداهێنانی شوێنی تەنگەبەردا، دوای ئەوەش بـەکارهێنانی هـەموو جـۆرە دەزگایـەکی ڕاگەیانـدن لـەرێی تەکنـەلۆجیای پێـشکەوتوو، لەگـەڵ پەخـشکردنی بەرنامـەی داڕێـژراو بـۆ کۆنترۆڵکردنی بیرو هۆشی خەڵك.

لەلایەکی تریشەوە دەزگای موخابەرات کاردەکات بۆ نـەمانی هەنـدێك خـۆراك لـەبازاڕداو دابەشـکردنی لەرێی بریکارە ڕەسمییەکانەوە تا هاووڵاتی عێراقی بەردەوام سـەرقاڵی پەیـداکردنی خـۆراکی ڕۆژانـەبێت کە لەرێگەی ئەمەوە، ژمارەی ئەندامانی هەر خێزانێك دەزانرێت.

جگەلەمانە، هۆکاری سەرەکی بۆ پشت شکاندنی هاووڵاتی، بەکارهێنانی هێـزو زەبـرو زاڵدەسـتییە تـا لــەناو مــاڵی خۆیــداو لــەناو خێزانیــشیدا نــەتوانێت لاری بنوێنێــت. واتــە: ئاگــادارکردنی هــاووڵاتی لەهەمووساتێکدا بەوەی کەلەلایەن ئامێری بچووکی بیستنەوە چاودێری دەکرێت کە لـەناو ماڵەکەیـداو لـەناو کەلوپەلەکانیـدا شـاردراوەتەوە، هـەروەها هەرچـی کەسـێك کـە لەدەرورووپـشتیەتی بـەکرێگیراوی

دەزگای موخابەراتە. جا هەر بەدروستکردنی گومان لای هاووڵاتی، ئیتر دەستگیرکردنی ئاسان دەبێت‌و خۆ ئەگەر بەساغی لەزیندان دەرچوو ئەوە بەخت یاوەری بووە.

ئامانجی دەزگای موخابەرات لەبەرکارهێنانی ئەم رێوشوێن‌و تەکنەلۆجیایانە کۆنترۆڵکردنی هاووڵاتیی عێراقییە بۆ زانینی هەر جووڵەیەك کە دەستپێکردنی شۆڕش یا پێکهێنانی بەرەیەکی ئۆپۆزسیۆنی لەدواوە بێت یان پێکەوەنانی گەلەکۆمەکی بێت کەهەڕەشە لەئاسایش‌و ئارامیی حکومەتی عێراقی دەکات. جا بەپێی رێبازی مامەڵەکردن لەگەڵ بەرەی ئۆپۆزسیۆن‌و کودەتاچییان، موخابەراتی عێراقی نەریتی وایە کەهێزەکانی ئاسایش(ئەمن) دەکەونە دەستگیرکردنی هەموو گومانلێکراوێك‌و لەجێدا لەسێدارە دەدرێن.

بەڵام ئەم دەزگایە، کارەکەی بەسادەیی ئەنجام نادات بەڵکو ڕێبازێکی زۆر چەپەڵ بەکاردێنێت چونکە کاتێك چاودێرانی دەزگاکە هەوڵیکی کودەتا ئاشکرا دەکەن وەنەبێت لەهەمان ساتدا تۆمەتبارو گومانلێکراوەکان بگرن، بەڵکو لێیان دەگەڕێن بەردەوام بن لەجموجووڵ بۆ ئەوەی لەکۆتاییدا بەتەواوەتی بزانن بەشداربوان چەند کەسن، ئنجا کادیرانی دەزگاکە خۆیان بۆ هەموو بەشداربوو و گومانلێکراوێك دەنێنەوە هەتا سەعاتی سفر دێت کاتێك هەر هەموویان دەستگیردەکرێن‌و لەسێدارەدەدرێن. ئنجا دەربارەی ئەوکەسەی چووبووە ریزی کودەتاچی یا پیلانگێڕەکان‌و هەواڵەکەی بەدەزگا دابوو ئەوە ماوەیەکی کورت لێی دەگەڕێن، بەڵام دوای ئەوە نۆرەی ئەویش دێت‌و لەناوی دەبەن، ئەمەش بۆ ئەوەی هەواڵەکە بڵاونەبێتەوەو خەڵك فێری یاخیبوون نەبێت یا هەر بیریشی لێنەکەنەوە.

ئەو رێنماییانەی بەڕێوەبەری دەزگا بۆ کادیرانی دەزگای دەردەکات دەبێت وەکو فەرمان وەربگیرێن‌و بەبێ چەندوچۆن جێبەجێ بەکرێن، ئنجا خاك بەدامەنی ئەوەی لەجێبەجێکردنیاندا کەمتەرخەمی دەنوێنێت یا بەوردی ئەنجامیان نادات.

چاودێریی دارایی، بەرێوەبەری دەزگا ناگرێتەوە، چونکە بەرێوەبەر دەستەلاّتی ڕەهای هەیە کەچۆن‌و چی‌و چەند خەرجدەکات، جگە لەوەی مافی هەیە ناوی ئەو کادیرانەی دەزگا ئاشکرا نەکات کە لەناوخۆو دەرەوەی وڵاتدا کاردەکەن.

بەڕێوەبەری دەزگای موخابەرات دەستەلاّتی ڕەهای هەیە لەڕووی دەستێوەردان لەکاروباری هەموو فەرمانگەو دامودەزگا رەسمییەکان بەوەزارەتی ناوخۆ بەخۆی‌و بەشەکانیەوە. لەهەمانکاتدا بەڕێوەبەر، لەپێناو گەیشتن بەئامانج‌و جێبەجێکردنی کارەکەی بۆی هەیە هەرچی پێچەوانەی یاسایە بیکات. واتە دەتوانێت لەکاتی پێویستدا چەك، پارە، فێڵ‌و کەڵەك، دزی، بێهۆشکردن‌و تەنانەت ئەگەر پێویستیکرد سێکسیش بەکاربێنێت. سەرۆکی وڵات تەنها کەسێکە بۆی هەیە مشتومڕو لێکۆڵینەوە لەگەڵ بەرێوەبەردا بکات یان بەرنامەو پێڕەوی کاری دەزگا راستبکاتەوە یا تەنانەت موحاسەبەی کادیرانی دەزگا بکات.

لێرەدا مەسەلەی بڕوا دووبارە دەکەمەوە کەدەبێت ئەوپەڕی بڕوا لەنێوان سەرۆکی دەوڵەت‌و بەڕێوەبەری دەزگاو سەرۆکی بەشەکان‌و ئەندام‌و کادیرەکاندا هەبێت.

دەبێت ئەوانەی رۆژانە راپۆرت بۆ سەرۆکی بەشەکان بەرزدەکەنەوە خاوەنی هەستو گیانێکی دەستپێشخەربن، واتە هەرچی مەسەلەیەکیان خرایە بەرچاو یەکسەر چارەسەری بۆ بدۆزنەوە. ئنجا سەرۆکی بەش، ئەو راپۆرتە بۆ بەڕێوەبەری دەزگا بەرز دەکاتەوە ئەوەش دوای چاککردنو روونکردنەوەی لایەنە تەمومژاوییەکانی.

پاشان بەڕێوەبەری دەزگا، دوای تاوتوێکردنی ڕاپۆرتەکە لەگەڵ سەرۆك بەشەکاندا، بۆ سەرۆکی دەوڵەتی بەرزدەکاتەوە کەئەویش لەلای خۆیەوە دەیخاتە بەرچاوی سەرکردە بەعسییەکان بۆ لێکۆڵینەوەو هەڵسەنگاندنی هەموو لایەنێکی ڕاپۆرتەکە بەچاكو خراپییەوە. ئنجا کاتێك سەرکردایەتیی حزبی بەعس بریار لەسەر راپۆرتەکە دەردەکات" سەرکۆمار فەرمانێکی پێدەردەکات.

شایەنی باسە کەدروشمو نەریتی باوی حزبی بەعس لەعێراقدا، ئەنجامدانی هەرچی کارێکە کەنەشێت بکرێت، ئەمەش لەپێناو پارێزگاریکردن لەدەسەلاَتی حزب لەناو ولاَتدا هەروەها پاراستنی ئەمنی

نەتەوەیىو ئەندامانی سەرکردایەتی.

سەرکردەکانی حزبی بەعس، دوای ئەوەی شارەزاییان لەدەزگای موخابەرات پەیداکرد هەموویان پێیان لەسەر ئەوە داگرت کەدەبێت بەڕێوەبردنی بەسەدام حسەین بسپێردرێت، ئەو برادەرەش چووە ژێر بارەکەو بوو بەیەکەم بەرپرسو سەرپەرشتیاری ئەو دەزگایە. جا بەهۆی ئەم توانا نوێیەوە(موخابەرات)، سەدام توانی وردەوردە دەست بەسەر عێراقدا بگرێتو کاروبارو بارودۆخ کۆنترۆڵ بکات.

هەروەها توانی بەخۆشی بێت یا بەناخۆشی، پشتگیری زۆربەی سەرکردایەتیی بەعس بەدەست بێنێت. ئەم نهێنیانەو زۆری تریش دوای ٢٥ ساڵ ئاشکرابوون بەلاَم من، لەڕێی بەڕێز نازم گزارەوە ئەمانەم زانی کەپەیوەندییەکی توندوتۆڵم لەگەڵیدا هەبوو، چونکە ناوبراو کرابووە بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی، هەروەها بەفەرمانی ئەنجومەنی شۆڕش" جێگری بەڕێوەبەری گشتیی پۆلیسیش بوو کەپەیوەندیی پتەوی لەگەڵ سەدام حسەیندا هەبوو، ئەوەبوو هەردووکیان(سەدامو نازم) دەستیان خستە ناودەستی یەکترو عێراقیان بەتەواوەتی کۆترۆڵکرد، ئەمەش لەڕێی پێکەوەلکاندنی هەردوو دەزگای ئاسایشو موخابەرات.

لەناو ئەندامانی سەرکردایەتیی حزبی بەعس لەوانەی ئاگاداری ئەم وردەکارییانەن ئێستا تەنها دوو کەسیان لەژیاندان ئەوانیش بەڕێزان تارق عەزیزو عزەت دوورییە کەئەمانە، لەپێناو پاراستنی گیانیان ورتەیان لەزار دەرنەچووە کەسەرۆك سەدام حسەین پێی لێڵ بێت. بەڕێز تارق عەزیز خەڵکی بەرتەلەی لای مووسڵەو لەمەسیحییە کلدانەکانە. بنەماڵەکەی، خۆیان بەکورد دەژمارد هەتا ناوی لە(دنخە)وە بۆ تارق عەزیز گۆڕی ئنجا ڕەگەزی نەتەوەییشیان گۆڕی. هەرچی بەڕێز عزەت دووریشە ئەوە خۆی واتەنی، لەسۆفییەکانەو خەلفەی شێخی رێبازی کەسنەزانییە.

کودەتای نازانم گزارو محەمەد فازل ئەگەر سەرکەوتبا ئەوە خوالێخۆشبوو عەبدولخالق سامەڕائی دەبوو بەسەرکۆمار، ئەوساکەش بەڕێزان ئەحمەد حەسەن ئەلبەکرو سەدام حسەین یا لەسێدارەدەدران یا بۆ دەرەوەی وڵات دوور دەخرانەوەو گەلی کوردیش ئەو نەهامەتیانەی بەسەر نەدەهات کە بەدەستی ئەلبەکرو سەدام چەشتی.

مەراقی گەورەوگرانی سەرکردایەتیی حزبی بەعس ئەوساو ئێستاش" دانانی ستراتیژێکی ئەمنی بوو بۆ پارێزگاریکردن لەئەمنی نەتەوەیی هەروەها سەپاندنی زاڵدەستیی رەهایان بۆ دەرکردنی بڕیار لەلایەن سەرکردایەتیی شۆڕشەوە بۆ پێکهێنانی دامودەزگا ئەمنیو موخابەراتییەکانی وەك: بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی پۆلیس، ئیستخباراتی سەربازی، ئاسایشی گشتی، موخابەراتی گشتیو رێکخستنی حزبی بەعس.

١ـ کارمەندانی بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی پۆلیس دەبێت پەیمان بدەن کەسەر بەهیچ حزبێکی سیاسی نین جگە لەحزبی بەعسی سۆشیالیست کەدەبێت بەزۆر ببن بەئەندامیو لێبڕاوانە کار لەناو ریزەکانیدا بکەن بۆ بەرزبوونەوەی پلەیانو بەدەستهێنانی پۆستی حزبی کەئەمەش نیشانەیەکی ئاشکرایە کەئەو ئەندامە چالاکە.

٢ ـ مەرجەکانی سەر کارمەندانی ئیستخباراتی سەربازی بەهەمان شێوە وەکو مەرجەکانی کارمەندانی بەرێوەبەرایەتیی گشتیی پۆلیسە بەلاّم جیاوازییەك لەنێوانیاندا هەبێت توندیو سەختیی ئەو سزایەیە کە بەسەر ئەفسەرو سەربازە کارمەندەکاندا دەسەپێنرێت کەحوکمی لەسێدارەدان بەشی کارمەندی سستو کارنەکەرە.

٣ ـ مەرجەکانی کارمەندانی ئاسایشی گشتیش دووبارە بەهەمان شێوەیەو سزاکانیشیان قورسترە، جگەلەوەی کارو ئەرکەکانیان فراوانترو مەترسیدارترن، چونکە ئەمانە بەرپرسیارن لەپارێزگاریکردنی ئارامیو ئاسایشی بەغدای پایتەخت لەدوژمنانی حزبی بەعس، هەروەها بەرپرسیارن لەوەی رێ نەدەن ئاژاوەو پشێویو کاری تێکدان رووبدات کەزیان بەئاسایشی پایتەخت دەگەیەنن، هەروەها پارێزگاریکردنی سنووری وڵات لەدزەکردنی هەربێگانەو گومانلێکراوێك بۆ ناو وڵات یا هەر پەیوەندییەکی گوماناوی لەگەڵ حزبێکی نەیار یان دەوڵەتێك، دۆست بێت یا دوژمن.

٤ـ دەربارەی مەرجەکانی دامەزرانو کارکردن لەموخابەراتی گشتیدا ئەوە بەهەمان شێوە وەکو مەرجەکانی لەمەڕ دامودەزگاکانی تری سەرەوەیەو هێشتا توندتریشە، کارمەندەکانیشی لەناو وڵاتدا بالاّدەستترنو گەورەترین دەستەلاّتیان لەلایەن رژێمەوە پێدراوە هەروەها مەترسیدارترین کارو فەرمانیان پیسپێردراوە کەپەیوەندیی بەئاسایشی دەوڵەتەوە هەیە وەك کودەتا، تیرۆر، لەسێدارەدانو کۆکوژی.

٥ ـ لەکۆتاییدا رێکخستنەکانی حزبی بەعس دێت کەدەبێت هەموو هاووڵاتییەکی رێکوپێك بچێتە ریزی ئەم رێکخستنەوە، ئەوەی ملیش نەدات ئەوە بەهاووڵاتیی پلەدوو لەقەڵەمدەدرێت. چوونە ریزی رێکخستنی حزبی بەعس هەموو چینو توێژەکانی کۆمەڵگە دەگرێتەوەو کەسی لێ هەڵنەبوێردراوە، ئەوەی نەچێتە ریزی بەعسەوە نیشانەیەکی پرسیار((؟)) لەسەر دۆسیەکەی دەکێشرێتو دەخرێتە ژێر

چاودێریکردنێکی وردو توندەوە، هەروەها لەزۆر مافی مەدەنی بێبەش دەکرێت، ئنجا قوڕ بەسەری ئەگەر بەئاستەم پێی خوار دانا .

دوای پێکهێنانی ئەو پێنج دەزگا ئەمنییەی سەرەوە، ئەنجومەنی شۆڕش بەیاننامەیەکی دەرکرد تێیدا جەختی لەسەر ئەوەکرد کەرژێمی عێراق پشتگیری ئەو دامودەزگایانە دەکات و دەستەڵاتی رەهای پێداون بۆ سەقامگیرکردنی دەسەڵات و ئاسایش و ئەمنی نەتەوەیی بەعس. هەروەها ئەنجومەنی شۆڕش بڕیاریدا مەسەلەی کورد لەباکوورو کێشەی شیعەکان لەباشووردا، چارەسەربکات. شایەنی باسە دامودەزگا ئەمنییەکان ئەوساو ئێستاش لەپەیوەندییەکی بەردەوام و راستەوخۆدابوون لەگەڵ سەرۆك ئەحمەد حەسەن ئەلبەکرو سەدام حسەینی جێگریدا، کەئەمانە بەهۆی ئەو دامودەزگایانە وڵاتیان کۆنترۆڵ دەکرد. بەڵام لەو دەمانەدا هێشتا دژایەتیکردنی ئاشکرای بەعس بۆ کوردو شیعەو ڕاگەیاندنی جەنگ لەدژیان، سەری هەڵنەدابوو.

سەدام حسەین لەسەرەتای ناودەرکردنیدا، لەناو سەرکردەکانی حکومەتی عێراق هەروەها لەناو گەلدا وەکو پیاوێکی دەست و داوێن پاك و بەویژدان و دڵسۆز ناوبانگی دەرکرد. خانوویەکی بۆ خۆی نەبوو، هەموو کاتێکی خۆی بۆ خزمەتکردنی حزبی بەعس و گەلی عێراق و سەرجەم عەرەب تەرخانکردبوو. بەکورتی، بەلای هەموو خەڵکەوە نموونەی مرۆڤی شۆڕشگێڕو پرۆلیتاربوو، لەبژێوی رۆژانە بەولاوە چاوی لەهیچیتر نەبوو. ئنجا رۆژ لەدوای رۆژ ناوی بوو بەوێردی سەر زرای هەموو بەعسییەك. پاشان دەستیکرد بەلابردنی نەیارەکانی لەدەستەڵاتدا ئەوەش لەرێی کردنیان بەگژی یەکتر، یان داباراندنی ماڵ و سامان بەسەریاندا، یا سەرقاڵکردنیان بەخۆشی و رابواردن و کۆکردنەوەی پارە بەناشەرعی.

ئنجا کەوتە هاندانی بنەماڵەی ئەحمەد حەسەن ئەلبەکرو ساڵح مەهدی عەمماش بۆ دەستکردن بەقاچاخچییەتی چونکە ئەمە خێراترین رێگەیە بۆ پارە کۆکردنەوە. لەو رووەشەوە کارئاسانی بۆ کردن، هەموو ئامانجێکیشی شێواندنی وێنەی سەرکردەکانی بەعس بوو لای رای گشتی بۆ ئەوەی لەکۆتاییدا لەپلەوپایەیان کەم بێتەوەو ناوبانگی سیاسییان بزڕێت. هەر بەراستیش دوای ماوەیەك توانی بەبەهانەی کۆکردنەوەی پارەو بەرتیل وەرگرتن و قاچاخچیەتیکردن و گرتنەبەری رێوشوێنی نایاسایی بۆ کۆکردنەوەی ماڵ و سامان، سەدام توانی ژمارەیەك لەئەندامانی سەرکردایەتی لێبخات. هەر خۆیشی لای سەرکۆمار ئەلبەکر ناوی دەدان و بوو بەمایەی ئەوەی ژمارەیەکیان زیندانی بەکرێن و لەئەنجامدا وێنەیان لەبەردەم رای گشتی و رێکخستنە حزبییەکاندا ناشیرین بوو.

سەدام بەم کردەوانەی رێچکەیەکی بۆ گەیشتن بەلووتکەی دەستەڵات بۆ خۆی کردەوە جگە لەوەدەستهێنانی بڕوای سەرکۆمار دوای ئەوەی نەیارەکانی لاداو خۆی وەکو عێراقییەکی بەعسی جوانمەرد دەرخست. ئنجا ئەلبەکری بەرنەداو خۆی لەبەرچاویدا وادەنواند گوایە کۆڵەکەیەکی بنەڕەتییە لەدەستەڵاتدا. پاشان دامودەزگا ئەمنییەکانی کۆنترۆڵکردو هەرچی لایەنگری ئەلبەکر بوو لایدان و لایەنگری خۆی لەجێیان دامەزراند. هەرچەندە ٩٩٪ی ئەو دامودەزگایانەی کۆنترۆڵکردبوو، بەڵام مەراقی هەرە گەورەی ئەوەبوو کەسوپاو وەزارەتی بەرگریی بۆ کۆنترۆڵ نەکرابوو کەئەمانە سەر بەخودی ئەلبەکر

بوون. بۆیە سەدام هەوڵیدا فەرماندەی فیرقەکان و لێپرسراوانی وەزارەتی بەرگری بگۆڕێت، ئنجا لەکۆتاییدا دەریچەیەکی بۆ ئەم ئامانجەی دیتەوە ئەویش لەرێی کۆنترۆڵکردنی مەکتەبی سەربازی کە بەهۆیەوە توانی تۆمەت و درۆودەلەسە بۆ هەندێك لێپرسراوی سەربازی هەڵبەستێت جگە لەدەمچەوەرکردنی هەندێك لێپرسراو بۆ زڕاندنی ناوی هەندێکی تر بەتایبەتی لایەنگرو هەوادارانی ئەلبەکر. ئیتر بەم شێوەیە بەئاواتی خۆی گەیشت و ئەوەندەی نەخایاند کەسوپای کۆنترۆڵکرد. پاشان لەرێی سێ شتەوە کەوتە پارێزگاریکردن لەدەستەلاّتەکەی ئەوانیش زیندانیکردن، تیرۆرو رفاندن. لەیەکەم هەنگاویدا عەبدولڕەزاق نایفی لەئینگلتەرە تیرۆرکرد کەناوبراو لەسەردەمی دەستەلاّتی ئەحمەد حەسەن ئەلبەکردا سەرۆك وەزیرانی عێراق بوو، شایەنی باسە کەتیرۆرکردنی ناوبراو بەفەرمانی سەدام و ئەلبەکر بوو. ئنجا دەستیاندایە لەناوبردنی سەرانی حزبی بەعس لەوانەی مەترسییان لێیان هەبوو یا بڕوای رەهایان بەدڵسۆزییان نەبوو. بۆ لەناوبردنی ئەمانە، فڕێیاندەدانە ناو رووبار بۆ ئەوەی وای بنوێنن گوایە خنکاون، یان بەهۆی رووداوی ئۆتومبێل دەیانکوشتن، یان بەژەهر دەیانکوشتن و راپۆرتی پزیشکیش بۆی دەسەلماندن کە بەوەستانی دڵ مردوون. ئەمانە تا ئەمڕۆ ئەمە پیشەیانە، خوا لەبەلاّ لاماندات.

هەندێك جار لەوجۆرە کەسانەیان بەئاشکرا دەکوشت بەبێ ئەوەی سڵ لەکەسێك بکەنەوە، بەلاّم ئەمانە ئەگەر لەخوا نەترسن ئیتر مرۆڤ چییە لێی بترسن. خوالێخۆشبوو حەردان تکریتی، بەفەرمانی سەدام و ئەلبەکر بەدەستی گرووپێکی پسپۆڕی دەزگای موخابەراتی عێراقی، کەئەو دەمانە کارمەندی باڵیۆزخانەی عێراق بوون لەکوێت، کوژرا.

سەعدوون شاکر پلانەکەی داڕشتبوو کەحەموود عەزاوی بەشداریی جێبەجێکردنی کرد، کەئەمیش پاشتر بەفەرمانی سەدام تیرۆرکرا. ئەم هەموو رووداوانە روویاندا کەچی حکومەتی کوێتی متەقی نەکرد، بەڵکو چەند سەعاتێك دوای تاوانەکە، کوێت رێگەی بەوەزیری دەرەوەی عێراقدا، بەرێز عەبدلکەریم شێخلی کەبەبێ هیچ پرۆتۆکۆلێکی پێشتر، سەردانی کوێت بکات و بەهەمان فڕۆکە کەپێی چووبوو، ژمارەیەك لەجێبەجێکەری تاوانەکە لەگەڵ خۆیدا بەریتەوە، ئەوانی تر بەناوی چاودێر لەگەڵ تەرمی حەردان تکریتیدا رۆیشتنەوە، راستیان گرتووە: (کابرا دەکوژن و تەرمەکەشی بەرێدەکەن)، بەلاّم بیرمان نەچێت کوشتنی پیاوێك لەدارستانێکدا تاوانێکە چەند بۆچوونێك هەڵدەگرێت، بەلاّم لەناوبردنی سەرجەمی گەلێك تاوانێکە لێبوردنی نییە.

خوێنەری خۆشەویست: لەراستیدا لەپێناو بەرژەوەندیی و سەرفرازیی گەلێك، چاوپۆشی لەتاوانێك دەکرێت. جا بەیاننامەی ١١ی ئازاری ١٩٧٠ مەزنترین رووداوی مێژوویی بوو کە لەکوردستاندا دوای رووخانی کۆماری مهاباد روویدابێت. سەدام و بارزانی دەیانتوانی لەرێی ئەو بەیاننامەوە، مەسەلەی کورد لەعێراقدا چارەسەربکەن. چونکە لەو ماوەیەدا کاتێك چاوم بەچەند سەرکردەیەکی حزبی بەعس کەوت و لەمەترسییەکانی رێککەوتنی بارزانیی و تاڵەبانی ئاگادارمکردن قسەکەیان ئەمەبوو: ( درۆیە

ئەگەر بڵێین لەبارزانی بەولاوە دۆستی ترمان لەناو کورددا هەیە، هەمووتان بچنە پاڵ هێزی بارزانی، رەفیق پشدەری : هێزی بارزانی هێزی بەعسە).

بەڵام ئەوەندەی نەبرد نازم گزار، بەفەرمانی سەدامو ئەلبەکر پلانی بۆ تیرۆکردنی بارزانی دارشت ئەویش بەتەقاندنەوەی چەند ملایەك کەچووبوونە سەردانی. ئەم پیلانە بەخۆرایی نەبوو، بەڵکو ئەنجامی هاتنەدیی بەیاننامەی ئادارو بەئاوات گەیشتنی گەلی کوردستان بوو کەوای لەشای ئێرانو (C.I.A) و بەرێز هیلمزی باڵیۆزی ئەمریکا لەتارانو بەرێز هنری کسنجەر هەروەها ئیسرائیلو تورکیا کرد، کەدەست بخەنە مەسەلەکەوەو ئەگەر بەتیرۆرکردنیش نەبێت ئەوە لەرێی هەرەسهێنانی شۆرش ئەنجامی بدەن کە لەکۆتاییدا سەدامو بارزانی ئەم پلانەیان جێبەجێکرد هەروەکو لەکتێبەکانی تردا بەدووورودرێژی باسی ئەمەم کردووە.

شایەنی باسە زنجیرەی کردەوە تاوانکارییەکانی دەزگای موخابەراتی عێراق دوایی نایەت، لەناوچوونو بێسەروشوێنبوونی چارەنووسی قادر تەگەرانیو گرووپەکەی نموونەیەکی ترە .

### ئیستخباراتی سەربازی

هەروەکو لەوەوپێش باسمکرد سەرۆك سەدام حسەین بەشێوەیەك سوپای کۆنترۆڵکرد کەهیچ ئەفسەرێك، یان فەرماندەی فیرقەو سەرلەشکرێك، یان سەرکردەکانی هێزی ئاسمانی پرکێشی نەکەن بیر لەئەنجامدانی کودەتایەکی سەربازی بکەنەوە ئەمەش بەهۆی زەبروەشاندنی بێبەزەییانەی سەدام حسەین لەبەرامبەر هەرکەسێك کەخاڵێکی رەش لەدۆسیەکەیدا تۆمارکرابێت، وەك ئەوەی سەر بەحزبێکی تری سیاسی بێت جگە لەحزبی بەعس. لەم رووەوە دەزگای موخابەراتی عێراقی چەند هەڵمەتێکی دەستگیرکردنی ئەفسەرانیان جێبەجێکردووەو زۆریشیان لێ کوشتوون جگە لەوەی فەرماندە سەربازییەکان لەعێراقدا بەردەوامو شەوو رۆژ، چاودێریی توندیان لەسەرە.

بەڵام بیرمان نەچێت کەسەرۆك سەدام حسەین کاتێك سوپای کۆنترۆڵکرد کە هێزی گاردی کۆماری پێکهێنا، ئەم هێزەش سەلماندی بۆ هەموو کارو فرمانێکی سەربازی لەخزمەتی سەرۆکەکەیدایە.

### دەزگای موخابەراتی گشتی

دارودیواری ئەم دەزگایە شایەدی دەدەن کەسەدام لەکاتێکەوە ئەم دەزگایەی کۆنترۆڵکردووە هێشتا جێگری ئەلبەکربووە، ئەوەبوو وێنەکانی ئەلبەکر داگیرانو وێنەی سەدامیان لەجێدا دانرا. ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کەکارمەندانی ئەم دەزگایە بەتەواوەتی پیاوی سەدام حسەینن. سەدامو ئەلبەکر ٩٠٪ دەزگای موخابەراتیان لەخزمەتی خۆیاندا تەرخانکردبوو تەنها ١٠٪ی بۆ خزمەتی گەلی عێراق بوو.

بەرەنگاریکردنی ئیرادەی گەلی کوردستان هەروەها سەرکوتکردنی شیعەو زۆر رووداوی تری دڵتەزێن وای لەنازم گزارکرد هەوڵی کودەتا بداتو رژێم بگۆرێت. جا دوای سەرنەگرتنی هەوڵەکەی نازم گزار کاتێك دەستگیرکراو بەکەلەبچەکراوی بردیان بۆ بەردەستی ئەحمەد حەسەن ئەلبەکر، لێی پرسی: چی هانیدایت هەوڵ بدەیت حوکمی من بڕووخێنێت لەکاتێکدا من تۆم گەیاندە ئەوپلەیەو کردمیت بەوپیاوەو گەیاندمیتە پلەی بەرێوەبەری ئاسایشی گشتیو جێگری بەرێوەبەری پۆلیسی گشتی؟ نازم

گزار وەڵامیدایەوە: ڕاستییەکە پێچەوانەی قسەکانتە، چونکە ئێمە تۆمان هێناو کردمانیت بەسەرۆکمان تا خزمەتی عێراق بەگشتیو حزبی بەعس بەتایبەتی بکەیت، نەمانکردیت بەسەرکۆمار تاببیتە دکتاتۆر بەسەرمانەوەو دەست بەسەر ماڵو سامانی وڵاتدا بگریت هەی ناپاك.

ئنجا هەرئەوەندەی لای ئەلبەکر دەرچوو، لەگەڵ هەموو هاوەڵەکانیدا لەسێدارەدان ئەگەرچی گزار عێراقییەکی عەرەبو بەعسییەکی دڵسۆزی نیشتمانی بوو، بەلاّم بەرگەی زوڵمو زۆرو ستەمو گەندەڵی نەگرت. جامیش کەپڕپڕبوو، لێی دەڕژێت.

ئەوەی لە شوێنی گزار دانرا دکتۆر فازڵ بەڕاك بوو، کرا بەبەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی، بڕواپێکراوی سەدامو ئەلبەکربوو هەروەها جێبەجێکەری ژمارەیەکی زۆری تاوانەکانیان بوو، بەلاّم دوای ئەوەی هەستی بەدکتاتۆریەتی سەدامو ئەلبەکرکرد کەهەموو شتێك لەپێناو بەرژەوەندیی خۆیاندا دەکەن" هەوڵیدا رابردووی رەشی لەگەڵ سەدامو ئەلبەکردا کەدژی گەلی عێراق تۆماریکردووە، بسڕێتەوە. پلانی کودەتایەکی کێشا بەلاّم نەیزانی لەلایەن نزیکترین کەسیەوە چاودێریکراوە. کاتێکیش تاوانەکەی لەسەر سەلما دەستگیرکرا، ئازارو ئەشکەنجەی زۆردارو سوکایەتی پێکرا، ئنجا بردیانەوە بۆ تکریت، لەوێ بەچاوی بەستراوەوە زۆریان لێکرد لەبەردەم کوڕەکەیو باوکیو کەسوکارو عەشرەتەکەیدا وەکو کەر بزەڕێت ! ئنجا دوای ئەوە یەکسەر چاویان کردەوە، ئەویش دەستیکرد بەگریان، پاشان لەسێدارەدرا.

پێش ئەوە بەهەمان شێوە لەگەڵ خوالێخۆشبوو مورتەزا حەدیسی جوولاّبوونەوەو پاشتر کوشتبوویان. ئەمانە رووداوی سەرەکین، بەلاّم زۆر رووداوی تری لاوەکی هەن کەناژمێردرێنو لەدڕندەییدا وێنەیان نییە.

ڕێککەوتننامەی شوومی جەزائیر لەساڵ ١٩٧٥دا لەلایەن سەدام حسەینو شای ئێران ئەنجامدرا کە بەهۆیەوە بەهێزترین شۆڕشی چەکداری کوردیان لەسەدەی بیستدا بەسەرۆکایەتیی بارزانی، لەناوبرد. ئەو ڕێککەوتننامەیە سەدام حسەینی لەناوخۆی وڵاتو دەرەوەشیدا ناودارکردو وای لێکرد دوای ئەوە، بێ ئەوەی کەس بێتە ڕێگەی، وڵات بەڕێوەبەرێت ئەگەرچی هێشتا جێگری سەرکۆماربوو.

لێرەدا دەگەڕێینەوە بۆ مەسەلەی کوردو دەپرسین: مادەم لەکاتی ڕێککەوتننامەی جەزائیردا، قسە قسەی سەدام بووەو بەحسابی خۆی کاری بۆ یەکیەتیی عێراقو بەرژەوەندیی گەلەکەیدا دەکرد، ئیتر بۆچی لەگەڵ بارزانیدا ڕێکنەکەوت؟ خۆ ئەگەر گومانی لەبارزانی هەبوبێتو بەبەکرێگیراوێکی (C.I.A) و مووسادی دەزانی هەورەکو دەڵێت، کەواتە خۆی بەو هەموو زانایییەوە بۆچی شوێنو پلەی بارزانی نەگرت تا لەسەر کورسییەکەی خۆیەوە وڵات بەشێوەیەك بەڕێوەبەرێت کەدوای نەهامەتییەکیان لەئەنجامی ڕێککەوتننامەی جەزائیر، خۆی لەکورد نزیك بکاتەوە، سەدام بەم کارەی دەیتوانی رای گشتیی کورد بەلای خۆیدا راکێشێتو بۆ یەکجاری لەگیروگرفتو کێشەکانی باکووری عێراق رزگاری بێت، هەروەها ئاشتیو ئارامی بۆ خەڵکی عەرەبی ناوەراستو باشوور مسۆگەر دەکردو لەئەنجامدا عێراقێکی یەکگرتووی بەهێز دامەزرێنێت. بەلاّم لەئەنجامی ئەم پرسیارو لێکدانەوانە راستییەکمان بۆ

دەردەکەوێت ئەویش ئەوەیە کەسەدام حسێن، کە بەشەمەندەفەری ئەمریکا لەعێراقدا دەستەڵاتی گرتە دەست، کار بۆ (C.I.A) دەکات ئەوەش لەرێی کەناڵی ترەوە کەشای ئێران یا تورکیایە .

جارێکیان داوایکردم، کەچووم لەگەڵمدا دانیشتو دەستیکرد بەئامۆژگاریکردنم، قسەکانی بۆنی هەڕەشەیان لێدەهات، من لەوە تۆقیم نەکا پەیوەندیی ژێربەژێرم لەگەڵ بزوتنەوەی کورد ئاشکرابووبێت.

گوتی: واز لەبزوتنەوەی کوردو کێشەو مەسەلەی کوردو یەکخستنیانو دامەزراندنی حکومەتی کوردو ئەم شتانە بێنە، ئەمە هەمووی خەیاڵە، من لەم شوێنەی خۆمەوە ئارەزوومە عێراق یەکبخەمو ئاسایشی بپارێزمو قودس رزگاربکەم، بەڵام ئەمە هەمووی قسەی قۆڕە، کەخۆم بۆم جێبەجێ نەکرێت بارۆژگار چارەسەریان بکات. ئنجا بزەیەکی کێشاو باسەکەی گۆڕی.

کەواتە سەدام حسەینیش وەکو ئەو خەڵکەی تر وایە بەڵام چەند پابەندێکی سیاسی بەستوویەتییەوە، هەروەها ئەرکی موخابەراتیشی لەسەرە کەدەبێت جێبەجێیان بکات.

ئێستاش ئەمریکا هەوڵی رووخاندنی دەدات چونکە پێدەچێ هەروەکو شای ئێران، ئەمیش رۆڵی نەمابێت.

بابگەرێینەوە بۆ سەربوردەی مەلامستەفا کەزیاد لەچارەکە سەدەیەك سەرکردایەتیی شۆڕشی کوردی کرد. ئەم پیاوە داستانەی هۆشو بیری زۆر کەسی کەمەندکێشو سەراسیمەکرد کەئەمەش لەخۆیدا راستییەکە ناکرێ دانی پێدانەنێین، لەبارەی ئەم پیاوەوە دەڵێم لەساڵانی چلەکانەوە هەتا رێککەوتنامەی جەزائیر( ئاداری ١٩٧٥) کە بەناوبـژیوانیی سەرۆکی جەزائیری هەواری بومدیەن، لەنێوان سەدام حسەینو شای ئێران مۆرکرا، مەلامستەفا تا ئەوکاتە سیمبوڵی تێکۆشانو دروشمی گەل بوو، چونکە بەهۆی ئەوبوو کەناوبانگی کورد بەهەموو جیهاندا بڵاوبۆوە جگەلەوەی کورد، لەهەموو جیهاندا مەلامستەفایان ناسی.

ئەم پیاوە لەدوو لاینەوە خزمەتی بەگەلی کورد گەیاند، یەکەمیان لایەنی راگەیاندن کەکوردی بەجیهان ناساند، دووەمیان توانی ریزی کوردان یەکبخاتو بۆ ماوەیەك ئاگر بکوژێنێتەوەو کورد بخاتە یەك سەنگەرو لەژێر یەك ئاڵادا کۆی بکاتەوە. لەبەرئەمانە وێنەکانی بارزانی، دارودیواری هەموو ماڵێکی رازاندبۆوەو لەپەڕەی هەموو دڵێکیشدا بوو، بوو بەباوکی خەمخۆری منداڵەکانی، بوو بەهیوای کورد لەهەر چوارپارچەکەو لەجیهانیشدا بۆ رزگاربوونی گەلی کوردستانو بەدەستهێنانی ئازادی.

من خۆم بەفریشتەیەکم دەزانی کەخوا لەئاسمانەوە بۆمانی ناردووە. ئەدیبو مێژوونووسو بیریارانی کورد پلەوپایەی بارزانییان لەپاش مەرگی، لەریزی مەزنەپیاوانی مێژوو دانابوو وەکو شێخ مەحمودی حەفید ـ مەلیکی کوردستان، قازی محەمەدی سەرکۆماری مهاباد، عومەر ئەلموختاری موجاهیدی لیبی، هۆشی منەی سیاسەتمەداری ڤیەتنامی، ماوەتیستۆنگی یەکەپیاوی چینو زۆری تر لەو نەمرانە. کەواتە کامیان چاکترە: ناوت بخرێتە ریزی نەمران، یان بەملیۆن و ملیار دۆلار بۆ منداڵەکانت بەجێبهێڵیت تەخشانو پەخشانی بکەن؟ ئاخر پارەی بەفر ئاودەیبات!

## مەراقی لەبیرنەچووی ڕێککەوتننامەی جەزائیر

لــە١٩٧٥/٣/١١دا، شـــای ئێـــران بەمەلامـــستەفای ســـەرکردەی بزووتنـــەوەی کـــوردی ڕاگەیانـــد کەڕێککەوتننامەی جەزائیر، حکومەتی ئێران پابەندی ئەوە دەکات کەیارمەتیو کۆمەك لەشۆڕشی کورد بگرێت تەنانەت ڕێگە لەو کۆمەکانەشی بگرێت کە لەدەرەوە بەخاکی ئێراندا دەگەیشتنە دەستی شۆڕشگێرانی کورد. بەواتایەکی ڕوونتر: شۆڕش ئاشبەتاڵی پێبکرێتو هەرکەسە بچێتەوە بۆ ماڵی خۆی. دوای ئەم هەواڵە مەرگەساتاوییە، شای ئێران ویستی چاوی بەبارزانی بکەوێت تا بەرتەکدانەوەی سەرکردەی بزوتنەوەی کوردی لەبەرامبەر ئەم بڕیارە ناڕەوایە بۆ دەربکەوێت کەکەس بۆی نییە بڕیاری لەمجۆرە دەربکات، چونکە ئەمە پەیوەندی بەبنەماڵە یا تەنانەت عەشرەتێکەوە نییە، بەڵکو مەسەلەی گەلێکی دێرینە ژمارەی دەگاتە چەندین ملیۆن کەس جگە لەوەی مەرگەساتی مێژووی بەکۆیلەبوونی ئەم گەلەش نیو سەدەی تێپەڕکردووە.

لەو ڕۆژە ڕەشەدا، جبەخانەی سەرەکیی شۆڕش پازدە هەزار فیشەکی تفەنگو گوللە تۆپی تێدابوو لەگەڵ پێنج هەزار گوللە هاوەن، ژمارەی پێشمەرگە کەتۆمارکرابوون زیاد لە ٧٠ هەزار کەس بوو، عەمبارەکانی ئازووقە ئەوەندەیان خۆراك تێدابوو بەشی زیاد لەپێنج مانگی دەکرد. تۆماری بەشی دارایی لەبارەگای سەرکردایەتی وای ڕادەنواند کە ٧٠ ملیۆن دۆلار هەروەها ٤٥ ملیۆن دینار لەبەردەستدایە، واتە ١٤٤ ملیۆن دۆلاری ئەو ڕۆژە. لەو ڕۆژەدا شۆڕشی کورد بەدەوڵەمەندترین شۆڕش دەناسرا لەڕووی داراییەوە لەڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا.

ئەم توانا سەربازیو داراییە بێسنوورە بێننە بەرچاوتان جگە لە پشتگیریی ڕەهای گەلی کوردستانو هەموو کوردێك لەهەر گۆشەیەکی جیهاندا بۆ ئەم شۆڕشە... بۆیە گوشاری سەر سەرکردایەتیی شۆڕش هەرچەندێك بووبێت یان پابەندبوونی ئەو سەکردایەتییە بە (C.I.A)و سیاسەتی ئەو کاتەی نێودەوڵەتی هەرچۆنێك بووبێت دەبوایە ئەو سەرکردایەتییە پێچەوانەی ئەو هەڵوێستەی بنواندایە کە بەداخەوە نواندی.

کۆمەلانی خەڵکی کوردستان چاوەڕێ بوون سەرکردایەتی لەئاست ئەو بڕیارەی شای ئێران هەڵوێست وەربگرێت بەلام کاتێکیان زانی بارزانی، لە ١٩٧٥/٣/١٢دا لەگەڵ وەفدێکدا سەردانی شای ئێرانی کرد کەئەویش هەرەس پێهێنانی شۆڕشی پێڕاگەیاند. لێرەدا هەڵوێستی بارزانی لەئاست مەسەلەی کورد لەو قسەیەدا بەرجەستەبوو کە لەبەردەم شای ئێران دەربڕی کاتێك گوتی: (سەروەرم شای ئێران، ئێمە گەلی تۆین، مادەم تۆ بەرێککەوتننامەی جەزائیر ڕازیتو لەو ڕێگەیەوە بەرژەوەندییەکانی ئێرانی نیشتمانی دایکمان بەدیدێنیت، ئەوە ئێمە دژایەتی ئەو بڕیارە ناکەین، بەڵکو دەستەونەزەر لەخزمەتتدایین بڵێیت بمرن دەمرین...ئێمە ئەوساو ئێستاش دڵسۆز بووین بۆ تۆ، لەداهاتووشدا هەروا دەبین، هیواداریشین سۆزو چاودێریتان لەسەر خۆمانو کێشەکەمان هەمیشە بەردەوام بێت).

هیچ کەس لەئامادەبوان بەرپەرچی قسەی بارزانی نەدایەوە، تەنها دکتۆر مەحموود عەلی عوسمان لەوقسانەی بارزانی ناڕازیبوو کەزۆر بوێرانە ناڕەزایەتیی خۆی بەرامبەر ئەو بڕیارە ناڕەوایەی شای ئێران" هەرلەوێ لەبەردەم ئامادەبواندا دەربڕی، بارزانی ورتەی لەدەم نەهاتە دەرەوە، جگە لەوەی بواری گفتوگۆو مشتومڕیش نەمابوو چونکە ئەوەی پلانی بۆ داڕێژرابوو، روویدابوو.

دوای گەڕانەوەیان، بارزانی بڕیارە مێژووییە رەشەکەی لەچەند خاڵێکدا دەرکرد:

١ـ تەسلیمبوون بەئیرادەی دوژمنانو کۆتایی هێنان بەشۆڕشی چەکداری کوردو دوایی هێنان بەخەباتی سی ساڵەی (١٩٤٦ ـ١٩٧٥) پارتی دیموکراتی کوردستان.

٢ـ گواستنەوەی ماڵو سامانی شۆڕش بۆ ئێران.

٣ ـ دەمودەست برووسکە بۆ هەموو بارەگاکانی پێشمەرگە لەهەموو لایەکی کوردستان بکرێت کەهەرچی چەکی قورسە کەهەیانە تێکوپێکی بدەنو هەتا ١٩٧٥/٣/٢٦ بەچەکە سووکەکانیانەوەو خۆیان تەسلیمی دەسەڵاتی ئێرانی بکەنو هەموو جۆرە چالاکییەك راگرن.

٤ـ فەرمانی بەئدریسو مەسعوود بارزانیدا کەهەرچی زووترە کار بۆ لەناوبردنی ئەوکەسانە بکەن کەخودی بارزانی گومانی لەوەهەبوو فەرمانەکان جێبەجێ ناکەنو بەردەوام دەبن لەخەباتی چەکدار، ئەمەش بۆ ئەوەی راگرتنی تەقە لەکوردستاندا مسۆگەربکات، بەتایبەتی ئەوانەی لەزیندانەکانی شۆڕشدابوون وەکو کەسایەتیی ناسراوی نیشتمانپەروەر محەمەد ئاغای مێرگەسووریو کوڕەکانی کەدەمودەست لەناویان بردن.

٥ـ بنەماڵەی بارزانی رووبکاتە ئێران کەلەوێ شای ئێران سەد خانووی زۆر رێکوپێکی لەکەرەج نزیك تاران پێبەخشین، جگە لەوەی بڕی یەك ملیۆن دیناری وەك خەرجی بۆ ناردن.

٦ ـ ئەسپاردەکردنی هەموو دارایی شۆڕش لەبانکەکانی ولاَتانی دەرەوە بەناوی بارزانییەوە کەپێشتر ئاماژەم بەوەدا دەگەیشتە بڕی ٢١٩ ملیۆن دۆلار، ئەمە لەکاتێکدا زۆربەی ئەوخێزانانەی دەگەڕانەوە بۆ کوردستان، پارەی نانێکیان لەباخەڵدا نەبوو.

ئەو چەند وشە سەرشۆڕیئامێزانەی بەبێشەرمانە لەزاری بارزانی دەرچوون کەس ناچاری نەکردبوو بیانکات، هەروەها تاکتیك نەبوون کەئەو قۆناغە پێویستی کردبێت بەڵکو بارزانی وەك بارێکی خۆئاسایی کەسایەتییە شلەکەی، لەخۆڕا ئەوقسانەی دەربڕی، لێرەدا داوای لێبوردنیش دەکەم کەئەم قسەیە دەکەم بەلاَم لەڕاستیدا ئەو مەسەلەیە لێکدانەوەی تر هەڵناگرێت. چونکە دەبوایە گوزارشتی لەئازاری دڵی زامداری گەلەکەی بەکردایەو داکۆکی لەکێشەی نەتەوەکەی بەکردایە ئەگەر بەسەرزارەکیش بوایە تا هەڵوێستێك بۆ خۆی تۆمار بکات، بەلاَم ئەوەی روویدا تازە ناگەڕێتەوە.

زۆر رووداوو هەڵوێستی مێژوویی هەن کە بەسەر سەرکردەو سەرۆكو لێپرسراودا هاتوون هەروەکو ئەوەی بەسەر بارزانیدا هات لەرێککەوتنامەی جەزائیردا، لەوانەشە هەندێك سەرکردە لەوە دژوارتریان هاتبێتەرێ بەلاَم هەموو سەرکردەیەك بەپێی هەڵکەوتو بارودۆخی خۆی بڕیار دەداتو رێگەچارە دەبینێتەوە بۆ چارەسەرکردنی گرفتێك یا تۆمارکردنی هەڵوێستێکی نەمر یا بەلایەنی کەمەوە

بەرپەرچدانەوەیەك دەنوێنێت با بێدەسەڵاتیشی پێوەدیاربێت. وەکو بینیشمان بارزانی، لەو هەڵوێستەیدا لەئاست شای ئێران تەنها ملکەچیی ڕەهای بۆ گەورەکانی نواندو پلانی ناڕەوای داگیرکەران چۆن کێشرابوو، بەبێ کەموزیاد جێبەجێیکرد. بارزانی بەهۆی ئەو بڕیارەیو جێبەجێکردنی ئەوپلانەی بۆ داڕێژرابوو، سەلماندی کەکارگوزاری دەزگای ساواکی ئێرانو (C.I.A)ی ئەمریکییە. جا لەدیدارێکییدا لەگەڵ ڕۆژنامەیەکی ئەو سەردەمەی ئێراندا گوتبووی ( کاری من تەمام شود)، واتە ئەرکی من کۆتایی هات. دەبوایە هەر لەبەرئەوە مەرگی بخواستایە. بەڵام عەرەب واتەنی: ئەم مردووە شایەنی ئەم گریانە نییە.

دوای هەرەسهێنانی شۆڕشو گەڕانەوەی شەڕکەران بەسەری شۆڕەوە بۆ ماڵو حاڵیان، لەبەغدا چاوم بەکەسایەتی ناسراوی کورد فوئاد عارف کەوت، پێمی گوت کەئەو، دوای هەرەسەکە ڕووبەڕوو بەبارزانی گوتبوو: ( کاتێك چاوت بەشای ئێران کەوتو بڕیارە ناڕەواکەی خۆیانی پێت ڕاگەیاند، دەبوایە بەردەمانچەت بدایە ئنجا خۆشت بکوشتایە).

لەمێژوودا زۆر وێنەی لەم شێوەیەو سەختتریش هەیە، جا هەیە خۆی کوشتووەو هەشە دەستی نەچۆتە خۆی، بۆ نموونە لەکۆتایی جەنگی دووەمی جیهانی کاتێك هێزەکانی هاوپەیمانان چوونە بەرلینو بارەگای هتلەریان گەمارۆدا، هتلەر دوای ئەوەی هاوسەرەکەی کوشت، خۆیشی کوشت. هەروەها گوبلز کەوەزیری ڕاگەیاندنی هتلەرو دەستە ڕاستیبوو، ئەویش دوای ئەوەی هاوسەرەکەی و هەموو منداڵەکانی کەگوشت، خۆی کوشت.

ساڵی١٩٥٦ پەلاماری سێقۆڵی لەلایەن هێزەکانی فەڕەنساو بەریتانیاو ئیسرائیل کرایە سەر میسر، جا وێڕای نابەرابەریی هێز کەپەلاماردەران لەمیسرییەکان بەهێزتر بوون بەڵام پەلامارەکە سەرینەگرت، ئەمە وای لەوەزیری دەرەوەی بەریتانیاکرد دەست لەپۆستەکەی بکێشێتەوە، بۆچی؟ چونکە لەئەرکەکەیدا شکستی خواردو بوو بەمایەی کوژرانی هەزاران سەربازی بەریتانیو فەرەنسی.

شۆڕش دوای ئەوەی هەرەسیهێنا خەڵك بوون بەسیٚبەشەوە:

١ ـ بەشێکیان لەئێران مانەوە ئەمەش بەهۆی بانگەشەی بنەماڵەی بارزانی کەوایان بڵاوکردەوە گوایە ئەوەی ڕوویدا شتێکی کاتییەو بەو زوانە ئاگری شۆڕش هەڵدەگیرسێننەوە.

٢ ـ ژمارەیەکی زۆر ڕووی لەئەمریکاو ئەوروپاو سووریاکرد.

٣ ـ بەشی هەرە زۆریان گەڕایەوە بۆ عێراق تا لەسایەی زەبری سەرۆکی عێراقی سەدام حسەیندا ژیان بەرنەسەر.

**کورتەیەك دەربارەی ئەوانەی لەئێران مانەوە:**

پێشینان گوتوویانە(پەتی درۆ کورتە) واتە کەسی درۆزن زوو ئاشکرا دەبێت. جا دوای ئەوەی هەردوو بەڕێز ئدریسو مەسعوود بارزانی مەسەلەی سەرپەرشتیکردنی ئەو پێشمەرگانەیان خرایە ئەستۆ کەڕوویان لەئێران کردبوو، سەرەتا دەستیانکرد بەرێکخستنەوەی ڕیزەکانی پارتیو بێئەوەی لەدەستەڵاتدارانی ئێران بترسن پەیوەندی لەنێوانیاندا دروست بکەنەوە. بەڵام هەرئەوەندەی هەست

بەجموجووڵی پارتی لەو رووەوە کرا، دەزگای ساواك هەموو ئەو ئەندامانەی گرت کەسەرقاڵی رێکخستنی پێشمەرگەبوون، ئەمەش گیروگرفتێکی گەورەی بۆ کوردە عێراقییەکان دروستکرد چونکە دەستەڵاتداریێتی ئێران کەوتە لێکتر دوورخستنیان و بەزۆر لەشارو شارۆچکەو گوندی دووردا نیشتەجێی کردن بێئەوەی ئیدریس و مەسعوود بارزانی هیچیان بۆ بکرێت.

دەزگای ساواك بەزۆری کادیرانی پارتی رەوانەی ناوچە فارس نشین و تورك نشینەکان دەکرد، دوای ئەوەش ساواك دزەیکردە ناو ریزەکانی پارتیو ژمارەیەکی زۆریان لێکردن بەپیاوی خۆیان. پاشان حکومەتی ئێران لەرێی دەزگا موخابەراتیەکانیەوە کەوتە سوکایەتیکردن بەکورد کەتەنانەت خودی بنەماڵەی بارزانیشی بەرکەوت.

کاك(...) بۆمی گێڕایەوە کەبەڕێزان ئیدریس و مەسعوود بارزانی، لەتاران چوونە سەردانیو داوایان لێکرد میوانداریی بارزانی بکات لەماڵەکەیدا. ئەو برادەرە گوتی: دوای ئەوەی میوانداریم کردن پێم گوتن کەبارزانی، وەکو برا وابوو لەگەڵ باوکی ئەمداو ئێستا ئەم، بارزانی وەکو مامی خۆی سەیردەکات و سەرشۆڕییە کەوا بکات بارزانی بێت بۆلای، بەڵکو دەبێت ئەم بچێتە خزمەتی. ئنجا چوو سەردانی بارزانیکردو ئەویش لەکاتی دیدارەکەدا داوای چەند شتێکی لێکردبوو ئەم بۆی هەڵنەسووڕابوو بەلام هەرچۆنێك بوو داواکارییەکانی بارزانی جێبەجێکردبوو، کاتێکیش بەجێی هێشتبوو لەدڵی خۆیدا بیری لەوەکردبۆوە کەشتێکی سەیرە بارزانی هەرەسی بەشۆڕشکردو سەری گەلی کوردستان و خۆیو بنەماڵەکەشی شۆڕکرد. چونکە بارزانی لەپێناو خزمەتکردنی شای ئێران، ناپاکییەکی گەورەی لەگەڵی کورد کرد، ئەوەتا ئێستاش شای ئێران سووکایەتی پێدەکات... بارزانی دەبوایە لەوە زیرەکتر بوایە کە نەکەوێتە تەڵەوەو، نە خۆی بدۆڕێنێت نە گەلی کورد.

سەبارەت بە ئەوانەی لەکاتی هەرەسی شۆڕشدا لەهەندەران بوون گەلی کورد سوودی لەئاوارەییان بینی. چونکە کەسێکی وەك بەڕێز تاڵەبانی، بوونی لەهەندەران سوودی بەگەلی کورد گەیاند کەئاگری شۆڕشی نوێی دوای ماوەیەکی کەم هەڵگیرساندەوەو بوو بەهیوای هەموو کوردێکی نیشتمانپەروەرو سەربەرز ئەمەش بەدەر لەچاکەو خراپەی خێرا هەڵگیرساندنی شۆڕش لەو قۆناغەدا.

بەلام سەبارەت ئەوانەی گەڕانەوە بۆ عێراق ئەوە من سوپاس و رێزم بۆ ئەو نیشتمانپەروەرانەیان دەردەبڕم کە بەژیانی سەر شۆڕی لەسایەی بنەماڵەی بارزانیو ساواکی ئێران رازینەبوون هەروەها سەریان بۆ موخابەراتی عێراقی نەوی نەکرد...هەزار سلاوو ستایش بۆ خۆڕاگرتنیان بۆ ئەو هەموو ئازارو ئەشکەنجەیەی هاتە رێیان.

لەئەنجامی ئەو زانیارییانەی بەدەستم خستن، بۆم دەرکەوت کەرێککەوتننامەی جەزائیر بەتەواوی پەسەندکراوەو شۆڕش ئاشبەتاڵی پێکراوە ئەگەر بۆ ماوەیەکیش بووە. دوای ئەوە چووم بۆ بەیرووت تا لەوێوە بچم بۆ تاران بۆ ئەوەی چاوم بەبارزانی بکەوێت و هەوڵی لەگەڵدا بدەم کارێك بکات سەری کورد بەرزبکاتەوەو بڕوا بۆ سەرکردایەتی بگێڕێتەوە، بەلام لەو ئەرکەمدا نوشوستم هێناو مام جەلال ئاگادارە. بۆیە گەڕامەوە بۆ بەغداو لەڕێی برایەکی خۆشەویست کەئەڵقەی پەیوەندی بوو لەنێوان منو بارزانیدا،

نامەیـەکی دووورودرێـژم بـۆ مـستەفا بـارزانی نـارد تێیـدا بارودۆخەکـەم بـۆ ڕوونکـرەوەو هـەموو لایەنـە ژێربـەژێرەکانی رێککەوتننامـەی جـەزائیرو رێگەچـارەکانی دەرچـوون لـەم قەیرانـەی گـەلی کـوردم بـۆ ئاشکراکرد، ئنجا ئەو برادەرەم راسپارد کەچەند قسەیەکی زارەکیم بۆ بگەیـەنێت، ئـەویش ماوەی دوو سـەعات لەگـەڵ مەسـعوود بارزانیـدا دانیـشتبوو هەرچیم پێ‌گوتبـوو بەئەمانەتـەوە گەیانـدبووی، بـەڵام ئەوان( بنەماڵەی بارزانی) هیچ بایەخێکیان بەزانیارییەکانم نەدابوو.

پـێش راگەیانـدنی ئاشـبەتاڵ، مـام جـەلال داوای لێکـردم کـە لەبـەیرووت چـاوم پێـی بکـەوێت. کاتێـك گەیشتمە خزمەتی، رێکوردەرەکەی بەردەستی خۆی بۆم کردەوە، گوێم لەدەنگی پاڤڵی کوڕی بوو لەسـەر کاسێتەکە، دوای ئـەو دەنگـی مامۆسـتای خوالێخۆشـبوو ئیـبراهیم ئەحمـەدم گـوێ لێبـوو بەهەتەرییـەوە داوای لێدەکردم ئەوپـەڕی هـەوڵ بدەم پێش ئـەوەی شـای ئێران شـۆڕش بەتـەواوی قووتبدات‌و هـەموو شتێکمان لەدەست بچێت، کەشێکی دانوستان لەنێوان بارزانی‌و سەدام‌و ئەلبەکردا بخوڵقێنم.

دوای گەڕانەوەم بۆ بەغدا، لەرێی ئـەو بـرادەرەم لەدەربەنـدیخان ئاگانامەیـەکم بـۆ نووسـینگەی بـارزانی نارد بەڵام ئەمجارەش هەروەکو هیچیش رووینەدابێت پشتگوێ‌خرا، ئیتر بـۆم دەرکـەوت ئـەو فەرمانانـەی کراوەتە سـەر بـارزانی بـۆ ئاشـبەتاڵ پێکردنـی شـۆڕش، لـەجێی خۆیدایـە. لەنامەکەمدا داوام لێکردبوون کەشۆڕش دەست پێبکەنەوە.

ئنجا زۆر هەوڵمـدا سـەرکردایەتی بـەعس قایـل بکـەم دانوسـتان لەگـەڵ بزووتنـەوەی کوردیـدا بکـەن بـۆ ئـەوەی کێـشەکان بەیـەکجاری بنەبڕبکـەن بـەڵام پێدەچـوو فـەرمانی (C.I.A) و بـەکرێگیراوەکانیان کاریگەریی زۆری هەبوو. لەلایەکی ترەوە سەیرمکرد دەزگای موخابەراتی عێراقی ئامادەباشی دەکات بۆ لەقاوغـدانی ئاشـبەتاڵ‌و لـەخۆگرتنی بارودۆخـە سیاسـییەکان ئـەوەش پـێش دەرچـوونی بەیاننامـەی ئاشبەتاڵ پێکردنی شۆڕش بەماوەیەك، وەك بڵێیت ئاگاداری هەموو شتێکن.

دەزگای موخابەراتی عێراقی لەمیانەی ئامادەباشییەکانیدا دەستیانکرد بـە دروسـتکردنی ژمارەیـەکی زۆری خانووی قوڕ لەپارێزگای دیوانیەو ناسرییە بۆ ئەو خەڵکەی لەو سەردەمەدا بەگەڕاوەکان بـۆ ڕیـزی نیشتمانی دەناسران. پارچە زوییـەك کەرووبەرەکەی ١٠ دۆنم دەبـوو پڕبـوو لـەداری خورمـا، ژمارەیـەکی زۆری ژووریان لەپووشی خورما تێدا دروستکرد کەسـەرەتا وامزانـی بۆبـەخێوکردنی گاوگۆتـاڵ دروسـت دەکرێن. شوێنی ئەم خانوانە نزیکەی ١٥ ــ٢٠ کیلۆمەتر لەباقووبەوە دووربوو.

هەرچـەندە مـن هـەرچی زانیارییـەکم لـەلابوو بۆ نووسـینگەی بـارزانیم نـاردبوو، بـەڵام لەبەرئـەوەی زۆر بـاوەڕم بەسـەرکرادایەتیی کـوردی هـەبوو وامـدەزانی ئـەمـە سـیناریۆیەکەو بەسـەر بارزانیـدا تێپـەڕنابێت، بەڵام ئەوەی لێی دەترسام روویدا. خانووە قوڕینەکان نزیکەی ٢٠ ـ٢٥ هەزار کەسی تێکـرا لـەژن‌و پیـاوو منـداڵ کـەوەك ئـاژەڵ خرانـە خانووەکانـەوە، گرتـەخۆی. ئەمانـە لەکاتێکـدا خـەڵکێکی ئـازادبوون‌و گیـانی خۆیـان بەسـەرکردایەتیی شـۆڕش بەخـشیبوو تـا سـەری کـوردی پـێ بـەرز بێـت کەچـی بـەو شـێوەیە تالانفرۆشکران و خرانـە خـانووی قوڕینـەوە لەکاتێکدا بنەماڵـەی بـارزانی لەکۆشك‌و تـەلاردا دەژیـان. تـۆ

بڵێیت خوا بەم بەشکردنە رازی بێت؟ ئایا ئەمە خەسڵەتی سەرکردەو سەرۆکە؟ بەڵام چی بەخەڵکێك بڵێم کەگوێنەداتە قسەی خەڵك؟

هەموو ئەوانەی بۆ عێراق دەگەڕانەوە دەبوایە بەشاری مونزرییەو خانەقیندا تێپەڕبوونایەو لەوێ ماوەیەك لەکەمپێکدا بمانایەتەوە کە بەناوی شوێنی حەوانەوە بۆیان ئامادەکرابوو، بەڵام لەراستیدا شوێنی لێپێچینەوەو لێپرسینەوە بوو بۆ ئاشکراکردنی ئەو کەسانەی لەدەزگای (پاراستن)ی لەمەڕ بارزانی کاریاندەکرد. جا تەنها ئەوانەی پێشتر پەیوەندییان بەدامودەزگا ئەمنییەکان و موخابەراتەوە هەبوو لەوکەمپانەدا نەدەمانەوە بەڵکو بەوپەڕی رێزەوە بەئوتومبیلی تایبەتی دەزگا ئەمنییەکان بۆ بەغدا بەڕێدەکران، وەکو شەوکەتی مەلا سمایل و هی تر لەسیخوڕو بەکرێگیراوان.

ئەوەی ئەم کتێبەم بخوێنێتەوەو ئەو کەمپەی بینیبێت لەقسەکەم حاڵی دەبێت. کاتێك سەردانی بەرێز عەبدولخالق عەبدولعەزیز ـ بەڕێوەبەری گشتیی ئاسایشم کردو بەزیادەوە بارودۆخی ئەوخەڵکەم بۆ باسکرد کەئەوە شێواندنی وێنەی رژێمی عێراقییە لای ئەو کوردەی دەگەڕێتەوە، هەروەها عەزیەتدان و وروژاندنی کورد لەبەرژەوەندیی دەسەڵاتدارێتی عێراقدا نییە بەڵکو لەراستیدا دەبێت بەنەرمی مامەڵەیان لەگەڵدابکرێت و زمانی شیرینیان لەگەڵدا بەکاربێنن بەشێوەیەك کەپێویستە هەموو فەرمانبەرێکیان بگێڕدرێتەوە بۆ سەر ئەو کارەی کەپێش ئەوەی بچێت بۆ شاخ لەسەری بوو، ئنجا بەسووربوونەوە داوام لێکرد پەیوەندی بەبەرێز سەدام حسەینەوە بکات و لەو رووەوە قایلی بکات، بەڕێوەبەری گشتی بەقسەکانم قایل بوو و دەمودەست پەیوەندی بەبەرێز سەدام حسەینەوەکردو هەرچیم پێ گوتبوو تێی گەیاند کە لەپێناو بەرژەوەندیی حزبی بەعسدایە، ئەویش فەرمانیدا هەرچی پێویستە جێبەجێ بکرێت و ئاسانکاری بۆ ئەو خەڵکە بکرێت کە لەئێران دەگەڕێنەوە کەزۆر لەو کەمپەدا نەمێننەوەو چاوپۆشی لەلێپێچینەوەو لێپرسینەوەیان بکرێت، ئنجا بەرێز عەبدولخالق عەبدولعەزیز دەمودەست کەمپەکەی خستە ژێر چاودێری بەڕێوەبەرایەتیی ئاسایشی گشتی و عەقید حاجی عەبدولواحد نوری کرد بەبەرپرسی.

دوای ئەوەی جارێکی تر چوومەوە بۆ کەمپەکە کەئەمجارە ئاسایشی گشتی سەرپەرشتیدەکرد پاسەوانەکان کەچاویان بەئوتومبێلەکە کەوت یەکسەر دەروازەکەیان کردەوە، لەوێ چاوم بەپیاوانی ئاسایش کەوت و زۆر لەگەڵ عەقید عەبدولواحید نوری دوام بۆ ئەوەی هانیبدەم ئاسانکاریی زیاتر بۆ ئەوخەڵکە بکات و زۆر لەکەمپەکەدا گیریان نەکات.

سێ لاو لەگەڵ عەقید عەبدولواحید کاریان دەکرد کەناوی خەڵکە گەڕاوەکەیان تۆماردەکرد. عەقید عەبدولواحید تەئکیدی بۆم کرد کەفەرمانی پێدراوە پەلە بکات بۆ گەڕاندنەوەی خەڵکەکە بۆ سەر کاروباریان و راپەڕاندنی ئیشوکارەکانیان. دیمەنی خۆڵاوی ئەو خەڵکە کەچڵك خواردبوونی هەرگیز لەبیرناچێتەوە، خوا ئەوە بگرێت کەبوو بەمایەی ئەوەی روویدا. لەناو ناڵەو ئازاری ئەو داماوانە گوێم لەدەنگێك بوو بانگی دەکردم، خێزانێك بوو دیاردی بۆ من دەکرد. سەرەتا نەمناسینەوە هەتا ئەوان خۆیان پێم ناساند... فەخری خوشکم و عەبدولڕەحمانی هاوسەری و منداڵەکانیان بوون، خوشکم گوتی

بەپێی بڕوانامەی لەدایکبوون ئێمە لەدایكو باوكێكین، بەڵام لەپێناو بەرژەوەندیی تایبەتو لەترسی سەدامو بارزانی ئاوڕمان لێمەدەرەوە. ئیتر منیش پشتگوێم خستن. زۆر خێزانی ترم ناسییەوەو یارمەتیم دان. ژنێك، دوای ئەوەی هەوڵمدا یارمەتی بدەم پرسی تۆكێیت وائەوەندە پیاوی باشیت؟ كاتێك خۆم پێناساند بزە گرتیو گوتی: ( كەواتە تۆ ناپاكیت !) . پێكەنینێك گرتمیو بۆ تاوێك ئێشوئازارم لەبیرچۆوەو سەرم لەئازایەتیی ئەو ژنە كوردە سووڕما كەلەو بارودۆخە ناسكەیدا ئەو قسەیە بكات.

لێرەدا بەگونجاوی دەزانم هەڵوێستی هەندێك لەسیاسەتمەدارو كەسایەتییە ناودارەكان بێنمەوە: گوتراوە كەباران بەبێ هەور نابێت. واتە ئەوەی هەڵوێستێكی پیاوانە بنوێنێت ئەوە ئەنجامی ئەو ژینگەیە كەتێیدا پەروەردە بووەو نەریتی خۆیەتی بەدەر لەپێگەی سیاسی یان ئایدۆلۆجیاكەی. عەبدولخالق عەبدولعەزیزی بەڕێوەبەری گشتیی ئاسایش، هەرچەندە عەرەبێكی بەعسی بوو كەدڵسۆزی حزبەكەیو حكومەتەكەیبوو، بەڵام لەرێی فێڵ لێكردنو هەڵخەڵەتاندنو هاندانی هەستی نیشتمانی وەكو عێراقییەك" توانیم لەپێناو خزمەتكردنی گەلی كوردستانو كێشە رەواكەی، بەكاری بێنم. ناوبراو لەزۆر هەڵوێستی تردا خزمەتی پێم گەیاندووەو هەروەكو پێشم راگەیەندرا ئەمانە بوون بەهۆی ئەوەی پۆستەكەی لەدەست بداتو دەستگیربكرێت. جا هەتا ١٩٧٦/٩/١٤ شایەدی بۆ پاكیو مرۆڤدۆستیی ئەم پیاوە دەدەم كەژمارەیەكی زۆری لەسیاسەتمەدارانی كورد لەپەتی سێدارە رزگاركردووە كەهەموو ئامانجێكیشی لەم كردەوانەی، پارێزگاریكردنی دەسەڵاتی بەعس بووە لەعێراقدا.

برای خۆشەویست بابەكر مەحموود ئاغای پشدەری بۆمی گێڕایەوە كەدوای ئەوەی رژێم گرتمی، سەردانی بەرێز عەبدولخالقی كردبوو بۆ ئەوەی دوو قسەی خێرم بۆ بكاتو حوكمەكەم كەم بكرێتەوە. بەرێز عەبدولخالق گوتبووی ئەو لەپەتی سێدارە رزگاریكردووم بەڵام بۆ مەسەلەی ئازادكردنم ئەوە كێشەكەم لەلای سەدام حسەینەو عەبدولخالق ناتوانێت قسەی تێدابكات.

ئنجا كاتێك بەرێز بابەكر مەحموود ئاغای پشدەری لەگەڵ خوالێخۆشبوو مەلا عەبدوڵڵا(مەلا ماتۆڕ) سەردانی مامۆستا تەها محێدینیان كردبوو بۆ ئەوەی بۆم تێبكەوێت" كەئەو كاتە ئەو دوو بەرێزە وەزیربوون لەحكومەتی عێراقیدا، مامۆستا تەها گوتبووی: ئەوەی بۆ بەرێز رەفیق لەدەستم هاتووە لەپەتی سێدارە رزگارم كردووەو لەوە زیاترم لەدەستەڵاتدا نییە.

ئەو دوو بەڕێزەی سەرەوە لەسەردانێكیاندا بۆ هەمان مەبەست بۆ لای بەرێز سەدام حسێن، خوالێخۆشبوو مەلاماتۆڕ بۆی گێڕامەوە كە: ( لای سكرتێری سەدام حسێن دانیشتین، دوای ئەوەی لەهۆی سەردانەكەمانی پرسی، قسەی سەدامی پێمان گوت كە: با قاوەم لەلا بخۆن بەسەرچاوان، بەڵام نامەوێت گوێم لەناوی رەفیق پشدەری بێت.

دوای گرتنم، بەكر رەزای پوورزامو مونیبە عوسمانی هاوسەری، خێزانەكەمو هەرسێ منداڵەكەم( رووبارو بازیان رەوەن) بۆ سەیران دەبەن بۆ سەیرانگەی زەورا لەبەغدا، لەوێ بەرێكەوت چاویان بەخوالێخۆشبوو ئەحمەد حەسەن ئەلبەكر دەكەوێت، دوای چاكو چۆنیو رێزنواندن، داوا لەبەرێزی

دەکەن کەئازاد بکرێم، ئەویش دەڵێت: نەمزانیوە کە بەڕێز ڕەفیق پشدەری گیراوە، گومانتان لەوە نەبێت کەوا دەکەم سبەینێ ئازادبکرێت و بێتەوە بۆ ناوتان.

بەڵام ئەحمەد حەسەن ئەلبەکر، هەروەکو سەرکۆمارێك بوو نەیتوانی من لەزیندان ئازادبکات، تەنانەت خۆیشی بۆ زگارنەکرا. چونکە خەڵکی عێراق شایەدی حاڵن کەئەلبەکر هەر بەزیندوویی تیاچووبوو.

وردترین باسێك لەسەر مردن ئەوەیە کەپێشینان گوتوویانە: ( مردن لەوەی پاشی ئاسانترەو لەوەی پێشی قورسترە). جا ئەگەر هەموو خەڵکی سەر ڕووی زەوی بۆ کوشتنی پیاوێك ڕێکبکەون ئەجەلی نەهاتبێت، ئەوە خوا کارێکی بۆ دەڕەخسێنێت لەو مردنە رزگاری ببێت. زۆرم لەوانەی سەدام حسەین دەناسن بیستووە کەپێش من کەس لەدەستی رزگاری نەبووە، چونکە ئەوەی بەفەرمانی ئەو گیرابێت تیاچووە، من نەبێت . خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ قل لن يصيبنا الا ما كتب الله لنا ﴾ خوای گەورە پێش ئەوە بەلوتف و کەرەمی خۆی لەزەبروزەنگی مەلا مستەفا بارزانی رزگاریکردم، لەم دواییانەشدا لەچنگی مەسعوودو نێچیرڤان بارزانی رزگاریکردم، کاتێکیش هێزەکانی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان من و خوالێخۆشبوو شەهید موختار عەبدوڵلاَ غەریبیان برد گوللەبارانمان بکەن ئەوەندەی نەمابوو تیابچم، بەڵام فەرمانی گوللەبارانکردنم لەلایەن بەڕێز جەلال تاڵەبانییەوە هەڵوەشێنرا. بەڕێزی گوتبووی: ڕەفیق پشدەری شازدە جار لەمردن رزگاری کردووم، دەبا منیش یەك جار لەمردن رزگاری بکەم. بەلاَم هاوەڵەکەمیان گوللەبارانکرد، خوا ئەویش و هەموو لایەکمان بەبەهەشتی بەرینی خۆی شادبکات.

## چەند هەڵوێستێکی مەردانە بۆ مێژوو

ئەوەی شارەزایی لەشۆڕشی ئەیلوولی ١٩٦١ هەیە دەزانیت کەهێزی پۆلیس، ڕۆڵی کاریگەری بۆ پشتیوانکردنی شۆڕش و بەهێزکردنی هەبوو. بەخۆم چەند جارێك لەبەڕێز جەلال تاڵەبانیم بیستووە دەربارەی پۆلیس گوتوویەتی: برایانی پۆلیس مەشخەڵی هەڵگیرسانی شۆڕشی ئەیلوول بوون.

دوای ڕێککەوتننامەی شوومی جەزائیرو ئاشبەتاڵ، ڕژێمی عێراق نزیکەی هەزار کەسی لەوانەی گەڕابوونەوە لەپۆلیسەکان کۆکردەوەو لەپارێزگای دیوانیەی دانان. ئەمانە هەرچەندە لەناو شارەکەدابوون بەڵام بۆیان نەبوو بەبێ فەرمانی بەڕێوەبەرایەتیی ئاسایش، دیوانیە بەجێبێڵن. ئەمانە لەبارودۆخێکدا دەژیان جەرگی بەئاودەکرد. بەدرێژایی ڕۆژ هەوڵیاندەدا نانی ڕۆژانەیان پەیدابکەن، هەموو جۆرە کارێکیان دەکرد هەر بۆئەوەی دەست پان نەکەنەوە. بەلاَم گرنگ ئەوەبوو سەرەرای کەمدەستیو بێدەرامەتییان سەریان بۆ دامودەزگا ئەمنییەکان شۆڕنەکردو رازینەبوون ببنە بەکرێگیراو، یان دەست بۆ ماڵی حەرام بەرن. بەگشتی خاوەن هەڵوێست بوون، ڕەفتاری جوانیان وای لەخەڵکی دیوانیە کرد بەدڵ لەگەڵیاندابن و هاوکارییان بکەن.

بۆ ئەو مەبەستە سەردانی وەزارەتی ناوخۆم کرد. لەوێ بەڵێنیاندا کەبیانگێڕنەوە بەمەرجێك سەدام و ئەلبەکر رازیبن. سەعدون غێدان پێمی گوت: لەتوانامدا نییە بیانگێڕمەوە سەرکارەکانیان.

دوای ئەوە چووم بۆ لای فەرماندەی فیرقەی دیوانیە خوالێخۆشبوو عومەر هەزاع. زۆر دەربارەی ئەو خەڵکە دواین، گوتم ڕەفتارو ئاکاری عەرەب لەگەڵ ئەوەدا نییە ئەو هەموو خەڵکە بەجلوبەرگی شڕو

گیرفانی خاڵییەوە بێڵانەو بێچارەنووس بەناو شاری دیوانیەدا بگەڕێن، چونکە ئەمە دوژمنایەتی لەنێوان گەلی کوردستان‌و حکومەتی عێراقیدا دروستدەکات لەکاتێکدا ئێمە پێویستمان بەوەیە جەماوەر لەدەوری خۆمان کۆبکەینەوە بەتایبەتی گەلی کورد. ئنجا باسی سەردانەکەم بۆ کرد بۆ وەزارەتی ناوخۆ بۆلای سەعدوون غێدان کەگوتی چارەسەرکردنی ئەوکێشەیە بەدەست سەدام‌و ئەلبەکرە. عومەر هەزاع زۆر مەردانە چوو بۆ لای ئەلبەکرو لێبوردنی گشتی بۆ ئەو پۆلیسە گەڕاوانە پێدەرکرد کەدوای ئەوە هەموویان گەڕانەوە بۆناو ماڵ‌و منداڵیان. لەو تاقمە تەنها چوار کەسیانم لێدەناسین، وابزانم ئەوانی تر ئاگایان لەوهەوڵەشم نەبوو، بەڵام بەسەرکەوتنەکەم دڵشادبووم. دەربارەی عومەر هەزاعیش ئەوە کۆتایی ژیانی زۆر مەرگەساتاوی‌بوو، چونکە سەدام حسێن بەزیندوویی زمانی بڕی‌و دوای ماوەیەکیش گوللەبارانیان کرد چونکە لایەنگری سەدام نەبوو.

لەدیدارێکمدا لەگەڵ عومەر هەزاع کەپەست‌و بێتاقەت دیاربوو وابزانم سەرخۆش بوو، گوتی: رێککەوتنمان لەگەڵ کورددا هەزار جار لەرێککەوتنمان لەگەڵ فارس باشتر دەبوو.

من شایەدی تەواو بۆ ئەم پیاوە دەدەم کەخزمەتی گەورەی بەگەلی کوردستان کرد، خوا لەگوناهەکانی خۆش بێت‌و پاداشتی بەخێر بداتەوە.

**راستییەکی شکۆدار**

زۆربەی چەکدارەکانی ئەفواج خەفیفە کەدژی شۆڕش بوون یان ئەوسا سەر بەدامودەزگا ئەمنییەکان بوون و ئەمڕۆ دەیانبینین لەریزی پێشمەرگەدان یان بەئازادی خەریکی‌کارو کاسبیی خۆیانن، کەباسی رابردوو دەکەن ماوەی ناپاکییەکەیان دەبوێرن‌و شەرم دەکەن باسی بکەن. بەڵام من بەپێچەوانەی ئەوانە، حەزدەکەم پڕ بەدەنگم هاوار بکەم تا هەموو گەلی کوردستان گوێیان لێم بێت کە: من رەفیق پشدەریم، ساڵانێکی زۆری ژیانم کارم بۆ موخابەراتی عێراق‌و دامودەزگا ئەمنییەکان کرد، بەڵام سەربارێشی‌و بەوپەڕی شانازییەوە توانیم خزمەتی گەلی کوردستان‌و کێشە رەواکەی بکەم ئەمەش بێئەوەی سەر بەهیچ حزبێکی سیاسی‌بم رێنماییم بکات کەئەمە بکەم‌و ئەوە نەکەم. هەروەها هیچ کەسایەتییەکی سیاسی نەبوو، رێگەم نیشان بدات یا فەرمانم پێ بکات تا لەرێ لانەدەم، هەموو ئامانجێکم ئەوساو ئێستاش خۆشەویستیی نیشتمانە کەبایەخدارترین شت لای مرۆڤ ژیانی خۆی‌و خێزانیەتی، بەڵام لەوەگرنگتر خاکە. چونکە ئەوەی داوای مەزنی بکات دەبێت شتی مەزن بکات بەقوربانی. ئەوەی لێرەشدا دەمەوێت بیڵێم بانگەوازێکە بۆ هەموو حزبێکی نیشتمانی‌و بۆ هەموو خێزاندارێك کە: باڵاترین شت کەلایەنگرانتان‌و منداڵەکانتانی پێ گۆش بکەن خۆشەویستیی نیشتمانە، تۆوی خۆشەویستی لەهەموو دەمارێکدا بچێنین تا هەریەکەمان هەرچییەك بێت‌و لەهەرکوێ‌بێت ببێت بەپێشمەرگەیەکی قارەمان، چونکە بەوە نەبێت رزگاریمان نابێت، واتە هەریەکەمان لەلای خۆیەوە هەست بەلێپرسراویەتی بکات... ئیتر خوا رێنیشاندەرمان بێت‌و ویژدانیش چاودێرمان بێت.

ئەنجومەنی سەرکردایەتیی شۆڕش بڕیارێکی دەرکرد تێیدا پێشوازیکردنی کوردی لەدوای ئاشبەتاڵ قەدەغەکرد، مەبەست لەم بڕیارە حزبی شیوعی بوو. جا تەنها دامودەزگا ئەمنییەکان دەسەڵاتی

پێشوازیکردنی کوردی گەڕاوەیان هەبوو، منیش لەبەرئەوەی لەو دامودەزگایانەدا کارم دەکرد بۆم هەبوو بێئەوەی چاودێرم لەگەڵدابێت یان سیخوڕم بەدواوەبێت، ئەوکارە بکەم. بەهۆی ئەمەوە توانیم یارمەتییەکی زۆری ئەو خەڵکە بدەم کە دەگەڕانەوەو تەواو باوەڕم بەخۆم بوو کەدەتوانم ئەوەی شۆڕش بۆی نەکرا، من لەجێی خۆمەوە جێبەجێی بکەم، چونکە لەو رۆژانەدا کەس ئەوەندەی من لەنزیکەوە ئاگاداری بارودۆخەکە نەبوو، جگە لەوەی دەسەڵاتێکی زۆریشم هەبوو.

لێرەدا دەمەوێ سلاوێکی شۆڕشگێڕانە ئاراستەی ئەو هۆشمەندانە بکەم کەدوای رێککەوتننامەی جەزائر نەچوونەوە پاڵ بنەماڵەی بارزانی. ئەم جۆرە کەسانە، هەندێکیان کۆچیانکرد بۆ هەندەران و هەندێکی تریان گەڕانەوە بۆ عێراق بەتایبەتی ئەو رۆشنبیرو سیاسەتمەدارانەی لەخزمەتیاندابووم. باشە ئەوانە لەو رۆژە سەختەدا چۆن رووبەڕووی بەرپرسە بەعسییەکان وەستان و رێگەی چارەسەرەکردنی مەسەلەی کوردیان خستە ڕوو؟ ئەوانە چەندیان لەسەر بنووسم هێشتا کەمە.

بەگشتی، هەموو ئەوانەی گەڕانەوە بۆ عێراق یەك داواکاریی هاوبەشیان لەحکومەتی بەعس هەبوو ئەویش گەڕاندنەوەیان بوو بۆ سەر کاروباری پێشوویان. لەهەرسێ بەرگی کتێبەکەم (کورد دوژمنی خۆت بناسە)دا بەدووورودرێژی باسی هەندێك لەو کەسانەم کردووەو بڕواناکەم تێیاندابێت نکووڵی لەرۆڵی من بکات لەرووی هاندانیان بۆ وەرگرتنی هەڵوێستی پتەو و چاندنی گیانی تێکۆشان لەلایان پاش ئەو کوتەکەی لەلایەن بارزانییەوە تێیان سرەوێنرا.

لەهەمان کاتدا توانیم رێ لەهەندێکیان بگرم کەنیازیان بوو ببن بەداردەستی رژێم دژی مەسەلەی کورد. ئەو راستییەش کەئەوساو ئێستاش هیچ کوردێکی هۆشمەند نکووڵی لێنەکردووەو نایکات ئەوەیە کەهۆی سەرنەکەوتنی کورد بۆ بەدیهێنانی کێشە رەواکەی" دۆڕانێکی سەربازی نەبوو لەجەنگدا بەڵکو سیاسەتی دۆڕاوو پێڕەوی هەڵەبوو، هەروەها بەرژەوەندیی موخابەراتی دەوڵەتە کۆڵۆنیالیست و زلهێزو حکومەتانی ناوچەکەبوو بەتایبەتی چوار حکومەتی کەدوای دابەشکردنە ناڕەوایەکە کوردستانیان پێوە لکێنرابوو، هەروەها دەستی ناپاکیی ناوخۆمان. ئەوەی روویشیدا دژوارو چاوەڕەواننەکراوبوو بۆیە زۆربەی ئەوانەی دەگەڕانەوە لەسەرلەنوێ هەڵگیرسانەوەی شۆڕش تەمابڕابوون، بەڵکو تێیاندابوو وەکو حەبیب محەمەد کەریمی سکرتێری پارتی دیموکراتی کوردستان لەوکاتەدا، خراپتری بەسەرهات هەروەکو پاشتر باسیدەکەم.

زەکیە ئیسماعیل حەقی یەکێك بوو لەوانەی گرەوی لێبردمەوە، ناوبراو رۆڵی ژنی شۆڕشگێڕی لای من گێڕا لەکاتێکدا بەکرێگیراوێکی موخابەرات بوو. دوای ئاشبەتاڵ، بەناوی گەشتەوە چوو بۆ قاهیرەو لەوسەرەوە حەبیب محەمەد کەریمی لەگەڵ خۆیدا هێنایەوە کەبوو بەفەرمانبەرێکی دەوڵەت و وردەوردە پۆستی بەرزو بەرزتری گرتەدەست، ئەوەتا ئەمرۆش لەسەنگەری شۆڕش و قارەمانییەتیدایە... جا یەکەم داوای حەبیب محەمەد کەریم ئەوەبوو حکومەتی عێراقی لەشوێنێکی دامەزرێنێت نە چاوی لەکوردێك بێت نە گوێی لەدەنگیشیان بێت.

سەرباریشی دەتوانم پێ لەسەر ئەوە دابگرم کەزۆربەی ئەو خەڵکەی دەگەڕانەوە، ملیان نەدا هاوکاریی دەستەڵاتدارانی عێراق بکەن. ئەوەی زیاتریش ئازاری دڵی ئەو خەڵکەی دەدا سەرسووڕمانیان بوو لەوەی روویدا کەئایا راستیە یان خەیاڵ ؟ لەناو سەرکردەکانی بەعسیشدا بەندوباو دەربارەی رێککەوتننامەی جەزائیر بلاّوبۆوە، تەنانەت ئەنجومەنی سەرکردایەتی بڕیارێکی دەرکرد بەشەش مانگ زیندانی یان دەرکردن لەڕیزی رێکخستنەکانی حزبی بەعس بۆ ئەو کەسەی شتێك دەربارەی رێککەوتننامەی ناوبراو بڵێت. لەسێ بەرگی کتێبەکەمدا بەدوورودرێژی باسی ئەم مەسەلەیەم کردووە، تەنانەت لەگەڵ یەکێك لەسەرکردەکانی بەعسدا رێککەوتم کەراپۆرتێکی دوورودرێژ دەربارەی رووداوەکانی ئەو دواییەی کوردستان بنووسم لەگەڵ ئەوەی بەمێشکمدا دەگەڕێت، ئنجا دوای ئەوەی راپۆرتەکەی خوێندەوەو هاتە سەر ئەوەی کەناوەڕۆکەکەی مەبەست دەپێکێت، دەستیکرد بەچاپکردنی بەیاریدەدەرەکەیو دواتر بیگەیەنێتە لای سەرکۆمار. دەقی راپۆرتەکە ئەمەبوو :

## بەڕێز سەرۆك کۆماری عێراق

**بەڕێز جێگری سەرۆك کۆماری عێراق**

دوای ئەوپەڕی رێزوسلاّو..

گەورەم سەرۆك، جەنابی جێگر: من هاووڵاتییەکی عێراقیم، بەوپەڕی شانازییەوە دەڵێم کەچارەنووسی خۆم بەچارەنووسی بەڕێزتانەوە گرێداوە، ئنجا بەهۆی ئەو بڕوا زۆرەوە کەپێمتان رەوابینیوە، رێگەم بەخۆمداوە" لەپێناو خزمەتکردنی وڵاتو بەتایبەتی خزمەتکردنی حزبی بەعس، ئەم راپۆرتە بنووسمو ناوەڕۆکەکەی بخەمە بەرچاوی بەڕێزتانو هیوادارم لێم ببوورن.

لەکاتێکدا شۆڕشی بارزانی لەترۆپکی هێزوگوڕیدابوو، ئێوە گوێپێنەدانتان نیشاندەدا ئەوەش بەو ناوەی کەچارەنووسی بارزانیو شۆڕشە چەکدارەکەی پابەندی رێککەوتنتانە لەگەڵ حکومەتی ئێراندا، چونکە بارزانی بەفەرمانێکی ساواكو (C.I.A) وەك بەفر دەتوێتەوە.

هەرچیتان فەرمو راست دەرچوو هاتەدی، چونکە هەرئەوەندەی شا گەڕایەوە بۆ تارانو چاوپێکەوتنی لەگەڵ بارزانیدکرد ئیتر لەماوەیەکی زۆر کورتدا فوو لەهەموو شتێك کراو شۆڕش، ئاداری بەسەر پاداریەوە نەما.

رووخانی لانەی بەکرێگیراو دەستکەوتێکی مەزنی حزبی بەعس بوو لەدوای خۆماڵیکردنی نەوت. بەرقەراربوونی ئارامیو ئاسایش لەباکووری خۆشەویستماندا باشترین بەڵگەی ئەو سەرکەوتنەیە کەسیاسەتە هۆشمەندەکەتان بەدەستیهێنا. بێگومان نابێت رۆڵی بارزانیش لەهێنانەدیی ئەم ئارامییەدا لەیادبکەین ئەوەش دوای ئەوەی سەرانی شۆڕشی کوشت کەهەڕەشەی سەرلەنوێ هەڵگیرساندنەوەی شۆڕشیان دەکرد وەکو محەمەدئاغا مێرگەسووریو مندالّەکانی.

دوای رووخانی لانەی بەکرێگیراو، ئەو تێکدەرانەی لەشۆڕشی بارزانیدا بەشداربوون، بوون بەسێ بەشەوە: بەشێکیان چوو بۆ هەندەران کەژمارەیان بەبەراورد لەگەڵ دوو بەشەکەی تردا کەم بوو. بەشی دووەم لەبنەماڵەی بارزانیو دەستوپێوەندو ژمارەیەکی زۆری ئەو کەسانە پێکدەهات کە لەئەنجامی

مژینی خوێنی گەل،ماڵو سامانێکی بێشوماریان پێکەوەنابوو، هەروەها ئەوانەشیان تێدابوو کەئازاری خەڵکیان دەداو هەندێکیان لەدەزگای(پاراستن)دا کاریاندەکرد، ژمارەیەکیشیان ئەو کادرە سیاسییانەبوون کەشەرمیان بەخۆ هات بەو راستییە دژوارەوە بچنەوە بۆ لای خەڵکی باکووری عێراق، کەژمارەی ئەمانە نزیکەی پەنجا هەزار کەس دەبێت لەئێران ماونەتەوەو رازین بەستەمو زۆرداریی دەزگای ساواك کەچۆتە ناویانو زۆریانی کڕیوە تا لەکاتی پێویستدا دژی عێراق بەکاریان بێنێت، بەلاّم من لێرەدا ئەوە عەرزی بەڕێزتان دەکەم کەئەمانە چەند بەکرێگیراوێکی بێهێزنو هیچ کاریگەرییان لەسەر ئاسایشی نەتەوەیی حزبی بەعسی سۆشیالیستی عەرەبی نابێت.

بەشی سێیەم ئەوانەی کە بەئوتومبێل یان بەفڕۆکە لەرێگەی ئێرانەوە هاتونەتەوە بۆ عێراق. هەرچەندە پەیوەندیم لەگەڵ زۆربەیاندا کردووەو بەدوورودرێژی لەگەڵیاندا دواوم بەلاّم بۆم دەرکەوتووە لەگەڵ بیروباوەڕو ئایدیۆلۆجیای پاکی بەعسدا نین، چونکە تەنها ١٪یان پەیوەندیی بەداموەزگا ئەمنییەکانەوە کردووەو زۆربەیان تەواو لەو بڕوایەدایە کەهەتا سەدەیەك یان دوو سەدەی تریش شۆڕش لەکوردستاندا هەڵناگیرسێتەوە. چونکە لەساڵی ١٩٦٢وە هەتا ساڵی ١٩٧٥، بارزانی سەروماڵی گەلی کوردستانی بەدەست بوو کەئەوانیش بیریان لەرێگەچارەیەك دەکردەوە تا لەو دەستەلاّتەی رزگاریان ببێت. چونکە لەهەموو شتێکدا قسەی ئەوی دەخوارد، لەجەنگدا، لەئاشتیدا هەروەها لەبەستنی رێککەوتننامەدا. جا ئەوەی لەم سەرکردە تاکەی گەلی کوردستان بینرا بەراستی سەرسووڕهێنەربوو چونکە ٩٩٪ ی ورەی شۆڕشگێڕی کوردی دابەزاند.

بەراستیش بیروڕا دروستەکانتان دەربارەی ئەو مەسەلەیە لەجێی خۆیدابوو، چونکە نە ئەم نەوەیە نە ئەوەی دوای ئەویش، جارێکی تر بیر لەوە ناکەنەوە بدەنە پاڵ هیچ شۆڕشێکی کوردی .

گەورەم سەرۆك... گەورەم جێگر...

لەسایەی خواو سیاسەتی داناتانەوە، ئێستا گەلی کوردستان هێمنو ئارام دەژینو ژیانێکی خۆش بەسەردەبەنو هیچ ناڕەحەتییەکیان نییە کەژیانیان لێڵ بکاتو من عەرزی بەرێزتانی بکەم. هەروەها وادێتە پێش چاوم کەبەڕێزتان لەئەنجامی بارودۆخی سیاسیی دوای رێککەوتننامەی جەزائیرو کۆتایی هێنانی شۆڕش رازین کەبەرژەوەندییەکانی بەلای حکومەتی عێراقو بەتایبەتی حزبی بەعسدا کەوتەوە.

بەلاّم ئەگەر بەڕێزتان رێگەم پێبدەن لەلایەکی ترەوە وای بۆ دەچم کە لەپێناو چاکترکردنی بارودۆخەکە کەزیاتر لەبەرژەوەندیی حزبی بەعسدابێت، دەڵێم بۆچی ئێمە سوود لەسەرلەبەری بارودۆخە سیاسییەکە وەرنەگرین، بۆچی ئێمە فەرمانڕەوای پشت کورسی بین؟ بۆچی خۆمان نەکەین بەهەموو ماڵێك لەعێراقدا هەر لەباکوورەوە هەتا باشوور بۆئەوەی ببین بەسەرچاوەی خۆشەویستیو ئارامیی هەموو عێراقییەكو هەردەم بیرمان لێبکاتەوە؟

لەم ڕووەوە، پێش هەموو شتێك دەسەلاّتدارێتی عێراق دەبێت ماف بەهەموو خاوەن مافێك بدات بێ جیاوازیکردن لەنێوان نەتەوە یان ئاینو مەزهەب. بەم ئازادیدانە کە لەسنوورێکدا دەبێت رێی تێدەچێت

ئەو ئارامیو ئاسایشە تەواوە بەدەستدبێنین کە بەهۆیەوە عێراق گەشەدەکاتو لەئەنجامدا دەستی ئاژاوەگێڕان لەعێراقدا دەبڕین.

پاشان پتەوکردنو بەهێزکردنی ژێرخانی ئابووریی هاووڵاتیی عێراقی . ئەوسا حکومەتی عێراق بەپلەی یەکەم پشتی بەسامانی کشتوکاڵو ئاژەڵی دەبەست بەڵام دواتر نەوت ئەم دوو سامانەی لەبیربردەوە. کەواتە تەنها پێویستمان بەپسپۆڕو رەنجدانی خۆمان هەیەو ئەوەی تر خوا بۆمان جێبەجێدەکات. هەموویشی چەند ساڵێکی پێناچێت کەداهاتی هاووڵاتیی عێراقی بەرزدەکەینەو باری ئابووریی وڵات بەرەوپێش دەبەین. چونکە بەهۆی ئەمەوە دەتوانین کارگە دروستبکەینو سامانە سروشتییەکانی ژێر زەوی بەکاربێنین. ئنجا دەتوانین زۆربەی ئەو کەلوپەلانەی رۆژانە بەکاریان دێنین بەخۆمان دروستیان بکەینو پشت بەدەرەوە نەبەستین بۆ هێنانیان. ئەوسایش بەوەی لەپێویستی گەل زیادە، دەتوانین چوارچێوەیەکی نویٚ بۆ وەزارەتی بەرگری دروستبکەینو هێزێکی نوێی سەربازی پێکبێنین بەتەکنەلۆجیایەکی باڵای سەربازییەوەو توانای هێزی سوپای عێراق بەرزبکەینەوە بەرادەیەك شان بدات لەشانی سوپای تورکیاو ئێران.

حکومەتی عێراق لەسەرەتای دروستبونیەوە لەگێژاوی ئاژاوەو گیروگرفتو قەیرانەکاندایە کە لەلایەن دراوسێکانیەوە هەردوو حکومەتی ئێرانو تورکیا بۆی دروستدەکەن. جا بۆ رزگاربوون لەم ململانێو گیروگرفتانە، دەسەڵاتی عێراقی پێویستە گیروگرفتە ناوخۆییەکانی بەشێوەیەکی ریشەیی بۆ هەتاهەتایە چارەسەربکات. کۆمەڵێك رێگەچارەی بەیاسای زەمینی بۆ دابڕێژرێت کەشەرعە ئاسمانییەکان موبارەکبادیی لێبکەن، چەند رێگەچارەیەك کەگیروگرفتی کوردو شیعە بەیەکجاری چارەسەربکەن ئەوسا عێراق خۆی دەبێتە مایەی سەرئێشەو گیروگرفت بۆ ئەو دوو دەوڵەتە دراوسێیە، چونکە ئەو سەربەخۆییەی گەلی عێراق کە لەسایەی دیموکراسیدا دەیباتە سەر، گەلانی ئێرانو تورکیاش بەتەمای بنیاتنانی دەبن. ئنجا هەموو جیهان ئەو هەواڵە سەیرە بڵاودەکاتەوە کەدەڵێت: ( حزبی بەعسی عەربیی سۆشیالیست لەعێراقدا مافی تەواو بەگەلی کورد دەبەخشێت کەسەرکردەکەیان مەلامستەفا بارزانیو شای ئێرانو دەزگای (C.I.A) پیلانیان بۆ پێشێلکردنی گێڕابوو). جا داننان بەئۆتۆنۆمی بۆ کوردو دیاریکردنی شارەکانی خانەقین، کفری، کەرکووك، دووبز، شێخان، شەنگارو تەلەعفەر لەسنووری ناوچەی ئۆتۆنۆمیو ئیدارەی کوردیو بەسەرپەرشتیی حوکمێکی خۆجێیی کەپایتەختەکەی هەولێر دەبێت هەروەها پێکهێنانی پەرلەمانێکی کوردی لەرێی هەڵبژاردنێکی ئازاد کەئیدارەی بەعس سەرپەرشتی دەکات، پاشان تەسلیمکردنی ئیدارەو ئاسایشی ناوچەکە بەلێپرسراوە کوردەکان بۆ ئەوەی مەسەلەی بەرقەرارکردنی ئارامیی ناوچەکە لەئەستۆیاندابێت، دەبێتە مایەی چارەسەرکردنی هەموو کێشەکان.

## هەمیشە دڵسۆزتان

رەفیق پشدەری[*]

هێـزی سـەربازیو وەزارەتـی نـاوخۆو ئـابووری لـەژێر سەرپەرشـتیی ئەنجومـەنی سـەرکردایەتیی شۆڕشدا دەبن کەهەر خۆیشی یەکەم پاڵێوراوو فەرمانڕەوای وڵات دەمێنێتەوە، لەپێناو عێراقو حزبی بەعسدا یاسا دادەڕێژێتو یاسای تر هەڵدەوەشێنێتەوە، بۆ نموونە ویلایەتی کیرلای نیمچە سەربەخۆ لەهند، حوکمێکی فیدراڵی هەبوو، بەڵام حکومەتی هندی کاتێك بینی جیابوونەوەی کیرلای زەرەرمەندە، بڕیاری دەرکرد کەمافی فیدراڵییەکەی هەڵوەشاندەوەو چیتر دانی بەحوکمی خۆجێیی کیرلادا نەنا ئنجا لکاندیەوە بەکارگێڕیەتیی ناوەندیی وڵات وەکو پارێزگاکانی تر، پاشان دۆسیەی ئەم مەسەلەیە داخرا چەند ئێزگەو رۆژنامەو گۆڤارێك نەبێت کەماوەیەکی کەم هەواڵی سەندنەوەی ئەو فیدراڵییەیان باسکردو هەمووی دوو هەفتەی نەخایاند هەموو شتێك لەبیرچۆوە.

کوردیش کاتێك دەبینن حزبێکی عەرەبی مافی وای داونیّ کە بەدرێژایی ١٤ ـ١٥ شۆڕشی یەك لەدواییەکی چەکدار دەستیان نەکەوتەوە، ئیتر بەبیّئەوەی پێویست بەشەڕوشۆڕ بکات، ئێرانیو تورکەکان هەتاهەتایە ناتوانن پێنج کەسی کورد دژی حکومەتی عێراقو عەرەب کۆبکەنەوە. ئنجا پەیوەندیی نێوان ئەم دوو هێزە بەردەوام لەگەشەسەندندا دەبێت. هاوکات کورد سنووری نێوان هەردوو دەوڵەت لەخانەقینەوە هەتا زاخۆ دەپارێزنو وەکو شوورەی چینیان لێدێت بەرامبەر دەستێوەردانی ئەو دوو هێزە. ئنجا لەداهاتوویەکی نزیکدا سنووری کورد فراوان دەبێتو بەهۆی ئەمەشەوە سنووری عەرەب لەعێراقدا دەگاتە ئەوسەری سنووری کورد لەهەردوو دەوڵەتەکەدا کەئەم ئەزموونەش لایەنی چاکی عەرەبو حزبی بەعس خزمەت دەکات، لایەنە سلبیەکەشی بۆ دەوڵەتانی ئێرانو تورکیاو ئیسرائیل هەروەها بۆ موخابەراتی ئەمریکی دەبێت.

---

[*] وەختەبوو شاگەشکەبم کاتێك دەنگوباسی ئەم راپۆرتە لەناو سەرکردەو لێپرسراوانی بەعسدا بڵاوبۆوەو لەزۆر دانیشتندا کادیرەکانی حزبی بەعس کەوتنە باسکردنی ئەم راپۆرتە لەگەڵمدا، منیش هەمیشە لایەنە ئیجابییەکەی راپۆرتەکەم لەبەرژەوەندیی بەعس دەخستە ڕوو بەگەورەترین پرۆژەم لەقەڵەمدەدا ئەگەر جێبەجیّ بکرێت. بەڵام کاتێك بیستم بەرێز جێگر( سەدام حسەین) لەکۆبوونەوەیەکیدا گوتوویەتی: ( جارێکیتر عێراق شۆڕشێکیتری چەکداری کورد بەخۆیەوە نابینێت کەچی دەبینین دۆستێکمان وەك بەرێز رەفیق پشدەری ئاماژەمان بۆ دەکات کەدەست بخەینە ناودەستی مردوانەوە) ئیتر ساردبوومەوە.

دوای ئەوە لەکاتێکدا لەگەڵ خێزانەکەمدا گەشتێکم بۆ بەیرووت کرد، لەویّ بەپەنامەکی چاوم بەبەڕێز جەلال تاڵەبانی کەوت. مام جەلال لەددیدارەکەدا سیّجار لێمی دووپاتکردەوە کە داوایەکم هەیە ئایا بۆمی جێبەجیّ دەکەیت ؟ گوتم: فەرمانت لەسەر سەرمە. گوتی: تکایە لەمەودوا سەدام حسەین ئامۆژگاری مەکە. گوتم: مام جەلال خەمت نەبێت، لەئەنجامی تاقیکردنەوەکانم لەگەڵیدا، بۆم دەرکەوتووە کەئەم کابرایە گویّ لەکەس ناگرێت، چونکە تەنها ئەوە دەکات کەلەو ساتەدا بڕوای پێیەتی.

کاتێك گیرابووم لەزیندانی موخابەرات، بەدووروودرێژی دەربارەی ئەو راپۆرتە لێپێچینەوەیان لەگەڵمداکرد، چونکە وایاندەزانی بۆ دەوڵەتێکی بیانی کاردەکەم، داوایان لێکردم دەستنووسی راپۆرتەکەیان بدەمیّو دوو هەفتە مۆڵەتیاندام بۆ بیرکردنەوە. دوای بەراوردکردنو پێکگرتنی هەردوو راپۆرتەکە، پرسییان کیّ چاپیکردووەو لایەنی زمانەوانیی چاککردووە؟ منیش ناوی ئەو لێپرسراوەی بەکارەکە هەڵساو کە بەیاردەرەکەی چاپکرد پیّ گوتن. ئنجا گوتیان: رەفیق خوا بتگرێت، ئەم ویلایەتەی کیرت لەکویّ هێنا، خۆ ئێمە هەردوو راپۆرتەکەمان بەراوردکردو زانیمان خۆت نووسیوتە.

لەئەنجامی ئەو پلەیەی بەدەستمهێنابوو زۆر لەخۆم رازیبووم، چونکە دەمتوانی بەشێوەیەك خزمەتی گەلەکەم بکەم کەشۆڕش نەیتوانیوە. ماوەیەکی زۆریش وام بەخەیاڵدا دەهات کەرۆژێك دادێت سەدام بیر لەم راپۆرتەم دەکاتەوە کەچەند خزمەتی بەعێراقو حزبی بەعسو رژێم دەکرد، لەو رێگەیەوە عێراق لەشەڕوشۆڕو وێرانکاریو شەڕی ناوخۆو دەستێوەردانی دەوڵەتانی دراوسیّو نەهامەتییەکانی گەلی عێراق رزگاری دەبوو. بەڵام چارەنووسمان بەئیرادەی سەدام حسەینەوە گرێدراوە کەبۆتە مایەی هەموو نەگبەتیەك. هەر ئەمەش بوو پاڵی پێوەنام کتێبەکانم دەربارەی سلبیاتەکانی ئەم کابرایە بڵاوبکەمەوە.

**تێبینی/**

هەندێك لەرۆشنبیرانی كورد لەكاتی گەڕانەوەیان بۆ عێراق كاتێك من پێشوازیم لێكردن، داوایان لێكردم چاویان بەلێپرسراوێكی گەورەی بەعس بكەوێت كە بەناوی حكومەتی عێراقییەوە بدوێت. منیش دیدارم لەگەڵ بەڕێز عەبدولخالق عەبدولعەزیزی بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی بۆ سازكردن و ئامادەی دیدارەكەبووم كەچەند سەعاتێكی خایاند. دوای كۆتایی هاتنی دیدارەكە، من و بەڕێز بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی سەرمان لەوقسانە سووڕما كەئەو كوردە گەڕاوانە دەربارەی دۆزینەوەی ڕێگەچارەی ریشەیی بۆ مەسەلەی كورد، كردیان.

بەڕێز بەڕێوەبەری گشتی لەقسەكانیان پەست بوو و گلەیی ئەوەشی لێكردم كەئەو دیدارەیم لەگەڵیاندا سازاندووە، منیش گوتم خۆشم سەرم لەو هەڵوێستەیان سووڕما. ئنجا بەڕێوەبەری گشتی، ئەو دیدارەی لەڕاپۆرتێكی دووردرێژدا نووسیو ڕۆژی پاشتر خستیە بەردەستی بەڕێزتان.

بەڕێز سەرۆك، ئەوەی ڕاستیش بێت، بیروباوەڕی ئەو كوردانەی گەڕابوونەوە كاریكردە من و بەڕێوەبەری گشتیو ژمارەیەك لەئەندامانی سەركردایەتیی حزبی بەعس لەوانەی بەڕێوەبەر ڕاپۆرتەكەی لەگەڵیاندا تاوتوێكرد پێش ئەوەی بۆ بەڕێزتانی بەرزبكاتەوە. ئەو برادەرانە دەستخۆشییان لێكردم بۆ ئەو هەنگاوەم هەروەها بۆ ئاگاداركردنتان لەڕاستی ڕووداوەكان. چونكە هەندێك كەسایەتیی سیاسەتمەداری كورد لەهەندەران وەكو جەلال تاڵەبانی كەچاوەڕێی هەلی لەبارن بۆ سەرلەنوێ هەڵگیرساندنەوەی شۆڕشی كوردی. كەواتە با بەهەموومانەوە ڕێگە لەهەركەسێك بگرین بیەوێت ئاژاوە لەعێراقدا بنێتەوەو، منیش لەلای خۆمەوە دەستەبەریی ئەوە دەكەم زۆربەی سیاسەتمەدارانی كورد، وەكو كەسایەتی سەربەخۆی كورد بگەڕێنەوە بۆ عێراق و لەپێش هەمووشیانەوە جەلال تاڵەبانی... فەرمانیش لەلای بەڕێزتانە.

## موخابەرات و سەرۆكی عێراقی سەدام حسەین

وەكوپێشتر باسمكرد موخابەرات دەورێكی كاریگەری هەیە لەسەر ئاسایشی دەوڵەت و سەلامەتی هاووڵاتییان لەهەر دەستدرێژییەكی دەرەوەو ناخۆ.

هەروەها هیچ ڕژێمێك نییە لەجیهاندا بتوانێت بەزەبری زۆر، ئارامیو ئاسایشی دەوڵەتێك بپارێزێت. شتێكی بەڵگەنەویستە كەپاراستنی ئاسایشی حكومەتی عێراق لەسایەی سەركردایەتییەكی وەكو حزبی بەعس بەو نەریتە دیكتاتۆرییەی كەپێڕەوی دەكات، پێویستی بەسەركوتكردن و تیرۆرو تۆقاندن و بەكارهێنانی هەموو ئەو ڕێوشوێنانەیە كەئەو دیاردانە دەنوێنن، هەموو ئەمەش بۆ ئەنجامدانی كردەوەگەلێك بەخەیاڵی شەیتانیشدا نایەت.

ئەم دەزگا تۆقێنەرە بەدرێژایی ساڵانی كاركردنی توانی كوردو شیعە كۆنترۆڵ بكات بەتایبەتی بنەماڵەی بەڕێز موحسن ئەلحەكیم و دوورخستنەوەی هەڕەشەو مەترسییەكانی هەموولایەك لەسەر دەسەڵات.

دەزگای موخابەرات چەندین بەشی هەیە کەخوێنەر بەکتێبێكو دوان شارەزاییان لەسەر پەیدا ناکات، بەڵام لێرەدا دەمەوێ باسی هەندێك لەوبەشانە بکەم کەبۆ باسەکەمان مەبەست دەپێکن.

دەوڵەت هەندێك جار پێویستی بەوەیە چەند ڕێگەچارەیەك بدۆزێتەوە بۆ لەناوبردنی هەندێك لەو کەسانەی دەبن بەمایەی مەترسی لەسەر ئاسایشی دەوڵەت یا ڕێژەی مەترسییەکە کەمیش بێت. واتە ڕاستە حزبی بەعس سڵ لەهیچ ناکات کەبیکات بەڵام هەندێکجار ڕووبەڕووبوونەوەکە لەگەڵ ئەندامی سەرکردایەتی دەبێت کە لەناو خەڵکدا ناسراونو لادانیان پێویستە.

لێرەدا لقی کودەتا لەدەزگاکەدا سیناریۆیەك دەهۆنێتەوە گوایە ئەم بەڕێزانەی خوارەوە بەتەمان کودەتا بکەنو، ئەمانە بەبەڵگەی لێدوانی تەلەفۆنی تۆمارکراو گیراون. جا چەند شارەزایەك دەنگی کەسانی مەبەست مۆنتاج دەکەنو نامەو شایەدی بەچاودیتەش ئامادەدەکەن. بەم شێوەیە دەتوانن چەند پرۆسەیەکی کۆمەڵکوژیو حەلاڵکردنی ماڵو سامانو کۆشكو تەلاری ئەو کەسانە بسازێننو لەئەنجامدا چوار چۆلەکە بەبەردێك بکوژن:

١ ــ سەرکردایەتی لەکەسانێکی چالاك ڕزگاری دەبێت کەبەرهایی مل بۆ سەرکردایەتی نادەن کەلەوانەیە ئەمانە ڕێگە بۆ خەڵکانی تر خۆشبکەن یاخی ببن یان لەلایەن دەرەوەی وڵات بەکاربهێنرێن.

٢ ــ دەزگای موخابەرات لەسەر شاشەی تەلەفزیۆن وەکو پاڵەوانی کارامەو شارەزا دەردەکەوێت کەخەمی ئارامیو ئاسایشی وڵات دەخۆن.

٣ ــ ترس لەدڵی ئەوانەدا دەچێنرێت کەبیر لەڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ حزبی بەعسو سەرکردایەتییەکەی دەکەنەوە کەخۆی لەسەدام حسەیندا دەبینێتەوە.

٤ ـ سووککردنو لووت شکاندنی ئەوانەی سەر بۆ شکۆو مەزنایەتیی سەرکردایەتیی دەوڵەت نەوی ناکەن، ئەمەش لەڕێی گرتنیان ئنجا ئازارو ئەشکەنجەدانیان هەروەها ناچارکردنیان بۆ داواکردنی لێخۆشبوون بەوەی بێگوناهنو دەستیان لەو هەوڵەی کودەتاکردندا نییە.

دەتوانم بێ دوودڵی بڵێم کەزۆربەی ئەو کودەتایانەی بیستوومانو کەژمارەیەکی زۆری کەسایەتییە سەربازیو سیاسەتمەدارەکانیان تێدا بوون بەقوربانی، لەم جۆرانەبوون کەهیچ بناغەیەکی ڕاستیان نەبووە. بۆ نموونە دەزگای موخابەرات ژمارەیەك ئەفسەری پیاوچاکی دەستگیرکرد بەناوی ئەوەی پیلانیان بۆ ئەنجامدانی کودەتایەکی سەربازی گێڕاوە لەوانە: ئیبراهیم فەیسەڵ ئەنساری، عەزیز تۆفیقو کەمال عەلەمدار. زۆرم هەوڵدا ئەو ئەفسەرانە لەمەرگ ڕزگاربکەم کە لەئەنجامدا پشت بەخوا ڕزگاریان بوو، دوای ئەوە کەچاوم پێیان کەوتو هەموو شتێکیان بۆگێڕامەوە کەدواتر دێمە سەر ئەو باسە" هەموویان سوپاسی ئەو یارمەتییانەیان کردم کە بۆمدان: زانیشم کەفەرمانی گرتنیان لەلایەن سەدامو ئەلبەکرەوە دەرکرابوو، ڕۆژانە بەچاوی بەستراوەوە لێپێچینەوەیان لگەڵدا دەکرا کە زۆربەی دانیشتنەکاندا سەدام حسەین ئامادە دەبوو تا گوێ لەقسەکانیان بگرێتو ڕاستییەکانی بۆ دەربکەوێت. سەرۆکی لیژنەی لێپێچینەوەش لەهەموو هەلێکدا کەداوای لەسەدام حسەین دەکرد ئازادیان بکات ئەو دەیگوت: با لەزیندانا دابڕزێن، هەتا لەزیندان بمێننەوە خەڵك زیاتر چاوترسێن دەبێت.

# قەسری نیهایە

قەسری نیهایە لەسەردەمی پاشایەتیدا کۆشکی رحابی پێدەگوترا. دوای شۆڕشی ١٤ی تەمموزی ١٩٥٨ ناوی بۆ (قصر النهایة) گۆڕا، قەسابخانەیەك بوو بۆ خۆی . سێ جۆر لەخەڵك دەبران بۆ ئەم شوێنە:

١ ـ ئەوانەی بەوە تۆمەتباردەکرێن کەپەیوەندیی گوماناوییان لەگەڵ دەرەوەدا هەیەو ناویان لەتۆماری سیخوڕاندا تۆماردەکرێت.

٢ ـ ئەوانەی سەر بەحزبی ترن جگە لەحزبی بەعس، وەك ئەوەی لەرێکخستنەکانی حزبی شیوعی یا پارتی دیموکراتی کوردستاندان.

٣ ـ پیاوانی سوپاو وەزارەتی بەرگریو وەزارەتی ناوخۆ کەهەواداری ئۆپۆزیسیۆنی عێراقین. بڕواش ناکەم ئەوەی بۆ قەسری نیهایە دەبرا بەساغی دەربچوایەتەوە مەگەر بەدەگمەن، خۆ ئەگەر تیانەچوایە ئەوە ئەندامێکی جەستەی لەدەستدەداو رێژەی رزگاربوون ٢٪ بوو.

ئەوانەی لەقەسری نیهایە زیندانیدەکران بەئاگاداریو سەرپەرشتیی خودی بەرێز نازم گزار بوون. بەفەرمانی ئەو دەگیران، هەروەها دیاریکردنی جۆری ئەشکەنجەدانی هەر زیندانییەك یان رەوانەکردنی بۆ دادگایەکی سەربازی یا گوللەبارانکردنی، کاری نازم گزاربوو. لەکتێبەکانی ترمدا زۆرم دەربارەی ئەم پیاوە نووسیوە.

جارێکیان داوام لێکرد سێ داخوازیم بۆ جێبەجێ بکات، پێم گوت: وابزانم دوانیان زۆر ئاسانن، حسەین شیروانیو ئەحمەد تۆفیق لای ئێوە زیندانین، دەمەوێت ئازادیان بکەیت، ئنجا دەربارەی ئەو گرووپەی لەگەڵ قادر تەگەرانیدابوون ئایا چارەنووسیان بەچی گەیشتووە؟ ماون یا مردوون؟ ئەگەر ماون چۆن بگەمە لایان؟

نازم گزار گوتی: ئەو دوو پیاوەی سەرەتا ناوت بردن سیخوڕنو کار بۆ بەرژەوەندیی موخابەراتی ئەمریکی دەکەن، مەسەلەی ئازادکردنیان تەنها لەدەسەڵاتی بەرێز جێگر سەدام حسەینە کەئەوەندە بایەخیان پێدەدات ناوناوە سەردانی قەسری نیهایە دەکاتو لەدانیشتنەکانی لێکۆڵینەوە لەگەڵیاندا، ئامادەدەبێتو بەخۆی لەدۆسیەکانیان ورد دەبێتەوە.

ئنجا نازم گزار لەناکاو گرژبوو بەتووڕەبوونەوە گوتی: دەربارەی قادر تەگەرانیو گرووپەکەیشی ئەوە دووبارە بەرێز جێگر لێیان ئاگادارە.

جاروبار کە بەتەنیا دادەنیشمو بیر لەخۆم دەکەمەوە کەئەو ماوەیە لەگەڵ دامودەزگا ئەمنییەکانی حکومەتی عێراقی کارمکردەوە دێمە سەر ئەو باوەڕەی کەسەرفراز ئەوکەسەیە خۆی رزگارکردووە. چونکە لای خوێنڕێژەکانی بەعس، پیاوکوشتنو ئاوخواردنەوە وەك یەك وابوو.

**دادگای شۆڕش... یان راستییەکەی دادگای قەرەقوش**

**خوێنەری خۆشەویست**

باپێکەوە لەم بینایە رامێنین کەکەم کەس هەیە ناوی نەبیستبێت. لەرووی دەرەوە دیمەنێکی قەشەنگ‌و دڵفرێنی‌هەیە، لەناویشەوە ئەگەر بەژوورەکانیدا بگەڕێیت دەبینیت زۆر پاکوتەمیزو رێکوپێکن، هەست بەئەوپەڕی ئارامی دەکەیت تێیدا کەڕاڕەوو ژوورەکانی تەیدەکەیت ژمارەیەکی زۆر لەکارمەندان دەبینیت بەجلوبەرگی رێکوپێکی رەسمییەوە، کەسەیریان دەکەیت وادەزانیت لەهۆڵی ئاهەنگێکی پادشایەندایت.

ئنجا دیمەنێکی سەیرو سەرسووڕهێنەر لەناو بیناکەدا دەبینیت ئەویش ئەو پاسەوانانەن کە بەجلوبەرگی رەسمییەوە لەهەموو کون‌و قوژبنێکدا راوەستاون‌و بزەی گاڵتەجاڕێکیش بەروخساریانەوەیە، لەکۆتایی دالآنێکدا دەگەیتە هۆڵی دادگا، هۆڵێکی فراوانە دادوەر لەئەوسەریدا لەناوەڕاستدا دانیشتووەو دوو دادوەری راوێژکار لەئەملاو ئەولایدا دانیشتوون. ئەم سێ کەسە خەڵك حوکم دەدەن، لەدامێنی ئەم سێ کەسەشدا دووکەسی تر دانیشتوون، یەکێك لەلای راست کەداواکاری گشتییەو، ئەوەی تر لەلای چەپ کەبنووسە.

تۆمەتبار کەدێتە ژوورەوە دەبێت سەرەتا سوێند بخوات کەهەرچی راستییە ئەوە بڵێت، پاشان داواکاری گشتی تۆمەتەکانی بۆ دەخوێنێتەوە ئنجا نۆرەی شایەدەکان دێت کەهەریەکە شایەدیی خۆی دەدات. پاشان بەلێشاو پرسیار ئاراستەی کەسی تۆمەتبار دەکرێت‌و پارێزەری بەرگری لیستێك دەخاتە ڕوو بۆ بێتاوان دەرکردنی کەسی تۆمەتبار. دانیشتنەکە بۆ چەند ساتێك دوادەخرێت، دوای ئەوە حوکمەکە دەردەچێت کەدادوەران، بەپێی ماددەیەکی یاسایی، کەسی تۆمەتبار تاوانباردەکەن‌و کابرا بەرەو چارەنوسێکی نادیارو رەش دەبرێت.

تۆ بڵێیت چاوەڕێی چی لەدووپشك بکرێت لەکاتێکدا پێغەمبەر(د.خ) فەرمانی پێمان کردووە ئەگەر لەکاتی نوێژیشدا بووین بیکوژین. لەبەرگی یەکەمی کتێبەکەم بەدووروردرێژی باسی دادگاییکردنی خۆم لەدادگای شۆڕشدا کردووە.

ئەم دادگایە بەشێکی لێکنەبچڕاوی دامودەزگا ئەمنییەکانی رژێمی عێراقە وەکو ئەمن، ئیستخبارات، موخابەرات، رێکخستنەکانی بەعس. هیچ کام لەم دەزگایانە بەدادگایشەوە گرێدراوی وەزارەتی داد نییە بەڵکو بەفەرمانی ئەنجومەنی سەرکردایەتیی شۆڕش دامەزراون. هەروەها هەمان ئەنجومەن، دادوەرو کارمەندو کارگوزارانی ئەم دەمودەزگایە دادەمەزرێنن. هەموانیش دەربارەی چۆنیەتی بەڕێوەچوونی دادگاییەکان‌و هەڵبەستنی تۆمەتەکان، فەرمان لەخودی بەرێز سەدام حسەین وەردەگرن، سەرۆکی دادگا ئەوەندەی لەسەرە فەرمان دەربکات کەیەکسەر دادوەرەکان، سیناریۆ دادوەرییەکە ئەوەندە بەوردی دەهۆننەوە کەئەوەی نەشارەزابێت سەری لەو دادپەروەری‌و دادگاییە مرۆڤایەتییە سووڕدەمێنێت.

ئەوەی تۆزێك هۆشی بەخۆی بێت خۆی لەدوعای زۆرلێکراو دەپارێزێت، چونکە ئەو دوعایە یەکسەر دەگاتە لای خوا.

## دەزگای ئەمن ـ ئیستخبارات ـ موخابەرات ــ ڕێکخستنەکانی بەعس

حزبـی بـەعس لەیەکـەم ڕۆژیـەوە کـەحوکمی گرتۆتـە دەسـت لەعێراقـدا، هەمیـشە لەکاردایـە بـۆ سـەرکوتکردنی ڕۆڵـەکانی گـەلی عێـراق لـەباکوورەوە تـا باشـوورو هێنانیـان بـۆ ژێـر بـاری ڕژێمـی عێـراق کەهیچ شەرعێك دانی پێدانانێت.

لەعێراقدا هاوولاَتی بۆی نییە سـەربەخۆبێت لەکاتێکدا تۆمـاری ژیـانی، ئاماژەیـەکی تێدایـە دەربـارەی ئامـادەبوونی لەکۆبوونەوەیەکـدا یـا ئیمزایـەکی کردبێـت یابەشـداریکردبێت لـەکاروباری ڕێکخـستنێکی حزبی جگە لەحزبی بەعس. خاك بەدامەنی ئەگەر مل نەدات!

پێویـستی هاتنـە ریـزی ڕێکخـستنەکانی حزبـی بـەعس ئـەرکی سەرشـانی کاسـبکاران و هـەموو چین و توێژەکانی کۆمەڵگەی عێراقە بەگشتی. هاوولاَتی ئەگەر نەیەتە ریزی حزبی بەعسەوە ئەوە خۆی تووشی گێـچەڵێك دەکـات دەروەسـتی نایـەت. چـونکە لـەم بـارەدا دەزگـا ئەمنییـەکان تۆمـەتی بێبناغـەی بـۆ هەڵدەبەستن و بـۆ ماوەیـەك زینـدانیی دەکـەن کەتووشـی چـەندین جـۆر ئـازارو ئەشکەنجە دەبێـت کـە نـە بینـراوە نـە بیـستراوە، پاشـان دۆسـیەکانی ڕەوانـەی دادگـای شـۆڕش دەکرێـت کەلـەوێ هەمووشـتێك ئامادەکراوە، چونکە لەڕێی چەند ماددەیەکی یاساییەوە حوکمی چەند ساڵێك بەتەنگەیدا دەدرێت.

**بەشی ئابووری**

لقێکی ئاسایشی گشتییە، ڕۆڵی گەورەی هەیە بۆ تۆمـەت هەڵبەستن و زینـدانکردنی خـەڵکی بێتـاوان، بەبێخۆهەڵکێشان دەڵـێم زۆر کەسـی بێتـاوانم لـەحوکمی چـەند سـاڵ زینـدانی ڕزگـارکردووە کەتۆمـەتی زیادەڕۆیکردن لەنرخی کەلوپەل بـە ٥٠٠ فلس، تۆمـەتبارکراون. ڕاستییەکەشـی وانـەبوو، تومـەز کـابرای داماو نەیویستبوو بچێتە ریزی حزبی بەعسەوە هیچیتر.

زۆر جاری تر دەمبینـی نـۆرە دەچـووە سـەر لێپرسـراوو سـەرانی خـودی حزبـی بـەعس ئـەوەش لەبەر ملنـەدانیان بـۆ فـەرمانێك یـان گومـانکردن لەدڵـسۆزییان لەئاسـت ڕژێـم. ئنجـا دەمودەسـت تۆمـەتیان بـۆ هەڵدەبەستراو زیندانیدەکران و دەکەوتنـە بـەر زەبـری ئـازارو ئەشـکەنجەدان. ئەمانـە تۆمـەتی ئەنجامـدانی لادانی سێکسی یان بەرتیل خواردن یان بوون بەپیاوی بێگانەیان دەدرایەپاڵ، نموونـەی ئەمانـە زۆر بـوو وەکو: عەبدلخالق سامەرائی، عەبدولکەریم شێخلی و زۆری تر.

**وەزارەتی داد:**

داد گرنگترنین پێوەرێکە بۆ زانینی بارودۆخی ولاَتێك و ناسینی ڕژێمە دەستەلاَتدارەکەی کەواتە وەرن باکورتەیەکتان دەربـارەی داد لەعێراقدا پێشکەش بکـەم لەسـەرەتای دامەزرانـدنی دەوڵـەتی عێـراق هـەتا ئەمڕۆ(مایسی ٢٠٠٢).

لەسـەردەمی حـوکمی پاشـایەتیدا داد بەرێگـەی ڕاسـتی خۆیـدا بەرێوەدەچـوو ڕۆڵێکـی گـەورەی بـۆ پارێزگاریکردن لەمافی هاوولاَتی عێراقی دەبینی هەروەها بۆ داکۆکیکردن لێی لەپیاوخراپان هەروەها بۆ دادگـایکردنی سەرپێـچکەران و سـزادانیان بـەپێی مـاددە یاسـییەکان بـەبێ زیادوکـەم. ئەوسـا بـواری کەسـایەتی و ناسـیاوی نـەدەدرا وەکـو ئـەمڕۆ پێـڕەو دەکرێـت. لێـرەدا ڕۆڵـی دادگـا سـەربازییەکان و

دامودەزگا ئەمنییەکان پشتگوێ ناخەم کەبەهجەت عەتیە بەڕێوەی دەبردن، چونکە ئەوە باسێکی ترەو ئێرە جێگەی نییە.

دوای شۆڕشی ١٤ی تەمموزی ١٩٥٨، بەپەلە دادگای شۆڕش بەسەرۆکایەتیی خوالێخۆشبوو مەهداوی دامەزرا. بەڵام ئەو دادگایە لەگەڵ شۆڕشی لەمەڕ بەعس بەراورد ناکرێت. ئەوەی یەکەم بۆ سەقامگیرکردنی بناغەکانی شۆڕش دامەزرا، بەڵام ئەوەی دوایی بۆ جێگیرکردنی زاڵدەستیی گروپێك پێکهێنرا. لەسەردەمی فەرمانڕەوایی سەرکردەی کۆچکردوو عەبولکەریم قاسمدا، دەزگای داد سەربەخۆبوو، بەبێ جیاوازیکردن لەکێشەی هاووڵاتیانی دەکۆڵێیەوەو بڕیاری دەردەکرد.

دوای ساڵی ١٩٦٣ کاتێك عەبدولسەلام عارف حوکمی گرتەدەست، بەخۆیو تۆمارە رەشەکەی کەپڕبوو لەهەڵوێستی دوژمنکارانە دژی گەلی کوردستان، وردە وردە پاشاگەردانی بڵاوبۆوەو ئارامیو ئاسایش لەگریژنە چوو، بەتایبەتی دوای بڕیارە ناڕەواکەی دەرهەق حەلاڵکردنی ماڵو سامانی کورد بۆ پیاوکوژەکانی هەتا خوای گەورە تۆڵەی کوردی لێسەند کاتێك ساڵی ١٩٦٦ بەرووداوی کەوتنە خوارەوەی فڕۆکەکەی، لەناوچوو.

ئنجا لە٣٠ی تەمووزی ساڵی ١٩٦٨دا بەعسییەکان حوکمیان گرتەدەستو سەدام حسەین بوو بەڕێوەبەری دامودەزگا ئەمنییەکان. کاتێکیش ئەنجومەنی شۆڕش دەستەڵاتی رەهای بەسەدام حسەین بەخشی ئیتر پێشێلکاریی یاسایی بەشێوەیەك زیایدیکرد کەهیچ کتێبێك نایگرێت، چونکە سەدام، لەپێناو پارێزگاریکردن لەخۆی و لەدەستەلاتەکەی" بەبێ رەچاوکردنی مافەکانی گەلی عێراق، رێگەی بەخۆیدا هەموو شتێك بکات! بەتایبەتی دوای شەڕی کەنداو و بێزاربوونی خەڵکی کەکاتێکی زانی ٤٠٪ ی کۆنترۆڵی لەدەستچووە.

جا ئەگەر دەربارەی بارودۆخو چۆنیەتی بەرێوەچوونی داد لەبەغدا" لەیەکێك بپرسیت لەوەلامدا دەڵێت ٧٥٪ ی نەماوە. ئنجا رژێم هەرچەند هەوڵبدات هێشتا بەرەلایی لەزیادبووندایە، بەداخیشەوە دەڵێن کەئێستا هەڵگرانی ئالای پشتگرتنی هەق، بەخۆیان زۆروستەم پیادە دەکەنو بەرەلایی بڵاودەکەنەوە. دەبینیت پارێزەرو ئەفسەری پۆلیس هەمیشە لەسەر ئەوە یەکدەنگن کەئەم تۆمەتبارە بەبێتاوان دەربکەونو ئەوەی تر کەبێتاوانە، بەتاوانبار دەربکەن. ئەوەی ئەمانەش لەسەری رێکناکەون مەسەلەی ئەو نرخەیە کە لەبنکەی پۆلیسدا وەریدەگرن، ئەفسەری پۆلیس کاتێك کێشەیەکی دێتە بەردەست بیر لەتۆمارکردنی کۆنووسی رێککەوتن ناکاتەوە ئەوەندەی بیر لەوە دەکاتەوە کام لایەنیان دەوڵەمەندترە، ئەمەش بۆئەوەی شەوێك زیاتر لە بنکەی پۆلیسدا گلی بداتەوە تا هەندێك پارەی لیبکێشێتەوە. جا ئەمە بارودۆخی دادو دادپەروەرییە لەبەغدا هەروەکو هامشۆکەران بۆمانی دەگێڕنەوە.

جارێکیان خوالێخۆشبوو بەرێز مەلا عەبدوڵلا(مەلا ماتۆڕ) بۆمی گێڕایەوە گوتی لەکۆبوونەوەیەکی سەرۆکایەتیی ئەنجومەنی وەزیراندا( کەخۆی ئامادەیبوو)، بەرێز سەدام حسەین گوتی: ئایا دەزانن تاکە

قازییەکی دادپەروەر لەهەموو پارێزگاکانی عێراقدا، قازیی خانەقینە کەسەر بەپارێزگای دیالەیە؟ دەزانن بۆ ؟ چونکە ئەو قازییە بەعسی نییە!

ئەمە دانپیانانێکی ئاشکرایە کەهۆکاری سەرەکیی بەرەلآیی یاسایی لەعێراقدا، گەندەڵیی کارگێڕیی بەعسە لەولآتدا.

## دادگا لەکوردستاندا دوور لەدەسەلآتی حزبی بەعس

لەگەڵ ئەوەی ناوچەکە لەئارامی سیاسی بێبەشەو لەهەمانکاتدا باری ئابووریی هەرێمی کوردستان شڵۆقە، بەلآم دەبینین وەزارەتی داد، هەر لەبەرێز وەزیرەوە هەتا بچووکترین کارمەندی وەزارەتەکە، کاروباری خۆیان لەرووی سەقامگیرکردنی ئاسایش و بەرقەرارکردنی بۆ خەڵکی کوردستان هیچی لەرۆڵی مامۆستا بەرێزەکان ( پەروەردەکاری نەوەی نوێ)و کارمەندی وەزارەتی تەندروستیو پەرستاران( بەژن و پیاویانەوە) کەمتر نییە. ئیدارەی هەرێمی کوردستان هەرگیز رۆڵی ئەم توێژانەی کۆمەڵگەو هی تر لەبیر ناچێتەوە کە( رازی نەبوون سەر بۆ مووچەی رژێم کەچبکەن)و کارکردنیان بەبێ مووچە لەکوردستاندا هەڵبژارد نەك لەسایەی سەدام حسەیندابن، ئەم پرەنسیپەشیان کرد بەدروشمیان.

ئەی داگیرکەری زۆردار هەرکەسێك بیت: ئەمە جوامێریی کوردی رەسەنە کە بەپێی بنجە رەسەنەکەی کاردەکات. لێرەدا دەمەوێت رووی گلەیم لەپیاوانی دەزگای داد بکەمو بڵێم: ئەی ئەوانەی بەچاوی بەستراوەوە تەرازووی دادپەروەریتان لەناو خەڵکدا بەرزکردۆتەوە، چاکتر وابوو هەمووتان یەکبگرنو لەرووی بەڕێوەبردنی سیاسەتو بەرقەرارکردنی ئاشتی لەهەرێمی کوردستاندا، رۆڵێکتان بگێڕایەو رایەکی توندتان بەسەر هەردوو بەرێز جەلال تاڵەبانیو مەسعوود بارزانیدا بسەپاندایە بۆ ئەوەی ناکۆکیی نێوان ئەم دوو حزبە زلهێزە بەلادا بخەن. چونکە ئەگەر ئەم ململانێو دابەشکردنەی هەرێمی کوردستان نەبوایە رۆژمان بەم رۆژە نەدەگەیشت...کەواتە جیاوازیی رێکخستنی سیاسی بخەنە لاوەو ئاورێك لەو خەڵکە بدەنەوە چونکە دەزگای داد پلەیەکی بالآی هەیە، ئێوەش مەزنن، پێغەمبەری خواش (د.خ) فەرمویەتی ( سەروەری خەڵك، خزمەتکاریانە).

دوای رووداوەکانی ٣١ی ئابی ١٩٩٦ کاتێك هەولێری پایتەختی هەرێمی کوردستان لەلایەن سوپای عێراقەوە داگیرکرا کەبنەماڵەی بارزانی بەبێ شەرم بۆ ناو خاکی پیرۆزی کوردستانی ئازادکراو کەوتنە پێش سوپای رژێم" کە لەئەنجامدا ئەمە بوو بەمایەی دابەشکردنی کوردستان بەسەر دوو ناوچەدا، ناوچەیەك بەرەی خیانەت لەهەولێر بەڕێوەی دەبات و، بەرەیەکی نیشتمانی لەسلێمانی کەیەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بەڕێوەی دەبات، ئنجا هەرناوچەیەك بوو بەخاوەنی ئیدارەیەکی سەربەخۆ، سەبارەت بە داد لەو ناوچەیەی کەبنەماڵەی بارزانی بەڕێوەی دەبات ئەوە دوای ٣١ی ئابی ١٩٩٦ بارودۆخی ناوچەکە تێکچوو، پێشێلکارییە یاساییەکان لە بواری داوەریدا لەئەوسا زیاتر بوو، بەلآم سەرباریشی ئەو پێشێلکارییانە لەگەڵ ئەو بەرەلآییو پێشێلکارییانەی لەمەڕ بەغدا، بەراورد ناکرێن. چونکە ئەگەر رێژەی پێشێلکارییەکان لەبەغدا ٧٥٪ بێت ئەوە لەشاری هەولێر دەگاتە ٢٠٪، هۆی سەرەکیی ئەمەش دەستێوەردانی دانیشتوانی هاوینەهەواری سەلآحەدینە لەکاروباری دادو، فەرمان

دەرکردن چ زارەکی چ بەنووسین یا بەتەلەفۆن بۆ دادگا. پاڵپشتیان بۆ ئەم کارانەش شێوانی بارودۆخی دادگاکانە بەپارێزەرو پۆلیسەوە.

لەوەتەی هەولێرم بەجێهێشتووە ئاگاداری بارودۆخی کاروباری دادوەری ئەوێ نیم، بڕواش ناکەم کەس پڕکێشی بکات شتێکی لەسەر بنووسێت، بەڵام وەکو دەڵێن: عەیبە، هەتا سەر ناشاردرێتەوە. ئەوەی هەیە ماوەی مانەوەم لەهەولێر دیمەنێکی زیندووی دەربارەی چۆنیەتیی بەڕێوەچوونی کاروباری دادو دادوەری لەوێ، لەلام دروستکردووە.

سەعات چواری عەسری رۆژی پێنج شەممە ١٩٩٧/١٠/٢٣، ئەفسەری لێکۆڵینەوە لەبنکەی پۆلیسی گەڕەکی ئیسکان(هەولێر)، لەگەڵ مەفرەزەیەکدا بازیانی کوڕە گەورەمی گرت و هەتا نیوەڕۆی رۆژی شەممە لەلای خۆی زینداندیکرد. لەهەمان رۆژدا داوانامەیەکم بەژمارە( ٩٩٧/٢٢٥ تنفیذ)بەناوی بازیانەوە نووسیو دەست بەدەست وێنەیەکیم لێ گەیاندە لای هەریەك لە وەزیری داد، بەڕێوەبەری گشتیی دادگا، بەڕێوەبەری گشتیی پۆلیس، بەڕێوەبەری پۆلیسی گەڕەکی ئیسکان، دادوەری لێکۆڵینەوەو سەندیکای پارێزەران، داوامکرد بریار لەسەر ئەو کێشەیە بدەن. دوای تاوتوێکردنی کێشەکە لەگەڵ لایەنە پەیوەندارەکان، بەم ئامانجە گەیشتم:

رائید نەجات . بەڕێوەبەری پۆلیسی گەڕەکی ئیسکان گوتی: نەمدەزانی بازیان کوڕی تۆیە دەنا بەقسەی عەونی بەزازی پارێزەرم نەدەکرد بۆ دەستگیرکردنی.

(منفذ عدلي) مامۆستا هادی کەداوای بانگێشتکردنەکەی ئیمزاکردووە پێمی گوت: گلەیی لێمەکە، هیچ لەیاسا نازانێت، پێشتر لەدادگا بنووس بووەو دوای ٣١ی ئاب لەبەرئەوەی لە(پاراستن)بووە ئەم پۆستەی پێدراوە.

بەڕێوەبەری گشتیی پۆلیس گوتی: دەتوانم بێ دوودڵی بڵێم زەحمەتە کاری وا لەکەسێکی دڵسۆزی وەك رائید نەجات بوەشێتەوە، ئەمە سەد دەرسەد کاری عەونی بەزازی پارێزەرە.

بەڕێوەبەری گشتیی دادگا پێمی گوت: رۆژانە ئەم مەسەلەیە لای ئێمە لەدادگا دووبارە دەبێتەوە. باش بوو کوڕی تۆ بەدوو رۆژ رزگاری بوو، چونکە کەسانی وا هەیە چەند مانگێك لەزیندان دەمێننەوە...مامۆستا رەفیق خێرت دەگاتێ ئەگەر دوای ئەم کێشەیە بکەویت و بەناو خەڵکدا بڵاویبکەیتەوەو بیگەیەنیتە سەرەوە.

لێپرسراوی سەندیکای پارێزەران گوتی: مامۆستا عەونی بەزاز چاکترین پارێزەرەو پاکترین تۆماری هەیە لەکاری پارێزەریدا، ئەم کارە لارووێرانە تەنها ئیشی رائید نەجاتی بەڕێوەبەری پۆلیسی گەڕەکی ئیسکانە کەسەری مارەکەیە.

گوتم: یەکێك لەهەڵەکانی بەڕێز مەسعوود بارزانی ئەوەیە کاروباری داد، بەتایبەتی کاروباری پارێزەرانی زیاد لەپێویست شایستەکردووە... زۆر بەداخەوە کەپارێزەری وا هەیە شایەنی رێزلێنان نین و هەموو ئامانجێکیان کۆکردنەوەی پارەیە بەزووترین کات.

لەودانیشتنەدا ژمارەیەك پارێزەری لێبوو.

دادوەری لێکۆڵینەوە کاک نەوزاد گوتی: بازیانی کوڕت دەبێ دوعا بۆ خوا بکات کە بەدوو ڕۆژ زیندانی ڕزگاریبوو، ئەمڕۆ کابرایەکم ئازادکرد شەش مانگ بەبێتاوان لەزیندان مابۆوە، پۆلیس و پارێزەر ڕێککەوتبوون تۆمەتێکیان بۆ هەڵبەست و کابرا خرایە زیندان. بەداخەوە کەیاسایەکیش هەیە ڕێگە دەدات شکات لەودادوەرە بکات کەفەرمانی دەستگیرکردنی دەرکردبوو.

وەزیری داد، دوای ئەوەی بەنووسراوەکانی کێشەکەدا چۆوە، فەرمانی دەرکرد لێکۆڵینەوەی تێدابکرێت و ئەوەی دەستی لەو سەرپێچییە نایاساییەدا هەبوو سزا بدرێت ئیتر هەرکەسێك بێت. بەڵام ئەمە قسەی سەرکاغەز بوو.

بناغەی سیناریۆکەش وابوو کەبازیانی کوڕم، کێشەی لەگەڵ ناوبراو ئیبراهمدا هەبوو کەکوڕی ملیۆنێرێکە . ئیبراهیم کە لەکێشەکەیدا لەگەڵ بازیاندا لەدادگا، سەرکەوتنی بەدەستنەهێنابوو بڕی ۱۵۰۰ دینار بەعەونی بەزازی پارێزەردا کەبازیان بۆ ماوەی دوو ڕۆژ بخاتە زیندانەوە، ناوبراو بەو پارە کەمە ویژدانی عەونی بەزازی پارێزەرو، ڕائید نەجات و، ئەفسەری لێکۆڵینەوە لەبنکەی پۆلیسدا کاک حەمید کەمالی بنووسی داواکردنی بانگێشتنەکەی لەمەڕ (منفذ العدلي)کڕبوو.

خوێنەری خۆشەویست ببینە چ تاقمێکن ئەمانەی بۆ ئەنجامدانی کارێکی وا یەکیان گرتووە، لەڕاستیدا ئەمانە دەبوایە دەستیان بخستایەتە ناو دەستی یەکتر بۆ ڕزگارکردنی بێتاوانێك یان چاککردنی ناپاکێك، ڕاستیشیان گوتووە ئەوەی لەکەس نەترسێت کەس لێی ناترسێت. شتێکی بەڵگەنەویستە کەجیاوازییەکی گەورە هەیە لەنێوان کاری جددی لەئیدارەی بەغدا لەگەڵ ئیدارەی کوردستان بەگشتی، چونکە ئەم دوانە بەراورد ناکرێن، بەڵام ڕاستییەکە ئەوە دەسەلمێنێت کەبارودۆخی ئیدارەی سلێمانی لەگەڵ ئیدارەی هەولێردا بەراورد ناکرێت. ڕێژەی بەرەڵایی یاسایی لەژێر سایەی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستاندا نزیکەی ٥٪، لێرەدا خەڵکی ناوشاری سلێمانی و دەوروبەرەکەی ڕۆڵی سەرەکییان هەیە لەڕووی بەرقەرارکردنی ئارامی و ئاسایش وەك سروشت و نەریتێکی خۆڕسکیان کەخوویان پێگرتووە، بەڵام ئەوەی لەبنکەکانی پۆلیس و نووسینگەی پارێزەرەکان لەسایەی دەسەڵاتی بارزانیدا ڕوودەدات، بەهیچ شێوەیەك لەگەڵ دەسەڵاتی ناوچەی تاڵەبانیدا بەراورد ناکرێت، نەك تەنها لەبەر ئەوەی خەڵك و لایەنە پەیوەندارەکانی ژێر دەسەڵاتی تاڵەبانی پاکن، بەڵکو لەبەرئەوەی لەئەنجامی پێشێلکردنی یاسا دەترسن.

بەڕێکەوت لەسلێمانی بۆ هەندێك کاروباری دادوەری ڕێم کەوتە بنکەیەکی پۆلیس، ئەوپەڕی پاکی و دڵسۆزی نواندن و جێبەجێکردنی فەرمان و پیادەکردنی یاسام بینی لەگەڵ ترسان لەئەنجامی خراپ. سەرەڕای هەندێك وردە کەموکورتی و هەڵە، بەڵام زۆر دڵبەندی کارمەندەکان بووم، ئەوەی هەیە لەناو پارێزەرەکاندا بەداخەوەو لەگەڵ ڕێزمدا بۆ هەموو پارێزەرێکی دڵسۆزو نشتمانپەروەر لەهەرکوێیەکدابێت" دەڵێم کەموکورتی زۆرم لەئیشوکاریاندا بینی. بینیم هەموویان هەر هەڵپەی پارە کۆکردنەوەیانە کەئەمەش تەنها لەڕێی یاساشکێنی دێتەدی. جا ئەگەر دەرچوویەکی کۆلیجی یاسا بۆی نەشێت داکۆکی لەتۆمەتبارکراوێك بکات کەتاوانەکەی ئاشکرابێت، ئەوە کێشەکە لەوێدایە پارێزەر،

هەندێك جار سوور دەزانێت خاوەن كێشەكەی چەورەو دادگا تۆمەتباری دەكات كەچی بۆ دۆزینەوەی ڕێگەچارەی یاسایی پێچ بەمەسەلەكان دەدات تا بێتاوانیی كابرا بسەلمێنێت‌و خۆیشی لەبەرامبەر ئەوەدا پاداشت وەربگرێت. جا هەڵەكە لێرەدایە. كاتێكیش باسی مەسەلەی كوردو كوردستان لەگەڵ ئەو پارێزەرەدا دەكەیت خۆی ئەوەندە بەشۆڕشگێڕو نشتمانپەروەر نیشاندەدات دان بەهیچ كام لەحزبە سیاسییەكاندا نانێت‌و هەموویان بەخاوەن هەڵوێستی خیانەتكارانە دەژمێرێت. بێگومان لێرەدا مەبەستم هەموو پارێزەران نییە، خوانەكات شتی وابڵێم، چونكە مێژووی خەباتی كوردایەتی، ڕاستگۆیی‌و پاكیی زۆریان تۆكاركردووە، بەلام ڕاگرو مامۆستایانی كۆلیجی یاساو ماف دەبێت جگە لەپێڕەوی خوێندن، نیشتمانپەروەری‌و خۆشەویستیی خاك‌و ئاكاری جوان‌و بێگەرد فێری خوێندكاران بكەن.

یەكێك لەو چەكە كاریگەرانە كەكۆماری ئیسلامی ئێران لەدژمان بەكاری دێنێت تلیاك‌و ماددە بێهۆشكەرەكانە. كۆماری ئیسلامی لەڕێی خەڵكی ناپاك‌و بێویژدان‌و سیخوڕەكانیەوە بەردەوام لەم ماددە بێهۆشكەرانە بۆ كوردستان ڕەوانە دەكات، ئیتر یا بەخۆڕایی یا زۆر بەهەرزان، لەكاتێكدا ئەم ماددانە لەناوچەكانی دەرەوەی كوردستان لەناو ئێراندا قەدەغەن‌و ئەوەی پێی بگیرێت سزا دەدرێت. بەڵام بەداخەوە، تەماعی زۆری هەندێك تەماعكار وایكردووە قاچاخچییەتی بەم ماددانەوە بكەن، هەروەكو دەشزانین بەندیخانەكانی لای خۆمان زۆری لەم جۆرە قاچاخچییانە تێدایە كەچی پارێزەریش هەیە داكۆكیان لێدەكەن‌و ماددەی یاسایی وایان بۆ دەدۆزنەوە تا بەبێتاوانیان دەربكەن.

**شایەدیدانێکی هەق**

زۆر بەدڵنیاییەوە دەڵێم ڕۆژێك دادێت، سەرۆكی عێراقی سەدام حسەین دەدرێ بەدادگای نێودەوڵەتی لەلاهای، ئەوەش ئەگەر تا ئەو ڕۆژە نەمرێت. خۆ ئەگەر خوا كردی من لەو دادگاییكردنەدا بەشایەد گیرام، ئەوە بەسوپاسەوە خۆم دەڕۆم‌و ئەوەی لەلامە هەڵیدەڕێژم.

ئەو پیاوە، لەگەڵ ئەو هەڵوێست‌و هەوڵانەی بۆ لەناوبردنی گەلی كورد داویەتی، بەڵام لەراستیدا داوامان لێدەكات یەك بگرین‌و یەك سەنگەر لەدژی خۆی‌و هەوڵەكانی بگرین. گەلی عێراقیش هەتا ماوە قەرزداری یەك شتی ئەم پیاوەیە ئەویش ئەوەیە كەرێگەی نەداوە ماددە بێهۆشكەرەكان لەعێراقدا بلاوبێتەوە، چونكە سەدام لەرۆژانی سەرەتای دەستگرتنی بەسەر دەسەلاتدا ئەوپەڕی زەبروزەنگی دژی بازرگانیكەران بەماددە بێهۆشكەرەكان‌و لەهەمان كاتدا ئەوەی بەكاریشی دێنێت، نیشانداوە.

بەلای خۆشمەوە لەدوولاوە خۆم بەقەرزارباری سەدام حسەین دەزانم، یەكەمیان ئەوەیە كە لەدواساتدا بەتەلەفۆن حوكمی لەسێدارەدانمی هەڵوەشاندەوەو كردی بەزیندانیكردنی هەتاهەتایی، دووەمیشیان ئەوەیە كە دوای بەسەربردنی ماوەیەك لەزیندانەدا، چاوپۆشی لەهەرچی كردبووم، كردو فەرمانی ئازادكردنمی دەركرد.

ئەمە ڕاستییەكی حاشاهەڵنەگرە. ئەوەی بەبیری مرۆڤیشدا دێت‌و پشتگوێی ناخات هەڵوێستی كەسانی خاوەن هەڵوێستە. ماوەیەك لەمەوبەر دوو پارێزەری ناسراوو بەناوبانگم بینی، سەیر ئەوەیە

دوای ئەوەی هەریەکەیانم بەجیا بینی، کەچی هەردووکیان یەك داوایان لێم هەبوو ئەویش ئەوەبوو کەلای(فلأن کەس) بۆیان تێبکەوم تا داماوێکیان بۆ ئازاد بکەم بەبیست کیلۆگرام هیرۆیینەوە گیراوە. خۆ ئەم ماددیە پێویست ناکات لەسەری بنوسین، خودی سەدام حسەینی سەرۆکی عێراق قەدەغەی کردووەو جەنگی دژی ئەوانە بەرپاکردووە کەقاچاخچییەتی پێوە دەکەن یان بەکاری دێنن، کەچی ئەوەش هەڵوێستی ئەوانەی لای خۆمانە کەئالأی داکۆکیکردن لەهەقیان هەڵکردووەو بەرگری لەدرندەیەك دەکەن ویستوویەتی ژەهر بەناو خەڵکی کوردستاندا بلأوبکاتەوە. بەلأم کاتێك زانیم ئامانج لەم داکۆکیکردنە تەماعی زۆرو پارەی مۆڵە، حەپەسانم زیاتر بوو، چونکە پیاوێك لەوانە دای بەگوێمدا کەئامادەیە بڕی ٦٠ هەزار دینارم بۆ پەیدابکات بۆ چاپکردنی کتێبەکەی دواییم، لەکاتێکدا بەئاشکرا دەیزانی ئەم پارەیەی نییە. لەهەمووی سەیرتر ئەوەیە ئەو قاچاخچییە تاوانبارەی کە بەتاوانی بازرگانیکردن بەماددە بیهۆشکەرەکان زیندانیکراوە لەگەڵ یەکێکی تردا لەسۆنگەی هەمان تاوان دەستگیرکراوە، کەچی کابرای دووەم بەهۆی واسیتەی فلأنەوە ئازادکراوە. ئنجا هەرچەندە من سوێندم خوارد کەهیچ پەیوەندییەکم بەفلأنە لێپرسراوەوە نییە تا دوو قسەی لەلا بکەمو ئەو قاچاخچییە ئازادبکرێت، بەلأم هیچیان بڕوایان پێنەکردمو منیش هیچم بۆ نەکرا.

لێرەدا دەمەوێت ئاوڕێك لەمەسەلەی دادگاو کاروباری دادو پێشێلکردنی یاسا لەسایەی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بدەم کەدەڤەری سلێمانی بەڕێوە دەبات:

ساڵی ١٩٩٩ کە لەهەولێر بووم، چاوم بە(...) ی پارێزەر کەوت، لەکاتی گفتوگۆدا باسی ئەوەیکرد کە لەدادگای سلێمانی، داوایەکی دادوەریم لەسەرە هێشتا بڕیاری لەسەر نەدراوە. ئنجا بۆ روونکردنەوەی قسەکانی گوتی کە فلأنە دادوەر دۆستی خۆشەویستیەتیو هەر کەئەم دەچێت بۆ سلێمانی لەماڵی ئەو دادوەرەدا دەمێنێتەوەو، ئەوەندە لەیەکتر نزیکن هیچ داوایەکی ئەم ناداتە دواوەو لەهەموو شتێکدا رێکن. لەدرێژەی قسەکانیدا گوتی ئەگەر ٢٥ هەزار دینارم بدەیتێ ئەوە دەتوانم وابکەم کێشەکە لەبەرژەوەندیی ئێوەدا یەکلابکرێت، بەپێچەوانەی ئەمەش ناتوانم دەستەبەری ئەنجامەکان بکەم، هەروەها ئاماژەی بەوەشدا کەئەو راپۆرتەی فلأنە دادوەر لەسلێمانی گەلألەی کردووە بەشێوەیەك دارێژدراوە کەدژی ئێوەیە، راپۆرتەکە لە١٨ لاپەڕە پێکدێت. میوانەکەم راستی دەکرد، تومەز فلأنە دادوەر راپۆرتێکی بە١٨ لاپەڕە لەدژی ئێمە دەرکردبوو، داواکەش ئەوەیە کە کەریم عەلی قادر، زەکیە زوهدی، عائیشە خەفافو شیرین مەعرووف ڕوستەم، وارسی شەرعی رۆستەم بەگن کەخاوەنی یاساییو شەرعیی سەنەدێکی هەمیشەیینو چەند بەڵگەو بڕیارێکی دادگا پشتگیریی ئەم داوایە دەکەن. لەهەمووی سەیرتر ئەوەیە کەکەسی ناودار لەکاربەدەستانی دادگای سلێمانی دان بەمافی ئێمە لەو پارچە زەوییەدا دەنێن کەکێشەی لەسەر هەروەها کەوەزارەتی پەروەردە دەستی بەسەر بەشێکیدا گرتووەو باقییەکەیشی بەدەست چەند کەسێکی ترەوەیە. یەکێك لەو کاربەدەستە دادوەرانەی سەرەوە گوتی لەئەم دونیاو لەئەو دونیاشدا لەبەردەمی خوا شایەدی دەدەم کەئەو زەوییە هی ئێوەیە بەلأم ئێوە لەرووی یاساییەوە لەدەستان دەرچووە...

خوێنەری بەڕێز سەرنجی ئەم چەند وشەیە بدە کەدەتوانم بەبەڵگە بیانسەلمێنم، هەر خۆتان ئەم قسانە هەڵسەنگێنن‌و بزانن چۆن دەبێت مرۆڤ، بەپێی یاسا مافی بخورێت. لێرەوە رووەدەکەمە ئەوانەی سەروەریکردنی کۆمەڵانی خەڵکیان لەسایەی داماوکردنیاندا دەوێت، دادپەروەربن تا دەستەلاتتان سەقامگیربێت چونکە کاروبار تەنها لەرێی دادپەروەرییەوە جێگیر دەبن‌و هەر کەدادپەروەری نەما ئەوانیش تیادەچن.

ئێستا هەموو هیوایەکی وەرەسەی روستەم بەگ بەڵێنێکی پێغەمبەری خوایە(د.خ) کەفەرمویەتی( مافێك داواکاری هەبێت نافەوتێت)، هەروەها چاویان لەدادپەروەریی بەڕێز جەلال تاڵەبانییە کەپیاوی یاسایە، پشت بەخوا من چاوەڕێی پشتگیریی ئەوم.

﴿ وان ليس عڵي للانسان الا ماسعى وأن سعيه سوف يرى﴾

لەچوارچێوەی دەزگای موخابەراتدا پلەی کارمەند ئەوەندەی چالاکییەکانی گرنگ نییە. بەش بەحاڵی خۆم، ئەو فاکتەرانەی لێهاتوویی کەیارمەتییانـدام بـچمە نـاو ریزەکـانی حزبـی بەعـسی عـەرەبیی سۆسیالیـست، شارەزاییم نەبوو لەلایەنە پەنهان‌و نهێنیەکان کەبۆ سەرکردایەتیی شۆڕشی کوردم دەناردن تا لەپێناو مەسەلەی گەلی کوردستان‌و بەرەنگاریکردنی بەربەستەکان بەکار بهێنرێن. هەموو ئەمانەو زۆری تر، بەهۆی بڕوای تەواوم بەرەوایەتیی کێشەی کوردو سووربوونم لەسەر ئەنجامدانی ئەوەی لەتوانای کەسانی تردا نییە، هەروەکو چۆن خوای گەورە فەزڵی خۆی بەسەر حەزرەتی ئادەم(د.خ)و نەوەکانی رژاند بەو بەهرانەی لەهۆشیاندایە. وەك دەزانین خوای گەورە وزەی زۆری بەمرۆڤ بەخشیوە تابیخاتە خزمەتی مرۆڤایەتی، جا شانبەشانی باوەڕهێنان بەخوا؛ هەستی نشتمانپەوەری بالاترین هەستێکە لەهەموو کەسێکدا کەئەوەندەی پێدەوێت دنەی بدەیت تا بێتەدی.

ئەوەی لەماڵ‌و سامان کۆکردنەوە دووریخستمەوە(کە لەبەردەستیشمدابوو)و ئەوەی هانیدام ژیانی خۆم‌و بنەماڵەکەم بخەمە مەترسییەوە بێ‌ئەوەی گوێ بەمەترسییەکانی یاری بەئاگرکردن بدەم هەستکردنم بوو بەوەی کەمن" لەپێگەیەکدام دەتوانم خزمەتی گەلی کوردستان بکەم، ئەمەش بەمەرجێك گوێ نەدەمە واتەوات، هەروەها گوێ نەدەمە ئەوەی کە بەناپاك ناوم دەبەن.

پرسیارگەلێك لەسەر من هەبوو کەداخۆ رەفیق پشدەری کێ بێت؟ تۆبڵێیت ئەو پیاوەی خەڵك باسی دەستڕۆییەکەیان دەکرد پلەی چیبێت؟ چی وای لەئەندامانی سەرکردایەتیی حزبی بەعسکرد هیچ داوایەکی ئەم پیاوە نە دەنەدواوە؟ ئنجا چۆن توانی بچێتە ناو ریزەکانی حزبی بەعس لەکاتێکدا ئەو لەنەتەوەیەکی ترە؟ ئەمانەو چەندین پرسیاری تر کەئاگام لێبوو لەسەرزاری خەڵکدابوون.

هەروەکو پێشتریش ئاماژەم پێدا خۆشەویستیی نیشتمان‌و سووربوونم لەسەر خۆبەختکردن لەو پێناوەدا، هاندەری سەرەکی‌و هەرە لەپێشم بوو.

هەر لەساڵی ١٩٦٥ هەتا ١٩٧٦/٩/١٤ کەدەکاتە ماوەی کارکردنم لەگەڵ دامودەزگا ئەمنییەکان بەناوی(وکیل امن)، لەهەمانکاتدا وەکو راوێژکار لەنووسینگەی بەڕێز جێگر سەدام حسەیندا کارم دەکرد. کاتێکیش لەلایەن هەمان دەزگاوە دەستگیرکرام، زۆر بەتوندی پێم راگەیەنرا کەنابێت هیچ کەسێك بزانێت من لەنووسینگەی بەڕێز جێگردا کارم کردووە، ئەگەر پرسیاریشم لێکرا دەبێت بڵێم لەبواری بازرگانیی ئازاددا کارم دەکرد.

لێرەدا مەبەستم ئەوەیە کەپلەی کارمەندانی دەزگای ئەمن و ئیستخبارات ئەوەندەی ئامادەباشی و تواناو چالاکیی کارمەندەکەوە بایەخی نییە، چونکە لەداموودەزگا ئەمنییەکاندا هیچ، هەموو شتێکە.

خوێنەری خۆشەویست ..

هەرچەندە من نەچووومەتە ریزی هیچ حزبێکی سۆشیالیست و پێڕەویانم بەلاوە پەسەند نییە بەلاّم لەراستیدا رێڕەوو بیروباوەڕی وایان هەیە کەشایەنی لەبەرچاوگرتنە. بۆ نموونە یەکێك لەرەخنە پەسەندەکانی سستەمی سۆشیالیست دژی سستەمی سەرمایەداریو من بەپەسەندی دەزانم، ئەوەیە کە سستەمی سەرمایەداری تەنها بایەخ بەرووکاری سەرەکیی دەوڵەت یان حزب یان عەشرەت دەدات و گوێ بەگەل یان لایەنگرانی حزبەکانی تر (جگە لەحزبی خۆیان) یان ئەندامانی عەشرەتەکان نادەن. چونکە بەلایانەوە مادەم سەرۆك لەگەڵیاندایەو لەژێر کۆنترۆڵیاندایە، ئیتر ملی ئەوانی تر بشکێت. بۆ نموونە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، لەرووی مامەڵەی لەگەڵ کۆماری میسری عەرەبییدا تەنیا سەرۆك حوسنی موبارەك دەناسێت. لەئەفغانستان تەنها بەڕێز حەمید کارەزای دەناسێت. بەهەمان شێوەش لەکوردستاندا، دەبینین ئەمریکا تەنها بنەماڵەی بارزانی دەناسێت و حسابی بۆ دەکات. ئەم نەریت یان پێڕەوە ئەمریکییەش مۆرکی هەموو دەرەبەگێکە لەهەر جێیەکدابێت. جا خوالێخۆشبوو مەلامستەفا بارزانی لەگەڵ ئەوەی هاوسۆزیی خۆی بۆ جەماوەر دەردەبڕیو لەکۆڕوکۆمەڵە گشتییەکاندا بانگەشەی بۆ دیموکراسی دەکرد بەلاّم کاتێك باس دەهاتە سەر جووتیارو مەسەلەی پشتگیریکردنی ئەم چینە ماندووە زەحمەتکێشە، هەمیشە دەیگوت: ( من گوێ بەبیروڕای جووتیار نادەم، مادەم حەمەڕەشیدخانی بانەو عەباس ئاغام لەگەڵدان ئیتر ئەوان چاویان دەردەهات) کەمەبەستی جووتیاران بوو.

بەلاّم سەیر ئەوەبوو بارزانی، لەکۆتاییدا دژایەتیی سەرۆك عەشیرەت و کەسایەتییە ناودارە کوردییەکانی‌کردو ئەوانیشی خستە ریزی نەفرەت لێکراوەکانیەوە. چونکە دوای ئەوەی گەڕایەوە بۆ عێراق(١٩٥٨)، لەدانیشتنەکانیدا هێرشی دەکردە سەر شەهیدی قارەمان قازی محەمەدی سەرکۆماری کوردستان، بارزانی جنێوی وای بەو سەرکردە نەمرە دەدا کە مرۆڤ لەرووی هەڵنایەت باسی بکات، ئەمەش بێ‌ئەوەی ئەوە لێکبداتەوە مرۆڤ کەمرد، شەیتان دەستی لێهەڵدەگرێت نەك گلەییشی لێبکرێت، بریا گلەیی لێکردنیش بوایە.

یەکێك لەفاکتەرەکانی سەرکەوتنم کاتێك لەبواری ئەمندا کارم دەکرد ئەوەبوو کەئاوڕم لەهەموو کارمەندەکان دەدا، هەر لەپرسگەوە هەتا پاسەوان و سکرتێریش، تەنانەت خزمەتگوزارەکانیش هەموویانم دەدواندو یارمەتیم دەدان. ئەوانیش لەبەرامبەردا" بێ‌ئەوەی بەخۆیان بزانن خزمەتیان بەکێشە رەواکەم دەگەیاند.

پێشینان گوتوویانە بەزمانی شیرین مار لەکون دێتە دەر. ٩٨٪ ی ئەو دیارییانەم دەبەخشی کەبۆم دەهات، ئەوەی گومانم لێبەکردایە دەشێ زانیارییەکم لێی دەستدەکەوێت یان بەهەر شێوەیەك بووە خزمەت بەکێشەی گەلی کوردستان دەکات بێبەشم نەدەکرد. بەردەوام دیاریم دەکڕیو دەمبەخشی، لەم رێگەیەوە گەیشتمە لای هەموو لێپرسراوێك و تەنانەت گەیشتمە لای هەرەگەورەکان. دیارییەکان فەرشی

بچووکی گرانبەها، یان ماستو پەنیرو گوێزو هەنگوین بوو. دایکم، خوا لێی خۆشبێت زۆرجار بەسەرمیدا دەبۆڵاند کەئەوەندە قاپو حاجەتی ناومالی دەفەوتێت کەپڕم دەکردن لەماستو بۆ لێپرسراوەکانم دەنارد، تەنانەت بۆ سەرکۆمار. بەدایکمم دەگوت: من شوکرانەی خوا دەکەم کاتێك بەتەلەفۆن داوام لێدەکرێت بەمەنجەلێك ماستەوە بڕۆم بۆ نووسینگەی سەرکۆمار. پێغەمبەر(د.خ) بەو مەزنییەی خۆی دیاری وەرگرتووە. بەڵام ئەوەی لەسەرکردەکانی بەعسو بنەماڵەی بەڕێز سەدام حسەینم بینیوە زۆر سەیرە، چونکە بەهیچ تێریان نەدەخوارد، هەتا من دەمگوت(هانیّ!) ئەوان هەر دەیانگوت(کوانیّ؟)، دەتگوت تێرنەخۆرەیان گەییوەتیّ!

راستیان گوتووە: دڵو دەروون هەتا بیدەیتیّ داوای زیاتر دەکات، بەڵام ئەگەر لێت گرتەوە ئیتر قایل دەبێت. بەڵام لای ئەو جۆرە کەسانە قایلی نییە، چونکە قایلی سیفەتی ئیسلامو مرۆڤی رەسەنە.

هەرچییەکیان داوا لێم بەکردایە دەمدانیّ، ئەمەش هەر بۆ ئەوەی زانیارییەکم دەستبکەوێت لەرێگەیەوە ئامانجێك بپێکم. لەڕێی ئەو دەستودیارییانەوە پەیوەندیم بەبنەماڵەی سەرکۆمارو بەرێز جێگر سەدام حسەینەوە پتەوبوو. خوێنەر سەری لێم سووڕنەمێنێت ئەگەر بڵێم: ئەگەر دوو ملیۆن دینارێکم دەبوو خۆم دەزانم چیم پێدەکرد! لەوانەشە بڕوام پێنەکەن ئەگەر بڵێم بەو پارەیە، دەمتوانی مافی گەلی کورد بەدەستبێنم.

لەکاتی گیرانمدا پرسیاری ناوی ئەو کەسانەیان لێدەکردم کەزانیاریی هێند مەترسیداریان پێداوم تەنها لەناو دانیشتنەکانی سەرکردایەتیی بەعسدا باسکراون. بەڵام دیارییەکانم بەهەموو کونێکدا دەچوون، وەك ئاو دزەیان دەکردە هەموو جێیەك.

دوای ئاشبەتاڵ، ماوەیەکی دژوارو لەبیرنەکراوم بردەسەر، چونکە کاتێکم زانی تەنیام، هیچ حزبێك نەماوە رۆژانە راپۆرتی بۆ بنێرم، گوێبیستێکم نییە نهێنییەکانی لەلا هەڵرێژم، چونکە کاتێك شۆڕش ئاشبەتاڵی پێکرا من ورەم نەرووخا، بڕوام بەخۆم مابوو کەدەتوانم هەمووشتێك لەپێناو کێشەی رەوای گەلی کوردستان بکەم، بەڵام پێویستم بەدەلاقەیەك بوو لەرێگەیەوە زمانم بەبەرەیەکی کوردی بگات... لەکۆتاییدا سەیرمکرد تەنها خۆمم، تاقو تەنیا، گۆڕەپانیش چۆڵە...سەرباریشی بەردەوامبووم، بەوهیوایەی لەوانەیە لەرووی گۆڕینی رەوتی رووداوەکاندا سەرکەوتن بەدی بێنم.

## چەند دیمەنێکی سەیر

لەمانگی تەمووزی ١٩٦٨ەوە کەحزبی بەعس لەعێراقدا دەسەلاتی گرتە دەست، بەرێزان ئەحمەد حەسەن ئەلبەکرو سەدام حسەین لەبەرچاوی خەڵك ئەوەندە تەبا دیاربوون تەنانەت لەهەندێك سەرکردەی بەعسم بیست کەئەم دوانە، ماوەی ٦-٧ ساڵیش مەگەر بۆ خەوی شەو لێکتر جیابوونایەتەوە دەنا هەمووده‌م پێکەوەبوون، هەتا ساڵی ١٩٧٥یش کاتێك سەدام بارودۆخەکەی کۆنترۆڵکردو چیتر لەئەلبەکر سڵی نەکرد، وەکو سێبەری یەکتروابوون.

جارێکیان پێش کودەتای ١٧ی تەمووز بەماوەیەکی کەم، لەناکاو بەبێ‌وادە سەردانی ئەلبەکرم کرد لەماڵی خۆیدا، چەند سەعاتێك لەلای مامەوە کەلەو ماوەیەدا نەکەس پەیوەندی پێوەدەکرد نەسەردانیان

دەکرد، بۆم ئاشکرابوو کەپشتگوێخراوە. سەیریش ئەوەبوو لەودیدارەدا دشداشەیەکی تۆزێك کورتی لەبەردابوو چەند کونێکی تێدابوو، جگەرەی تێکراویشی دەکێشا کە لەماڵەوە دروستدەکرێت. ئیتر رۆژی ١٨ی تەممووزم هێنایە بەرچاوم کاتێك ئیزگەی بەغدا رایگەیاند بەڕێز ئەحمەد حەسەن ئەلبەکر بۆتە سەرۆکی کۆماری عێراق. ئنجا رێککەوتنی نهێنیی سەدامو سالح مەهدی عەمماش و ئەلبەکریشم لەیادە بۆ پاکتاوکردنی جەستەیی کەسایەتییە ناودارە سیاسییەکان و چۆلکردنی گۆڕەپانی سیاسی لەو پیاوانە بەماوەیەکی کورت، ئەوەش لەڕێی بەکارهێنانی دڕندانەترین رێوشوێنی کوشتوبڕو زیندانیکردن و دوورخستنەوەو رەفتاری نائەخلاقی و زۆر رێبازی تری شەیتانییانەی لەناوبردنی مرۆڤ.

ژمارەیەکی کەمی ئەو جۆرە کەسانە رزگاریان بووو توانییان خۆیان لەولات دەرباز بکەن و ماڵ و منداڵیان لەژێر بەزەیی ئەو ستەمکارانە بەجێبهێڵن کەبەزەییان بەکەسدا نایەتەوە.

حزبی بەعس لەسەرەتای دەسەلات گرتنەدەستدا، تاکە کەسێك هەولی بەهێزکردنی دابێت بەڕێز سەدام حسەین بوو، چونکە ئەم پیاوە هەڵوێستی زۆر ئیجابی هەبووە کەخۆی وەکو فریشتە دەنواند، ئەوانەی کەرۆڵیان لەبواری پیلاننانەوە هەبوو عەماش و حەردان بوون.

میشێل عەفلەق رۆڵێکی گەورەی بینی بۆ هێورکردنەوەی بارودۆخ و قەیرانی نێوان ئەندامانی سەرکردایەتیی بەعس، ناوبراو یەك بەیەك بەتەنیا چاوی پێیان دەکەوت و کاریگەریی زۆری لەسەریان هەبوو، توانی کۆیان بکاتەوەو پەیوەندیی نێوانیان پتەوبکات، هەروەها ئەلبەکرو سەدامیشی ئەوەندە بەهێزکرد کەسەرکردایەتی بگرنەدەست و سەرکردایەتیش پێیان رازیبێت.

میشێل عەفلەق دوای جموجووڵەکانی لەنێوان سەرکردەکانی بەعس، بەرێژەی ٩٧٪ کاریگەری لەسەر ئەلبەکر دەرخست و بۆ سەر سەدام بەرێژەی ٩٠٪، هەروەها ناوبراو توانیی ئەلبەکر بەوە قایل بکات کەرەزامەندیی سەرکردایەتی و گوێڕایەڵبوونیان بۆ فەرمانەکانی سەدام، لەبەرژەوەندیی ئەلبەکردایەو خزمەت بەپلانەکانی دەکات. بەلام ئەو دەرەنجامەی بەدەستهێنا ئەوەبوو کەدەستێکی نادیار لەپشت میشێل عەفلەقەوەیە بۆ ئەنجامدانی پلانێکی دارێژراو بەپێی میتۆدو بنەماگەلێکی سەقامگیر.

کورتەباسێك دەربارەی ئەحمەد حەسەن ئەلبەکر

خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا فەرمویەتی﴿ ان اکرمکم عند الله اتقاکم﴾ پێغەمبەریش(د.خ) فەرمویەتی: ( لافضل لعربي عـلي أعجمي ولا لأعجمي عـلي عربي الا بالتقوى، کلکم من ادم وادم من تراب).واتە خوای گەورە هیچ کەسێك بەپێی رەگەزی نەتەوەیی پاداشت ناکات، بەڵکو بەپێی ئیمانداری و خواپەرستی پاداشتی مرۆڤ دەکرێت یان سزا دەدرێت. هاوکات هیچ ئایەتێك لەقورئاندا یان هیچ فەرمودەیەکی پێغەمبەر نییە کەئاماژە بەوە بدات مرۆڤ دەست لەنەتەوەی هەڵبگرێت، کوردیش دەڵێت: ( رێوی لەکونی خۆی هەڵگەڕێتەوە، گەڕ دەبێت).

چەندین بەڵگە هەن دەیسەلمێنن کەئەلبەکر بەرەگەز کوردە، لەبەرگەکانی کتێبەکەمدا(کورد دوژمنی خۆت بناسە) باسی ئەوەم کردووەو تەنانەت ئەلبەکر لەبەردەم خەڵکێکی زۆردا پێمی گوت کەعومەر ئاغا، کەکاتی خۆی لەتکریت دادوەربوو، کوردبووەو خاڵی ئەمیش بووە. ئەلبەکر بەدرێژایی ژیانی

لەیەك شتدا راستی گوتووە ئەویش ئەوەبوو، کە لەچەند دانیشتنێکدا گوتوویەتی: (دەبێت ئەو رەگەزی کوردبوونەم، کە بەهۆی عومەر ئاغای خاڵمەوە بۆم ماوەتەوە، لەرەگوڕیشە بێنم). لەراستیشدا ئەو هەوڵەی بوو بەمایەی لەناوبردنی هەزاران کورد کەگیرۆدەی چەندین جۆر دەردەسەریو ئەشکەنجە هاتن کەئەلبەکر فەرمانی بەدەستوپێوەندەکانی دەدا بۆ سەلماندنی دوژمنایەتییەکەی دەرهەق گەلی کورد. لەکتێبەکانی ترمدا بەدووروودرێژی باسی کۆتایی ئەم پیاوەم لەئەم دونیادا کردووەو تەنها خودا بەخۆی دەزانێت چارەنووسی لەئەودونیادا چۆن دەبێت.

جا وەك سیفەتی هەموو خۆبەزلزانێکی زاڵدەست، ئەلبەکر رادەبەدەر کورسیی فەرمانڕەوایی خۆشدەویست، کەواتە تۆ بڵێیت چی وای لێکرد دەست لەکورسییەکەی بۆ سەدام حسەین هەڵگرێت؟...مەگەر بێدەسەڵاتیو بێئاوەزیو لاوازیی کەسیەتی بووبێت.

ئەلبەکر دوای ئەوەی لەوە دڵنیابوو کەدەتوانێت بەهۆی سەدام حسەین، پایەکانی دەسەڵاتەکەی سەقامگیربکاتو لەگەڵ ناوبراودا بەبێ یەکتر نایانکرێت، بۆیە پێکەوەن تا یەکتر بەرنەدەنو پشتی یەکتر بگرنو بۆ هەتاهەتایە ناپاکی لەیەکتر نەکەن هەروەکو لەمەزاری ئیمامی ئەبو حەنیفە(لەبەغدا)سوێندیان بۆیەکتر خوارد، بەلام سەرباریشی گزییان لەیەکترکردو زۆر بەڵێنو پەیمانیان لەگەڵ زۆر کەسی تردا پێشێلکرد.

لێرەدا دەمەوێت باسێکی سیفەتەکانی ئەم فەرمانڕەیە بکەم کەبۆ چەند دەهەیەك سەرۆکایەتی گەلی داماوی عێراقیکرد. ئەم پیاوە بێهێز، نەوێر، ستەمکارو درۆزن بو. هەروەها بێبەڵێنو، نهێنگربوو، بەرووی گەشەوە بەپێشوازت دەهاتو لەهەمان کاتدا فەرمانی بەدەستوپێوەندەکانی دەدا تەقەمەنی لەناو ئوتومبیلەکەتدا دابنێن. بەهیچ شێوەیەك سیفەتی فەرماندەی راستودروستی تێدانەبوو، هەروەکو لەکتێبەکانی ترمدا باسمکردووە توانیم لەدواساتدا شێخ عوسمان بارزانی(برازای مەلامستەفا بارزانی) لەکۆشکی کۆماریدا لەلێدانێکی خەستوخۆڵ رزگاربکەم کەئەلبەکرو چەتەکانی بۆیان نابۆوە، ئەمەش لەکاتێکدا ئێمە بەفەرمانی ئەو بانگێشت کرابووین. زۆربەی خوێنەرانیش دەزانن کەوەحشیی بکوژی حەمزەی سەرداری شەهیدانی بەهەشت، کاتێك پێغەمبەر(د.خ) چاوی پێکەوت تەنها بەنەرمی فەرمانی بەدوورخستنەوەیدا بێئەوەی ئەو کۆستەی لێیکەوتووە(بەشەهیدکردنی مامە پاڵەوانەکەی) کاری تێبکات.

لەمانگی تەممووزی ساڵی ١٩٦٨دا، بەرێز ئەحمەد حەسەن ئەلبەکر بەجلوبەرگی سەربازی هاتە کۆشکی کۆماری، بەجێبێکی سەربازی کەئەفسەر فەوزی لێی دەخوڕی کەئەم ئەفسەرە یاریدەدەری سەعدوون غێدان بوو. ئنجا ئەلبەکر بوو بەسەرکۆمارو کاروباری وڵاتی گرتەدەست، پاشان دەردەسەریی گەلی عێراق دەستی پێکرد کەتا ئەمڕۆ درێژەی هەیە. بەلام دەربارەی سەدام حسەین کە لە١٧ی تەممووزی ١٩٦٨ەوە حوکمی گرتۆتە دەست، سێ بیروڕا هەیە:

١ ـ خاوەن كەسايەتييەكى سياسيى ليهاتوو، كارامە، پالەوانێكى چاونەترس، زيرەك، قالّوخاراو، شارەزايى تەواوى لەبوارى موخابەراتدا هەيە، بەهۆى كەسايەتيى و رەنجدان و تێكۆشانى خۆى، حوكمى عێراقى گرتەدەست.

٢ ـ لەزووەوە ئامادەكراوە بۆئەوەى پۆستى سەركۆمارى لەعێراقدا بگرێتە دەست و بۆ ئەو ئامانجە مەشقى پێكراوە.

٣ـ بەرێكەوت بوو بەسەركۆمار.

ئەم سێ بيروڕايە لەسەر ئەم پياوە هەيە كەنيشانەى پرسيار لەئاست رەچەڵەكى هەيە! لەكتێبەكانمدا بەدوورودرێژى باسى ئەم پياوەم كردووە كەدواى ١١ى ئازارى ١٩٧٠ ناوبانگى لەعێراقدا پەيداكرد. جاليرەدا بيروڕاى يەكێك لەوانەى لەكۆليجى ماف لەگەڵيدابوون دەهێنمەوە كەپێكەوە خوێندكاربوون، ئەويش خواليخۆشبوو كاكە شازاد سائيبە كەدەيگوت: سەدام حسەين پياوێكى نەوێربوو، چونكە هەركەپياوانى ئاسايشى دەبينى خۆى دەشاردەوە، لەكاتێكدا ئەوكاتە خۆى هيچى وانەبوو. لەهەوڵى تيرۆركردنى سەركردەى كۆچكردوو عەبدولكەريم قاسمدا، سەدام حسەين كارەكەى بەرێكوپێكى ئەنجام نەدا. ناوبراو لەرووى مامەڵە لەگەڵ دۆستانيدا هەرگيز دڵسۆزو پاك نەبوو. هەروەها هيچ شارەزايى لەكاروبارى موخابەراتدا نەبوو، چونكە بەخۆم نزيكەى دوو دەهە، لەپێناو خزمەتكردنى گەلى كوردستاندا بەكارمهێناوە( قسەى كاكە شازاد تەواوبوو).

بەلأم راستييەكەى ئەوەبوو كەزيرەكيى سەدام حسەين لەوەدابوو دەيزانى چۆن گێچەڵ و گيروگرفت بۆ هەركەسێك بنێتەوە كەمەترسيى لێى هەبێت. من ليرەدا سوورم لەسەر ئەوەى كەسەدام بەخۆى، خۆى دروستكردو حوكمى عێراقى گرتەدەست. جا ئەگەر خوێنەر بەنووسينەكانمدا( سێبەرگى كورد دوژمنى خۆت بناسە)دا بچێتەوە بەهەمان ئەنجام دەگات. ئەمە راى خۆمە دەربارەى بيروباوەڕى يەكەم.

بيروڕاى دووەم ئەمەيە: سەدام حسەين دواى ئەوەى بەشداريكرد لەهەوڵى تيرۆركردنى سەرۆك عەبدولكەريم قاسمدا، بۆ دەرەوەى ولأت هەلأت. خوێنەر دەتوانێت ئەو بارودۆخە سەر شۆڕيهێنەى ئەو بێنێتە بەرچاوى كە لەميسر، سەردانى هەرەم و مەلهاكانى دەكرد كەليرەدا دەشێ لەرێى كچانى سۆزانييەوە خۆيان پێگەياندبێت و بەكاريان هێنابێت، لەوەش زياتر لەوانەيە زانيارى لاى پزيشكى پسپۆڕ هەبێت كەدەستى لەگەڵ ژناندا تێكەڵكردووە. خوێنەر پێويستە بزانێت كەيەكێك لەرێوشوێنە چەپەڵەكانى موخابەراتى جيهانى ئەوەيە كەسى مەبەست بەتەواوەتى دەپشكنن بۆ دەرخستنى كردەوە نائەخلاقييەكانى بۆئەوەى بيكەن بەكارتى دەستيان بۆ گوشارو هەڕەشەلێكردن. شايەنى باسە دەزگاى موخابەراتى عێراقى چەندين جار لەرووى پزيشكييەوە خەڵكى كوردستانيان پشكنيوە كەسەردانى بەغدايان كردووە، بەتايبەتى خەڵكى هەولێر.

خوێنەرانى بەرێز، ئەگەر نووسينەكانم بەوردى بەسەربكەنەوە بەو ئامانجە دروستانە دەگەن كەهۆش و ژيرى پەسەندى دەكەن...ديارە شتێكى سروشتى نەبوو كەسەرۆكى عێراقى عەبدولڕەحمان عارف بەو ئاسانييە دەست لەكورسييەكەى بۆ ئەلبەكر هەڵبگرێت. سەرۆك عەبدولڕەحمان عارف

**کەسایەتییەکی بەڕەوشتو، لەخواترس بوو، دژی چەوساندنەوەی مرۆڤ بوو، لێبوردەو دڵفراوان بوو کەجیاوازیی لەنێوان گەلانی عێراق بەتایبەتی کوردو عەرەب نەدەکرد، هەرگیز نەمبیست عەزیەتی کەسێکی دابێت، بەدرێژایی ئەو ماوەیەی ناسیومە لەهیچ شتێکدا گومانم لێی نەبووە. وە نەبێت تەنها لەگەڵ مندا وابووبێت بەڵکو، ئەمە مامەڵەی بوو لەگەڵ هەموو کەسێکدا، ئەوەی خستیشیە داوی بەعسەوە ناوریایی‌و خۆنەپاراستنی بوو کەنەریتی بوو، چونکە بەتەمانەبوو ڕۆژێك لەرۆژان کوڕەکەی یان براکەی، بەهەرزان بیفرۆشن‌و ئەوەی بەرامبەر بکەن کەکردیان.**

**لەکاتی کودەتاکەدا سەرۆك عارف بەدەم پیاسەکردن لەشەقامەکانی لەندەن بەهاوڕێکەی دەگوت: ( خەمی بەڕێز ئیبراهیم داودمە بکەوێتە دەستی کودەتاچییەکان‌و عەزیەتی بدەن)، ئەم داماوە لەوکاتەدا نەیدەزانی ئەو ئیبراهیم داودەی خەمی دەخوارد، دوای کودەتاکە کرا بەوەزیری بەرگری.**

**شەوی کودەتاکە (١٧ـ١٩٦٨/٧/١٨)، سەرۆك عارف بەتەلەفۆن ئاگادارکرا کەکودەتا کراوە، بەڵام ئەمە دوای ناپاکیکردنی دۆست‌و برادەرەکانی‌و دوای کارلەکارترازان بوو، نیوەشەو تەلەفۆنیان بۆکرد، ئەو بەعسییانەی دەستێکی باڵایان لەکودەتاکەدا هەبوو ئەمانە بوون: عەبدولڕەزاق نایف ـ یاردیدەدەری بەڕێوەبەری ئیستخبارات، ئیبراهیم داود ــ فەرماندەی لیوای گاردی کۆماری، سەعدوون غێدان ــ فەرماندەی فەوجی گاردی کۆماری.**

**بیروڕای سێیەم دەربارەی دەستەلاّت گرتنەدەستی سەدام حسەین لەعێراقدا کەبەڕێکەوت بوو... سیاسەتی دەزگای موخابەراتی ئەمریکی بۆ کۆنترۆڵکردنی جیهان ئەوەیە کە پێش ئەوەی هیچ گۆڕانکارییەك لەهەر ولاّتێکی جیهاندا رووبدات ئەو ئاگاداری بێت، بەتایبەتی لەناوچەی رۆژهەلاّتی ناوەڕاستدا کەخاوەنی سامانێکی گەورەی کانزاکانی ژێر زەمینە، جگەلەوەی سەرکردەی ولاّتانی ئەم ناوچەیە خاوەنی بیروباوەڕو ئایدیۆلۆجیانین‌و لاوازن، ناوچەکەش لەدەوڵەمەنیدا شایەنی ئەوەیە کۆنترۆڵ بکرێت. دەزگای موخابەراتی ئەمریکی لەم رووەوە رێگەی بەخۆیانداوە پاڵەوانەکانی سیناریۆکان هەڵبژێرن، بۆ نموونە ئەوەی ناوی (حەمید کارازای)ی بیستبێت لەجیهاندا پێنج هەزار کەس تێیەڕناکات، بەلاّم لەپێناو بەرژەوەندیی ئەمریکا، ئەم پیاوە بەسەر ئەفغانستاندا سەپێنرا. لەعێراقیشدا دەزگای (C.I.A) کاتێك بۆ پیاوی شایستەی سەرۆکایەتی دەگەڕێت، بەلایەوە دەبێت ئەم مەرجانەی خوارەوەی تێدابێت:**

**١ ـ دایك‌و باوکی عێراقی بن‌و بەڕەگەز عەرەب بن، تەمەنی ٢٥ ـ ٣٠ ساڵ بێت، مەزهەبی سوننی بێت، فڕی بەسەر ئاینەوە نەبێت، واتە تەنها بەپێی ناسنامە موسڵمان بێت.**

**٢ـ سەر بەرێکخستنەکانی بەعس بێت‌ولایەنگرو هەواداری هەبێت.**

**٣ــ شۆڤێنی بێت، بڕوای بەمافی کەمینە نەتەوەییەکانی ناو عێراق نەبێت، هەروەها بیروباوەڕی لەئاست مەسەلەی کورددا سلبی بێت، بەرەلاّو سەرچڵ، کۆ لەهیچ نەکات.**

٤ـ ئاشقی میلیتارییەت بێت و کار بۆ پێکهێنانی سوپایەکی دڕ بۆ عێراق بکات کە بەباشترین چەك و تەکنەلۆجیای سەربازی چەکدار بکرێت بۆ لەناوبردنی مرۆڤایەتی، ئنجا ترس و تۆقین لەناوچەی کەنداوو رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا بچێنێت.

دەزگای موخابەراتی ئەمریکی کاتێك هەوڵدەدات پیاوی دەستبژێری خۆی بەو هەموو مەرجانەوە بۆ ئەو پۆستە بدۆزێتەوە، شتێکی بەڵگەنەویستە کە لەسەدام حسەین بەولاوە کەسی تر نادۆزێتەوە، چونکە تەنها سەدام حسەین(بەلای موخابەراتی ئەمریکییەوە) پیاوی شایستەی پۆستی گونجاو بووە. جا ئەگەر لەهەرکەسێکی عێراقی پرسیار بکرێت کەتا بیست و چوار سەعات پێش کودەتای تەممووزی ١٩٦٨، چەند کەس ناوی سەدام حسەینی بیستووە ئەوە وەڵامەکە وادەبێت کەئەو کاتە، ژمارەی ئەندامانی حزبی بەعس لەعێراقدا نزیکەی پێنج هەزار کەس بووە، لەمانە ژمارەی ٢٥٠ کەسیان سەدام حسەینیان بینیوە، ژمارەی ٤٧٥ کەسیشیان تەنها ناوی بیستبوو. لەخەڵکی عەرەبیش لەعێراقدا بەهەموویەوە نزیکەی سێهەزار کەس ناوی سەدام حسەینیان بیستبوو، لەکوردیش ژمارەی پێنج سەد کەسێك ناویان بیستبوو کەئەمانەش ئەو کەسانەبوون کە لەبواری سیاسیدا کاریان کردبوو یاخود لەدادگای شۆڕش لەسەردەمی خوالێخۆشبوو مەهداویدا، دادگاییکرابوون و حوکم درابوون. خوالێخۆشبوو مام میرزای کوردی بەشەرەف، رۆڵێکی گرنگی هەبوو بۆ ناساندنی سەدام حسەین بەکورد ئەویش کاتێك سەدام هەڵدێت و داوا لەسەباح میرزا دەکات بیشارێتەوەو ئەویش لەماڵی خۆیدا پەنای دەدات و وەکو برا مامەڵەو خزمەتی دەکات. سەباح زۆر بەزەحمەت باوکی بۆ قایلکرا ئەو میوانە بۆ ماوەیەك لەماڵی خۆیاندا دابکەن کەئەو کاتانە سەباح میرزا، کرێکاری چاودێری بوو لەگەڕەکی ئیسکانی غەربی لەبەغداو مووچەکەی ١٩ دینار بوو. ژمارەی هەموو ئەو کوردانەی لەوکاتەشدا سەدامیان لەماڵی مام میرزا بینیوە ناگاتە پەنجا کەس. شایەنی باسە مام میرزا، خوالێی خۆشبێت، شانازی بەکوردبوونی رەگەزی خۆی دەکرد، رێکۆردەرەکەی زۆربەی کات لەتەنیشتیەوە بوو لەماڵەوە هەمیشە سروودی شۆڕشگێڕی کوردیی لێدەدا.

## چەند تیشکێکی خێرا لەسەر دەسەڵات گرتنەدەستی سەدام حسەین

ئەگەر فاڵگرەوەیەك رۆژێك لەرۆژان فاڵی بۆ ئەلبەکر بگرتایەتەوە ئەوە برا بەدکارەکەی پێ دەناساندو نیشانەکانی بۆ هەڵدەدا. نیشانەی پیاوخراپانیش وەهایە کەئەوەی تێکەڵاوییان بکات لەبەلایان رزگاری نابێت، هەروەها ئەگەر لێشیان دووربکەوێتەوە هێشتا بەلایان یەخەی دەگرێت. بێگومان ئەلبەکر بەهیچ شێوەیەك بەتەما نەبوو لەلایەن ئەوەی خۆی پلەی بەرزکردبۆوە، زیندەبەچاڵ بکرێت. سەدام حسەین لەیەکەم رۆژەوە زانی کەوا دەبێت هێزی خۆی لەئەلبەکر وەربگرێت، جگە لەوەی بەرزیی ئەلبەکر بەرزیی خۆیەتی و دۆڕاندنیشی، تێکشانیەتی، بۆیە هەرچی فێڵ و تەڵەکێك کەدەیزانی لەپێناو ئەوەدا خستیەکار تاببێتە نزیکترین کەسی ئەلبەکرو لەم پێناوەدا کۆی لەهیچ نەدەکرد.

سەدام حسەین وەك جێگری سەرکۆمار بەیاننامەیەکی دەرکرد دەربارەی داڕشتنی یاسایەك لەعێراقدا کە لەدوو بڕگە پێکدێت، یەکەمیان ئەوەی کە(باوکی فەرماند)ە، ئەحمەد حەسەن ئەلبەکر بڕیاری لەسەر

دەردەکات، دووەمیشیان ئەوەی ئەندامانی سەرکردایەتیی هەرێمایەتی بەکۆی دەنگ بڕیاری لەسەر دەدەن. ئەم بڕیارە کەسەدام لەخۆیەوە دەریکرد وای لەئەلبەکر کرد کە لەکۆبوونەوەیەکی گشتیی کادیرانی بالآی ڕێکخستنی حزبی بەعسدا بەشانوباڵی سەدامدا هەڵبلێتو گیانی فیدارکاریو شۆڕشگێڕیەتیو دڵسۆزییەکەی بۆ عێراق بەگشتیو بۆ حزبی بەعس بەتایبەتی، بەرز بنرخێنێت.

ئنجا بەرپرسیاریەتیی پاراستنی گیانی ئەلبەکرو بەردەوامیدان بەدەسەڵاتەکەی، کەوتە ئەستۆی سەدام. ئەمە وای لەئەلبەکرد کرد لەزۆر کاروباری بەڕێوەبردنی عێراقدا پشت بەسەدام ببەستێتو بەرپرسیاریەتیی گەورەوگرانی پێ بسپێرێت کەپەیوەندی بەئاسایشی عێراقەوە هەیە. سەدامیش لەلای خۆیەوە ئەم بڕوا کوێرانەیەو دەسەڵاتە ڕەهایەی لەپێناو دوورخستنەوەی لایەنگرانی ئەلبەکر لەناوەندەکانی دەسەڵات قۆستەوە ئەمەش لەڕێی بەکارهێنانی دڕندانەترین ڕێوشوێنی کوشتن یا تۆمەت هەڵبەستنو دەستگیرکردن. تاکە کەسێك کەبەرەنگاریی دەسەڵاتی سەدامی کردبێتو لەسەرەتادا ملی بۆ نەدابێت بەلآم نەیتوانیبێت لەو ململانێیەدا بەردەوام بێتو لەکۆتاییدا چۆکی بۆ ئارەزووی سەدامو فەرمانەکانی دادابێت، بەڕێز تارق حەمەد عەبدوڵلآیە کەبێ چەندوچوون بوو بەداردەستی سەدام.

هەندێك لەئەندامانی ڕێکخستنی حزبی بەعس وەکو حەردان تکریتیو سالّح مەهدی عەماشو عەبدولخالق سامەڕائی، لەوبارەیەوە گفتوگۆیان لەگەڵ ئەلبەکرداکردو لەکۆبوونەوەیەکی داخراودا، لەئاکامی خراپی تەسلیمکردنی عێراق بەدەستی لاوێکی ناشایستەی وەك سەدام دوابوون کەشارەزای کاروباری سیاسی نییە، جگە لەوەی جێی بڕواش نییە، کە لەئەنجامی ئەم کارە عێراقو حزبی بەعس دووچاری نەهامەتی دەبن. حەردان گوتبووی: ئەم گەنجە(واتە سەدام)، من پێی ڕازینیم وەکو بنووسێك لەبەردەستمدا کاربکات نەخوازە ببینم کاروباری ولآتی گرتبێتە دەست، چونکە ئەمە لەغەدرکردن بەولاوە هیچی تر نازانێت.

دەربارەی خزمانی ئەلبەکریش کەئەوسا بەبێ پرس سەردانیان دەکردو دوا هەواڵیان بۆدەهێناو گومانیان لەسەدام لەلا خۆشدەکرد، سەدام لێیان نزیك بۆوەو یارمەتی زۆریدان ئەوەش لەڕێی ئاسانکردنی ڕێوشوێنی سامان کۆکردنەوەو دەمچەورکردنیان بەکۆشكو تەلارو ئوتومبێل... سەدام وای لەوانەکرد دەستبدەنە کاروباری نایاسایی لەپێناو کۆکردنەوەی سامان، ئینجا ئەوەندەی پێنەچوو دەوڵەمەندبوونو بەملیۆنەها دیناریان لەلا کەڵەکەبوو. پاشان سەدام کەوتە گەیاندنی ڕاپۆرتی تایبەتی بۆ بەردەستی ئەلبەکر کە لەلایەن دامودەزگا ئەمنییەکانەوە بۆی دەهات، ڕاپۆرتەکان ئەلبەکریان لەو مەترسییانە ئاگادار دەکردەوە لەسەر بەڕێوەبەردنی دەستەڵات هەروەها ناوزڕانی ئەلبەکر لەلای جەماوەر لەئەنجامی کردەوەی خزمەکانی کەکاری ڕسواو نایاسایی ئەنجامدەدەن. ڕاپۆرتنووسەکان مەسەلەکانیان وەها گەورەکرد کەئەلبەکر لەوخزمانانەی تووڕەو زویربێت کەخۆیان لەپێناو سەربەرزیو خزمەتکردنی ئەلبەکردا بەختکرد، هەتا وایان لێهات نەتوانن چاویان پێی بکەوێت ئنجا وردەوردە بارەکە گەیشتە ئەوەی کەلێنی نێوان ئەلبەکرو ئەو خزمانەی، گەورەتربوو ئیتر کەوتنە ئەوەی هەمیشە دەیانگوت: (ئەرێ چی ئەو پیرەمێردەی لەبەرامبەرمان گۆڕی؟). دوو کەس لەخزمەکانی ئەلبەکر،

لەوانەی نامەویت ناویان بێنم، لەو دەرەنجامە خراپانەی ئاگاداردەکەنەوە کە لەئاکامی بەخشینی دەسەلاّت لەعێراقدا بەسەدام، خودی خۆیو حزبی بەعسو گەلی عێراقیش دووچاری دێن. بەلاّم وەلاّمی ئەلبەکر بۆ ئەو دوو خزمەی ئەمەبوو: (سەدام حسەین پیاوێکی راستگۆو دڵسۆزو بەئەمەکە، نە لەعێراق نە لەرێکخستنەکانی حزبی بەعسدا لەرووی دڵسۆزیو دەستپاکییەوە هاووێنەی نییە، خۆیشی بەهۆی سەدامەوە لەئەوپەڕی خۆشیو ئارامیدایە).

لەکاتێکیشدا ئەلەبەکر لەبێئاگایی خۆیدا دەژیا، سەدام لەلای خۆیەوە، هەموو بەرهەڵستکارانی دەوروپشتی ئەلبەکری لەکۆشکی کۆماری لەناوبردبوو، ئەمەش بەناوی داکۆکیکردن لەباوکی فەرماندە. ئینجا بۆ پارێزگاریکردن لەگیانی خۆی، ئەلبەکر دەزگای موخابەراتی لەکۆشکی کۆماریدا دامەرزاندو خستیە ژێر دەستی سەدام. پاسەوانو ئەفسەرو سەربازو هەموو کارگوزارانی کۆشك لەقسەی سەدام دەرنەچوونو رۆژانە راپۆرتیان دەربارەی ئەلبەکر بۆ بەرزدەکردەوە، بەمەش توانی هەموو هەڵسوکەوتێکی ئەلبەکر کۆنترۆڵ بکات.

ئەلبەکریش لەهەموو کۆڕو دیوەخانێکدا دەیگوت بەدرێژایی ژیانم وەکو ئێستا بێخەم نەبووم، تەنانەت کارمەندو کارگوزارەکانی دەوروبەرم هەردەڵبێیت وا مەشقیان پێکراوە کە لەخزمەتمدان، چونکە قسەکە لەدەمم دەرناچێت کەدەبینم جێبەجێ بووە. ئەمە جگە لەبەرقەراربوونی ئارامیو ئاسایش لەولاّتدا کەهەموو ئەمانە لەچاوی برای خۆشەویست سەدام حسەینی دەزانم.

دوای ئەوە سەدام، بەهاوکاری(...)کەوتە پیلانو نەخشە داڕشتن بۆ لێدانی ئەو کادێرو ئەندامانەی بەعس کەملیان بۆ پێڕەوەکانی نەدابوو، ئەمەش لەرێی لەکاردەرکردن، دوورخستنەوە، گواستنەوە، دەست بەسەراگرتنی ماڵو سامان، کوشتنو زۆر رێوشوێنی تر کەمەگەر تەنها بەبیری شەیتاندابێت. زۆر جاریش سەدام دەچووە بن کلێشەی ئەلبەکرو قایلیدەکرد کەفلاّن کەس مەترسیدارە، ئەویش دەمودەست بڕیارێکی بەئەنجومەنی سەرکردایەتیی شۆڕش لەسەر ئەو کەسە دەردەکرد. بۆ نموونە کاتێك بەڕێز حەردان تکریتی جێگری سەرۆك وەزیرانی عێراق بەسەردان لەئیتالیابوو بۆ راپەراندنی هەندێك کاروباری سیاسیو سازدانی دیدار لەگەڵ سەرکۆماری ئیتالیا، کەلەوگەشتەیدا باڵوێزی عێراق لەئیتالیا مامۆستا تەها محێدین مەعرووفی لەگەڵدابوو، کاتێك بەئوتومبێلی باڵوێزخانەی عێراق بەرەو کۆشکی کۆماری ئیتالیا دەچوون، مامۆستا تەها محێدین لەباڵوێزخانەوە بەتەلەفۆن ئاگادارکرا کەبەڕێز حەردان تکریتی، بەفەرمانی ئەنجومەنی سەرکردایەتیی شۆڕش، لەپۆستەکەی، وەك جێگری سەرۆك وەزیران خراوە.

ئەوەندەشی پێنەچوو بەرێز ساڵح مەهدی عەمماش کرا بەباڵوێزی عێراق لەرووسیا، دوای ئەویش هەمان سیناریۆ بۆ عەبدولخالق سامەڕائی سازدراو بەم شێوەیە... برادەرێکی خۆشەویستم کەئێستا دواڕۆژانی تەمەنی لەزیندانەکانی بەعسدا دەگوزەرێنێت پێمی گوت: ئەلبەکر بەدوایدا ناردو پێی گوت: ( فلان کەس، ناوت لەگەڵ ناوی حەوت کەسی تردا هاتووە کە لەسەر کارەکانتان دەربەکرێن، تۆش لەبەرئەوەی ماوەیەکی زۆر خزمەتی حزبی بەعست کردووەو یەکێك لەدامەزرێنەرانی بوویت،

بەدەرکردنت رازی نەبووم‌و فەرمانم داوە بەکرێیت بەباڵوێزی عێراق لە فلانە دەوڵەتدا). برادەرەکەم زۆر سوپاسی ئەلبەکر دەکات‌و دەست بەرەو رادیۆکە درێژدەکات تا دەنگی بەرزتر بکات دەڵێت: گەورەم ئەی سەرۆك، تۆ ئەگەر کادیرە بەعسییەکان دەربکەیت کەدڵسۆزی تۆو وڵاتن ئەوە نەگەبەتییەکی گەورە بەسەر خۆت‌و عێراق‌و حزبی بەعسیشدا دێنێت، چونکە کاتێك دەبینیت تەنیا ماویتەوەو گیرۆدەی بەڵا دەبیت.

ئەلبەکر دوای ئەوەی بەشڵەژانەوە رادیۆکە دەکوژێنێتەوە دەڵێت: من ئیشوکاری خۆم دەزانم‌و کۆشکی سەرۆکایەتیم لەژێر چاودێرییەکی توندداییە لەپێناو پارێزگاری لێکردنم، بەدرێژایی ژیانیشم وەکو ئێستا بێ‌بەلاو بێخەم نەبوومە، چاوپۆشی لەم قسانەت دەکەم کەکردت بەمەرجێك دووبارەی نەکەیتەوە، ئەگەر یەکێکی تر قسەی وای بەکردایە زیندانیم دەکرد. دوای ئەوەی قاوەکەت خواردەوە ئێرە بەجێبێڵەو برۆ.

کاتێك بەچاوی خۆم بینیم چۆن دوعاکەی پێغەمبەری خوا(د.خ) کەفەرموی(اللهم اضرب الظالمين بالظالمين واجعلنا من بين ايديهم سالمين) لەمانە روویداو هاتەدی، لەخۆشییان وەختەبوو شاگەشکەبم. هەموودەم بەخۆشییەوە ئەم دوعایەم لەبەرخۆمەوە دەخوێندەوە چونکە ئەو تاقمە، تێیاندا نەبوو دەستی بەخوێنی گەلی عێراق بەگشتی‌و گەلی کوردستان بەتایبەتی، سوور نەبووبێت. ئەوانە زۆربەیان خاوەنی دڵ‌و دەروونێکی رەش‌و شەڕئەنگێزبوون، کەمیان وەکو خوالێخۆشبوو عەبدولخالق سامەرائی تێدابوو کەهەرچەندە لەمن بەدگومان بوو، بەڵام بەرامبەر گەلی کوردستان خۆشەویستیی لێدەباری. بەدوگومانییەکەشی لەئاست مندا بەوە دەربڕیبوو کەچەند جارێك مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەدو بەرێز مام جەلالی ئاگادارکردبۆوە کەمن، لەبەرئەوەی لەدەزگای موخابەراتدا کاردەکەم ئەوە دەبێت لەدیدەنیکردنم وریابن. ئەگەرچی ناوبراو دژم بوو بەڵام من بەم هەڵوێستە جوامێرەی دڵخۆش بووم... خوا لێی خۆشبێت.

جارێکیان بۆ پرسەی چوار کادیری حزبی بەعس سەر بەرێکخستنی فوراتی ناوەڕاست، کە لەرووداوێکی ئوتومبێلدا تیاچووبوون (تەواو دڵنیاش بووم کە ئەو رووداوە تاوانێکی نەخشە بۆ داڕێژراوبوو لەلایەن جێگر سەدام حسەینەوە کەدەزگای موخابەرات جێبەجێی‌کرد)، ئەو کاتە لەخزمەتی هەردوو بەرێز عەبدولکەریم ئاغای برادەری خۆشەویستم‌و کاك رەزای ئامۆزامدا چووم بۆ پرسەکە کە لەئەنجومەنی نیشتمانی بۆیان دانیشتبوون. دوای نیو سەعات کەویستمان هەڵسین یەکێك پێمی راگەیاند کەسەرکردایەتیی بەعس داوام لێدەکات بۆ نانی ئێوارە بمێنمەوە . منیش بەناوی ئەوەی وادەیەکی سیاسیم هەیە لەگەڵ کەسێکداو دەبێت برۆم، داوای لێبوردنم کرد. لەناکاو پاسەوانەکە گەڕایەوە بۆ لام‌و گوتی بەفەرمانی بەڕێز جێگر سەدام حسەین دەبێت هەموو وادەکانم دوابخەم‌و بۆ نانی ئێوارە بمێنمەوە.

بەشداری پرسەی زۆر کەسم کردووە لەوانەی بوون بەقوربانیی پرۆسەکانی پاکساز. لەو پرسانەدا، لەکاتێکدا سەرەخۆشیم لەبنەماڵەی کۆستکەوتووەکان دەکرد دەتگوت ئاو بەدڵمدا دەکەن، بەڵام بێگومان

خۆم خەمبار نەنواند. وام لێکدەدایەوە کەشەڕی نێوان ئەمانە دەشێ دەسەلأت لەعێراقدا بێهزبکاتو وای لێبکات بیرێك بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد بدۆزنەوە.

لەدوا دیدارم ساڵی ١٩٧٦ لەگەڵ بەرێز تاڵەبانی لەبەیرووت، پێم راگەیاند کەوێنەکانی ئەلبەکر لەدارودیواری ژوورەکانی دامودەزگا ئەمنییەکان دادەگیرێنو وێنەی سەدامیان لەجێ هەڵدەواسرێت. ئیتر لەوکاتەوە بۆمان دەرکەوت کەسەدام دەسەلأت دەگرێتە دەست. هەروەها لەدوا گەشتمدا بۆ قەندیل، بەخوالێخۆشبوو عومەر دەبابەم گوت: ئەمە سەرەتایەکی مەترسیدارە، مانگ سەر لەئیوارە دیارە.

## بۆشایی سیاسیو کۆنترۆڵکردنی کوردستان لەلایەن سەدامو ئەلبەکر

ماوەی دوای هەرەسی ١٩٧٥ بۆ گەلی کوردستان زۆر دژواربوو، ئەوکاتە هیچ دەزگایەکی راگەیاندن نەبوو باسی ئەو مەرگەساتانە بکات کە بەسەر گەلی کوردستاندا دێت، کورد دووچاری سەرشۆڕیو سووکایەتی پێکردنێ هات هەرگیز بەخۆیەوە نەدیبوو، ناشزانم بۆچی نووسەرە هاوچەرخەکان لەئەدەبیاتەکانیاندا لەقەرەی ئەم باسەیان نەدا.

کاتێك لەبەغداو پارێزگاکانی کوردستاندا دەچووم بۆ دامودەزگا ئەمنییەکانو ئەو هەموو کەسایەتی و خەڵکە لێهاتووەی گەلی کوردم دەبینی هاتوچۆی ئەو دەزگایانە دەکەن بۆ هاوکاریکردنی پیاوانی ئاسایشو موخابەراتو بوون بەپیاوی ئەوان، هەستم بەئازارێکی گەورە دەکرد دڵم دەگوشێت هەرچەند ٨٠٪ ی ئەوانە، بەو کارەیان قایل نەبوون.

نەخشەو پلانی سەدامو ئەلبەکر روونو ئاشکرابوو، رێنماییەکانیان بۆ مەڵبەندەکانی رێکخستنی حزبی بەعس هەمیشە وابوو کەکاری بەردەوام بکرێت بۆ ملکەچ پێکردنی گەلی کوردو پێویستیی رێکخستنیان لەریزی حزبی بەعسدا، ئەوەبوو دروشمی( بەعس رووناکییە بۆ ئەوەی بێتە سەر رێو، ئاگرە لەڕووی دوژمنکاران) بەرزکرایەوە، بەو واتایەی کەئەوەی سەر بەبەعس بێت لەبەلأ بەدوور دەبێت، ئەوەی نەشیەتە ریزی بەعسەوە، خاك بەدامەنی.

ئنجا وردەوردە پێڕەوێکی تۆقێنەرو شەیتانییانەی گرتەبەر بۆ کۆنترۆڵکردنی خەڵکی کوردستان، ئەوان بێخەم دەخەوتن چونکە هەموو شتێك بەدڵی ئەوان بەرێوە دەچوو، لێرەدا تەنها ئەوەندەم لەدەست دێت لەخوا بپارێمەوەو بڵێم: خوایە ئەوەی بوو بەمایەی ئەم مەرگەساتە، لەگەڵ پێشتگیریکەرانیاندا بەناخی زەوییاندا بەریتە خوارەوە.

هەلیکۆپتەرەکانی بەعس وەکو پۆلە کوللە دەیاندا بەسەر گوندە دوورەکانی سەر سنووری ئێرانو تورکیا وەکو پاداشتدانەوەیەك بۆ ئەو دێهاتییانەی بەگەرمی بەخێریان دەهێنان. سەربازەکان گوندەکانیان دەپشکنیو هەرچی کەلوپەلو ناومالێکی گرانبەهایە تالأنیاندەکرد، ئەمەش دوای سوکایەتیکردن بەو خەڵکەو جەزرەبە پێگەیاندنیان.

بێگومان پیاوخراپ ئەگەر رێزی لێ بنێیت سووکایەتیت پێدەکات، خوا لەزۆرو ستەمی ستەمکاران بمانپارێزێت.

**مەکتەبی کاروباری باکوور**

لەوانەیە هەندێك کەس بپرسن ئەم مەکتەبە چییە!

خوێنەری بەرێز: مەکتەبی کاروباری باکوور( مكتب شؤون الشمال)، هەر لەسەرەتای دامەزرانیەوە لەسەرەتاکانی سالأنی حەفتاکاندا هەتا ئەمڕۆ، بەرپرسیاری یەکەمە لەهەموو گرتن، تیرۆرکردن، لەسێدارەدان، تەعریب و تەبعیس، دوورخستنەوە، رووخاندنی گوندەکان، دەست بەسەراگرتنی ماڵ و سامانی گەلی کرودستان و لەم جۆرە وێرانکارییانە. بەرپرس و نەخشە داڕێژەرو بەڕێوەبەری ئەم بەشە تۆقێنەرەی دەزگای موخابەراتیش خودی سەدام حسەینە، هەموو رووداوە کارەساتئامێزەکانی کە بەسەر خەڵکی کوردستاندا هاتووە دەبێت نووسراوێکی بەئیمزای سەدام حسەین پێدەرچووبێت یان بەفەرمانێکی زارەکیی ئەوجێبەجێ کرابێت.

بەلأم ستەمکار هەتا ماوەی زۆر بخایەنێت هەردەبێت رۆژی بێت، تۆمارەکانی مێژووش نموونەی زۆری لەم رووەوە تێدایە کە لەژمارە نایەن، بەردەوام بوونی واقعیش مەحاڵە، چونکە ئەگەر بۆ خەڵکی تر بشیایە ئەوە بۆ تۆ نەدەبوو. منیش بڕوای تەواوم بەوە هەیە کەکۆتایی سەدام نزیك بۆتەوەو رۆژی حسابیش نزیکە، ئنجا قوربەسەری ستەمکارو خوێنرێژان لەدادگای ستەم لێکراودا.

کاتێك رۆژی دەسەلأتی رژێمی عێراق کۆتایی دێت ئەوسا ژمارەی قوربانییەکان راستدەکرێتەوە. ئەوەندەی خەملێنراوە، گەلی کوردستان نزیکەی ١٨٥ هەزار شەهیدیداوە لەژن و لەپیاو" بەنهێنی یا بەئاشکرا کە لەلایەن پیاوانی حزبی بەعسی سۆشیالیستی عەرەبی لەناوبران و بەفەرمانی خودی بەڕێوەبەری مەکتەبی کاروباری باکوور تیاچوون کەئەویش رێزدار دیکتاتۆر سەدام حسەینە.

جا ئەگەر دۆسیەی تۆماتبارێکی کورد لەفەرمانگەی ئاسایش یان موخابەرات یان ئیستخباراتەوە رەوانەی مەکتەبی کاروباری باکوور بکرێت، ئەم مەکتەبە دۆسیەکە یەکسەر رەوانەی دادگای شۆڕش دەکات کەئەویش لەلای خۆیەوە، لەسەر داوای دامودەزگا ئەمنییەکان و پەراوێزو روونکردنەوەی مەکتەبی کاروباری باکوور، تۆمەتبارەکە دادگایی دەکات ئنجا یا حوکمی زیندانیکردنی دەردەکات بەدوو ساڵ یان بیست ساڵ... یان لەسێدارەدان. لەبارێکیشدا ئەگەر ناوچەیەکی کوردستان رابگوێزرێت ئەوە دۆسیەکە رەوانەی ئەنجومەنی سەرکردایەتیی شۆڕش دەکرێت کەئەویش لەلای خۆیەوە فەرمان بۆ وەزراەتی ناوخۆ دەردەکات کەناوچەکە رابگوێزێت، ئەمە ئەگەر کارەکە ئاسان بوو، بەلأم ئەگەر مەترسییەکی لێرەچاودەکرا،وەك ئەوەی دەشێ پێکدادانی چەکداری رووبدات، ئەوە دۆسیەکە بۆ وەزارەتی بەرگری رەوانەدەکرێت.

دەربارەی مەسەلەکانی دوورخستنەوەش ئەوە دۆسیەکە بۆ بەڕێوەبەرایەتی گشتیی ئاسایش رەوانە دەکرێت کەئەویش لەلای خۆیەوە کارەکە جێبەجێ دەکات و کەسی تۆمەتبار بۆ ئەو شوێنە دووردەخاتەوە کەبەشی پەیوەنداری دەزگا، شوێن و دوورییەکەی دیاریدەکات لەگەڵ فەرمان دەرکردن بەهێشتنەوەی ئەو کەسە هەتا ماوەیەکی نادیار لەوشوێنەدا... بەسەدان کەسمان بینی کەدوور لەکەس وکاریان مردن و نێژدران.

لێرەدا دەمەوێت ناوی خۆمتان بەبیربێنمەوە، من ڕەفیق پشندەریم، بەناوی ستەم لێکراوانی خەڵکی کوردستانەوە هەڕەشەکەم رادەگەیەنمو پشتگیری ئەو کەسەش دەکەم کەبەم چەند وشەیە ئاماژەی بەهەقداوە: کوشتنی مرۆڤێك لەدارستانێکدا تاوانێکە دەشی لێی بکۆڵرێتەوە، بەڵام لەناوبردنی تەواوی گەلێك، تاوانێکە لێبوردنی نییە.

ئەگەر تەنیا نەمابوومایەو پشتو پەنایەکم دەبوو داکۆکیم لێبکات ئەوە ئەوپەڕی هەوڵمدەدا ناوی سەرۆکی بەشەکانی دامودەزگا ئەمنییەکان وەربگرم لەوانەی دەستیان هەبووە لەپرۆسەی حەلاڵکردنی سەرو ماڵی گەلی کورد، ئنجا ناویانم لەم کتێبەدا بلاّوەکردەوە، بەلاّم ژمارەیەك لەو کەسانە ئێستا لەهەندەرانن چاوەڕێی رووخانی رژێمی عێراق دەکەن تا لەئیدارەی نوێدا پلەی بەرزیان بدرێتێ. سەیر لەوێشدایە هەندێکیان ئێستا لەریزی ئۆپۆزسیۆنی عێراقیدان، لافی نیشتمانپەروەری لێدەدەنو لەم رووەوە بانگەشە بۆ برایەتیی کوردو عەرەب دەکەن، هەروەکو پەندەکەش دەڵێت: (کابرا دەکوژنو بۆ گۆڕستانیش بەڕێیدەکەن).

لەرووی بلیمەتییەوە نییە ئەگەر بڵێم بەلاّی سەرشانی گەلانی عێراق بەگشتیو گەلی کورد بەتایبەتی ١٠٠٪ دەستیسەی ئەلبەکرو سەدام حسەینە، هەروەها هەموو ئەندامانی سەرکردایەتیی شۆڕش بەشدارن لەپرۆسەی کوشتنی ١٨٥هەزار کەسی کوردو دوورخستنەوەی فەیلییە کوردەکانو دەست بەسەراگرتنی ماڵو سامانیان، ئەمە جگە لەگرتنی ژمارەیەکی زۆر لەلاوانی فەیلی لەساڵی ١٩٨٤دا کەهەتا ئێستا چارەنووسیان نادیارە.

هەموو گەلی کوردستان ئاگاداری ڤین کێشانی فارسو تورکن بەرامبەر گەلی کورد کەچەندین سەدەیە درێژەی هەیە. بەلاّم ئەوەی چاوەڕوان نەدەکرا ڤینەبەرایەتیی عەرەبە بەرامبەرمان کەرێژەی ڤینەبەراتیی فارسو تورکی بەزاندووە، ئەمە سەرباری پەیوەندیو مێژووی هاوبەشی نێوانمان لەرووی سەقامگیرکردنی ئاینی ئیسلامو ئاشتی لەدوورگەی عەرەبیو رۆژهەلاّتی ناوەڕاستدا، بەڵگەشمان بۆ ئەمانە کتێبە مێژووییەکانە.

ئەوەی ئەمرۆ بەدەستمانەوەیە ئەو قورئانەیە کە بەوپەڕی توانامانەوە باوەڕمان پێهێناوە، بەبێ شانازیکردنیش دەڵێم ئێمەی کورد لەو گەلانەین کە لەناو گەلانی تری جیهاندا، لەرووی بڕواداریمان بەکتێبە ئاسمانییەکانو قورئانی پیرۆز نموونەیەکی دیارین، بۆیە لەم روانگەیەوە دەستی پاڕانەوەمان بۆ پەروەردگار بەرزدەکەینەوە کە بەسەر فارسو تورکو عەرەبی شۆڤێنیستدا سەرمان بخات، ئەوەی خوداش پشتیوانی بکات کەس بەسەریدا زاڵ نابێت، لەخوای گەورە داوادەکەین تۆڵەمان لەدوژمنانمان بۆ بکاتەوە بەوەی پێکیاندا بدات هەروەکو پێغەمبەری خوا(د.خ) دوعای کرد، بێگومان پەروەردگار پشتمانی بەرنەداوە هەروەکو بەگەورەیی خۆی لەم وێنانەدا بۆمانی نواند کەلێرەدا هەندێکیان دێنمەوە.

ژمارەیەکی زۆری سەرکردەو لێپرسراوەکانی بەعس بەدەستی ئەو هاوەڵانەیان تیاچوون کەپێکەوە تاوانیان دەرهەق گەلانی عێراق ئەنجامداوە بەتایبەتی دەرهەق گەلی کوردستان، لەوانە:

١ ـ سەرۆکی عێراقی ئەحمەد حەسەن ئەلبەکر کەسەدام حسەین بەشێوەیەکی ئاشکراو ئابڕووبەرانە ناچاریکرد دەست لەکاربکێشێتەوە، بەشێوەیەك لەوەپێش لەگەڵ کەسدا نەکراوە، ئنجا مانەوەی زۆرەملێی لەماڵی خۆیدا دەستەبەریکردو پاسەوانیشی بەدیارەوە دانا. ئەلبەکر پێش مردنی، پاسەوانێکیش لەبەردەرگاکەیدا نەبوو کە لەسەر پشت بوو، هەروەکو خودی ئەلبەکر بەبرادەرێکی گوتبوو: ( مانگێك دەبێت دەمم لەنانو ئاو نەداوەو دڵیشم هیچ نابات، وەك دەشبینیت بەجێیان هێشتووم بمرم). پاشان هەیسەمی کورییان کوشتو بەئوتومبێلەکەیەوە فرێیاندایە ناو رووباری دیجلەوە ئەوەش بەو بیانووەی گوایە دوای نیوەشەو، بەسەرخۆشی ئوتومبێلی لێخوڕیوەو کەوتۆتە ناو رووبارەکەوەو لەئەنجامدا خنکاوە. سیناریۆکە زۆر کاریگەربوو، شوێنی رووداوەکەش لەنزیك گەڕەکی زوویە بوو لەبەغدا.

٢ ـ نازم گزراری بەڕێوەبەری گشتیی ئاسایش گوللەبارانکرا، تا ئێستا گۆڕیشی ونە، ئەوەش ئەگەر نێژدرابێت.

٣ ـ عەدنان خەیروڵڵا تەڵفاحی وەزیری بەرگری(خاڵۆزای سەرۆك سەدام حسەین) لەهەلیکۆپتەرێکی مینرێژکراودا کوژرا.

٤ ـ حسەین کاملی زاوای سەرۆك سەدام حسەین لەناو ماڵی خۆیدا هێرشیان کردە سەرو کوشتیان.

٥ . کوژرانی بیست کەس لەئەندامانی سەرکردایەتیی هەرێمایەتی.

٦ ــ تاریق حەمەد عەبدوڵڵای سکرتێرو بەرپرسی نووسینگەی ئەلبەکر، سەدام حسەین بەزۆر رایکێشایە ناو ریزی دەستوپێوەندەکانی خۆیو کردی بەوەزیری پیشەسازی، پاشان ژەهرخواردووکرا گوایە بەنەخۆشی دڵ مرد.

٧ ـ دکتۆر فازڵ بەڕاکی بەڕێوەبەری گشتیی ئاسایشو بەڕێوەبەری گشتیی موخابەرات کەدەستێکی باڵای لەدوورخستنەوەی فەیلییە کوردەکاندا هەبوو، زۆر دڕندانە کوژرا.

ئەوانەی دەستی تۆڵەی خوایان نەگەیشتووەتێ ئەوە جاریێ نۆرەیان نەهاتووە، ئەمانە لەقوللەی قافیشدا بن دەستی مەرگیان دەگاتێو درەنگ بێت یان زووو نۆرەیان دێت، ئەوانەش ئەم بەرێزانەن: سەدام حسەین، تەها یاسین رەمەزان، عێزەت دووری، عەبدولخالق عەبدولعەزیز، نووری فەیسەڵ شاهر، عەلی حەسەن ئەلمەجید کەبەعەلی کیمیاوی ناسراوە، تاریق عەزیز، سەعدوون شاکرو زۆری تر.

هەندێك لەئەندامانی سەرکردایەتیی شۆڕش هەن هیچ پەیوەندییان بەم ئەنجومەنەوە نییە مەگەر ئەوەندەی ناویان لەلیستی ئەندامیەتیدا تۆمارکراوە، چونکە ئەمانە بەکردەوە بەشداری ناکەن لەدەرکردنی بڕیارەکاندا، لەمانە: مامۆستا تەها محێدین مەعروف کەهیچ ئاگای لەبڕیارەکانی مەکتەبی کاروباری باکوور نییە بەڵکو وەك هەر هاووڵاتییەکی ئاسایی، لەرێی دەنگوباسی ئێزگەو رۆژنامەکانەوە دەیانبیستێت. بەپێچەوانەی ئەمەش بەڕێز تەها یاسین رەمەزانە کە لەدەرەکردنی بڕیاردا پرسو راوێژی پێدەکرێتو بەرێژەی ٩٥٪ ئاگاداری هەمووشتێکە، ناوبراو یەکێکە لەو سێ کەسەی دەستیان لەو

ستەمو زۆردارییانەدا هەیە کەبەرامبەر گەلی عێراق بەگشتیو گەلی کورد بەتایبەتی کراوە، کەدوانەکەی تر سەدام حسەینو عەلی حەسەن ئەلمەجیدن.

ئەوەی لەم دوو تەهایەدا( تەها یاسین رەمەزانو تەها محیّدین) سەیرە ئەوەیە کەهەردووکیان کوردن، بەلاّم جیاوازیی نێوانیان لەوێدایە کەتەها محیّدین مەعرووف نکووەلیی لەرەگەزی خۆی وەکو کوردێك نەکردووە هەرچەندە رۆشنبیرەو چەند زمانێك دەزانێت، بەلاّم تەها یاسین رەمەزان لەکونی خۆی هەڵگەراوەتەوەو ویژدانی خۆی فرۆشتووەو بۆتە ئەندامی دەستەی موخابەرات. بەلاّم هەردوو تەها، لەرووی ملکەچکردنیان بۆ بەرەی شەڕ، چونیەکن.

**بانگەوازێك بۆ برایانی کوردی نیشتەجێی بەغدا**

پێش هەموو شتێك، هەروەکو لەبەشەکانی تری کتێبەکەم( کورد دوژمنی خۆت بناسە)دا ئاماژەم پێداوە، من بەڕەگەز کوردم، لەقەزای قەلاّدزیّ لەدایکبوومو ماوەی زیاتر لەچارەکە سەدەیەکی ژیانم لەبەغدا بەسەربردووە، ئەمەش وایکردووە زۆربەی دۆستو برادەرانم لەکوردو عەرەب، هەتا ١٩٧٦/٩/١١ لەوانەن کەدانیشتووی بەغدان کەلەویّ لەدامودەزگا ئەمنییەکاندا کارم دەکرد. دەشتوانم پێبەپێی زانیارییەکانم" بڵێم کەکوردە نیشتەجێیەکانی بەغدا، ئەگەر لەگەڵ کوردی نیشتەجێی کوردستاندا بەراورد بەکرێن سەرمان لەشتێك سوڕدەمێنێت ئەویش ئەوەیە کەرێژەی هاوکارانی رژێم لەکوردی نیشتەجێی بەغدا لەچاو هاوکارانی رژێم لەوانەی لەکوردستاندان زۆر کەمە، ئەمەش مایەی شانازیکردنە، چونکە شتێکی بەڵگەنەویستە کەئەو کوردەی لەبەغدا دەژی زیاتر بکەوێتەبەر گوشاری سیاسی لەلایەن رژێمەوە بەتایبەتی ئەگەر ئەو کوردە کەسایەتییەکی ناوداربێت. جا ئەوانەی توانییان بەرەنگاریی تەماعی دارایی و گوشاری سیاسی بکەنو ملیان بۆ بەعس کەچ نەکرد، ئەوە لەلایەن عەرەبو خودی بەعسییەکانەوە رێزدارترن. چونکە لەبەغدا، مرۆڤی کورد توانیویەتی کەسایەتیی خۆی لەناو کۆڕوکۆمەڵی سیاسیو بواری کاریدا بسەپێنێت، ئەوەش لەرێی زیرەکیو لێهاتوویيو ئاکارو پاکیو زمانزانییەکەیەوە، بۆیە دەبینین کاسبکاری کورد لەبەغدا دەستیان بەسەر بازاڕی شۆڕجەدا گرتووە کەرێژەیان لەو بازاڕە بازرگانییەدا دەگاتە ٦٥٪.

ئنجا ئەگەر پەیوەندیی کورد بەسیّ نەتەوەی فارسو تورکو عەرەبەوە بەراودبکرێت دەبینین پەیوەندییەکە لەگەڵ عەرەبدا پتەوترە، چونکە کوردو عەرەب زیاتر لێکتر دەگەن. جا سەرباری هەوڵەکانی سەدامو ئەلبەکر بۆ دروستکردنی کەلێنێك لەنێوان کوردو عەرەب هەروەها هەوڵدانیان بۆ لەناوبردنی گەلی کورد، بەلاّم دەبینین دۆستایەتییەکی بەتین لەنێوان کوردو عەرەب لەعێراقدا هەیە کەهەموو مەرگەساتەکانی نێوانیان لەبیر خۆیان بردۆتەوە.

لەمەش گەورەتر ئەو ئاگادارییەیە کەدەمەویّ ئاراستەی خێزانە کوردەکانی دانیشتووی بەغدای بکەم کەدەشیّ شتێکیان بەسەر بێت پەشیمانی کەڵك نەگرێت، چونکە دەبێت وریابنو خۆیان بپارێزن.

لەساڵی ١٩٧١ەوە، واتە ساڵێك دوای دەرچوونی بەیاننامەی ١١ی ئادار، مەکتەبی کاروباری باکوور بڕیارێکی دەرکرد بۆ دوورخستنەوەی کورد لەزێدی خۆیو دەستگرتن بەسەر ماڵو سامانیان بەلاّم

**جێبەجێکردنی ڕاگیرابوو هەرچەندە چاوەڕواندەکرا لەهەر ساتێکدا بێت جێبەجێبکرێت، چونکە هاوولاتیی عێراقی هەمیشە چاوەڕوانی شتی چاوەڕوان نەکراو دەکات لەلایەن سەرۆکی عێراقی سەدام حسەین(حزبی بەعس).**

خوێنەری بەڕێز: هەتا ئەو کاتەی لەگەڵ دامودەزگا ئەمنییەکانی عێراقدا کارم دەکرد چەندین جار گویم لەبەرێز سەدام حسەین بووە گوتوویەتی کوردە دەوڵەمەندەکانی بەغدا بەهۆی حزبی بەعس ماڵو سامانیان کۆکردۆتەوە، هەرکاتێکیش بینیمان پێویستمان بەو ماڵو سامانەبوو ئەوە لێیان دەسێنینەوەو دیدەینەوە بەخاوەنی شەرعیی خۆی کەحزبی بەعسی دەسەلاَتدارە...کەواتە با ڕەنج بدەنو ماڵو سامان کۆبکەنەوە هەتا ڕۆژیان دێت.

**ماوەیەك لەمەوبەر برادەرێکی خۆشەویستم لەو کوردە دەوڵەمەندانەی بەغدا سەردانیکردم، بۆمی گێڕایەوە چۆن کوڕەکەی لەکاتێکدا پارەیەکی زۆری پێ بووە کوژراوە، تەواو لەوەش دڵنیایە کەبکوژەکانی، ئەندامانی بەعسن. چەند سەعاتێك لەگەڵ ئەو برادەرەدا دانیشتم قسەم لەگەڵدا‌کردو هەوڵمدا قایلی بکەم کەبگەڕێتەوە بۆ کوردستانو سامانەکەی لەناو گەلەکەیو لەخاکی خۆیدا ڕەنیۆ بێنێت، زۆر نموونەشم خستە بەرچاوی لەسەر ئەو ئازادییەی لەکوردستاندا بەرکەماڵە کە لەگەڵ بەغدا بەراورد ناکرێت.**

**جا سەبارەت بە کاری ئازاد لەشاری سلێمانی، ئێستا چەندین کۆمپانیا هەیە لەهەموو جۆرە کاروبارێکی بازرگانیدا کاردەکەن بێئەوەی سانسۆریان لەسەربێت مەگەر لەبارێکدا سەرپێچییەکی نایاسایی بکەن. بۆنموونە ٣٥٠ کۆمپانیای بازرگانی هەیە کە لەتۆماری ڕێکخراوە خێرخوازەکان لەکوردستاندا کاردەکەنو تۆمارکراون، لەگەڵ نزیکەی ١٥٠ کۆمپانیای تر کەهێشتا تۆمارنەکراون لەکاتێکدا هیچ گیروگرفتێکیان لەپێش نییە کەشایەنی باسکردن بێت. ئەو برادەرەم بۆمی باسکرد چۆن دامودەزگا ئەمنییەکان گێچەڵ بەدەوڵەمەندەکان دەکەن، زیندانیان دەکەنو تەنها بەبەرتیلی زۆر بەریاندەدەن ئەمەش بێئەوەی چاوپۆشی لەو کەسانە بکەن کەخزمەتی ڕژێمیان کردووە یان لەریزی حزبی بەعسدان.**

**ئەمڕۆ دەوڵەمەندی کورد لەبەغدا، دەبێت هەرچییەکی پەیداکردوە بیداتە بریتی ژیانی خۆی ئەگەر بیەوێت بژی.**

**بەعسییەکان لەزۆر باردا دانیان بەنەتەوەی کورددا نەدەنا، بۆ نموونە لەناوەڕاستی حەفتاکاندا، کچێکی کورد لەبەغدا بەشاجوانی عێراق هەڵبژێردرا بەلاَم لایەنە پەیوەندارەکان بۆ ئەوەی وێنەی ئەو کچە بلاَوبکرێتەوەو هەڵبژاردنەکەی بکرێت بەرەسمی مەرجی گۆڕینی ناوو ڕەگەزەکەییان بەسەریدا سەپاند، بەلاَم کچەکە بەوە ڕازی نەبوو ئیتر کەسیش بەو هەواڵەی نەبیستو ڕۆژنامەکان بلاَویان نەکردەوە.**

**زۆرجار خوێندکاری کورد لەدوا قۆناغەکانی خوێندندا پلەی بەرزیان بەدەست دەهێنا بەلاَم ناوو نەتەوەیان دەگۆڕدرا بۆ ئەوەی خانەوادەکەی خانوویەکی لەبەغدا پێبدرێت لەگەڵ مووچەیەکی مانگانە**

بۆ هەتاهەتایە ئنجا خوێندکاری زیرەك ڕەوانەی هەندەران دەکرا بۆ خوێندن بەڵام وەکو عەرەبێکی عێراق، زۆر نموونەی تری لەم بابەتە هەیە.

ئەلبەکرو سەدام لەسەرەتاوە پێکهاتبوون کەکێشەی نەتەوەی کورد یەکلایی بکەن و بەهەموو شێوەیەك بەرەنگاری ببنەوە، جا لەپرۆسەکانی سەرژمێرکردنی شاری بەغدا هەمیشە لەزیادبوونی بەردەوامی ژمارەی کورد لەوێ دەترسان و چاوەڕێی ئەوەیان دەکرد ڕۆژێك دادێت کوردی بەغدا ڕاپەڕن و پەلاماری دامودەزگاکانی ڕژێم بدەن، بۆیە لەم ڕوانگەیەوە ڕژێم هەمیشە بۆ هەلێك دەگەڕا کورد بۆ دەرەوەی پایتەخت دووربخاتەوە، ئەوەی هانی ئەنجامدانی ئەم پرۆسەیەی دەدا تەها یاسین ڕەمەزان و خەیروڵڵا تەڵفاح بوو کەدەستی بەسەر چەند خانوویەکی خەڵکی کوردو ماڵ و سامانیاندا لەبەغدا گرت ئەوەش دوای تاوانبارکردنیان بەتۆمەتی بێبناغەو زیندانیکردن یان کوشتن یان دوورخستنەوەیان بۆ دەرەوەی وڵات.

شایەنی باسە ڕژێمی عێراق کاتی خۆی، لیستێکی پێشکەشی کۆمەڵەی وڵاتە عەرەبییەکان کرد تێیدا داوایکرد ٢ ـ ٣ ملیۆن کورد بۆ وڵاتە عەرەبییەکان دووربخاتەوە تا ئەوان وەکو هێزی کار بۆ خۆیان بەکاریان بێنن، بەڵام سەرۆك معمەر قەزافیی دۆستی گەلی کورد ڕۆڵێکی گەورەی هەبوو لەکۆبوونەوەکەدا بەرەنگاری ئەم بیرە شەیتانیە بووەوە لەرێی ڕاکێشانی چەند دەنگێك بۆ لای خۆی، پرۆسەکەی پووچەڵکردەوە، ئەوەبوو بەرێز حافز ئەسەدی سەر کۆماری سووریا دەنگی خستە پاڵ دەنگی بەرێز قەزافیی و هەوڵە نامرۆییەکەی عێراقیان هەڵوەشاندەوە. بەڵام بەعسییەکان دوای ئەوەی ئەم هەوڵەیان سەرینەگرت دەستیاندایە پرۆسەیەکی تر ئەویش دەرکردنی فەیلییە کوردەکان بوو بۆ ئێران، ئەوەش دوای دەستگرتن بەسەر هەموو ماڵ و سامانێکیاندا و ئاودیوکردنیان بەجلوبەرگی خۆیانەوە. ئەوانیش کەخاوەنی چەندین ملیۆن دیناربوون و زێڕنگەرو خاوەن کۆمپانیای هاوردن و هەناردنی کەلوپەل بوون و زەویوزاری زۆریان هەبوو، هیچیان بۆ دەرنەچوو، ئەو دەمە ململانێی گەورە لەنێوان سەرانی ڕژێم بەرپابوو لەسەر چۆنیەتیی دابەشکردنی ماڵ و سامان و موڵکی ئەو خەڵکە لەناو خۆیاندا.

بۆیە ڕووی دەمم دەکەمە هەموو کوردێکی دانیشتووی بەغدا کەئاگایان لەخۆیان بێت لەزەبری بەعس و ئەوە بزانن کە لەبەغدا هیچ یاسایەك پارێزگاری لەکورد ناکات، با هەموان ئەوەیان لەبەرچاوبێت کە بەچاوی خۆتان دەبینن چۆن بەعس لەبەغدا دەرتاندەکات.

خوێنەری بەرێز: دەمەوێت دەربارەی مەسەلەی ڕاگواستنی کورد لەبەغدا ڕووداوێك باس بکەم کە بەسەر خۆمدا هات. جارێکیان بەرێکەوت لەئۆتومبێلەکەمدا دوو کەس لەکادیرانی بەعسم لەگەڵدابوون کەهەرسێکمان ماڵمان لە(حي الضباط)بوو، یەکێکیان خوالێخۆشبوو سەعدوون غێدان بوو، ناوی ئەوی تر ناهێنم چونکە ئێستا ماوەو لەبەغدا دەژی. کاتێك ئۆتۆمبێلەکە لەخانوویەکی گەورەی سەر شەقامی سەرەکی نزیکبۆوە داوای مۆڵەتم لێکردن تا بۆ کارێکی تایبەتی بچمە ئەو ماڵە، کەگەڕامەوە لێمیان پرسی: ئەم خانووە هی کێیەو چەند کەسی تێدا دەژی؟ گوتم: خانووی عەقید شەوکەت نەجیبە، هەر خۆی و هاوسەرەکەی تێدا دەژین کەخزمێکی نزیکمە. بەسەرسووڕمان و ئاگادارکردنێکەوە بەیەك دەنگ

گوتیان: بەپێویستی دەزانین ئاگادارت بکەین خانوویەك بەم گەورەییو خۆشییەو تەنها دوو کەسی بەرەگەز کوردی تێدا بژی مایەی ئەوەیە دەستی بەسەردا بگیرێت و خاوەنیشی لەبەغدا دەربکرێت. کاك رەفیق هێشتا کاتی ئەوە نەهاتووە بڕیاری دوورخستنەوەی کورد لەبەغداو دەستگرتن بەسەر ماڵو سامانیاندا جێبەجێبکرێت. گوتم: ئایا ئاگاداریان بکەم؟ گوتیان: ئەوە نەکەیت، ئەمە نهێنییەکی دەوڵەتە.

پاشتر خاوەنی خانووەکەم ئاگادارکرد بەلام گوێیان بەقسەکەم نەداو تەنانەت بڕواشیان پێنەکردم.

جارێکی تر لەرووداوێکی لەو جۆرەدا، خوا لێخۆشبوو خالید زاحی کەبەڕێوەبەری فەرمانگەی رەگەزنامەبوو لەم مەسەلەیە ئاگاداریکردم و پێمی راگەیاند کەدۆستو ناسیاوی خۆم لەکوردەکان لەم بارەیەوە ئاگادر بکەمەوە کەهەر دەقەیەك بێت، ئەو بڕیارە جێبەجێ دەکرێت.

لەدیدارێکمدا لەگەڵ بەڕێز مام جەلالدا ئامۆژگاریکردم کەهەندێك خانووبەرە لەبەغدا بەکرمو بەناوی منداڵەکانمەوە تۆماری بکەم لەبەر پاشەڕۆژیان. منیش ئەوەی باسمکرد بۆم گێڕایەوەو گوتم: من هەموو دەقەیەك چاوەڕێی ئەوە دەکەم ئاشکرام بکەن، بۆیە نامەوێت وابکەم رژێم دەست بەسەر یەك بست زەویمدا بگرێت.

ئنجا مام جەلالم بەوە قایلکرد کە بەهۆی ئەوەی شارەزای سیاسەتی سەدامو ئەلبەکرم کەرۆژانە دەست بەسەر ماڵو سامانی کوردی دانیشتووی بەغدادا دەگرن، ئەوە هەتا لەسایەی حزبی بەعسدابم ئامادەنیم بستێك زەوی لەپایتەختدا بەکرم.

کاتی خۆیشی لەبەغدا چەند بنەماڵەیەکی کوردی نیشتەجێی ئەویم لەو رووەوە ئاگادارکردۆتەوە کە بەباشی نازانم ناویان بێنم. یەکێك لەو بنەمالانە بەگوێیکردمو هەرچی هەیانبوو لەگەڵ خۆیاندا دەریانکرد بۆ لەندەن.

بەپێی خەملاندنە خۆجێییەکان، نزیکەی یەك ملیۆن کورد لەبەغدا دەژی، بەدڵنیاییشەوە دەڵێم ئەگەر رۆژێك بێت دەوڵەتی کوردی دابمەزرێت ئەوە ژمارەی ئەوانە دەگاتە دوو ملیۆن کەس بەلام بۆ مەبەستی خۆپاراستنو لەترسی زەبری حکومەتە یەك لەدوای یەکەکانی عێراق دەبینین کوردی نیشتەجێی بەغدا، سەری داخستووەو کوردبوونی خۆی ئاشکرا ناکات... بەلام کاتی خۆی دێت.

ئەی ئەو کوردانەی لەبەغدا نیشتەجێن، ئەوەتان لەبەرچاوبێت کەهەموو یەکێکتان تۆمارێکی رەشی هەیە کە لەلقێکی تایبەتی بەڕێوەبەرایەتیی ئاسایشی گشتییدا هەڵگیراوە بێئەوەی گوێ بدرێتە ئەوەی کەئەمە وەزیرەو ئەوەی تر باڵوێزە، یان پەیوەندیی بەگەورە لێپرسراوانی بەعسەوە هەیە کەمەبەستم ئەندامانی ئەنجومەنی سەکردایەتیی شۆڕشە. چونکە هەموو کوردێك لەژێر چاودێری وردایە کەژمارەی خێزانەکەی چەند کەسە، جموجووڵی رۆژانەیان، جۆری ئەو ئۆتۆمبێلەی هەیانە، ژمارەی تەلەفۆنەکەیانو رۆژانە بەتەلەفۆن قسە لەگەڵ کێدا دەکەن... ئینجا رۆژانە بۆی هەیە تۆمەتێکی بۆ هەڵبەسترێتو سەری تیابچێت . چونکە بەلای حزبی بەعسەوە، ملیۆنێری کوردی نیشتەجێی بەغدا، سامانی لەسەر خاکی عەرەبدا کۆکردۆتەوەو ئەو شوێنو پلەیەی کەگرتوویەتی هی هەر عەرەبێکی

عێراقییه که لەبەغدا دادەنیشێت، دەرەنجامی ناڕەوای ئەم هەڵسەنگاندنەش دیارە کەسامانی ئەو کوردە دەبێت هی عەرەب بێتو دواجار بۆ دەوڵەت دەگەڕێتەوە کەلێرەدا حزبی بەعسی دەسەڵاتدارە، تەنانەت ئەم کوردە ئەگەر تەنها بەرەگەز کوردیش بێتو هیچ پەیوەندییەکی لەدوورو لەنزیك بەهاوپشتە کوردەکانیەوە نەبێت.

لەوانەیە هەندێك کورد بڵێن ئێمە گوێ نادەینە ئەم ئاگاردارییانەی رەفیق پشدەری چونکە لەناو ئەنجومەنی سەرکردایەتیی شۆڕشدا دۆستو ناسیاومان هەیە کەدەبنە قەڵغانێك لەهەر گیروگرفتێکدا تێی بکەوین. بەڵام با ئەوانە بزانن کەهیچ دەسەڵاتێك لەعێراقدا ناتوانێت رەخنە لەبڕیارێکی مەکتەبی کاروباری باکوور بگرێت کەخودی سەدام بەڕێوەی دەبات. دوو رووداوی دەستگیرکردن هەیە کەناویانم نایەتەوە یاد، یەکێکیان لەکاتێکدا گیرا نانی نیوەڕۆی لەگەڵ بریکاری وەزیر دەرەوەدا دەخوراد بێئەوەی پلەی دپلۆماسیی بریکاری وەزیری لەبەرچاو بگرێت. دووەمیشیان لەکاتێکدا بەتەلەفۆن قسەی لەگەڵ ئەندامێکی ئەنجومەنی سەرکردایەتیی شۆڕشدا دەکرد تەلەفۆنەکەی لەدەست راپسکێنراو دەستگیرکرا.

جاکاتێك یەکێکمان قسە لەگەڵ کوردێکی ناوداری بەغدا دەکات بۆ گواستنەوەی شوێنی نیشتەجێی بۆ کوردستان دەبینین کابرا بەهانەی ئەوە دەهێنێتەوە گوایە لەبەغدا بەرژەوەندیگەلێکی هەیەو ناتوانێت دەستیان پێدابێنێت نەکا گومانی لێبکرێت چونکە لەوێ هەموان لەزەبری سەدام حسەین دەترسن. یان کابرای کورد بیانووەکەی ئەوە دەبێت گوایە لەکوردستاندا، بەهۆی ناکۆکیی نێوان هەردوو حزبە گەورەکە، ئارامی نییە، چونکە بەلایەوە، کاتێك سەرکردەی هەردوو حزب بەڕێزان جەلال تاڵەبانیو مەسعوود بارزانی دەبینێت لای بەیانی پێکەوە تەوقەدەکەن هیچ بەدووری نازانێت سەر لەئێوارە شەڕ لەنێوانیاندا بەرپابێت. جا لەکوردستاندا خەڵك بڕوایان بۆ دۆزینەوەی رێگەچارەیەکی ئاشتیخوازو یەکجارەکی بۆ شەڕی ناوخۆ، لەدەستداوەو پشتیان بەخوا بەستووە ئەم مەسەلەیە بەلایەکدا بخات . چونکە ئاشتی لەکوردستاندا کەوتۆتە دەست دەوڵەتە زلهێزەکان، جەنگیش بەدەست چوار دەوڵەتی دراوسێوەیە.

جا دوای جێگیرکردنی هێزی هاوپەیمانان لەبنکەی ئەنچەرلیك، نزیکەی ١٥٪ی کوردی بەغدا گەڕانەوە بۆ کوردستان هەرچەندە ئەم رێژەیە بەبەراورد لەگەڵ ژمارەی کوردی نیشتەجێی ئەوێ، کەمە. چونکە کورد زۆر شت هەیە سەری لێدەرناکات. بۆ نموونە مێشکی ئەوە وەرناگرێت کەئەوانەی کارەساتی ٣١ی ئابی ١٩٩٦یان خوڵقاند پێڕەوو ستراتیجی خۆیان گۆڕیوەو لەسەنگەری خیانەتەوە چوونەتە سەنگەری نیشتمانپەروەری، باشە ئایا یاریکردن بەچارەنووسی گەلان بەم شێوەیە دەبێت؟ مێژوو وەڵامی ئەم پرسیارەمان دەداتەوە.

بەڵام من رووی دەمم دەکەمە ٨٠٪ی ئێوە کەبەغداتان بۆ بەسەربردنی ژیانتان هەڵبژاردووە، ئێوەی رۆشنبیرو سیاسەتمەدارو کارگوزار لەهەموو بوارێکی تری زانستیداو دەڵێم: دەبوایە خەڵکی کوردستان سوودی لەسامانو زانستەکانتان وەربگرتایە، چونکە وەك دەڵێن نان بۆ خۆیش نەك بۆ دەرویش، جگە لەوەی هەتا ماڵ وەستابێت مزگەوت حەرامە. ئێمە لێرە پێویستمان پێتانە هەرچەندە ئیدارەی کوردی

لەکوردستاندا کاری جددیی بۆ ئاسانکردنی گەڕانەوەتان نەکردووە. بۆ نموونە مامۆستای کۆچکردوو مەلا جەمیل رۆژبەیانی، ئەگەر لەکوردستاندا بوایە بەو ئاسانییە دەستدرێژی نەدەکرایە سەر هەرچەندە شەرعی ئاینی ئیسلام وشەی(ئەگەر)ی قەدەغەکردووە، چونکە ناوبراو بلیمەتێکی سەردەمەکەی بوو. خوالێی خۆشبێت.

دواشت کەباسی بکەم ئەوەیە کاتێك فلأنە کەسی کورد، حکومەت بۆ پۆستی وەزیری یان لێپرسراوێکی گەورەی دەزگایەکی دەوڵەتی دەیپاڵێوێت یەکسەرو زۆر بەنهێنی قسە لەگەڵ هەردوو سەرکردە جەلال تاڵەبانیو مەسعوود بارزانی دەکات کەئەوانیش پیرۆزبایی ئەو پۆستەی لێدەکەن ئەمەش گوایە بەناوی ئەوەی کابرا لەوشوێنەیەوە خزمەت بەم حزبەی ئەمان دەکات بێئەوەی ئەو راستییە حاشاهەڵنەگرە لێکبدەنەوە کەئەم کارە، تەنها خزمەتی بەرژەوەندییە کەسایەتییەکانی ئەو پیاوە دەکاتو چاوەڕێی ئەوەی لێناکرێت خێر بۆ کوردستان بداتەوە، لەوانەشە هەبێت بپرسێت: رەفیق پشدەری ئەدی تۆ؟ چۆن بەو پلەیەت گەیشتیت؟ منیش دەڵێم: کاتو بارودۆخێك کەمن بەسەرم برد لەهی ئەمرۆ زۆر جیاوازبوو، جا ئەوەی بۆ من رێکەوت، بۆ خەڵکی تر رێناکەوێت!

جارێکیان دوو سەرۆك عەشیرەتی کوردم لەگەڵ خۆمدا برد بۆ دیدەنیی بەرێز سەعدوون غێدان کە لەبەرئەوەی جێ‌بڕوای هەردوولا بووم رۆڵی وەرگێڕم لەنێوانیاندا بینی. زۆر سەرم لەوە سووڕما کەهەردوو سەرۆك عەشیرەتەکە هانیاندام لەلای سەعدوون غێدان لەسەر حسابی ئەوی تر بەشانو باڵیدا هەڵدەمو باسی ئازایەتیو ناوبانگی بکەم لەناو عەشرەتەکەیدا کەدەتوانێت زۆرترین ژمارەی چەك لەناو خەڵکی کورددا دابەش بکاتو لەرووی خزمەتکردنی حزبی بەعس، لەخەڵکی تر خزمەتگوزارتر دەبێت. منیش خۆم پێنەگیراو بەروویدا هەڵشاخام گوتم: من بۆ ئەوە لەگەڵتاندا هاتووم کەوەکو وەرگێڕ بم نەك دەلأڵ بم لەزیادکردنێکی بازرگارنیدا. ئەوان سەریان داخست. لەبەرئەوەی ئەو دوو کەسە ئێستا لەژیاندان چاوپۆشی لەناوهێنانیان دەکەم.

برای کوردی بەشەرەفم کەنیشتەجێی بەغدای پایتەختی دەسەڵاتی زۆردار: ئایا بڕیارتانداوە خوێنتان بەفیڕۆ بڕوات؟ ئەدی خودا نەیفەرموە: ﴿ولا تلقوا بایدیکم الی التهلکة ...﴾،بۆیە تکام ئەوەیە باش بیر لەقسەکانم بکەنەوەو هەتا کارلەکار نەترازاوە پاشەڕۆژی منداڵەکانتان دەستەبەربکەنو خزمەتێکی کوردستان بکەن، چونکە خەڵکێك لەپێش ئێوە هەوڵیانداوەو هیچیان بۆنەکراوە، هەموشمان قەرزاری نیشتمانی دایکمانینو هەردەگەڕێینەوە بۆ باوەشی.

لەوانەشە ئەمانەی باسمکردن بەلای ئەوانەی ئاگاداری سەردەمی دەسەڵاتی رژێمی عێراقین نامۆ نەبێت بەلأم بەلای نەوەی داهاتووەوە شتێکی سەیرە کەئەم نەوەیە هاوچەرخی سەردەمی ئازادیو سەربەخۆییە لەسایەی حکومەتی هەرێمی کوردستانداو ئاشنای پرۆسەکانی زاڵدەستیو کۆیلەیی بەعس نییە.

## ئه نجومه نی سه رکردایه تیی شۆڕش و مه کته بی کاروباری باکوور

ئەنجومەنی سەرکردایەتیی شۆڕش ماوەیەکی کەم دوای کودەتای ١٧ی تەمموزی ١٩٦٨ دامەزرا، بەڵام مەکتەبی کاروباری باکوور لەسەرەتای حەفتاکاندا دامەزرا، ئامانجی ئەم دوو دەزگایەش کۆنترۆڵکردنی عێراق و جێبەجێکردنی تەواوی خواست و ئارەزووەکانی سەرکردایەتیی بەعسە لەعێراقدا. شایەنی باسە هەموو بڕیارەکانی ئەنجومەنی سەرکردایەتیی شۆڕش یان مەکتەبی کاروباری باکوور تەنها لەسەر قسەو بەئیمزای سەدام حسەین دەردەچن. مەکتەبەکەش زیاتر لەدادگایەکی عورفی دەچێت بۆ سەرکوتکردنی بزووتنەوە کوردییەکان هەروەها کۆنترۆڵکردنی کوردستان. هەموو کێشەیەکیش کەرووبەڕووی دامودەزگا سەرکوتکەرەکانی وەکو موخابەرات و ئیستخبارات و ئاسایش دەبێتەوە ئەوە دوای داڕشتنی، ڕەوانەی مەکتەبی کاروباری باکوور دەکرێت کەلەوێ بڕیاری لەسەر دەدرێت ئینجا ڕەوانەی وەزارەتی بەرگری یان وەزارەتی ناوخۆ یان وەزارەتی کشتوکاڵ دەکرێت بەپێی پەیوەندی. هەندێك جاریش کێشەکە بەئەنجومەنی سەرکردایەتیی شۆڕش دەدرێت تا بەپێی یاسایەك مامەڵەی لەگەڵدابکرێت کەمشتومڕ هەڵنەگرێت. زۆرجاریش مەکتەبی کاروباری باکوور، پێش ئەوەی لایەنە پەیوەندارەکان بڕیاری خۆیان لەسەر کێشەکە دەربکەن ئەو بڕیاری خۆی دەدات، بۆ نموونە لەسەرەتای گرتنی ئەندامانی سەرکردایەتیی کۆمەڵەی ڕەنجدەران کەباڵێکی یەکێتیی نیشتیمانیی کوردستان بوو، بەڕێز شەهاب و هاوڕێکانیم ئاگادارکرد کەئەو لێکۆڵینەوانەی ڕۆژانە لەگەڵیاندا ئەنجامدەدرێن ڕۆتینن، هەروەها هەوڵەکانی دەرەوەو ناوەوە بۆ ئازادکردنیان یان کەمکردنی حوکمەکانیان بێسوودە، چونکە دەمزانی کەمەکتەبی کاروباری باکوور، پێشتر بەفەرمانی سەدام حسەین حوکمی لەسێدارەدانیانی دابوو، بۆیە تکام لێکردن هاوکاریم بکەن بۆ فڕاندنی کوڕی سەدام حسەین بۆ ئەوەی وەکو بارمتە بۆ ئازادکردنیان بەکاری بێنن. لەبەرگەکانی کتێبەکەم (کورد دوژمنی خۆت بناسە) بەدووروودرێژی باسی ئەمەم کردووە، بەڵام لەبەرئەوەی هیچ دەسەڵاتێکی ترم نەبوو ئەوەبوو حوکمە ناڕەواکەیان جێبەجێکرا.

بەڕێز سەدام حسەین لەساڵی ١٩٧٤ ەوە کەدۆسیەی کوردو شیعەو دەوڵەتی ئێرانی گرتەدەست لەسەر خۆی بەپێویستی زانی کەهەوڵبدات ئەم کێشە گرنگانە چارەسەر بکات کەپەیوەندییان بەئاسایشی دەوڵەتەوە هەیە. لێرەدا مەبەستم ئەوەیە کەهەرچی خراپەکارییەکی حکومەتی عێراق کەدەرهەق کوردو شیعەی عێراق و دەوڵەتی ئێران جێبەجێکرابێت بەفەرمان و داڕشتنی سەدام حسەین بوو... بەڵام ببینن چ نەخشەیەکی داڕشت و چیکرد: کابرا واتەنی: هات چاکی بکات بەڵام خراپی کرد!

### بڕیارەکانی مەکتەبی کاروباری باکوور بۆ سەرکوتکردنی کورد :

سەدام حسەین لەڕێی ئەم مەکتەبە سێ بڕیاری گەورەوگران و ناڕەوای دەرهەق بەکوردی فەیلی، ئێزدی دەرکردوە، لەگەڵ دووبەرەکی نانەوە لەنێوان سۆرانی و بادینانی لەکوردستاندا.

### فەیلییەکان :

گەلی کورد نکووڵی لەخەباتی فەیلییەکان ناکات کە بەدرێژایی چەندین ساڵ لەپێناو رزگاریی کوردستاندا قوربانیی زۆریان داوە، ئەمانە بەرەگەزو بنەچە کوردن‌و هیچ جیاوازییەکیان لەگەڵ ئێمەدا نییە. بەڵام سەدام حسەین، وەکو پیلانێکی شەیتانی، دروشمی(پەرت بکە، زاڵبە)ی لەمەڕ کۆلۆنیالیستە کۆنەکان بۆ ئەم مەبەستە بەکارهێنا، ئەوەبوو لەرێی رێکخستنەکانی حزبی بەعسەوە وای بلاوکردەوە گوایە فەیلییەکان عەجەمن‌و بەناوی ڕەگەزی کوردییەوە بەدزییەوە لەئێرانەوە هاتوون بۆ عێراق‌و پاشان توانییان بازاڕی بەغداو پارێزگاکانی تر کۆنترۆڵ بکەن، هەروەها ئەو سامانەی کۆیان کردۆتەوە ماڵی گەلی عێراقە بەکوردو عەرەبەوەو ئەو سامانە دەبێت بۆ ئەمان بگەڕێتەوەو...زۆری تر لەم جۆرە واتەواتانە. هەروەها لەبەرئەوەی فەیلییەکان مایەی مەترسین بۆ سەر ئەمنی نەتەوەیی عەرەبی ئەوە دەبێت دەسەلاتداریەتیی عێراق کاری پێویست بۆ دژایەتیکردنیان بکات. بۆیە هێزەکانی دامودەزگا ئەمنییەکان کەوتنە گرتنیان کەهەتا ئەمڕۆ، دەیان لاوی فەیلی کەخرابوونە زیندان‌و گرتووخانەکانەوە، بێسەرو شوێنن...

بۆ زانیاریی خوێنەریش ئەوەی لەسەرەتاوە ئەم بیرەی هێنایە ئاراوە سێ کەس بوون: ئەحمەد حەسەن ئەلبەکر، ساڵح مەهدی عەمماش‌و سەدام حسەین. ئەمانە لە کودەتای تەممووزی ١٩٦٨ەوە پیلانیان بۆ ئەم کارە ناڕەوایە داڕشتووە، ئنجا بەکردەوە دەستیاندایە کۆچ پێکردنی فەیلییەکان‌و دوورخستنەوەیان بۆ سنووری ئێران، ئەمەش دوای ئەوەی دەستیانگرت بەسەر هەموو ماڵ‌و سامانێکیان. ئەم کردەوە نامرۆییە هاندەرێکی بەتین بوو بۆ پتەوکردنی پەیوەندیی فەیلییەکان لەگەڵ کورددا، زیاد لەمەش قینی کوردی دژی رژێمی بەعس لەجاران زیاترکردو لەئەنجامدا کردەوەیەکی تری دڕندانەی خستە سەر لیستی کردەوە نامرۆییەکانی حزبی بەعس.

**ئێزدییەکان:**

پێڕەوانی ئەم بیروباوەڕە ئاینییە لەکوردستانی باشووردا لەقەزای شنگارو شێخان‌و تەلعەفەر دەژین. ژمارەیان ٤٠٠ ــ ٥٠٠ هەزار کەسێکە، ژمارەیەکی کەمیشیان لەحەڵەب(سووریا)و ئەرمەنستان‌و کەفکاسیان. ئەمانە نزرگەیەك بەپیرۆز دەزانن کە لەناوچەی هەکاریی سەر بەشاری مووسڵە، نزرگەکە مەزاری شێخ ئادییە(شەرەفەدین ئەبو فەزائلە کە لەساڵی ١١٦٢ز کۆچی دوایی کردووە)و خاوەنی کتێبی جیلوەیە کەکتێبی ئاینی ئێزدیەکانە. ئەمانە بەڕەگەزو بنەچە کوردن، زۆر جۆر نەهامەتی‌و ئێش‌وئازارو گرتن‌و ئەشکەنجەدانیان لەلایەن رژێمی عێراقەوە بەسەرهاتووە کە لەئەنجامی سووربوونیان لەسەر کوردبوونیان، دوچاریان هاتوون.

ئێزدییەکان لەساڵی ١٩٦٣وە کەعەبدولسەلام عارف بوو بەسەرکۆماری عێراق دووچاری هەموو جۆرە راوەدوونان‌و دژایەتیکردنێك هاتوون ئەمەش بۆئەوەی نکووڵی لەڕەگەزی کوردییان بکەن‌و دان بەعەرەب بوونیاندا بنێن، بەڵام ئەمان تا ئەمڕۆ ملیان نەداوە .

لەساڵی١٩٦٨ ەوە کەحزبی بەعس حوکمی گرتەدەست گوشاری زیاتریان کرایەسەر. سەدام‌و ئەلبەکر هەموو جۆرە رێوشوێنێکیان گرتەبەر بۆ بەدیهێنانی ئامانجە گلاوەکانیان، بۆیە دەستیانکرد

بەتاڵانکردنیان و رووخاندنی گوندەکانیان و راگواستنیان لەزێدی باوباپیرانیان. هەموو ئەم کردەوانەش لەپێناو ئەوەی ئێزدییەکان دەستبەرداری نەتەوەکەیان بن و ببنە عەرەب و سەنگەری خەباتی کوردایەتی چۆڵ بکەن. ئەمانیش لەم پێناوەدا سەدان قوربانییان داوە، ئەمانیش وەکو فەیلییەکانیان بەسەرهات.

نوێنەرانی ئێزدییەکان لەچەندین دیداری ئاشکرا بەحکومەتی عێراقییان گوتووە کەکەس نکووڵی لەرەسەنایەتیی نەتەوەی عەرەب ناکات و گوایە عەرەب سەرداری هەموو نەتەوەکانی ترن، بەڵام ئێمەش لەلای خۆمانەوە (واتە ئێزدییەکان) نکووڵی لەکوردبوونی خۆمان ناکەین چونکە ئەمە پێچەوانەی بنەماکانی دابونەریت و ئاین و یاسایە میرەکەیان، تەحسێن بەگی ئێزدی کە لەمانگی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٨٠ەوە نەمبینیوە، هەتا ئەمڕۆ کوردێکی نیشتمانپەروەرەو زیرەك و ئازاو دڵسۆزە. لەشۆڕشی ئەیلوولدا بەشداریکردووە، ئنجا دوای هەرەسەکە چوو لەلەندەن بژی. من باشی دەناسم چونکە پەیوەندییەکی بەتینم لەگەڵیدا هەیە، هەمیشە بەئامادەبوونی مامۆستای کۆچکردوو ئیبراهیم ئەحمەدو حاتەمی تەیی کوردان خوالێخۆشبوو عەلی کەمال و قارەمانی خوالێخۆشبوو عومەر دەبابەو بەڕێز دکتۆر لەتیف رەشیدو هەرکوردێك کەئاواتی سەربەخۆیی کوردستان و پێکهێنانی حکومەتی کوردییە، ئامادەی دانیشتنەکانمان دەبوو. لەهەرسێ بەرگی کتێبەکەم(کورد دوژمنی خۆت بناسە)دا بەدووروردرێژی باسی ئەم کەسایەتییەو هەروەها باسی ئەو ئێزدییانەم کردووە کە لەبەندیخانەی ئەبوغرێب لەگەڵمدابوون، جا ئەم میرە کوردە رۆڵێکی گەورەی هەبوو لەڕووی خۆگرتنی ئێزدییان و سووربوونیان لەسەر کوردبوونیان.

لەهەمانکاتدا ناپاك و بێورەشیان تێدابوو، ئەوەبوو شێخێکیان کەناوی مەمۆی ئێزدیبوو، بەرامبەر پارەیەکی مۆڵ دەستیدایە هاوکاریکردنی دەسەڵاتدارێتیی عێراقی و دەیگوت: (ئێمەی ئێزدی بەرەگەز عەرەبین و بەهیچ شێوەیەك ناچینەوە سەر رەگەزی کورد، دەستەڵاتداریەتیی عێراقیش بەهەموو شێوەیەك یارمەتیدا بۆئەوەی زۆرترین ژمارە لەئێزدییان لەدەوری ئەم کۆببنەوە، بەکردەوەش ناوبراو توانی ١٪ی ئێزدییەکان قایل بکات کەرەگەزیان لەکوردەوە بۆ عەرەب بگۆڕن، بەمەش سیاسەتی بەعس لەرووی نانەوەی دووبەرەکی لەڕیزی ئێزدییاندا شکستی خوارد. لەم ساڵانەی دواییشدا شێخ تەحسێن بەگی ئێزدی، دوای ئەوەی بۆی دەرکەوت ئێزدییەکان لەچ بارودۆخێکدا دەژین، ژیانی خۆی لەپێناویاندا خستە مەترسییەوەو لەلەندەنەوە گەڕایەوە بۆ عێراق و توانی ٩٩٪ یان لەدەوری خۆی کۆبکاتەوە.

**دووبەرەکی نانەوە لەناو کورددا، رێنمایی مەکتەبی کاروباری باکوورە**

رژێمی عێراق بەدرێژایی ساڵانی رابردوو، بۆ دژایەتیکردنی گەلی کوردستان وەکو کۆڵۆنیالیستی زۆردار بیری کردۆتەوە بیئەوەی بیر لەوە بکاتەوە کەگەلان نابەزن. یەکێك لەرێوشوێنەکانی رژێم نانەوەی ئاژاوەو پشێوییە لەناو گەلی کورددا ئەوەش لەرێی بەکارهێنانی چەند رێبازێك کەیەکێکیان ئاینە. وەك دەزانین لەناو کورددا ژمارەیەکی زۆر مەسیحی هەن کەهەرگیز نەبیستراوە ناکۆکییەکیان لەگەڵ برا کوردە موسڵمانەکانیاندا هەبووبێت، هەروەها مەسیحیی کورد هەرگیز لەکوردایەتیو تێکۆشان لەپێناو مەسەلەی رزگاریی گەلی کورد دانەبڕاوە، جگە لەوەی مەسیحییەکان نکووڵییان

لەکوردبوونیان نەکردووە. بەڵام رژێمی عێراق بەفەرمانێکی توندی بەرێز سەدام حسەین گوشاریان خستە سەر مەسیحییەکان بۆ گۆڕینی رەگەزیان بەوەی رەگەزنامەی عەرەبی بەوانەیان بدەن کە لەکوردستاندا دەژین، لەم پێناوەشدا رژێم هەموو رێوشوێنێکی بەکارهێنانی گوشاری خستە گەڕ بۆئەوەی هەموو مەسیحییەکی کورد رەگەزی بکات بەعەرەب، زۆرجاریش بەخشینی پارەی مۆڵ‌و تەماعی ئابووری، مرۆڤ دەخاتە دەریای بیرکردنەوە بەڵام ئەم رێگەیە لەگەڵ مەسیحییەکاندا بێسوودبوو، چونکە بەعسییەکان لەبەر نەزانییان کەئەوەندە قینیان لەهەموو کوردزمانێکە بیریان چوو کەمەسیحیی کورد، ئەویش وەك هەر مرۆڤێکی تر خاوەنی بیروباوەڕی نەتەوەیی‌و هەستی نیشتمانی‌و رەوشت‌و ویژدانە، ئیتر نازانم عەقڵییەتی دەسەڵاتداریەتیی حوکمڕان لەعێراقدا چۆن بیری لەوەکردۆتەوە دەتوانێت کەهەست‌و بیروهۆشی مرۆڤ کۆنترۆڵ بکات!

دەربارەی بادینی‌و سۆرانیش ئەوە حکومەتی عێراق ئەوساو ئێستاشی لەسەربێت بەردەوامە لەگرتنەبەری هەموو رێوشوێنێك بۆ دووبەرەکی‌نانەوە لەنێوان سۆرانی‌و بادینیدا. دیارە جوگرافیای کوردستان کەدەستکردی خوای گەورەیە، زێی گەورەی تێداهەڵکەوتووە کە لەکوردستانی تورکیا هەڵدەقوڵێت‌و لەنزیك مووسڵ دەڕژێتە ناو رووباری دیجلەوە. ئەم چەمە لەمپەرێکی سروشتیی دروستکردووە لەنێوان ناوچەی سۆران‌و ناوچەی بادینان کەئەگەر بەرێژەیەکی کەمیش بێت پەیوەندیی نێوان کوردی هەردوو دەڤەرەکەی ئەستەم کردووە. هەر لەسالآنی چلەکانیشەوە پرۆژەیەکی عێراقی لەئارادابووە لەپێناو راکێشانی رێگەیەکی خێرا بۆ گرێدانی هەردوو پارێزگای سلێمانیی سۆران لەئەمپەری باکووری رۆژهەلاتی عێراقەوە، بەشاری زاخۆی دەڤەری بادینان لەئەوپەری باکووری رۆژئاوای عێراق. جا هەموو حکومەتە یەك لەدوای یەکەکانی عێراق بەبیانوی پڕوپووچ کاریان بۆ پەکخستنی سەرگرتنی ئەم پرۆژەیە کردووە. ئەندازیارێکی کوردی خەڵکی شاری کەرکووك بۆمی گێڕایەوە کە بەیارمەتی چەند خێرەومەندێك، ئەم پرۆژەیەی خستەوە بەرچاوی بەرێز سەدام حسەین‌و وای شیکردەوە بۆی کە لەچەند لایەکەوە سوود بەگەلی کورد دەگەیەنێت، بەڵام هەموو جارێك سەرۆکی عێراقی جێبەجێکردنی پرۆژەکەی دوا دەخست ئەمەش بەناوی تێچووی زۆری پرۆژەکەو نەگونجانی لەگەڵ باری نالەباری ئابووریی عێراق. بەڵام کاتێك مەسەلەی دروستکردنی پڕۆژەی بەنداوی بێخمە هاتە ئاراوە" کەتێچووەکەی دە ئەوەندەی تێچووی ڕاکێشانی ئەو رێگەیەیەو لەهەمانکاتدا دەبوو بەمایەی رووخانی دەیان شارۆچکەو گوندی کوردستان، ئەمە سەرباری قازانجی لەرووی بەرهەمهێنانی وزەی کارەبا لەناوچەکەدا، ئەوەبوو بەڕێز سەدام حسەین یەکسەر رەزامەندی بۆ دەست پێکردنی پرۆژەکە نیشاندا، ئەمەش لەبەرئەوەی لەلایەکەوە کروردستانی ئاوەدان دەکردەوە، لەلایەکی تریشەوە وێرانی‌دەکرد. بەڵام شتێکی بەڵگەنەویستە ئامانجی حزبی بەعس وێرانکردنە نەك ئاوەدانکردنەوە بۆیە چەمکی وێرانکردنەکە بەسەر پرۆژەکەدا زاڵبوو. بەڵام وەکو دەزانین ئیرادەی خوای گەورە هەروەها جەماوەری گەلی کوردستان لەسەرووی ئیرادەی بەعسە کەوایکرد بەنداوی بێخمە تەواوبکرێت‌و ناوچەی سۆران لەبادینان دابڕێت.

**دووبەرەکی لەنێوان عەشرەتە کوردەکان و جووتیارو دەرەبەگ :**

یەکێك لەهەنگاوە شەیتان ئاساکانی سیاسەتی دامودەزگا ئەمنییەکان بەکارهێنانی هۆش و گۆشی سادەی دێهاتییان بوو کەدژی یەکتر دنەیان دەدان ئەوەش لەرێی زیندکردنەوەی ناکۆکییە دێرینەکانی نێوان باوباپیرانی دێهاتییان، یان راسپاردنی پیاوێکی ئاسایش کەتەقە لەمانگای یەکێك بکات یان خەرمانەکەی بسووتێنێت. ئەمە بەهەمان شێوە لەنێوان جووتیارو دەرەبەگدا پێڕەو دەکرێت کەدامودەزگا ئەمنییەکان بەزەبری پارە، وایان لەچەند پیاوێك دەکرد بچنە پاڵ لایەنی دەستدرێژیکار بۆ فراوانکردنی چوارچێوەی ئاژاوە. یان هەندێك جار دامودەزگا ئەمنییەکان پشتی لایەکیان لەدژی لایەکی تر دەگرت و هانیاندەدا دژایەتی و شەڕی بکات، لەو لاشەوە دەزگای موخابەرات پشتی لایەنی بەرامبەری دەگرت و ئەوی لەبەرامبەرکەی تیژدەکرد تا ئاگرەکە خۆشتربێت. لەناو عەشیرەتی جافدا ناوبراو حەمەعیسا لەگەڵ موخابەراتدا کاریدەکرد، دەزگای موخابەرات فەرمانی پێکرد تەقە لەخوا لێخۆشبوو مستەفا بەگی جاف بکات، ئەویش بەرۆژی نیوەڕۆو لەبەرچاوی خەڵکدا تەقەی لێکرد بێئەوەی پۆلیس دەستگیری بکات یان هیچ نەبێت لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا بکات تا بەو ناوەوە هیچ نەبێت سەعاتێك زیندانی بکات. ئەو پیاوە دژایەتیی عەشیرەتی جافی دەکرد کەئەم عەشیرەتە بەپێی ئاماری مێژوونووسان بەگەورەترین عەشیرەت لەکوردستانی گەورەدا دەژمێردرێت.

زۆر نموونەی تری لەم جۆرە هەیە وەکو ئەوەی لەناوچەی پشدەر روویدا کاتێك دامودەزگا ئەمنییەکان کەوتنە پشتگیریکردن و بەهێزکردنی بابەکر وسوو لەپێناو بەرهەڵستیکردنی ئاغاکانی ناوچەکەو شەڕ پێفرۆشتنیان بەتایبەتی ئەو ئاغایانەی ملیان بۆ فەرمانی دامودەزگا ئەمنییەکان نەدەدا. ناوبراو لەشەڕ پێفرۆشتنەکانیدا هەموو دابونەریتێکی دەبەزاند لەکاتێکدا پێشتر لەخزمەتی مستەئاغای مەحموود ئاغادا کاریدەکرد. ئەم بابەکر ناوە، دەزگای ئیستخباراتی سەربازی بەتایبەتی پشتگیری دەکرد، لەئەنجامی ئەمە گیروگرفت و کێشە لەنێوان عەشیرەتەکانی ناوچەکەدا دروستبوو کەئاکامەکەی تیاچوونی چەند کەسێك بوو. ئاژاوەکە ئاگرێکی لێ هەڵایسا هەتا ئەمڕۆ نەکوژاوەتەوە . لەم میانەیەدا ئاشکرابوو کەئەوەی لەگەڵ دامودەزگا ئەمنییەکاندا کاربکات و داخوازییەکانیان جێبەجێ بکات دەروازەی خۆشبەختی لەروودا دەکرێتەوە، بەڵام لەبەرامبەریشدا سەرشۆڕی بەشی دەبێت. ئەوەی بەرەنگاری داخوازییەکانی بەعسیش بوایەتەوە تووشی چەرمەسەری و دەربەدەری دەبۆوە!

**دووبەرەکی نانەوە لەنێوان کوردو تورکمان لە پارێزگای کەرکووکدا :**

هەرچەند لەسێ بەرگی کتێبەکەمدا باسی ئەم کێشەیەم کردووە بەڵام دەمەوێت لێرەدا بەکورتی ئاوڕ لەو باسانە بدەمەوە کەپێشتر خۆم لەقەرەیان نەداوە.

حزبی بەعس لەساڵی ١٩٦٨ەوە کەدەسەڵاتیان لەعێراقدا گرتۆتە دەست بەردەوامبوون لەکۆچ پێکردنی کورد ئەوەش بەبیانووی جۆربەجۆر لەپێناو دەرکردنی چەندین بنەماڵەو خێزانی کورد لەم پارێزگایەدا بۆ بەرژەوەندیی خۆیان هەروەها بۆ مسۆگەرکردنی دەست بەسەراگرتنی ئەم ناوچە ستراتیجییە کەسەرچاوەی داهاتی سەرەکی و بێشوماری عێراقە.

پرۆسەی کۆچ پێکردنی کورد وردە وردە فراوانبوو ئنجا دانیشتوانی گوندەکانی کەرکووکی گرتەوە کەدەستکرا بەنیشتەجێکردنی خەڵکی عەرەب لەشوێنیاندا. لەهەمانکاتدا رژێم زیاتر بایەخی بەتورکمانەکان دەداو بەسەر کورددا شایستەیان دەکردن بەوەی مافی هاوولاتییەتیی پلە یەکیان پێدەدان، ئەمەش تەنها لەپێناو جۆشدانی قینی مرۆڤی کورد دژی تورکمان. ئەم پرۆسەیە بەکردەوەش بەری پێویستی خۆیداو ئاژاوەو کێشەی زۆری لەنێوان هەردوو نەتەوەدا دروستکرد. بەلام بەگشتی، رژێم نەیتوانی وایان لێبکات قینەبەرایەتی لەنێوانیاندا رەگ دابکوتێت و لەئەنجامدا ئەوەندەی پێنەچوو تورکمانیش خرانە لیستی دژومنانی بەعسەوەو ئەوەی بەسەر کورددا هات ئەوانیشی گرتەوە، بەتایبەتی لەدوای ساڵی ١٩٧١ەوە.

شایەنی باسە لەساڵی١٩٣٠یەوە هەتا ساڵی ١٩٦٠، برایەتیی نێوان کوردو تورکمان زۆر پتەوبوو هەتا کاتێك شەڕی نێوان شیوعییەکان و تورکمان هەڵگیرسا کەخەڵکی کورد لایەنی شیوعییەکانیان گرت. لەئەنجامدا شەڕێکی گەورە لەکەرکووك روویدا بەلام خوا رەحمی کرد ئاگرەکە زوو کوژایەوە، ئەوەی هەبوو تۆوی قینەبەرایەتی لەدڵی هەندێك توندڕەوو خەڵکی ناحاڵیی کورددا چەکەرەی کرد بەتایبەتی دوای ئەوەی هەندێك لەتورکمانەکان دەستیان لەگەڵ دەزگای میتی تورکیدا تێکەڵکرد کەئەم هەنگاوە کەلێنی نێوان کوردو تورکمانی فراوانترکرد.

ئەوەی بەڕێز سەدام حسەین لەکەرکوکی دەوێت ئەوەیە کە٨٥٪ی دانیشتوانەکەی بکات بەعەرەب دوای راگواستنی کوردو تورکمان لەم شارەو دەوروبەریدا. واقیعیش دەیسەلمێنێت کەرژێمی بەعس هەتا ئەمڕۆ توانیویەتی ٦٠٪ی باری دیمۆگرافیی ئەم شارە بگۆڕێت کە لەبەرەبەیانی مێژووەوە دروستکراوە، مێژوونووسان شایەدی ئەوەن کەدانیشتوانەکەی کوردو تورکمان و هەندێك خێڵی کۆچەری عەرەبن. جا ئەگەر حکومەتی عێراق بەو هەموو تواناو دەسەلاتەیەوە توانیبێتی بۆ زۆربەی دەوڵەتانی عەرەبی بسەلمێنێت کەزۆربەی دانیشتوانی شاری کەرکووك عەرەبن ئەوە کورد بەڵگەی بەهێزتری بەدەستەوەیە کەدەیسەلمێنێت تا ناوەڕاستی ساڵەکانی شەستەکان، واتە هەتا ئەو رۆژەی رژێمی بەعس دەسەلاتی لەعێراقدا گرتەدەست، بەژمارەی پەنجەکانی دەست خەڵکی عەرەب لەگۆڕستانەکانی کەرکووکدا نەنێژدراون. هەروەکو پێشتریش باسمکرد ئەوانە کۆچەری بوون و بەناوچەکەدا بەدوای لەوەڕ بۆ ئاژەڵەکانیان ئەم هەوارو ئەو هەواریان دەکرد، کەواتە ئایا رێی تێدەچێت شارێك، کەبابلیی و ئاشوورییەکان لەمێژووی کۆندا باسیانکردووەو لەولاشەوە ساسانییەکان بە(گرمکان) ناویان بردووەو سەرچاوە سریانییەکان بە(بین کرمای) ناوزەدیان کردووە کەئەمانەی دوایی مێژوویان بۆ دەوروبەری سەدەی پێنجەمی پ.ز دەگەڕێتەوە، دەڵێین ئایا رێی تێدەچێت بەدرێژایی سەدان ساڵ خەڵکی ئەم شارە تەنها دە کەسیان لێمردبێت و مردووەکانی گۆڕستانەکان عەرەب بووبن هەروەکو بەڕێز سەدام حسەین دەڵێت، عەرەب نامرێت. ماشەڵلا لەگەورەیی خوا، نەمری تەنها بۆ ئەوە، بێگومان شتێکی بەڵگەنەویستیشە کەدەسەلاتی ئیمپراتۆر سەدام حسەین هەر کۆتایی دێت، ئەوساکەش زۆرداری نامێنێت و هەموو ستەم لێکراوێك بەمافی زەوتکراوی خۆی دەگات، ئنجا خەڵکی عەرەب

کەماڵو زەویوزاری کوردو تورکمانیان داگیرکردووە دەست لەگونان درێژتر دەچنەوە بۆ ناوچەی خۆیانو لەئەنجامدا تەنها ئەوەی بەرەگەزو بنەچە کەرکووکی بێت دەگەڕێتەوە بۆ کەرکووكو خوای گەورەش پاداشتی ساڵانی ئاوارەییو دەربەدەریی دەداتەوە.

بەپێی ئامارە رەسمییەکانی حکومەتی عێراق، هەتا ساڵی ١٩٥٨ڕێژەی ٨٥٪ی دانیشتوانی شاری کەرکووك کوردبوونەو ١٥٪یان تورکمان بوونە. ئنجا بەپێی سەرچاوەکانی ئامار، خەڵکی عەرەبی کەرکووك عەرەبی بیابانن کەدوای دامەزراندنی حکومەتی عێراق، لەسووریاوە کۆچیانکردووەو لەناوچەی حەویجە نیشتەجێبوون. واتە ئەمانە بەرەگەز عەرەبی رەوەندن، لەوانەشە عەرەبی نیشتەجێی ناوچەکە بڵێت ئەم زەوییەم بەپارەی خۆم کڕیوە، بەڵام راستییەکەی ئەوەیە ئەو گوندانەی کەدانیشتوانە کوردو تورکمانەکەیان راگوێزدراوە، بەزەبری زۆر، عەرەبی تێدا نیشتەجێ کراوە، هەموو ئەو پارەیەش کەلەو پێناوەدا خەرجکراوە وەکو بەخشش‌ێك لەغەزنەکەی بەڕێز سەدام حسەین دەرچووە. لەگوندەکانی دەوروبەری کەلارەوە، هەر لەگوندی کوڵەجۆوە هەتا جەلەولا، لەگەڵ چەند گوندێکی دەوروپشتی خودی شاری کەرکووك کەکاتی خۆی مەکتەبی کاروباری باکوور فەرمانی توندی بەوەزارەتی ناوخۆو بەڕێوەبەرایەتی ئاسایشی گشتی کردبوو پارە بۆ ئەو مەبەستە خەرج بکەنو مەسەلەی کۆچ پێکردنی دانیشتوانەکەیو نیشتەجێکردنی عەرەب لەشوێنیاندا، ئاسان بکات، لەبنەڕەتدا ماڵی شەرعیی کوردو تورکمان بوون.

ئەی برایانی تورکمان: کێشەی ئێوە لەرێی دەزگای میتی تورکی چارەسەر ناکرێت، بەڵکو رێگەچارەی ریشەیی کێشەکەتان لای برا کوردەکانتانە، چونکە بەدرێژایی ماوەی حوکمی حکومەتە یەك لەدوای یەکەکانی عێراق، ئێوە لەسەرشۆڕیو چەوساندنەوە بەولاوە هیچی ترتان دەستنەکەوتووە، تەنانەت لەکارەساتی ٣١/ئابی ١٩٩٦، ئەو تورکمانانەی بانگەوازیان بۆ مافی رەوایان لەسەر خاكو زێدی داگیکراویان هەڵدەدا، دەسەڵاتدارێتی عێراق دەستگیریکردن ئەمەش سەرباری پەیوەندیی حزبی تورکمانی لەگەڵ بنەماڵەی بارزانی کەئەمەی دوایی پەیوەندیی توندوتۆڵی لەگەڵ حکومەتی عێراقیدا هەبووە، بەڵام هێشتا تورکمانە داماوەکان لەرەشبگیری عێراقی قوتار نەبوون.

جا ئەگەر تورکمانێك لەکەرکووك یان هەولێر بمرێت ئەوە دەزگای میتی تورکی تەرمەکەی ناگەیەنێتە گۆڕستان بەڵکو دراوسێ کوردەکانی دەینێنە بان شانیانو دەیبەن دەینێژن. هەمان باریش سەبارەت بە کوردەوە کەپێش ئەوەی دۆستو برادەرو کەسوکاری بگەنە سەری، دراوسێ تورکمانەکەی بەئەرکی سەرشان هەڵدەستێت. کەواتە بۆچی خەڵکی تورکمان کێشەکەیان لەرێی کوردەوە چارەسەر ناکەن؟ من لەو باوەڕەدام کەتورك، دەستی یارمەتی بۆ تورکمان لەپێناو چاوی کاڵیان درێژناکەن بەڵکو لەبەرئەوەیە کەلەو رێگەیەوە کفریو هەولێرو کەرکووكو تەلەعفەرو گوندەکانی دەوروپشتی ئەوشارو شارۆچکانە داگیر بکەن. جەنەڕاڵە تورکەکان کە٦٥٪ی خاکی کوردستانیان داگیرکردووە دەمیان چەشەبووە بۆ داگیرکردنی رووبەری زیاتر لەکوردستاندا. بەڵام پشت بەخواو ئیرادەی گەلی کوردستان، ئەو نیازە گڵاوەیان نایەتەدی.

لەدیدارێکدا لەگەڵ برایەکی خۆشەویستی تورکمان لەوانەی شانازی بەدۆستایەتییانەوە دەکەمو کەپابەندی سیاسی هەیە، لەبەردەم خەڵکێکی زۆردا(ئەمەش تەنها بۆ بیرخستنەوە دەهێنمەوە) پێم گوت: ئەوسا هەردوولامان لەسەرئەوە رێکەوتبووین زیندووەکەمان تەرمی مردووەکەمان بەشان بگەیەنێتە گۆڕستان، ئەمەش تەنها لەرێی ئەوە دێتەدی پەنا نەبەینەبەر یەکێك لەدەوڵەتانی دراوسێ، چونکە کەس چاوەرێی خێرو چاکە لەم دەوڵەتانە ناکات بەڵکو زیانیان بۆمان هەیە، کوردیش دەڵێت: لەکوورە نزیك بێتەوە پریشکی بەردەکەوێت، جا ئەگەر لەئاگر نزیك بیتەوە لەوانەیە دەستوپل و دەموچاوت بسووتێت، خۆ ئەگەر زیاتر خۆت پاراست لەوانەیە گڕ، تەنها جلوبەرگت بگرێتەوە، خۆ ئەگەر خۆت لەمەش پاراست ئەوە هەر دەبێت بۆنی دووکەڵت لێبێت کە بەهۆیەوە خەڵکی لێت دەبێزرێن، چونکە زۆر زەحمەتە داگیرکاری زۆردار، کەبڕوای بەکتێبە ئاسمانییەکان نییەو بایەخ بەپەرستگە پیرۆزەکان نادات، دان بەمافی گەلانی ژێردەستەیدا بنێت، مافە نەتەوەییەکانی تورکمانیش تەنهاو تەنها لەدۆسیەی کورددایە، زەمانەش ئەمە دەسەلمێنێت، ئەمڕۆ یان سبەی.

بەو برادەرە تورکمانەم گوت: دەبینم واتێدەگەن لەپێگەی پەیوەندییەکانتانەوە لەگەڵ دەسەڵاتداریەتیی تورکیدا دەتوانن نەتەوەکەتان بپارێزنو مافەکانی بێننەدی؟! کەواتە مادەم خۆتان وادەبینن ئەدی بۆچی دەسەڵاتداریەتیی تورك قایل ناکەن کەدان بەمافی ٢٣ ملیۆن کەسی کورددا بنێت لەکوردستانی باکووردا کە لەسادەترین مافیان بێبەشن ! ئەوسا ئێوە، بەم کارەتان پەیوەندییەکانی کوردو تورکمان بۆ هەتا هەتایە پتەوتر دەکەن.

بەڵام کاتێك لێپرسراوێکی حزبی تورکمانی رۆژژمێرێکی دیواری پێشکەش کردم، لەنەخشی ڕووی رۆژمێەکە موچڕکم بەلەشدا هاتو بەراستی ترسم لێ نیشت، چونکە ئەوهێمایانەی دەربارەی پارێزگاکانی کوردستان لەسەری نەخشرابوو وای بۆ بینەر رادەنواند گوایە نەتەوەی تورکمان لەکوردستانی باشووردا، زۆرینەی دانیشتوان پێکدێننو لەبەرامبەردا کورد کەمینەن. ئەم وێناکردنە زیادەڕەوییە کە لەهەمانکاتدا هەڵەکارانەیە، تەنها قینەبەرایەتیو ئاژاوەو دوژمنایەتیی لەنێوان کوردو تورکمان لێدەکەوێتەوە . ئنجا کاتێك زیاتر لەو رۆژژمێرە وردبوومەوە بینیم لەچاپخانەیەکی تورکیا چاپکراوە، ئیتر راستیی نیازو تەماعکارییەکانی تورکیام بۆ ئاشکرابوو کە لەرێی حزبی تورکمان ئیلی، تەماعی کردۆتە کوردستان، هەروەها بۆم دەرکەوت کەئەندامانی حزبی تورکمان هەرچەندە ئاکاری سیاسییان باڵاو پاك بێت بەڵام گوێ لەمستی دەزگای میتی تورکینو لەبەرامبەریاندا دەسەڵاتی مێرووله‌یەکیان نییە.

لەو وتوێژەدا لەگەڵ ئەو برادەرە تورکمانییەدا گوتم کە بەپێی ئامارەکانی توماری دەزگای میتی تورکی، نزیکەی(٣) ملیۆن تورکمان لەکوردستانی باشووردا هەن، ئەم ژمارەیەشم لەرێی کۆمەڵەی خاچی سووری تورکی دەستکەوت کاتێك خێزانە کوردەکانی بەناوی تورکمان تۆمارکردبوو ئەوەش بۆ ئەوەی خۆراکیان بەسەردا دابەش بکات. جا لەرێی ئەم ئامارە هەڵانەوە، دەزگای میتی تورکی هەوڵدەدات کوردستان، وەکو قوبروس داگیرو کۆنترۆڵ بکات لەکاتێکدا ئەم کۆمەڵەیە (خاچی سووری

تورکی) خۆی چاك دەزانێت کەئەو خێزانە کوردانەی بەتورکمان تۆماری کردوون، لەپێناوی بژێو، خۆیان بەتورکمان ناونوسکردووە. جا ئەگەر بێتو ڕۆژێك لەرۆژان ئامارێکی ڕێکوپێك لەکوردستاندا جێبەجێبکرێت دەبینین کەئەو ژمارە خەیاڵییە دێتە سەر ژمارەیەکی زۆر بچووك، ئەمەش مشتومڕ هەڵناگرێت چونکە واقیعی حاڵ ئەمە دەسەلمێنێتو بەری ڕۆژیش بەبێژنگ ناگیرێت.

ئەو خۆراکەی هێنرایە کوردستانو ویژدانی چەند کوردێکی پێکڕدرا، بایی(١٣) ملیۆن دۆلار بوو کەرێکخراوی خاچی سووری نێودەوڵەتی بۆ کرودستانی تەرخانکردبوو بەلاّم دەزگای میتی تورکی دەستی بەسەر ٥٠٪ی ئەو پارەیەدا گرت و بەناوی چەند کەسێکەوە ئەسپاردەی چەند بانکێکیکرد، ئەوەی گەیشتە دەستی ئێمەی کوردیش بەرماوەکەبوو. جا ئەگەر بنەماڵەی بارزانی دەستی بەسەر ماڵو سامانی کورددا نەگرتایەو نەبوایەتە مایەی داڕماندنی ئابووریی کوردستان ئنجا تێکدانی بارودۆخی ئەمنیی هەرێمی کوردستانو لەدەستدانی باری ئارامیو قەوارەی کوردی، ئەوە دەزگای میتی تورکی نەیدەتوانی چاو ببڕێتە خاكو سامانی کوردستانو، لەئەنجامدا خاکمان نەدەبوو بەشانۆی دەوڵەتانی ناوچەکەو بەمانۆڕە سەربازییەکانیان لەکوردستاندا تەڕاتێن بکەن. جا بەدڵ تکام لەو برادەرە تورکمانەم کرد کەبەراستی کار بۆ ئەم مەسەلانە بکات بەشکو بارودۆخەکە یارمەتی بداتو دەستی هەبێت لەرزگارکردنی گەلی کوردستان لەسەرشۆڕی.

**دووبەرەکیو ئاژاوەنانەوە لەنێوان دانیشتوانی هەولێرو سلێمانی**

لەوەتەی حزبی بەعس لەعێراقدا دەستەلاّتی گرتۆتە دەست، پەیوەندییەکانیان لەگەڵ جەنەڕاڵەکانی تورکیادا لەچڵەپۆپەدایە . هەردوولا دەربارەی چۆنیەتیی سەرکوتکردنی بزووتنەوە کوردییەکان، لەهەرکوێیەك بن، تەبان، ئەوەش لەپێناو دەستەبەرکردنی ئارامیو ئاسایشی سنووری نێوان خۆیان ئنجا بۆ چەوساندنەوەی کورد. لەهەمان کاتدا حزبی بەعسو جەنەڕاڵەکانی تورکیا لەسەر ئەوەش ڕێککەوتوون کە لەدامودەزگاکانی ڕاگەیاندنیاندا باسی تورکمان نەکەن کەکەمینەیەکی نەتەوەیین لەعێراقدا، بەلاّم دەستەلاّتداریەتیی عێراق کەوتۆتە بایەخدانێکی زۆر بەتورکمانەکانی ناو هەولێر هەرچەندە ئەوانە زۆربەیان بەزمانی زگماکی خۆیان نادوێن بەڵکو زمانی عەرەبی بەسەریاندا زاڵە سەرباریشی، ڕژێمی عێراق یانەیەکی بۆ کۆبوونەوەو کات بەسەربردن بۆیان تەرخانکردووە بەناوی یانەی برایەتیی تورکمانی، سەبارەت بەخوێندنیشیان لەخوێندنگەکاندا ئەوە بەزمانی عەرەبی بوو.

پێڕەوکردنی سیاسەتێکی نەرم هەروەها چاووڕاو لەگەڵداکردنو پاشان تەمای دارایی، گشت ئەمانە لەدوای ئاشبەتاڵی ساڵی ١٩٧٥وای لەخەڵکی هەولێر بەگشتیو تورکمانەکانیان بەتایبەتیکرد، کە بەئاشکراو بەژمارەی زۆر بچنە ڕیزی حزبی بەعسەوە. هەندێکیان ئەمەیان لەپێناو بەدەستهێنانی پلەوپایەکرد بۆیە دەستیاندایە پێشبڕکێ لەگەڵ پارێزگاکانی تر بۆ خزمەتکردنی حزبی بەعسو ملکەچکردن بۆ سەرکردایەتیی ڕژێم کەخۆی لەبەڕێز سەدام حسەیندا دەبینێتەوە کەتووشی لەخۆبایی بوونو خۆبەزلزانین بووە. چونکە هەرکەسێك شیعرێکی پێداهەڵبڵێت یان گۆرانییەکی بەسەردا بڵێت یەکسەر بە(١٥٠) دینار پاداشت دەکرێت، بۆ نموونە گۆرانیی (زێڕە)ی لەمەڕ هەولێر کە

لەدامودەزگاکانی راگەیاندنی رژێم بەردەوام لێیاندەدایەوە کێشەیەکی گەورەی بۆ خەڵکی سلێمانی نایەوە، چونکە بینییان دامودەزگا ئەمنییەکان داوایان لێدەکەن گۆڕانییەکی بەهێزتر بۆ بەشان‌وباڵی سەرۆکدا هەڵدان بڵێن، لەهەمانکاتدا ئەمە بووە مایەی نیگەرانیی زۆر لای کوردە نیشتمانپەروەرەکان لەهەموو جێیەکدا، ئنجا دامودەزگا ئەمنییەکان دەستیاندایە دووبەرەکی نانەوە لەنێوان دانیشتوانی هەردوو شار (هەولێرو سلێمانی) کە لەئەنجامدا لەهاوینەهەوارو سەیرانگاو تەنانەت لەرێوبانەکاندا، قڕەو هەراو ئاژاوەی لەنێوان خەڵکی هەردوو شاردا لێکەوتەوە. بەداخیشەوە ئاسەواری ئەم بارە نالەبارە هەتا ئەمڕۆ بەردەوامەو بەزەقی دەبینرێت، بەتایبەتی لەشاری سلێمانی.

ئەوەی دوای ئەوە بۆم دەرکەوت و موچڕکی بەلەشمدا هێنا، سەرنجمدا تەماعکارییەکانی حکومەتی عێراق زۆر فراوانتربوون و کەوتنە بیرکردنەوە لەوەی شاری هەولێر وەکو کەرکووك تەعریب بکەن، ئەوەبوو رژێم دەستیدایە ئاسانکاری بۆ هاوولاتییانی دانیشتووی شاری مووسڵ و دەوروبەری کەخانوو زەوییوزار لەشاری هەولێر بەکرن و لەوێ کاسبی بۆ خۆیان بدۆزنەوە، لەبەرامبەریشدا کەوتە ئاسانکاری بۆ هاوولاتیی کوردی دانیشتووی هەولێر کەبۆ هەرکوێ بیەوێت باربکات و کورد بۆ هەولێر بارنەکات. ساڵی ١٩٨٩ لەگەڵ ئەو هەموو هەوڵ وتەقەلایەم (بەحوکمی پەیوەندییەکانم) کەدام بۆ وەرگرتنی مۆڵەت بۆ گواستنەوەی کەلوپەلی ناوماڵم لەسلێمانییەوە بۆ هەولێر کەچی هەوڵەکەم شکستی خوارد، ئیتر دوای ئەوە زانیم کەئەم تەگبیرە بەفەرمانی بڕیارێکی مەکتەبی کاروباری باکوورەو بۆ ئەوە دانراوە کەرێگە بەهاوولاتیی کورد نەدرێت بۆ شاری هەولێر باربکات.

راستیان گوتووە ئەوەی لای بەندە خەیاڵە، لای خوا بەتاڵە، چونکە ئەگەر رژێمی عێراق جەنگی کەنداوی هەڵنەگیرساندایە ئێستا دەستی تەعریب گەیشتبووە شاری هەولێری دێرین، بەلام خوای گەورە بەزەیی بەکورددا هاتەوە.

**کوردو رێکخستنەکانی حزبی بەعس**

رێکخستنەکانی مەکتەبی سیاسی گرووپی بەڕێز مام جەلال(لەشەستەکاندا) رۆڵێکی دیاریان هەبوو لەوەی کورد نەچنە ریزی رێکخستنەکانی حزبی بەعس مەگەر بەژمارەیەکی کەم، هەتا دەرچوونی بەیاننامەی ١١ی ئازاری ساڵی ١٩٧٠ کاتێك سەرکردایەتیی پارتی، لەگەڵ سەرکردایەتیی حزبی بەعسدا رێککەوت بەناوی نزیکبوونەوەی رێکخستنەکانی هەردوو حزب لەپێناو چەسپاندنی برایەتی و پەیوەندیی دۆستایەتی لەنێوان هەردوو گەلی کوردو عەرەبدا. دوای ئەوە حکومەتی عێراق کەوتە بەکارهێنانی هەموو جۆرە گوشارێك بۆ ئەوەی کورد بچنە ریزی حزبی بەعسەوە، ئنجا دۆسیەیان بۆ هەموو ئەندامانی رێکخستنەکانی پارتی کردەوەو چەند ئەندامێکی کاراو چالاکی عەرەبی بەعسییان هەڵبژارد کەهەوڵبدەن زۆرترین ژمارە لەئەندامانی پارتی، بکەن بەبەعسی. لێرەدا کەمتەرخەمی نواندنی بنەماڵەی بارزانی بەرامبەر کادیرە حزبییەکانی پارتی لەدوای ئاشبەتاڵی ساڵی ١٩٧٥ گورزێکی کوشندەی بەگەلی کوردستان گەیاند کە لەئەنجامدا خەڵکێکی کەم لەئەندامانی پارتی لەو داوەی بەعس رزگاریان بوو.

چالاكیی شارەزایانەی كادیرە بەعسییەكان بۆ ڕێكخستنی خەڵكی كورد لەریزی حزبی بەعسدا گەیشتە لووتكە، ئیتر وای لێهات لەهەموو جێیەك لەدەرگای ماڵی هەموو كوردێكیان دەدا، بەڵام خوای گەورە، ستەمكارانی كرد بەگژ یەكتردا. ئەوەبوو سەدام حسەین كەوتە گیانی هەركەسێك كە لەكوردستاندا خراپەی كردووە، یان هەندێكی زیندانی كرد یان دووری خستنەوە یان لەماڵی خۆیاندا دەستبەسەریكردن، وەكو تاوانكاری زۆردار شوكری حەدیسی كەبۆی نەبوو لەدەرگای حەوشەی ماڵی خۆی بترازێت، كەناوبراو یەكێك بوو لەوانەی ڕێكخستنی حزبی بەعسی هێنایە سلێمانیو ڕۆڵێكی گەورەی لەبڵاوكردنەوەی حزبی بەعس لەناو گەلی كوردستاندا بینی.

جا ڕێكخستنی حزبی بەعس، لەبەرئەوەی ئاواتی كورد بەدی ناهێنێتو بەزۆر بەسەریدا دەسەپێنرێت ئیتر ئەندامی كورد، دوای ماوەیەك بەجێی دێڵێت. ڕێكخستنی حزبی بەعس ڕێكخراوێكی سەركوتكەری تیرۆریستە كار لەدژی هەموو بزاڤێكی شۆڕشگێڕی نیشتمانیو ڕزگاریخواز دەكات، ئەوەش لەپێناو كۆنترۆڵكردنی دەوڵەتانی دراوسێ، هەروەها ئەگەر بۆی لوا جیهانیش داگیردەكات. تەنها ناونیشانی ئەم حزبە بەسە بۆ ئەوەی هەركوردێك لەڕێكخستنەكانی دەربكات با ماوەیەكی زۆریش ئەندامی بێت.

بەڕێز سەدام حسەین كەئەو ژمارە خەیاڵییانەی بۆ دەچوو دەربارەی ئەو كوردانەی چوونەتە ریزی حزبی بەعسەوە لەخۆشییان وەختەبوو شاگەشكەبێت، نەیدەزانی یان خۆی لەوە گێل دەكرد كەئەمانە، ئەمڕۆ بێت یان سبەی هەر لەخاكی كوردستانیش دەریاندەكەن، ئەوەبوو ڕاپەڕینی بەهاری ١٩٩١ ڕوویداو بەچاوی خۆمان بینیمان بەعس چی بەسەرهاتو ئەوەی كورد بەسەر بەعسیدا هێنا، با بەدەواری شڕی نەكردووە.

جارێكییان بەڕێز سەدام حسەین سەرسوڕمانی خۆی دەربڕی كاتێك گوتم من بەعسی نیم. چونكە ئەو بەتەمابوو من پلەیەكی گەورەی حزبیم لەریزی ڕێكخستنەكانی حزبی بەعسدا هەبێت. بەڵام من هەرچەندە لەگەڵ دامودەزگا ئەمنییەكانی بەعسدا كارم دەكرد ئەوەی هەبوو لەرووی ڕێكخستنەوە بێلایەن بوومو ئەوەی بەتەمابوایە بچێتە ریزی دامودەزگا ئەمنییەكانەوە بەرهەڵستیم دەكردو نەمدەهێشت ئەوەبكات، بەڵكو دوای ئەوەی لەسەر داواكەی هەتەر دەبوو، دەمبرد بۆ بارەگایەكی حزبی بەعس تاببێتە بەعسی. بەڵام سەرباری هەموو ئەمانە ٩٨٪ی ئەو كوردانەی ببوون بەبەعسی، لەكاتی ڕاپەڕینی ١٩٩١دا دژی حكومەتی عێراق وەستان.

سەرەتا خەڵكێكی زۆر لەكورد چوونە ریزی ڕێكخستنەكانی حزبی بەعسەوە، ئەمانە تێیاندابوو لەهەڵگیرسانەوەی شۆڕشێكی نوێی كورد لەدوای ئاشبەتاڵ، تەمابڕاو ببون، هەندێكیان وای بۆ دەچوون كەهاوكاریكردنی دامودەزگا ئەمنییەكان جگەلەوەی بژێوی مسۆگەر دەكات لەهەمانكاتدا گێچەڵ پێكردنو بەڵای ڕژێمیشی لێدووردەخاتەوەو خۆیو خێزانی پارێزراو دەبن. هەندێكی تر كەعەوداڵی پارەو دەسەڵات بوو، بینی دەست تێكەڵكردن لەگەڵ دامودەزگا ئەمنییەكاندا كورتترین ڕێگەیەكە ئەو ئامانجانەی بێنێتەدی. بەڵام ئەوەی لەهەموو جۆرەكانی تر نالەبارتربوو ئەوەبوو كەكاتێك چووە ریزی

دامودەزگا ئەمنییەکانەوە وەك سەگی هاری لێهات بەربووە گیانی کورد. هەشبوو بەسەربەرزی مایەوەو ملی بۆ رژێم دانەخستو هەتادوا هەناسە بەرگری کردو ژیانی خۆی لەپێناو کوردو کێشەی رەوای گەلەکەی بەختکرد. ئەوەی راستیش بێت ئەم جۆرەی دوایی، خودی دەسەلاّتدارانی رژێمیش سەریان لێیان سوورِما، چونکە مرۆڤی نیشتمانپەروەرو سەرکەش وەکو خۆر وایە، پرشنگی لەکەس شاراوە نییە مادەم رێگەی راستی گرتۆتەبەر. بۆ نموونە دوای ئاشبەتالّ، وەکو نوێنەرێکی دەولّەت چاوم بەو سەرکردەو سیاسەتمدارانە دەکەوت کەدەگەرِانەوە بۆ عێراق، یەکێك لەوانە تێکۆشەری خوالێخۆشبوو سالّح یووسفی بوو کە لەئوتێلی کیلۆپاترە چاوم پێکەوت، لەو دیدارەدا رەحمەتی ئەوەندە توند بوو دەتگوت نوێنەری ئەو شۆرِشەی کوردە کەهێشتا ئاشبەتالّی پێنەکراوەو بۆ ئەوە هاتووە رێککەوتنێك دەربارەی چارەسەرکردنی دۆزی کورد سازبدات.

گفتوگۆکانم لەگەلّ شەهید سالّح یووسفی بەدووروودرێژی بۆ بەرِێوەبەری ئاسایشی گشتی گێرِایەوە، حەپەسانم زیاتربوو کاتێك گوێم لەبەرِێوەبەربوو گوتی: ئەگەر سالّح یووسفی لەجێی مەلا مستەفا دەبوو ئەمە بەسەر کورددا نەدەهات بەلاّم تازە کار لەکار ترازاوە، چونکە دوای رووخانی شۆرِش ئیتر ئەم پیاوە لەتوانایدا نییە ئەوەی رماوە هەلّیبسێنێتەوە.

دەربارەی پالّەوانی کۆچکردوو عەلی عەسکەری، بەرِێوەبەری بەشی سیاسی لەبەرِێوەبەرایەتیی ئاسایشی گشتی دوای ئەوەی دیدارێکی لەگەلّ خوالێخۆشبوودا سازدا گوتی: ئەم پیاوە بەراستی شایەنی رێزلێنانە، ئەگەر ئەم سەرۆکی بزوتنەوەی کورد بوایە، بەهۆی توندییەکەی زۆر زەحمەت دەبوو گفتوگۆی لەگەلّدا بکرێت، بەراستی شایەنی رێزە.

بەرِێوەبەری ئیستخباراتی سەربازیش دەربارەی شەهید دکتۆر خالد حەمە سەعید گوتی:ناردبووم بەشوێن خالد حەمە سەعیددا کەچەند پرسیارێکی لێبکەم، بەلاّم سەیرمکرد بەرامبەر ئەو کەسایەتییە بەهێزەی‌و برِوای پتەوی بەکێشەکەی، ناچارم رێزی لێبگرم، بۆیە راپۆرتێکم دەربارەی بیرورِایەکانی بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد بەرزکردەوە، لەدلّی خۆشمدا وام لێکدایەوە کە جوان نییە جارێکی تر بەدوویدا بنێرمەوە بەلّکو پێویستە بەخۆم بچم بۆ مالّی یان بۆ شوێنی کارەکەی..

دەربارەی ئەندامەکانی سەرکردایەتیی کۆمەلّەی رەنجدەرانیش کەحوکمی لەسێدارەدانیان دەرچوو، دادوەری لێکۆلّینەوە پێمی گوت: ( کاکە رەفیق لەنێوان خۆماندا بێت، ئەم تاقمە شایەنی لەسێدارەدان نین، پیاو هەرئەوەندەی لەدەست دێت شانازی بۆ ئەو رۆشنبیرییە فراوانەو گیانی شۆرِشگێرِییەیان بکات، برِواشم پێبکە بەش بەحالّی خۆم زیندانیشیان پێ‌رەوا نابینم‌و ئەوەی لەتوانامدا بێت دەیکەم بۆ رزگارکردنیان، چونکە ئەمانە سوودیان بۆ گەلی کوردستان دەبێت. لەبارەیانەوە قسەم لەگەلّ بەرِێز بەرِێوەبەری گشتی‌کردووە کەچی گوتی: کێشەکەیان بەدەست بەرِێز جێگری سەرۆکە... تەنها ئەو برِیار لەسەر چارەنووسیان دەدات .

خوێنەری بەرِێز سەرنجی ئەم هاوسۆزییەی دەسەلاّتداران بدە بەرامبەر ئەو بەناو تێکدەرانە، لەلایەن کێشەوە؟ دادوەرێکی لێکۆلّینەوەی ئاسایش بەو شێوەیە باسی شەهاب‌و جەعفەرو هاورێکانیان دەکات،

ئەمەش تەنها لەبەر ئەوەبووە کەگیانی نیشتمانپەروەریو فیداکاری لەپێناو گەلی کوردستان لەناو ئەوانەدا بینیوە دوور لەهەر جۆرە دەست تێکەڵکردنو خیانەتکارییەك...جا ئازایەتیو جوانمەردی لەهەموو ئانو سەردەمێکدا جێی خۆی لەهەموو دڵێکدا کردۆتەوە.

وەزارەتی ئەوقاف

هەمیشە تەنسیق لەنێوان وەزارەتی ئەوقافو خەیروڵلا تلفاحدا هەبووە چونکە ناوبراو هەرچەندە وەزیری ئەوقاف نەبوو، بەلام هەمیشە ئاگاداری وردودرشتی کاروباری ئەم وەزارەتە بووەو لەبارەی ڕاپەڕاندنی ئیشوکارە جۆربەجۆرەکان، تەنها قسەی ئەمی دەخوارد.

وەزارەتی ئەوقاف هەندێك جار خەیروڵلا تلفاحی لەوە ئاگادار دەکردەوە کە ئەو مەلایانە ئاشکرا دەکات کەهاوکاریی ڕژێم دەکەن، ئەوەش بەوەی بەئاشکرا پێیان دەڵێت : ( تۆ سەر بەئێمەیت)، تەنانەت جارێکیان مەلا عەلی عەبدولعەزیز، لەوەزارەتی ئەوقاف شکاتی لێکردبوو کەدەبێتە مایەی ئاشکراکردنی لەناو جەماوەردا. جا ئەو مەلایەی ملی بۆ فەرمانەکانی ڕژێم دادەخست خەیروڵلا تلفاح بەشێخ ناوی دەبردو دەیگوت: ( ئەو مەلایەی شەرم لەمێزەرە سپییەکەی نەکات دەبێت ئاشکرا بکرێت). مەلاکان دەبوایە هاوکاری ڕژێم بکەن، ئەوەی وتاری هەینی هەبوایە دەبوایە هیچ نەکات هەتا وتارەکەی بەچاپکراوی لەلایەن بەعسەوە بۆ دەهات کەدامودەزگا ئەمنییەکان سەرپەرشتی ئەم کارانەیان دەکرد.

زۆرم دەربارەی بەیاننامەی ١١ی ئازاری ١٩٧٠ نووسیوە (بڕوانە هەرسێ بەرگی کتێبەکەم: کورد دژمنی خۆت بناسە) بەلام دوای هەڵگیرسانەوەی شەڕ لەنێوان دەسەلاتداریەتیی عێراقو سەرکردایەتیی شۆڕشدا(١٩٧٤)، ئەلبەکرو سەدام کەوتنە کارکردن بۆ قایلکردنی گەلی کورد بەوەی گوایە ئەو شەڕە، دژی دەستەیەکی تێکدەرەو ئەوانیش (حزبی بەعس) دان بەسەرجەم مافە ڕەواکانی گەلی کورددا دەنێن، بۆیە دەستیاندایە دامەزراندنی ناوەندو دەزگاکانی بەناو ئۆتۆنۆمی کە بەلایانەوە خۆی لەهەردوو ئەنجومەنی یاسادانانو ڕاپەڕاندن(المجلس التشريعي والمجلس التنفيذي)دا دەبینییەوە، هەروەها چەند وەزارەتێك بۆ کورد دابنرێت بەوەی کەسایەتیی بەرەگەز کورد بیگرنە دەست. دەربارەی ئەو وەزیرانە، لەگەڵ داوای لێبوردندا دەڵێم ئەمانە لەڕووی خزمەتکردنی کوردێکی نیشتمانپەروەریش دەستەوسان بوون، وەك ئەوەی نیشتەجێی بکەن یان بژێوی دەستەبەر بکەن، یان بۆ نموونە لەفەرمانگەیەکدا دایمەزرێنن، یان تەنانەت کوردێکی نیشتمانپەروەر لەزیندانو گرتووخانەکانی بەعس ئازادبکەن، بەلام لەهەمانکاتدا هەمیشە دەستی بالایان هەبووە بۆ وێرانکردنی هەر گوندێکی کوردستان لەبەر هەر هۆیەك بێت، یان فەرمانـدان بەجێبەجێکردنی حوکمی لەسێدارەدانی دەیان کەس لەڕۆڵە بەشەرەفەکانی کوردستان. لەولاشەوە ئەندامانی ئەنجومەنی یاسادانانو ئەنجومەنی ڕاپەڕاندن، پالاوتنو هەڵبژاردنیان بەفەرمانی مەکتەبی کاروباری باکوورو تەزەکیەی دامودەزگا ئەمنییەکان بوو هەرچەندە هەندێك لەو ئەندامانە هەوڵیاندا مل بۆ ئەو دامەزراندنە نەدەن، بەلام کێ پرکێشی دەکات فەرمانی بەڕێز جێگر( سەدام حسەین) بشکێنێت، چونکە ئەوکاتە ڕێککەوتنێك لەنێوان حزبی شیوعیو حزبی بەعسدا هەبوو کەبەرەیەکی هاوبەشیان پێکهێنابوو، بۆیە ژمارەیەکی زۆر لەشیوعییە کوردەکان، بوون بەئەندامی

ئەنجومەنی یاسادانان و ئەنجومەنی راپەڕاندن کە لەگەڵ ڕێزی زۆرم بۆیان، ئەوانیش وەکو وەزیرە کوردەکان، لەرووی خزمەتکردنی رۆڵەکانی گەلی کوردستان دەستەوسان بوون و خاک بەدامەنی ئەوەی ئارەزووەکانی حزبی بەعسی پشتگوێ دەخست یان فەرمانێکیانی جێبەجێ نەکردایە. بۆ نموونە رژێمی عێراق، خوالێخۆشبوو شاکر فەتاحی تەنها لەبەرئەوە کوشت کەشتێکی گوتبوو بەدڵی حزبی بەعس نەبوو. یان شێخ ئەحمەدی نەقشبەندی، سەرۆکی ئەنجومەنی یاسادانان، بەهۆی کەمتەرخەمیکردن و ملنەدانی بۆ ئارەزووەکانی حزبی بەعس لەکۆڕێکی رۆژنامەوانیدا کەبۆی گیرابوو، بەپلەی تێبینەر خانەنشین کرا. ئنجا پێویست ناکات بڵێم وەزیرەکان یاخود بریکارەکانیان یاخود کارمەندەکانی هەردوو ئەنجومەنی یاسادانان و راپەراندن کەدەستیان لەگەڵ دامودەزگا ئەمنییەکاندا تێکەڵبوو لەوان باشتر بوون چونکە هەموو خۆشی و رابواردنێکی ئەم دنیایەیان بۆ مسۆگەر کرابوو بەڵام رێزو سەربەرزیی خۆیان دۆڕاندبوو.

**ئەو کوردانەی هاوکاری رژێم بوون**

دوای رووداوەکانی کوردستان وەکو راپەڕینی بەهاری ١٩٩١و کۆڕەو، هەروەها دیاریکردنی ناوچەی ئارام و دانانی هێزی هاوپەیمانان لەئەنچەرلیك، پاشان هەڵبژاردنی پەرلەمان(١٩٩٢/٥/١٩) و پاشتر و لەهەمان ساڵدا پێکهێنانی حکومەتی هەرێمی کوردستان، هاوکارو دەستوپێوەندەکانی رژێم لەخەڵکی کورد، بوون بەچوار بەشەوە:

١ . ئەوانەی لەسەر خەیاڵ دەژیان و چاوەڕێیان دەکرد بەعس بگەڕێتەوەو دەست بەسەر کوردستاندا بگرێتەوە، ئەمەش بۆ ئەوەی پلەوپایەی ئەوسایان دەست بکەوێتەوە کەئەمانەش لەلای خۆیانەوە سێ جۆر بوون:

ا ـ ئەوانەی دەستیان بەخوێنی شەهیدانی رێگەی رزگاریی کوردستان سووربوو.

ب ـ ئەوانەی فەرمودەکەی خوای گەورەیان بەسەردا دەسەپێت کە لەقورئاندا فەروویەتی ﴿ واذا لقوا الذين امنوا قالوا امنا واذا خلوا الى شياطينهم قالوا انا معكم انما نحن مستهزءون ﴾ (البقرة: ١٤)، چونکە ئەمانە هەلومەرجێکیان بۆ خوڵقاوە لەگەڵ تەماعکارییەکانیاندا ناگونجێت کەتەنها بەکۆکردنەوەی پارە کۆتایی نایەت. ئەمانە توانیویانە هاوسەنگییەکی نابەرامبەر پێکبێنن، ئەوسا بەرێژەی ٨٠٪ هاوکاریی دامودەزگا ئەمنییەکانیان دەکردو بەرێژەی ٢٠٪ پەیوەندییان لەگەڵ بزووتنەوەی کوردیدا هەبوو کەدەیانویست نەکەونە کێشە لەگەڵ شۆڕشداو ئەویش دژایەتی نەکردن. جا هەموو هۆشمەندێك چاك و خراپی بۆ جیادەکرێتەوە.

ج . ئەوانەی لەدامودەزگاکانی ئۆتۆنۆمیدا پۆست و پلەی ئیدارییان گرتە دەست، ئەمانە تەنانەت ئەگەر بزووتنەوەی کوردیش لێبوردنیان بۆ دەربکات بەڵام گەلی کوردستان خۆشی ناوێن، چونکە ئەم تاقمە بۆ ماوەی چەند دەهەیەك، لەبەرامبەر ئێش و ئازارەکانی گەلی کوردستاندا بێهەڵوێست بوون و شتیان لێبینراوە کە لەبیر ناچێتەوە.

٢ ـ ئەوانەی کوردستانیان لەترسان بەجێهێشت نەبادا دەستی تۆڵەی کۆمەلآنی خەڵکی کوردستان بیانگاتێ لەپای ئەو تاوانانەی ئەنجامیان دابوو.

ئەمانە ناوبەناو دەگەڕێنەوە بۆ کوردستان بۆ سەردانیی کەسوکاریان، بەلآم وەکو غەریبە وان، چونکە هەرچەندە ڕێزی شایستەی میوانیان لێدەنرێت(چونکە مافی پەنابەرییان لەهەندەران وەرگرتووەو پارەدارن) بەلآم خەڵك ئەو بایەخەیان پێنادات.

٣ ـ ئەوانەی بەئارامیو هێمنی لەکوردستاندا دەژینو کۆمەلآنی خەڵکی کوردستان ئەوپەڕی ڕێزی شیاویان لێدەنێت لەسۆنگەی ئەو خزمەتانەی لەرۆژانی سەختدا پێشکەشیان کردن لەکاتێکدا ئەوان لەلووتکەی دەسەلآتیاندا بوون، ئەمانە ئێستا هەندێکیان لەبازاڕ کاسبی دەکەنو هەندێکی تریان لەدامودەزگا رەسمییەکانی حکومەتی هەرێمدا پۆستی ئیدارییان بەدەستە.

٤ ـ جۆرێکی ترمان هەیە کەئەگەر دەسەلآتیان هەبێت ئەوە لەدڕندەییدا وێنەیان نییە، خوا پشتیان نەدات. ئەمانە بەپێی فەرمانەکانی دامودەزگا ئەمنییەکان لەکوردستاندا ماونەتەوەو وەکو رۆبۆت فەرمانی ئەوان جێبەجێ دەکەن، نە هەستی نیشتمانییان هەیە نە هەستی مرۆیی، ئامادەن هەموو فەرمانێکی رژێم جێبەجێ بکەن ئەوەش لەپێناو سێ شت:

ا ـ ئارەزووی بێسنووریان بۆ کۆکردنەوەیماڵو سامان بەزووترین کات.

ب ـ مێژوویەکی ئەوەندە رەشو رسوایان بەرامبەر گەلی کرودستان هەیە کە لەتاریکیدا( وەکو شەمشەمەکوێرە) نەبێت هەڵناکەن، چونکە ئەمانە رووناکیی ئازادی، کوێراییان دادێنێت بۆیە هەمیشە دژی ئازادینو لەگەڵ کۆمەلآنی ئازادیخوازی کوردستاندا نایانکرێت.

ج ـ یەکێك لەرێوشوێنەکانی دەزگای موخابەرات دوای دەستگیرکردنی کەسێك یان خزمێکی ئەوکەسە، بادانی باڵیەتی، بەشێوەیەك کەزیرەکانە تەگبیری بۆ دەکرێت بێئەوەی لەخوابترسن یان شەرم لەخۆیان بکەن، دەبینین کاری وای بەسەر دێنن کەئێش بەدڵی بگات تاخواستەکانیان بێنێتەدی... بەلآم لەخوا بەزیادبێت ژمارەی ئەو کوردانەی هاوکاریی دامودەزگا ئەمنییەکان دەکەن، بەپەنجەی دەست دەژمێردرێن.

ژمارەیەکی کەم لەکادیرانی بەعس(عەرەب) هەبوون کە بەراستی خزمەتی گەورەیان بەکورد گەیاندو هەوڵیاندەدا کێشەی کوردی چارەسەر بکەن، بەلآم دوای ساڵی ١٩٧٤ کاتێك سەدام حسەین دۆسیەی کوردی گرتە دەست هەموو ئەوانەی لەدەسەلآت دوورخستەوەو هەندێکی دەستبەسەرکراوەو ئەوەی تر پۆستێکی گەورەی بەدەستە بەلآم بێئەوەی هیچ دەسەلآتێکی هەبێت چونکە لەفەرمانگەیەکدا لێپرسراوی کارگێڕییە!

دوای رزگارکردنی جەزائیر، ئەوانەی هاوکاریی رژێمی کۆلۆنیالیستیان کردبوو و هەڵوێستی خیانەتکارانەیان هەبوو ولآتیان بەرەو فەڕەنسا بەجێهێشت کەتا ئەمڕۆ گیروگرفتێکی گەورەیان پێکهێناوە لەمیانەی پەیوەندییەکانی نێوان جەزائیرو فەڕەنسا بۆ گێڕانەوەیان بۆ جەزائیر.

ئەوساوئێستاشی لەسەربێت، دووبەرەکی‌نانەوە کاریگەرترین چەك بوو کەحوکمەتە یەك لەدوای یەکەکانی عێراق دژی گەلی کوردستان‌و بزاڤە رزگاریخوازییەکەی بەکاریان هێنابێت. هاوکات زۆر هۆکار پاڵیان بەهەزاران کوردەوە ناوە کەبۆ دەرەوەی ولاّت کۆچ بکەن، ئێستاش کەیازدە ساڵ بەسەر هەڵبژاردنی پەرلەمان‌و دامەزراندنی حکومەتی هەرێمی کوردستاندا تێپەڕیوە کەچی کۆچکردن هێشتا بەردەوامە، ئەوانەش کەبیر لەگەڕانەوە بۆ کوردستان دەکەنەوە، بەپەنجەی دەست دەژمێردرێن. تۆبڵێی کاتی ئەوە نەهاتبێت ئاوارەکانمان بیر لەو هەلومەرجە نوێیەی کوردستان بکەنەوە دوای کۆتایی هاتنی دەسەلاّتی سەدام حسەین؟ ئایا بیریان لەکەشی گونجاو نەکردۆتەوە کەئارەزووی ئاوارە بێنێتەدی‌و وای لێبکات بگەڕێنەوە بۆ ولاّت؟ من وای دەبینم گۆڕانکاریی دەسەلاّت لەعێراقدا، تەنهاو بەپلەی یەکەم خزمەت بەهاوولاّتیی چەوساوەی کورد دەکات کەلەوەتەی بووە خەبات دەکات، لەهەمانکاتدا زیان بەتەنها بەتاوانکارانی جەنگ دەگەیەنێت کەبوون بەمایەی چەرمەسەری‌و دەربەدەری بۆ کورد، ئەمانە رۆژیان دێت‌و هەروەکو حەزرەتی لووط پێغەمبەر فەرمویەتی: ﴿ الیس الصبح بقریب ﴾!

دوای ئەو گۆڕانکارییانەی لەئێران هاتنەدی بەهۆی رووخانی دەسەلاّتی شا لەئەنجامی شۆڕشی مەزنی ئێران، ئەو کوردە ناودارانەی لەئێران دەژیان گەڕانەوە عێراق‌و لەلایەن دەسەلاّتداریەتیی عێراقەوە بەپێزانین‌و رێزلێنانەوە پێشوازییان لێکرا. دوای راپەڕینی بەهاری ۱۹۹۱ یش لەکوردستانی باشوور، بەشێکی تریان گەڕانەوە بۆ کوردستان‌و خودی بەڕێز مەسعوود بارزانی بەوپەڕی رێزلێنانەوە پێشوازیی لێکردن، بەلاّم یەکێك لە دوژمنە سەرسەختەکانی کورد کەنەگەڕایەوە بۆ کوردستان، عەبدولوەهاب ئەتروشی‌بوو.

دەربارەی ئەو ناپاکە بەکرێگیراوانەی کورد کەکار بۆ موخابەرات دەکەن‌و بۆ هەل دەگەڕێن زیان بەکوردستان بگەیەنن، زەحمەتە بناسرێن‌و ئاشکرا بەکرێن مەگەر بەرێکەوت یان بەلێهاتوویی پیاوانی ئاسایش کەخۆیان بۆ خزمەتکردنی کوردستان تەرخانکردووە یان لەڕێی سەرانیانەوە، بۆ نموونە کە لەبەندیخانەی موخابەرات بووم، لەکاتی لێکۆڵینەوەدا سەرم سووڕما کاتێك ئەو ناوە نهێنییەمیان بەروومدا دایەوە کە لەمیانەی پەیوەندییەکانم لەگەڵ بارزانیدا هەمبوو کاتێك راوێژکاری کاروباری باکوور (کوردستان) بووم لای بەڕێز سەدام حسەین، ناوە نهێنیەکەم (بەیرووت مارتینس)بوو، تەنها من‌و مەسعوود بارزانی دەمانزانی!

لەساڵی ١٩٤٦ەوە بەتایبەتی لە ١٩٧٥/٧/٥ەوە، بنەماڵەی بارزانی، تاکە سیمبوڵی خەباتی کوردایەتی‌بوون لەسەرانسەری کوردستاندا، شایەدیدانیان لەرووی تەزەکیەکردنی کەسێك وەکو نیشانەیەکی شانازی‌بوو کە لەتۆماری مێژووی کورددا تۆمار دەکرا، بەلاّم دوای ئاشبەتاڵی ساڵی ١٩٧٥ هەروەها ئەو ناپاکییە مێژووییەیان کە لە ٣١ی ئابی ١٩٩٦دا خۆیان خستە باوەشی سوپای عێراق تاکوردستانی ئازاد داگیر بکات کە لەئەنفالە بەدناوەکان دژوارتربوو، ئیتر بنەماڵەی بارزانی وایان لێهات ئەوان پێویستیان بەتەزەکیەکردن بوو لای گەلی کوردستان تا لێیان ببوورێت. لەوانەیە خوێنەری بەڕێز کەئەمە دەخوێنێتەوە بزە بیگرێت‌و لەبەرخۆیەوە بڵێت ئەمە چۆن دەبێت لەکاتێکدا بنەماڵەی بارزانی زیاتر لەنیوەی کوردستانیان کۆنترۆڵ کردووەو سامانێکیان لەژێردەستدایە کەدەوڵەتانی دراوسێ

خەونی پێوە دەبینن. بەڵام من دڵنیاتان دەکەم کەبەردەوامبوونی واقیع هەتا سەرنابێت، چونکە مادەم بۆ پێش خۆت نەچۆتە سەر، ئەوە بۆ تۆش ناچێتە سەر.

بڕواش ناکەم کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان بەهۆی ئەو چەرمەسەریو نەهامەتییانەی بەسەریاندا هاتووە ناوو روخساری لێپرسراوانی ئەنجومەنی یاسادانانو ئەنجومەنی راپەڕاندنی لەمەڕ دەزگای ئۆتۆنۆمی لەبیربچێتەوە کە ئەمڕۆ لەدامودەزگاکانی ئۆتۆنۆمیدا پۆستیان بەدەستە. کەسیش هەڵوێستی ئیجابیی ئەو بەڕێزانەی کوردی لەبیرناچێتەوە کەلەگەڵ ئەوەی هاوکاریی حکومەتی عێراقیان دەکرد بەلأم خزمەتی هێژایان بەگەلی کوردستان گەیاند، وەکو بەڕێزان شێخ ئەحمەد نەقشبەندی، مامۆستا بابەکر مەحموود ئاغای پشدەر، مامۆستا سیروان عەبدوڵلاّ بەگی جاف. ئەمانە هەڵوێستی مەردانەیان هەبوو کە لەبیرناچێتەوە هەرچەند لای رژێم پۆستی گەورەیان هەبوو.

گەشتوگوزار، چەکی کوشندەی دەستی مەکتەبی کاروباری باکوور بۆ سەرکوتکردنی کورد :

بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی گەشتوگوزار لەسەردەمی پاشایەتییدا دامەزرا، ئەو کاتە رژێم بایەخی زۆری بەهاوینەهەواری سەلاّحەدین دا بەهۆی تایبەتمەندییە تەندروستییەکانی بۆ پاراستنی لەشساغیی پاشا کەنەخۆشیی تەنگەنەفەسی هەبوو .

ئەوکاتە لەهاوینەهەواری سەلاّحەدیندا حەوت خانووی گەورە بۆ ئەندامانی ئەنجومەنی وەزیران دروستکرا لەگەڵ کۆشکێکی تایبەت بۆ خاوەن شکۆ پاشا، هەروەها بیستو یەك خانووی تر بۆ دەستوپێوەندو یاوەرو کارمەندو پاسەوانان دروستکرا لەگەڵ ئۆتێلی پیرمامو گازینۆیەك بۆ گەشتیاران، ئنجا کاربەدەستان دوای ماوەیەك کەوتنە بایەخدان بەسەری رەشو زاویتەو چەند شوێنێکی تر کەهاوینەهەواربوون.

حزبی بەعسیش لەوەتەی خۆی بەسەر گەلی عێراقدا سەپاندووە بایەخێکی زۆری بەبواری گەشتوگوزار داوە کەئەمەش لەپێناو چەند شتێکدا بووە، چونکە بەڕێزان ئەحمەد حەسەن ئەلبەکرو ساڵح مەهدی عەمماشو سەدام حسەین، هەر لەساڵی ١٩٦٩وە لەسەر ئەوە رێککەوتوون کەمەسەلەی گەشتوگوزار بۆ سەقامگیرکردنی دەسەلأتی زۆردارییانو کۆنترۆڵکردنی گەل بەکاربێنن ئەوەش لەژێر دروشمی دەستەبەرکردنی ئارامیو خۆشیی هاووڵاتیی کوردو خولقاندنی کەشێکی وا بۆی کەچەرمەسەرییەکانی رابردووی لەبیربچێتەوە بەشێوەیەك کەلەگەڵ لێبووردەییو نەرمونیانیو ئایدۆلۆجیای بەعسی دەسەلأتداردا بگونجێت، بۆیە سەرانی رژێم، هەموو رێوشوێنێکی پێویستیان بۆ بواری گەشتوگوزار لەسەرانسەری عێراقدا دەستەبەرکردو لەئەنجامی بواری گەشتوگوزار نەشونمای کردو بوو بەچەکێك لەگازی خەردەلو V.X مەترسیدارتر دەرچوو لەسەر گەلی کوردستان. ئەم بارەش هەتا ساڵی ١٩٩٠ بەردەوام بوو.

ئەركو بایەخدانی سەرەکیی مەکتەبی کاروباری باکوور راکێشانی کەسایەتییە سیاسییەکان بوو کەسەرۆکی عێراق( سەدام حسەین) لێیان دەترساو هەمیشە بەتەمای ئەوەبوو پشتی هەندێکیان

بشكێنێت یان هەندێكیان بەزەبری هەڕەشەو ئابڕووبردنو ناوزڕاندن ناچاربكات دەست لەگەڵ ڕژێمدا تێكەڵ بكەن.

بۆیە زۆربەی كارمەندانی بنكە گەشتوگوزارییەكان(لەژنو پیاو) سەر بەدەزگای موخابەراتن. بۆ نموونە ناوەندەكانی رابواردنو خزمەتگوزارییە گشتییەكان لەو بنەكانەی گەشتوگوزاردا لانەی پیاوخراپان بوو، وەكو كوافێرەكانی ژنان كەهەڵدەستان بەوێنەگرتنی هاوسەری كەسایەتییە سیاسییەكان لەباری سێكسیدا یان لەكاتی دواندنیاندا ئنجا بەكارهێنانی ئەو وێنانە بۆ ناچاركردنی ئەو ژنانە تا هاوكاریی دەزگای موخابەرات بكەن بۆ ئەوەی هەواڵی هاوسەرەكانیان بەدەزگا ئەمنییەكان بگەیەنن یان تەنانەت ژەهراویكردنیان. هەمان شت لەگەڵ سیاسەتمەدارەكاندا بەكاردەهێنرا كەكامێرای شاراوەیان لەژووری ئۆتێلەكاندا بۆ دادەنانو كچیان بۆ دەكردنە ژوورەوە تا دەستیان لەگەڵدا تێكەڵ بكەن كەوێنەكەیان نیشان دەدرایەوە زۆرجار لەمەراقان دڵیان دەوەستا! یان بەلێزانییەوە قومارخانەكانیان بەكاردەهێنا بۆ رووتاندنەوەی ئەو جۆرە كەسانە پاشان ناچاركردنیان بۆ قەرزكردن بەمەش پشتیان دەشكاندن، یان ئەو كەسەیان سەرخۆش دەكرد یان بەماددەی بێهۆشكەر خەویان لێدەخست ئنجا لەسەر چەند بارێكی نەشیاو، بەخەوتوویی وێنەیان دەگرت، یان بەزۆر دەستدرێژییان دەكردە سەر شەرەفی هاوسەری هەندێك كەسایەتی كەدیارییان دەكرد. هەموو ئەم رێوشوێنە دوور لەرەوشتو نامرۆڤانەیە لەلایەن دەزگای موخابەراتەوە بەكاردەهێنرا كەپیاوەكانیان لەبنكەكانی بەڕێوەەرایەتیی گەشتوگوزاردا كاریان دەكرد. شایەنی باسە كەئەم پێڕەوە بیژۆكانە تا ئەمڕۆ لەلایەن زۆربەی دامودەزگا موخابەراتییەكانی دەوڵەتانی جیهان بەكاردێتو بۆتە چەكێكی كاریگەری دەستیان بۆ سەركوتكردنو هەڵسووڕاندنی كەسایەتییە ناودارەكان بەو ئاوایەی كەموخابەرات دەیەوێت.

لەكوردستانی خۆشەویستیشماندا، خوا پایەداری بكاتو خەڵكە باشەكەی بۆ بێڵێت، خەڵك بایەخێكی زۆر بەزیندوكردنەوەی جەژنی نەورۆز دەدەن كەدەبینین خێزانەكان دەچن بۆ شوێنە گەشتوگوزارییەكانو سەر چەمو رووبارەكانو بناری شاخەكان، لەوێ رۆژگار بەخۆشی بەسەر دەبەن، هەڵدەپەڕن، چییان بەدڵ بێت دەیخۆن بێئەوەی كەس لەكەس بكەوێتو بەدەگمەن دەبیستین رووداوێكی نابەجێ رووبدات كەسەرو دڵی خێزانە سەیرانكەرەكان تێكبدات.

### دەزگای موخابەراتو وەرزش

عێراق ماوەیەكی بەخۆیەوە بینی تێیدا بێزاری وبێتاقەتی، هەموو دانیشتوانی گرتبۆوە بەتایبەتی دانیشتوانی بەغدادی پایتەخت. بەرێز سالح مەهدی عەمماش مەسەلەی وەرزشی هێنایە ئاراوە بۆ ئەوەی خەڵك خەریكو خەركاو بكاتو بیرو هۆشیان لەمەسەلە نیشتمانییەكان دووربخاتەوەو هاووڵاتیی عێراق لەسیاسەت دووربكەوێتەوە،ئیتر پیاوانی ئاسایش دەستیانكرد بەپڕوپاگەندەكردن بۆ پاڵەوانی جیهانیی بەرەگەز عێراقی، عەدنان قەیسی كەماوەیەك كەهەستو هۆشی خەڵكی كۆنترۆڵكردو وای لێهات ئەوەی بۆی نەكرایە بێت بۆسەیری پاڵەوانبازییەكان لەیاریگاكاندا، بەتەلەفزیۆن سەیری دەكردو هەموو سەریان سووڕمابوو كەدەیانبینی عەدنان قەیسی، زۆرانبازی لەگەڵ پاڵەوانانی جیهان دەكات

وەکو جۆ فرێری‌و هی تر بێئەوەی بزانیٚ ئەوە هەمووی فێڵ‌و کەڵەك بوو چونکە خۆیان لەگەڵ پیاوانی موخابەراتدا رێککەوتبوون لەسەر ئەوەی براوەو دۆڕاو، کیٚ دەبێت!

لەکۆتاییدا بەرێز ئەحمەدد حەسەن ئەلبەکر دڵنەرمی خۆی نیشاندا کاتێك کۆتایی بەم سیناریۆ ساختەیە هێناو بڕیاریدا عەدنان قەیسی، لەماوەیەکی دیاریکراودا خاکی عێراق بەجێبێڵێت‌و ئەویش بەیەکجاری عێراقی بەرەو ئەمریکا بەجێهێشت‌و نەمریی پاڵەوانییەتییەکی ساختەی لەدوا بەجێما...خوا رووڕەشی بکات.

**موخابەرات، مەلهاکان بەڕێوە دەبات**

جارێکیان گەورە لێپرسراوێکی دەزگای ئاسایشی ناوچەی باکوور(...) بۆ نانخواردنی ئێوارە بانگهێشتی کردم بۆ (ملهی المسبح) لەبەغدا، ویستی پەلەبکات‌و لەکاتی بڕینی بلیتەکان پێشم بکەوێت بەڵام من رامگرت‌و داوام لێکرد لەدەرگای پشتەوە بچینە ژوورەوە، ئەویش سەری لەو کارەم سووڕماو داوای روونکردنەوەی لێکردم. بەپێچەوانەی ئەوەی ئەو دەیویست، پەنایەکی چەپەکم هەڵبژاردو لێی دانیشین‌و نەمهێشت بانگی بۆیەکە بکات کە بەپێی پلە بەرزەکەی ئەم خزمەتمان بکات، ئیتر بۆیەکە وەك هەر هامشۆکەرێکی ئاسایی کەدێتە مەلهاکە، خزمەتیکردین. کچێکی سۆزانیش ویستی بماندوێنیت‌و لەگەڵماندا دانیشێت بەڵام من پێیدا هەڵشاخام کەلێمان دووربکەوێتەوە. لێرەدا برادەرەکەم خۆی بۆ نەگیراو بەروومدا تەقییەوە، گوتی: ئەریٚ کاك رەفیق چیتە؟ بۆچی بەم شێوە سەیرە رەفتار دەکەیت؟ منیش بەدەنگێکی نزم بۆم روونکردەوە کەئەوانەی لەویٚ کاردەکەن، هەر لەدەرگاوانەکەوە هەتا کچە سۆزانییەکە، سەر بەموخابەراتن.

ئەم پیاوە یەکێك بوو لەجەللادەکانی بەعس کە لەدامودەزگا ئەمنییەکان لەکوردستاندا کاری دەکرد، ژمارەیەکی زۆری لەخەڵکی بێتاوان بەکوشتن دابوو، هەموو کارێکی کوشتن‌و لەناوبردنی گەلی کوردستان بوو لەکاتێکدا لەبەغدا، لەبەردەم دەسەلاّتی سەدام حسەیندا دەسەلاّتی مێشوولەیەکی نەبوو.

جارێکی تر لەگەڵ بەرێز رەشید عارف، بانگێشت کرابووین بۆ مەلهایەك لەبەسرە کەپیاوێکی ترمان لەگەڵدابوو، ئەوەندەی پێنەچوو یەکێك لەبۆیەکان بوو بەقڕەی لەگەڵ کابرای سێیەمماندا و بردیان بۆ گرتووخانە. بۆ بەیانی ئێمە چووین بۆ بەڕێوەبەرایەتیی ئاسایش لەبەسرە تا ئەو برادەرمان بەر بدەین، بینیمان ئەو بۆیەی کەبرادەرکەمان شەڕی لەگەڵدا کردبوو ئەفسەری دەزگای موخابەراتەو دەبێت تکای لێبکەین بۆئەوەی برادەرەکەمان ئازاد بکرێت دەنا تووشی رۆژە رەشی خۆی دەبێت، ئنجا زۆر بەزەحمەت توانیمان برادەرەکەمان لەژێر چنگی پیاوانی موخابەرات دەربکەین.

پیاوانی دەزگای موخابەرات سڵ لەهیچ شتێك ناکەنەوە، تەنانەت بواری دیپلۆماسیش بەو تایبەتمەندیی خۆپارێزییەی کەئەندامەکانی هەیانە، لەدەستی پیاوانی موخابەرات رزگاریان نابێت.

کەسایەتییەکی سیاسەتمەداری ناسراوی کورد بۆمی گێڕایەوە لەگەڵ برادەرێکی عەرەبدا کەپۆستی سکرتێری یەکەمی هەیە لەباڵوێزخانەیەکی عێراق لەیەکێك لەدەوڵەتانی کەنداو، ئەمانە لەگەڵ دوو کچی سۆزانیدا لەشوقەیەکدا، شەوێکیان بۆ خۆیان رادەبوێرن لەناکاو پۆلیسی ناوخۆ بەچەکەوە بەسەر

شوقەکەدا دەدەن. برادەرەکەم دوای ئەوەی پێناسەی دیپلۆماسیی خۆی دەنوێنێت گوایە خۆپارێزیی دیپلۆماسی هەیە بایەخێکی تایبەتی پێدەدەن و بەئوتومبێلی موخابەرات دەیبەن بۆ جێیەکی تایبەتی. کاتێکم زانی ئەو برادەرەم بەتەلەفۆن هاواری بۆ دەبردم کەرزگاری بکەم. بەپەلە چووم بۆ بنکەی پۆلیس کەلەوێ گوتیان گوایە بەریانداوە، منیش چووم بۆ شوقەکەی کەئەویش مەسەلەکەی بەوردی بۆم باسکرد، گوتی: کاتێك پۆلیس دای بەسەرماندا بینیم یەکێك لەکچەکان تەلەفۆنی بۆ شوێنێك کردو تەنها گوتی ( هەموو شتێك تەواو بووە) پاشان خستمیانە ناو ئوتومبیلێکی تایبەتو گەیاندمیانە بەردەرگای شوقەکەم. بەڵام برادەرەکەم دیار نەماوە، منیش تا ئێستا نەموێراوە ئەم مەسەلەیە لای کەس باس بکەم جگە لەوەی کەسیش باسی نەکردووە.

خوێنەری بەرێز: لێرەدا دەمەوێ هەندێ رووداو بێنمەوە کە بەسەر چەند کەسایەتییەکی عەرەبدا هاتووە لەوانەی سەر بەرێکخستنی حزبی بەعسن.

**عەبدولکەریم مستەفا نەسرەت**

هێزەکانی موخابەرات بەفەرمانی بەرێز سەدام حسەین، عەمید روکنی چەترباز(مظلي)عەبدولکەریم مستەفا نەسرەتیان کوشت کە لە٨ی شوباتی ١٩٦٣، فەرماندەی فیرقەی وەزارەتی بەرگریبوو، هەروەها ئەندامی ئەنجومەنی سەرکردایەتیی شۆڕش و مەکتەبی سەربازی بوو. ناوبراو لەرێی ناوزڕاندنی کوشتیان، ئەوەبوو نەگبەتێکی بێوژدان لەوانەی خۆیان بەهەرزان دەفرۆشن، لەسەر تەلەفزیۆن بەدرۆ ئیعترافی کرد گوایە بۆیە ئەو کەسایەتیەی کوشتووە چونکە بەرگری لەخۆی کردووە دژی دەستدرێژیکردنی ناوبراو لەسەر شەرەفی ژنەکەی، بۆیە نەك تەنها بەکوشتنی وەستان، بەڵکو ئابڕووشیان برد.

**فوئاد رکابی**

قوربانییەکی تری زەبری بەرێز سەدام حسەین، فوئاد رکابییە کەیەکەمین ئەمیندنداری سەرکردایەتیی هەرێمایەتیی حزبی بەعس بوو لەعێراق، هەروەها یەکەم بەعسی بوو پۆستی وەزیر لەحکومەتی عێراقدا بگرێتە دەست، پاشان بوو بەئەمینداری گشتیی بزووتنەوەی یەکیەتیخوازانی سۆشیالیست، هەروەها پلان دارێژەرو جێبەجێکەری پرۆسەی تیرۆرکردنی سەرۆك عەبدولکەریم قاسم بوو کەبەرێز سەدام حسەینی گەیاندە لووتکە.

ناوبراو لەناکاو بەتۆمەتی سیخوڕیکردن دەستگیرکرا، لەکاتێکیشدا لەبەندیخانەی باقووبە بوو، پیاوێکی موخابەرات لەوانەی خرابوونە ناو زیندانییەکانەوە چەقۆیەکی لێدا گوایە فوئاد رکابی ویستوویەتی بەکاری بەدڕەوشتی دەستدرێژی لێبکات ئەویش (موخابەراتەکە) بەرگری لەخۆی کردووە. کاتێك چەقۆکەی لێدرا کەس نەهات بەلایەوە هەتا گیانی لەدەستدا. پاشان بکوژەکەی درا بەدادگاو دەستەڵاتداریەتیی عێراق گوتیان گوایە لەسێدارەدرا، بەڵام دوای ماوەیەك ئەو پیاوە(بکوژەکە) بینرا بۆتە فەرمانبەر لەباڵوێزخانەی عێراق لەسۆفیا.

**موقەدەم داود جەنابی**

یەکێك بوو لەئەنجامدەرانی بزووتنەوەی ٨ی شوباتی ١٩٦٣، لیوای هەشتی کۆنترۆڵکردو دایە دەست عەقید عەبدولغەنی راوی، ئنجا خۆی بەفەوجێکەوە چووە سەربەغدا. پاشان کرا بەفەرماندەی کۆلیجی سەربازیو دواتر بوو بەفەرماندەی فیرقەی دەهەمی زریپۆشو پاشتر فەرماندەی هێزە سەربازییەکانی بەغدا. بەلاّم بەهۆی ناکۆکییەکی لەگەڵ حسەین کاملی زاوای سەرۆك سەدام حسەین، لەهەموو دەسەلاّتو پۆستێك خراو بە بڕیارێکی دادگای سەربازی کە بەتۆمەتی بەدڕەوشتی لەلایەن دەزگای موخابەراتەوە تۆمەتبارکرا، لەسوپا دەرکرا. بێگومان بەرەنگاریکردنی شێرێکی برسی لەدەشتدا، زۆر ئاسانترە لەبەرەنگاریکردنی ئەم شەیتانانە.

**شەفیق کەمالی**

یەکێك بوو لەبەشداریکەرانی کودەتای بەعسییەکان، وەزیری دەوڵەت بووە، هەروەها ئەندامی سەرکردایەتیی هەرێمایەتی و نەتەوەیی، بڕوانامەی ماجستێری هەبوو لەفەلسەفەدا، لەگەڵ کوڕەکەیدا( لەشەوی زاوایەتیدا) پێکەوە کوژران ئەوەش بەهۆی ئەوەی لەلایەکەوە بەڕێز سەدام حسەین لێی ناڕازی بوو، لەلایەکی تریشەوە عودەی سەدام حسەین تەماعی کردبووە بووکە نازدارەکەی کوڕەکەی شەفیق کەمالی.

داوای لێبوردن لەخوێنەران دەکەم ئەگەر هەستی قێزهاتنەوەیان جۆشابێت بەڵام مەبەستم ئەوەیە تیشك بخەمە سەر هەندێك لای تاریکی ستەمی دەسەڵاتداریێتی لەعێراقداو نهێنییەکانیان ئاشکرا بکەم بۆ ئەوەی هۆش و بیری گەنجەکان ڕۆشن بکەمەوە بەو مەبەستەی یەکبگرن لەدژی زۆرو ستەم.

هەروەکو پێشتر باسمکرد، بەڕێز سەدام حسەین لەڕێی دامودەزگاکانی گەشتیاریو ڕابواردن، توانی بەغدای پایتەخت کۆنترۆڵ بکات، لێرەشدا بەنیازم ئەو کردەوانەی کە لەڕێی گەشتیارییەوە لەکوردستاندا ئەنجامیدا، بخەمە بەرچاو.

لەڕۆژی ٢٠٠٢/٦/١٧ کاتێك خەریکی داڕشتنی بەشێکی ئەم نووسینەم بووم، گوێم لەئێزگەیەکی کوردی بوو هەواڵێکی بڵاودەکردەوە دەربارەی بەردەوامبوونی دەسەڵاتداریێتی عێراق لەسەر ڕێڕەوی دێرینی خۆی لەرووی ڕاگواستنی خەڵك لەناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆی. لێرەدا بیرم لەعەقڵی سەرۆکی عێراق کردەوە کەچۆن بیردەکاتەوەو تا ئێستا بەبێ بچڕان لەسەر دابونەریتی خۆی بەردەوامە، وەکو ئەو سیسرکە هاتە بەرچاوم کەدەیەوێ بەشوێنێکدا بڕوات ناگەڕێتەوە مەگەر پان بکرێتەوە.

سەرۆکی عێراق لەبەر چەند هۆیەك نەیتوانی ئەو سەرکەوتنانەی لەناوەڕاستو باشووری عێراق بەدەستی هێنان، لەکوردستاندا بەدەستیان بێنێتو خەڵکی کوردی بۆ کۆنترۆڵ نەکرا. بەزۆری پێم وایە مۆرکی ئاینی کە بەسەر خەڵکی کوردستاندا زاڵە هەروەها پابەندبوونیان بەدابونەریتەوە وای لەکورد کرد بتوانن بەرەنگاری فەرمانڕەوایانی عێراق ببنەوە. من لێرەدا لەواقیع لانادەم کەداکۆکی لەنەتەوەکەم بکەم، چونکە گەلێکی گەورەوگرانی وەکو گەلی کوردستان بەشی خۆی خەڵکی ناپاكو دەروون نزمو بێورەی تێدایە. چونکە کاتێك موختاری گەڕەك لەئارادابوو، خەڵك ئاگاداربوون کەئەمانە دەستیان لەگەڵ ڕژێمدا تێکەڵە، بەڵام ئەوەی هەبوو ڕۆڵی ئەمانە تەنها خەبەردان و ڕابەریکردن بوو، تەنانەت تێیاندابوو لەموختارەکان خزمەتی گەورەی بەهەندێك خێزانی کورد گەیاند لەوانەی ناویان لەلیستی ڕەشی دامودەزگا ئەمنییەکاندا تۆمارکرابوو.

دامودەزگا ئەمنییەکان بۆ جێبەجێکردنی نیازە گڵاوەکانیان لەکوردستاندا، هەمیشە دەزگا گەشتەوەرییەکانیان بەکارهێناوە. بۆ نموونە، خەڵکی شارۆچکەی قەڵادزێ تائێستا لەبیریانە کاتێك دەسەڵاتداریەتی عێراق، سێرکێکی نمایشکاریی بەتایبەتی لەکۆماری میسری عەرەبییەوە هێنا کەژمارەیەکی زۆر کچی سۆزانییان لەگەڵدابوو. دامودەزگا ئەمنییەکان لەقەڵادزێ میوانداریيانکردن بۆئەوەی ماوەیەکی دووردوودرێژ بمێننەوەو ڕەوشتی زۆرترین ژمارە لەلاوانی ناوچەکە تێکبدەنو

داوێنپیسی بڵاوبکەنەوە هەروەها بەقومار، باخەڵی پیاوەکان خاڵی بکەن. بەڵام خەڵکی بەشەرەفی شارۆچکەی قەڵادزێ بەرەوڕووی ئەم هەوڵە گڵاوەی رژێم بوونەوەو لەم رووەوە مامۆستای تێکۆشەر، مەلا محەمەد دڵگەیی کەناوی وەکو نیشتمانپەروەرو کوردپەروەر رۆیشتووە، هەڵوێستی مەردانەی بەرامبەر ئەم هەوڵەی رژێم نیشاندا، ئەوەبوو کۆمەڵانی خەڵکی کوردستانی کۆکردەوەو خۆپیشاندانێکی گەورەی لەژن و پیاو لەشارۆچکەکەدا سازدا کەپەلاماری دامودەزگا ئەمنییەکانیانداو بەرهەڵستیی بوونی ئەو ژنە سۆزانییانەیان لەشارۆچکە بەشەرەفەکەیاندا کرد.

ئەمە، ئەندامانی تیپی سێرکەکەی لەژن و لەپیاو ناچارکرد لەترسی رق و تووڕەیی خەڵکەکە، شەو لەبنکەی پۆلیسی قەڵادزێدا رۆژبکەنەوە. رۆژی پاشتر میوانە ناحەزەکان بنەوبارگەیان پێکەوەناو چوونەوە بەغدا بۆ ناوباوەشی دەزگای موخابەرات کەرەوانەی کردبوون. هاوکات چەند بێویژدانێك هەبوون لەوانەی هاوکاری دامودەزگا ئەمنییەکان بوون و رۆڵی بەرچاویان هەبوو لەرووی یارمەتیدانی پیاوانی دامودەزگا ئەمنییەکان بۆ پڕوپاگەندەکردن بۆ ئەو سێرکەو سەرخستنی کارەکەی و ئاسانکاریکردن بۆ هاتنی بۆ شارۆچکەی قەڵادزێ و دەستنیشانکردنی جێ‌وڕێی گونجاو بۆ حەوانەوەیان... بەڵام لەو هەوڵەیاندا سەرکەوتوو نەبوون و رەنجیان بەباچوو.

گومان لەوەدا نییە سەرۆکی عێراق، کاتێك لەدوورەوە بەشە رزگارکراوەکەی کوردستان دەبینێت کەچۆن هەوڵ و تێکۆشانی چەندین ساڵەی خۆی و سەرکۆمارو فەرمانڕەواکانی پێش خۆی بەباچووە، ئەوە هەست بەئەوپەڕی دەستخەڕۆیی دەکات. شایەنی باسە پرۆسەی شۆڤێنیستی عەرەبی کەدەسەڵاتداریەتیی عێراق بەدرێژایی حەفتا ساڵ هەوڵی لێبڕاوانەیدا بۆ جێبەجێکردنی نیازەکانی، ئەمڕۆ بەئاشکرا ئەنجامەکەی بێهوودە دەرچوو. ئەمڕۆش سەرنجدەدەین UN لێبڕاوانە سەرقاڵی ئاوەدانکردنەوەی کوردستانەو بنکە گەشتەوەرییەکان لەهەموو جێیەکی رزگارکراوی کوردستان لەنەشونمادایە کەمەبەستیش بەدیهێنانی خۆشی و رابواردنی گەلی کوردستانە، هەروەها قیرتاوکردنی دوورترین رێوبانی سەرسنوور لەکوردستانی باشووردا نیشانەی ئەو نەشونماکردنەیە. ئەمڕۆش کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان چاوەڕێی هەوڵ و کاری زیاترن کەبۆیان ئەنجام بدرێت. چونکە بواری گەشتوگوزار، کەدەبێت لەژێر چاودێریی بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی گەشتوگوزاردا بێت و لەراستیدا دەبێت لەخزمەتی خۆشگوزەرانیی هاووڵاتیدابێت بەڵام لەکوردستاندا، کەزوڵم و ستەم باڵی بەسەردا کێشابوو، زۆر شوێن دەبینین کەخوای گەورە هەموو تایبەتمەندییەکی بەدیهێنانی خۆشگوزەرانیی بۆ مرۆڤ تێدا فەراهەم کردووە بەڵام پشتگوێ خرابوو، وەکو هاوینەهەواری سەری رەش و سەلاحەددین کەقیبلەگای خەڵکی بەشەرەفی هەولێر بەتایبەتی و هەموو کوردستان بوو بەگشتی، کەچی دەبینین ئەمڕۆ لەوەتەی بنەماڵەی بارزانی دەستی بەسەرداگرتووە بۆتە بنکەی هەمیشەیی ئەوان وەکو بارەگایەکی حزبی و سەربازی، ئەوان کەدەستیان بەسەر ماڵ و سامانی کوردستاندا گرتووە کەچی ئەم دوو هاوینەهەوارە بەخەڵکی کوردستان رەوانابینن.

لەلایەکی ترەوە، دەبینین ناوچەی گەشتەوەریی تەوێڵەو بیارە لەپارێزگای سلێمانی، گرووپی(جند الاسلام) کەئەمڕۆ ناوی بە(انصار الاسلام PAK) رۆیشتووە، کۆنترۆڵیکردووە. ئەم گرووپە وەکو خەڵك باسیان دەکەن توندڕەون و دان بەباقی مەزهەب و بیروباوەڕو تەنانەت حزبە ئیسلامیەکانیشدا نانێن کە لەناوچەکەدان گوایە تەنها پێڕەوو ئایدۆلۆجیای ئەوان، لەرووی شەرعی ئاینی ئیسلامەوە راست و دروستە. بەلاّم لێرەدا دەمەوێت ئەوەتان وەبیربێنمەوە کە لەخەسڵەتەکانی موسڵمان ئەوەیە هەرچییەکی بۆ خۆی بوێت و خۆشی بوێت، دەبێت بۆ موسڵمانیشی بخوازێت، چونکە پێغەمبەری مەزن(ﷺ) لەماڵی خۆی هیچی لەخەڵکی نەدەگرتەوە، هیچی بۆ خۆی گل نەدەدایەوە، بەلاّم ئەگەر دادپەروەری لەکایەدا نەبوو ئەوە هەمیشە هێز بالاّدەستە، هاوکات هیچ یاسا یان دەقێکی ئاسمانی رێگە بەکەس نادات خێروبێرەکانی سروشت بۆ بەرژەوەندیی کەسایەتیی خۆی پاوان بکات، بەلاّم ئەمانە ئەگەر بەڵگەی ئەوە بێننەوە کەپێغەمبەری خوا(د.خ)، بەدەقی خوایی کەخاوەنی بەزەیی‌بووەو، رەحمەتبوو بۆ هەموو جیهان ﴿وما ارسلناك الا رحمة للعالمين﴾ بەلاّم لەشەڕی بەدردا ئاوی لەقورەیشییەکان گرتەوە، ئەوە لەبەرئەوەبوو کەئەوان کافربوون...کەواتە تۆبڵێیت لایەنگرو هەوادارانی PAK بەو چاوە کەپێغەمبەر لەشەڕی بەدردا قورەیشییەکانی هەڵسەنگاندبوو، سەیری کۆمەلاّنی خەڵکی کوردستان بکەن؟!

لەبەرئەوەی منیش لەنزیکەوە ئەم گرووپە توندڕەوە ناناسم، ناتوانم ئەوەی لەمێشکیاندایە بخەمە بەرچاو، چونکە وەکو حەزرەتی ئیمامی عەلی کوری ئەبو تالیب(ر.خ) فەرمویەتی: (نێوانی راستی و ناراستی چوار پەنجەیە) ئنجا بەدەستی ئاماژەی بۆ نێوان گوێچکەی و دەمی‌کردبوو... بەلاّم سەرباریشی، دەڵێم خەڵك بەپێی رواڵەتەکان حوکم دەدەن، ئەوەی لەبەرچاویشە ئەم گرووپە(انصار الاسلام) تەوێڵەو بیارەیان داگیرکردووە کەئەمەش نە لۆجێك پێی رازییە نە ویژدان، بۆیە تەنها ئەوەندەم لەدەست دێت لەخوا بپاڕێمەوە و تکا لەو گرووپە بکەم کە لەئاست خەڵکدا دڵنەرم بن و کۆتایی بەزاڵدەستیی چەکدارییان لەناوچەکەدا بێنن و ئاشتی و تەبایی و بەزەیی و خۆشەویستی بکەن بەپێڕەویان، چونکە هەروەکو شاعیرێکی عەرەب گوتوویەتی:

مل پێدان بەزەبری چەك ناچێتە سەر....

بەزمانی شیرین مار لەکون دێتە دەر

دووساڵ لەمەوبەر بەخت یارم بوو کاتێك بەدیداری تێکۆشەرو نیشتمانپەروەرو بیروباوەڕ قایم و دڵسۆزی خاکی کوردستان مامۆستا مەلا عەلی باپیر شادبووم، لەراستیشدا ئەوەی لەم پیاوەدا بۆم دەرکەوت مایەی هیواو خۆشی‌بوو، ئنجا تەنها خوا ئاگاداری ناو دلاّنە. لەناو ئەو قسەوباسانەی کردمان، مەسەلەی داگیرکردنی ناوچەی گەشتەوەریی ئەحمەدئاوا(پشتی خورماڵ)بوو کەرێگە بەخەڵك نادەن سەردانی ئەو هاوینەهەوارە دڵفرێنە بکەن، ئنجا لەمیانەی گفتوگۆکانماندا تکام لێکرد دەرگا لەرووی خەڵکی گەشتیاردا ئاوەلاّ بکەن بۆ ئەوەی سەردانی ناوچەکە بکەن و تێکەڵیان ببن تاهیچ نەبێت شارەزای برِوباوەڕی ئەمان ببن.

**مەکتەبی کاروباری باکوورو وەزارەتی ئەوقاف**

مزگەوتەکان بەگشتیو خودی مەلاکان بەتایبەتی، هەمیشە لەژێر چاودێری دامودەزگا ئەمنییەکاندا بوونە بۆ کۆنترۆڵکردنیان بەمەبەستی بەرکارهێنانیان بەپێی پێویستو لەچوارچێوەی ئایدیۆلۆجیای حزبی بەعسو بەڕێز سەدام حسەیندا.

لەو رۆژەوەی هەوڵی تیرۆرکردنی مەلا مستەفا بارزانی درا لەرێی تەقاندنەوەی مەلاکان کەبۆ ئەوە نێردرابوون، سەدام حسەین لێهاتوویی دامودەزگا ئەمنییەکانی نیشاندا هەروەها تا چەندێك دەتوانێت وەزارەتی ئەوقافو زانایانی ئاینی بخاتە ژێر رکێفی خۆیو بەکاریان بێنێت. بەڕێز سەدام حسەین لەدیدارێکیدا لەگەڵ وەزیری ئەوقاف گوتبووی: ( ئەمڕۆ وەزارەتی ئەوقاف لەعێراقدا خزمەتی عێراقو حزبی بەعس دەکات، هەروەها لەوەزارەتی بەرگریو وەزارەتی ناوخۆ زیاتر داکۆکی لێدەکات).

سەرباریشی بارودۆخی مەلای کورد لەکوردستاندا زۆر لەبارودۆخی مەلا عەرەبەکانی ناوەڕاستو باشوور باشتر نەبوو، چونکە ئەمانەی دوایی ژمارەیەکی کەمیان توانیویانە خۆیان لەژێر چنگی بەعس قوتار بکەن ئەوەش یا بۆ دەرەوەی عێراق هەڵاتوون یان وازیان لەپیشەی مەلایەتی هێناوەو لەکونی ماڵدا بەژیانی کولەمەرگی رازیبوونە. بەڵام لەکوردستاندا لەسایەی بوونی بزووتنەوە شۆڕشگێڕییەکانو هەڵکەوتی هەندێك ناوچەی سنووریو سەختی هەندێك ناوچە کەرژێم نەیتوانیوە کۆنترۆڵیان بکات، ژمارەیەکی زۆر لەمەلاکان لەزەبری رژێم رزگاریان بووە، هاوکات مەلای واش هەبووە خۆی فرۆشتووەو دەستی لەگەڵ دامودەزگا ئەمنییەکاندا تێکەڵکردووە کەژمارەیان لەپەنجەی دەست تێناپەڕنو پێویست ناکات ناویان بێنم، بەڵام ئەو قورئانەی لەسنگیاندایە شایەنی ئەوەیە تۆبەیان پێبکات یان قینو خەشمی خوایان بەسەردا داباریێنێت.

هەموو مەلاکانی کوردستان شانبەشانی پێشمەرگە بەشداریی شۆڕشی مەزنی ئەیلوولەیان کردووە، مزگەوتەکان هەمیشە وەکو شوێنی حەوانەوەی پێشمەرگە بەکارهێنراون جگەلەوەی دەرسو دەوری قورئانو وانەی خەباتی تێدا گوتراوەتەوە. دوای ئاشبەتاڵیش(١٩٧٥)، زۆربەی مەلاکان گەڕانەوە بۆ باوەشی رژێمو سەردانی دامودەزگا ئەمنییەکانیان کرد ئەوەش یەکەم: لەپێناوی بژێو، دووەم: لەترسی زەبری ئەو دامودەزگایانە دژی خێزانەکانیان. بەڵام ژمارەیەکی کەمیان هاوکاریی ئەو دامودەزگایانەیان کرد، بەڵکو زۆربەیان لەسەر هەڵوێستی شۆڕشگێرانەیان مانەوە جگەلەوەی زۆر مەلا هەبوون کە بەراستی هەڵوێستی قارەمانانەیان هەبوو لەهەموو سەردەمێکداو کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان شایەدییان بۆ دەدەن، لەوانە: مامۆستا مەلا ئەحمەدی وەرتێ ـ رەواندوز، مامۆستا مەلا محەمەد ئەمین چەمچەماڵی (سەرۆکی خولی ئێستای یەکێتی زانایانی ئاینی ئیسلامیی کوردستان ـ سلێمانی) مامۆستا مەلا ساڵح کانی چناری کەدانیشتووی کەرکووك بوو، رژێم لەسەر هەڵوێستە مەردانەکانی دەستگیریکردو زۆر ئەشکەنجەیدا ئنجا چاوێکیان دەرهێنا، ناوبراو لەناوەراستی مانگی حزەیرانی ساڵی ٢٠٠١دا کۆچی دوایی کرد.

هەروەها ماموستا مەلا محەمەد دەڵگەیی کەرژێم دەستگیریکردو زۆر ئەشکەنجەیدا ئەمەش کاتێك بەرەنگاری دەسەڵاتداریەتیی بەعس بۆوە کاتێك ویستیان دانیشتوانی قەڵادزێ راگوێزن. ئەمڕۆش دەبینین دۆسیەی ئاوەدانکردنەوەی شارۆچکەی قەڵادزێ پشتگوێخراوە لەکاتێکدا هەموو خانووەکانی رووخێنراون. ئنجا رژێم، ماموستا مەلا محەمەد دەڵگەیی بەدەستی بەستراوەوە لەزیندان دەرکردو هێنای بۆ قەڵادزێ تا بەچاوی خۆی، داروپەردووی خانووەکان ببینێت بۆئەوەی خۆیو هەموو کەسێك کە لەخۆی رادەبینێت رووبەڕووی رژێم ببێتەوە، تەمبێ ببێت. سەرباریشی، بینیمان کەچۆن بنەماڵەی بارزانی، ماڵی ئەم ماموستا تێکۆشەرەیان لەهەولێر تاڵانکرد کاتێك لەتاو هێزەکانی رژێم، هەولێری بەجێهێشت کەچەکدارەکانی پارتی لە٣١ی ئابی ١٩٩٦ دا پێش سوپای رژێم کەوتن.

لەفەرمودەیەکی پێغەمبەری خۆشەویستیدا(د.خ) هاتووە کەزانایان وەرسەی پێغەمبەرانن، بەم پێیە، زانایانی ئاینی هیچ بەهانەیەکیان بەدەستەوە نەماوە بۆ خزمەتکردنی پەیامی خوایی‌و جۆشدانی گیانی فیداکاری لەناو جەماوەری گەلی کوردستان لەرێی وتارەکانیانەوە، ئەمە جگە لەکاری بێوچانیان لەپێناو داکۆکیکردن لەمافی زەوتکراوی کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان‌و بەرنەدانی رێگەی تێکۆشان هەتا شەهید بوون.

ململانێی نێوان هەردوو بەرەی بەشەڕهاتوو لەکوردستاندا(یەکێتی‌و پارتی) لەسەرەتایەوە یەکەم هۆکاری پەکخستنی شۆڕشی کوردبوو، هەروەها مایەی ئاژاوەو نەگبەتی‌و کۆسپی سەرەڕێی رزگاربوونی گەلی کوردستان بوو. کەواتە ئاشتبوونەوەی ئەم دوو بەرەیە یەکێکە لەکارە گرنگەکانی شەرعی ئاینی ئیسلامەو لەهەمانکاتدا خزمەتکردنە بەشۆڕشی کورد. بۆیە پێم وایە کەدەبوایە وتاربێژەکان، کەخەڵکی لەرۆژانی هەینی لەمزگەوتەکاندا بەهەزاران کەس لێیان کۆدەبنەوە هەروەها لەشەوە پیرۆزەکاندا دادەنیشن گوێیان لێدەگرن دەتوانن رۆڵی خۆیان بەباشی بگێڕن لەرووی ئامۆژگاریکردنی خەڵك. ئەم زانا ئاینییانە، ئەگەر لەمزگەوتەکانداو بەناوی قورئانەوەو دوور لەهەر دەستەگەرییەکی حزبی یان سیاسی‌و زیاد لەوە( خوا پەنامان بدات) دوور لەهەموو جۆرە ریاکارییەك، ئەگەر بەدڵ‌و بڕوایەکی پتەوەوە یەکبگرن دەتوانن رۆڵێکی کاریگەر ببینن بۆ هەوڵدان بۆ یەکلاخستنی ناکۆکیی نێوان یەکێتی‌و پارتی ئنجا وابکەن ئەم دوو بەرەیە لەدەسەڵات بخەن. دەبا زانایانی ئاینی تاقە جارێك لەژیانیاندا گوێ بەو مەترسییانە نەدەن کەهەڕەشەیان لێدەکات‌و لەپێناو رزگاریی گەلی کرودستان، لایەنی خەتابارو کەڵەکباز لەم ململانێیەدا ئاشکرا بکەن. کەئەمەیان کرد ئنجا با خوێنیان، میحرابی مزگەوتەکانیان سووربکات، چونکە ئەو کاتە بەهەشت جێگەیان دەبێت، خۆ ئەمانە لەحەزرەتی عومەری کوڕی خەتاب نازداترنین کە لەناو میحرابی مزگەوتدا شەهیدکرا... کەواتە ئێوەی زانایان کە بەتەمای بەهەشتن‌و قورئانتان لەسنگتاندا هەڵگرتووە ئەوە ئەنجام بدەن کەئێستا عەرزم کردن...

بەڵام بەداخەوە، لەبەرئەوەی زۆربەی مەلاکانمان بەحزبەکانەوە گرێدراون، دەست‌وپێیان بەستراوەتەوەو کارێکیان لەدەست نایەت کەهەم مرۆڤ رازیبکات هەم خوای گەورە. بۆ نموونە، ئاگادارین کەچۆن کۆماری ئیسلامیی ئێران پشتگیریی هەموو هەنگاوێکی مەلا عەلی عەبدولعەزیز دەکات با

هەنگاوەکانیشی پێچەوانەی ڕێڕەوی شۆڕش و ئاواتەکانی گەلی کوردستان بێت، ئەمە جگەلەوەی ژمارەیەکی زۆر لەدۆست و یاوەرانی نزیکی مەلا عەلی، دان بەوەدا دەنێن کەناوبراو پەیوەندیگەلێکی گومان لێکراوی هەیە لەگەڵ دەوڵەتە دراوسێکان، سەرچاوەی گومانەکانیشیان ماڵ و سامانە زۆرەکەی مەلا عەلییە هەروەها هەڵوێستە سیاسییەکانی دژی ئیرادەی گەلی کوردستان... تەنها خوداش لەراستییەکان ئاگادارە. جا ئەگەر لیژنەیەك پێکبهێنرێت و لەبڕی ماڵ و سامانی مەلا عەلی بکۆڵرێتەوە دەبینین توانیویەتی لەماوەیەکی کورتدا کەناگاتە دە ساڵ، سامانێکی زۆری پێکەوەناوە لەزەویوزارو خانووبەرەو بیری ئیرتوازی و پارەی نەختینە، لەکاتێکدا ئەم زاتە نە بازرگان بووە، نە بەڵێندەر، بەڵکو پێشنوێژو وتارخوێن بووە، یان شۆڕشگێڕێك بووە لەسەنگەردا شەڕیکردووە، کەواتە ئەمەت لەکوێ بوو؟

دەربارەی هەڵوێستەکانی مەلا عەلیش، دەیتوانی ڕۆڵی هەبێت لەڕەوتی ئاشتیی و برایەتی لەنێوان حزبە کوردستانییەکان و ئیسلامییەکانیشدا، چونکە ناوبراو زانایەکی ئایینیەو شارەزای شەرعە، هەروەها لەبنەماڵەیەکی ئاینییە کەناوبانگیان لەهەموو کوردستاندا بڵاوبۆتەوە... بەڵام بەداخەوە، هەمیشەو تائەمڕۆ هەوڵیداوە لەپێناو بەرژەوەندییە کەسایەتییەکانی و بۆ ماڵ و منداڵی خۆی، کاربکات.

لەوانەیە مەلا عەلی بتوانێت پاساو بۆ هەڵوێستەکانی بێنێتەوە، بەڵام وتارەکەی لەکۆبوونەوەی ڕۆژی پێنجشەممە ١٩٩٦/٩/٢٦ (دوای ٣١ی ئابی ١٩٩٦)کاتێك وەکو میوان لەیەکەم دانیشتنی خولی سێیەمی پەرلەمانی کوردستان . هەولێر بانگیشت کرابوو وتوێژەکان لەپرۆتۆکۆلی دانیشتنی ژمارە(٣) ی پەرلەمانی کوردستان (حکومەتی پارتی دیموکراتی کوردستان بڵاوکرایەوە تایبەت بەناوەلینان و براوادان بەئەندامەکانی کابینەی سێیەمی پەرلەمانی کوردستان، مەلا عەلی عەبدولعەزیز بەدەق گوتبووی:

( شایەنی باسەو زۆر دڵخۆشین بەم ڕۆژە زیاتر بەوەی کە لەراستیدا کەهیچ پەرلەمانێکی جیهانی و سیاسەتی نێودەوڵەتی وەکو ئێمە نەماندیوە کەوا(فیفتی فیفتی) دوو کەس کەوا یەکێکیان بەرپرسیاریەتی زیاتر نەبێ لەوەی تریان، ئەوا هەروەکو بەسوننەتی قورئان قەت قابیل نیە شتی ئەوها ﴿ لو کان فیهما الهین الا الله لفسدتا ﴾ئەمە مومکین نیە هەموو کەسێك خۆی بە مسۆولی یەکەم بزانێ لەولاتێکدا دوایی ئەوبارە بەردەوام بێ، ئێستاکە دڵخۆشین بەوەی کەوا(الحمد لله) لایەنێك خاوەنی خەباتێکی چەند ساڵەیی کەمەسۆوەلیەتی یەکەم لەئەستۆ ئەگرێ ئومێدەوارین انشاء الله کارەکەمان زۆر چاك دروست بێت).

مەلا عەلی عەبدولعەزیز بەم پشتگیریکردنەی بۆ هەنگاوی بارزانی کەشاری هەولێری داگیرکرد کەدەشیزانی بەپشتیوانیی سوپای عێراق بووە، نیشانەی ڕەزامەندییەتی لەسەر ئەو کارە، پیرۆزباییکردنیشی لەم هەنگاوە خیانەتکارانەیە هەروەکو لەوتارەکەیدا هاتووە ڕەهەندی زۆر دەگەیەنێت کە ئەمە بۆ خوێنەر بەجێدێڵم. هاوکات ژمارەیەك لەزانایانی ئاینی، زۆر بەتوندی لەڕەوتی شۆڕشی کوردستان لایانداوەو دژی لایەنەکەی تر وەستاونەتەوە کە لەراستیدا ئەمانە دەبوایە بێلایەن بوونایە چونکە ئەوەیان مایەی سەربەزی دەبوو بۆیان.

ژیـان بـەبێ هیـوا نابێـت و هیـواش بـەبێ ژیـان نابێـت . راسـتیان گوتـووە کـە مـرۆڤ، ئەگـەر جارێـك نووچیدا، نابێـت هیوابڕێـت، چـونکە دەشـێ لەژیانیـدا زۆرجـار تەگـەرەی بێتـەرێ، بۆیـە مـرۆڤ دەبێـت وریابێـت و کارێـك نـەکات وەهابکـەوێت ژیـانی لەدەستبدات بـەڵکو تـەنها ئـازاری پێبگـات. شۆڕشـی گـەلی کوردسـتانیش کەبنەماڵـەی بـارزانی ئاشبەتاڵیان لێکـرد زەبرێکـی کەمەرشکێن بـوو بەکۆمـەڵانی خـەڵکی کوردسـتان گەیـشت، چـونکە ورەی شۆڕشـگێڕان و نـەوەی نوێـشی رووخانـد... مـردنیش راسـتییەکەی لەهۆشی مرۆڤدا جێگیرە، بەڵام ئەوەی بەخەیاڵدا نەهاتبێت ئەوەیە کەگەورەی خێزان، خیانەت بکات.

زۆربـەی سـەرکردەو شۆڕشـگێڕانی کـورد، لەهەڵگیرسـانەوەی شۆڕشـێکی نـوێ لەکوردسـتاندا تـەمابڕاوبوون، دەمبیـنین خـەم روخـسارییانی ژاکانـدبوو، دەتگـوت کوتـەکێك بەسـەریاندا کێـشراوە. لەبەرامبەریـشدا سـەرکردەکانی بـەعس و کادیرەکانیـان گـەز گـەز باڵایانـدەکرد، قاقـای پێکـەنینیان بـەرز دەبۆوەو دەیانگوت کارێك دەکـەین مرۆڤی کورد، لـەدە دەرگـا بدات تـا چەقۆیەك پەیدادەکات خواردنی پێئامادەبکات، هـەروەها هـەتا سـەدەیەکی تـریش بیر لەشۆڕشێکی نوێ نەکەنـەوە. بـەڵام ئەفسووس، بـەدڕەفتارییان و خـراپ بـەرێوەبردنی کاروبـاری کوردسـتان و کـۆنترۆڵکردنی خەڵکەکـەی و نوانـدنی زاڵدەسـتیی نابـەجێ وای لەخـەڵك کـرد بیر لەدامەزرانـدنی حزبێکـی سیاسـی بکەنـەوە تـا ئـەو بۆشـاییە سیاسـییە پڕبکاتـەوە، خـوای گـەورەش فەرمویـەتی: ﴿ ولقـد كرمنـا بـني ادم وحملنـاهم في الـبر والبحـر ورزقنـاهم مـن الطيبـات وفـضلناهم عـلي كـثير ممـن خلقنـا تفـضيلا ﴾(ئایـەت) . کەواتـە مـرۆڤ لەسـەر سەربەرزی دروستکراوە، تەنانـەت ئیمـامی عـەلی (ر.خ) لـەم رووەوە گوتوویـەتی: ( دوژمنـت تـووڕە مەکـە بەوەی بەبچووکی بزانیت، چونکە دەشێ تۆڵەت لێبکاتەوەو خراپت بەسەر بێنێت).

سوپاس بۆ خوا کـە بێئـەقڵیی حکومـەتی عێـراق و سیاسـەتە چـەوتەکەی، بـوو بەمایـەی هەڵگیرسـانی شۆڕشـێکی نـوێ لکوردسـتاندا ئـەوەش دوای ماوەیـەکی کـەم لەئاشبەتاڵ. ئنجـا لـەپێناو بـەرگیریکردن لەزاڵدەستیی تاکە حزب و کۆنترۆڵکردنی گەلی کورد، جارێکی تر ژمارەی حزبە سیاسییەکان زۆر بوو .

خـەڵك بەپەرۆشـەوە چـاوەڕێی سـەرهەڵدانی بزووتنەوەیـەکی چـەکدارییان دەکـرد، بـۆ نموونـە خـەڵك کەوتنە باسکردنی جموجووڵیکی چەکدار لەدژی دەسەڵات لەشاخ و دۆڵـەکانی قەندیل، هـەروەها گوایـە هێزەکـانی پـۆلیس، راوەدووی جووتیـارێکی چـەکدار دەنـێن کەتـەهها چـەند کەسـێکی لـەخزمانی خـۆی لەگەڵدایە و گوایە ئەو چەکدارە، لەسەر کێشەی زەوی، جووتیـارێکی کوشتووە. ئـەویش خوالێخۆشـبوو حەمـەی مـەلا شـەریف بـوو کـەدواتر بـوو بەیەکـەم شۆڕشـگێڕی دامەزرێنـەری بنکـەی خـەباتی چـەکداری لەشـاخەکانی کوردسـتان لـەدوای ئاشـبەتاڵ بەماوەیـەکی کـەم. ئـەم پیـاوە داسـتانە، نەسیاسـیبوو نەخاوەنی هەستونەستی نیشتمانی یـان نەتـەوەیی، هـەموو مەبەسـت و ئامـانجێکی ئـەوەبوو لەدەستی پـۆلیس هـەڵبێت، لەکاتێکـدا خـەڵکی کوردسـتان سەرگوزشـتەو چـیرۆکی قارەمانیـەتییان دەبـارەی دەگێڕایـەوە ئـەوەش بـەو ئاواتـەی کـەحزبێکی سیاسـی کـوردی دابمـەزرێت و بڵێسەی شۆڕشـێکی نـوێ لەکوردستاندا چەخماخەبدات. ئنجـا خـەڵك، حەمـەی مـەلا شـەریفیان ناونـا(کوێخـا رینگـۆ). مامۆسـتای تێکۆشەر مەلا محەمەد دەڵگەیی لەلای خۆیەوە رۆڵێکی سەرەکی هەبوو لـەوەی حەمـەی مـەلا شـەریف بۆ

مەبەستێکی پێچەوانەی واقیعەکەی وێنابکات، چونکە مامۆستای ناوبراو بەلایەوە وابوو کەدەبێت ئەم پیاوە، بەردەستی پۆلیس نەکەوێت چونکە ئەم کارە سوودێکی گەورەی بۆ ئێستاو دواڕۆژی گەلی کوردستان دەبێت.

دوای ماندوبوونێکی زۆر، توانیم مەکتەبی کاروباری باکوورو بەڕێوبەرەکەی(سەدام حسەین) قایل بکەم کەبوونی حەمەی مەلا شەریف وەکو رووکارێکی نیشتمانی، لەچەند لایەکەوە خزمەت بەحزبی بەعس دەگەیەنێت، ئنجا لەکۆتاییدا توانیم بیری دانوستان لەگەڵ گرووپێکدا کەژمارەیان (٥ ـ ٧) کەس دەبوو لەلای حکومەتی عێراقی دروستبکەم . ئەم مەسەلانەم لەهەرسێ بەرگی کتێبەکەم( کورد دوژمنی خۆت بناسە)دا باسکردووە، پاشان سوپاسی خوام کرد کەتوانیومە یەکەم بنکەی پێشمەرگە لەشاخەکانی کوردستاندا، لەدوای ئاشبەتاڵی شۆڕشی (١٩٦١) دامەزرێنم.

بەبیانووی گەشتەوە مۆڵەتم لەدەسەلاتداریەتیی عێراقی خواستو رومکردە بەیرووت. دوای ٢٦ رۆژ، لەڕێی خوالێخۆشبوو مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد، چاوم بەبەرێز مام جەلال کەوت. سەرەتا ئاگادارم کرد کەچیتر توانام نەماوە لەسایەی حزبی بەعسدا بژیمو رۆژانە ببینم چەند تاوان دەرهەق گەلی کورد ئەنجام دەدەن، هەروەها تێمگەیاند کەبارودۆخی ئێستای کوردستان زۆر پێویستی بەرێکخراوێکی سیاسیی کوردییە. ئنجا بەرێزیان کەوتە باسکردنی رێکخستنی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، بەڵام بیروڕای دەربارەی هەڵگیرسانەوەی شۆڕش پێچەوانەی بیروڕایەکانی من بوو، چونکە ئەو وای بۆ دەچوو کەدواخستنی وادەی هەڵگیرساندنی شۆڕش، لەپێشخستنی باشترە، ئەمەش لەپێناو ئەوەی کەبەعسییەکان لەخراپەکارییاندا بەردەوام بنو کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان دوای چەشتنی ئازاری زۆر، هەست بکەن پێویستیان بەم رێکخستنە سیاسییە کوردییەیە.

راطةياندني دامةزراندني ريَكخستني يةكيَتيي نيشتمانيي كوردستان

لەراستیدا دامەزراندنی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان لەلایەن چەند کوردێکی نیشتمانپەروەرو شۆڕشگێری دوورەوڵات" بەسەرکردایەتیی بەرێز مام جەلال لەو رۆژگارە سەختەدا کەگەلی کورد گیرۆدەی زەبرێکی کوشندەبوو لەسۆنگەی هەڵوێستی گومناویی سەرکردەکەی(بارزانی) کەئاشبەتاڵی بەشۆڕشەکەیان کرد، ئەمە خۆی لەخۆیدا هەڵسانەوەیەکی بێوێنەبوو. چونکە راگەیاندنی دامەزراندنی حزبێکی شۆڕشگێڕ لەورۆژەدا بەرەنگاریکردنێك بوو دژی ئیدارەی دەوڵەتانی ناوچەکەو بەتایبەتی دژی بنەماڵەی بارزانی کەهەرسیان بەشۆڕش کردبوو.

خەڵکی نیشتمانپەروەری کورد لەگەڵ هەموو ئایدۆلۆجیای جیاوازیانو بیروباوەڕی لێکدووریان دڵشادبوون، چونکە ئەوەی بەلایانەوە گرنگ بوو بزیسکەکەبوو، دیارە بڵێسەش لەبزیسکەوە دروست دەبێت. لەئەنجامدا خەڵك هیوایان بەوەدەستهێنانی ئازادی پەیداکردەوە، چونکە ئەوەی لەدایکدەبێت، بەئازادی لەدایکدەبێتو هیچ کەسێك رازی نییە لەسایەی زەبرو کۆیلایەتیدا بژی . جا دوای وتوێژێکی چەند سەعاتی لەگەڵ بەرێز مامەم جەلالدا، بەدڵێکی خۆشو کامەرانییەوە کەمژدەی هەڵگیرسانەوەی شۆڕشم پێیە، گەڕامەوە بۆ بەغدا، سەرەتا چوومە ماڵەوە بینیم دایکم چاوەڕێمە، هەستی بەخۆشییەکەم

کردبوو چونکە بەدەموچاومەوە دیاربوو، گوتم: ( مژدەم بدەریّ، هەواڵێکم پێیە خەڵکی کوردستان پارە بۆ بیستنی دەدەن، لەمێژە وێڵی دوای ئاوی زیندەگیم، ئەوە ئەمرۆ دیتمەوە، دایە بزانە کەوا مام جەلال حزبێکی نوێی دامەزراندووە) دایکم لەخۆشیان دەستی بەرەو ئاسمان هەڵبڕیو کەوتە پاڕانەوە بۆ مام جەلال و حزبە نوێیەکەی.

هەروەکو لەگەڵ مام جەلالدا رێکەوتبووین، ئەو رێنماییانەی پێمی‌دابوو بەوردی جێبەجێم کردن و ئەوەی بەمەسەلەکەوە پەیوەنداربوو ئاگادارمکرد کەشۆڕشی ئەمجارەی گەلی کوردستان بەسەرکردایەتیی حزبێکە ناوی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانە کەمام جەلال رابەرایەتیی دەکات. لەوانەی ئاگادارمکردن کەبێنە ریزی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانەوە ئەمانە بوون:

عەلی عەسکەری: بەفەرمانی بنەماڵەی بارزانی شەهیدکراو راست بەدەستی یەکێك لەجەلادەکانیان ئەویش سامی عەبدولڕەحمان بوو کەچەکی R.B.G ی بەفەرمانی ئیدریس بارزانی بەکارهێنا بۆ ئەوەی جەستەی پارچە پارچە ببێت.

دکتۆر خالد حەمە سەعید: ئەمیش بەهەمان شێوە بەفەرمانی بنەماڵەی بارزانی بە R.B.G کوشتیان کەدووبارە سامی عەبدولڕەحمان کارەکەی ئەنجامدا سەیر لەوێشدایە سامی عەبدولڕەحمان، ساڵی ١٩٦٣ کاتێك دوابەدوای کودەتای بەعسییەکان بەغدای بەرەو کۆیە بەجێهێشت، مامۆستا عەبدوڵلاّ کانی‌مارانی رۆڵێکی گەورەی بینی بۆ رزگارکردنی لەمەرگ، ئەوەبوو ماوەیەك لەماڵی خوالێخۆشبوو کاکە زیاد محەمەدئاغا لەکۆیە مایەوە. هەر شەهید خالیدیش بوو کەیارمەتی سامی عەبدولڕەحمانی‌دا کە لەرێکخستنەکانی پارتیدا کارێکی دەستبکەوێت کاتێك لای بارزانی قسەی خێری بۆکردبوو لەکاتێکدا لەکۆیە کەس گوێی پێنەدەدا، تەنانەت بارزانی گوتبووی: ( ئەم شیوعیە بەلاّی بۆ خۆی سازاندووەو ئێوەش دەتانەوێت کاری بۆ بدۆزنەوە...باشە، با قسەی ئێوەبێت) پێدەچێت سامی عەبدولڕەحمان، ئەو رقەی لەدڵی خۆیدا هەڵگرتبێت کەدکتۆر خالید کاتی خۆی یارمەتیداو ئەم خۆی بەکەمتر زانیوە... بەلاّم وەکو نەیدەتوانی رزگاری بکات، دەبا هیچ نەبوایە خۆی جەلادی نەبوایە!.

شەهاب، جەعفەرو ئەنوەر: بەفەرمانی سەدام حسەین لەسێدارەدران.

شەهید ئارام: بەدەستی تەحسێن شاوەیش کوژرا کەفەرماندەی مەفرەزەیەکی ئاسایشی گشتیی بوو لەژێرەوە کاری بۆ بنەماڵەی بارزانی دەکرد کەبۆ ئەوە رەوانەی ناوچەکەیان کردبوو نیازە گلاّوەکانیان لەدژی شۆڕشی نوێی گەلی کوردستان جێبەجێبکات.

عومەر مستەفا(عومەر دەبابە): بەنەخۆشیی کۆچی دوایی‌کرد.

مەسعوود محەمەد: کوڕی زانای پایەبەرز مەلا محەمەدی جەلی زادە، ئەمیش بەنەخۆشیی دڵ کۆچی دوایی‌کرد.

ئەمانە خوا بەگەورەیی خۆی لێیان خۆش بێت هەمیشە سیمبوڵی خەباتی شۆڕشگێڕبوون لەکوردستاندا. ئەوانەی ماون بەڕێزان محەمەدی حاجی تایەرو عەلی مام رەزا کەئێستا لەسلێمانی دەژین، خوا تەمەنیان درێژ بکات.

## لادانەكانی یەكێتیی كەكاریان كردە سەر رەوتی شۆڕش

یەكێتیی نیشتمانیی كوردستان، لەرۆژی دامەزراندنیەوە تا ئەمڕۆ كەدەكاتە ٢٧ساڵ، دووكاری لێوەشاوەتەوە كە بەگورزێكی كوشندە لەسەر رەوتی خەباتی كوردی دەژمێردرێت، یەكەمیان: شەڕی ناوخۆیە لەگەڵ پارتی دیموكراتی كوردستان كە تائەمڕۆ بەردەوامە ئەوەش ئەگەر ماوەی دوای وەستانی شەڕ، بەجەنگی سارد لەنێوانیاندا لەقەڵەم بدەین هەرچەندە بەڕێز مام جەلال و سەركردایەتیی حزبەكەی، ئەوساو ئێستاش رۆڵی بەرچاویان گێڕاوە بۆ سەقامگیركردنی ئاشتی. دووەم كار: رێگەدان بەهێزە چەكدارەكانی كۆماری ئیسلامیی ئێران كە لەبنكەوبارەگاو ئۆردوگای پارتی دیموكراتی كوردستانی ئێران بدەن لەرێی بەكارهێنانی ناوچەی ژێر دەسەلاتی یەكێتیی هەرچەندە پێش پەلامارە سەربازییەكەی ئێران، بەڕێز دكتۆر فوئاد مەعسووم، مەكتەبی سیاسیی پارتی دیموكراتی كوردستانی ئێرانی لەو هەنگاوە ئاگاداركردەوەو لەئەنجامدا یەك كەس بەرنەكەوت و تەنها زەرەروزیانێكی كەم بەچەند خانوویەك كەوت.

من لەلای خۆمەوە، تائێستا خۆم بەقەرزارباری ئازادیی چاپەمەنی لەسایەی دەسەلاتی یەكێتیی نیشتمانیی كوردستان دەزانم كەتا ئێستا یەكێك لەسەر بلاوكردنەوەی سێ بەرگی كتێبەكەم (كورد دوژمنی خۆت بناسە) رێگەی پێنەگرتووم لەكاتێكدا لەزۆر شوێنی نووسینەكانمدا باسمكردوون و گیروگرفتم بۆیان ناوەتەوە، بەلام وەكو گوتم: ئازادیی چاپەمەنی لەم ناوچەیەی كوردستانی ئازاددا بواری بۆ خەڵك هەمواركرد ئاگاداری وردودرشتی ژیانی سیاسیم ببن و بەو زانیاری و راستییانەش بزانن كە لەلامن.

### دووبەرەكی فاكتەری كەمەرشكێنی گەلی كورد

ململانێی ناوخۆو بەدینەهێنانی یەكڕیزی و یەكڕایی، هەمیشە هۆكاری سەرەكی بوون لەوەی كورد بەمافی رەوای خۆی نەگات و خوێنی مرۆڤی كورد، بەدەستی هاوخوێنی بەفیڕۆبڕوات، لەكاتێكدا هەموو كتێبە ئاسمانییەكان ئەم نەریتانەیان قەدەغەكردووە هەروەكو خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: ﴿ ومن يقتل مؤمناً متعمداً فجزاؤه جهنم خالداً فيها، وغضب الله علیه ولعنه وأعد له عذاباً عظيما﴾ (ئایەت) هەروەها پێغەمبەری مەزن(د.خ) كەفەرمویەتی: ( لزوال الدنيا أهون على الله من قتل مؤمن بغير حق) .

پێم وایە شەڕی ناوخۆی كوردان میراتییەكە لەباوباپیرانمانەوە بۆمان بەجێماوە، هەندێك جار شەڕ لەنێوان میرنشینە كوردییەكان یان عەشرەتەكاندا هەڵدەگیرسا، بەلام پێ بەپێی پەرەسەندن و گۆڕانكارییە كۆمەڵایەتییەكان ئێستا بۆتە شەڕی نێوان حزبە سیاسییەكان كەدیارە لەئەوسا توندترە . لەم بارودۆخەی ئێستاشدا كەبۆ كورد هەڵكەوتووە، ئەگەر ناكۆكی و شەڕی ناوخۆ نەبوایە ئەوە كورد بەمافی خۆی دەگەیشت... بەلام خوا خەتابار بگرێت.

هۆی دواكەوتنی كورد لەبەدەستهێنانی ئازادی و هەنگاونان شانبەشانی گەلانی ئازاد، بۆ سێ هۆكار دەگەڕێتەوە:

١ ــ لێنــەهاتوویی ســەرکردە کوردەکــان و دەستەوســانییان لەیەکخــستنی وشــەی کــورد لــەپێناو بەکارهێنانی یەکڕیزی و یەکڕایی بۆ بەرژەوەندیی نەتەوەی کورد، جا لێنـەهاتوویی و دڵسۆزی نەنوانـدن، تواناو کاردروستایی لەناوبرد.

٢ـ کەمی ژمارەی رۆشنبیران و ئاگایانی سیاسی لەناو خەڵکی کوردستاندا وایکرد دیدی مرۆی کورد بەرامبــەر پێـشهاتەکان نابینابێــت و هەڵــسەنگاندنی بــۆ رووداوەکــان لاواز بێــت و چــاك و خــراپ لــێکتر جیانەکاتەوە، دیارترین نموونەش هەڵبژاردنەکانی ١٩٩١ە.

٣ ـ چوار دەوڵەتی دراوسێی کوردستان (عێراق، سووریا، تورکیاو ئێران) رۆڵی سەرەکییان بینیوە لەرووی ئاژاوەنانەوەو بەرەنگاربوونی هەر بزووتنەوەیەکی راستگۆی جەماوەری کورد لەپێناو ئازادی. موخابەراتی ئەو چوار دەوڵەتە ئەوساو ئێستاش پارەی مۆڵ بۆ بزووتنەوەکان تەرخاندەکەن تا کۆڵ بدەن و، ئەگەر ملیان نەدابێت پیلانیان بۆیان گێڕاوە کەئەم هەنگاوە شەیتانیانەیە تا ئەمرۆ بەردەوامەو پرۆسەی ئاشتی لەکوردستاندا لەبارداەت و کۆمەڵانی خەڵکی کوردستانیش گیرۆدەی چەرمەسەری و دەربەدەری و ماڵوێرانی دەکات. بۆ نموونە لەوەتەی ناوچەی ئارامی دژەفڕین دەستنیشانکراوەو هێزی هاوپەیمانان لەئەنچەرلیك جێگیرکراون، ئیدارەی دەوڵەتانی دراوسێی کوردستان هەموو سێمانگ جارێك کۆبوونەوەی ئاسایی خۆیان بۆ تاوتوێکردنی بارودۆخی کوردستان دەبەستن . کاتێکیش توانییان تۆوی ئاژاوەو دووبەرەکی بچێنن و شەڕی ناوخۆ لەنێوان هەردوو زلهێزی کوردستاندا هەڵگیرسا، ئیتر کۆبوونەوەکانی ئەوان کەمبۆوە، ئێستاش ئەوان لەبەیاننامە رەسمییەکانیان بەئاشکرا هاوار دەکەن کەرازی نین ئەمریکا دەست وەربداتە کاروباری ناوخۆی عێراق ئەمەش لەترسی ئەوەی نەبادا کوردستانی باشوور، مافە رەواکانی بێنێتەدی کەشتێکی بەڵگەنەویستە ئەمە کاریگەریی خراپی دەبێت بۆ سەر ئاشتیی ئەو وڵاتانە، ئنجا لەگەڵ داخی زۆرماندا دەبینین هەموو دەوڵەتە عەرەبییەکان، لەگەڵ دەوڵەتانی دراوسێدا هاوبیروڕان جگە لەسەرۆك و خۆشەویستی گەلی کورد، سەرۆك معمەر قەزافی خوابیپارێزێت.

رێگەچارەی کێشەکەمان و دەرمانی دەردە کاریگەرەکەمان تەنها یەکێتی و یەکبوون و یەکگرتنە کەئەمەش بەسەقامگیرکردنی بیروڕای راستگۆو کۆمەکی هێزو بازووی دڵسۆزان نەبێت نایەتەدی ئەمەش لەرێی پاکسازیکردنی سەرچاوەکانی خراپەکاری و گەندەڵی لەکورستانداو یەکخستنی گەلی کورد لەسایەی یەك ئاڵادا، ئەڵبەت رۆژێکیش دێت ئەم خەونە دێتە دی.

پێغەمبەری مەزن فەرمویەتی: ( کەسی ئیماندار دووجار لەیەك شوێندا پێوەنادرێت)، بەڵام سەرکردەو سەرۆکەکانمان هەمیشە دەکەونە هەمان هەڵەی پێشوویان، هۆی ئەمەش بۆ سوود وەرنەگرتن دەگەڕێتەوە لەئەزموونەکانی رابردوو هەروەها نەشارەزایی و تێکەوتنیان بەوەی دەبنە بەکرێگراوی وڵاتان.

دوای ئەوەی مەلامستەفا بارزانی و ئیدریس و مەسعوودی کوری، ئاشبەتاڵیان بەشۆڕشی کورد کرد لەپێناو ماڵی دونیا، پێشمەرگەکانی شۆڕش و ئەندام و کادیرە حزبییەکانی پارتی" بەدەر لەپلەی حزبی و

دەوری سیاسییان، بوون بەسێ بەشەوە: بەشێکیان خۆیان تەسلیمی حکومەتی عێراقی کردو خۆیان دایە دەستی قەدەر کەزۆربەی ئەمانە زەرەرمەندبوون، بەشێکیان ئاوارەیی‌و دوورەولاتییان هەڵبژاردو بوونە پەنابەر لەولاتە جیاجیاکانی جیهان کەئەمانە براوەبوون، بەشێکیشیان روویانکردە ئێران‌و لەسایەی حکومەتی شای ئێران ژیانیان بردەسەر کەئەمانە لەهەموان زیاتر زەرەرمەندبوون.

لەکەسایەتییە ناسراوە سیاسییەکان کە لەگرووپی یەکەم بوون‌و گەڕانەوە بۆ عێراق: ساڵح یووسفی کەدەسەلاتداریەتیی عێراق تیرۆریکرد، عەلی عەسکەری‌و دکتۆر خالید محەمەد سەعید کەبنەماڵەی بارزانی شەهیدیانکردن، دارا تۆفیق‌و لوقمان مستەفا بارزانی‌و سابیر مەلامستەفا بارزانی، دەسەلاتداریەتیی عێراق تیرۆریکردن، نوری ئەحمەد تەها لەماڵی خۆیدا کۆچی دوایی کرد، عومەر مستەفا(عومەر دەبابە) لەباوەشی شۆڕشی کوردستاندا بەنەخۆشی کۆچی دواییکرد، کاکە حسەین خانەقا لەماڵی خۆیدا کۆچی دوایی کرد، مەلا جەمیل رۆژبەیانی لەم دواییانەدا دەسەلاتداریەتیی عێراق تیرۆریکرد، عەبدولوەهاب ئەترووشی چووە ریزی موخابەراتی عێراقیی، عەبدوڵلا ئاغای پشدەرو رەشید سندی گەڕانەوە بۆ ریزی بنەماڵەی بارزانی، شێخ رەزا گولانی لەدوای هەڵگیرسانی شۆڕشی ئیسلامی لەئێران، گەڕایەوە بۆ عێراق وهەتا رووداوەکانی ٣١ی ئابی ١٩٩٦مایەوە ئنجا چووەوە باوەشی بنەماڵەی بارزانی، کاکە زیاد ئاغا لەکۆڕەوە مەزنەکەی گەلەکەمان (نیسانی ١٩٩١) کۆچی دواییکرد.

بەشی دووەم کەروویانکردە هەندەران‌و ئاوارەییان هەڵبژارد ئەم بەرێزانە بوون: ئیبراهیم ئەحمەد، د.فوئاد مەعسووم، د.کەمال فوئاد، د. مەحموود عەلی عوسمان، شەمسەدین مفتی، نوری شاوەیس، مستەفا قەرەداغی، د. شەفیق قەزاز، جەوهەر نامیق، رۆژ نووری شاوەیس، فازل میران، عەدنان مفتی، عارف تەیفوور، کەریم سنجاری، سامی عەبدولڕەحمان، محەمەد ئەمین محەمەد بەگ، عەبدولڕەحمان بێداوی، موحسن دزەیی، عەلی سنجاری، عەبدولڕەزاق فەیلی، عادل موراد، ئازاد خەفاف، کەمال شێخ غەریب، حەمەی عەزیز.

بەڕێز جەلال تاڵەبانی‌و کاک نەوشیروان مستەفا هەرپێش ئاشبەتاڵ، بۆ هەندێك کاروباری سیاسی بەفەرمانی سەرکردایەتیی حزب لەدەرەوەبوون.

بەشی سێیەم لەپاڵ بنەماڵەی بارزانیدا مانەوە کە بەهەرزان فرۆشتنیان، ئەمانە ژیانیان لەسایەی شای ئێران‌و بارزانیدا هەڵبژارد کەئەمانەبوون: عەلی عەبدوڵلا، خورشید شێرە، مەلا قادر، یوونس رۆژبەیانی، عەبدولوەهاب ئەترووشی، شێخ رەزا گولانی، رەشید سندی، عەبدوڵلا ئاغای پشدەر، جەمال نامیق، فازل میران، خەلیل ئیبراهیم.

هەموو ئەمانەی باسمکردن، هەتا هەڵگیرسانی شۆڕشی خوالێخۆشبوو خومەینی سەربەخۆبوون، دوای ئەوە دووبارە چوونەوە پاڵ بنەماڵەی بارزانی جگە لەعەبدوولوەهاب ئەترووشی کەچووە ریزی موخابەراتی عێراق، هەروەها خەلیل ئیبراهیم کەگومانی لێدەکرا پەیوەندی بەدەسەلاتدارانی عێراقەوە هەبێت.

مەحموودئاغا کاکە زیادئاغا لەدوای ئاشبەتاڵو هەتا لەگەڵ خێزانەکەیدا ئێرانی بەجێهێشتو لەئەورووپا داوای مافی پەنابەریکرد هەر سەربەخۆ مایەوە. ناوبراو کوڕی حەمە ئاغای کۆیەیە (حاتەمی تەیی کوردان). مەحموود ئاغا سیاسەتمەدارێکی نیشتمانپەروەرو دڵسۆزو چاونەترسو شۆڕشگێڕبوو.

کورد، بەدرێژایی مێژووی، هیچ شۆڕشێکی ئەوەندەی شۆڕشی ئەیلوول نەیخایاند(١٩٦١ ـ١٩٧٥) کەلەو ماوەیەدا هەموو کوردی لەژێر یەك ئالأدا یەکخستو پشتگیریی زۆربەی خەڵکی کوردی لەسەرانسەری جیهاندا بەدەستهێنا. بەڵام ئەوەی گەلی کوردو بەتایبەتی سیاسەتمەدارەکانی بەتەمای نەبوون ئەوەبوو کەبارزانی هەرەسی پێبێنێت هەرچەندە زۆر رێوشوێن لەئارادابوو کە لەرێگەیانەوە، گەورەکانی رازی بکاتو ماڵوێرانیو کوشتاری خەڵکی کورد لەکوردستان دووربخاتەوەو بەوشێوەیە کۆتایی بەو شۆڕشە مەزنە نەهێنێت، ئەمە جگە لەوەی بارزانی، هەموو هەوڵەکانی لەباربردنی شۆڕشی گەلی کوردستانی پووچەڵکردەوەو تەنانەت بەتوندی دژایەتی ئەوانەشی کرد کەویستیان لێڕاوانە هەوڵبدەن شۆڕش هەرەس نەهێنێت، ئەوەبوو لە ١٣ی ئازاری ١٩٧٥ تێکۆشەری شۆڕشگێڕ حەمەئاغای مێرگەسووری کوشت کەهەوڵیدا بەرهەڵستی بکاتو هەرەس بەشۆڕش نەهێنێت.

لەکۆبوونەوەیەکدا لەم بارەیەوە، خوالێخۆشبوان، ئیبراهیم ئەحمەد، عەلی عەسکەری و عومەر دەبابە بەهەموو زانایيو زیرەکییەکیانەوە هەوڵیاندا بارزانی قایل بکەن کە لەبڕیاری ناڕەوای ئاشبەتاڵی شۆڕش پەشیمانی بکەنەوە لەبەر رەهەندە مەترسیدارەکانی. ئینجا زۆر پێشنیاریان خستە بەرچاوی کەپێش ئەوەی بچنە لای، لەناو خۆیاندا لێیان کۆڵیبوونەوە کەپێشنیارەکان هەموو لایەکیان رازیدەکرد، بەڵام بێسوودبوو، خوالێخۆشبوو دکتۆر کامل عەتار بۆمی گێڕایەوە کەئەوان، ئاگاداری ئەم کۆبونەوەیە بوونو بەپەرۆشەوە چاوەڕێی ئەنجامی باشیان لێدەکرد. هەروەها گوتی منو سیاسەتمەدارو فەرماندە سەربازییەکانی تر لەکۆبوونەوەیەکدا بەشداربووین کەبەرێز فاروقی مەلا مستەفا نوێنەری حزبی شیوعی (قیادەی مەرکەزی) بوو لەو کۆبوونەوەیەدا کاك فاروق زۆر هەوڵی لەگەڵ بارزانیدا کەرێگەچارەیەکی تر بۆ کێشەکە بدۆزێتەوە نەك ئاشبەتاڵ کەبارزانی لەبەردەمی ئامادەبوان زۆر سووربوو لەسەر ئەنجامدانی . کەچی بەرێز رەشید سندی، لەبریتی بارزانی وەڵامی فارووقی مەلا مستەفای دایەوەو گوتی: بارزانی، لەدوای روخانی کۆماری مهاباد کەروویکردە یەکێتیی سۆڤێت توانی دوای دوانزە ساڵ بگەڕێتەوەو سەرکردایەتیی ئەم شۆڕشە مەزنە بکات، کەواتە چی تێدایە ئەگەر ئێستا بەپێی گوشاری پێشهاتەکان هەرەسی پێ بێنێت، دوای ماوەیەکی کەمیش بێت شۆڕش هەڵدەگیرسێنێتەوە.

ئەم هەوڵو تەقەلا دڵسۆزانە لەگەڵ بارزانیدا کەڵکیان نەبوو، چونکە توندیی ئەو فەرمانانەی پێی کرابوون کەئاشبەتاڵ بەشۆڕش بکات لەوە زۆر گەورەتربوون. هەروەها زاڵدەستیی بارزانی لەسەر شۆڕش فاکتەرێکی بەهێز بوو لەدژی بیروڕاو هیواو ئاواتی ئەو بەرێزانە، بۆیە بارزانی رێگەخۆشکەری خیانەتکاری بوو کەشتێکی بەڵگەنەویستیشە گەورە، ئاو دەڕێژێتو بچووك پێی تێدەخات. بەڵام بەپشتیوانی خواو تێکۆشانی خەڵکانی ورەبەرزو نیشتمانپەروەر، بێدەسەڵاتيو بێورەیی، هەموو سیاسەتمەدارو شۆڕشگێڕەکانی نەڕووخاندو لەماوەیەکی کەمدا کەچاوەڕوانکراو نەبوو، گرووپێك

لەشۆڕشگێڕە هەرە دڵسۆزەکانی گەلی کورد یەکیانگرتو شۆڕشێکی تریان بەسەرکردایەتیی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان هەڵگیرساندەوە کەلەوانە کۆمەڵێك بوون لەوانەی پێش ئاشبەتاڵ لەهەندەران بوون وەکو بەڕێزان: مامە جەلال، نەوشیروان مستەفا، دکتۆر فوئاد مەعسووم، عەدنان مفتی، عادل موراد، عەبدولڕەزاق فەیلیو هی تر. بەلأم خوالێخۆشبوو ئیدریس بارزانی راستی گوت کاتێك گوتی: ئەگەر نەتوانین درێژە بەشۆڕشەکەمان بدەین ئەوە دەتوانین شۆڕشی خەڵکی تر لەناوبەرین!

بەراستیش هەمووی دوو مانگ بەسەر دامەزراندنی یەکێتیی نیشتمانی کوردستاندا تێنەپەڕی کاتێك بنەماڵەی بارزانی دەستیانکرد بەکۆسپوتەگەرە نانەوە لەبەر رێی شۆڕشی نوێدا کەئەم بارە تا ئەمڕۆش بەردەوامە، ئەوەش سەرەتا لەرێی دامەزراندنی (القيادة المؤقتة)بوو کەکوردستانی بەسەر دووپارچەدا دابەشکرد کەئەم بارەشیان تا ئەمڕۆ بەردەوامە.

لێرەدا رووی گلەییم ئاراستەی سەرکردایەتیی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان دەکەمو دەڵێم دەبوایە لەروانگەیەکی وردترەوە سەیری واقیعەکەیان بەکردایەو، لەسەرەتای دامەزراندنی یەکێتیی نیشتمانیدا پەیوەندیی بەرفراوانیان لەگەڵ هەموو سەرانی شۆڕشی ئەیلولدا بەکردایە کەلەو کاتەدا لەهەندەران بوون. لەرێی مام جەلالەوە ئاگاداری هەندێك لەو پەیوەندییانە بووم بەلأم دەبوایە ئەو مەسەلەیەیان فراوانتربەکردایەو حسابێکیان بۆ رۆڵی دەزگا موخابەراتییەکانی دەوڵەتانی دراوسێ بەکردایە کە بەهەزار باردا، شۆڕشی نوێیان هەڵدەسەنگاند، بەرێوەبەری ئاسایشی ناوچەی باکوور(عێراق) بۆمی گێڕایەوە کەئەوان هەمیشە پەیوەندییان لەگەڵ دامودەزگا ئەمنییەکانی تورکیاو ئێران هەبوو لەوبارێوە بێئەوەی گوێ بدەنە پەیوەندییە ئاڵۆزەکانی نێوان حکومەتەکانیان.

چەند نیشانەو بەڵگەیەك هەیە لەسەر ئەوەی کەقیادەی مووەقەتە، رەزامەندی لەدەزگا موخابەراتییەکانی دەوڵەتانی دراوسێ وەرگرتبوو، بۆ نموونە لەسەرەتای دامەزراندنی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، دوای هەوڵدانێکی زۆر توانیم دەروازەی گفتگۆ لەنێوان سەرکردایەتیی حزبی بەعسو بەرێز مام جەلالدا بکەمەوە، لەم رووەشەوە هەنگاوی باشم نابووو هیوای زۆرم بەئەنجامەکانی هەبوو چونکە یەکێتیی نیشتمانی، تاکە حزبێك بوو لەکوردستاندا کەبشێت گفتوگۆی لەگەڵدا بکرێت ئەمەش چونکە هیچ گوشاری دەرەکی لەسەر نەبوو کەرێگە لەسەقامگیرکردنی ئاشتیو پاراستنی ئاسایشو مافەکانی هاوولأتیی کورد بێنێتەدی. بەلأم لەناکاو گۆڕانکارییەکی کتوپڕ بەسەر هەڵوێستی حکومەتی عێراقییدا هات کەنەمزانی هۆی چی بوو! دوای ماوەیەك بۆم دەرکەوت کەدامەزراندنی قیادە مووەقەتە، بوو بەمایەی ئەوەی دەسەلأتدارانی عێراق بایەخ بەشۆڕشی نوێی گەلی کوردستان نەدەن، چونکە پێدەچێت ئەوان تەواو لەوباوەڕەدابن کەلایەنێك هەیە، بێئەوەی پێویست بەئەمان(بەعس) بکات، شۆڕش پەکبخەن. خوالێخۆشبوو مامۆستا مەسعوود محەمەد، کاتێك مەسەلەی هەڵگیرسانەوەی شۆڕشی گەلی کوردستانم بەسەرکردایەتیی مام جەلالو لەژێر ئالأی یەکێتیی نیشتمانییدا بۆ کردەوە یەکسەر گوتی: چاکتر وایە مام جەلال، لەگەڵ کوڕەکانی بارزانیدا رێکبەکەوێت، چونکە ئەوان رێگەی پێنادەن سەرکردایەتیی شۆڕشی کوردستان بکاتو تەگەرە دێننە رێگەی.

بەراستیش وادەرچوو، جا ئەگەر لاپەڕەکانی مێژوو هەڵبدەینەوە بۆمان دەردەکەوێت کەخودی بارزانی و بنەماڵەکەی، هەمیشە کۆسپی ڕێگەی شۆڕشەکانی کوردستان بوون لەهەموو بەشێکی کوردستانی گەورەدا.

لێرەدا دەمەوێت لەدڵەوە سلاوێکی شۆڕشگێڕانە ئاراستەی سەرکردەو ئەندامە بەشەرەفەکانی پارتی بکەم کەهەمیشە نیشتمانپەروەرو بەئەمەك بوون، بەڵام حەزدەکەم پرسیارێکیان ئاراستە بکەم کە بەبیری هەموو سیاسەتمەدارێکی کورددا دێت: ئێوەی سەرانی پارتی، عەرشی بارزانیو نەمرییەکەیتان دروستکرد، هەرگیز خودی بارزانی پاڵنەرتان نەبووە بۆ نواندنی نیشتمانپەرەری، ئەوەی لەتواناتاندابوو کردتان بۆ سەرخستنی شۆڕشی کوردستان کەئەو سەرۆکایەتی دەکرد، بەڵام ئێوە هەمیشە دەتانبینی چۆن بەشێوەیەکی نادادپەروەرانە ماڵی کوردی دابەشدەکرد ( 1 for you،10 for me )، ئاگاداریشن چۆن ماڵو سامانیان کۆکردەوەو دوای ئاشبەتاڵ پێکردنی شۆڕشی کوردستان، بەناوی خۆیانو کەسوکاریانەوە لەبانکەکاندا ئەسپاردەیان کردن.

دوای ئاشبەتاڵ، ئەوانەی ڕوویانکردە ئێران هەوڵیاندا ڕێکخستنەکانی پارتی یەکبخەنەوە، بەڵام پیاوانی ساواك( موخابەراتی ئێران) ڕێگەیان لێگرتنو چەند کادیرێکیان لێیان دەستگیرکرد. کاتێکیش تۆمەتی سەرلەنوێ ڕێکخستنەوەی پارتییان درایە پاڵ، ئەوان بۆ خۆ ڕزگارکردن نایان بەسەر بنەماڵەی بارزانییەوە کەچی بنەماڵە، نکووڵی لەوەکرد! چونکە بارزانی رایگەیاندبوو کە(جارێکی تر درێژە بەشۆڕش نادەمو کورد بەکوشت نادەمەوە)، دوای ئاشبەتاڵیش دەیگوت (جارێکی تر سەرکردایەتیی هیچ شۆڕشێك ناکەمو خەڵکی بێتاوان بەکوشت نادەم)، بۆیە بنەماڵە، بەم کارەیان، گەورەکانیان رازیکردو هەتا شۆڕشی نوێ بەسەرکردایەتی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان هەڵگیرسا، ئەوان بەپێی ئەو فەرمانانەی پێیان درابوو، ڕێگەیان بەشۆڕش نەدا.

کەواتە ئەی ئەندامە بەشەرەفەکانی پارتی، دوای هەموو ئەمانە بۆچی چوونەوە ژێر سایەی بنەماڵەی بارزانی؟ بۆچی نەچوونە ریزی شۆڕشەکەی بەرێز تاڵەبانی کەلەوێ، لەئێستا شکۆمەندتر دەبوونو پلەشتان بەرزتر دەبوو؟ چونکە بنەماڵەی بارزانی بەکەس رازی نییە مەگەر سەری بۆ شۆڕ بکاتو تەواو گوێ لەمستی بێت!بەڵام لەگەڵ بەڕێز تاڵەبانیدا تاکە حزبی کوردستانیان پێکدەهێنا، هەروەها پشتگیریی سەرجەم جەماوەری کوردستانتان بەدەست دەهێناو کوردیش بەمافە رەواکانی خۆی گەیشتبوو و ڕۆژی بەم ڕۆژە نەدەگەیشت. ئەوسا ئیدارەی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، بەهۆی شارەزاییو ئەزموونو زانیاریتان لەناوخۆی وڵاتو لەدەرەوەیشدا، لەئێستای بەهێزتر دەبوو.

بێگومان ئیدارەی حکومەتی هەرێمی کوردستان، لەوبارەیدا چەند دەستکەوتێکی دەبوو:

١ ــ دەوڵەتانی ناوچەکە سڵیان لێدەکردو حسابیان بۆ دەکرد، بڕواو مەرجی خۆیانو حزبی کارتۆنییان بەسەردا نەدەسەپاند.

٢ ـ مامەڵەی دەوڵەتانی زلهێز لەجیهاندا لەگەڵیدا بەشێوەیەکی تر دەبوو.

٣ . باری ئابووریی کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان لەئەمڕۆی زۆر باشتر دەبوو، چونکە جەستەی دروست لەبیری دروستدایە، ئنجا سەرکردایەتیی داناو دادپەروەر هەرچی چاکەیە ئەوەی لێ دەبینرێت، ئێوەش ئەگەر لەگەڵ ئایدۆلۆجیای تاڵبانیدا ناگونجێن، بۆچی لەهەندەران بیرتان لەوە نەکردەوە کەحزبێکی سیاسی دامەزرێنن؟ خۆ شارەزاییتان هەبوو، لەو رووەوە پسپۆڕ بوون! ئەوسا پلەوپایەیەکی بالاّترتان دەبوو کەهەموو لایەك حسابی بۆتان دەکرد.

لەوانەیە هەندێك گەنج لەوانەی ئاگاداری رووداوەکانی رابردوو رەوتی شۆڕشی کوردستان نین، بەتوندڕەوو لایەنگری لایەنێك تۆمەتبارم بکەن، بەلاّم راستییەکەی وانییە، چونکە ئەوەی سێبەرگی کتێبەکەمی خوێندبێتەوە راستییەکەی بۆ دەردەکەوێت، جگە لەوەی من یەکەم کەس نیم کە بەخراپەبردنی ناوی بارزانی سنوورم بەزاندبێت. جگە لەوەی من هەمیشە حسابم بۆ شتەکان کردووە، ئەوەتا دکتۆر مەحموود عەلی عوسمان، ساڵی ١٩٧٧ نامیلکەیەکی بەناونیشانی( هەڵسەنگاندنی رەوتی شۆڕشی کوردو هەرەسهێنانیو پەندو ئامۆژگارییەکان کەلێوەی هەڵێنجراون) دەرکرد لەلایەن لیژنەی ئامادەکاری پارتییەوە. دوای ئەو، سامی عەبدولڕەحمان کتێبێكو بەیاننامەیەکی دەرکردو سەرباریشی حزبێکی لەدژی بنەماڵەی بارزانی دامەزراند(پارتی گەلیی کوردستان)، ئنجا پرۆفیسۆر کەمال مەجید نەك هەر بەئاشکارکردنی راستییە بێپەردەکان لەسەر بنەماڵەی بارزانی نەوەستایەوە بەڵکو لەلەندەن، لەبەردەمی خەڵکێکی زۆردا رووبەڕوو هەموو پێشێلکاریو زیادەڕەوییەکانی بنەماڵەی بارزانی بەرووی مەسعوود بارزانیدا دایەوە کە بەدرێژایی شۆڕشی کوردستان ئەنجامیانداوە.

ئیدریس بارزانی لەگەشتە یەك لەدوای یەکەکانی کەبۆ پێکهێنانی قیادە موەقەتە ئەنجامیدا، هەموو ئەو بەڵێنانەی پێشێلکرد کە لەدیدارەکانیدا لەهەندەران بەئەندامانی پارتی دابوو، چونکە ئەوان لەسەر ئەمانە رێککەوتبوون:

١ ـ پەیوەندییەکان بەتەنها لەگەڵ ولاّتانی دراوسێدابن، ئەوەبوو بینیمان چۆن دڕترین دوو سوپا بەهەموو تفاقێکی جەنگییەوە هاتنە کوردستان کەبنەماڵەی بارزانی بۆ شکاندنی پشتی کوردو سەرشۆڕکردنی، پێشیان کەوتن. بۆ نموونە کاتێك هەموو حزبە کوردستانییەکان بەبۆنەی یادی ٢٢ ی بەهمەنی ساڵی ١٩٨٨ کۆبوونەوەو بەڕێزان محەمەد مەتەڕیو ئەمیری، نوێنەری کۆماری ئیسلامیبوون، نوێنەری بنەماڵەی بارزانی (فازل میران) بێشەرمانە لەبەرچاوی ئەو هەمووە گوتی: ( بارزانی کاتی خۆی لەپێناو خزمەتکردنی شای ئێران شەڕی پارتی دیموکراتی کوردستانی ئێرانی کرد، لەسەردەمی کۆماری ئیسلامیشدا لەپێناو ئێران ئەو شەڕەی کردەوە، ئەمڕۆش هەر بەناوی بارزانییەوە ئامادەیی خۆمان نیشاندەدەین کەپێش هەر حزبێکی تر ئامادەین کۆماری ئیسلامی رازیبکەینو شەڕی دوژمنەکانی بکەین.

٢ ـ نەهێشتنی دووبەرەکی، کەچی وەکو بینیمان درێغییان نەکرد لەهەڵگیرساندنی شەڕی ناوخۆ، لەوەش دژوارتر لەدوای رووداوەکانی ٣١ی ئابی ١٩٩٦، دەبینین حزبە کوردستانییەکان هەریەکە لەلای خۆیەوە پێشبڕکێ دەکات بۆ رازیکردنی بنەماڵەی بارزانی، دیارە ئەمە تەنها بۆ کوژاندنەوەی خوێنو

کپکردنی ئاستی دووبەرەکییە هەروەها زەمینە خۆشکردن بۆ دواڕۆژێکی باشتر بۆکوردستان بەڵام بنەماڵەی بارزانی ئەو بەربەستەی لەبەرامبەر پرۆسەی هاوپەیمانیەتیی کوردیدا دروستی دەکات، هەتا دێت بەرزتری دەکات.

٣ ـ پابەندبوون بەهەڵوێستی مەردانەو زیادەڕەوی نەکردنی لەسیاسەتی ناوخۆو دەرەوەدا بۆئەوەی کاریگەریی خراپی نەبێت لەسەر حزبە کوردستانییەکانی تر یان دەوڵەتانی دراوسێ ئیتر رەگەزو ئاینیان هەرچییەك بێت، نموونەی ئەم پێشێلکارییانەش ئەوەندە زۆرن بەدەیان کتێب تەواو نابن، بۆنموونە مەرگەساتی عەشیرەتە کوردەکان دوایی نایەت، شەڕی حزبە کوردییەکان بەفەرمانی دەوڵەتانی دراوسێ ئەوەندە زۆرو ئاشکران هەموو کەسێك دەیانزانێت، بەڵام رووداوی وا هەیە هەستو ویژدان بریندار دەکەنو لەمرۆڤایەتی بەدوورن، وەکو هەڵوێستی مەردانەو پاڵنەری مرۆیی کەوای لەمولازم رەباح عجیل ساری تکریتی کرد (کەناوبراو سەر بەعەشیرەتەکەی سەدام بوو) لەگەڵ رەنا ئیبراهیم خەلیل ئەلناسری هاوسەری(خزمی یاوەرێکی سەدام حسەین بوو) کەسکی سێمانگان بوو، لەگەڵ مولازم عیسام عەبدوڵلا بەکر ئەلقەیسی، بەرەو ناوچەی ئۆتۆنۆمی هەڵێن کاتێك دەسەڵاتداریەتیی بەعس سەرقاڵی گێڕانی ئاهەنگی لەدایکبوونی سەدام بوو لە ٢٨ی نیسانی ١٩٩٨دا. ئەو تاقمە چوونە هەولێر بەو نیازەی کەرووبکەنە دەرەوەی ولاتو لەوێ" لەئەوروپا مافی پنابەرێتی وەربگرن، بەڵام بەتەنسیق لەنێوان دەزگای موخابەراتی عێراقو دەزگای پاراستنی لەمەڕ پارتی، ئەوسێ کەسە دەدرێنە دەست رژێم کەهەرسێکیانی کوشتو دوای سێ رۆژ تەرمەکانیانی دایەوە بەکەسوکاریان کەئاسەواری ئەشکەنجدان، بەئاشکرا بەجەستەیانەوە دیاربوو.

کەواتە، برایانی ئەندامی پارتی: کاتێك دوور لەچاوەکانی بنەماڵەی بارزانی، لەماڵەوە ئەم کتێبانەم دەخوێننەوە بڕواناکەم لاریتان بەرامبەر یەك وشەم هەبێت، ئیتر نازانم بۆچی غیرەتتان ناجووەلیت؟ خۆ دوای رووداوەکانی ٣١ی ئابی ١٩٩٦ چەندین کەسایەتیو لێپرسراوی پارتیم بەتەنیا بینیوەو ئەو پرسیارەم لەهەموویان دووبارە کردۆتەوە کەئایا ئاگایان لەمەسەلەی ٣١ی ئاب هەبووەیان نا؟ هەروەها هەڵوێستیان چیبووە بەرامبەری، کەچی سوێندیان دەخوارد لێی بێئاگابوون!، کەواتە ئێوە بەو پلەوپایەیەی هەتانە چۆن بەو رەفتارانەی پارتی رازین کە بەوشێوەیە پارە کۆدەکاتەوەو شۆڕشی کوردستان پەکدەخات، ئنجا سەرباریشی ئەم هەموو پێشێلکارییانەی بنەماڵەی بارزانی دەبینن کەهیچ حسابێکیش بۆ ئێوە ناکات ... ئێوە دەبوایە بەیاننامەیەکتان دربەکردایە تێیدا، رووداوەکانی ٣١ی ئاب ئیدانە بکەن بەڵام...

بنەماڵەی بارزانی کەتوانی رەزامەندیی دەزگا موخابەراتییەکانی چوار دەوڵەتی دراوسێ بەدەست بێنێتو دەستی بەسەر زۆربەی داهاتی کوردستاندا گرتووە کە بەملیۆنان دۆلاری بۆ هەڵدەڕێژێت، هەروەها چەكو تەقەمەنی دەوڵەتانیشی لەبەردەستدایە، ئیتر من بەقەڵەمێکەوە تەنها خوام هەیە پەنای بۆ بەرمو لێی بپاڕێمەوە کەپشتوانیم بکات بۆ ئەوەی بەم چەکەم تۆڵەی گەلەکەم بکەمەوە کەئینشاڵڵا دەشیکەمەوە.

٤ ـ ماڵ و سامانی کورد کەبنەماڵەی بارزانی لەدوای ئاشبەتاڵەوە دەستی بەسەردا گرتووە، لەپێناو خزمەتی گەلی کورددا بەکار بهێنرێت کە بەپێی تۆمارەکان بە ٧ ملیۆن دۆلارو ٤٥ ملیۆن دیناری عێراقی مەزەندەکراوە، ئەمە جگە لە قازانجی ئەو پارەیە لەبانکەکاندا.

لەو رۆژەوە کەقیادە مووەقەتە دامەزراوە هەتا ئێستا، کورد گیرۆدەی نەهامەتیو چەرمەسەری زۆربووە کەچی نەمانبیست لەوپارە دزراوە، یەك دینار بکرێت بەقەرەبووی زیانێك یان لەپرۆژەیەکی ئاوەدانکردنەوەدا بەشداربکرێت، رۆژ بەرۆژ پارەکەیشیان زیاد دەبێت، بەپێی مەزەندەکارییەکانم بۆ داهاتی خاڵی گومرگی ئیبراهیم خەلیل هەروەها بازرگانییە ئاشکرایەکەی نێوان بنەماڵەی بارزانیو دەوڵەتانی دراوسێ، دەستکەوتیان نزیکەی سێ ملیار دۆلارە کەهەمیشە دەڵێن ئەوان لەخزمەتی گەلی کوردستانداندان و ماڵ و سامانی کورد پارێزراوە بۆ رۆژی رەش، ئیتر نازانم چ رۆژێکیان مەبەستە!

کورد دەڵێن پارەی سپی بۆ رۆژی رەش، بۆ ئەمەش شتێك دێنمەوە کە لەبەشەکانی کتێبەکەمدا باسمکردووە: بارزانی دوای ئەوەی ساڵی ١٩٥٩ گەڕایەوە بۆ عێراق، پارەیەکی زۆری ئێرانیی پێدام کە لەبازاڕ بیگۆڕمەوە، دیارە بڕوای بەمن بوو. کەپارەکەم بردە بازاڕ کابرای سەڕاف گوتی ئەم سکەیە کۆن بووەو لەمێژە کاری پێناکرێت چونکە هی سەردەمی رەزا شایە. تکا لەخوێنەر دەکەم سەرنجی یەك شت بدات، بارزانی بەدرێژایی (١٢) ساڵ سامانێکی زۆری لای خۆی هەڵگرتبوو لەکاتێکدا هاوەڵەکانی لەبرسان مردبوون، چونکە ئەوانەی بۆ رووسیای سۆڤێت لەگەڵیدا چووبوون باسی شتی سەیروسەمەرە دەکەن کە لەپێناو پەیداکردنی نان بەسەریاندا هاتووە، بەڵام بارزانی بیری لەوە نەکردەوە دەست لەوپارە شاردراوە بدات کە بەخوێنی ئەوان کۆیکردبۆوە.

تۆ بڵێیت کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان لەئاشبەتاڵەکەوە تا ئەمڕۆ ئەوەندە دەردەسەرییان نەچەشتووە کەبنەماڵەی بارزانی ئەو پارەیەی کە لەلایەتی دابەشی بکات، ئەو پارەیەی لەشای ئێرانیان وەرگرت لەبری جێبەجێکردنی ئەرکەکانیان؟ ئنجا بارزانی دوای ئەوەی چوو بۆ ئەمریکا، لەوێش یەك ملیۆن دیناری وەرگرت! لەدانیشتنێکدا لەگەڵ کوردێکی ئاوارەی هەندەران لەوانەی شارەزاییەکی چاکی هەیە لەبواری بازرگانیو ئەندازیاریو ئاوەدانکردنەوەداو لەئاوارە دەوڵەمەندەکان دەژمێردرێت، دەربارەی ئەو ماڵ و سامانە پرسیارم لێکرد کەبنەماڵەی بارزانی دەستیانکەوتووە، ئەو برادەرە گوتی: من لەبەردەمی خوا دان بەوەدا دەنێم کەئەگەر کاروباری ئاوەدانکردنەوەی کوردستانم بدرێتە دەستو ئەو ماڵ و سامانەی کەبنەماڵەی بارزانی دەستی بەسەرداگرتووەو کە بە ٣ ملیۆن دۆلار مەزەندە دەکرێت بخرێتە بەردەستم، دەڵێم دەتوانم کوردستان بەشێوەیەك ئاوەدان بکەمەوە کەس لەوە جوانتری نەبینیبێت، ئنجا کەفیلیی ئەوەش دەکەم کارگەو دامەزراوی وا دروست بکەم کەپێویستییەکانی کوردستان دابین بکەمو یەك بێکار نەبینن مەگەر خەڵکی نوقستانو کەم ئەندام، زیاد لەوەش دەوڵەتانی دراوسێو بازرگانە ملیۆنەرەکانی جیهان ناچار بکەم شێت بن هەتا پشکێکیان لەمامەڵەو بازرگانیکردن لەگەڵ کوردستاندا دەست بکەوێت. کەواتە بنەماڵەی بارزانی ئەمرۆ چۆنیان دەوێت با بەوشێوەیە بیبەنەسەر، بەڵام دەبێت

**بـزانن کەقـەرز، کـۆن دەبێـتو نافـەوتێت... خـوای گـەورەش فەرمویـەتی﴿یـا ایهـا الـذین امنـوا اصـبروا وصابروا ورابطوا واتقوا الله لعلکم تفلحون ﴾.**

## موخابەراتو ئەنفال

خــوای گــەورە، ئــادەمیزادی بەســەر هــەموو بوونــەوەرەکانی تــردا شایــستەکردووەو هەرچــی لەگەردووندایە خستوویەتییە خزمەتی مرۆڤ. هەموو مرۆڤێکیش بەئازادی لەدایکدەبێت بەڵام زۆرداران بەکۆیلەی دەکەن ـ پەیامی پێغەمبەری خوا خواش(د.خ) شۆڕشێك بوو بۆ پشتگیریکردنی کۆیلە دژی گەورەکان... کەواتە، تۆبڵێی ئاینێکی لێبوردەی وەکو ئاینی ئیسلام کەرێگەی داوە مرۆڤ لەپێناو بەرگری لەخۆکردن، مرۆڤ بکوژێت، ئایا بەقەلاچۆکردنی گەلێك رازییە کەتەنها تاوانێکیان ئەوەیە کوردن.

زۆردارەکانی حزبی بەعس لەهەڵمەتەکانیان بۆ قەلاچۆکردنی کورد، وشەی ئەنفالیان بەخۆڕایی بەکارنەهێناوە بەڵکو نیازێکی خراپیان لێی هەبووە کەشەیتان ئەو دەرسەی پێداون. یەکێك لەو نیازانەی بەکارهێنانی ناوی سوورەتێکی پیرۆزی قورئان بۆ حەلاڵکردنی لەناوبردنی نەتەوەیەك پاساوی کردەوەیەکە تەنها ستەمکارە بێبەزەییەکان پێی قایلنو بڕوایان بەوەیە کەخوا، فەرمانی بەو کردەوەیە داوە کەئاینە ئاسمانییەکان حەرامیانکردووەو خودی مرۆڤ دڵی لێی دەبێزرێت. ئەنفال واتە ماڵو دەستکەوتێکە کە لەشەردا دەستدەکەوێت، ئەوانەش کەخوێنخۆرەکانی سەدام لەناویان بردن خەڵکی بێچەكو نەداربوون، لەزەویو کۆختەکانیان بەولاوە هیچی تریان نەبوو کەشەڕکەر تەماعی تێبکات...جگە لەوەی شەڕکەر، رازی نییە منداڵ زیندەبەچاڵ بکاتو ژن بکوژێتو جەستەی کوژراوێکی بێچەك بشێوێنێت.

ئێستا ئێمە بەپەرۆشەوە چاوەڕێی ئەو رۆژەین کەخوای گەورە لێشاوی قینی بەسەر سەدام حسەینو دەستوپێوەندەکانی داباڕێنێت بۆ ئەو تاوانانەی ئەنجامیاندا، چونکە ئەوەی بەزەیی لەدڵیدا نەبێت، خواش بەزەیی پێدا نایەتەوە. وەکو پێشتر لەکتێبەکانمدا باسمکردووە، باسی شتێك ناکەم لێی ئاگادار نەبم، بەلاَو ئەو مەرگەساتەی بەسەر کوردستانی باشوور(باکووری عێراق) دا هات کەدڕندانەترین پرۆسەی تاوانکارییە لەلایەن دڕندەترین کەسەوە بەرامبەر بەگەلێك کردبێتیو هەوڵیدابێت بەئاگرو ئاسن، گەلی کوردستان بتوێنێتەوەو ترسو تۆقین بخاتە دڵی هەرکەسێکەوە کەپرکێشی دەکاتو وەك مرۆڤ داوای مافی خۆی دەکات، ئەمە ناچاریکردم شتێکی لەسەر بنووسم هەرچەندە لەوکاتەدا لەعێراقدا نەبووم، بەلاَم بۆ نووسین پشتم بەو نووسینانە بەست کەدەزگاکانی بلاَوکردنەوە لەناوخۆو لەدەرەوەی عێراقدا بلاَویان کردەوە، هەروەها دیدارەکانم لەگەڵ چەند دۆستێکی دێرین لەوانەی خێزانو کەسوکاریان ئەنفالکراون بەتایبەتی لەناوچەکانی دەوروبەری کەرکوكو قەرەداغ. شایەنی باسە مامۆستا سەلاَح رەشید رۆڵی سەرەکیی بینی کەدەرگای وەزارەتەکەی (وەزارەتی مافی مرۆڤ) بۆ کردمەوەو ئاسانکاریی بۆم کردم کەبەڵگەنامەو ئەو نووسراوانەی خستە بەردەستم کە بۆئەم مەبەستە پێویستم پێ بوو، هەروەها سوپاسی زۆرم بۆ مامۆستا مەنسوور محەمەد کەریم بەڕێوەبەری گشتیی لەوەزارەتی مافی مرۆڤ کە یارمەتیاندامو بەڵگەنامەی پێویستیان خستە بەردەستم دەربارەی گەورەترین پرۆسەی جینۆساید دەرهەق بەگەلی کوردستان کەمرۆڤایەتی، لەدوا چارەکی سەدەی بیستەمدا بەخۆیەوە بینی.

لەمێـژە خـۆم ئامـادە دەکـەم بـچمە بـنج و بنـەوانی لایەنـە پەنهانـەکانی ئـەم کوشـتارە بەکۆمەڵـەو لەمەبەسـتەکەی تێبگـەم تـا بەسـادەیی بیخەمـە بەردەسـتی خوێنـەران ئنجـا بـەپێی تێگەیـشتنی خـۆم، ڕەهەندەکانی بەکورتی دەربڕم.

هەرگیز نەمانبیستووە پیاوکوژێك لەسزا ڕزگاری بووبێت، ئەگەر ئەمڕۆ سزا نەدرێت ئەوە سبەینێ بەسزای خۆی دەگات. دەربارەی بەڕێز سەدام حسەین ئەوە پێویستی بەوە نییە دادگایی بکرێت تا وەکو هەڵسووڕێنەرو جێبەجێکەری پرۆسەکانی ئەنفال تاوانبار بکرێت... بەڵام هەر بۆ تۆڵە سەندنەوە لەبەرامبەر تاوانی ئەنفالەکان، دەبێت سەدام حسەین و ئەنجامدەرانی ئەو تاوانە بدرێنە دادگا. بەزۆری، چارەنووسی پیاوکوژ کەدادگایی دەکرێت یا لەسێدارە دەدرێت، یا زیندانی دەکرێت یا بەکەفالەت بەرەڵا دەکرێت. مەبەستم ئەوەیە کەیەکێك لەو خاڵانەی دەبێتە مایەی مشتومڕی نێوان دادوەرو داواکاری گشتی و پارێزەردا هۆکاری کوشتنەکەیە !

جائەگەر بپرسین چی پاڵی بەسەدام حسەین و حزبی بەعسەوە نا کەرۆڵەکانی گەلی کورد لەناوبەرن و زیاد لەوە هەوڵبدەن قەلاچۆیان بکەن؟ ... ئایا چی پاڵی بەسەدام حسەن و حزبی بەعسی دەسەلاتدارەوە نا ئەنفالەکان دابهێنێت کەدڕندانەترین تاوانی کۆمەڵکوژییە لەدوا چارەکی سەدەی بیستەمدا دەرهەق بەمرۆڤایەتی ئەنجام درابێت کەتێیدا ٤٥٠٠ گوندو شارۆچکە وێرنکران هەروەها دەیان هەزار کەس تیاچوون کەتائەمڕۆ، کەسوکاریان چاوەڕێی هەواڵێکیانە، جگە لەکوژراوانی زیاد(٥) لەهەزار کەس لەژن و منداڵ لەماوەی چەند ساتێکداو برینداربوونی زیاد لە(١٠) هەزار کەسی بێتاوان لەکیمیابارانی هەڵەبجەدا ساڵی ١٩٨٨ بەدەستی بەعسییەکان، هەموو ئەم تاوانانەو دەیانی تریش لەپێناوی چی جێبەجێکران کەحکومەتی عێراق تائێستا دەرهەق گەلی کوردستان پێڕەویان دەکات.؟

گیروگرفتی بەڕێز سەدام حسەین و حزبی بەعس گرێی دەروونیە لەناخیاندایەو لەناخی هەموو داگیرکەرێکدایە کەتوندوتیژی و زاڵدەستی بۆ ملکەچ پێکردنی گەل بەکاردێنێت. ئەم بیرکردنەوە چەپەڵە وەکو ڤایرۆس وایە کەدەچێتە خوێنەوەو لەناومێشکی دەسەلاتدارو زەبربەدەستاندا هێلانە دەکات بەبێ جیاوازیی ئاین و نەتەوە، بۆیە جیاوازی چیە لەنێوان ئیڤانی رووسی و هتلەری ئەڵمانی و سەدامی عێراقی؟ لەراستیشدا مۆرکی ڕۆشنبیری و پێکهاتەی کۆمەڵگە، لەزەبروزەنگی ئەم کەمدەکاتەوەو بەر بۆ ئەوەی تر بەرەڵا دەکات بۆیە جیاوازییەکە لەرواڵەتدایە، بەڵام لەناوەرۆکدا هەموو ئەوانە یەکن کەچارەسەرکردنی کێشەکەیان تەنها ئەوەیە بەزەبری هێز ڕووبەڕوویان بوەستیت چونکە ئەم جۆرە کەسانە بڕوایان بەلۆجیك نییەو دان بەدیالۆگ و تێگەیشتن نانێن. بیروباوەڕی ئەوانەش لەم بارەیەوە بەکارهێنانی هەموو جۆرە ڕێوشوێنێکە لەپێناو پاراستنی دەسەلات و چارەسەرکردنی کێشە ناوخۆییەکان بەئاگرو ئاسن.

ئەنفالەکان زۆر بەرێکوپێکی بەرنامەیان بۆ دارێژرا، واتە لەئەنجامی هەڵچوونی دەروونی یان بڕیاری سەرپێیی یان قینی سەرزارەکی جێبەجێنەکرا، بەڵکو ئامانجێکی ستراتیجی شۆڤێنی بوو چەند مەبەستێکی هەبوو وەکو:

١ ـ لەرێی کۆمەڵکوژیو ئاوارەکردن، ژمارەی دانیشتوانی کوردستان کەم بێتەوە.

٢ ـ تۆقاندنی خەڵك لەپێناو بەرگرتن لەبیروباوەڕی شۆڕشگێڕو هەوڵدان بۆ بەرەنگاریکردنی دەسەڵات.

٣ ـ رووخاندنی گوندو شارۆچکە کوردییەکان کەبەدەنگ پێڕەوی بەعسەوە نەچوون و سەنگەرو لانەی حەوانەوەی پێشمەرگەبوون.

٤ ـ قوتاربوون لەئەرکی لەبەرێوەبردنی هەندێك ناوچەی سنووری یان دەوروبەری ناوچە ستراتیجیەکان و کردنیان بەناوچەی قەدەغە(محرمة)بۆ ئەوەی کۆنترۆڵکردنیان ئاسان بێت.

٥ ـ تێکدانی ژێرخانی ئابووریی جووتیاری کوردو ناچارکردنی کە لەشاردا بژی، ئەمەش بۆ شێواندنی کۆمەڵگە.

بەپێی ئامارەکانی لایەنە پەیوەندارەکان دەربارەی رێژەی دانیشتوان لەدوای جەنگی عێراق ـ ئێران، زیاتر لەیەك ملیۆن سەربازی عێراقی کوژراوە لەمانە ٥٪ یان کوردن، ئەمە جگە لەسەدان هەزار برینداروکەمئەندامو بێسەروشوێن و دیل، لەکاتێکدا بارودۆخی کورد لەعەرەب باشتربوو کەبەو ئەندازەیە بەشداریی جەنگیان نەکردووە چونکە هەڵاتووی کورد، شوێنی هەبوو پەنای بۆ بەرێت.

بۆ نموونە خوالێخۆشبوو محمد هەرکی (سەرۆك عەشیرەت) کە بەهۆی ئەوەی بنەماڵەی بارزانی دوژمنایەتی دەکرد چەکی بۆ رژێم هەڵگرت و بەتەواوی سەری بۆ بەعس نەویکرد، بەفەرمانی سەدام حسەین کوژرا ئەمەش چونکە رازی نەبوو شانبەشانی سوپای عێراق بەشداری بکات لەجەنگ دژی ئێران.

واتە پرۆسەکانی ئەنفال باشترین رێگەچارە بوو بۆ هێنانەدیی ئامانجی ستراتیجی لەرووی هاوسانیکردنی رێژەی دانیشتوان لەنێوان کوردو عەرەب لەعێراقدا.

هەندێك سیاسەتمەدار وای رادەگەیەنن گوایە حزبە کوردییەکان رۆڵی سەرەکییان هەبوو لەروودانی ئەنفالەکان ئەمەش بەهۆی هاوکاریکردنی ئێران دژی عێراق کەئەمە سەدام حسەینی تووڕەکردو پاڵی پێوەنا تۆڵە لەخەڵکی کرودستان بکاتەوە بەتایبەتیش کەئاماژەیان بەو هێرشە سەربازییەی هێزەکانی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بۆ سەر شاری کەرکووك دەدا کەبۆ لێدانی نەوتەڵانەکان، هێزی ئێرانیان لەگەڵ خۆیاندا هێنابوو.

راستییەکەشی پێچەوانەی هەموو ئەمانەیە، چونکە هاوکاریکردنی حزبە کوردییەکان لەگەڵ دەوڵەتی ئێراندا تەنها لەبەرئەوەبوو کەئێران تاکە رێگوزەرێکیان بوو بۆ هەندەران. ئنجا هێزەکانی یەکێتیش کەپەلاماری نەوتەڵانەکانی شاری کەرکووکیاندا بەفەرماندەیی مامۆستا نەوشیروان مستەفا کەنزیکەی(٣) هەزار پێشمەرگەی قارەمان بوون، پێویستیان بەکەس نەبوو لەگەڵ خۆیاندا بیبەن چونکە خۆیان لەسوپا دەچوون . ئنجا ئەو هێرشە سەربازییە بۆ سەر دامودەزگاکانی نەوتی عێراق بەو ئەندازەو قەوارە گەورەیەی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، کەزەرەوزیانێکی زۆری بەهێزەکانی دەوروبەری کەرکووك گەیاندو کارگێڕیەتیی بەعسی تۆقاند کەئەم بوێرو ناکاوەی پێگەیشت لەناو سەنگەری خۆیداو

لەئەنجامدا ناردنی نەوتی عێراق بۆ ماوەی ٧٢ سەعات وەستا، ئەمە نیشانەی لێهاتوویی‌ەکی سەربازیو لێزانیی‌ەکی شارەزایانەیە لەسەرکردایەتیی یەکێتیی نیشتمانییدا بەو توانا کەمەیانەوە لەورۆژەدا، چونکە پێشمەرگە گیانی خۆی بەختدەکرد لەپێناو بەرگریکردن لەخاك‌و نیشتمانی، بەرتەکدانەوەی دەسەلاتی عێراقی دەستەبەر نەکردبوو کاتێك پەلاماری سەربازگەکانی دەدا، ئنجا رژێمی فاشیستمی عێراقی کە لەساڵی ١٩٦٣وە بەنیازی دەستگرتن بەسەر سامانی نەوتی کەرکوك‌و قۆرخکردنی ئەم سامانەو سوودەکانی تەنها بۆ عەرەب، دەستیکردووە بەجێبەجێکردنی سیاسەتی‌گۆڕینی باری نەتەوەیی لەپارێزگای کەرکووکدا.

حکومەتی عێراق لەناوەڕاستی ساڵی ١٩٦٣دا سیانزە گوندی کوردی لەدەوروبەری شاری کەرکوك وێرانکردو لەهەمان ساڵدا(٣٣) گوندی تری لەناحیەی دووبز وێرانکرد کەدواتر ناوەکەیان بۆ دبس گۆڕی. لەهەمان ساڵدا، چەند خێزانێکی عەرەبیان لەناوەڕاستی عێراق هێناو دوای ئەوەی زەوییەکانیان پێ‌ فرۆشتن‌و بەناویانەوەکردن، لەوێ‌ نیشتەجێیان کردن. دوای ئەوە دەیان هەزار خێزانی عەرەبیان هێناو لەشاری کەرکووکدا نیشتەجێیان کردن کەئەم پرۆسەیە تا ئەمڕۆ درێژەی هەیە. دوای ئەوەش ساڵی ١٩٧٢ ناوی ئەو پارێزگا دێرینەی کوردیان لەکەرکووکەوە بۆ تەئمیم گۆڕی بۆئەوەی بۆ یەکجاری ئاسەواری مێژوویی ئەم شارە بگۆڕن کەهەزاران ساڵە هەیە.

جێبەجێکردنی پرۆسەی ئەنفال وەکو خۆی، ئامانجێکی بنەڕەتیی حکومەتی فاشیی عێراق بوو، بێگومان بۆ جێبەجێکردنی تەنها یەکێك لەکادیرە باوەڕپێکراوەکانی دەزگای موخابەرات هەڵدەبژێردرێت بۆیە بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە دڕندانەیە لەعەلی حەسەن ئەلمەجیدیان باشتر دەستنەکەوت کەبۆ ئەم کارە بشێت. ئەویش لەئەنجامی لێهاتوویی‌و کارامەیی لەبەکارهێنانی چەکی کیمیاوی بۆ قەلاچۆکردنی گەلی کوردستان ناونرا: عەلی کیمیاوی.

زۆربەی کادیرانی دەزگای موخابەرات‌و بەڕێوەبەرەکانی بەشەکان بەشداریی ئەم پرۆسەیەی جینۆسایدەیان کرد شانبەشانی هێزە سەربازییەکانی عێراق بەرێکوپێکی ئەنجامیاندا، بەلام تۆمارەکانی جوانمەردیی شەڕکەری عێراقی هەندێك هەڵوێستی بۆ چەند ئەفسەرێکی عێراقی لەکاتی جێبەجێکردنی ئەنفالەکاندا تۆمارکردووە.

لەم رووەوە چەند کۆمیتەیەکی لێکۆڵینەوە بۆ چەند ئەفسەرێك پێکهێنرا کەسەرپێچی سەربازییان لێوەشاوەتەوەو فەرمان‌و یاساکانیان پشتگوێ‌ خستووە وەکو ئەو کۆمیتەیەی بۆ ئەفسەرێکی(دوو ئەستێرە) پێکهێنرا کەتاوانەکەی ئەوەبوو یارمەتیی ژنێکی سکپڕی دابوو گوللەیەك بەر سکی کەوتبوو و ئەمە ببوو بەهۆی لەباربردنی سکەکەی. جا لەکاتێکدا ئەم ژنە گیانی دەدا داوای پەرداخێك ئاوی کردووە، تاوانی ئەفسەرەکەش ئەوەبووە کەئەو پەرداخە ئاوەی بەو ژنە داوە کە لەسەرەمەرگدا بووە.

### هەڵوێستی حکومەتە دراوسێکان لەکاتی کیمیابارانەکەدا

هێزی ئاسمانیی عێراق شاری هەڵەبجەی بە(غاز الخردل، سارین، تابون) بۆردومانکردو بوون بەمایەی کوشتن‌و بریندارکردنی هەزاران ژن‌و منداڵ‌و بەساڵداچووی ئەو شارە. لێرەدا کەس نکووڵی

**لەڕۆڵی جوامێری دەوڵەتی ئێران ناکات کەسنوورو شارۆچکەو نەخۆشخانەکانی کردەوەو ئەوەی لەتوانایدابوو پێشکەشی بریندارەکانی کرد کەروویان لەسنوورەکانی کردبوو، ئنجا ئەوەی پێویستی بەچارەسەر لەدەرەوەی وڵات هەبوایە بەتایبەتی بۆ ئەوروپا، ئەوە ئاسانکاریی بۆ دەکرد، پاشان رێگەی بەدەزگای رۆژنامەوانی رۆژئاوادا کەبێنە ناو سەنگەرەکانی واقیع لەهەڵەبجە لەرێگەی ئێرانەوە بۆئەوەی لەرێی وێنەگرتنو دیدارو ریپۆرتاجەوە، ئەو تاوانە نامرۆییە بگەیەننە ئیزگە جیهانییەکان بۆئەوەی هەموو کەسێك ئاگاداری ئەم تاوانە ناڕەوایە بێت.**

**دەربارەی نیازی پاڵ ئەم کردەوە جوانمەردانەیەی ئێران ئەوە بۆ خوای گەورەی بەجێدێڵم کەهەر خۆی بەناو دڵان دەزانێت، چونکە دەوڵەتی ئێران کەلەو رۆژە سەختەدا سنوورەکانی لەرووی لێشاوی خەڵکی لێقەوماودا کردەوە چاکەیەکە هەرگیز لەبیرناچێتەوە.**

**وەزارەتی دەرەوەی تورکیا لە٩ی ئەیلوولی ١٩٨٨دا لەرێی دەزگاکانی راگەیاندنیەوە، ئەم تاوانکارییەی بۆ جیهان ئاشکراکرد ئەوەش دوای ئەوەی بەشێك لەوانەی بەگازە ژەهراوەییەکان برینداربوون گەیشتنە تورکیا، دەوڵەتی تورکیا لەبڵاوکردنەوەی هەواڵەکەدا پشتی بەشایەدی بەچاودیتەو بەڵگە بەست.**

**لەکاتی ئەنجامدانی ئەم تاوانەدا من لەگوندی راژان بووم لەسەر سنووری ئێران کەبارەگای مەکتەبی سیاسیی پارتی دیموکراتی کوردستانی لێبوو، وەك لەبەشەکانی تری کتێبەکەمدا باسمکردووە من بەنهێنی لەوێ بووم، سەرقاڵی پرۆسەی ئاشتی بووم لەنێوان هەردوو حزبی سەرەکیداو نوێنەری یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بووم‌و ئەمەی دەینووسم لەو خەڵکانەم بیستووە کەخۆیان کارەساتەکەیان بینیوە.**

**هێزەکانی هەردوو حزبی سەرەکی بەیارمەتیو هاوکاری رێکخستنە ناوشار توانییان دەست بەسەر شاری هەڵەبجەو هاوینە هەواری ئەحمەدئاوا بگرن‌و ناوچەکە لەبەعس‌و پیاوانی دەسەڵاتی عێراق رزگاربکەن، بەڵام بەرپەرچدانەوەی حکومەتی عێراقی دڕندانەتربوو، چونکە لەو باوەڕەدام کەئەوەی خەڵکی هەڵەبجە لەکاتی بۆردومانی کیمیابارانەکەدا بەسەریاندا هات، دۆزەخ بووە بەخۆی کەدۆزەخیش لەباسکردن نایەت.**

جاش خەفیفەو موستەشارەکان

**مرۆڤ کۆمەڵێك دژایەتیو خەسڵەتە، جوانترین خەسڵەتی باڵا کەهەست‌ونەست لای هەموان دەبزوێنێت هەستی نیشتمانپەروەرییە کە لەمنداڵییەوە لەگەڵماندایەو تەنها هەندێك هاندەری پێدەوێت تا دەربکەوێت.**

**پێغەمبەر(د.خ) کاتێك شاری مەککەی بەجێهێشت، فرمێسك بەچاوانی هاتە خوارەوە لەتاو خەم‌و پەژارەی بەجێهێشتنی زێدی خۆی لەکاتێکدا کەس وەکو پێغەمبەر(ﷺ)ی خواناس نییە، کەچی خۆی بۆ نەگیراو هەستی نیشتمانیی خۆی دەربڕی کە لەناخی هەموو مرۆڤێکدایە، بەڵام هەندێك سات مرۆڤ لەتاوی تووڕەیی‌و تەماع وای لێدێت نیشتمان‌و ئەرکی سەرشانی لەبیردەچێتەوە بۆیە پشتی**

لێهەڵدەکاتو بەناپاك دەدرێتە قەڵەم، ئەی نابینیت کاتێك لەناپاکیدا زیادەڕەویی دەکات دوای ماوەیەك پەشیمان دەبێتەوە.!

خوێنەری خۆشەویست: نامەوێ پاساو بۆ ئەوانە بنێمەوە کەخیانەتیان لەنیشتمان کردو چەکیان دژی شۆڕشی کوردستان هەڵگرت، نەخێر، بەڵام ئەگەر لەو هۆکارانە بکۆڵینەوە کەوایان لەئامر فەوج و مەفرەزە تایبەتەکانی دەزگای موخابەراتو ئەمن کرد بەو شێوەیە بچنە پاڵ ڕژێم، دەبینین ژمارەیەکی کەمی ئەوانە بەیەکجاری ئابڕویان تکاوەو هەستی نیشتمانییان دۆڕاندووە، ئەمانە هەر دەبێت کەوتبنە بەر کاریگەریی هۆکاری لاوەکیو وای لێهاتبێت لەپێناوی پارەدا، چەك دژی گەلەکەی هەڵبگرێت.

بەڵام زۆربەی ئەوانەی بەرامبەر شۆڕشی کوردستان وەستان بەهۆی تووڕەبوونیان بووە لەئەنجامی ترسان یان هەڵاتنیان لەتاوی زەبری دەسەڵاتداران یان زۆریان لێکراو ئەوانیش وەك بەرگری لەخۆکردن، دژی شۆڕش وەستان.

لەبەشەکانی تری کتێبەکەم(کورد دوژمنی خۆت بناسە)دا بەدووردرێژی باسی عەشایەرەکانی کوردستانم کردووە کەیەکەم کەس بوون چوونە پاڵ ڕژێمو دژی شۆڕش وەستانو ئەم هەڵوێستەیان بەهۆی دوژمنایەتیکردنی بارزانی بوو لەبەرامبەریان کەگەورەکانیانی کوشتو جگە لەتۆقاندنیان، بوو بەهۆی ئاوارەبوونیانو ئەوانیش تەنها ئەوەیان بۆمایەوە پەنا بۆ دەسەڵاتدارێتی عێراق بەرن.

ژمارەیەکی زۆری ئامر مەفرەزەی سەر بەدەزگای ئەمنی گشتی یان دەزگای موخابەرات بەهۆی شەڕی ناوخۆی نێوان حزبە کوردستانییەکان بوو کەدەستیاندایە خیانەتکاری.

سەیر ئەوەیە زۆربەی ئەو ئامر فەوجو ئامر مەفرەزانە، وەلائی خۆیان بۆ حزبە کوردستانییەکان دەردەبڕیو لەگەڵ ئەو حزبەدا ڕێکدەکەوت کەخۆی بەدڵی بووە، وەك ئەوەی مانگانە مووچە بۆ حزبەکە بڕنەوەو لەبەرامبەردا، حزبەکە چاوپۆشی لەخیانەتکارییان بکات بێئەوەی جیاوازی بکرێت لەنێوان ئاستی دڕندەییو خوێنڕێژیی ئەم یان ئەو ئامر فەوج لەبەرامبەر گەلی کورد، دەبینین هەندێك لەوانە دەستیان بەخوێنی کورد سووربووەو لەئەنفالەکاندا بەشدارییان کردووە کەئەمانە وەکو ڤاپرۆس وان هەردەبێت لەناوببرێن، بەڵام دوای ڕاپەڕینی گەلی کوردستان بڕیاری لێبوردن کەدەرچوو هەموویانی گرتەوە، بەڵام ئەمە ئەوە ناگرێتەوە کەببینین ئەمڕۆ، ئەوانە پلەو پۆستی گەورەیان لەئیدارەی کوردستاندا بەدەست بێتو بەپاڵەوان لەقەڵەم بدرێن لەکاتێکدا لەرووی مامەڵەیان لەگەڵ خەڵکی سادەدا هەروەکو ئەوسا تووڕەو تڕۆن.

دەمێکە دەمەوێ شتێك لەسەر هەموو ئەوانە بنووسم کەشانبەشانی ڕژێم چەکیان هەڵگرتو باسی چاکەو خراپەکانیان بکەم، بەڵام ئەوەندە بەسە کەئێستا دەینووسمو ئەگەر تەمەن باقی بوو ئەوە کتێبێکیان لەسەر دەردەکەم، چونکە ئەوانە لەوەتەی شۆڕشی کوردستان سەریهەڵداوە ڕۆڵی خۆیان بینیووەو دەبێ خەڵك ئاگاداری ئەو ڕاستییانەبن کە لەلا من، لەو ڕاستییانە تێیاندایە هەموو کەسێك شانازی پێوەدەکاتو تێیاندایە مرۆڤ شەرمەزاردەکات، شایەنی باسە کەژمارەی بەناو فەوجی خەفیفە

لەکوردستاندا گەیشتە ٥١٥ فەوج، هەروەها ژمارەی ١٠٠ مەفرەزەش هەبوو کەسەر بەدامودەزگا ئەمنییەکان بوو.

خیانەتکاری، بۆ سەرەتای دامەزراندنی قەوارەو ئیدارەی مرۆڤایەتی دەگەڕێتەوە کەبێگومان تەنها لەکوردستانو لەناو موستەشارەکاندا نەبووە بەڵکو لەهەموو کاتو جێیەکدا هەبوو.

سامری هەروەکو قورئانی پیرۆز بۆمان باسدەکات، سیانزە سەدە لەمەوبەر خیانەتی لەوپەیمانەکرد کەلەگەڵ خودا وموسا پێغەمبەر کاتێك حەزرەتی خوداو مووسا پێغەمبەری(ﷺ)بەدرۆخستەوەو خەڵکی فریودا پەیکەری گوێرەکەیەك بپەرستن لەزێڕ دروستیکردبوو، سامری کونێکی لەناو سکی پەیکەرەکە کردبوو کەدەمی‌و پاشی پێکەوە دەبەستەوە ئیتر کەرووەو با دایدەنا دەنگێکی لێدەهات بیستەر سەری لێی سووڕەما. لەسەردەمی پێغەمبەریشدا(د.خ) هەر لەکەسوکاری خۆی هەبوو دایە پاڵ قورەیش‌و دژی پەیامی ئاسمانی وەستا. هەروەها دەبینین لەناو خەڵکی عەرەبی فەلەستین کەئەمانە خاوەنی کێشەکی پیرۆزن کە رووبەڕووی ئیسرائیل وەستاونو بەرگری لەخاك و ئاین دەکەن، دەبینینن عەرەبی موسڵمانیان تێدا دەبینین دەستیان خستە ناو دەستی حکومەتی ئیسرائیل‌و خیانەتیان لەنیشتمانیان کرد. لەبەرامبەریشدا لەناو ئیسرائیلییەکاندا کە لەبەرچاوی هەموو جیهان بانگەشە دەکەن گوایە لەهەموو گەلانی جیهان یەکگرتوو ترن، دەزگا ئەمنییەکانی ئیسرائیل حەوت ئیسرائیلییان لەریزی هێزە چەکدارەکان دەستگیرکرد دوانیان ئەفسەر بوونو پێنجەکەی تر سەربازبوون، کەئەمانە چەکیان بەهێزە فەلەستینیەکان فروشتبوو لەکاتێکدا مووچەی زۆریان هەبوو لەسایەی حکومەتەکەیانداو بەخۆشی دەژیان. لەم بارەیەوە ئیزگەی رادیۆی لەندەن لێدوانێکی لەسەر ئەم هەواڵەداو گوتی: لەمەودوا فەلەستینیەکان پێویستیان بەوە نییە چاوەڕێ بکەن هەتا دەوڵەتە عەرەبییەکان چەکیان دەدەنێ مادەم ئەم جۆرە ئەفسەرو سەربازانە لەڕیزی سوپای ئیسرائیلدان کەچەکیان پێدەفرۆشن.

جا ئەگەر ئەمە حاڵی ئەو گەل‌و دەوڵەتانە بێت، تۆبڵێی بارودۆخی کورد لەوبارەیەوە چۆن بێت لەکاتێکدا بەسەرچوار دەوڵەتدا دابەشکراونو بوونەتە ژێر دەستەی سێ نەتەوەی جیهانی سێ؟!

ژمارەی ئەوانەی چەکیان بۆ رژێم هەڵگرت، ئەگەر لەگەڵ ژمارەی دانیشتوانو گەلانی تردا بەراوردبکرێت بۆمان دەردەکەوێت ئێمە باشترین. بەڵکو موستەشارو ئامرفەوجی وا هەبوو خزمەتی زۆر گەورەی بەشۆڕشی گەلی کوردستانو خەڵك گەیاند، خزمەتی وا کەشایەنی بەخشینی نیشانەی پاڵەوانیەتییە پێیان چونکە ئەوانە لەشوێنی مەترسیداردابوونو هەمیشە ژیانیان لەمەترسیدار بووە چونکە لەناوجەرگەی ئاگرەکەدابوونو لەباوەشی دەسەڵاتی عێراقدابوون کەسەرۆکەکەی بەزەیی بەنزیکترین کەسدا نەهاتۆتەوە هەر ئەوەندەی گومانی لێکرا.

لەوێنەی ئەمانە لەکوردستاندا زۆرەو هەڵوێستی وایان هەبووە نووسینەوەیان بەچەند دێڕو رۆژنامەیەك کۆتایی نایەت بەڵکو دەبێ کتێبێکی بۆ تەرخان بکرێت، لەوانە: حاجی عەلی سستە لەقەڵادزێ، هەروەها منداڵەکانی عەباسی مەمەند ئاغا لەناوچەی بیتوێن‌و، زەیدی عومەر ئاغای سوورچی لەناوچەی هەولێر. زۆری تر هەن داوای لێبوردن دەکەم کەلێرەدا ناویان نابەم، ئەمەش

لەوانەیە بەئەقەست نەبێت، بەڵام هەموو ئەمانە گیانی دەیان هەزار کەسیان لەخەڵکی کوردستان پاراست کەلەریزی فەوجەکانیان وەریانگرتن بۆئەوەی سەربازی نەکەن کەجەنگی عێراق ـ ئێران سەدان هەزار کەسی بەکوشتدا، جا بەهۆی ئەم فەوجانەوە، زیاد لە ٦٥٠ هەزار کەسی کورد بەسەلامەتیو بەبێوەی لەناو خێزانو کەسوکاری خۆیاندا دەژیانو خەریکی کاروکاسبی خۆیان بوون دوور لەهەموو جۆرە مەترسییەك. هەندێك لەو عەشرەتە چەکدارانە پلەوپایەیەکی تایبەتیان هەبوو کەحسابیان بۆدەکرا، راستییەکەشی ئەوەیە چەکدارەکانی فەوجەکانو مەفرەزەکانی دامودەزگا ئەمنییەکان داردەستی راپەرینی گەلی کوردستان بوون.

جا ئیدارەی خراپی حزبی بەعسو پرۆسەکانی قەلاچۆکردنی گەلی کوردە ترسو تۆقینی خستە دڵی ئەمانەو وای لێکردن هەر کەهەلیان بۆ هەڵکەوت لەدژی دەسەڵاتی بەعس بوەستن هەروەکو لەراپەریندا بینیمان. هەروەکو لەبەشەکانی تری کتێبەکانمدا باسمکردووە، سەر لەشکر( قائدفیلق)ێك هەموو موستەشارەکانی کۆکردبوۆوە و زۆر بەبێشەرمانە نیازی حکومەتی عێراقی لەلایان ئاشکراکردبوو، کەپێشمەرگە لەهەر گوندێکدا ببینرێت ئەوە گوندەکە بۆدرومان دەکرێت، لێرەدا موستەشارەکان بۆیان دەرکەوت کەبارەکە مەترسیدارەو حکومەت نیازی خراپەو هێشتا جیاوازی ناکات لەنێوان پێشمەرگە کەماوەیەکە دژی رژێم وەستاوە، لەگەڵ ئەو کوردە چەکدارەی ژیانی خۆی لەپاڵ رژێمدا بەسەر بردووە.

ئنجا راپەرین روویداو سەنگەرەکان گوازرانەوە، پاشان لوولەی تفەنگەکان روبەرووی رژێمی زۆردار کرانەوە... خوا هەمومان بۆ خزمەتی کوردستان یەکبخات.

لێرەدا دەمەوێ بانگەوازێك ئاراستەی هەموو موستەشارەکان(ئامر فەوجەکان) بکەن کەبارودۆخی هەڵاوێردە کردنی بەملیۆنێر، داوایان لێدەکەم بەچاوی بەزەییەوە ئاوڕ لەخەڵکی کوردستان بدەنەوەو لەوسامانەی کەسەرۆکی عێراقی پێی بەخشیون، بەشێکی ببەخشنە خێزانی شەهیدەکان چونکە چ زەرەرێك دەگەیەنێت ئەگەر هەریەکەیان خێزانێکی دەربەدەر بەخێو بکات کەرژێم ستەمی لێکردووە؟ ئەو سامانەی لەلای ئەمانەیە ماڵی گەلە، لەبیریشمە موستەشارێك گوتی: هەرکاتێك بنەماڵەی بارزانی، ئەو ماڵو سامانەی لەلایانە گێڕایەوە کە بەنزیکەی ٣ ملیار دۆلار مەزەندەکراوە، ئەوە ئێمەش ئەوەی لەلامانە دەیگەڕێننەوە.

نامەیەکی کراوە بۆ مامۆستا مەلا کرێکارو هاوەڵەکانی

دوای رێزو سڵاو

وەکو هەر موسڵمانێکی ئاشتیخواز، سۆزی خۆمت پێکەش دەکەم لەگەڵ سڵاوی شۆڕشگێڕانەی کوردێك کەهەموو ئاواتێکی، رزگاریی کوردستانە، لەمنەوە بۆ تۆ سڵاوێکی برایانە، کەکلەیلا دەروازەی دڵانە.

ئیمامی بەرێز...

دوای ئەوەی دەستتان بەسەر ئەو CD یەمدا گرت کەسێ بەرگی کتێبەکەمی لەخۆی گرتبوو" ئەوەی بەپێی رێکەوتنێکی نێوان هەردوولامان پێمدابوون کە بەچەند بەرگێك، لەسەر ئەرکی خۆتان چاپیان

بکـەن، بـەو هیوایـەی کەکتێبـەکانم بگەنـە بەردەسـتی هـەموو خوازیـارێکی راسـتیو ناسـینی دوژمنـی راستەقینەی گەلی کوردستان.

بەزۆری پێموایە دوای ئەوەی CD یەکەتان خوێندوەوەو بۆتان دەرکەوت کە ناوەرۆکەکەی دەکێشتە سەر دۆستو هاوپەیمانتان، ئیتر ئەمە ناچاریکردن بەڵێنی چاپکردنی ١٠٠٠ دانە لەکتێبەکەم بشکێنن کـەوەك پـشتگیریەکی شۆڕشـی فیکـەریم دابووتـان، نـەك هـەر ئەمـە بـەڵکو، ئێـوە بـوون بەمایـەی زەرەر پێگەیاندم لەرووی مادییەوە جگە لەبەفیڕۆدانی کاتم بەچاپکردنەوەی نووسینەکەم لەسەر CD یەکی تر، چونکە ئەوەندەی بێهوودە هەوڵمدا بتانبینم ئیتر لەوەدەستخستنەوەی CDیە تیاچووەکەم تـەمابڕاوبوم، ئەمـەش لەبەرئـەوەی کـابرای برادەرتـان(... ) گـوتی : ( مـەلا کرێکـار ئـەوەی لـەلای بـووە لەدەسـتیداوە، هەروەها کەمجار بەڵێنی دەباتە سەر، بۆیە ئەوەندەم لەدەستهات کەبڵێم: خوا جەزای بداتەوە.

بـەرێزان : هـەروەکو لەبەرگـەکانی کتێبەکەمـدا روونم کردۆتـەوە، مـن بەرەگـەز کـوردم، شـانازیش بـەم رەگەزەمەوە دەکـەم، خـەڵکیش شایەدی لەسـەر دەسـتپاکیو ئیمانـداریی باوبـاپیرانم دەدەن... تـا ئێـستا کارێکم نەکردووە خوا پێی ناخۆش بێت، هەروەها واشم نەکردووە دەوڵەتە دراوسێکانو هەندێك لەحزبە کوردستانییەکان لێم زویر بنو لەوە زیاتر قەستەسەرم بن.

ئــەوەی منــی بــەم بــارەی ئێــستام گەیانــدووە پــشتگویٚ خــستنی دەســەلاٚتی زۆردارو هۆنینــەوەی راسـتییەکانە بەهەسـتێکی نیـشتمانپەوەرانە کـەئاینی ئیـسلام لەمـەدا هاندەرمـە، هـەروەها کۆمـەلاٚنی خەڵکیش هانم دەدەن کەلـەم کارەمدا بـەردەوام بم، خـوای گـەورەش پـشتیوانمەو هـەر ئەویـشە ئاگـاداری ناودلاٚنەو فەرمویەتی: ﴿ قل لن یصیبنا الا ما کتب الله لنا ﴾ .

بـەرێز مامۆسـتا مـەلا کرێکـار: مـنو تـۆ سـیٚ جـار بەیـەك گەیـشتووین، هەریەکـەمان شـارەزای بیروبـاوەڕو ئایدیۆلۆجیای ئەوی ترمان بووە، جا لەم میانەیـەدا دوو نـاوکۆیی هەیـە کـەمن و تـۆ پێکـەوە گرێـدەدات، ئـاینو نەتـەوە. ئەوەنـدەی هەیـە ئـەوەی لەسـەری کـۆك نـین گوزارشـتکردنە لەدیـدو بۆچـوون بەرامبـەر جیهـانو رووداوەکانی دەوروپشتمان، چونکە هەریەکـەمان ئامـانجێکی ئاشکرای هەیـە، ئـەوەی لـەناو دلاٚنیـشدا شاراوەیە، ئەوە خودا بەخۆی دەیزانێت.

کەبـەرێزتان دەتانـەویٚ بـەپێی ئـەوەی لـەقورئانی پـیرۆزدا هـاتووە، گـەلی کوردسـتان کـۆنترۆلٚ بکـەنو لەسەر ئەو پێودانگە مامەڵە لەگەلٚ خەڵکدا بکەن کەکاتی خۆی پێغەمبـەری خـوا(د.خ) مامەڵـەی پێکـردوە بێئەوەی گویٚ بدەنە ئەوەی کەپێغەمبەر فەرمویەتی: ( یسِّروا ولاتُعسروا).

لـەوەش گـەورەتر ئەوەیـە کـەئێوە، لەوەتـەی دامەزرانـدنی حزبـە ئیـسلامییەکەتان راگەیانـدووە، رەنگوبـۆی نیـشتمانپەروەریی شۆڕشـگێڕانەمان تێـدا هەسـت پێنـەکردووە، وردتـر بلێـین( کوردایـەتی) تێـدا نییـە، چـونکە مـۆرکی داخـراوی ئـاینی بەسـەرتاندا زاڵـە بێئـەوەی گـویٚ بدەنـە هەسـتی کـوردو سـتەمی دەوڵـەتانی دراوسـیٚ بەرامبەر کوردستان.

دەربـارەی خۆشـم، هیـوادارم گـەلی کوردسـتان بتوانێـت پیٚبـەپێی شـەرعی قورئـان جیٚپێـی خـۆی لەگۆڕەپانی سیاسیدا بکاتەوە بۆئەوەی نەکا رووداوی تـر بەسـەردابێنو بایەکە، بەپێچەوانەی خواستی شەنکەرەوە هـەڵبکاتو ئەوسا خۆمـان بـدۆڕێنین ! چـونکە مـن لـەو بڕوایـەدام ئـەمجارە گـەلی کوردسـتان،

ئەگەر ئەم هەلە لەدەست خۆی بدات ئەوە هەتا چەندە دەهەیەکی تر شتێکی وای بۆ هەڵناکەوێتەوە، بۆیە دەبێت ئەم هەلە بقۆزینەوە، چونکە هەل، هەمیشە هەڵناکەوێت.

سەرباری ئەو زەرەروزیانانەی شەڕی ناوخۆی نێوان هەردوو حزب PDK و PUK بەرەوتی شۆڕشی کوردیان گەیاندووە، لەولاشەوە ناکۆکیی نێوان حزبە ئیسلامییەکان‌و یەکنەگرتنیان، کەمتر زیانیان پێمان نەگەیاندووە. ئەمە جگە لەوەی سەرجەم حزبە ئیسلامییەکان، هیچ هەڵوێستێکیان بەرامبەر خیانەتی ٣١ی ئابی ١٩٩٦ نەبووە، شتێکی بەڵگەنەویستیشە کەحزبە کوردستانییەکان لەدەڤەری هەڵەبجەدا، ئەگەر کۆك‌و تەبابوونایەو لەژێر ئالآی یەك سەرکردایەتیی نیشتمانپەروەرو زانای وا بوونایە کەهەلومەرجەکەی رەچاوبەکردایە، ئەوە رۆژمان بەم رۆژە نەدەگەیشت. وەك دەشزانین لەهەڵبژاردنە دەورییەکانیان، سەرۆکی پێشەوای خۆیان، مەلا عەلی عەبدولعەزیزیان هەڵنەبژاد، بەڵکو مامۆستا عەلی باپیر زۆرینەی دەنگەکانی بەدەستهێنا، جا مامۆستا مەلا عەلی عەبدولعەزیز، لەرێی داننەنان بەواقیعدا، گێرمەوکێشەی دروستکردو بوو بەمایەی سەرهەڵدانی ئەو حزبە نوێیە ئیسلامییانە. لەدیدارێکدا لەگەڵ مامۆستا مەلا عەلی باپیردا بۆم دەرکەوت کەئەم پیاوە، کەسایەتییەکی سیاسیی ئیسلامیی نیشتمانپەروەرە هەوڵ بۆ کوردایەتی دەدات، جگە لەوەی مرۆڤێکی کراوەو بلیمەتە.

دەربارەی باقی حزبە ئیسلامییەکانی تر، ئەگەر یەکدەنگ بوونایە ئەوە دەبوونە سێیەم زلهێزی کوردستان‌و خەڵکێکی زیاتر لەدەوریاندا کۆدەبوونەوە جگە لەوەی دەبوونە بەربەست لەبەر رێی جمووجووڵی گومان لێکراوی هەندێك حزبی سیاسی بەتایبەتی بنەماڵەی بارزانی. چونکە لەبەردەم پەیوەندیی هەریەکە لەم حزبە ئیسلامییانە لەگەڵ دەوڵەتە دراوسێکاندا، نیشانەیەکی پرسیارو سەرسوڕمان هەیە!

یەکگرتنی ئیسلامیی لەنێوان ئەم حزبانە شکۆو پلەوپایەیەکی لێ دەڕسکا کە بەهۆیەوە بەرگیریی لەدەستێوەردانی بێپەردەی ئێران دەکرد لەرووی گۆڕینی ئایدیۆلۆجیای ئەم حزبانەو سەپاندنی مەرج بەسەریاندا هەروەکو ئێستا بەبەردەوامی دەبینین کە لەرێی هەندێك پیاویەوە، بۆ رووخاندنی قەوارەی کوردی ئەنجامیدەدات.

ئەم یەکگرتنە کەشێکی سیاسیی وای دەخوڵقاند کەدوو حزبە گەورەکەی ناچاردەکرد لێکتر نزیك ببنەوەو قسەیان بکەن بەیەك، ئەمەش رۆڵی خۆی دەبینی لای سیاسەتمەدارو سەرکردە کوردەکان.

ئەوەی ئێمە پێویستمان پێیەتی ئاشتییە، ئەوەی کەقەوارەی کوردیمان پێ دروست دەکرد، جا ئەگەر ئاشتی لەراپەرینەوە بەرقەرا بوایە ئەوە رۆژمان بەم رۆژە نەدەگەیشت.

حزبە ئیسلامییەکانی هاوسنووری ئێران کۆمەڵێك گیروگرفتیان بۆ ئیدارەی کوردی دروستکردووەو بوونە هۆی نائارامی‌و نەمانی ئاشتی لەناو کۆمەڵانی خەڵکی کوردستاندا ئەمەش لەرێی ناکۆکییە زۆرەکانیان کەپرۆسەی کۆنترۆڵکردنی ئیدارەی هەرێم‌و پاراستنی سنووری کوردستانی لاوازکردووە، کەئەمە رێگەی لەبەردەمی ئێران خۆشکردووە بەشێوەیەکی فراوانتر دەست بخاتە گرووپی بێگانە

فەراهەمکرد کەئیدارەیەکی نویێ لەناوچە سنوورەییەکاندا دروست بکەن، تەنها خوداش دەزانێت هەندێك لەم گرووپە ئیسلامییانە لەکوێ دروستبوون و چییان دەوێت !

بەهیوابووم ئەگەر بینیمن ئەوە لەنزیکەوە بیانناسم و باشتر لێیان تێبگەم، بەڵام هەوڵەکانم بۆ بینینیان سەرینەگرت. ئەوەی هەبوو لەبەر رۆشنایی ئەو بابەتانەی لەسەر ئەوان بەرچاوم کەوت و ئەوەی لەدەمی ئەو کەسانەوە بەرگوێم کەوت کەماوەیەك لەگەڵیاندا بوون، هەروەها لەئەنجامی ئەو رووداوانەی ئەم دواییەی کوردستان کەدرایە پاڵ ئەوان، بۆم دەرکەوت کەئەو کردەوانە، نە ئاین دانیان پێدادەنێت، نەهۆش و نەلۆجیك.

هەرچەندە بەڵگەنامەی پێسەلمێنم کەمە بۆ پشتگیریکردن لەقسەکانم، بەڵام بەپێی ئەو بەڵگە هۆشەکییانەی دەستم کەوت دەتوانم بڵێم کەئەو گرووپە ئیسلامییەی ناوی (جند الاسلام)ی لەخۆی نابوو، بۆ بەرژەوەندیی دەوڵەتانی دراوسێ کاری دەکرد لەپێناو لەقکردنی بناغەی ئیدارەی کوردی و شێواندنی ئارامی و ئاسایش لەوڵاتدا. چونکە رێی تێناچێت ئەمانە، لەژێر ئاڵای ئایندا، دوژمنایەتیی سێ ملیۆن کورد بکەن و هەڕەشە لەو ئیدارە بچووکەی بکەن کە لەسەر بەشێکی بچووکی خاکی کوردستان دایمەزراندووە، ئەویش دوای خەباتێکی درێژخایەن لەماوەی دەیان ساڵ کەتێیدا ماڵ و گیانیان نایە پێناو بەدیهێنانی ئازادی و سەرخستنی ئەو ئەزموونەی ٤٢ ملیۆن کورد لەجیهاندا چاوی لەسەریەتی و بەئاواتەوەیە سەربگرێت تا سەرانسەری کوردستانی گەورە بەخۆشی بژی.

من هەرچەندە ئەوەندەم لەتەمەن بڕیوە کەتەماعم بەدونیاو پلەوپایەی دونیایی نەماوە، جگە لەوەی لەلایەن بنەماڵەی بارزانییەوە هەڕەشەی گرتنم لەسەرە، بەڵام من بەوپەڕی شانازییەوە ئامادەم ببم بەپاسەوانێکی دڵسۆزی پاراستنی ئیدارەی کوردی بەدەر لەوەی سەرۆکایەتی ئیدارەکە بەدەست تاڵەبانی بێت یان بارزانی. کاتێکیش لەبەرگەکانی کتێبەکەمدا داوام لەو دوو سەرکردەیە کرد دەست لەکار بکێشنەوە مەبەستم شکاندنی ئیدارەکە نەبوو ئەوەندەی مەبەستم، گۆڕینی ئەو دوو سەرکردەیە بوو کەپێکنایەن، هەموو ئاواتێکیشم ئەوەیە خوای گەورە ئەم ئەزموونەمان بۆ سەربخات کەکورد، زیاد لەهەشتا ساڵە خەباتی بۆ دەکات. بەبێ چەندوچوون، ئەوەی بەرهەڵستی ئەم ئەزموونە بکات هەم خوا غەزەبی لێدەگرێت هەم دووژمنایەتی گەلی کورد بۆ خۆی دەسازێنێت. دەربارەی دان نەنانی ئاینیش بەکردەوەی ئەو گرووپە ئیسلامییانە، دەڵێم کەخوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا فەرمانی پێمانکردووە گوێڕایەڵی پێغەمبەرین و سوننەتەکانی پێڕەو بکەین، ئینجا لەکتێبەکانی (السیرة)دا نەمانبیستووە کەپێغەمبە(د.خ) پلانی بۆ تیرۆرکردنی یەکێك لەگەورە پیاوانی قورەیش لەسەرانی کوفر داڕشتبێت لەوانەی کەبەدرێژایی مێژوو هەتا ئەمڕۆ لەرووی کوفرەوە کەس هاوتایان نەبوو، بۆیە هەوڵی تیرۆرکردنی د. بەرهەم ئەحمەد ساڵح ـ سەرۆکی حکومەتی هەرێم( سلێمانی)، بەو شێوە خۆکوژییە، هەوڵێکی ستەمکارانەبوو بۆ پەکخستنی ئیدارەی هەرێمی کوردستان و ناشیرینکردنی وێنەی حکومەتی هەرێم و دەرخستنی لێنهاتوویی کورد لەوەی کە بەئازادی وڵاتی خۆیان بەرێوەبەرن،هەروەها بۆ ئەوەبوو کەوا بنوێنرێت گوایە گەلی کورد، گەلێکی دڕندەیە لەواتای مەدەنییەت و شارستانیبوون تێناگات و

لەگەڵیدا هەڵناکات... دەنا ئەم گرووپە چییان لەتیرۆرکردنی د. بەرهەم دەستدەکەوێت" ئەم لاوە رۆشنبیرەی دەستی لەژیانی خۆشیو نازی ئەوروپا هەڵگرتووەو نیوەی تەمەنی لەوێ بەسەربردووەو هاتووە ژیانی زەحمەتو پڕ دەردەسەری لەکوردستاندا هەڵبژاردووە تا ئەوەندەی لەتوانایدایەو بەپێی زانابییەکەی، خزمەتی رۆڵەکانی گەلەکەی بکات.

باشە بۆچی ئەو هەوڵە لەپێناو تیرۆرکردنی سەرۆکی عێراق( صەدام حسەین) و دەستوپێوەندەکانی نەدرا کەدەستیان بەخوێنی رۆڵەکانی گەلی کوردستان سوربووەو رێزی قورئانو مزگەوتەکانیان پێشێل کرد، تەنانەت هەوڵەکانیان بۆ تەقاندنەوەی شوێنە گشتییەکانو کوشتنی خەڵکی بێتاوان، تەنها خزمەت بەچوار دەوڵەتی دراوسێ دەکاتو ئارەزووەکانی ئەوان دێنێتەدی. ئنجا ئەوەی بۆتە داخی دڵم ئەوەیە کەئەم گرووپە، خەڵکێکی ئازاو ئیماندار بەبێ هوودە بەکوشتدەدەن، ئەو پاڵەوانانەی کەئامادەبوون لەپێناو ئەوەی بڕوایان پێیەتی خۆیان بتەقێننەوەو بەنرخترین شت لەدەست خۆیان بدەن کەگیانیانە.

کەواتە لێرەدا، ئایا مافی ئەوەم نییە سەرزەنشتی ئەو مامۆستایانە بکەم کەئەو جۆرە قارەمانانە بەشێوەیەك بەکوشت بدەن کە نە یاسای ئاسمان نە یاسای زەوی پاداشتیان ناداتەوە لەسەریو بەخۆڕایی و بێئەوەی خزمەت بەکێشەی رەوای گەلی کوردستان بگەیەنن، تیابچن.

ئەو کردەوە خۆکوژییانە، بۆچی لەپێناو تۆقاندنی دوژمنانی کورد نەبێت کەدەوڵەتە دراوسێ داگیرکەرەکانی کوردستانن، بۆچی لەپێناو سەپاندنی ئیرادەی کوردی نەبێت بەسەر ملهوڕیی حکومەتەکانی ناوچەکە بۆ ئەوەی مل بۆ رەوایی مافەکانمان بدەنو دانیان پێدا بنێن.

کەواتە بەسە... چیتر شەڕ بەئیدارەی کوردی مەگێڕنو هەوڵبدەن کوڵەکەکانی ئەزموونەکەمان سەقامگیر بکەن...

براکەم شەرم دەکاو بکوژی باوکمانی وەلاناوە

نەئاین بەمە رازییە نەخوا دانی پیاناوە

هیوادارم دەربارەی بەکرێگیراویەتیی ئەو گرووپە ئیسلامییە، بەهەڵەدا چووبم، بریا پێچەوانەی ئەم بۆچوونەیان بۆ کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان دەسەلماندو بەدگومانیمانیان دەڕەواندەوە، ئەمەش لەرێی جێبەجێکردنی فەرمایشتەکانی خوای گەورەو دڵفرەوانیی ئاینی ئیسلام بەوەی گەلی کورد رازی بکەن، چونکە رەزابوونی خوای گەورە لەرەزابوونی خەڵکەوەیە، هەروەها لەپشتگیریکردنی ئەزموونی کوردییە هەتا ئەوکاتەی خوا سەریدەخات، ئەوساش گەل بریار دەدات کەکێ ولات بەڕێوە دەبات.

دەربارەی ئەوەش کەعەقڵ لەگەڵ کردەوەکەی ئەم گرووپەدا نییە، دەڵێم: ماوەیەك لەمەوبەر بیستمان چەند گۆڕێکیان هەڵداوەتەوە(٢٠٠٢/٦/١٧)و

تەرمی ئەو مردوانەیان لێدەرکردوون کە لەمێژە لەوێ نێژراون.

جا ئەگەر کەسایەتیی تەرمی ناو ئەو گۆڕانەش بخەینە لاوەو ئەم کردەیەوە بەعەقڵ هەڵسەنگێنین، تۆ بڵێی هۆشمەندێك هەبێت رێگە بدات گۆڕی شەیتانیش هەڵبدرێتەوە؟... ئەم کردەوەیە، نەمرۆڤایەتی پێی رازییە، نەقورئانیش رێگەی پێدەدات.

جگە لەمە، ئەو تەرمانە خەڵكێكی خراپەكارنەبوون تا بەم دڕندایەتییە مامەڵەیان لەگەڵدا بكرێت، كوردیش دەڵێت: مرۆڤ كەمرد، شەیتانیش دەستی لێهەڵدەگرێت ! جگە لەوەی ئەم زاتانە خاوەنی تەریقەت بوون. لەرێگەی مریدەكانیانەوە ئاینی ئیسلامیان بەهەموو جیهاندا بلاَوكردەوە، جایەكێك لەسیفەتەكانی موسڵمان ئەوەیە هەروەكو قورئانی پیرۆز لەسەرەتای سوورەتی بەقەرەدا فەرمویەتی: ﴿ ومما رزقناهم ینفقون ﴾، نانداني خەڵك لەرێی خوادا یەكێكە لەسیفەتە چاكەكانی موسڵمان كەخوا لێی رازیدەبێت و فەرمانیشی پێكردووە . تەكیەو خانەقای خاوەن تەریقەتەكان ڕۆژانەو بەردەوام و لەهەر كوێ بووبن . نانی سەدان بەڵكو هەزاران خەڵكی هەژارو داماویانداوە، من بەخۆم ئەمەم لەتەكیەی شێخ قادری چوێسەو تەكیەی كەسنەزانیدا بینیووە، تەنانەت جارێكیان كە لەخزمەت شێخ محەمەدی شێخ عەبدولكەریمی كەسنەزانیدا بووم كەشێخ، هەزاران مریدی لەدەور خڕببونەوە، لەو ئامۆژگارییانەی شێخ دەیكردن گوێم لێنەبوو شتێكی دژی شەرعوئاینیان پێبڵێت، ئامۆژگاری دەكردن راست بڕۆن، رێگەی شەرعی خواو سوننەتی پێغەمەر(د.خ) بەرنەدەن، سیخوڕی بۆ هیچ لایەنێك نەكەن، خیانەت لەنیشتمان نەكەن، هەروەها خۆشەویستیی نیشتمان لەئیمانەوەیەو زۆر ئامۆژگاری تر كەمرۆڤایەتی پێی رازییە. ئینجا ئێوە، ئەگەر خاوەن تەریقەتەكان بەبڕوادار نازانن و گوایە رچەكەیان نەشیاوە، ئەوە بەرپەرچدانەوەی كاری نەشیاو، بەئەنجامدانی كاری خراپ و نەشیاوتر نابێت، ئەمەش فەرمانی پێغەمبەرە(د.خ) كەگوێڕایەڵبوون بۆ فەرمانەكانی حەزرەتی پێغەمبەر ئەركی سەرشانمانە.

بەڵام زۆر بەداخەوە، سوقراتی دانای یۆنانی جوانی گوتوە كە( مشتومڕ مەكە لەگەڵ یەكێكدا كەكتێبێكی خوێندۆتەوە). داوای لێبوردنیش دەكەم كە ئەم پەندەم هێنایەوە بەوهیوایەی ئەمان نەگرێتەوە، بەڵكو من ئەوەندەم لەسەرە بڵێم: خوای گەورە رێنیشاندەرمانە.

ئنجا دەربارەی نەگونجانی كردەوەی ئەم گرووپە ئیسلامییە لەگەڵ لۆجیكدا دەمەوێ ئەوە روونبكەمەوە كە بەپێی هەموو شەرعە ئاسمانیی و زەمینیەكان، لاری لەوە نییە هەركەسێك بڕوای بەهەرچییەك هەبێت مادەم ئەو بڕوایە، زیان لەئازادی خەڵكی تر نەدات. چونكە ئازادیی بیروباوەڕ، لەهەموو ئان و سەردەمێكدا هەبووە، ئەوەی لەو بیروباوەڕەش بەرپرسیارە ئەوەندەی لەسەرە ئامۆژگاری بەرامبەرەكەی بكات كە لەرووی بیروباوەڕەوە لەگەڵیدا كۆك نییە، خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا فەرمویەتی ﴿ لا اكراه في الدين قد تبين الرشد من الغي ﴾، جگە لەچەند فەرمودەیەك كەئاماژە بەوە دەدەن كە لەگرۆی ئادەمیزاددا، لەدوای خوای پەروەردگار لەخودی پێغەمبەر(د.خ) نەرمترو بەبەزەییتر نەبووە بەرامبەر بەمرۆڤ ... خوا ئێمەی لەنەبوو دروستكرد، بێئەوەی هیچمان هەبێت رزقمانیدا، بێئەوەی دەسەلاَتیشمان هەبێت تەمەنی پێمان بەخشیوە، هەر خواشە كەمرۆڤ سەربەرز دەكات و دەیشكێنێت، ئەمانەو زۆر بەخششی تر كەخوا پێمانی بەخشیوە بەلاَم نەمانبینی كەسێك كوفر بكات یا نكوڵی لەبوونی خوا بكات خوا پەنامان بدات... سەرباریشی دەبینین خوا چەند لێبوردەیە، ئەدی هەر خۆی هەرە خاوەنی بەزەیی نییە! كەواتە ئێوە كێن و چین تا ئالاَی ئیسلام هەڵكەن و لاف بەسەر خەڵكدا

لێبدەن و خۆتان لەو خوایە بەگەورەتر بزانن کەئاسمانەکانی بەبێ کۆڵەکە ڕاگرتووەو لەنێوان ئاوەکاندا زەوی داڕشتووە!

برا هاوئیمانەکان، ئێوە ئەگەر وەکو خۆتان دەڵێن موسڵمان بن، ئەوە خوا فەرمانی بەوەی کردوتانە، نەکردووە، خۆ ئەگەر بەپێچەوانەی ئەوەی دەیزانین، وەحیتان بۆ هاتووە ڕایگەیەنن... دەنا ئەگەر لارییەکتان لەئیدارەی کوردستاندا بینیوە بۆچی لەگەڵ کاربەدەستدا دانانیشن تاڕاستی بکەنەوەو بیهێننە سەر ڕاستەڕێ... خۆ ئەگەر نە ئەوەشن و نەئەمە، بەپیرۆزی خاک سوێندتان دەدەم لەکۆڵ کوردببنەوە.

ئێوە ئەی ئەوانەی بەیداخی ئیسلامتان کردوە بەئالآتان و دوور لەجیهان، لەبستێکی کوردستاندا مەلآستان خواردووە، چاکتر نەبوو هەر لەسەرەتاوە خەڵکتان بەلای خۆتاندا ڕاکێشایەو وێنەی شێواوی ئیسلام چاک بکەن کەرەفتاری هەندێک لایەنگرو هەوادارای حزبە ئیسلامییەکان شێواندوویانەو، بەم کردەوەیەتان قوڕەکەتان خەستتر نەکردایە؟

ئەوەی چەک و تەقەمەنی پێتانداوە دەیتوانی ئەوەندە پارەتان بداتێ ئەو بەشەی کوردستانی پێ ئاوەدان بکەنەوە کەئێستا خۆتانی تێدان، ئەوەی کەئێوە بوون بەهۆی ئەوەی ڕێکخراوە بیانییەکان و ئیدارەی حکومەتی هەرێمی کوردستان دەست لەئاوەدانکردنەوەی هەڵگرن.

لەسەرتان پێویستە قەرەبووی داماوی و بێبەشیی ئەو خەڵکە بکەن بۆ ئەم چەند ساڵەی لەدەستیان چووە، بەڵام خوا پشتیوانمانە.

بەڕێزان مامۆستا مەلا کرێکارو هاوەڵەکانی

لەدوا دانیشتنماندا لەسەر چەند خاڵێك ڕێککەوتنین دەربارەی ڕێگەچارەی رزگاریی گەلی کوردستان‌و هەوڵدان بۆ چەسپاندنی ئاشتی‌و دادپەروەری لەناو خەڵکداو کەئەمە تەنها لەرێی رزگاربوون لەهێزەکانی میلیشیا دێتەدی کە ئیدارەی کوردستانیان کۆنترۆڵکردووە، لەسەرڕووی هەمووشیانەوە بنەماڵەی بارزانی. ئەم ئاواتەش تەنها لەرێی دەسەلاّتی سەربازیی UN دێتە دی ئنجا دوای ئەوە خەڵك لەوەدا ئازادن دەنگ بۆ کێ دەدەن.

جگە لەمە، خەڵکی بڕواداری کوردستان هەرگیز بڕوایان بەراستگۆیی حزبە ئیسلامییەکان‌و بەشداربوونیان لەئیدارەی کوردیدا نەبووە، دەنا لەهەڵبژاردنەکەی ساڵی ١٩٩١ دەنگی تەنها بۆ ٧٪ ی پاڵێوراوە ئیسلامییەکان نەدەدا. ئێوە دەبوایە ئەو وێنە شێوازەی خۆتان چاك بەکردایەو باوەڕی جەماوەرتان بۆ خۆتان رابکێشایەو خەڵکتان هانبدایە شۆڕشی جیهادی بکەن، لەمەش گرنگتر: ئایا ئەم شۆڕشە بۆکێ‌و دژی کێ بێت؟ ئنجا دوژمنی راستەقینەی گەلی کوردستان کێیە؟

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿عسى أن تكرهوا شيئاً وهو خير لكم وعسى أن تحبوا شيئاً وهو شر لكم والله يعلم وأنتم لا تعلمون ﴾.

دەستپێکی ئەم گرووپە ئیسلامییە بەکوشتنی یەکێك لەسەرانی نزیکی بنەماڵەی بارزانی کەئەویش فرەنسۆ هەریرییە، ئەو خۆبەزلزانەی رۆژانە روویەکی بنەماڵەی بارزانی ناشیرین دەکردو قینی خەڵکی بەرامبەریان دەجۆشاند، دەڵێم تیرۆرکردنی ئەو پیاوە، بنەماڵەی بارزانی تۆقاندو وای لێکردن بیر لەوە بکەنەوە وریابن‌و پارێز وەربگرن، ئەمەش هانیدان کە لەیەکێتی نیشتمانیی کوردستان نزیك ببنەوە هەرچەندە ئەمە خزمەت بەکێشەی کوردی ناکات بەڵکو هۆکاری سەرەکیی لێکدووركەوتنەوەی یەکێتی‌و پارتییە.

لەکۆتاییدا هیواردارم ئەم نووسینەم لەبەرچاو بگرن‌و هەست بەوە بکەن کە شتێکی دڵخۆشکەرەیە مرۆڤ ئەوەی دەستبکەوێت کە بەلایەوە بایەخدارە، بەڵام نابێت ئەوەمان لەبیربچێتەوە کەهەمیشە گرنگتر هەیە. هەندێك جار خۆم بەگوناهبار دەزانم کەنەمتوانی بتانبینم، چونکە لەوانەیە بمتوانیایە رێنمونیتان بکەم بۆ خێری هەموو لایەك، یان حوکمدانم بەپێی شەرع، بەڵام تۆ دەتەوێ، منیش دەمەوێ‌و خواش ئەوە دەکات کە خۆی دەیەوێ...

## ئیتر خۆشیتان

خزمەتکاری کوردو کوردستان

رەفیق پشدەری

**وەسیەتنامەی شەهید قازی محمد**

خوێنەرانی خۆشەویست، خوشك‌و برای هاوخوێن‌و هاوزمانم سڵاوی خواتان لێبێت لەهەرکوێ هەبن، بیروباوەڕتان هەرچی بێت...

لێرەدا دەمەوێ ئەوەتان بەبیربێنمەوە کە هەر زانیاری، یان ئامۆژگاری، یان ئاشکراکردنی نهێنی، یان زیادەڕەوی، یان پیاهەڵدانێکتان لەنووسینەکانمدا خوێندبێتەوە ئەوە هەموو مەبەستێکم تەنها یەك شت بووە، ئەویش دامەزراندنی دەوڵەتی کوردییە کە هیواو ئاواتی هەموو کوردێکە.

لەوانەشە، خوێنەری بەرێز، بزە بتگرێت یان بدەیتە قاقای پێکەنین کاتێك سووربونم لەسەر ئەم مەسەلەیە بەدی دەکەیت، من کە بێ عەشرەت‌و بێ حزب‌و بێ سامان‌و بێدەسەڵات‌و بێهیچ پشتیوانێکی دەرەکیم... بەڵام بڕوای تەواوم بەخوای پەروەرگارو توانای بێپایان، هەروەها بڕوام بەرەوایی داواکەم‌و ئیرادەی گەلی کوردستان هانیداوم کە لەسەر ئەم ئامانجەم سووربم‌و هەوڵی بۆ بدەم تا دەیهێنمەدی، هەروەکو شاعیری عەرەب فەرمویەتی:﴿اذا الشعب یوما اراد الحیاة... فلابد أن یستجیب القدر). لێرەدا جەخت لەسەر ئەوە دەکەم بەڵکو زیاد لەمە سوێند دەخۆم کەئێمە بەئاواتمان دەگەین، لەم بیروباوەڕشمدا پشتم بەفەرمودەی پێغەمبەری خوا(د.خ) بەستووە کەفەرمویەتی: (ما ضاع حق وراءه مطالب). جا ئەگەر چاو بەهەر کتێبێکی ئاسمانیو هەواڵ‌و دەنگوباسی خەڵك لەمێژووی کۆن‌و نوێدا بخشێنن سەرنجدەدەن کەسوودی ئەوەیە پەند لەبەسەرهاتی ئەو خەڵکە وەربگرین‌و نەکەوینە هەڵەکانیانەوە.

لەبەرئەوە بەباشم زانی ئەم وەسیەتنامەیەی شەهید قازیی محەمەدی سەرکۆماری کوردستان بخەمە بەرچاوتان لەپێناو زیندووکردنەوەی یادی ئەم سەرۆکە قارەمانە، چونکە ئەویش هەوڵیداوە نەمربێت‌و هەموو ئەوانەش لەوپێناوەدا تیاچوون هەمان مەبەستیان بووە کەهەتا رۆژی قیامەت یادیان بکرێتەوەو کردەوەکانیان بەکرێن بەسەر مەشق هەروەکو حەزرەتی ئیبراهیم پێغەمبەر(د.خ) لەو رووەوە لەقورئانی پیرۆزدا فەرموی: ﴿ واجعل لي لسان صدق في الاخرين ﴾.

ئەم ئامانجەش تەنها لەرێی خۆلادان لەخۆشییەکانی دونیاو تەماعەکانی دێتەدی، شاعیرێکی دانای عەرەبیش جوانی فەرموە:

لاتخضعن لمخلوق عةلي طمع

فأن ذلك نقص منك في الدين

واسترزق الله مما في خـزائنه

فأن رزقك بين الكـاف والنون

لەوەبەرچاوخستنی ئەم وەسیەتنامەیەی سەرۆکی تێکۆشەر دوو مەبەستم هەیە، یەکەمیان: بەرچاوخستنی ئەوەی ئەو زاتە فەرمانی پێکردووە کە ئامۆژگاری گەلی کوردستان‌و لێپرسراوانی دەکات، دووەمیان: دەشێ ئەم وەسیەتنامەیە ئاگادارکردنێك بێت بۆ سەرکردە کوردەکان کەهێشتا کاروباری کوردیان بەدەستە لەپێناو دەستەبەرکردنی دواڕۆژێکی رۆشن‌و پرشنگدار بۆ گەلی کورد، چونکە هێشتا کار لەکار نەترازاوە، دەبا ئەوەی بەسەر شەهید قازی محەمەددا هات بێتە پەند بۆ هەموو هۆشمەندێك.

**بسم الله الرحمن الرحيم**

**میللەتی رۆڵەو برا عەزیزەکانم، برا بەش خوراوەکانم، میللەتە زوڵم لێکراوەکەم، وام لەدوایین ساتەکانی ژیانمدا، چەند ئامۆژگاریەکتان دەکەم، وەرن بەخاتری خوا چیتر دوژمنایەتیی یەکتری مەکەن؛ یەك بگرن‌و پشتتان وەیەکتری بدەن، لەبەرابەر دوژمنی زۆردارو زاڵم بوەستن، خۆتان بەخۆڕایی بەدوژمن مەفرۆشن، دوژمن هەر ئەوەندە ئێوەی دەوێ؛ تاکاری خۆی پێتان جێبەجێ دەکات‌و قەت بەزەیی پێتاندا نایە، لەهەر هەلێکدا بێ، قەت لێتان نابوورێ.**

**دوژمنانی گەلی کورد زۆرن، زۆردارن، بێ بەزەیین، رەمزی سەرکەوتنی هەر گەل‌و نەتەوەیەك" یەکگرتن‌و یەکبوونە، پشتگیری تەواوی میللەتە، هەر میللەتێك یەکێتی‌و تەبایی نەبێ" هەردەم ژێردەستی دوژمنانی دەبێ، ئێوە گەلی کورد: هیچتان لەگەلێنی سەر ئەم گۆی زەویە کەمتر نییە،بەڵکو لەپیاوەتی‌و غیرەت‌و لێهاتوویی، لەزۆر لەو گەلانەی کەرزگاربوون لەپێشترن، ئەو میللەتانەی کە لەچنگی دوژمنە زۆردارەکانیان رزگاریان بوو، وەك ئێوەن، بەلام ئەوانەی خۆیان رزگارکردووە، یەکێتییان لەنێواندا هەبووە، بائێوەش وەکو هەموو گەلانی رووی زەوی،چیتر ژێردەست نەبن، هەر بەیەکگرتن‌و حەسوودی بەیەك نەبردن‌و خۆنەفرۆشتن بەدوشمنان لەدژی نەتەوەکەمان دەتوانن رزگار بن.**

**براکانم چیتر فریوی دوژمن مەخۆن، دوژمنی کورد لەهەر رەنگ‌و دەستەو قەومێك بێت" هەر دوژمنە، بێ روحەمە، بێویژدانە، روحمتان پێناکات، بەیەکترتان بەکوشت دەدا، تەماحو وەبەردەنێ، بەدرۆو فڕوفێڵ بەگژ یەکترودا دەکا، لەناو هەموو دوژمنەکانی گەلی کورد، دوژمنی عەجەم لەهەموویان زاڵمترو مەلعوونترو خوانەناسترو بێبەزەیترە، لەهیچ تاوانێك بەرانبەر بەگەلی کورد دەست ناگێڕێتەوە، هەر بەدرێژایی مێژوو لەگەڵ گەلی کورد" غەرەزو کینەی ریشەداری هەبووەو هەیەتی، تەماشاکەن بڕوانن تەواوی گەورەپیاوانی گەلەکەتان" لەسمایل ئاغای شکاکەوە بگرە" تا جەوهەر ئاغای برای‌و هەمزە ئاغای مەنگوڕو چەندو چەندین مرۆڤی دیکە" هەر هەموویان بەفریودان ئارامیان کردنەوەو خەڵکیان لەپشت کردنەوەو ئینجا زۆر نامەردانە" کوشتیانن، هەموو ئەوانەیان بەسوێند و قورئان فریو دان کەگوایە عەجەم نییەتی خێری لەگەڵیاندا هەیەو چاکەیان لەگەڵدا دەکات، بەلام هەر کوردێ خۆش باوەڕەو بەسوێندو سۆزی عەجەم فریوی خواردووەو باوەڕی پێهێناون، کەچی تائێستاش بەدرێژایی مێژوو، کەس نەیدیوە تاکو جارێکیش عەجەم بەسوێندو وادەو ئەو پەیمانانەی کە بەسەرانی کوردی داوە، وەفای پێبکاو وادەکانی لەگەڵ کورد بەجێ بگەیەنێ، هەر هەمووی درۆزن فڕوفێڵ بووە، جاوا من وەکوو برایەکی چووکەی ئێوە، لەرێگای خوادا، بۆخاتری خودا پێتان دەڵێم: یەکتر بگرن‌و قەت پشتی یەکتر بەرمەدەن، دڵنیا بن ئەگەر عەجەم هەنگوینتان بداتێ، دیارە ژەهری تێکردووە، بەسوێندو بەڵێنی درۆی عەجەم فریو مەخۆن، کەئەگەر هەزار جار دەست لەقورئانی پیرۆزیش بداو بەڵێنتان پێ بدا، دڵنیابن تەنیا مەبەستی فریودانی ئێوەیە" تاوەکو فێڵێکتان لێ بکا.**

**وا من لەدوایین ساتەکانی ژیانمدا بەخاتری خودای گەورە ئامۆژگاریتان دەکەم، پێتان دەڵێم‌و خوا بۆ خۆی دەزانێ کەمن ئەوەی لەدەستم هات ؛ بەسەرو بەگیان‌و تێکۆشان، بەئامۆژگاری‌و رێنوێنی‌و رێگەی راست نیشاندانی ئێوە؛ درێغیم نەکردووە، ئێستاش لەو ساتەداو لەوبارودۆخەدا؛ دیسان پێتان رادەگەیەنم کەچیتر**

فریوی عەجەم نەخۆنو باوەڕ بەسوێندو دەست لەقورئان دانو بەڵێنو سۆزەکانیان مەکەن، چونکە عەجەم نە خوا دەناسنو نە باوەڕیان بەخواو پێغەمبەر هەیەو نە باوەڕیان بەرۆژی قیامەتو حسابو کیتاب هەیە، لەلای ئەوان ئێوە هەرە لەبەرئەوەی کەکوردن، باموسڵمانیش بن، تاوانبارو مەحکوومن، بۆ وان دوژمنن، سەروماڵو گیانتان بۆ ئەوان حەڵاڵەو بەغەزای دەزانن، بەڵێنم وانەبوو من بڕۆم و ئێوە بەدەست ئەو دوژمنە دڵڕەشانەوە بەجێ بهێڵم، زۆرجاریش بیرم لەرابردوو گەورەپیاوانمان کردۆتەوە؛ کەعەجەم بەفریوو سوێندو درۆو حیلە گرتوویانو کوشتوویانن، چونکە لەمەیدانی نەبەردیدا پێیان نەوەستان و نەیانتوانیوە لەبەرانبەریاندا رابوەستن، ناچار بەدرۆو فڕوفێڵ هەڵیان خەڵەتاندوون؛ کوشتویانن.

من ئەوانم هەر هەموویان لەبیر بوو، قەتیش باوەڕم بەعەجەمان نەکردووە، بەڵام عەجەم لەپێش گەڕانەوەیان بۆ ئێرە چەندین جار وەڵامو راسپاردەیان بەنامەو بەناردنی کەسی ناوداری کوردو فارس، بەدانی بەڵێنو پەیمانی یەکجار زۆرو بۆرەوە کەدەوڵەتی عەجەمو شا خۆی نیەتی خێریان هەیەو ئامادەنین تەنانەت دڵۆپێك خوێن لەکوردستان بڕژێ.

ئێستا ئێوە ئەنجامی بەڵێنەکانیان بەچاوی خۆتان دەبینن" ئەگەر سەرانی هۆزو عەشیرەتە کوردەکانمان خیانەتیان نەکردباو خۆیان بەحکوومەتی عەجەم نەفرۆشتبا" ئێمەو ئێوەو کۆمارەکەمان" وای بەسەردا نەدەهات.

ئامۆژگاریو وەسیەتم ئەوەیە: با منداڵەکانتان بخوێنن، چونکە ئێمەی میللەتی کورد هیچمان لەمیللەتانی دیکە کەمتر نییە" ئیللا خوێندن نەبێ، بخوێنن بۆ ئەوەی لەکاروانی گەلان دوا نەکەون، هەر خوێندن چەکی کوشندەی دوژمنە.

دڵنیابنو بزانن ئەگەر تەبایيو یەکگرتنو خوێندەواریتان باش بێ" زۆر باشیش بەسەر دوژمنانتان سەردەکەون، ئێوە نابێ بەکوشتنی منو براو ئامۆزاکانم چاوتان بترسێ، هێشتا دەبێ زۆر کەسی دیکەی وەکو ئێمە لەو رێگایەدا بەخت بکەن" تا دەگەنە ئاواتو مەبەستتان.

دڵنیام لەدوای ئێمەش زۆر کەسی دیکە هەر بەفێڵو دووڕوویی لەبەین دەبرێن.

دڵنیام زۆر لەوانەی لەدوای ئێمەش دەکەونە دوای فڕوفێڵی عەجەمان" لەئێمەش زاناترو لێهاتووتر دەبن، بەڵام هیوادارم کوشتنی ئێمە ببێتە پەندو عیبرەت بۆ دڵسۆزانی گەلی کورد. وەسیەتێکی دیکە بۆ ئێوە ئەوەیە لەخوای گەورە داوابکەن" هەرچیەکتان بۆ سەرفرازیی ئەو گەلە کرد" کۆمەکتان لەئەو بێ" دڵنیام خوای گەورە سەرتان دەخاو کۆمەکتان دەکا. رەنگە بڵێن ئەی بۆ من سەرنەکەوتم، لەوەڵامدا دەڵێم: بو خوایە من سەرکەوتووم" چ نیعمەتێكو چە سەرکەوتنێك لەوە گەورەتر، کەئێستا وا من لەرێگەی گەلو میللەتو وڵاتەکەمدا، سەرو ماڵو گیانم لەپێناوی ئەودا دادەنێم، باوەڕ بکەن من خۆم لەدڵمەوە ئارەزووم بوو" ئەگەر مردم بەمەرگێك بمرم کە لەحوزووری خواو رەسوولی خواو گەلو میللەتەکەمدا " رو سووربم" بۆ من ئەو مەرگە سەرکەوتنە.

خۆشەویستەکانم کوردستان ماڵی هەموو کوردێکە، هەروەکوو لەماڵەوەدا ئەندامانی ئەو ماڵە هەر کەس لەهەر جۆرە کارو کردەوەیەکدا دەیزانێ، ئەو کارەی پێ دەسپێرن" ئیتر کەس مافی چاوچنۆکی پێنییە، کوردستانیش هەر ئەو ماڵەیە، ئەگەر زانیتان کەسێك لەئەندامانی ئەو ماڵە کارێکی لەدەست دێ" لێی گەڕێن بابیکا. ئیتر نابێ بەرد بخەنە سەر رێیو نابێ بەوە دڵگیربن کەیەکێك لەئێوە

بەرپرسیارەتیی گەورەی بەدەستەوەیە، ئەگەر کاری گەورە کەوتۆتە سەر شانی کەسێك و بەرێوەی دەبا" دیارە لێی دەزانیّ و بەرپرسیاریەتیی گەورتریش لەبەرانبەر ئەو ئەرکەدا هەیە.

دڵنیابە برا کوردەکەت هەر چاکترە" دوژمن کینەی لەدڵەو ئەگەر من بەرپرسیاریەتیی گەورەم لەسەر شانی نەبوایە" ئێستا لەژێرداری سێدارەدا رانەدەوەستام، بۆیە نابیّ لەگەڵ یەکتردا چاوچنۆك بن، ئەوانەی فەرمانی ئێمەیان بەجیّ نەدەگەیاند، نەك هەر فەرمان جێبەجیّنەکەن" بەڵکو بەتەواوی دوژمنایەتیان دەکردین، لەبەرئەوەی خۆمان بەخزمەتکاری خەڵکی خۆمان دەزانی، ئێستا ئەوان لەنێو ماڵ و منداڵی خۆیان" لەشیرین خەودان، بەلاّم ئێمە بەناوی خزمەتکردن بەمیللەت" وا لەژێردرای سێدارەین و خەریکم دوایین ساتەکانی ژیانم بەم وەسیەت نامەیە تەواو دەکەم، جا ئەگەر منیش بەرپرسیاریەتیی گەورەم لەسەرشان نەبوایە، ئێستا منیش وەك ئێوە لەناو خاوخێزان و لەماڵی خۆم لەشیرین خەودا دەبووم، ئەوەی کەئامۆژگاریتان بۆ دوای خۆم دەکەم" ئەمەش یەکێکە لەو بەرپرسیاریەتیانەی کە لەسەر شانمە، دڵنیام ئەگەر کەسێکی دیکە لەئێوە" بەرپرسیاریەتیەکانی منی وەئەستۆی خۆی گرتبا، ئێستا ئەو لەشوێنی من لەژێر سێدارە دەبوو، وا من بەمەبەستی رەزایەتیی خوداو بەپێی بەرپرسیاریەتیی سەرشانم، وەکو کوردێکی خزمەتکاری گەل و لەرێگای کاری چاکدا( امر بالمعروف) ئەو چەند ئامۆژگارییەم کردن کەهیوادارم لەمەودوا عیبرت وەربگرن و بەتەواوی گویّ لەئامۆژگارییەکانم بگرن، بەهیوای خوای گەورە بەسەر دوژمنانتاندا سەرکەون.

١ ـ باوەڕتان بەخوداو ﴿ماجاء من عند الله ﴾ و پەرستنی خوداو پێغەمبەر(د.خ)و بەجێگەیاندنی ئەرکی ئاینی پتەوبیّ.

٢ . یەکێتیو تەبایی لەنێوان خۆتاندا بپارێزن، کاری نەشیاو لەبەرانبەر یەکتردا مەکەن و چاوچنۆك مەبن" بەتایبەت لە بەرپرسیاریەتیو خزمەتکردندا.

٣ . خوێندن و زانست و پلەی زانیاریتان بەرنە سەرەوە" بۆئەوەی کەمتر فریوی دوژمنان بخۆن.

٤ . باوەڕ بەدوژمنان مەکەن، بەتایبەت بەدوژمنی عەجەم، چونکە بەچەند هۆو رێگاوە عەجەم دوژمنی ئێوەیە، دوژمنی گەل و نیشتمان و ئاینتانە. مێژوو سەلماندوویەتی کەبەردەوام لەکورد بەبەهانەیەو بەکەمترین تاوان دەتانکوژیّ و لەهیچ تاوانێك بەرانبەر بەکورد دەست ناگێڕێتەوە.

٥ . بۆ چەند رۆژێك ژیانی بیّ قیمەتی ئەم دنیایە خۆتان مەفرۆشن بەدوژمن، چونکە دوژمن دوژمنەو جێگەی هیچ باوەڕپێکردنێك نییە.

٦ . خیانەت بەیەکتری مەکەن، نە خیانەتی سیاسیو نە گیانیو ماڵیو ناموسی، چونکە خیانەتکار لای خوداو مرۆڤ سووكو تاوانبارە، خیانەت بەرووی خیانەتکاردا دەگەڕێتەوە.

٧ . ئەگەر یەکێك لەئێوە توانی کارەکانی ئێوە بەبیّ خیانەتکردن ئەنجام بدا، هاوکاری بکەن، نەوەك لەپێناوی چاوچنۆکیو بەخیلیدا دژی بوەستن، یان خوا نەکا لەسەری بین بە جاسووسی بێگانە.

٨ . ئەو شوێنانەی لەوەسیەتنامەکەدا نووسیومە بۆ مزگەوت و نەخۆشخانەو قوتابخانە، ئێوە هەمووتان داوای بکەن تا دەکریّ و سوودیان لیّوەردەگیریّ.

**٩ . ئێوە لەخەبات و هەوڵ و تێکۆشان نەوەستن" تاوەك هەموو گەلانی دیکە لەژێر چەپۆکی دوژمنان رزگارتان دەبێ، ماڵی دنیا هیچ نییە، ئەگەر ولاتێك هەبێ، سەربەستییەك هەبێ و، ماڵ و خاك و نیشتمانەکەو هی خۆتانبێ، ئەو کاتە هەموو شتێکتان هەیە، هەم ماڵ، هەم سەروەت، هەم دەوڵەت و ئابڕوو نیشتمانیشتان دەبێ.**

**١٠ . من پێم وانیە حەقی خودا نەبێ، حەقی دیکەم لەسەربێ، بەلاّم ئەگەر کەسێك لای وابوو، لەکەم تا زۆر شتێکی لای منە، سەروەتی زۆرم جێ هێشتووە، بابچێ لەواریسانم داوابکاو وەری بگرێتەوە.**

**تا ئێوە یەکتر نەگرن، سەرناکەون، زوڵم و زۆر لەیەك مەکەن، چونکە خوا زۆر زوو زاڵم لەبەین دەباو نابوودی دەکا، ئەوە بەڵێنی خواوەندە بێکەم و زیاد، زاڵم دەڕووخێ و نابوود دەبێ، خوا تۆڵەی زوڵمی لێدەکاتەوە.**

**هیوادارم ئەوانە لەگوێ بگرن و خوا سەرکەوتووتان بکات بەسەر دوژمناندا، وەك سەعدی فەرمویەتی:**

**مراد ما نصیحت بود وگفتیم**

**حوالت باخدا کردیم و رفتیم**

خزمەتگوزاری گەل و نیشتمان

**قازی محەمەد**[*]

---

[*] سەرچاوە: سەرۆك کۆماری کوردستان لەبەردەم دادگای ئێراندا، بەرهەڤکردنی بەدرەدین ساڵح، گۆڕینی بۆ کرمانجی : سامی ئەنگۆشی، دەزگای چاپ و بلاّوکردنەوەی موکریانی، کوردستان، هەولێر، چاپی یەکەم، ٢٠٠١، ل ٤١-٤٧.

خوێنەری خۆشەویست

ئەم وەسیەتنامەیەی سەرەوە، قازیی محەمەد چەند ساتێك پێش لەسێدارەدانی نووسی، واتە لەساڵی ١٩٤٧دا نووسراوە، کەواتە ڕێی تێناچێت بارزانی نەیخوێندبێتەوە لەکاتێکدا ماوەیەك لەگەڵ سەرۆکی شەهیددا ژیاوە، دەنا کاری پێدەکرد، بەڵام لەناوەرۆکەکەی لایداو ئاشبەتاڵی بەشۆڕشی کوردستان کرد کەدەیتوانی لەومیانەیەدا هەڵوێستێك بنوێنێت مێژوو تا هەتا هەتایە بەنەمر باسی بکات. لەوانەیە یەکێك بڵێت بارزانی، لەمنداڵییەوە لەناو عەشایەرە دوورەکاندا ژیاوە دوور لەهەر زانستو زانیارییەكو هەتا کۆچی دوایی‌کرد کەسێك نەبووە فێری سیاسەتو بواری ئیدارەی بکات... بۆیە دەبینین هەڵسوکەوتەکانی نامەنتیقینو شیاوی سەرکردەیەکی کوردنییینو بوون بەهۆی گەورەترین نسکۆ کە گەلی کورد دووچاری هاتووە.

باشە ئەی سیاسەتمەدارەکانی وەکو دکتۆر عەبدولرەحمان قاسملوو شەرەفکەندی، ئەو دوو سەرکردەیەی کورد کەیەك لەدوای یەك کەوتنە داوی ئێرانییەکانو، لەئەنجامی شەهیدبوونیان، گەلی کورد شارەزاترین دوو کەسی سیاسەتمەدارو ئابووریناس لەدەستدا کەژنە ڕۆژنامەنووسێکی فەرەنسی دەربارەی قاسملوو نوسیبووی( لەژیانمدا، بەکەسێك نەگەیشتووم کەلەم سەرکردەیەی کورد زیرەکتربێت، من کورد دڵنیا دەکەمەوە کەهەتا لەسایەی سەرکردایەتیی کەسێکی وەك دکتۆر عەبدولرەحمان قاسملوو بێت ئەوە ئازادیی خۆی بەدەستدێنێت).

ئێرانییەکان توانییان فریویان بدەنو لەئەنجامی پیلانێکی دڕندانەدا تیرۆریان کردن، جگە لەتاوانە دزێوەکەی کارەساتی ٣١ی ئابی ١٩٩٦ کاتێك بەرێز مەسعوود بارزانی بەپاڵپشتی سوپای عێراق، هێزەکانی یەکێتی نیشتمانیی کوردستانی لەبەشێکی خاکی ئازادکراوی کودستان بەدەرنا... من تەواو لەوباوەڕەدام کەئەو بەئیرادەی بەرێز مەسعوود بارزانی نەبوو، بەڵکو پیلانی دەوڵەتە کۆلۆنیالیستەکانی دراوسێبوو...دەنا چی وا لەسەرکردەکانی کورد دەکات هەمیشە بکەونە داووپیلانی دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستانەوە؟

هۆی ئەمە بۆئەوە دەگەڕێتەوە کەئەگەر لێکۆڵینەوەیەکی پاراسایکۆلۆجی بۆ زۆربەی سەرکردەکانی کورد بکرێت لەوانەی تێکەڵاوییان هەبووە لەگەڵ حکومەتانی هاوسنووری خاکی کوردستان، دەردەکەوێت کەبوونە مایەی دروستبوونی هەستو هەڵسوکەوتی ناسروشتی لەناو کورددا، ئەمەش لەبەر ئەم هۆیانەی خوارەوە :

١ ـ گەلی کورد ماوەیەکی دووروودرێژە لەژێر زەبری زوڵمو ستەمی حکومەتانی دراوسێی کوردستاندا دەژی کەهیچ بەرهەڵستێکیان نەبووەو کوردیش کەسی نەبووە پەنای بۆ بەرێت.

بەکۆیلەکردنی درێژخایەن جۆرە لاوازییەك لەئیماندار دروستدەکاتو مۆرکی بێوەریو کورتبینی دروستدەکاتو وا لەکۆیلە دەکات لەیەکەم خەندەی گەورە دوژمنەکاندا خۆی بەدەستەوە بداتو بڕوا بەفرمێسکی درۆزنانەی دوژمنان بکات بێئەوەی سەرنجی کارەکانیان بدات(الفضل بن موسى الشيباني) دەڵێت: ( ڕاوچییەك لەرۆژێکی ڕەشەبادا ڕاوە چۆلەکەی دەکرد، ڕەشەبا خۆڵی کرد بەناو چاویدا بۆیە هەر چۆلەکەیەکی دەگرت باڵی دەشکاندو دەیخستە ناو توورەکەکەیەوە، چۆلەکەیەك بەهاوڕێکەی گوت: بڕوانە چەند دڵی نەرە بەرامبەرمان... ئەو فرمێسکانەی نابینیت؟ ئەوەی تر گوتی: مەڕوانە فرمێسکەکانی، بڕوانە کردەوەی دەستی)!.

٢ـ حکومەتە کۆلۆنیالیستەکان، کوردیان لەدێهاتەکانیان ڕاگواستو زۆریان لێکردن لەشارەکاندا نیشتەجێبن، لەئەنجامی ئەمەش، جووتیاریان لەپیشەی جووتیاری دوورخستەوەو فێری ژیانی شاریان کرد، ئەویش هەم کشتوکاڵی لەبیرچۆوە هەم بەژیانی شاریش ڕانەهاتو کورد واتەنی لەهەردوو جەژنەکە بوو! لەبەرئەمەشە دەبینین جووتیاری کورد، ئەگەر خوێندەواریش پەیدا بکات ئەوە هێشتا نابێتە خاوەنی ڕۆشنبیرییەکی وا کەدۆستو دوژمن، چاكو خراپ لێکتر جودابکاتەوەو لەئاکامدا لەپێناو پاراستنی شەرەفی، هەمیشە لەبەردەم گەورە کۆلۆنیالیستیەکانیدا سەرکزو داماوە.

٣ ـ یەکێك لەرێوشوێنەکانی کۆلۆنیالیستان ئەوەبوو ڕێگەیان بەمرۆڤی کورد نەداوە بازرگانیی ئازاد بکاتو بەحەڵاڵی نانی پەیدا بکات، بەڵکو ناچاریانکردووە لەرێی دەسەڵاتەوە بژێوی پەیدا بکات ئەمەش وەك پاداشتێك بەرامبەر خیانەتکارییەکانیو هاوکاریکردنی ڕژێمە داگیرکارەکان. لەراستیشدا پەیداکردنی نانی حەڵاڵ حیکمەتێکی خوایی تێدایە کەسوودی دەروونی بۆ خاوەنی هەیە، لەم ڕووەوە لوقمانی حەکیم(ڕەزای خوای لێبێت) بەکوڕەکەی فەرموە: ( کوڕم پشتت بەکاسبی حەڵاڵ قایم بێت، چونکە ئەوەی هەژار کەوتبێت گیرۆدەی سێ دەرد بووە: لاوازی لەئاییندا، کورتهێنان لەهۆشیداو لەدەستدانی پیاوەتی، لەهەموو ئەمانەش

دژوارتر ئەوەیە کەخەڵك سووکایەتی پێدەکەن.

٤ ــ سەرکردەیەکمان نەبووە خەسڵەتەکانی سەرکردەیی تیابێت کە لەو ڕێگەیەوە ریزەکانی یەکبخاتو بمانگەیەنێتە ئاوات، رۆژهەلاتناسێکی ئەوروپی لەمیانەی وەسفکدنی کورددا گووتویەتی: ( کورد بەئەسپێکی رەسەن دەچێت کەتەنها سوارێکی لێهاتووی کەمە!).

خوێنەری خۆشەویست

مەبەستم لەمانەی پێشەوە ئەوەیە کەویستوومە ئەوە بخەمە بەرچاو کەسەرکردەو سەرۆکەکانمان سودیان لەهەڵکانی باوباپیرانمان وەرنەگرتووە بۆیە ئێمەش، بێئەوەی بەلاپەڕەکانی مێژوودا بچینەوەو سوودیان لێوەربگرین، هەمان رچەمان گرتەبەر.

دوا وتە:

لەکۆتایی ئەم کتێبەدا دەمەوێ بەکورتی، بارودۆخی ئێستای کوردستان هەڵسەنگێنم کە بەقۆناغێکی ناسکدا تێدەپەڕێ.

عێراق:

تا ئەمرۆ (٢٠٠٢/٨/١١) گۆڕانگارییەکی وامان لەلایەن سەدام حسەینی سەرۆکی عێراقی، دەرهەق مەسەلەی کوردی بەدی نەکردووە، چونکە سیاسەتە شۆڤێنییەکانی لەتەعریبو تەبعیسو راگواستنو رەشبگیرو لەسێدارەدان بەردەوامە، ئەمەش لەکاتێکدا ناوبراو لەبەر زەبرو هەڕەشەیەکی ئاشکرای جۆرج بۆشی سەرۆکی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادایە کەرایگەیاندووە لەعێراق دەداتو سەدام حسێن لەدەسەلاٽ لادەبات.

دەوڵەتە عەرەبییەکان:

زۆربەی سەرکردە عەرەبەکان بەرهەڵستی پرۆسەی لێدانی عێراقو لەدەسەلاٽ خستنی سەرۆك سەدام حسەین دەکەن، هەروەها جەختدەکەن لەسەر هەڵوێستی نەگۆڕیان دەربارەی دابەشنەکردنی خاکی عێراق، هەموانیش دەزانن کەدابەشکردنی عێراق تەنها لەپێناو پێکهێنانی قەوارەیەکی کوردییە، لەناویشیاندا تەنها سەرۆك معەمەر قەزافییە کەسووورە لەسەر حەتمی بوونی رزگارکردنی کورد لەکوێرەوەریو دەردەسەری ... ئەمەش هەڵوێستێکە هەرگیز لەیاد ناچێت.

سەرکردە عەربەکان، دەبوایە ئارەقەی شەرمەزارییان بڕشتایە هەر کەبیریان بەکردایەتەوە سەرکردەی پاڵەوانی کورد سەلاحەدینی ئەیووبی، چۆن رۆژێك بوو، پێش ٣ هەزار شەرڤانی کورد کەوتبوو کەزۆربەیان خەڵکی هەولێری قەلاومنارەبوون لەکوردستانی باشوور، ئنجا زۆربەیان لەمیانەی بۆ دووەم جار پاککردنەوەی خاکی عەرەبی لەفەلەستین، تیاچوون، کەپێشتر بۆ یەکەمجار ئەو خاکە لەسەردەمی خەلیفە عومەری کوڕی خەتتاب(ر.خ) داگیرکرابوو، کەچی ئەمڕۆ دەبینین دەوڵەتە عەرەبییەکان بەهەموویانەوە ناتوانن شوێن پێیەك بۆ خۆیان لەخاکی فەلەستین بگرن، هۆی ئەمەش تەنها بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە لەگەڵ ئەو هەموو توانا سەربازیو تفاقە جەنگییانەیانەوە، تۆزقاڵێکی ئازایەتی سەلاحەدینی ئەیووبیان لەگیانـدا نییە... وەك دەشزانین زۆر کەمن گۆرستانەکانی دەوڵەتە عەرەبییەکان کەگۆڕی شەهیدانی کوردیان تیا نیە، لەو کوردانەی کە بەدرێژایی مێژوو بەدەنگ هاواری عەرەبەوە چوون بۆ رزگارکردنی خاکیان.

لەوەتەی کوردستان پارچە پارچەکراوە بەچاوی خۆتان دەبینن کەداگیرکەران چیمان پێدەکەن، زیاد لەوەش ئێوەی سەرکردەی عەرەب پشتگیریی سەدام حسەینیان کردووەو ئەوپەڕی هاوکاریشیان کردووە، هەر ئەویش بەبەڵگەوە نەخشە دارێژەرو جێبەجێکەری ئەنفالەکانو کیمیابارانە، جا ئەگەر بەراستی هەوڵتان بدایە دەتانتوانی سیاسەتە چەواشەکانی راست بکەنەوە، لەملاشەوە لاپەڕیەکی نوێ لەرووی دۆستایەتیکردنی کورددا هەڵبدەنەوە... بەلاٌم ئایا ئێوە شتی واتان لەدەستدێت؟ .

تورکیا:

بلّند ئەجەویدی سەرۆك وەزیرانی تورکیا، بەپشبەستن بەهێزی جەنەڕاڵەکانی تورکیا، بەبێ ترسو بەوپەڕی لەخۆڕابینین رایگەیاند کەهێزەکانی تورکیا لەبۆسەدان بۆ هەر جموجووڵیکی کورد لەپێناوی دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی لەکوردستانی باشووردا لەدوای رووخانی رژێمی ئێستای عێراق، هەروەها پلان دادەڕێژن بۆ داگیرکردنی شاری مووسڵو کەرکووك. بەلاٌم ئەوەی بارودۆخەکەی گۆڕی ئەوەبوو کە لەسەرەتای مانگی ئابی ٢٠٠٢ دا، پەرلەمانی تورکیا بڕیارێکی دەرکرد تێیدا ڕێگەی بەکورد لەتورکیادا کەبەزمانی کوردی بخوێنن،

هەروەها دانانی ئێزگەیەکی رادیۆو یەکێکی تەلەفزیۆن کەبەرنامەکانی بەزمانی کوردی بلاّوبکاتەوە، ئنجا هەلگرتنی حوکمی عورفی لەکوردستانی باکووردا. ئەمە بڕیارێکی دلّخۆشکەرەو مایەی خێردانەوەیە ئەگەر دەسەلاّتدارانی تورکیا جێبەجێی بکەنو لەهەمانکاتدا واز لەدەستێوردانە ناڕەواکانیان لەکوردستانی باشوور بێننو پیاوەکانیان لەتابووری پێنجەم بەرنە دەرەوەی خاکمان.

سووریا:

حکومەتی سووریا ئێستاش، وەکو ئەوسا لەسەر ئەو پەیمانەیەتی کەلەگەلّ حکومەتی عێراقو ئێران ئیمزایکردووە بۆ یارمەتیدانی یەکتر لەپێناو بەرەنگاریکردنی هەر جمووجوولیکی سەربازیی کوردی، تا ئەمڕۆش سوورییەکان، سەرباری هەبوونی ۳ ملیۆن کورد لەسووریادا، هێشتا دان بەمافی کورددا نانێن تەنانەت پشتێنەی سەوزیان وەکو سنوورێك لەبەردەمی کورددا داناوە نایەلّن تێکەلّی ناوچەو هەرێمەکانی تری ناو سووریا بن.

ئێران:

لەرۆژی کودەتای ئیسلامی بەسەر حکومەتی شا، هەتا ئەمڕۆ پەیوەندییەکانی کۆماری ئیسلامی لەگەلّ حکومەتی عێراقدا، رۆژ بەرۆژ روو لەخراپییە، ئەمەش وای لەهەردوو ولاّت کردووە یارمەتییەکی سنووردار پێشکەشی بەرەی ئۆپۆزسیۆن بکەن لەپێناو بەکارهێنانیان وەکو داردەستی مەرج سەپاندن لەکاتی پێویستدا، ئەوەی مل بۆ رێنماییەکان کەچ بکاتو فەرمانەکانی دەولّەتی بەرامبەر جێبەجێ بکات ئەوە کۆمەك دەکرێت، لەمیانەی ئەو یارمەتییانەش بەکارهێنانی خاكو سنووری دەولّەتەکەیە لەلایەن حزبە کوردییەکانەوە بۆ هاتووچۆکردن بۆ دەرەوەی ولاّت.

دەربارەی هەلّوێستیان لەئاست مەسەلەی کورد ئەوە وەك دەولّەتەکانی ترە لەرووی بەرەنگاریکردنی هەر جمووجوولیکی سەربازیی کوردی هەروەکو لەوبەیاننامەیەدا بەرچاو دەکەوێت کەبەرێز ئایەتوڵلاّ خومەینی لەسالّی ۱۹۷۹ دەریکردو تێیدا رایگەیاند کە(من وەکو فەرماندەی گشتیی هێزە چەکدارەکان، داوا لەهێزە زەمینیو ئاسمانیو دەریاییەکان دەکەم هەرچی زووترە بەتوندی لەدوژمنانی شۆڕش بدەن، بچنە کوردستان تا ئاگری ئاژاوەی کوردستان بکوژێننەوەو کۆتایی پێ بێنن)، ئەمە بەیاننامەی سەرکردەی شۆڕشی ئیسلامی بوو لەسەرەتای خۆگرتنی دەولّەتی نوێی ئێراندا.

جا دوژمنایەتیی دەولّەتی ئێرانی ئیسلامی، ئەوساو ئێستاش باری گەلی کوردی گران کردووە ئەمەش بەهۆی کاریگەرییەکەی چونکە سنووریان پێکەوە دوورودرێژە هەروەها بەهۆی ئاینەوە کەکۆماری ئیسلامی هەولّدەدات نەتەوەی کورد لەو بۆتەیەدا بتوێتەوە هەرچەندە پێغەمبەر(د.خ)لاری لەوە نەبوو یاوەری پابەرز سەلمانی فارسی خۆی بەنەتەوەی فارسی خۆیدا هەلّنێت، ئەوپیاوەی کەشەرەفی ئەوەی پێبڕا پێغەمبەر لەرۆژی شەڕی خەندەقدا دەربارەی ئەو گوتی: (سەلمان لەئێمەیە ئالوبەیت).

کۆمەلاّنی خەلّکی کوردستان کەپیرۆزباییان لەشۆڕشی ئیسلامی بەسەرۆکایەتی بەرێز ئایەتوڵلاّ خومەینی کرد، لەپێناو ئەوە نەبوو ببینن دوژمنایەتیی حکومەتی ئیسلامی لەدژیان، توندترو دژوارترە، چونکە ئاینی ئیسلام ئاینی بەزەییو دادو یەکسانییەو هەرگیز نەمانبیست ئاینی چەوساندنەوەو ستەمو زۆرداری بێت...لەشۆڕشە جەماوەرییەکەی دژی ئێران، کورد دەستی گەورەی هەبوو لەرزگارکردنی کوردستانو رێککەوتن لەگەلّ نەتەوەکانی تر بۆ ئەوەی یەك بەرە دروستبکەن دژی شای ئێران کەهەولّیدەدا زمانی کورد ریشەکێش بکاتو سامانەکانی لووش بدات... ئەوەبوو زۆربەی سیاسەتمەدارانی کورد پەیوەندییان بەسەرانی شیعەوە هەبوو لەهەندەران پێش ئەوەی ئێران رزگار بکرێت... بەلاّم خەلّك وایان نەدەزانی کەرژێمی کۆماری ئیسلامی، بەم شێوەیە کەئاینو مرۆڤایەتی فێزی لێدەکاتەوە، مامەلّە لەگەلّ گەلی کورددا دەکات.

لەوەتەی خوای گەورە دەرووی رەحمەتی خۆی لەرووی کورددا کردۆتەوەو بەشێکی خاکەکەی رزگاری بووە، دەبینین دەستێوەردانی ئاشکراو بێپەردەی ئێران بەچاوی خۆمان دەبینین لەکاروباری حکومەتی هەرێمی کوردستانو ئەمە بۆتە مەترسییەك بەئاشکرا هەڕەشە لەم قەوارە بچووکە دەکات، هاندەرو پالّنەری سەرەکیی شەڕی پکەکەو (جند الاسلام)، دەولّەتی ئێرانە. لەبارەی(جند الاسلام) شتێکم لەم کتێبەدا نووسیووە، هەموانیش دەزانن ئەگەر پشتوانیی دەولّەتی ئێران نەبێت ئەوانە نەیاندەتوانی خۆیان لەبەردەم هیچ حزبێکی کوردستانیدا بگرن کەچەندین دەهەیە تێدەکۆشن.

دەربارەی پەکەکە، ئەوانە لەمێژە تێکۆشانی چەکدارییان دژی دەوڵەتی کۆلۆنیالیستی تورکیا راگرتووە لەکاتێکدا دەبینین خەباتی چەکدار دژی گەلو قەوارەی کوردی لەکوردستانی باشووردا رادەگەیەنن کەدەبوایە پشتگیرییان بەکردایەو بەهەموو هێزو توانایەکیانەوە پشتیان بگرتایە. پەکەکە، وەکو کردەوە سەربازییەکانیان دژی تورکیا راگرتووە، دەبوایە وتوێژ لەگەڵ حکومەتی هەرێمی کوردستان بکەن تا جێ پێیەکیان لەکوردستاندا دەست بکەوێت بەبێ قرەو ئاژاوە، هەموان لەسایەی ئیدارەی کوردیدا بژین وەکو هەموو حزبەکانی تر کەشەریان لەدژی دەوڵەتی ئێرانو تورکیا راگەیاندووە، نەك ناوبەناو هەڕەشەی داگیرکردنی شارە ئازادکراوەکانی کوردستان بکەن ئەمەش بەناوی رزگارکردنی ئەو شارانە، لەکاتێکدا خودی ئێران یارمەتییان دەداتو، نەخۆشخانەی بۆ کردوونەتەوەو، ئەمڕۆ بارەگای فەرماندەیی گشتییان لەخاکی ئێراندایە. سیاسەتی پەکەکە ئاشکرایە، ئەوەتا ناوچەی شاخی قەندیلو قەڵاتووکانیان داگیرکردووەو چاوەڕێی ئەوەن رژێمی عێراق بڕووخێت تاهێرش بکەنو ناوچەی حەوزی دوکان داگیربکەن لەکاتێکدا هێزەکانی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان سەرقاڵی راوەدوونانی هێزە هەڵاتووەکانی سوپای عێراقە... لەلایەکی ترەوە پەکەکە هەڕەشە لەپارتی دیموکراتو کۆمەڵەی ئێرانی دەکات کەئەگەر بەشێوەیەك دژی دەوڵەتی ئێران بجووڵێنەوە ئەوە لێیاندەدات ... کەواتە پەکەکە هەڕەشە لەشۆڕشی کورد دەکەن لەهەرکوێ هەبێت... داخی گرانم بۆ ئەو شۆڕشگێڕە نیشتمانپەروەرانەی لەپێناوی بیروباوەڕێکی پتەودا خۆیان دەتەقێننەوە کەچی کۆتاییەکەیان بەوە بگات کەببنە داردەستی ئێران، ئەو دەوڵەتەی هەرگیز و لەپاشەڕۆژیشدا کەمتەرخەمی ناکات لەلێدانی بزووتنەوەی کوردیو دژایەتیکردنی (هەموو ئەم گێرمەوکێشەوگیروگرفتانە، دەستکردی دامودەزگای موخابەراتی دەوڵەتانی دراوسێیە).

خوێنەری خۆشەویست ...برا بەڕێزەکان، ئەی سیاسەتمەدارو لێپرسراوانی کوردستانی ئازیز، داوای لێبوردنتان لێدەکەم ئەگەر زیادەڕەویم بەرامبەر یەکێکتان کردبێت، بەڵام خوا ئاگادارە ئاگرێك لەناو هەناوم دەئایسێت هاوارم لێدەکات شتێکی باش بۆ گەلی کوردستانو ئیدارەکەی بکەم، ئەوەی لەمەوپێش گوتوومە، مەبەستم لێی ئەوەبووە کەئەو گەلو حکومەتانەی دراوسێمان چاوەڕێی ئەوەیان لێناکرێت خێر بدەنەوە بۆمان، تاقیکردنەوەش باشترین بەڵگەیە، ئەوانەش وەك دووپشکەڕەشە وان، ئەگەر بۆت ناکرێت پانی بکەیتەوە خۆتی لێلابدە.

هەرچی وڵاتانی دەوروبەرە چاویان بڕیوەتە ئەم بستۆکە خاکەی کوردستان کە بەخواستی خواو سیاسەتی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاو سووربوونی ئەوگەلەی ئەوساو ئێستایش هەوڵدەدات لەپێناو بەدیهێنانی مافە رەواکانی، رزگاریبووە. ئێستا پۆلیسی هاتوچۆو ئاسایشو کارمەندو لێپرسروانی فەرمانگەکان وەزیرو باقی بەڕێوەبەران ئیدارەی هەرێمی کوردستانی کوردن.

هەندێك جار وام دێتە بەرچاو کەئەو کوردەی لەسەردەستی شۆڤێنیستە عەرەبەکانی وەك پۆلیسو سەربازو پیاوانی دامودەزگا ئەمنییەکانی حکومەتی عێراق سووکایەتی پێکراوەو زۆرستەمی چەشتوون، ئێستا کەخۆی لەم ئازادییەدا دەبینێت بەخەونی تێدەگات. سوپاس بۆ هەموو ئەوانەی رۆڵیان هەبوو لەدامەزرانو پەرەپێدانی ئەم ئیدارە کوردییەی پێی ناوەتە دوازدەهەمین ساڵی تەمەنیدا...

سەرەتاش سوپاسی بێپایان بۆ بەدیهێنەری گەردوون، ئینجا سوپاس بۆ ئیدارەی ئەمریکیی خاوەنی پرۆژەی ناوچەی ئارام، ئەم ئەزموونە مۆدێرنە بێوێنەیە، هەروەها سوپاس بۆ رێکخراوەی نەتەوە یەکگرتووەکان کەپرۆژەی نەوت بەخۆراکی هێنایە کایەو هەروەها تائێستا پشتگیریی ئەو رێکخراوانە دەکات کەکوردستان ئاوەدان دەکەنەوە، کوردستان کەزۆربەی گوندو شارۆچکە سنوورییەکانی وێرانە بوونو ئەمڕۆ دەبینین بونەتە بەهەشت. هەروەها سوپاو پێزانینمان بۆ سەرکردەو سیاسەتمەدارو لێپرسراوو کارمەندانی حکومەتی هەرێمی کوردستان بەتایبەتی بەڕێزان مام جەلالو، مەسعوود بارزانی، د. فوئاد مەعسووم، کۆسرەت رەسول عەلی، د.رۆژ نووری شاوەیس، د.بەرهەم ئەحمەد ساڵح، نێچیرڤان بارزانی، عەدنان موفتی، شەوکەت یەزدین، جەوهەر نامیقو، سەرجەم کارمەندانی ئیدارەی کوردی.

لەراستیدا لەتوانامدانییە وەسفی ئەم ئەزموونە بێوێنەیەی ئەمڕۆ بکەم؛ کەدەبینم پێشکەوتنو گەشە لەهەموو بوارەکانی کشتوکاڵ، تەندروستی، ئاوەدانی لەبەرچاودایە... ئەوەتا نزیکەی هەزار کۆمپانیای ئاوەدانکردنەوە لەکوردستاندا دەستبەکارن جگە لەکۆمپانیاکانی بازرگانی... لەهەموویشی گرنگتر ئەو کەشی

ئازادییەی خەڵك بەسەریدەبەن کەهەموو میوانێکی دەرەوەی کوردستانو تەنانەت ئەورووپاش هەستی پێدەکات... ئەمە شتێکە رۆژێك لەرۆژان تەنها بەخەیاڵماندا دەهاتو ئەمڕۆ هاتۆتەدی... کەواتە ئایا ئەمە شایەنی ئەوە نییە نوێژی سوپاسگوزاری بۆ بکەین تابیپارێزین... ئایا شایەنی ئەوە نییە هەموومان یەك ریز بوەستین لەدژی تێکدەران ئینجا پشتگیری ئاوەدانکەران بکەین... ئایا ئەمە شایەنی ئەوە نییە هەمومان بیر بۆ ئەوەبکەینەوە هەوڵ بۆ بەڕێوەبردنی ئەم ئەزموونە بدەینو زیاد لەمەش، پەرەی پێبدەین تا هەموو ئەو شارو شارۆژکانەمان بگرێتەوە کەلەم نازە بێبەشن!

خوایە ئەم ئەزموونەمان درێژە پێبدەیتو کوردستان بەخۆشی خەڵکە موسڵمانەکەی ئاوەدان بکەیتو لەبەڵای ناگەهان بمانپارێزیت.

لێرەدا دەمەوێ نامەیەکی کراوە ئاراستەی بەڕێزان جەلال تاڵەبانیو مەسعوود بارزانی بکەم وەك بانگەوازێك نەك داوای لێبوردن، بانگەوازێك کەخێری نەتەوەی کوردی بەدەمەوەبێت، بۆیە بینیم ناچارم لەم کتێبەدا بڵاویبکەمەوە، چونکە دوای بیرکردنەوەیەکی زۆر سەیرمکرد ئەمە باشترە لەوەی لەرێی نووسینگەکانیان بۆیان بنێرم کەدەستیکەسی پێڕانەگات، یان تەنانەت ئەگەر بەدەستیشیان بگات ئەوە نایخوێننەوە، چونکە ئەمە بۆتە نەریتیان کەخۆیان لەو پلەوپایەیەدا بینیوتەوە، بێگومان چاوپێکەوتنیشیان لەوە زەحمەتترە کەمرۆڤ بیری لێبکاتەوە، چونکە ئەو بەربەستەی دەستوپێوەندو پاسەوانەکانیان دروستیان کردووە مەگەر باڵندە بەئاسمانەوە بیبڕێت، بۆیە ئەم نامەیەی لەم کتێبەدا بڵاودەبێتەوە، لەرێی دۆستەکانیانەوە پێیان دەگاتو ئەوسا ناچاردەبن بیخوێننەوە.

## بۆ هەردوو سەرکردەی کاربەدەست، مامۆستا جەلال تاڵەبانیو ڕێزدار مەسعوود بارزانی

سلاۆوێکی شۆڕشگێرانە

پیرۆزبایی لەخۆتانو هەردوو ئیدارەی کوردی دەکەم بۆ ئەو سەرکەوتنەی بەدرێژایی ماوەی رابردوو بوو بەمایەی بەرزیی پلەی کورد بەو شێوەیەی کەوای لەئەمەریکای خاوەن گەورەترین دەسەلاتو هێز لەجیهانداکرد کەبایەخ بەکوردستان بدات بێئەوەی بایەخ بەدەستکەوتە خۆییەکانی بدات. کاتێك هەواڵی بانگێشتکردنتانم بۆ ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بیست لەپێناو وتوێژکردن دەربارەی نزیکبوونەوەی لێدانی عێراقو لەکار لابردنی سەدام حسەین سەرکۆماری عێراق، ئەوپەڕی خۆشی دایگرتم بۆ ئەم بایەخ پێدانە. ئەوسا هەمیشە چاومان لەوەبوو ئێزگەیەکی جیهانی، ناوی کوردستان بێنێت، یان بۆچەند چرکەیەك باسی گەلی کورد بکات ... جا لەمیانەی ئەم پێشکەوتنەی ئەمڕۆ دەیبینین جیاوازییەکی گەورە بەدیدەکەین لەنێوان بارودۆخی ئەوسامان بەبەراورد لەگەڵ ئێستادا کەکێشەکەمان بۆتە وێردی سەرزاران لەکۆڕوکۆمەڵە جیهانییەکاندا.

بێگومانم لەوەی کەزانیارییەکانم، بەبەراورد لەگەڵ ئەو زانیارییانەی لەلای ئێوەیە دەربارەی بارودۆخی ئێستاو هەڵوێستی دەوڵەتانی دراوسێو پێگەی سیاسیمان لەجیهاندا، کورت دێنن، بەلاّم لەبەرامبەر گرنگیی ئەو هەڵوێستەی ئەزموونی کوردی پێیدا تێدەپەڕێت هەست بەبەرپرسیاریەتی دەکەم کەئەمەش هانیدام ئەم نامە کراوەیەتان بۆ بنووسم.

سەرۆکە بەڕێزەکان . . .

گەورەیی بەرپرسیاریەتیتان‌و گرنگیی بارەکە ناچارتان دەکات لەبەرامبەری خوای گەورەو ئیرادەی کۆمەلآنی خەلکی کوردستان بەلێن بدەن کەهەموو توانایەکی لێهاتوویی سیاسی بخەنەگەڕ، لەو ڕووەوە لەئینگلیزو عەجەمان بلیمەتتربن بۆ رزگارکردنی گەلی کورد. گومان لەوەدا نییە کەسیاسەتی دەرەوەتان سەرکەوتووبووەو پێویست بەبەلگە هێنانەوە ناکات هەرچەند نووسینەکانی دووتوێی کتێبەکانی منتان بەدلّ نییە، بەلآم تەواو لەوباوەڕەدام کەسەرکەوتنتان لەم ئەزموونەدا وا لەخەلکی کوردستان دەکات لەهەردوو بەشەکەدا، کتێبەکانم بسووتێنن، بەلآم خوانەخواستە، ئەگەر شکستتان خوارد ئەوە هەردوو دنیاتان لەدەستداوەو ئەوسا ئەوخاکەی بەسەریشدا دەڕۆن نەفرەتتان لێدەکات، خێزانی شەهیدەکان‌و پیرو جوانی گەل، سەرزەنشتتان دەکەن‌و لەئەنجامدا هەموو حزبە عەلمانییەکان‌و ئیسلامییەکانی کوردستان کەدەستیان لەم مەسەلەیەدا هەیە، لەگەلّ خۆتاندا نغرۆ دەکەن، چونکە ئەوەی بەسەر شای ئێراندا هات، بەسەر ئێوەشدا دێت. چونکە کاتێك خاك تووڕەدەبێت‌و خەشم‌و قینی هەلّدەستێت کەس رزگارتان ناکات لەدەستی، نە سوپا نە دۆستی نزیك بەفریای ناکەوێت. جابەڕێزان، دیمەنی کۆمەلآنی خەلکی کوردستان بەتێکشکاوی‌و دۆڕاوی بێننە بەرچاوتان کەدووبارە دەکەونەوە بەردەستی دوژمنە شۆڤێنیستەکان لەعەرەب‌و عەجەم‌و تورك.

بەرێزان

لەوانەیە ئاگاداری باروودۆخی خەلکی نەبن، ئەمرۆ خەلّك زۆر بەترسەوە ڕووداوەکانی جیهان‌و ئەوانەی پەیوەندران بەکوردستانەوە، هەلّدەسەنگێنن‌و گرەو لەسەر تێکشکان دەکەن، ئەمەش لەبەر هۆیەکی زۆر گرنگ ئەویش ڕێکنەکەوتنی ئێوەیە هەرچەندە دامودەزگاکانی راگەیاندنی هەردوولاتان هەمیشە بەباشە باسی ئەو دیدارانەی گەورەئەندامانی حزبەکانتان دەکەن کەژمارەی دیدارەکان لەهەشتا جار تێپەریوە، ئەمە لەکاتێکدا واقیع، پێچەوانەی ئەم گەشبینییە دەسەلمێنێت.

پێبەپێی بلآوبوونەوەی هەوالّی هێرشی ئەمریکی بۆ سەر عێراق لەدەزگاکانی راگەیاندندا، دەبینین حزبە کوردستانییەکان هێشتا سەرگەرمی دیدارو چاوپێکەوتنن، تەنانەت ڕێککەوتنی پارتی لەگەلّ هەندێك حزبی سیاسیدا هێشتا قسەی سەرکاغەزەو لەچەند بانگێشتێکی نانخواردن‌و چەند دانیشتنێکی زارەکی تێنەپەڕیوە چونکە بەدەنگەوە چوون بۆ ڕێککەوتن، یەکلایەنەیە.

دوو کێشەی سەرەکی لەبەردەم بەرێزتاندایە، یەکەمیان: گەیشتن بەرێککەوتنێکی هەمیشەیی کەمەبەستی یەکگرتنە لەنزیکترین هەلدا، دووەمیان: رازیکردنی گەل‌و دروستکردنی پردی لێك گەیشتن لەگەلّیدا. جا بەربەستێکی گەورە هەیە لەنێوان بەرێزتان و خەلکی کوردستاندا، وابزانم ئەوەش لەرێککەوتنی ناو خۆتان ئەستەمترە، ئەوەی ئەم بەربەستانەشی دروستکردوە نەمانی بروایە لەنێوان سێلآیەندا، ئێوەو ئەندامانی هەردوو حزبتان، لەگەلّ لایەنی سێیەم کەئەویش گەلە. پێغەمبەری خوا(د.خ) کاتێك لەرێککەوتنامەی حودەیبیەدا تەنازولی بۆ سەرانی قورەیش کرد، یاوەرەکانی سەرزەنشتیان کرد، بەلآم ئەو هەنگاوە دەروازەی سەرکەوتنی موسلّمانە کان بوو بۆ داگیرکردنی مەککە.

بەرێز مام جەلال: بێگومان بەرێزتان لەسۆنگەی سەردانیکردنت بۆ لای بەڕێز مەسعوود بارزانی، گلەیی زۆرت لەلایەن ئەندامانی مەکتەبی سیاسی‌و دۆستانتەوە هاتەسەر، ئەی بۆچی بەسەر ئەو هەستەدا زالّ نابیت‌و سەردانەکت دووبارە ناکەیتەوە.

دەربارەی تۆش بەڕێز مەسعوود بارزانی، خەلّك باسی لەخۆبایی بوون‌و خۆبەزلزانین‌و بەبچووك سەیرکردنی هەموو خەلّك دەکەن، خوای گەورەش نەهی لەم سیفەتانە کردووە، جا ئەگەر وانەبێت ئەوە واقیع وانالّێت. ئێوە لەپێناو بەرژەوەندیی تەسکی حزبایەتی‌و بەهێزکردنی لایەنەکەتان‌و بێهێزکردنی لایەنی بەرامبەر، هەمیشە ئامادەبوون سەد جار لەگەلّ دوژمنانی کورد دانیشن، باشە بۆچی ئەو رق‌و کینەیەی ناو دەروونتان بەرامبەر بەگەل ناسڕنەوە تا ئاشتی‌و تەبایی بێتەدی‌و لەئەنجامدا یەکگرتنی لێبکەوێتەوە.

بێگومان ئێوە، دوای رزگارکردنی کوردستان کەهاتنە کوردستان ئەو هەموو خەلکەتان لەگەلّدا نەبوو کەئێستا گوێ لەمشتانن، سامانێکی واشتان پێنەبوو، بەلآم ئەوەی ئێستا لەبەردەستاندایە، هیچ نییە لەچاو ئەوەی لەبەردەستی میرەکانی کەنداودایەو بایی ئەوەش نییە هێرشێك بۆ سەرکوردستان بشکێنێت بەلآم بۆ کورد زۆرە، کەواتە لاف بەچییەوە لێدەدەن.

كەواتە بەڕێزان، ئەگەر هەستی نیشتمانیو بەزەیی هاتنەوە بەخەڵکدا کاریگەری نەبێت بۆ پەلەکردن لەیەکگرتنو ڕێککەوتن، دەبا یەکەم بۆ خوا بێت ئنجا بۆپارێزگاریکردنی دەورەکەتان.

تۆبڵێی ئەگەر ئەمڕۆ هەڵبژاردنێکی ئازاد لەکوردستاندا ئەنجام بدرێت، ئایا ئێوە زۆرینەی دەنگەکان بەدەستدێنن؟ بڕواناکەم...کەواتە بەچەپڵەی جەماوەر لەبۆنەکاندا هەڵمەخەڵەتێن، ئەوە پڕوپاگەندەیە کەخەڵکی چەواشەکار، بۆرازیکردنی ئێوە دەیسازێننو لەواقیعەوە دوورە.

لایەنگری بەزەبری هێزو هەڕەشە تا سەر نییە، بڕواش ناکەم هەست بەچەرمەسەری گەلی کوردبکەن لەئەنجامی ئەم ناتەباییو نائارامییە. کەواتە بۆچی بیر لەوە ناکەنەوە گەل لەهەنگاوەکانتاندا بەشداربکەن، چونکە تەنها گەل پاڵپشتانە بۆ پتەوکردنی دەسەڵات، بۆ نموونە لەدوای ڕاگەیاندنی جەنگ دژی ئەڵمانیا، ئەندامانی حکومەتی بەریتانیا، داوایان لەونستۆن چرچڵ کرد وەزارەتێکی نوێ پێکبێنن، چرچڵ ئەمەی ڕەت کردەوە بەلام یەك مەرجی بۆ جێبەجێ کردنی داواکە دانان ئەویش ئەوەیە کەهەموو ئەندامانی حکومەتو لایەنە حزبەییەکانو جەماوەر بەشداربن، ئنجا بەکردەوە سەرۆك وەزیرانی پێشوو وەك وەزیر لەوەزارەتی نوێدا دامەزراند ئیتر جەماوەر بەکوتەك و دارەوە ڕژانە شەقامەکان بۆ پشتگیرکردنی چرچڵ...کەواتە بەڕێزان، هەتا کار لەکارنەترازاوە بیر بکەنەوە.

بەڕێز مەسعوود بارزانی: لە١٩٩١/٣/١٣ کاتێك لەماڵی عزەت بەگ چاوم پێت کەوت نزیکەی ٣هەزار کەس لەبەر باران بەپەرۆشەوە چاوەڕێی دەرکەوتنتان بوون تا بۆ چەند ساتێك بتانبینن... باشە تۆ بڵێی ئێستا هەمان جەماوەرو هەمان پشتگیریتان هەبێت ؟!

کەواتە بۆچی بەخۆتاندا ناچنەوەو بەخۆتان لەو ڕاستییە ناکۆڵنەوە تا بزانن خەڵك هەست بەچی دەکەنو داوای چیدەکەن! تکام وایە وەکو ئەوسا دڵی خەڵك نەك جەستەیان، بەلای خۆتاندا رابکێشنەوە...

بەڕێزان هەردوو سەرکردەی کورد:

ڕۆژگارو تاقیکردنەوەکان ئێوەی قاڵکردووەو پێویستیتان بەئامۆژگاری نەماوە، بەلاَم خوای گەورە فەرمانی پێمان کردووە راوێژ بکەین منیش ئەگەر لەو بڕوایەدا نەبم کەدەستوپێوەندو پاسەوانەکانتان دیوارێکیان بەبیانووی پاراستنتان دروستکردووەو تەنها هەواڵەکان لەمو لەو دەبیستن، ئەوە بەم نامەیە قسەم لەگەڵتاندا نەدەکرد.

تێکشکاندنی ئاواتی دەوڵەتانی دراوسێو بەزینی حزبو لایەنە نەیارەکانی ئیدارەی کوردی تەنهاو تەنها لەرێی یەکخستنی ریزەکان دەبێت، ئەوەش لەرێی نیازپاکیو راستگۆییو رێگەنەدان بەئیدارەی ئەمەریکی کەقسەی خۆی بەسەرتاندا زاڵ بکاتو ناچارتان بکات لەبەرچاوی جیهان وەك برای تەبا دەرکەون.

بادیدارەکانتان راستگۆبێت نەك مادەیەکی ئیعلامی، بریا ئەندامانی مەکتەبی سیاسیو لیژنەی مەرکەزیتان پێکەوە بەهەموو کۆمیتەو بارەگا حزبەییەکاندا دەگێڕا بەتایبەتی بۆ بارەگای حزبە نەیارەکانی وەکو پارتی پارێزگاران وە بنەماڵەی خدر ئاغا سورچی کە لەئەنجامی شەڕی ناوخۆ چەرمەسەرییان بەسەرهات.

تکام ئەوەیە هەرچی زووترە تەنسیق بکەن بۆ یەکگرتن بۆ پێکهێنانی پتەوترین هێز لەکوردستاندا کەهەموان سڵی لێدەکەن، ئنجا دوژمن لەپێش دۆست ناچار بکەن حساب بۆ ئیدارەی هەرێمی کوردستان بکاتو ستافی ئەوئیدارەیە، مێژوو لەتۆماری قارەمانو مەزناندا رێزیان بکات.

لەکۆتاییشدا، ئەگەر رێگەم بدەن رووداوێك بەنموونە دێنمەوە کە لەمێژوودا روویداوە هیوادارم ئێوە بگرێتەوە.

لەسەردەمی پاشایەتیدا، بەڕێوەبەری ناحیەی دەربەندیخان دەربەگێکی بانگ کردبوو تاچیتر خۆی بەسەر خەڵکدا نەسەپێنێتو زەوییەکانیان نەخاتە ژێر دەستی. دوای گفتوگۆیەکی دوورودرێژ بەرێوەبەری ناحیە فەرمانیدا کەدەرەبەگەکە زیندانی بکرێت، ئەویش بەو هێزو دەسەلاَتەی کەهەیبوو ویستبووی بەرامبەری بوەستێتو زیاد لەوەش رێگە نەدرێت فەرمانەکە جێبەجێبکرێت، بەرێوەبەری ناحیە گوتبووی: دەی من چ زەرەرێك دەکەم کەتۆ فەرمان جێبەجێ ناکەیتو ناچیتە زیندانەوە، وادەزانیت بۆ من دەچیتە زیندانەوە! من هەموو مەبەستێکم بەدیهێنانی دادپەروەرییە!

بەجێبەجێکردنی ئەوەی دەیخوازمو گەلی کوردستان بەهیوایەتی، پێش هەموو شتێك خزمەتکردنە بەبەرژەوەندیی خۆتان، کەواتە بەڕێزان، هەتا کار لەکار نەترازاوە باش بیر لەمەسەلەکە بکەنەوەو رەنجەکەمان بەفیڕۆ مەدەن.

خوایە ئەتۆ ئاگاداریت ... ئەوە من ئاگادارم کرد.

بژی کورد... بژی کوردستان

**رەفیق پشدەری**
**خزمەتکاری کوردو کوردستان**